**بەرگی دووەم**

# فەرهەنگی هەژیر

## فارسی - کوردی

**وشە و چەمکە فارسی و ئەو وشە عەرەبی و ئینگلیزییانەی کە بوونەتە زاراوە لە زمانی فارسی لەخۆ دەگرێت**

**وەرگێڕان و ئامادەکردنی:**

**هەژیر عەبدوڵڵا پوور**

**هەولێر** - 2008

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **فەرهەنگی هەژیر**
- وەرگێڕان و ئامادەکردنی: هەژیر عەبدوڵڵا پوور
- نەخشەسازی ناوەوە: هەردی
- پیتچنین: زانکۆ حەسەن ساڵح
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: ( 406 ) ساڵی 2007
- نرخی هەردوو بەرگ: (20000) دینار
- چاپی یەکەم : 2008
- تیراژ: 1000 دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب** (316 )



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

## سپاس و پێزانین

سپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی ئەم بەڕێزانە دەکەم:

* بەڕێز کاک فەتاح کاویان کە لە کاتی نووسینەوەی بەرگی دووهەم نزیکەی سێ هەزار وشەی نوێی لە فەرهەنگی ئینگلیزی ـــ فارسی ئارپیان پوور بۆ دەرهێنام.

* بەڕێز سەییدجەلال ساڵحی کە وشەگەلێکی زۆری لە بواری پزیشکی بە مانا کوردییەکەیەوە بۆ کۆکردمەوە.

## چەند تێبینییەك

1) ئەمن زۆر بە کەمی خۆم لە قەرەی ناوی گژوگیا و جرۆجانەوەر و کەلوپەل داوە، چونکە نە لە توانای من دابووە و نە زۆریشم بە پێویست زانیوە و پێشم وایە لەم سەردەمانەدا دەبێ فەرهەنگی ئەو جۆرە وشانە بەپێی تایبەتمەندییەکانیان و بە هۆی پسپۆڕی خۆیانەوە لێك جیابکرێنەوە و پۆلێن بەندی بکرێن.

2) ئەم فەرهەنگە لە بنەڕەتدا فەرهەنگێکی فارسی ــ کوردی ــ کوردییە و ئەمن تا ئەو جێگەی لە توانام دابووە هەوڵم داوە بۆ هەر زاراوە و چەمکێکی فارسی چەندین مانای کوردی بۆ بدۆزمەوە و لە راستیدا بەتێکهەڵکێش کردنی دوو فەرهەنگی باسکراو و فەرهەنگی هەنبانە بۆرینەی مام هەژار ئەم بەرهەمەی لێ شین بووە و ئەو سەرچاوانەی دیکەش کە کەڵکم لێوەرگرتوون لە کۆتایی کتێبەکەدا ئاماژەم پێکردوون.

3) شێوازی خوێندنەوە یان چۆنیەتی گۆکردنی (تلفظ) بەشێك لە وشەکانم داناوە، بۆ وێنە بە دوای وشەی "اجل"دا بزوێنەکانی بەم شێوەیە هاتوە: (أَ.جَ).

4) لە بەرامبەر هەندێ وشەدا وشەی بڕوانە هاتووە بۆ وێنە بۆ دۆزینەوەی مانای "افرازیدن" دەبێ بڕوانییە وشەی "افراختن".

5) لە بەرامبەر هەندێ وشەشدا وشەی سووکەڵە هاتووە کە بە مانای "مخفف"ی فارسییە.

6) وشەیەك کە چەند مانای جیاوازی هەیە بە دانانی ژمارە یان دانانی خاڵ (.) لێك جیاکراوەتەوە.

6) وشەی مێینە لە بەرامبەر هێندێ زاراوەدا بە مانای وشەی "مؤنث"ی عەرەبی هاتووە.

7) ئەگەر وشە یان دەستەواژەگەلێك بۆ وێنە بەشێوەی "خندە زدن ــ زیر" نووسراوە، دەبێ بەمشێوەیە بیخوێنییەوە: "زیر خندە زدن".

# س

**سائب:** 1) ڕەوان، بێگیر، بێگرێ، خوڕ. 2) بەلەسە، پەلە، وەپەلەکەوتوو.

**سائبە:** 1) بەرەڵاکراو، کۆیلەی ئازادکراو. 2) وشترێ کە لە سەردەمی نەزانی/بت پەرستی دا بۆ نەزر بەرەڵایان دەکرد تا بە ئارەزووی خۆی بۆ هەر کوێیەك بچوایە و بلەوەڕایە.

**سائح:** گەشتیار، گەڕیدە، توورییست. پیاوی ڕۆژوەوان و بەستراوە بە مزگەوت.

**سائد:** گەورە/ سەروەری قەوم.

**سائر:** 1) گەڕیو، ڕۆیو، ڕەوان، بێگیر. 2) باو، کەسێك کە ببێتە چیرۆکی ناو خەڵك و ناو پەیدا بکا. 3) دیتر، خەڵکی دی. 4) ناسراو، بەناوبانگ.

**سائس:** پەروەردەکار، ڕاهێن، دەستەمۆکار، کەسێك کە بە ئاوەز و تەگبیر کاروباری قەوم و کۆمەڵێك ڕادەپەڕێنێ، کارزان، سیاسەتوان.

**سائغ:** 1) ڕەوا، ڕێپێدراو. 2) بەتام، خۆش چێژ، ئەوەی کە بە هاسانی لە گەروو بچێتە خوار.

**سائق:** شۆفیر، لێخوڕ.

**سائل:** پرسکەر، پرسیارکەر. داواکار، خوازیار، ویستەر. "**سائل بکف**": کەسێك کە بۆ سواڵ کردن دەستی بۆ لای خەڵك درێژ دەکا، سواڵکەر.

**سائم:** 1) لەوەڕخۆر، چەرننە. 2) ئەوەی کە بە ئارەزووی خۆی بۆ هەر لایەك بچێ. 3) شوان، گاوان.

**ساب:** ساوین و ڕێکوپێك کردنی ڕووی موزاییك و بەرد و شتی لەوبابەتە، سیقاڵدان. "**ساب خوردن**": سوان، سیقاڵدران. "**ساب دادن**": ساوین، سوونەوە.

**ساباط:** دالان، دارەپیچان، ڕێگەی بەدیواری سەرداپۆشراو.

**سابح:** 1) مەلەکەر، مەلەوەر. 2) تیژڕۆ، خۆشبەز، خۆشڕەو.

**سابع:** حەوتەم، حەوتەمین.

**سابق:** 1) پێشکەوتوو، پێشدەرەوە. 2) پێشین، پێشوو، ڕابردوو، ئەوسا. "**سابق بر این**": جاران، پێشتر.

**سابقاً:** جاران، جاریجاران، بەردا، لە پێش دا، پێشوو، پێشتر، لە بەرێدا، بەرلە(ئێستە)، لە مەو بەر، لەکاتی ڕابردوودا.





**سابق الذکر:** ناوبراو، باسکراو.

**سابقە:** 1) ڕابردوو، پێشینە، مێژینە. 2) ئاگایی و زانیاری لە کەسێ یان شوێنێ، ئاشنایی. "**سابقە داشتن**": هەبوونی پێشینە. هەبوونی زانیاری یان ئاشنایی پێشتر لەمەڕ شتێ یان کەسێك. "**سابقەشدن**": مانەوەی ئاسەواری هەڵسوکەوت و کرداری کەسێك. بوونە باو، بوونە نەریت. "**سابقە کار( خدمت)**": ماوەیەك کە کەسێك لە شوێنێ دا خەریکی کارێك بووە، ڕابردووی کار یان خزمەت.

**سابقەدار:** پێشینەدار، بەپێشوونە، خاوەن پێشینە، بە ڕابردوو.

**سابقەسالار:** 1) سەرقافڵە، پێشەنگی کاروان، پێشڕەوی لەشکر. 2) دەسپێك.

**سابقین:** پێشینیان، پێشوونان، وەرینان، لە مێژینەکان.

**سابلە:** 1) ڕۆیشتوو، پێوراو. 2) ڕێبوارەکان، ڕاویارەکان.

**سابوتاژ:** کاولکاری، کارشکێنی، خراوکاری لە کارخانە یان کانگادا، بەئانقەست خراوکردنی کار یان ئامرازی کار.

**سابوتە:** پیرێژن، پیرەژن.

**سابوورە:** نێرەمووك، نەنێرنەمێ. حیز، هیزەکە.

**سابوس:** ساین، ساوین، سوون، سوونەوە.

**ساپورت:** پشتیوانی کردن. "**ساپورت داشتن**": پشتیوانی لێکران.

**ساتر:** پۆشەر، وەشێر. پەرژین.

**ساتراپ:** دەسەڵاتدار، ڕاژۆر، پارێزگار لە ئێرانی کۆن دا.

**ساتی:** ژنی بەئەمەگ. لە ئایینی هێندوو دا بەو ژنانەیان گوتووە کە کاتێك شووەکانیان دەمرد ئەوانیش خۆیان دەخستە ئەو ئاگرەوە کە بۆ سووتاندنی جەستەی مێردەکەیان ئامادە دەکرا تا لە گەڵ جەستەی ئەو دا بسووتێ و ببێتە خۆڵەمێش، ئەگەر شووەکەش دوور لە ژنەکەی بمردایە جەستەی ژنەکەیان دەگەڵ یەکێك لە شتەکانی مێردەکەی دەسووتاند، ئینگلیسییەکان ئەم نەریتەیان لە ساڵی 1829ی زایینیدا هەڵوەشاندەوە.

**ساجد:** کڕنۆشبەر، سوژدەبەر.

**ساحت:** بارەگا، هەرێم، مەڵبەند، حەوشە، زەوییەك کە میچی نەبێ، گۆڕەپان، مەیدان.

**ساحر:** بڕوانە: "جادوگر".

**ساحرانە:** بە شێوازی سێحربازان، سێحربازانە، وەك جادووکاران.

**ساحرە:** مێینەی"ساحر"، ژنی سێحرباز.

**ساحل:** لێوار، لێوارە، ڕۆخ، قەراخ، دەم چەم، زەوی نزیك دەریا. "**ساحل گرفتن**": لەنگەرخستن، لەنگەرگرتن.

**ساخت:** 1) پێکهاتگ، پێکهاتە، بنیات. 2) بەرهەم، دەسکرد، دروستکراو، شکڵ و فۆرمی شتی دروستکراو. 3) سازکردن، سازان، ئامادەیی و ڕازاوەیی.

**ساختار:** پێکهاتە، بنەما، قەوارە. **"ساختار اصلی"**: پێکهاتەی سەرەکی. **"ساختار بنیادی"**: پێکهاتەی بنەڕەتی/ بناخەیی. **"ساختارشکنی"**: بنەماشکێنی، پێکهاتەشکێنی، پێکهاتە هەڵوەشێنی. **"ساختارگرایی"**: پێکهاتەخوازی، بنەماخوازی. **"ساختارگرایی تکوینی"**: بنەماخوازیی پێکهاتەیی/ ژێنێتیکی. **"ساختارمحور"**: پێکهاتەتەوەر. **"ساختار ذهنی"**: پێکهاتەی زەینی.

**ساختاری:** پێکهاتەیی، بنەمایی.

**ساختکار:** بڕوانە:"مکانیسم".

**ساختکاری:** لێك و لەبارکردن، کردەی سازکردن و ئامادەکردنی شتێك.

**ساخت گرایی:** بڕوانە:"ساختارگرایی".

**ساختگی:** 1) ئامادەبوون و ڕازاوەبوون. 2) دەس هەڵبەست، دەس هەڵبەس، هەڵبەستراو، هەڵبەسیاگ، دەستکرد، چێ کری، تەزویری، ناڕاستەقینە. **"ساختگی کردن"**: دابین کردنی پێشەکی و کەرەسەکانی کارێك.

**ساختمان:** 1) بینا، باڵەخانە، خانووبەرە. 2) سازکردن، بیناکردن. 3) شێوەی سازکردن.

**ساختن:** 1) دروست کردن، سازکردن، سازدان، بیناکردن، چێکرن، سازای، ڕۆنان، داهێنان، بنیاتنان. 2) مداراکردن، دان بەخۆداگرتن ( بناچار باید ساخت). 3) سازان، ڕازیبوون. 4) کەین و بەین کردن، بوونە هاودەست. 5) سازگاربوون. 6) ساختەکاری. 7) کێشانەوە، نیگارکێشی. 8) پەروەردەکردن، ڕاهێنان. 9) ڕازاندنەوە، خەملاندن. 10) نیشاندان بەپێچەوانەی ڕاستی. 11) نووسین، هۆنینەوە. 12) ژەنین، لێدان. 13) ئامادەکردن. 14) تەگبیرکردن. 15) ئامادەکردنی خۆراك. 16) ئەنجامدان، کردن. 17) دیاریکردن، دەست نیشانکردن. 18) گوتن، وتن. 19) ئامادەبوون. 20) دەسپێکردن. 21) بێ سەروشوێن کردن، کوشتن. **"خود را ساختن"**: کێشانی ماددەی سڕکەر و کەڵك وەرگرتن لە خواردنەوە ئالکۆلییەکان و هاتنە حاڵ و کەیف سازبوون. خۆڕازاندنەوە، خۆ لە گوڵدان.

**ساخت و پاخت:** کەین و بەین، بەن و بەس، سات و سەودا، سەروساخت، سازانی پشتی پەردە.

**ساخت و ساز:** 1) سازکردن، دروست کردن. 2) چۆنیەتی پێکهاتە و قەوارەی شتێ، پێکهاتە. 3) کەین و بەین، تەون و بەست، سەروساخت.





**ساخته:** 1) دروسکراو، دروسکەردە، سازدراو، چێکراو، ئامادەکراو. 2) کۆك کراو و ئامادە بۆ ژەنین. 3) بەشێوەی ئامادە، ئامادە. **"ساختەشدن برای چیزی"**: هەبوونی توانایی یان ئامادەیی بۆ ئەو کارە، بۆ ئەو شتە دروست کران، بابەتی ئەو شتە بوون. **"ساخته کردن"**: ئامادەکردن. **"از کسی ساخته بودن"**: لە توانایی ئەو دابوون.

**ساختەکاچار:** سازدراو و ئامادەکراو، بەئامراز و کەلوپەلی تەواوەوە.

**ساخته و پرداخته:** 1) لێك و لەبار، ڕێکوپێك، پەرداخ، پەرکاڵ. 2) بەرهەمی کار و زەحمەت. 3) حازر و ئامادەکراو. 4) دروستکراو، جێبەجێکراو. 5) تەواو، بێ کەموکووڕی.

**ساختی:** بڕوانە:"ساختاری".

**ساخر:** بڕوانە: "مسخرەکنندە".

**ساخط:** تووڕە، قەڵس، ڕق هەڵساو.

**ساخلوکردن:** جێگیرکردنی گروپێك نیزامی لە شوێنێ.

**سادس:** شەشەم، شەشەمین.

**سادگی:** سادەیی، ساکاری، دڵسافی، دڵپاکی.

**سادم:** خەمبار و پەشیمان.

**ساده:** 1) ساکار، سادە. 2) سانا، هاسان. 3) دەمرووت، لاوی موو لە ڕوو نەهاتگ. 4) ساویلکە، خۆش باوەڕ. 5) سەرڕاست، بێ ڕیا. 6) بێزریقەوبریقە، بێ خشڵ و زەنبەر. 7) بێ نەخش و نیگار (پارچە سادە). 8) نەبوونی پسپۆڕی و شارەزایی تایبەت (کارگر سادە). 9) پاك، بێ تاوان.

**سادەاندیش:** کەسێك کە مەسەلەکان کەم نرخ و ئاسان دەگرێ.

**سادەانگار:** ساویلکە، سادەلۆك، شەواك، سەپۆل.

**سادەجگر:** دڵساف، بێ فرتوفێڵ، دوور لە ڕق و قین.

**سادەدل:** ڕاست بێژ و بێ ڕیا، بێ فرتوفێڵ، دڵساف، دڵپاك، دەروون پاقژ، ساویلکە، سافیلکە، دڵ سادە، کەسێك کە زوو باوەڕ دەکا.

**سادەرخ:** 1) دەکەل، بێموو، بێریش، جوان.2) خۆش باوەڕ، ساویلکە.

**سادەرو:** بڕوانە: "سادەرخ".

**سادەزنخ:** بڕوانە: "سادەرخ".

**سادەسازی:** هاسان کردنەوە.

**سادەضمیر:** دەروون پاك، دڵساف.

**سادەعذار:** دەکەل، جوان، قەشەنگ.

**سادەکردن:** 1) ساکار/سادەکردنەوە. 2) لەناوبردنی نەخش و نیگاری شتێ. 3) سرین، ئەستڕین. 4) تاشینی موو.

**سادەلوح:** لە کار نەزان و گێلۆکە، بەسەزمان و گێل، سادەکار، سادەلۆك، ساویلکە، شەواك، سەپۆل، سادە و فەقیرحاڵ، بەستەزمانۆکە، شێتکە، دەم چەفت، دەم چەوت، لاژگ، گوێ شۆڕ، گوێ لەق، خام.

**سادەنگری:** بەسانا و ئاسان یان بیٚنرخ زانینی شتەکان.

**سادیسم:** ئازاردانی جنسی، دڵبەرئازاری، ئازاردانی لایەنی بەرامبەر لە کاتی ئیلاقەکردندا، شێتی خەڵك ئازاری، دیترئازاری.

**سارا:** پوخت، پاك، خاوێن، بیٚگەرد.

**ساربان:** وشترەوان، شڤانیٚ دەڤەهان، حوشتروان، هێشترڤان، شووڤك ڤان، سالوان، سالڤان، کاروانڤان، سەرۆکی کاروان.

**سارق:** دز، ماڵبڕ.

**ساروان:** بڕوانە: "ساربان".

**ساری:** تەشەنەسێن، دزەکەر. پەتا، ئاهوو، نەخۆشی گیرۆ، درم.

**ساز:** 1) ئامرازی مووسیقی. 2) ئامراز، کەلوپەل، پێداویستی. 3) ئامرازی شەڕ، چەکوچۆڵ و خواردەمەنی پێویست بۆ شەڕ. 4) ڕێکوپێکی. 5) ڕێباز، ئایین. 6) ئەوەی بۆ ئەنجامدانی کارێك پێویستە، ئیمکانات. 7) مەکر، فێڵ. 8) بەرگ، جلوبەرگ. 9) سازگاری، سازان. 10) بڕوانە: "تحمّل". 11) هاوکێش بوون. 12) باو. 14) بەتوانا، بەهێز. 15) شکۆ. **"سازآمدن"**: سازگاربوون، پێکەوەگونجان. **"ساز چیزی کردن( آوردن )"**: بەنیازبوون، ئیرادەکردن. **"ساز چیزی گرفتن"**: بەنیازی ئەنجامدانی ئەو بوون. **"ساز خود را زدن( كوك کردن )"**: پێداگرتن لە کار و بۆچوونی خۆ و بەهێند نەگرتنی خواستی دیتران. **"سازدادن"**: 1) ساز و ئامادەکردن. 2) ڕازاندنەوە، سەروسامان دان، ڕێکوپێك کردن. 3) ساز ژەنین. 4) وتن، شیکردنەوە. **"سازراه"**: بارگەوکەلوپەلی سەفەر. **"ساززدن"**: سازلێدان، ساز ژەنین. **"سازکردن"**: 1) دروست کردنی ئاهەنگ و ئاواز و شتی لەوبابەتە. 2) دەسپێکردن. ئامادەکردن، جێبەجێکردن. 3) کۆك کردنی ئامرازی مۆسیقی. 4) بەنیازبوون. 5) سازگاربوون. 6) نووژەنکردن(ەوە). **"سازکردە"**: چێکراو و ئامادەکراو. **"ساز مخالف زدن( كوك کردن )"**: دژایەتی کردن. **"از ساز شدن( رفتن )"**: ناهاوکێش بوون، ناهاوئاهەنگ بوون. **"بر ساز"**: ئامادە، ساز. **"بە ساز"**: 1) قورمیش کراو، کۆك کراو. پۆشتەوپەرداخ، هەبوونی کەلوپەلی پێویست بۆ کارێك. 2) ڕێکوپێك. **"بە ساز کسی رقصیدن"**: بە مەیل و ویستی ئەو جووڵانەوە، لە قسەی ئەو دەرنەچوون، لەژێر فەرمانی ئەو دابوون. **"هر روز ( يك ) سازی زدن"**: هەر ڕۆژەی سازێك لێدان، هەر ڕۆژەی ڕەفتار و کردارێکی جیا لە ڕۆژی پێشوو هەبوون.

**ساززن:** سازڤان، سازژەن، سازبەند، سازلێدەر.





**سازش:** سازان، سازیان، سازین، ساچان، ڕێککەوتن، سازشت، هاوئاهەنگی، گونجان، ڕەزامەندی، ڕازیبوون، قبوڵ کردن، ئاشتی، دۆستایەتی. **"سازش دادن"**: پێك هانین، پێك ئانین، پێکهێنان، ئاشت کردنەوە، سازاندن، سازدانی کار، گونجاندن. **"سازش داشتن"**: لێك تێگەیشتن و هاوئاهەنگی هەبوون. **"سازش کردن"**: پێك هاتن، ڕێککەوتن، لێکهاتن، ئاشتەوبوون، ئاشت بوونەوە، سازان، هاتنەبار، هاتنەڕێگە، وەلانانی ناکۆکی، هۆریٚئاردەنە.

**سازشکار:** سازشتکار، ئەوەی کە دەگەڵ کەسێکی دی پێك دیٚ و سازشت دەکا، ساتوسەوداکەر، سەروساختکەر، مەسڵەتکەر.

**سازش ناپذیر:** نەساز، کەسیٚ کە دژایەتی دەکا و لە ئاشتی نەبانە. شێلگیر، پێداگر، سوور.

**سازشنامە:** سازشتنامە، نووسراوەیەك کە سەبارەت بە وەلانانی ناکۆکی و ئاشتەوەبوون واژۆ دەکریٚ.

**سازگار:** گونجاو، پێکەوەگونجاو، سازگار، تەبا، هاوڕا، حەواوە، خۆش. **"سازگارشدن"**: گونجان، پێکەوەگونجان. هاوڕابوون. **"سازگارکردن"**: گونجاندن، پێك گونجاندن.

**سازگاری:** لێك نزیکی، پێکەوەگونجان، پێکەوەسازان، سازگاربوون، هەڵکردن، حەواوەیی، هاوئاهەنگی.

**سازگان:** سیستم، ڕێکخراوە، دەزگا.

**سازگان دارشدن:** سیستماتیزەبوون، بەسیستم بوون.

**سازگان دهی:** ڕێکخستن، تەکووزکردن، سامان دان، سیستماتیزەکردن.

**سازگانی:** سیستماتیك، سەربەسیستمێکی تایبەت، خاوەنی سیستمی دیاریکراو.

**سازگاه:** کارخانە.

**سازگر:** بڕوانە: "سازگار".

**سازمان:** 1) دام و دەزگا، ڕێکخراو، ڕێکخراوە. 2) سازکردن، شێوەی دروست کردن، ڕێکوپێکی. 3) ئۆرگان، بنیات، سازمان، ڕێکخستنەکان.

**سازمان بخشی:** ڕێکوپێك کردن، ڕێکخستن، سیستماتیزەکردن.

**سازمان بندی:** کردەی ڕێکخستن.

**سازمان دادن:** ڕێکخستن، داهێنانی دام و دەزگایەك و تەکووز و ڕێکوپێکی کردنی، ئۆرگانیزەکردن، سەروسامان دان.

**سازمان دار:** تەکووز، ڕێکوپێك، ئۆرگانیك.

**سازمان دهندە:** ڕێکخەر، پێکهێنەر.

**سازماندهی:** بڕوانە: "سازمان دادن". **"سازماندهی مجدد"**: ڕێکخستنەوە.

**سازمانگر:** ڕێکخەر، پێکهێنەر، بنیاتنەر، ڕێکوپێککەر.

**سازمان یافتە:** ڕێکخراو، ڕێکخراوەیی.

**سازمند:** سازکراو و ئامادە، ڕازاوەوسیستماتیك، تەکووز و ڕێکوپێك.

**سازمندکردن:** ڕێکخستن، ئۆرگانیزەکردن، تەیارکردن، ئامادەکردن.
**سازمندی:** بڕوانە:"سازمان دهی".
**سازندگان:** بەرهەمهێنەران، چێکەران.
**سازندگی:** 1) بنیاتنەری، بنیاتنەربوون، سازێنەری، چێکەری. 2) دروست کردن. 3) ئاوەدانکردنەوە. 4) ژەنین، سازلێدان. 5) سازگاری، ڕازیبوون.
**سازنده:** 1) دروستکەر، چێکەر، سازێنەر، بنیاتنەر، داهێنەر. 2) بەقازانج و بەکەڵك بۆ دروست کردن یان باشکردنی شتێك. 3) سازژەن، ژەنیار. 4) ڕێکخەر، پێکهێنەر. 5) سازگار، هاوڕا. 6) بڕوانە: "کارساز".
**ساز و آواز:** ئاوازی تێکەڵ بە مۆسیقا.
**سازوار:** 1) سازگار، هاوڕا، ئەهلی سازان. 2) شایان، شایستە.
**سازواره:** ئۆرگانیسم، بوونەوەری زیندوو، جەستە، قاڵب، قەوارە.
**سازواری:** سازگاری، سازگاربوون، هاوڕایی، هارمۆنی.
**سازوبرگ:** ئامراز و کەل و پەل، تروتفاق، چەکوچۆڵ و پێداویستی شەڕ کە بە سەرباز دەدرێ. "**ساز و برگ سفر**": تێشو و شتومەکی سەفەر.
**سازور:** لێك و لەبار، سازوئامادە، ڕازاوە، خاوەن سامان. 2) بڕوانە: "سازمند". 3) خاوەنی ساز.

**ساز و ساخت:** ئامراز و کەلوپەل، سامان و جلوبەرگ و شتومەك.
**ساز و سامان:** کەلوپەل و پێداویستی، سەروسامان، ڕێسا و ڕێوشوێن.
**سازوسوز:** تاقەت هێنان لە بەرامبەر تاڵی و سەختییەکان دا و سکاڵانەکردن.
**ساز و ضرب:** 1) ساز و دەهۆڵ، ساز و دنبەك پێکەوە، دارتومەك. 2) بەزم و ڕەزم.
**سازوکار:** میکانیزم، ئالییەت.
**سازونهاد:** دۆخ و ڕەوش. نەریت و ئایین.
**سازه:** 1) پێکهاتە. 2) (بیرکاری) فاکتۆر/ فاکتەر، هۆکار. 3) چێکراو، دروسکراو. 4) گروپ.
**سازه‌شناسی:** مۆرفۆلۆژی، پێکهاتەناسی وشە.
**سازیدن:** سازکردن، دروست کردن، بیناکردن، ڕێکخستن و جێبەجێکردن، ڕازاندنەوە، ئامادەکردن.
**ساسان:** نەدار، هەژار، کەسێ کە لە مڵك و ماڵ دووری بکا.
**ساستا:** 1) ستەمکار، بێبەزەیی، مزیر. 2) بڕوانە: "اهریمن".
**ساسی:** هەژار، نەدار، سواڵکەر.
**ساطع:** ڕووناك، درەوشاوە، هەڵکراو. پرژوبڵاو. ئاشکرا، دیار. "**ساطع شدن**": بڕوانە:"درخشیدن". "**ساطع کردن**": ڕووناك کردن(ەوە)، ڕۆشن کردن.





**ساطن:** ناپاك، گەمار، دەروون پیس، چەپەڵ، پەڵۆخ.
**ساطور:** ساتوور، ساتۆرك، چەپەچاخ، شەتیر. "**ساطور کردن**": وردوخاش کردن بە ساتوور.
**ساعات:** کۆی"ساعت".
**ساعت:** 1) سەعات، کاژمێر، کات ژمێر، شەست خولەك. 2) کات، سات، گاف. 3) قیامەت، ڕۆژی پەسڵان. "**ساعت به ساعت**": سات بە سات، کاتژمێر بە کاتژمێر. "**ساعت داشتن**": پیرۆزبوونی کاتێك بۆ ئەنجامدانی کارێك. "**ساعت صفر**": کاتی سفر، سفرەکات. "**ساعتی**": ماوەیەك، زەمانێك. سەعاتی، کاتژمێری. "**درساعت(اندرساعت،بەساعت)**": دەزبەجێ، جێبەجێ.
**ساعت شماری:** زۆر چاوەڕوان بوون بۆ گەیشتنی کاتژمێر یان کاتێکی تایبەت.
**ساعد:** باسك.
**ساعی:** 1) کۆشیار، ڕەنجدەر، تاقالاکار، هەوڵدەر. 2) دووزمان، قسەبەر. 3) پۆست چی. 4) خرکەرەوەی زەکات.
**ساغرزدن:** مەی خواردن، شەڕاب خواردن.
**ساغرکشیدن:** شەڕاب نۆشین.
**سافر:** بۆ سەفەرچوو، ڕێبوار. نووسەر.
**سافل:** نزم، نشێو، نەوی، زەلیل و زەبوون. "**اسفل سافلین**": نزمترین پلەکان، نەویترین شوێنەکان.
**سافدوش:** برازاوا، شۆشبان.
**ساقط:** 1) کەوتوو، وەریو، دابەزیو. 2) ناکەس، زەبوون، پەست. "**ساقط شدن**": لەناوچوون، ڕووخان. لەسەرکارلابران. "**ساقط کردن**": لەسەرکارلابردن، لێخستن، وەلانان. لەباربردن، بەرخستن. بەتاڵکردن، خاڵیکردن. "**از هستی(زندگی) ساقط شدن**": زۆر دەستەنگ بوون.
**ساقه:** چڵ، قلە گیا.
**ساقی:** مەیگەڕ، مەیگێڕ. ئاوگێڕ. دۆست، خۆشەویست. لە ئەدەبیاتی عیرفانیدا هێمای خودا یان پیر. "**ساقی کوثر**": حەزرەتی عەلی(د.خ).
**ساکب:** ڕژاو، هەڵ ڕژاو.
**ساکت:** بێ دەنگ، کپ، کڕ، مات، ئارام، بێ هات و هاوار، وسکت، وست، کەسێ کە قسە نەکا. "**ساکت شدن**": بێ دەنگ بوون، دەنگ لێ بڕان، دەنگ نەکردن، دەمکوت بوون، قسە پێنەمان، دەم دروون، وسبوون، وسبین، وسکت بوون، مات بوون، متبوون، متەق لێوەنەهاتن، هوش بوون. "**ساکت شدن درد**": ژان شکان، هێوربوونەوە. "**ساکت کردن**": بێ دەنگ کردن، وسکت کردن، وست کردن، دەنگ لێ بڕین، دەمکوت کردن، لەتاندن، قەمتەرکردن(بڕێتی). "**ساکت نشستن**": ناڕەزایەتی دەرنەبڕین، بێدەنگ دانیشتن، متەق لیوەنەهاتن.
**ساکن:** 1) بێجووڵە، نەجووڵ، بێبزاو، وەستاو، مەنگ، مەند، بێدەنگ، داسەکناو، هادار، ئارام. 2) بەخاترجەمی، بەدڵنیایی. 3) دانیشتوو، نیشتەجێ، جێگرتوو لە ماڵ یان پۆستێك دا.

**ساکنین:** کۆی "ساکن"، دانیشتوان.

**سال:** ساڵ، ماوەی دوازدە مانگ، سێسەدو شەست و پێنج ڕۆژ و نزیکەی پێنج کاتژمێر و چل و نۆ خولەك(ساڵی هەتاوی) یان بەرامبەر بە سێسەدو پەنجا و چوار ڕۆژ(ساڵی مانگی). پایەی خوێندەواری(سال اوّل تحصیلی). تەمەن. **"سال اعتدالی"**: ساڵی هەتاوی. **"سال شمسی(خورشیدی)"**: ساڵی هەتاوی. **"سال قمری"**: نزیکەی سێسەدو پەنجا و چوار ڕۆژو شەش کاتژمێر. ساڵی کۆچی مانگی. **"سال کبیسه"**: ساڵی پڕ، ساڵێ کە مانگی ڕەشەممە سی ڕۆژە. **"سال میلادی"**: ساڵی زایینی کە لە یەکەمی ژانویە(یازدەی بەفرانبار)وە دەست پێدەکا. **"سال نجومی"**: ماوەی یەك دەور سووڕانی زەوی بە دەوری خۆردا. **"سال نوری"**: مەودایەك کە نوور لە ماوەی یەك ساڵ دا دەیپێوێ. **"سال و زمانه"**: ڕۆژگار، دەورە. **"سالهای سال"**: چەندین ساڵ، ساڵیانێکی زۆر، ماوەیەکی دوور و درێژ. **"سال هجری شمسی"**: ساڵی کۆچی هەتاوی. **"سال هجری قمری"**: ساڵی کۆچی مانگی.

**سال آزمای:** پیری بەتەمەن و بەئەزموون، کەسێك کە ساڵانێکی درێژ خۆشی و ناخۆشی ڕۆژگاری دیبێ و ئەزموونی لێوەرگرتبێ، سارد و گەرم چەشتوو.

**سالار:** 1) سەردار، سالار، گەورەی کۆمەڵ، گەورە و پێشەنگی کاروان یان لەشکر. 2) فەرماندەری لەشکر. 3) پاشا. 4) ڕێبەر.

**سالارجنگ:** فەرماندەری شەڕ، فەرماندەی سپاکان لە شەڕدا.

**سالاسال:** ساڵ بە ساڵ، هەموو ساڵێك.

**سال اندر:** ساڵ نە ساڵ، ساڵێك نا ساڵێکی‌تر.

**سالانه:** ساڵانە، ساڵیانە، سالین، هەرساڵ، ساڵی جارێك، ساڵ بە ساڵ.

**سالب:** 1) داماڵێنەر، داڕن، ڕفێنەر. 2) نەرێ، نیگەتیڤ.

**سال بسال:** ساڵ بە ساڵ، هەرساڵە، هەموو ساڵێك، ساڵی جارێك.

**سالبه:** ساڵی باش، ساڵی خۆش.

**سال پیموده:** بڕوانە: "سالخوردە".

**سال تا سال:** 1) ساڵەوساڵ، لە ساڵێکەوە تا ساڵێکی تر. 2) ماوەیەکی دوور و درێژ. 3) تەواوی ساڵ.

**سال تحصیلی:** ساڵی خوێندن.

**سال تحویل:** بڕوانە: "تحویل سال".

**سال خرد:** بڕوانە: "خردسال".

**سالخورد/سالخورده:** کۆنساڵ، سالبۆری، کال، پیر و بە تەمەن، زۆر بە تەمەن، بەساڵاچوو، پیرەمێرد، دێرینە، کۆن.

**سالدار:** پیر، بەتەمەن، بەساڵاچوو.

**سالدیده:** بڕوانە: "سالخوردە".

**سالروز:** ساڵوەگەڕ، ساڵڕۆژ، ساڵیاد.





**سالف:** پێشوو، ڕابردوو.

**سالك:** (لَ) کوانی خورما، دومەڵێکە لە سەروچاو دێت.

**سالك:** (لِ) کەسێك کە ڕێگایەك بگرێتە بەر و بەو ڕێگایەدا بڕوا. تەرکە دنیا، دژکام، پێڕەو، عارف.

**سالگرد:** ساڵوەگەڕ، ساڵڤەگەڕ، ساڵبڕ، ساڵیاد، تێپەڕبوونی ساڵ بە سەر ڕووداودا.

**سال گرفتن:** بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسم دوای تێپەڕینی یەك یان چەند ساڵ ڕاست لەو ڕۆژەی دا کە کەسەکە کۆچی‌دوایی کردوە.

**سال گشت:** بڕوانە: "سالگرد".

**سالم:** 1) ساخ، ساغ، ساق، چاك، بێ عەیب. تەواو. 2) پاك، بەبێ‌ئالوودەیی(هوای سالم). 3) خاوێن یان بەکەڵك بۆ تەندروستی لەش(غذای سالم).

**سالماه:** بڕوانە: "سالمه".

**سال مرگ:** ساڵڕۆژی مەرگی کەسێك.

**سالم سازی:** لەناوبردنی هۆکارەکانی نەخۆشیهێن یان زیان هێن.

**سالمند:** بڕوانە: "سالخوردە". **"سرای سالمندان"**: خەڵوەتگەی پیری.

**سالمه:** حەساوی ساڵ و مانگ، ڕێکەوت، بەروار.

**سالنامه:** 1) ساڵژمێر، ساڵ پێو، ساڵنامە، ڕۆژئەژمێر، ڕۆژژمێر. 2) کتێوێ کە ڕووداوە گرینگەکانی ساڵێکە تێدا نووسرابێ. 3) بڵاڤۆکێ کە ساڵێ جارێك بڵاوبێتەوە.

**سالنما:** بڕوانە: "تقویم".

**سالوس:** دەم تەڕ، زمان لووس، خەڵەتێن، فریودەر، ڕیاییکەر، ڕواڵەت باز. بە مانای فێڵ و کەڵەکیش هاتوە.

**سالوسی:** ڕیاکاری، ڕواڵەتبازی، خەڵك خەڵەتێنی، فێڵبازی، مەکربازی.

**سالوك:** لاواز، نەدار، بەلەنگاز. دز و ڕێگر.

**سالیاد:** بڕوانە: "سالگرد".

**سالیان:** کۆی "سال". **"سالیان سال"**: ماوەیەکی زۆر، ساڵانێکی زۆر.

**سالیانه:** 1) ساڵانە، ساڵ بە ساڵ، ساڵی جارێك، ساڵکی. 2) جیرە یان کرێ یان داهاتێ کە ساڵانە بە کەسێك دەگا.

**سام:** ئاوسان، ماسان، پەنەم، نەخۆشی.

**سامّ:** ژەهراوی.

**سامان:** 1) سەرزەوی، مەڵبەند، شوێن. 2) کەلوپەلی ناوماڵ، پێداویستی ژیان، سامان، دارایی. 3) ڕادە، ئەندازە. 4) توانایی، تین و وزە. 5) ڕازاوەیی و تەکووزی. 6) سەبر، ئارام و قەرار. **"بە سامان"**: ڕێکوپێك، تەکووز، بەڕێوشوێن. باش، چاك. دوور لە شێواوی و پەرێشانی.

**سامان دادن:** 1) تەکووز و ڕێکوپێك کردن، سەروسامان دان، بەماڵ و حاڵ کردن، پێڕاگەیشتن. 2) چاکسازیکردن، ڕیفۆرم.

**سامان دار:** بڕوانە:"سازمان دار".

**ساماندهی:** بڕوانە: "سامان دادن".

**سامانگر:** 1) بڕوانە: "سازمانگر". 2) ڕێفۆرمخواز. 3) بەڕێوەبەر، سەرپەرشت.

**سامان گرفتن:** سەروسامان گرتن، بوونە خاوەن ماڵ و ژیان، تەکووزی و ڕێکوپێکی بە خۆوە گرتن.

**سامانمند:** تەکووز، ڕێکوپێك، ڕێکخراو، ڕازاوە، ئۆرگانیزە، سیستماتیك.

**سامانه:** سیستم، نموونە. سایت.

**سامح:** بەخشندە، دڵاوا.

**سامر:** ڕازەبێژ، چیرۆکبێژ. کۆڕی ڕازەبێژان.

**سامع:** گوێگر، بیسەر، گوهدار، ژنەوا.

**سامعه:** بیسەر، ژنەوا. ژنەوایی، گوێ.

**سامك:** بڵیند لە هەر شتێك.

**سامه:** 1) پەیمان، بەڵێن، سوێند. 2) پەنا، پەناگا.

**سامی:** 1) بەرز، بڵیند، پایەبەرز. 2) کوڕی حەزرەتی نووح.

**سان:** 1) نەریت، شێواز. 2) بەش، لەت، کوت. 3) ڕێژە. 4) چۆنیەتی. 5) خوو، عادەت. "**سان سان**": بەش بەش، کوت کوت، پارچەپارچە. "**بدین سان**": بەمجۆرە. "**بەسان**": وەکوو، وێنەی. "**چە سان**": چۆن.

**سان:** بڕیەند. "**سان زدن**": بڕیەندلێدان.

**سانتر:** ناوەند، ناوەڕاست، سەنتەر.

**سانترال:** ناوەندی. سەرەکی.

**سانتراليسم:** چەقخوازی، ناوەندگەرێتی، چڕبوونەوەی دەسەڵات لە ناوەندا.

**سانتراليزەکردن:** چڕکردنەوە، کۆجێییکردن، جێگیرکردن.

**سانترومر:** (پزیشکی) ناوەندەبەش.

**سانتی گراد:** سانتیگراد، سەدپلەیی، سەدبەشی.

**سانتی گرم:** سانتیگرەم، لە سەد گرەم یەك گرەم.

**سانتيم:** سانتیم، سەدی یەك.

**سانتی مانتال:** هەستیار، پڕهەست، هەست ناسك، دڵناسك، خوێن گەرم، دلۆڤان و هەست بزوێن.

**سانتی مانتاليسم:** هەست بزوێنی، دڵناسکیگەری.

**سانتی متر:** سانتیمیتر، یەك سانت، لە میترێك سانتێك. "**سانتی متر مربع**": سانتی میتری چوارگۆشە، سانتی میتری دووجا. "**سانتی متر مکعب**": سی سی، سانتیمیتری سێجا.

**سانحه:** ڕووداو، پێشهات، کارەسات.

**سانسور:** ڕاپشکین و چاوەدێری دەوڵەت بە سەر فیلم و شانۆنامە و بابەتی ڕۆژنامە و چاپەمەنییەکانی تر پێش لە بڵاوبوونەوەیان، سانسۆر، وردەگری، ڕەخنەکاری.

**ساويدن:** بڕوانە: "سایيدن".





**ساوێز:** خۆش خوڵق، خۆش ڕەفتار.

**ساهر:** بەخەبەر، نەخەوتوو.

**ساهی:** هەڵەکەر، فەرامۆشکار، خافڵ، کەسێ کە دڵی لە جێگەیەکی دی بێ.

**سايان:** لە حاڵی ساوین دا.

**سايبان:** هەرچی سێبەری هەیە، بەسێبەر، سایەبا، سایەوان، سەیڤان، سەیوان، کەپر، سابات، چەتر، پەردە، خێوەت کە بۆ پێشگیری لە هەتاو هەڵی دەدەن.

**سايت:** ماڵپەڕ، سایت.

**ساير:** بڕوانە: "سائر". "**سايرساختن**": بڵاوکردنەوە، پەرەپێدان. "**سايرشدن**": بڵاوبوونەوە، پەرەسەندن.

**سايس:** بڕوانە:"سائس".

**سايش:** 1) سوان، سوێن، کردەی ساوین. 2) لێك خشان.

**سايکولوژی:** دەروون ناسی، شیکاری دەروونی. "**سايکولوژی لذت نفسی**": سایکۆلۆژی چێژی دەروونی.

**سايگاه:** بڕوانە: "سایەگاه".

**سايندە:** ساوێن، ساوێنەر، ڕێخەر، پیامالّ، پیاساو، کەسێ کە شتێ بسوێتەوە.

**سايوان:** بڕوانە: "سایبان".

**سايه:** 1) سا، سای، سێبەر، سێوەر، سێ، سێە، سیکك، سایە. 2) پشتیوانی، پەنا( زیر سایه عالیجناب بەسر میبریم). 3) کارتێکەری، کاریگەری(در سایە پیشرفتهای اقتصادی هنر هم رشد می کند). 4) ناڕاستەقینە، ڕواڵەتی(نیروهای اپوزیسیون کاندیدای سایه معرفی کردەاند). "**سايه سر**": سەرپەرشت، یارمەتیدەر. "**سايه کسی را با تير زدن**": سێبەری وی بەتیر لێدان، دوژمنی سەرسەختی ئەو بوون. "**سايه کسی سنگين شدن**": کەمتەرخەم و کەم لوتف بوونەوەی ئەو. "**از سايه خود ترسيدن( رميدن)**": واتە لە هەموو شتێ ترسیان، لە سێبەری خۆ ڕەوینەوە.

**سايه‌افكندن( انداختن):** 1) سێبەرخستن، سێوەرکردن. 2) زاڵبوون، باڵادەست بوون. 3) سەرنج دان، ئاوڕلێدانەوە.

**سايه‌بان:** بڕوانە:"سایبان".

**سايه پرست:** سێبەرپەسند، سێبەردۆست، سێبەرپەرست، ئەوەی کە سێبەری خۆش بوێ و بچێتە بەرسێبەر، ئاسوودەییخواز.

**سايه پرور:** کەسێ یان شتێ کە لە بەرسێبەر دا پەروەردەبووبێ، میوەیەك کە لە بەرسێبەردا گەیبێ یان لە ژێر سێوەر دا وشك یان کردبێتەوە. کەسی ئاسوودە و تووشی مەینەتی نەهاتوو، کەسێك کە بەردەوام لە ناز و نێعمەت دا ژیابێ، نازپەروەر، ناسك نارنجی.

**سايه پسند:** سێبەردۆست، سێبەرپەرس، ئاسوودەییخواز.

**سايه‌ترس:** زۆر ترسەنۆك، کەسێك کە تەنانەت لە سێبەری خۆی بترسێ.

**سایەخشك:** وشك كراوە لە بەر سێبەر، میوەیەك كە لە سێبەر دا وشك كرابێتەوە.

**سایەخوش:** سێبەرخۆش.

**سایەدار:** بەسێبەر، سێبەردار.

**سایەدست:** دەستنووس، نووسراوە.

**سایەرو:** كەسێ كە بە بەر سێبەر دا دەڕوا، شەورۆ، شەوڕۆ، شەونخوون. ئەوەی ڕووی لە سێبەرە.

**سایەروشن:** تاریكی و ڕۆشنی، سایەڕۆشن، وێنە یان دیمەنێك كە لەو دا تارمایی سێبەر و ڕووناكایی تیشك لێكدرابێ. فەزای سیاسی و كۆمەڵایەتی كە تووشی گۆڕانكاری هاتبێ و داهاتوویەكی ناڕوونی هەبێ.

**سایەزدە:** 1) ئەوەی كە سێبەری كەوتبێتە سەر، سێوەرلێدراو. 2) شەوەلێدراو.

**سایەشكن:** ڕۆشنكەرەوە، سێبەرڕەوێنەوە.

**سایەكردن:** سێبەر دروست كردن.

**سایەگاە:** سایەبان، بەرسێبەر، شوێنی سێبەردار.

**سایەگستردن:** "سایەافكندن".

**سایەنشین:** سێبەرنشین، كەسێك كە لە بەر سێبەر دا دابنیشێ. بریتی لە كەسی بێكارە و خۆش ڕابوێر، كەسێك كە خووی بە بێكاری گرتبێ و ئەرك و زەحمەت نەكێشێ.

**سایەوار:** سێبەرئاسا، وەك سێوەر.

**سایەور:** سێبەردار، پڕسێوەر، سەهەند، سەهەنگ.

**ساییدگی:** سوان، لۆسی، ساویاگی، حاڵەت و چۆنیەتی شتی ساویاگ.

**ساییدن:** سایین، ساوین، سێویان، سوین، سوان، سوونەوە، سواندن، هەساوین، هسوون، هشكاندن، كوتان و نەرم كردن. تێسوان، تێ ساوین، تێ سوون، تێوەدان، پێداساوین، پیاساوین، پیامالین، لێخستن. بڕبەندلێدان، ژەنگ سڕینەوە.

**ساییدەشدن:** لۆسبوون، سوان لە بەر كاری زۆر، ساوان، ساویان، سوویان.

**ساییدە( شدە ):** 1) لۆسبوو، لووسبووگ، سواو، ساویاو، ساویاگ، سێویاگ، سووراوە، لووس و كەم كردو لەبەر دەكارهێنانی زۆر. سیقاڵ دراو، تیف تیفەدراو. 2) سڕاو، خاوێن كراو. 3) پرتوك و ڕزاو.

**سؤال:** 1 ) پرسیار، پرس، پەرسای، ویستە. 2) سواڵ. 3) بەدوای هەقیقەتەوە بوون. **"سؤال كردن"**: پرسیاركردن، پرس كردن، پرسین. داوای شتێ كردن، سواڵ كردن. **"سؤال و جواب"**: پرسیار و وڵام. **"سؤال و جواب كردن"**: پرسیاركردن و وڵام بیستن. وتووێژكردن. لێپرسینەوە، لێپێچینەوە. **"كسی( چیزی ) را زیر سؤال بردن"**: بردنەژێرپرسیار، لە ڕەوایی‌بوونی ئەو دڕدۆنگ بوون.





**سؤال برانگیز:** پرسیارخولقێن، پرسیارهێنەر.

**سؤال پیچ كردن:** لێكدالێكدا پرسیار كردن، ل (ێ) هەڵپێچان (بەپرسیار).

**سآمت:** وەزاڵە هاتن، بێزاربوون. دڵتەنگی.

**سئانس:** كۆبوونەوە، دانیشتن، كۆڕ.

**سبات:** (سً) 1) سەرخەو، سووكەخەو. 2) ڕۆژگار، سەردەم. 3) پیاوی زیرەك.

**سبّاح:** (سَ) مەلەوان.

**سبّاح:** (سً) كۆی"سابح".

**سباحت:** مەلەكردن. مەلەوەری.

**سباع:** كۆی"سبع"، بوونەوەرانی دڕندە، دڕندەكان، شێرەكان.

**سباعی:** حەوت تایی، حەوت پیتی، شتێ كە حەوت بنەما یان پایەی هەبێ.

**سباق:** كەوتنەبەرەوە، كەوتنەپێشەوە، پێشبڕكێ، گرێوەغار.

**سبّاك:** تاوێنەری زێڕوزێو یان كانزای تر، دەقاڵب كەری تاویاو، داڕێژ، زێڕینگەر.

**سبال بركندن:** تەممێ‌كردن، سزادان.

**سبال زدن:** لاف لێدان، خۆهەڵكێشان.

**سبب:** هۆ، سۆنگە، سەمەد، سەخمەراتی، بیانوو، لەبەر، بایس، بایست. نزیكی، خزمایەتی. **"سبب شدن"**: بوونەهۆی. **"از این سبب"**: بەم هۆیە.

**سبب ساز:** خودا كە سازێنەر و بەدیهێنەری هۆ و ئەگەری دەستەبەربوونی خواست و ئاواتە. **"سبب سازی"**: هۆ سازكردن، بیانووهێنانەوە.

**سبب سوزی:** هۆ و بیانوو لێبڕین.

**سببی:** تایبەتمەندی جۆرێ خزمایەتی كە بەهۆی پێوەندیی ژن و مێردایەتی نێوان كەسەكانەوە وەدی دێ.

**سبحان:** بەپاكی و بێگەردی یادی خوا كردنەوە، پاك و خاوێن كردنەوە.

**سبز:** 1) سەوز، كەسك، كاسك. 2) لایەنگری خاوێنی ژینگە. 3) شاد، خۆش. 4) لە حاڵی شادی و خۆشحاڵیدا.

**سبزارنگ:** بەڕەنگی سەوز. سەوزە.

**سبزایوان:** بریتی لە ئاسمان.

**سبزپا:** بڕوانە: "شوم".

**سبزپری:** وەرزی بەهار.

**سبزتشت:** بریتی لە ئاسمان.

**سبزجا:** جێی‌سەوز، سەوزەڵان.

**سبزچهره:** سەوزە، گەنمی، زەری، كەرەن زەر، سپی‌ئامالێ زەرد.

**سبزخط:** كەسێ كە تازە مووی لە دموچاوی هاتبێ. تازەلاو، لاوێژە.

**سبزخوان:** بریتی لە ئاسمان. بریتی لە زەوی پڕگیا، سەوزەڵانی.

**سبزده:** بڕوانە: "سبزتشت".

**سبززاغ:** بریتی لە ئاسمان. بریتی لە دنیا.

**سبز شدن:** 1) بە ڕەنگی سەوز دەرهاتن. 2) ڕوانی ڕوەك، سەوز بوون، شین بوون، گەڵا دەركردن. 3) بەشێوەی كتوپڕ دەركەوتن.

**سبزطاق:** بریتی له ئاسمان.

**سبزطاوس:** بریتی له ئاسمان.

**سبزفام:** هەوزەك، ئامالٚ كەسك، ئامالٚ سەوز، بە ڕەنگی سەوز.

**سبزفرش:** بریتی له ئاسمان.

**سبزقدم:** بڕوانە: "شوم".

**سبزكالك:** میوەی سەوز و كالٚ، میوەی نەگەیو.

**سبزكردن:** 1) ڕەنگی سەوز له شتێك دان، بە ڕەنگی سەوز دەرهێنان. 2) سەوزكردن، ڕواندن، چاندن و شین بوون.

**سبزكوشك:** بریتی له ئاسمان.

**سبزگار:** سەوزكەر، بە ڕەنگی سەوز دەرهێن. سەوزەڕەنگ، سەوزەڵە.

**سبزگرا:** بڕوانە: "سبزقبا".

**سبز گنبد:** بریتی له ئاسمان.

**سبز گون:** ئامالٚ سەوز، سەوزی، سەوزە.

**سبزه:** 1) شینایی، سەوزە، سەوزایی، چیمەن. 2) جۆرێ مێوژ. 3) سەوزە، زەری، سپی ئامالٚ زەرد. 4) حەشیش.

**سبزەزار:** سەوزەڵان، سەوزەڵانی، سەوزەزار، گیاجاڕ، مێرگ، چیمەن، شوێنی پڕ له گیا شین.

**سبزه قبا:** كاسەڵەشینكە، سەوزەكۆ.

**سبزیجات:** سەوزەوات ، هەشینایی.

**سبزینه:** 1) ئامالٚ سەوز، سەوزی، سەوزڕەنگ. 2) "كولۆرۆفیل".

**سبع:** (سَ) حەوت. "**یوم السبع**": ڕۆژی پەسلان. "**سبع طباق**": حەوت نهۆمی ئاسمان.

**سبع:** (سً) حەوت یەك.

**سبع:** (سَ.بً یا سَ.بَ) دڕ(ندە). شێر. "**سبعانه**": دڕندانە، وەحشیانە. شێرانە.

**سبعیّت:** دڕندەیی. شێری، وەك شێر.

**سبغانه:** بڕوانە: "بیعانە".

**سبق:** (سَ) كەوتنەپێشەوە، كەوتنە بەرۆ. "**سبق اللسان**": هەڵەی زمانی، هەڵەی لەبزی. "**سبق تصمیم**": (مافناسی) بڕیاردان بەر لە تووشبوون بە تاوان. "**سبق ذهن**": هەڵە، خەتا.

**سبق:** (سَ.بَ) كەوتنەپێشەوە، كێبەركێ. وانەی ڕۆژانە. قورئان. "**سبق بردن**": كەوتنەپێشەوە لە كێبەركێدا، بردنەوە، گرێوبردنەوە. "**سبق خوان**": قوتابی، فێرخواز، زانست خواز. "**سبق گرفتن**": كەوتنەبەرەوە، كەوتنەپێشەوە.

**سبقت:** پێشكەوتن، پێشدانەوە، پێشدەستی، پێشڕەوی."**سبقت جستن**": بڕوانە: "پیشیجستن". "**سبقت گرفتن**": بڕوانە: "پیشی گرفتن".

**سبك:** (سَ) 1) تاواندنەوەی كانزا و دەقاڵب ڕژتنی، دەقاڵب ڕژتنی كانزای تواوە. 2) شێواز، ستایل. 3) ڕێسا، ئوسلۆب. "**سبك شناختی**": شێوازناسانە. "**سبك شناسی**": شێواز ناسی، زانستی ناسینی شێوازە ئەدەبییەكان . "**سبك گرایی**": شێوازگەرێتی. "**سبك گزینی**": شێواز هەڵبژاردن. "**سبك عالی**": شێوازی بەرز. "**سبك مورد نظر**": شێوازی خوازراو/جێی باس.





**سبك:** 1) (سَ.بُ) سووك، سفك، سڤك، دژی گران و سەنگین. 2) خواردەمەنییەك كە بە ئاسانی لەناو گەدەدا بتوێتەوە. 3) ناسك(پارچە سبك). 4) چالاك، فرز. 5) ئارام، هێواش. 6) كەم نرخ. 7) ڕاحەت و ئاسوودە. 8) سووك، جلٚف. 9) نالەبار و ناحەز(رفتار سبك). 10) پیرۆز، بەفەڕ(قدم سبك). 11) كەم، ئاستەم، بەحالٚ، تۆزقالٚ. 12) زوو، خێرا، بەپڕتاو. 13) بەئارامی. 14) بەسانایی. 15) بڕوانە: "گوارا". 16) كورت. 17) تەبع پەسند و دلٚخۆشكەر. "**سبك(و) سنگین كردن**": هەڵگرتنی شتێ بەدەست بۆ مەزندەكردنی، سەنگوسووك كردن. بەراوردكردن، هەڵسەنگاندنی نرخی كەسێ یان شتێ. "**سبك شدن**": 1) كەم بوونەوە. 2) ئاسوودەبوون، ئۆقرەگرتن، هێوربوونەوە. 3) نزم و سووك بوون. "**بسیار سبك**": سڤكۆك، سڤیلانك، زۆر سووك.

**سبكبار:** 1) بارسووك، سووكبار، سڤك بار، سووكە بار، بریتی لە كەسی ئاسوودە و بێ خەیالٚ و ڕەبەن. 2) كەم نرخ. 3) بێ مەیل بە كاروباری دنیایی. 4) ئەوەی كەمتر تووشی گوناح بووە. 5) بەبێ دژواری، بەئاسانی.

**سبكباری:** بارسووكی، سووكباری، بریتی لە ئاسوودەیی و كم ئەركی.

**سبكبال:** پەڕوبالٚ سووك، باڵندەی تیژبالٚ/ فڕا، بالٚداری گچكە.

**سبك پا:** پێسووك، چالاك، گورجوگۆلٚ، فرز.

**سبك پر:** 1) فڕا، فڕۆك، زۆر لە فڕین خێرا. 2) بەخێرایی، بەپەلە.

**سبك پوی:** بەزا، خۆشڕەو، خۆشبەز.

**سبك پی:** بڕوانە:"سبك پا".

**سبك خرد:** ئاوەز سووك، كەم ئاوەز، ساویلكە.

**سبك خواب:** خەوسووك، له خەو دا له سەر هەست.

**سبك خیز:** ڕۆح سووك، ئێسك سووك، گورجوگۆلٚ، توندوتۆلٚ، فرز.

**سبك داشتن:** به سووك دانان، بە سووك و چرووك دانان.

**سبك دست:** 1) تەڕدەست، بەدەست و برد، فرز، گورج. 2) كەسێك كە بێ هۆ دەست بۆ لای كەسێكی دی درێژ بكا و لێی بدا. 3) دەست بەخێر، خاوەنی دەستی بەفەڕ. 4) بەپڕتاو، بەلەسە.

**سبك دل:** بێخەم، دلٚخۆش، خۆشحالٚ.

**سبك دوش:** كەسێك كە بارێكی بە كۆڵەوە نەبێ.

**سبك رای:** كەم ئاوەز، بێئەقلٚ، گەوج، گەمژە.

**سبك رفتار:** 1) خۆشڕەو، خۆشبەز، گورج، بەپڕتاو. 2) جلٚف، بلٚح، ئاكارناشیرین.

**سبك ركاب:** سواری چالاك و خۆشبەز.

**سبك رو:** (رَ 1) پێ سووك، گورج، تێژڕۆ، كرژ. 2) بڕوانە:"خوش گوار".

**سبك رو:** (رً) بێ شەرم، چەقاوەسوو، ڕووهەڵماڵاو.

**سبك روح:** ڕەزا شیرین، ڕەزا سووك، ئێسك سووك، خوێن شیرین، ڕووگەش، شاد، دڵخۆش، بێ فیز و دەعیە، گورجوگۆڵ، ڕۆح سووك.

**سبكسار:** بێ ئەقڵ، خۆسەر، لاسار. پەست، بێحوزم و سووك، بێنرخ. بزۆز، زەپرتی، نەحەواوە. بەدخولق، تووڕەوتۆسن.

**سبك سایە:** بریتی لە ناجێگیر و تیژتێپەڕ.

**سبكسر:** بلح و جلف ، هەرزە، بێئەقڵ، ئەقڵ سووك، سەربەتاڵ، گەوج، خۆسەر، مل پێوەنەر، پەست. كەسێ كە نەریت و باو بەهێندناگرێ و كردار و گوتاری ناحەز و نەشیاو لە خۆنیشاندەدا.

**سبك سنگ:** سووك لە كێش دا. پەست، سووك، كەم نرخ. گەمژە، نەزان.

**سبك سیر:** تیژتێپەڕ، تێژڕەو، خۆشبەز، كرژ.

**سبك عقل:** كەم ئاوەز، سووك ئەقڵ، بێ ئەقڵ.

**سبك عنان:** سوارچاك، خۆشبەز، چالاك.

**سبك فكر:** كەم زەین، كەم ئاوەز.

**سبك گام:** پێسووك، خۆشبەز، تیژڕۆ.

**سبك مایه:** 1) كەم نرخ، بێقەدر و قیمەت، پەست و سووك. 2) نەزان، بێ ئاقڵ. 3) دەست تەنگ، نەدار. 4) لاواز، كەم توانا.

**سبك مغز:** گەوج، گەمژە، لاژك، ئەقڵ سووك، بێئاوەز، بێمێشك، كەم فام، ئاقڵ سووك، گێلەپیاو.

**سبك وزن:** 1) كەم كێش. 2) كەم نرخ، هەرزان قیمەت.

**سبكی:** 1) سووكی، سفكی، سڤكی، دژی قورسی و سەنگینی. 2) جلفی، سووك و چرووكی. 3) كەمتەرخەمی بە دابونەریت. 4) بێنرخی. 5) چالاكی، گورجوگۆڵی، فرزی. 6) ئاسوودەیی، ڕەحەتی. "**سبكی كردن**": هەڵسوكەوت و گوتاری ناحەز و بلح لە خۆ نیشاندان. مداراكردن، بەنەرمی هەڵسوكەوت كردن.

**سبك یاب:** بەبیر، بیرتیژ، بەهۆش، كەسێك كە زوو لە بابەتێك بگا.

**سبلت:** 1) سمێڵ. 2) شاتوشووت و خۆهەڵكێشان. "**سبلت بركندن**": تەممێكردن و سزادان. "**سبلت مالیدن**": بڕوانە:"تفاخر".

**سبیل:** (سَ) ڕێگا، جادە. نەزر، لەخۆگرتن. حەڵاڵ، ڕەوا. شێوە، شێواز. "**سبیل كردن**": بەخۆڕایی لە ڕێگەی خوا بەخشینەوە. "**بر سبیلِ**": بۆ، لەبەر. وەك. بەهۆی. بەشێوەی.





**سبیل:** (سِ) سمێڵ، سمبێل. "**سبیل تاب دادن**": سمێڵ بادان، هەست بە ڕازیبوون و شانازیكردن یان خۆبەتووڕە نیشاندان. "**سبیل كسی آویزان بودن**": ناڕەحەت یان ناڕازیبوونی ئەو. "**سبیل كسی را چرب كردن**": تێركردن و ڕازیكردنی ئەو، بەرتیل پێدان بەو. "**سبیل كلفت**": سمێڵ بابڕ، سمێڵ زل. "**سبیل گذاشتن**": سمێڵ هێشتنەوە، سمێڵ نەتاشین. "**سبیلو**": سمێڵدار، سمێڵی. "**از سبیل كسی خون چكیدن**": ترس خستنە دڵەكانەوە لە لایەن ئەوەوە. "**روی سبیل شاه نقاره زدن**": پێڕەوی لە هیچ دەسەڵاتێ نەكردن و هەبوونی ژیانێكی بەشكۆ.

**سپاردن:** بڕوانە: "سپردن".

**سپارش:** بڕوانە: "سفارش".

**سپاس:** سوپاس، سپاس، بەچاكە زانین، چاكە لەبەر چاو بوون.

**سپاس پذیرفتن:** قبووڵی منەت كردن و منەت كێشان، سپاس كردن.

**سپاسدار:** منەت هەڵگر، منەتبار، سپاسكار.

**سپاسداری:** ئەمەگداری، پێزانی، منەتباری.

**سپاس داشتن:** منەت كێشان، منەتباربوون، سپاس كردن.

**سپاسگزار:** سپاسكار، شوكرانەبژێر، شوكرخاز، شوكرخواز، منەتدار، منەتبار، بەئەمەگ.

**سپاسگزاری:** منەتباری، منەت خوارن، سوپاس لە چاودا، بەچاكە زانین.

**سپاسمندی:** بڕوانە:"منّت".

**سپاسی:** سواڵكەر، دەرۆزەكەر.

**سپاه:** سپا، سوپا، لەشكر. "**فرمانده سپاه**": سپاران، سەركردەی سپا، فەرماندەری سپا. "**سپاه(بر)كشیدن**": لەشكركێشی كردن.

**سپاهآرایی:** تەكووزیدان بە هێزی نیزامی، ڕێكخستنی سپا.

**سپاهبد:** سپاران، سەركردە/فەرماندەی سپا.

**سپاهسالار:** سپاسالار، سوپاسالار، سەركردەی سپا/هەموو لەشكر.

**سپاهی:** سپایی، چەكداری لەشكر، نیزامی. هەركام لە تاكەكانی سپا.

**سپتیسیسم:** ئاییینی شك و دڕدۆنگی، حیكمەتی سۆفێستایی.

**سپتیك:** لایەنگری سێپتیسیسم، سۆفێستایی، كەسێك كە لە قبووڵ كردنی شتە هەست پێنەكراوەكان دا شك و دوودڵی هەبێ.

**سپر:** سپەر، سپێر، مەتاڵ، مەرتاڵ، قەڵخان. "**سپرانداختن**": بریتی لە تێك شكان و دەست لە خەبات هەڵگرتن و خۆبەدەستەوەدان. "**سپر برآب افكندن**": زەبوون بوون، وەڕەز بوون، هەڵاتن لە بەر دوژمنەوە.

**سپرآتشین:** بریتی لە هەتاو.

**سپرباز:** شەڕکەر، دلێر، ئازا.

**سپردن:** (سِ.پَ.دَ) 1) پێوان، ڕێگەبڕین، تێپەڕاندن. 2) پێشێل کردن، خستنە ژێرپێ.

**سپردن:** (سِ.پُ.دَ) سپاردن، سپارتن، ئەسپارتن، ئەسپاردن، سپاردەیی، لە قەبەڵ، دانەدەست، ڕادەست کردن. ڕاسپاردن، قەوینتی کردن.

**سپردە:** ئەسپاردە، ئەسپێراو، سپارتی، سپاردە، سپارە، سپاردی، سپێراو، سپێریاگ، ئەمانەتی، ئامانەتی.

**سپرز:** سپڵ، شوشو، شمش.

**سپرلوس:** کاخ، کۆشکی پاشایەتی.

**سپری:** تێپەڕیو، بەسەرچوو، بە کۆتایی گەیشتوو، تەواوبوو. "**سپری شدن**": 1) بەکۆتاییگەیشتن، کۆتاییهاتن، تەواوبوون، بەسەرچوون، تێپەڕین. 2) مردن، کۆچی دواییکردن. "**سپری کردن**": 1) تێپەڕاندن، سەرکردن، بردنە سەر، ڕابواردن، بەسەر بردن، تەواوکردن، بە کۆتایی گەیاندن. 2) لەناوبردن، تیابردن. 3) کوشتن.

**سپریدن:** (سِ.پَ.دَ) 1) تێپەڕاندن، تەواوکردن، بەکۆتاییگەیاندن. 2) پێشێل کردن.

**سپزگ:** دووزمان، دۆقلمەر، شوفار، زمان شڕ، قسە بەر.

**سپس:** پاشان، دواتر، دوای ئەوە، ئەوسا، دواجار.

**سپسایگی:** گەڕانەوە، گەڕانەوە بۆ دواوە، بەرەودواوەچوون.

**سپست:** (سً.پً) بڕوانە: "بدبو".

**سپلشت:** (سِ.پَ.لَ) پێشهاتی ناخۆش.

**سپنتا:** پیرۆز، موارەك.

**سپنتامینو:** وزەی فرەکردنی ئاوەز و چاکێتی.

**سپنتایی:** پیرۆزی، پاکێتی.

**سپنج:** ماڵی ساتی، نەهەمیشەیی، کاتی و نابەردەوام و تێپەڕ. لەوەڕگە. "**سپنج دادن**": بەشێوەی کاتی جێپێدان. "**سپنج یافتن**": بەشێوەی کاتی نیشتەجێبوون. بوونەمیوان.

**سپنج سرای:** بریتی لە دنیا.

**سپنجگانی:** کاتی و ناپایەدار.

**سپنجی:** ناسەقامگیر، ناجێگیر، نابەردەوام.

**سپندآسا:** گورجوگۆڵ، فرز و خێرا.

**سپوختن:** 1) تێڕا کردن، بە زۆر ئاخنین، پووڕاندن، تێکوتان، پیابردن، لێبردن، تێنان، تێڕۆکردن، تێچەقاندن، دەناوخستن. 2) دوورخستنەوە، ئەمڕۆ و سبەی پێکردن، بێنەوبەرەپێکردن. 3) ئیلاقەکردن، گایین، نیهان.

**سپوزش انگیز:** بڕوانە:"شهوانی".

**سپوزکار:** سست و تەوەزەل، کەسێك کە لە ئیشەکان دا ساوەساو و قوونەقوون دەکا.

**سپوزیدن:** بڕوانە: "سپوختن".





**سپەآرا:** ڕازێنەر/ ڕێکخەری سپا.

**سپهدار:** سپاڕان، سپادار، سەردار. دەسەلاتدار، پاشا.

**سپهرار:** تەشقی ئاسمان.

**سپهرشناس:** ئەستێرەناس.

**سپهسالار:** بڕوانە: "سپاەسالار".

**سپەشکن:** سپاشکێن، تێك شکێنەری سپا.

**سپەکش:** سپاڕان، لەشکرکێش.

**سپەکشی:** سپاڕانی، لەشکرکێشی.

**سپید:** سپی، چەرمگ، چەرمووگ.

**سپید پا:** بریتی لە پێبەخێر و خۆش قەدەم.

**سپیدچشم:** بریتی لە پێداگر، لاسار، بێ شەرم، ڕووهەڵمالاو.

**سپیددست:** ڕیاکار، ڕواڵەتباز.

**سپیدرو:** ڕووسپی، دەموچاو سپی، ئەوەی ڕوخسارێکی سپی و تابانی هەیە. بریتی لە خەڵکی چاکەکار و سەربڵند، ڕووسوور.

**سپید فام:** ئاماڵ سپی، سپیواش.

**سپیدکار:** 1) سپیکار، سپیکەرەوە، مسگەر. 2) بریتی لە کەسی چاکەکار و سەرڕاست. 3) بە مانای ساواز و ڕووهەڵمالاو و ڕیاباز یش هاتوە.

**سپیدکاسە:** بریتی لە مێرخاس، دڵاوا.

**سپیدنامە:** بریتی لە کەسی خۆپارێز و ڕاست کردار.

**سپیدەدم:** بەرەبەیان، بەیانی ڕوون، هەوەڵ بەیان، بەیانەکی، بوولێڵەی بەیان، شەوەکی، کازوکوز، کازیوە، گورگومێش.

**ستاد:** 1) بارەگا، بنکە، ناوەند. 2) وەستان، نیشتەجێبوون. "**ستاد ارتش**": ناوەندی فەرماندەیی لە ئەرتەش دا کە پلان و نەخشەکانی شەڕ تاوتوێ و متالا دەکا. "**ستاد فرماندهی**": ناوەندی فەرماندەیی.

**ستادن:** وێستان، ڕاوەستان، هەستان، ڕاستەوەبوون. وەرگرتن، لێسەندن، ئەستاندن.

**ستارەپرست:** شەونخوون. هۆگر بە سەیرکردنی ئەستێرەکان.

**ستارەدان:** ئەستێرەناس.

**ستارەسوختە:** بریتی لە بەخت ڕەش، بەدبەخت.

**ستارەشمر:** ئەستێرەژمێر، ئەستێرەناس.

**ستارەشمردن:** بریتی لە بەخەبەربوون تا بەیانی، شەونخوونی.

**ستارەشناس:** ئەستێرەناس، هەسارەناس، هەسارەگەڕێن، شارەزای زانستی ئەستێرەناسین، ئەستێرەگەری.

**ستاگو(ی):** پەسندەر، پەسن بێژ، پیاهەڵدەر، ستایشکەر.

**ستاند:** ستاند، ژوور.

**ستاندن:** لێ سەندن، ئەستاندن، ستاندن، وەرگرتن، لێ سەندنەوە.

**ستانندە:** بسێن، ئەستێن، وەرگر.

**ستایش:** پیاهەڵگوتن، پیاهەڵدان، هەڵدان، هەڵ نان، پەسن دان، تاریف کردن، بەبەژن و باڵا هەڵگوتن، ستایش کردن.

**ستایش آمیز:** تێکەڵ بە پەسن دان و پیاهەڵگوتن.

**ستایش کنان:** لە حاڵی ستایش و پیاهەڵداندا، تاریفکەر، پەسندەر، ستایشکەر.

**ستایشگر:** پیاهەڵدەر، پەسندەر، تاریفکەر، ستایشکەر.

**ستاینده:** بڕوانە: "ستایشگر".

**ستاییدن:** بڕوانە: "ستودن".

**ستایل:** شێواز.

**ستبر:** 1) توور، ستوور، قەبە، قالەن، بە گرتک، زل. 2) ناخۆش لە گوێ. 3) خەست، توند.

**ستبرا:** ئەستووری، قەبەیی.

**ستخیز:** بڕوانە: "رستاخیز".

**ستدن:** 1) ستاندن، ئەستاندن، سەندن، وەرگرتن. 2) داگیرکردن.

**ستده:** 1) وەرگیراو، ئەستێنراو. 2) ڕاندمانی بەرهەم یان ڕادەی بەرهەمی پوختەکراو.

**ستر:** (سِ) سەرپۆش، پەردە.

**ستر:** (سَ.تَ) داپۆشین، شاردنەوە.

**ستردگی:** سڕانەوە، پاکبوونەوە.

**ستردن:** تراشین، تاشین. سڕین، سڕینەوە، ئەسترین، ئەسترینەوە، بردنی پەڵە یان خەت، ماڵین و پاک کردنەوەی پەڵە بە پەڕۆ، (ستردن نوشته) هەڵگرتنەوە. لەناوبردن.

**سترسا:** هەست، سەح، ئاگاکردن، حەسیان.

**سترسایی:** هەستیاری، سڵی، قوتی.

**سترش:** (سِ تَ.رُ) دەرهاویشتن، لە قەڵەم کەوتن.

**سترگ:** 1) گەورە، مەزن. 2) باهۆدار، زنتۆڵ، زەلام و بەتاقەت، قەڵەووبەخۆوە. 3) گرینگ، گرنگ. 4) بێشەرم.

**سترون:** قسر، نەزۆك، نەزا، ئەستێور.

**سترون کردن:** نەزۆك کردن، لە سك و زا خستن.

**ستل:** (سَ) هاتنە دەری گروپێك یەك بە دوای یەك دا.

**ستل:** (سَ.تَ) کوتەك، ئازار.

**ستم:** ستەم، زوڵم، زڵم، ناهەقی، ناڕەوایی، گووج، زۆری. "**ستم رفتن بر کسی**": زوڵم لێکران لە ئەو. "**به ستم**": بەزۆر.

**ستم آباد:** شوێنێ کە زوڵم و ناهەقی زۆری لێ بێ، بریتی لە دنیا.

**ستم آمیز:** تێکەڵ بە ستەم و ناڕەوایی. زاڵم، بێبەزەیی.

**ستم اندیش:** ستەمکار، خەڵك ئازار.

**ستم بردن:** تەحەمموولی زوڵم و ناهەقیکردن.

**ستم پرور:** کەسێك کە لایەنگری لە ستەمکار بکا و پەرە بە زوڵم بدا، ستەم پەروەر.زاڵم، ستەمکار.





**ستمدیده:** ستەم لێکراو، ناهەقی لێکراو، بەشخوراو.

**ستم شکن:** بەرلێگری ستەم، کەسێك کە لە بەرامبەر ستەم و ناهەقی بوەستێ.

**ستمکار:** ستەمکار، زاڵم، زیناتکار، زۆردار.

**ستمکاری:** دەسدرێژی، زۆری کردن، زۆرداری، زوڵم، ناهەقی.

**ستم کردن:** ناهەقیکردن، زوڵم و ستەم کردن.

**ستمکش:** بڕوانە:"ستم دیده".

**ستم کشیدن( دیدن ):** ستەم لێکران، ناهەقیلێکران.

**ستم کشیده:** ستەم لێکراو، ناهەقی لێکراو.

**ستم کیش:** زاڵم، ستەمکار.

**ستمگر:** زاڵم، ستەمکار، دەست درێژکەر، لامەزەب، ماڕز، غەدار، خوێنخوار.

**ستمگری:** زاڵمی، ستەمکاری، خوێنخواری.

**ستم گستر:** پەرەپێدەری ستەم، ستەم پەروەر، زاڵم، ستەمکار.

**ستنج:** پاشەکەوت، پەسمەندە.

**ستوار:** بڕوانە: "استوار".

**ستوان:** پتەو، قایم، پایەدار، ڕاوەستاو، باوەڕپێکراو. پلەیەکی ئەرتەشییە.

**ستودن:** پیاهەڵدان، ستایش کردن، تاریف کردن، پەسەن دان، پەسنددان ، هەڵ کوتن، هەڵ گوتن.

**ستوروار:** وەك چوارپێیان، چوارپێ ئاسا.

**ست و سیر:** 1) تا ڕادەی تێربوون. 2) تێروتەسەل.

**ستون:** پایە، کۆڵەکە، ئەستوندەك، ئەستوونە، ستینك، گولتە، چەلاك، دیرەك، دیرەگ، کاروان(ستون نظامی: کاروانی سەربازی).

**ستون پنجم:** تابووری پێنجەم. ئەم زاراوەیە لە کاتی شەڕە ناوخۆییەکانی ئیسپانیا سەریهەڵدا، کاتێك چوار تابوور لە لایەنگرانی ژێنراڵ فرانکۆ بەرەو مادرید دەچوون فەرماندەکەیان پێی وتن بێجگە لەم چوار تابوورە کە بەرەو پێتەخت دەچن تابوورێکی پێنجەمیش لە ناو مادرید دا بە قازانجی ئێمە ئیش دەکا.

**ستون فقرات:** بڕبڕە، بڕبڕاگە، پشتەمازە، مۆغەرە/مووڕەغەی پشت، مڕۆخەی پشت، کاریتەپشت، موركی پشت، تیغەرەی پشت، ستووناپشت، ماریپشت، مازگە، مازی، مۆرتخە، گازەرا، گەوبەند، گەوبەندە، گرێپشت، سنسل.

**ستوه:** وەزاڵەهاتوو، جڕهاتوو، وەئامان هاتوو، شەکەت و داماو. "**بەستوەآمدن**": وەزاڵەهاتن، وەئامان هاتن، جاڕزبوون، وەڕەزبوون، بێزاربوون، ئۆقرەلێبڕان. "**بەستوەآوردن**": وەزاڵەهێنان، وەزاڵەخستن، وەئامان خستن، وەڕەزکردن.

**ستوهاندن:** وەزاڵەهێنان، وەئامان هێنان، خستنە تەنگامەوە.

**ستوهمندانه:** داماوانە، بەداماوی.

**ستوهی:** شەکەتی و داماوی، وەزاڵەهاتوویی، دڵتەنگی.

**ستوهیدن:** وەزاڵەهاتن، جرهاتن، کەوتنەتەنگانەوە، شەکەت و ماندووبوون.

**ستوهیده:** وەزاڵەهاتوو، وەئامان هاتوو، شەکەت و داماوبوو.

**ستهم:** سەخت، دژوار، چەتوون، ئاریشە.

**ستهیدن:** بڕوانە: "ستیهیدن".

**ستیخ:** بڕوانە: "ستیغ".

**ستیر:** پۆشراو، داپۆشراو. داوێن پاک، خۆپارێز.

**ستیز/ستیزه:** شەڕ و مشتومڕ، دوژمنی و سەرکێشی، کێشمەکێش، مقۆمقۆ. دژایەتی و سەرسەختی.

**ستیزکار/ستیزەکار:** شەڕکەر، شەڕانی، سەرکێش، نەسازاو، لاسار، کەللەشەق، کەسێک کە کاری شەڕ و کێشمەکێشە.

**ستیزگر/ستیزەگر:** کەللەشەق، سەربزێو، سەرکێش، شەڕانی.

**ستیزەجو:** شەڕانی، شەڕاشۆ، شەڕخواز، شەڕفرۆش، رووشن، جینگن، جنگن، زڕەک، کەرچۆقە، وەیخڕ، دەم سوور، مقەرس، سەرنەوق، بەکێشە و نەسازاو، بەدفەڕ، نەئال، نەقەتۆ، سەرکێش، نەگونجاو، هاروهاج، بەتەشقەڵە، مرۆی بەدفەڕی شەڕانی.

**ستیزه جویی:** شەڕخوازی، شەڕاشۆیی، شەڕفرۆشی، نۆیی، دڕی، جینگنی، سەرکێشی و نەسازاوی، بەرهەڵستی.

**ستیزەخو:** سەربزێو، سەرکێش و نەسازاو.

**ستیزەکردن:** دوژمنایەتی کردن. پێداگری لە دژایەتی و دوژمنایەتیدا.

**ستیزیدن:** شەڕ و کێشمەکێش کردن، دوژمنایەتی کردن، سەرکێشی و دژایەتی کردن، مقۆمقۆکردن. شەڕکردن یان خەبات کردن.

**ستیغ:** تەلان، تەلان، تیغە شان، سەرشان، سەریاڵ، لاشاخ، لاشان، یاڵە، یاڵ، چووک، چلخت، (لا)باسک، بستو، شانی چیا، ملەی کێو، بەرزایی کێو.

**ستیهش:** 1) لاساری، کەللەشەقی، سەربزێوی و سەرکێشی. 2) مشتومڕ، باس و گفتوگۆ، دیالەکتیک. 3) تۆران، زیزبوون.

**ستیهشگر:** زووهەڵچوو، شەڕەنگێز، کەللەشەق.

**ستیهشی:** باس هەلگر/وورووژێن، polemic.

**ستیهیدن:** شەڕ و کێشمەکێش کردن، سەرکێشی و سەربزێویکردن.

**سجّاد:** زۆر کڕنۆش بەر.

**سجاف:** 1) پەراوێز. 2) درز، کەلێن.

**سجال:** پێک نازین، نازکردن بەسەر یەکتردا.

**سجام:** سەرما، ساواق.





**سجانیدن:** بڕوانە: "شجانیدن".

**سجده:** کڕنۆش، سوژدە، توێڵ نانەسەرزەوی بۆ گەورەتر.

**سجدەگاه:** بڕوانە: "مسجد".

**سجدەگزار:** سوژدەبەر، کڕنۆش بەر.

**سجع:** 1) ئاخاوتەی بەسەروا، ئاخاوتنی سەروادار. 2) گمەگمی کۆتر.

**سجل:** ناسنامە، پێناس. "**سجل احوال**": ناسنامە. "**سجل شدن**": مسۆگەربوون، حەتمیبوون. "**سجل کردن**": پشت ڕاستکردنەوە. سەلماندن.

**سجن:** بەندیخانە، گرتووخانە.

**سجیل:** بەش، بەهرە، قازانج.

**سجین:** بڕوانە: "محبوس".

**سحّار:** بڕوانە: "جادوگر".

**سحر:** (سِ) سێحرکردن، جادووکردن، فریودانی کەسێک بە کاری سەرسووڕهێنەر. "**سحر حلال**": هونەرنوێنی لە پەخشان یان هۆنراوە دا.

**سحرآمیز:** (سِ) سێحراوی، تێکەڵ بە سێحر و جادوو.

**سحرخیز:** (سَ.حَ) زووڕاب، کەسێ بەیانی زوو لە خەو هەڵدەستێ.

**سحرگاه:** (سَ.حَ) بڕوانە: "سپیدەدم".

**سحری:** پارشێو، پارشەو، ساگوور، دووهەم شێوی ڕۆژەوان.

**سحق:** (سَ) کوتان، ساوین، نەرم کردن، وردوردکردن، هاڕین.

**سحیق:** ساویاگ، هاڕپاو. دوور.

**سخافت:** کەم ئاوەزی، سووک ئاوەزی، گەمژەیی، گێلی. "**سخافت رأی**": ئاقڵ سووکی، بێ مێشکی، کەم ئاوەزی.

**سخاوت:** دڵاوایی، دڵئاوالایی، ڕەندی، ئادا، بەخشندەیی، بەخشش، کەرەم، جوامێری، مێرخاسی.

**سخاوتمند:** دڵاوا، بەخشندە دەست بڵاو، کەرەمدار، کەرەمکار، جوامێر، خۆشنان، نان بدە، خواردە.

**سخت:** 1) دژوار، سەخت. 2) ڕەق، توند، هشک، سفت. 3) پتەو و خۆڕاگر، بەدەوام. 4) سەقیل، قرنیس. 5) بەتەوژم. 6) کاری، کاریگەر(در اثر زخمهای سخت مرد). 7) دڵڕەق، بێبەزەیی. 8) چارەهەڵنەگر، بێعیلاج. 9) هەڵەت، هەڵەمووت. 10) بەتەواوی، بەچڕی، زۆر، بەشێوەی جیدی(سخت درس می‌خواند. سخت در اشتباه است). 11) بەتوندی (سخت به دیوار خورد). 12) بەزەحمەت و دژواری یان ناڕەحەتی. 13) تاقەت پڕوکێن، ناخۆش.

**سخت افزار:** ڕەق ئامێر، سەخت ئامێر. "**نرم افزار**": نەرم ئامێر.

**سختانه:** قسەی ڕەق.

**سخت بازو:** زۆردار، پڕزۆر، بەهێز، ئەوەی باسکی پتەو و قەوی هەیە.

**سخت بنیاد:** بینای پتەو و خۆڕاگر.

**سخت پا:** پایەدار، خۆڕاگر، قایم.

**سخت پيشانی:** کەللەڕەق، دلێر، نەترس.

**سخت جان:** بڕوانە: "جان سخت".

**سخت دل:** بێبەزەیی، دڵ ڕەق.

**سخت رو:** 1) ڕووهەڵماڵاو، بێشەرم، پڕڕوو. 2) مڕومۆچ، ڕووگرژ، ڕووترش. 3) بەقەوەت و خۆڕاگر.

**سخت سر:** سەر ڕەق، سەرشەق، گیان سەخت و بەتاقەت و کەللەشەق.

**سخت شدن:** 1) توندبوونەوە، سفت بوونەوە. 2) دژواربوونەوە.

**سخت کردن:** 1) پتەوکردن، قایم کردن. 2) دژوارکردنەوە. 3) توندبەستن، شەتەکدان.

**سخت کمان:** 1) تیرهاوێژی شارەزا. 2) بەتاقەت، زۆربەهێز. 3) بێبەزەیی، دڵڕەق.

**سخت کوش:** 1) فرە کۆشیار، کەسێ کە کۆششی زۆر دەکا. 2) شەڕکەری ئازا. 3) بەزیبك و زاکوون، توندوتیژ.

**سخت گرفتن:** سەخت گرتن، لاڵێ بڕینەوە، قەتیس کردن، خستنە ژێر گوشارەوە، دژوارکردنەوە.

**سخت گزین:** بڕوانە: "مشکل پسند".

**سختگیر:** 1) بەزاکوون، بەزیبك و زاکوون، گوناه نەبەخش، توندوتیژ، پێداگر و لاسار، بیانووگر. 2) بەئێرەیی، چاوچنۆك، تەماکار.

**سختگیری:** بەزاکوونی، پێداگری، بیانووگرتن. حەمبەڵی، وازوازی.

**سختن:** 1) کێش کردن. 2) تاقیکردنەوە، ئەزموونکردن. 3) ژماردن.

**سخته:** 1) هەڵسەنگێنراو. 2) بڕوانە: "محدود". 3) ئەزموون دیتوو. 4) کێشراو.

**سختی:** 1) کوێرەوەری، چەرمەسەری، مەینەت، دژواری. 2) ڕەقبوون، پتەوی، سفتی. 3) دەسکورتی، دەستەنگی، نەداری. 4) توندوتیژی. "**بە سختی**": بە زەحمەت و دژواری.

**سختی کردن:** بڕوانە: "سخت گرفتن". "**سختی کردن با کسی**": بە توندوتیژی دەگەڵ ئەو هەڵسوکەوت کردن.

**سختی کشیدن(دیدن):** کوێرەوەری دیتن، ئەرك و زەحمەت کێشان، ناسۆری و مەینەت کێشان، هەڵکردن دەگەڵ نەداری و دەستەنگی.

**سخره:** بێگاری، سۆغرە، کاری بێمووچە ئەنجامدان. زەلیل و گرفتار و ژێردەست. کەسێك کە خەڵك گاڵتەی پێبکەن. "**سخرەشدن**": گاڵتەپێکران. بەدیل گیران و تێکشکان. "**سخرەگرفتن (بردن)**": بەبێگاریگرتن.

**سخريه:** بڕوانە: "استهزاء".





**سخن:** 1) قسە، پەیڤ، وتە، گلی، گوتار. 2) زانستی ئەدەبیان، ئەدەب. 3) هەڵبەست، هۆنراوە. "**سخن بردن از کسی**": یادکردن لەو. ناوهێنانی ئەو. "**سخن بدون عمل**": سەرزاری، سەرزارەکی، قسەی بەدەم نە بەکردەوە. "**سخن کردن(گزاردن، سرودن)**": قسەکردن، ئاخاوتن. "**بە سخن(درسخن)آمدن**": دەست بە قسەکردن. "**کسی کە در میان سخن دیگری بپرد**": باوەگۆ، قسە دە قسەداکەر.

**سخن آرا:** زمان پاراو، ڕەوانبێژ، قسەڕازێنەوە، نووسەری باش.

**سخن آفرین:** گوتەداهێن، پەیڤ خوڵقێن.

**سخن آموزنده:** قسەی نەستەق، قسەی پڕ لە ئامۆژگاری.

**سخن پراکنی:** 1) قسەکردن. 2) بڵاوکردنەوەی گوتار لە نێرەرە ڕادیۆییەکان. 3) دەنگۆبڵاوکردنەوە، قاوداخستن.

**سخن پرداز:** 1) ڕەوانبێژ و بەدەم و پل، قسەزان. 2) هەڵبەستوان، شاعیر.

**سخن پرور:** بڕوانە: "سخن پرداز".

**سخن تودار:** بریتی لە قسەی بە هێما، قسەی زیپك و پلار، بەتوێکڵ، بە تۆکڵ.

**سخنچین:** دووزوان، دووزمان، دۆقلمەر، شوفار، زمان شڕ، قسەبەر، قسەهێن، چوکڵەشکێن، خەبەر گوهێز، چوخور، چوولو، تێچین، شەیتانیکەر، بەزاخ، بەزاجکەر، عەوان، نێوان تێکدەر.

**سخنچینی:** دووزمانی، شوفاری و شەیتانی، بەزاج، قسەهەڵچنین، قسەبردن، قسەهێنان، زمان شڕی.

**سخندان:** 1) دەمڕاس، دەمڕاست، دمڕاست، بەدەم و دوو، خۆش ڕاوێژ، قسەڕەنگین، تەڕزمان، تەڕزوان، تەڕدەم، دەم پاراو، وتەپاراو، دەماوەر، زمان پاراو، قسەزان و بەگفت و لفت. 2) هەڵبەستڤان، شاعیر. "**سخندان فصیح**": وێژا، زۆر قسەزان و دەم پاراو، مەلابەزێن.

**سخنران:** وتاربێژ، پەیڤەر، بێژەر، گوتۆخ، ئاخێوەر.

**سخن راندن:** ئاخاوتن، قسەکردن.

**سخنرانی:** ئاخێوەری، لێدوان، دوان، ئاخاوتن. "**سخنرانی انگیزگر**": لێدوانی ورووژێنەر(انە). "**سخنرانی کردن**": وتوو، وتاردان، قسە بۆ خەڵك کردن، لێدوان.

**سخن رك:** تەنگەگر، قسەی ڕەق.

**سخن رك و صريح:** وەکات، قسەی ڕەپ و ڕاست، قسەی ڕاست و ڕەوان، قسەی بێ ڕووبینی.

**سخن رمش:** بڕوانە: "مصاحبە".

**سخن سرا:** 1) قسەزان و دەم پاراو. 2) وتەبێژ، بێژەر. 3) چیرۆك بێژ، گێڕەرەوە. 4) بڕوانە: "نغمەسرا". 5) شاعیر، هۆزان.

**سخن سنج:** 1) ڕەخنەگری ئەدەبی. 2) ئەدیب، وێژەر، هۆزانڤان.

**سخن شناس:** وتەناس، پەیڤ ناس، کەسێ کە چاکی و خراپی هەڵبەست یان نووسراوەیەك لێك بکاتەوە، ڕەخنەگری ئەدەبی.

**سخن شنو:** کەسێك کە بەگوێی کەسێکی دی بکا، قسەقبووڵ کەر، پەندوەرگر، گوێڕادێر، گوێڕایەڵ.

**سخن کنایە آمیز:** (قسەی)بەتەوس، (قسەی)بەزیپك، قسەی بە پلار، قسەی بەتێکوڵ.

**سخن گزار:** 1) بڕوانە: "سخنگو". 2) هەڵبەستڤان، نووسەر. 3) ئافرێنەری پەیڤ.

**سخن گستر:** ئەوەی تاوتوێی قسەیەك بکا، کەسێك کە بابەتێك شیدەکاتەوە، ڕاڤەری بابەتێ.

**سخن گفتن:** ئاخاوتن، قسەکردن، پەیڤین. "**سخن گفتن با شتاب**": هەڵەهەڵ، قسەی بە پەلەپەل.

**سخنگو:** 1) وتەبێژ، گوتەبێژ، بێژەر، قسەکەر، بەردەفك، وتەوان، دەمڕاست، دمڕاست، نوێنەر بۆ قسەکردن. 2) شاعیر، نووسەر. 3) زۆربلێی، فرەوێژ.

**سخنگویی:** ئاخێوەری و ڕەوان بێژی.

**سخن محوری:** پەیڤ تەوەری، گوتە تەوەری.

**سخن ناشنوا:** بلەوەز، گوێ نەبیس، گوێ نەبیست، نەژنەو.

**سخن ندان:** دەم پووچ، دەم پووچەڵ، دەم چەفت، قسەنەزان.

**سخن نما:** ئۆرگان، زمان حاڵ، دەمڕاست، وتەبێژ.

**سخن نیوش:** گوێگر، گوێدێر، بەردەنگ.

**سخنور:** قسەزان و دەم پاراو ، بەدەم و دوو، بدوو، وتاربێژ، پەیڤەر. بوێژ، ئەدیب.

**سخنوری:** بوێژی، شاعیری، شێعرخوێندنەوە، بێژەری، چیرۆك بێژی.

**سخونت:** گەرمی، تین.

**سخی:** بەرچاوتێر، دڵاوا، دەسڤالا، دەس ڤەکری، دەسکراو، دڵگوشاد، دەسگوشاد، بەخشەندە، جوامێر، دژی ڕژد و چرووك.

**سخیف:** سووك، لاواز، کەموکووڕیدار. ئەقڵ سووك، بێمێشك. بێتام.

**سدّ:** 1) بەربەند، لەمپەر، کۆسپ، پێش بەست، بەرگر، ڕتم. 2) بەنداو، بەربەند، کەرپە، سەد. 3) داخستن، پێوەدان، بستن. 4) سنوور. "**سد باب کسی شدن**": پێش بە کاری وی گرتن، بوونە لەمپەر لە بەرامبەر کاری ئەودا. "**سد بستن**": دروست کردنی بەنداو. "**سدجوع**": خواردنی خواردەمەنی، برسیەتی ڕەواندنەوە. "**سد راە کسی(چیزی) شدن**": بوونە لەمپەر لە بەرامبەر گەیشتنی ئەو بەو شتە. "**سدکردن**": بستن، داخستن. دژوارکردنەوە و پێش بە وەدیهاتنی گرتن. "**سد معبر**": 1) بەسترانی ڕێ. 2) داخستنی ڕێگای هاتووچۆ.





**سدکیس:** بڕوانە: "رنگین کمان".

**سده:** 1) سەدە، قەڕن، دەورەیەکی سەد ساڵە. 2) ئاگر، گڕ، بڵێسە.

**سدید:** قایم و توندوتۆڵ، پتەو و ڕاوەستاو. ڕاست و دروست، جێیبەقا.

**سرّ:** ڕاز، نهێنی، سڕ، سوڕ، ڕەمز و ڕاز.

**سرآخر:** سەرەنجام.

**سرآغاز:** سەرەتا، دەسپێك، پێشەکی.

**سرآمد:** بڕوانە: "سرامد".

**سرآمدن:** بە کۆتایی گەیشتن، کۆتاییهاتن، تەواوبوون، دواییهاتن، بەسەرچوون، سەرچوون، سەرهاتن، هەڵاتن، خەلاس بوون، نەمان، بڕانەوە.

**سرآوازه:** سەربەند، پێشەکی.

**سرآوردن:** کۆتایی پێهێنان، بەکۆتایی گەیاندن.

**سرا:** ماڵ، جێگە، شوێن. "**سرای پسین**": پەسڵان، ئەو دنیا. "**سرای جاوید**": جێگەی مانەوە، ئەو دنیا، بەهشت. "**سرای سپنج**": بریتی لە دنیا. "**سرای فانی**": دنیا.

**سراب:** تراویلکە، بەردە تراویلکە، لەیلان، هاڵ، ڕەوڕەوك.

**سرابالا:** بڕوانە: "سربالا".

**سراپا:** 1) سەرتاپێ، سەرتاپا، لە سەر تا پێ، گشت، گشت لە گشت، هەموو ئەندام. 2) بڕوانە: "تماماً".

**سرّاج:** زیندروو، زیندوور.

**سرازیر:** سەرەژێر، سەرەوژێر، سەربەرەژێر، سەرەوار، سەرەوخوار، بەرەوخوار، بەرەوخوارە، بەرەژێر، بەرەوژێر، ڕووبەخوار، نشێو. "**سرازیر شدن**": بەرەوخواربوونەوە، سەربەرەژێرچوون، بەرەوخوارچوون، سەربەرەوخوارچوون، خلۆر بوونەوە، خلیان، تلەوبوون. "**سرازیرکردن**": سەرەوخوارکردنەوە، بەرەوبەرەژێربردن، سەرەوژێرکردن، سەرەونخوون کردن.

**سرازیری:** سەربەرەو ژێری، سەربەرەژێرە، سەربەرەوژێرە، سەرەوژێرە، سەرەژێرە، سەرەوخواری، سەربەرەوخواری، سەرەوخوارە، سەربەرەوخوارە، سەرەولێژی، سەرەولێژە، سەرەوارە، لێژ، لێژی، لێژایی، بەرەولێژایی، نشێوی، ڕوەونشێوی. "**سرازیری کم**": بەرەوژێرکە، بەرەولێژکە.

**سراسر:** سەرانسەر، سەراسەر، سەرتاسەر، گش، هەموو، تەواو، ئەم پەڕاوپەڕ، پەڕان پەڕ، شەقانشەق، لەم سەر تا ئەو سەر.

**سراسیمگی:** سەرشێوان، سەرلێشێوان، هەوڵ بوون، پەرێشانی و سەرگەردانی، سەرسام بوون، دامان.

**سراسیمه:** هەراسان، سەرلێشێواو، سەرگەردان، پڕوپەشێو، هەوڵ، پەشۆکاو، حاڵ پەرێشان، تاساو، واج، واژ، وڕ، واق وڕماو، گێژ و سەرسام، گێژ و سەرشێواو، گێژ و مات و داماو. "**سراسیمه شدن**": حەپەسان، وڕ بوون، واق وڕمان، تاسین، هەوڵ بوون، پەشۆکان، گێژوهوڕبوون.

**سراشیب:** بەرەلێژ، بەرەولێژ، لێژ، ڕووەونشێو، نشێو، بەرەوخوار، بەرەوخوارکە، بەرەوخوارە، سەربەرەژێر، بەرەوژێر، سەربەرەژێرکە، سەربەرەژێرە، سەربەرەخوار، سەربەرەوخوار، ڕووبەخوار.

**سراشیبی:** سەربەرەخواری، سەربەرەخوارە، سەربەرەوخوارە، بەرەوخوارە، سەربەرەوژێری، سەرەوژێری، سەرەولێژە، سەرەولێژی، سەرەولێژایی، سەربەرەولێژایی، سەرەوچێر، سەرنسوڤ، سەرنشیڤ، لێژی، خەزگ، خەشیقولك، گۆرەنیش، ڕێگەیەك كە بەرەو نشێوی بچێ.

**"سراشیبی اندك":** سەرەوناو، سەرەوناوە، سەرەولێژکە.

**سراغ:** پێوشوێن، پەیسەر، سۆراخ، پرسیارکردن لە جێگەو شوێنی کەسێك.

**"بە سراغ کسی یا چیزی رفتن":** چوون بە پەیسەری دا، چوون بە پێ وشوێنیدا.

**سراغ دادن:** زانیاری سەبارەت بە جێگەی کەسێك یان شتێك دان.

**سراغ کردن:** زانیاری وەدەست خستن لە شتێ یان کەسێك، سۆسەکردن. پەیسەرگرتن، گەڕان بە شوێن کەسێ یان شتێك دا.

**سراغ گرفتن:** پەیسەر گرتن، سۆراخ گرتن، چوونە پەیسەری، وەدواکەوتن، بەدوی شتی گوم بوو دا گەڕان.

**سر افتادن:** تێگەین، پەیبردنە بابەتێك.

**سرافراز:** سەربەرز، سەربڵێند، سەربڵند.

**"سرافراز داشتن":** سەربەرز کردن. ڕێز و قەدر قایل بوون. **"سرافرازکردن":** بوونە مایەی سەربڵێندی کەسێك. سەربەرزکردن.

**سرافرازی:** 1) سەربەرزی، سەربڵێندی، شانازی بە کاری باش. 2) بڕوانە: "تکبر".

**سرافزون:** کای لاوەکی و ناجیددی و زیادی.

**سرافشان:** سەرجوولێن، مەست، بەفیزوهەوا، لووت بەرز.

**سرافشاندن:** سەرجووڵاندن یان سەر لە حەواکردن. گیاندان، گیان سپاردن. لەخۆبوردوویی‌کردن.

**سرافکندگی:** سەرشۆڕی، شەرمەزاری، تەریقی، فەدیکاری.

**سرافکنده:** سەرشۆڕ، سەرنزم، سەرنەمە، سەرنەوی، سەرنەوەر، سەروهار، سەرداخستوو، تەریق، شەرمەزار و خەجاڵەت. سەرشۆڕانە، شەرمەزارانە.

**سراکوفت:** سەرزەنشت، تانە، لۆمە.

**سراگون:** بڕوانە: "سرنگون".

**سرامد:** 1) گرۆبەر، باوخۆشتر لە خەڵکی تر، لە خەڵك لەپێشتر، سەرتڵ، سەرگوڵ، هەڵبژاردە. 2) کۆتایی، سەرەنجام.

**سران:** بەرپرسان، سەرۆکەکان.

**سرانجام:** سەرەنجام، ئاکام، لە کۆتایی دا، دمایی، بڕانەوەی کار. **"بە سرانجام رسیدن":** بە ئاکامێکی دڵخواز گەیشتن.





**"سرانجام دادن":** بەکۆتاییگەیاندن، تەواوکردن.

**سرانداز:** 1) سەرناز، سەرەناز، بەسەردادراو، بەخۆدادەر. 2) لاکێش، مافوورەی درێژۆکە. 3) نەترس، بوێر، دلێر، لەخۆبوردوو، ئەوەی لە ڕێی دلبەرەکەیدا سەردابنێ. 4) پەچە، ڕووسەری.

**سراندرکشیدن:** چوونە ژوور، چوونەبان. جووڵان، بزاوتن.

**سراندرون:** ئاوری ژێرکا و فێڵەزان.

**سراندن:** (سَ.دَ) سووڕاندن، خول پێدان.

**سرانه:** سەرانە، ساوەری، پیتاك لە هەر تاکێ لە مرۆ و ئاژەڵ. جیاوازی بەهای دوو شت. **"سرانه دام":** پووشانە، مەکات.

**سراهنگ:** سەرقافڵە، پێشڕەو، پێشەنگ.

**سرایان:** لەحاڵی هۆنینەوە/هۆندنەوە، لە حاڵی ستران بێژی دا.

**سرایت:** 1) کەوتنەڕێ و گەڕان لە شەودا، شەوگەڕی، شەوڕەوی. 2) تەشەنە/ تەشەناکردن، تەشەنەسەندن، تەنینەوە، داگرتن، داگری، گیرۆیی، ستیرمە، (لێ)گرتنەوە، تووش بوونی نەخۆش لە خەڵکەوە(ئەم نەخۆشیە گرتنەوەی هەیە).

**سرایدار:** دالاندار، پاسەوانی کاروانسەرا و ماڵەگەورە، درگاوان.

**سرایش:** (سَ.یِ) ستران بێژی، گۆرانی چڕین.

**سراینده:** (سَ.یِ) سروودبێژ، بێژەر، بوێژ، هەڵبەستڤان، شاعیر.

**سراییدن:** (سَ.یِ) گۆرانی نیشتمانی وتن، هۆنینەوە، هۆندنەوە، شێعروتن، گۆرانی وتن.

**سرباختن:** سەردان، سەردانان، خۆبەختکردن، خۆ دەپێناونان، خۆ بە کوشت دان.

**سربار:** 1) شتێ کە لە سەر باری بارەبەر دادەنرێ، سەربار، سەربارە، چەمپال، نابیش سەر. 2) دەرد و زەحمەتی زیادی. **"سربارشدن":** خەرجی خۆ خستنە ئەستۆی دیتران، داسەپێنران، بوونە سەربار.

**سرباز:** ئەوەی کە سەرەکەی ئاوەڵەبێ، سەرئاوەڵە، بێمیچ. 2) باڵباز، سەرباز، سەرواز، چەکداری دەوڵەت، سپایی، لەشکری، نیزامی. 3) ژنی بێ پەچە.

**سربازخانه:** قشڵە، قژڵە، سەربازخانە، سەروازخانە، سپاگە، بنکەی چەکدارانی دەوڵەت.

**سر باززدن:** لەژێر بار دەرچوون، نەچوونەژێربار، نەکردن، سەرپێچی کردن، مل نەدان.

**سربازکردن:** دەم کردنەوە، سەرئاوەڵەبوون. کرانەوەی زارکی شتێ. شیکردنەوە، دەربڕین.

**سربازگمنام:** سەربازی ون، سەربازێکی نەناسراو کە تەرمەکەی لە ناو تەرمی کووژراوەکانی شەڕ دا هەڵدەبژێرن و وەك نوێنەری ئەو سەربازانەی کە گیانیان لە پێناو نیشتمان دا بەخت کردوە بە خاك دەسپێرن و ڕێز لە گڵکۆکەی دەگرن.

**سربازگیری:** سەربازگرتن، سەربازگیری، سەروازگیری، خەڵك بۆ سەربازی بردن.

**سربازنهادن:** سەرنانەسەر سەرین یان زەوی.

**سربازی:** 1) سەربازی، سەروازی، چەکداری بۆ دەوڵەت. 2) ئازایەتی، بوێری، چاونەترسی. 3) گیانبازی، لەخۆبوردوویی.

**سربالا:** بەرەوژوور، ڕوو بە بڵندی. نەرێنی، نیگەتیڤ(جواب سربالا).

**سربالایی:** بەرەژوورە، بەرەوژوورە، سەربەرەوژوور، سەربەرەوژوورە، سەرەوژوورایی، سەرەوکۆ، ڕوەوبڵێندی، ڕووبەبڵێندی، هەوراز، هەورازی، ئەڤراز، هەڤراز، بەرزایی، بڵێندایی، ڕکە.

**سربتو:** سەرداخستوو، سەربەژێر، کەسێك کە ڕازی خۆی بە کەس نالێ. بەمەکر و فێڵباز، فێڵەزان، تەڵەکەباز.

**سربخش:** بەهرە، بەش.

**سربدار:** ئەوانەی ئامادەن ملیان بە پەتەوە بکەن، کەسی سەربەگۆبەند و جەنگاوەر کە دژی حکوومەت ڕاپەڕێ.

**سربرآوردن:** 1) ڕاپەڕین، سەربڵندکردن/ کردنەوە، سەربەرزکردنەوە، قووت بوونەوە، هەستان. 2) خۆنیشاندان، دەرکەوتن. 3) ڕوان، هەڵدان. 4) شانازیکردن.

**سربراه:** 1) بڕوانە: "مطیع". 2) پابەند بە بنەما ئەخلاقییەکان.

**سربرتافتن:** سەرپێچی کردن، نەچوونە ژێر بار، سەربزێوی کردن، سەرچەوتی کردن.

**سربرخط:** ملکەچ، ژێرفەرمان، بەرفەرمان، گوێڕایەڵ.

**سربرداشتن:** 1) سەربەرزکردنەوە لە سەر سەرین. 2) هەستان، ڕاپەڕین، ڕابوون، شۆڕش کردن.

**سربرزدن:** 1) شینبوون، سەوزبوون. 2) خۆرهەڵاتن، هەتاوکەوتن.

**سربرکردن:** 1) سەربڵێندکردن، سەرهەڵێنان. 2) ناڕەزایەتی دەربڕین.

**سربزنگاه:** سەری وەخت، بەوەخت، لەکاتی خۆیدا.

**سربزیر:** سەربەژێر، بەشەرم و حەیا، خاکەڕا، بێدەمار.

**سربسته:** سەرداپۆشراو، سەرداخراو.

**سربسر:** 1) بەتەواوی، سەرانسەر. 2) بەرابەر، یەکسان. 3) بەشێوەی یەکسان. "**سربسرشدن**": یەکسان بوون، بەرابەربوون. "**سربسرکردن**": بەرابەری کردن. قەرەبووکردنەوە.





**سربفلك کشیده:** زۆر بەرز.

**سربلند:** 1) سەربەرز، سەربڵێند، پێوەنازیو.2) بەرز، بڵێند.

**سربلندشدن:** سەربەرزبوون، سەربڵێندبوون، پێوەنازین.

**سربلندکردن:** 1) سەربەرزکردن، سەربڵێندکردن، گەورەکردن. 2) سەرهەڵێنان، بەرزکردنەوەی سەر. 3) ڕاپەڕین، هەستان.

**سربمهر:** 1) سەرمۆر، سەربەمۆر، دەست لێنەدراو. 2) ئاشکرانەبوو، نەوتراو. 3) کچێنی.

**سربها:** بڕوانە: "خون بها".

**سر به سر گذاشتن:** دواندن و جاڕز کردن، توتانن، سەرخستنەسەر، سەرنانەسەر، سەرکردنەسەر، وێڕزان، تیزپێکردن، گەمەپێکردن، تووڕەکردن بە قسە و دەست بازی.

**سربەگریبان:** خەمبار، خەمناك.

**سر به نیست:** شرت و گوم ، بێ سەر و شوێن.

**سربەهم آوردن:** سارێژبوونەوە.

**سربەهوا:** هەدانەدەر، بزۆز، کەسێك کە بە دوای هەوەس و خولیاکانی خۆیەوە بێ. بێسەروبەر، گوێ نەدەر، حولحولی، گەللایی.

**سرپا:** ڕاوەستاو، وێستاو، وێساو.

**سرپاس:** 1) مەتاڵ، سپێر، کڵاوی ئاسنینی شەڕکەر. 2) گورز. 3) سەرتیپ. 4) نگابان، پارێزەر.

**سرپایی:** 1) کەسێك کە بەبێ دووکان مامەڵە دەکا. 2) کارێ کە بە پێوە ئەنجام بدرێ. 3) ئیلاقە کردن بە پێوە، زیناکاری. 4) کەوشی سووکەڵەی بێپانیە، دەمپایی.

**سرپایین:** بڕوانە: "سرازیر".

**سرپرست:** سەرپەرست، سەرپەرشت، پەرستار، ئاگاداری کار، مشوورخۆر، مشوورخۆرە، گۆهدار، گۆهدێر، کەسێ کە ئاگای لە کەسێ یان شتێ دەبێ. "**سرپرست دلسوز**": خەمخۆرە، مشوورخۆرە، سەرپەرشتی دڵسۆز.

**سرپرستی(کردن):** سەرپەرشتی، سەرپەرستی، ڕاگەیشتن، مشوورخۆری، ئاگاداری کردن، بەخێو کردن، بەخۆکردن، خۆدی کرن، خوێداری، خاوەنداری، حاواندنەوە، لای خۆ حەواندنەوە، وەخۆگرتن، بەڕێ بردن، بەسەرەوە گەڕان، خەمخۆری لێکردن، هەڤاندن.

**سرپنجگی:** پڕزۆری، زۆرداری، دلێری، تەڕدەستی.

**سرپنجه:** بریتی لە وزە و هێز، تەڕدەست و پڕزۆر. زاڵم، ستەمکار.

**سرپوش:** دەڤۆك، پاسا، پۆرتك، سەرقاپ، مووداپۆش، زاربێن، قاپاغ، قەپاغ، هەرچی شتی پێ لەبەرچاو نەدیو دەکەن. "**سرپوش گذاشتن**": سەرپۆش دانان، سەرپۆش لە سەر دانان، داپۆشان، داپۆشاندن، داپۆشانن، داپۆشین، نوخوماندن، شاردنەوە.

**سرپوش گذار:** داپۆش، داپۆشەر، سەرپۆش دانەر.

**سرپوشیده:** ژن یان کچێ کە پەچە یان چارشێوی بە سەر خۆیدا دابێ. ماڵ یان داڵانی سەرداپۆشراو، شوێنێ کە بن میچی هەبێ، بەرانبەر بە سەرئاوەڵە.

**سرپیچ:** مێزەر، شاشك.

**سرپیچی (کردن):** سەرپێچی کردن، سەربزێوی کردن، ئەشقیایی، سەرکێشی کردن، نەکردن، مل نەدان، لارەملی، نەچوونە ژێربار.

**سرتابیدن:** بڕوانە: "سربرتافتن".

**سرتاپا:** بڕوانە: "سراپا".

**سر تاخت:** دەزبەجێ، بەخێرایی.

**سرتاسر:** بڕوانە: "سراسر".

**سرتافتن:** بڕوانە: "سرتابیدن".

**سرتراش:** سەرتاش، دەلاك.

**سرتیر:** دەزبەجێ، بەخێرایی.

**سرتیز:** 1) نووك تیژ. 2) خیلەسەر، سەرکێش. 3) کاریگەر، کارتێکەر.

**سرجمع:** سەرجەم، لەسەریەك. هەڵبژاردە، سەرچڵ. "**سرجمع زدن**": حەساوکردن.

**سرجمله:** 1) بڕوانە: "برگزیده". 2) بەکورتی. 3) بەگشتی.

**سرچشمه:** سەرچاوە، سەرچاوکە، سەرچاوگە، سەرچەمە، سەروچاوە، سەروچاوێ، سەروکانی، سەراو، چاوگە، چاوەی ئاو، کانی، سەرکانی.

**سرچنگ:** سەرپەنجە، سەری پێنج قامك بە تێکڕای. شەقەزللە، شەپڵاغە.

**سرچین:** سەرتەڵ، سەرتڵ، هەرشتێکی بژاردە.

**سرحال:** کەیف ساز، بەکەیف و دەماخ، خۆش دەماخ، دڵخۆش، دڵشاد، خۆشحاڵ، ڕووخۆش، شادمان، لەش ساغ، ساغ و سلامەت، چراخ. "**سرحال آمدن**": سەرخۆهاتن، هاتنەسەرخۆ، هاتنەگووڕ، گوڕگرتنەوە، گوڕبەستنەوە، هاتنەحاڵ، لە کزی و نەخۆشی ڕزگاربوون، کەیف سازبوون، بووژانەوە، ڤژانەوە.

**سرحد:** سنوور، کەوشەن، تخووب.

**سرحدات:** ناوچە سنوورییەکان.

**سرحددار:** سنوورپارێز، سنوورڤان.

**سرحلقه:** ڕێبەر، پێشەوا، کەسی دیار و زەق لە ناو گروپێکدا.

**سرخ:** 1) سوور، سۆر، سوهر، سویر، بەڕەنگی خوێن. 2) خوێناوی(انقلاب سرخ). 3) کومونیست. "**سرخ کوچك**": سوورکەلە، سوورکەڵە، ڕەنگ سووری چکۆلە. "**سرخ مایل به کبودی**": سوورکەوگ، سووری ئاماڵ شین. "**سرخ و سفید**": ڕوخسار ڕۆشن و گەشاوە.

**سرخاب:** سووراو، سووراڤك، دەرمانی سوور بۆ خۆ جوان کردن.

**سرخارنگ:** ئاماڵ سوور، سوورباو، سۆرینگ، ڕەنگ سوور.





**سر خاریدن:** 1) دڕدۆنگبوون. 2) لاواندنەوە. 3) سەرلێخوران.

**سرخ تیره:** سووری تۆخ، سۆری تار.

**سرخجه:** سوورەکوان.

**سرِ خر:** خوێنتاڵی کارتێکەر.

**سرخ رگ:** خوێن بەر، دەماری خوێن ڕاگوێز لە لەش دا.

**سرخ رنگ:** بڕوانە: "سرخارنگ".

**سرخ رو:** سوورلام، دەم و ڕووسوور، ڕوخسار بە ڕەنگی سوورکارە. بریتی لە شاد و خۆشحاڵ و دڵخۆش و سەرکەوتوو.

**سرخ روشن:** سووری ئاڵ، سووری کەژ.

**سرخ شدن:** سوور بوونەوە، سوورەوەبوون، سوور هەڵگەڕان، هەڵ کزان، هەڵ کزیان، هەڵ کزین. "**سرخ رنگ شدن از شرم**": سووربوونەوە، سوورداگیرسان، سوورۆداگەڕان، لەبەر حەیا و شەرم سوورهەڵگەڕان. "**سرخ شدن فلز از حرارت**": سووربوونەوە، سوورەوەبوون، لە ناو ڕۆنا چزان.

**سرخ فام:** ئاماڵ سوور، بە ڕەنگی سوور.

**سرخك:** سوورك، سوورکە، سوورکێ، سوورێژە، سوورێژکە، سووریك، سووریکە، سوورێکە، سوورێجە، سووریجە، سوهرك، سۆرك، سوێرێژك، جۆرێ زیپکەی سووری وردە لە منداڵ دێ.

**سرخ کردن:** سوورەوەکردن، سوورکردنەوە، لە ڕۆنا چزاندن، هەڵ کزاندن، هەڵ کزانن.

**سرخ کوچك ــ آدم:** سوورکەڵە، سوورکەلە.

**سرخگون:** بڕوانە: "سرخارنگ".

**سرخم کردن:** سەرچەماندن، سەردانەواندن.

**سرخ نای:** سوورانچك، سوورچك، سوورێچکە، سوورێنچك، سوورێنچکە، سوورێنە، سۆرسۆرك، ستۆکڕك، ستۆکوڕ، ستۆکڕك، ستۆکوڕك، سکور، سێرۆچکە، ئەستوکوڕك، کڕکڕك، کڕکڕاگە، قوڕاچکە، قوڕقوڕاچکە، قوڕقوڕاگە، قورتم، زەنگەلۆر.

**سرخوانی:** ستران بێژی، گۆرانی وتن.

**سرخود:** خۆسەر، ئازاد و سەربەست، سەرەڕۆ.

**سرخور:** سەرەخۆرە.

**سر خوردن:** (سً) داخزان، خزیان، داخزیان، سوڕیان، خلیسکان، خلیسکین، دەرحەسین.

**سرخوردن:** (سَ) هیوابڕان لە کارێ یان لە شتێك و وازهێنان لێی، ناهومێد و بێزاربوون. شکست خواردن، سەرنەکەوتن. "**سرخوردگی**": دڵشکان، دڵساردی، ناهومێدی.

**سرخوش:** مەس، مەست، سەرخۆش. شاد، خۆشحاڵ.

**سرخی:** سوورایی، سوورایەتی، سووراتی، سوورێتی، سۆهری، سووری. "**مایل به سرخی**": سوورباو، سوورکار، سوورکارە.

**سرد:** چێیی، چای، چایگ، فێنك، سار، سارد، سەرد. 2) ناخۆش و نارەحەتكەر(حرف سرد). 3) بەبێ‌كەڵك وەرگرتن لە چەك یان هێزی نیزامی. "**بسیارسرد**": ساردوسڕ، سەرتەزێن، نەكەرۆز، زۆرسارد.

**سرداب/سردابە:** سارداو، سارداوە، سەرداو، سەرداڤ، قوڵكە لە زەوی بۆ ئاو تێدا سارد كردن.

**سردادن:** (سَ 1) بەرەڵداكردن، بەرەڵاكردن، بەردان، وێڵ كردن، ئازاد كردن. 2) بڕوانە: "سرباختن".

**سر دادن:** (سً) خلیسكاندن، ڕەت پێدان لە سەر سەهۆڵ.

**سردار:** 1) سالار، گەورەی كۆمەڵ. 2) پێشەوا، ڕێبەر، سەروەر.

**سرداور:** دانێر، ناوبژیكەر.

**سردبیان:** قسەسارد، پەیڤ نەخۆش كەسێك كە بە قسە سارد و سڕەكانی بەرامبەرەكەی وەڕەز بكا.

**سردبیر:** سەرنووسەر، سەرنڤیسار، سەرەك نووسەر.

**سردرآوردن:** 1) سەردەرهێنان، سەردەرهاوردن، پەیابوون. 2) سەرنەویكردن، ملدان، مل شۆڕكردن، خۆبەدەستەوەدان. "**سردرآوردن از كاری**": سەرلێ‌دەرچوون لە كارێك، سەرلێ دەركردن، سەردەرهێنان.

**سردرپیش:** سەرشۆڕ، شەرمەزار، تەریق.

**سردرد:** سەرئێشە، سەرێشە، سەرئێشان، سەرێشان، ژانەسەر، سەراسێ.

**سر دركردن:** 1) سەر تێخستن. 2) چوونەناوەوە.

**سردرگم:** سەرلێشێواو، سەرگەردان، گێژ، هالۆز، هالۆزاو، ئالۆز، تێك هالاو، هەبلین، هم گم.

**سردرگم شدن:** تێك هالان، هالۆزان، هالۆزبوون، ئالۆزبوون، سەرلێشێوان.

**سردرگمی:** سەرلێشێواوی، سەرگەردانی، گرێوگۆڵ.

**سردرهوا:** هەوەسباز، هەوەسپەرست، تۆلاز، بلەوەز، خەیالاوی، خەیاڵ پەروەر.

**سردسته:** سەردەستە، سەرگەورە، سەرپەل، سەرداری كۆمەڵێك.

**سردستی:** شتێ كە لە سەر دەست یان بەردەست دابێ، كارێ كە بە خێرایی و دەسبەجێ جێ بەجێ بكرێ، ئەوەی ئامادەبێ یان زوو ئامادە بكرێ. كەم، كورت.

**سردسیر:** بڕوانە: "ییلاق".

**سرد شدن:** 1) ساردبوون (ەوە). 2) كەمبوونەوە یان لەناوچوونی خۆشەویستی و گەرموگوڕی نێوان كەسەكان. 2) ناهومێدبوون لە شتێ یان كەسێك و بێ مەیل بوون سەبارەت بەو. 3) بڕوانە: "خاموش شدن". "**سردشدن هوا**": ساردكردن، هەواساردبوون.





**سردفتر:** بەڕێوەبەر و بەرپرسی دەفتەری بەڵگە ڕەسمییەكان. ڕێبەر، پێشەوا.

**سردمدار:** 1) دەمڕاست، هەڵسووڕێنەر. خاوەن تەكیە. خاوەن قاوەخانە. پاتۆقدار. 2) ڕێبەری گروپ، سەرۆك.

**سردماغ:** بەكەیف و دەماخ، خۆش دەماخ، بەدەماخ، دڵخۆش.

**سردمزاج:** بێ‌حاڵ، بێ‌واز، سست، خەمبار.

**سردمزاجی:** سستی و بێحاڵی، هاتنەخواری مەیلی سێكسی لە ژن یان پیاو دا كە لەوانەیە هۆی دەروونی هەبێ.

**سردواندن/سردوانیدن:** بێنەوبەرەپێكردن، ئەمڕۆ و سبەی پێكردن، دەستی‌دەستی پێكردن، هێنان و بردن.

**سردور:** (سَ.دَ) سەركردەی زیرەوان و هەواڵنێران.

**سردوگرم چشیده:** بەئەزموون، ساردوگەرم چەشتوو، تاڵی ڕۆژگار چەشتوو.

**سردی:** ساردی، سەردی. بێ‌مەیلی. بێ ڕەحمی. "**احساس سردی**": ساردایی، هەست بە سەرما كردن.

**سرراست:** ڕاستەوخۆ، یەكسەر، ڕێگەی ڕاست، ڕاسەوڕاست، سەرڕاست، بێ پێچ و پەنا. بەبێ لێڵی و ئالۆزی، ڕووڕاست. بێ كەموكوڕی.

**سرراستاد:** بەڕێوەبەری گشتی.

**سررسید:** كۆتایی كاتی ئەنجامی كارێك. كاتی دانەوەی قەرز.

**سررسیدن:** گەیشتن، لەپڕایەكی هاتن، وەختی هاتنی كاتی كارێك. تەواوبوونی ماوەی شتێ.

**سررشتە:** 1) سەرتا، سەرتاڵ، سەرەداو. 2) سەرەتا و دەسپێكی هەر شتێك. 3) ئاگایی و ئەزموون. 4) لێزانی، لە كار زانین. 5) دەفتەر حەساو. 6) یادداشت، نووسراوە، ڕاپۆرت. "**سررشتە چیزی از دست رفتن**": لە كۆنترۆل دەرچوون. "**سررشتەداشتن**": هەبوونی زانیاری و ئەزموون. "**سر رشتە را گم كردن**": سەرلێشیوان.

**سررفتن:** 1) كۆتاییهاتن، تەواوبوونی كات. 2) لێوڕێژبوون، سەرڕێژبوون، سەرڕێژكردن، لیپاولیپ بوون، هەڵچوون، هەل چوون، شیلاڤكرن. 3) كەم تاقەت بوون.

**سرریز:** سەرڕێژ، لێوڕێژ.

**سر( و )زبان دار:** حازرجواب.

**سرزبانی:** بەبێ فیكر و ئەندێشە یان بەبێ بڕوای قووڵ.

**سرزدن:** 1) سەردەرهێنان و شین بوونی ڕوەك. 2) خۆرهەلاتن، تاودەركەوتن. 3) سەرلێدان، سەردان، دیەنیكردن. 4) دەركەوتن. 5) سەربڕین. "**سرزدن بە كاری یا چیزی**": سەرقوتان، سەردان و تاوتوێ كردن یان پێڕاگەیشتن.

**سرزدە:** 1) لەنخافڵ، بەشێوەی كتوپڕ، بێ

چاوەنۆڕی، بێ پرس و ڕا. 2) سەرکوتکراو، زیندەوەرێ کە سەریان کوتابێتەوە.

**سرزدەرفتن:** بێ ئیزن و لە ناکاو چوونە شوێنێك، بێپرس و ڕا خۆپێداکردن. "**سرزدە مهمان شدن**": بەسەرادان، لە نخافڵ بوونە میوانی کەسێك.

**سرزمین:** نیشتمان، وڵات، سەرزەوی.

**سرزن:** سەرکێش، سەربزێو، کەسێك کە مل بۆ بڕیارێك نەدا.

**سرزندە:** 1) سەرحاڵ، بەکەیف و دەماخ، دڵخۆش، خۆشحاڵ. 2) پیاوی ناودار، بەناوبانگ، دەست ڕۆیشتوو، سەردەستە، گەورەی کۆمەڵ.

**سرزنش:** سەرکۆ، سەرکۆنە، سەرزەنش، سەرزەنشت، سەردەنشت، کۆڕان، لۆم، لۆمە، لۆمەی، لوومەی، لەوم، لۆرین، دەمکوت، چفان، چکی، تریت، تەپەسەر، پلار. "**سرزنش کردن**": بەسەراچوون، بەسەراهاتن، سەرکۆنەکردن، کۆڕاندنەوە، کۆڕاننەوە، چفاندن، لۆمەکردن.

**سرزیر:** بڕوانە: "سرازیر".

**سرسام:** واسەر، ئەسپەك، سەروخولێ، نەخۆشییەکی مێشکە زیپکە لە سەر و توێڵ دەردەخا و نەخۆش وەك شێتی لێ دێ، "مەنێنژیت".

**سرسام آور:** 1) واسەرهێن، ئەوەی کە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئەسپەك. 2) سەرسامکەر، سەسووڕهێنەر، سەرسووڕێن.

**سرسبد:** بڕوانە: "برگزیدە".

**سرسبز:** سەرسەوز، تەڕوتازە، تورت و تێراو، گەشاوە. ڕووناك، ڕۆشن.

**سرسپردن:** بریتی لە خۆبەدەستەوەدان، هاتنەسەرچۆك، ملنیان، چوونە ژێر فەرمان، هاتنەبەرفەرمان، سەرسپاردن.

**سرسپردە:** بەرفەرمان، ژێرفەرمان، ملکەچ، ڕاژێر، گوێڕایەڵ.

**سرستون:** سەرکۆڵ، داری نێوان ئەستوون و بان.

**سرسخت:** بریتی لە گیان سەخت، پڕتاقەت، ڕاوەستاو و خۆڕاگر، کەللەڕەق، کەللەشەق، سەرڕەق، سەرشەق، سەروشك، سەرسەخت، لاسار، بلەوەز، سەهندە، سەهنگە، گوێنەبیس.

**سرسختی:** خەزر، پێچەقان، مانگرتن، گیان سەختی، ڕاوەستاوی و خۆڕاگری، کەللەڕەقی، کەللەشەقی، لاباری.

**سرسرە:** خلیسك، شوێنی خلیسکان.

**سرسری:** 1) سەرچڵ، سەرپۆت، سەرشکێن، بیرنەکەرەوە و هەڵەڕۆ، سەرسەری، بێبیرکردنەوە، بەهەڵە و لەزو بیرنەکەرەوە، کارێك کە بەبێ بیرلێکردنەوە و بە کەمتەرخەمی ئەنجام بدرێ، کەسێ بەلەز و بێلێکدانەوە کار دەکا. 2) قسەی قۆڕ و هزرنەکراو، وتەی پووچ و بێمانا. 3) بێ بناغە، بێ بنەما. 4) کەم، چووکە، کەم نرخ.





**سرشاخ شدن:** مل دەبەر ملنان/ئامبازبوونی دوو زۆرانیگر لە سەرەتای زۆران گرتن دا، زۆرەزمێی دوو زۆرانباز بێ ئەوەی یەکتر لە زەوی بدەن، بەگژیەکاچوون یان پێك هەڵپڕژان.

**سرشار:** 1) لێوانلێو، لێوڕێژ، لچانلچ، لچانلیچ، لیپاولیپ، قەڵاچن، سەرڕێژ، پڕاوپڕ، لیپاولیپ، لیڤ ولیڤ، زەپەزەپ، کەیل، تژی. 2) زۆر، فراوان.

**سرشت:** سروشت، سوروشت، سرشت، جەوهەر.

**سرشتن:** کردنەهەویر. تێکەڵکردن، تێوەردان. خولقاندن، ئافراندن، داهێنان.

**سرشدن:** تەواوبوون، بەسەرچوون.

**سرشك:** فرمێسك، ئەسر، ئەسرین، ڕۆندك. بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "اشك".

**سرشکستگی:** شەرمەزاری، تەریقی.

**سرشکستە:** 1) سەرشکاو، کەسێك کە سەری شکابێ. 2) سەرشکستی، خەجاڵەت، شەرمەزار، سەرشۆڕ، تەریق.

**سرشکن:** 1) سەرشکێنەر، کەسێ کە سەری کەسێکی دی بشکێنێ، شتێ کە سەر بشکێنێ. 2) سەرشکێنە، شێوەی دابەش کردنی شتێ لە نێوان گروپێك کە بە هەر کەسەو بەشێك بگا.

**سرشمار:** سەرئەژمێر، سەرژمێر، سەرژمار، سەرنووس، کەسێك کە گیانداران دەژمێرێ.

**سرشماری:** سەرئەژمێری، سەرژمێری، سەرژماری، سەرنڤیسی، ژماردن، هەڵ ژمار، بژاردنی مرۆ یان ئاژەڵ.

**سرشناس:** ناسراو، ناسیاو، ناسیاگ، سەرناس، بەناوبانگ، بەناودەنگ، بناڤ و دەنگ، بەناو، بەناڤ، ناودار، ناڤدار، ناوبەدەرەوە، سەربەدەرەوە، کەسێ کە زۆربەی خەڵك بیناسن.

**سرشناسە:** بڕوانە: "عنوان".

**سرشیب:** بڕوانە: "سراشیب".

**سرطان:** شێرپەنجە، پەنجەشێر، قرژە، قرژاڵە، نەخۆشی سەرەتان.

**سرعت:** خێرایی، پەلە، لەز، تاڵووکە. "**سرعت انتقال**": بەخێرایی تێگەیشتن لە شتێ. "**سرعت رفتن**": خێرا لێخوڕین. "**سرعت سقوط**": خێرایی داکەوتن. "**سرعت صوت**": خێرایی دەنگ. "**سرعت عمل**": چالاکی، فرزی، چوستی. "**سرعت کردن**": پەلەکردن، خێراکردن. "**بەسرعت**": بەپەلە، خێرا، دەسبەجێ. "**سرعت مجاز**": خێرایی ڕێ پێدراو.

**سرعت گیر:** تاسە، لەمپەر.

**سرعنوان:** سەردێڕی سەرەوەی لاپەڕە.

**سرغزل:** باشترین غەزەڵ لە غەزەڵەکانی شاعیرێك.

**سرغوغا:** کەسێ کە ببێتە هۆی قواقو و ئاژاوە.

**سرف:** (سَ.رَ) خافلان و لەبیرکردن، هەڵەکردن. زێدەڕۆیی و سنوورپەڕاندن.

**سرفراز:** بڕوانە:"سرافراز".

**سرفرازیدن:** بەخۆنازین، شانازی کردن.

**سرفرماندهی:** 1) پۆستی ڕێبەری و سەرۆکایەتی تەواوی گروپە نیزامییەکان. 2) کۆمەڵێك پێکهاتوو لە فەرماندەرانی پایەبەرزی شەڕ. 3) فەرماندەری گشتی.

**سر فروافکندن:** چوونە فیکرەوە.

**سرفرودآوردن:** سەردانەواندن، سەرچەماندن، داهاتنەوە بۆ کڕنۆش بردن. خۆبەدەستەوەدان، ملنیان، چوونەبەرفەرمان.

**سرفروانداختن:** سەرداخستن، شەرمەزاربوون.

**سرفروکردن:** خۆبەدەستەوەدان، ملنیان.

**سرفصل:** 1) سەردێڕی پاری کتێب. 2) سەرەتا، دەسپێك. 3) قۆناغێکی گرینگ لە کارێ یان ڕووداوێ.

**سرفەکردن:** کۆکین، کۆخین، قۆزین، قفین، قفەکردن، کلهایش.

**سرفیدن:** بڕوانە:"سرفەکردن".

**سرقافله:** سەرقافڵە، کاروانڤان، سەرۆکی کاروان، ڕچەشکێن.

**سرقت:** دزی. دزین، دزی کردن،ماڵ بردن، ڕفاندن. "**سرقت ادبی**": قسە و نووسراوەی دیتران ڕەپاڵدانە خۆ، دزینی ئەدەبی. "**بە سرقت بردن**": دزین، ڕفاندن. "**بە سرقت رفتن**": دزران، ڕفێنران.

**سرقدم رفتن:** 1) دەست بە ئاو گەیاندن بەتایبەتی کاتی سکەشۆرە. 2) ئەنجامدانی کارێك بەسەرسەری و بێ بیرلێکردنەوە.

**سرقصیده:** باشترین قەسیدەی دیوانە شێعرێك.

**سرقفلی:** سەرقفڵی، سەرقفڵانە، پارەدان بۆ چۆڵ کردنی دووکان و خانووی بەکرێ. "**سر قفلی داشتن چیزی**": بەنرخ بوونی ئەو.

**سرك:** (سَ.رَ) 1) سەری گچکە. 2) زۆربوونی کێش یان نرخی شتێ نیسبەت بە شتێکی دی. 3) سەربار، سەربارە، ناوبار، ناڤبار، نێوبار، ناوتا.

**سرکار:** کاربەدەست، کارگێڕ. بەردەست، گزیر. وەستاکار. "**سرکار پادشاه**": بارەگا.

**سرکتاب:** فالگرتنەوە لە ڕووی کتێب.

**سرك داشتن:** (سَ.رَ) بەسەرەوەبوون و زۆربوونی شتێ نیسبەت بە شتێکی دی لە کێش یان لە نرخ دا.

**سرکردن:** 1) دەست پێکردن. 2) ڕابواردن، هەڵکردن، بەسەربردن، دەگەڵ کەسێك سازان و ڕابردن، دەگەڵ کەسێك ژیان و مداراکردن. 3) سەرلێدان. 4) وردبوونەوە لە شتێ. 5) دەمکرانەوە. 6) دەست بەهاتن کردن.

**سرکردگی:** سەرکردایەتی، فەرماندەیی.

**سرکرده:** فەرماندە، سەرکردە، سەردەستە.





**سرکش:** 1) سەرکێش، سەربزێو، سەرپێچ، ئەشقی، یاخی. 2) ڕام نەبوو. 3) شەڕکەری بەهێز و تاقەت.

**سرکشی:** 1) سەرکێشی، سەربزێوی، سەرپێچی، ملەپێچی، ئەشقیگەری، یاخیگەری. 2) سەرکێشی و پێڕاگەیشتن. 3) ئازایی و بەهێزی.

**سرکشیدن:** 1) بەسەرەوەنان، بێ نێوان دان فڕکردن، خواردنەوەی یەکسەرە، هەڵقوڕاندن، هەڵقوڕانن، هەڵقوڕین، هەڵ لووشان، هەڵ لووشین، هەڵ نووشین، بێنێوان دان فڕکردن. 2) سەرکێشیکردن، سەرلێدان. 3) ڕوان، هەڵدان. 4) چوونەبان. 5) ڕوو وەرگێڕان.

**سرك کشیدن:** ملەقوتە، ملەقوتێ، ملەتاتکێ، هەڵقوت، هەڵقوتان، هەڵ قوتاندن، هەڵقورت، هەڵقورتان، سەرەتاتکێ، سەرکێشان، سەرقوتان، ڕوانین بە دزییەوە.

**سرکوب کردن:** سەرکوت کردن، چەپاندن.

**سرکوبگر:** سەرکوتگەر.

**سرکوبگران:** سەرکوتکەران.

**سرکوفت:** 1) سەرکۆنە، سەرزەنشت، لۆمە، تانە، توانج. 2) تەمبێ، سزا.

**سرکوفتن:** تانەوتەشەرلێدان، توانج لێدان. لەناوبردن.

**سرکوفته:** سەرکوت کراو، گیانلەبەرێ کە سەریان کوتابێتەوە.

**سرکیسەکردن:** گرتن یان ئەستاندن( بەپاڕانەوە یان بەپێداگری).

**سرگذشت:** بەسەرهات، سەربوردە، سەربووری، سەرگورشتە، سەرگوروشتە، چیرۆك، نەزیرە، نەزیلە، نەقڵ، ئەوەی کە بەسەر کەسێك دا هاتووە. بەسەرهات نووسی، "بیۆگرافی".

**سرگران:** ناڕازی. تووڕە، قەڵس.سەرخۆش، لەخۆدەرچوو، لەخۆبایی. شەیدا.

**سرگرای:** 1) سەرپێچیکەر، سەرکێش، سەربزێو. 2) بێئۆقرە، بێئارام، هەدانەدەر.

**سرگرایی:** سەرپێچی، سەرکێشی، سەربزێوی.

**سرگردا:** سەرگێژە، سەرزڤڕان.

**سرگردان:** سەرگەردان، سەرگندان، سەرلێشێواو، ڕێلێشێواو، سەرلێتێکچوو، ڕێگوم کردوو، ڕێك ونداکری، پەشێواو، تەیا، تیا، چارچاڤ، چاش، چارچەش، قەوچە، باهێر، پەشێو، داماو، دەسەسەر، گێژ و مات، لانەواز، عەوداڵ، ئاوارە، هەڵوەدا.

**سرگردانی:** سەرلێشێواوی، سەرگەردانی، پەشێوی، داماوی، چاشبوون، بەهەڵەچوون، ئاوارەیی، هەڵوەدایی، لانەوازی، وێڵبوون.

**سرگرفتن:** 1) دەسپێکران. 2) تێکهەڵچوون، تێك گیران. 3) جێبەجێبوون. "**از سر گرفتن**": دەستپێکردنەوە.

**سرگرم:** 1) خەجڵ، خەرکاو، خەریك، سەرقاڵ، سەرجەنجاڵ، غاپۆرە، مژوول بەکار. 2) سەرخۆش، مەست. "**سرگرم شدن**": خەریك بوون، پێوەخەریك بوون، سەرقاڵ بوون، سەرقاڵی، ئاگالێبڕان، تاوژین، مژوول بوون، خافڵان، غافڵان، خاوان، سەرگەرم بوون. "**سرگرم کردن**": خافڵاندن، خڵافاندن، خاواندن، خاوانن، سەرقاڵ کردن، خەریك کردن بە کارێکەوە، سەرلێتێك دان.

**سرگرمی:** خۆخڵافکێ، سەرقاڵی، خەریکی، تاوژین، مژولاهی، پژگاڵ، خافڵان، هاوژین، شتێ کە خۆی پێوە خەریك بکەن لە بێکاریان.

**سرگزیت:** خووك، باربوو، ساوەری، گەزیت.

**سرگشاده:** 1) ئاشکرا، ڕوون. 2) سەرئاوەڵە، سەرکراوە، بێسەرپۆش. 3) ڕاخراو، پانکراوە.

**سرگشته:** 1) بڕوانە: "سرگردان". 2) داماو، بێچارە. 3) ئاشق، شەیدا. 4) شێت، دێوانە.

**سرگل:** سەرتۆپ، سەرتل، باشترین لە هەر شتێ.

**سرگم:** سەرلێشێواو، سەرگەردان، وڕ، کەسێك کە ڕێیگوم کردبێ و سەرگەردان مابێتەوە.

**سرگوشی:** پچە، پچەپچ، سرتە، سرکە.

**سرگیجه:** سەرگێژە، سەرەگێژە، سەرگێژی، گێژبوون، سەرەخولێ، سەرەسووڕە، سەرەسووڕێ، سەرزڤرین، سەرزڤران، گێجەگێج.

**سرگیس:** بڕوانە: "قوس قزح".

**سرلوح/سرلوحه:** 1) سەردێڕ، ناونیشان. 2) سەرچەشن، نموونە. 3) بەرنامە (ی کار).

**سرما:** سەرما، هەوای سارد، ساردی، زم، زما، دژی گەرما. "**سرما و یخبندان**": سەرماوسۆڵ، سەرماوسۆڵە، سەرما و بەستەڵەك، (سرمای شدید)ساواق، سایقە، سەهەند، جەبەرە، جەوەرە، کەلواز. "**سرمای خشك**": وشکەسەرما، هشکەساری، هشکەسڕ. "**سرمای ناگهانی**": گەلواز، سەرماسۆڵی لەنکاو. "**احساس سرما کردن**": سەرمابوون، هەست بە سەرما کردن. "**سوزش سرما**": سۆزە، تەزووی سەرما. "**کسی که تاب مقاومت سرما را ندارد**": سەرمابردوو، سەرمابردە، سەرمابردەڵ، سەرمابردەڵە. "**لرزیدن از سرما**": هەڵ لەرزین، لەرزین لە سەرما. "**هنگام سرما**": ساردوسەرما، جەنگەی هەواساردی.

**سرماخوردگی:** هەڵامەت، چیامانی، چایمانی، باپەڕ، سەرمابوون، نەخۆشی لە سەرماوە. "**سرماخوردگی شدید**": نزڵە، نوزڵە.

**سرماخوردن:** تووشی هەڵامەت بوون، سەرمابوون.





**سرماریزه:** خووز، خووس، خووسار، خویز، خوویسار، خویسك، خووسار، سووخ، سووخار، سیخ، سیخار، سیخوار، خازی، ئاڵشك، زوقم، زەمەگولیلك، قڕ، قڕاف، قورۆ.

**سرمازدگی:** سەرمابردن، سەرماکارلێکردن.

**سرمازده:** سەرمابردوو، سەرمابردگ، سەرمابردە، سەرمابردەڵ، سڕبری، ڕەق بوو، پاییزەڕێز، شەختەلێدراو.

**سرمایش:** فێنك کردنەوەی ئاو و هەوا بە دەزگای فێنك کەرەوە. فێنك کردنەوەی هەوای ناو بینایەکان.

**سرمایه:** سەرمایە، سەرمیان، دەزمایە، دەستمایە، دەسمایە، تەنخوا.

**سرمایەدار:** سەرمایەدار، خاوەن سەرمایە، بوروژوا، دەوڵەمەند.

**سرمایەداری:** سەرمایەداری، بورژوازی.

**سرمایەگذاری:** وەگەڕخستنی سەرمایە بۆ وەدەست خستنی قازانج، تەرخان کردنی سەرمایە، سەرمایە گوزاری.

**سرمایی:** سەرمابردوو، سەرمابردە، سەرمابردەڵە.

**سرمحرر:** سەرنووسەر.

**سرمد:** بەردەوام، هەمیشە، نەمر، هەرماو، هەرهە.

**سرمدی:** نەمر، هەتاهەتایی، هەرماوی، هەمیشەیی. خودایی.

**سرمربی:** ڕاهێنەر، فێرکار.

**سرمست:** سەرخۆش، سەرمەس، سەرمەست، غەڕە، بەفیز و هەوا.

**سرمشق:** نموونە(ی‌سەرەکی)، نموونە بۆ فێربوون، نمینەك، سەرچەشن، پاڕادایم.

**سرمقاله:** سەروتار.

**سرمنشأ:** هۆ، سەمەد.

**سرمه کشیدن:** داڕشتن، چاوڕشتن، کل دەچاو کێشان/کردن.

**سرناچی:** سوڕناژەن، زوڕناژەن، زوڕناچی.

**سرنامه:** سەردێڕ، دەسپێکی نووسین. پێشەکی کتێو.

**سرنخ:** سەرەداو، سەرتاڵ، سەرتا، سەرەتا، سەرڕشتە.

**سرنفر:** سەرگروپ، سەردەستە.

**سرنگون:** 1) سەرنخوون، سەرنوخوون، سەرنەخوون، سەرەونخوون، دەمەونخوون، ژێروژوور، سەرەوژێر، چەرخ پێدراو، وەرگەڕاو، قڵپ. 2) لەسەرکارلابراو. "**سرنگون شدن**": 1) سەرەوژێر بوون، سەرەونخون بوون، دەمەونخون بوون، نوخوون بوونەوە، ئاوەژوو بوونەوە، قوڵب بوون، وەرگەڕان. 2) ڕووخان، لەناوچوون. 3) لەدەست دانی دەسەڵات یان پۆست. 4) بەزەوی دادران. "**سرنگون کردن**": 1) سەرنخون کردن، ژێر و ڕوو کردن، سەرەوژێر کردن، بەراوەژوو کردن، وەرگەڕاندن، نوخاندن، نوخاننەوە، وەرگەڕاندن. 2) لەناوبردن. 3) لەدەسەڵات خستن، ڕووخاندن.

**سرنگونسار:** بڕوانە: "سرنگون".

**سر نگهدار:** نهێنی پارێز، ڕازدار.

**سرنوشت:** 1) چارەنووس، سەرنڤویس، سەرنڤیشت، خوانووس. 2) سەرەنجامی کەسێك یان شتێك. 3) بەسەرهات، ڕووداو.

**سرنوشت ساز:** چارەنووس ساز.

**سرنوشتە:** سەردێڕ، تیتر.

**سرنهادن:** 1) سەر نانە سەر شتێ یان جێگایەك. 2) ڕاکشان و خەوتن. ملکەچ و بەرفەرمان بوون. 3) ڕەوان بوون، بزووتن.

**سروا:** حەدیس، ئاخاوتە، ڕازە، چیرۆك.

**سرواد:** سروود، هەڵبەستە، شێعر.

**سروادگونە:** شێعرئاسا.

**سروادە:** شێعر، پاشڵی شێعر.

**سروازدن:** سەرپێچی کردن، نەکردن، مل نەدان، نەچوونە ژێربار.

**سروبند:** چاخ، دەم، تاف، سەروبەند.

**سروتراپی:** چارەسەرکردن بە سرۆم، لێدانی سرۆم.

**سروتە:** سەروژێر، سەروبن، هەوەڵ و ئاخری شتێ یان جێیەك.

**سروچمان:** بریتی لە گراوی جوان و بەژن و باڵا ڕێکوپێك.

**سرود:** سروود، گۆرانی نیشتمانی.

**سرودسرا:** سروودخوێن.

**سرودن:** 1) هۆندنەوە، هۆنینەوە، هۆنین، شێعروتن.2) ئاوازوخوێندن. 3) وتن.

**سرودە:** هەڵبەست، شێعر.

**سرور:** (سُ.رُ) خۆشی، شادی، شادمانی.

**سرور:** (سَ.وَ) سەروەر، سەردار، سالار، پێشەوا، گەورە، مەزن، سەرۆك. "**سرورکائنات**": پێغەمبەری ئیسلام.

**سروری:** (سَ.وَ) مەزنایەتی، گەورەیی، سەروەری، سەرۆکایەتی، فەرماندەیی.

**سروسامان:** 1) کەلوپەلی ناومال، پێداویستی ژیان، سەروبەر، سەروسامان. 2) ڕێکوپێکی و سازی و ئاسوودەیی لە ژیاندا. 3) مانا، هەقیقەت. 4) چارە، دەوا. "**سروسامان دادن**": سەروبەرکردن، ڕێکوپێك کردن، سەروسامان دان.

**سروسرّ:** سڕوتڕ، کەین و بەین، ڕاز و پێوەندی نهێنی.

**سروسودا:** 1) ئارەزوو، خواست و مەیل. 2) پێوەندی ئاشقانە.

**سروسیما:** سەر و گوێلاك، سەروسەکوت، سەروپۆتراك، سەروپۆترك، سەروقڵخ، بیچم، پۆتلاك، پۆتراك، دیمەنی سەر و سەرپۆش.

**سروش:** پەیامهێن. جوبرەئیل.

**سروصدا:** هات و هاوار، هەراوهوریا، هەرا و زەنا، هەراهەرا، قوولەقوول، گازەگاز، گاڵەگاڵ، دەنگەدەنگ، گرمەگرم، هورپەهورپ، هۆگاڵە.

**سروصورت:** بڕوانە: "سروسیما". "**سروصورت دادن**": ڕێکخستن و جێبەجێکردن، ڕێکوپێك کردن. "**سروصورت گرفتن**": 1) تەکووز و ڕێکخران. 2) ئەنجام بوون و بەکۆتاییگەیشتن.





**سروقت:** لەکاتی خۆیدا، لە کاتی دیاریکراودا. "**سروقت کسی رفتن**": چوونەسەردانی.

**سروقد:** کەڵەگەت، باڵابەرز، بەژن بەرز.

**سروکار:** پێوەندی، ئاشنایەتی، مامڵە، ئاڵوویر، دان و ستان، سەروکار.

**سروکلّەزدن:** باس کردن دەگەڵ کەسێکدا، باس و گفتوگۆکردن بۆ فێرکردنی کارێك یان سەلماندنی بابەتێ، سەرنانەسەر، سەرخستنەسەر، سەروکەللەلێدان.

**سروکیسەکردن:** 1) بریتی لە بەزۆر وەرگرتن. 2) بە فریودان و زمان لووسی پارە وەرگرتن لە کەسێك.

**سرویراستار:** سەرهەڵەچن، چاوەدێری هەڵەبڕەکان.

**سرە:** هەڵبژێراو، بژاردە، پەسندکراو. پوخت، ناب. باش، چاك. بەباشی. بێکەمایەسی، بێکەموکورتی. بێخەوش، عەیارتەواو. گەرموگوڕ، بێڕیا. گرانبایی، بەنرخ. "**سرەمرد**": پیاوی هەڵبژاردە، سەرچڵ، جوامێر، مێرخاس، بێ ڕووبینی.

**سرهال:** سەرلێشێواو، سەرگەردان، پەرێشان.

**سرهم:** لەسەریەك، بەگشتی. پێکەوە لکاو.

**سرهم بندی کردن:** سەر یەك نان، ئەنجامدانی کارێك بەکەمتەرخەمی و بێبیرلێکردنەوە، سازکردنی شتی ناپتەو و لەق.

**سرهم رفتە:** لەسەریەك، بەشێوەی گشتی.

**سرّی:** نهێنی، سەنتە، شاراوە.

**سری:** زنجیرە، ڕشتە، ڕیز، شەمەندەفەر، دەستە، گروپ، نهۆم، کۆ، کۆمەڵ.

**سریال:** لێکدالێکدا، پەیتاپەیتا، پاژبەپاژ، سڕیاڵ.

**سریان:** 1) شەوڕەوی، شەوڕۆیی، شەوگەڕی. 2) ڕۆچوونەناوشتێ، تەشەنەکردن و ڕەوان بوونی شتێ لە ناو پاژەکانی شتێکی دی.

**سریدن:** (سُ) خلیسکان، شەمتین، ڕەت بردن لە سەر سەهۆڵ.

**سریش کردن:** بەیەکەوە چەسپاندن، پێکەوەلکاندن.

**سریع:** خێرا، کرژ، گورج، چالاك، زوو، تیژ، توند، بەگوژم، بەگوڕ، بەهەڵمەت.

**سریع الانتقال:** بەبیر، بیرتیژ، بەهۆش، ئەوەی بە خێرایی لە بابەتێك بگا. خاوەنی جووڵەی خێرا.

**سریع الجریان:** خوڕ، بێگیر، خێراڕەو.

**سریع الحرکە:** خۆشبەز، چالاك، گورج، کرژ، فرز.

**سریع الزوال:** گڕوفڕ، شتێ کە زوو بفەوتێ.

**سریع السیر:** زەرۆپ، خۆشڕەو، شاتر، تەتەر، بەپا، بەپێ.

**سریع العمل:** بەکار، ئازا، چالاك، لەش سووك.

**سریع الهضم:** زووگوێر، زووهەرس، زووحەل.

**سزا:** تۆڵە، پاداش، پاداشت، سزا، قەرەبوو. شایستە، شیاو، لایق. "**بەسزا**": شیاو، شایستە. تەواو، بەس، زۆرباش. بەشیاوی. "**بە سزای خود رسیدن**": بە سزای خۆ گەیشتن، سزادران.

**سزاوار:** شیاو، شایان، لێوەشاوە، لێهاتوو، هێژا، پێکەوتوو، شرژاو، شایستە، وەرای.

**سزاواری:** شیان، وەشیانەوە، لێوەشانەوە، لێهاتن، پێڕەوابوون.

**سزندگی:** بڕوانە: "سزاواری".

**سزیدگی:** بڕوانە: "اولویّت".

**سزیدن:** شیاوبوون، شایان بوون، شایستەبوون، پێ ڕەوابوون.

**سست:** خۆنەگیر، خۆنەگر، لەق، ناقایم، ناپتەو، ناجێگیر، نەبەگە، شل، شلك، شل و ول، شل و شۆل، شلووق، شل و شەوێق. خاو، بێ هێز، بێ تاقەت، لاواز، بێحاڵ، گژ، تەپ، تەوەزەل، لەشگران، دێرخێز، دێراخیز، سس، سست. بێ بناغە. بێ ئیرادە، لێنەبڕاوی، لەرزۆك. بێ نرخ، بێ قیمەت. "**سست شدن**": خاوبوونەوە، خەوخان، شل بوون/ بوونەوە، لەقبوون، ناجێگیری، فشەو بوون، وەڕەز و سست بوون، سست بوونەوە، پلەتسیان.

**سست اندام:** بێهێز، کز، لاواز، کەنەفت.

**سست بنیان:** بنیات لەق، بینایەك کە بناغەکەی لەق و خۆڕانەگر بێ.

**سست پیمان:** کەسێك کە پەیمان و بەڵێنەکەی جێبەجێ نەکا، پەیمان شکێن.

**سست رأی:** کەم ئەقڵ و بێتەگبیروڕا، کەسێك کە ڕا و ئاوەزی لاواز بێ.

**سست رگ:** تەوەزەل، تەمەڵ. بێغیرەت. بێئیرادە.

**سست ریش:** پیاوی ڕیش درێژ. بریتی لە گەمژە، گەوج، ساویلکە.

**سست عنصر:** بێئیرادە، بێغیرەت.

**سست کار:** شلوشەوێق، شل و شێواو، شلەپەتە.

**سست نهاد:** خۆبەکەمگر.

**سستی:** شلی، شولی، شلوشەوێقی، خاویلکەیی، مرتین، نەبەگەیی، خۆنەگرتوویی، بێهێزی، داهێزان، خاوخاو، ساوەساو، تەمەڵی، لەش گرانی، کەتوەری، سستی. "**سستی کردن**": تەوەزەلی و خاوەخاوکردن. "**سستی گرفتن**": لاواز بوونەوە، کەم بوونەوە. لەبرەوکەوتن، کەساس بوون. "**احساس سستی**": داهێزان، لەش گران بوون، هەجنین، هەجناندن.

**سطح:** 1) بان، ڕوو، ڕووکار، سەر هەر شتێ کە پان و تەخت بێ. 2) ئاست. 3) ڕووبەر (سطح اتاق پنج متر مربع است). 4) توێژ، گروپی کۆمەڵایەتی. 5) ڕێژە، ڕادە. 6) سەرانسەر (برنامەهای فردا در سطح کشور پخش می شود). 7) لا، لایەن. 8) پانایی، پانتا.





9) هەرێم، چوارچێوە. "**سطح توقع**": ئاستی چاوەڕوانی. "**سطح درآمد**": ڕێژەی داهات. "**سطح زندگی**": ڕێژەی داهاتی ڕاستەقینەی خەڵکی لە ناوچەیەك یان وڵاتێك و ئیمکانی دەست پێڕاگەیشتنی ئەوان بە پێداویستی خۆشگوزەرانی. "**سطح عالی**": ئاستێکی بەرز. "**سطح کلامی**": ئاستی ئاخاوتەیی. "**سطح مایل**": لارەڕوو، ڕووی لار. "**سطح مربع**": ڕووی چوارگۆشە. "**سطح مستوی**": ڕووی تەخت. "**سطح منحنی**": ڕووی چەماوە. "**سطح هموار**": ڕووی تەخت.

**سطحی:** جێگرتوو لە سەرووترین بەشی جێیەك. ڕووکەشی، ڕووکاری، ڕۆخی، ڕواڵەتی، سەرپۆت، سەرسەری، سەرچڵ، بێ بیرکردنەوە، نەهزراو، کەسێ کە بەلەز و بێ لێکدانەوە کار دەکا.

**سطحی‌نگری:** ڕووکەشی ڕوانی، نەبوونی ڕوانگە یان تێفکرینی قووڵ.

**سطر:** هێڵ، دێڕ. ڕیز. "**سطر ریز**": ڕێزك، دێڕەخەتی ورد.

**سطرآرا:** ڕاستە، مەستەڕە.

**سطوت:** هێرش بردن و زاڵبوون بە سەر کەسێك دا. حوزم، قورسوقۆڵی، شکۆ، مەزناهی. دەست بەسەردا ڕۆیشتوویی.

**سطوح:** کۆی "سطح". "**سطوح متلاقی**": ڕووە بەیەك گەیشتوەکان. "**سطوح متناظر**": ڕووە هاوتاکان، ڕووە هاوجێکان. "**سطوح متوازی**": ڕووە تەریبەکان.

**سطور:** کۆی "سطر".

**سطور مقفا:** دێڕگەلی هاوسەروا.

**سطیح:** لێك کشاو، پانەوەکراو. کەسێ کە بە هۆی بێهێزی یان نەخۆشی بەحاڵەحاڵ لە جێ هەستێ.

**سعادت:** بەختەوەری، خۆشبەختی، بەختیاری، کامەرانی.

**سعادتمند:** بەختەوەر، خۆشبەخت، بەختیار.

**سعار:** گەرما، تینی ئاگر. توونیەتی زۆر. برسێتی زۆر.

**سعایت:** 1) دووزمانی، قسەهەڵچنین، بەدگۆیی. 2) هەوڵ، تەقالا.

**سعت:** هەراوبوون، بەرفرەه بوون، بەرفراوان بوون، ئاوەڵەبوون. تێداجێبوونەوە.

**سعتری:** پیاوی بەخشندە، بوێر، شۆخ و نەترس. سیت بلۆق، ژنی ئیشتیا لە گان.

**سعد:** پیرۆز، موارەك. بەختەوەری.

**سعر:** (سِ) نرخ، قیمەت.

**سعر:** (سً) تین. شێتی، دێوانەیی.

**سعود:** پیرۆزبوون، موارەك بوون.

**سعه:** بەربڵاوی، بەرفرەهی، فراوانی، دەوڵەمەندی. "**سعه صدر**": هەبوونی تەحەمولی بیستنی قسەگەلی دژ بە دیتران، سنگ فراوانی.

**سعی:** 1) هەوڵ، تەقەللا، تەقەلا، ئەخت،

کۆشش، تێکۆشان، کارکردن. 2) ڕێگەڕۆیشتن، ڕاکردن. 3) بڕوانە: "سخن چینی". **"سعی بلیغ"**: هەوڵی زۆر و هەمەلایەنە. **"سعی داشتن"**: هەوڵدان، تێکۆشان. **"سعی کردن"**: هەوڵدان، تێکۆشین. دووزمانیکردن، قسەهەڵچنین. **"سعی وخطا"**: ئەزموون و خەتا.

**سعید:** بەختەوەر، بەختیار، کامەران. پیرۆز، موارەك.

**سعیر:** کڵپە/بڵێسەی ئاگر. دۆزەخ.

**سغب:** برسێتی، داماوی. **"سغب داشتن"**: 1) برسیبوون. 2) ڕژدبوون، چاوچنۆکبوون.

**سغبه:** 1) فریوخواردو. 2) شەیدا. 3) ملکەچ، فەرمانبەر.

**سفاح:** (سِ) 1) زیناکردن، گانی نارەواکردن. 2) خوێن ڕێژی.

**سفّاح:** (سَ) 1) خوێن ڕێژ. 2) زۆر بەخشندە. 3) وتەپاراو و بوێژ.

**سفار:** سەفەرکردن.

**سفارت:** 1) نێوبژیوانی کردن. 2) کار و ئەرکی باڵوێز کە لە لایەن دەوڵەتێکەوە دەنێردرێتە پێتەختی وڵاتێکی تر. 3) باڵوێزخانە.

**سفارتخانه:** باڵوێزخانە، شوێنی باڵوێز، ماڵێك کە لەودا باڵوێز و کارمەندەکانی خەریکی کاروباری سیاسین.

**سفارش:** قەوینتی، سەختی، پێسپێری، ڕاسپێری، سپاردەیی، ئەسپارەیی، ئەسپاردەیی، دەستوور. **"سفارش دادن"**: ڕاسپێران، ڕاسپاردن، سپاردن، ئەسپارتن، قەوینتی کردن، ڕاگەیاندن.

**سفارشی:** ڕاسپێراو، ڕاسپاردە، ئەسپاردە، سپاردە، سپارتی، سپێریاگ. تایبەتی، باش لەباری چلۆنایەتییەوە.

**سفاك:** خوێنڕێژ، مرۆڤ کوژ، بێ بەزەیی.

**سفال:** هەڕگینە، سواڵەت، کرێچ. **"سفالی"**: گڵێن، گڵێنە، لە گڵ چێکری.

**سفالت:** پەستی، ناکەسی، نزمی.

**سفالگر:** گۆزەکەر، گۆزەگەر، گۆسکەر، هەوڕگەر، ئێربارگەر، کاسەکەر، پیرۆت، قەواق، کەسێ کە دەفری سواڵەت چێ دەکا.

**سفاهت:** گێلی، گەوجی، حۆلی، دەبەنگی، نەزانی، کەم ئاوەزی، بێئەقڵی. بەدزوانی، زمان پیسی.

**سفت:** (سً) کون، سیلاخ.

**سفت:** (سِ) ڕەق، توند، زوا، پتەو، خەست، سخ، پڕپۆ، قایم، تەنراوی قایم، سەخت، سفت، کەم ئاو، وشك، هیشك. **"سفت و سخت"**: 1) سفت و ڕەق، بەشێوەی پتەو و خۆڕاگر. 2) بەلێبڕاوی و پێداگری. **"سفت و صاف"**: سفت و سۆڵ، سخی سافولووس.

**سفت شدن:** (سِ) چیڕبوونەوە، توندبوونەوە، ڕەق هەڵاتن، بوونە بەرد، وشك بوون، سخ بوون، لەنەرمییەوە سەخت بوون، سفت بوون(ەوە)، پتەوبوون(ەوە).

**سفتن:** (سُ.تَ) 1) کون کردن، سمین،





سماندن، ساوین، سوین، سواندن. 2) تێپەڕین، دەرچوون. **"سفته"**: کون کراو، سواو، ساویاو.

**سفته:** (سَ.تِ) بەڵگە، قەباڵە، قەبز. دیاری، پێشکەشی.

**سفتی:** (سِ) پتەوی، قایمی، توندی، سفتی، سفت و سۆڵی، توندی تەنراو.

**سفر:** سەفەر، لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی تر ڕۆیشتن. مردن. **"سفر قندهار"**: بۆ سەفەرچوونی دوور.

**سفرنگ:** بڕوانە: "تفسیر".

**سفرنگ گر:** بڕوانە: "مفسر".

**سفرنگی:** لێکدانەوەیی.

**سفساف:** پەست و نزم لە هەر شتێ، قسەی خۆڕایی و بێ مانا، کاری نزم.

**سفسطه:** سەفسەتە، هەڵپەتەکاری، هەڵەپەتێ، پەرت گۆیی، ئادی و بۆدیکردن، ئاوبۆکردن بۆ گێژکردن و تووشی هەڵەکردنی لایەنی بەرپرسیار و خۆپەڕاندنەوە، هەڵەیەك کە بە مەبەستەوە دەکرێت بۆ سەرلێشێواندنی رکابەرەکەی، ئەمەیش جۆرێکە لە بە بەڵگەهێنانەوە کە لە سەر فێڵ و هەڵخەڵەتاندن دەوەستێت، حاشالێکردنی شتە هەست پێکراو و بەڵگەنەویستەکان، شێر و ڕێوی هێنانەوە.

**سفك:** (سَ) ڕشتن، خوێن ڕژتن. کوشتار و خوێن ڕێژی.

**سفله:** (سِ.لَ) پەست، نزم، ناکەس، گناس، سپڵە.

**سفله:** (سَ.فَ.لَ) کۆی "سافل".

**سفلی:** خواروو، ژێروو، نزمتر.

**سفول:** نزم بوون، بێڕێزبوون، پەست بوون.

**سفید:** 1) سپی، سفی، چەرمگ، چەرموو. 2) ڕوون، ڕۆشن.

**سفیدآب:** سپیاو، سپیاڤ.

**سفیدامضا:** چەکی سپی.

**سفید بخت:** خۆشبەخت، بەختەوەر.

**سفید پوست:** سپیپێست، بەرانبەر بە ڕەش پێست.

**سفیددستی:** ڕیاکاری، خیانەت پیشەیی.

**سفیدرو:** بڕوانە: "سپیدرو".

**سفیدشدن:** بە ڕەنگی سپی دەرهاتن، سپیبوونەوە. دەرکەوتن.

**سفیدفام:** سپیکەلە، سپیلکە، سپیلە، سپیواش، ئاماڵ سپی.

**سفیدکار:** سپیکار، مزگەر. بریتی لە کەسی چاکەکار و ڕاست کردار.

**سفیدکاری:** سپی کردنەوە، گەوراندن.

**سفیدکاسه:** بریتی لە جوامێر، میوان دۆست.

**سفیدگر:** مزگەر، مسگەر، وەستای قاپ و قاچاغ سپیکردنەوە.

**سفیدنامه:** بڕوانە: "سپیدنامە".

**سفیدەدم:** بڕوانە: "سپیدەدم".

**سفیدی:** سپیاتی، سپیاهی، سپیایی، سپێتی، چەرمگی. **"از سفیدی نمك تا سیاهی زغال"**: بریتی لە هەموو شتێ.

**سفیر:** 1) بەرەڤان، ناوبژیکەر. 2) بالوێز، کەسێك کە بە نوێنەرایەتی لە لایەن دەوڵەتێکەوە بچێتە پێتەختی دەوڵەتێکی تر.

**سفیل:** پەست، زەبوون، بەدبەخت.

**سفیه:** حۆل، گێل، گەوج، خول، نەفام، لاژگ، نەزان، کەم ئاوەز، تێنەگەیشتوو.

**سقام:** (سِ) کۆی"سقیم".

**سقام:** (سَ) نەخۆش کەوتن. نەخۆشی، دەردەداری، لەش بەباری.

**سقامت:** نەخۆش کەوتن. نەخۆشی، ناخۆشین، ناسازی، ناساخی.

**سقایت:** ئاوپێدان و تێراوکردن.

**سق زدن:** خواردن بەتایبەتی خواردنی خۆراکی کەم.

**سقر:** جەحەندم، دۆژە.

**سقط:** (سَ.قَ) 1) هەر شتێکی بێ فایدە و هیچ و پووچ، کەلوپەلی بێ نرخ. 2) خەنزاری، ڕیسوایی، ناوزڕان. 3) هەڵەکردن لە نووسین یان وتن دا.

**سقط جنین:** بەراویتن، بەرخستن، بارخستن، بەرفڕێدان، لەباربردن، لەبەرچوون، لەبارچوون، ژبارچوون، ژبەربرن، زیان کردن(پوورە حەلاو منالەکەی زیان کرد).

**سقط شدن:** (سَ.قَ) سەقەت بوون، سەکەت/سەکت بوون، سەکتین، تۆپین، کەوتین، هەڵ تلۆپان، هەڵ تلۆپین، مردارەوە بوون، شیاین، زنگرین.

**سقط فروش:** فرۆشیاری کەلوپەلە وردەوپردەکان، کەسێ کاسپیەکەی ئاسنجاو فرۆشتنە، ئاسنەواڵەفرۆش، سەقەت فرۆش.

**سقط کاری:** 1) بەکارهێنانی بەرد و خشت لە بینا دا. 2) ئەنجام بوونی کارە گچکەکان.

**سقط کردن:** بڕوانە:"سقط جنین".

**سقط گفتن:** جوێن دان، جنێودان.

**سقطه:** 1) خەتا، هەڵە. 2) کەوتن.

**سقطی:** بڕوانە:"سقط فروش".

**سقلمبه:** 1) سیخورمە، مستەکۆڵە، مشتەکۆڵە، کێلنجی، ناقورچ. 2) ڕەق، سەخت.

**سقم:** 1) نەخۆشی، ناساغی. 2) نادروستی، چەوتی.

**سقوط:** هەڵدێران، پەرت بوون لە ژووروورا، ڕسیان، داکەوتن، کەوتنە خوارەوە، وەرین. "**سقوط کابینە**(**دولت**)": وەلانران و لەکارکەوتنی کابینەی وەزیران. "**سقوط کردن**": داکەوتن، لە بەرزاییەکی زۆرەوە بە زەوی دادران. لەسەرکارلابران. "**سقوط کردن شهر**": داگیرکرانی شار.

**سقی:** ئاودان.

**سقیط:** 1) بەفر یان تەرزە کە بێتە سەر عەرز. 2) پیاوی گەوج، کەم ئاوەز.

**سقیم:** نەخۆش، ناساز، ناساغ.

**سکاچه:** بڕوانە:"بختك".





**سکّار:** شەڕاب ساز، شەڕاب فرۆش.

**سکّاك:** 1) سککەلێدەر، قەرەپووڵ چێکەر. 2) ئاسنگەر.

**سکانت:** بڕا، ببڕ، بەبڕشت.

**سکانس:** بەرودوایی، سێکانس.

**سکته:** 1) دڵەکپێ، دڵ وەستان، دڵەوەستێ، جەڵتە، قۆتك، سەکتە، مەرگی لە پڕ و ناکاو. 2) بڕوانە: "صدمه". "**سکته از شادی**": شادەمەرگ، سەکتە لە خۆشیان.

**سکر:** (سُ) مەستی، سەرخۆشی. "**سکرآور**": سەرخۆشکەر، مەستیهێن.

**سکر:** (سِ) 1) سازکردنی بەنداو. 2) پێوەدانی درگا.

**سکران:** (سَ) مەست، سەرخۆش.

**سکران:** (سَ.کَ) سەرخۆش بوون بە هۆی خواردنەوەی شەڕاب.

**سکرت:** سەنتە، شاراوە، نهێنی، بەنهێنی، ژێرجلەکی.

**سك زدن:** (سُ) چاوتێبڕین، تواشاکردن. دنەدان، هاندان.

**سکستن:** پسان، پچڕان، لەبەریەك چوون. هەڵکەندن. هەڵکەنران، لێبوونەوە، جیابوونەوە.

**سکسکه:** وەگرگریایەنە، نزگەرە، نزگرە، نزرگ، نسگەرە، بەرچیچکە، شهی، هەسر، عیسك. "**سکسکه خفیف**": بەرسنجك، سووکەنزگەرە.

**سکسیون:** بڕ، برشش، بڕان، بڕگە، پار، بەش، پاژ. فۆڕمی نیوەڕوو لە پانایی یان درێژایی بۆ نیشاندانی بۆ درێژی و قووڵایی نەۆمە جۆراوجۆرەکانی بینا.

**سکن:** (سَ.کَ) 1) مدران، پشوودان، نیشتەجێبوون. 2) ئەوەی خووی پێبگرن و پێی هێور ببنەوە. 3) ئاسوودەیی، هێمنی، ئۆخژن. ئاور.

**سکنات:** کۆی"سکنه".

**سکنجیدن:** تراشین، ڕووشاندن، گەستن. کۆخین، قفین.

**سکندری:** تەپوخ، تەڕپل، تەسە، ڕەت، شەلف، ساتمە، سەرسم. "**سکندری خوردن**": گلان، بەسەرڕووداکەوتن، هەڵەنگوتن، هەلنگفتن، هەلنگافتن، تێ هەڵەنگان، تێ هەڵەنگوتن، ڕەت بردن و کەوتن، پا هەڵکەفتن، هەڵ نووتن، ساتمەبردن، تل بردن، تەرپلین، نووچ بردن، هل کومین، لکومین، سەرەنگرێ بوون، هەڵ نوتن، شەلفین. "**سکندری خوردن چارپا**": سەرسم بردن، سەرسم دان.

**سکنه:** کۆی"ساکن"، دانیشتوان.

**سکنی:** 1)ماڵ، خانوو، شوێنی نیشتەجێبوون. 2) نیشتەجێ بوون، مەزران، دامەزران، لەجێگایەك مانەوە، وەستانەوە. "**سکنی دادن**": نیشتەجێکردن.

**سکوت**(**کردن**): بڕوانە:"ساکت شدن". "**سکوت را شکستن**": بێدەنگی شکاندن، قسەکردن.

**سکولاریسم:** سێکۆلاریزم، تیۆرییەك لە سەر بنەمای جیایی دەوڵەت و حکوومەت و بنیاتەکانی دەوڵەت یان حکوومەت لە دین.

**سکولاستیسیسم:** سکۆلاستیسیزم، فەلسەفەی قوتابخانەیی.

**سکون:** 1) مەدران، ئۆقرەگرتن، هێوربوونەوە، سوکنایی‌داهاتن، سرەوتن، جێگرتن و نەبزووتن، نەجوولان.

**سکونت:** 1) هەژاربوون، نەداربوون. 2) نیشتەجێبوون، دامەزران، جێگرتن.

**سکەافتادن ـ از:** لە برەو کەوتن، لە دەست دانی بەها و گرینگی خۆ.

**سکەدادن:** بریتی لە برەوپێدان.

**سکەداشتن:** بەدیمەن بوون، هەبوونی جوانی.

**سکەکاری را خوردن:** بەو کارەوە ناوبانگ دەرکردن.

**سکە کردن:** 1) برەو پێدان بە شتێ. 2) برەوسەندن. 3) نەخشی سککەلێدان.

**سکّیر:** فرە مەست، هەمیشە سەرخۆش.

**سکیز:** بروانە:"آلیز".

**سکیزیدن:** هەڵبەزدابەزین، هەڵخستنەوە، لووشکەخستن، جووتەوەشاندن، لەقەخستن.

**سگار:** زەوت کردن، بەزۆرستاندن.

**سگال:** بیر، بیرۆکە.

**سگالش:** 1) هزر، بیر، فکر، وێنا. 2) تەگبیر، راوێژ. 2) نیازخراپی، پیلان، دوژمنایەتی. 4) تاوتوێی ورد. 5) رامان، تێرامان. 6) قوولبوونەوە، رۆچوون.

**سگالشگر:** راوێژکار، تەگبیرکەر. نیازخراپ، بیرخراپ، پیلانگێڕ.

**سگالشگری:** راوێژ، تەگبیر، تەگبیرورا، شێور. نیازخراپی، پیلانگێڕی.

**سگالیدن:** 1) بیرکردنەوە، راوێچەکردن. 2) تەگبیروراکردن، راوێژکردن. 3) دوژمنایەتیکردن، بیرکردنەوە بە نیازخراپی، پیلان گێڕان. **"سگالیده":** بیرلێکراوە، چارەدۆزیکراو، تەگبیروراڵێکراو.

**سگ پا سوخته:** سەگی پێ سووتاو، بریتی لە بێ ئۆقرەو هەدانەدەر.

**سگ جان:** بروانە:"جان سخت".

**سگ جگر:** بریتی لە دڵ ڕەق، بێبەزەیی، قاپگر.

**سگ دل:** بریتی لە دڵڕەق، بەددڵ، درندە، ئازاردەر.

**سگ دو:** بریتی لە کەسێك کە بێهوودە بۆ هەر لایەك دەچێ. لە کوردی دا بەهێنان و بردنی بێ فایدە دەڵێن: سەگ بە حەسار، سەگ بە حەوشە.

**سگرو:** 1) سەگرەو، حەپەی سەگ. 2) بریتی لە خەڵك ئازار.

**سگسار:** وەك سەگ. بریتی لە بەتەماح، تەماحکار، چاوچنۆك.





**سگ شدن:** تووڕەبوون، بەدخولق بوون.

**سگ مسب:** نەحلەتی، بەنەحلەت کراو.

**سگ منش:** بەدخوو، بێئەدەب، بێشەرم.

**سگی:** 1) خوو و خەسڵەتی سەگ هەبوون. 2) دڕی، درندەیی. 3) شیاوی سەگ. 4) بێ ڕمێن، نائەسڵ (عرق سگی). 5) زۆر خراو، کارەساتبار. 6) هەبوونی حاڵەتی تووڕەتۆسنی و شەڕەنگێزانە.

**سلّ:** (سِ) سیل، نەخۆشی دیق، دەردەباریکە، ژانەزراڤ. **"سل علاج ناپذیر"**: ڕەشەسیل.

**سلّ:** (سَ) دەرهێنان، دەرهاوردن، دەرکێشان، هەڵکێشان.

**سلاّب:** زۆر ڕفێنەر و رووتکەرەوە.

**سلاح انداختن:** بریتی لە خۆ بەدەستەوەدان. چەك دانان/ فرێدان.

**سلاحدار:** بروانە:"مسلّح".

**سلاحشور:** بروانە:"سلحشور". **"سلاح شوریدن"**: بەکارهێنانی چەکوچۆڵ و ئازایەتی نواندن.

**سلاخ:** گورێن، سەربڕی ئاژەڵ.

**سلاخی کردن:** کوشتنەوە و کەوڵ کردن، سەربڕین و پێست لێکردنەوەی ئاژەڵگەلێکی وەك مەڕ و گا. کوشتنی کەسێك بەشێوەیەکی بێ بەزەییانە.

**سلاست:** نەرمبوون، ڕام بوون، دەستەمۆبوون. نەرمی، ئاسانی، ڕەوانی.

**سلاسل:** کۆی"سلسله".

**سلاك:** بروانە:"اجاره".

**سلال:** (سً) کزی، لاوازی، نەخۆشی دەردەباریکە.

**سلاله:** ئەوەی کە لە شتێکی دی هەڵبهێنجرێ، پوختە، هەڵبژاردە. نەسڵ، رۆڵە، تۆو.

**سلام:** سڵاو، سلاڤ. لە عەیب یان پەتا رزگاربوون. ملکەچ کردن، چوونە بەر فەرمان. **"سلام رساندن"**: سڵاو پێگەیاندن. هەواڵ پرسین. **"سلام سردستی"**: سووکەسڵاو. **"سلام علیکم"**: سڵامالێ، سڵامەلێ، سڵامەلێك، سلاڤ. **"سلام علیك پیدا کردن"**: ئاشنابوون. **"سلام کسی را گرفتن"**: وڵامی سڵاوی وی دانەوە.

**سلامت:** لەش ساغی، لەش ساقی، سەرساغی، سەرساخی، سەرمایی، سلامەتی، وەسەتی، وەشەنی. **"سلامت نفس"**: خێرخوازی، چاکەخوازی. **"سلامت یافتن"**: چابوونەوە، خۆشەوبوون.

**سلانه سلانه:** لۆژە لۆژ، سەبرەسەبرە رۆیشتن، هەڵتەك هەڵتەك، شلەشل، پاشەلەقە، ئارام ئارام، هێدی‌هێدی.

**سلب:** داماڵین، دارنین، تێکول لێکردنەوە، کەوڵ کردن، رووت کردنەوە. لێ سەندن، زەوت کردن، ستاندنەوە. بێبەش کردنی کەسێ لە شتێك. **"سلب مسئولیّت"**: لێ سەندنەوەی بەرپرسایەتی.

**سلبی:** نیگەتیف، نەرێنی.

**سلحشور:** چەك هەڵگر، ئاشتی پارێز، پڕچەك، چەكداری ساز و تەیار، چارچەك.

**سلخ:** كەوڵ كردن، پێست لێكردنەوە، داماڵین.

**سلس:** (سَ.لَ) نەرم بوون، دەستەمۆبوون، ملدان. میزەچركە.

**سلس:** (سَ.لِ) نەرم و ئاسان. ڕەوان، بێ گیر، بێگرێ. ڕام، دەستەمۆ. قسەی نەرم و شیرین.

**سلسله:** 1) زنجیر، زنجیرە، ڕیز. 2) چین، گروپ. 3) بنەماڵە، خانەدان. "**سلسله چیزی را جنباندن**": سەرقاڵ بوون بەوەوە، خەریكی ئەو شتە بوون. پەنابردنە بەر ئەو.

**سلسه جبال:** ڕزد، زنجیرە كێو/چیا، سەفان، چەند چیایەك بە پاڵ یەكەوە.

**سلسله‌جنبان:** هاندەر، دنەدەر، ورووژێنەر.

**سلسله جنباندن:** وەجووڵەخستنی زنجیر. بریتی لە وەجووڵەخستن و ناچاركردنی گروپێك بۆ ئەنجامدانی كارێك.

**سلسله‌مراتب:** (زنجیرەی) پلەبەندی، پلەداری، هیراركییەتی.

**سلطان:** 1) پاشا. 2) شارەزایی بێوێنە لە تێكنیك یان هونەرێكدا(شكسپیر سلطان تراژدی است). 3) دەسەڵاتدار، حاكم. 4) گەورە، سەروەر، سەرۆك. 5) دەسەڵاتدارەتی، باڵادەستی.

**سلطنت:** پاشایەتی، شایەتی، دەسەڵاتدارەتی. هێز، توانایی، باڵادەستی. "**سلطنت طلب**": خوازیار یان لایەنگری سیستمی پاشایەتی.

**سلطه:** هێز، توانایی، دەسەڵات، دەسەڵاتدارەتی، زاڵێتی، باڵادەستی. كاریگەریی دیاریكەری شتێ بەسەر ژیانی تاكەكەسی یان كۆمەڵایەتی و هتد.

**سلطه‌جو:** ئەوەی ویست و دەسەڵاتی خۆی بەسەر دیتران دا دەسەپێنێ، ئیرادەسەپێن، دەسەڵات (سەپێن/خوان)، دیكتاتۆر، ملهوڕ.

**سلطه‌طلب:** بڕوانە: "سلطه جو".

**سلطه‌گر:** بڕوانە: "سلطه جو".

**سلف:** 1) ڕابردوو، پێشوو. پێشین، باوان. 2) قەرزێ كە بۆ قەرزدەر قازانجێكی نەبێ و هەر ئەوەی دەست كەوێتەوە كە بە قەرزی داوە. مامڵەیەك كە نرخی شتێ پێشەكی بدەن و دواتر وەریبگرن، سەوزخڕ، پێش فرۆش كڕ.

**سلفی:** سەلەفی، ڕابردووخواز، پێشینەخواز، كۆنخواز.

**سلفیّت:** پێشینەخوازی.

**سلفیدن:** 1) دانی پارەیەك بەناچاری یان وەك بەرتیل. 2) كۆخین، كۆكین.

**سلم:** (سِ) كەسێك كە لە ئاشتی و تەبایی‌دابێ، ئاشتی.

**سلم:** 1) پێش خڕ، پێشكڕ، پووڵ بە سەلەم دەر، پێش فرۆش، كڕین و فرۆشتنی دانەوێڵە یان شتی دیكە كە هێشتا نەگەیبێ و ئامادە نەبووبێ، سات و سەلەم. 2) ملكەچی و گوێڕایەڵی. 3) دیل، یەخسیر، گیراو. "**سلم فروش**": سەوزفرۆش.





**سلندر:** مات و سەرگەردان و ئاوارە.

**سلو:** تاكبێژ، تاك خوێن.

**سلوان:** لەبیرچوونەوە، لەبیربردنەوەی بابەتێ یان كەسێك و خەریك بوون و شاد و بێخەم بوون.

**سلوت:** لەناوچوونی خەم و ناڕەحەتی و سوكنایی‌داهاتن. "**سلوت كردن**": دڵدانەوە، دڵخۆشی‌دانەوە. "**سلوت یافتن**": لە خەم و خەفەت ڕەخسان، سوكنایی داهتن.

**سلوك:** 1) هەڵسوكەوت، ڕەفتار، ڕەوشت، ئاكار، كردار. 2) گرتنە پێشی ڕێگەیەك و پێداچوونی، ڕێگەپێوان.

**سلول:** ژوور. خانە، زیندوولەیەكی هەستیار و بزۆك كە توخمی سەرەكی لەش و بوونەوەرە زیندوەكان پێك دێنێ.

**سله بستن:** وشك بوونەوەی زەوی دوای ئاوداشتن و قەڵش تێكەوتنی.

**سلیس:** بڕوانە: "سلس".

**سلیطه:** كەڵتە، بێ شەرم و زمان درێژ، دەراشۆ، بێ حەیا.

**سلیقه:** سرشت، سروشت. سەلیقە، زەوق.

**سلیم:** 1) ساغ، ساق، سالم. 2) بێگەرد، بێخەوش. 3) ساویلكە و خۆش باوەڕ. "**سلیم القلب**": بڕوانە: "پاك دل". "**سلیم النفس**": چاكەخواز و ڕاست كردار، دەروون پاك.

**سمّ:** ژەهر، ژار، ژاڵ، ژاعر.

**سماجت:** پێداگری، قیرسیچمەیی، وڕك گرتن، بەربین گرتن، شین. ناحەزی، بێ شەرمی.

**سماحت:** جوامێری، مێرخاسی، بەخشندەیی، سنگ فراوانی.

**سماع:** سەما، هەڵپەڕكێ. بیستن، گوێ گرتن، ژنەوتن. سترانی خۆش، ئاواز، سروود، چریكە.

**سماعی:** زارەكی، ژنەوتە، بەبیستن، بێ ڕێزمان. "**فعل سماعی**": (ڕێزمان) فرمانی بیستیاری.

**سماق مكیدن:** بریتی لە كاری بێ بەهرەكردن، كات بەخت كردنی بەخۆڕایی لە چاوەڕوانی كەسێك یان شتێكدا.

**سمانتیك:** (زماننناسی) ماناناسی.

**سمبل:** نیشان، نیشانە، هێما، ڕەمز، سەمبول، نموونە، نوێنەر، پیشاندەر، دروشم.

**سمبولیست:** هێماخواز، پێڕەوی ڕێبازی سەمبولیزم.

**سمبولیسم:** هێماخوازی، كردار یان هونەری بەكاربردنی هێماكان.

**سمبولیك:** هێمایی، هێمایین، ڕەمزی.

**سمپات:** لایەنگر، بەتایبەتی لایەنگری گروپێكی سیاسی.

**سمپاتی:** مەیلی سروشتی، بەستراوە/ ئیننتما بەسروشت، پێوەندی مەعنەوی، هاودەردی، خەمخۆری، دڵسۆزی، خۆبەشریك زانین لە خەمی كەسێكدا، بەشداری لە خەمی دیتران.

**سمپاتیک:** هۆگری و بەستراوەیی سروشتی، تێکەڵ بە خۆشەویستی، خاوەنی هەستی هاودەردی، هاودڵ، هاودەرد، هاوبیر، هاوڕا، کۆک، دڵسۆز. سەرنج ڕاکێش، خوێن شیرین، لەبەردڵان.

**سمپوزیوم:** کۆڕێك کە لەو دا کۆمەڵێك لە خەڵك لە مەڕ بابەتێکی زانستی تایبەتییەوە باس و ڕاوێژ دەکەن.

**سمت:** (سِ.مَ) 1) پیشە، کار. 2) پلەوپایە، پێگە. نیشانە، شەقڵ.

**سمت:** (سَ) لا، ئالی، ڕەخ. ڕێگە، نیوەی ڕێ. "**سمت گیری**": 1) جوولان بە ئاراستە یان ڕەوگەیەکی دیاریکراودا. 2) بڕیاردان یان دەربڕینی بڕوایەکی دیاریکراو سەبارەت بە بابەتێ یان هۆگری پەیاکردن بە ڕوانگەیەکی سیاسییەوە، هەڵوێستگرتن.

**سمج:** 1) قیرسیچمە، بەگیرەونیرە، سامنج، بەگیرەوسەرسەخت، ورکگر، پێداگر. 2) درێو، ناحەز، ناشیرین، بێشەرم.

**سم خورانیدن:** ژاردان، دەرمانداوکردن.

**سمدار:** ژاراوی، ژاردار.

**سمسول:** بێ شەرمی، ڕووهەڵماڵاوی.

**سمل:** (سَ) 1) چاودەرهێنان، کوێرکردن. 2) پاك کردنەوەی حەوز لە قوڕ و لیتە.

**سمن:** (سِ.مَ) قەڵەوبوون. قەڵەوی.

**سمنامبولیسم:** ڕێڕۆیشتن لە خەودا، خەوگەڕی، جووڵەی بێ ئیرادە یان هەستان و ڕێڕۆیشتن لە خەوی سروشتی یان مێغناتیسیدا.

**سمی:** ژەهردار، ژاردار، ژەهرین، شتێ کە ژەهری هەبێ.

**سمیع:** گوێگر، بیسەر، ژنەوا.

**سمین:** قەڵەو، چەوریدار.بەنرخ، باش. "**کلام سمین**": ئاخاوتەی بەنرخ و باش.

**سمینار:** 1) سمینار، کۆمەڵە ئاخێوەرییەك کە سەبارەت بە بابەت گەلێکی تایبەتی و لە ماوە و شوێنێکی دیاریکراودا پێشکەش دەکرێ. 2) فێرگە یان دامەزراوەیەك کە گروپیکی هاوپیشە لەوێدا کۆوەبن و فێری بابەتەکانی پێوەندیدار بە پیشەکەی خۆیان بن.

**سنّ:** ماوەی ژیان، تەمەن.

**سن:** شوێنی نواندن، سەکۆ.

**سناء:** بڵێندی، بەرزی. ڕۆشنی، ڕووناکی.

**سناتور:** ئەندامی سەنا، نوێنەر لە مەجلیسی سەنا.

**سناریست:** سیناریۆنووس، سیناریست، نووسەری شانۆنامە بۆ فیلمی سینەمایی، فیلم نامە نووس.

**سناریو:** سێناریۆ، فیلم نامە، شانۆنامە.

**سنباندن:** 1) کون کردن، سمین، کوڵین. 2) ناچار بە قبوولّ کردنی بابەتێ بە دیتران، قبووڵاندن.

**سنبل:** (سَ.بَ) کاری سەرچڵ و دەسبەجێ.





**سنبیدن:** کون کردن، سماندن، سمین.

**سنّت:** نەریت، دابونەریت، باو. شەریعەت. "**سنت بەجای آوردن**": بەجێهێنانی کاروباری دینی. "**سنت کردن**": خەتێنەکردن، سوننەت کردن. "**سنت گزاردن**": بەجێهێنانی ئەرکە دینییەکان بە تایبەتی نوێژ خوێندن.

**سنتروزوم:** (پزیشکی) ناوەندە تەنۆچکە.

**سنتز:** 1) سازکردنی مادەگەلی کیمیایی ناساکار و ئالۆز لە ڕێگەی تێکەڵکردنی ماددەگەلی سادەوە. 2) سەنتێز، ئەوەی لە ڕووبەڕووبوونەوەی کاریگەریی ئانتیتێز لەسەر تێز وەدیدێ.

**سنّت شکن:** نەریت شکێن، نەریت بەزێن.

**سنت کنان:** بڕوانە:"ختنەسوران".

**سنّت گرا:** نەریت خواز، هۆگر بە پاراستنی نەریتەکانی ڕابردوو.

**سنّت گرایی:** نەریتخوازی، "ترادیسیۆنالیزم".

**سنّتی:** نەریتخواز، پێڕەوی نەریت.

**سنجش:** پێوان، هەڵسەنگان، قەبڵ، قەرسان. "**سنجش افکار عمومی**": هەڵسەنگاندنی بیروڕای گشتی.

**سنجە:** 1) پێوانە. 2) بڕوانە:"ضابطە".

**سنجیدگی:** بەئەزموونی، ئەزموویی، بەتاقیکراوی، کارامەیی.

**سنجیدن:** 1) کێشان. 2) پێوان، ئەنازەگرتن. 3) بەراوردکردن، هەڵسەنگاندن، سەنگاندن، نرخاندن، دیاریکردنی نرخی شتێك. 4) لەبەرچاوگرتن. 5) بەرابەریکردن. 6) شیاوبوون، شایان بوون.

**سنجیدە:** 1) حەساو(بۆ)کراو، هەڵسەنگێنراو، هزراو. 2) بڕوانە:"دقیق". 3) خاوەنی هەڵسوکەوت و ئاخاوتەی دروست و باش.

**سنخ:** چەشن، جۆر. بن، بناخە، بنیات، ماکە.

**سنخ شناختی:** "تایپۆلۆجیکاڵ".

**سنخیّت:** وێکچوون، هاوچەشنی، هاوڕایی، سازگاری. "**سنخیّت داشتن**": سازگاربوون، هاوڕابوون، وێکچوون. "**عدم سنخیّت**": وێکنەچوون، ناسازگاربوون.

**سند:** بەڵگە، بەڵگەنامە، دیکۆمێنت، قەباڵە، نقیسك، گرتنەك، بەڵگەی حەساوکتاو. "**سند دیداری**": بەڵگەیەکی تیجارەتی کە هەر بەخستنەڕوو و دیتنی لە لایەن قەرزدارەوە دەبێ بدرێ. "**سنددستگیری**": ڕاگیرنامە. "**سند مالکیت**": قەباڵەی مڵك، قەبارە، تاپۆی مڵك، قۆچان، بنچاخ، جاخ، چاخ، تاپۆ.

**سندروم:** کۆمەڵێ لە نیشانەکانی نەخۆشی کە بەشێوەیەکی ئاسایی دەگەڵ یەك دەردەکەون بەڵام ناکرێ ناوی نەخۆشییەکی دیاریکراویان لەسەر دابنرێ.

**سەندروم داون:** جۆرێ تێکچوونی کرۆمۆزۆمی کە لەودا خانەکانی کەسی تووشبوو لەجیاتی چل و شەش کرۆمۆزۆم چل و حەوت کرۆمۆزۆمی هەیە و نیشانەگەلێکی وەك کەم زەینی و کورتەبالایی و نەخۆشییەکانی دڵی بەدواوەیە.

**سندری کردن:** لەسەرڕێدانان(منال).

**سندسازی:** بەلگەسازکردن.

**سندیّت:** بەبەلگەبوون، بەلگەمەندبوون، بەلگەداربوون.

**سندیکا:** سەندیکا، یەکیەتی، نوێنەرایەتی هاوپیشەیی، یەکیەتی هاوپیشەیی کە بۆ مەبەستی پاراستنی ماف و بەرژەوەندی هاوبەشی کەسانی هاوپیشە پێك دێ.

**سندیکالیسم:** تیۆرییەك کە بەپێی ئەو تیۆرییە دەبێ بە کردەوەگەلێکی وەك مانگرتن، پیشەسازی و حکوومەت بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی یەکیەتییە کرێکارییەکان.

**سنسکریت:** سانسکریت، زمانی زانستی و پیرۆزی هێندییەکان کە سەر بە زمانەکانی هێندی و ئورووپاییە.

**سنگاشگر:** دەمارگیر، بیرکورت.

**سنگ انداختن:** بریتی لە کارشکێنیکردن، ئاستەنگی نانەوە.

**سنگ اندازی:** بەردهاویشتن. سازکردنی کۆسپ و تەگەرە.

**سنگ باران:** هاویشتنی پەیتاپەیتای بەرد، بەردباران کردن. بارینی بەرد لە ئاسمانەوە.

**سنگ بست:** چێکراو لە بەرد، وشکەکەڵەك. پتەو و قایم. "**سنگ بست کردن**": دەورەگرتن بە دیواری بەرد. بەردەڕێژکردن.

**سنگ به شکم بستن:** بریتی لە لە نەداری و برسێتیدا ژیان.

**سنگ پا:** وەك هێمای بێ شەرمی و پڕڕوویی بەکاردەبرێ.

**سنگ پارە:** لەتێ لە بەرد.

**سنگ پرانی:** بەرتێك، بەردهاوێژی، بەردەفرکێ، کوچك هاویتن.

**سنگ پیش پای کسی انداختن:** بریتی لە کۆسپ ساز کردن لە کاروباری ویدا.

**سنگ تاب:** کولاو لەسەر بەرد، برژاو لەسەر بەرد.

**سنگتراش:** بەردبڕ، بەردتاش، تەوەنتاش، کەفرتاش، کەفرتەراش، کەڤرتاش، کوچکتاش.

**سنگ تمام گذاشتن:** بریتی لە بەباشترین شێوە ئەنجام دان.

**سنگ جان:** زۆر خۆڕاگر و قایم.

**سنگچین:** وشکەچین، وشکەچن، خزن، دیواری وشکەبەرد، وشکەکەڵەك، ئیشکەکەڵەك، بەرد لە سەر یەك هەڵچنین، بەردەڕێژ، نژار، نژین.

**سنگدل:** دڵ ڕەق، دڵ سەخت، دڵ ڕەش، بێڕەحم، زالم، زۆرکار.





**سنگر:** سەنگەر، مەتەرێز، مەتەرێس، خەڵ، چەپەر، سپەر، سپێر، پەناگە.

**سنگربستن:** دروست کردنی سەنگەر، ئامادەکردنی سەنگەر.

**سنگربندی:** سەنگەربەندی، چەپەرکۆڵین، کردەی سازکردن و ئامادەکردنی سەنگەر.

**سنگرگرفتن:** سەنگەرگرتن. کردنەبیانوو یان پەنابردنەبەر ئەو.

**سنگریزە:** زخور، چەو، زیخ، خیز، زغرك، زگار، بەردەورتکە، وردکەبەرد، وردەبەرد.

**سنگسار:** بەردەباران، بەردباران، کوچك واران، ڕەسخ.

**سنگستان:** بەردەڵان، سیتەك، زەوییەك کە بەردی زۆری تێدابێ.

**سنگ فرش:** بەردەڕێژ، سەلبەند، ڕەقف، بەرد دە ڕێگەگرتن، سەنگ فەرش.

**سنگ کردن:** ئەنازەگرتنی ڕێژەی ئاوی ڕەوان.

**سنگلاخ:** تەقتەق، بەردلاوی، بەردەڵان، سیتك، سیتەك، کەڕە، کەرە، کەڤرە، کەڤری، کەمەرن، گەڤرۆك، گیڕ، وڕە، شاوان، شەهوان، ڕێخناخ، ڕێخەلان، زەوی بەردینە، زەوییەکی بنی ڕەق و ڕەقەنە. "**سنگلاخ صعب العبور**": زاخان، بەردەڵانی زۆر چەتوون. "**زمین سنگلاخی**": تەمتەم، تەمتەمان، ڕەقەن، بەردەڵێن.

**سنگ محك:** بەردی زێڕئەزموون.

**سنگناك:** بڕوانە: "سنگلاخ".

**سنگ نوشته/سنگ نبشته:** بەردەنووس، نووسراوەی سەر بەرد، وشەگەلێ کە لەسەر بەرد هەڵکەنراون.

**سنگ نگارە:** وێنەی زەق لە سەر بەرد.

**سنگوارە:** بڕوانە: "فسیل".

**سنگی:** چێکراو لە بەرد. قورس، بەکێش. بێ هەست.

**سنگین:** 1) کێشدار، بەکێش، گران، قورس، سەنگین. 2) قوولّ (خواب). 3) ئەوەی لە بەرد چێکرابێ. 4) خالّی لەسۆز، بێهەست. 5) زۆر، فرە(تلفات سنگین). 6) گرانبایی. 7) بەهێز(ضربه سنگین). "**سنگ(و)رنگین**": قورسوقۆڵ و لەسەرخۆ. "**سنگین سنگین**": بەئەسپایی.

**سنگین بار:** 1) خاوەنی نرخی زۆر. 2) پێومانگ.

**سنگین دل:** بریتی لە دڵڕەق، زالم، بێ بەزەیی.

**سنگین شدن:** 1) قورسبوون. 2) زکپڕبوون، ئاوسبوون. 3) سڕبوون، تەزین.

**سنگین کردن:** قورس کردن، پێوەزیادکردن.

**سنگین و سبك کردن:** سەنگ و سووك کردن، هەڵسەنگاندن.

**سنگینی:** 1) گرانی، گرانایی، قورسایی، قورسی، سەنگایی، سەنگاتی، دژی سووکی. 2) قورسوقۆڵی، قورسایی و گرانایی مرۆ. 3) بەنرخ بوونی شتێ، گرانباییبووونی شتێ. "**سنگینی کردن**": قورسایی کردن، گوشارهێنان و بوونە هۆی ژان و ناڕەحەتی. "**سنگینی گوش**": گوێ گرانی.

**سنن:** کۆی "سنّت"، نەریتەکان.

**سنوح:** دەرکەوتن، خویابوون، وەدیهاتن، ڕوودانی بابەتێ.

**سنوی:** سالانە، سالیانە.

**سنین:** سالان.

**سو:** 1) جەبەر، لا، ئالی، ڕەخ، بەر. 2) ڕوناکی، ڕۆشنایی، تروسکە. 3) هێزی بینایی. 4) سوود، قازانج. "**از سوی**": بەنوێنەرایەتی لە، لەلایەن. "**بەسوی**": بەرەو.

**سواء:** ناوەڕاست، داد، یەکسان، وەکیەك. جیا، جیاواز، تەریك. "**سواسوا**": جیاجیا. "**سوا کردن**": جیاوەکردن، جیاکردنەوە، بژارتن. هەڵبژاردن. "**سوای**": جگە، بێجگە.

**سوائب:** کۆی"سائب".

**سوابق:** کۆی"سابقە".

**سواحل:** کۆی"ساحل".

**سواد:** 1) ڕەشی، ڕەشایی، تارمایی. 2) ڕەشنووس. 3) خوێندەواری، خۆنەواری، توانایی خوێندنەوە و نووسین. 4) زانست و ئاگایی. 5) ڕوونووس، کۆپی. 6) سەرزەوی. 7) حەشیمەت. 8) دەورووبەری شار. "**سواداعظم**": شاری گەورە، پێتەخت. "**سوادالعین**": ڕەشایی چاو. "**سوادالليل**": درێژایی شەو، تاریکایی شەو. "**سوادالناس**": گشت/ تەواوی خەڵك.

**سوادداشتن:** خوێندەواربوون، خوێندەڤان بوون، کەسێ بتوانێ بخوێنێتەوو و بنووسێ.

**سوار:** سوار، سوارە، سیار، بەرانبەری پیادە، کەسێك کە بەسەر بارەبەر یان هەرشتێکی دی سەفەر بکا.

**سواران آب:** بڕوانە:"آب سوار".

**سوارشدن:** 1) سواربوون، وەنشتا، وەنشتش. 2) مونتاژبوون. 3) زالبوون، بالادەست بوون.

**سوارکار:** سوارچاك، سوارخاس، سووکەسوار، سووکەڵەسوار.

**سوارکردن:** 1) سوارکردن. 2) جێکردنەوە، خستنەجێی شتێ لەسەر شتێکی دی. 3) گەلاڵەکردن و جێبەجێکردنی پیلانێکی نهێنی.

**سوارە:** سوار، لەحاڵی سواربووندا. سەرەتای شەو، ئێوارەدرەنگان، بەشێك لە شەو تا کاتی خەوتن. شەونشینی، میوانی لە شەو دا بە مووسیقا و سەماوە.

**سواری:** 1) سواری، سواربوون. 2) بارەبەرێ کە بۆ سواری دەست ئەدا. "**سواری خوردن**": بەهرەمەندبوون لە چێژی سواری. "**سواری دادن**": چوونەژێرباری چەوساندنەوەی خەڵکانی دی، بەلاش کارکردن بۆ دیتران. "**سواری گرفتن**": سواری چوارپێ یان ماشێن بوون. چەوساندنەوەی کەسێك، بێگاری لێ کێشانەوە.





**سوانح:** کۆی"سانحە".

**سوء:** خراپە، بەدی، شەڕ، پەتا، درم، گەندەڵی. "**سوءاثر**": کاریگەری ناخۆش. "**سوءادب**": بێئەدەبی، بێحورمەتی. "**سؤاستفادە**": کەڵکاوەژوو، بە خراپە کەڵك وەرگرتن، کەڵکی نابەجێ وەرگرتن لەشتێ. لە خۆ دەرچوون. "**سوء برداشت**": بەهەڵە تێگەیشتن، تێگەیشتنی هەڵە، خراپ تێگەیشتن. "**سوءتدبیر**": چارەدۆزی بێئەقڵانە، مشوور لێخواردنی خراپ و سەقەت. "**سوءتعبیر**": خراپ لێکدانەوە. "**سوء تغذیە**": بەدخۆراکی، دژخۆراکی، هەڵەخۆری. "**سوءتفاهم**": خراپ تێگەیشتن، خراپ لێکگەیشتن. "**سوء رفتار**": بەدرەفتاری، بەدکرداری، ئینات، هەڵسوکەوتی خراپ. "**سوء ظن**": دڕدۆنگی، بەدگومانی. "**سوءقصد**": نیازی خراپ. بەنیازبوون یان هەوڵدان بۆ کوشتن. "**سوءمزاج**": نەخۆشی. ڕق، کینە، دوژمنی. "**سوءنظر**": بڕوانە:"سوءنیّت". "**سوء نیت**": بەدنیازی، نیازخراپی، بەدخوازی. "**سوء هاضمە**": ئینتەلا، سابخۆر، سقڵ، نەخۆشی گرفت کە لە هەرس نەکردنی خواردنەوە تووشی دەبن.

**سوبژکتیو:** ناوەوە، ژوور، دەروون، ناخ، هەناو. زەینی، ناخی، ناوەکی، هەناوی.

**سوپریور:** ژوور، سەرەوە، سەروتر، بان.

**سوتام:** کەم، کەموکە، تۆزقاڵ، گچکە. کەمووکوورپیدار.

**سوت وکور:** بێدرەوشین، بێبرەو. مات و بێدەنگ، خەڵوەت و بێدەنگ، بێ هەراوهوریا، چۆڵ.

**سوتەدل:** ئاشقی ڕەنج دیتوو، داغ دیە، دڵسووتاو.

**سوتی دادن:** ئەنجامدانی کردەی هەڵەی دوور لە چاوەڕوانی دیتران. تووشی هەڵەی لەبزی یان ڕەفتاری بوون، گاف لێدان.

**سوج:** بڕوانە:"سوز".

**سوجش:** بڕوانە:"سوزش".

**سوخت:** 1) سووتا، سچیا، سووچا، سۆچا، سووچیا، سووزیا، ئاگری تێبەربوو. 2) سووتەمەنی، سووتەنی، ئاردوو، ئاوردوو، ئاگوردی. "**سوخت شدن**": لەناوچوون. "**سوخت فسیلی**": سووتەمەنییەك کە سەرچاوەی ڕوەکی و بوونەوەری هەیە وەك نەوت و گازی سروشتی. "**سوخت و ساز**": بڕوانە:"متابولیسم". "**سوخت و سوز**": زەرەر، زیان.

**سوختگی:** 1) سووتاوی، سوتیاگی. 2) سووتان بەهۆی تین. 3) ئەوینداری و شەیدایی و ئێش و ژانی ئەو خۆشەویستییە.

**سوختن:** 1) سووتان، سووتیان، سووتن، سۆتن، سووچان، سچیان، سۆچیای، سۆژان، سووژیان، سۆژین، سۆزان، سۆزیان، سووزیان، سووزان، شەوتان،

شەوتین، سۆهتن، ئاگرتێبەربوون، ئاگرتێبەردران، ئاگرتێچوون. 2) لەناوچوون، زایەبوون. 3) لەناوبردن، زایەکردن. 4) هەست بە گەرمای زۆرکردن و ئازار چەشتن. 5) دۆڕان لە کایەدا. 6) دڵ پێ سووتان و هەستی بەزەییکردن. 7) خستنە ڕەنج و ئازارەوە. 8) ئایسان، ڕۆشن بوون و گەرمی یان نوور دان. **"سوختن سطحی"**: هەڵ کرووزان، هەڵ پرووکان، هەڵ زووران. **"سوختن و ساختن"**: مداراکردنی دەگەڵ دژواری و سەختییەکان و سکاڵانەکردن، دەربردن دەگەڵ کێشە و ناڕەحەتییەکان.

**سوختنی:** سووتەمەنی، سووتەنی، ئاردوو، ئاگوردی، شیاوی سووتان.

**سوختە:** 1) سووتاو، سووتە، سۆتەی، سۆتی، سووزیاگ، سووزیاو، سووژیاو، شەوتی، ئاگرگرتوو، شتێ کە ئاوری تێبەربووە. 2) کەسێك کە مەینەتی و ئازاری چەشتبێ، مەینەتی چەشتوو، سەختی دیتوو. 3) ئاشق و شەیدا. 4) زۆر توونی و وشك لەبێ ئاوی‌دا( خاك سوختە). 5) پاشماوەی سووتانی شتێك. 6) بڕوانە:"خالص". 7) ناوی یەکێك لە گەنجەکانی خوسرەوپەرویز. **"کاملا سوختە"**: شەواتە، تەواو سووتاو.

**سوختەجان:** بریتی لە ئەویندداری دڵسووتاو.

**سوختەخرمن:** کەسێك کە خەلەوخەرمانی ئاگری گرتبێ و سووتابێ. بریتی لە کەسێك کە دارونەداری لە دەست دابێ، رووت و نەدار، بەدبەخت.

**سوختە دل:** دڵسووتاو، دڵ پەڕتی، دل شەوات ، دل شەواتی، دل شەوتی، ستەم لێکراو، داغ دیە، خەمناك، زۆر ناڕەحەت و خەمبار.

**سود:** قازانج، قانجاز، فایدە، خێر، بەهرە، کەڵك، هاقل، سوود.

**سودآور:** قازانج هێن/گەێن، خێردەرەوە، خێرەودەر، بەهرەدەر.

**سودا:** بڕوانە:"معاملە".

**سوداء:** 1) ڕەش. 2) نەخۆشی گلاراو، خولیا، ئیشتیا بە خەیاڵ، خەیاڵ پەروەری، عەودال. 3) هۆگری زۆر بەکەسێك، ئەویندداری، خۆشەویستی. 4) هەواوهەوەس. 5) تووڕەیی، قەڵسی. **"سودا پختن"**: خەیاڵی دوورودرێژ کردنەوە، خەیاڵ پەروەری کردن. **"سوداپرست"**: کەسێك کە ملکەچی هەواوهەوەس/ئیشتیا و ئارەزووەکانی خۆی بێ، خەیاڵ پەرست، هەوەسپەرست، خەیاڵ پەروەر. **"سوداکردن"**: تووڕەبوون، قەڵس بوون. **"سوداگرفتن"**: ڕەش بوون. **"سودای کسی(چیزی) را پختن"**: ئاواتەخوازی ئەو بوون، تامەزرۆی ئەو بوون.

**سودازدگی:** حاڵەتی شێت و شەیدایی.

**سودازدە:** 1) ماخولیایی، گلاراوی، شێواو، شەیدا، خولیا. 2) دڵدار، ئەویندار.

**سوداکدە:** شوێنی ماڵە.

**سوداگر:** بازرگان، تاجر، ماڵەچی.

**سوداناك:** خاوەن خولیا و سەودا، تێکەڵ





بە هەواوهەوەس.

**سوداوی:** ماخولیایی، کەسێك کە خولیا و خەیاڵ بە سەریدا زاڵ بێ.

**سودایی:** 1) شەیدا، ئاشق. 2) شێت، دێوانە. 3) کەسێك کە خولیا و خەیاڵ بەسەریدا زاڵە.

**سود بخش:** خێردەرەوە، خێرەودەر، شتێ کە بەهرە و قازانج بداتەوە.

**سود بخشی:** خێردانەوە، بەهرەدان، قازانج دانەوە.

**سود بردن:** بەهرەدیتن، بەهرەبردن، بەهرەگیرهێنان، بەهرەگیرکەوتن، قازانج کردن، قازانج بردن، ڤەبرن، هاقل بوون، خێرکردن، خێردیتن.

**سود پرست:** قازانج پەرست، کەسێك کە بۆ قازانج بردن دەست بداتە هەر کارێك.

**سود جستن:** کەڵك وەرگرتن، کەڵك لێوەرگرتن، قازانج لێبردن، خێرلێدیتن.

**سودجو:** قازانج خواز، کەسێك کە بەردەوام بە دوای قازانج و بەهرەوەیە.

**سودجویی:** قازانج خوازی.

**سوددادن:** هاقل کرن، بەهرەپێدان/دان، کەڵك دان، خێردانەوە.

**سودداشتن( دربرداشتن ):** 1) داهات هەبوون لە ماڵەدا. 2) هەبوونی ئاکامی بەکەڵك. 3) کاریگەری‌دانان، کارتێکردن.

**سوددهی:** بەهرەدانەوە، کەڵك دانەوە، کەڵك دانەوە، بەرهەمداری، بەهرەداری.

**سودسپردە:** بەهرەیەك کە بە پارەی سپێردراو بە بانك دەبڕێ.

**سودصوری:** زێدەبایی ڕەسمی داراییەك.

**سودکردن:** 1) قازانج کردن، سوودبردن. 2) ئاکامی دڵخواز وەدەستهێنان لە ماڵەیەکدا.

**سودگرایی:** بەرژەوەندخوازی، قازانج خوازی.

**سودگی:** ساویاوی، ساویاگی، کۆنەیی، پرتوکیاوی.

**سودمند:** بە قازانج، سووددار، بەسوود، بەکەڵك، بەهرەدەر. **"سودمند شدن"**: بەهرەبردن/وەرگرتن، قازانج بردن، خێرکردن.

**سودن:** 1) ساو، ساوان، ساویان، ساوین، ساین، سوون، سێویان، کوتانەوە، نەرمکردن. 2) پاك کر دن، سڕین(ەوە). 3) بەرکەوتن، دەست لێدان. 4) ماندوو و شەکەت بوون. 5) لابردنی پەردەی کچێنی.

**سود ناویژە:** جیاوازی نرخی فرۆش و نرخی تەواوبووی کالا.

**سود ویژە:** قازانجێ کە دوای کەمکردنی تەواوی خەرجییەکان وەدەست دێ.

**سودە:** 1) ساویاو، ساویاگ، سێویاگ. 2) نەرم کراو، کوتراو.

**سور:** 1) میوانی، بەزم، جێژن، زەماوەند.

2) دیواری دەوری شار. "**سورچراندن**": شام و نەهار و چەرەز و هتد خواردن وەك میوان. "**سوردادن**": میوانیدان بە بۆنەی پێشهاتێکی باش و سەرکەوتوانە. "**سورکردن**": میوانیدان، سازدانی کۆڕی شادی، ئاهەنگ گێڕان.

**سوراخ:** کون، کونا، سۆنت، سیلا، سیلاخ، قول، قولیلك، قلێل، نقول. "**سوراخ دعا را گم کردن**": نەزانینی ڕاز و نهێنی سەرکەوتن و ڕێگەی گەیشتن بە ئامانج. 2) بەلاڕێداچوون. هەڵەکردن. "**سوراخ سوراخ**": کون کون، شەبەق شەبەقئاژن ئاژن. "**سوراخ و سمبە**": گۆشەوکەنار. پەناگە، حەشارگە.

**سوراخ شدن:** سمان، کون بوون، کونابوون، قول بوون. "**سوراخ شدن دیوار یا کالا**": شەبەق تێکەوتن، شەبەق تێبوون.

**سوراخ کردن:** 1) کون کردن، کون تێکردن، قوول کرن، قولیکرن، سمین، سماندن، سمتاندن، سمتن، سمتین، سۆنتن، نووژین. 2) کارتێکردن. "**سوراخ کننده**": کونکەر، سمتۆك.

**سوراخی:** جێگەی بەرتەسك و باریك.

**سورپریز:** ڕووداوی سەرنج ڕاکێش و دڵخۆشکەر، ئەوەی بەشێوەی چاوەڕواننەکراو ڕوودەدا یان پێشکەش دەکرێ و هاوکات کە کەسەکە خۆشحاڵ دەبێ سەریشی سووڕ دەمێنێ.

**سورت:** توندی، تیژی.

**سورتمە:** خزاگ، تاخورك، کاشە.

**سورچران:** سك لەوەڕێن، زگ لەوەڕێن، چلێس، زۆرخۆر، چەورەی ماڵانگەڕ، نەوسنی ماڵانگەڕ، وەردەك، لەگام، لەم لەوەڕن.

**سوررآلیست:** پێڕەو و لایەنگری سووررئالیزم.

**سوررآلیسم:** شێوازێکی ئەدەبییە کە لە ساڵی 1924ی زایینی لە فەڕانسە سەریهەڵدا و ئامانج لەو دەربڕینی هەست و خەیاڵات و بیرۆکەگەلە ئازادە بێکۆتوبەندەکان بوو و پێڕەوکارانی ئەم ڕێبازە لەسەر ئەو بڕوایەبوون کە دەبێ نووسەر و هەڵبەستڤان بەبێ ڕەچاوکردنی کۆتوبەندە ئەخلاقییەکان یان بەستراوەیی زەینی یان دەمارگیری یان دەبەرچاوگرتنی ڕێسای ئەدەبی و هونەری ئەوەی بە مێشکی دەگا بیهێنێتە سەر کاغز و دەریبڕێ. ئەم شێوازە لە شێوەکاریش دا بووە هۆی خوڵقاندنی شێوازێکی نوێ کە حاڵەتێکی خەوناوی بە شتەکان دەدا و شێوەکار بەدوور لە بەربەستە لۆژیکی و ئاوەزییەکان هەرچی بە مێشك و زەینی دەگەیشت دەیکێشاوە.

**سورسات:** بڕوانە: "سیورسات".

**سورن:** هێرش و پەلامار، هروژم و شاڵاو، هەراهەرا و زەنازەنای لەشکرەکان کاتی هەڵمەت بردنە سەریەك.

**سورنك:** برین.

**سورە:** سووڕەت، بەندێ/پارێك لە قوڕئان.





**سوری:** ا) بڕوانە: "سورچران". 2) لە خەڵکی سووریە. 3) سوور، بەڕەنگی سوور. 4) چوارشەممەسووری.

**سوز:** 1) سووتانەوە، سووتیانەوە، سۆڵانەوە، کزە. 2) بای تێکەڵ بە سەرمای توند، کزەی سەرما. 3) بڕوانە: "اشتعال". 4) ئاگر، ئاور. 5) خەم و کەسەری زۆر. "**سوزوبریز**": گریان و ناڵان. "**سوزوساز**": بریتی لە تاقەت و پشوودرێژی لە بەرانبەر نەهامەتی و کوێرەوەرییەکان دا. خەم و کەسەری زۆر بەهۆی دووری و تاسەکردن.

**سوزآور:** 1) ئەوەی دەبێتە هۆی سووتانەوە/سۆڵانەوە، شتێ کە ببێتە هۆی سووتان. 2) "سوز"هێن.

**سوزا:** سووتێن، سووتێنەر. لە حاڵی سووتاندا، سووتەمەنی.

**سوزاك:** سووزەنەك، سووسەنەك، نەخۆشییەکە لە جێگەی شەرمی نێر و مێ پەیدا دەبێ.

**سوزان:** 1) سووتێن، سووتێنەر، بەتین. 2) زۆرگەرم. 3) لەحاڵی سووتاندا. 4) زۆر کاریگەر و وروژێنەر(نگاه سوزان). 5) زۆر، فراوان(اشتیاق سوزان). 6) بەژان، ئێشدار(زخم سوزان، دل سوزان). 7) لێوڕێژ لە خەم و تامەزرۆیی (عشق سوزان).

**سوزاندن:** سووتاندن، سووتانن، سووژاندن، سووزاندن، سووزانن، سچاندن، سچانن، ، شەوتاندن، ئاگر تێ بەردان، داچزاندن، داغ بە ئەندامی لەشەوەنان. "**سوزاندن سطحی**": هەڵ پڕووکاندن، هەڵ کڕووزاندن، هەڵ کوڕووزاندن.

**سوزاننده:** سووتێن، سووتێنەر، شەوتاندۆخ.

**سوزانی:** سووتێنەربوون، هەبوونی گەرمای زۆر. "**سوزانی کردن**": سووتاندن، ئاگرتێبەردان.

**سوزش:** خورانەوە، تووزیان، تووزیانەوە، سۆڵانەوە، سۆڵاندنەوە، سووتانەوە، سووتیانەوە، چووزان، چووزانەوە، چووزینەوە، کڕووزانەوە، کووزانەوە، کووزریان، سفت و سۆ، سفت و سوێ، برژانەوەی پێست و زام. "**سوزش معده**": دڵەکزە، دڵەکزێ.

**سوزمانی:** سۆزانی، ژنی خراپەکار.

**سوزناك:** 1) ئەوەی لە ڕووی خەم و ژانەوە دەوترێ. 2) خەم هێن. 3) بەژان و سووتانەوە. 4) کزە/ کسپە لە جەرگەوەهێن. 5) سووتێنەر، گەرم و بەتین. 6) تێکەڵ بەخەم، خەمبارانە.

**سوزن زدن:** 1) بڕوانە: "دوخت و دوز". 2) دەرزی/ شریقە لێدان/ وەشاندن.

**سوزنده:** سووتێن، سووتێنەر، ئەوکەسە یان ئەو شتەی بسووتێ.

**سوزنك:** بڕوانە: "سوزاك".

**سوزنگر:** 1) بەرگدروو. 2) دەرزی ساز.

**سوز و گداز:** 1) خەم و کەسەری زۆری سەرچاوەگرتوو لە دووری و تامەزرۆیی. 2) ژانکردن و سووتانەوە. 3) قسەیەك کە لە خەمباری و داماوییەوە وترابێ. 4) خەم هەلگرتن و ڕەنج کێشان.

**سوزە:** بڕوانە: "سوژە".

**سوزیان:** سووکەڵەی سوود و زیان، قازانج و زەرەر. ماڵ و سەرمایە. ڕاز و نهێنی.

**سوزیدن:** بڕوانە: "سوختن".

**سوژە:** 1) سووژە، ناسکار، subject. 2) مژاد، درغە، هەیبەر، شیاوی نووسین، مەبەست بۆلێدان و لە سەر نووسین، ئەوەی کە سەبارەت بەوی باس و شیکار یان تاقیکاری ئەنجام بدرێ.

**سوسو:** تروسکایی، تروسکەی لە دوور، ڕووناکی زۆر کەم، پیچەك ڕوهنی، سۆڵە. "**سوسو زدن**": سۆڵەکردن، تروسکانەوە.

**سوسە:** فرتوفێڵ، ڕیا و کەڵەك و درۆ. "**سوسەآمدن**": بەکاربردنی هەرچەشنە فێڵ و تەڵەکەیەك دژی کەسێکی تر. "**بی سوسە**": ئاشکراوڕوون، ڕەپ و ڕاست، ڕاست و دروست و بێ ڕیا و فێڵ. "**سوسە دواندن**": سەبارەت بە کەسێك یان کارێك شتێك وتن کە ببێتە هۆی زەحمەت و گرفت.

**سوسیال دموکرات:** لایەنگری سوسیال دێموکراسی.

**سوسیال دموکراسی:** تیۆرییەکی سیاسی لەسەر بنەمای کەڵك وەرگرتن لە شێوازە دێموکراتیکەکان بۆ وەدەستهێنانی بەرەبەرەی سوسیالیسم.

**سوسیالیست:** لایەنگری سوسیالیسم، یەکسانیخواز.

**سوسیالیسم:** هاوبەشایەتی، سوسیالیسم، ڕێبازێکە کە دەوڵەت دامەزراوە گەورە ئابووری و پیشەیی و سەرچاوە سروشتییەکانی بۆ قازانج گەیاندن بە گشت خەڵك و بە مەبەستی پێشگیری لە کۆبوونەوەی سامان لە دەست هێندێك کەسدا دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی. جووڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتی و تیۆرییەکی سیاسی سەرچاوەگرتوو لەوەی کە لە ڕێگەی هەڵوەشاندنەوەی خاوەنداریێتی تایبەتییەوە خوازیاری لابردنی نابەرابەرییە کۆمەڵایەتییەکان و چەوساندنەوەی مرۆڤ بەدەست مرۆڤەوەیە.

**سوسیتە:** کۆمەڵ، حەشیمەت، لێژنە، دەستە، کۆڕ، گروپ.

**سوسیولوژی:** زانستی کۆمەڵ، کۆمەڵناسی، توێژینەوەی زانستی پێوەندییەکانی نێوان کەسەکان، گروپەکان و چینە کۆمەڵایەتییەکان.

**سوش:** بن، بێخ، ڕەگ، بنیچە، بنچینە.

**سوغات:** دەستەریقانە، دیاری، پێشکەشی.

**سوغان:** ڕێ پێدران و ڕەوابوونی بابەتێ.





هەڵاتنی وشتر یان ئەسپ بە دوای یەکتردا. ڕاهێنانی ئەسپ بۆ سواری یان گرێوەغار.

**سوفسطایی:** پێڕەوانی ئەم ڕێبازە بە سۆفیست واتە تۆرەڤان و بیرمەند ناودەبرێن، سۆفستاییەکان لە باسی پرسە فەلسەفی و ئەخلاقی و سیاسییەکاندا بەشێوەی دیالەکتیك و هەڵەکاری و سەفسەتە دەدوان و بڕوایان بە حەقیقەت نەبوو و بە ڕێژەیییان دەزانی و بە بڕوای ئەوان بە جیاوازی حاڵەتی دەروونی دەگۆڕێ.

**سوفیکس:** بڕوانە: "پسوند".

**سوق دادن:** پاڵ نان، ڕادان، بردن، دانەپێش. دیاریکردنی ڕەوگەی جووڵان و پێشکەوتن. "**سوق الجیش**": لەشکرکێشی، ستراتێژی. "**سوق الجیشی**": ستراتێژیك. نیزامی. "**سوق دهندە**": پاڵنەر، پاڵ پێوەنەر.

**سوقات:** بڕوانە: "سوغات".

**سوك:** 1) بڕوانە: "سوگ". 2) خەم، خەفەت، کەسەر.

**سوك سرود:** بڕوانە: "مرثیە".

**سوکسە:** ناوبانگ و خۆشەویستی.

**سوکمیسیون:** کۆمیسیۆنی لاوەکی.

**سوکیدن:** خستنەژێر چاوەدێری ئاکار و کرداری کەسێك، چاوەدێری کردن.

**سوگ:** پرسە، سەرەخۆشی، تازیە، ماتەم، خەم. "**بە سوگ نشستن**": ئازیەتباربوون یان تازیەباریکردن.

**سوگدار:** بڕوانە: "سوگوار".

**سوگلی:** خۆشەویست تر لە هەموان لە نێوان کۆمەڵێکدا.

**سوگمند:** بڕوانە: "عزادار".

**سوگناك:** خەمهێن، پەژارەهێن.

**سوگنامە:** 1) بڕوانە: "مرثیە". 2) هەرجۆرە ڕووداو یان دۆخێکی ناخۆش و خەمهێن.

**سوگند:** سوێن، سوێند، سووند، سۆند، سۆکەند. "**سوگند خوردن**": سوێند خواردن. "**سوگنددادن**": سوێنددان. "**سوگند یادکردن**": سوێندخواردن. "**بە... سوگند**": سوێند بە...

**سوگندنامە:** سوێندنامە.

**سوگ نگارە:** بڕوانە: "مرثیە".

**سوگوار:** تازیەبار، ئازیەت دار، سویٚدار، ماتەمین، داغ دیە، خەمبار.

**سوگوارە:** شانۆی ئایینی، تازیە.

**سوگواری:** تازیەباری، ئازیەتی، ئازیەت باری، پرسە، شین گێڕی، ڕەش گرێدان.

**سولدان:** جێگەی تاریك و پیس و نالەبار. گرتووخانە.

**سولە:** بڕوانە: "سوراخ".

**سوم:** (سِ.وُ) سێهەم، ئەوەی لە پلەی سێ دایە. "**یك سوم**": سێیەك، لە سێ پاژ پاژێك، یەك لەسەر سێ.

**سوم:** (سَ) دەرخستنی کالا و گوتنی

نرخەکەی. خەریك بوون بە بازرگانییەوە. مامڵە. نرخ و بەها.

**سوماتوتروپ:** (پزیشکی) هۆرمۆنی گەشەکردن.

**سومه:** (سَ.مَ) نیشان، نیشانە.

**سون:** لا، ئالی، ڕەخ. "**بەسون**": بەرەولای.

**سونش:** تۆپاڵ، ئارداسن، وردەئاسن.

**سونوگرافی:** ئۆلتڕا، سۆنۆگرافی.

**سونیدن:** جیاکردنەوەی تۆپاڵ لەشتێ، بڕبەندلێدان.

**سوهان:** بڕبەند، کارتك، ڕنەك، قەورە، سوان، کوچکەهەسان. "**سوهان روح**": ئازاردەری ڕۆح. "**سوهان زدن(کشیدن)**": بڕبەندلێدان.

**سوهان سبلت:** سۆفی.

**سوهش:** هەست، سەح، پسوو.

**سوهش انگیز:** پڕهەست، خەیاڵ وروژێن.

**سوهش پذیر:** هەست پێکراو، بەرهەست.

**سوهش پذیری:** هەستیاری، لەسەرهەست بوون، قوتی.

**سوهشدار:** خاوەن هەست، کەسی هەستیار.

**سوهش گر:** ئەندامی هەستەکی، وەرگر.

**سوهش گرایی:** 1) عاتیفەگەرێتی، دڵناسکی گەری، هەست بزوێنی، سانتی مێنتالیزم. 2) هەست باوەڕی.

**سوهشمند:** هەستیار، لەسەرهەست، سڵ، قوت، ئاگا.

**سوهشمندکردن:** هەستیارکردن، هەستەوەرکردن.

**سوهش نمایی:** مەیل بۆ زێدەڕۆیی لە دەربڕینی هەست و سۆز(هەستیاری) دا.

**سوهشی:** 1) هەست ناسك، دڵناسك، هەستیار، سانتیمێنتاڵ. 2) هەستەکی، هەست پێکراو.

**سوهیدن:** هەست (پێ)کردن، سەح پێکرن.

**سویّ:** بەرابەر و ڕێك، یەکسان، وەکیەك، ناوەڕاست.

**سویت:** بەرابەری، یەکسانی.

**سویگان:** ڕەهەند.

**سهاد:** بێخەوی، کەمخەوی.

**سهار:** بێخەوی لە شەودا، شەونخوونی.

**سهارکان:** بریتی لە ڕەقەمەنی و ڕوەك و ئاژەڵ. "سەاساس و سەگوهر و سەفرزند" یشیان پێوتوە.

**سهاله:** بڕوانە: "سونش".

**سهام:** کۆی"سهم".

**سەبعدی:** بریتییە لە درێژی و پانی و قووڵی.

**سه پهلو:** سێپاڵوو، سێ حاچە، سێ گۆشە، تاشراوی سێ سووچ. گوتەیەك کە چەند تێگەیشتنی جیای لێهەڵبهێنجرێ.

**سهتن:** ترسان، ترسین.

**سهدوری:** بڕوانە: "سهبعد".

**سهر:** (سَ.هَ) بەئاگابوون، نەخەوتن لە شەودا، شەونخوونی.

**سهستن:** 1) دەرکەوتن، هاتنە بەر چاو.





2) ترسین، ترسان، سڵەمینەوە، ڕەوینەوە و هەڵاتن.

**سهش:** هەست، سەح، پسوو، ئاگاکردن. "**سهشی**": هەستەکی، هەست پێکراو.

**سەشنبه:** سێ شەم، سێ شەمب، سێ شەمبو، سێ شەمبۆ، سێ شەمبی، سێ شەمۆ، سێ شەمە، سێ شەممە، سێ شەمی، چوارەم ڕۆژی حەوتە.

**سهضلعی:** سێ گۆشە.

**سهگان:** سێ دانە، یان سێ دانە سێ دانە.

**سهگانه:** سێیانە، پێکهاتوو لە سێ ئەندام، سێ دانەیی. سێ دانە سێ دانە.

**سهگوشه:** سێ چوکڵە، سێسووچ، سێ گۆشە، سێ کۆچە.

**سهگوهر:** بڕوانە: "سهارکان".

**سهل:** ئاسان، هاسان، سانا، سادە، بەبێدژواری، تاقل، ڕەحەت. نەرم، زەوی نەرم و ڕێك. "**سهل ممتنع (سهل و ممتنع)**": ئاخاوتەیەکی ئەدەبی(پەخشان یان هۆنراوە) کە لەبەر ڕەوان بوون زۆر سادە دێتەبەرچاو بەڵام هۆنینەوە یان نووسینی لەوبابەتە نەشیاو و زۆر چەتوونە.

**سهل الحصول:** ئەوەی وەدەستهێنانی ئاسان بێ، ئاسان بەدەستەوە هاتن.

**سهل العبور:** ڕێگایەك کە بە سانایی بتوانی لێوەی تێپەڕی، ئاسان ڕۆ.

**سهل العلاج:** نەخۆشییەك کە بە سانایی تیمار بکرێ، نەخۆشی سووك.

**سهل القبول:** زوو وەرگر، زووقبووڵکەر، کەسێك کە زوو بڕوا دەکا.

**سهل القیاد:** گوێلەمست، گوێڕایەڵ.

**سهل الوصول:** قامخۆش، ئەوەی بە سانایی دەست دەکەوێ.

**سهل الهضم:** خۆش هەرس، خواردەمەنییەك کە بە ئاسانی هەزم بێ.

**سهل انگار:** کەمتەرخەم، خەمسارد، گوێنەدەر، خۆ لە کار بوێر.

**سهل انگاری:** گوێ نەدان ، کەمتەرخەمی، خەمساردی، خۆ لە کار بواردن.

**سهم:** 1) بەش، بەشە، بێش، واش، ئاماڵ، پشك، پار، لەڤا، هۆخ، قەت، سەری، بەری، بارە، بەهرە، لۆتم، ماف. 2) پشك، تیروپشك. "**سهم بردن**": بەهرەمەندبوون، بەش بردن. "**سهم رسیدن**": بەرکەوتن، بەش بەرکەوتن.

**سهمگن:** بڕوانە: "سهمگین".

**سهمگین:** سامناك، سامدار، بە سام، ترسناك، ترس هێن.

**سهمناك:** بەسام، سامدار، سامناك، زەرندە، جێی ترس، بە ترس، خەتەروبەرمەترسی، ورەبەر.

**سهمیدن:** ترسان، ترسیان، سام کردن.

**سهمیه:** بڕوانە: "سهم". "**سهمیه بندی**": بەش بۆ دانان، جیرەبەندی.

**سهو:** 1) خەڵەت، هەڵە، خافڵان، سەوخان، یانش. 2) لەبیرچوونەوە و خافڵان.

**سهواً:** بەهەڵە، لەڕووی هەڵەوە.

**سهول:** کۆی"سهل".
**سهولت:** ئاسانی، سانایی، هاسانی، هێسانی، سادەیی.
**سهوی:** لە ڕووی هەڵەوە.
**سهی:** ڕاست، ڕاست ڕاوەستاو.
**سەیك:** بڕوانە:"ثلث".
**سهیم:** بەشدار، هاوبەش، شەریك، بەش بەر، پشك دار، هاوبەهرە. "**سهیم شدن**": هاوبەش بوون، بەشدار بوون، شەریك بوون.
**سیّاح:** سەیرانکەر، کەسێك کە دەچێتە سەیران، گەشتیار، گەشتۆك، دنیاگەڕ، تووریست.
**سیاحت:** 1) گەشت، سەیران، گەڕان بە کەیف. 2) گەشتیاری، دنیاگەڕان، جیهان گەڕی، تووریستی.
**سیاحتگاه:** گەشتگە، گەشگە، سەیرانگا، جێگەی سەیران لێکردن.
**سیاحتنامه:** گەشتنامە، بیرەوەری گەشتیار.
**سیادت:** سەروەری، گەورەیی، پایەبەرزی.
**سیّار:** کەسێك کە زۆر بگەڕی و بچێتە سەیران، گەڕندە، گەڕۆك، گەڕا، گەڕیدە، دایم بەڕێوە.
**سیاره:** ئەستێرە گەڕۆك.
**سیّاس:** 1) سیاسەتوان، ڕامیار. 2) بڕوانە: "حیلەگر". 3) تەمبێ کەر.
**سیاست:** 1) ڕامیاری، سیاسەت، بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات، هونەری ڕێخستنی کاروباری ناوخۆیی و دەرەکی وڵات. 2) سزا، تەممێ.
**سیاست باز:** 1) سیاسەتوان، ڕامیار. 2) کەڵەکباز بەتایبەتی لە کاوباری سیاسیدا.
**سیاست خانه:** بڕوانە:"سیاستگاه".
**سیاست کردن:** تەمبێکردن، سزادان.
**سیاستگاه:** شوێنی تایبەتی تەمبێ کردن و بەسزاگەیاندنی تاوانباران، ئەشکەنجەگا.
**سیاست گذار:** سیاسەت دانەر، داڕێژەری سیاسەت.
**سیاستمدار:** 1) ڕامیار، سیاسەتوان، سیاسەتڤان، سیاسەت زان. 2) بەتەگبیر و زیرەك، بیرتیژ.
**سیاسی:** 1) ڕامیاریانە، سیاسی. 2) سیاسەتوان، ڕامیار، کارامە و لێزان لە سیاسەت دا.
**سیاسی کاری:** 1) خەریك بوون بەکاروباری سیاسییەوە. 2) ئەنجامدانی کاروبارەکان بەپێی بەرژەوەندی نەك بەپێی پڕەنسیپێکی دروست و لۆژیکی.
**سیاسیون:** کۆی"سیاسی". سیاسەتوانان. خەباتکارانی سیاسی.
**سیاق:** 1) شێواز، شێوەی پەیڤ. 2) ئاژۆتن، لێخوڕینی چوارپێکان. "**سیاق کلام**": شێوازی ئاخاوتە، ڕەوتی ئاخاوتە، شێوەی ڕستەبەندی. "**ازاین سیاق**": لەم چەشنە، لەم جۆرە.
**سیاقت:** 1) لێخوڕین، ئاژۆتن. 2) شێوازی





خوێندنەوە و دەربڕینی ئاخاوتە.
**سیّال:** 1) ڕەوان، ناجێگیر، بێگیر، ڕانەوەستاو، خوڕ، شتێ کە وێستانی نیە. 2) خاوەنی تایبەتمەندی پەیدۆزەرانە.
**سیالیت:** 1) ڕەوانبوون، بێ گیربوون. 2) ڕەوانی و خێرایی.
**سیاه:** 1) ڕەش، ڕەژ، شەڤین، بەرانبەری سپی. 2) تاریك (شب سیاه). 3) خەمهێن یان کارەساتاوی (روزگار سیاه). 4) ڕەشبینانە. 5) کەم نرخ، پەست، نزم. 6) پیس، چڵکن (دستهای سیاه). 7) ڕەش پێست. "**سیاه براق**": ڕەشتوز، ڕەشی بریقەدار. "**سیاه مایل به کبودی**": ڕەشکەوگ، ڕەشکەوە، ڕەشکەوەگ، ڕەشی ئامالْ شین. "**بسیار سیاه**": ڕەش و برش، سیازوخالْ، زۆر ڕەش.
**سیاه بخت/ سیه بخت:** چارەڕەش، بەخت ڕەش، بەدبەخت، بەوشانس، سیاتاڵە، کولۆڵ، کلۆڵ، کلۆر. ژنێ کە لە ژیانی ژن و مێردایەتیدا سەرکەوتوو نیە.
**سیاهبندی:** فریودانی کڕیار یان فرۆشیار بەهۆی کەسی سێهەم کە بەڕواڵەت بە لایەنگری لە یەکیان یان ڕکبەڕکێ دەگەڵ ئەوان خۆ لە مامڵەکە دەڵدەقوتێنێ. 2) جامبازی، فێڵبازی، مەکربازی.
**سیاهبین:** ڕەش بین.
**سیاه پستان:** ژنێ کە مەمکی ڕەش بێ. بریتی لە ژنێ کە مناڵەکەی بەباشی پەروەردە نەکا، ژنێ کە شیر بدا بە هەر مناڵێك ئەو مناڵە بمرێ.
**سیاه پوست:** ڕەش پێست، قولەڕەش، قولەڕەشە، کەسێ کە لە نەژادی ڕەش بێ.
**سیاه پوش:** 1) ڕەش پۆش، جلك ڕەش. 2) بریتی لە ئازیەتبار، تازیەبار.3) قەشە، کەشە.
**سیاهچادر:** ڕەشماڵ، ڕەشمار، سیاماڵ، خێوەتی ڕەش، تاوڵ، کۆن.
**سیاهچال:** شوێنی قووڵ و تەنگەبەر و تاریك، چاڵی ڕەش. بەندیخانە و شوێنی تاریك و تنۆك لە ژێر زەویدا.
**سیاهچرده/سیهچرده:** سەوزە، ڕەشتاڵ، ڕەشتاڵە، ڕەشکار، ڕەش ئەسمەر، سیاتاڵە، سیاتۆمە، سیاتۆوە، سیوالا، چەردە."**سیهچرده کوچك**": ڕەشکەڵە، ڕەشکەلە، ڕەشتاڵەی چکۆڵە.
**سیاهچشم:** 1) چاوڕەش، سیاچەم. 2) سوڕپەری، جوان چاك.
**سیاهخانه:** 1) بڕوانە:"سیاهچادر". 2) بریتی لە ماڵی شووم و بێ فەڕ. 3) بەندیخانە، گرتووخانە.
**سیاهدانه:** ڕەشکە، سیاوڵە/ تۆمێکی ڕەشە بەنانی دا دەکەن.
**سیاهدرون:** دەروون ڕەش، نیازپیس، بیرخراو.
**سیاهدست:** 1) دەست ڕەش، کەسێك کە خێری لە دەستی نابینن. 2) بریتی لە بەغیل، قڕنیس، سەقیل.
**سیاهدفتر:** گوناحکار، کەسێ کە نامەی

کرداری ڕەشە.

**سیاەدل:** 1) بەدگومان، دڵ پیس. 2) دڵ ڕەش، دڵڕەق، بێبەزەیی.

**سیاهرگ:** خوێن هێن.

**سیاەرو:** کەسێك کە دەمووچاوی ڕەش بێ. بریتی لە گوناحکار، فەدیکار، شەرمەزار، رووڕەش.

**سیاەروز:** بڕوانە: "سیەروز".

**سیاەزخم:** تیراوێ، بریناڕەش.

**سیاەسرفە:** کۆکە/ قۆزە ڕەشە.

**سیاەسال:** ڕەشەساڵ، وشکەساڵ.

**سیاەشدن:** 1) ڕەشبوون، بەڕەنگی ڕەش دەرهاتن. 2) تووشی گوناح بوون، گوناحکاربوون. 3) لەبەرچاوکەوتن، لەبەرچاوڕەش بوون. 4) فریوخواردن و کەوتنە بەر گاڵتەی خەڵکی.

**سیاەفام/سیەفام:** ڕەش باڤ، ڕەش باو، رەش تاڵە، ئاماڵ رەش، ڕەش تاڵە، ڕەش ئەسمەر، ڕەش هەڵگەڕاو، سیوالا، تێڵە، تاڵە، تەحلك.

**سیاهك:** کوێروو، کوێرك، کوێرەك، کۆروو، بەڵای ڕەشی گەنم.

**سیاهکار/سیەکار:** بریتی لە بەدکار، بەدکردارگوناهکار، زاڵم، ستەمکار.

**سیاەکاسە/سیەکاسە:** بریتی لە پیسکە، قڕنیس، چرووك.

**سیاهگر:** بڕوانە: "سیاهکار".

**سیاەگلیم/سیەگلیم:** بریتی لە چارەڕەش، بەدبەخت، کلۆڵ، ڕەش و ڕووت.

**سیاەگون:** بڕوانە: "سیاەفام".

**سیاەمست:** ڕەشەمەست، فرەمەست.

**سیاەنامە:** بریتی لە گوناحکار، بەدکار، سۆتە.

**سیاهە:** سیایی، فاکتۆر، سووڕەت، نووسینی حەساو و ناو لە قاقەز، لیستە.

**سیاهی:** 1) ڕەشی، ڕەشاتی، ڕەشایەتی، تاریکی/ تاریکایی، دژی چەرمگی. 2) تارمایی، سامۆرتك. "**سیاهی‌بەسیاهی کسی رفتن(آمدن)**": بەدوای ئەوەوە بوون، وەشوێن ئەو کەوتن، دەگەڵ سێبەری ئەوچوون. "**سیاهی زدن**": بەڕەنگی ڕەش هاتنە بەرچاو. "**سیاهی کردن**": 1) تووشی کاری ناحەزبوون بۆوێنە تێکدانی ژیان و کاری کەسێك. 2) تاریکی کردن. 3) بوونە هۆی ئێش و ڕەنج.

**سیّیء:** درێو، ناحەز و خراو، ناپەسند.

**سیبل:** ئاماژ، نیشانە، کێلك، ئامانج بۆ تیر و بەرەقانی.

**سیبەآرایی:** بڕوانە: "سنگربندی".

**سیبەکردن:** خەندەك دروست کردن. کردنی کەسێ یان شتێ بەپارێزەرو و پەناگای خۆ.

**سیتو:** ڕێکخراوی پەیمانی ئاسیای باشووری خۆرهەڵات کە لە ساڵی 1954ی زایینی لە نێوان ئەمریکا و وڵاتانی غەیرەکومۆنیستی ئەو مەڵبەندە بەسترا.

**سیتواسیون:** دۆخ، بارودۆخ، حاڵەت.

**سیتولوژی:** (پزیشکی) خانەزانی، بەشێك لە زیندەوەرزانی کە سەبارەت بە خانە(سلول) توێژینەوە دەکا.

**سیج:** 1) مەینەت، چەرمەسەری، کوێرەوەری، دژواری. 2) مەترسی، خەتەر.

**سیجگاه:** قەیران، تەنگەژە.

**سیج گیر:** قومارکەر(لەماملەدا).

**سیجمند:** دەردبار، دەردەدار، مەینەتبار.

**سیجناك:** مەترسیدار، بەهاتونەهات.

**سیچیدن:** ئامادەکردن، سازکردن، تەکووز و ڕێکوپێك کردن.

**سیخول:** تەسپۆك، سیخوڕ.

**سیخونك زدن:** تێوەژان، تێوەژاندن، تێوەژەندن، نەقیزەلێدان، نەقیزەکوتان، نەقیزەتیڕۆکردن، کوایش.

**سیر:** (سَ) 1) ڕۆیشتن و گەڕان، بە ڕێداچوون. 2) موتالا و تاوتوێ. 3) گەڕان، ڕەوت. "**سیرباطن**": تێفکرین و تێڕامان. "**سیرکردن**": 1) گەڕان، بەسەفەرچوون. 2) ڕاگوێزران، جووڵان. 3) خولخواردنەوە لە جیهانی فیکر و خەیاڵ دا. 4) تاوتوێوموتالاکردن. دیتن، سەیرکردن. "**سیروسلوك**": 1) جووڵان و پێوانی مەودایەك. 2) بڕینی قۆناغەکانی سۆفیگەرێتی بۆ نزیك بوونەوە لە خودا. "**سیروسیاحت**": گەڕان و سەیران کردن لە شوێنە جۆراوجۆرەکان دا.

**سیر:** (سِ) 1) زك تێر، تەسەل، دژی برسی. 2) بێزار، وەڕەز. 3) تۆخ(سبز سیر). 4) بێنیاز بەتایبەتی لە بواری ماڵییەوە. "**سیر شدن**": 1) تەسەل بوون، تێر بوون، تێرخواردن، لە برسێتی ڕزگاربوون، نەمانی برسیاتی. 2) تێرئاوبوون. 3) بێ مەیل یان بێزاربوون. بێ نیازبوون. 4) بڕوانە: "ارضاشدن".

**سیرآب:** 1) تێراو، پڕئاو، سەوزە و دەغڵی نەتینوو. 2) تازە، بەتەڕوبڕی. 3) بەتەواوی بەهرەمەند لە شتێ. "**سیرآب شدن**": 1) تێراوبوون، سەقاهەڵگرتن. 2) بەتەواوی بەهرەمەندبوون. "**سیرآب کردن**": 1) تێراوکردن. 2) ئاوداشتن.

**سیرآبی:** تێراوی، تورت و تێراوی، گەش و شەق و لە سیسی بەدوور.

**سیراگر:** تێرکەر، پڕکەر، لێوڕێژکەر.

**سیراندن:** ڕازیکردن، قەناعەت پێکردن.

**سیرت:** 1) ڕەوشت، خوو و ڕەوشت، نەریت، ئاکار. 2) شێوە، شێواز. 3) ڕێباز، شێوازی تێفکرین و تێڕوانینی فەلسەفی.

**سیرخواب:** تێرخەو.

**سیرگاه:** شوێنی گەڕان و سەیران.

**سیره:** 1) شێوەی هەڵسوکەوت، خوو و ڕەوشت. 2) شێوە. 3) ژیان نامەنووسی.

**سیری ناپذیر:** تێرنەخۆر، چاوبرسی، ڕژد، تەماکار.

**سیری:** 1) تێری. 2) دڵ نەبردن و بێزاری. 3) بێ نیازی.

**سیس:** ئەسپی خۆشبەز، خۆشڕەو.

**سیستم:** 1) شێواز، شێوه، ڕێسا، ڕەواڵ. 2) تۆڕ، پێکهاتە. 3) تەکووزی، ڕێکوپێکی. 4) سیستم، کۆئەندام (سیستم اعصاب).

**سیستم آنالیست:** شیکارگەر/ڕاڤیاری سیستم.

**سیستماتیزەکردن:** تەکووز و ڕێکوپێک کردن، شێوازمەندکردن، بەسیستم کردن.

**سیستماتیك:** تەکووز، ڕێکوپێك، ڕێکخراو، لە ڕووی حەساو و کتێبەوە، شێوازمەند، خاوەنی پێکهاتە و سیستم.

**سیستن:** بڕوانە:"جهیدن".

**سیستول:** (پزیشکی) کرژە.

**سیسموگراف:** دەزگای بوومەلەرزە پێو.

**سیسمولوژی:** زانست سەبارەت بە بوومەلەرزە و جووڵەکانی گۆی زەوی.

**سیطرە:** 1) زاڵبوون، دەست بە سەردا ڕۆیشتن، باڵادەست بوون، سەرکەوتن، خستنە ژێر ڕکێف. 2) باڵادەستی، زاڵێتی.

**سیغ:** چاك، باش، جوان.

**سیفون:** هەڵمژەك.

**سیفە:** دووری، مەودا.

**سیکل:** 1) دەور، دەورە، خول، گەڕان. 2) پۆلی سێهەمی ناوەندی.

**سیل:** بڕوانە: "سیلاب".

**سیگار:** جگەرە، جغارە. "**سیگارآتش زدن**": جگەرە هەڵکردن، جگەرەداگیرساندن، جگەرەپێکردن. "**سیگارپیچیدن**": جگەرە پێچانەوە. "**سیگاردودکردن**": جگەرەکێشان. "**سیگارکشیدن**": 1) جگەرەکێشان. 2) هاونوێن بوون دەگەڵ سۆزانی. "**سیگارگیراندن**": جگەرە هەڵکردن، جگەرەپێکردن.

**سیگاری:** 1) جگەرەخۆر، جگەرەکێش، جغارەخۆر. 2) جگەرەفرۆش.

**سیلاب:** بەش، "سیلاب".

**سیلاب:** (سَ) سێڵاو، لافاو، لاپاو، لاو، لاخێز، لاسامە، لالاڤ، لەهی، لەی، لی، لێ، لێیە، لێسەر، لێمشت، لووشاو، شیپ.

**سیلابگیر:** سێڵاوگر.

**سیلان:** 1) ڕەوان بوونی ئاو یان خوێن یان هەر تراوێکی دی. 2) سووزەنەك، گۆنۆریا.

**سیل خیز:** شوێنێ کە سێڵاو لەوێوە هەڵدەستێ، زەوی‌یەك کە زیاتر لە شوێنەکانی‌تر سێڵاو بیگرێتەوە.

**سیل زدە:** سێڵاولێدراو، وەبەرسێڵاوکەوتو.

**سیلگاه:** شوێنی سێڵاو، سێڵاوگر.

**سیلە:** ڕەوە، ڕەوکە.

**سیلی:** زللە، زیللە، شەپلاغە، شەپلاخە، شەپازللە، شەقەزللە، شرماپ، شرن، سەترە، لامات.

**سیم آگین:** پڕ لە زێو، تەواو سپی بە ڕەنگی زێو، زێوئەندام.

**سیما:** ڕۆما، سەروسەکوت، سۆکوم، سکوم، ڕەنگ و ڕوو، ڕواڵەت، ڕوخسار، دەم و چاو، دم و چاو، بیچم، ڕوومەت، دیمەن، چار، چارە. "**صدا و سیما**": تەلەویزیۆن.





**سیماب:** جیوە. "**سیماب درگوش ریختن**": کەڕکردن. "**سیماب کشتە**": جیوەی پوختەنەکراو.

**سیماب آتشین:** بریتی لە خۆر.

**سیماب گون:** ئامالْ زێو، بە ڕەنگی زێو.

**سیمابکاری:** دڵەکوتێ و لەرزە.

**سیم اندام:** کەسێ کە لەشی وەك زێو سپی‌یە.

**سیم اندود:** ئاوەزێو، رووکێشی زێو/زێوین، زێو تێ ساویاو، زێوکفت.

**سیمبر:** بڕوانە:"سیم اندام".

**سیمتن:** بڕوانە:"سیمبر".

**سیم کشتن:** پارەخەرج کردن، هەڵەخەرجی کردن.

**سیم کشیدن:** 1) سیم کەشیکردن. 2) ماسین و چلك کردنی برین بە هۆی سەرماوە.

**سیمگر:** کەسێك کە لە زێو ساز دەکا.

**سیمگون:** بەڕەنگی زێو/زیڤ.

**سیمەسار:** سەرلێشێواو، سەرگەردان و وڕ.

**سیمیا:** 1) نیشان، نیشانە. 2) شادمانی، جوانی و گەشی.

**سیمین:** زێوین، چێکراو لە زێو، لە ڕەنگی زێو، وەك زێو، هەر شتێ کە لە زێو ساز کرابێ، سیمەن، سینەم. سپی و بەدرەوشاوە.

**سیمین بدن:** بڕوانە:"سیمبر".

**سیمین عذار:** جوان چاك، خوشیك، گەلەك سپەهی.

**سینا پس:** لێك ئاڵان.

**سینجر:** سکلْ، پەرەنگ، ئاورنگ، پزیسك، پڕیشکەی ئاگر.

**سین جیم:** پرسیار و وڵام، لێپرسینەوە، وەقسەخستن.

**سینکرون:** گونجان و هاوکات کردنی دەنگ و وێنە لە فیلم دا.

**سینما:** 1) سینەما، کورتکراوەی وشەی "سینەماتۆگراف". 2) هونەری نواندنی وێنەکان و دیمەنەکان و کەسەکان و تەنەکان و جووڵەی ئەکتەرەکان کە دەخرێتە سەر فیلم و لەسەر پەردە نیشان دەدرێ.

**سینماتیك:** زانستی جووڵەکان، جووڵەناسی، بەشێك لە میکانیك کە باس لە گۆڕانی تەنەکان بەپێی کات دەکا.

**سینماگر:** ئەوەی خەریکی کاری سینەمایی‌یە بەتایبەتی دەرهێنەر.

**سینمارو:** هۆگر بە دیتنی فیلم لە سینەمادا.

**سینە:** 1) سنگ، سینگ. 2) گوان. 3) سی، سیپەلاك. 4) زەین، بیرگە. 5) شوێنی سۆز و بیرەوەری‌یەکان، دلْ. 6) پانتایی، مەیدان. "**سینەبەسینە**":

بەشێوەی زارەکی، زاربەزار. ڕووبەڕوو. "**سینەبەسینەشدن**": ڕووبەڕووبوونەوە. "**سینە پیش دادن**": سینگ هێنانەپێش. "**سینەدادن**": سنگ دان، هاتنەپێشی دیوار یان میچ. "**سینەسپرکردن**": ئامادەی لەخۆبوردوویی و بەربەرەکانیبوون، سینگ کردنە قەڵغان. "**سینەسپر کردن برای کسی( چیزی )**": بەتوندی بەرگریلێکردن. "**سینەکردن**": کۆکردنەوە و وەبەرخۆدانی گروپێك بۆ بردنیان بۆ شوێنێکیتر. بەهەوڵ و زەحمەت پێوانی جێگەیەك. شانازی کردن. "**سینەکشیدن**": وەجووڵەکەوتن و هاتنەپێش.

**سینە پهلو:** سینەپاڵوو، ژان و برك لە سەرماوە، ماسینی سیيەکان، ڕەقێتە.

**سینەچاك:** بریتی لە ڕەنجاو، دڵشکاو، مەلوول، ماتەمین، خەمباری خۆشەویست مردوو، ئەویندارى دڵسووتاو.

**سینەدار:** 1) خاوەنی سینگی پان و قوت. 2) پان، بەرین. 3) ئەوەی سینگی خاڵی پێوەیە.

**سینەدرد:** ژانی سینگ.

**سینەریش:** دڵشکاو، دڵتەنگ، دڵڕەنجاو.

**سینەزنی:** لخۆدان ، تلّپ، سنگ کوتان، سنگ قوتان، بە چەپۆك سنگ و سەر کوتان.

**سینەسوز:** خەم و کەسەری سەخت کە دڵ زیز و مەلوول بکا، کزە لە دڵەوە هێن.

**سینەکردن:** بە سینگ پاڵنان، خستنەپێش خۆ و پاڵ پێوەنان.

**سینەکش:** سینەکێش، دەستەوهەوراز، ئاماڵ هەوراز.

**سینەکش آفتاب:** شوێنی ڕوو بە خۆر، ڕوو بە ڕۆژ، بەڕبەڕۆچك، بەڕۆچك.

**سینەکفتری:** خاوەنی سینگی پان و قوت. بە ڕەنگی بنەوشی تۆخی مەیلەو تەلّایی.

**سیورسات:** سوورسات، سولوسات، ڕزق و بژیوی لەشکر کە لە ڕەعیەتانی دەستێنن، خۆراك، تێشو.

**سیویل:** شاری، نافەرمی، خەڵکی ئاسایی.

**سیەجگر:** خەمبار، خەمناك.

**سیەخرمن:** خەلەوخەرمان سووتاو، بەدبەخت.

**سیەروز:** دێران، بەدبەخت، نەگبەت، ڕۆژڕەش، بەخت ڕەش، چارەڕەش، هەش بەسەر، سیاڕۆ، لێقەوماو، کۆست کەوتە.

**سیەروزی:** کولەمەرگی، کوێرەوەری، ڕۆژڕەشی، بەدبەختی، چارەڕەشی، نەگبەتی، لێقەوماوی.

**سیەطالع:** بەدبەخت، ڕۆژڕەش.

**سیەگر:** پێکهێنەری ڕەشی و تاریکی. فێلەباز و ستەمکار.

**سیەنام:** ناوزڕاو، بەدناو.

**سیهە:** سۆزانی، ژنی بەدکار.

**سی یك:** یەك بەش لە سی بەشی شتێك، یەك لەسەر سی.

# ش

**شائبە:** 1) گومان. 2) کەموکورتی، خەوش.
**شائق:** کەسیٚ خەڵك تامەزرۆی دیتنیین.
**شائك:** دڕکین، چقڵاوی.
**شاباش:** 1) دڵخۆش بی، هەر بژی. 2) شاباش، بەخشش بە بەزمگێڕی زەماوەند.
**شات وشوت:** هارتوهورت، هاشوهووش، هاتوهاوار، ئیددیعای پووچ.
**شاجب:** بڕوانە: "اندوهگین".
**شاخ:** 1) شاخ، زەقی ڕەقی ئاژەڵ. 2) لکی دار. 3) بەش، پار. 4) لەت، پرتك، تیکە. 5) منداڵ، نەسڵ. "**شاخ انداختن**": بڕوانە: "حجامت کردن". "**شاخ بر شاخ**": جۆراوجۆر. "**شاخ بر شاخ زدن**": شەڕکردن. "**شاخ بە شاخ شدن**": تێگیراندنی دوو شاخ لە یەکتر، شەڕەشۆق، شەڕەشاخ، قۆچ قۆچانی. تێك گیران، شاخ بە شاخ بوون. شەڕکردن. "**شاخ درآوردن**": بریتی لە سەرسووڕمان یان واق وڕمان لە دیتنی شتیٚ یان بیستنی قسەی سەیروسەمەرە. "**شاخ در شاخ**": لێك ئاڵاو. جۆراوجۆر. "**شاخ زدن**": 1) چڵ/لق دەرکردنی دار، ڕوان. 2) کەللەلێدانی ئاژەڵی شاخدار لە کەسیٚ یان ئاژەڵێکی تر، بەشاخ لێدان، قۆچدان، قۆچ تێهەڵدان، قۆچ لێدان، قۆچ وەشاندن، قۆچ هاویشتن. "**شاخ زن**": قۆچ وەشێن، قۆچ هاوێژ، سەروەشێن، شاخداریٚ کە بە شاخ لە خەڵك هەڵدەدا. "**شاخ شاخ**": 1) پچڕپچڕ، ڕیشاڵ ڕیشال. 2) پارچەپارچە، کەرت کەرت. 3) بڵاو، پەرتەوازە. 4) لك لك. "**شاخ شدن**": بەشکڵی شاخ دەرهاتن. بوونە کۆسپ یان مایەی ژانەسەر. "**شاخ شمشاد**": کوڕی باڵابەرز و بەژن ڕێك. "**شاخ غول (دیو) را شکستن**": ئەنجامدانی کاری گرینگ و دژوار. "**شاخ کردن**": ڕوانی لك. "**شاخ کسی را شکستن**": بەزاندن یان تەمبیٚکردنی ئەو. "**شاخ و برگ**": 1) لق و گەڵای دار. 2) بریتی لەو شتانەی کە بە چیرۆك و قسە زیاد دەکریٚ. "**شاخ و برگ دادن/ شاخ و برگ ساختن**": بە تێروتەسەلی گێڕانەوەی قسە یان چیرۆك یان ڕووداوێك و زیادکردنی شت گەلێك بە دەقی ئەو بابەتانە. "**شاخ (و) شانە کشیدن**": هەڕەشەکردن.
**شاخابە:** 1) هاتنەپێشی کەمی ئاوی دەریا و گۆل و ڕووبار لە لێواردا. 2) کەنداو.





**شاخچەبستن:** تۆمەت لێدان، قسەهەڵبەستن.
**شاخص:** 1) سەماك، تیرەگە. 2) شاز، بژاردە، هەڵبژاردە و جیاکراوە، هەرەچاك، دانسقە، سەرتۆپ، کەم وێنە. 3) چاوێك کە مژۆڵ/ برژانگی لیٚ نەدا. 4) پێوەر. 5) نیشانە. 6) نموونە، سەرچەشن. 7) دیار، بەرچاو.
**شاخور:** 1 ) شاخدار، ئاژەڵیٚ کە شاخی هەیە. 2) پڕ لق و چڵ.
**شاخە:** 1) حاچە، بەش، لق، لك، چڵ. 2) دەسك (شاخەعینك). 3) یەکەی بژاردنی تیراسن و نەبات و سیم.
**شاخی:** 1) چێکراو لە شاخ. 2) شەنەی دار.
**شاخین:** بڕوانە: "شاخور".
**شاد:** گەش، بەکەیف، دڵخۆش، دەماخ چاخ، گەوز، شا، شاد.
**شاداب:** 1) بەگەشەوتێراو، گەش و شلك، گەوش، تورت وتێراو، شەق و تورت و بەکەیف، بەکەیف و زەوق، نازاو، نازاڤ، پاراو، بسکوڕی، گەوز. 2) ئاوەدان و بەبرەو.
**شادابی:** بەگەشەیی و تێراوی، گەشی و شلکی، تەڕوتازەیی، پاراوی، شۆق.
**شادان:** دڵخۆش، شاد، خۆشحاڵ، شادمان.
**شادباش:** 1) پیرۆزبایی. 2) خۆش بی، هەر بژی.
**شادبهر:** کەسێك کە لە شادی و خۆشی‌یەکانی دنیا بەهرەی زۆر دەبا، خۆشحاڵ.
**شادخ:** 1) منداڵ. 2) لاو. 3) ورد و ناسك و تەڕ و تازە.
**شادخو:** شادمان، خۆشحاڵ، دڵخۆش.
**شادخواب:** خەوی شیرین، خەوی خۆش.
**شادخوار/خوارە:** 1) شادمان، خۆشحاڵ، خۆش ڕابوێر. 2) شەڕابخۆر، مەیخۆر.
**شادخواری:** 1) شادی، خۆش ڕابوێری. 2) مەیخۆری.
**شادراز:** قوتابی باڵابەرز.
**شادروان:** 1) خوالێخۆشبوو، کۆچکردوو. 2) شاد، خۆشحاڵ.
**شادروز:** خۆشبەخت، بەختەوەر.
**شادزیستن:** بە شادی و دڵخۆشی ژیان.
**شادشدن:** دڵکرانەوە، گەشەکردن، کەیف خۆش بوون، کەیف سازبوون، گەشانەوە، گەشیان، گەشیانەوە، گەشینەوە، شابوون، شادبوون.
**شادکار/شادگار:** شادمان، خۆشحاڵ، ڕازی.
**شادکام:** خۆشبەخت و خۆشحاڵ، شاد و بەختەوەر. "**شادکامی**": خۆشحاڵی و بەختەوەری.
**شادمان:** دڵخۆش، خۆشحاڵ، شا، شاد.
**شادمانی:** دڵخۆشی، خۆشحاڵی، خۆشی و شادی، شادمانی، شاوانی، شاهینە.
**شادمند:** دڵخۆش، خۆشحاڵ.
**شادناك:** شادمان، خۆشحاڵ، بەرامبەری خەمناك.

**شادورد:** 1) خەرمانەی مانگ. 2) تەختی پاشایان.

**شادوشنگول:** کەیف ساز، تەڕدەماخ، دەماخ تەخت.

**شادی:** دڵخۆشی، خۆشحاڵی، بەکەیفی، بەدەماخی، شادی.

**شادی آور:** دڵخۆشکەرە، دلڤەکەر، دڵ گوشا، شتێ کە دڵ خۆش دەکا.

**شادیانە:** 1) لە ڕووی شادی و خۆشحاڵییەوە. 2) جێژنێ کە لە شادی و خۆشی بیگرن. 3) مزگێنی.

**شادی بخش:** شادی هێن.

**شادیفزا:** زۆرکەری شادی و خۆشحاڵی.

**شادیگستر:** ئەوەی ببێتە هۆی شادی و خۆشحاڵی هەموان.

**شادی مرگ:** شادەمەرگ بوون، مەرگ بە هۆی شاگەشکە بوون، کەسێ کە بە هۆی خۆشحاڵی زۆر لە پڕایەکی بمرێ.

**شاذ:** تاکوتەرا، تاقانە، دەگمەن، دانسقە، ناوازە، کەم وێنە، کەس نەدار، بێهاوتا.

**شارب:** بڕوانە:"نوشندە".

**شاربن:** تیراوێ، برینارەش.

**شارت و شورت:** بڕوانە:"شات وشوت".

**شارح:** ڕاڤەکار، ڕاڤەوان، شیکەرەوە، لێکدەرەوە.

**شارد:** ڕەویو، هەڵاتوو، سەرکێش، نافەرمان.

**شارژ:** 1) بار، قورسایی کار.2)ماڵیات. 3) نوێنەرایەتی. 4) پۆست، پلەوپایە. 5) ڕادەی کارەبای پاشەکەوت کراوی دەزگایەکی ئێلێکتریکی، شارژ. 6) سەرحاڵ، بەکەیف و زەوق.

**شارع:** 1) دۆزەرەوەی ڕێگە، ڕێنوێن، خاوەن شەرع. 2) هێنەری ئایین، دانەری شەریعەت. 3) شەقامی سەرەکی. "**شارع مقدّس**": پێغەمبەری ئیسلام. "**شارع عام**": ڕێگە و کۆڵانێ گشت کەس پێیاڕابرن.

**شارق:** دەرخەر، ئاشکراکەر. "**شارق شدن**": دەرکەوتن، هەڵاتن، هاتنەبەرچاو.

**شارگانی/شارگی:** بڕوانە:"روانگری".

**شارلاتان:** قەلاش، کەڵەش، قۆڵچماغ، خاوەئەستێن، شەلاتی، سەرسەری، بێ ئاکار، تەوەل، چەقاوەسوو، یارمباز، هاڵۆز، بێ شەرم و بەچەقە و شلّتاغ.

**شاریدن:** بڕوانە:"شریدن".

**شاسّ:** کز، لاواز، وشك.

**شاسع:** 1) دوور. 2) کەسێ کە لە شار و زێدی خۆی دوور بێ، زۆر دوورەك.

**شاش ارمنی:** بریتی لە خواردنەوەی ئاڵکۆلی.

**شاش بند:** میزگیران، نەخۆشی میز بۆ نەکران.

**شاشدن:** بڕوانە:"شاشیدن".

**شاشو:** مناڵێ کە بێئیختیار میز بە خۆیدابکا و جلەکانی خۆی تەڕ بکا، ئەوەی لە خەو دا میز بەخۆیدا بکا، میزن، مێزن.





**شاشیدن:** میزکردن، مێزکردن، گمێزکردن. "**شاشیدن به (توی) چیزی**": زایە و خراپ بوون. "**به خود شاشیدن**": بریتی لە زۆر ترسان و خۆدۆڕاندن، لە ترسان میزکردن بەخۆدا.

**شاطر:** 1) نەترس، بوێر، ئازا. 2) زیرەك، بیرتیژ. 3) چالاك، فرز. 4) شاتر، نانکەر.

**شاطی:** لێوار، قەراغ، ڕۆخ.

**شاعر:** 1) وێژەوان، هەستیار، هۆزان، هۆزانڤان، هەڵبەست، هەڵبەس وان، بوێژ، نەوشەکار، شاعیر، شایەر. 2) ئاگادار، بەئاگا.

**شاعر ارتجالی:** خۆوێژ، شاعیرێ کە بەبێ بیرکردنەوە شێعر دەڵێ، شایەر.

**شاعرانە:** 1) بە شێوازی هۆزانڤانان، وەك شاعیران، شاعیرانە. 2) بەهەست، ناسك.

**شاعرە:** ژنەشاعیر، شاعیری ژن.

**شاعی:** شێعە. پێڕەو.

**شاغل:** 1) کار و پیشەیەك کە کەسێك پێوەی خەریك بێ. 2) بەرگێڕەوە، بەربەست.

**شافع:** تکاکار، پارێڕەوە، ڕجاکەر، خوایشتکەر.

**شافی:** 1) تەواو، دروست، ورد. 2) خۆشکەرەوە، چاککەرەوە. 3) ڕازیکەر. "**جواب شافی**": وڵامی بەبڕشت کە کۆتایی بە گفتوگۆ بێنێ.

**شافیدن:** کەوتن، خلیسکان.

**شاقّ:** دژوار، سەخت، قورس.

**شاقّة:** مێینەی"شاقّ"، سەخت و دژوار. "**اعمال شاقه**": کاری تاقەت پڕوکێن، کاری دژوار.

**شاكّ:** گومانکەر. "**شاك شدن**": گومان کردن.

**شاکار:** کاری بێ مووچە.

**شاکر:** شوکرانەبژێر، شوکرخواز، سپاسکار.

**شاکری:** خزمەتکار، خزمەتگوزار.

**شاکی:** 1) سکاڵاکەر، دادبەر، گلیکار، شکایەتکەر. 2) تووڕە، قەڵس، ناڕەحەت، ناڕازی.

**شاکی السلاح:** پیاوی پڕچەك و بە شان و شکۆ.

**شاگرد:** قوتابی(شاگرد مدرسە)، بەرەوەستا، بەردەستی وەستا، سیار، شاگرد.

**شاگردانگی:** شاگردانە، بەخششی بەرەوەستا.

**شاگردانە:** 1) وەك قوتابییان، بەرەوەستائاسایانە. 2) شاگردانە.

**شالدە:** بڕوانە: "شالودە".

**شالودە:** بن، بێخ، بنج، بناغە، بنەما، بنەڕەت، خیم. پلان و نەخشە. "**شالودەریختن**": بناغەداڕشتن، بنیات نان. "**شالودەشکنی**": بنەماشکێنی.

**شالهنگ:** 1) سەرکێش، سەربزێو، یاغی. 2) گریو، بارمتە. 3) مەکر، فێڵ.

**شالی پایە:** بڕوانە:"شالیزار".

**شالیزار:** مەرەزە، چەڵتووك جاڕ، برنجاڕ، برنجەجاڕ، قەرە، کێڵگەی برنج، زەوییەك کە برنجی تێدا بچێنن. "**نگهبان شالیزار**": مەرەزەوان.

**شالیکار:** گۆخڵ، جۆدان، وەڕاز، چەڵتووك چێن.

**شالیکوب:** پادینگ، سندۆڵ. "**شالیکوبی**": کردەی جیاکردنەوەی برنج لە پێستەکەی، کرکردن.

**شام:** نانی شێوان، شێو، شیڤ.

**شامپیون:** قارەمان، پاڵەوان، براوەی کێبەرکێ، خەباتکار، داکۆکی کەر.

**شامخ:** بەرز، بڵیند.

**شامگاه:** وەختی شێوان، تەنگی نوێژی شێوان، دەمی چرا هەڵکران، چراکەران.

**شامل:** 1) داگر، لەخۆگر، تێدابوون، بریتی. 2) تەواو، کامڵ. "**شامل شدن**": لەخۆگرتن، گرتنەوە.

**شامّه:** (مَ) هەستی بۆن پێکردن، بۆنایی.

**شامه:** (مَ 1) لە زاراوەی فیزیۆلۆژیدا: لۆخ، ناوپەنچك. 2) دەسماڵ، ڕووسەری.

**شامیدن:** نۆشین، خواردنەوە.

**شانتاژ:** شانتاژ، مەکر، فرتوفێڵ، فێڵبازی، هەڕەشەکردن لە کەسێ بە درکاندنی نهێنییەکانی.

**شاندن/ شانیدن:** 1) داهێنان، شانەکردنی موو. 2) بڕوانە:"نشاندن".

**شانس:** شانس، بەخت، کابەشاك، تاڵە، تالح، هاتە، خواپێدان، سعوود، نگین. "**شانس آوردن**": بەخت هێنان، پێوەهاتن، بۆهاتن. "**خوش شانس**": خواپێداو، خواپێ ڕەوادیو، بەختەوەر، بەسعوود. "**بسته بە شانس**": هات و نەهات، هات و بات، هایبەخت، خۆوبەخت.

**شانسی:** خوابەختەکی، خۆوبەخت، دووبەختی، بەهەڵکەوت، ئاهی نەگرفتە.

**شانەبالااندازی:** کەمتەرخەمی، بەهێندنەگرتن، گوێپێنەدان.

**شانەبەشانە:** لە یەك ڕیزدا، لەتەنیشت یەك.

**شانەبین:** فاڵگر، فاڵچی، فالاوێژ بە ئێسقانی شانی مەڕ.

**شانەخالیکردن:** لەژێرکاردەرچوون، خۆدزینەوە لە کار.

**شانەدزدیدن:** بڕوانە:"شانەخالیکردن".

**شانەزدن(کردن):** داهێنان، سەرداهێنان، سەرداهاوردن، شانەکردنی موو.

**شاه:** شا، پاشا. "**شاهمردان**": نازناوی عەلی(د.خ).

**شاه انجم:** پاشای ئەستێرەکان. بریتی لە خۆر.

**شاهانە:** شایانە، شاهانە، وەك شایان، شیاوی شا. بەشکۆ.

**شاهبیت:** 1) شا کۆپلە، باشترین و پاراوترین کۆپلە لە کۆپلەکانی غەزەڵ یان قەسیدەیەك. 2) گرنگترین و سەرەکیترین کەس لەناو گروپێك دا.





**شاهپور:** بەچکە شا، شازادە.

**شاهد:** 1) شایەتحاڵ، شایەت، شادە، گۆڤا، گۆڤان، گۆڤاه، گەڤا، گەواه، ئاگادار لە ڕووداو. 2) مناڵ و پاشماوەکانی شەهید. 3) جوان چاك، سوورپەری. 4) دۆست، خۆشەویست، دلبەر. 5) بەرز، باش، دڵپەسند. 6) بڕوانە: "روسپی". 7) بەجوانی، بەباشی. "**شاهد عادل/شاهد معتمد**": شایەتحاڵی ڕاستبێژ و جێی متمانە.

**شاهد جان:** دۆست، خۆشەویست، دڵبەر، لەبەردڵ.

**شاهدارو:** 1) دەوای یەکاویەك، دەوایەك کە لە تەواوی دەواکانیتر باشتر و سوودمەندتر بێ. 2) بە مانای شەڕابیش هاتووە.

**شاهدباز:** ئەوەی کە دەگەڵ کوڕان و کچانی جوان ئاوێتە دەبێ.

**شاهدپرست:** گراوی/دڵبەرپەرست، ئەوەی کە دلبەرێکی جوانی زۆر خۆش دەوێ و دەیپەرستێ.

**شاهدخت:** کچەشا، خاتوو شازادە.

**شاهد روز:** بریتی لە خۆر.

**شاهدوش:** جوان، قەشەنگ، خشکۆك.

**شاهر:** 1) ناسراو، ناودار. 2) لە کالان دەرهاتو.

**شاهراه:** شاڕێ، شاڕێگە، جاددەڕێ، ڕێگەی پان و سەرەکی، چواردەڕێیان.

**شاهرگ:** تەمار، شادەمار، شاڕەگ، شاڕەهـ، شەڕەگ، ڕەگی مل، ڕەگی هەرە ئەستوور لە ئەندامی گیانداردا. "**شاهرگ درخت**": شاڕیشە، ڕەگی هەرە ئەستووری دار.

**شاهزادە:** شازادە، بەچکەشا.

**شاه زن:** شاژن، سەرتۆپی ژنان.

**شاهزنگ:** بریتی لە شەو، تاریکی شەو.

**شاهسوار/شهسوار:** 1) سواری چاك، سواری بێوێنە، شاسوار. 2) شوالیە. 3) کەسی زۆر بەرچاو و شاز.

**شاهسون:** لایەنگری شا، شادۆست.

**شاهفرد:** باشترین کۆپلەی شێعرێك.

**شاهفش:** وەك شا.

**شاهق:** بەرز، بڵیند، گەردنکەش.

**شاهکار:** شاکار، کاری زۆر باش.

**شاهگان:** سەربەشا، شایانە.

**شاهندن:** خۆپارێزیکردن، سەرڕاست و خۆپارێز بوون.

**شاهندە:** چاکەکار، ئاکارباش، خۆپارێز، سەرڕاست، باش و پیرۆز.

**شاهوار/ شهوار:** هەرشتێکی باش و گرانبایی، شتێ کە شیاوی شا بێ.

**شاهورد:** بڕوانە:"شایورد".

**شاهوش:** وەك شا، شائاسا.

**شاهیدن:** پاشایەتیکردن، سەروەریکردن. بە مانای خۆپاراستن و چاکەکاربوونیش دێ.

**شایان:** 1) لێوەشاوە، شایان، شیاو، وەشاو، پێشان، مەشیا، هێژا، شرژاو، پێکەوتوو، تاشیە، بابەت، حەل.2) زۆر، فراوان (استعداد شایان). "**شایان توجّه**": 1) شیاوی وردبوونەوە. 2) زۆر، فراوان. "**شایان ذکر**": شیاوی وتن.

**شایانی:** لێوەشانەوە، شیانی کارێك یان جلكێك بۆ كەسێك.

**شاید:** دنیایە، دەبێ، ڕەنگە، لەوانەیە، وێدەچێ.

**شایدی:** بڕوانە:"احتمالی".

**شایستگی:** شیاوی، وەشانەوە، وەشیانەوە، لێهاتوویی، ژێهاتوویی، هەژیاتی، هێژایی، لەبارابوون، لەتاقەت دا بوون، سەوچیان، ڕەوایی، ڕایە، ڕایەكەوتن، بافت(بافتی ئەم كارە نیە)، شایستەیی. **"شایستگی در خود دیدن":** لەخۆڕادین، لەخۆڕادیتن، لەخۆڕاپەڕموون، خۆ بە شیاوی كارێ زانین.

**شایستن:** 1) شیاوبوون، شایان بوون. 2) لوان، دەستدان.

**شایسته:** شیاو، شایان، لێوەشاوە، ژێهاتی، لێهاتوو، لێهاتگ، لێهاتی، بەركەتی، هەژی، مێژۆ، پەسند و لەبەر دڵ و چاو، ڕەجڵ، هێژا، سەوچ، وەرای، دەرخوارد، دەرخورد، ڕەوا. **"شایسته دانستن":** (بە) شایان زانین، تێڕادیوی، تێڕادیتن، ڕاپەڕموون.

**شایع:** 1) لەناوخەڵكدا بڵاو. 2) باو. 3) پەرەگرتو، پەرەسەندو. 4) ناودار، بەناوبانگ. 5) ئاشكرا، ڕوون.

**شایعات:** كۆی"شایعە".

**شایعه:** دەنگۆ، دەنگ داكەوتن، گۆتە، گۆتەگۆت، گوتۆ، قسەوقسەلۆك، بەندوباو، بەنگوباو، وتە، وتەوت، واتۆ، بیستراو، دەم هەڵبەس، لۆغەت، قاو، قال، لۆغەت، هەواڵێ كە دەناو حەشامات دا بڵاوبۆتەوە، دەنگوباسی ناو خەڵك.

**شایعه پراكنی:** قاوداخستن، دەنگۆ بڵاوكردنەوە، بڵاوكردنەوەی بەندوباو، زڕاندن.

**شایگان:** 1) شیاو، هێژا، بەنرخ، هەرشتێكی باش و گرانبایی، شیاوی پاشا. 2) كاری بەلاش و بەخۆڕایی.

**شایندگی:** بڕوانە:"شایستگی".

**شاینده:** ڕێتێچوو، گونجاو، شیاو.

**شاینده‌سالاری:** سەرگوڵ سالاری، سەرتا(نخبە)سالاری.

**شایندی:** بڕوانە:"شایدی".

**شایورد:** خرمانەی مانگ.

**شاییدن:** بڕوانە:"شایستن".

**شآمت:** 1) شووم و نگریس بوون، ناپیرۆزبوون، بێفەڕبوون. 2) نگریسی، بێ فەڕی، نەگبەت، بەدبەختی. 3) جنێودەر، دەم پیس.

**شأن:** 1) پلەوپایە، پلە و پۆستی كۆمەڵایەتی. 2) شكۆ، گەورەیی. 4) نرخ، گرینگی. 5) كاروبار، كار یان بابەتی گەورە و گرنگ. 6) ڕێسا، ئایین. **"شأن كسی اجل شدن(بودن)":** چوونەسەری پۆستی ئەو. **"در شأن شما نیست":** لە ئێوە ناوەشێتەوە.

**شئون:** كۆی"شأن"، كاروبارەكان.





**شب:** شەو، شەف، شەڤ. **"شب بخیر":** شەو خۆش. **"شب به شب":** هەر شەو. **"شب چله":** دوایین شەوی پاییز. **"شب چهل":** شەوی چلەم دوای مردنی كەسێك. ڕێوڕەسمێ كە بەو كەسەی دەگرن. **"شب دیجور":** شەوی زۆرتاریك، تاریكەسەلات، شەوی ئەنگوستەچاو. **"شب را روز(صبح) كردن":** شەوبەسەربردن، شەوتێپەڕاندن، شەو بە ڕۆژ گەیاندن. **"شب كسی روز بودن":** بەختەوەربوونی ئەو، خۆشبەخت بوونی ئەو. **"شب و روز كسی را یكی كردن":** ڕەنجاندن و ئازاردانی ئەو. **"شب همه شب":** سەرانسەری شەو، تەواوی شەو. **"شب یلدا":** 1) دوایین شەوی پاییز. 2) شەوی تاریك و درێژ.

**شباب:** 1) گەنجێتی، لاوێتی، لە باڵغ بوونەوە تا سی ساڵەیی. 2) سەرەتای هەر شتێ.

**شباخون:** بڕوانە:"شبیخون".

**شباروز:** بڕوانە:"شبانەروز".

**شباشب:** كاتی شەو، شەوانە.

**شب افروز:** 1) هەر شتێ كە لە شەو دا بریقە و ڕووناكی هەبێ، ڕووناك و بریقەدەر. 2) جوان چاك، سورپەری.

**شبان:** شوان، شڤان، ئاگاداری ئاژەڵ.

**شب اندر روز:** شەو وڕۆژ، هەر بیست و چوار دەمژمێری شەو و ڕۆژ.

**شبان فریب/ فریبك:** شڤان خاپێن، شڤانكوژ، شوان خاپێن، شوان خەڵەتین، شوان هەڵخەڵەتێنە.

**شبانگاه:** كاتی شەو. **"شبانگاهان":** شەوانە، بەشەو، شەوگار، سەرانسەری شەو.

**شبانه:** شەوانە، بەشەو، كاتی شەو، هەر شتێ كە لە شەو مابێتەوە. **"تب شبانه":** شەوتا، شەڤتا، شەفتا، تای شەوانە، نۆبەتێ لە شەودا. **"آبیاری شبانه":** شەودێر، شەودێری، شەواو، بە شەو ئاودانی زرعات.

**شبانەروز:** شەو و ڕۆژ، هەموو دەم بێ پسانەوە. بیست و چوار كاتژمێری تەواو.

**شبانی:** 1) ئەوەی كاتی شەو ڕوو دەدا. 2) شوانێتی، كاری شوان.

**شباهت:** وێچوون، لێچوون، لێچوویی، لەیەكچوون، لێكچوون، وێكچوون، چوونیەكی، وێچوویی، لێك كردن، هاوێنەیی، هاوشێوەیی، هاوتایی، دروب، دروڤ، شبان، تۆلانی، میناهی، میناكی، مینین، قام، بە دیمەن وەكوو یەك، مانایش، مەندش.

**شباهنگام:** شەوار، تەنگی نوێژی شێوان، كاتی شەو.

**شب باره:** كەسێ كە شەوی پێخۆشە. ژنی بەدكار و هەڵەگەڕ.

**شب بیدار:** شەونخوون، شەونشین، شەوبێدار، كەسێ كە بە شەو نەخەوێ.

**شب پوی:** شەوڕۆ، كەسێ كە بە شەو بەڕێدا دەڕوا.

**شب پیما:** کەسێ کە لە شەو دا ڕێ ببڕێ. ئەوەی کە شەوگار بەبێ خەوی و بێ ئۆقرەیی تێپەڕێنێ، شەونخوون.

**شب تاز:** چەپخوون، پەلاماری شەوانە، هەڵکوتانی کتوپڕ بۆ سەر دوژمن لە شەودا.

**شب چره:** شەوچەرە، شەوچەلە، خواردنێ کە لە شەوبێری دەخورێ.

**شبح:** تارمایی، سامۆتك، سەهویر، سێتاڤ، سەهنە، سوێس، سای، ڕەشکەوپێشکە، ڕەشایی لەدوورەوە، ڕەشایی بەر دیمەن، شتی خەیاڵی بە بەرچاو داهاتن، قەرە، قەرەنتو، قەراتە، دێم جامە، تاپۆ، شەودێز.

**شب خوش:** شەوباش.

**شبخون:** بڕوانە:"شبیخون".

**شب خیز:** 1) شەوبێدار، شەونخوون، ئەوەی کە بۆ پەرستن لە خەو هەستێ. 2) بەرەبەیان، شەوەکی.

**شبدیز:** بە ڕەنگی شەو، وەك شەو، شەو ئاسا. تاریك و نوتەك.

**شبرنگ:** ڕەش، لێڵ و تاریك وەك شەو.

**شبرو:** شەورۆ، شەوڕەو، شەڤرۆ، کەسێ بە شەو بەڕێدا دەڕوا. بە مانای "دز و ڕێگر و هەساس" یش هاتووە. "شبروی": شەوگەڕی، ڕێگەڕۆیشتن لە شەودا، ڕێتار.

**شب زندەدار:** شەونخوون، شەوبێدار، شەونشین، کەسێك کە شەو تا بەیانی نەخەوێ و بەخەبەر بێ.

**شب زندەداری:** 1) بەخەبەربوون لە شەودا، شەونخوونی.2) سەیران و ڕابواردن کاتی شەو.

**شبست:** بەسام، ترسناك.

**شبشت:** ناحەز، ناشیرین.

**شب شماری:** چاوەڕوانی لە درێژایی شەودا.

**شب شمر:** چاوەڕوان، چاوەڕێ.

**شبع:** تێربوون، تێری.

**شبعان:** تێر.

**شبق:** تامەزرۆیی بۆ گان، بەکەڵ، بەئالۆش.

**شبك:** کۆی"شبکە".

**شبکار:** شەوکار، کاری شەوانە، شەڤکری، کرێکارێ کە لە شەو دا ئیش بکا.

**شب کور:** 1) شەوکوێر، شەوکوور، شەوکۆرە، شەڤکۆر، ترتەمیس، کەسێ کە بە شەو نابینێ.2) شەمشەمەکوێرە.

**شب کوری:** شەوکوێری، شەوکۆری، نەخۆشی بەشەو نەدیتن.

**شبکە:** 1) تۆڕ. 2) داو. 3) کاناڵ، ڕایەڵکە، چەند دامەزراوە یان دەزگای پێکەوەگرێدراو. 4) هەرشتێکی کون کون. شبکیە: تۆڕە، تۆڕی چاو. چینی تۆڕە.

**شبگاە:** 1) کاتی شەو، بەشەو. 2) پەرچە، هەوێز، شوێنی مانەوەی مەڕ لە کاتی شەودا.

**شب گذرانی:** تێپەڕاندنی شەو، شەو بەسەر بردن. سەیران و ڕابواردن لە شەودا.





**شبگرد:** چەرخەچی، شەوگەڕ، شەوگەرد، شەڤگەڕ، شەڤگێڕ. پاسەوانی شەو، ئێشکچی شەوانە. دز.

**شبگردی:** گەڕان لە شەودا، شەوگەڕی، پاسەوانی لە شەودا.

**شبگون:** ڕەش، لێڵ، بەڕەنگی شەو.

**شبگیر:** بەرەبەیان، بەیانەکی، جووڵان لە دوای نیوەی شەو و کاتی بەرەبەیان لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی تر.

**شب ماندە:** شەومەن، شەومەنە، شەومەندە، شەوی، شەژی، بەرماوەی شەو.

**شب نامە:** شەونامە، هەر نووسراوەیەك کە بەشەو و بەنهێنی لە ناو خەڵکدا بڵاوبکرێتەوە.

**شب نشینی:** شەونشینی، شەڤهەری، شەڤرۆنك، شەوبێری، ئالایش، شەو لە دەوری یەك کۆبوونەوەی دۆست و خێزان.

**شبنم:** خۆ، خوناو، خناڤ، خناف، شەڤنم، شەڤنەم، شەونم، ئاونگ، قەراو.

**شب نما:** شەونما، شەونوێن.

**شبە:** وەك، وەکوو، شێوە، هاوشێوە، نیمچە، نیوە.

**شبهات:** کۆی"شبهە".

**شبەجزیرە:** کەرکە، کەرگراڤ، گراڤە، دوڕوە، نیمچەدوڕگە، دوڕگەئاسایی.

**شبەجملە:** کلۆز، ڕستەتا، سارستە، وشەیەکی ڕێزمانە.

**شبەدانش:** شێوەزانست.

**شبە رسمی:** سامیری، نیمچە ڕەسمی، نیمچە فەرمی.

**شبەفلز:** نیمچە کانزا.

**شبەمستقل:** نیوەسەربەخۆ.

**شب هنگام:** بەشەو، لەشەودا، کاتی شەو.

**شبهە:** شك، گومان، دڕدۆنگ. "شبهەکردن": گومان کردن. "بە شبهە انداختن": خستنە گومان و دڕدۆنگەوە.

**شبیخون:** چەپخوون، شەوخوون(ی)، شەڤخوونی، پەلاماری شەوانە.

**شبیخون زدن:** لە ناخافڵ هەڵکوتانە سەر دوژمن لە شەودا.

**شبینە:** 1) شەوانە، بەشەو. 2) بەرماوەی شەو.

**شبیە:** لێچوو، لێکچوو، وێچوو، هاوشێوە، چەشن، جۆر، نۆتل، وەکیەك، زاناڤ، لەوێنەی، لەگوێن، لە بیچم دا تەواو وەکوو یەکتر. "شبیە": (ەِ) وەکوو، وێنەی.

**شبیەخوانی:** تازیەخوێنی.

**شبیەسازی:** خوڵقاندنی بەرهەمێکی هونەری کە تەواو دەگەڵ دەقی بابەتەکە یان بەرهەمی ئەسڵی بگونجێ، کۆپیکردن، هاوشێوەکردن، سازکردنی شتێ لە ڕووی شتێکیترەوە.

**شبیەگردانی:** تازیەخوێنی.

**شپ شپ:** ئالۆز و پەشۆکاو.

**شپشو:** دزۆێن، سپێون، ئەسپێون، ڕشکاوی، ڕشکۆ، ڕشکن، کەسێ کە زۆری سپێ پێوەبێ. قێزەون، بێزاریهێن، بێ نرخ.

**شپـلیدن:** 1) فیکەلێدان، فیقەنەکێشان. 2) بڕوانە: "افشردن".

**شپوختن:** بڕوانە: "اشپیختن".

**شپیلیدن:** گوشین، گلۆفین، حەشکاندن.

**شتا:** برسی.

**شـتاب:** زوو، پەلـە، پەلـەیی، تالۆوکـە، تەلۆوکە، لـەز، لـەزاهی، بـریف، هەشـتاو، سـەرپێ، کولـووکی، تێزەتێـزە، هەڵپـە، هەلپە، بەلەزەیی، دەوالّ، ساتی، چالاکی و خێرایـی. "شـتاب آوردن بـر کسی (چـیزی)": هێرش بردنە سەر ئەو، پەلاماربردنـە سـەر ئەو. "به شتاب": بەلەسە، بەپڕتاو.

**شتاب آلود:** بڕوانە: "شتابزده".

**شتابان:** هەڵەداوان، تەقڵـەکوت، بـەپڕتاو، بەلەســە، بەلرفەوپەلــە، پەلــەی زۆر، پەلەپڕووزێ، کەسێ کـە بـە پەلـە دەڕوا. "شتابان شدن": بەپەلەڕۆیشتن.

**شتاب برداشتن:** بڕوانە: "شتاب گرفتن".

**شـتابزدگی:** پەلـەپڕووزە، گەلـەك بەلـەز، پلەپەرتکێ، هەڵەشەیی.

**شـتابزده:** تـەنگاو، تەنگـەتاو، هەشـتاوی، بەلـەز، بەپەلـە، پەلەپەلکـەر، هەشـتاوی، وەسەرپەلەخراو، وەپەلەکـەوتوو، کەسێك کە بە پەلە و خێرا کارێك ئەنجام بدا.

**شتابکاری:** بڕوانە: "شتاب کردن".

**شتاب کردن:** دەسەواکردن، وەپـەلەکـەوتن، پـەلەکردن، بەلەسەبوون، لەزین.

**شتابگر:** بەهەڵەولەز، پەلەکەر، کەسێك کە بەپەلە و خێرا بڕوا.

**شـتاب گـرفتن:** پەلـەکردن، خێراکـردن، وەپەلەکەوتن، دەورهەڵگرتن.

**شتابنده:** بڕوانە: "شتابگر".

**شتابیدن:** بڕوانە: "شتافتن".

**شـتات:** 1) پـرژوبلاوی، بلاوبـوون، لێـك بلاوی. 2) پرژوبلاو، پەرەم پەرەم.

**شتافتن:** بەپەلە و خێرایی بەرەو لایەك چـــوون، لـــەزین، پەلـــەکردن، وەپەلەکـــەوتن، خێراکـــردن، خێـــرا ڕۆیشتن. "شتافتن بر کسی": هێرش کردنە سەر ئەو، پەلاماردان.

**شتّام:** فرە جوێن فرۆش.

**شتاویدن:** بڕوانە: "شتافتن".

**شتر:** (شَ) بڕین، لەت لەت کردن.

**شتر:** (شُ) وشتر، حوشتر. "شتر با بـارش گـم شـدن": بریتـی لـە زۆر قـەرەباڵغ و ئـالۆزبوون. وشـتر بـە بارەکەیـەوە ون دەبێ. "شتر را جـایی خوابانـدن": مانـەوە لەو شوێنە یان دەست بردن بۆ کارێك. "شـتر را کـشتن": لـە تروپـك یـان بـرەو کەوتنی کارێ. "شتر عصارخانه": ئـەوەی هەوڵ و تەقالای بێئاکام دەکا. "شـتر نقارەخانـە": ئـەوەی لـە هاتوهـاوار و هەڕەشـەی خـەڵکانی دی ناترسـێ و مەیدان چۆڵ ناکا.





**شتربار:** باری وشترێك.

**شتربان:** (شُ) بڕوانە: "ساربان".

**شترچران:** وشترلەوەڕێن.

**شـترخار:** وشـترخۆرە، وشـترخوار، وشـــترخۆرکە، حوشـــترخۆرکە، حوشترئالوك، وشترالوك.

**شترخو:** پڕ ڕق و کینە وەك وشتر. یـان قانع و خۆڕاگر وەك وشتر.

**شتر دل:** بریتی لە کەسـی بـەدگومان و ترسەنۆك ، قین لە دڵ، بوغز لە زگ.

**شترك:** (شُ.تُ.رَ) 1) وشـتری چـووکە. 2) لۆچـاو، لیپـاو، وشـترە، وشـتراو، شەپۆلی دەریا.

**شترکـشان:** کردنـە قوربـانی وشـتر بـە ڕێوڕەسمی تایبەتەوە. کاتی برەوی کار.

**شـترکین:** ڕقـاوی، ڕککـین، ڕك هـەڵگر، کینەکێش، وشترقین.

**شترگربە:** بریتی لە دوو شـتی نـاجۆر و نەگونجاو، تێکەڵ پێکەڵی.

**شـترگلو:** وشـترگەڵو، حوشـترگەڵوو، حوشـترگەروو، گونجـەی سـواڵەتی تێکخراو بۆ ڕاگوێزانی ئاو.

**شـترمآب:** کەسـێ کـە وەك وشـتر بـە شـێنەیی و ئـارامی بـڕوا. خـاوەنی هەڵـسوکەوتی لەڕادەبـەدەر وشـك و جیددی یان ڕەسمی.

**شـتروار:** وەك وشـتر، حوشترئاسـا. بـاری وشترێك.

**شتروان:** بڕوانە: "شتربان".

**شـترە:** شـل و شـەوێق، شـپڕێو، قـوون لێکەوتوو. "شترەزدن": بێهوودە و بێئامـانج گەڕان.

**شترەشلختە:** بڕوانە: "شترە".

**شتك زدن:** ڕۆیشتن بە ناو ئاو دا و پڕژاندنی ئاوەکە بە جووڵاندنی لاق.

**شتلم:** بڕوانە: "اشتلم".

**شتم:** جنێو، جوێن، دژمان.

**شـتویّ:** زسـتانە: بـارانی زسـتانە. "زراعـت شتوی": زستانەکێڵ، ئەوەی کە لە زسـتاندا دەچـێنرێ و لـە بـەهار یـان لـە هاوینـدا ڕەنیودێ.

**شـتی:** بـلاو، جۆراوجـۆر. پەرێـشان. زۆر، فرە.

**شتیت:** پرژوبلاو، کەرت و پەرت.

**شجاج:** (شِ) شکاندنی سەری یەکتر.

**شجار:** دەگەڵ یـەك شـەڕ و مقۆمقـۆکردن، دەمەقالّی.

**شجاع:** ئازا، نەترس، بەغیرەت، بەجـەرگ، جـەرگ قـایم، زاتـدار، بـەزات، بـوێر، زەنەقدار، گەڕناس، چاونەترس، قـادڤین، قادۆ، قەلاگر، وێرا، وێرۆك، وەند، هـەوێرا، جـامێر، جـوامێر، مێرخـاس، دل سـتوور، دلێـر، عـەگن، عـەگیت، دڵـشێر، سـەفدڕ، بەکار، وەکار، یەمان.

**شـجاعانە:** ئازانـە، ئازایانـە، بوێرانـە، نەترسانە، کەلانە، وەندانە، وەك کەسـانی نەترس و بەجەرگ.

**شجاعت:** ئازایەتی، ئازاتی، ئازایی، نەترسان، وێران، بوێری، وێرایی، چاوسووری، چاونەترسی، مێرخاسی، زیخی، گەڕناسی، هێور، هەوێری، هەترە، هەترەش، هەوتانایش، هەیهێز، هەناو، مێرانی، نەترە، زەهلە، ورە، ورار، وریەنگ، ورینگە، زات، زراو، زەندەك، زەهلە، غیرەت، هێزی دڵ، تین و تاوی دڵ، قەوەتی دڵ.

**شجام:** سەرما، سەرما و سۆڵێ کە دارەکان وشك بکا.

**شجانیدن:** ساردکردن(ەوە)ی شتی گەرم.

**شجانیده:** تووشی هەڵامەت بوو، سەرمابردوو، کەسێ یان شتێ کە بە هۆی سەرماوە بێهۆش بووبێ.

**شجرەنامە:** ڕەگەزنامە، بنەچەنامە، سیایی ناوی باب و باپیران.

**شجلیز:** سایقە، سەهەند، جەبەرە.

**شجن:** داخ، خەم ، پەژارە. لك، لق.

**شجون:** خەمباربوون، دڵتەنگ بوون.

**شجیج:** کەسێ کە سەری شکابێ.

**شجیدن:** سەرمابوون، تووشی هەڵامەت بوون.

**شجیده:** بڕوانە:"سرمازده".

**شجیع:** بڕوانە:"شجاع".

**شحاح:** بەغیل، قڕنیس، ڕژد، چاوچنۆك.

**شحنە:** داروغە. فەرماندار/ فەرماندەری لەشکر. نگابان، پاسەوان. "**شحنە شناس**": کەسێ کە دەگەڵ داروغە لەئەنجامدانی تاوانەکان دا هاودەستە.

**شخالیدن:** ڕووشاندن، ڕووکاندن، ئاژنین، پیاچەقاندن.

**شخسار:** زەوی ڕەق و بەکەندوکلۆ، بەردەڵان، شەهوان. لق/ لکی دار.

**شخش:** کۆنە، پرتوکیاگ.

**شخشانیدن:** بڕوانە: "لغزانیدن".

**شخشیدن:** بڕوانە: "لغزیدن".

**شخص:** کەس، تاك، مرۆڤ، زەلام. جەستە، لەش. "**شخص اوّل**": زەقترین کەس، گرینگترین کەس. "**شخص ثالث**": سێهەم کەس.

**شخصاً:** خۆی، خودی کەس. "**من شخصاً**": من بۆخۆم.

**شخصك:** بووکەڵە، پەیکەر.

**شخصی:** کەسەکی، کەسێنی، کەسانی، کەسۆکی، کەسی، کەسین، تایبەتی بە بنیادەمێ، خۆیی، سیویل، خەڵکی ئاسایی.

**شخصیّت:** 1) کەسێتی، کەسایەتی. 2) زاتی هەر تاکێك، خوڵق و خووی هەر تاکێك، ڕەوشت و سفەتە باشەکانی کەسێك، شەخسییەت. ئەکتەر، هەر کام لە کەسەکانی شانۆنامە، "پێرسۆناژ".

**شخصیت بخشی:** دانی کەسیتی مرۆ بە شتەکان و وێناکردنیان وەك مرۆ.

**شخصیّت چندگانە:** بوونی دوو یان چەند کەسێتی جیا لە کەسێك دا کە هەر دەمەی یەکێك لەو کەسایەتی‌یانە لەودا دەردەکەوێ.





**شخصیّت سازی:** کەسێتی پەروەراندن.

**شخصیّت کلیشەای:** کەسێتی کلیشەیی، کەسێتی چەندپاتکراو.

**شخصیّت مثبت:** ئەوەی لە بەرهەمێکی ئەدەبی یان فیلم یان بەرهەمی شانۆیی تایبەتمەندی باش و جوانی هەیە.

**شخصیّت منفی:** کەسێتی خراپە/ناپەسند.

**شخصیّت نمایشی:** کەسێتی شانۆیی.

**شخلیدن:** بڕوانە:"شخولیدن".

**شخم:** شێو، شێف، شێڤ، شۆ، شۆم، شۆو، جووت، گایار، کاڵیان، کێڵانی زەوی. "**شخم زدن/کردن**": زەوی کێڵان، جووت کاری، گایاری، خەت دان، وەردبڕین، گاسن لە زەوی‌دان، شێف بڕین، شۆبڕینی زەوی، شوم بڕیەی. ژێروڕووکردن. "**شخم زدن دوباره**": خەپراندن، وەرددانەوە، لە جارێ پتر کێڵان و گاسن لێدان.

**شخم زن:** جۆتکار، جووتیار، جووتێر، جووت بەندە، وەرزێر، بکێڵ.

**شخن:** (شَ.خَ) ڕووش، ڕووشان، تێڕۆچوون.

**شخودن:** ڕووشاندن، ڕووکاندن، کۆڵەوارکردن، زامدارکردن، بە نینۆك هەڵکەندن.

**شخوص:** 1) هەستان، هەڵاتنی ئەستێرە. 2) چاونەترووکاندن.

**شخولیدن:** 1) هەراکردن، نالاندن. 2) فیکەلێدان، فیقەنەلێدان. 3) ژاکان، سیس بوون.

**شخیدن:** خلیسکان، دەرحەسین. ژاکان، شەمزان، چرچ هەڵگەڕان.

**شخیص:** 1) باهۆدار، زنتۆڵ، زەبەلاح، زل. 2) ڕێزدار، هێژا، مەزن.

**شخیلیدن:** بڕوانە:"شخولیدن".

**شدّ:** 1) بەستن، شەتەکدان. 2) ڕاکردن، پەلاماربردن. 3) هەڵاتن/هاتنەبانی خۆر. "**شدّالرحال**": بریتی لە سەفەر، پێچانەوەی باروبنەی سەفەر. "**شد رحال کردن**": سەفەرکردن، باری سەفەر بەستن. "**شدّ مخالف**": گۆرانی هەڕەمەکی و ئاوازی ناخۆش. "**شدومد**": شان و شکۆ، زۆر و هێز. شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی تێروتەسەل. "**بەشدومد رفتن**": بریتی لە بەنازوغەمزە ڕۆیشتن، خلنگین.

**شدآمد:** 1) ترافیك. 2) هاتوچۆ.

**شدآمدن:** چوون و گەڕانەوە. شیکردنەوە.

**شدائد/شدايد:** کۆی"شدیده"، دژوارییەکان، سەختییەکان.

**شدّت:** 1) توندی، سەختی، خەستی، خێرایی، کوڵەکوڵ، گوڕوتین، توندی و تیژی، گوژم، تەنگوچەڵەمە و دژواری ژیان. 2) هێز، وزە، توانایی. "**شدت پیداکردن**": توندتربوونەوە، زۆربوونی لەڕادەبەدەری شتێ. "**شدت داشتن**": هێزهەبوون، قەوەت هەبوون، توندبوون. "**شدت صوت**": وزەی دەنگی ڕاگواستراو لە چرکەیەك دا، توندی دەنگ. "**شدت عمل**": توندگرتن لە بەڕێوەبردنی کارێك دا، پێداگری. "**شدت کردن**":

توندبوونەوە. "**بەشدت**": 1) بەتوندی، بە هێز یان گوشاری زۆر. 2) بەهەوڵ و تەقالای زۆر.

**شدكیس:** بڕوانە: "رنگین كمان".

**شدگان:** پێشینیان، كۆچكردوان، ڕۆیشتوان.

**شدنگاه:** شوێن و كاتێ كە لەو دا شتێ ڕوودەدا. شوێنی گەڕانەوە.

**شدەبند:** هەواڵنێر، نووچەگهان، مێژوونووس.

**شدید:** توند، توندوتیژ، سەخت، خەست، بەهێز، پتەو، بەتین، بەكوڵ، زۆر، چڕ.

**شدیداً:** بەتوندی، بەسەختی.

**شدیدالقوی:** پڕزۆر، فرە بەتاقەت و بەهێز.

**شدیداللحن:** دەربڕینی توند.

**شدیده:** مێینەی "شدید".

**شرّ:** 1) خراپە، ئەوەی ببێتە هۆی زیان و گەندەڵی و ئازار. 2) زەرەر، زیان. 3) مایەی ئازاری دیتران. "**شر بە پا كردن**": ژانەسەر و ناڕەحەتی سازكردن. "**شر خوابیدن**": لەناوچوونی ئاژاوە و فیتنە. "**شر كردن**": ژانەسەر و ناڕەحەتی سازكردن. "**شروشور**": بەدفەڕی و كاری سەگانە.

**شراء:** كڕین و فرۆشتن.

**شراب:** 1) خواردنەوە. 2) مەی، بادە، شەڕاب. "**شراب انداختن**": شەڕاب سازكردن. "**شراب پیمودن**": شەڕاب دان. "**شراب كردن**": شەڕاب دروست كردن. "**شراب كشیدن**": شەڕاب خواردنەوە. "**در شراب آمدن**": گەڕاندنی شەڕاب و دانی بە مەیخۆرەكان.

**شراب بارە:** كەسێك كە مەی زۆر دەخواتەوە.

**شرا بخور:** مەیخۆر، شەڕابخۆر، مەی پەرست.

**شرابزدە:** كەسێ كە شەڕابی زۆری خواردبێتەوە و ئیتر ئیشتیای لێنەبێ، مەی زەدە.

**شرابیّ:** مەیفرۆش، شەڕاب فرۆش.

**شرار:** (شَ) بڕوانە: "شرارە".

**شرارت:** 1) شەڕاژۆیی، شەڕەنگیزی، بەدكاری و ئاژاوەگێڕی. 2) فیتنە و ئاژاوە. 3) نیازخراپ، نییەت خراپ. 4) بڕوانە: "شرارە".

**شرارە:** ئاورنگ، ئاورینگ، بریسك، كریسك، كریسكە، چوریسك، قریسك، پزیسك، پڕشنگ، ڤەژەن، پڕیشكەی ئاگر، نەختووكە ئاگرێك.

**شرارە پراگندن:** ئاورنگدان، بریقەدان، پزیسك دان، كریسكەدان، بریسكان، بروسكین، ورشەدان.

**شراست:** بەدخوویی، بەدخوڵقی، تووڕە و تۆسنی.

**شراشر:** تەواوی لەش، سەراپای ئەندام.

**شراع:** 1) بادەوان. 2) خێوەت، چادر. 3) بەسێبەر، سەیڤان. "**شراع كشیدن**": بادەوان هەڵدان و ئامادەی بزاوتن بوون. خێوەت یان سایەوان لێدان.





**شرافت:** 1) بەشەڕەف بوون. 2) گەورە و پایەبەرز بوون. 3) مەزناهی، گەورەیی، پایەبەرزی.

**شرافتمند:** بەشەڕەف، ڕێزدار و هێژا، ڕەسەن و بنەچەدار.

**شراكت:** شەریكایەتی، هاوبەشی، شەریكی، هەڤ پشكی. "**شراكت داشتن**": بوونە هاوبەش.

**شرانگیزی:** پیاهەڵپژان، شەڕپێفرۆشتن و گەڕتێهاڵاندن.

**شرایط:** كۆی "شرط"، هەلومەرجەكان، بارودۆخەكان.

**شرایع:** كۆی "شریعت".

**شرایین:** خوێن بەرەكان، ئەو دەمارانەی خوێن لە دڵەوە بۆ ئەندامەكانیتری لەش دەبەن.

**شرب:** (شُ) خواردنەوە، نۆشین. "**شرب مداوم**": مەیخواردنەوەی دایم. "**شرب الیهود**": بریتی لە مەی خواردنەوە بە نهێنی.

**شرتی:** ژنی شپڕێو كە كارەكانی بە ناڕێكوپێكی و سەرسەری ئەنجام بدا. پەیتاپەیتا، لێكدالێكدا.

**شرج:** (شَ) 1) كۆكردنەوە. 2) تێكەڵ كردن. 3) تایفە، گروپ. 4) چەشن، جۆر. 5) ئاوەڕۆ، ڕەهەند.

**شرجی:** هەوای گەرمی تێكەڵ بەشێی زۆر.

**شرح:** 1) هەراوكردن، ئاوەڵەكردن، بەرفرەكردن. 2) شیكردنەوە، شرۆڤەكردن، لێكدانەوە، باسیاری. "**شرح حال**": بیۆگرافی، بەسەرهات نووسی. "**شرح صدر**": 1) بڕوانە: "سعەصدر". 2) توانایی وەرگرتنی هەقیقەتەكان. "**شرح كشاف**": ڕوونكردنەوە و شیكردنەوەی تێروتەسەلی شتێك بە وردەكاییەوە. "**شرح مبسوط**": ڕاپۆرت و ڕوونكردنەوەی تێروتەسەل لە شتێ. "**شرح و بسط**": شیكردنەوەی بابەتێ بەتەواوی و تێروتەسەلی. "**شرح و تفسیر**": ڕاڤە، ڕاژە، ڕاوە، شیكردنەوەی واتا، واتاشیكردنەوە. "**بەشرح**": بەتێروتەسەلی، بەدوور و درێژی.

**شرحە:** لەت، كەرت.

**شرحەشرحە:** شەقارشەقار، لەت لەت، كوت كوت، دابەش دابەش، پارچەپارچە، خارخار.

**شرحەنویسی:** سكاڵای بەژان.

**شرخ:** (شَ) 1) بنج و بناوان. 2) هەڕەتی لاوێتی، سەرەتای هەر كارێ. وێنە و هاوتا.

**شرذمە:** كۆمەڵێكی كەم لە خەڵك، بەشێكی كەم لە شتێ.

**شرر:** بڕوانە: "شرارە". "**شرربار**": 1) ئەوەی لە پڕیشكی ئاورەوە دادەبارێ. 2) تووڕە، ڕق هەستاو.

**شرزە:** 1) ئاژری، تووڕە، بەقەوەت، لەهێرت، سفەتی شێر و پڵینگ كە لە قەڵسی و تووڕەیی زۆر دا دیانی چیڕدەكاتەوە. 2) ئازا، بوێر.

**شرس:** (شَ.رَ) بەدخوویی، بەدخوڵقی.

**شرشر:** چۆڕچۆڕ، دەنگی ڕژانی ئاو لە بڵندەوە.

**شرط:** (شَ.رَ) 1) نیشان، نیشانە. 2) سەرەتای هەر شتێ. 3) ئاوەڕۆی چووکە. 4) خەڵکانی پەست و نزم. 5) سەرۆك و گەورەی قەوم.

**شرط:** (شَ) گرێو، گرۆ، مەرج، شەرت، هۆی. "**شرط کافی**": (لۆژیك) دۆخێ کە هەرکات بوونی هەبێ ڕووداوێ ڕوودەدا یان شتێ دێتە ئاراوە. "**شرط لازم**": دۆخێ کە لە نەبوونی ئەو دا ڕووداوێکی دیاریکراو ناتوانێ ڕووبدا یان شتێك نایەتە ئاراوە. "**شرط نگاه داشتن**": پابەندبوون بە مەرج. "**شرط و بیع**": قەرارومەدار. "**بەشرط**": بەمەرج، مەرجدار. بەشیاوی. "**بە شرط چاقو**": بە مەرجی چەقۆ.

**شرط بستن:** گرێوکردن، گرۆکردن، مەرج دانان، مەرج بەستن، هۆیاندن.

**شرط بندی:** لەسەرگرێو، گرێوکردن، گرۆکردن، مەرج بەستن، شەرت کردن، مێچلگە.

**شرط نامە:** پەیماننامە.

**شرطە:** 1) ئەوەی ببێتە مەرج، مەرج و پەیمان. 2) پاسەوان. "**باد شرطە**": بای سازگار، بایەك کە بۆ لێخوڕینی پاپۆڕ لەبارە.

**شرطی شدن:** دەرکەوتنی حاڵەتێکی دەروونی لە گیانداردا کە بەو هۆیەوە لە بەرامبەر کردارێکی دیاریکراودا دژکردەوە لە خۆی نیشان دەدا. مەرجدار بە مەرجێ بوون.

**شرطیە:** بەمەرج، مەرجاوی، بەشەرت.

**شرع:** 1) شەرع، ڕێوشوێنی ئایینی، یاسای ئیسلام. 2) دەسپێکردن. "**شرع انور**": ئایینی ئیسلام. "**شرع پیوستن درکاری**": دەسپێکردنی ئەو کارە. "**شرع کردن**": دەسپێکردن. "**شرع و عرف**": ئەوەی لە ئایین و نەریت دا باوە.

**شرعاً:** بەپێی شەرع.

**شرعی:** شەرعی، یاسایی، ئەوەی کە دەگەڵ بنەماکانی شەرع بگونجێ.

**شرعیات:** زانست و حوکمە ئایینییەکان.

**شرف:** (شَ.رَ) شەڕەف، غیرەت، ئابڕوو، نامووس. گەورەیی، مەزناهی، پایەبەرزی. "**شرف حضور یافتن**": شانازی چوونەدیاری کەسێکی گەورە و بەڕێز پەیاکردن. "**شرف دادن**": سەربەرزکردن. "**شرف صدور یافتن**": دەرچوونی بڕیار و نامە و شتی وا. "**شرف کردن**": شانازی(پێوە)کردن. "**شرف نزول ارزانی داشتن**": هاتن. "**بەشرف عرض کسی رساندن**": بەئاگاداری ئەو گەیاندن.

**شرفاء:** (شُ.رَ) کۆی"شریف".

**شرفیاب:** کەسێ کە بە خزمەت کەسێکی گەورە و بەڕێز بگا.

**شرفیابی:** بەخزمەت گەیشتن.





**شرق:** (شَ رَ) شەقە، دەنگی وێکەوتنی دوو شت بە تایبەتی دوو دەست. "**شرق دست**": بریتی لە زەحمەت، هەوڵ.

**شرق:** (شَ) 1) هەڵاتنی خۆر، شوێنی خۆرکەوتن. 2) ڕۆژهەڵات خۆرهەڵات. 3) وڵاتانی ئاسیایی. "**شرق ادنی**": بڕوانە:"خاور نزدیك". "**شرق اقصی**": بڕوانە:"خاوردور". "**شرق اوسط**": بڕوانە: "خاورمیانە". "**شرق و غرب**": سەرانسەری جیهان، تەواوی دنیا.

**شرق شناختی:** ڕۆژهەڵات ناسانە.

**شرق شناس:** ڕۆژهەڵاتناس، خۆرهەڵاتناس.

**شرقی:** 1) ڕۆژهەڵاتی، خۆرهەڵاتی. 2) خەڵکی خۆرهەڵات یان ئاسیا.

**شرك:** هاوبەش، هاوپشك، شەریك. چەنخوایی (هاوەڵ بۆ خوا پەیا کردن).

**شرکا:** کۆی"شریك".

**شرکت:** 1) بوونە هاوبەش، هاوبەشی، هەڤبەشی، بوونە هاوپشك، بوونە شەریك، شەریکایەتی، بەشداری کردن. 2) بەشگە، بەشدارگە، شەریکە، شیرکەت، کۆمپانیا. "**بە شرکت**": بەهاوبەشی.

**شرکت تجارتی:** شەریکە، کۆمپانیای بازرگانی، بنکەی هاوبەشی لە بازرگانیدا.

**شرکت جستن:** بەشداریکردن. هاوەڵ بۆ خوا قایل بوون.

**شرکت دادن:** بەشداری پێکردن.

**شرکت داشتن:** بەشداریکردن، هاوبەشی.

**شرکت سهامی:** کارجف، دامودەزگای هاوبەشی لە بازرگانی دا.

**شرکت نامە:** پێڕەوی شەریکە.

**شرکت واحد:** کۆمپانیایەك کە تەنیا ئەرکێکی تایبەتی ڕادەپەڕێنێ.

**شرم:** 1) چاوەڕوو، چاوڕوو، حەیا، فهێت، فەدی، شەرم. 2) کەنداو، لاوچ. 3) کۆئەندامی جووت بوون.

**شرم آلود:** شەرمۆ، شەرمن، شەرمەزار.

**شرم آلودگی:** شەرمنی، حاڵەت و چۆنیەتی"شرم آلود".

**شرم آور:** 1) شەرم هێن، شەرم هێنەر. 2) ناحەز، دزێو.

**شرمجا:** بڕوانە:"شرمگاه".

**شرم زد/شرم زده:** شەرمەزار، تەریق، فهێتکار.

**شرمسار:** تەریق، ترێق، شەرمەزار، سەرشۆڕ، چاوشۆڕ، گوێشۆڕ، گۆهشۆڕ، ڕووزەرد، ڕووخار، سەروهار، خەجاڵەت، دریبەردە، شەرم گرتوو، بەشەرم داکەوتوو. "**بسیار شرمسار**": گبر، زۆر تەریق، سوورهەڵگەڕاو.

**شرمساری:** سەرشۆڕی، شەرمەزاری، چاوشۆڕی، تەریقی، فەدیکاری، گبریتی، خەجاڵەتی، خەجاڵەتباری، حەیاچوون.

**شرم کردن:** چاوپێهەڵنەهاتن، شەرم کردن، شەرم لێکردن، ڕووکردن، ڕووگرتن، فەدیکردن، خەجاڵەتی کێشان.

**شرمگاه:** شەرمگا، کۆئەندامی سێکس، ناوگەڵی ژن و پیاو. تووکەبەر.

**شرمگن/شرمگین:** 1) شەرمۆ، شەرمن، شەرمین، بەحەیا. 2) شەرمەزار، شەرمەندە، تەریق، فهێتکار.
**شرمگینی:** شەرمنی، شەرمدار، شەرمەزاری، شەرمەندەیی.
**شرمناك:** شەرمەزار، شەرمەندە، تەریق.
**شرمندگی:** خیت، ڕووزەردی، شەرمەزاری، مل شۆڕی، خەجاڵەتی، تەریقی.
**شرمنده:** شەرمەزار، تەریق، تەریق، خەجاڵەت، فهێت کار، فەدیکار، چاڤشۆڕ، چاوشۆڕ، چاوبەرەژێر، ڕووزەر، ڕووزەرد، سەرشکەستی، قۆتۆ.
**شرمندەشدن:** تەریق بوونەوە، تەریق بوونەوە، بەشەرم داکەوتن، شەرمەزاربوون، بەتەقەکەوتن، خەجاڵەت بوون.
**شرنده:** 1) شپرێو، ئاڵۆز و شپرزە. 2) کۆنە، شڕۆڵ، لەت و کوت، لەتار.
**شرنگ:** سەم، ژەهر، هەرشتێکی تاڵ.
**شرنگ آور:** کوشندە، کوژەر.
**شروح:** کۆی "شرح".
**شرود:** (شُ.رُ) ڕەوینەوە، سڵەمینەوە، ترسان و هەڵاتن، هەوتی.
**شرور:** گونجڕ، تووش، توخس، تووڕ، جینگن، بەدفەڕ، ناخار، شەڕهەڵایسێن.
**شروط:** کۆی "شرط".
**شروع:** 1) دەسپێکردن. 2) سەرەتا، دەسپێك.
**شروق:** خۆرکەوتن، تاوهەڵاتن.
**شرّو ور:** قسەی قۆڕ و بێ مانا، هەڵیت پڵیت، حەللەق مەللەق.
**شره:** (شَ.رَ) 1) چاوچنۆکی، چاوبرسی، ڕژدی، بەئێرەیی. 2) هۆگریی زۆر.
**شریان:** خوێنبەر، ڕەهێ خوون.
**شریب:** هەر تراوێك کە بۆ خواردنەوە بێ.
**شریدن:** سەرونخوون بوون و ڕژانی ئاو یان شتێکی دی لە سەرەوە بۆ خواری، ڕەوان بوون.
**شریطه:** 1) مەرج و پەیمان. 2) ئەنجامی کار، ئاکام.
**شریعت:** 1) شەریعەت، ئایینێ کە پێغەمبەرەکان هێناویانە. 2) شێوە. **"شریعت ورزیدن"**: بەدین بوون، دینداربوون.
**شریف:** بەشەڕەف، مەزن، گرس، پایەبەرز.
**شریك:** هاوبەش، هاوپشك، هەڤپشك، هەمپشك، هەڤبەش، هاوپاژ، هەڤپار، هەڤبەهر، هەڤبەحر، هەڤدار، شەریك.
**شریك دزد:** دایکەدزە، دزدەسەك، دزەکە، دەستەدز، دەستەك دز، دەسکیس.
**شستگانی:** بناغە، بناخە، بنیات.
**شست گیر:** تیرهاوێژ.
**شستن:** 1) شۆردن، شۆرین، شۆران، شۆریان، شتن، شردن، شووتن، ششتن، شووشتن. 2) لەناوبردن، سڕینەوە. 3) پاك کردنەوە، خاوێن کردنەوە. **"شستن حبوبات"**: شۆردنەوە، شۆرینەوە، شتنەوە، شردنەوە.





**شست و شوی:** کردەی شووشتنی شتێ. **"شست و شوی مغزی دادن"**: مێشك شۆردنەوە.
**شسته:** 1) شۆردراو، شۆڕاو، شۆریاو، شۆریاگ، شتراو، شوتراو، شتوو، شردوو، بە ئاو خاوێنەوە کراو. 2) پاك، خاوێن. 3) بەبێ نیگەرانی و پەشێوی. **"شسته و رفته"**: 1) پاك و خاوێن. 2) ڕێکوپێك و خاوێن. 3) بەڕەوانی و ڕوونی.
**شش:** (شُ) سی، جەرگی سپی، سیپەلاك، سێپەلاك، سیپەلك، سەپەلیك، شمش، شیشار، ئەندامی هەناسەدان لە لەشدا. **"شش کسی حال آمدن"**: چێژبردن لەو.
**شش پستان:** (شُ.پِ) ژنێ کە مەمکەکانی نەرم و زل بێ، ژنی پیر.
**شش تا:** زۆر توند.
**شش جهت:** 1) شەش لا، شەش ئالی، شەشدەر(چەپ، ڕاست، سەر، ژێر، پێش، پاش). 2) گشت جیهان.
**شش دانگ:** 1) شەش دانگ، تێکڕای مڵك. 2) تەواو، گشت. 3) بەتەواوی. 4) بەبێ کەموکورتی.
**ششدرفنا:** بریی لە دنیا.
**شش دره:** شوێنی مەترسیدار.
**شش روزن:** بریتی لە دنیا.
**شش سری:** زێڕی بێخەوش.
**شش سو:** بڕوانە: "شش جهت". **"شش سوی عالم"**: باکوور. باشوور. خۆرهەڵات. خۆراوا. سەر.ژێر.
**شش ضلعی:** شەش گۆشە، شەش پاڵوو، خەتێ کە لە شەش جێوە شکابێ و سەری وێك کەوتبێ.
**ششك زدن:** مردنی کورپەڵەیەك لە شەشەمین شەوی لەدایك بوونیدا.
**شش ماهه:** شەش مانگە. **"شش ماهه به دنیا آمدن"**: کەم چیکەڵدانە و بزۆز بوون.
**شش میخه:** پتەو، قایم.
**شطاح:** 1) بێشەرم، ڕووداماڵیاگ. 2) لە زاراوەی سۆفیاندا: کەسێ کە قسەی بە ڕواڵەت پێچەوانی شەرع بلێ وەك "اناالحق" ی مەنسووری حەلاج.
**شطحیات:** قسەی بێ مانا و پووچ، قسەی هەڵەت و پڵەتی دەروێشانە.
**شطر:** پاژ، لەت، کەرت، نیو، نیوە.
**شطط:** 1) لە ئەندازە و سنوور تێپەڕاندن، لە ڕادە دەرچوون، دوورکەوتنەوە لە هەق. 2) زوڵم و ستەمی زۆر.
**شعار:** 1) دروشم. 2) هێما، نیشانە. **"شعار دادن/شعار سردادن"**: دروشم دان.
**شعائر:** باو، دابونەریت، ڕێوشوێن.
**شعاع:** تیشکی خۆر، تیرێژ، تیرۆژ، لیزگ. **"شعاع دایره"**: نیو ژێ، نیوەتیرە. **"شعاع ساقط"**: تیشکی کەوتوو، تێشکی لێدەر. **"شعاع منعکس"**: تیشکی دراوە، تیشکی ڕەتەوەبوو. **"شعاع منکسر"**: تیشکی شکاوە.
**شعب:** (شُ.عَ) کۆی "شعبه".
**شعبده:** چاوبەستی، کەڵەکبازی، فێڵبازی. **"شعبدەباز"**: چاوبەست، تەڕدەست. فێڵەزان، کەڵەکباز.

**شعبه:** لق، پەل، چلّ. تایفە، دەستە، کۆمەڵێ.

**شعر:** هەڵبەست، هەل بەست، هۆنە، هۆنراوە، نەوشە، شێعر، بەرانبەری پەخشان. "**شعرآزاد**": شێعری ئازاد، شێعری سپی. "**شعر اعترافی**": شێعری دانیانان. "**شعر بندتنبانی**": شێعری ڕەق و تەق. "**شعربی قافیە**": شێعری بەتاڵ (لە سەروا). "**شعرتبعیدی**": شێعری تاراوگە. "**شعرخالص**": شێعری خاوێن، شێعری پاراو. "**شعرداستانی**": شێعری گێڕانەوەیی. "**شعر عینی/انضمامی**": شێعری بەرهەست. "**شعر غنایی(بزمی)**": شێعرێ کە دەربڕی حاڵەتی سۆزداری بەتایبەت ئەوینە. "**شعرمدح**": دولگە، هەڵبەستی دڵخۆشکەرە. "**شعرناخالص**": شێعری ناخاوێن. "**شعر نو**": شێعری نوێ. "**شعر هجایی(سیلابی)**": شێعری بڕگەیی. "**یک قطعە شعر**": نەوشەك، پارچەیەك لە شێعر.

**شعراء:** کۆی"شاعر".

**شعرسرودن:** شێعر هۆنینەوە، شێعروتن، شەڤانە.

**شعف:** خۆشی، شاگەشکەیی، دڵخۆشی، خۆشحاڵ بوون، شادمانی، شەیدابوون، ئەوین و شەیدایی.

**شعله:** بڵێسە، بڵێزە، کڵپە، گڕ، گڕاگڕ، گڵ.

**شعله انگیختن:** هەڵایساندنی ئاگر.

**شعله زدن (کشیدن):** بڵێسەسەندن، کڵپەسەندن.

**شعلەور:** بڵێسەدار، کڵپەسەندوو، داگیرساو، گڕتێبەربوو، گڕگرتوو. "**شعلەورشدن**": گڕان، گڕگرتن، گڕتێبەربوون، گڕداربوون، هەڵبوونی ئاگر، بڵێسەداربوون، بڵێسەسەندن، کڵپەسەندن، کڵپەکردن، داگرسیان، ئایسان، گەشانەوە، تەیسین، سنجران.

**شعواء:** بڵاو، پڕژوبڵاو، پەرتەوازە. "**غارت شعواء**": تاڵانی پڕژوبڵاو و بەردەوام.

**شعور:** 1) هەست. 2) پێزانین، هەست کردن، هەساندن. 3) ئاوەز، ئەقڵ، فەرهەنگ، هۆش. 4) ئاگایی، زانیاری. "**شعورداشتن**": بەهرەمەندبوون لە "شعور". ئاوەز هەبوون.

**شغار:** 1) ڕادان و دەرکردنی کەسێك لە شارەکەی خۆی. 2) ژن بە ژن.

**شغّال:** کەسێ کە کاری زۆری هەیە، زۆر سەرقاڵ.

**شغال مرگی(مردگی):** خۆ لە مردن دان، یان خۆ بە زوڵم لێکراو نیشاندان.

**شغب:** (شَ.غَ) فیتنە و ئاژاوە، ئاژاوەگێڕی، گێرەشێوێنی. هاتوهاوار.

**شغف:** (شَ.غَ) بالاترین پلەی ئەوین و دڵداری، شەیدایی.

**شغل:** 1) کار، پیشە، شوول، سەرقاڵی. 2) پێشهاتی خراپ، ژانەسەر، گرفتاری.





**شغم:** بڕوانە:"حریص".

**شفا:** خۆشبوونەوە، چاك بوونەوە. "**شفابخش**": چاککەرەوە، خۆشکەرەوە. پزیشکێ کە نەخۆش چاك بکاتەوە. دەوایێ کە نەخۆشییەکە بڕەتێنێ. "**شفابخشیدن(دادن)**": خۆشەوکردن، خۆشەوەکردن، دەش کەردش. "**شفایافتن**": چاکبوونەوە، چابوون، چابوونەوە، چاك بوونەوە، خۆشەوبوون، خۆشبوون، خۆشبوونەوە، خاسەوبوون، ساغبوونەوە، چارەسەربوون، ڕاس بوونەوە.

**شفاخانه:** نەخۆشخانە، خەستەخانە.

**شفادارو:** دەوای چاککەرەوە، دەوای یەکاویەك، ژاربڕ، ژاربەر.

**شفاعت:** تکا، وەپاڕان، پاڕانەوە بۆ کەسێك، ئەرجوو، ڕەجا، دیلەك.

**شفاعتگر:** تکاکار، پاڕێرەوە.

**شفّاف:** 1) ڕووتەنك، ڕوون، ڕووناك، دیار، هەرشتێکی تەنك و ناسك کە لە پشتییەوە شتەکانیدی دیار بن وەك شووشە. 2) بەبێ لێڵی و ئاڵۆزی، ڕوون، ئاشکرا. 3) بڕوانە:"درخشان".

**شفّاف سازی:** ڕوونکاری، لابردنی تەمومژ و لێڵی، تیشك خستنەسەر.

**شفاه:** کۆی"شفه"، لێوەکان.

**شفاهی:** وەزار، (سەر)زارەکی، بەزارگوتن، دەڤکی، لەبزی، زمانی، ڕاسپێری بەدەم، بەقسەی ڕووبەڕوو.

**شفّافیّت:** ڕوونی. ڕوونبێژی.

**شفت:** (شَ) قەبە، گەورە، بەکەندوکلۆ.

**شفتالوزدن:** بریتی لە ماچکردن، ڕاموسین.

**شفع:** جووت.

**شفعاء:** کۆی"شفیع".

**شفق:** 1) سووری ئاسۆ کاتی خۆراوابوون. 2) ڕۆژ. 3) دلۆژانی، بەزەیی. 4) ترس، خۆف.

**شفقّت:** بەزەیی، بزی، دلۆڤانی، دڵسۆزی، دڵنەرمی.

**شفك:** بێهونەر، نەزان، تێنەگەیشتوو.

**شفوده:** حەوتوو.

**شفوق:** دڵسۆز، دلۆڤان، خاوەن بەزەیی.

**شفیع:** تکاکار، تکاکەر، ڕەجاکەر، پاڕێرەوە، دیلەکچی، مەهدەرچی. "**شفیع آوردن(کردن،گرفتن) کسی را**": بە دیلەك هەڵبژاردنی ئەو، کردنە نێونجیکەر. "**شفیع شدن**": داوای لێبوردن و بەخشین بۆ کەسێك.

**شفیف:** هەر شتێکی تەنك و ناسك. بای سارد، تەوژمی سەرما.

**شفیق:** دڵسۆز، هەڤسۆز، دلۆڤان، خاوەن بەزەیی.

**شقّ:** (شِ) 1) نیوەی لەش، لایەکی لەش، نیوەی شتێ. 2) لا، ئالی.

**شقّ:** (شَ) 1) قڵیش، تلێش، درز. 2) قەڵەشاندن، تلێشاندن، دادڕین، دڕاندن. 3) بڵاوەپێکردن.

**شقاء:** بەدبەختی، دژواری و تەنگوچەڵەمە.

**شقاشق:** قسەی ڕەوان و پاراو.
**شقاق:** 1) دژایەتیکردن، دوژمنایەتیکردن. 2) ناکۆکی، دووبەرەکی. 3) جیابوونەوە. 4) درز، قەڵشت.
**شقاوت:** بەدبەختی، پێچەوانەی خۆشبەختی. دڵڕەقی، بێبەزەیی.
**شقەکردن:** (ش.ق) دوولەتکردنی کەسێ یان شتێ لە درێژیدا.
**شقیّ:** بەدبەخت، بەخت ڕەش، چارەڕەش، کولۆڵ.
**شقیق:** 1) نیوەی شتێك. 2) برا.
**شقیقە:** 1) ژانی لایەکی سەر. 2) شیشنگ، شەقە، نیوەی توێڵ و سەر. 3) خوشك.
**شكّ:** خەلێڵە، شك، گومان، دوودڵی، ڕوێز. "**شك داشتن**": دوودڵ بوون، دڕدۆنگ بوون. "**شك کردن( آوردن، بردن )**": شك کردن، گومان بردن. "**شك کرده**": بەشك، بەگومان. "**شك گرایی**": شکخوازی، گومانگەرێتی. "**بەشك افتادن**": کەوتنەگومانەوە، گومان بردن. "**بە شك انداختن**": خستنە گومانەوە، تووشی گومان کردن.
**شکار:** ڕاو، ڕاڤ، نچیر، شڤ، سەی، سەیدە، ئەو گیانلەبەرەی لە ڕاو دا دەگیرێ. وەدەست خستنی شتێ لەکاتی ناسك و لەباردا. "**شکارگروهی**": ڕاوشکار، ڕاووشکار. "**شکاری**": 1) ئەوەی بۆ ڕاو بەکار دەبرێ وەك تفەنگی تایبەت بە ڕاوکردن، لەبار بۆ ڕاوکردن. 2) سەگی ڕاوکەر.
**شکارافکن:** فرز و چالاك لە ڕاوکردن دا. ئەوەی ئاژەڵێ بە تیر بهەنگێوێ و بە زەویدا بدا.
**شکارچی:** ڕاوکەر، ڕاویار، ڕاوچی، ڕاڤەڤان، ڕاڤیار، ڕاڤکار، ڕاڤ ڕۆ، سەیڤان، سەیدەوان، نچیرکار، نچیروان، نچیرڤان. "**کمین شکارچی**": سیپە، شارگە، حەشارگە، ڕەبەت.
**شکارستان:** بڕوانە:"شکارگاه".
**شکارگاه:** ڕاوگە، ڕاڤگە، نێچیرگا، جێڕاو.
**شکارگر:** بڕوانە:"شکارچی".
**شکاریدن:** ڕاوکردن، ڕاڤ کرن.
**شکاف:** درز، کەلێن، قەلش، قەڵشت، قەڵەش، قەڵەشت، قلێش، قلاش، تلیش، شەقترەك، ڕەخنە. دووبەرەکی، دوودەستەیی. "**شکاف افتادن**": دووبەرەکی و ناکۆکی تێکەوتن. "**شکاف زمین**": خومخۆرك، قەڵەشتی زەوی.
**شکافاندن:** دڕاندن، تلێشاندن، داتلێشاندن، قەڵەشاندن.
**شکاف برداشتن( خوردن ):** قەڵەشان، قەڵش بردن، تلێشان، وەبیایش، بۆ مانای زیاتر بڕوانە:"ترك برداشتن".
**شکافت:** کردەی داتلێشان.
**شکافتگی:** دڕاوی، دڕیاوی، هەڵدڕاوی، هەڵ تلێشاوی، داتلێشاوی.
**شکافتن:** 1) درزپێدان، درزپێ بردن، تلێشاندن، داتلێشان، داتلێشیان، داتلێشاندن، تلێش تێبردن، تلێشان، تلێشیان، تلێشاندن، هەڵ تلێشان، شەق بردن، داقلێشان، قەڵشاندن، قلێشاندن، قلاشتن، قەلاشتن، قەلاشدن، قەڵەشتن، قلێشان، قلێشاندن، کەلاشتن، کەلاشتن، شەق بردن، دڕاندن، بشکافتن، هەڵ پشکوتن، هەڵ ترەکان، هەڵ ترەکیان، هەڵوەشانی جێ تەقەڵ، وەرتەگەنە، وەکەردش.2) شیکردنەوەی بابەتێك و ڕوونکردنەوەی وردەکارییەکانی یان لێڵی و ناڕوونییەکانی. 3) خراوکردن. 4) لە دایکبوون، هاتنەدی. 5) پێشێلکردن. 6) جیابوونەوە، کەرتبوون. 7) پشکوتن، گەشانەوە. 8) وەدەست هاتن.
**شکافتە:** داتلێشاو، داتلێشیاگ، تلێشاو، داقلێشاو، هەڵ قلێشاو، قەڵشاو، درزتێگەوتوو، کەفتە، دڕاو.
**شکاف دادن:** بڕوانە:"شکافتن".
**شکاف شدن (کردن ):** درزتێکەوتن، تلێشبردن، داتلێشان، قەڵشان، قلێشان، قلێشانەوە، لەبەریەکچوون.
**شکافندە:** درزپێدەر، داقلێشێن، کەلێن تێخەر، پێدزکەکەر.
**شکافەزن:** ژەنیار.
**شکافیدن:** 1) بڕوانە: "شکافتن (1)". 2) بڕوانە: "شکافتەشدن".
**شکّاك:** بەگومان، خاوەن گومان، دوودڵی.
**شکاندن:** شکاندن، وردکردن.
**شك اندیشی:** دوودڵ بوون، دڕدۆنگ بوون.
**شکاونە/شکاوندە:** کۆڵەر، زەوی دەرەوە. "**گور شکاونە**": کەسێ کە گۆڕی مردوو هەڵبکەنێ، کفن دز.
**شکاویدن:** هەڵدانەوەی زەوی، هەڵکۆڵین، کۆڵینەوە، توێژینەوە.
**شکایات:** کۆی"شکایت".
**شکایت:** سکاڵا، گازندە، گلەیی، دادبردنەبەر، شکات، شکایەت. "**شکایت آوردن**": دەربڕینی نارەزایەتی لە کەسێ یان شتێ. "**شکایت ابتدایی**": سکاڵا، شکایەتنامە.
**شکایت گستر:** ئەوەی سکاڵا بەرێتە لای هەموو کەسێك، سکاڵاپیشە.
**شکر:** (شُ) سوپاس، ستایش.
**شکرافشان/شکرفشان:** (شِ.كَ) دەڤ خۆش، قسەشیرین، ڕاوێژ خۆش، گفت و لفت خۆش.
**شکران:** (شُ) سپاس کردن، منەت خوارن.
**شکراندا:** (شِ.كَ) تێکەڵ بە شەکر.
**شکرانداختن:** (شِ كَ. اَ.تَ) پرژاندن و بەخشینەوەی شەکر بە نیشانەی شادی.
**شکرانە:** (شُ) قسەیەك کە وەك شوکرانەبژێری دەوترێ. وەك شوکرانەبژێری.
**شکربار:** (شِ كَ) 1) ئەوەی قەند دروست دەکا. 2) شیرین. 3) خۆش، سازگار. 4) قسەخۆش، خۆش وێژ.
**شکرچش:** (شِ.كَ) بریتی لە شتی شیرین کە بۆ نموونە بیچێژن.
**شکرچین:** (شِ.كَ) شەکرخۆر.

**شكرخا:** 1) شەكرخۆر. 2) شیرین، سازگار. 3) قسەخۆش، ڕاوێژخۆش.
**شكرخنده:** (ش.كَ) بزەی بەخۆشی، زەردەخەنە، شەكرخەن، شەكرخەنە.
**شكرخواب:** (ش.كَ) خەوی خۆش و شیرین، خەوی بەرەبەیانی.
**شكرخوار:** (ش.كَ) 1) شەكرخۆر. 2) قسەخۆش، ڕاوێژخۆش.
**شكر خوردن:** (ش.كَ) غەڵەت كردن، گوو خواردن.
**شكردار:** (شُ) زۆر شوكرانەبژێر.
**شكردن:** (ش.كَ.دَ) 1) ڕاوكردن. 2) تێك شكاندن و وردكردنی دوژمن. 3) شكاندن. 4) كوشتن. 5) لەناوبردن. **"شكرده":** ڕاوكراو و تێك شكێنراو.
**شكر ریز:** 1) كەسێ كە نوقڵ و نەبات لە شەكر چێ دەكا. 2) گفت و لفت شیرین، ڕاوێژخۆش. 3) قسەشیرین و دەماوەر. 4) بریتی لە لێوی دڵبەر. 5) كۆڕی شادی، زەماوەند.
**شكرسخن:** بڕوانە: "شیرین سخن".
**شكر شكستن:** (ش.كَ) زۆر شیرین و خۆش قسەكردن، قسەی خۆش كردن.
**شكرشكن:** 1) شەكرخۆر. 2) بریتی لە قسە شیرین، گفت و لفت خۆش.
**شكرفیدن:** خلیسكان، ڕەت بردن و كەوتن، ساتمەبردن.
**شكرك:** 1) هەرشتێكی وەك شەكر، شەكر ئاسا. 2) وەك شەكر شیرین.
**شكرگزار:** شوكرانەبژێر، شوكرخواز، سپاسكەر.
**شكرگزاری:** شوكرانەبژێری، منەتباری، منەت خوارن، سوپاس لە چاودا، بەچاكە زانین.
**شكرگفتار:** قسەشیرین، زمان خۆش، خۆش زوان، دەم و ڕاوێژ خۆش، دڤنەرم.
**شكرلب:** قسەشیرین، ڕاوێژخۆش. كەسێ كە یەكێ لە لێوەكانی قەڵەشیبێ.
**شكرنده:** ڕاوكەر، تێك شكێنەر.
**شكره:** 1) جانەوەری ڕاوكەر. 2) ڕاوكراو.
**شكریدن:** بڕوانە: "شكردن".
**شكرین:** شەكردار، شیرین، شیرینی.
**شكست:** 1) شكان، نسكۆ، شكس، شكست، بەزین، دۆڕان. 2) سەرنەكەوتن. 3) كەم بوونەوە و دابەزینی نرخی شتێ. 4) درز، كەلێن، قەڵشت. 5) ناڕێكوپێكی. 6) شەرم. حەیا. 7) شكاندی، شكینا. 8) لە زاراوەی زەوی‌ناسیدا: لێك پسان و جیابوونەوەی بەردەكان. 9) لە زاراوەی فیزیكدا: شكانەوە، شكانی نوور. **"شكست بازار":** دابەزینی نرخەكان. **"شكست و بست":** باس و گفتوگۆ.
**شكست برداشتن:** بڕوانە: "ترك برداشتن".
**شكست خوردن:** تێشكان، تێك شكان، شكست خواردن، لەبەر دژ دانەواندن، بەزان، بەزین، بن كەوتن لە شەڕ یان لە سەودا و مامەڵەدا، دۆڕان، هەڵاتن لە پێش دوژمنەوە. **"شكست خورده":** تێشكاو، تێك شكاو، بەزیو، ژێركەوتوو لە شەڕدا، هەڵاتوو لە پێش دوژمنەوە، ناكام.





**شكست دادن:** تێشكاندن، تێك شكاندن، شكست دان، شكست پێدان، بەزاندن، بەزانن، كۆڵ پێدان.
**شكست كردن:** سووك كردن.
**شكستگی:** 1) شكاوی، وردبوون. 2) ڕەنجیان و داماوی.3) بڕوانە: "لكنت". 4) دۆڵ، هەڵدێر. **"بهبود شكستگی":** گرتنەوە، هاتنەوەجێی شكاو.
**شكستن:** 1) شكاندن، شكانن، شكیناندن، شكەناندن، شكان، شكیان، ورد و لەت كردن، لەت بوون، داقولین، هەرستین، (شكستن تخمه) تترووكان، تترووكاندن. 2) پێشێلكردن (قانون را شكست). 3) دابەزاندن، هێنانەخوار. 4) تێك شكاندن، شكست پێدان. 5) سووك كردن، كەم كردنەوەی نرخ و ڕێزی كەسێك یان شتێك. 6) بەكۆتایی گەیشتن، كۆتایی هاتن. 7) بڕان. 8) بڕوانە: "گسستن". 9) ڕاوكردن، كوشتن. **"شكستن سخن كسی":** قسەشكاندن، بەقسەنەكردن، تكانەگرتن. **"دوباره شكستن":** شكانەوە، شكیانەوە، دووباره شكاندن.
**شكست نا پذیر:** لەشكان نەهاتوو.
**شكستنی:** شكستۆك، لە شكان نزیك، كەلوپەلێ كە لەوانەیە بشكێ.
**شكست و مكست:** شكاو، پڕ پێچاوپێچ.
**شكسته:** شكاو، شكیاگ، شكەستی، لەتبوو، وردبوو. 2) ڕەنجاو، دڵشكاو. 3) كەوانەیی. 4) بڕوانە: "ناقص". 5) تێكشكاو، بەزیو. 6) خاكەڕا، خۆنەگر. 7) داماو، حاڵ پەرێشان. 8) وێران بوو، كاول بوو. 9) پەرێشان، بڵاو. 10) سككەی كەم نرخ. 11) ئەویندار، ئاشق. 12) لەناوچوو. **"شكسته(و)بسته":** پرتوكیاو و كاركردوو. خراو، وێران. ناجێگیر، ناپایەدار. ڕەنجاو، خەمبار. ناتەواو، كەموكوورپدار. پەشێو، پەرێشان.
**شكستەبال:** 1) باڵ شكاو. 2) بریتی لە داماو و پەرێشان.
**شكستەبند:** ئێسك گرەوە، هەڵبەس، هەستی گرەك، كەسێ شكاو دەبەستێتەوە.
**شكستەبندی:** ئێسك گرتنەوە، هەستی‌گرتن، هەڵبەستنەوە، كاری ئێسك گرەوە. "ئۆرتۆپێدی".
**شكستەحال:** حاڵ پەرێشان، بێكەیف، بەدبەخت، دەس تەنگ.
**شكستەخاطر:** خەمبار، دڵتەنگ، زیز، ناڕەحەت.
**شكستەدل:** دڵشكاو، ئازاردراو، ئازار چەشتوو، ڕەنجیاو، زیزبوو.
**شكستەرنگ:** ڕەنگ پەڕیو، ڕەنگ بزڕكاو، ڕەنگ زەرد.
**شكستەزبان:** زمان شكاو، زمان لە گۆ چوو، لاڵەپەتە، تور، زمان پسك، زمان بە گرێ، زوان بەگیر، زمان فس.

**شکستەنام:** بەدنێو، ناوزڕاو، خەنزار، ئابڕوونەماو.

**شکستە نفسی:** خاکەڕایی، خۆشکێنی، خاکێتی، خۆ بە کەم زانین.

**شکفاندن:** 1) پشکوتنی خونچەی گوڵ. 2) رواندنی گیا. 3) شاد و خۆشحاڵ کردن.

**شکفتگی:** گەشانەوە، بووژانەوە، کرانەوەی لێوەکان کاتی پێکەنین و دڵخۆشی.

**شکفتن:** 1) پشکووتن، گوڵ کردن، گوڵ دەرکردن، گەشانەوە، گەشیان، گەشیانەوە، گەشینەوە، گەش بوونەوە، دەم دانەوە، خونچەکردن، وەبوونی خونچە، 2) شاد و بەگەشەبوون، کرانەوەی لێوەکان کاتی پێکەنین. 3) ئاشکراکردن. "**شکفتە**": 1) پشکوتوو، بشکفتی. 2) گەش، گەشاوە، خەنان. 3) تازە، بەگەشە و تێراو.

**شکفە:** بڕوانە:"شکوفە".

**شکفیدن:** بڕوانە:"شکفتن".

**شکل:** 1) فۆڕم، شکڵ. 2) ڕواڵەت، ڕوخسار، بیچم، کێسم، وێنە، شێوە، تەشك. 3) وەك، وەکوو، هاوتا. "**از شکل افتادن**": لەدەست دانی جوانی ڕواڵەتی خۆ، ناحەزبوون.

**شکل بندی:** کردەی شکڵ پێدان، فۆڕم بەندی، وێنەکێشانەوە.

**شکل پذیر:** فۆڕم وەرگر/گر، دەقگر.

**شکل دادن:** 1) فۆڕم پێدان، شکڵ پێدان. 2) بە شێوەی ڕێکوپێك دەرهێنان.

**شکل داستانی:** فۆڕمی گێڕانەوەیی.

**شکل دهندە:** فۆڕمدەر، شکڵدەر.

**شکل کردن:** دەمەلاسکێ کردن.

**شکل گرایی:** "فۆڕمالیزم".

**شکل گرفتن:** 1) فۆڕم گرتن، دەق گرتن، شکڵ گرتن.2) وەدیهاتن، هاتنەدی. 3) حاڵەت و چۆنیەتی باش پەیاکردن.

**شکلگیری:** فۆڕم گرتن، شکڵ گرتن.

**شکلك:** دەمەلاسکێ، لاسایی کردنەوە.

**شکلیدن:** ڕووشاندن، ڕووکاندن.

**شکم:** 1) زگ، سك، گەدە. 2) کۆئەندامی هەرس کردن. 3) مناڵدان. 4) هەرکام لە کەرەتەکانی زاوزێ. 5) هەناو، ناوەوە. خۆراك. "**شکم آوردن**": قەڵەوبوون و هاتنەپێشی زگ. "**شکم دادن**": سك دان. "**شکم رفتن**": سکچوون، سکەشۆرە. "**شکم کسی بالاآمدن**": سکپڕبوون. "**شکم کسی بە پشت چسبیدن**": زۆر لەڕ و لاواز بوون. "**شکم کسی را پارەکردن (دریدن، سفرەکردن)**": بە توندی سزادان و تەمبێ کردنی ئەو یان بە توندی ئازاردانی ئەو. "**از سر شکم حرف زدن**": قسەی قۆڕ و بێبناغەکردن. "**از شکم کسی زدن**": تێرنەکردن، خۆراکی تەواو پێنەدان. "**تە شکم کسی را گرفتن**": برسیەتی ڕەواندنەوەی





ئەو. "**چیزی بە شکم کسی بستن**": 1) دەرخواردی ئەودان. 2) وتنی شتێ بەو.

**شکم بارە:** زۆرخۆروچڵێس، فرەخۆر، پووتەك، فارزك.

**شکم بندە:** بڕوانە:"شکم پرست".

**شکمبە:** ورگ، عرك، عوور، عووير، عويرگ، کرش، کەرش، گرگ.

**شکم بە آب زن:** بریتی لە هەڵەخەرج، ئەبلەخەرج.

**شکم پایان:** بوونەوەرانێ کە لەسەر ماسوولکەکانی سکیان دەخزێن.

**شکم پرست:** تەشپیتڕێن، نەوسن، چڵ، چڵەك، چڵێس، چڵێز، چڵێك، چەفتليس، کاسەلێس، کولب، کولبەوی، زگ لەوەڕێن، زکین، زکوونی، کەرخۆر، پێلۆ، کولافی، حەف حەفی، زۆرخۆر، هەڵمەتەکاسە، نوشگل، چاوچنۆك بۆ خواردن، چەورە، نەفسەك.

**شکم پرستی:** چڵێسی، نەوسنی، زگ لەوەڕێنی، زکوونی، چەورەیی، هەفهەفیاتی، نفت.

**شکم پرور:** خۆرا، زۆرخۆر، فرەخۆر، خۆش خۆر، تەشپیتڕێن، چڵێس، زك لەوەڕێن.

**شکم چرانی:** زەلاندن، زگ لەوەڕاندن، زگ لەوەڕێنی.

**شکم خالی:** برسی.

**شکم خوار/شکم خوارە:** زۆرخۆر، فرەخۆر، خۆرا، کەرخۆر.

**شکم خوارگی:** بریتی لە فرەخۆری، زۆرخۆری.

**شکم دار:** بریتی لە زۆرخۆر، خوارۆخ، و کەسێ کە زگی زلی هەیە، ورگن، سك زل.

**شکم درد:** سکێشە، زگ ئێشە.

**شکم دریدە:** سك دڕاو، سکن، زۆرخۆر.

**شکم ران:** 1) خۆرا، واردۆخ، زۆرخۆر، زگ لەوەڕێن، سکدڕاو. 2) سنامەکی، دەرمانی ڕەوانی.

**شکم رو/روش/روە:** بڕوانە: "اسهال".

**شکم سیری:** سك تێری، خۆش بژیوی و ئاسوودەیی و بێ ئاگابوون لە نەداری.

**شکم گندە:** 1) گرگن، گەدگن، سك زل، زگ زل، هورگن، ورگن. 2) زگدڕاو، فرەخۆر، خۆرا. 3) دەوڵەمەند یان خاوەنی پلەو پۆست.

**شکمو:** سکن، زگن، زگ زل، زۆرخۆر، خۆهرا، فارزك، کەرخۆر، چڵەك، نەوسن، چڵێس، گنۆیی.

**شکم وار:** بە قەرای سکێك، بە ڕادەی خۆراکێك.

**شکن:** 1) چرچ و لۆچی قوماش، چەم و خەمی ئەگریجە.2) شەپۆل. 3) بێ هێزی و سستی. 4) سروود. "**شکن در شکن**": پێچاوپێچ، پێچەڵاوپێچ.

**شکنج:** 1) لوولی ئەگریجە. 2) هەر کام لە چینەکانی بەسەریەکاکەوتوو. 3) ئەشکەنجە، ئازار. 4) مەکر و فێڵ. 5) سروود.

**شكنجه:** ئەشكەنجە، جەزرەبە، ئازار، جەڕومەنگەنە، تراز. "**شكنجەدادن(كردن)**": ئەشكەنجەدان، ئازاردان. "**شكنجەشدن**": ئەشكەنجەدران، جەزرەبەدران.
**شكنجەگاە:** سزاخانە، جێگەی ئازاردن، ئەشكەنجەگا.
**شكنجەگر:** ئەشكەنجەدەر.
**شكنجيدن:** (شِ. کَ.دَ) ئەشكەنجەكردن، جەزرەبەدان، ئازاردان.
**شكنجيدن:** (شِ.کُ.دَ) هەڵ قورينجان، چرنۆق گرتن.
**شكندگرى:** ڕەخنەی تاڵ و لەسەر دڵ گران، تانە و تەشەر.
**شكن كارى:** بەزاندن و بێدەنگ كردنی كەسێك بە تانە و توانج.
**شكن گير:** شەپۆلاوی، بەپێل.
**شكننده:** 1) لاواز، لەرزۆك، ناسك، تورت، شكێنەر. 2) وردكەر. 3) داشكێنەر. 4) ئازاردەر.
**شكنه:** (شِ.کَ.نَ) ناز، غەمزە، عيشوە.
**شكوات:** كۆی "شكوە".
**شكوخ:** ساتمە، سەرسم، خليسك. خەتا.
**شكوخندگى:** خليسكان، خريكين، خەشكين.
**شكوخيدن:** هەڵەنگوتن، سەرسم بردن، خليسكان. ترسان، ترسيان.

**شكور:** (شَ.کُ) 1) پاداشت دەر، بدەری پاداشتی فراوان بۆ كاری بچووك. 2) شوكرانەبژێر، سپاسكار
**شكوفاشدن:** 1) هەڵدان، گەشەكردن، گەشانەوە، گەشيان، گەشيانەوە، گەشينەوە، تێراو و شەق و تورت بوون، هەراش بوون، بەخۆداهاتن، هاتن بەخۆدا، فەنزين. 2) پەرەگرتن، پەرەسەندن، پێشكەوتن. "**استعدادهاى شكوفا**": بەهرە پشكوتووەكان/گەشەسەندوەكان.
**شكوفاننده:** گەشەكەر، هەڵدەر.
**شكوفايى:** 1) پشكوتن، گوڵ دەركردن. 2) پێشكەوتن، برەو.
**شكوفتن:** بڕوانە: "شكوفيدن".
**شكوفه:** خونچە، گوڵی دار، چرۆ، گوڵووك. ڕشانەوە. "**بەشكوفه نشستن**": چرۆكردن، خونچەكردن.
**شكوفه دادن:** گوڵ كردن، خونچەكردن. ڕووناكيدان.
**شكوفەكردن(زدن):** 1) چرۆكردن، خونچەكردن، گوڵ كردن. 2) ڕشانەوە، هەڵێنانەوە.
**شكوفيدن:** 1) خونچەكردن، چرۆدەركردن، والابوون، كرانەوە. 2) درزپێدان، قلێشاندن، تێشكاندنی لەشكر.
**شكوك:** (شُ.کُ) كۆی "شك".
**شكوه:** (شُ.کُ.ه) شكۆ، پايەبەرزی، گەورەيی. "**شكوه داشتن**": ڕێزهەبوون، حورمەت هەبوون.





**شكوه:** (شِ.وَ) 1) گلەيی، گازندە، سكاڵا. 2) نەخۆشی، نەخۆشين، ناساغی. 3) ناڵە، هاوار. "**شكوه داشتن**": گلەيی هەبوون. "**شكوەكردن**": دەردەدڵكردن، گلەيی لە بەخت كردن، گازندەكردن، لاكايا، لاكايە.
**شكوهش كردن:** هێز و گەورەيی خۆنيشاندان.
**شكوهمند:** بەشكۆ، بەشان و شكۆ، مەزن.
**شكوەنامە:** شكايەتنامە.
**شكوهە:** شكۆ، شان و شكۆ، گەورەيی. جوانی.
**شكوهيدن:** (شُ.کُ) پاراستنی گەورەيی و شكۆی كەسێك و ڕێزلێگرتنی.
**شكوهيدن:** (شِ.کُ) ترسيان، سام كردن، چاوشكان.
**شكوى:** گلەيی كردن، گازندەكردن. گلەيی، سكاڵا، شكايەت.
**شكەشدن:** ڕاچەنين، ڕاچڵەكين، داتروسكان، داچڵەكين، داچڵەكان، تاسان، شڵەژان، بۆ مانای زياتر بڕوانە: "يكەخوردن". "**شكەشدە**": داچڵەكاو، داچڵەكياگ، داچڵەكيو، شڵەژاو.
**شكەكردن:** ڕاچەناندن، ڕاچڵەكاندن، داتروسكاندن، داتوروسكانن، داچڵەكاندن، داچڵەكانن، داخورپاندن.
**شكهيدن:** (ش.ک.ه.د) شڵەژان، پەشۆكان، بێئۆقرەبوون، ترسيان.

**شكيب:** سەبر و ئارام، سەبرو حەوسەڵە، لەسەرخۆيی، قەری.
**شكيبا:** بەسەبروحەوسەڵە، خاوەن حەوسەلە، بەسەبروپشوو، پشوو لەسەرخۆ، لەسەرخۆ، لسەرخۆ، سەرەخۆ، پشوودرێژ، بەپشوو، بەتاقەت، نەفەس درێژ، كاوەخۆ، هێدی، هێمن، ئارام، جەرگ قايم، بەگير، بەگيرگە، خۆڕاگر، پڕزوو، دلفراوان، دڵفرەوان.
**شكيبايى:** قنيات، تەسەلا، سەبر و حەوسەلە، (پشوو)لەسەرخۆيی، پشوودرێژی، سەمەت، ئارامی، شێنەيی، نتم.
**شكيبيدن:** سەبروحەوسەلەكردن، ئۆقرەگرتن، هەدادان، هێوربوونەوە، تاقەت هێنان.
**شكير:** بڕوانە: "شكور".
**شكيفتن:** بڕوانە: "شكيبيدن".
**شكيل:** جوان و قەشەنگ، بەژن و باڵاڕێك، بەژن و باڵا جوان.
**شگال:** (شِ) درز و كەلێنی قووڵ لە زەویدا، چاڵ.
**شگالە:** بەتەواوی.
**شگرد:** شێوە، فەن و شێوەی كردار، فووت و فەن، تێكنيك.
**شگرف:** 1) سەير، سەمەرە، سەرسووڕهێنەر، دەگمەن و بێ هاوتا لە جوانی و چاكيدا. 2) گرينگ. 3) بەهێز، بەتوانا.

**شگرفی:** چاکەیی و جوانی.

**شگفت:** سەمەر، سەمەرە، سەیر، سۆبەت، سەرسام. سەیر و سەرسوورهێنەر. "**شگفت آمدن کسی را**": سەرسوورمانی ئەو. "**بە شگفت( درشگفت )آمدن**": سەرسوورمان، سەرسام بوون.

**شگفت آور:** سەیروسەمەرە، سەرسووڕێن، هەیهۆلان.

**شگفت انگیز:** سەرسوورهێنەر، سەرسامکەر، سەیروسەمەرە.

**شگفت زدە:** حەپەساو، واق وڕماو، سەرسووڕماو، واق وڕبووگ.

**شگفتن:** سەرسووڕمان، واق وڕمان، سەرسام بوون.

**شگفتی:** سەرسووڕمان، سەرزڤڕین، سەرزڤڕان، واق وڕمان، واق وڕبوون، حەپەسان، پەشۆکان. سەرسوورهێنەر، سەرسامکەر.

**شگفتیدن:** سەرسووڕمان، واق وڕمان، سەرسام بوون، وڕبوون.

**شگوم:** بڕوانە: "شگون".

**شگون:** ودم، ورمێ، هورم، بەخت، ماراو، فەڕ، پیرۆزی و موبارەکی.

**شل:** (شُ) 1) شل، سست، نەرم، تراو. 2) کەسی سست و بێ هێز و تەوەزەل. "**شل آمدن درکاری**": بەدوادانەچوون، پێدانەگری لەو کارەدا. "**شل شدن**": شل بوونەوە. "**شل و شوفتە**": شپرزە و شێواو. "**شل و شید**": سست و بێحاڵ. شلوێل. "**شل و لق**": شل و شەوێق و نەبەگە.

**شلافە:** ژنی بێ حەیا و بێ شەرم.

**شلاّق:** بڕوانە: "تازیانە".

**شلاق زدن:** بەقامچی لێدان، شەلاقکاری.

**شلاق کش:** 1) توند. 2) بەپەلە، بەخێرایی.

**شلال:** (شَ) ساف و بریقەدەر. "**شلال دادن**": خۆبادان و بەناز و ئەدا ڕۆیشتن.

**شلال:** (شِ) 1) تەقەڵی درشت. 2) گروپی پەرتەوازە. 3) گروپێ کە وشترەکان لێدەخوڕن. "**شلال کردن**": دوورینی قوماش بە دەست، تەقەڵی درشت لێدان.

**شلان شلان:** شەلەشەل.

**شلتاق:** 1) تەشقەڵە، تەشخەڵە، گەڕ، دەبە، دەببە، شلّتاغ، شلّتاخ، حەچەل، گێچەڵ، گیتەڵە، گغنی، چاچۆلە، چووڕ، گەڕ، گیڕە، بیانووپێگرتن. 2) قواقو، زەنازەنا، هەراوهوریا.

**شلتوك:** چەڵتووك، شەبلووك، برنجی بە تێکوڵەوە.

**شلتوك کاری:** برنج کاری، چاندنی برنج.

**شلختە:** شپرزە، شپڕێو، شلەپەتە، شل و شەوێق، قوون لێ کەوتوو.

**شل شلکی:** بەسستی و بێحاڵی.

**شلف:** سۆزانی، جندە، قەحبە.

**شلق:** داقڵیشاندن لە درێژاییدا. بە قامچی لە کەسێك دان.





**شلنگ:** هەڵپەڕداپەڕ، هەڵبەزینەوە، شەقاو. "**شلنگ انداختن**": بەهەنگاوگەلی گەورە و نارێك ڕێ ڕۆیشتن، شەقاونان.

**شلنگ** (و) **تختە:** بڕوانە: "جست و خیز".

**شلوار خود را خراب کردن:** 1) میز بەخۆداکردن. 2) زۆرترسان.

**شلوار کسی دو تا شدن:** بریتی لە باشتر بوونی باری ماڵی ئەو.

**شلوغ:** ژلوق، ژلوقان، ژلوقیان، شلووق، قواقوو، زەنازەنا، قەڕەباڵغ، پڕ حەشیمەت، پڕهەراوهوریا، پڕجموجۆڵ و پڕهەراوهوریا، ئاپۆڕە و جمەی خەڵکی، تێکەڵ پێکەڵ و بێ سەرەوبەرە.

**شلوغ کردن:** 1) قەرەباڵغی کردن، هاتو هاوارکردن، هەراوزەناکردن، قوولەقوول کردن. 2) لەناوبردنی تەکووز و ڕێکوپێکی شوێنێك. 3) زیادپێوەنان، لەڕادەبەدەر گەورەکردنەوەی بابەتێ. 4) ئاژاوە و پشێوی نانەوە.

**شلوغکاری:** هاتو هاوار و پشێوی نانەوە.

**شلوغ(و)پلوغ:** تێکەڵ پێکەڵ و نارێکوپێك، ئاڵۆز. پڕهەراوهوریا.

**شلوغی:** حەشروحەلا، حەشەڕەڵا، قەڕەباڵغ، پڕایی زۆری خەڵك، هەراوهوریا، هەراوزەنا، هەراوهوریای تێکەڵ و پێکەڵ، چەقەوگوڕە، هاوهاجی.

**شلەشلەکردن:** بەتوندی بریندارکردن.

**شلەکردن:** بڕوانە: "قصاص کردن".

**شلیدن:** شەل بوون.

**شلیك کردن:** تەقەکردن، تەقاندن، تەقانن، پێوەنان، هاویژتن، هاویشتن، نایيش پا، نایيش پرا.

**شمّ:** بۆن کردن.

**شماتت:** 1) خۆشحاڵی دەربڕین بە خەم و مەینەتی کەسانی دی و تانە لێدانیان. 2) سەرکۆنە، سەرزەنشت، لۆمە.

**شمّاخ:** 1) فرە بەرز. 2) سەربەرز، سەربڵیند، لووت بەرز و بەفیز.

**شمار:** ژمار، ژمارە، ژمێرە، هەژمار، هەژمارە، هژمار، ئەژماه، بژار، بژارە، حەساو، حیساب. ڕێسای نووسین و خوێندنەوەی ژمارەکان. تیراژ. زانستی حەساو. "**شمارانـدرآوردن**": حەساوکردن، ژماردن. "**شمار داشتن**": 1) حەساوکردن، حەساوی شتێ ڕاگرتن. 2) سەروکار هەبوون. پێوەندی هەبوون. "**بەشمارآمدن**": لەبەرچاوگیران، ژمێران. "**روزشمار**": 1) ڕۆژی حەساو، ڕۆژی قیامەت. 2) ڕۆژژمێر.

**شمارخوان:** مەئموری خوێندنەوەی کۆنتۆڕ.

**شماردن:** بڕوانە: "شمردن".

**شمارش:** ژماردن، ژمارتن، ئەژمارتن. "**شمارش معکوس**": ژماردنی پێچەوانە.

**شمارش پذیر:** لەژمارهاتن، شیاوی ژماردن.

**شمارش گر:** ماشێن حەساو.

**شمارك:** بڕوانە:"بارم".

**شمارگان:** تیراژ.

**شمارگانی:** ژمارەیی. تیراژی.

**شمارگاە:** مەحشەر، ڕۆژی پەسلان.

**شمارگر:** ژمارەگەر، ژماریار، ژمێریار. ماشێن حەساو.

**شمارمند:** زۆروزەوەند، فراوان.

**شمارنا پذیر:** لەژمارنەهاتو، بێئەژمار.

**شمارنامە:** نامەی کردار.

**شمارە:** 1) نمرە. 2) ژمارە. "**شمارەبرداشتن**": نووسینی ژمارەی شتێ، ژمارە هەڵگرتنەوە. "**شمارە حساب:** ژمارە حەساو. "**شمارەزدن**": ژمارەلێدان. "**شمارەکردن**": ژمارەکردن، ژمارەدانان. حەساوکردن، ژماردن. "**شمارەگرفتن**": ژمارەگرتن. "**شمارەیك**": ژمارەیەك، گرینگ، سەرەکی.

**شمارەگاە:** بڕوانە:"شمارگاە".

**شماری:** ژمارەیەك، سنووردار و کەم.

**شماس:** جانکوش، خزمەتکاری کلیسا.

**شماگند:** بڕوانە:"متعفن".

**شمال:** باکوور، بەرانبەری باشوور. "**باد شمال**": شەماڵ.

**شمالگان:** ئەو سەرزەوییانەی کە لە جەمسەری باکوور هەڵکەوتوون.

**شمان:** ترس لە دڵ، پەشۆکاو و پەرێشان.

**شمانیدن:** پەشۆکاندن، پەرێشان کردن، سڵەماندنەوە، ترساندن.

**شمایل:** شکڵ، وێنە، شێوە، گارە، ڕوخسار، خوو و خسڵەتەباشەکان. "ئایکۆن".

**شمایل نگاری:** شێوەکاری.

**شمر:** (شَ.مَ) تالاو، حەوزۆکە.

**شمردن:** 1) ژماردن، ژمارتن، ژمارەکردن، هەژمارتن، هەژماردن، هێژمارتن، هەژمراندن، ئەژمارتن، بژاردن، بژارتن، شماردن، حەساوکردن، هومارتش. 2) شیکردنەوە، وتن. 3) دان. 4) بڕوانە: "گذراندن".

**شمردە:** 1) ژمێردراو، ژمێراو، هەژماردی، هەژماردە، هەڵبژێراو، هەڵبژاردە، بژێراو، ئەژماردە. 2) لەسەرەخۆ و بەئەسپایی (قدم های شمردە). 3) تەواو. 4) سنووردار، کەم. 5) جوان و ڕێکوپێك قسەکردن، یەك یەك قسەکردن.

**شمرش:** بڕوانە:"شمارش".

**شمریدن:** بڕوانە:"شمردن".

**شمش:** قورسە، لۆك، تۆڵا، کلۆی ساف لە زێڕ و زێو.

**شمشادقد:** باڵابەرز، ئەوەی بەژن و باڵای وەك داری شمشاد بەرز و ڕاستە.

**شمشادگون:** بە ڕەنگی شمشاد، سەوز ڕەنگ وەك شمشاد.

**شمشیر را غلاف کردن:** 1) شمشێر خستنە کالانەوە. 2) وازهێنان لە ئەنجامدانی کارێك بە هۆی ترس.

**شمشیرزدن:** شەڕکردن بە شمشێر.

**شمشیرزن:** 1) شمشێرلێدەر، شیروەشێن. 2) ئازا و شەڕکەر.





**شمشیرکشیدن:** لە کالان دەرهێنانی شمشێر، دەرکێشانی شمشێر لە کایلان بەمەبەستی شەڕ کردن.

**شمشیرگر:** شوورگەر، شیرگەر، شمشێرساز.

**شمع:** مۆم، شەم، شەمێ. ئەستێرە. "**شمع افروختن**": مۆم دایساندن، هەڵکردنی مۆم. "**شمع جمع**": هۆی برەو و گەرمی کۆڕ و ئەنجومەن. "**شمع کردن**": مۆم دروست کردن. هەڵکردنی مۆم. "**شمع کشتن**": مۆم کووژاندنەوە.

**شمعدان:** شەمدان، شەمان، شەمدو، شەمسۆز، مۆمدان.

**شمع ریز:** شەم چێکەر، مۆمکەر.

**شمعك:** مۆمك، شەمی بچووك. پاڵەوانە.

**شمغند:** بڕوانە:"شماگند".

**شمل:** حەشیمەت، گروپ، کۆمەڵ.

**شملال:** خێرا، تیژڕەو، خۆشبەز.

**شمنیسم:** جۆرێ ئاکار و بیرۆکە لەسەر بنەمای سێحر و جادوو کە لە ناو هێندی و چینی و ئیسکیموو و سوورپێستەکان دا باوە.

**شموس:** دێز، سەرکێش، شەمووز، جووتەهاوێژ.

**شمول:** گرتنەوە، گشتگیر، هەموو لا لێگرتن، دەورەدان، ئاخڵەدان، لەخۆگرتن.

**شمولیّت:** گرتنەوە، سەرلەبەرگیری، لەخۆگری، گشتگیری.

**شموم:** 1) بۆنکەر. 2) بۆنخۆش.

**شمّە:** (شَ.مَ) 1) بۆنی کەم. 2) یەکجار بۆن کردن. 3) کەم، کێم، کەموکە، بەحاڵ، تۆزقاڵ.

**شمیدگی:** بێزاری، خۆش نەویستن.

**شمّەای:** کەمێ، کەمەکێ، کەموسکەیەك، هێندێك، پاژێکی کەم، تۆزێ، نەختێ.

**شمیدن:** 1) ترسان، ڕەوینەوە، سڵەمینەوە. 2) لەهۆش چوون، لەسەرخۆچوون، پەشۆکان. 3) بڕوانە: "آشفتن". 4) لە بێ ئاویدا وشکبوون. 5) بۆنکردن.

**شمیدە:** ڕەویو، سڵەمیو، پەشۆکاو، لەخۆچوو.

**شمیم:** بۆنی خۆش.

**شمین:** بۆنخۆش.

**شنا:** مەلە، مەلێ، سۆباهی، سۆبایی.

**شنابر:** مەلەوان، مەلەوان.

**شناخت:** لۆژیك، "ئەبستیم"، ناسان، ناسین، ناسیاوی، ناسیاری، لێ شارەزابوون، بەحاڵ و باڵ زانین، فامین و تێگەیشتن، ئاشنایەتی، زانیاری.

**شناخت شناسی:** بڕوانە:"معرفت شناسی".

**شناخت پدیدە:** لۆژیکی دیاردە.

**شناخت چندگانە:** لۆژیکی چەندلایەنە.

**شناختن:** ناسین، ناس کرن، ئاشنابوون، زانین، تێگەیشتن دەگەڵ کەسێك ئاشنایەتی هەبوون، هەبوونی دۆستایەتی. "**بازشناختن**": ناسینەوە، شباندن، دیتن و کەوتنەوەبیر.

**شناختەشدن:** ناسران، شناس بوون. "**شناختەشدە**": ناودار، ناڤدار، سەر بە دەرەوە، ناسراو، ناسیاگ، ناسیاو، شناس.

**شناختی:** تێگەیینی، ناسانە.

**شنار:** (شِ) بڕوانە:"شنا".

**شنار:** (شَ) 1) شوورەیی، ناحەزترین عەیب. 2) نگریس، دۆبڕ، بێفەڕ.

**شناژ:** شناژ، کردەی دروست کردن و پێکەوەگرێدانی پاژەکانی بناغەی بینایەك.

**شناس:** لۆژیك، ئەبستیم. "**شناس کردن**": ناسین، ناس کرن.

**شناسا:** 1) بەرناس. 2) زانا و ئاگا، ئاگادار، بەئاگا. 3) ناسراو."**شناساشدن**": بوونە هەڤاڵ و ئاشنا. "**شناساکردن**": 1) ناساندن، پێناسین. 2) ئاگادار و بەئاگاکردنەوە. 3) پێشکەش کردن، خستنەڕوو.

**شناساگر/شناسگر:** 1) (کیمیا) ئەندیکاتۆر، ماددەیەکە کە لە بەرامبەر ماددەگەلی دیکەدا ڕەنگ دەگۆڕێ. 2) جیاکەرەوە.

**شناساگری کردن:** وەسف کردن.

**شناساندن:** ناساندن، ئاشناکردن، پێ ناسین.

**شناساننده:** پێناسێن، ئاشناکەر.

**شناسایی:** 1 ) ئاگایی و زانیاری سەبارەت بە شوناس یان تایبەتمەندیی شتێ یان کەسێك. 2) دەستنیشانکردن، شناسایی، شوناسایی، ناسین، ناسینەوە. 3) ئاشنایی. 4) کردەی بە فەڕمی ناسینی دەوڵەتێکی تازەسەربەخۆ یان دەوڵەتێ بە دۆخێکی نوێوە لە لایەن دەوڵەتێکیترەوە. 5) بڕوانە: "معرفت". "**شناسایی دادن**": خۆناساندن. "**شناسایی داشتن**": ئاشنایی هەبوون، زانیاری هەبوون. "**کارت شناسایی**": پێناسە، کارتی پێناس، ناسنامە.

**شناسنامه:** پێناس، پێناسە، ناسنامە، سەرنامە. "**شناسنامه کسی باطل شدن**": بریتی لە مردنی ئەو.

**شناسنده:** 1) بەرناس. 2) ئەوەی کەسێ یان شتێ بناسێ، ئاگادار، (بە)ئاگا. 3) بڕوانە: "عارف".

**شناسه:** 1) ڕاناوی لکاوی بکەری، "شوناسە". 2) نیشان.

**شناسیدن:** بڕوانە:"شناختن".

**شناعت:** 1) ناحەزی، ناشیرینی، خراپی. 2) سەرزەنشت، تانە.

**شناگر:** مەلەزان، مەلەوان، مەلەڤان، مەلۆو، سۆبایی کەر.

**شناگری:** مەلەوانی، مەلۆنی، مەلەکردن، سۆبایی کرن.

**شناو:** بڕوانە:"شنا".

**شناور:** سەراوی، سەرئاوکەوتوو، مەلەوەر، ئەوەی لەسەر ئاو مەلە دەکا. لەحاڵی مەلەکردندا. مەلەوان. پاپۆڕ (شناورجنگی: پاپۆڕی شەڕکەر).





**شناوری:** مەلەوەری، مەلەکردن لە سەر ئاو.

**شناه:** بڕوانە:"شنا".

**شنایع:** کۆی"شنیعە"، ناحەزیەکان، خراوییەکان.

**شنبه:** شەم، شەمۆ، شەمبۆ، شەممۆ، شەمە، شەممە.

**شن پوش:** زیخ پۆش.

**شنج:** 1) کەپك، لووتکە، پێشکۆ. 2) زەوی سەخت و بەکەندوکلۆ.

**شندر:** بڕوانە: "پارە". "**شندرپندر**": 1) کۆنە و ڕزیو. 2) کۆنەپۆش، شڕۆڵ، بەرگ دڕاو.

**شنزار:** چاولگ، خیزەڵان، زیخەڵان، زیخەڵانی، زوخڕۆنەك، زخدان، خرپ، شخەڵ.

**شنعت:** 1) تانە، سەرزەنشت. 2) ناحەزی، خراپی.

**شنف:** (شَ.نَ) ڕق و دوژمنی.

**شنف:** (شَ) گوارە.

**شنفتن:** بڕوانە:"شنیدن".

**شنق:** (شَ) ئەڵقاوێزکردن، خنکاندن بە سێدارە، لەسێدارەدان.

**شنگ:** (شَ) 1) شۆخ و ناسك، قەشەنگ، دەلال، سپەهی. 2) بێ شەرم، بێ حەیا. 3) دز، چەتە، ڕێگر. 4) بڕوانە: "سرزنش".

**شنگال:** سفت و پتەو، ڕەق، ڕەق هەڵاتو.

**شنگرف گون:** ئاماڵ سوور، بە ڕەنگی سوور.

**شنگل:** (شَ.گُ) لەسەرکەیف و دڵخۆش، شۆخ و ناسك، جوان، دەلال، سەرخۆش، سەرمەست.

**شنگول:** بڕوانە:"شنگل". "**شنگول منگول**": شاد و بەکەیف.

**شنگیدن:** 1) حاڵەتی سەرخۆشی لەخۆ نیشان دان. 2) هەوەسی شووکردن. 3) بێزووهەبوون.

**شنوا:** بیسەر، گوێ بیس، گوێگر، ژنەوا.

**شنوانیدن/شنواندن:** بەگوێدادان، ناچار بە بیستن کردن.

**شنوایی:** بیسایی، بیستن، بیسیاری، ژنەوایی. "**شنوایی داشتن**": ملکەچی قسەی کەسێك بوون.

**شنود:** گوێدێر، گوێگر. "**شنود گذاشتن**": زەفت کردن و کۆنتڕۆڵ کردنی قسەی تەلەفوونی کەسێك.

**شنودگاه:** تالاری ئاخێوەری.

**شنودگر:** بڕوانە:"شنوندە".

**شنودن:** بڕوانە:"شنیدن".

**شنوشه:** 1) بڕوانە:"عطسە". 2) سەبر، سەور، تاقەت، خۆڕاگرتن.

**شنونده:** بیسەر، بیسیار، گوێگر، گوێدێر، گوێدەر، گۆهدار، گوهدێر، گوێڕاگر، کەسێ کە قسە یان دەنگێ دەبیستێ.

**شنویدن:** بڕوانە:"شنیدن".

**شنیدار:** کردەی بیستن.

**شنیدن:** بیستن، بیسن، بهیستن، ژنەفتن، ژنەوتن، ژنەوین، ئەژنەفتن، شنەفتن، شنەوتن، گویٚلیٚبوون، گۆهداری. "**دوبارە شنیدن**": بیستنەوە، دووبارە ژنەوتن.

**شنیدنی:** شیاوی بیستن.

**شنیع:** درزێو، ناحەز، خراو.

**شنیعت:** درزێو، کاری ناحەز.

**شواهد:** بەڵگەکان، شایەتەکان، نیشانەکان.

**شوخ:** 1) شۆخ، قسەخۆش، گاڵتەچی، جەفەنگ باز، حەنەکچی. 2) شاد، خۆشحاڵ. 3) نەترس، بوێر. 4) جوان و دلگر. 5) پیشاندەری نەترسی و بیٚ شەرمی.

**شوخ چشم:** 1) ساواز، سای واز، ڕووهەڵماڵاو، ڕووقایم، بیٚشەرم.2) جوان و دلڕفێن.

**شوخ طبع:** دەلکی، جەفەنگ باز، حەنەکچی، شۆخیکەر، قسەخۆشی گاڵتەکەر.

**شوخگن:** چلکن، چەپەڵ، پیس، گەمار، پۆخڵ، ناپاك، لەوت، دۆژین.

**شوخ و شنگ:** خانومان، جوان و دلگر، قەشەنگ و ناسك، دلبەری جوان و ڕێکوپێك، چەلەنگ، ولێو، شۆخ و شەنگ.

**شوخی:** حەنەك، گاڵتە، گەڵتە، گەپ، شۆخی، لەق، گەف. "**شوخی کردن**": گاڵتەکردن، شۆخی کردن.

**شور:** (شُ) 1) سوێر، پڕ خویٚ، خوێدار، سۆڵ، شۆل. 2) پشێوی، هەرا و زەنازەنا، ورووژان و ئاژاوە. 3) یەکێك لە ئاهەنگەکانی مۆسیقای ئێرانی. 4) شەوق، مەیل، سۆز، گوڕوتین. 5) دڵەڕاوکیٚ، نیگەرانی. 6) هۆگریی زۆر، ئەویینداری. "**شورانگیختن (برانگیختن)**": فیتنە و ئاژاوەنانەوە. "**شور بە دل کسی افتادن**": پەرێشان و نیگەران بوونی ئەو. "**شور داشتن**": شەوق هەبوون. "**شورزدن**": نیگەران بوون، دڵ سواربوون، هەبوونی دڵەڕاوکیٚ. "**شور کردن**": 1) پەشێو و نیگەران بوون. 2) ئاژاوە و پشێوی نانەوە. 3) شەوق و سۆز لەخۆشاندن. 4) ناڵەوهەراکردن. "**شور کسی (چیزی) را زدن**": نیگەرانی ئەو بوون. "**شوروشر**": 1) ورووژان و دڵەڕاوکیٚ. 2) فیتنە، ئاژاوە. "**شورو شك**": دڵەڕاوکیٚ و نیگەرانی و دوودڵی. "**شور و شوق**": تامەزرۆیی، تاسەمەندی، شەوق. "**شوروشین**": 1) گریان و ناڵە. 2) فیتنە و ئاژاوە. "**شور و نشاط**": شەوق و شادی. "**شور چیزی را درآوردن (بالاآوردن)**": زێدەڕۆیی کردن لەودا. "**از شور دررفتن**": لە حاڵەتی میانەڕۆیی و ئەنازە دەرچوون.

**شور:** (شَ) ڕاوێژ، تەگبیر، شێور. "**شورکردن**": ڕاوێژکردن، تەگبیرکردن، کۆڵینەوە.





**شورا:** ئەنجومەن، شووڕا، ڕاوێژ، کۆڵینەوە. "**شورا کردن**": ڕاوێژکردن، تەگبیرکردن. "**شورای امنیّت**": ئەنجومەنی ئاسایش.

**شورابە:** 1) ئاوی سوێر، سوێراو. 2) فرمێسك، ئەسرین.

**شوراندن/شورانیدن:** 1) ورووژاندن، هورووژاندن، خرۆشاندن، هەڵ خڕانن، پلەنیان، هاندان، قۆماندن، قۆمانن، شێواندنی کۆمەڵ، فیتنە و ئاژاوە نانەوە. 2) ئاڵۆزکردن، پەرێشان کردن. 3) بەپێل کردن، شەپۆلاوی کردن. 4) بەکاربردن.

**شورانگیز:** 1) سۆزبزوێن، خرۆشێن، وروژێنەر.2) بڕوانە: "فتنەانگیز".

**شوربخت:** بڕوانە: "بدبخت".

**شوربوم:** بڕوانە: "شورەزار".

**شورپشت:** بریتی لە سەرکێش، سەربزێو، نەگونجاو، شەڕاشۆ.

**شورتی:** ژنی شلوشەوێق و شپرزە.

**شورچشم:** چافکەر، چاڤینۆك، چاوپیس، کەسیٚ کە بە چاوەوە دەکا.

**شورسان:** بڕوانە: "شورستان".

**شورستان:** بڕوانە: "شورەزار".

**شورش:** 1) سەربزێوی، سەرکێشی، یاخیگەری. 2) نیگەرانی، دڵەڕاوکیٚ. 3) شۆڕش، ڕاپەڕین، ڕابوون، خرۆشان، وەگوڕوتین کەوتن. 4) ئاژاوە، پشێوی، بیٚ سەرەوبەرەیی. 5) شەوق، ورووژان. 6) بڕوانە: "استفراغ".

**شورش گر:** ڕاپەڕیو، ڕابوو.

**شورمزە:** سوێر، سۆڵ، سور، سۆلۆخوا. "**بسیا شورمزە**": سوێرخویٚ، زۆر سوێر.

**شورمندی:** بڕوانە: "اشتیاق".

**شورناك:** بڕوانە: "شورەزار".

**شورنمایی:** بڕوانە: "اشتیاق".

**شوروغوغا:** ئاژاوە و زەنازەنا، هەرا و هوریا، دادوهاوار.

**شورە:** 1) کرێژ، ، کەلەتۆر، کەلەی، کهەن، شۆرە. 2) شۆراخ، زەوی بیٚداهات.

**شورەزار:** شۆرەکات، شامات، شۆراخ، سێلەك، زەوییەك کە خوێی تێکەڵاوە.

**شوریدگی:** سەرشێوان، سەرسام بوون، پەرێشانی، شێواوی، ئەوین و شێتی.

**شوریدن:** سەربەرزکردنەوە، سەربڵندکردنەوە، شۆڕش کردن، شۆران، ڕاپەڕین بەتووڕەیی، خرۆشیان، ورووژان، وەگوڕوتین کەوتن، هەڵچوون، پەرێشان بوون، شێوان. "**شوریدن بخت**": بەخت هەڵگەڕانەوە.

**شوریدە:** 1) پەشۆکاو، شێواو، پەرێشان، تێکچوو، گۆڕاو، هەستاو، ڕاپەڕیو، ڕابوو، خرۆشاو. 2) ئاشق، شەیدا.

**شوریدە بخت:** بڕوانە: "بدبخت".

**شوریدەحال:** پەشێو، پەشۆکاو، شەمزاو، شێواو، شپرزە، پڕوپەشێو، حاڵ پەرێشان.

**شوریدەدماغ:** شێواو، تێکچوو، شێت، دێوانە.

**شوریدەراە:** گومڕا، لاڕێ، ئاقارێ، بێبڕوا بە خوا، بەدخوو.

**شوریدەرنگ:** سپی یان زەرد هەڵگەڕاو، ڕەنگ پێنەماو، هەڵبزڕکاو، ژاکاو، خەمبار.

**شوریدەروزگار:** بێسەروبەر، هەژار، ڕووت و نەدار، بەلەنگاز.

**شوریدەسر:** بێئۆقرە، بێئارام، هەدانەدەر، پەشۆکاو و پەرێشان.

**شوریدەکار:** شپرێو، شپرزە، کەسێ کە کارەکانی بێ سەرەوبەرە وئاڵۆز بێ.

**شوریدەمغز:** گلاراوی، ماخولیاوی، شێت، دێوانە.

**شوسە:** شۆستە، ڕێگەی خۆشکراو، چەوڕێژکراو، خیزڕێژکراو.

**شوق:** تامەزرۆیی، تاسەمەندی، تاسەباری، ئاواتەخوازی، حەزکردن، ئارەزوو، شەوق. پاڵنەر و خواستێ لە دڵی عارف دا بۆ گەیشتن بە ئامانج. "**شوق داشتن**": مەیل هەبوون، خوازیاربوون. "**شوق و ذوق کردن**": دڵخۆش بوون، خۆشحاڵ بوون.

**شوك:** 1) ڕاتەکان، زەربەیەکی توندی دەروونی کە بە هۆی ترس و ناڕەحەتی و هتد لەکەسێك دەدرێ و ئەو تووشی ناڕەحەتی و بێهێزی دەکا. 2) (پزیشکی) هێدمە. "**شوك عصبی**": (پزیشکی) دەمارەهێدمە. "**شوك آلرژی**": (پزیشکی) پاراستنە هێدمە.

**شوکت:** شکۆ، گەورەیی و پایەبەرزی، هێز و دەسەڵات.

**شول:** (شَ) 1) ئاوی کەم. 2) پیاوی سووك و فرز.

**شولك:** ئەسپی خۆشبەز.

**شولیدن:** شێوان، پەرێشان بوون، دامان و وڕبوون.

**شوم:** 1) بێفەڕ، قەشان، قدۆش، وەیشوومە، نگریس، دۆبڕ، تاڵە، سمسك، بەدودم، بەودم، کۆدقەلین، نەفەس پیس، چاوپیس، شووم. 2) خراو، زیان هێن.

**شومن:** دانەر/دامەزرێنەری پیشانگا.

**شومیز:** زەوی وەردکراو و ئامادە بۆ زرعات.

**شوند:** ئاماژ، کەرەسە.

**شووینیسم:** (سیاسی) شوینیزم، نیشتمان پەرستی دەمارگیرانە، ناسیۆنالیزمی بەرچاوتەنگ.

**شوهاء:** ژنی ڕووترش، ڕووتاڵ، مرومۆچ، ناحەز، نگریس، شووم.

**شوهر:** مێر، مێرد، شوو. "**شوهردادن**": بەشوودان، بەمێرددان. شتێ بە کەسێ دان. "**شوهرکردن**": شووکردن، شوویکرن، مێردکردن.

**شوهرداری:** 1) چاوەدێری و ئاگاداری لە مێرد کردن. 2) ماڵداری، کەیبانوویی.





**شوییدن:** بڕوانە: "شستن".

**شهاب:** شۆڵە، ڕاخوشینی ئەستێرە.

**شهادت:** 1) (شهادت دادن)شایەتی دان، شادەدان، ستووڤدان. 2) (بەشهادت رسیدن)شەهید بوون، کووژران لە ڕێگەی خوا یان نیشتماندا. 3) ئەوەی بۆ مرۆڤ ئاشکراو و دیارە وەك سروشت و جیهانی ماددە. "**عالم شهادت**": دنیای دیار و ئاشکرا، پێچەوانەی دنیای پێوار.

**شهادت نامە:** شادەنامە، بڕوانامە.

**شهامت:** بوێری، نەترسی، ئازایی، زیرەکی، توانایی و گەورەیی و دەسەڵاتدارەتی.

**شهامت یافتن:** ترس لێشکان، وەغیرەت کەوتن، ڕەوینەوەی ترس و خۆف.

**شهبانو:** شاژن، قەڕاڵیچە، مەلەکە.

**شهد:** 1) ڕەواق، ڕنگ، ڕنگاڵ، شیلە، ئەو شیرە تراوەی لە شانەهەنگوین هەڵدەچۆڕێ. 2) هەنگوین. 3) هەرشتێکی دڵپەسند و سازگار.

**شهداء:** کۆی "شهید".

**شهر:** باژێڕ، شار.

**شهرآرا:** شار ڕازێنەوە.

**شهرآشوب:** 1) ئاژاوەگێڕی شار. 2) زۆر جوان و دلگر.

**شهربانو:** شاژن، مەلەکە.

**شهربانی:** شارەوانی.

**شهربند:** 1) دیواری دەوری شار. 2) بەندیخانە. 3) گیراو، کەسێك کە گەمارۆ درابێ.

**شهربندان:** زیندان، گرتووخانە. "**شهربندان کردن**": گرتن، زیندانی کردن.

**شهرت:** ناوبانگ، ناقدەنگ، ناوودەنگ، دەنگ و ناو، نێوبانگ، دەنگان، ئاوازە. "**شهرت بەهم زدن**": ناودەرکردن، ناوبانگ ڕۆیشتن. "**شهرت دادن**": قاوداخستن، دەنگوداخستن. "**شهرت داشتن**": 1) بەناوبانگ بوون، ناودابوون. 2) لەناو خەڵکا بلاوبوون(ەوە). "**شهرت کردن**": 1) ناوبانگدەرکردن، ناوڕۆیشتن. 2) بڵاوبوونەوە لە ناو خەڵکا. "**شهرت یابی**": گەڕان بە دوای ناوبانگ دا، ناوبانگ دۆزی. "**شهرت یافتن (گرفتن)**": بڕوانە: "شهرتکردن".

**شهرت طلب:** خوازیاری ناووناوبانگ بوون.

**شهرچە:** شارۆچکە.

**شهردار:** 1) شاردار، شارەدار. 2) سەرۆکی شارەداری.

**شهرستان:** شارسان، شارستان، شارستێن.

**شهرك:** شارۆچکە، شارۆکە، شارووکە، شاری بچووك.

**شهرگان:** شارنشین.

**شهرگرایی:** شارگەرێتی، شارگەرایی.

**شهرگردان:** تاوانبارێ کە لە شار دا دەیگێڕن تا ڕیسوا بێ.

**شهرنشین:** شارنشین، دانیشتوی شار، شارستانی.

**شهرنشینی:** شارستانیەتی، ژیاری، باژێڕی، شاروەری.
**شهروزە:** سوالکەرێ کە هەر ڕۆژەی لە بەشێکی شار دا بگەڕێ و سوالێ بکا.
**شهروند:** هاوولاتی، شارۆمەند.
**شهروندی:** هاوولاتیبوون، شارۆمەندی.
**شهرە:** ناسراو، بەناوبانگ، ناودار، ناقدار بە چاکە یان خراپە. "**شهرە شهر**": 1) ناودار و ناسراو لە شارێك دا. 2) زۆر بەناوبانگ. "**شهرە آفاق ـ شهرەی عالم**": بەناوبانگ لە گشت جیهان دا.
**شهری:** 1) دانیشتوی شار، شارنشین. 2) خاوەن شارستانێتی. 3) خەلکی ئاسایی.
**شهریار:** شالیار، شالیار، دەسەلاتداری شار، پاشا.
**شهریاری:** پاشایەتی، دەسەلاتدارەتی.
**شهریت:** هەبوونی تایبەتمەندییەکانی شار. شارنشینی.
**شهریدە:** پڕژوبلاو، کەرت و پەرت.
**شهریور:** خەرمانان، شەشەمین مانگی سالێ.
**شهریە:** (کرێی)مانگانە. مووچەی مانگانە.
**شهزادە:** بڕوانە:"شاهزادە".
**شهسان:** شایانە.
**شهقەزدن:** نەڕاندن.
**شهکار:** بڕوانە:"شاهکار".
**شهلەکردن:** جیاکردنەوەی چەوری لە گۆشت. بریندارکردن، شڕوپەتۆرکردن.

**شهلیدن:** لێك هەلوەشان و بلاوبوون، بەش بەش بوون.
**شهم:** بیرتیژ، چالاك، ئازا.
**شهوات:** کۆی"شهوت".
**شهوانی:** زەنەك، سیت بلۆق، زۆر بەئالۆش، ئیشتیا لە گان، گانەك، گاناوی، حەشەری. "**زن شهوانی**": گانەکی، سیت بلۆق، ژنی حەشەری و گاناوی.
**شهوت:** 1) تامەزرۆیی زۆر بۆ شتێ کە خۆشت دەوێ. 2) داوای نەفس، ئارەزوو، هەوەس، مەیلی سیکسی.
**شهوت آلود:** تێکەلێ بە هەوا و هەوەس.
**شهوت انگیز:** هەستئامێز، هەوەس بزوێن، هەوەس (هەلخڕێن، وروژێن).
**شهوت انگیزی:** هەستئامێزی، هەوەس هەلخڕێنی.
**شهوت بار:** هەوەسبار، ئەوەی لە ڕووی هەوا و ئارەزووی زۆرەوە بێ.
**شهوت پرست:** هەستئامێزخواز، هەوەس پەرست، هەشەری، حەشەری، ئەوەی ملکەچی ئارەزووی نەفس بێ، کەسێ کە بەردەوام تامەزرۆی گانە.
**شهوتران:** تۆلاز، چاولەوەڕێن و ژنباز، هۆکێ، هەوەسباز، هەوەسی.
**شهوت کلام:** تامەزرۆیی زۆر بۆ قسەکردن.
**شهود:** 1) کۆی"شاهد". 2) حالەتی ئاشکرابوونی شتێك. 3) دیتنی شتێ، ئاگاداربوون. 4) دیتنی هەق لە دلێ دا.
**شهودیە:** ئاشکرا، ڕوون.





**شهیّ:** 1) پیاوی چاوچنۆك و بەئیرەیی. 2) جوان و هەوەس بزوێن. 3) شتی دلخواز و بەڕمێن و بەتام.
**شهید:** 1) شەهی، شەهید، کووژراو لە ڕێگەی خوا یان نیشتمان. 2) شادە، شایەت، ئاگادار لە ڕووداو.
**شهید پرور:** شەهیدپەروەر، پەروەردەکەری کوڕان و لاوانێ کە خوازیاری گیانبەخت کردنن لە پێناو ئارمانێك دا.
**شهیر:** ناودار، بەناو و دەنگ، بەدەنگ و ناو، ناسراو، سەربەدەرەوە.
**شیاب:** تێکەلێ کردن، ئاوێتەکردن.
**شیّاد:** چەتلەمەر، دەسبڕوفێلباز، گوێبڕ، بەمەکروفێلباز، گورگە.
**شیار:** 1) شوێن و لەلە، شەقار، هێلێ، خەت، کێڕ. 2) زەوی کێلدراو. "**شیارشیار**": خەت خەت، ڕێ ڕێ، شەقارشەقار. "**شیارکردن**": خەت دان، گاسن لە زەویدان، شۆبڕینی زەوی.
**شیاریدن:** شێف بڕین، خەت دانی زەوی بۆ کێلان.
**شیاعت:** ئاشکرابوون، خویابوون.
**شیان:** 1) سزادانەوە. 2) پاداشت دانەوە. 3) قەرەبووکردنەوە.
**شیء:** شت، چت، چشت.
**شیئیّت:** شت بوون، بەشت بوون.
**شیب:** 1) داخز، سەرەولێژی، سەرەوخواری، شوێنی لێژ. 2) شەیدا، شێواو، سەرلێشێواو، پەرێشان. 3) ئەشکەنجە، ئازار. "**شیب تند**": کاشوکووش، سەرەولێژی ڕژد.
**شیبا:** شەیدا، پەشێو، دێوانە.
**شیبان:** لە حالی لەرزین دا، پەرێشان، پەشێو، شێواو.
**شیبانیدن:** 1) وەلەرزەخستن، تەکانی ڕۆحی پێدان. 2) شەیداکردن، پەشێوکردن، شێواندن. 3) تێکەلێ کردن، کردنە هەویر.
**شیبیدن:** 1) لەرزان، لەرینەوە. 2) شەیدابوون، شێوان، پەرێشان بوون.
**شیپورچی:** بۆڕی ژەن، شەیپوور ژەن.
**شیخوخت:** پیربوون، پیری.
**شیخوخیّت:** 1) پیربوون، پیری. 2) گەورەیی و ڕێبەری، پێشەوایی.
**شیخون:** بەتەمەن، بەسالاچوو.
**شید:** (شِ) تیشك، ڕۆشنایی، هەتاو، نوور.
**شیدآوردن:** دەزبڕی کردن، جامبازی کردن.
**شیدآمایی:** (زیندەوەرزانی) فۆتۆسەنتێز.
**شیدا:** شەیدا، دێوانەی عەشق، ئاشق. پەشێو و پەرێشان.
**شیداگر:** دلڕفێن، تەڕلان.
**شیر:** 1) شیر. 2) بڕوانە: "شیرابە". 3) شەڕاب. 4) شیرەخۆرە. "**شیر از راه گوش خوردن**": خافلێ و بێئاگابوون. "**شیر از(ز) ماه(مە) دوشیدن**": جادووکاری کردن. "**از شیر بریدن(بازکردن)**": شیر لێگرتنەوە و لەجیاتی شیر خۆراك پێدان. "**انگشت تو(ی)**

**شیر زدن"**: شۆفاری کردن، دووزمانی کردن.
**"بەشیر"**: شیرخۆرە.
**شیرآموز**: بڕوانە:"شیرخوار".
**شیرابە**: شیلە، شیرە، تراوێ کە لە دار و گیا دەتکێ.
**شیرازە**: شیرازە، بن دروونی پەڕە کتێب پێکەوە. "**شیرازە چیزی از هم گسیختن(گسستن، متلاشی شدن)**": لێك ترازان، شیرازە تێکچوون.
**شیرازەبند**: شیرازەچن، تابەن.
**شیرازەبندی**: تابەنی، شیرازەچنی، بن چنین.
**شیرافکن**: دلێر، بوێر، چاونەترس، پیاوی ئازا و بەهێز کە شێر بدا بە زەویدا و بیکووژێ.
**شیراوژن**: بڕوانە:"شیرافکن".
**شیربرفی**: شێرەبەفرینە، بریتی لە کەسێ کە لە ڕواڵەت دا بەسام و هەیبەتە بەڵام لە ناوەرۆك دا خوێڕی و بوودەڵەیە.
**شیربها**: شیربا، شیربایی، شیروا، شیروایی، قالان، قەرەن، قەلەن، قەلەند.
**شیر پاك خوردە**: حەڵاڵ زایە، ڕەسەن، جسن.
**شیرپنجە**: بریتی لە پەنجەقەوی، پڕزۆر، بەقەوەت.
**شیرتوشیر**: ئاڵۆز، ناڕێکوپێك.
**شیرجەرفتن**: لوورهاتنەخوار، غیژکرن.
**شیرچنگ**: بڕوانە:"شیرپنجە".
**شیرخشت مزاجی**: بڕوانە:"هم جنس باز".
**شیرخشتی**: بڕوانە:"شیرخشت مزاجی".
**شیرخوار(ە)**: شیرخۆر، شیرخۆرە، شیرەخۆرە، شیرمژ، (لە)بەرمەمکان، مەمك خۆر، مەمك خۆرە.
**شیرخور(ە)**: بڕوانە:"شیرخوار".
**شیردرفش**: وێنەی شێر لە سەر ئاڵا.
**شیردل**: بریتی لە بەغیرەت، بەجەرگ، جەرگ قایم، بوێر، گەڕناس.
**شیردوش**: بێری، بێریڤان، شیردۆش، دادۆش، مەڕدۆش، دۆشەری ئاژەڵ.
**شیردە**: شیرا، شیردار، شیردەر، بەشیر، گیانداری کە شیر دەدا.
**شیررگ**: ئازا، بەهێز.
**شیرزاد**: 1) بەچکەشێر، لە شێر بوو. 2) ئازا، بەجەرگ.
**شیرزد/شیرزدە**: منالێ کە لە کاتی ساوایی دا شیری کەمی خواردوە و لاواز و کز مابێتەوە.
**شیرزن**: شێرەژن، ژنی بەجەرگ و لەسەرخۆ.
**شیرزور**: ئەوەی قەوەت و زۆری شێری هەیە، دلێر و پڕزۆر وەك شێر.
**شیرژیان**: شێری دڕندە.
**شیرسار**: وەك کەللەسەری شێر.
**شیرسگ**: بریتی لە سەگی چالاك و بەقەوەت.
**شیرشرزە**: شێری تووڕە، شێری دڕندە.
**شیرشکار**: کەسێ کە شێر ڕاو دەکا، پیاوی دلێر، بەجەرگ.





**شیرشکری**: ڕەنگی سپی ئامالێ زەرد.
**شیرعلم**: وێنەی شێر کە لەسەر ئاڵا کێشرابێتەوە.
**شیرفش**: وەك شێر، شێرئاسا، ئازا و دلێر وەك شێر.
**شیرفهم**: بەباشی تێگەیشتن، حاڵیبوون. "**شیرفهم کردن**": تێگەیاندنی بابەتێ بە کەسی گەمژە و کەم زەین.
**شیرك**: 1) شێری چکۆلە. 2) کەسی بوێر و بەجەرگ. 3) شیلە، شیرە. "**شیرك شدن**": بوێر و ئازابوون، زات پەیاکردن.
**شیرکچی**: خاوەن مەیخانە، ئارەق فرۆش.
**شیرکردن/شیرك کردن**: زات و ورە وەبەردانی کەسێك و هاندانی بۆ ئەنجامدانی کارێك.
**شیرگی**: کەسی گیرۆدە بە شیرەی تریاك.
**شیرگیر**: 1) ڕاوکەری شێر، شێرگر. 2) ئازا و دلێر. سەرخۆش.
**شیرمان**: وەك شێر، دلێر، بەجەرگ.
**شیرمرد**: شێرا، پیاوی دلێر، نەترس، ئازا، جەرگ قایم.
**شیر مرغ**: بریتی لە شتی نایاب و گیرنەکەوتوو، شتێ کە بوونی نیە چونکە مریشك شیر نادا.
**شیروار**: وەك شێر، شێرئاسا.
**شیرور**: بڕوانە:"شیردە".
**شیروش**: (ش.وَ) شێرئاسا، وەك شێر، وێرا، نەترس.
**شیرە**: شیرە، دۆشاو.
**شیرەخانە**: 1) شوێنێ کە شیرەی تریاکی تێدادەکێشن. 2) مەیخانە.
**شیری**: 1) شیرکی، بە ڕەنگی شیر. 2) شیرەخۆرە.
**شیرین**: 1) شیرین. 2) لەبەردڵان، خوێن شیرین، ئێسك سووك، دلگر. 3) بەڕێز، خۆشەویست. 4) بەخاترجەمی(پنجاه سال را شیرین داشت). "**شیرین شدن**": شیرین بوون. بەڕێزبوون. "**شیرین کاشتن**": ئەنجامدانی کارێك بە شێوەیەکی باش و جوان.
**شیرین دهن**: کەسێ کە دەم و لێوی جوان و لەباری هەیە، لێونەقوڵی، دەم نوقڵ. خاوەنی زاری جوان.
**شیرین زبان**: زمان شیرن، زمان شیرین، خۆش زوان، خۆش زوبان، زمان خۆش، قسەخۆش، دەم و ڕاوێژخۆش، دڤنەرم، زمانپاراو، قسەڕەوان.
**شیرین زبانی**: خۆش زوانی، زمان خۆشی، زمان پاراوی، قسەڕەوانی.
**شیرین سخن**: دەڤ خۆش، ڕاوێژخۆش، قسەخۆش، خۆش وێژ.
**شیرین شمایل**: جوان چاك، خوەشك، ئەوەی ڕوخسار و ئەندامی جوان و لەباری هەیە.
**شیرین قلم**: خەت جوان، خەت خۆش.
**شیرین کار**: شیرینکار، کارجوان.
**شیرین کاری**: شیرینکاری، هونەرنوێنی، دەست ڕەنگینی، کاری جوان و سەرنجراکێش کردن.

**شیرین گوار:** بەتام، خۆش چێژ.

**شیزوفرنی:** بڕوانە:"جنون جوانی".

**شیشکی:** شیڕ، جرت، چورت، زڕت، ڤت، عەفتە.

**شیشکی بستن:** جڕداهێلان، جڕداهێشتن، زڕت کێشان، شیڕداهێتن.

**شیشله:** سست و بێهێز، کەسێ کە دەست و پێی شل و بێهێز بێ.

**شیشەباز:** بریتی لە فێڵباز، مەکرباز، مزاور، تەڕدەست.

**شیشەبر:** شووشەبڕ، شووشەکار، جامچی.

**شیشه بر سر بازار شکستن:** درکاندنی ڕاز.

**شیشه بر سنگ زدن:** بڕوانە:"رسواکردن".

**شیشەجان:** کەسێ کە بە توندی چاوەدێری سلامەتی و گیانی خۆیەتی.

**شیشەخانه:** ویترین.

**شیشەکار:** شووشەگەر، کەسێ کە جام دروست دەکا.

**شیشەگر:** شووشەگەر، کەسێ جام دروست دەکا.

**شیشەگردان:** بریتی لە کەڵەکباز، فێڵباز، تەڕدەست، چاوبەست.

**شیشەگردن:** بریتی لە گەمژە، گەوج، بێئاوەز.

**شیطان:** 1) شەیتان، مەلەک تاوس، بنەمای خراپە، سەرپێچ، سەرکێش، دێو، ئیبلیس.2) پڕجموجۆڵ و بزۆز. "**شیطان به (توی، در، زیر) جلد (پوست) کسی رفتن (افتادن)**": کەڵکەڵەبوون بۆ ئەنجامدانی کاری نەشیاو. "**شیطان را درس دادن**": بریتی لە فرە فێڵاوی و زیرەك بوون، لە کوردیدا دەڵێن دەرسی شەیتانیش دادەدا. "**شیطان را در شیشه کردن**": زاڵبوون بەسەر شەیتان دا.

**شیطانی:** 1) گونجڕانە، بەدفەڕانە. 2) هاروهاجی، بزۆزی، بەدفەڕی. "**شیطانی شدن**": شەیتانی بوون، ڕەحەت بوون لە خەودا، گان لە خەودا. "**شیطانی کردن**": 1) هاروهاجیکردن، بەدفەڕیکردن. 2) ئەنجامدانی کارگەلی مەترسیدار.

**شیطنت:** 1) هاروهاجی، بەدفەڕی، بزۆزی، هەڤانی، سەگایەتی، کاری سەگانە، کەلپەی، شلۆقی. 2) کێلپەنی، فێڵبازی و درۆزنی، شەیتانی کردن، سەرکێشی و نافەرمانیکردن. 3) بەدکاری و دووڕوویی و نیازپیسی. 4) فریودان و بەلاڕێدابردن. 5) شۆخی.

**شیطنت باز:** هاروهاج، نەگونجاو، بزۆز، دیڤۆك.

**شیعه:** شیعە، کۆمەڵێ لە موسڵمانان کە بڕوایان بە جێنشینی حەزرەتی عەلی هەیە. پێڕەو. "**شیعی**": 1) پێڕەوی ئایینی شێعە. 2) یەك کەس لە شیعە.

**شیفت:** نۆبەی کار.

**شیفتگی:** شەیدایی، شەیدابوون، ئاشقی.

**شیفتن:** 1) شەیدابوون، ئاشق بوون، دڵدان. 2) فریودان، خەڵەتاندن. 3) پەرێشان بوون، بێ ئۆقرەبوون.





**شیفته:** 1) ئاشق، شەیدا. 2) شێت، دێوانە.

**شیفتی:** بەنۆبە.

**شیفر:** ژمارە، نمرە، نرخ، ڕەمز، نیشانە.

**شیك:** 1) قۆز، قەشەنگ، کەشخە، جوان، لۆکس، ناسك، نەرم و نیان، ڕێك و لەبار و بەرچاو، فەرز، لهەڤ. 2) جۆرێك سەما.

**شیك پوش:** تەڕپۆش، تەڕەنداز، خۆش پۆش، دڵتەڕ، کەسێ کە جلوبەرگی جوان دەبەر دەکا.

**شیلان:** میوانی. خۆراك، خواردەمەنی. "**شیلان کشیدن**": سازدانی جێژن و میوانی تێروتەسەل.

**شیله:** (شِ.لَ) فێڵ، تەڵەکە، کەڵەك، مەکر، دهۆ. "**بی شیله/بی شیله و پیله**": بێ شێلوبێلە، بێ شێلە و بێلە، بێ فێڵ و تەڵەکە، ساف و سادە.

**شیماء:** ژنی خاڵدار.

**شیموترا پی:** چارەسەری کیمیایی.

**شیمیایی:** شیمیایی، کیمیایی. چێکراو بەهۆی دژکردەوە شیمیاییەکان.

**شیمی دان:** شیمیزان، کیمیازان، "شیمیست".

**شیمیست:** بڕوانە:"شیمی دان".

**شین:** (شَ) عەیب، شوورەیی، ناحەزی.

**شیناب:** بڕوانە:"شنا".

**شینتو:** ئایینی خەڵکی ژاپۆن.

**شیوا:** ڕەوان، یەکیەك و ڕوون و دڵنشین. تەڕزوان، دەماوەر، قسەڕەوان.

**شیوان:** تێکەڵاو و لەسەر یەك. لەرۆك، لەرزۆك.

**شیوانگر:** شتێ کە دەلەرێتەوە.

**شیواندن/شیوانیدن:** بڕوانە:"شیبانیدن".

**شیوع:** 1) تەشەنەسەندن و بڵاوبوونەوە، هەمووگری، پەرەگرتن، پەرەسەندن. 2) ئاشکرا و خویا بوون، دەرکەوتن. 3) وترانی قسەیەك بەشێوەی زاربەزار. 4) بوونەباو.

**شیون:** چەمەر، چەمبەر، شەپۆڕ، شین و شەپۆڕ، کەوگری، کتارو، گریەوڕۆ، گریەوڕۆڕۆ، وەشەت. "**شیون کردن (زدن، کشیدن)**": شین و شەپۆڕکردن، شیوەن گێڕان، گریان و ناڵاندن. "**شیون و شین**": گریان و ناڵە.

**شیوه:** شێوە، شێواز، شێل، ئوسلووب. چەشن، ڕێسا، ڕێ و شوێن. فێڵ، تەڵەکە. ناز، خەمزە. حاڵەت، دۆخ. "**شیوەتولید**": لە ئابووری مارکسیستیدا واتە تێکەڵی پێوەندیی بەرهەمهێنان و وزەبەرهەمهێنەکان. "**شیوەگفتار**": دەڤۆك، شێوەی ئاخافتن.

**شیوەکار/شیوەباز:** بڕوانە:"شیوەگر".

**شیوەگر:** ئەوەی خاوەن شێوە یان شێوازێکە، دڵبەرێ کەگشت فەننەکانی دڵبەری بزانێ و بەکاری ببا، مەکرباز، فێڵباز.

**شیوەگری:** 1) نازوکریشمە، نازفرۆشی. 2) مەکربازی، فێڵبازی.

**شیویدن:** ئاوێتەکردن، ئاوێتەکران، تێکـەڵ بوون. لەرزان، وەلەرزین کەوتن.

**شیهە:** حیلە، حینە، دەنگی ئەسپ.

**شـیهەزدن** (**کـشیدن**)**:** حیلانـدن، هیلانـدن، شهین.

**شیهەکردن:** بڕوانە: "شیهەزدن".

# ص

**صائــب:** 1) ڕاس، ئەنگێـوەر، پـێـکەر. 2) ڕاست و دروست، تەواو.

**صائد:** ڕاوکەر، نێچیرڤان.

**صائغ:** زێرینگەر. داڕێژ.

**صائم:** بەڕۆژوو، ڕۆژووەوان. **"صائم الدهر"**: کەسێك کە تەواوی ڕۆژەکانی ساڵ بەڕۆژوو بێ.

**صابر:** بەسەبروپشوو، لەسەرخۆ، پشوودرێژ، سەبرکەر.

**صابی:** پێڕەوی ئایینی "صابئین".

**صابئین:** گروپێکی ئایینی کە ئەستێرە و بوتەکانیان دەپەرست و لەو بڕوایەدابوون کە جیهان ئافرێنەرێکی بەتوانا و زانای هەیە کە نزیك بوونەوە لەو تەنیا بەهۆی بوونەوەرە ڕووحانیەکانەوە ئەگەری هەیە.

**صاحب:** 1) خاوەن، خاوەند، خاون، خودان، خێو، خێوەند، ماخۆ، ماڵخۆ، وایر، وایەر، وەهەر، وەندە، وەیر، وەئەر، یار، داژدار، ساحێو، ساحێب. 2) سەروەر، ئاغا. 3) دەسەڵاتدار، حاکم. **"صاحب چیزی(کسی)شدن"**: بوونە خاوەنی، وەدەستهێنانی ئەو. **"صاحب دست"**: داینەدە، دڵاوا، بەدڵ، بەخشنە. **"صاحب دعوت"**: میواندار، خانەخوێ، داوەتکەر. **"صاحب شریعت (شرع)"**: پێغەمبەر. **"صاحب صبر"**: خودا. **"صاحب صدر"**: خاوەن پۆست **"دارای صاحب"**: خاوەندار، بەخاوەن.

**صاحب احسان:** خێراندار، خێرەومەند، خاوەن چاکە.

**صاحب اختیار:** سەرپشك، خاوەن دەسەڵات، خاوەن ئیختیار.

**صاحب اسرار:** ڕازگر، ڕازڤان، ڕازدار، سوڕهەڵگر.

**صاحب اصول:** مۆسیقازان، مۆسیقاژەن.

**صاحب الجیش:** سپاسالار،سەرکردەی سپا.

**صاحب امتیاز:** سەرپشك، ناقبەر، خاوەن ئیمتیاز.

**صاحب بیان:** چیرۆك ڤان، چیرۆك گێڕەوە.

**صاحب تسخیر:** بڕوانە:"جن گیر".

**صاحب ترجمه:** کەسێك کە بەسەرهاتەکەی دەنووسنەوە.

**صاحب تشریف:** بەڕێز و خۆشەویست.





**صاحب تصرف:** 1) زەوتکەر، داگیرکەر، مالك. 2) پیرێ کە ئاگای لە ناخی موریدە و دەتوانێ ئاڵوگۆڕی وەسەربێنێ.

**صاحب جاه:** خاوەنی پۆست و پلە، خاوەنی ڕێز و پێگە، ڕێزدار.

**صاحب جیش:** سپاسالار، سپاڕان.

**صاحب حدیث:** بڕوانە:"محدّث".

**صاحب شدن:** بوونەخاوەن، بەخاوەن بوون، داژداری، وایرەی، وایری، وایەرەر.

**صاحب خانه:** 1) خاوەنی ماڵ. 2) خانەخوێ.

**صاحب خبر:** 1) ئاگا، بەخەبەر، زانا. 2) هەواڵگەێن، ڕاپۆرتدەر، پەیامبەر. 3) سیخوڕ، زمانگر، زیرەوان.

**صاحب خرد:** ئاقڵ، ژیر، بەئاوەز، ئاوەزمەند.

**صاحب خیال:** دوودڵ، بەگومان.

**صاحب خیر:** خاوەن چاکە، خێرەومەند، چاکەکار.

**صاحب داری:** چاوەدێری و ئاگالێبوون.

**صاحب درد:** 1) بەئازار، لەش بەبار، دەردەدار.2) لێقەوماو، بەڵالێدراو.

**صاحب دل:** 1) بوێر، بەغیرەت، دلێر. 2) خوانــاس، تەرکەدنیا. 3) خاوەنی زەوقی هونەری و ناسك.

**صاحب دلق:** 1) پیاگی بەرگ دڕاو، شڕۆڵ، جل شڕ.2) سۆفی.

**صاحب دولت:** 1) ساماندار، دەوڵەمەند، زەنگین. 2) بەختەوەر، خۆشبەخت. 3) پاشا، دەسەڵاتدار.

**صاحب دیوان:** چاوەدێری خەزێنە و دارایی دەوڵەت، وەئەستۆگری سامان و داراییەکانی حکوومەت.

**صاحب رأی:** خاوەن ڕا و تەگبیر، بەتەگبیر.

**صاحب زبان:** بڕوانە:"شیرین زبان".

**صاحب سخن:** وتاربێژ، پەیڤەر، ئاخێوەر.

**صاحب سر:** بڕوانە:"رازدار".

**صاحب سریر:** خاوەنی تەختی پاشایی، پاشا.

**صاحب سفره:** میوانەوین، میوان دۆست، بەخزمەت.

**صاحب شمشیر:** خەباتکار، شەڕکەر.

**صاحب عزا:** بڕوانە: "عزادار".

**صاحب عقیده:** بڕوامەند، باوەڕدار، بەبڕوا.

**صاحب عله:** بڕیاردەری سەرەکی.

**صاحب عنوان:** 1) خاوەنی پۆست یان نازناو. 2) بەشەخسییەت.

**صاحب غار:** نازناوی حەزرەتی ئەبووبەکر کە دەگەڵ پێغەمبەر چووە ئەشکەوت.

**صاحب غرض:** غەرەزاوی، قین لە دڵ.

**صاحب فراش:** نەخۆشێ کە لە جێ دا کەوتبێ.

**صاحب فکر:** بیرمەند، بیریار، بیرەوەر.

**صاحب فن:** شارەزا لە فەنێکا. ئاگا و کارزان.

**صاحب قبول:** وەرگیراو لە لایەن خەڵکەوە، قبوولکراو.

**صاحب قدم:** 1) هەنگاونەر بۆ کارێ. 2) پیری خاوەن بڕشت و کاریگەری.

**صاحب قرابت:** ئەوەی بەشەمیراتی لە یاسادا بەوردی دیاری نەکراوە.
**صاحب قلم:** نووسەر.
**صاحب قول:** خۆش قەول، خۆش بەڵێن.
**صاحب قیاس:** خاوەن ڕا، خاوەن بۆچوون.
**صاحب کار:** 1) خاوەن کار. 2) ئەوەی کارێ ئەنجام دەدا. 3) پسپۆڕ یان شارەزا لە کارێکا.
**صاحب کلام:** بڕوانە:"سخنور".
**صاحب کلاه:** خاوەن تاج، پاشا. "**صاحب کلاهی**": پاشایەتی.
**صاحب کمر:** پاشا، دەسەڵاتدار.
**صاحب کمند:** ڕاوچی، ڕاوکەر.
**صاحب لسان:** زمان پاراو، زوان دار، قسەزان، دەمەوەر.
**صاحب ماتم:** تازیەدار، پرسەدار، سوێدار.
**صاحب مال:** ساماندار، دەوڵەمەند.
**صاحب مرده:** ئەوەی خاوەنەکەی مردبێ، خاوەن مردگ، بێ خاوەن.
**صاحب مرض:** نەخۆش، ناساغ، دەردەدار.
**صاحب مقام:** خاوەن پلەو پۆستی گرینگ.
**صاحب منصب:** 1) خاوەنی پلە و شوغڵی بەرز. 2) کەسێك کە خاوەنی پلە و پۆستی دەوڵەتی یان سەربازی بێ.
**صاحب نام:** بەناوبانگ، بەناودەنگ، بناڤ و دەنگ، بەناڤ، ناودار، ناڤدار، ناسراو، سەربەدەرەوە.
**صاحب نسق:** بڕوانە:"داروغە".
**صاحب نصاب:** 1) سامانێ کە زۆربووە و زەکاتی دەکەوێ. 2) دەوڵەمەند، دارا، زەنگین. 3) بڕوانە: "بهرەمند". 4) دەوڵەمەند و پایەبەرز.
**صاحب نظر:** 1) خاوەن ڕا، خاوەن بۆچوون، ئاگا. 2) هیممەت بەرز، ئیرادەبەرز. 3) کەسێك کە جوانی خۆش دەوێ و چێژ لە دیتنی دەبا.
**صاحب نفس:** ئەوەی قسە و نزای قبووڵ دەکرێ.
**صاحب ولایت:** پیر، ڕێبەر.
**صاحبه:** ژن، خێزان.
**صاحب هنر:** هونەرمەند، خاوەن هونەر.
**صاحب یسار:** دەوڵەمەند، ساماندار، زەنگین.
**صادرآمدن:** دەربڕان، درکان، دەرخران.
**صادرات:** دەرکردە، هەناردە، ناردە.
**صادر اوّل:** ئاوەزی یەکەم.
**صادرشدن:** 1) هەناردران، ناردران. 2) هاتنەدی، وەدیهاتن. 3) هاتنە قۆناغی کردەوەوە. 4) دەربڕان، درکان. "**صادرشده**": هەنێراو، هەناردراو.
**صادرکردن:** 1) ناردنەدەرەوە. 2) پێڕاگەیاندنی بابەتێ یان شتێ بە کەسێ یان سەبارەت بەکەسێ بە شێوەی نووسراوە یان زارەکی. 3) نووسین و حەواڵەکردن.
**صادرکنندگان:** هەناردکاران.
**صادرکننده:** هەناردکار.





**صادره:** 1) دەرچوو، دەرچووی. 2) ناردراو، نێردراو.
**صادق:** ڕاستۆك، ڕاس بێژ، ڕاستگۆ، سەرڕاست. "**صادق درآمدن**": ڕاست دەرهاتن. "**صادق القول**": خۆش قەول، خۆش بەڵێن. "**صادق الوعد**": کەسێك کە وادەکەی خۆی بەرێتە سەر.
**صادقانه:** ڕاستگۆیانە، بەدروستی.
**صارف:** بەرگێڕەوە، کۆسپ.
**صارم:** 1) شمشێری تیژ. 2) شێری درِندە. 3) پیاگی بوێر، ئازا. 4) بڕنە، بڕ.
**صاع:** 1) یەکەیەکی پێوانی کێش، پێوانە. 2) پەیمانە. "**صاع در بار کسی نهادن**": تۆمەت لێدان لەو.
**صاعد:** سەرکەوتوو، کەسێ کە چووبێتە سەر. "**صاعد کردن**": چوونەسەر، ڕۆیشتنەبان.
**صاعقه:** 1) هەورەتریشقە، بروسکە. 2) بەڵای ئاسمانی دڵتەزین و سامهێن. "**صاعقه‌آسا**": بروسکەئاسا.
**صاف:** 1) ساف، لووس، شایك، خز، وێژە، بێگنج، بێ گرێ وگنج، بێ چرچولۆچی، حولی. 2) ڕێك، تەخت، بەبێچاڵوچۆڵی. 3) ڕوون، دیار، ساف. 4) هەتاوی، ساف. 5) بەبێ خواروخێچی، ڕاستەوڕاست، ڕاستەڕێ. 6) پاك، بەبێ ڕیا و ساختەکاری.7) ڕوون، ئاشکرا، بەبێ لێڵی یان ئالۆزی. "**صاف صاف**": بەڕاشکاوی، بێشەرمانە. ڕێك و ڕاست. "**صاف و پوست کنده**": بەڕوونی و ئاشکرایی و بەبێتێبینی و پەردەپۆش کردن. "**صاف و راست**": سەرڕاست، ڕاستۆك. ڕاستگۆیانە. "**صاف و ساده**": بێڕیا و ڕووڕاست، یەکدڵ. دڵساف، دڵپاك، ساویلکە. "**صاف و صوف**": 1) بەبێچرچولۆچی، بەبێکەندوکڵۆو ناڕێکی. 2) بەبێڕق و نێوان ناخۆشی. "**آسمان صاف**": ساو، سامالّ.
**صاف شدن:** لووسبوون، ساف بوون، لە زبری ڕزگاربوون، ڕێك بوون.
**صافکار:** لووسکار، سافکار، کەسێ شتی زبر ساف دەکا.
**صافکاری:** لووسکاری، سافکاری، کاری لووسکار.
**صاف کردن:** 1) ساف کردن، لووس کردنی چرچولۆچ، دەق دان. 2) لەسافیدان، پاڵاوتن. 3) یەکلاکردنەوە.
**صافی:** 1) پاڵوێنە، پاڵێوکە، پارزن، پارزون، پارزنگ، پارزۆنگ، ڕاوك، ڕاوەك، نەسەل، فیلتێر. 2) لووسی، سافی، دژی زبری. 3) خاوێن و ڕوون، ڕوون و پاك، بێ خەوش، بێگەرد. 4) بەتاڵ، خاڵی. 5) بەئاسوودەیی و بێ شەڕوکێشە. "**از صافی گذراندن**": 1) لە سافیدان. 2) هەڵبژاردن بە لێکۆڵینەوە و تاوتوێ.
**صافی درون:** دەروون پاك.
**صافی دل:** 1) دڵپاك، دڵپاقژ، دڵساف، بێڕق و کینە. 2) ساف و ڕوون.
**صافی شدن:** پاك و خاوێن بوونەوە، بێ خەوش بوونەوە.

**صافی کردن:** لەناوبردنی دوژمنان، سڕینەوەی دوژمنان.

**صافیه:** زەوییەك کە خاوەنەکانی کۆچیان کردوە یان مردوون و میراتگرێك لەوان نەماوەتەوە.

**صالح:** 1) پیاوچاك. 2) باش، چاك، چاکەکار. 3) خاوەنی بڕوا و کرداری دروستی دینی.

**صامت:** مات، کڕ، کپ، بێدەنگ. "**صامت و ناطق**": کۆی زێڕوزێو و چوارپێ کە لە خاوەندارێتی کەسێك دایە.

**صانع:** 1) خولقێنەر، چێکەر، سازێنەر، دروستکەر. 2) پیشەساز، سنعاتکار.

**صبا:** بایەك کە لە خۆرهەڵاتەوە هەڵ بکا.

**صباح:** بەیانی، شەوەکی، سۆزی. "**چندصباح (صباحی)**": چەند ڕۆژ(ی)، ماوەیەکی کورت. "**هر چند صباح**": هەر چەند وەخت جارێك.

**صباح الخیر:** بەیانی باش.

**صباحت:** جوانی، شۆخ و شەنگی، قەشەنگی.

**صبّار:** زۆر لەسەرخۆ، فرە بەپشوو.

**صباغ:** ڕەنگ.

**صبّاغ:** خومچی، خومڕێژ، ڕەنگڕێژ.

**صباغت:** ڕەنگڕێژی، خومگەری.

**صباوت:** منالی، مندالی.

**صبح:** بەیانی، سبەی، سەرەتای ڕۆژ. "**صبح آخر (آخرین، پسین، دوم)**": بڕوانە: "صبح صادق". "**صبح ازل**": سەرەتای ئافراندن. "**صبح اوّل صبح (صبحی)**": بەیانی زوو. "**صبح بام**": بەیانی زوو. "**صبح دروغ**": بڕوانە: "صبح کاذب". "**صبح دولت (دولت کسی) دمیدن**": بەختەوەربوونی ئەو. "**صبح سحر**": بەیانی زوو. "**صبح صادق**": بەیانی ڕوون، هەوەڵی بەیان. "**صبح ظهور**": سەرەتای ئافراندن، سەرەتای خولقاندن. "**صبح کاذب**": بوومەلێڵە، کازیوەی بەیان. "**صبح نخست (نخستین، اول)**": بڕوانە: "صبح کاذب".

**صبح آسا:** وەك بەیانی، وەك بەیانی ڕوون.

**صبحانه:** نانی بەیانی، نانی سەرلەبەیان، ناشتا، بەرچایی، ژێرقلیان، قاوەتوون، قاوەتی، قاوەلتی.

**صبح خیز:** زووڕاب.

**صبحدم:** کاتی بەیانی، بەرەبەیان، هەوەڵ بەیان.

**صبحدمان:** بەکاتی بەیانان.

**صبح رو:** ڕووسپی، دەموچاوسپی.

**صبح سعادت:** سەرەتای بەختەوەری.

**صبح شدن:** ڕووناك بوونەوەی هەوا، ڕۆژبوونەوە.

**صبح فام:** سپی، ڕوون، بەڕەنگی بەیانی.

**صبح فش:** وەك بەیانی، سپی و ڕوون.

**صبحگاه:** کاتی بەیانی، سبەینێ. بەرنامەیەك کە هەموو ڕۆژێ بەیانان لە پادگانەکان یان شوێنە نیزامییەکان بە هەڵدانی ئالاّ و خوێندنەوەی سروود دەست پێدەکا.





**صبح وار:** سپی و ڕوون، وەك بەیانان، بەیانی ئاسا.

**صبح وش:** بڕوانە: "صبح فش".

**صبر:** سەور، سەبر، تاقەت، تەحەممولّ، خۆڕاگرتن، دان بەخۆداگرتن، خۆگرتن، تاقەت و پشوودرێژی، لەسەرخۆیی، دایاخ، ئارامی. "**صبرآمدن**": سەبرهاتن، لە کاتی پژمین دا دەوترێ. "**صبر کردن**": سەورکردن، خۆڕاگرتن، دان بەخۆداگرتن. چاوەڕوانیکردن بۆ گەیشتنی کاتی پێویست.

**صبرسوز:** پشووبڕ، لەتاقەت بەدەر، لەتاقەت نەهاتو.

**صبغه:** 1) ڕەنگ. 2) حاڵەت، تایبەتمەندی. "**صبغة اللّه**": ئایینی خوا، ئایینی ئیسلام. "**صبغه محلی**": ڕەنگ و ڕووی ناوچەیی.

**صبوح:** هەر شتێ کە بەیانی بیخۆن یان بینۆشن. "**صبوحی**": شەڕابێ کە بەیانی زوو بیخۆنەوە. "**صبوحی زدن**": خواردنەوەی شەڕاب لە بەیانان دا.

**صبور:** بەسەبروحەوسەلە، بەسەبروپشوو، لەسەرخۆ، هێمن، سەماس، خۆڕاگر، بەگیر، بەگیرگە.

**صبوری:** بەرایی، بەکێش، سەبرهاتن، سەبووری(هاتن)، پشوودرێژی، لەسەرخۆیی، ئۆقرەیی.

**صبیح:** جوان، قەشەنگ، خوشیك. دەم بەپێکەنین و خۆشحاڵ.

**صبیر:** 1) بڕوانە: "صابر".2) کەفیل و جێ متمانەی قەوم.

**صحاف:** پەڕەچن، بەرگ تێگر.

**صحافی:** جزوبەند، بەرگ تێگرتن. پەرتووك فرۆش.

**صحبت:** قسەکردن، باس کردن، دوان، گوتن، پەیڤین، کوتن، ئاخاوتن، ئاخافتن. یاروهاودەم بوون، هاوڕێیەتی. هاونشینیکردن دەگەڵ خەڵکی. "**صحبت با کسی پیوستن**": هاونشین بوون دەگەڵ ئەو. "**صحبت راندن**": قسەکردن، گفتوگۆکردن. "**سر صحبت را (با کسی) بازکردن**": سەری قسەکردنەوە.

**صحبت جو:** 1) خوازیاری هاونشینی و تێکەڵی دەگەڵ کەسێك. 2) خوازیار و تامەزرۆی ئاوێتەبوونی سێکسی بوون.

**صحت:** 1) سلاّمەتی، تەندروستی، لەش ساغی. 2) ڕاستی، دروستی. "**صحت خواب**": بەکەسێ دەوترێ کە تازە لە خەو هەستابێ. "**صحت عمل**": سەرڕاستی، ڕاست کرداری. "**صحت مزاج**": لەش ساغی. "**صحت و سقم**": دروستی و نادروستی، ڕاستی و ناڕاستی.

**صحرا:** 1) بیابان، سارا، قووزی، چۆلگە. 2) گۆڕەپانی شەڕ. "**صحرای بی چون**": جیهانی پێوار. "**صحرای رزم**": شەڕگە، گۆڕەپانی شەڕ. "**به (بر) صحرا فکندن (افکندن)**": وێڵ کردن، خستنەلاوە، وازهێنان.

**صحرابر:** بڕوانە: "صحرانورد".

**صحراگذار:** بڕوانە: "صحرانورد".

**صحراگرد:** بڕوانە: "صحرانورد".

**صحرانشین:** دەشتەکی، کۆچەری، چۆڵپەرست، سارانشین، چادرنشین.

**صحرانورد:** چۆڵگەڕ، بیاوانگەڕ.

**صحرایی:** 1) بیابانی، پەروەردەبووی سارا. 2) ئەوەی لە بیابان دا ئەنجام دەدرێ. 3) ئازاد، سەربەست. 4) سارانشین، کۆچەری. 5) ئاژەڵی هۆقی. "**صحرایی شدن**": ئاشکرابوون.

**صحن:** 1) دیمەن، بەرجەوەن. 2) ناوەڕاستی حەوشە، هەرێمی ماڵ. 3) قاپ، دەفر. 4) گۆڕەپان، فەزا، پانتایی.

**صحنه:** 1) گۆڕەپان. 2) (لە شانۆدا) شوێنی هونەرنواندن، سێن. 3) زەوی تەخت، جێگەی بەرفرە. 4) دیمەن. 5) شوێنی ئەنجام بوونی کارێ یان ڕووداوێ.

**صحنه‌آرایی:** 1) دیمەن ڕازاندنەوە، "میزانسێن". 2) شیکردنەوە و وەسفی دیمەنەکان.

**صحنه پردازی:** دیمەن ڕازاندنەوە.

**صحنه‌سازی:** دیمەن ڕازێنەوە. شانۆسازی، چێکرنی دۆخ و حاڵەتێکی درۆیین و دەسکرد بۆ سەرنج ڕاکێشانی دیتران.

**صحنه‌گردان:** 1) (سینەما) بەڕێوەبەری دیمەن. 2) داڕێژەر و ڕێنوێنیکەری ڕووداوێك بە ئامانجی پیلانگێڕانە.

**صحنه نمایش:** سەکۆی شانۆ، سێن.

**صحه:** واژۆکردنی نووسراوەیەك بە نیشانەی پشت ڕاستکردنەوەی ناوەڕۆکەکەی.

**صحیح:** ڕاست، دروست، بێ هەڵە، تەواو. ساغ، سالم، بێ کەمووکووڕی. ڕاست کردار. "**صحیح کردن**": نمرەپێدان بە تاقیکاریی قوتابیان. "**صحیح و سالم**": ساغ و سلامەت. سالم، بێ کەموکووڕی یان خراپی.

**صحیفه:** 1) نامە. 2)کتێب. 3) ڕۆژنامە. 4) پەڕ، لاپەڕ.

**صخره:** گاشەبەرد، کەمز، کەفر، کەڤر، هێرك، بەردی زەلام.

**صدا:** بانگ، دەنگ، گازی، گاسی، قاو. "**صداآمدن**": بەگوێ گەیشتنی دەنگ، دەنگ هاتن. "**صدا ازکسی درنیامدن**": 1) بەتەواوی بێدەنگ بوون، دەنگ لێوەنەهاتن، قڕوقەپ کردن. 2) ملدانی ئەو، تەسلیم بوونی ئەو، ناڕەزایەتی دەرنەبڕینی ئەو. "**صدا به صدا دادن**": هاودەنگ بوون. "**صدا تو(ی) جایی (چیزی) پیچیدن**": دەنگ دانەوە. "**صدا تو(ی) صدا افتادن**": زۆر قەرەباڵغ و پڕ هەرا و هوریابوون. "**صدا دادن**": دەنگ دان، دەنگدانەوە، زرینگانەوە. "**صدا درآوردن**": دەنگ دەرهێنان. "**صدا(را) در صدا انداختن**": بەیەکەوە خوێندن. "**صدا را ول دادن**": بەدەنگی بەرز قسەکردن، هەرا کردن. "**صدای چیزی (را) درآوردن**": لاسایی‌کردنەوەی ئەو، دەنگی ئەو دەرێنان. "**صدای چیزی را درنیاوردن**": قسەنەکردن لەبارەی ئەوەوە، بێدەنگی لێکردن، شاردنەوەی ئەو. "**صدای حاد**": دەنگی زیل، دەنگی تیژ. "**صدای خود را بریدن**": بێدەنگ بوون، متەق لێوەنەهاتن. "**صدای کلفت**": دەنگی بۆڕ، دەنگی گڕ. "**صدای کسی (چیزی) افتادن**": 1) بڕانی دەنگی ئەو. 2) بێدەنگ بوونی ئەو. "**صدای کسی (چیزی) خوابیدن**": بڕانی دەنگی ئەو، بێدەنگ بوونی ئەو. "**صدای کسی (چیزی) را بریدن**": بێدەنگ کردنی ئەو. "**صدای کسی را درآوردن**": لاساییکردنەوەی ئەو. "**از صدا افتادن**": بێ دەنگ بوون، دەنگ لێ بڕان، لەدەنگ کەوتن، دەنگ نەکردن. "**به صدا درآمدن**": 1) قسە دەستپێکردن. 2) دەست پێکران. 3) دەنگ لێوەهاتن. 4) ناڕەزایەتی دەربڕین.





**صدا بر:** (بَ) دەنگ بەر، دەنگبەرە، دەنگەوەرە، میکرۆفۆن.

**صدابردار:** دەنگ هەڵگرەوە.

**صدابرداری:** دەنگ هەڵگرتن، کاروباری(دەنگ).

**صدا پیچیدن:** دەنگ دانەوە، گەڕانەوەی دەنگ.

**صداخفه‌کن:** دەنگ بڕ، دەنگ کپ کەر.

**صدادار:** 1) دەنگ دار، بەرانبەری بێ دەنگ. 2) خاوەنی دەنگی ڕەسا.

**صدارت:** باڵانشینی، لەپێشەوەبوون، پێشەنگی. پۆستی سەرەك وەزیر، سەرەك وەزیری.

**صدازدن:** دەنگ کردن، بانگ کردن، قاوکردن، گازیکرن، گاسیکردن، جاڕدان.

**صداسازی:** دەنگ سازی.

**صداع دادن:** بوونە هۆی زەحمەت پێدان، لەکۆڵ نەبوونەوە، تەنگ پێ هەڵچنین.

**صداق:** 1) دۆستایەتیکردن بە پاکی. 2) مارەیی، مارەبڕی، مارەبڕانە، ماکەلە، کاوین.

**صداقت:** یەکڕوویی، یەکڕەنگی، ڕاستی‌ودروستی، ڕاستێتی، دۆستایەتی بێفرتوفێڵ، گیانی برایەتی، دژی دووڕوویی.

**صداکردن:** بانگ کردن، گازی‌کرن، بە دەنگ هەرا لێکردن. 2) بانگهێشت کردن، خوازتن. 3) دەنگ لێوەهاتن، دەنگ لێ بەرزبوونەوە. 4) ناوبانگ دەرکردن، دەنگدانەوە.

**صداگذاری:** دەنگ دانان.

**صداگرفتگی:** دەنگ کەوتن، دەنگ گیران، دەنگ گیریان، دەنگ نووسان، دەنگ دەرنەهاتن، گەرووگیران.

**صداگرفته:** دەنگ کەوتوو، دەنگ نووساو، دەنگ گیراو، باخە.

**صداوسیما:** دەنگ و ڕەنگ، تەلەویزیۆن.

**صد بخشی:** پلەی سانتی‌گراد.

**صد تا یك غاز:** بێنرخ، بێقیمەت.

**صد تا یکی:** سەدی یەك.

**صدتو(ی):** سەدتوێ.

**صدچندان:** چەندبەرابەر، زۆرزیاتر.

**صدد:** بەرانبەر، ڕووبەڕوو. "**در صدد بودن**": ویستن، بەنیازبوون.

**صددرصد:** لەسەداسەد، سەدوسەد. بێگومان، حەتمەن. "**صد در صدِ**": گشتی، تەواوی، سەداسەدی.

**صددله:** تووشی گومان و دڕدۆنگی زۆر، ناخاترجەم، نادڵنیا.

**صددلی:** دڕدۆنگی و سەرگەردانی.

**صدر:** 1) سەر، سەرو، سەرەوە. 2) سەرەتا، پێش. 3) سنگ، سینگ. 4) بەشی سەرەتای سەردەمێك (صدر اسلام). 5) سەرۆك. 6) ناخ، زەین. 7) گلکۆ، گۆڕ. 8) "**صدر اعظم**": سەرەك وەزیر. لە هێندێ وڵاتان ناوێکە بۆ بەرزترین پۆستی ڕەسمی دوای سەرۆك کۆمار. "**صدر کبیر**": سەرۆکی دادوەران. "**صدر مجلس**": سەرووی کۆڕ.

**صدرنشین:** 1) بان نشین، سەرنشین، باڵانشین، کەسێ کە لە سەرەوەی کۆڕ دابنیشێ. 2) پێشەوا. 3) بەڕێز، پایەبەرز. 4) خاوەنی نرخ و گرینگی.

**صدسال:** بۆ دەربڕینی دژایەتی تێکەڵ بە پێداگری و بێزاری بەکار دەبرێ، هەرگیز.

**صدق:** ڕاستگۆیی، ڕاست بێژی. ڕاستی و دروستی. "**صدق عرف**": گونجاندنی یەك یان چەند ماددەی یاسایی دەگەڵ نەرت و باو. "**صدق کردن**": دروست بوون، ڕاست (لە ئاو)دەرهاتن.

**صدقات:** کۆی"صدقه".

**صدقه:** 1) خێر(لە ڕێی خودادا)، خێرات، دەسەنە، حەوتم، سەغدە، بەلاگێڕەوە، وەی وەگەڕێن. 2) زەکات. "**صدقه تطوع**": خێری جیا لە زەکات. "**صدقه جاریه**": خێرێ کە بۆ کەڵك لێوەرگرتنی گشتی و لە ڕێگەی ڕازیکردنی خوادا ئەنجام دەدرێ. "**صدقه سر کسی(چیزی) شدن**": بەقوربانی ئەو بوون، دەبەر ئەو مران. "**صدقه فریضه**": خێری واجب کە هەمان زەکاتە. "**(از) صدقه سر کسی (چیزی)**": لەبەر بوونی ئەو، بەخاتری دلۆڤانی ئەو. "**قربان و صدقه‌رفتن**": دەبەرمردن، بەقوربان بوون، دەسەرگەڕان، گۆڕیبوون.

**صدقه‌خوار:** ئەوەی خێری پێدەگا.

**صدمات:** کۆی"صدمه".

**صدم کردن:** وەدەرنان، پاڵنان، دەڵەك نان.

**صدمه:** زەربە. ئازار. زیان، خەسار. کوتران. "**صدمه خوردن(دیدن)**": زەربە وێکەوتن، بەرکەوتن، ئازاردیتن، ئێش و ئازارپێگەیشتن، زیان لێکەوتن. "**صدمه دیده**": بەرکەوتوو، زەربەوێکەوتوو، ئازارپێگەیشتو، زیان لێکەوتوو. "**صدمه‌زدن**": زەربەلێدان، زیان لێدان، زیان پێگەیاندن. "**صدمه‌کشیدن**": ڕەنج و ئازارکێشان، بەرگەی چەرمەسەری و کوێرەوەری گرتن.





**صدور:** 1) دەرچوون، دەرکردن. 2) هەناردن، ناردن. 3) نووسین و تۆمارکردنی بەڵگەگەلی ڕەسمی. 4) بۆ دەرەوە ناردن یان ناردرانی شەپۆلەکان. 5) گەورەکان، بەرپرسەکان. 6) سنگەکان. "**صدور حکم**": دەرچوون (دەرکردن)ی بڕیار. "**صدور کالا**": ناردن (هەناردن)ی کەلوپەل.

**صدهزاران:** زۆر، فرە.

**صدید:** بڕوانە:"خونابە".

**صدیق:** (صَ.دِ) دۆست و هەڤاڵ، هەواڵی دڵسۆز و پاك.

**صدّیق:** (صِ.دِّ) پیاوی فرە ڕاستگۆ. پیاوچاك.

**صراحت:** ڕاشکاوی، بەڕوونی. ڕووڕاستی، ڕاستی و دروستی، یەکبوونی نییەت و قسە. "**صراحت لهجه**": قسەلەڕوویی، ڕاشکاوی لە دەربڕینی مەبەستدا.

**صراحتاً:** بەڕاشکاوی، بەڕوونی.

**صرّاف:** 1) پوولێ گۆڕەوە، پارەفرۆش، پارەگۆڕ(ەوە)، دراوگۆڕ(ەوە)، گوهێڕ، سەڕاف. 2) زێڕناس.

**صرافت:** بیر و نیازی ئەنجامدانی کارێك. "**از صرافت افتادن**": وازهێنان لە نیاز و بڕیارێ. "**از صرافت کسی(چیزی) افتادن**": لەبەرچاونەگرتن، فەرامۆش کردن یان وازلێهێنان. "**به صرافت خاطر**": بە ویست و خواستی خۆ. "**به صرافت کاری افتادن**": 1) کەوتنە بیری ئەنجامدانی ئەوەوە. 2) پێزانین، پەیبردن بەو.

**صرّافی:** 1) گوهێڕك، جێگەی پارەگۆڕینەوە، کاری پارەفرۆش، سەڕافی. 2) جیاکردنەوەی چاك و خراپ، جیاکردنەوەی هەق و ناهەق.

**صرامت:** 1) بەبڕشت و بەزاکوون بوون لە ئەنجامدانی کارەکاندا. 2) ئازایەتی، نەترسی، بوێری.

**صرصر:** بای سەڕسەڕ، بای توند و سارد.

**صرصرتك:** تیژڕۆ، خێراڕۆ، خۆشبەز.

**صرع:** 1) فێ، خوو، خووداری، گەشکە، پەرکەم. 2) خستن، بەزەوی دادان. "**دچار صرع شدن**": گەشکەبوون، گەشکەگرتن، فێ لێهاتن.

**صرعدار:** بڕوانە:"صرعی".

**صرعی:** گەشکەدار، خێدار، خوودار، فێدار، تووشی نەخۆشی فێ. "**صرعی شدن**": فێ گرتن، تووشی خووداریبوون.

**صرف:** (صَ) 1) پارە گۆڕینەوە. 2) بەکاربردن، بەکارهێنان. 3) خەرج کردن. 4) خواردا یان خواردنەوە. 5) لە زاراوەی بانکیدا: جیاوازی نێوان نرخی ڕاستەقینەی پارە و قیمەتێ کە لە بازاڕ دا کاری کڕین و فرۆشتنی پێدەکرێ. 6) سوود، قازانج. 7) جیاکردنەوەی چاك لە خراپ. 8) سووڕی ڕۆژگار، سووڕی زەمانە. 9) وشەسازی. 10) لەسەر کار

لابردن، گەڕاندنەوەی کەسێ یان شتێ بۆ جێیەك، ڕەت کردنەوە. "**صرف الدهر**": پێشهات و ڕووداوەکانی ڕۆژگار. "**صرف داشتن**": قازانج هەبوون. "**صرف زمام کردن**": ئاراستە گۆڕین، ڕەوگە گۆڕین. "**صرف نظر از**": جیا لەوە، بێجگە لە، چاوپۆشین لە.

**صرف:** (صِ) 1) ڕووت، پەتی. 2) بێ خەوش، بێگەرد، پوختەی هەر شتێ. 3) هەربۆ، تەنیا. 4) ڕێسا. "**بە صرف**": بەهۆی، لەبەر، بەخاتری.

**صرفاً:** 1) تەنیا. 2) بەتەواوی.

**صرف شدن:** خەرج بوون، بەکاربران، دەکارهێنران.

**صرف کردن:** 1) خەرجکردن. 2) دەکارکردن، بەکارهێنان. 3) خواردن یان خواردنەوە. 4) قازانج هەبوون، بەهرەهەبوون. 5) تێپەڕاندن، ڕابواردن. 6) بڕوانە: "برگرداندن". 7) لەسەر کار لابردن.

**صرف نظرکردن:** 1) دەست لێ هەلگرتن، وازهێنان، وازلێهێنان، لێگەڕان، دەستبەرداری. 2) دەبەرچاونەگرتن، چاوپۆشی.

**صرفە:** قازانج، بەهرە، سوود، کەلك. "**صرفە از کسی بردن**": کەوتنە پێش ئەوەوە. "**صرفەبردن**": 1) قازانج کردن، بەهرەگیرهێنان. 2) خێردانەوە، قازانج دانەوە. "**صرفە نگاە داشتن**": بڕوانە: "صرفەجویی". "**بەصرفە**": خێردەرەوە، بەقازانج.

**صرفەجو:** ڤەگر، وەگر، لەخەرج گێڕەوە، پاشەکەوت کەر، دەست پێوەگر.

**صرفەجویی:** پاشقل، پاشەکەوت، گردەوەکۆیی، لەدەم گێڕانەوە، پێخۆرپێوەکردن، دەس پێوەگرتن (ی خەرج)، ڤەگرتن، ڤەگری، گرتنەوە، وەگرتن، لەشتێ شتێ وەلانان، دزینەوە، خەرجیکەم کردنەوە، لە خەرجی گێڕانەوە، کەم خەرجی، دەست گێڕانەوە، دەسگرتنەوە، بەرڤەدانی، ماڵداری، ڕاگرتنی بەکاربردنی شتی زیادەکی.

**صرفەگری:** بڕوانە: "صرفەجویی".

**صرفیدن:** قازانج هەبوون، خێردانەوە.

**صرم:** بڕین.

**صریح:** ڕاست بڕاست، ڕاستەوڕاست، ڕاست و ڕەوان، بەئاشکرا و بێپێچ و پەنا، قسەلەڕوو، ڕاشکاو، ڕووڕاست. "**صریح اللهجه**": قسەلەڕوو.

**صریرآوردن:** دەنگ دەرهێنان.

**صریع:** بەزەوی دادراو، بەزیو، شکست خواردو.

**صعب:** 1) چەتوون، تووش، دژوار، سەخت. 2) ناخۆش. 3) هەڵەت، نارێك. 4) ماقووڵ، قورس و قۆڵ. 5) بەهێز، بەتاقەت، پڕزۆر. 6) زۆر، فرە. "**صعب الحصول**": ئەوەی بە دژواری وەدەست دێ. "**صعب العبور**": هەڵەت، هەڵەمووت. "**صعب الوصول**": ئەوەی وەدەست خستن یان پێگەیشتنی دژوارە.





**صعوبت:** 1) دژواربوونەوەی کار. 2) دژواری و سەختی کار. 3) نارێکی، هەڵەتی.

**صعود:** ڕۆیشتنەسەر، چوونەسەر، چوونەبان، هەڵکشان، هەڵاچوون، سەرکەوتن.

**صغیر:** 1) گچکە، بچووك. 2) ئەوەی بە تەمەنی هەژدە ساڵی نەگەیشتبێ. 3) کەسێ کە بە تەمەنی باڵغی نەگەیشتبێ. "**صغیر و کبیر**": 1) ورد و درشت، چووکە و گەورە. 2) گشت، هەموو.

**صف:** 1) ڕیز، سەف، ڕێچکە، قەتار، زنجیرە، شتی بە پاڵ یەکەوە. 2) گروپ، دەستە. 3) پۆل. 4) شەڕ، جەنگ. 5) بازاڕ. "**صف بستن(کشیدن)**": ڕیزبەستن، بەڕیزبوون، قەتاربەستن، ڕێچکەبەستن، سان بەستن. "**صف بندی**": ڕیزبەندی، جێگرتنی کەسەکان یان شتەکان لە یەك یان چەند ڕیزدا. ئارایش چنین، هاوپێوەندی و ئامادەیی کەسەکانی گروپێ بۆ بەربەرەکانی و خەبات دژی گروپێکیتر. "**صف زدن**": بڕوانە: "صف کشیدن". "**بەصف**": لەیەك ڕیز دا، ڕێکوپێك.

**صف آرایی:** جێگیربوونی کەسەکانی گروپێ لە یەك یان چەند ڕیز دا بە شێوەی ڕێکوپێك لەبەرامبەر گروپێکی تردا، بەڕیزبوون، ڕیزبەستن. جێگیرکردنی سپای تەیاروئامادە لە ڕیزگەلێکی ڕێکوپێکدا. هاوپێوەندی و ئامادەیی کەسەکانی گروپێ بۆ بەربەرەکانی و خەبات دژی گروپێکیتر.

**صفاء:** 1) پاك و ڕوون و بێگەردبوون. 2) پاکی، ڕوونی، خاوێنی. 3) خۆشی. "**صفا بخشیدن**": (سۆفیگەری) ڕێنوێنیکردن. "**صفادادن**": 1) شتن، خۆشۆردن. 2) ڕدێن تاشین. 3) ناخۆشییەکان لە دڵدا سڕینەوە. 4) پاك کردنەوە، سڕینەوە. "**اهل صفا**": خوازیاری ئاشتی و سازان. "**باصفا**": خۆش و دلگر.

**صفات:** کۆی "صفت".

**صفّار:** قەلاچی، مزگەر، قاپ و مس سپی کەرەوە.

**صفاکردن:** 1) سولح کردن، ئاشتیکردن، سازان. 2) شادی و خۆشیکردن، خۆش ڕابواردن. 3) چێژبردن لە سەیرکردنی شتێ.

**صفت:** 1) لە ڕێزماندا: ئاوەڵناو. 2) پەسن، وەسف. 3) سۆز، وەفاداری، بەئەمەگ بوون. 4) سفەت، خەسڵەت. 5) (فەلسەفە) حاڵەتێکی تایبەتی کە سروشتی شت بەرتەسك دەکاتەوە. 6) پەسنی خوا بە ناوە تایبەتەکان. 7) چۆنیەتی، چلۆنەتی. 8) شوغڵ، کار. 9) مانا، ناخ. 10) شکڵ، جۆر، ڕەنگ. 11) نیشانە. 12) خوو و ئاکار. "**صفت تفضیلی**": (ڕێزمان) ئاوەڵناوی باڵا. "**صفت ثانوی**": تایبەتمەندیی شتێ یان هەڵسوکەوتێ کە دواتر لە گیاندارێکا دەردەکەوێ. "**صفت عالی**": (ڕێزمان) ئاوەڵناوی هەرەباڵا. "**صفت غالب(بارز)**":

سفەتیٚ کە بوونی یەك دانە ژێنی ئەو لە ناوکی خانەدا بۆ دەرکەوتنی بەسە. "**صفت کردن( دادن )**": پەسن دان، پەسن کردن. "**صفت گفتن**": پەسن دان، پیاهەڵدان. "**صفت فاعلی**": (ڕێزمان) ئاوەڵناوی بکەری. "**صفت مرکب**": (ڕێزمان) ئاوەڵناوی لێکدراو. "**صفت مشتق**": (ڕێزمان) ئاوەڵناوی داڕژاو. "**صفت مطلق**": (ڕێزمان) ئاوەڵناوی سادە(ساکار). "**صفت مغلوب( نهفته )**": سفەتیٚ کە لانیکەم دەبیٚ دوو ژێنی لە ناوکی خانەدا بیٚ تا دەرفەتی دەرکەوتن پەیا بکا. "**صفت نسبی**": (ڕێزمان) ئاوەڵناوی پاڵشت. "**بدین صفت( بر این صفت )**": بەم فۆڕمە، بەم حاڵەتە. "**برصفتِ**": وەکوو، وێنەی.

**صفحات:** کۆی"صفحه".

**صفحه:** 1) ڕوو، پانتایی. 2) ڕووپەڕ، لاپەڕە، لاپەڕ، پەڕە. 3) ناوچە، سەرزەوی. 4) لا، لێوارەی شتیٚ، کەنارە. "**بر صفحه‌آمدن**": نووسران.

**صفحه آراستن:** نووسینی شتیٚ لەسەر لاپەڕەی کاغز لاپەڕی کتێب یان نامە ڕازاندنەوە و نەخش و نیگار کردنی.

**صفحه‌آرایی:** مۆنتاژ و ڕازاندنەوەی لاپەڕەکان، نەخشەسازی ناوەوە، مونتاژی کامپیۆتێری.

**صفحه‌بستن:** ئامادەکردنی لاپەڕەکانی کتێو و ڕۆژنامە و هتد بۆ چاپ.

**صفحه‌بندی:** 1) بڕوانە: "صفحه‌آرایی". 2) فۆڕمی ڕواڵەتی هەر لاپەڕەیەکی چاپی.

**صفحه پردازی:** بڕوانە:"صفحه‌آرایی".

**صف دار:** فەرماندەری لەشکر.

**صفدر:** سەف شکێن، بوێر، ئازا لە شەڕ، نەترس، بەجەرگ.

**صفر:** (صِ) بەتاڵ، پووچ، هیچ، سفر. "**صفر مطلق**": سفری ڕەها.

**صفراء:** 1) زەرداو، زراو، زەرتاڵ، کرانتی. 2) تووڕەیی. 3) زیٚڕ، تەڵا. 4) هەوەس، مەیل. 5) شەڕاب. "**صفرابردن( راندن )**": لەناوبردنی زەرداو. "**صفرا بریدن**": کەمکردنەوەی زەرداو. "**صفرا شکستن**": لەناوچوونی زەرداو.

**صفرا زده:** زەرد هەڵگەڕاو بەهۆی زەردووییەوە.

**صفراکردن:** بریتی لە تووڕەبوون، تووڕەیی و تۆسنی بەخەرجدان.

**صفراوی:** 1) زەرداوی. 2) بەدخولق، تووڕە و تۆسن.

**صف شکن:** بڕوانە:"صفدر".

**صفوت:** پاکی، بێگەردی. خاوێن و بژاردە، هەڵبژێراو. .

**صفوف:** کۆی"صف".

**صفیر:** دەنگی بەرز و تیژ، فیتە. دەنگ. "**صفیر زدن**": بانگ کردن، بانگهێشت کردن. "**صفیرکشیدن**": فیت فیتەلێدان، فیقەنەلێدان.

**صقال دادن:** سیقاڵ دان، مشت و ماڵ دان، زاخاوکردن، سڕینەوەی ژەنگ و شتی وا. "**صقال گرفتن**": سڕان، زاخاودران.





**صقل:** سڕین و خاوێن کردنەوەی ژەنگ، برقاندن.

**صلا:** بانگ، بانگەواز، قاو. "**صلاآواز دادن**": جاڕدان، بانگەوازکردن. "**صلازدن**": بانگهێشتن. "**صلای چیزی دردادن ( زدن )**": بانگێشتن بۆ ئەو شتە.

**صلابت:** 1) پتەوی، سەختی، ڕەقی. 2) وزە، هێز، توانایی.

**صلاح:** (صِ) 1) ئاشتیکردن، سازان، پێکهاتن. 2) بەرژەوەندی.

**صلاح:** (صَ) 1) بەرژەوەندی، قازانج. 2) چاکەکاری، پیاوچاکی، خێرەومەندی. 3) چاك بوونەوەی دۆخ. 4) سوودمەندبوون، بەقازانج بوون. "**صلاح برزیدن**": چاکەکردن. "**صلاح داشتن با کسی**": ڕاوێژکردن دەگەڵ ئەو بۆ ڕاخواستن. "**صلاح دانستن**": بەباش زانین، بەشیاوزانین. "**صلاح دیدن**": 1) بە دروست و شیاوزانین. 2) ڕاوێژکردن، ڕاخواستن. "**به صلاح**": شیاو، شایستە، باش. "**به صلاح آوردن**": 1) چاك کردن، باش کردن. 2) باشترکردن، چاکترکردن.

**صلاح اندیشی:** (صَ) لەبەرچاوگرتنی خێر و چاکە بۆ بڕیاردان یان چارەدۆزی بۆ چارەسەری کێشەیەك.

**صلاح بینی:** بڕوانە:"صلاح اندیشی".

**صلاح جویی:** بڕوانە:"صلاح اندیشی".

**صلاح دید:** 1) بەچاك زانین. 2) بۆچوونیٚ کە هەڵگری ڕوانگەی کەسێکە سەبارەت بە دروستی یان نادروستی بابەتیٚ بیٚ.

**صلاحیت:** 1) شیاوی، شایستەیی، شیان، لێهاتوویی. 2) دەسەڵات، سەلاحییەت. "**صلاحیّت دار**": شیاو بۆ ئەنجامدانی کارێك. "**صلاحیت داشتن**": 1) شیاوبوون. 2) بوونی دەسەڵاتی یاسایی بۆ ئەنجامدانی هێندیٚ کار.

**صلبیه:** سپێنەی چاو.

**صلح:** ئاشتی، تەبایی، سازان.

**صلح آمیز:** ئاشتیانە.

**صلح افتادن:** جێگیربوونی ئاشتی.

**صلح جو:** بڕوانە:"صلح طلب".

**صلح دادن:** پێکهێنان، پێك ئینان، پێك ئانین، لەڤئانین، ئاشت کردنەوە.

**صلح سبز:** ئاشتی کەسك.

**صلح طلب:** ئاشتیخواز، هێمناییخواز.

**صلح کردن:** 1) ئاشت بوونەوە، مەسڵەتکردن، پێکهاتن، ڕێککەوتن، سازان. 2) ڕازیبوون، قانعبوون. 3) ناوبژیوانیکردن بۆ ئاشت کردنەوەی دوو لایەن.

**صلح گونه:** ئاشتی و سازانی کاتی و بەپێی بەرژەوەندی(یەوە).

**صلحنامه:** ئاشتی نامە.

**صلف:** 1) خۆهەڵشرنگاندن، شات و شووت کردن، لاف لێدان. 2) بیٚ بەشبوونی ژن لە مێرد.

**صلم:** ڕیشەکێش کردنی شتێ، هەڵکەندنی گوێ یان لووت.

**صله:** 1) پەیوەست بوونی شتێ بە شتێکەوە، پێوەندی. 2) چاکە، خاسە، خێر. 3) پاداشت، خەڵات. "**صلەرحم**": سیلەی ڕوحمێ، بە زەیی بە خزماندا، بەخشین و چاکە دەگەڵ خزمان یان سەردان و هەواڵپرسیکردنیان. "**صلەدادن**": 1) خەڵاتدان. 2) بەخشینی ماڵ لە بەرامبەر شێعری پیاهەڵگوتن دا بە هەڵبەستوانان.

**صلیب:** 1) خاچ، چەلیپا. 2) لە خاچ دراو. 3) توند، پتەو، قایم. "**صلیب سرخ**": خاچی سوور، دامەزراوەیەکی نێونەتەوەییە کە کە یارمەتی وڵاتان و خەڵکێ کە تووشی ڕووداوی کوتوپڕ و خەسارەتی ماڵی و گیانی دەبن، دەکا. "**بە صلیب کشیدن**": لە خاچدان.

**صلیبی:** 1) بە شکڵی خاچ، خاچ ئاسا. 2) خاچ پەرست، مەسیحی.

**صمد:** 1) بێ نیاز. 2) خودا.

**صمدیّت:** 1) بێ نیازی. 2) خوداوەندی.

**صموت:** بێدەنگ بوون، مات بوون.

**صمیم:** 1) بناغە و پوختەی هەر شتێك. 2) کوڵەکوڵی گەرما یان گوڕمی سەرما. 3) ناوەڕاست، ناوجەرگە، ناخ. "**صمیم زمستان**": سەرما و سۆڵەی ناوەڕاستی زستان. "**از صمیم قلب**": لە ناخی دڵەوە، پڕ بە دڵ.

**صمیمی:** نێوان خۆش، گەرموگوڕ، تێکەڵ(زۆر تێکەڵێن)، کۆك، گیانی گیانی، یەکدڵ، جووت، بێ ڕیا، دڵپاك.

**صمیمیّت:** نێوان خۆشی، گەرموگوڕی، تێکەڵی، کۆکی، هەڤڕەنگی، دۆستایەتی گەرم، یەکدڵی، ڕووڕاستی و پاکی.

**صناع:** کۆی"صانع".

**صناعت:** 1) هونەر، پیشە، کارو پیشەیەك کە بیرکردنەوە و لێهاتوویی پێویست بێ. 2) کیمیا. "**صناعت کردن**": شارەزایی و وەستایەتی لە خۆ نیشاندان، هونەر بەخەرجدان.

**صناعت خانە:** قوتابخانەی هونەر، هونەرستان.

**صناعی:** دەسکرد، دروستکراو.

**صنایع:** کۆی"صناعت".

**صندوقچە:** مجری، سندۆقی چکۆلە. جەموجۆر، خنج و خۆڵ. "**صندوقچە سر**": بڕوانە:"ڕازدار".

**صندوق خاکی:** جەستە، گیان.

**صندوقخانە:** گەنجە، گەزنە، خەڵوەتی.

**صندوق دار:** دەخڵدار.

**صندوقە:** بڕوانە:"صندوقچە".

**صنعت:** 1) پیشە، پیشەسازی، سەنعەت. 2) هونەر. 3) تەڕدەستی. 4) تەگبیر، چارەدۆزی. 5) ڕواڵەت سازی. "**صنعت اکسیر**": کیمیاگەری. "**صنعت کردن**": 1) بەکارهێنانی سەنعەتی ئەدەبی زۆر لە ئاخاوتن یان نووسیندا. 2) بڕوانە: "تکلف کردن". 3) فێڵبازیکردن، ڕیابازی.





4) کارتێکردن، کاریگەری دانان. 5) دروست کردن یان ئافراندنی شتێ یان کەسێك. 6) هونەرنوێنی کردن. 7) چارەدۆزیکردن.

**صنعت کار:** بڕوانە:"صنعتگر".

**صنعتگر:** پیشەساز، پیشەکەر، هۆستاکار، هنەری، هونەرمەند، سنعاتکار.

**صنعت گستری:** بڕوانە:"صنعتی شدن".

**صنعتی:** دەسکرد، دەسکوت، سەنعەتی.

**صنعتی شدن:** پیشەسازیبوون، (بە)سەنعەتیبوون.

**صنف:** 1) سنف، هاوپیشە. 2) جۆر، چەشن. 3) گروپ، دەستە.

**صنم:** 1) بت، بوت. 2) دلبەر، گراوی.

**صنم گر:** بت ساز.

**صنیع:** 1) دروستکراو، سازکراو. 2) شمشێری تیف تیفەدراو. 3) پیاوی لێهاتوو و شارەزا لە کار و هونەری خۆیدا.

**صنیعی:** بڕوانە:"طبیعی".

**صواب:** 1) چاکە، ڕاست. 2) کاری دروست، شێوەی دروست. 3) ڕاستی، دروستی. 4) گونجاو، شیاو. "**صواب آمدن**": دروست بوون یان دروست لەئاو دەرهاتن. "**صواب دیدن**": بەدروست و شیاو زانین، بە قازانج زانین.

**صواب دید:** بڕوانە:"صلاحدید".

**صوب:** 1) لا، ئالی. 2) ناوچە، مەڵبەند. 3) دابارین، هاتنەخوار. "**بر صوب(بە صوب)**": بەرەولای.

**صوبە:** بەشێك لە وڵات، ناوچە.

**صورت:** 1) وێنە، نیگار. 2) ڕوخسار، دەموچاو، چڕوچاو، سیما. 3) شکڵ، فۆرم. 4) ڕواڵەت، بەشی دەرەوە و ڕواڵەتی شتێك. 5) سیایی، فاکتۆر. 6) چۆنیەتی، چلۆنایەتی. 7) ڕوخساری جوان. 8) جەستە، گیان. 9) نەخشەی جوغڕافیایی. 10) شێوە. 11) جۆر، چەشن. 12) دۆخ، حاڵەت. "**صورت انگیختن (برکشیدن، پرداختن**": نیگارکێشانەوە، وێنەکێشانەوە. "**صورت چیزی بە خود گرفتن**": دۆخ و حاڵەتی ئەوگرتن، شکڵی وی گرتن. "**صورت حال**": چۆنیەتی ڕووداو. "**بە(در)صورت**": بەڕواڵەت. "**بەصورت**": بە فۆرمی، بەشکڵی. "**در این صورت**": کەواتە، کەوایە، بەم پێیە. "**در صورتی کە**": 1) لە دۆخێك دا. 2) ئەگەر، بێتوو. "**در هر صورت**": لە هەر حاڵەتێکا، بە هەر چۆنێك، هەرچۆنێك بێ.

**صورت آرا:** 1) شکڵ کێش، نیگارکێش. 2) بڕوانە: "آرایشگاە".

**صورت برداشتن:** 1) سیایی نووسین، فاکتۆرنووسین. 2) کۆپی هەڵگرتنەوە. 3) نیگارکێشانەوە.

**صورت بستن:** 1) شکڵ گرتن، وەدیهاتن. 2) لوان، ڕەخسان.3) نەخش و نیگار کێشان. 4) بەبیراهاتن، وێنابوون.

**صورت بندی:** 1) فۆرم پێدان، شکڵ پێدان، فۆرماسیۆن. 2) ئامادەکردنی پێڕست لە شتێ. 3) (کۆمەڵناسی) پێکهاتە یان فۆڕمی دیاردەیەك. 4) (نیزامی) (خۆ)ڕێکخستنی سەربازی.

**صورت بین:** ڕواڵەت بین.

**صورت پذیر:** شیاوی جێبەجێبوون، لوان، گونجان.

**صورت پرست:** ئەوەی ڕوخساری جوانی خۆش دەوێ، ڕوخسارپەرست.

**صورت حساب:** فاکتۆر، لیستە، سیایی.

**صورتخانە:** بتخانە.

**صورت دادن:** 1) دەرهێنانی شتێ بە شکڵێ یان فۆڕمێکیتر. 2) ئەنجامدانی کارێ، بەکۆتاییگەیاندنی کارێ، جێبەجیکردن.

**صورت ذهنی:** وێنەی زەینی، وێنەی بیرەکی.

**صورت ساز:** وێنەکێش، نیگارکێش.

**صورت سازی:** 1) نیشاندانی شتێ بە شێوەی ناڕاستەقینە، ڕواڵەتبازی. 2) بەڵگەسازکردن. 3) گریم. 4) وێنەکێشی، نیگارکێشی.

**صورتك:** 1) بڕوانە:"ماسك". 2) حاڵەتێ لە ڕوخساری مرۆ کە پیشاندەری ناخی ئەو نیە.

**صورتكار:** وێنەکێش، شکڵ کێش.

**صورتكده:** 1) کارگەی نیگارکێشی و وێنەسازی، نیگارستان. 2) بتخانە.

**صورت کردن:** 1) وێنەکێشانەوە، نیگارکێشانەوە. 2) وێناکردن، وازانین، هێنانەبەرچاو. 3) ڕاپۆرتی درۆدان. 4) دروست کردنی ڕوخسارێ وەك ڕوخساری مرۆ یان گیانلەبەرانی تر.

**صورتكش:** وێنەکێش، وێنەساز، نیگارکێش.

**صورتگر:** شکڵ کێش، شکل کێش، وێنەکێش، نیگارکێش.

**صورت گرایی:** شکڵ خوازی، فۆڕم خوازی، فۆڕمالیزم.

**صورت گرفتن:** 1) ئەنجام دران، جێبەجێبوونی کارێ یان مامڵەیەك. 2) سیایی نووسین، فاکتۆرنووسین.

**صورتگری:** نیگارکێشی، وێنەسازی.

**صورت مسئله:** بنچینەی بابەت یان مەسەلە. **"صورت مسئله را پاك كردن"**: وازهێنان لە بنچینەی بابەت یان کێشە.

**صورت نا پذیر:** نەشیاو، محاڵ، ئەستەم.

**صورت نگار:** نیگارکێش، وێنەکێش.

**صورت وضعیت:** ڕاپۆرتی چۆنیەتی یان بەرەوپێشچوونی کار لە دامەزراوەیەکدا.

**صورتی:** 1) چێرەیی، پەمەیی، سووری کاڵ، کنووشك، گول خار. 2) دڵبەستراوە بە "صورت".

**صوری:** وێنەیی، ڕووکەشی، ڕواڵەتی.

**صوفی:** سۆفی، مریدی بێپرچی شێخان.

**صوفیانە:** وەك سۆفیان، بەشێوازی سۆفیان.

**صوفی خانە:** خانەقا.

**صوفیگری:** سۆفیاتی، سۆفیایەتی، مریدایەتی شێخان.

**صوفی وش:** وەك سۆفی، سۆفیئاسا.

**صولت:** 1) پەلاماربردن. 2) هێز، دەسەڵات، هەیبەت. 3) توندی.





**صومعە:** دەیر، خانەقا، ئەشکەوت و شوێنی پەرستن.

**صومعەدار:** تەرکەدنیا، دنیانەویست، ڕاهێب. **"صومعەداران فلك"**: فریشتەکان.

**صومعەنشین:** تەرکەدنیا، خۆپارێز.

**صهبا:** 1) سوور و سپی، سوور و سپی تێکەڵاو، شێ. 2) شەڕاب.

**صیاح:** بانگ، هەرا، هاوار.

**صیّاد:** ڕاوکەر، ڕاوچی، ڕاڤیار، ڕاڤکار، نچیرڤان.

**صیاغت:** زێڕنگەری، داڕشتن.

**صیال:** هێرش، پەلامار.

**صیام:** ڕۆژووگرتن، بەڕۆژووبوون.

**صیانت:** 1) پاراستن، پارێزگاریکردن. 2) خۆپارێزی، بەربەخۆگرتن.

**صیحات زدن:** نەڕاندن، هەراکردن.

**صیحە:** هەرا، نەڕە، گوڕە.

**صیدافکن:** ڕاوکەر، ڕاوچی، ڕاڤیار.

**صیدانداز:** بڕوانە:"صیدافکن".

**صیدبند:** بڕوانە:"صیاد".

**صیدشدن:** 1) ڕاوکران، کەوتنەداوەوە. 2) گرفتار و یەخسیر بوون.

**صیدکردن:** 1) ڕاوکردن، ڕاڤکرن. 2) گرفتار و یەخسیر کردن.

**صیدگاە:** ڕاوگە، جێڕاو.

**صیدگر:** بڕوانە:"صیاد".

**صیدگرفتن:** ڕاوکردن، ڕاڤ کرن.

**صیدلانی:** دەوافرۆش، دەرمانخانە.

**صیرفی:** بڕوانە:"صرّاف".

**صیرورت:** بوون، گۆڕانشتێ لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکیتر.

**صیغە:** 1) شێوە، شکڵ، داڕشت. 2) قەپاتمە، سووتلی، سویتلی، ژنی کاتی، سووکەمارە، مارەی کاتی. 3) (فەلسەفەی کۆن) دەربڕینێکی ورد و دیاریکراو کە بەرهەمی ئاکام گیرییە. 4) بڕوانە: "عنوان". 5) (ڕێزمان) ڕێژە. **"صیغە اخوت (برادری) بستن (خواندن) با کسی(چیزی)"**: یەکگرتن دەگەڵ ئەو. **"صیغە بلعتەی چیزی را خواندن"**: خواردنی ئەو شتە. بەناڕەوا داگیرکردنی ئەو شتە. **"صیغە جاری کردن"**: خوێندنەوەی مارەنامە یان تەڵاقنامە یان مامڵەیتر.

**صیفی:** (کشت صیفی) هاوینە، هاوینی، هاڤینی، شیناورد، شیناوەرد، شیناتی.

**صیفیجات:** شینایی، شیناوەرد، هاوینی، هاوینەجات، سەوزی و بێستانە.

**صیفی کاری:** سەوزی و بێستان چاندن، سەوزە و میوە بەرهەم هێنان، بێستانکاری.

**صیقل:** 1) سیوسیوە، سیقاڵ، سیل، ماڵشت، مشتوماڵ، خۆڵماڵ. 2) ژەنگ سڕێن، سڕێنەر، تیژکەری خەنجەر. **"صیقل خوردن"**: سڕان و بریقانەوە. **"صیقل دادن"**: 1) سیل کردن، سیقاڵ دان، مشتوماڵ کردن، ماڵشت، ماڵەفە، ڤەمشتن، ژەنگ سڕینەوە و بریقەدارکردن. 2) تیف

تیفەدان، خۆتیل کردن، خۆتاس و لووس دان، خۆجوان و لووس کردن. "**صیقل زدن**": ژەنگ سڕینەوە. پاك کردنەوە، خاوێن کردنەوە. "**صیقل یافتن**": سڕانەوە، بریقانەوە، سیقاڵ دران.

**صیقلگر:** سیقاڵدەر، سیقاڵکار، سڕێن، (ژەنگ) سڕێنەرەوە، زۆخی، وەستای شیرگەر، کەسێ تیغ زاخاو دەداتەوە.




**ضائر:** زیان پێگەیێن.

**ضابط:** 1) ڕاگر، تۆمارکەر. 2) بەهێز و بە توانا لە بەڕێوەبردنی وڵات دا. 3) حاکم، ڕاژۆر. 4) کاربەدەست و بەڕێوەبەر(ضابط دادگستری). 5) ئەفسەر.

**ضابطە:** 1) ڕێسا، دەستوور. 2) توانایی زەین بۆ ڕاگرتن و وەبیرهێنانەوە و ناسینەوەی ئەو شتانەی کەپێشتر فێری بووە یان ڕووی داوە. 3) تەکووزی، ڕێکوپێکی. 4) باو، ئایین.

**ضارب:** لێدەر، قوتێن، کوتەر.

**ضال:** 1) گومڕا، لەڕێدەرچوو. 2) ئاوارە، دەربەدەر.

**ضامر:** کز، لەڕ، لاواز.

**ضامن:** دەستەبەر، دەستەوەر، دانەبەر، بەرعۆدە، ئەستۆگر، دابین کەر، مسۆگەر، کەفیل، کەفێڵ. "**ضامن دادن**": 1) ناساندنی کەسێك وەك دەستەبەر. 2) دەستەبەربوون، دەروەست بوون، بەرعۆدەبوون. "**ضامن شدن**": دەستەبەربوون، لەملەخۆگرتن، بەرعۆدەبوون، مسۆگەرکردن.

**ضایع:** بەتلاو، فیڕۆ، لەکیس چوو، خراپ، خراو، خەسار، بەترەف، زایە. "**ضایع شدن**": 1) لەکیس چوون، زایەبوون، ژدەست چوون، خەساربوون، بەفیڕۆچوون، هەرزبوون، خراوبوون. 2) لەناوچوون. 3) مردن، بەهیچ چوون، لەدەست چوون. 4) نەمانی ئیعتبار و ئابڕوو لای دیتران. 5) بێ فایدەبوون. 6) ون بوون. "**ضایع کردن**": بەخەساردان، بەفیڕۆبردن، لەکیس دان، زایەکردن، هەڕماندن. "**ضایع گذاردن**": 1) لەناوبردن. 2) خۆتێنەگەیاندن، وێڵکردن.

**ضایعات:** 1) زیانەکان، زەرەرەکان، خەسارەتەکان. 2) شتە بەفیڕۆچووەکان.

**ضایعە:** 1) خەسار، زەرەر و زیانی گەورە بەتایبەت بە هۆی لەدەست چوونی کەسێکەوە. 2) لەناوچوو، بەفیڕۆچوو.

**ضایق:** تەنگەبەر، تەسك.

**ضبط:** 1) زەفت، زەبت. 2) تۆمارکردن، شریتکردن. 3) ڕاگرتن، پاراستن. 4) یاداشت کردنی زانیاری و بابەت و شتی وا. 5) بڕوانە: "تصرف".





6) بەڕێوەبردن، سەرپەرشتی. 7) پتەوی، قایمی. 8) لەبەرکردن، خستنە مێشکەوە. 9) لە حەپس دا هێڵرانەوە. "**ضبط دماغ داشتن**": خاوەنی بیرگەی بەقەوەت بوون. "**ضبط کردن**": 1) تۆمارکردن، شریت کردن. 2) پاراستن، ئارشیوکردن. 3) بڕوانە: "توقیف". 4) سەرپەرشتی کردن. 5) ڕاگرتن، پاراستن. 6) لەبەرکردن. "**ضبط نفس کردن**": خۆڕاگرتن، خۆپارێزی، بەربەخۆگرتن. "**ضبط و ربط**": 1) بەڕێوەبردن و سەرپەرشتی جێیەك یان کارێك. 2) یاداشت کردن. 3) تەکووزی و ڕێکوپێکی. جەموجۆری. 4) چاوەدێری و ئاگالێبوون."**ثبت و ضبط**": دەست بە سەرداگرتن، زەوتکردن.

**ضجاج:** هەراکردن، ناڵاندن و هەراکردن لە ترسان.

**ضجر:** (ضَ.جَ) بێئۆقرەیی، دڵتەنگی، بێئارامی.

**ضجر:** (ضَ.جِ) 1) بێئۆقرە، بێئارام، دڵتەنگ، نارەحەت. 2) تووڕە، قەڵس. 3) بە حاڵەتی دڵتەنگ و نارەحەت.

**ضجە:** قاووقیژ، ناڵەوشیوەن، هاوار.

**ضحاك:** زۆر دەم بەپێکەنین، فرە رووڵکەن.

**ضحکە:** 1) پێکەنین، پێخەنین. 2) مایەی پێکەنین.

**ضخام:** قەبە، گەورە، ئەستوور.

**ضخامت:** ئەستووری، ئەستوورایی، ستووری، قەبەیی، کەتەیی.

**ضخیم:** ئەستوور، ستوور، قەبە، قۆڵ، قەوی.

**ضد:** دژ، دژکار، دش، دوژ، نەیار، زج، دوژمن. "**ضدونقیض**": دژ و پێچەوانە، لێکدژ.

**ضدیّت:** دژێتی، دژایەتی، نەیاری، نۆیین، دوژمنی.

**ضدید:** دژ، دوژمن.

**ضرائب:** کۆی"ضریب و ضریبە".

**ضراب:** (ضِ) تێکەڵچوون، شمشێرلێدان.

**ضراب:** (ضَ) زۆرلێدەر. سککەلێدەر. زێڕینگەر.

**ضرابخانە:** شوێنی سککەلێدان.

**ضرار:** زیان پێگەیاندن بەیەکتر، زەرەرلێدان.

**ضرارت:** کوێربوون، کوێری.

**ضراعت:** پاڕانەوە، لالانەوە.

**ضرب:** 1) لێدان، کوتان، کوتەك لێدان. 2) (مۆسیقا) ڕیتم. 3) سککەلێدان. 4) نەخشێ کە لەسەر سککەی دەدەن. 5) هێنانەوە، گوتن(نموونە، قسە). 6) جۆر، چەشن. 7) لە بیرکاریدا: جار(ان)، لێکدان. 8) دمەك، دنبەك، دومەڵەك. "**ضرب افقی**": (بیرکاری) لێکدانی

ئاسۆیی. "**ضرب و جرح**": زەربە و برینێ کە دەکەوێتە سەر لەشی کەسێك. "**ضرب و شتم**": کوتەك کاری و جوێن پێدان. "**بە ضربِ**": بە یارمەتی، بەزۆر. "**سرِ ضرب**": بەخێرایی، دەسبەجێ.

**ضرب الاجل:** ماوەدیاریکردن، دیاریکردنی کات بۆ قەرزدانەوە یان ئەنجامدانی کارێك، مۆڵەت.

**ضرب الفتح:** لێدانی دەهۆڵ کاتی سەرکەوتن.

**ضرب المثل:** 1) نموونە هێنانەوە. 2) نموونەیەکی بەرچاو لە بابەت یان کارێك دا کە بکەوێتە سەرزاران، پەندی پێشینیان. 3) قسەی نەستەق.

**ضربان:** لێدان، لێدانی دڵ، ترپەی دڵ. "**ضربان الدهر**": ڕووداوەکانی ڕۆژگار.

**ضرباهنگ:** ڕیتم.

**ضربت:** زەبر، لێدان(ێك)، لێخستن، لێخەك، دەرب، زەرب(ە). "**ضربت خوردن**": زەبر وێکەوتن. "**ضربت زدن**": زەبرلێدان، زەربەلێدان. "**ضربت لازم**": زەربەیەك کە ئاسەوارەکەی لەناو ناچێ. "**ضربت نواختن**": بڕوانە:"ضربت زدن".

**ضربتی:** خێرا و دەزبەجێ، چەکوشی.

**ضرب خوردگی:** 1) جێ یان ئەندامێ کە زەبری وێکەوتوە. 2) بڕوانە:"ضرب خوردن".

**ضرب خوردن:** زیان دیتن، زەرەردیتن. زەبر وێکەوتن، کوتەك خواردن.

**ضرب دار:** (مۆسیقا) ڕیتمیك.

**ضرب دست خوردن:** کوتەك خواردن، لێدران.

**ضرب دیدگی:** بڕوانە:"ضرب خوردگی".

**ضرب دیدن:** 1) بڕوانە:"ضرب خوردن". 2) زەربەوێکەوتن.

**ضرب زدن:** 1) زیان لێدان، زیان پێگەیاندن. 2) دمەك لێدان، دنبەك ژەنین.

**ضرب زن:** 1) دمەك ژەن. 2) (نیزامی) جۆرێ تۆپی چووکە.

**ضرب شست:** 1) زەربەیەك کە بە دەست دەیوەشێنن. 2) کردەیەك کە پیشاندەری هێز و توانایییە بەمەبەستی کۆنترۆڵ کردن یان سەرکوت یان تێکشکاندنی خەنیم یان دوژمن ئەنجام دەدرێ.

**ضربگیر:** 1 ) دمەك ژەن. 2) زەربەگیر.

**ضربه:** 1) بڕوانە:"ضربت". 2) برین، کوتران، ئێش، ئازار.

**ضربه خوردن:** زەبروێکەوتن.

**ضربەزدن:** 1) لێدان، وەشاندن، زەبرلێدان. 2) زیان پێگەیاندن.

**ضربەکاری:** زەبری قورس، گرچوبڕ، گورچووبڕ.

**ضربەگیر:** 1) زەربەگیر. 2) کۆمەگ فەنەر.

**ضربی:** بەڕیتمێکی دیاریکراو.

**ضرر:** زیان، زەرەر، زەرەد، زەهی، خوسار.





**ضررداشتن:** 1) بوونە هۆی ناڕەحەتی و گرفتاری. 2) زەرەر هەبوون. 3) بوونە هۆی زیانی جەستەیی.

**ضرردیدن:** 1) زەرەرکردن. 2) تووشی ناڕەحەتی و گرفتاری بوون.

**ضرر رساندن:** زیان گەیاندن، زیان لێدان

**ضرررزدن:** زیان پێگەیاندن، زیان لێدان.

**ضررکشیدن:** زیان کردن، زیان دیتن، زەرەدکردن.

**ضرغام:** 1) شێری دڕننە. 2) پاڵەوانی دلێر، بوێر.

**ضرور:** پێویست، واجب.

**ضرورت:** 1) پێویستی، پێداویستی، نیاز. 2) ناچاری. 3) حاڵەتێ لە کاروباری سیاسیدا کە لەودا دەوڵەت بۆ پاراستنی بەرژەوندییە باڵاکانی ناچارە هێندێ لە دەروەستە نێونەتەوەییەکانی ئەنجام نەدا. 4) کار یان بابەتی پێویست. 5) حەتمی، پارێزهەڵنەگر. "**ضرورت داشتن**": پێویست بوون. "**بە ضرورت**": بەناچار، بەهۆی پێویست بوون.

**ضروری:** پێویست، واجب. ناچاری. "**غیرضروری**": ناپێویست، زیادی.

**ضریب:** 1) ڕێژە، بڕێ لە هەر شتێ کە وەك پێوەری سەرەتایی سەیری دەکرێ. 2) جۆر، چەشن، شکڵ. 3) وەك، وێنە. 4) (بیرکاری) هاوکۆلکە. "**ضریب هوشی**": بەهرەی هۆشی، i.q.

**ضریبه:** 1) باج، سەرانە،ماڵیات. 2) خوو، سرشت. 3) بە خەنجەر لێدراو.

**ضریح:** گڵکۆ، گۆڕ.

**ضریر:** کوێر، نابینا.

**ضعف:** (ضِ) دووقات، دووبەرابەر.

**ضعف:** (ضَ) 1) دڵ بوورانەوە، بێ توانایی، بێهێزی، لاوازی، سستی. 2) نەبوونی ئیرادەی پتەو و بڕوای شێلگیر یان توانای بڕیاردان. 3) نەبوونی هێز و توانای بەرگری، بێهێزی، لاوازی. 4) کەمبوونی توانای ماڵی، نەبوونی سامان. "**ضعف داشتن**": تووشی بێهێزی بوون، دڵ بوورانەوە. "**ضعف ریال**": بێ پارەیی، دەستەنگی، دەسکورتی. "**ضعف عقل**": کەم ئاوەزی. "**ضعف کردن**": تووشی بێهێزی و بێحاڵی بوون یان لەسەرخۆچوون. "**ضعف نفس**": بێ توانایی ڕۆحی و بێ ئیرادەیی. "**برای کسی (چیزی) ضعف کردن**": زۆر هۆگری ئەو بوون.

**ضعف الذاکره:** زەین کوێری، بیرکۆڵی.

**ضعیف:** 1) لاواز، بێهێز، سست، کەنەفت، لەڕ، کز، داڵگۆشت. 2) نەدار، بێ پارە. 3) ناپتەو و خۆڕانەگر(پایەی پل ضعیف است ممکن است بریزد). 4) نەبوونی تۆکمەی و یەکگرتوویی یان دروستی. 5) بێ توانا و بێ ئیرادە. 6) بەشێوەی سەقەت و خراپ. "**ضعیف البنیه**": بێتوان، بێوزە، لەق و خۆڕانەگر.

"**ضعيف الجثه**": قولە و لەڕ، ئەوەی جەستەی لەڕ و لاوازی هەیە. "**ضعيف الرأی**": بڕوانە: "سست رأی". "**ضعيف العقل**": کەم ئاوەز، ئەقلّ لاواز. "**ضعيف القلب**": ترسەنۆك، نەوێر، بێ جەرگ. "**ضعيف النفس**": خۆبەکەمگر. نەفس نزم. "**نور ضعيف**": نووری کز، تروسکە.

**ضعيفه**: 1) مێینەی "ضعيف"، زەعیفە، بریتی لە ژن. 2) بی توان، لاواز.

**ضغط**: 1) گوشار، تەوژم، پاڵەپەستۆ. 2) گوشاردان، ڕێك گوشین. 3) تەنگ پێ هەڵچنین، خستنەتەنگانەوە.

**ضغن**: ڕق هەڵگرتن، بوغزلەزگی.

**ضلال**: گومڕایی، هەڵەیی، بەلاڕێداچوون.

**ضلالت**: گومڕابوون، گومڕایی.

**ضلت**: سەرلێشێوان، سەرگەردانی.

**ضلع**: 1) پەل، لا، پاڵوو. 2) پەراسوو. "**ضلع قائم**": (بیرکاری) لای وەستاو، لاڕێك. "**ضلع مايل**": (بیرکاری) لای لار.

**ضلول**: گومڕا، لەڕێدەرچووگ.

**ضليل**: لاڕێ، گومڕا.

**ضمّ**: 1) کۆکردنەوە، خڕکردنەوە. 2) بزوێنی بۆر ڕەپاڵ وشە دان. 3) گرتنەخۆ.

**ضمائر**: کۆی "ضمیر".

**ضمائم**: کۆی "ضمیمە".

**ضماد**: لەپێخە، لەبیخە، شەڵتەونیونمەك، شەڵتەی سەربڕین.

**ضمار**:ماڵی لە دەس چووگ، ماڵی شاراوە.

**ضمان**: قبووڵ کردن، وەئەستۆگرتن، دەستەبەری.

**ضمانت**: دەستەبەری، دەستەبەربوون، وەئەستۆگرتن، بەرعۆدەبوون، "گرەنتی". "**ضمانت اجرا**": دەروەستێ کە بۆ جێبەجێکردنی کارێ دەدرێ یان دۆخی لەبار بۆ ئەنجامدرانی ئەوکارە. "**ضمانت دادن**": دەستەبەربوون، وەئەستۆگرتن. دابین کردنی پێداویسییەکانی پێویست بۆ ئەنجامدرانی کارێ.

**ضمن**: ناوەوە، ناخ. "**ضمنِ**": (نِ) وێڕای، لەگەڵ، هاوکات. سەرەڕای. "**در ضمن**": هەروەها. "**در ضمن داشتن**": لەگەڵابوون، بەدواوەبوون.

**ضمناً**: هەروەها، لەهەمان حاڵدا.

**ضمنی**: 1) پاڵەکی، لاوەکی. 2) بەئاماژە. 3) ئاماژەگەرانە.

**ضمور**: کز و لاوازبوونەوە.

**ضمه**: بۆر، نیشانەیەکە بەم فۆڕمە(ُ).

**ضمير**: 1) ویژدان. 2) هەناو، ناخ، دەروون، بیر و ڕازی شاراوە لە دڵ دا. ئەوەی بە زەین دا تێدەپەڕێ، بیر، بیرۆکە. 3) (لەڕێزمان دا) (دەستە)ڕاناو، جێناو. "**ضمير اشاره**": (ڕێزمان) ڕاناوی ئاماژە. "**ضمير شخصی متصل**": (ڕێزمان) ڕاناوی کەسیی لکاو. "**ضمير متصل**": (ڕێزمان) ڕاناوی لکاو. "**ضمير متصل اضافی**": (ڕێزمان) ڕاناوی لکاوی خستنەسەر. "**ضمير متصل فاعلی**": (ڕێزمان) ڕاناوی لکاوی بکەری. "**ضمير متصل مفعولی**": (ڕێزمان) ڕاناوی لکاوی بەرکاری. "**ضميرمتكلّم**": (ڕێزمان) ڕاناوی خۆیی، جێ ناوی خۆیی/بگۆیی. "**ضمير مشترك**": (ڕێزمان) ڕاناوی هاوبەشی. "**ضمير ملكی**": (ڕێزمان) ڕاناوی خاوەنی. "**ضميرمنفصل**": (ڕێزمان) ڕاناوی سەربەخۆ/جیا.

**ضميم**: خاوەن، هاوڕێ.

**ضميمه**: پاشکۆ. هاوپێچ کراو، پەیوەستکراو. "**ضميمه اعور**": ئاپاندیس. "**ضميمه‌كردن**": خستنەپاڵ، خستنە گەڵ یان پێوەزیاد کردن، کردنە پاشکۆ، لکاندن، هاوپێچ کردن.

**ضمين**: 1) دەستەبەر، بەرعۆدە، وەئەستۆگر. 2) نەخۆشی زەمینگیر کە تووشی نەخۆشیی هەمیشەیی هاتوە.

**ضوابط**: کۆی "ضابطە"، ڕێسا و یاساکان، دەستوورەکان، (ئابووری) بەندوبەست.

**ضوارب**: کۆی "ضارب".

**ضياء**: ڕووناکی، ڕووناهی، ڕۆشنایی.

**ضياع**: (ضَ) زایەبوون، خەساربوون، بەفیڕۆچوون.

**ضياع**: (ضِ) زەوی وزار، زەوی کشتوکاڵی.





**ضيافت**: بوونە میوان. میوانداری. "**ضيافت دادن**": میوانیدان.

**ضياگستر**: ڕووناکیدەر، تیشك دەر.

**ضيف**: میوان، میڤان.

**ضيق**: تەنگی، تەسکی. تەنگ بوونەوە. "**ضيق حال**": بەدحاڵی. دەست کورت. "**ضيق نفس**": بەرهەنگ، هەناسەبڕکێ، ئاسم.

**ضيقت**: نەداری، دەسکورتی، دەستەنگی.

**ضيم**: زوڵم، ستەم.

# ط

**طائفه:** لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە کۆمەڵێکی داخراوە و جیادەکرێتەوە لە چین بەوەی کە ئەم زیاتر لەسەر بناغەیەکی ئایینی دەوەستێت و زیاتر داخراوە، دەستە، گروپ، تیرە، تایفە.

**طائفی:** تایفەیی، تیرەگەری.

**طائل:** 1) کەڵك، قازانج. هێز، توانا. 2) فراوانی، زۆری.

**طابع:** 1) چاپکەر، چاپچی. 2) خوو، سرشت. 3) شەقڵ.

**طارق شدن:** پێشهاتن، ڕوودانی حاڵەتێك.

**طاری شدن:** 1) بڵاوبوونەوە، پەرەسەندن. 2) پێشهاتن.

**طاس گردانی:** سواڵ، سواڵکەری، دەرۆزە.

**طاس گرفتن:** مۆرەگرتن.

**طاعت:** فەرمانبەری، بەندەیی، ملکەچ کردن، گوێڕایەڵی کردن.

**طاعت بین:** کەسێ کە بەندەیی کەمی خۆی بەزۆر دەزانێ.

**طاعت پیشه:** ملکەچ، گەردنکەچ، ملچەوت، فەرمانبەر، گوێڕایەڵ، گوێ لەمست، گوێبەفەرمان.

**طاعت دار:** فەرمانبەر، گوێبەفەرمان، ملکەچ.

**طاعت ور:** بڕوانە: "طاعت پیشه".

**طاعن:** سەرزەنشتکەر.

**طاغوت:** 1) ملهوڕ، سەرکێش، سەرەڕۆ. 2) بوت، هەر شتێکی پووچ کە بپەرستن. 3) هەر پاشا یان دەسەڵاتدارێکی کافر و ستەمکار.

**طاغی:** 1) سەرکێش، سەربزێو، لەڕادە تێپەڕیوو. 2) ستەمکار، زۆردار.

**طاق:** 1) تاق، میچی بەکەوانە. 2) تاقچە. 3) ئاسمان. **"طاق ابرو"**: کەوانەی برۆ. **"طاق ازرق"**: بریتی لە ئاسمان. **"طاق زدن"**: تاق سازکردن. **"بر(به،در) طاق نسیان(فراموشی) نهادن(گذاشتن)"**: 1) لەبیر بردن، فەرامۆشکردن. 2) وەلانان، تەرك كردن.

**طاق:** 1) تاك، تاق، پێچەوانەی جووت. 2) تەنیا، بێوێنە. 3) تاق و تەنیا، جیا. 4) بەتاڵ، خاڵی. **"طاق آمدن"**: تەواوبوون، بە کۆتایی گەیشتن. **"طاق و جفت"**: 1) جۆراوجۆر، ڕەنگاوڕەنگ. 2) تاق و جووت.





**طاقباز:** بەپشتاخەوتوو، لەسەر پشت خەوتوو.

**طاقت:** توانا، هێزوتوان، تابشت، تاقەت، پرزە، بەرگە، وزە، سەبروحەوسەلە. **"طاقت کسی طاق شدن"**: تەواوبوونی سەبر و تاقەتی ئەو.

**طاقت آوردن(بردن):** بەرگەگرتن، باشارکردن، دەربردن، هەڵکردن، پێوەستان، تاقەت هێنان.

**طاقت زدا:** وزەبەر، تاقەتبەر.

**طاقت فرسا:** تاقەت پڕووکێن، سەخت و لەتاقەت نەهاتوو.

**طاقچه بالا گذاشتن:** خۆ لە خەڵکی دی لەسەرتر زانین و فیز و دەعیەکردن.

**طاقدیس:** 1) وەك تاق، بەشکڵی تاق، هەر شتێکی تاق ئاسا و کەوانەیی. 2) لە زاراوەی زەویناسیدا: نالێکییەکانی زەوی کە بە شکڵی تاقە.

**طالب:** خوازەر، خوازیار، خوازگار، داواکار، داواکەر، بەتەما. قوتابی.

**طال بقا:** 1) تەمەنی درێژ بێ. 2) ستایش، پێداهەڵگوتن.

**طالح:** پیاوخراپ، پیاوی بەدکردار.

**طالع:** بەخت، شانس، خیف، تالح. **"طالع کسی را دیدن"**: تاوتوێکردنی بەختی ئەو، پێشبینیکردن سەبارەت بە چارەنووس یان داهاتووی ئەو. **"طالع یار بودن"**: بەخت و شانس لە گەڵ ئەو بوون.

**طالع بین:** ئەستێرەگەری، کەسێ کە لە ئەستێران دەڕوانێ و تالحی تێدا دەبینێ، فالگر.

**طالع شدن:** 1) هاتنەبان، هاتنەدەر، دەرکەوتن. 2) سەرهەڵدان.

**طالع مند:** خۆشبەخت، خۆش شانس.

**طالع نحس:** بەختی شووم.

**طامات:** شاتوشووت، قسەی پووچ و بێمانا.

**طامح:** 1) ژنێ کە بێئیزنی شووەکەی بچێتە لای کەسانی خۆی، ژنی نافەرمان، سەرکێش. 2) بڵیند لە هەر شتێ.

**طامع:** بڕوانە: "آزمند".

**طاووس پیکر:** خاوەنی ئەندامی جوان و ڕەنگاوڕەنگ وەك تاوس.

**طاووس وار:** تاوس ئاسا، وەك تاوس.

**طاهر:** 1) پاك، خاوێن. 2) بێ تاوان. 3) بێگەرد.

**طایفه:** بڕوانە: "طائفه".

**طبَ:** 1) دەرمانکردن، دەواکردن. 2) (پزیشکی) زانستێ کە سەبارەت بە نەخۆشییە جۆراوجۆرەکان و شێوەی چارەسەرکردنیان دەدوێ. **"طب سوزنی"**: دەرزی ئاژنین، دەرزی ئاژەنین.

**طبابت:** 1) پزیشکی، ئیشی پزیشك. 2) دەست نیشانکردنی نەخۆشی و چارەسەرکردنی.

**طباعت:** ئیشی چاپچی، هونەری چاپ. **"دارالطباعة"**: چاپخانە.

**طبآل:** تەپڵ ژەن، دەهۆڵ ژەن.

**طبایع:** کۆی"طبیعت"، خووەکان، سرشتەکان. **"اهل طبایع یا طبایعی"**: کەسانێ کە حاشا لە بوونی خوا دەکەن و هەموو شتێ ڕەپاڵ سروشت دەدەن.

**طبع:** 1) زەوق، بەهرە، توانایی. 2) نەخش کردن، چاپکردن. 3) سروشت، خوو، تەبع. **"باب طبع"**: بەدڵخواز، دەگەڵ مەیل سازگار. **"طبع کافوری"**: سروشت سارد و وشك. **"طبع کردن"**: چاپکردن. **"طبع کسی بلند بودن"**: 1) دایندە و دڵاوابوون. 2) ڕێز و حورمەت گرتن لە کەسێتی خود. **"طبع کسی پست بودن"**: 1) قرێنیس یان بەرچاوتەنگ بوونی ئەو. 2) سووك و پەست یان سواڵکەر سفەت بوونی ئەو. **"به طبع"**: بەشێوەی سروشتی. **"به طبع رساندن"**: چاپ کردن.

**طبع آزمایی:** شێعر هۆنینەوە بەمەبەستی تاقیکردنەوە یان هەڵسەنگاندنی توانایییە زەوقی و هونەرییەکانی خۆ.

**طبعاً:** 1) بەشێوەی سروشتی. 2) بڕوانە: "خواەناخواە".

**طبق:** (طِ) بەپێی، بەگوێرەی. **"طبق معمول"**: وەك هەمیشە، وەك باوە. **"بر طبق"**: بەپێی.

**طبق:** (طَ بَ) 1) یاڵتەبەق، تەبەك، مجۆمعە، سینی. 2) ئەندامی جووت بوونی ژن. **"طبق زدن"**: پانپانۆکە، پانپانۆکێ. **"طبق طبق"**: زۆرزۆر، فراوان. **"بر طبق نهادن"**: پێشکەش کردن، ڕانان، پیشاندان، خستنەڕوو.

**طبقات:** کۆی"طبقە"، پلەکان، چینەکان، نهۆمەکان، قاتەکان.

**طبقاتی:** چینایەتی.

**طبقە:** پلە، ڕیز، چین، نشف، پۆلێن. نهۆم، قات. **"طبقە حاکم"**: چینی دەسەڵاتدار/باڵادەست.

**طبقەبندی:** قات بەندی، نهۆم بندی، چین بەندی، پۆلێن بەندی، پۆلێنکاری، چاوەچاوکردن.

**طبل توخالی:** ئەوەی زۆر هاشوهووش دەکا و قسەکانی پێچەوانەی ڕاستییە.

**طبل خوار:** خۆرا، فرەخۆر، زۆرخۆر، مفتەخۆر.

**طبل خوردن:** 1) زۆر خواردن، فرەخۆریکردن. 2) بەهرەمەندبوون، پێ بڕان.

**طبل زدن:** تەپڵ لێدان.

**طبل زن:** تەپڵ ژەن، دەهۆڵ ژەن.

**طبل زیر گلیم:** بریتی لە بابەتێکی ئاشکرا کە بیانەوێ بیشارنەوە.

**طبل فروکوفتن:** تەپڵ لێدان. بەنیازی شەڕکردن بوون.

**طبل نواز:** بڕوانە:"طبل زن".

**طبیب:** پزیشك.





**طبیعت:** 1) سروشت. 2) جیهانی هەبوون. 3) ڕۆژگار. 4) خوو، سرشت، تەبیات. 5) وارسکە، خدوو.

**طبیعتاً:** بەپێی سروشت یان چییەتی. بەشێوەی سروشتی.

**طبیعت بازنمایی:** سروشتی نواندنەوە.

**طبیعت شناس:** سروشت ناس. پزیشك.

**طبیعت کردن:** تێکچوونی حاڵەتی سروشتی کەسێك.

**طبیعت گرا:** سروشت خواز.

**طبیعت گرایانه:** سروشت خوازانە.

**طبیعی:** 1) سروشتی، سرشتی، خۆڕسك(ی)، خۆڕسکاو، خۆکرد، خۆوەر، دەسکردی خوا، دروست نەکراو. 2) ڕەسەن، دەست لێنەدراو. 3) ئاسایی، نۆرماڵ. 4) کەسێ کە هەموو شتێ ڕەپاڵ سروشت دەدا. 5) زانستێ کە سەبارەت بە چۆنیەتی سەرهەڵدانی بوونەوەران و ڕوەکەکان تاوتوێ و لێکۆڵینەوە دەکا. 6) سروشت زان. **"طبیعیات"**: زانستێکە کە لەمەڕ سروشت و تایبەتمەندی شتەکان دەدوێ. **"طبیعی دان"**: ئەوەی سەبارەت بە زانستە سروشتییەکان یان دیاردەکانی سروشت موتاڵا و تاوتوێ دەکا. **"طبیعیون"**: زانایانی زانستە سروشتییەکان. کەسانێ کە حاشا لە بوونی خولقێنەر دەکەن و هەموو شتێ ڕەپاڵ سروشت دەدەن. **"غیرطبیعی"**: پێژەك، کاوش، ناسروشتی، زیادلە ئەندازە، پیچەوانەی سرشتی، نەگونجاو دەگەڵ دامودەستووردا، بیژۆك.

**طبیعی‌گری:** سروشتی خوازی.

**طـ پاندن:** بڕوانە:"تپاندن".

**طحال:** سپڵ، سەپەل، سوویە، شوشو، فشك، ددان خۆشك، فاتەڕەشك، فاتەڕەشە، شمش، گورگ نەخۆرە، پارچە گۆشتێکی ڕەشە لە هەناودا.

**طرائف:** کۆی"طریفە"، شتەتازە و نوێیەکان. شتە ناسك و سووك و گرانباییەکان.

**طرائق:** ڕێگاکان، شێوەکان. **"طرائق الدهر"**: پێشهاتەکانی ڕۆژگار.

**طراح:** 1) شێوەکار، نیگارکێش. 2) گەڵاڵەداڕێژ، گەڵاڵەدانەر، پلان داڕێژ، نەخشەکێش. 3) ئەوەی لەسەر ڕێی بوونەوەران تەڵە دادەنێتەوە. **"طراح ساختمان"**: نەخشەکێشی بینا. **"طراح صحنه"**: دێکۆراتۆر، دیمەن ڕازێنەوە.

**طراحی:** 1) شێوەکاری، نیگارکێشی. 2) داڕشتن، بەرنامەڕێژی بۆ کار یان چالاکی یان بۆ داڕشتنی بابەتێ. 3) دروست کردن، بیناکردن. 4) دیزاین. **"طراحی شده"**: داڕێژراو، گەڵاڵەکراو. **"طراحی کردن"**: 1) گڵاڵەکردن، گەڵاڵەکردن، داڕشتن. 2) نیگارکێشانەوە، نەخشەکێشانەوە.

**طرادآوردن:** هێرش بردن، پەلاماردان.

**طرّار:** تەڕدەست، گیرفان بڕ، کیسەبڕ، قەمك، قەمکە، دزی تەڕدەست و خێرا.

**طراز:** 1) ڕیز، چین، پلە. 2) چەشن، جۆر. 3) ڕێکخستن، میزان کردن. 4) پەراوێزی قوماش یان جلوبەرگ. 5) تاڵ، هەودا، ڕشتە. 6) خشڵ، خەمڵ، زەنبەر. 7) ڕادە و ئەندازە. "**طراز کردن**": ڕیزکردن. ڕازاندنەوە. هۆنینەوە.

**طرازیدن:** 1) ڕازاندنەوە، ڕێکوپێك و جوانکردن. 2) چاك کردن، دروست کردن. 3) ئامادەکردن.

**طرافت:** نوێبوونەوە، تازەبوونەوە.

**طراوت:** 1) پاراوی، تێراوی، تەڕوتازەیی، تەڕوبڕی، تەڕوپاراوی. 2) نەرمونیانی و بەگەشەیی و جوانی. 3) شادی، دڵخۆشی.

**طرب:** (طَ رَ) شادی، شادمانی.

**طرب آرا:** ڕازێنەوەی کۆڕی بەزم و شادی.

**طرب آشیان:** شوێنی بەزم و شادی.

**طرب انگیز:** شادیهێن، ئەوەی ببێتە هۆی بەزم و شادی.

**طربخانه:** شوێنی بەزم و شادی، بەزمگا.

**طرب شکار:** ئەوەی ببێتە هۆی شادی و خۆشی.

**طربگاه:** بڕوانە:"طربخانە".

**طربناك:** شادمان، دڵخۆش، خۆشحاڵ.

**طربنامه:** نامەی خۆشی، نامەیەك کە خوێندنەوەکەی ببێتە هۆی شادی و دڵخۆشی.

**طرح:** 1) وەلانان، دوورخستنەوە. 2) بەرخستن، لەباربردن، نەویستن. 3) گەڵاڵەپێشنیار، گەڵاڵەکار، دەستووری کار. 4) پڕۆژە، نەخشە، پلان، کەین و بەین. 5) بەچك، بیچم، سەکوت، کەسم، فۆڕم، شکڵ، وێنە. 6) ڕەشنووسی سەرەتایی بەرهەمێکی ئەدەبی و هونەری یان نامیلکەی زانستی و شتی لەو بابەتە کە ناوەڕۆکی گشتی بەبێوردەکارییەکان دەخاتەڕوو. 7) خستنەڕوو، نواندن، پێشکەشکردن، هێنانەبەر باس(طرح مسئله). 8) دارشتنی بابەتێ یان پرسیارێ(طرح نقشه). 9) داو یان تۆڕی ڕاوکردن. 10) فرۆشتن بەزۆر. 11) بناغەدانان، بناخەدارشتن. 12) (بیرکاری) لێدەرکردن، دەرکردن. "**به طرح**": 1) بەزۆر، زۆرەکی، بەتۆپزی. 2) بتەوێ یان نەتەوێ، چاری‌ناچار، بەناچاری.

**طرح افکندن:** پلان دانان، بناخەدارشتن، بنیاتنان.

**طرح بندی:** بڕوانە:"نقشەکشی".

**طرح دادن:** 1) گەڵاڵە پێشنیاردان. 2) خستنەڕوو یان خستنەبەرباسی بەرنامە یان پێشنیارێکی تایبەت.

**طرح ریختن:** 1) دیاریکردنی بەرنامە و ئامانجی کارێك. 2) نەخشەکێشان، بەرنامەڕێژیکردن.





**طرحریزی:** 1) پلان دانان، دابین کردنی نەخشە یان بەرنامەی شتێ. چۆنیەتی بیچمی دروست کراو. 2) تەگبیری پێشەکی.

**طرح کردن:** 1) خستنەڕوو، خستنەبەر باس، پێشکەش کردن. 2) دارشتنی بابەتێ یان پرسیارێ یان بەرنامەڕێژی بۆ کارێ یان چالاکییەك. 3) وازهێنان، دەست لێ هەڵگرتن، تەرك کردن. 4) فرۆشتن بە زۆر. 5) ناچارکردنی کەسێك بەدانیماڵیات. 6) سووك کردن، بێ نرخکردن. 7) خستنەئەستۆی کەسێکی دی، پێ سپاردن.

**طرح کش:** 1) نیگارکێش، نەخشەکێش. 2) دۆڕاو و داماو.

**طرد:** 1) دەرکردن، لەخۆدوورخستنەوە. 2) خستنە لاوەی کەسێك و پساندنی پێوەندی دۆستایەتی و تێکەڵی دەگەڵ ئەو. 3) بڕوانە: "تبعید". 4) ڕاوکردن.

**طرز:** 1) شێوە، چۆنیەتی ئەنجامدانی کارێك. 2) چەشن، جۆر. 3) شکڵ و بیچمی شتێ.4) ڕێسا، ئایین.

**طرغان بستن:** خڕکردنەوەی لەشکر.

**طرف:** (طَ) چاو، گۆشەی چاو. بەهرە، قازانج. "**طرف بربستن ـــ طرف بستن**": بەهرەگیرهێنان، قازانج کردن.

**طرف:** (طَ رَ) 1) ڕوو، لا، پاڵ، قەراغ و کۆتایی شتێ. 2) لایەن. 3) تخوون، جەبەر. 4) فلان، کاورا، ئەوەکە. 5) دۆستێ لە ڕەگەزی ژن یان پیاو. 6) مەڵبەند، ناوچە، شار(آن طرف ها میوه فراوان است). 7) (فەلسەفەی کۆن) کۆتایی شتێ لە کات و شوێن دا. 8) ڕوو. "**طرف برطرف**": گشت جێیەك. "**طرف کسی(چیزی) را گرفتن**": لایەنگری یان پشتیوانی لێکردن لەو. "**از طرف**": لە لایەن. "**از طرف کسی(چیزی)**": بە نوێنەرایەتی لە لایەن ئەوەوە. "**از طرفی**": لە لایەکیترەوە، هەروەها. "**از یك طرف**": لە لایەکەوە. "**با کسی طرف بودن**": دەگەڵ ئەو ڕووبەڕووبوون یان سەروکارهەبوون. کێشە یان ناکۆکی هەبووون دەگەڵ ئەودا. "**به طرفِ**": بەرەولای. "**کسی را با کسی طرف کردن**": لە بەرامبەر یەك دانانی ئەوان، ڕووبەڕووکردنەوەی ئەوانە.

**طرفدار:** (طَ رَ 1) پشتیوان، لاگر و پارێزەر، لایەنگر، لایەنگیر، لاگر، لانگر، لادار، داژدار. 2) سنوورپارێز. "**طرفدار انجم**": بریتی لە هەتاو. "**طرفدار پنجم**": بریتی لە مریخ.

**طرفداری:** (طَ رَ 1) لاگیری، لاگری، لایەنگری، لان گرتن، لانگری، داژداری، داشداری، لاکۆشکە، لاکۆشی، پشتیوانی. 2) ئاگاداری وپارێزگاری لە ناوچە و سنوورەکان.

**طرفگاه:** (طَ) بریتی لە جیهان.

**طرفگیر**: (طَ رَ) لایەنگر، پشتیوان.
**طرف نشین**: سنوورپارێز، سنوورڤان.
**طرفه**: (طُ.فَ) 1) سەیروسەمەرە، سەرسووڕێن. 2) جوان و دڵخۆشکەر، دلگر، دڵپەسند. 3) قسەی ناسک. 4) هەر شتێکی جوان و کەم وێنە و سەرسووڕێن.
**طرفین**: (هەر)دوولا، دوولایەن.
**طرق**: (طُ رُ) کۆی "طریق"، ڕێگاکان، شێوەکان.
**طرید**: 1) دەرکراو. 2) شێعری پیاهەڵدان لە شەرگەدا.
**طریفه**: شتی سەیر و دەگمەن. تازە و نوێ، قسەی باش و جوان.
**طریق**: 1) ڕێوشوێن، شێوە. 2) چەشن. 3) ڕەوگە، جادە، ڕێ. 4) شێواز. "**طریق سپردن**": گرتنەپێشی شێوازێ. "**طریق چیزی پیش گرفتن**": گرتنەپێشی ئەو شتە، خەریکی ئەوبوون.
**طریقت**: ڕێباز، ڕێچکە. شێوە.
**طریقه**: ڕەوش، شێواز. ڕێگەچارە.
**طعام**: خۆراك، خواردەمەنی، هەرشتێکی خواردنی.
**طعم**: چێژ، چێژە، چەژە، تام. "**طعم چیزی را چشیدن**": 1) تاقیکردنەوەی تامەکەی، تام لێکردن. 2) هەست پێکردن یان تاقیکردنەوەی ئەو.
**طعمه**: خواردەمەنی، ڕسق، ڕۆزی. چەشە. "**طعمه چیزی شدن**": لەناوچوون بەهۆی ئەوەوە.
**طعمه جو**: خۆرا، زۆرخۆر، پووتەك.

**طعن**: 1) نێزە لێدان. 2) تەشەرلێدان، تانەلێدان، سەرزەنشت کردن.
**طعن آمیز**: تەشەراوی، تەوساوی، تێکەڵ بە تانە و سەرزەنشت.
**طعن کردن**: لۆمەکردن، سەرزەنشت کردن، تانەلێدان.
**طعنه**: 1) تانە، تانووت، تیز، قەرف، تەوس، تەشەر، توانج، لەقەم، لۆمە، سەرکۆنە، سەرزەنشت. 2) ئاسەواری نێزە لە لەش دا. "**طعنه زدن**": تانەلێدان، تەشەرلێدان، تەوس پیادان، پللارتێگرتن. "**به طعنه**": بەتانە، بەتەوس.
**طغام**: لات و لووت، لۆتیوپۆتی، خۆڕیوتۆڕی.
**طغرازدن**: 1) مۆر و واژۆی خۆ لەسەر شتێ دان. 2) نەخش کردن، چەسپاندن. "**به طغرا رساندن**": واژۆکردن.
**طغیان**: 1) لە ڕادەتێپەڕین. 2) ڕابوون، هەستان. 3) بەرزبوونەوەی ئاوی دەریا یان ڕووبار، ئاوسەرکردن. 4) نافەرمانی، سەرکێشی. 5) هەڵچوون، دەرکەوتنی شتێ بەجارێك و بە توندی.
**طفره**: 1) بازدان. 2) مەودایەك کە بکەوێتە کارێکەوە. "**طفره تقلا**": هەوڵ، تەقالا. "**طفره رفتن**": تەفرەچوون، دەساودەس کردن، بێنەوبەرەکردن، هێنان و بردن. "**طفره کردن**": بازبازان کردن، هەڵبەزدابەز کردن.





**طفل**: منداڵ، زارۆ. کۆرپە، ساوا. "**طفل راه**": قوتابی و تازەکار.
**طفولیت**: سەردەمی منداڵی، منداڵ بوون.
**طفیل**: بەستراوە. میوانی نەخوازراو، لاورگە. "**بەطفیل (از طفیل)**": بەخاتری، لەبەر بوونی.
**طفیلی**: چەورە، زگ لەوەڕێن، سك لەوەڕێن، لەم لەوەڕن، دووڤ دەهۆڵێ، مشەخۆر، مفتەخۆر، لاورگە، وەردەك، ڕەگەڵ ڕەگەڵ، میوانی نەخوازراو. بەستراوە بە کەسێکیدی.
**طلا**: زێڕ، تەڵا. "**طلای ابلهان**": (زانستەکانی زەوی) "پیریت". "**طلای سبز**": لێڕەوار. "**طلای سیاه**": نەوت.
**طلاق**: جیابوونەوەی ژن و پیاو لەیەکتر، دەست لێهەڵگرتن، وازلێهێنان، بێبەش بوونی ژن لە مێرد، تەڵاق.
**طلاقت**: 1) زمان پاراوی، قسەڕەوانی. 2) ڕووخۆشی، دەم بەپێکەنینی.
**طلاکاری**: تەڵاکاری، زێڕکفت، زێڕکاری، سازکردنی نەخش و نیگار بەزێڕ لە شتێکا.
**طلاکردن**: (طِ) تێساوین، تێهەڵسوون، پیامالین.
**طلاوت**: چاکێتی، باشی.
**طلایع**: کۆی "طلیعە".
**طلایه**: پێشەنگەکانی لەشکر. "**طلایگی**": پێشەنگ بوون، پێشڕەوبوون. "**طلایەدار**": 1) سەرۆکی پێشەنگەکانی سپا، فەرماندەری پێشڕەوەکان. 2) پێشڕەو، پێشەنگ. 3) نگابان و پارێزەری سپا بەتایبەتی لە شەودا.
**طلب**: (طُ) گروپ، دەستەیەك لە خەڵکی. "**طلب طلب**": گروپ گروپ، دەستەدەستە.
**طلب**: (طَ لَ) داوا، داخوازی، خواستن، ویست. تکا. قەرز.
**طلبات**: داخوازییەکان.
**طلب کردن**: 1) خارتن، خوازتن، داواکردن، ویستن. 2) بەدواداگەڕان، بە دوای شتێ یان کەسێکەوە بوون.
**طلبکار**: خوازەر، داواکار، لاوەکەر، خاوەن واو، خودان قەرز، قەرزدەر، وامدەر.
**طلبگی**: فەقێیەتی، قوتابێتی.
**طلبه**: کۆی "طالب"، فەقێ، فەقە، فەقەه، دەرس خوێن لە مزگەوت. خوازیاران، پەیجۆران. "**طلبه علم**": خوازیارانی زانست، پەیدۆزانی زانست، خوێندکاران.
**طلبیدن**: 1) خواستن، داخواستن، خوازتن، ویستن. 2) بانگهێشت کردن، داواکردن. 3) بڕوانە: "جُستن".
**طلسم**: 1) چاچۆلە، تەلیسم. 2) سێحر، جادوو. 3) گرفتاری جادوو. "**طلسم چیزی را شکستن**": 1) تەلیسم شکاندن. 2) لابردنی کۆسپ یان گرفتەکانی.

3) لەناوبردنی ئەو. 4) لەناوبردنی هێزی کاریگەری ئەو. **"طلسم چیزی را گشودن"**: پووچەڵکردنەوەی تەلیسمی ئەو. **"طلسم کردن"**: 1) تەلیسم کردن، جادووکردن. 2) بەتوندی خستنە ژێرکاریگەری. 3) ئاستەنگی نانەوە، کۆسپ نانەوە. 4) دەگەڵ کۆسپ و تەگەرە ڕووبەڕووکردنەوە.

**طلعت:** 1) دیمەن، ڕوخسار، ڕوومەت. 2) هەڵاتن، دەرکەوتن.

**طلوع:** 1) هەڵاتن، هەڵهاتن، هەڵهاتن، دەرکەوتن، لەئاسۆدەرکەتنی خۆر و مانگ، هاتنەبەرچاو، هاتنەدەر. 2) سەرەتای سەرهەڵدانی شتێ. **"طلوع آفتاب"**: خۆرکەوتن، خۆرەتاوکەوتن، تاوکەوتن، تاوهەڵاتن، ڕۆکەتن، زەردەکەوتن، وەرکەفتەی، هۆرامان. **"زمان طلوع خورشید"**: تاوهەڵات، هۆربەشان، هۆربەشیان، دەمی تاوکەوتن.

**طلیعه:** پێشەنگی لەشکر، پێشڕەوی سپا، پێش قەڕەوڵ.

**طلیق:** ئازاد، سەربەست.ڕووخۆش، دەم بە پێکەنین. **"طلیق اللسان"**: زمان پاراو.

**طمّاع:** ڕژد، چنۆک، تەماکار، بەتەماح، چاوبرسی.

**طمأنینه:** 1) ئارام گرتن، ئۆقرەگرتن، هێمن بوونەوە. 2) ئاسوودەیی، دڵنیایی. 3) ئەسپایی، کاوەخۆیی. 4) بڕوانە: "وقار".

**طمس:** (طَ) سڕینەوە، لەناوبردن، تیابردن. ڕۆچوون.

**طمطراق:** 1) شکۆوسەنتەنە، پیشاندانی شکۆ و جەلال. 2) دەعیە و خۆنوێنی. 3) هاتوهاوار، هەراوهوریا.

**طمع:** تەما، تەماح، ڕژدی، دڵ بزۆکی، هەڵپ، چاونەزێری، چاوچنۆکی، هومێد و داوای ناڕەوا. **"طمع برداشتن(بریدن، گرفتن، برگرفتن،گسستن)"**: تەمابڕان، هیوابڕان. **"طمع بردن"**: تەماح (تێ)کردن، وەتەماح کەوتن. **"طمع بستن"**: تەماکردن، وەتەماح کەوتن، مرخ لێخۆش کردن. **"طمع خام"**: چاوەڕوانی بێجێ، ئاواتی پووچ. **"طمع داشتن"**: بەتەماح بوون، تەماحکاربوون، چاوچنۆک بوون. چاوەڕوانی هەبوون. **"طمع کردن"**: تەماح تێکردن، وەتەماح کەوتن، مرخ لێچوون، مرخ لێ پەڕین، مرخ لێخۆشکردن. هیوا یان چاوەڕوانی هەبوون. **"به طمع"**: بەهیوای، بە تەمای، بە نیازی داگیرکردنی ناڕەوا. **"به طمع انداختن"**: وەتەماح خستن، تەماح وەبەرنان.

**طمعکار:** دڵ بزۆک، مووزر، چاوچنۆک، چاونەزێر، تەماحکار، بەتەماح، کۆدۆ.

**طموح:** دوورڕوانی، دوورنواڕی.

**طمیس:** کوێر.

**طناب خور:** قوولی، قوولایی. پەت هەڵێنج.

**طناب کشی:** گوریسەکێشکە، دۆژکێشان.

**طنّاز:** 1) شۆخ، بەناز. 2) زۆر جوان و دڵگر. 3) نکتەزان و ئیرادگر.





**طنز:** 1) حەنەک، هەنەک، هەنک، فەنەک، قەرف، تەنز، قسەی گاڵتەوگەپ، قسەی پێکەنین. 2) ناز و عیشوە. 3) تانە، تەوس، سەرزەنشت. 4) تەوزەپێکردن، گاڵتە پێکردن. 5) نازکردن. **"طنزکردن(زدن)"**: تانەلێدان، تەوس لێدان، گاڵتەپێکردن. **"طنزکنان"**: لە حاڵی ناز و عیشوەدا.

**طنزآمیز:** تەوساوی، تەوسن.

**طنزگو:** نکتەزان، زۆرزان لە قسەی جەفەنگی دا، حەنەکی، لێبۆک.

**طنطنه:** 1) بزەم بزەم، سەنسەنە، تەنتەنە، دەنگی تار و دمەک، جەلال و شکۆ. 2) ناوبانگ، ناڤدەنگ.

**طنین:** 1) زرینگانەوە، دەنگدانەوە، زایەڵە. 2) لە فیزیادا: ڕاژانە لاوەکییەکانی دەنگ. **"طنین افتادن"**: دەنگدانەوە. **"طنین انداختن"**: پەخش یان بڵاوبوونەوە، دەنگدانەوە. **"طنین کردن"**: بەرزبوونەوەی دەنگ.

**طنین افکن:** ڕەسا.

**طنین انداز:** تایبەتمەندیی دەنگێ یان هەواڵێ کە لە جێیەکەوە پەخش و بڵاو دەبێتەوە. **"طنین انداز شدن"**: پەخش و بڵاوبوونەوە.

**طوائف:** کۆی"طائفه".

**طوابع:** کۆی"طابع".

**طواف:** 1) گەڕان، دەورلێدان، سووڕانەوە. 2) گەڕان بە دەوری شتێکا. 3) سەردانی شوێنێ یان کەسێکی بەقەدر و ڕێز کردن. **"طواف دادن"**: 1) گەڕاندنی شتێ یان کەسێك بەدەوری کابە یان هەر شوێنێکی پیرۆز دا. 2) گەڕاندن، سووڕاندنەوە، دەورپێلێدان.

**طور:** (طَ) 1) جۆر، چەشن، وەك، لەوێنە، گۆر. 2) شێوە. 3) حاڵەت، چۆنیەتی. 4) جار، کەڕەت، چەل. 5) شێوە و شێواز لە تێکنیکە ئەدەبییەکان دا. **"طوری"**: بەشێوەیەك. **"به طور"**: بە شێوەی. لە ڕوانگەی، بەپێی ڕوانگەی. **"به طور حتم(قطع،یقین)"**: بێگومان، بێئەملاوئەولا، بەمسۆگەری.

**طوفان:** 1) باوبۆرانی توند، تۆف و زریان، سێڵاوی بەتەوژم، تۆفان، ڕۆژی زۆر تووش و بەکرێوە. 2) هەرجۆرە بەڵا یان ڕووداوێکی سەخت و ناخۆش. 3) هەراوهوریا، هاتوهاوار.

**طوفان زا:** تۆفان زا، ئەوەی ببێتە هۆی سەرهەڵدانی تۆفان.

**طوفان زده:** تووشی تۆفان بوو، تۆفان لێدراو.

**طوفانی:** 1) تۆفانی، شەپۆلاوی. نائارام، شڵەژاو و گۆڕاو. 2) زۆر بەهێز و پڕهەراوهوریا.

**طول:** 1) درێژی، درێژایی، بەرامبەری پانایی. 2) ماوەدا، ڕاستا. 3) درێژبوونەوەی کاتی بە ئەنجام گەیشتنی کارێ یان بابەتێ. **"طول عمر"**: ماوەی ژیان. **"طول و تفصیل"**: 1) شیکردنەوە یان تاوتوێکردنی وردەکارییەکانی بابەتێ. 2) کەلوپەلی ڕازێنەرەوەیی ناپێویست. **"طول و عرض"**:

1) درێژی و پانی. 2) سەرانسەر. "**به طول انجامیدن**": درێژەکێشان، خایاندن، پێچوون.

**طولانی:** 1) درێژ، دوور و درێژ. 2) مەودای زۆر، درێژماوە.

**طول دادن:** درێژکردنەوە، درێژەپێدان، لە کورتیەوە لە دودان، لەسەر ڕۆیشتن، وەدرەنگ خستنی کارێك.

**طول کشیدن:** درێژەکێشان، پێچوون، خایاندن، خایانن، کات بردن.

**طولی:** لەدرێژیدا، بەدرێژی.

**طولیاب:** کامێرای زەوی پێوی، "تێئۆدۆلیت".

**طومار:** گۆرۆز، تۆمار، نووسراوی لوولدراو. "**تومار چیزی درهم پیچیدن**": کۆتایی هاتنی ئەو شتە.

**طوی کردن( دادن ):** بەڕێوەبردنی میوانی و جێژن.

**طویل:** درێژ. درێژماوە. بە دوور و درێژی. "**طویل الذیل**": تێروتەسەل، بەربڵاو، چڕوپڕ. کلك درێژ. "**طویل القامة**": باڵابەرز، بەژن و باڵابەرز. "**طویل المدّت**": درێژماوە، درێژخایەن.

**طهارت:** 1) خاوێن ڕاگرتنی لەش، لەشپاکی. 2) دەست بە ئاو گەیاندن. 3) پاك بوون لە گوناح یان گیرۆدەییە ئەخلاقییەکان. 4) دەست نوێژ (هەڵگرتن).

**طهور:** 1) پاککەرەوە. 2) پاك و پوخت.3) دەست نوێژ هەڵگرتن.

**طهوریّت:** پاکی، پیرۆزی.

**طی:** 1) پێوان، (ڕێ) بڕین. 2) بڕوانە: "گذراندن". 3) لوولەکردن، پێچانەوە. 4) ئەنجام بوون. "**طی طریق**": پێوانی ڕێگە، ڕێگابڕین، ڕێپێچانەوە. پێوانی قۆناغەکانی سۆفیگەرێتی. "**طی کردن**": 1) (ڕێگە)بڕین، ڕێبڕین، ڕۆیین، پێوان. 2) بڕوانە:"گذراندن". 3) بڕوانە: "درنوردیدن". 4) سڕینەوە، لەناوبردن. 5) تەواوکردن، کۆتایی پێهێنان. "**درطی**": لە درێژەی، لە ماوەی.

**طیارکردن:** ئامادەکردن، ساز و تەیارکردن.

**طی الارض کردن:** بڕینی مەودایەکی دووررودرێژ لە چرکەیەك دا.

**طیب:** (طِ) 1) خۆشی، چێژ. 2) بۆنی خۆش. 3) هەرشتێکی بۆنخۆش. 4) باشترین لە هەر شتێ. 5) پاکی، خاوێنی. "**بطیب نفس ـ بطیب خاطر**": بە ویستی خۆ، بە مەیلی خۆ.

**طیَب:** (طَ) پاك، خاوێن. "**طیب و طاهر**": 1) پاك و خاوێن و حەڵاڵ. 2) بێ تاوان.

**طیبت:** 1) شۆخی، شۆخیکەر، جەفەنگباز. 2) هەر شتێکی بۆنخۆش. "**طیبت کردن**": شۆخیکردن. "**به طیبت نفس**": لە دڵەوە.





**طیر:** باڵندە.

**طیران:** هەڵفڕین، فڕین، دەحەواچوون، باڵگرتن.

**طیره:** 1) سەرشۆڕی. 2) خەجاڵەتی، تەریقی، شەرمەزاری. 3) تووڕەیی. 4) بەتووڕەییەوە. 5) پەرێشان. "**طیرەشدن**": هەڵچوون، تووڕەبوون. تەریق بوونەوە. "**طیره گرفتن**": تووڕەبوون.

**طیف:** 1) خەیاڵ کردنەوە لە خەودا. 2) خەیاڵ، وەهم. 3) شەبەنگ، تارمایی، سیتاڤك. 4) کۆمەڵە خەڵکێ یان شت گەلێ کە تایبەتمەندیی هاوبەشیان هەبێ. 5) لایەن.

**طین:** 1) خاك، گڵ، قوڕ. 2) جەستە و گیانی مرۆ.

**طینت:** سرشت، خوو.

**طیور:** کۆی"طائر"، باڵداران، پەلەوەران.




**ظافر:** سەرکەوتوو، براوە.

**ظالم:** ستەمکار، زاڵم، زالمەی، زۆردار، غنزیل، خوداگیر، دەست درێژکەر بۆ مافی بێدەسەلات.

**ظالمانە:** زاڵمانە، ستەمکارانە، زۆردارانە.

**ظالم بلا:** مزیر، بەدفەڕ.

**ظاهر:** 1) ڕووکەش، ڕواڵەت، دیمەن، ئەوەی لەبەرچاوە. 2) ئاشکرا، دیار، بەرچاو. 3) دەرەوەی شار. "**درظاهر (بەظاهر)**": بەڕواڵەت، بەئاشکرا.

**ظاهراً:** 1) بەڕواڵەتی، بەنما، بەئاشکرا. 2) ڕەنگە، گۆیا، لەوانەیە.

**ظاهربین:** ڕواڵەت بین، ڕووکەش بین.

**ظاهرپرست:** ڕواڵە پەرست، ئەوەی ڕواڵەتی خۆش دەوێ و گرینگی بە دەروون نادا.

**ظاهرسازی:** 1) ڕواڵەت نوێنی، ڕواڵەتبازی، ڕووبازی. 2) ڕواڵەت پاراستن.

**ظاهرشدن:** 1) دەرکەوتن، دیاریدان، ئاشکرابوون. 2) (وێنەگری) شۆردرانەوە، بە شێوەی وێنە دەرهاتن. 3) دەستەبەربوون، وەدیهاتن.

**ظاهرفریب:** خاوەنی ڕواڵەتی فریودەر.

**ظاهرکردن:** دەرخستن، ئاشکراکردن. 2) (وێنەگری) شۆردنەوە.

**ظاهری:** 1) ڕواڵەتی، ڕووکەشی. 2) بەتاڵ لە ناوەڕۆک و ڕاستێتی. 3) ئاشکرا، دیار. 4) تایبەتمەندی کەسێ کە تەنیا سەرنج دەداتە ڕواڵەت یان بە ڕیاکاری و ڕواڵەتبازی هەڵسوکەوت دەکا. 5) لە ڕووی ڕواڵەت نوێنی و یان بۆ پاراستنی ڕواڵەت.

**ظرافت:** 1) جوانی و هاوڕێژەیی لە ڕواڵەت یان پێکهاتەی شتێ یان لە ڕوخسار و ئەندام و هەڵسوکەوتی کەسێکدا، وردکاری، ناسک کاری. 2) قسەقوتی، خۆش زەوقی، خۆش مرخی. "**ظرافت کردن**": شۆخی و گاڵتەکردن.

**ظرف:** 1) دەفر، فەرە، قاپ، فۆل، ئامان. 2) (فەلسەفە) هەڵکەوتی کاتی یان شوێنی لەبار بۆ شتێ یان کارێ. "**ظرفِ**": لەماوەی.

**ظروف:** 1) قاپ و قاچاخ، قاپ و قاچاغ، قاپوقنجاڕ، دەفر بەگشتی. 2) هەڵکەوتەکان، کاتەکان. 3) بارودۆخ. "**ظروف طبیعی**": باری سروشتی.





**ظرفیّت:** 1) دەفرایەتی، (تێدا)جێبوونەوە، بڕی لەخۆگر( ئەو تانکییە چەنێك ئاو دەگرێ؟). 2) لێهاتوویی، لەباربوون، توانایی(ظرفیت تولید). 3) ئەندازە، ڕادە. 4) (شیمی) توانایی هەر ئەتۆمێ بۆ دروست کردنی پێوەندی شیمیایی دەگەڵ ئەتۆمەکانی‌تر. "**ظرفیّت داشتن**": دێران، جێگاتێدابوونەوە، جێگابوونەوە، گونجان. جەنبەهەبوون، توانایی وەرگرتن یان تەحەممولٚ کردنی شتێ. "**کم ظرفیّت**": کەم جیگلدانە، بێحەوسەلە، کەم پشوو، فرش تەنگ.

**ظریف:** 1) ناسك، نازك، شەنگ، قەشەنگ، قۆز، کەشخە، کەیلان، جوان. 2) ورد یان شیاوی سەرنج و وردبینی. 3) هەڵسەنگێنراو، هەزراو، ژیرانە. 4) قسەقوت و نوکتەزان. 5) قسەخۆش، قسەشیرین، حەنەکچی، شۆخ.

**ظفت کردن:** 1) خستنە ژێر کۆنترۆڵ یان دەست بەسەراگرتن. 2) سەرنجدان یان خستنە ژێر چاوەدێری.

**ظفر:** سەرکەوتن، بەئاوات گەیشتن، زاڵبوون. "**ظفر یافتن**": باوسەندن، وەسەرکەوتن بەسەر غەنیمدا.

**ظفرمند:** سەرکەوتوو، بەئاوات گەیشتو.

**ظفرنمون:** سەرکەوتوو.

**ظل:** 1) سێبەر. 2) (بیرکاری) تانژانت.

"**ظل تمام**": (بیرکاری) کوتانژانت.

**ظلام:** تاریکی.

**ظلامە:** سکاڵا، دادخوازی.

**ظلم:** (ظُ) زوڵم، زڵم، زاڵمایەتی، زالمکی، زالمەتی، زالمێنی، ناهەقی، ناڕەوایی، ستەم، زۆر، زۆرکاری، لەتم. "**ظلم رفتن بر کسی**": زوڵم لێچوون، ناهەقی لێکران.

**ظلم:** (ظُ لَ) کۆی"ظلمت".

**ظلماء:** شەوەزەنگ، تاریکەسەلات، تاریك و تنۆك.

**ظلمات:** نووتەك، تنۆك، تاریك و نوتەك، تاریکایی خەست.

**ظلمانی:** زۆرتاریك، تاریکەسەلات.

**ظلم پیشە:** زۆردار، ستەمکار، زاڵم.

**ظلمت:** تاریکی.

**ظلمت فزا:** زۆرکەرەی تاریکی.

**ظلمتکدە:** 1) بریتی لە دنیا. 2) هەر جێیەکی زۆر تاریك.

**ظلمە:** کۆی"ظالم".

**ظلیل:** سێبەردار، نسار، ئەوەی سێبەری دایمی هەبێ.

**ظن:** دڕدۆنگ، گومان، شك. "**ظن بردن**": گومان کردن بەتایبەتی گومانی خراو. "**حسن ظن**": گومانی باش. "**سوء ظن**": دڕدۆنگی، بەدگومانی.

**ظنون:** (ظُ نُ) کۆی"ظن".

**ظنون:** (ظَ نُ) 1) پیاوی بەدگومان. 2) پیاوی سست و لاواز کە نەکرێ متمانەی پێ بکرێ.

**ظنيّات:** گومانە خراوەکان سەبارەت بە کەسێك یان شتێك. تۆمەتەکان، دەنگۆکان.

**ظنين:** بڕوانە: "بدگمان".

**ظواهر:** کۆی "ڤاهر".

**ظهار:** حەرام بوونی ژن لە پیاو کاتێ بە دایکی خۆی بشوبهێنێ.

**ظهر:** نیوەڕۆ، نیڤرۆ، نیڤران. "**درهنگام ظهر**": نیوەڕۆ یان نیوەڕۆییێ، نیورانێ، لە کاتی نیوەڕۆدا.

**ظهرانه:** فراوین، نەهار، نانی نیوەڕۆ.

**ظهور:** 1) دەرکەوتن، سەرهەڵدان، ئاشکرابوون. 2) (وێنەگری) شۆردنەوە. "**ظهورآنی**": دەرکەوتنی کتوپڕ. "**ظهورکردن**": دەرکەوتن، ئاشکرابوون. هاتنەدی، وەدیهاتن. "**بەظهورآمدن**": 1) دەرکەوتن و ئاشکرابوون. 2) دەستەبەربوون، وەدیهاتن.

**ظهير:** یاریدەدەر، پشتیوان.

# ع

**عائد:** 1) گەڕاوە. 2) سوود، قازانج، داهات. 3) سەردانکەر، سەرلێدەر لە نەخۆش. "**عائد شدن**": وەدەست هاتن، ڕەنیوهاتن. "**عائد شدن بەچیزی**": بوونە هۆی ئەوە. "**عائدکردن**": 1) دانەدەست یان پێگەیاندن. 2) بڕوانە:"سود بردن". 3) بڕوانە:"سودکردن".

**عائق/عایق:** 1) کۆسپ، تەگەرە، پێش گر، بەرگێڕەوە. 2) لە زاراوەی فیزیك دا: جسمێ کە برق یان تینی لێوەدەرنەچێ.

**عائل/عایل:** هەژار، دەسکورت، نەتێر.

**عائلە/عایلە:** بنەماڵە، خێزان. "**عائلەمند**": ژن و منداڵدار، خێزاندار.

**عابث:** کەسێ کە کاری پووچ و بێهوودە دەکا.

**عابد:** پەرسیار، پەرستەر، کەسێ کە خوا بپەرستێ.

**عابدفریب:** فریودەری پەرسیار، کەسێك کە پەرستەر فریو بدا و نەیەڵێ کاروباری خواپەرستی ئەنجام بدا.

**عابر:** ڕێبوار، ڕێوار، ڕێرەو، ڕاگوزەر.

**عاتق:** 1) سەربەست، ئازادبوو لە کۆیلەیی. 2) شەڕابی کۆنە.

**عاجز:** 1) داماو، کوڵۆڵ، بێچارە، دەستەوەستان، بێدەسەڵات، سست و بێتوانا. 2) وەزاڵەهاتوو لە شەڕەنگێزی و ئازاری کەسێك. 3) نالایق، ناشایست. 4) بڕوانە:"علیل". "**عاجزآمدن**": دامان، دەستەوەستان بوون، سست و بێتوانا بوون. "**عاجز شدن**": کوڵۆڵ بوون، دامان، یاس بوون.

**عاجزانە:** بەبێهێزی و داماوی، داماوانە، کوڵۆڵانە.

**عاجزنواز:** یاریدەدەری بێتوانایان، لاوێنەوەی داماوان.

**عاجل:** 1) بەهەڵەولەز، پەلەکەر. 2) خێرا، بەپەلە، زوو، دەسبەجێ. "**بە عاجل**": بەپەلە، بەخێرایی، بەپڕتاو.

**عادات:** ڕێوشوێن، باوی ناوکۆمەڵ، خوو و خدە.

**عادت:** 1) خوو، ڕەوشت، هۆگری، ڕاهاتوویی، عادەت. 2) داب، داپ، نەریت، دام و دەستوور. "**عادت دادن**": گیرۆدەکردن، ڕاهێنان، هۆگرکردن، عادەت دان. "**عادت داشتن**": هۆگربوون، گیرۆدەبوون، عادەت هەبوون. "**عادت شدن**":





1) دەق گرتن، بوونەداب، بوونەباو. 2) بەخوێن بوونی ژن، عادەتی مانگانەی ژن. "**عادت کردن**": هۆگرتن، هۆگربوون، هۆگری، خووگرتن، خووپێگرتن، کردنەئاکار، ڕاهاتن، فێربوون بەباشی، عادەت کردن، عادەت گرتن. "**عادت گرفتن**": بڕوانە:"عادت کردن". "**عادت ماهانە**": بێنوێژی ژن، بەخوێن بوونی ژن، خوێنی مانگانە، عادەتی ژنانە.

**عادل:** دادپەروەر، دادگەر، عادڵ.

**عادلانە:** دادپەروەرانە، عادڵانە.

**عادلە:** 1) مێینەی"عادل"، ژنی عادڵ. 2) بە نرخی ڕۆژ. "**حکومت عادلە**": حکومەتێ کە لەسەر بنەمای دادپەروەری بێ.

**عادی:** 1) ئاسایی، باو، شتێ کە لای کۆمەڵ باوە و ناسراوە. 2) (نیزامی) سەربازێ کە ڕادەی خوێندەواری لە ژێر دیپلۆم یان نەخوێندەوار بێ. "**غیرعادی**": نائاسایی، لۆق، بیژۆك، بەدەر لە دام و دەستوور.

**عادی سازی:** ئاساییکردنەوە.

**عادیە:** تەشەنەسێن.

**عاذل:** سەرزەنشتکەر، لۆمەکەر.

**عار:** شوورە، شوورەیی، شەرم، عەیب. "**عارآمدن**": هەست بە شەرمەزاریکردن. "**عار داشتن**": شەرم و حەیاکردن.

**عارض:** 1) ڕوومەت، لاجانگ، نێوان ڕوومەت و ئەستۆ. 2) سکاڵاکەر، دادبەر. 3) ڕووداو. 4) فەرماندەری لەشکر.

**عارض شدن:** 1) ڕوودان، پێشهاتن. 2) سکاڵاکردن، شکایەت کردن، دادخوازیکردن.

**عارضە:** 1) پێشهات، ڕووداو بەتایبەتی ڕووداوی ناخۆش. 2) نەخۆشین. 3) نیشانە.

**عارضی:** 1) ئەوەی نەگۆڕ و سەرەکی نەبێ، پێچەوانەی سەرەکی و ناوەڕۆکی شتێ. 2) ئەوەی جوزوی خودی شتەکە نەبێ.

**عارف:** 1) زانا، ئاگا، عارف. 2) ئاگادار. 3) خواناس.

**عاری:** 1) دوور لە شتێ. 2) پەتی، ڕووت. "**عاری شدن**": داماڵران، ڕووت کران.

**عاریت:** 1) بڕوانە:"عاریە". 2) تیژتێپەڕ، نابەردەوام.

**عاریت سرا:** بریتی لە دنیا.

**عاریتی:** 1) بڕوانە:"عاریە". 2) ناجێگیر، نابەردەوام، کاتی. 3) ئەوەی بە قەرز وەریگرن یان بیدەن. 4) دەسکرد، ناڕاستەقینە.

**عاریە:** 1) مێینەی"عاری"، ڕووت، پەتی. 2) بەقەرز وەرگیراو، ئەوەی بۆ قازانجی کاتی وەردەگیرێ و دوایە دەدرێتەوە. 3) ئەوەی لە کەسێکی دی وەرگیراوە یان لێی وەرگیراوە. 4) دەسکرد. 5) گرێبەستێ کە بەپێی ئەو گرێبەستە کەسێ ئیزن بە کەسێکی دی دەدا کە لە ماڵەکەی وی بەخۆڕایی کەڵك وەرگرێ. "**عاریەدادن**": شتێ وەك ئەمانەتی و بەشێوەی کاتی نانە ئیختیار کەسێك.

**عازم شدن:** چوون، ڕۆیشتن، ڕەوانەبوون.

**عاشق:** ئەویندار، دڵدار، ئەڤیندار، هەڤیندار، دڵبەستە، دڵتەڕ، دڵ داگ، دل کەتی، هەزکەر، بەندەوار، ئاشق، ئاشقە، گیرۆدە. "**عاشق بودن**": هەژیکرن، حەزلێکردن، ئەڤاندن، هەزژیکرن، دڵداری.
"**عاشق سینەچاك**": ئەوینداریٚ کە لەبەر دۆستەکەی ئامادەی هەر جۆرە ڕووبەڕووبوونەوەیەکە. "**عاشق شدن**": دڵ پێوەبوون، دڵ دان، حەزلێکردن، ئاشق بوون.

**عاشقانە:** ئاشقانە، ئەویندارانە، وەك ئەڤینداران.

**عاشق بارە:** ئاشق پەرست، ئاشق دۆست.

**عاشق پیشە:** 1) کەسیٚ کە کاری ئەوینداری و ئاشقییە. 2) بڕوانە: "احساساتی".

**عاشق نواز:** ئاشق لاوێن، دڵبەریٚ کە دڵدارەکەی بلاوێنێتەوە و خۆشی بویٚ.

**عاشق وش:** دڵدارئاسا، وەك ئەویندار.

**عاشقی:** دڵداری نێوان دوو کەس، ئەوینداری، حەزلێکردوویی، هەڤینداری، ئاشق بوون.

**عاصر:** کوشەر، گوشەر.

**عاصف:** 1) توند، سەخت. 2) بای توند و بەتەوژم. 3) گەرداو.

**عاصمە:** پێتەخت، ناوەندی وڵات.

**عاصی:** 1) سەرکێش، سەرپێچیکەر، یاخی. 2) گوناحکار.

**عاطفە:** سۆز، بەزەیی، دلۆڤانی، دڵسۆزی، خۆشەویستی.

**عاطفی:** 1) سۆزداری، سۆزی، عاتیفی. 2) کەسیٚ کە بەتوندی لەژێرکاریگەری سۆز و بەزەیی خۆی دایە.

**عاطل:** 1) بێکار، بێکارە، بیٚ ئیش. 2) بێبەش. 3) خاڵی، بەتاڵ. 4) بیٚ فکر، ئەوەی چالاکی زەینی نیە. "**عاطل شدن**": 1) بڕوانە: "تعطیل شدن". 2) بێکاربوون. 3) بێبەش بوون. 4) بیٚ ئاکام بوون. 5) لەناوچوون. "**عاطل و باطل**": بێکار، بەدەرنەخۆر، چرووك و بیکەڵك.

**عافیّت:** 1) نۆش(ی گیان)، سلامەت. 2) لەش ساغی، تەندروستی. 3) ئاسوودەیی، هێمنایەتی.

**عاق:** ئازاردەری دایك و باب، کەسێك کە دەگەڵ دایك و بابی بەدڕەفتاری بکا. "**عاق والدین**": کەسیٚ کە دایك و بابی لێی ناڕازی بن. "**عاق کردن**": لەخۆ دوورخستنەوەی ئەولاد یان لە میرات بێبەش کردنیان بە هۆی سەرکێشی.

**عاقبت:** سەرەنجام، ئاکام، ئەنجام، دوماهی، ئاخری کار، کۆتایی هەر شتیٚ.

**عاقبت الامر:** سەرەنجام، لەکۆتاییدا.

**عاقبت اندیش:** دوورنواڕ، دووربین، دوورئەندێش.

**عاقبت اندیشی:** هزر و بیرکردنەوە لە ئەنجامی کار، دوورنواڕی، تێبینی.





**عاقبت بخیر:** ئاخرخێر، ئەوەی کە کۆتایی کارەکەی یان ژیانی باش بیٚ.

**عاقبت نگر:** دووربوان، دووربین، ئەوەی سەرەنجامی کارەکەی لەبەر چاو بیٚ.

**عاقر:** نەزۆك، ئەستێور.

**عاقل:** زانا، ژیر، ئاقڵ، ئەقڵدار، بەئاوەز، وریا و فامیدە.

**عاقلانە:** ژیرانە، ئاقڵانە، وەك ئاقڵان.

**عاقل فریب:** ئاقڵ خەڵەتێن.

**عاقلەزن:** ژنی نێوانساڵ، قەیرەژن.

**عاکف:** چلەکێش، گۆشەگیر، تەریك.

**عالم:** (لِ) زانا، زۆرزان، زانیار، فرەزان، ئاگا، هۆزان، تۆرەڤان، بیرمەند.

**عالم:** (لَ) 1) جیهان، دنیا، ڕۆژگار. 2) گروپیٚ لە خەڵکی دنیا، زۆریٚ لە خەڵکان. 3) هەرکام لە دنیا و پەسلانیٚ. 4) حاڵەت، دۆخ. "**عالم و آدم**": ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك، گشت.

**عالم آرا:** جیهان ڕازێن، ڕازێنەرەوەی جیهان.

**عالم آشوب:** تێکدەری جیهان. ئەوەی خەڵکی شەیدای جوانی خۆی بکا.

**عالماً:** ئاگایانە، لە ڕووی زانست و ئاگاییەوە.

**عالم افروز:** ڕووناککەرەوەی جیهان.

**عالم باقی(بقا):** دنیای دوای مەرگ.

**عالم تاب:** ئەوەی نوور و ڕووناکی بە جیهان دەبەخشیٚ.

**عالم جان:** جیهانی ڕۆحەکان. دنیا.

**عالم جسمانی:** جیهانی سروشت و ماددە.

**عالم حس:** بڕوانە:"عالم شهادت".

**عالم خاك:** بریتی لە دنیا.

**عالم خلق:** هەمگەل و بوونەوەرانی جیهانی ماددە و سروشت.

**عالم سفلی:** زەوی، ئەم جیهانە.

**عالم شهادت:** ئەم دنیایە کە هەستی پێدەکریٚ، جیهانی سروشت و ماددە.

**عالم صغیر:** جیهانی چووکە. مرۆڤ، لەشی مرۆڤ کە جیهانێکی چووکەیە.

**عالم علوی:** 1) ئاسمان. 2) چوارچێوەیەك کە ماددەی تێدا نیە.

**عالم غیب:** ئەودنیا، پەسلان.

**عالم کبیر:** جیهانی گەورە، گشت جیهان.

**عالمگیر:** جیهانی، داگری تەواوی جیهان. ئەوەی گشت جیهان داگیر بکا. "**عالمگیرشدن**": هەموو جێیەك داگرتن.

**عالم لاهوت:** جیهانی خوایەتی.

**عالم ناسوت:** جیهانی سروشتی و ماددی.

**عالم واقع:** جیهانیٚ کە تێیدا دەژین، جیهانی ڕواڵەت.

**عالمە:** 1) بیرمەند(ژن). 2) زانا، ئاگا.

**عالمیان:** جیهانیان، گشت خەڵکی جیهان.

**عالی:** 1) زۆر باش. 2) بەرز، بڵیند. 3) گرینگ، گەورە، مەزن. 4) شایانە، پاشایانە. "**عالی و دانی**": گشت تاکەکان و بەرپرسان لەسەریٚ ڕا بۆ خواریٚ.

**عالی آوازە:** 1) خۆش خوێن، دەنگ خۆش. 2) ناودار، بەناوبانگ.

**عالی تبار:** ڕەچەڵەك باش و بەشەڕەف.

**عالی جاە:** پایەبەرز.

**عالی جناب:** بەڕێز، ڕێزدار.

**عالی رتبە:** پایەبەرز، پایەبڵیند.

**عالی شأن:** خاوەنی پلە و پۆستی بەرز.

**عالی قدر:** پایەبەرز، مەزن.

**عالی گهر:** پاك نەژاد، بنەچەدار.

**عالی مرتبە:** پایەبڵند، خاوەنی پلە و پۆستی بەرز.

**عالی مقام:** پایەبەرز.

**عالی همّت:** ئیرادەبەرز، هیممەت بەرز، جوامێر.

**عامّ:** 1) گشتی، تێکڕایی، هەموانی. 2) جەماوەری خەڵکی بە تایبەتی خەڵکێ کە کەم خوێندەوار و فەرهەنگی خوڕافاتیان بەسەرا زاڵە. 3) گشت خەڵکی، هەموو. "**عام المنفعە**": شتێ کە قازانجی بۆ هەموانە. "**اسم عام**": (ڕێزمان) ناوی گشتی.

**عامد:** زانستە، دەس ئانقەست.

**عامداً:** بەئانقەست و ئاگایانە.

**عامل:** 1) هۆکار، فاکتەر. 2) بەڕێوەبەر، جێبەجێکەر، بکەر. 3) پسپۆڕ، لێزان، کارزان، کارامە. 4) سوور لەسەر کار، هەوڵدەر. 5) نوێنەری کۆمپانیا یان ڕێکخراو یان ئۆرگانێ بۆ فرۆشتنی کاڵای ئەوان. 6) ئەوەی ئەرکە دینییەکانی بەڕێوەدەبا. 7) حاکم، ڕاژۆر. 8) (بیرکاری) کۆلکە، کۆلك. "**عامل مساعد**": 1) هۆی یاریدەدەر. 2) هۆکاری لەبار/باش.

**عاملان:** بکەران، بەڕێوەبەران، بەرپرسیاران.

**عاملیّت:** هۆکاربوون.

**عامّە:** 1) جەماوەری خەڵکی ئاسایی. 2) گشت، هەموو، هەموان، هەمووەکی. 3) گشتگیر، هەموولاگر، هەموانی، سەرپاك.

**عامّە پسند:** جەماوەر پەسند.

**عامەفهم:** شیاوی تێگەیشتن بۆ هەموان.

**عامی:** نەزان و خاوەنی فەرهەنگی خوڕافی، ڕەمەکی، دەشتەکی. خەڵکی ئاسایی.

**عامیان:** خەڵکی نەزان یان گشت خەڵکی.

**عامیانە:** ئەوەی لە ناو جەماوەر دا بەکار دەبرێ و بەشێوەی ئاسایی ناوەرۆکی نازانستی و نارەسمەی هەیە، ڕەمەکییانە، دەشتەکییانە، وەك خەڵکی نەخوێندەوار.

**عاید:** بڕوانە:"عائد".

**عایدات:** کۆی"عائد"، داهاتەکان، بەرهەمەکان.

**عایدی:** قازانج، داهات. "**عایدی داشتن**": داهات هەبوون.

**عبادت:** بەندەیی، پەرستن.

**عبادتخانە:** پەرستگا، پەرستگە.





**عبادتکار:** پەرسیار، کەسێ کە کاری پەرستنە، تەرکەدنیا.

**عبادتگاە:** پەرستگە، مزگ، شوێنی پەرستن. "**عبادتگاە زردشتیان**": هورمزگا. "**عبادتگاە مسلمانان**": مزگەوت، مێژگە، نوێژدان. "**عبادتگاە مسیحیان**": کلیسا. "**عبادتگاە یهودیان**": کەنشتە، کەنیشتە، کنشت، تەوسکە.

**عبادت نما:** ڕواڵەتباز، ڕیاکار.

**عبادی:** دابودەستووری ئایینی.

**عبارت:** 1) بریتی، پێکهاتوو. 2) دەستەواژە، ڕێکەوەند. 3) دەربڕین، لێکدانەوە، شرۆڤەکردن. 4) قسە، گوتار. "**عبارت است از...**": بریتییە لە.... "**عبارت بودن از...**": بریتی بوون لە. "**عبارت کردن**": دەربڕین. "**بەعبارت دیگر**": بە دەربڕینێکی تر.

**عبارت آرا:** قسەڕازێنەوە، زمان پاراو.

**عبارت پرداز:** کەسێ کە مەبەستی خۆی بە وشەی جوان و خۆش بڕازێنێتەوە.

**عبث:** فیڕۆ، بێهوودە، کاری پووچ، کارێ کە قازانجەکەی دیار نەبێ، بێئاکام.

**عبد:** کۆیلە، بەندە، بەنی.

**عبرانی:** جوولەکە، مووسایی، زمانی جوو.

**عبرت:** (عِ) 1) ئاگا و وریابوونەوە و ئەزموون فێربوون، پەندوەرگرتن. 2) جۆر، چەشن. 3) ماڵیات. 4) وانە.

**عبرت آمیز:** تێکەڵ بە پەند و ئامۆژگاری.

**عبرت انگیز:** ئەوەی ببێتە هۆی پەندوەرگرتن.

**عبرت بین:** ئەوەی لە دیتنی شتێ پەند وەرگرێ، پەندوەرگر.

**عبرت پذیر:** پەندوەرگر.

**عبرت گرفتن( برگرفتن ):** پەندوەرگرتن، سەرمەشق وەرگرتن، ئاگا و وریابوونەوە.

**عبرت نما:** 1) ئەوەی ببێتە هۆی پەند و ئامۆژگاری. 2) سەرسووڕهێنەر.

**عبرکردن:** پەندوەرگرتن.

**عبرە:** 1) بڕوانە:"عبور". 2) فرمێسك، ئەسرێن. "**عبرەدادن**": تێپەڕاندن، پەڕاندنەوە. "**عبرەکردن**": پەڕینەوە، ڕەت بوون، ڕۆیشتن.

**عبری:** جوو، مووسایی، زمانی جوولەکە.

**عبس:** (عَ) ڕووترشی، ڕووگرژی، مڕومۆچی.

**عبودیّت:** 1) بەندەیی، پەرستن. 2) ملکەچی، گوێڕایەڵی.

**عبور:** تێپەڕین، ڕێگەبڕین (پێوان)، ڕۆیین، ڕابردن. "**عبوردادن**": پەڕاندنەوە، پەڕاننەوە، ڤەپەڕاندن، دەربازکردن. "**عبورکردن**": پەڕینەوە، پەڕانەوە، ڤەپەڕین، ڤەپەڕان، ڤەپەڕیان، (لەئاو)دەربازبوون، ڕابردن، ڕەت بوون، ڕۆیشتن، ڕۆیین، چوون. "**عبور و مرور**": هاتوچۆ، ئاموشۆ.

**عبوس:** گرژ، مۆن، نمرچ، مڕومۆچ، ناچاوتورشیاگ.

**عتاب:** گازن، گازندە، لۆمە، سەرکۆنەی دۆستانە.

**عتاق:** ئازادبوونی کۆیله.

**عتبه:** 1) شۆپ، داری ژێردەرانە، ژێردەرانەی درگا. 2) گلکۆ.

**عتیب:** لۆمە، سەرزەنشت.

**عتیق:** 1) ئەنتیك، مێژینە، کۆنینە. 2) کۆیلەی ئازادکراو. 3) ڕەسەن، جسن.

**عتیقه:** کەڤنارك، ئەنتیکە، کەلوپەلی زۆر کەونارا، شتی زۆر لە مێژینە و بەنرخ. ناحەز یان لەمۆدکەوتو و بەدەرد نەخۆر.

**عجائب/عجایب:** کۆی"عجیبه".

**عجالتاً:** جارێ، ئێستا.

**عجایز:** پیرێژنان.

**عجب:** (عَ جَ) سەرسووڕمان، واق وڕمان. سەیر، سەمەرە. "**در عجب شدن**": تووشی سەرسووڕمان بوون.

**عجب:** (عُ) خۆبینی، خۆپەسندی، لووت بەرزی، بادیهەوایی.

**عجز:** 1) نەتوانین، داماوی، لاوازی. 2) وەزاڵەهاتن، وەئامان هاتن، جاڕزبوون. 3) پەککەوتن.

**عجله:** پەلە(یی)، لەز، لەزلەز، لەژ، لەزاهی، بەلەسەیی، هەلپە، خێرا(یی)، حەلوەلا، پەلەپەل و تەنگانە، زوو. "**عجله داشتن**": پەلەهەبوون. "**عجله رفتن**": پەلەکردن، لەپین، بەپەلەڕۆیشتن. "**عجله کردن**": پەلەلێکردن، لەزلێکردن، خێراکردن، هنجراندن. "**با عجله**": بەپەلە، بلەز، لەزکانی، لەزەی.

**عجم:** (عَ جَ) غەیرەعەڕەب. بە وڵاتی ئێرانیش گوتراوە.

**عجوز:** (عَ) 1) پیرێژن، ژنی بەساڵاچوو. 2) پیروپاتاڵ.

**عجول:** بزۆز، زەپرتی، بزێو، بێئارام، نەحەواوە، ئۆقرەنەگر.

**عجولانه:** 1) لەزالەز، پەلەپەل، دەس بەجێ. 2) نەهزراو، هەڵنەسەنگێنراو.

**عجیب:** 1) حەپەسێن، دایلان، یەمان، سۆزرەت، سۆسرەت، بەڵاجەوی، حەلامەت، حەنتیکە، عەنتیکە، زۆر سەیر، سەمەرە، غەریب. 2) ناسروشتی یان نائاسایی یان ناڕوون و نەناسراو. "**عجیب و غریب**": سەیروسەمەرە، عاجباتی.

**عجین:** هەویر. تێکەڵکراو.

**عداد:** ژمار. "**در عداد**": لە ژماری، لە ڕیزی.

**عدالت:** دادگەری، دادپەروەری، عادڵی، عەداڵەت، زوڵم نەکردن.

**عدالت پیشه:** دادپەروەر، دادگەر.

**عدالتخانه:** خانەی داد.

**عدالت خواه:** خوازیاری جێبەجیکردنی دادپەروەری.

**عدالت گستر:** دادگەر، عادڵ، پەرەپێدەری داد.

**عداوت:** دوژمنایەتی، دوژمنی، دژایەتی.

**عدد:** ژمارە، ئەژمارە، نمرە، دانە. "**عدد اتمی**": (شیمی) ژمارەی پڕۆتۆنەکانی ناوکی ئەتۆمی هەر توخمێکی شیمیایی.





"**عدد جرمی**": (شیمی) کۆی ژمارەی پڕۆتۆن و نۆترۆنەکانی ناوکی ئەتۆمی هەر توخمێکی شیمیایی. "**عدد صحیح**": (بیرکاری) ژمارەی تەواو. "**عدد عشری**": (بیرکاری) ژمارەی دەیی، ژمارەی دەیەکی. "**عدد کسری**": (بیرکاری) ژمارەی کەرتی، ژمارەی بەکەرت. "**عدد مرکب**": (بیرکاری) ژمارەی ئاوێتە.

**عددوار:** (بیرکاری) "ئێسکالێر".

**عدسی(چشم):** هاوێنە، بیلبیلەی چاو.

**عدل:** 1) داد، حوکمی ڕەوا، دژی زوڵم و زۆر. 2) دادگەر، عادڵ. 3) ڕاست، بیکەموکورتی. 4) پیاوێ کە شایەتییەکەی قبووڵ بکرێ. 5) یەکسانی، هاوسەنگی، هاوتایی.

**عدل گستر:** دادپەروەر، عادڵ.

**عدله:** کەسانێ کە بۆ شایەتی دان شیاو بن.

**عدلیه:** دادخانە، فەرمانگەی داد.

**عدم:** 1) ون کردن، ون کردن و لە دەست دان. 2) نەبوون، نەمان، هیچ. "**عدم آباد**": جیهانی دوای مەرگ.

**عدو:** دوژمن، نەیار.

**عدوان:** 1) دوژمنایەتی. 2) زوڵم، ناهەقی، ستەم. 3) لەڕادە تێپەڕین، دەست درێژی. "**تصرف عدوانی**": داگیرکردنی ملکێ بەزۆر، دەست بەسەر داگرتنی زۆرەکی.

**عدوبند:** بەدیلگری دوژمنان.

**عدول:** 1) لادان، ترازان، پاشگەزبوونەوە، گەڕانەوە، وازهێنان. 2) بەریان، مەیل. 3) بڕوانە:"منحرف شدن".

**عدومال:** تێکشکێنەری دوژمنان.

**عده:** ژمارە.کۆمەڵ. ماوەی مێردمردە و تەڵاق دراو بۆ مێردکردنەوە. "**عده کسی سرآمدن**": کۆتایی هاتنی ئەو ماوەی کە نابێ شوو بکاتەوە.

**عدیده:** 1) زۆرێك، چەندان. 2) ژمێردراو.

**عدیل:** هاوتا، هاوشێوە، بەرابەر.

**عذاب:** ڕەنج و دەرد، ئەشکەنجە، جەزرەبە، ئازار. "**عذاب الیم**": ئەشکەنجە یان ڕەنجی تاقەت پڕووکێن. "**عذاب دادن**": تووشی ڕەنج و سەختی کردن، ئازاردان. "**عذاب کردن**": ئەشکەنجەدان. "**عذاب کشیدن**": ڕەنج و سەختی زۆر کێشان، زەجرکێشان، ئازار چەشتن.

**عذاب آور:** ئازاردەر، هۆی ئازار و ئەشکەنجە.

**عذار:** 1) لاجانگ، نێوان ڕوومەت و ئەستۆ. 2) خەتی ڕدێن.

**عذر:** 1) بیانوو، بیانك، پەڵپ. 2) بڕوانە: "قاعدگی". "**عذر تقصیر**": لێبوردن خوازی لە هەڵە یان گوناحی خۆ. "**عذر شرعی**": بڕوانە: "قاعدگی". "**عذر کسی را خواستن**": 1) دەرکردنی ئەو لە شوێنێ یان لێسەندنەوەی پۆستێ لەو. داوای لێبوردن لەو کردن. 2) چاوپۆشیکردن لە هەڵە یان تاوانی ئەو.

**عذرآوردن:** بیانووهێنانەوە، داوای لێبوردنکردن.

**عذرتراشی:** بیانوو دیتنەوە، بیانوو هێنانەوە، بیانوو تاشین.

**عذرخواهی:** داوای لێبوردن، بووردن خوازی.

**عذرداشتن:** 1) بیانووهەبوون. 2) بووردن خوازی. 3) عادەتی مانگانە هەبوون. 4) تازیەداربوون، ئازیەتباربوون.

**عرادە:** عەڕابە، عاڕەبانە. "**عرادە کسی بە (بەروی) غلطك افتادن**": چاکتربوونی دۆخی ژیانی ئەو، برەوسەندنی کاری ئەو. "**عرادە کسی لنگ بودن(نچرخیدن)**": دابین نەبوونی بژیوی ئەو.

**عراضە:** بڕوانە:"رەآورد".

**عرایض:** 1) کۆی"عریضە"، سکاڵایەکان. 2) قسەکان، گوتەکان.

**عربدە:** گوڕە، نەڕە، هەرا. بەدخولقی. بەدمەستی.

**عربدەجو:** شەڕاشۆ، ئاژاوەخواز، کەسێك کە بەگوڕەگوڕ و هەراوهوریا ئاژاوە بنێتەوە. "**عربدەجویی**": بەدمەستی و ئاژاوەگێڕی.

**عرش:** قوڕش، تەخت، خێوەت، سایەوان، سەیوان، میچ، کۆشك. ئاسمان. "**عرش را سیر کردن**": لە حاڵەتی خۆشی تەواودا بەسەربردن. "**بە عرش بردن(رساندن)**": بە پێگەی بەرز و بڵێند گەیاندن، بردنە بان.

**عرشە:** تەختەبان، بەشی سەرەوەی پاپۆڕ، گۆڕەپان.

**عرصات:** 1) کۆی"عرصە". 2) بریتی لە ڕۆژی پەسڵان.

**عرصە:** 1) بڕوانە: "حیطە". 2) گۆڕەپان، مەیدان بە تایبەتی مەیدانی شەڕ. 3) زەوی هەراو و بەربڵاو. 4) پانتایی. 5) سەرزەوی. "**عرصە بر کسی تنگ بودن**": تەنگ پێ هەڵچنرانی ئەو، دەگەڵ دژواری و گرفتاری زۆر ڕووبەڕووبوونی ئەو. "**بە عرصە رسیدن**": هەڵدان، گەورەبوون.

**عرض:** (عَ) 1) ئاشکراکردن، دەرخستن، پیشاندان. 2) پانی، پانایی، هەرایی. 3) شمەك، کاڵا. 4) ماوە. 5) (بیرکاری) پانی. "**عرضِ**": لە ماوەی. "**عرض اندام**": خۆنوێنی. "**عرض حال**": بڕوانە: "عریضە". "**عرض دادن**": 1 ) خستنە بەرچاوی کەسێك، خستنە ڕوو، پیشاندان. 2) سان دیتن. "**عرض داشتن**": بە نیازی وتنی بابەتێ بوون. "**عرض کردن**": 1) دەربڕین، وتن. خستنەڕوو، پیشاندان. 2) سان دیتن. 3) پشکنین. "**عرض وجود**": خۆنوێنی، سنگ دانەپێش. "**عرض و طول**": 1) پانی و درێژی. 2) بەربڵاوی، دوور و درێژی.

**عرض:** (عَ رَ) ئەوەی جوزوی سروشت یان ژییەتی جەوهەری شتەکە نەبێ وەك ڕەنگ بۆ شتەکان.





**عرض داشت:** بڕوانە:"عریضە".

**عرضگاە:** 1) پیشانگا. 2) گۆڕەپانی سان دیتن و ژماردنی سپاکان، جێگەی خڕبوونەوەی سپاکان. 3) جێگەی پێڕاگەیشتن بە سکاڵا.

**عرضە:** (عُ) 1) لێهاتوویی، توانایی، شیاوی، عورزە. 2) نیشانە، ئامانج.

**عرضە":** (عَ) نواندن، پیشاندان، خستنەڕوو، دەرخستن، پێشکەش کردن. "**عرضە کردن(دادن)**": بۆ فرۆشتن دانان. خستنە بەر چاوی کەسێ، پیشاندان، نواندن. دەربڕین، گوتن. دان، پێشکەش کردن. "**عرضە مستقیم کالا**": فرۆشتنی ڕاستەوخۆی کاڵا لە لایەن بەرهەمهێنەوە. "**عرضە و تقاضا**": دەرخستن و خواستن. "**عرضی**": لە پانابیەوە.

**عرضی:** (عَ رَ) تایبەتمەندی ئەوەی بەسەر کەسێکا هاتوە. (لۆژیك) تایبەتمەندی ئەوەی لە دەرەوەی ناوەرۆکی بابەتە.

**عرف:** باو، داب، نەریت، ڕەوشت، خوو و عادەت.

**عرفان:** ناسین. خواناسی. ئاشنایی.

**عرق:** (عَ رَ) 1) ئارەق، ئارەقە. 2) ئارەق، خواردنەوەی ئاڵکۆڵی. 3) هەڵمی ئاو. 4) گوڵاو. "**عرق برآوردن**": ئارەق ڕشتن. "**عرق جبین**": ئارەقی ناوچاوان، بریتی لە زەحمەت، هەوڵ. "**عرق خجالت**": ئارەقەی شەرم. "**عرق ریختن**": 1) ئارەق ڕشتن، ئارەق دەردان، خۆدان دانی زۆر. 2) زەحمەتی زۆر کێشان. "**عرق کردن**": ئارەق ڕشتن، ئارەق کردن، ئارەق دەردان، خۆهدان. پارەخەرج کردن بۆ کەسێك یان دیاریدان بە ئەو بەبێمەیلی. "**عرق کسی را درآوردن**": 1) ئارەق پێکردن. 2) خەجاڵەت کردنی ئەو. "**عرق کشیدن**": 1) سازکردنی ئارەق لە ڕێگەی دلۆپاندنەوە. 2) خواردنەوەی ئارەق.

**عرق:** (عِ) 1) دەمار، ڕیشە، بنج و بناوانی شتێك. 2) خوو، سرشت. 3) نەژاد، ڕەچەڵەك، تۆرەمە.

**عرق النساء:** (عِ.قُ) 1) ڕەهێش، "سیاتیك"، نەخۆشییەکی گرانە. 2) کیر.

**عرق چین:** تەقیلە، ئارەقچن، ئارەقچین، عەڕەخشە، کڵاو.

**عرقخور:** ئارەقخۆر، مەینۆش.

**عرق سوز:** سووتانەوەی پێستی لەش بە هۆی ئارەق کردنی زۆر.

**عرقناك:** ئارەقاوی.

**عروبت:** بەزمانی عەڕەبی ئاخاوتن.

**عروج:** بەرزبوونەوە، چوونەبان. "**عروجی**": ڕوولەبەرزبوونەوە.

**عروس:** 1) وەوی، بووك. 2) باشترین، جوانترین. 3) زۆر جوان و ڕازاوە. "**عروس بردن**": ژن هێنان بۆ کوڕی بنەماڵە. بەخاووخلیچکی ڕۆیشتن. "**عروس بی تنبان**": بێئابڕوو، ئابڕوونەماو، حەیاچوو، خەنزار.

**عروسان:** خزم و کەسانی بووك.

**عروسك:** 1) وەولە، وەوی، وەویلە، وەیوولە، وەیوولێ، بووكلە، بووكەلە، بەبۆكە، بەبۆڵە، بیبی، بەبلانە، كوكلە. 2) ژن یان كچی زۆر جوان و ناسك. 3) تایبەتمەندی كەسێكی بێ ئیرادە كە كردار و هەڵسوكەوتی بە مەیل و فەرمانی كەسێكی دیكەیە. "**عروسك بازی**": 1) بووك بووكێنە، بیكانێ، گەمەی بووكەڵە. 2) شاسەلیم، شانۆبازی.

**عروسی:** زەماوەند، بەزم و داوەت. خۆشی و شادمانی زۆر. "**عروسی كردن**": زەماوەند كردن.

**عروض:** 1) كێشناسی لە شێعردا. 2) ناوەرۆكی ئاخاوتە.

**عروق:** كۆی "عرق"، دەمارەكان. ناخ و قوولایی هەر شتێ.

**عریان:** 1) ڕووت و قووت، زەلووت، زوت، پەتی. 2) بەبێناڕوونی و داپۆشراوی، ڕوون، بەئاشكرا، ڕاستەوراست. 3) بێبەش، دوور.

**عریض:** پان، بەرپان، بەرین، هەراو، پۆڕ، پەحن، ولە. "**عریض شدن**": هەراو بوونەوە، بەرین بوون(ەوە). "**عریض و طویل**": دوور و درێژ، تێروتەسەل، بەربڵاو.

**عریضه:** عەرزوحاڵ، شكایەتنامە، سكالانامە. "**عریضەكردن**": عەرزوحاڵ نووسین.

**عزا:** تازیە، تازیمانە، ئازیەت، عازیەت، ماتەم، خەم داگرتن بۆ تازەمردگ. "**عزا دادن**": سەرەخۆشی لێكردن. "**عزاگرفتن**": تازیەگرتن، ئازیەتباری. خەمبار و ناڕەحەت بوون. "**عزا نهادن**": تازیەباری. "**كسی را به عزا نشاندن**": تازیەباركردنی ئەو(بە كوشتنی خۆشەویستەكانی).

**عزاب:** پیاوان یان ژنانی سەڵت.

**عزادار:** 1) تازیدار، تازیەدار، ئازیەتبار، پرسەدار، سوێدار، خۆشەویس مردوو، ئازیزمەردە. 2) زۆر خەمبار و ناڕەحەت.

**عزاداری:** پرسە، سەرەخۆشی، تازیەباری، ئازیەتباری.

**عزایم:** 1) جادوەكان، سێحرەكان. 2) ویستەكان، بڕیارەكان. "**عزایم فروش**": سێحرباز، جادووگەر.

**عزب:** (عَ زَ) ئازەب، عازەب، پیاوی بێ ژن، جحێڵی بێ ژن یان بێ مێرد، ڕەبەن.

**عزب خانه:** ماڵێ كە چەند پیاوی ئازەبی تێدابێ.

**عزبی:** جوانەزوە، جوانەزەوە، سنگەك، جوانكە، زیپكەی دەموچاوی لاوی تازە پێگەیشتو.

**عزّت:** 1) شانازی، سەربەرزی. 2) قەدر، ڕێز، حورمەت. "**عزّت گذاشتن**": ڕێز و حورمەت لێگرتن. "**عزّت نفس**": ڕێز و حورمەتێ كە كەسێك بۆ كەسێتی مرۆیی خۆی دایدەنێ، متمانەبەخۆ.





**عزرائیل:** گیان بەر، گیانكەنكە، گیان كێش، فریشتەی گیان كێشان، پێمێردی خودا، ئیزرایل. "**عزرائیل را جواب كردن**": لە نەخۆشی سەخت یان مردن ڕزگاربوون. زیاتر لە ڕادەی باو زیندوومانەوە و ژیان.

**عزل:** لەكارلادان، لەسەركار لابردن، ڕاقەتاندن، دوورخستنەوە، بێكاركردن. "**عزل شدن**": لابران، لەسەركارلابران، دوورخرانەوە.

**عزلت:** گۆشەگیری، دوورەپەرێزی، دووریكردن لە تێكەڵی و هاونشینی دیتران. "**عزلت گزین**": گۆشەگیر، گۆشەنشین، دوورەپەرێز.

**عزلتگه:** خەڵوەتگە، شوێنی تەریكی و گۆشەنشینی.

**عزم:** ویست، ئیرادە. بڕیارێ كە كەسێك بۆ ئەنجامدانی كارێك هەیەتی، نیاز. "**عزم خود را جزم كردن**": بڕیاری یەكجارەكی دان و ئیرادەكردن، لێبڕان. "**عزم داشتن**": ویستن، بەنیازبوون. "**عزم كردن**": بڕیاری یەكجارەكی گرتن بۆ ئەنجامدانی كارێك. "**به عزم**": بەنیازی.

**عزوبت:** بێ ژنی، بێ مێردی، ڕەبەنی، تەنیابوون.

**عزوجز:** داواكردنی شتێ بە پاڕانەوە و لالانەوە.

**عزیز:** 1) بەڕێز، ڕێزدار، خۆشەویست، ئازیز. 2) پیرۆز، موارەك. 3) دەگمەن، كەم وێنە. 4) بەهێز، خورت. 4) بڕوانە: "مرشد". "**عزیزداشتن**": ڕێز و حورمەت گرتن. "**عزیز دل(دلم)**": زۆر خۆشەویست. "**عزیزشدن**": 1) بەڕێز و خۆشەویست بوون. 2) بڕوانە:"گران شدن". 3) قات بوون، كەم وێنەبوون.

**عزیزالنفس:** بەڕێز، ڕێزدار.

**عزیزالوجود:** دەگمەن، قات، كەم وێنە.

**عزیزدردانه:** ئەوەی خۆشەویستیی لەڕادەبەدەری كەسێكە، فرە ئازیز و خۆشەویستیی كەسێك.

**عزیزكرده:** بڕوانە:"عزیزدردانە".

**عزیزمرده:** خۆشەویست مردوو، ئازیزمردە.

**عزیمت:** 1) ڕێكەوتن، بەڕێكەوتن، ڕەوانەبوون، ڕۆیشتن. 2) ئیرادە، ویست. 3) سێحر، جادوو.

**عسر:** سەختی، دژواری، تەنگانە.

**عسرت:** 1) سەختی، دژواری، تەنگانە. 2) دەست تەنگی، دەست بەتاڵی، نەبوونی.

**عسس:** شەوگەرد، شەوگەڕ، شەوەڕەو، جەزایەرچی، چەرخەچی، ئێشكدەری شەوانە، ئێشكگری شەو، هەساس، هەسهەس، عەسعەس.

**عسیر:** دژوار، سەخت.

**عشاء:** خەوتنان، ماوەیەك دوای نوێژی شێوان، شەو كاتی خەوتن.

**عشاوه:** شەوكوێرى.

**عشائر:** كۆى"عشيره".

**عشّاق:** كۆى"عاشق"، ئاشقان، شەيدايان، دڵداران، دڵ تەڕان، ئەويندارن.

**عشر:** (بيركارى) دەيەك، دەهێك.

**عشرت:** 1) خۆشگوزەرانى، كەيف كردن. 2) هاونشينى، هاوڕێيەتى و تێكەڵاوى.

**عشرتكده:** 1) شوێنى كەيف و ڕابواردن. 2) قاحبەخانە.

**عشق:** 1) ئەوين، ئەوينى، ئەڤين، ئەڤيندارى، دڵ پێدان، دڵبەستن، دڵخوازى، دڵدارى، هەڤين، عاشقى، خۆشەويستى دڵبەر، حەزلێكەرى، حەزلێكردوويى، بەندەوارى. 2) مەيل، بەريان، هۆگرى. "**عشق افلاطونى**": خۆشەويستى بە دوور لە مەيلى سێكسى. "**عشق باختن**": هەستى ئەوين و هۆگرى و دڵبەستراوەيى يان مەيلى زۆر هەبوون بە كەسێ يان بە شتێ، دڵدارىكردن، خۆشويستن. "**عشق داشتن**": 1) ئاشق بوون. 2) هەبوونى دڵبەستراوەيى و مەيلى زۆر. "**عشق كردن**": دڵدارىكردن، ئاشقايەتيكردن. چێژى زۆر بردن. "**عشق كشيدن**": مەيل پەياكردن بۆ ئەنجامدانى كارێك، هەوەس كردن، پێخۆشبوون، ويستن. "**عشق ورزيدن**": بڕوانە:"عشق باختن". "**به عشق چيزى(كسى)**": لەبەر ئەو، بەخاترى ئەو لە ڕێگاى ئەودا.

**عشق آفرين:** حەزوخۆشەويستى خولقێن، كەسێ كە بە جوانى خۆى ئەوين و خۆشەويستى لەناو خەڵكا پێك دێنێ.

**عشقباز:** ئاشق، ئەويندار، كەسێك كە بە ئەوين و خۆشەويستييەوە خەريكە.

**عشقبازى:** 1) دامەزراندنى پێوەنديى ئاشقانە يان سێكسى دەگەڵ كەسێك. 2) گرينگى زۆردان بە شتێك و دڵ پێخۆش كردنى. 3) بڕوانە:"عشق ورزيدن".

**عشقى:** 1) ئاشقانە(داستان عشقى). 2) لە ڕووى مەيل و هەوەسى كتوپڕەوە.

**عشوه:** 1) خەمزە، لەنجە، ناز و كريشمە. 2) گوتار يان هەڵسوكەوتى ناڕاستەقينە و درۆيين دەگەڵ فێڵ و تەڵەكە.

**عشوه‌خريدن:** 1) تەحەممولى ناز و كريشمە يان هەڵسوكەوتى تێكەڵ بە دژايەتى كەسێك كردن. 2) فريوخواردن، هەڵخەڵەتان.

**عشوه‌خوردن:** خەڵەتان، هەڵخەڵەتان، هەڵفريوان، خلافان، فريوخواردن، فريودران.

**عشوه‌دادن:** فريودان، هەڵخەڵەتاندن.

**عشوه‌گر:** نازكەر، نازفرۆش.

**عشيره:** هۆز، عەشير(ە)، عەشيرەت، بريتى لە خزم و كوسوكارى باب و نزيكەكانى، هەروەها كۆمەڵگەيەكى بچووكى سەرەتايى كە ئينتمايان بۆ يەك





تەوتم هەيەو بەشدارن لە يەك موڵكيەتدا و يەك دەگرن لە كاتى ڕووبەڕووبوونەوەى دوژمنەكانياندا و ئەم پێوەندييانەش بەرتەسك ترن لە پێوەندييەكانى نێوان خێڵ كە ئەمەى دواييان زياتر خوێن و بيروباوەڕ كۆيان دەكاتەوە.

**عصاره:** 1) گڤيشك، كوشراو، كوشراوى ميوە، شيرە، شيلە، خۆشاو. 2) ناوەرۆك و كاكڵى سەرەكى يان كورتەيەكى هەر شتێكى وەك گوتار و نووسراوە، پوختە.

**عصب:** دەمار، ڕەگ. "**عصب بينايى**": بينينەدەمار، دەمارى چاو. "**عصب پاراسمپاتيك**": دەمارى وەرگر. "**عصب سمپاتيك**": دەمارى وزەواز. "**عصب شوكى**": دڕكەدەمار.

**عصبانى:** تووڕە، ڕق هەستاو، قەڵس، زرز، زيز، زوير، وەڕەز، قوشقى، كەشتەنگ، جەحنى، كەللەگەرم. "**عصبانى شدن**": توندبوون، تووڕەبوون، قەڵس بوون، قوشقىبوون، ڕق هەستان، ڕك هەستان، هەڵچوون، نگرين، عنگرين، عێنگرين، عەنرين. "**عصبانى كردن**": تووڕەكردن، قەڵس كردن.

**عصبانيّت:** تووڕەيى، تووڕەبوون، ڕق هەستاوى، ڕك بوونەوە، قەڵسى، زرزى، گەروشە، توندى، جەحنين، خوريت، ڤز. "**عصبانيّت فراوان**": خوورژى، قەڵسى و تووڕەيى زۆر.

**عصبى:** 1) دەمارگير، دەمارگرژ. 2) دەمارى، لەپێوەند دەگەڵ دەماردا. 3) گيزەڵ، كەسى تووڕە و قەڵس، بە حاڵەتى تووڕەيى و قەڵسى. 4) تووشى گوشارى ڕۆحى و دڵەڕاوكێ يان بێ ئۆقرەيى. 5) تێكەڵ بە ناڕەحەتى و گوشارى ڕۆحى. "**عصبى مزاج**": تيزۆ، هەڵتۆزين، سڵ و قەڵس، تووڕە و تەنگاو.

**عصبيّت:** 1) دەمارگيرى، دەمارگرژى. 2) غيرەت. 3) دوژمنايەتى سەرچاوەگرتو لە دەمارگيرييەوە.

**عصر:** 1) سەردەم، چاخ، چەرخ، ڕۆژگار. 2) (دەمەو)ئێوارە.

**عصرانه:** ژەمەخوێرى.

**عصمت:** 1) پاكى، داوێن پاكى، بێگوناحى، خۆپارێزى. 2) بڕوانە: "بكارت". 3) بڕوانە:"نگهدارى".

**عصيان:** ياخيگەرى، ياخيبوون، نافەرمانى، سەرپێچى.

**عصيان گر:** نافەرمان، سەرپێچيكەر، سەركێش، سەربزێو.

**عصير:** شيلە و چۆڕاوەى شتێ.

**عضلات:** كۆى"عضله".

**عضله:** ماسوولكە، ماسۆڵە، گردك، لەملانە، زەبلەك، زەقلەك، زيپەڕ، وەرسە، وەرسەلە. "**عضله فوق خارى**": دڕكە ماسوولكەى سەرەوە.

**عضلانى:** 1) ماسوولكەيى. 2) بەتاقەت، بەهێز.

**عضو:** 1) بەشدار، ئەندام. 2) ئۆرگان، ئەندام، پاژێك لە لەش وەك دەست و پێ وسەر وهتد. 3) دانە.

**عضویّت:** ئەندامەتی، ئەندامێتی.

**عطاء:** بەخشین، خەلأت، دیاری. "**عطا بخش**": داینده، دلاوا، نان بدە، بەخشەر، بەخشندە. "**عطای کسی را به لقای او بخشیدن**": لە خێر و قازانج یان بەخشینی ئەو چاوپۆشیکردن.

**عطّار:** بۆن فرۆش، عەترفرۆش.

**عطارد:** 1) زاوە، ئەستێرەیەکە. 2) هێمای نووسەری و قسەپاراوی.

**عطالت:** 1) بێکاربوون. 2) بێکاری.

**عطایا:** کۆی"عطیە".

**عطر:** بۆن، بۆنی خۆش. "**عطر افشاندن**": بڵاوکردنەوەی بۆنی خۆش. "**عطردادن**": بۆنخۆش کردن.

**عطسە:** 1) بێنشك، هەپش، فشك، پژمە، پونژین، کرچە. 2) ئەوەی بەتەواوی لە کەسێکی دی دەچێ. 3) پەروەردەکراو. 4) ئاکام، بەرهەم.

**عطسەکردن:** پژمین، پشمین، پنژین، بێنژین، پێکژین، هل پژکین، هل پشکین، هەپش کرن، فشکین، ڤەبونژین، کرچەنە، کژین.

**عطش:** 1) توونیەتی، تینوویەتی، تینگی. 2) سۆز و تاسەی زۆر هەبوون بۆ شتێ.

**عطف:** 1) بادانەوە و چەمانەوە بەرەو لای شتێك. 2) مێهرەبانی، سۆز. 3) لێوارە، کەنارە. "**عطف بە**": بە سەرنجدان بە. "**عطف توجه**(**نظر**)": بڕوانە: "اعتنا". "**عطف عنان کردن بە جایی**": ڕەوانەی ئەو شوێنە بوون. "**حرف عطف**": (ڕێزمان) پیتی پێرا، پیتی بادانەوە. "**نقطە عطف**": خاڵی وەرچەرخان.

**عطفەکردن:** لەنکاو گەڕانەوە و زەبروەشاندن لە خەنیم لە شەڕدا.

**عطلت:** بێکاری.

**عطوفت:** ڕووخۆشی، مێهرەبانی، خۆشەویستی.

**عطیە:** خەلأت، دیاری.

**عظام:** 1) پایەبەرز، مەزن. 2) گەورە، گرینگ.

**عظما:** 1) گەورە، گرینگ. 2) پایەبەرز.

**عظمت:** 1) گەورەیی، بەربڵاوی، بەرینی. 2) شکۆ. 3) پایەبەرزی، گرینگی.

**عظیم:** 1) مەزن، گەورە، زل. 2) بەشکۆ. 3) لەئەنازەبەدەر، زۆر، فراوان(تلاش عظیم). 4) گرینگ، گەورە(کار عظیم).

**عظیم الجثە:** زەبەلاح، زەلام و ئەستوور، باهۆدار.

**عظیم الشأن:** بەشان و شکۆ، پایەبەرز.

**عظیمە:** 1) مێینەی"عظیم". 2) پێشهاتی زۆر سەخت، کاری گرینگ.

**عفّاف:** خۆپاریزی لە کاری ناحەز و ناڕەوا، پارێزکاری، داوێن پاکی.





**عفّت:** پاکی، بێگەردی، داوێن پاکی، پارێزکاری. "**عفّت کلام**": پاراستنی ئەدەب و بنەما ئەخلاقییەکان لە گوتار و نووسیندا.

**عفریت:** نڕناش، دێو، دێوەڵووکە، درنج، جنۆکەی زەبەلاح، بوونەوەری ناحەز و خراو و ترسناك.

**عفریتە:** "مێینەی"عفریت"، دەڵەدێو، ژنی ناحەز و بەساڵاچوو و کەس نەویست.

**عفو:** نوخاف، جەب، جەبە، بووردن، ویردن، عافوو، بەخشین لە خەتا و تاوان. "**عفوکردن**": لێبووردن، بوورین، بەخشین لە هەڵە، لێخۆش بوون.

**عفوپیشە:** بەخشۆ، لێبووردە، گوناهبەخش.

**عفوعمومی:** لێبووردنی گشتی، لێخۆش بوونی گشتی، عافوات.

**عفونت:** ئاوەدزکردن، کێم و چڵك کردن، کێم و زووخاوهێنانەوەی برین، تەشەناکردن، بۆگەن کردن، گەنین، بۆنی زۆر ناخۆش.

**عفونی:** بۆگەنیو و کێم و چڵك هاوردوو. "**بیماری عفونی**": نەخۆشینی تەشەنەسێن، نەخۆشییە کە بە هۆی میکڕۆبێکی تایبەتییەوە سەرهەڵدەدا و بە شێوەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکیتر تەشەنەدەکا. "**ضدعفونی**": دژەتەشەنا، دژگەن، دژە چڵك، "ئیستریلیزێ".

**عفیف:** پاك، داوێن پاك، خۆپارێز لە کاری خراو و حەرام.

**عقائد/عقاید:** کۆی"عقیدە".

**عقاب:** (عِ) ئەشکەنجەکردن، ئازاردان، سزادان.

**عقار:** (عَ) خانوبەرە، ماڵ، ملْك، ئاو و زەوی کشتوکاڵی.

**عقب:** پاش، دما، پشتەسەر، دوا(وە)، دوابەدوا، بەشوێندا. "**عقب چیزی**(**کسی**) **رفتن**": بەدواداگەڕان. "**عقب سر**": پشتەسەر. "**عقب کار خود رفتن**": ڕۆیشتن و خەریکی کاری خۆ بوون، بەدوای کاری خۆ دا چوون. "**عقب کسی**(**چیزی**) **رفتن**": بەدوای ئەو دا چوون. بەدوای ئەو داگەڕان یان چوون بۆ هێنانی ئەو. "**عقب کسی فرستادن**": بە دوای ئەو دا ناردن. "(**در**) **عقب کسی گذاشتن**": بە دوای ئەو داچوون، وەشوێن ئەو کەوتن. "**بر عقبِ**": بەدوای. "**بە عقب انداختن**": وەدواخستن، خستنە دواوە.

**عقب افتادگی:** وەدواخراوی، دواکەوتوویی.

**عقب افتادن:** بەجێمان، مانەوە، دواکەوتن. وەدواکەوتن. "**عقب افتادە**": وەدواخراو، دواکەوتوو، دواکەوتە، بەجێماو، جێماو. (دەروونناسی) دواکەوتووی زەینی.

**عقب انداختن:** وەدواخستن، خستنەدواوە. پێش بە پێشکەوتنی گرتن.

**عقب رفتن:** 1) بۆدواوەچوون. 2) لاچوون. 3) لە پێشکەوتن جێمان.

**عقب زدن:** لە خۆ دوورخستنەوە، لادان. ڕادانی شتێ یان کەسێك لە شوێنێك.

**عقب ماندگی:** دواکەوتوویی، پاشکەوتوویی، پاشڤەڕۆیی.

**عقب ماندن:** بەجێمان، دواکەوتن. "**عقب مانده**": پاشڤەڕۆ، دواکەوتوو، پاشکەوتوو، پاشکەوتە، بەجێماو.

**عقب نشستن:** 1) چوونە لاوە یان مەوداگرتن لە شتێ. 2) وازهێنان لە بڕیارێ یان لە ئەنجامدانی کارێك. 3) پاشەکشەکردن، پاشگەزبوونەوە، بەرەودواوەچوون، بەرەودواوە کشانەوە، گەڕانەدواوە.

**عقب نشینی:** 1) (نیزامی) پاشەکشەکردن، بەرەودواوەچوون، بەرەودواوە کشانەوە، گەڕانەدواوە. 2) وازهێنان یان پاشگەزبوونەوە لە بڕیارێ یان دەست بردن بۆ کارێ.

**عقبه:** (عَ قَ بَ) هەوراز و هەڵەمووت، ڕێگەی سەخت و چەتوون.

**عقبی:** (عُ) پاشەڕۆژ، دواڕۆژ، دوایی هەرشتێك، کۆتایی و سەرەنجامی کارێك. سزای کردار.

**عقد:** 1) بەستن، گرێدان. 2) پەیمانی ژن و مێردایەتی. 3) بەڵێننامە، گرێبەند، گرێبەست. "**عقد انقطاع**": گرێبەستێ کە لەودا ماوە دیاریکرابێ. "**عقد بستن**": پەیمان بەستن. مارەکردن. "**عقد جایز**": گرێبەستێ کە هەردوولا هەرکاتێ بیانەوێ دەتوانن هەڵیوەشێننەوە. "**عقدضمان**": وەئەستۆگرتنی قەرزی کەسێك و بوونە دەستەبەری وی. "**عقد کردن**": مارەکردن، مارەبڕین. ژماردن، حەساوکردن. شایەتیدان. "**عقد کرده**": مارەکراو. "**عقدکنان**": مارەبڕان، مارەبڕین، لێك حەڵاڵ کردنی ژن و پیاو. "**عقد لازم**": گرێبەستێ کە هیچ کام لە لایەنەکانی مامەڵە نەتوانن هەڵیوەشێننەوە مەگەر بەپێی یاسا. "**عقدنامه**": مارەنامە. "**به عقد خود درآوردن**": مارەکردن.

**عقده:** 1) توخمە زەینی و سۆزدارییە سەرکوتکراوەکان کە ئاسەوارەکەی لە ڕەهەندەکانیتری ژیان دا دەردەکەوێ، کۆمپلێکس. 2) گرێ، لك.دەردەدڵ. 3) بابەت یان کارێکی ناڕوون و ئاڵۆز کە شیکردنەوەی دژوار بێ. "**عقده حقارت**": گرێی خۆبەکەمزانین، حاڵەتی سەرکوتکراوی و خەمۆکی تێکەڵ بە ڕق لەسکی کە بە هۆی نامرادی و تەحەمولی ڕەنج و سەرشۆڕی و زەبوونی سەرهەڵدەدا. "**عقده دل**": خەمی دڵ، خەم و کەسەر و گلەیی و گازندەیەك کە لە دڵ دا پەنگ بخواتەوە.

**عقدەگشا:** گریکەرەوە، گرفت ڕەوێنەوە.





**عقدەگشایی:** سوکنایی پێدان بە خەم و ڕەنجی ناخی خۆ.

**عقل:** 1) ئەقڵ، ژیری، ئاوەز. 2) زەین. "**عقل از سر (کلّة) کسی پریدن**": ئەقڵ لە کەللە پەڕینی ئەو، شێت بوونی ئەو. "**عقل خود را با (کسی یا کسانی) روی هم گذاشتن (ریختن)**": پێکەوە هاوفکری و تەگبیرکردن. "**عقل کردن**": ژیرانە جووڵانەوە، بیرکردنەوە بەشێوەیەکی لۆژیکی. "**عقل کسی به جایی (چیزی) رسیدن**": ئەقڵ پێشکان. "**عقل کسی به (در) چشم او بودن**": ڕواڵەت بین بوونی ئەو، ئەقڵ لە چاودابوونی ئەو. "**عقل کسی پارسنگ (پارەسنگ) برداشتن**": کەم ئاوەزبوونی ئەو. "**عقل کسی رسیدن**": هەبوونی توانایی بیرکردنەوەی دروست لە لایەن ئەوەوە. "**عقل کل**": زۆرزان و ژیر. "**به عقل جن هم نرسیدن (قدندادن)**": بە بیری شەیتانیش دا نەهاتن. "**به عقل کسی رسیدن (قددادن)**": بە زەینی ئەو گەیشتن. "**(به) سر عقل آمدن**": ئاقڵ بوون.

**عقلاء:** کۆی "عاقل".

**عقلانی:** ئاوەزمەندی، ئەقڵانە، ژیرانە.

**عقلانیّت:** ئاوەزمەندێتی، ئەقڵانییەت.

**عقلایی:** بەشێوەی ئاقڵان، ئاقڵانە، ژیرانە.

**عقل رس:** ئاقڵ، ژیر.

**عقل ستیزی:** دژەئەقڵی.

**عقل گرایی:** بڕوانە: "خردگرایی".

**عقل گریز:** ئەقڵ بێز.

**عقوبت:** ئەشکەنجە، تەمبێ، سزای گوناح و خراپە. "**عقوبت بردن**": تەحەممولی تەمبێ و سزادران کردن. "**عقوبت کردن**": سزادان.

**عقود:** کۆی "عقد".

**عقوق:** نافەرمانیکردن، ڕەونجاندنی دایك و باب.

**عقول:** (عُ قُ) کۆی "عقل". "**ارباب عقول**": پیاوانی خاوەن ئەقڵ. "**اهل عقول**": ئاوەزمەندان، ژیران، ئاقڵان.

**عقیدت:** بڕوا، باوەڕ.

**عقیدتی:** لەسەر بنەمای بڕوا.

**عقیده:** بڕوا، باوەڕ، بیروباوەڕ، بیروڕا، ئایین.

**عقیر:** 1) وەجاخ کوێر. 2) ماندوو و بریندار.

**عقیل:** پیاوی بەڕێز و بەئاوەز.

**عقیم:** 1) نەزۆك، قسر، ئەستێور، هەرکان. 2) بێ بەرهەم، ئەوەی قازانج و ئاکامی نەبێ. "**عقیم شدن**": لەبارچوونەوە، منداڵدارنەبوون، زارۆنەهێنان، نەزۆك بوون، هەرکین. "**عقیم کردن**": نەزۆك کردن، هەرکاندن، لەزك و زا خستن. "**عقیم ماندن**": 1) نەزۆك مانەوە، لەبارچوونەوە. 2) سەرنەخستن.

**عکّاس:** وێنەگر.
**عکّاسی:** 1) وێنەگری، کاری وێنەگر. 2) شوێنی کاری وێنەگر. 3) تێکنیك و هونەری وێنەگرتن.
**عکس:** 1) ڕەسم، وێنە، ئەکس. 2) بەراوەژووکردن، هەڵگەڕاندنەوە. 3) (بیرکاری) پێچەوانە. **"عکس انداختن":** 1) وێنەگرتن. 2) ڕادیۆگرافیکردن. **"عکس زدن":** تیشك خستن. **"عکس کردن":** بەراوەژووکردن(ەوە)، هەڵگەڕاندن(ەوە). بڕوانە: "منعکس شدن". **"عکس کشیدن":** کێشانەوەی وێنەی کەسێ یان شتێ. **"عکس گرفتن":** وێنەگرتن.
**عکس العمل:** دژکردەوە، کاردانەوە.
**عکس برداری:** وێنەگری، وێنەهەڵگرتنەوە.
**عکس دار:** وێنەدار، پێناسەیەك کە وێنەی خاوەنەکەی پێوەبێ.
**علاء:** بەرزبوونەوە، هەستان. مەزنی، گەورەیی.
**علائق:** کۆی "علاقه".
**علائم/علایم:** کۆی "علامت"، نیشانەکان.
**علاج:** 1) چارەکردن، دەرمانکردن. 2) دەوا، دەرمان، چارە.
**علاج پذیر:** چارەهەڵگر، دەرمان هەڵگر.
**علاّف:** ئاڵف فرۆش، دەخڵ فرۆش. تایبەتمەندی کەسێك کە لە حاڵەتی سەرگەردانی و بێئاسۆییدا لەشوێنێ جێ خۆش بکا یان بێت و بچێ بە بێ ئەوەی کار یان ئامانجێکی دیاریکراوی هەبێ. **"علاّف شدن":** دەسخەڕەبوون، بەتەمای یەکێتر لە کار و کاسپی بوون. **"علاّفی":** بێ ئاسۆیی، سەرگەردانی.
**علاقه:** 1) هۆگری، گیرۆدەیی، پێخۆشی، لەدڵەوە خۆش ویستنی کەسێك. پەیوەندی، دۆستایەتی، ئاشنایی. 2) دارایی بەتایبەتی زەوی و مڵك. **"علاقه‌داشتن":** هۆگربوون، پێخۆش بوون. **"علاقه‌کردن":** دابین کردنی زەوی و زار. **"علاقه‌گرفتن":** بڕوانە: "تعلّق گرفتن".
**علاقه‌جات:** دارایی، مڵك و ماڵ.
**علاقه‌مند/ علاقمند:** دەربایس، دەربایست، دەربەس، دەربەست، دەربەستە، دەربەن، دەربەند، هۆگر، بەگرینگ گر، گوێدەربەکار، ئیلاقەدار. **"علاقمندی":** ئۆگری، هۆگری، گیرۆدەیی، دەربایستی، دەربەستەیی، بەئیلاقە، پەیوەندیداری، بەگرینگ گرتن.
**علامات:** کۆی "علامت".
**علامت:** 1) زناك، درف، دورف، هەوە، نیشانە. 2) (بیرکاری) هێما، نیشانە. 3) ئاڵا.
**علامت دار:** نیشانەدار.
**علامت کردن:** لێدانی نیشانە یان نەخشێ لەسەر نامە یان دەستووری بەنیشانەی پشت ڕاستکردنەوەی. بەناوبانگ کردن، ناودارکردن.





**علامت گذاری:** دەس نیشان، دەست نیشان، مۆرنان، شەقڵ کردن، دیاریکردن، نیشان بۆدانان، نیشانەدانان، نیشان کردن، درۆشم بۆ دانان، دانانی نیشانە لە قەراغ جادده یان سنوور.
**علاّمه:** زۆرزان، زۆرزانا، هۆزان.
**علان:** ئاشکراکردن، دەربڕین.
**علاّن:** کەسێ کە کاروباری ڕوون و ئاشکرا بێ، پیاوی ناودار و ناسراو.
**علاوه:** 1) زیادی. 2) ئەوەی بە شتێ زیاد بکرێ. **"علاوه‌بر":** جگەلە، بێجگەلە، وێڕای، دەگەڵ ئەوەشدا، سەرەڕای. **"علاوه کردن":** زیادکردن، زۆرکردن.
**علّت:** 1) دەرد، نەخۆشی. 2) کەموکورتی، عەیب. 3) هۆ، سەمەد، مەڵات، هجران. 4) بیانوو، پەڵپ. 5) بڕوانە: "قاعدگی". **"علّت وجودی":** هۆی بوون. **"قید علّت":** (ڕێزمان) ئاوەڵکاری هۆیی.
**علّة العلل:** هۆی سەرەکی. خودا.
**علت ناك:** نەخۆش: دەردەدار.
**علف:** ئاڵف، لەوەڕ. **"علف خرس":** بریتی لە شتی بەلاش و بێنرخ و زۆر کە بە سانایی وەدەست دێ. **"علف زیر پای کسی سبز شدن":** زۆر چاوەڕوان بوونی ئەو.
**علف چر:** لەوەڕخۆر، ئاژەڵێ کە بلەوەڕێ.
**علف خور:** ئاڵف خۆر، لەوەڕخۆر.
**علفزار:** لەوەڕگە، گیاجاڕ، مێرگ و بژوێن.
**علقه:** ئەوین و خۆشەویستی و دڵبەستراوەیی، پێوەندی.
**علك خاییدن:** 1) بنێشت جاوین، جاچکەجاوین.2) منجەمنج کردن، قسەی قۆڕ و بێتام کردن.
**علل:** کۆی "علّت".
**علم:** (عَ لَ) 1) ئاڵا، بەیداخ. 2) ناوی تایبەتی، ناوێ کە کەس ناوبانگی پێ دەرکردبێ. 3) کەسی ناودار، بەناوبانگ. 4) سەرگەورە، گەورەی قەوم. 5) نەخش و نیگاری جلوبەرگ. 6) لوتکەی چیا، دوند. **"علم بر افراشتن(برافراختن، برئوردن، برکشیدن)":** ئاڵاهەڵدان، ئاڵاهەڵکردن. خۆنیشاندان. **"علم زدن":** ئاڵاهەڵکردن. ئاشکرابوون. **"علم روز":** بریتی لە بەیانی، هەتاو. **"علم صبح":** ڕووناکی بەیانی. **"علم بەخون تازه کردن/علم به خون چرب کردن":** ئاڵا بە خوێنی دوژمن شەڵاڵ کردن لە شەڕدا. **"به علم":** نەخشدار، بەنەخش و نیگار. **"زیر علم کسی(چیزی) سینه زدن(رفتن)":** پشتیوانی کردن لەو یان پێڕەوی لێکردنی.
**علم:** (عِ) 1) زانست، زانایی، زاناهی. 2) زانیاری، ئاگایی. **"علم اشاره":** تێگەیاندنی بابەتێ بە کەسێ بە هێما و ئاماژە. **"علم الاجتماع":** کۆمەڵناسی. **"علم الاحجار":** بەردناسی. **"علم الادیان":** ناسینی ئایینەکان، ئایین ناسی. **"علم الاشیاء":** ناسینی شتەکان، مێژووی سروشتی، زانستەسروشتییەکان. **"علم الحیات":**

زیندەوەرزانی، زیندەوەرناسی. "**علم الروح**": بڕوانە:"پسیکولوژی". "**علم المیقات**": کاتناسی، وەختناسی. "**علم النفس**": دەروونزانی، دەروونناسی. "**علم الیقین**": زانینی شتێ بەتەواوی و بەبێ شك و گومان. "**علمی**": زانستی.

**علماء:** زانایان، بیرمەندان.

**علمدار:** (عَ لَ) ئالاهەڵگر، بەیاخدار.

**علم شدن:** (عَ لَ) 1) ناسران، ناودەرکردن، ناوبانگ ڕۆیشتن. 2) دامەزران، بەرپابوون.

**علم غیب:** (عِ) پێوارزانی، ئاگاداری لە کاروباری نهێنی.

**علم کردن:** (عَ لَ) 1) هەڵدان، بەرزکردنەوە، بڵیندکردن. 2) دامەزراندن، بەرپاکردن. 3) ئامادەکردن. 4) هاندان، دنەدان، ورووژاندن. 5) خستنەڕووی بابەتێ یان تیۆرییەك کە هەقیقەتی نیە و بەمەبەستی ڕاکێشانی پشتیوانی یان پشت ڕاست کردنەوەی کۆیی و گەیشتن بە ئامانجێ. 6) ڕاخستن، پانکردنەوە.

**علناً:** بەڕاشکاوی، بەئاشکرا.

**علنی:** ئاشکرا، دیار. "**علنی شدن**": ئاشکرابوون، دیارکەوتن. "**علنی کردن**": ئاشکراکردن، دەرخستن.

**علوّ:** (عُ لُ) بەرزبوونەوە، بەڕێزبوون، گەورەبوون. بەرزی، بڵیندی.

**علوم:** کۆی"عِلم". "**علوم اجتماعی**": زانستە کۆمەڵایەتییەکان. "**علوم حیاتی**": زیندەوەرناسی. "**علوم خفیّة( غریبة، نهانی )**": زایاریگەلێ سەبارەت بە غەیب وێژی و جادووگەری و شتیوا. "**علوم رفتاری**": زانست گەلێ کە تاوتوێی هەڵسوکەوتی مرۆ و ئاژەڵ دەکا. "**علوم زیستی**": زیندەوەرناسی. "**علوم سیاسی**": زانستە سیاسییەکان. "**علوم طبیعی**": زانستە سروشتییەکان وەك: بوونەوەرناسی و زەوی ناسی. "**علوم عقلی**": زانستە بەرئاوەزەکان وەك: لۆژیك و فەلسەفە. "**علوم کاربردی**": زانستە پڕاکتیکییەکان وەك: پزیشکی.

**علوی:** سەرەوەیی، ئاسمانی.

**علویّت:** لەسەرتری.

**علّه:** بڕوانە:"علّت".

**علّی:** هۆکرد، هۆدار.

**علیا:** (عُ) 1) سەرووتر، ژوورتر. 2) بەرز و بڵیند، شوێنی بەرز، سەرەوەی هەر شتێ.

**علی‌الاتّصال:** بەردەوام، هەمیشە.

**علی‌الاجمال:** بەشێوەی کورت و پوخت.

**علی‌الاصول:** لەبنەڕەت ڕا، لە بناغەڕا.

**علی‌الاطلاق:** بەشێوەی ڕەها، بێ مەرج. بەشێوەی گشتی.

**علی‌البدل:** جێگر.

**علی‌التحقیق:** بێشك و گومان، بە دروستی.

**علی‌التفصیل:** بەتێروتەسەلی.





**علی‌الجملة:** بەکورتی.

**علی‌الحساب:** 1) وەرگرتن یان دانی پارەیەك پێش لە کاتی دانەوەی. 2) جارێ، ئێستاکە.

**علی‌الخصوص:** بەتایبەتی.

**علی‌الدوام:** بەردەوام، هەمیشە.

**علی‌الرسم:** بەپێی داب و نەریت.

**علی‌السویه:** بەشێوەی یەکسان. بەبێ گرنگی یان لەسەرتری.

**علی‌الظاهر:** بەڕواڵەت.

**علی‌العموم:** بەگشتی، تێکڕایی.

**علی‌العمی:** کوێرکوێرانە، هەڵنەسەنگێنراو، نەهزراو.

**علی الفور:** بڕوانە:"فوراً".

**علی‌القاعده:** بەپێی ڕێسا، لەبنەڕەت ڕا.

**علی‌القطع:** بەتەواوی، بێئەولاولا.

**علیّت:** پێوەندی هۆ و بەرهۆی نێوان دوو شت، هۆکارێتی، هۆیەتی، هوەتی.

**علیحده:** جیاواز، جیاکار، بەجیا، بە تەنیا.

**علیرغمِ:** 1) بەپێچەوانەی. 2) سەرەڕای.

**علیل:** 1) دەردەدار، نەخۆش، لەش بەبار، ئێشدار. 2) داماو، کلۆڵ. 3) بڕوانە: "ناقص".

**علیم:** زانا، بیرمەند.

**عماد:** پاڵپشت، کۆڵەکە.

**عمارت:** ئاوەدان کردنەوە، بیناکردن. باڵەخانە، تەلار، خانووبەرەی زل و بڵیند، ئەمارەت. "**عمارت کردن**": ئاوەدانکردنەوە. نووژەنکردنەوە.

**عمّال:** کۆی"عامل".

**عمامە:** مێزەر، پێچی سەر، شاش، شاشك. "**عمامە بە سر**": ئاخوند، مەلا.

**عمد:** ئانقەست، قەست، ئاگایی. "**بەعمد**": بڕوانە:"عمداً".

**عمداً:** ئانقەس، ئانقەست، لە ئانقەست، لەقەست، لەقەستی، دەسانقەست، بەقەستی، قەسدانە، زانستە، بەڕاست، هەڵە لە ڕووی ئاگادارییەوە.

**عمدتاً:** بەشێوەی سەرەکی یان گشتی.

**عمده:** 1) پاڵپشت، کۆڵەکە. 2) سەرەکی، گرینگ، بەرچاو، دیار. 3) بەشی گرینگ و سەرەکی شتێك. 4) فرە، زۆر.

**عمده‌فروش:** کۆفرۆش، کۆم فرۆش، بەرانبەر وردەفرۆش.

**عمدی:** بڕوانە:"عمداً".

**عمر:** 1) تەمەن، ماوەی ژیان، عومر. 2) ڕۆژگاری درێژ. 3) بڕوانە:"معشوق". "**عمر ابد**": ژیانی هەرمان. "**عمر خود را بە کسی دادن**": مردن، کۆچی‌دوایی کردن. "**عمر خود را کردن**": تێپەڕاندنی زۆرترین دەورانی ژیان. کۆن و پرتوکیاو بوون و لەکارکەوتن. "**عمر داشتن**": زیندوو بوون. "**عمر در کاری( چیزی ) کردن**": تەواو یان زۆرتری ماوەی ژیان بەوەوە خەریك بوون. "**عمر دوبارە**": ماوەی ژیانی کەسێك کە لە مەرگ

ڕزگاری بووبێ. "**عمر دو روزه**": دەورانی ژیانی زۆر کورت، تەمەنی دوو ڕۆژە. "**عمر کردن**": ژیان، ژیان بردنەسەر. بەرگەگرتن، دەوام هەبوون. "**عمر کسی بە دنیا بودن**": کاتی مەرگی ئەو نەبوون. "**عمر کسی وفا نکردن**": دەوام نەهێنانی ژیانی وی. "**عمری**": ڕۆژگارێکی دوور و درێژ، تەمەنێك. "**يك عمر**": بڕوانە: "عمری".

**عمراً:** هەرگیز، بەهیچ کلۆنجێك.

**عمران:** ئاوەدانی، ئاواکرن. "**عمرانی**": کاروباری پێوندیدار بە ئاوەدانکردنەوە، ئاوەدانکاری.

**عمرکاه:** (عُ) کەمکەرەوەی تەمەن، زایەکەری تەمەن.

**عمق:** 1) قوولّی، قوولّایی، کوورایی، کووراهی، چالّی. 2) ناخ. "**عمق ظاهری**": قوولّی دیار، دیارەقوولّی. "**عمق حقیقی**": قوولّی ڕاستەقینە، ڕاستەقوولّی.

**عمل:** 1) دروستکردن، کارکردن. 2) کردە، کردەوە، کردار، ڕەفتار. 3) کار، ئیش. 4) چۆنیەتی کاری دەزگایەك. 5) ئاکامی کاری کەسێك، بەرهەم. "**عمل آمدن**": پەروەردەبوون. دروسکران یان ئامادەبوون و بە فۆڕمی دلّخواز دەرهاتن. "**عمل آوردن / بعمل آوردن**": دروست کردن، ڕەعەمەل هێنان، ئامادەکردن، جێبەجیکردن، بەڕێوەبردن. "**عمل ابداعی**": کاری داهێنەرانە. "**عمل دادن**": بڕوانە: "منصوب کردن". "**عمل صالح**": کاری چاك، کردەوەی باش. "**بعمل آمدن**": دروستکران، ئامادەکران، جێبەجێبوون، ئەنجامبوون. "**در عمل**": بەکردەوە، لەکردەوەدا.

**عملاً:** 1) بەکردەوە، لەکردەوەدا، لە باری کار و کردەوەدا، بەشێوەی ئەزموون و تاقیکاری. 2) لە ڕاستیدا.

**عمل ارادی:** کاری خۆویست(انە)، کرداری خۆکرد.

**عملکرد:** 1) ڕەفتار، کردەوە. 2) کاردانەوە. 3) کاردا، بەرهەمی و ئاکامی کار، ئەنجام.

**عمل کردن:** 1) هەلّسوکەوت کردن، ڕەفتارکردن. 2) نەشتەرگەریکردن. 3) کەوتنەکار، کارکردن. 4) کاریگەربوون، کارتێکردن. 5) بەکارهێنان، ئەنجام دان، خستنە خانەی جێبەجێ کردنەوە. "**عمل کردن بە چیزی**": جێبەجیکردنی ئەو کارە.

**عملگاه:** 1) شوێنی مەئمووریيەتی ڕاژۆر و کارگێڕی حکوومەتی. 2) کارخانە، کارگە.

**عملگرا:** کردەخواز، کردەوەخواز، پڕاگماتیك.

**عمل گرایی:** 1) کردەگەرێتی، پڕاگماتیسم.2) (سیاسی) تیۆری لایەنگری لە هەولّی ڕاستەوخۆ و چڕوپڕ بۆ سەرکەوتن.

**عملگی:** کرێکاری.





**عمله:** 1) کرێکار(بەتایبەتی کرێکاری بینا و خانووبەرە). 2) کارگێڕان، پێڕسۆنێل. 3) مەئموور، نۆکەر.

**عملی:** 1) کردەیی، کردەوەیی، کرداری، ئەوەی بگاتە قۆناغی کردەوە.2) تریاکی، گیرۆدە بە ئەفیون. 3) دەسکرد. "**عملی شدن**": جێبەجێبوون، چوونە خانەی کردەوەوە، پراکتیزەبوون. "**عملی کردن**": 1) خستنە خانەی کردەوەوە، جێبەجێکردن، پڕاکتیزەکردن. 2) گیرۆدەکردن بە ماددەی سڕکەرەکان.

**عملیات:** 1) کۆمەلّە کارگەلێ کە بۆ ئامانجێکی تایبەت ئەنجام دەدرێ. 2) (نیزامی) چالاکییە نیزامییەکان. 3(پزیشکی) نەشتەرگەری.

**عمود:** 1) کۆلّەکە، ئەستوون، ئەستوندەك، دیرەك.2) گورز، گورزی ئاسنی. 3) ڕاستەوخۆ(آفتاب عمودی میتابید). "**عمود منصف**": (بیرکاری) ئەستوونی لەتکەر، ئەستوونی نیوەکەر.

**عمودی:** ئەستووندەکی، ستوونی، کۆلّەکەیی، شاولّی.

**عموم:** گشت، تێکڕا، هەموو، هەموان. "**بر عموم**": بەشێوەی گشتی.

**عموماً:** گش، گشت، پەیاپەی.

**عمومی:** گشتی، تێکڕایی، هەموانی.

**عمومیّت:** گشتگر(ی)، گشتێتی. "**عمومیّت دادن**": گشتگیرکردن، تێکڕاییکردن. "**عمومیّت داشتن**": گشتیبوون، تێکڕاییبوون.

**عمید:** سەرەك و گەورەی قەوم.

**عمیق:** قوولّ، قویل، کووڕ.

**عمیقاً:** 1) بە قوولّی.2) بە وردی و بەجیددی و هەولّی زەینی زۆر. 3) لەدلّەوە.

**عنا:** 1) ڕەنج، سەختی. 2) خەم، کەسەر. "**عنا خوردن**": خەم خواردن. "**عنا کشیدن**": مەینەتیکێشان، خەفەت خواردن. "**عنا نمودن**": زەحمەت پێدان، چەوساندن.

**عناد:** 1) دژایەتیکردن دەگەلّ کەسێك و خیلەسەریکردن. 2) ڕق و دوژمنایەتی. "**عناد ورزیدن**": دژایەتی یان دوژمنایەتی کردن دەگەلّ کەسێك.

**عناصر:** کۆی"عنصر". "**عناصر اربعه**": بریتییە لە ئاو.خاك. با. ئاگر. "**عناصر سازنده**": توخمە پێکهێنەرەکان.

**عن اصله:** 1) لە ڕەگەوە. 2) لەبنەڕەت ڕا.

**عنان:** لغاو، جلّەو، هەوسار. "**عنان اختیار (را) از دست کسی(چیزی) بیرون آوردن(ربودن)**": بێدەسەلّات کردنی ئەو یان خستنەژێر کۆنترۆلّی خۆ. "**عنان باز کشیدن**": وێستان. دەست کێشانەوە لە کارێ. "**عنان پیچیدن(گرداندن، بر پیچیدن، برشکستن)**": ڕوووەرگێڕان، پشت تێکردن. "**عنان (بر)تافتن از چیزی(کسی)**": ڕووورگێڕان لەو، دووری کردن لەو. "**عنان تافتن بە جایی**": بەرەو ئەوێ بزووتن یان ڕەوانەبوون.

**"عنان چیزی را به دست کسی سپردن( دادن )":** خستنە ئیختیار و بەردەستی ئەو. **"عنان چیزی (کسی) را گرفتن( کشیدن )":** 1) ڕاوەستاندنی ئەو، ڕاگرتنی ئەو. 2) خستنە ژێر ئیرادە و ئیختیاری خۆ و زاڵبوون بەسەر ئەودا. 3) نزیك بوونەوە لە ئەو و هاوڕێیەتی کردن لە گەڵیدا. **"عنان (در) کشیدن":** لغاوکێشان، ڕاگرتن، ڕاوەستاندن. خۆبواردن، دووری کردن. **"عنان کشیدن به جایی":** تاودان بەرەو ئەو شوێنە.

**عنان پیچ:** سوارکار، سووکەڵەسوار. **"عنان پیچ شدن":** جووڵان، ڕۆیشتن.

**عنان گسسته:** 1) هەوسارپچڕاو. 2) بەخێرایی.

**عنان گسیخته:** بڕوانە:"عنان گسسته".

**عنان گیر:** 1) هەوسارگر. 2) بەرگێڕەوە، گرفتارکەر. 3) بەخزمەت، میوان دۆست. **"عنان گیر کسی شدن":** گرفتارکردنی ئەو، بەسەر ئەودا زاڵبوون.

**عناوین:** کۆی"عنوان". **"به عناوین مختلف":** بە شکڵ و شێوازی جۆراوجۆر.

**عنایت:** 1) بایەخ پێدان، گرنگی پێدان، سەرنج پێدان. 2) یارمەتی، کۆمەگ، بەتەنگەوەبوون. 3) بڕوانە:"قصد". 4) چاکە، خاسی.

**عنایت نامه:** ڕاسپێرنامە.

**عنبیه:** ڕەنگینە.

**عنصر:** 1) توخم، جسمی سادە، جسمێ کە ماددەی دیکەی لێنەبێتەوە. 2) کەس، تاك. 3) فاکتەر. 4) جەوهەر، بنەما و بنیات یان سروشتی هەقیقی شتێ یان کەسێك.

**عنف:** توندی و بێڕەحمی، زەبروزەنگ. **"به عنف":** بەزۆری، بەناچاری.

**عنفاً:** بەتوندی و زۆرەکی.

**عنفوان:** هەڕەت، جەنگە، تاف، قەبزە، گەرمە، دۆخیان، بن دەق، بەنان، کوڵەکوڵ، کەلاکەل، کەلدایا، سەرەتای باشی هەر شتێ. **"عنفوان بهار":** چۆپ چۆپان، چۆپ چۆپێن، گیاڕەش، جەنگەی بەهار. **"عنفوان جوانی":** گۆنل، گونەل، خۆرتانی، تافی لاوێتی، جەنگەی لەوەندی، ڕۆژگاری گەنجی.

**عنق:** 1) بڕوانە:"اخمو". 2) بەدئەخلاق، تۆسن.

**عن قریب:** بەزوویی، بەم زوویە، بەم زوانە، بەم نزیکانە.

**عنوان:** 1) سەردێڕ، سەرباس، تیتر، ناونیشان، نیشانی، دەسپێکی کتێب یان نامە. 2) بیانوو. 3) بەڵگە.4) دۆخ، حاڵەت. 5) بەرهەم. **"عنوان شدن":** هاتنە گۆڕ، هاتنە بەرباس. **"عنوان کردن":** هێنانەگۆڕ، خستنەبەرباس. **"به عنوان":** بەناوی، بە شکڵێ یان بە بیانووی، وەك، وەکوو. **"تحت عنوان":** لەژێر ناوی، لە ژێر سەردێڕی.

**عنوان بندی:** 1) (سینەما) تیتراژ. 2) تیتربەندی.





**عوارض:** 1 کۆی"عارضە". 2) لە جوغرافیادا: نالێکی، ناڕێکی.3) ئاسەوار و ئاکامی نەخوازراو بەزیان(عوارض فقر). 4)ماڵیاتی سەراسایی کە بێجگە لە ماڵیاتی ئاسایی لە خەڵك وەردەگیرێ. 5) ڕووداو بەتایبەتی ڕووداوی ناخۆش.

**عوارضی:** 1) شوێنی وەرگرتنی ماڵیات. 2) ماڵیات وەرگر.

**عواطف:** کۆی"عاطفە"، سۆزەکان، هەستەکان.

**عواقب:** ئاکام، دەرەنجام، ئاسەوار.

**عوام:** 1) جەماوەری خەڵکی ئاسایی. 2) گشت خەڵکی. **"عوام الناس":** هەموو خەڵکی، خەڵکی ئاسایی.

**عوامانه:** 1) ڕەمەکییانە، بەشێوەی خەڵکی ئاسایی. 2) ڕواڵەتی و بەبێ قووڵ ڕوانی.

**عوام پسند:** جەماوەرپەسند.

**عوامفریب:** خەڵك خەڵەتێن.

**عوامل:** 1) کۆی"عامل". 2) هۆکارەکان، فاکتەرەکان، بکەرەکان، دەست و پێوەندەکان، بەکرێگیراوان. 2) (ئابووری) سەرچاوە و ماددەی سەرەتایی بەرهەمهێنان. 3) (کشتوکاڵی) گایەك کە زەوی پێ دەکێڵن. 4) ئامرازگەلێ کە لە کانزا و شتی وا ساز دەکرێ. **"عوامل پنجگانه":** بریتی لە ئاو.خاك. تۆو. کار. گا.

**عوایب:** کۆی"عیب".

**عواید:** 1) کۆی"عاید". 2) داهاتەکان. 3) قازانجەکان. 4) ماڵیات.

**عودت:** گەڕانەوە. **"عودت دادن":** گەڕاندنەوە. **"عودت کردن":** گەڕانەوە.

**عور:** (عُ) 1) ڕووت و پەتی. 2) زۆر نەدار و دەسکورت. 3) بێخشڵ و زەنبەر.

**عورت:** 1) ئەندامی جووت بوون. 2) ژن. 3) ناحەزی، ئەوەی ببێتە هۆی شەرم کردن. 4) شوێنی دزەکردنی دوژمن.

**عوز:** (عَ وَ) 1) دەگمەن بوون، دەس نەکەوتنی شتێ کە کەسێ پێی نیازمەندە. 2) دەست تەنگی، دەسکورتی، هەژاری.

**عوض:** 1) بری، باتی، جیاتی. 2) پاداشت، هەقدەست. 3) ماڵێ کە فرۆشیار دەداتە کڕیار. **"عوضِ":** لەبری، لەجیاتی. **"عوض دادن":** شتێ وەك پاداشت یان لەباتی شتێ بەکەسێك دان. **"عوضش":** لەباتی، لەجیاتی. **"عوض شدن":** گۆڕیان، گۆڕان. **"عوض کردن":** گۆڕاننەوە، گۆڕین، گۆڕینەوە، گوهارتن، گوهەڕین، شتێ لە جیاتی شتێ ساندن. **"عوض گرفتن":** پاداشت وەرگرتن. **"درعوض":** لە بەرامبەردا. **"در عوضِ( بەعوضِ )":** لەجیاتی، لەباتی، لەبری.

**عوض بدل:** جێگۆڕکێ پێکردن.

**عوضی:** 1) تایبەتمەندی ئەوەی لە جێی شتیدی بەکارببرێ. 2) ئەوەی لە جێی سەرەکی خۆی نەبێ. 3) بەهەڵە، بەخەتا. 4) کەسێ کە هەڵسوکەوتی ناسروشتی و نائاسایی هەیە. **"عوضی گرفتن":** لێگۆڕان، لێتێکچوون.

**عوضی گویی:** بەکارهێنانی نابەجێی وشە، لە جێی خۆیدا بەکارنەهێنانی وشە.

**عهد:** 1) پەیمان، بەڵێن، گرێدانك، گفت، سوێند. 2) سەردەم، ڕۆژگار. 3) وەئەستۆگرتن و پابەندبوون. 4) پاراستن و ڕاگرتن. 5) پەیماننامە. 6) فەرمانی بەنووسراوەی حکومەت کە پاشاکان بۆ میری هەرێمەکانیان دەنارد، بڕیار. "**عهد بستن**": پەیمان بەستن، بەڵێن دان. "**عهد تازەکردن**": بەڵێن و دۆستایەتی نویکردنەوە. "**عهد دقیانوس**": سەردەمی زۆر کۆن. "**عهد شاەوزوزك (بوق)**": سەردەمانی زۆر کۆن. "**عهد شکستن**": شکاندنی پەیمان بەپێچەوانەی پەیمان جووڵانەوە. "**عهد عتیق**": کەونینەدەم، سەردەمی کەونارا. "**عهدکردن**": مەرج کردن، پەیمان بەستن، بەڵێن دان، شەرت کردن.

**عهدشکن:** پەیمان شکێن.

**عهدنامه:** پەیماننامە، بەڵێننامە.

**عهده:** ئەستۆ، دەرۆستی، دەستەبەری، لەسەر. "**عهدەکردن**": پەیمان بستن، بەڵێن دان. "**از عهده چیزی (کاری) برآمدن (بیرون آمدن، بەدرآمدن)**": بەباشی ئەنجامدانی، لەئەستۆهاتنی. "**از عهده کسی برآمدن**": پێوەستان، دەرەقەت هاتن، توانایی زاڵبوون بەسەر ئەوداهەبوون. "**بە (در، بر) عهده داشتن**": لەئەستۆبوون. "**بەعهده کسی گذاشتن**": خستنە ئەستۆی ئەو، پێسپاردنی بەرپرسییەتی ئەنجامدانی کارێك. "**بر (بە) عهدەگرفتن**": وەئەستۆگرتنی بەرپرسێتی ئەنجامدانی کارێك، دەروەست بوون. "**چیزی (کاری) از عهده کسی بیرون بودن**": لە دەرەوەی توانایی ئەو بوون.

**عهدەدار:** ئەستۆگر، وەئەستۆگر، دەرۆست، بەرعۆدە، بەڵێندەر.

**عهود:** 1) کۆی "عهد". 2) گرێبەستەکان، پەیمانەکان. 3) ڕۆژگاران، سەردەمەکان. 4) بڕیارە بەنوسراوەکان. "**عهود کردن**": پەیمان بەستن.

**عیادت:** هەواڵپرسی نەخۆش، سەردان، سەرلێدان، پێوەهاتن، پێوەچوون(بۆ شتی خۆش و ناخۆش دەبێ). "**عیادت رساندن**": هەواڵپرسی کردن لە لایەن کەسێکیترەوە.

**عیار:** 1) پێوانە، پێوەر. 2) ئەندازە، ڕادە. 3) پوختی و پاکی. 4) تەرازوو. 5) پوخت و بێخەوش. "**تمام عیار**": بێ خەوش. بە تەواو مانا.

**عیّاش:** خۆش ڕابوێر، دڵچەڕێن، فرە خۆشگوزەران.

**عیّاشی:** کوڕێنی، تۆلازی، دڵچەڕاندن، خۆش ڕابواردن، بەکەیفی خۆکردن.

**عیال:** ژن و مناڵ، خێزان.

**عیالمند:** پیاوی ژن و مناڵدار.

**عیالوار:** خێزاندار، ژن و مناڵدار، کلفەتبار، کلفەتدار، عایلەمەن.





**عیان:** 1) دیار، ئاشکرا. 2) بەچاودیتن، بینین. "**عیان شدن**": ئاشکرابوون، خویابوون. "**عیان کردن**": ئاشکراکردن، دەرخستن. "**بەعیان (برعیان)**": ڕاشکاوانە، بەڕاشکاوی.

**عیانی:** شایەت، شایەتحاڵ، گەواه.

**عیب:** 1) کەموکورتی، ناتەواوی، ئیراد، خەوش، عەیب، زەدە، خراوی. 2) ناپەسند، نەشیاو. 3) خەتا، هەڵە، گوناح.

**عیب آوردن:** بڕوانە: "عیب گرفتن".

**عیب بین:** کەسێ کە کەموکووڕی و خراوی دیتران ببینێ و ئاشکرای بکا.

**عیب پوشیدن:** عەیب داپۆشین و ئاشکرانەکردنی.

**عیب جویی:** ڕەخنەگرتن، ئیرادگرتن، وردەگیری.

**عیب دار:** زەدەدار، خەوشدار، سەقەت، عەیب دار. "**عیب دار شدن**": خەوشداربوون، عەیبداربوون.

**عیب داشتن:** عەیب داربوون، خەوشداربوون. ناڕەوا یان نەشیاو بوون. بەخراو زانین.

**عیب کردن:** 1) خراوبوون. 2) ئازاردیتن. 3) ئیرادگرتن، لۆمەکردن.

**عیب گرفتن:** ئیرادگرتن، عەیب گرتن.

**عیبناك:** 1) بڕوانە: "عیب دار". 2) کچێ کە پەردەی کچێنی نەمابێ. 3) بەهەڵە و کەموکووڕیدار.

**عید:** جێژن، جەژن، گێژن. "**عید کردن/گرفتن**": جێژن گرتن. "**ایام عید**": جێژنان، جەژنان، ڕۆژانی جێژن.

**عیدانه:** جێژنانە، جەژنانە.

**عیدگاه:** شوێنی جێژن، ڕۆژی جێژن.

**عیدمبارکی:** جێژنە پیرۆزە، جێژنە پیرۆزی.

**عیدی:** جێژنانە، جەژنانە.

**عیسوی:** بڕوانە: "مسیحی".

**عیش:** 1) ژیان بەسەربردن، ژیان کردن. 2) ژیان. 3) خۆراك، خواردەمەنی، بژیوی. 4) ڕابواردن، خۆشگوزەرانی، کەیف و شادمانی. "**عیش کسی را کور (منغض) کردن**": تێکدانی شادی و خۆشی ئەو. "**عیش کسی کوك بودن**": دابین بوونی ئامرازی شادی و خۆشی ئەو.

**عین:** 1) خود، جەوهەری هەر شتێ. 2) (فەلسەفە) هەقیقەتی ماددی کە لە دەرەوەی زەینی مرۆ بوونی هەیە. 3) چاو. 4) کانی، سەرچاوە. 5) تەڵا، زێڕ. "**عینِ**": دروست وەك. "**عین خیال کسی نبودن**": کەمتەرخەم بوونی ئەو نیسبەت بە شتی گرینگ، بەهێند نەگرتنی ئەو. "**عین صواب**": بەتەواوی دروست. "**بەعین**": بێ کەم و زیاد. بەڕاشکاوی. "**در عین حال**": لە هەمان حاڵدا، لە هەمان کاتدا.

**عیناً:** بیکەم و زیاد، تەواوهەو، کتومت، کوتومت، هەروەك، هەمان.

**عین گرایی: ( فەلسەفە ) بڕوانە: "عینیّت گرایی".**

**عینی:** 1) بابەتی(یانە)، (بەر)چاوەکی، ئەوەی کە بە چاو ببینرێ، ئابژێکتیڤ. 2) هەست پێکراو، ئەوەی بە یەکێك لە هەستەکان دەرکی پێبکرێ. 3) لەسەر بنەمای دیتن یان پێگەیشتن.

**عینیّت:** بابەتیبون، بابەتێت(ی)، دۆخ و حاڵەتی بابەتیێ، (بەر)چاوەکییەت. "**عینیّت بخشیدن**": هێنانەدی، وەدیهێنان.

**عینیّت گرایی:** هەبوونی مەیل یان بەریان بۆ مەسەلەگەلێ کە لە جیهانی دەرەوە بوونیان هەیە، ئابژێکتیویزم.

**عیوب:** کۆی"عیب".

# غ

**غائـــب:** 1) بـــەرپیوار، نادیـــار، گـــوم لەبەرچـاو، بـزر، ون. 2) ئامادەنـــەبوو، کەسێ کە ئامادە نیە و لە جێیـەکیـتـرە . **"غائب بـودن از کسی"**: دووربـوون لـە ئـەو و یەکتر نەدیتن. **"غائب شدن"**: بزربـوون، ون بوون، خۆون کردن، خۆشاردنەوە. **"غائب شدن از خـود"**: بێئاگـابوون لـە خـۆ بـەهۆی شـەیدایی و زۆر سـەرنجدانە کەسـێ یـان شتێ. **"ضمیر غائب"**: ڕاناوی نادیـار. **"غائب کردن"**: لەدەست دان، ون کردن.

**غائر:** نزم، نەوی. ڕۆچوو.

**غائص:** بڕوانە:"غواص".

**غائلــە:** 1) فیتنــە، ئــاژاوە. 2) مقۆمقــۆ، چەقەوگوڕە. 3) وەزەنگ، پێوەر، ئـازار. 4) ســەختی، دژواری. 5) بــەڵا، پــەتا. **"غائلــە خوابیــدن"**: کۆتـایی هـاتنی فیتنـەو ئاژاوە.

**غائی:** دوایەمین، کۆتایی.

**غابط:** ئێرەیی بەر، ئاواتـەخواز بـە حـاڵی کەسێك بـێ ئـەوەی خوازیـاری تیاچـوونی ماڵ و سامانی ئەو بێ.

**غاب کردن:** خراو و زایە کردن.

**غـــابن:** 1) دەســـبڕ، قـــۆڵبڕ، فێڵـــەباز، خەڵەتێن. 2) شل و ول، گنخێن.

**غابـــــە:** 1) چـــیتەڵان، قامیـــشەڵان، قـامیـشەڵێن، ژاژۆك. 2) گروپـی خـەڵکی. 3) نێزەی درێژ.

**غـادر:** خـاین، بـێ ئەمـەگ، بڕیارشـکێن، پەیمان شکێن.

**غـار:** ئەشـکەوت، ئەشـکەفت، شـکەفت، کـاف، کافـك، کـوول، کـەورگ، کـەوەر، مغارە، غار، هلۆڵ و ڕەهۆڵ لە کێودا. **"غار نشین"**: ئەشـکەوت نـشین، کەسـێ کـە لـە ئەشـکەوت دا دەژی. هـەرکام لـە مرۆڤـە سەرەتاییەکان کە لە ئەشکەوتدا دەژیان. **"غـــارنوردی"**: چـــوونە ئەشـــکەوتەوە بەمەبەستی شناسایی و دۆزینەوە.

**غارت:** تاڵان، تاڵوو، پوور، پووڕ، پـووڕ، ڕاووڕووت، کاڵات، کاڵەت، گلاهـە، یاخمـە، چـەپاو. **"غـــارت زده"**: تـــاڵانکراو، تـــاڵان کریـاگ، تـــاڵان لێـدراو. **"غـــارت شـــده"**: دامـەلاغارس، تـاڵانکراو، پـورکری. **"غـارت کـــردن"**: تـــاڵانکردن، شـــەلاندن. **"غـــارت و چپاول"**: تاڵان و بڕۆ، زاخـۆران. **"بـە غـارت بردن"**: تاڵان کـردن، بـە تـاڵان بـردن. **"بـە غارت دادن"**: بڕوانە: "تاراج کردن".

**غـــارتگر:** تاڵانکـــەر، نـــژدە، قەرەپـــشی، چەتە، دز.





**غارتیدن:** تـاڵان کـردن، ڕاو و ڕووتکـردن، شەلاندن.

**غارق:** نوقم بوو.

**غاروغور:** دەنگەدەنگ و هەراوهوریا.

**غاز:** 1) قاز، باڵدارێکی سـپییە و گۆشـتی دەخورێ. 2) چووکترین یەکـەی پـووڵ لـە قــەدیم دا کــە تــا ســەرەتای ســەردەمی قاجارەکـان بـاو بـووە. 3) پینـە. 4) درز، کەلێن. **"غاز چراندن"**: وەخت و تەمەنی خۆ بەکاری پڕوپووچەوە خەریك کردن. بێکار و دامـــاوبوون. **"غازغـــاز"**: لێـــك تلێـــشاو، شـــــڕودڕ. **"غـــــازکردن"**: کێـــــشان و درێژکردنەوە(بادان)ی خوری یان لۆکە بـە دەسـت بـۆ ڕسـتن. **"یـك غـازی"**: بریتـی لـە کەسی قرنیس و سەقیل.

**غازل:** ڕێسەر، هۆنەر.

**غـاسـق:** 1) تـــاریکەشەو، تاریکەسـەلات. 2) ماری ڕەش. 3) مانگ.

**غاشم:** ستەمکار، زۆردار، داگیرکەر.

**غاشیە:** 1) داپۆشەر. 2) پەردە، پـەردەی دڵ. 3) ڕووپۆشـــی زینـــی ئەســـپ. **"غاشـــیەبردوش"**: بریتـــی لـــە ملکـــەچ و بەرفەرمان.

**غاصـــــب:** داگـــــر، داگیرکـــــەر، دەس بەسەرداگر، دەسدرێژ، زەوتکـەر، ستێن، زۆرکار.

**غاصبانە:** داگیرکەرانە، زەوتکەرانە.

**غـــافر:** 1) لێبـــوردە، لێخۆشـــبوو. 2) لـــە سفەتەکانی خوا. **"غافر شدن"**: لێبـوردن لـە گوناحی کەسێك.

**غـافـل:** 1) خـافـڵ، غافـڵ، بـێئاگـا، بـێ خەبـــەر، بـــێ خـــەوەر، هـــای لێ نـــا، فەرامۆشـــــکار. 2) بەهێندنـــــــەگر و کەمتەرخـــەم ســـەبارەت بـــە پرســـە جیددییەکان، نـەزان. **"غافـل شـدن"**: خافـڵ بـــوون، غـــافڵان، ئاگـــا لەخۆنـــەمان، لەبیرکردن(ەوە).

**غافلانە:** خافڵانە، بێئاگایانە.

**غافل گونە:** بێخەوەرئاسا، خافـڵ ئاسـا، وەك غافڵ.

**غـــافلگیر:** خـافڵگیر، ئـەوەی کتـوپڕ و بـێ خـــەوەر بەســـەر کەســـێك دا بـــچێ. **"غافلگیرشـــدن"**: خـــافڵگیربوون، بەشـــێوەی کتـوپڕ و چاوەڕواننەکراو کەوتنـە هـەلێکی پێـــشبینینـــەکراوەوە. **"غـــــافلگیرکردن"**: بەسەراچوون، بەسەراهاتن، لەنخافڵ گرتن، بێچاوەڕوانی گەیشتنە سەر یەکێك.

**غـــالـــب:** 1) بـــاڵادەســـــت، زاڵ. 2) سەرکەوتوو، براوە. 3) زۆربە، زۆرینـە، زۆرتـر. 4) ئەگـەری بـەهێز. **"غالـب آمـدن / غالب شدن"**: زاڵبـوون، سـەرکەوتن. **"غالـب اوقات"**: زۆربەی کاتـەکان، زۆرجـار. **"غالـب الظن"**: گومانی زاڵ. **"غالب بـودن بـر چـیزی"**: لەو لەسەرتربوون یان زیاتر بوون.

**غالباً:** زۆرتر، زۆرجار، زۆربەی کاتەکان.

**غـالبیّت:** زاڵێتی، باڵادەستی.

**غالط:** هەڵەکار، خەتاکار.

**غالی:** 1) گران، گرانبایی. 2) لەڕادەتێپەڕێن، پێوەنەر.

**غالیدن:** 1) خلۆربوونەوە، گلاربوونەوە، گلێربوونەوە. 2) خلۆرکردنەوە، گلارکردنەوە.

**غامر:** زەوی بوورە و خراپ.

**غامض:** 1) ئالۆز، لێڵ. 2) دوور لە زەین، قسەی دوور لە فام. 3) زەوی نزم.

**غانی:** دارا، بێنیاز، ماڵدار، دەوڵەمەند.

**غانیە:** ژنێ کە لەبەر جوانییەکەی پێویستی بە خۆڕازاندنەوە نەبێ. ژنی داوێن پاك و بەمێرد.

**غاوی:** گومڕا و بێهیوا.

**غایات:** کۆی"غایت".

**غایب:** بڕوانە:"غائب".

**غایت:** ئامانج، مەبەست. 2) کۆتا، ئەنجام. 3) ئەوپەڕی. 4) دوایین پلە. "**غایت مطلوب**": ئەوپەڕی دڵخواز. "**غایت الآمال**": ئەوپەڕی ئاواتەکان. "**بە غایت**": زۆر، فرە. "**تا این غایت**": تا ئەم کاتە. "**تا غایت وقت**": تاکوئێستا، تائێستاکە.

**غایتشناسی:** ئەنجامناسی، موتاڵای حیکمەتی "غائی"، "تێلیۆلۆژی".

**غایت گرایی:** ئەنجامگەرێتی، ئامانجگەرێتی، تیۆرییەك کە کاروبارەکان بەسەرنج دانە ئەنجامی ئەوان تاوتوێ و لێکدەداتەوە.

**غایت مندی:** ئەنجامناسی.

**غایتنگری:** بڕوانە: "غایت شناسی".

**غایط:** 1)پیسایی مرۆ، گوو. 2) زەوی نەوی.

**غباد:** (غُ) داهێنان، داهاوردن.

**غبار:** 1) تۆز، غومار، خاکی نەرم. 2) لێڵی، تەم. "**غبارآلود**": تۆزاوی، تەپ و تۆزاوی، تۆزین، خۆڵاوی، وەلن، وەلنە. "**غبارانگیز**": تۆزکەر، گەردان. "**غبار خاطر/ غبار دل**": بریتی لە دڵتەنگی، دڵشکیان. "**برانگیختن غبار**": تۆزهەستاندن، تۆزکردن.

**غباوت:** گەوجی، گەمژەیی، نەزانین، ئەقڵ پێ نەشکان.

**غبطە:** خۆزگەخواستن، ئاواتی نێعمەت و بەختەوەری خەڵکانی دی خواستن. خۆشحاڵی و دڵخۆشی.

**غبغب:** بەرچێڵە، بەرخەبەبە، ژێرچەناگە، ژێرچەنە. "**غبغب انداختن (گرفتن)**": حاڵەتی بەسەرداهەبوون نیسبەت بە کەسێك لەخۆ نیشان دان.

**غبن:** فێڵ کردن لە مامڵەدا، فریودانی کەسێك لە کڕین و فرۆشتندا. زەرەر لە کڕین و فرۆشتندا، زەرەرکردن. حەیف، مخابن."**غبن فاحش**": زیانی ئاشکرا و زۆر لە کڕین و فرۆشتندا.

**غبیّ:** نەزان و کەم زەین، گەوج.

**غثیان:** دڵ بەیەکاهاتن، ڕشانەوە.

**غدّار:** بەمەکرو فێڵباز، تەڵەکەباز، ڕیپۆکار. 2) زۆر ناهەقیکەر، زاڵم، غەددار. 3) بێئەمەگ و پەیمان شکێن، خاین، کامباخ.





**غدّارە:** 1) ژنی بێئەمەگ و فریودەر. 2) جۆرێ شەمشێری کورت و دەم پان، غەدارە.

**غدد:** کۆی"غدە".

**غدر:** 1) مەکر، فێڵ، فریو. 2) پەیمان شکێنی، ناهەقی و زوڵم، خیانەت، بێئەمەگی، غەدر، ڤەفر.

**غدراء:** 1) تاریکی. 2) شەوی تاریك.

**غدنگ:** 1) نەزان، گەوج، کەم زەین. 2) ناشیرین، نەهەز.

**غدود:** بڕوانە:"غدە".

**غدور:** بێئەمەگ، بێوەفا.

**غدّە:** گرێ لە گۆشتی لەشا، ئالگ، دژێن، دوبشی، لڤك، لك، لوك، لوو، لۆ، خوش خوشك. (پزیشکی) ڕژێنە. تومۆر. "**غدە آدرنال**": (پزیشکی) ڕژێنی سەرگورچیلە."**غدە اشکی**": (پزیشکی) ڕژێنەی ئەسرین، فرمێسکە ڕژێنە. "**غدە تیروئید**": ڕژێنی ملەقۆرتە، ڕژێنەی دەرەقی.

**غدیر:** پەنگاو، تالاو، ئەستێرك، شوێنی کۆبوونەوەی ئاو لە بیابان دا. "**غدیرخم**": شوێنێکە لە نێوان مەککە و مەدینەدا.

**غذاء:** خۆراك، خواردەمەنی، ئەوەی بخورێ. "**غذائی**": خۆراکی. "**غذا دادن**": خۆراك پێدان. گەیاندنی ماددەی خۆراکی بەهۆی دەمارەکانەوە بۆ ئەندامە جۆراوجۆرەکانی لەش. "**غذا کردن**": خۆراك پێدان، تێرکردن. "**غذا کشیدن**": تێکردنی خۆراك لە دەوری و دیس و شتیوا، خۆراك کێشان. "**از غذا افتادن**": ئیشتیالێنەبوون لە خواردن بە هۆی نەخۆشی یان ناڕەحەتی دەروونی و هتد.

**غر/قر:** (غِ) لەنگاندنی لەش، جووڵاندنی ئەندامێ لە لەش بۆ نازکردن یان لە حاڵەتی سەمادا. "**غر و غر بیله**": لەنگاندنی کەمەرو سمت لە حاڵی سەمادا. "**غر و غمزە**": ناز و هێما بە چاو و برۆ.

**غر:** (غَ) سۆزانی، قاحبە. هیزەکە، نێرەمووك.

**غر:** (غُ) بۆڵە، پرتە، ورتە. "**غر زدن**": بۆڵاندن. "**غرغرکردن**": بۆڵەبۆڵ کردن، ورتەورت کردن.

**غرّ:** (غِ) لاوی بێئەزموون و چاونەکراوە، کەسێ کە هەڵبخەڵەتێ.

**غرّاء:** (غَ) 1) پاراو و لێك دانەبڕاو(قصیدە غرا). 2) بەرز، درێژ یان تەواو(تعظیم غرا). 3) کێشراو و بەرز و ڕوون (صدای غرا). 4) بڕوانە:"درخشان". 5) ڕوون و ئاشکرا و قایم.

**غرائب:** کۆی"غریبە".

**غرائز:** کۆی"غریزە".

**غرابت:** 1) دوور لە زەین بوون. 2) سەیر و سەمەرەبوون.

**غرار:** (غِ) 1) بادی هەوابوون، فریوخواردن. 2) بێئەزموونی، چاونەکراوەیی. 3) تیژی دەمە شەمشێر. 4) بێ بازاڕی، ناڕەواجی. 5) جەواڵ، لایەکی تێڕێك.

**غرار:** (غَ) فریودەر، خلەتێن.
**غرارت:** سپیبوونەوە، سپیبوونەوەی دەموچاو.
**غراشیدن:** 1) بڕوانە: "خراشیدن". 2) تووڕەبوون، ڕق هەستان.
**غرام:** 1) ئاشقی و شەیدایی کە ببێتە هۆی دڵتەنگی. 2) ئازار، ئەشکەنجە و ژان.
**غرامت:** 1) تاوان، خەسارەت، بژاردن. 2) پەشیمان بوون، پەشیمانی. "**غرامت پرداز**": تاواندەر، جەریمەبژێر، بژێرەوەی زیان. "**غرامت خواستن**": داوای بژاردنەوە کردن، داوای قەرەبووکردنەوە، داوای خەسارەت کردن. "**غرامت دادن**": بژاردن، بۆ بژاردنەوە، قەرەبوو (کردن/ کردنەوە). "**غرامت ستاندن**": خەسارەت وەرگرتن. "**غرامت کردن**": وەرگرتنی ئەوەی وەك خەسارەت دیاریکراوە. پەشیمان بوونەوە. "**غرامت کشیدن**": لەئەستۆگرتن و دانەوەی ئەوەی وەك خەسارەت دیاریکراوە، ناچاربوون بە دانەوەی خەسارەت. تەمبێ یان سزادران بەهۆی ئەنجام دان یان ئەنجام نەدانی کارێ. "**غرامت گرفتن**": وەرگرتنی ئەوەی وەك خەسارەت دیاریکراوە.
**غرامت نامه:** خەسارەتنامە.
**غرّان:** خورۆشان. لە حاڵی نەڕاندن دا.
**غرایز:** کۆی "غریزه".

**غرب:** 1) خۆشاردنەوە، خۆون کردن، دوورکەوتنەوە. 2) ڕۆژئاڤا، ڕۆژاوا، خۆراوا، خۆرنشین، بەرامبەری خۆرهەڵات. 3) وڵاتانی ئەمریکایی و ئورووپایی. "**غربزده**": لەژێرکاریگەری فەرهەنگی و سیاسی و ئابووری خۆراوادا، خۆراواچی. "**غربزدگی**": خۆراواچییەتی، خۆراواگرۆیی. "**غرب گرا**": خۆراواخواز، لایەنگر و پێڕەوی شێوەی ژیان و بەها فەرهەنگییەکان یان ڕوانگەگەلی سیاسی وڵاتانی خۆراوا. "**غربی**": 1) خۆراوایی، ڕۆژاوایی، ڕۆژاڤایی. 2) خەڵکی خۆراوا یان ئورووپا و ئەمریکا. 3) هەڵکەوتوو لە لای خۆراوا.
**غربال:** بێژن، بێژنگ، بێژینگ، قەڵبێر، مۆخل. "**غربال کردن**": لەبێژنگ دان، بێژنگ کردن، دابێژان. "**غربال گر**": بێژنگ ساز. "**غربالی**": وەك بێژنگ.
**غربت:** 1) دوورکەوتنەوە لە ماڵ و بنەماڵە و زێدی خۆ دەگەڵ هەست بە نامۆیی و دڵتەنگی و تەنیایی، دووری لە نیشتمان. 2) مەنفا. 3) دووری لە خزم و کەسوکار. "**در غربت مرده**": گۆڕغەریب.
**غربت گرا:** مەنفانشین، ئەوەی کە ئارەزوو و مەیلی لە مەنفایە.
**غربتی:** 1) بڕوانە: "کولی". 2) بێگانە. 3) نامۆ لەگەڵ یاسا و دابونەریتی کۆمەڵگا. "**غربتی بازی**": وەرێخستنی قوولەقوول و هەراوهوریا یان شەڕو مقۆمقۆ.





**غربچه:** جوێنێکە، واتە مناڵی ژنی سۆزانی.
**غربیل:** بڕوانە: "غربال".
**غربیله:** 1) بڕوانە: "غربال". 2) سەمای کەمەر، لەنگاندنی کەمەر و سمت.
**غرتشن:** شەلاتی و زاڵم.
**غرچگی:** لەپیاوەتیکەوتن.
**غرچه:** 1) بڕوانە: "مخنّث". 2) نەزان، گەوج، داماو. 3) کێوی، کوێستانی.
**غردل:** (غَ.د) ترسەنۆك، نەوێر، قزە.
**غرزدن:** (غُ.زَ دَ) بۆڵەبۆڵ کردن، پرتەپرت کردن. هەڵخلەتاندن، فریودانی ژن یان کچێك و دەگەڵ خۆبردن بۆ کاری سێکسی.
**غرزن:** (غَ.زَ) 1) سۆزانی، قاحبە، جندە. 2) پیاوێ کە ژنی خراپەکاری هەیە.
**غرس (کردن):** چەقاندن، چەقنای، نیان، ڕنایش، نایش ڕۆ.
**غرّش:** گوڕ، گوڕرە، گوڕە و هاڕە، گوڕین، گورمژ، خوڕین و گرمە، گرمەگرم، شیڕان، شریخە، شریقە، نەڕە(غرّش درنده)، نارە، تاف، تەندورە، هەرژ، مەڕژ، دەنگی زۆر زل و بەقەو. "**غرّش ابر**": خورمین، گوڕژاندن، گرماندنی هەور. "**غرش خشم آلود**": شیپۆران، گوڕە و هەرای بەتووڕەیی. "**غرش شدید**": شریخاندن، گرماندن. "**غرّش پیاپی**": شریخەشریخ، گوڕەگوڕ، گرمەی بە شوێن یەکا.
**غُرشدگی:** بڕوانە: "فرورفتگی".

**غرض:** 1) تامەزرۆبوون، تاسەکردن. 2) ئامانج، مەبەست. 3) مەبەست و نیازی ناڕەوا. 3) کینە، ڕك، غەرەز. "**غرض آلود**": غەرەزاوی، ڕقاوی. "**غرض داشتن**": مەبەست هەبوون، بوونی نیازێ بە قازانجی خۆ و بە زیانی دیتر، هەبوونی دوژمنایەتی و دژایەتی. "**غرض رانی/ غرض ورزی**": بە غەرەزەوە کارکردن، ڕق و کینە بەکاربردن. "**غرض و مرض**": دوژمنایەتی، ڕق، ڕك.
**غرغرکردن:** بۆڵەبۆڵکردن، پرتەپرتکردن.
**غرغره:** قورگ، گەروو، هێنان و بردنی ئاو لە قورگ دا. "**جان به غرغره رسیدن**": وەزاڵەهاتن، وەئامان هاتن.
**غرفه:** ژوور، هۆدە، ستاند.
**غرق:** 1) نوقم، قووم، نغرۆ، چوونەژێر ئاو بە جۆرێك حاڵەتی خەفەبوون پەیاکا. 2) بەتەواوی لە ژێرکاریگەری یان گرفتار. "**غرق بوسەکردن(ساختن) کسی(چیزی)**": زۆر ماچکردنی ئەو، تێر ماچکردن. "**غرق (در) چیزی(کاری) شدن**": 1) بەتەواوی سەرقاڵ بوون بەوەوە. 2) بەتەواوی کەوتنە ژێرکاریگەری ئەو یان گیرۆدەی ئەو بوون. "**غرق شدن**": نوقم بوون، قووم بوون، نووقان، نغرۆبوون. "**غرق عرق**": 1) شەرمەزار، تەریق. "**غرق کردن**": نوقم کردن، نغرۆکردن. 2) سەرقاڵ کردن بە کارێکەوە. 3) بەتەواوی خستنەژێر کاریگەری یان گیرۆدەکردن. 4) تێخستن لە کاتی جووت بوون دا.

**غرقاب:** 1) گێژاو، گەرداو. 2) شوێنی قووڵی دەریا و شتی وا. 3) مۆلەکە، تالوکە. 4) بەتەواوی خەریك و گرفتار. 5) نوقم بوو، نغرۆبوو.

**غرقابە:** بڕوانە: "غرقاب(1،2)".

**غرقگاه:** شوێنی نوقم بوون.

**غرقە:** خەڵتان، گەوزان، تێوەچوون، نوگوم، نگوم، نوقم بوو. "**غرقە بە (در) خون**": خەڵتانی خوێن، خوێناوی. "**غرقەشدن**": چوونە ناو ئاو و نقووم بوون.

**غرقەگاه:** جێگەی نقووم بوون.

**غرمان:** (غَ) تووڕە، قەڵس.

**غرمبیدن:** بڕوانە: "غرنبیدن".

**غرنب:** گرم، گرمە، هاڕە، هرم، نارەتە، قرمژن.

**غرنبان:** گرمەکەر، هاڕەکەر، لە حاڵی گرماندن دا.

**غرنبش:** دەنگی گەورە و ترسێنەر.

**غرنبیدن:** 1) بۆڵاندن، بۆڵەکردن. 2) گرماندن، گرمانن، گرمین، گرمەکردن، گورماندن، هاڕاندن، هوڕمین، هرمین.

**غرندە:** گرمێن، گرمەکەر.

**غرنگ:** دەنگی گریان و ناڵان، دەنگیٚ کە کاتی گریان لە گەروودا پێچ دەخوا.

**غروب:** 1) خۆراوا، هۆراوا، ڕۆژاڤا، خۆرنشین، وێرەگا، دەمی ڕۆژاوابوون، تەنگی نوێژی شێوان. 2) کۆتایی شتیٚ یان کارێك. "**غروب شدن**": گەیشتنی کاتی ڕۆچوونی خۆر لە ئاسۆ. "**غروب کردن آفتاب**": ڕۆژپەڕین، خوەرنیشتن، نەدیوبوونی زەردەپەڕ، خۆراوابوون. "**هنگام غروب**": بڕوانە: "غروبگاه".

**غروبگاه:** ڕۆژپەڕ، ئێواریٚ درەنگ، دەمی ڕۆژاوا، دەمی زەردەپەڕ.

**غرور:** 1) دەسخەڕۆیی، خەڵەتان. 2) باییبوون، لووت بەرزی، بەدەماری. 3) هەست بە سەربەرزی و شادی کردن بەهۆی سەرکەوتن یان بوونی ڕێز و حورمەت لای دیتران. 4) مەکر و فریو. "**غرور کسی را شکستن**": سووك کردنی ئەو لای خەڵکانی دی.

**غرورآمیز:** تێکەڵ بە فیز و لووت بەرزی، لووت بەرزانە.

**غرورجوانی:** 1) بەخۆنازینی لاوێتی، خۆپەسندی لاوان، دەعیەی لاوان. 2) جۆریٚ نەخۆشی پێستی کە لە دەورانی پێگەیشتن دا سەرهەڵدەدا و بە شکڵی زیبکە لە دەموچاو دەردەکەویٚ.

**غرّە:** (غِ رَ) 1) فریودان، لەخۆڕا هیوادارکردنی کەسێك. 2) بیٚ ئاگایی، بیٚ خەبەری. 3) کۆمەڵی بیٚ ئەزموون و ناخافڵ. "**غرّە شدن**": فریودران، فریوخواردن.

**غرولند:** بۆڵەبۆڵ، پڕمە، بڵمەبڵم، برمەبرم، بڕمە، پرتەپرت، ورتە، پرتەوبۆڵە، لووتەلووت، لووت و پووت، بۆڵەی زۆر، خوتەخوت، وتوت، ڕینگە، ڕینگەڕینگ، ڕیوەڕیو، کورکان، کورکە، کوفەنی، گمایش.





**غرولندکردن:** خوتەکردن، بۆڵاندن، بۆڵەبۆڵ کردن، پرتاندن، ورتەورت کردن.

**غرولندکن:** جووکن، خوتن، بەبۆڵەوپرتە، بەبۆڵەبۆڵ، پرتەکەر، نووزەنووزکەر، گازندۆك، دەم بە گلەیی.

**غریب:** 1) دوورکەوتوو لە زێدی خۆ، ئاوارە لە وڵات، بێگانە، غەریب. 2) سەیر، سەمەرە. 3) زۆر باش. 4) کەم وێنە و تاقانە. "**غریب آمدن**": سەیروسەمەرە وەبەرچاوهاتن.

**غریب آشنا:** غەریبلاوێن، غەریب (ە) خۆشەویست.

**غریب المرمی:** دوور لە زەین.

**غریبانە:** وەك غەریبان، غەریبانە.

**غریب پرست:** غەریبە خۆشەویست، ئەوەی خەڵکانی غەوارەی خۆش دەویٚ و چاکە لە هەقیان دادەکا.

**غریب پرور:** غەریبە لاوێن، کەسێك کە بە خەڵکی غەوارە و نەدار ڕادەگا.

**غریب حسن:** کەسێك کە جوانییەکی سەیر و سەمەرەی هەیە.

**غریب دشمن:** دوژمنی غەوارە، پێچەوانەی غەریب خۆشەویست.

**غریب دوست:** غەریبە خۆشەویست، غەریب لاوێن.

**غریبستان:** 1) شوێنی غەریبان. 2) گۆڕستان.

**غریب قامت:** کەسیٚ کە قەڵافەتی جوان و سەرسوڕهێنەری هەیە.

**غریب کش:** غەریب کوژ، ئەوەی غەریبەکان ئازار دەدا.

**غریب گور:** گۆڕغەریب.

**غریب مرگ شدن:** لە غەریبایەتیدا مردن، دوور لە شار و زێدی خۆ مردن.

**غریب نواز:** غەریب لاوێن(ەوە)، غەریب پەروەر.

**غریب وار:** غەریب ئاسا، وەك غەریبان.

**غریبە:** 1) نامۆ، بێگانە و نەناسراو، غەریبە، غەوارە. 2) سەیر، سەمەرە.

**غریبی:** دۆخ و حاڵەتی غەریب، غەریب بوون، غەریبێتی. "**غریبی رفتن**": سەفەرکردن و دوورکەوتنەوە لە نیشتمان. "**غریبی کردن**": هەستی نامۆیی و نائاشنایی کردن.

**غریدن:** نەڕاندن، گوڕران، گوڕراندن، گومین، گرماندن، گرمین، خوڕین، کاڵیان، داکاڵیان، شیڕاندن، مەڕژین، خرۆشان.

**غریر:** لاوی بیٚ ئەزموون، خۆبەزۆرزان، لەخۆدەرچوو.

**غریزە:** وارسکە، خدوو، ڕەمەك، خۆڕسك، سرشت. بەهرەی زکماکی بوونەوەران بۆ چۆنیەتی ژیان کە بەهیچ جۆریٚ پێویستی بە فێربوون نیە وەك هێلانە سازکردنی باڵندەکان. هەستێکی ناڕوون کە جۆریٚ زانیاری بە کەسەکە دەدا.

**غریزی:** 1) لەسەر بنەمای "غریزە"، ڕەمەکی، خدوویی. 2) زکماکی. 3) سروشتی.

**غریق:** نوقوم بوو. "**غریق رحمت کردن**": لێبوردن، لێخۆشبوون.

**غریو:** 1) نەڕە، شیڕە، قریو، قریپ، هەراوهاوار، دەنگی بەرزی بەتووڕەیی. 2) گریان و نالاَن و پاڕانەوە. "**غریو آمدن**": بەرزبوونەوەی دەنگی بلّیند یان ترسناك.

**غریوان:** خرۆشان، لە حالّی هەراوهاوارکردندا.

**غریویدن:** 1) قریواندن، هەراوهاوارکردن، گوڕاندن، نەڕاندن. 2) بەرزبوونەوەی دەنگ لە ئامێرە مۆسیقاییەکان. 3) گریان.

**غزا:** 1) خەزا، شەڕی ئایینی، شەڕ دەگەلّ دوژمنانی ئایین. 2) شەڕ لەڕێگەی خوادا.

**غزال:** 1) ئاسك، مامز، غەزالّ. 2) بریتی لە گراوی و ژن یان کچی جوان.

**غزل:** (غَ) 1) ڕستن، ڕێسان. 2) تالّ، دەزوو، ڕشتە.

**غزل:** (غَ زَ) غەزەلّ، شێعری ئاشقانە. "**غزل خداحافظی را خواندن**": جێهێشتنی کاریٚ یان کەسانیٚ. مردن. "**غزل خوان**": غەزەلّ بێژ. لەحالّی غەزەلّ خوێندنەوەدا. ژەنیار یان ستران بێژ. "**غزل سرا**": غەزەلّ بێژ، ئەوەی غەزەلّ بهۆنێتەوە.

**غزو:** 1) شەڕی ئایینی، شەڕ کردن لە ڕێگەی خوا دا. 2) هێرش و پەلاماردان لە سەرزەوینی دوژمن دا، بەسەردادان.

**غزوات:** 1) "غزوە"کان. 2) شەڕە ئایینییەکان.

**غزوه:** شەڕیٚ کە موسولّمانەکان دەگەلّ کافرەکان دەیانکرد و خودی پێغەمبەر تێیدا بەشدار بووە.

**غژنده:** بڕوانە:"خزندە".

**غژیدن:** چوار دەست و پیٚ ڕۆیشتن یان خزیان، خشان، خشیان، بەسینەخشکیٚ ڕۆیشتن، خۆبەسەر زەویدا کێشان.

**غسل:** (غُ) شۆردن، شتن.

**غشّ:** (غَ) 1) فێلّکردن، گزیکردن، قۆپیە. 2) خیانەت. 3) کەمایەسی، خەش. "**غش کردن**": خیانەت کردن.

**غش:** (غَ) شۆبە، بووردنەوە، لەهۆش چوون. "**غش کردن**": بوورانەوە، دارانەوە، (دلّ) لەخۆچوون، دلّچوون، لەسەرخۆ چوون، پیران بردنەوە، کەوشین، بێهۆش بوون. "**غش کردن از شادی**": شاگەشکەبوون، بوورانەوە لە خۆشیان.

**غشاء:** 1) ناوپەنچك، کاژی، لۆخ، پەردەی ناوسکی دەوری ناوزگ. 2) بڕوانە: "پوشش".

**غشاك:** بۆنی ناخۆش، بۆگەنیو.

**غشم:** زولّم کردن، ستەم کردن.

**غشوم:** زالّم، ستەمکار.

**غشەرشه:** خەلّکانی نزم و کەمتەرخەم.

**غشی:** بێهۆش بوون، لەخۆچوون، بوورانەوە.





**غصب** : (داگیر)کردن، (زەوت) کردن، بەزۆرسەندن، ساندنی بەزۆر، دەست بەسەراگرتن، ستاندن، قەچماندن، قتووت، چوپ، واگیر، ستەم.

**غصبی:** زەوتی، مالّی داگیرکراو، ئەوەی بە زۆری دەستی بەسەراگیراوە.

**غصّه:** 1) خەفەت، خەم. 2) ئەوەی کاتی خواردن لە گەروو دا گیر بکا. "**غصه خور**": ئەوەی بۆ هەر کێشە و گرفتارییەك خەفەت دەخوا. "**غصّه خوردن**": خەفەت خواردن، تووشی خەم و کەسەر بوون. "**غصّه دادن**": خەمبارکردن، خەفەتبارکردن. "**غصّەدار**": خەمناك، خەمبار. "**غصّەکاه**": کەمکەرەوەی خەم و کەسەر. "**غصّەگسار**": خەمبار، ئاخدار، پەژارەدار، خەمخوار، خەمگین. "**غصەناك**": خەمناك، خەمبار.

**غضب:** تووڕەیی، قەلّسی.

**غضب آلود:** تووڕە، ڕق هەستاو.

**غضب انگیز:** تووڕەکەر، قەلّس کەر.

**غضب کردن:** تووڕەبوون.

**غضبناك:** تووڕە، ڕق هەستاو، قەلّس.

**غضبی:** ژنی تووڕە.

**غضروف:** کڕکڕە، کڕوچەنە، کڕکڕاگە، کڕکڕانە، کرکرۆکە، کرکرتۆکە، کڕکڕك، کڕکڕگ، کرتك، کرتە، کرۆژنە، کرۆژە، کرۆژەلّە، کورکورۆژە، کەرکەریك، خرتە، خرمووتە، خرمووتك، خرمووچك، ڕەقێنە، ئێسکی ناسکی کرۆشتەنی.

**غضنفر:** 1) شێر. 2) پیاوی زل و بەدخولّق.

**غطریس:** خۆبین، لووت بەرز، ڕۆح زل.

**غفران:** (غُ) چاوپۆشی کردن لە تاوان(گوناح)ی کەسێك، لێبووردن، لێخۆشبوون.

**غفلت:** 1) خافلّ بوون، خافلاّن، سەوخان، گویٚ نەدان بەئەرك، لەبیرچوون. 2) بیٚ ئاگایی، بیٚ خەبەری، فەرامۆشکاری. 3) نەزانی. "**غفلت کردن از کسی( چیزی )**": کەمتەرخەمی سەبارەت بەو، بەهێند نەگرتنی ئەو. "**به غفلت**": یەکجاەکی و کتوپڕ، لەنخافلّ.

**غفلتاً:** بڕوانە:"بەغفلت".

**غفور:** گوناە بەخش، گوناە داپۆش، لێبوردە.

**غفول:** بڕوانە:"فراموش کردن".

**غفیر:** 1) لێخۆشبوون لە گوناحی کەسێك. 2) زۆر، فراوان.

**غلّ:** ڕق، دوژمنایەتی. "**غلّ و غش**": 1) ڕك، دوژمنایەتی. 2) فێلّ و ناڕاستی. 3) تێکەلّ کردنی شتێکی کەم نرخ یان بیٚ نرخ دەگەلّ شتێکی بەنرخ.

**غلاء:** گرانی، بەرزبوونەوەی نرخ. "**غلاء و قحط**": وشکەسالّی و گرانی بژیوی ژیان.

**غلاب:** (غِ) زالّبوون بەسەر کەسێك.

**غلات:** کۆی"غلّە". "**غلات اربعه**": بریتی لە گەنم.جۆ.خورما. کشمیش.

**غلاف:** کالان، قلّێف، بەرگ. "**غلاف کردن**": خستنە کالان.

**غـلام:** 1) كـوڕ، كـوڕێ كـه تـازه سمێڵـی دەرهـاتبێ. 2) خـولام، خـولام، نۆكـەر، خزمەتكار، بەنی، هژمە، هەشمەت.

**غلامانە:** شاگردانە.

**غلامبـــــارە:** منالبـــاز، هــــەتيوباز، لووسكەباز، كوڕگێ.

**غلامە:** ژنی خزمەتكار.

**غلامی:** خولامـەتی، خولامـەتی، نۆكـەری، خزمەتكاری.

**غلبە:** 1) زاڵبوون، سـەركەوتن، بردنـەوە. 2) گروپێكی زۆر لە خەڵكی كە لە شوێنێك دا كـۆوەبـن. 3) ئـاپۆڕەی حەشـيمەت. 4) دەنگـی بـەرز، هـەرا. "**غلبــە خــون**": بــروانــە: "فـشـارخون". "**غلبەداشتن**": 1) زاڵبوون. 2) زیاتربوون.

**غلت:** تل، خلار، خلۆر، خەول، خولۆپ، گل، گلار، گلۆر، گەوز، گندر، وتـووز، ئوتـوس، بزووتن لەسەر لا، بەڕاكشاوی ئەم دیو و ئەو دیــو كــردن. "**غلــت خــوردن/زدن**": بروانــە: "غلتیدن". "**غلت دادن**": بروانە: "غلتاندن".

**غلتان:** 1) خل، خولۆر، خلۆر، گلار، گلێر، گلۆر، گولۆر، وتووز. 2) هەرشتێكی خڕ و گرۆڤەر.

**غلتانـــــدن:** خولۆپانـــدن، خولۆپـــانن، خەولانـدن، خلكردنـەوە، خلۆركردنـەوە، تلۆركردنـەوە، تـل دان، تلاوتـل پێـدان، ڤرڤراندن، دۆلكرن، گلاندن، گلاركردنەوە، گلـــديكرن، گلێركردنـــەوە، گەوزانـــدن، گندرانـدن، گوندڕانـدن، پلاّنـدن، پلاّنـن، ڤەزەلاندن، وتووزكردنەوە.

**غلتاننــــدە:** تلـێن، تـل پێـدەر، گلـێن، خلۆركەرەوە.

**غلتانیدە:** تل دراو، خلۆرەوەكراو.

**غلتیدن:** 1) گـلان، گلیـان، گلاربوونـەوە، گل بوونەوە، گلۆربوونـەوە، گـل خـواردن، گلێربوونەوە، گلێرەوبوون، گلۆل بوونەوە، گنـدرایش، تـلان، تلانـەوە، تلبوونـەوە، تلۆربوونـەوە، تـل خـواردن، تلتـای، خـل بوونەوە، خلـەوبوون، خلیـان، خلیانـەوە، خلۆربوونـەوە، خۆتلاندنـەوە، خولۆپـان، خولۆپیـــان، خولۆپیانـــەوە، خـــەولان، خرتـەگل، جالـەبوون، پـلان، وتووزبـوون، وەرتـانـــدن، وەگـــێـــرەیایش، گنـدرایش. 2) بڕوانە:"غوطـەخوردن".

**غلتیـدە:** تـل بـردو، تلیـاگ، تـل خـواردو، ڕەت بردە.

**غل خـوردن:** (غِ) تلیانـەوە، گـل خـواردن، خولانەوە.

**غل زدن:** (غُ) كوڵین، كوڵان، كوڵخواردن.

**غلـط:** خـەتا، هەڵـە، چـەوت. نادروسـت. "**بەغلط**": لە ڕووی هەڵە و خەتاوە.

**غلط انداز:** 1) وەسـەر هەڵەخـەر، ئـەوەی كـەسـێك بخاتە هەڵەوە یـان فریـوی بـدا. 2) لە ڕووی هەڵە و خەتاوە. 3) لـە حـاڵی وەهەڵە خستنی كەسێك دا.

**غلط بین:** ئەوەی لە بینین دا چـاوی خـەتا بكا.





**غلـــط خوانـــدن:** چـــەوت خوێندنـــەوە، خوێندنەوەی هەڵە.

**غلط كار:** خەتاكار، هەڵەكەر.

**غلط كردن:** هەڵەكردن، خەتاكردن.

**غلط گرفتن:** هەڵەگرتن، دۆزینەوەی هەڵە و خەتای كەسێك.

**غلــط گــیر:** ڕاسـت كـەرەوە، هەڵەچـن، هەڵەبڕ، هەڵەی نووسراو لابەر. "**غلط گیری**": هەڵەچنی، هەڵەبڕی.

**غلطنامە:** خشتەی هەڵە، هەڵەنامە.

**غلطی:** بەهەڵە.

**غلظت:** 1) خەستی، خەسـی، تـیری، دژی تراوی، بەرانبەری شلی. 2) زۆری، توندی. 3) توندوتیژی، سەختگیری. "**غلظت خون**": چوونەســـــەری ڕێـــــژەی سروشـــــتی هێمۆگلۆبینی خوێن.

**غلغل:** (غُ.غُ) هەراوهوریا و دەنگـی تێكـەڵ پێكەڵ. قولتـە، قولتـەقولت، قولپـەقولپ، دەنگی كوڵینی ئاو یان هەر تراوێكیتر.

**غلغـل زدن:** (غُ.غُ) قولـت دان، قولتـەقولت كردن، قولپەقولپ كردن، كوڵدان.

**غلغلستان:** شـوێنێ كـە دەنـگ و هـەرا و هوریای زۆری لێبێ.

**غلغلـــك:** ختكـــە، ختكـــی، ختووكـــە، ختوولكـــە، ختیلكـــە، ختـــێ، خـــدووك، خدووكـە، خدیكـە، قدیلكـە، قانەقـدی. "**غلغلــك دادن**": ختووكـەدان، ختیلكـەدان، قدیلكەدان.

**غلغلــە:** 1) هەلاوهەنگامـە، هـەراوهوریاو دەنگــی تێكــەڵ پێكــەڵ. 2) ئــاپۆڕەی جـەماوەر و هـەراوهوریا. "**غلغلــە افتــادن**": هەلاوهەنگامە و ئاژاوە سازبوون.

**غلفتی:** 1) پێستی مەڕ یان هەر ئـاژەڵێكی تـر كـە بـە شـێوەی یەكپارچـە دایمـاڵن، گـوران، گـوروون، گـروون، لەپێـست دەرهاتن. 2) بەتـەواومانا. 3) جـەموجۆر، خنج و منج.

**غلندر:** بڕوانە: "قلندر".

**غلو:** 1) لەڕادە دەرچوون، سنووربەزاندن. 2) پێوەنان، پێوەزیادكردن، زێدەڕۆیی.

**غلوآمیز:** ناواقیع، نامەیسەر، دوور.

**غلـوط:** قسەی هەڵە، قسە یان مەسەلەیەك كە كەسێكی پێ سەر هەڵە بخەن.

**غلــە:** (غُ لَ) تـوونیـــەتی زۆر. دەغیلـــە، دەخلدان.

**غلــە:** (غَ لَ) خەلـە، دانەوێلـە، دەخـڵ، دەغڵ.

**غلەكاشتن:** خەلەچاندن، دەغڵ كردن.

**غلی:** كوڵان، كوڵیان.

**غـلـیـان:** 1) جۆشـــان، كـوڵان، كـوڵین. 2) وەجۆش و خرۆش كەوتن، وەگـوڕوتین كەوتن، هەڵچوونی سۆز و هەستەكان. "**بـە غلیان آمدن**": كوڵان، وەكوڵ هاتن، جۆشان.

**غلیز:** لیك، لیق، لیكاو، لیقـاو ئـاوی دەم.

**غلیزبند:** بەرلیك، بەرجل، بەروانكە.

**غلیژن:** قوڕولیتە، قوڕوچڵپاو.

**غليظ:** 1) تیر، خەس، خەست، خەستاو، هەس، کەسکوون، کسکوون، کۆلکن، توند، دژی تراو. 2) تووڕە، بەدخولق. 3) ئەستوور و پتەو. "**غليظ كردن**": 1) خەست کردنەوە. 2) زیدەڕۆیی یان پێوەنان. "**غليظ و پرمايه**": خەست و خۆڵ، هەس و هۆڵ، خەست و بەچێژ. "**غليظ القلب**": دڵڕەق، بێبەزەیی.

**غليل:** زۆر تینوو.

**غـم:** خەفەت، پەژارە، کەسەر، کول، خەم، غەم، مەینەت، جغار، ڕاخ، شاییش. "**غم بسيار**": خەمان، کولّ و کەسەری زۆر. "**غـم كسى(چـيزى) را خـوردن**": خەمی ئەو خواردن. نیگەرانی کێشە و گرفتارییەکانی ئەو بوون. چاوەدێر و پشتیوانی ئەو بوون. "**غـم و انـدوه**": خەم و کەسەر، پەرۆش، داخی دڵ. "**غـم و هـم**": خەم و خەفەت.

**غـم آبـاد:** 1) خەمخانە، جێگەی کولّ و کەسەر. 2) دنیا.

**غـم آشـام:** خەم خۆر، ئەوەی خەم و خەفەتان دەخوا.

**غم آشيان:** 1) هێلانەی خەم، خەمخانە. 2) بریتی لە دنیا.

**غم آلود:** 1) خەماوی، پیشاندەری خەم. 2) خەمبار و ناڕەحەت.

**غم آهنج:** خەمڕەوێن.

**غمّاز:** 1) بڕوانە:"نمّام". 2) خەمزەکەر، بەچاوهێماکەر. 3) ئاشکراکەری ڕاز. "**غمّازى**": دووزمانی، شوفاری و شەیتانی، قسەهەڵچنین.

**غمـان:** 1) کۆی "غـم"، خەمەکان، کەسەرەکان. 2) خەمبار، خەفەتبار.

**غم انگيز:** خەم هێنەر، خەفەت هێن.

**غم بار:** خەم هێنەر، کەسەرهێن.

**غـم پـرداز:** خەمڕەوێن، خەم لابەر، دوورخەرەوەی خەفەت.

**غم پرست:** خەمخۆر، کەسێك کە خەمی شتێ یان کەسێك دەخوا.

**غم پرور:** ئەوەی بەردەوام خەم و خەفەت دایگرتبێ.

**غم جانگداز:** بشۆرە، خەمی زۆرگران.

**غمخانه:** 1) خەمخانە، شوێنێ کە خەم و خەفەتی زۆری تێدابێ. 2) بریتی لە دنیا. 3) ماڵێ کە لەودا تازیە گیرابێ.

**غمخـوار/غمخـواره:** 1) جگەرسۆز، هەڤسۆز، خەمخۆر، خەمخوار، غەمخۆر، دەردەهەر، سەرپەرشتی دڵسۆز. 2) خەمبار، خەمناك.

**غمخوارگى:** خەمخۆری، سەرپەرشتیکردنی دڵسۆزانە.

**غـم خـوردن:** خەم خواردن، خەفەت خواردن.

**غـم خيـز:** مەکۆی خەمان، شوێنێ یان شتێ کە خەم و خەفەتی لێ هەستێ.

**غمدار:** خەمبار، خەمناك.





**غمدان:** جێگەی خەم.

**غـم ديـده:** ماتەمین، تازیەبار، ئاخدار، خەمبار.

**غمر:** نەزان و بێئاوەز و بێئەزموون.

**غمـز:** 1) چاوداگرتن، بەچاو و برۆ هێماکردن، چاوقرتانن، قەرپاندن، ڤەهلدان.2) دووزمانی، شوفاری، قسەبردن. "**غمزكاره**": شۆفار، تێچێن، شەیتانیکەر، دووزبان. "**غمزكـردن**": دووزمانی کردن، قسەهێنان و بردن.

**غمـزدا:** خەمڕەوێن، وەروێرکە، خەفەت سڕێن(بەر)، ئاودەنگی.

**غمزده:** 1) خەمبار، خەمۆك، ناڕەحەت. 2) خەمهێن. 3) ماتەمی، تازیەتبار، پەژارەدار.

**غمزگان:** کۆی"غمزه".

**غمزه:** خەمزە، غەمزە، چاوداگرتنی بەناز، جارێك هێما بەچاو یان برۆ. "**غمزه آمدن**": جووڵاندنی چاو و برۆ یان لێو بۆ ورووژاندنی بەرامبەر بەتایبەتی لە لای ژنانەوە. "**غمزه‌زن**": خەمزەکەر، چاوداگر بەناز و خەمزەوە. "**غمزه كردن**": 1) بڕوانە: "غمزەآمدن". 2) ئاماژەکردن.

**غمستان:** جێیەك کە خەم و خەفەتی زۆری لێبێ، خەمخانە.

**غم سوز:** خەفەت (لا)بەر، کەمکەرەوەی خەم و کەسەر، لەناوبەری خەم و خەفەت.

**غمض:** 1) چاوپۆشی لێکردن.2) ئاسان گرتن لە مامەڵەدا. "**غمض عين**": چاوپۆشی کردن لە هەڵەی کەسێك، چاوڵێ نووقاندن.

**غم فزا:** زۆرکەری خەم و کەسەر.

**غمكاه:** کەمکەرەوەی خەم.

**غـمكـده:** 1) خەمخانە، مەکۆی خەمان. 2) بریتی لە دنیا.

**غمكش:** خەمبار، دەستەوئەژنۆ.

**غم كشيدن(بردن):** بڕوانە:"غم خوردن".

**غمگداز:** بڕوانە:"غمزدا".

**غمگسار:** 1) هاودەم و خەمخۆر، هەواڵی خۆشی و ناخۆشی. 2) خەمڕەوێن، خەفەتبەر.

**غـم گسل:** خەم ڕەوێن، خەفەت بەر، کەسەر سڕێن.

**غمگن:** سووکەڵەی"غمگین".

**غمگـين:** سەرکز، خەمبار، خەفەتبار، خەمین، مەینەتبار، لێوبەبار، ئاخدار، پەژار، پەژارەدار، خەمخۆر، خەمخوار، خەمگین، خەمین، غەمخۆر، دڵتەنگ، دل کول، دڵ برین، دڵ بریندار.

**غمم:** کۆی"غمە".

**غمناك:** خەمناك، خەمبار، مات، دەست بەئەژنۆ، دەستەوئەژنۆ. خەمهێن.

**غمنامه:** خەمنامە، نامەی خەمهێن.

**غمند:** خەمناك، خەمبار.

**غـم نـشان:** سوکنایی دەری خەم و خەفەت، دامرکێنەری خەم و پەژارە.

**غمـوس:** (غُ مُ) ونبوون، بزربوون، ئاوابوونی ئەستێرە.

**غموض:** (غُ مُ) 1) شاراوەیی، ناڕوونی، لێڵی. 2) دژواری و سەختی.

**غموم:** کۆی"غم".

**غمّە:** 1) داپۆشەر، ئەوەی شتێ داپۆشێ. 2) خەفەت، داخ، کەسەر. 3) سەرسامی و گومان.

**غمی:** (غَ) بێهۆش بوون، بێهۆشی.

**غمیس:** تاریکی، تاریکەشەو.

**غمین:** بڕوانە:"غمگین".

**غناء:** (غَ) دەوڵەمەندبوون، سامانداربوون، بێ نیازبوون.

**غناء:** (غِ) گۆرانی خۆش، سروود.

**غنائم:** کۆی"غنیمت".

**غنائی:** تایبەتمەندی بەرهەمێکی ئەدەبی کە دەربڕی سۆز و هەستەکان بێ وەك غەزەلی ئاشقانە.

**غناساز:** گۆرانی بێژ، ژەنیار، ئاهەنگساز.

**غناگر:** ستران بێژ، ژەنیار، ئاوازەخوێن.

**غنّام:** 1) ئەوەی مەڕی زۆری هەیە، مەڕدار، شوان. 2) کەسێ کە تالانی زۆر وەدەست بخا.

**غنپز:** (غُ.پُ) شات و شووت، هاشوهووش، هارت و هورت. "**غنپززدن**": خۆهەڵکێشان و هاشوهووش کردن.

**غنج:** (غَ) ناز و عیشوەکردن.

**غنج زدن:** زۆر تامەزرۆبوون.

**غنچە:** بشکۆش، بشکۆژ، پشکۆژ، سۆلینە، خونچە، گوڵی هێشتا نەپشکوتوو.

**غنچە پیشانی:** بریتی لە نمرچ، خوێن تاڵ، ناوچاوان گرژ.

**غنچەخسپ:** کەسێ کە لە سەرما دا بەخاتری نەبوونی پێخەف دەست و پێی خۆی کۆکاتەوە و بخەوێ، خۆگرمۆڵەکردن لە خەودا.

**غنچەدل:** دڵتەنگ، خەمبار، دڵپڕ، خەمناك.

**غنچەدهان:** دەم/زار خونچە، دەمکوڵ، بریتی لە گراوی جوان کە لێوی وەك خونچە وابێ.

**غنو:** خەو، خەف.

**غنودگی:** خەواڵوویی، چاو بەخەوی.

**غنودن:** 1) خەوتن، خەفتن، نووستن، نڤستن. 2) بە ئاسوودەیی ژیان. 3) مردن و ئاسوودەبوون.

**غنوند:** وادە، پەیمان، بەڵێن.

**غنویدن:** بڕوانە:"غنودن".

**غنی:** 1) دارا، دەوڵەمەند، ساماندار. 2) بێ نیاز، تێروتەسەل.

**غنیّت:** دەوڵەمەندی، بێنیازی.

**غنی سازی:** پیتاندن، هەوێن کردن، مەهاندن.

**غنی شده:** پیتێنراو، هەوێن کراو، پوختەکراو.

**غنیم:** دوژمن.





**غنیمت:** تالانی، دەسکەوتێ کە بەبێ ڕەنج و زەحمەت وەدەست بێ، ئەوەی لە شەڕدا بە زۆر لە دوژمن بگیرێ. "**غنیمت شمردن**": بەهەل زانین، بەدەرفەت زانین، کەڵك وەرگرتن لە دەرفەتی لەبار.

**غوائل:** کۆی"غائله".

**غوات:** کۆی"غاوی".

**غوادر:** ژنانی بێئەمەگ و پەیمان شکێن.

**غوّاص:** نوق ڤان، مەلەوانی بن گۆم.

**غوامض:** کۆی"غامض".

**غوایت:** گومڕابوون، بەلاڕێداچوون.

**غور:** 1) قووڵبوونەوە، بە وردی ڕۆچوونە شتێك، تێفکرین و تێڕامان یان لێکۆڵینەوە و موتالا هەبوون سەبارەت بەشتێ یان کارێ. 2) چالایی، قووڵایی. 3) زەوی نزم. 4) بن، بنج و بناوان. 5) سەختی، ڕەنج و زەجر. "**غورداشتن**": 1) لێکۆڵینەوە و موتالا هەبوون یان بەئاگابوون لە هەقیقەت و بنج و بناوانی شتێ. 2) بوونی دەرەنجامی ناخۆش. "**غورکردن**": 1) بڕوانە:"غور(1)". "**غوروغائله**": بناغە و ئەنجامی کارێك و ئاکامی خراپی ئەو.

**غوررسی:** تاوتوێ کردنی بنج و بناوان یان هەقیقەتی کارێ یان شتێ، موتالا و لێکۆڵینەوە.

**غورگاه:** شوێنی قووڵبوونەوە.

**غوره:** قۆرە، بەرسیلە، پەسیلە. "**غورگی**": قۆرەبوون، کاڵ و نەگەییو. "**در غورگی مویز شدن**": پیربوون لە کاتێکا بە لاوێتی نەگەیشتن، بەمراد نەگەیشتن. "**غوره‌افشاندن**": فلیقاندنەوەی قۆرە بۆ ئاولێگرتن. گریان و فرمێسك ڕشتن. "**غوره‌چلاندن**": بریتی گریان و ئەسرین ڕشتن بەشێوەی ناڕاستەقینە. "**غوره نشده مویز شدن**": بەبێئەزموون و زانیاری پێویست خوازیاری پلە و پۆستی بانتر یان باشتر بوون.

**غوش:** (غُ) 1) ئەسپی یەخترمە. 2) ڕووت، پەتی. 3) گوێ.

**غوص:** مەلەکردن و چوونە ژێرئاو، نقووم بوون. "**غوص کردن**": 1) چوونەژێرئاو. 2) تێڕامان، قووڵبوونەوە.

**غوط:** چوونەناوەوە، چوونەژێرئاو.

**غوطه:** 1) قوڵت، قوڵتە، بڵقی چوونەژێرئاو. 2) بڕوانە:"گرداب". "**غوطه‌باز**": بڕوانە:"غواص". "**غوطه‌خوردن**": قوڵتان، وەژێرئاوکەوتن، چوونەژێرئاو، سەرخستنە ژێر ئاو، قووم بوون، نقووم بوون. "**غوطه‌ور**": قورت، قوم، نقم بوو، تەپاو لەشتی تراو و ئاودا. "**غوطه‌ور در آب**": بینەکێش، قوڵتەخۆرە. "**غوطه‌ورشدن**": قوڵتیان، چوونەژێر ئاو، سەربردنە ژێر ئاو. "**غوطه‌ورکردن**": نۆقاندن، دەبن ئاوڕاکردن، خستنە ژێرئاوەوە، وەژێر ئاو خستن، قوم کردن.

**غوغا:** 1) قواقو، زەنازەنا، قرەقرِ، هەراوهوریا و دەنگەدەنگ، قەرەباڵغی و ئاپۆرِە، دەنگی تێکەڵ پێکەڵ کە کاتی شەرِ یان قەرەپەستانی خەڵك دەبیسترێ. 2) فیتنە، ئاژاوە. 3) خەڵکانی شەرِاشۆ و ئاژاوەخواز. "**غوغا انگیختن**": فیتنە و ئاژاوەنانەوە. "**غوغا برآوردن**": هەراوهوریا و دەنگەدەنگ کردن. "**غوغابرخاستن**": دەنگ و هەرا سازبوون. فیتنە و ئاژاوە بەرپابوون. "**غوغایی**": برِوانە: "فتنەانگیز".

**غوغاسالاری:** دۆخێ کە لەودا کارگێرِانی تەبلیغاتی سەبارەت بە شتێ **هاتوهاواری** درۆیین سازدەکەن تا **هەقیقەتەکانی** کۆمەڵگا بشارنەوە.

**غوغاطلب:** ئاژاوەخواز، کەتن خواز، شەرِاشۆ، سەربەگۆبەند.

**غوغاکردن:** 1) دەنگ و هەراکردن. 2) فیتنە و ئاژاوەنانەوە.

**غوغاگر:** : ئاژاوەچی، ئاژاوەگێرِ، پیلانگێرِ، بشێونە، کەتن گێرِ، گۆبەندگێرِ.

**غول:** بوونەوەرێکی ترسناك وەك دێو، مێردئەزمە، دیوەزمە، غوول. "**غول آسا**": دێوەزمەئاسا، زەبەلاح ئاسا، وەك غوول، زۆرگەورە. "**غول بیابان**": پیرهەڤۆك، پیرهەڤی، **هلێن**، حۆلیبیابان، دێوەزمەیەك کە لە بیابانابێ، جنۆکەی خەڵك ترسێن، جنۆکەی خەیاڵی کە منداڵی پێ دەترسێنن. "**غول بی شاخ و دم (بیابانی)**": کەسی ناحەز و ناقۆڵا. "**غول پیکر**": مێردەزمەئاسا، گەورەو و ترسناك.

**غولدنگ:** کەسی باڵابەرز و قەڵەو.

**غول وار:** برِوانە: "غول آسا".

**غوله:** کاڵ، نەگەیو. کەم ئاوەز، گەمژە.

**غیاب:** بزربوون، نائامادەبوون، نەبوون، دیارنەبوون، دوورکەوتنەوە لە چاوان. "**در غیاب کسی**": لە نەبوونی ئەو.

**غیاباً:** بەبێ ئامادەبوونی کەسی جێی ئاماژە.

**غیابی:** دووربەدوور، لەدوورەوە، ئەوەی لە نەبوونی کەسێك دا بیلێن یان ئەنجامی بدەن وەك پاشەملە. "**حکم غیابی**": برِیارێ کە دادگا لە نائامادەبوونی کەسێك دا دەریدەکا، برِیاری پاشملە.

**غیاث:** 1) برِوانە: "فریادرس". 2) برِوانە: "دادخواهی".

**غیب:** 1) پێوار، نادیار، نەدیار، نەلەبەرچاو، خەیب، غەیب. 2) ون بوون، لەبەرچاو لاچوون. 3) نهێنی، شاراوە. "**غیب بین**": پێواربین، خەیب بین. "**غیب دان**": پێوارزان، خەیب زان. خودا. "**غیبستان**": جیهانی خەیب. "**غیب شدن**": ون بوون، لەبەر چاو بزربوون. "**غیب گفتن**": لە پێوارەوە خەبەر دان، **هەواڵدان** لە شتە نهێنییەکانەوە. "**غیب گو**": خەف زان، غەیب وێژ، زانا بە نادیاریان. "**غیب نما**": پێوارنوێن، خەیب نوێن. "**درغیب**": پەنامەکی، نەپەنی.





**غیبت:** 1) بزربوون، لەبەرچاو ونبوون، خۆون کردن. 2) پاشملە(گوتن)، پاشملە خراو گوتن، لەپشت سەرەوە خوێندن، لەدەمەودان، خوسپ، کورتوپست، گالەگورت، چەودەم. "**غیبت حسودانه**": پیاهەڵکاڵان، ئێرەیی بە کەسێك بردن و قسەی حەسوودانە کردن.

**غیبتگر:** کابگر، پاش ملەبێژ، کەسێ کە پاشملە قسان دەکا، بەدوێژ لە نەبوونی خەڵکا.

**غیبوبت:** 1) دیارنەمان، (لەبەرچاو)ونبوون. 2) ئاوابوونی خۆر.

**غیبیات:** پەنامان، نادیارییەکان.

**غیر:** 1) تر، دیکە، کەسیتر، بێگانە. 2) جیاواز، جیا. "**غیرِ**": جگە، بێجگە. "**غیر ارادی**": نائیرادی. "**غیر از**": جگەلە، بێجگەلە. "**غیر اصیل**": نارِەسەن، ناجسن. "**غیر انتفاعی**": بنیات یان رِێکخراوێ کە ئامانجی سەرەکی لە چالاکییەکانی وەدەستهێنانی سوود و قازانج نیە. "**غیربازنمایی**": نانواندنەوەیی. "**غیر پاسخگو**": وڵام نەدەر. "**غیرجلسی**": نەنێرنەمێو. "**غیر داستانی**": ناگێرِانەوەیی. "**غیررسمی**": نارِەسمی، نافەرمی. "**غیرشرعی**": ناشەرعی. نارِەوا. "**غیرشفاف**": لێڵ و نارِوون. "**غیرضروری**": ناپێویست. "**غیر طبیعی**": ناسروشتی، دەسکرد. "**غیر عادی**": نائاسایی. "**غیرعلنی**": نارِاشکاو، نائاشکرا. "**غیرقابل اعتماد**": برِواپێنەکراو، جێی بەقا نەبوون، جێی متمانە نەبوون. "**غیر قانونی**": نایاسایی. "**غیر متحرّك**": بێ جووڵە، وەستاو، رِاوەستاو، نەبزوو، چەق، سنگەپێ. "**غیر مترقبه**": چاوەرِواننەکراو، پێشبینی نەکراو. بەشێوەی کتوپرِ. "**غیرمتعهد**": بێلایەن، نادەروەست. "**غیر متفکرانه**": نابیریارانە. "**غیر مجاز**": نایاسایی، رێنەدراو. "**غیر مستقیم**": 1) نارِاستەوخۆ. 2) بەهێما و ئاماژە. "**غیرمسلّح**": 1) بێ چەك، خەڵکی ئاسایی. 2) تایبەتمەندی ئەوەی کە ئامراز یان دەزگای پێویستی بۆ کارێك نیە(چشم غیر مسلح). "**غیر مشروع**": نارِەوا. "**غیر ممکن**": ناشۆ، نەشیاو، محاڵ، ئەستەم. "**غیر مشروط**": بێ مەرج. "**غیرمقیّد**": نادەرۆست، پابەندنەبوو. "**غیرمنتظره**": چاوەرِواننەکراو، لەنکاو. "**غیر منطقی**": نالۆژیکی. "**غیرمنقول**": مردە، مردەماڵ، تایبەتمەندی شتێ کە رِاناگوێزرێ وەك ملّك و ماڵ. "**غیر موجه**": پاساوهەڵنەگر. نائاراستە. "**غیرنظامی**": خەڵکی ئاسایی، سڤیل. "**غیرنقدی**": نانەختینەیی. "**غیرواقع**": نارِاست، ناواقیع. "**غیرهستەای**": ناناوەکی.

**غیرت:** ئازایی. پیاوەتی، جوامێری. ناموس، غیرەت.

**غیرتمند:** بەغیرەت، بەناموس.

**غیرتی:** بەغیرەت، خاوەنی غیرەت و بەدەماری نیسبەت بە ناموس و بنەماڵە.

**غیریّت:** 1) (فەلسەفە) بوونی یەکێك لە دوو شت یان دوو بابەت کە پێچەوانەی یەکتربن. 2) بڕوانە:"دوگانگی".

**غیژاندن:** خزاندنی شتێ لەسەر شتێکی دی.

**غیض:** 1) کەمبوونەوەی ئاو، نیشتن. 2) دابەزینی نرخی کاڵا. 3) کەم، تۆزێك. "**غیضی**": کەسێك کە زوو هەڵدەچێ. "**غیضی از فیضی**": کەمێ لە ڕادەیەکی زۆر.

**غیظ:** تووڕەیی، ناڕەزایی. "**غیظ کردن**": تووڕەبوون، ڕق هەستان.

**غیلان:** کۆی"غول".

**غیو:** بڕوانە:"غریو".

**غیوب:** کۆی"غیب".

**غیور:** بەغیرەت، بەناموس، ناموس پارێز.

**غیه:** هەرا و دەنگی بەرز و کوتوپڕ لە شادی یان پرسەدا.

# ف

**فائت/فایت:** لەناوچوو، لەدەست چوو، لەقەڵەم کەوتو. "**فائت شدن**": لەدەست چوون، لەبەین چوون، فەوتان.

**فائح/فایح:** 1) بڵاو و ئاشکرا. 2) شتی کە بۆنی خۆش بدا.

**فائده/فایده:** 1) قازانج، بەهرە، سوود، کەراو. 2) کەڵك. 3) ئاکامی دڵخواز و بەکەڵك. 4) قسەگەلی بەنرخ. 5) شیکردنەوەی بەکەڵك. "**فائده بخشیدن**": ئاکامی دڵخواز لێکەوتنەوە، تێدابەستەبوون. "**فائده دادن**": قازانج پێگەیاندن. بەقازانج بوون، بەکەڵك بوون، دەرەنجامی دڵخواز لێکەوتنەوە. قسەی بەکەڵك وتن. "**فائده داشتن**": تێدابەستەبوون، بەکەڵك هاتن، بەقازانج بوون، بەسوودبوون، کاریگەر و بەکەڵك هاتن. "**فائده کردن**": قازانج بردن، خێرکردن، سوودکردن، بەهرەبردن. ئاکامی دڵخواز بەدەستەوەدان.

**فائده باوری:** بەرژەوەندخوازی.

**فائده گرایی:** (ئابووری) پڕەنسیپێك کە بەپێی ئەو دەبێ زۆرترین تاکەکانی کۆمەڵگا زۆرترین بەهرە لە ژیان ببەن، ڕێبازی قازانج خوازی، "یوتلیتاریانیزم".

**فائز:** سەرکەوتوو، براوە. "**فائز شدن (آمدن)**": وەدەستهێنان.

**فائض/فایض:** 1) بەخشش گەیەن، دابارێن، داوەرێن. 2) ئاوێ کە دوای لێوڕێژبوونی دەفر دەڕژێ. 3) سوودی پارە، بەهرە.

**فائق/فایق:** 1) سەرکەوتوو، بە ئاوات گەیشتوو لە کار دا، لەسەرتری، زاڵ. 2) باش، هەڵبژێراو. "**فائق آمدن**": 1) سەرکەوتن، زاڵبوون.

**فابریك:** 1) کارخانە. 2) تازە و دەکارنەکراو، فابریك، ئەسڵ.

**فابل:** هەقایەتی ئەخلاقی کورت کە پاڵەوانەکانی زۆرتر ئاژەڵن.

**فا پیش:** 1) بۆپێشەوە. 2) پێشواز. "**فا پیش رفتن**": بەرەو پێش چوون، چوونەپێش.

**فاتالیسم:** بڕوا بەوەی کە ڕووداوەکان هەموو لە پێشتردا دیاریکراون.

**فاتح:** 1) کەرەوە، واڵاکەر. 2) سەرکەوتوو، ئەوەی شوێنێك دەگرێ. "**فاتح شدن**": سەرکەوتن، بەزاندنی دوژمن.





**فاتحانه:** سەرکەوتوانە.

**فاتحه:** 1) سووڕەتی یەکەمی قورئان. 2) کۆڕی پرسە. 3) سەرەتایکار، دەسپێکیکار. "**فاتحه کسی (چیزی، کاری) را خواندن**": لەناوبردنی ئەو یان وەك لەناوچوو وێناکردن.

**فاتر:** 1) سست و بێهێز، ساردوسڕ. 2) شلەتێن. "**فاترکردن**": ناهومێدکردن.

**فاتق:** ئەنجامدەری کار و چارەسەرکەری دژواری. دەرپەڕیو، هەڵتۆقیو.

**فاتور:** لە کوڵ کەوتو، ئاوی شیلەوگەرم.

**فاتوریدن/ فاتولیدن:** دوورکەوتنەوە، چوونەلاوە، ڕەوینەوە، سڵەمینەوە.

**فاجر:** تاوانبار، گوناحبار، زیناحکار، داوێن پیس. "**فاجره**": ژنی خراپەکار، قاحبە.

**فاجعه:** کارەسات، لێقەومان، کۆست، بەڵای گەورە، جەرگبڕ.

**فاجور:** زیناحکار، گوناحکار، تاوانبار.

**فاجه:** بڕوانە: "خمیازە".

**فاحش:** لەڕادەبەدەر، زۆر ئاشکرا و ڕوون و بەرچاو بە هۆی زەقی و زۆری یان گرینگی. "**غبن فاحش**": زیانی لەڕادەبەدەر. "**غلط فاحش**": هەڵەی ئاشکرا و گرنگ.

**فاحشگی:** ڕووسپییەتی، جندەیی، قاحبەیی.

**فاحشه:** ژنی خراپەکار، خراپە، سۆزانی، ڕووسپی، قاحبە، فاشە، جندە، جونە. 2) زۆر ناحەز و ڕاشکاوانە. 3) تاوان و کردەی زۆر ناحەز. "**فاحشه پنهانی**": گوزلی، سۆزانی بە دزییەوە. "**فاحشه خانه**": جندەخانە، قاحبەخانە، کەللەچی.

**فاخر:** 1) بەنرخ، گرانبایی. 2) باش، چاك.

**فاخریدن:** دووبارە کڕینەوە.

**فاخیدن:** لێکردنەوە، لێك جیاکردنەوە، هەڵلاجیکردن.

**فادزهر:** بڕوانە: "پادزهر".

**فادوسیدن:** چەسپیان، چەسپین، لکیان.

**فاراب:** بەراو.

**فارغ:** 1) لێبۆوە لە کارێك، ئاسوودەبوو، کەسێ کە دەستی لە کارێك کێشابێتەوە و ئاسوودە بووبێ. 2) ئازاد، سەربەست. 3) بێ خەبەر، بێ ئاگا. 4) چاڤ تێر، بێ نیاز. 5) بۆش، بەتاڵ. "**فارغ آمدن**": 1) لێبوونەوە لە کارێك، لەکار خەلاس بوون. 2) خەریك نەبوون بەکارێکەوە، بێکاربوون. "**فارغ داشتن**": ئاسوودەکردن. "**فارغ ساختن**": ئاسوودەکردن، لە کۆڵ کردنەوە. "**فارغ شدن**": 1) لێبوونەوە، لەکار خەلاسبوون، ئاسوودەبوون، ڕاحەت بوون. 2) زان، بێچووهێنان، لێبوونەوە.

**فارغ البال:** ئەرخەیان، خاترجەم، دڵاسوودە. بێنیاز.

**فارغ التحصیل:** دەرچوو، کەسێ کە خوێندنی باڵای لە ڕشتەیەك دا بە کۆتایی گەیاندبێ.

**فارغ دل:** بڕوانە: "فارغ البال".

**فارغ زی:** ئەوەی بە ئاسوودەیی و ئەرخەیانی بژی.

**فارفتن:** (ر.تَ) گسك لێدانەوە.

**فارق:** 1) جیاکەرەوە، جیاکار. 2) جیاوازی نێوان دوو شت.

**فارماکولوژی:** دەواناسی، زانستێ کە لە سەرچاوە و ناوەرۆکی شیمیایی دەواکان و تایبەتمەندی ئەوان و ئاسەواریان لەسەر بوونەوەرانی زیندوو دەکۆڵێتەوە.

**فارندیدن:** ڕەندەکردنەوە، تاشینەوە.

**فاروق:** 1) جیاکەرەوەی هەق و ناهەق، جیاکار. 2) نازناوی حەزرەتی عومەر (د.خ).

**فارهه:** کچ یان ژنی گەنج و جوان.

**فاریاب:** بەراو، زەوینی ئاوی.

**فاریختن:** بڕوانە: "فروریختن".

**فاریدن:** قووت دان، قووت کردن، دابەلاندن.

**فاژ:** باوێشك، ئاژاژك، گرگەش، دەبەنك.

**فاژیدن:** باوێشك دان.

**فاساختن:** بڕوانە: "سازش کردن".

**فاسپردن:** دووبارە سپاردن، ئەسپاردنەوە، ڕادەست کردنەوە.

**فاستدن:** وەرگرتنەوە، ئەستاندنەوە.

**فاسخ:** هەڵوەشێنەر، پووچەڵکەرەوە.

**فاسد:** 1) گەندەڵ، ڕزیو، گەنیو، بۆبا، کتکی، زایە. 2) خراپ، تێکچوو. 3) بەدوور لە پێوانە ئەخلاقی و ئایینییەکان. 4) لاڕێ، لەڕێدەرچوو، گومڕا. 5) نادروست، ناهەق. "**فاسدشدن شیر**": هەڵ بڕزکان، هەڵ بڕزکین، هەڵ بڕسکان، هەڵ بزڕکان، هەڵ بزڕکین، پیسبوون. "**فاسد شدن آدامس**": هەڵ پڕووسقان، هەڵ پڕووزقان. "**فاسدشدن غذا از گرما**": شەمیخین، ترشانی چێشت لەبەر گەرما. "**فاسدکردن**": گەناندن، پیس کردن.

**فاسق:** بی دین، سۆتە، گوناحبار، دامێن پیس، داوێن پیس، زیناحکار، داوشکەستی.

**فاش:** 1) ئاشکرا، خویا. 2) ڕاشکاوانە، بەڕاشکاوی. 3) بڵاو. "**فاش شدن**": فارش، ئاشکرابوون، بڵاوبوونەوەی نهێنی. "**فاش کردن**": ئاشکراکردن، فارش کری، بڵاوکردنەوەی نهێنی.

**فاشیست:** پێڕەوی ڕێبازی فاشیزم.

**فاشیسم:** فاشیزم، دیکتاتۆری، شێوە حکوومەتی کە لە نێوان شەڕی یەکەم و دووهەمی جیهانی لە ئیتالیا زاڵبوو و بە شێوازی سەرەڕۆیی و دیکتاتۆری بەڕێوە دەچوو.

**فاصل:** 2) جیاکەرەوەی دوو شت لە یەك، بەرزەك، پەرژین، سپین، تیغە، نێوان. 2) بڕوانە: "مانع".

**فاصله:** مەودا، ماوەی بەینی دوو شت، نێوان، دووری، هەودا، دۆرینگ، دۆژ، دۆمەی، جیایی. **فاصلەدادن(گذاشتن)**: لێك دوور کردنەوە، مەودا خستنە نێوان. "**فاصلەداشتن**": مەوداهەبوون. دووربوون. "**فاصلەگذاری**": مەودادانان. "**فاصلەگرفتن**": دووری کردن، مەودا تێخستن.





**فاصله نمایی:** مەودانوێنی.

**فاضح:** 1) ڕوون و ئاشکرا. 2) ئاشکراکەر، ڕازهەڵماڵەر، دەرخەر.

**فاطر:** 1) ئافرێنەر، خوڵقێنەر، دەسپێکەری کار. 2) لە سفەتەکانی خودا.

**فاطن:** زیرەك و زانا، ئاگا.

**فاعل:** 1) بکەر، پێکار، بەجیهێنەر، ئیشکەر. 2) گانکەر، گایەر، ئیلاقەکەر. "**فاعل شناسا**": سووژە، ناسکار. "**فاعل کنش**": بکەری کار.

**فاعلیّت:** 1) بکەربوون، بکەری. 2) ئەنجامدانی کردەوەی نامەشروعی سیکسی دەگەڵ کەسێك.

**فافا:** چاك، تازە، جوان.

**فاقد:** 1) ئەوەی شتێکی نیە، بی بەش لە شتێك. 2) جەرگ سووتاو، کەس مردوو. "**فاقد ارزش**": بی نرخ. "**فاقد چیزی بودن**": ئەو شتە نەبوون.

**فاقع:** هەر ڕەنگێکی ناتێکەڵاو.

**فاقه:** نەداری، دەسکورتی.

**فاکت:** فاکت، نموونە بۆ سەلماندنی ڕاستی شتێك.

**فاکتور:** 1) هێمان، سیایی، لیستە، فاکتۆر. 2) هۆکار، فاکتەر. "**فاکتور ریسك**": هۆکارە ترسناکەکان.

**فاکولته:** قوتابخانەی بەرز، کۆلێژ، زانینگە.

**فاگوسیت:** بێگانەخۆر، خانەیەك کە گەردیلە زیانەخورۆکان بخوا و لە ناویان ببا.

**فال:** فاڵ، گیڕ، بەخت خوێندنەوە. "**فال زدن**": فاڵ گرتنەوە.

**فال:** 1) یەکەیەکە بۆ ژماردنی هێندێ لە شتەکان. 2) ڕاوکە، ڕامکە. "**فال فال**": بەش بەش، چەندانە چەنددانە.

**فالانژ:** 1) هەرکام لە تاکەکانی گروپەکانی گوشار کە بەشێوەیەکی ئاسایی خاوەنی ڕوانگەی سیاسی و فەرهەنگی نین و تایبەتمەندیی بەرچاوی ئەوان بەکارهێنانی توندوتیژی دەرهەق بە گروپە ڕێفۆرمخواز و شۆڕشگێڕەکانە. 2) ناونیشانی گشتی ئەو حیزبانەی بڕوایان بە فالانژیسم هەیە. 3) دەمارگرژ و دوگماتیك لە مەرام و ڕێباز یان بڕوای سیاسیدا.

**فالبین:** خیرە، خیف زان، خیپك، فاڵگرەوە، فاڵگەر، فاڵاوێژ، گیڕزان.

**فالج:** شەپڵە، نەخۆشی ئیفلیجی.

**فالج زده:** شەپڵەلێدراو، داملە، دەملە.

**فالکباز:** بڕوانە: "فالبین".

**فالگو:** بڕوانە: "فالگیر".

**فالگوش:** شەمالە، شەمالی، شەمۆلە، گویگرتنی ژنان بە شەو لە قسەی خەڵك بۆ بەخت تاقیکردنەوە.

**فالگیر:** فاڵچی، فاڵگر، فاڵگرەوە، فاڵگەر، فاڵبین، فاڵبێژ، فاڵاوێژ، خەف زان، بەخت وەخوێن، حەساوگەر، حیساب گەر.

**فام:** 1) جق، ئاماڵ، وەش، بەش. 2) وام، قەرز. "**فام کردن**": قەرزکردن.

**فام آلگین:** پڕڕەنگ.

**فامدار:** قەرزدار، وام لەسەر.

**فامگزار:** قەرزدەرەوە.

**فامیل:** 1) خزم، کەسوکار. 2) بنەماڵە. 2) ناوبانگ. "**فامیلدار**": ئەوەی بنەماڵەیەکی ناسراوی هەیە.

**فامیلی:** 1) بنەماڵەیی. 2) هەموو "فامیل" بەگشتی. 3) خزم بوون. 4) ناوبانگ.

**فانتزی:** 1) بە فۆرم یان شکڵی سەرنج ڕاکێش و نارەسمی و زیاتر بۆ سەرگەرمە. 2) جۆرە نانێکە. 3) خوازیاری سەرگەرمی و ناجیددی. 4) خەیاڵ، وەهم، وێنا.

**فانتوم:** خەیاڵ، وێنەی خەیاڵی، تارمایی، وەهم.

**فانی:** لەناوچوو، نابەردەوام، ناپایەدار. پیری پەککەوتە. "**دارفانی**": بریتی لە دنیا.

**فاوا:** شەرمەزار، ڕیسوا.

**فایل:** فایل، پووشە. دۆسیە، پەروەندە.

**فؤاد:** دڵ. مێشك.

**فئودال:** دەرەبەگ، ئاغا، خان.

**فئودالیتە:** (کۆمەڵناسی) حکوومەتی دەرەبەگەکان لە ئورووپای سەدەکانی ناوەڕاست، خانخانی.

**فئودالیسم:** دەرەبەگایەتی، سیستمی خاوەندارێتی لە سەدەکانی ناوەڕاست کە زەوییە بەرین و بەربڵاوەکان لە بەردەستی خان و فێئۆدالەکان دابوو و ئەو چینە بەسەر کاروباری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری وەرزێرەکانیشدا زاڵبوون. سیستمی خان و ڕەعیەتی لە کوردستاندا.

**فتادن:** بڕوانە:"افتادن". "**درهم فتادن**": تێك گیران، دەگەڵ یەك تێکهەڵچوون.

**فتاریدن:** بڕوانە:"فتالیدن".

**فتالیدن:** 1) پرژانن، بڵاوکردنەوە. 2) دڕاندن، تلّیشاندن، کەلاشتن.

**فتّانە:** 1) دلڕفێن، دڵبەر. 2) شەڕەنگێز، ئاگرخۆش کەرە.

**فتح:** 1) کردنەوە، والاکردن. 2) گرتن، بەردەست کردن. 3) سەرکەوتن. "**فتح خیبرکردن**": ئەنجامدانی کاری گرنگ یان دژوار. "**فتح کردن**": 1) گرتن، بەردەست کردن، سەرکەوتن بەسەر دوژمندا. 2) کردنەوە. 3) ئەنجامدانی کاری گرنگ.

**فتح الباب:** 1) کردنەوە. 2) سەرەتا، پێشەکی. "**فتح الباب کردن**": کردنەوەی درگا.

**فتح الفتوح:** سەرکەوتنی گەورە.

**فتحنامه:** نامەی سەرکەوتن.

**فتحه:** لە ڕێزمان دا: سەر، سەرە.

**فتدن:** بڕوانە:"افتادن".

**فتر:** (فَ تَ) بیهێزی، سستی.

**فترات:** کۆی"فترت"، سستییەکان، بی هێزییەکان. ڕووداوە ناخۆشەکانی نێوان دوو ڕووداو.

**فتراك:** سامۆتە، سامۆرتە، بن سامۆرتە، شۆپا، گۆرژال، گۆرنیك، ئاڵقە و بەندی پاشکۆی زین.





**فترت:** 1) سستی، بی هێزی. 2) نێوان دوو جار نۆبەتی. وچان، پشوو، ئەو کاتانەی حکوومەت یان دەوڵەتی لەناوچووە و هێشتا دەوڵەتێکیتر نەهاتۆتە سەرکار.

**فتردن:** دڕاندن، دادڕین، شڕکردن، داقلّیشاندن.

**فتق:** 1) قۆڕی، گون شۆڕی، گون ماسان، گونەکی، گەدەوڵی، کوویت. 2) کردنەوە، درزپێدان.

**فتنه:** 1) تاقیکردنەوە، ئەزموون کردن. 2) گومڕاکردن، بەلاڕێدابردن. 3) لاڕێبوون، لەڕی دەرچوون. 4) ئاژاوە، فەرتەنە، فیتنە. 5) مەینەتی، ئازار، ئەشکەنجە، بەلا. 6) گەندەڵی. 7) ئاشق، شەیدا. 8) لەناوچوونی تەکووزی، پشێوی و قەرەباڵغی.

**فتنەانگیختن:** ئاژاوەنانەوە، گەردش نانەوە، گەردەش گێڕان، کەتن گێڕان، کێشەهەڵایساندن، شەڕهەڵخڕاندن، گێرەشێوێنی.

**فتنەانگیز:** ئاژاوەگێڕ، ئاژاوەچی، ئاگرخۆش کەر(ە)، کێشەهەڵایسێن، گێرەشێوێن، کەتن گێڕ، سۆدرە، سەرەسۆدرە، شەڕهەڵخڕێن، شەڕەنگێز، شەڕبەشاران، جنگن، قنگ بەگێچەڵ، گولکە، وەیشووم، خەڵك بەگژیەکاکەر، کلکەنەفتینە، کتکەنەفتینە، هەڤان، عەوان، مایەفیتنە.

**فتنەجو:** ئەوەی بە دوای ئاژاوە و گێچەڵ نانەوەیە.

**فتنەخیز:** شوێنێ کە شەڕ و گەندەڵی و ئاژاوە لێی سەرهەڵبدا، ئاخێزگەی ئاژاوە.

**فتنەزا:** کونەئاژاوە، مەکۆی فیتنە و ئاژاوە.

**فتنەگر:** بڕوانە:"فتنەانگیز".

**فتنەنشان:** دامرکێنی فیتنە و ئاژاوە، ئەوەی ئاژاوە دابمرکێنی و ئاسوودەیی جێگیربکا.

**فتوا/فتوی:** 1) دینا، بەڕەوازانین، فتوا، وەجەر. 2) ناوبژیوانی.

**فتوّت:** 1) جوامێری، مێرخاسی، پیاوەتی. 2) دڵاوایی، ڕەندی، بەخشەندەیی.

**فتوح:** 1) کۆی"فتح"، سەرکەوتنەکان. 2) کرانەوە لە کاردا.

**فتوحات:** ئەو سەرزەوییانەی کە بە شەڕ ئازاد دەبی، سەرکەوتنەکان، داگیرکارییەکان.

**فتور:** 1) سستی و بێحاڵی، خاوی، ئارامی دوای گرژی و دژواری. 2) کەموکورتی، کەمی. 3) درێغی، خێشاندن، کەمتەرخەمی.

**فتورمان:** چیرۆکێ کە ڕووداوەکانی بەهۆی وێنەوە دەردەبڕدری.

**فتوژنتیك:** تایبەتمەندی ئەو کەسەی کە ڕوخساری لە وێنە یان فیلم دا باشتر لە خۆیەتی.

**فتوسفر:** ڕووناکترین بەشی دیار و بەرچاوی خۆر.

**فتوسل:** چاوی ئێلێکتریکی.

**فتوسنتز:** سازرووناکی، ڕۆشنەپێکهاتن.

**فتوشیمی:** لقێك لە شیمی کە تاوتوێی ئاسەواری نوور لەسەر کاردانەوە شیمیاییەکان دەکا.

**فت و فت:** پشت سەری یەك، لێکدالێکدا.

**فت و فراوان:** زۆر و زەوەند.

**فتوگرافی:** وێنەگرتن، وێنەگری.

**فتون:** کەوتنە ئاژاوە و گێچەڵەوە یان خستنە گێچەڵەوە.

**فتی:** جوامێر و بەخشندە.

**فتیدن:** بڕوانە:"افتادن".

**فتیش:** شتێ کە بیپەرستن وەك بوت.

**فتی شیسم:** مەیل یان هۆگری زۆر بە شتی بێگیان وەك کەوش و گۆرەوی و جلوبەرگی ژێرەوە وەك هێمایەك لە دلبەر، دیاریخوازی.

**فجایع:** کارەساتەکان، کۆستەکان.

**فجر:** بەرەبەیان، بەیانی ڕوون، شەوەکی مەلابانگان، مەلابانگدان، سەرەتای ڕۆژبوونەوە.

**فجرصادق:** سپیدپەهنا، بەیانی ڕوون، هەوەڵ بەیان، کەڕی بەیان، سیسان، شەوەکی.

**فجرکاذب:** سبادەرەوین، سپیبالا، سپیدبالا، کازوکووز، بوومەلێڵە، کازیوەی بەیان.

**فجور:** تاوان کردن، زیناح کردن، درۆ وتن، ڕوو وەرگێڕان لە هەق، سەرپێچی لە هەق. لە فارسی زیاتر بە مانای داوێن پیسی و کردەوە و هەڵسوکەوتی ناحەز دێ.

**فجیع:** بەژان، دڵتەزێن، کارەساتبار، ناخۆش و ئازاردەر.

**فحّاش:** دوژێنفرۆش، زڕجان، زمان پیس، جنێوفرۆش، سخێف بێژ، دەم چەپەڵ.

**فحاوی:** کۆی"فحوا".

**فحش:** (فُ) جوێن، جنێو، سخێف، دژمێن، خەڵەت. **"فحش آب نکشیده"**: جوێنی زۆر ناحەز. **"فحش خوردن"**: جوێن پێدران، کەوتنە بەر تۆمەت و قسەی ناحەز. **"فحش دادن"**: جنێودان، جوێن دان. **"فحش (را) کشیدن به (جان) کسی (چیزی)"**: بیوچان جوێن بەودان. **"فحش کاری کردن"**: جوێنی زۆر دان.

**فحشاء:** 1) تاوانی گەورە و کاری زۆر ناحەز، گوناح. 2) تاوانی سیکسی. 3) ڕووسپییەتی، جندەیی، قاحبەیی.

**فحص:** پشکنین، گەڕان، لێکۆڵینەوە، توێژینەوە. لێنۆڕی، تاقیکاری.

**فحل:** 1) ڕەگەزی نێر لە هەر ئاژەڵێ، کەڵ. 2) فرەزان، بەئاوەز، هەڵبژاردە، هەڵکەوتە.

**فحوا/فحوي:** مانا، واتا. ناوەرۆك.

**فحولت:** نێرییێتی، پیاوەتی.

**فخامت:** 1) بەڕێزبوون، گەرەیی، سەنگینی. 2) زنتۆلی، ئەستووری.

**فخر:** نازین، پێنازین، شانازی. **"فخر فروختن"**: بەخۆنازین، شانازی بەخۆکردن.

**فخیم:** بەنرخ، بەشکۆ، بەرچاو.





**فخیمه:** گەورە، بەڕێز.

**فداء:** 1) گۆری، قوربان، دەسەرگەڕان، بەلاگێڕ، خۆدەپێناو ناو. 2) دانی شتێ بۆ ڕزگاری خۆ یان دیتران، کڕینەوەی خۆ یان کەسی دی لە دیلیەتی، ڕزگارانە. **"فدات (شوم)"**: دەبەرت مرم، دەسەرت گەڕێم. **"فداء شدن"**: بوونە قوربانی، گیان بەخت کردن لە ڕێی کەسی یان ئامانجێکدا. دەبەرمران، دەسەر گەڕان. **"فداءکردن"**: بەقوربان کردن، کردنەقوربان، بەکوشت دانی خۆ یان کەسی دی لە ڕێگەی ئامانجێکدا.

**فداکار:** گیان فیدا، لەخۆبوردوو.

**فدامت:** بەدئەخلاقی، تووڕەوتۆسنی.

**فدایی:** 1) پێشمەرگە، گیان فیدا، سەرگۆری، هژمە، قۆچی قوربان. 2) قوربانی. 3) هەرکام لە ئەندامانی ڕێکخراوی فیدائیانی گەل.

**فدراتیو:** بەڕێوەچوو بەشێوەی فیدڕاڵ.

**فدراسیون:** 1) یەکیەتیی چەند وڵات، یەکیەتیی چەند پارێزگا، یەکیەتیی چەند گروپ لە خەڵك. 2) ڕێکخراو یان ئەنجومەنێ کە بۆ بەڕێوەبردنی ڕشتەیەکی وەرزشی پێك دێ. 3) یەکیەتییەك لە سەندیکا کرێکارییەکان.

**فدرال:** تایبەتمەندی وڵاتێ کە بەشێوەی یەکیەتییەك لە ئیالەتە خۆبەڕێوەبەرەکان بەڕێوەدەچی.

**فدرالیزم:** یەکیەتی ئارەزوومەندانەی گەلان، سیستمی سیاسی کە بە پێی ئەو سیستمە وڵاتێ لە یەکیەتیی ئیالەتە سەربەخۆکان پێك دی.

**فدیات:** کۆی"فدیه".

**فدیه:** ڕزگارانە، خوێنبایی، دانی شتێ بۆ ڕزگاربوون، سامانێ کە بۆ کڕینەوەی گیانی خۆ بیدەن، ئەوەی کە دیلەکان بۆ ڕزگاری خۆیان دەیدەن.

**فرّ:** 1) شان و شکۆ. 2) مایەی شکۆ. 3) جوانی و لێهاتنەوە، لێکالانەوە. 4) فەڕ، پیرۆزی، موبارەکی.

**فرآور:** کاریگەر، سوودبەخش.

**فرآویز:** خشڵ، زێڕوزەنبەر.

**فراآراستن:** جێبەجیکردن، ئامادەکردن.

**فراآمدن:** پێشهاتن، ڕوودان.

**فراآوردن:** بەرهەم هێنان، بەدەست خستن، کۆکردنەوە.

**فرآورده:** بەرهەمی وەدەس هاتو، دروستکراو. **"فرآوردەکشاورزي"**: بەربێڵ، بەروبوو، داهاتی زەوی.

**فرآوش:** بڕوانە:"خاستگاه".

**فرائض:** کۆی:"فریضە".

**فرا اعتقاد:** بان بڕوا.

**فراادبی:** بان/سەروو ئەدەبی.

**فراافکندن:** 1) ڕەپاڵدان، لەخۆ دوورخستنەوە. 2) هێنانەبەرباس، خستنەڕوو.

**فرابافتن:** 1) تەنینەوە، چنینەوە، هۆندنەوە. 2) تۆمەت لێدان، بوختان بۆ هەڵبەستن.

**فرابافته:** دەسکرد، دروستکراو.

**فرابرپذیر:** شیاوی ڕاگواستن(بە پاپۆڕ).

**فرابردن:** بردنەپێش. ڕاگواستن.

**فرابریدن:** بەدوادانەچوون، بێدەنگی لێکردن.

**فرابستن:** شەتەك دان، بەستن.

**فرا پاش کردن:** بڕوانە:"پراکندن".

**فرا پاویدن:** چاوەدێریکردن، ئاگالێبوون.

**فرا پایە:** پایەبەرز.

**فرا پشت:** لەسەر پشت. "**فرا پشت کردن**": خستنە سەر شان، قەڵادۆشکان کردن.

**فرا پوش:** لەهۆش چوو، لەسەرخۆچوو، بێهۆش.

**فرا پیش:** پێش(ەوە)، بەر(ەوە).

**فراتاب:** 1) پرۆژۆکتۆر. 2) کاردانەوە، ڕەنگدانەوە.

**فراتاز:** بڕوانە:"تجاوز".

**فراتر:** 1) بانتر، سەرتر. 2) پێشتر. 3) زیاتر. 4) دوورتر. 5) بەنرختر، بەبایەختر، بایەخدارتر، لەسەرتر.

**فراترك:** کەمێ لە پێشتر.

**فراجناحی:** بان قۆڵی، تیۆری یان سیاسەتێکی گشتگیر کە بە گروپ و قۆڵێکەوە نەبەستراوەتەوە و بڕوا و دەنگی هەموو گرووپەکان لە خۆدەگرێ.

**فراچنگ:** لەناو دچنگا، لەناو لەپی دەستدا. "**فراچنگ آوردن**": وەچنگ خستن، بەدەست هێنان.

**فراچیدن:** کۆکردنەوە، خڕکردنەوە، چنینەوە، هەڵگرتنەوە.

**فراحکایت:** بان گێڕانەوە.

**فراخ:** 1) هەراو، هیرا، فرەه، گوشاد، پان، بەرین، بەربڵاو. 2) زۆر، فراوان. 3) هەڵگر، لەخۆگر. 4) بڕوانە:"رقیق". 5) ڕاڤەکراو، شرۆڤەکراو، تێروتەسەل.

**فراخ آستین:** بریتی لە کەسی بەخشندە، جوامێر، دەسڤالا.

**فراخ آهنگ:** دوورە فڕ، تیرێ کە ئامانجە دوورەکان بپێکێ.

**فراخا:** هەراوی، پان و بەرینی، بەرینایی.

**فراخ ابرو:** خۆش خوڵق، هەڵسوکەوت جوان.

**فراخاستن:** ڕابوون، ڕاست بوونەوە، هەستان.

**فراخ اندیش:** بڕوامەند بە وێك هەڵکردن.

**فراخبال:** ئەرخەیان، خاترجەم.

**فراخ بر:** سنگ پان.

**فراخ بوم:** زەوی بەرین، دەشتی بەربڵاو.

**فراختن:** بڕوانە:"افراختن".

**فراخ جا:** جێگەی بەرین، شوێنی بەربڵاو.

**فراخ حوصلە:** بریتی لە پشوودرێژ، لەسەرخۆ، قورس و قۆڵ، ماقووڵ.

**فراخ دامن:** 1) تێروتەسەل، دوورودرێژ. 2) بەربڵاو، بەرین.

**فراخ درم:** پووڵدار، دەوڵەمەند.

**فراخ دست:** 1) بریتی لە بەخشندە، دڵاوا، دەست واڵا، دەسەنەدار، جوامێر. 2) دەوڵەمند، زەنگین.





**فراخ دل:** 1) هیمەت بەرز و دڵاوا. 2) نەترس، بوێر. 3) زۆرخۆر، خۆرا، پێلۆ.

**فراخ دوش:** چوارشانە، شان پان.

**فراخ دهان:** 1) زارئاوەڵە. 2) بریتی لە زۆروێژ، چەڵتەباز، کۆڵەوێژ.

**فراخ دیدە:** 1) چاو و دڵ کراوە. 2) هیممەت بەرز و بەخشندە.

**فراخ رو:** (فَ.رَ) 1) بە پەلە ڕۆیشتو. 2) کەسێ کە لە سنووری خۆی تێپەڕێ، سنووربەزێن، زێدەڕۆ. "**فراخ روی**": زێدەڕۆیی، تێپەڕین لە سنووری خۆ.

**فراخ روزی:** کەسێ کە ڕسق و ڕۆزی زۆری هەیە.

**فراخ روی:** (فَ. رُ) 1) ڕووخۆش، ڕووگەش، دەم بەپێکەنین. 2) لەڕادە تێپەڕاندن، زێدەڕۆییکردن. 3) بڕوانە: "تساهل".

**فراخزیدن:** بۆ پێشەوە خزین، بۆ بەرەوە خوشین.

**فراخ زیست:** ئەوەی لە نێعمەت و ڕاحەتی دا دەژی، خۆش بژیو، خواپێداو.

**فراخ سال:** ساڵی پڕ بەرهەم و داهات، پێچەوانەی "تنگسالی".

**فراخ سخن:** زۆربڵێ، فرەوێژ، چەنەوەڕ، چەڵتەباز.

**فراخ شانە:** چوارشانە، شان پان.

**فراخ شلوار:** تەوەزەل و دەست و پێ سپیلکە.

**فراخ عیش:** بڕوانە:"فراخ روزی".

**فراخ کام:** زەنگین و کامڕەوا، شاد و بەختەوەر.

**فراخ کندوری:** دڵاوا، دڵگوشاد، بەخشندە، جامێر.

**فراخ گام:** 1) ئەوەی شەقاو هەڵدێنێتەوە، تیژڕۆ. 2) تێپەڕێن، بێ سەروبەر، کەمتەرخەم، حولحولی، ناپابەند.

**فراخ گو:** بڕوانە:"پرحرف".

**فراخ مزاح:** زۆرگاڵتەکەر، زۆر شۆخی کەر.

**فراخنا:** هەراوی، بەرفرەهی، پانوبەرینی، بەرینایی، بەربڵاوی.

**فراخ نان و نمك:** بەخزمەت، میوان دۆست.

**فراخ نشستن:** بڵاودانیشتن، دوور لەیەك دانیشتن.

**فراخواست:** بانگهێشت(بۆ دادگا).

**فراخوان:** بانگهێشت، داوەت.

**فراخواندن:** بانگهێشت کردن، بانگ کردن، خوازتن.

**فراخود:** (دەروونناسی) بەرزەخود، منی لەسەرتر.

**فراخور:** 1) شیاو، شایان، شایستە، لەبار. 2) هاوڕێژەیی، هاوتایی. 3) ئەندازە، ڕادە.

**فراخورد:** شیاو، شایان، لەبار.

**فراخویش:** دەگەڵ خۆ، بەخۆ.

**فراخە:** لەرزە، لەرە، موچڕك.

**فراخی:** هەراوی، هەرایەی، پان و بەرینی، بەرینایی.

**فراخیدن:** سیخ بوونی موو. لێکجیابوونەوە. ئاوەڵابوون(ەوە)، هەراوبوونەوە.

**فراخیگاه:** جێگەی هەراو و بەربڵاو.

**فرادا:** نوێژێ کە بەتەنیا بیخوێنن.

**فرادادن:** 1) شیکردنەوە، شرۆڤەکردن، دەربڕین. 2) بڕوانە:"گرداندن". "**پشت فرادادن**": پشت تێکردن و هەڵاتن. "**گوش فرادادان**": گوێ هەڵخستن، گوێچکە شلکردن، گوی بۆ قسە ڕاگرتن، گوێگرتن.

**فراداشتن:** ڕاگرتن، نگاداریکردن. 2) دانان، دیاریکردن. "**گوش فراداشتن**": گوێدان و بیستن.

**فراداستان:** بان چیرۆك (چیرۆکێك سەبارەت بە چیرۆکێکی تر).

**فرادست:** بانتر و لەسەرتر. "**فرادست دادن**": پێ سپاردن، دانەدەستی کەسێك.

**فرادهش:** نەریت، باو.

**فرادی:** 1) کۆی"فرد"، بە مانای تاق، تەنیا، بێ هاوتا. 2) بڕوانە: "فرادا".

**فرادید:** دیار، بەرچاو، خویا. "**فرادیدآوردن**": بەدیهێنان، وەدیهێنان، ئاشکراکردن، خۆیاکردن.

**فرادیدن:** دیتن، بینین.

**فرار:** هەڵاتن، هلاتن، فنار، باز، ڕە، ڕەڤ، ڕەتان. "**فراردادن کسي**": دوورخستنەوە و ڕەتاندنی ئەو لە مەترسییەك. "**فرار را دمش دادن**": بە خێرایی هەڵاتن. "**فرارعمومي از ترس**": هەڵات هەڵات. "**فرارکردن**": 1) هەڵاتن، ڕاکردن، ڕاکرن، ڕاپسکان. 2) دووری کردن لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دۆخێکی نەخوازراو و ناخۆش. "**فرارمغزها**": هەڵاتنی مێشکەکان.

**فرّار:** 1) ئەوەی زوو ڕابکا، زووڕاکەر، ناجێگیر، ناپایەدار، زوو لەبیرچۆوە. 2) لە زاراوەی کیمیادا: جسمێ کە بەخێرایی ببێتە هەڵم. "**فرّاربودن**": جێگیرنەبوون.

**فرارسیدن:** 1) هاتن، نزیك بوونەوە و گەیشتنی کاتی شتێ یان کارێك. 2) توانین و هەل بۆ ڕەخسان لەمەڕ کارێ.

**فرارفتن:** 1) هەڵاتن، ڕاکردن. 2) چوون، ڕۆیشتن، چوونەبەرۆ. 3) چوونەناوەوە.

**فراروانی:** بان دەروونی.

**فرارون:** 1) باش، چاك. 2) بەرز، بڵێند. 3) ڕاست، ڕاستەوخۆ. 4) داوێن پاك، خۆپارێز. 5) ڕاست کردار، ڕاست بێژ.

**فراروند:** شێوەی کار، ڕێگەی دەربازبوون.

**فراروی:** 1) ڕووبەڕوو، بەرامبەر، لەپێش. 2) ناسراو، بەناوبانگ.

**فراری:** 1) هەڵاتوو، ڕاکردوو، تەرە، هەڵۆەدا. 2) دووریکەر و بێزار. "**فراری شدن از کسی(چیزی)**": بێزران و بێزاربوون لەو. دووریکردن لەو.





**فراز:** (فَ) 1) هەوراز، بەرەوژوور، سەربەرەوژوورە، لای سەرو، بڵێندایی، بەرزایی. 2) داخراو، بەستراو. 3) لە زاراوەی فیزیادا: جەمسەری موسبەتی جەریانی کارەبا، "ئاند". "**فراز آمدن**": 1) گەیشتن. 2) نزیك بوونەوە، هاتنەبەرۆ. 3) خڕبوونەوە، کۆبوونەوە. 4) وێکهاتن، بەستران. 5) هاتنەناوەوە. 6) هاتنەوە، گەڕانەوە. 7) ڕوودان، پێشهاتن. "**فرازآوردن**": 1) خڕکردنەوە، گردەوکردن. 2) هێنانەپێش. 3) وێکهێنان، بەستن. 4) هێنانەدی، وەدیهێنان. 5) بڕوانە: "براوردن". 6) کێشان بەرەو لایەك. 7) هێنانەخوار، دابەزاندن. "**فرازبردن**": بردنەنزیك. "**فراز رسیدن**": 1) نزیك بوونەوە. 2) گەیشتن. 3) پەیدابوون، بەدیهاتن. "**فراز رفتن**": چوونە نزیکەوە. "**فرازشدن**": 1) چوونەنزیك (ەوە). 2) داخران، وێکهاتن. 3) هەنگاونان، دەست بردن. "**فرازکردن**": 1) هێنانەپێش، نزیك کردنەوە. 2) داخستن، وێکهێنان. 3) کردنەوە. 4) کۆکردنەوە، خڕکردنەوە. 5) درێژکردن(ەوە). "**فرازونشیب**": 1) بەرزی و نزمی، هەوراز و نشێو. 2) خۆشی و ناخۆشی. "**بههم فرازآمدن**": وێکهاتن، داخران.

**فراز:** ڕستە، دەربڕین، ئاخاوتە.

**فرازآمد:** پێشهات.

**فرازانی:** بەسەردابوون، لەسەرتردابوون.

**فرازانیدن:** 1) هەڵدان، بەرزکردنەوە، بردنەسەر. 2) ئایساندن، هەڵکردن، پێکردن.

**فرازبر:** برەوپێدەر، وەڕمێن خەر.

**فرازد:** انفجار.

**فرازسوی:** بەرەوسەر، سەرووترین.

**فرازش:** بڕوانە:"ترفیع".

**فرازکش:** گوشار بەرەو بان.

**فرازمان:** بڕوانە:"جزمی".

**فرازي:** بڕوانە:"سربالایی".

**فرازیاب:** بەرزیپێو، "ئاڵتی مێتر".

**فرازیدن:** 1) هەڵدان، بەرزکردنەوە، بردنەبان. 2) کردنەوە، واڵاکردن. 3) بستن، داخستن. 4) زاڵبوون، باڵادەست بوون.

**فرازین:** بڕوانە:"زبرین".

**فراساختار:** بان بنەما، بان پێکهاتە.

**فراساختن:** 1) سازان، پێکهاتن. 2) ئامادەبوون. 3) تاقەت هێنان، بەرگەگرتن، دەوام هێنان. "**بههم فراساختن**": دەگەڵ یەك گونجان(دن).

**فراسایکولوژی:** بان دەروون ناسی.

**فراست:** (فِ.سَ) 1) وریایی، وشیاری، بیرتیژی. 2) ئاوەز، زانایی. "**علم فراست**": زانستی کە بە لێڕوانین لە سەر و بیچمی کەسەکان پەی بە ئاکار و ڕەوشت و ناخی ئەوان ببەی، بیچم ناسی.

**فراست:** (فَ.سَ) شارەزابوون لە سوارکاری و ناسینی ئەسپ.

**فراستاندن:** ئەستاندن، وەرگرتن، وەرگرتن.

**فراستمند:** ئاقڵ، فرەزانا.

**فراسر:** بان سەر، ژێرسەر، دەوری سەر.

**فراسوی:** ئەوبەری شتێ، ئەودیوی شتی.

**فراش:** (فِ) 1) نوێن، پێخەف، جێوبان، هەر شتێکی ڕایەخ. 2) هاوسەر. "**فراش بستری**": نەخۆشی لەجیداکەوتوو. "**تجدیدفراش کردن**": سەرلە نویٚ ژن هێنان.

**فرّاش:** (فَ) 1) ڕاخەری فەرش. 2) خزمەتکار، پێش خزمەت. 3) پارێزەر و خاوێن ڕاگری هەرێم و شوێنی پیرۆز. "**فراش پست**": نامەگەێن. "**فراش خلوت**": خزمەتکاری تایبەتی پاشا.

**فراشا:** حاڵەتێ کە پێش لە نۆبەتێ ئینسان دادەگرێ، لەرزە.

**فراشتن:** بڕوانە:"افراشتن".

**فراشد:** پڕۆسە.

**فراشدن:** 1) هاتن، هاتنەناوەوە. 2) چوونەپێشەوە، نزیك بوونەوە. 3) ڕۆیشتن. 4) تووڕەبوون، قەڵس بوون.

**فراشیدن:** لەرزین و حاڵ تێکچوون پێش لە دەرکەوتنی نۆبەتێ.

**فراغ:** 1) بەتاڵایی، بۆشایی، واڵایی. 2) لێبوونەوە، ئاسوودەبوون، سەرسووك بوون. 3) هەل، دەرفەت. 4) بێ نیازی، چاڤ تێری. 5) بەتاڵ بوونەوە، خاڵیبوون.

**فراغ خاطر:** ئاسوودەیی، بێ خەمی.

**فراغت:** 1) ئاسوودەیی، بێ خەمی. 2) دەرفەت، هەل، سونگە، سونکە. 3) لێبوونەوە و ئاسوودەیی لە کار. 4) دەربازبوون لە کۆتوبەندەکان. 6) بێ نیازی، کاربەکەس نا. "**فراغت داشتن**": 1) ئۆقرەگرتن، ئەرخەیان بوون، دڵنیابوون. 2) دەرفەت هەبوون، هەل بۆ ڕەخسان. "**فراغت داشتن از کسی(چیزی)**": بی نیازبوون لەو. "**فراغت یافتن**": لێبوونەوە، پابوونەوە، سەرسووك بوون، خەلاس بوون لە ئەرك، ئاسوودەبوون.

**فرافر:** (فُ.فِ) بەرخ، کاژیلە، گوێلك. پیاوی گەوج و نەزان، گەمژە.

**فرافکنی:** ڕەپاڵدان، ڕەگەڵ خستن، لەخۆدوورخستنەوە، دیترهاوێژی.

**فراق:** جودایی، لێك دوورکەوتنەوە. "**فراق زده**": جودایی چەشتو، دوورەوەکەوتوو.

**فراك:** 1) پشتەوە. 2) بڕوانە:"مخنث". 3) پیس، چەپەڵ.

**فراکافت:** شیتەڵکاری، لێکدانەوە.

**فراکاوی:** توێژینەوە، کۆڵینەوە.

**فراکردن:** 1) درێژکردن(دەست). 2) ناچارکردن، ورووژاندن، هاندان. 3) هەڵبژاردن، هەڵ بژین. 4) دروست کردن، بیناکردن.

**فراکسیون:** فڕاکسیۆن، دەستەیەك لە ئەندامانی هاوبیری بنیاتی یان حیزبی یان گروپێکی سیاسی کە بۆ گەیشتن بە ئامانج گەلێکی دیاریکراو چالاکی دەکەن.





**فراکش:** جیاکردنەوە.

**فراکشیدن:** هێنانەپێش، بەرەولای خۆهێنان، هێنانەبان.

**فراگذشتن:** 1) تێپەڕین، دەرچوون، ڕەت بوون. 2) بڕوانە:"رهاکردن".

**فراگرد:** پڕۆسە، ڕەوت.

**فراگرفتن:** 1) وەبەرهاتن، گرتنەوە، داگرتن. 2) گرتن، گرتنەوە، داگیرکردن، دەورەدان. 3) فێربوون، هەڤۆتن، ڕاهاتن. 4) خستنە ژێر کاریگەرییەوە. 5) گەمارۆدان، ئابلۆقەدان. 6) گرتن، دەستگیرکردن. 7) گرتن، ئەستاندن. 8) وادانان.

**فراگشت:** پڕۆسە.

**فراگفتمان:** بان ئاخێو.

**فراگیر:** 1) بەربلاو، پەرەگرتوو. 2) گشتگیر، هەموولاگر. 3) (سیاسی) توتالیتیر. 4) قوتابی یان خوێندکار. "**فراگیرنده**": داگر، لەخۆگر، هەموو لا وەبەرخۆدەر. "**فراگیری**": 1) ڕەژتنەوە، داگرتن، بەهەموولاڕاگەیشتن، هەموولاگرتنەوە. 2) فێربوون، ڕاهاتن.

**فراماسونری:** ڕێکخراوێکە کە ڕێسای تایبەتی و کۆبوونەوەگەلی ڕەمزاوی هەیە و لە هێندێ وڵات بەتایبەتی بریتانیا ڕێکخستنی هەیە و ئەندامەکانی وەك "فراماسون"ناو دەبرێن و مەرامیان لایەنگری لە مرۆڤایەتی و پاك کردنەوەی ئاکار و پەرەسەندنی هزری خەڵك و وەلانانی ناتەبایی ئایینییە بەڵام لە هێندێ وڵات دا وەك پیلانگێڕ و سیخوڕ ناوبانگیان دەرکردوە.

**فرامایە:** بەنەزاکەت، بەئەدەب، ئاکارباش.

**فرامتن:** 1) بان دەق، ئەوەی دوای خوێندنەوەی دەق لە زەینی خوێنەر دا شکڵ دەگری. 2) مەسەلەگەلێ کە دوای خوێندنەوەی دەقێ دێنەگۆڕ وەك ڕاڤە و ڕەخنە.

**فرامتنی:** بان دەقی، بان دەقێتی.

**فرامدرن:** 1) زۆر پێشکەوتو و نوێ. 2) بڕوانە: "پسامدرن".

**فرامش/فرامشت:** بڕوانە:"فراموش".

**فراملّی:** بڕوانە:"فراملیّتی".

**فراملیّتی:** بان نەتەوەیی، لەپێوەندی دەگەڵ زیاتر لە یەك نەتەوە یان یەك وڵات.

**فرامن:** (دەروونناسی) بەرزەخود، منی لەسەرتر.

**فراموش:** لەیادچوو، لەبیرچوو، لەبیرکراو، لەبیرنەماو، ئەوەی لە بیری کەسێك مەفح بۆتەوە، فەرامۆش. "**فراموش شدن**": لەبیردەرچوون، لەبیرچوون، لەبیرکران، لە یاد دەرچوون، لەهۆش چوون، ژبیرکەتن، ژبیرچوون، ژبیرڤەچوون. "**فراموش کردن**": دەسەرچوون، لەسەرچوون، لەبیرچوون(ەوە)، لەیادچوون، بیرچوون، بیرچوونەوە، ژبیرکرن، بیربردن، بیرکردن، بیرچوون.

**فراموشخانە:** 1) بڕوانە:"فراماسونری". 2) بـریتی لـە بەندیخانـە پڕخـۆف و ترسێنەرەکان، شوێنێ کە لەودا هەموو شتێك و گشت کەسێك لەبیر بکرێ.

**فراموشکار:** بێ بیر، بێ هۆش، فەرامۆش کار، کەسی کە زوو شتی لە بیر دەچێ.

**فراموش ناشدنی( نشدنی ):** لەبیرنەچۆوە.

**فراموشی:** شت لەبیرچوون، لەبیرچوونەوە، فەرامۆشی.

**فراموشیدن:** بڕوانە:"فراموش کردن".

**فراموقعیّت:** بان پێگە، ئەوپەڕی پێگە.

**فرامون:** 1) دەوروبەر، دەورو پشت، دەوران پشت، دەوراندەور، دۆرمادار. 2) بڕوانە:"بعد".

**فرامین:** کۆی"فرمان"، فەرمانەکان، بڕیارەکان.

**فرانج:** بڕوانە:"کابوس".

**فرانسوی:** فەڕانسەیی، لە خەڵکی فەڕانسە، زمانی خەڵکی فەڕانسە.

**فرانقد:** بان ڕەخنە(ڕەخنەی ڕەخنە).

**فرانگره:** بڕوانە:"نظریه".

**فرا نما:** بڕوانە:"شفّاف".

**فرا نمودن:** 1) پیشان دان، دەرخستن، ئاشکراکردن. 2) وادەرخستن، وانواندن. 3) گوتن یان نووسین.

**فرانوشته:** پێچراوە، قەدکراو.

**فرانهادن:** خستنەبەر باس، هێنانەگۆڕ.

**فرانیاد:** بان سروشتی.

**فراوان:** 1) زۆر، فرە، زیاد، کواکو، فراوان. 2) قوول. "فراوانی": 1) فرەیی، فراوانی، زۆری. 2) فرەکانس.

**فراور:** بەرهەم هێن، بەرهێن.

**فراورده:** بڕوانە:"فرآورده".

**فراوری:** کۆمەڵە کارگەلێکی بەردەوام کە بۆ بەرهەمهێنان یان پالاوتن یان ئامادەکردنی ماددەگەلی جۆراوجۆر ئەنجام دەدری.

**فراهستی:** بەرچاوەکی، ڕاستەقینە، ئۆبژێکتیڤ.

**فراهم:** 1) ئامادە، تەیار. 2) پاشەکەوت کراو، لەجێیەك کۆوەکراو. 3) لە تەنیشتی یەك، لە دەوری یەك. "**فراهم آمدن**": 1) خڕبوونەوە، کۆبوونەوە لە دەوری یەك. 2) وەدەست هاتن، بەرهەم هاتن، ڕەنیوهاتن. 3) نووسران. 4) لە تەنیشت یەك جێگرتن. 5) داخران، بەستران، وێکهاتن. "**فراهم آوردن**": 1) دابین کردن، ئامادەکردن، پێکهێنان، سازدان، وەرەی ئامایش. 2) کۆکردنەوە، کۆوەکردن. "**فراهم شدن**": 1) ئامادەبوون، دابین بوون. 2) بەرهەم هاتن، وەدەست هاتن. 3) کۆوەبوون. "**فراهم کردن**": 1) ئامادەکردن، دابینکردن. 2) کارسازی، پێکهێنان، سازدان. 3) خستنەسەر یەك و بەستن. 4) جەموجۆرکردن، ڕێکوپێك کردن. "**فراهم گرفتن**": گنج کردن و کۆکردنەوە.





**فراهمایی:** کۆنفرانس.

**فراهیختن:** ئەدەب کردن، پەروەردەکردن.

**فرایازی:** بڕوانە:"تصاعد".

**فرایافت:** بڕوانە:"برداشت".

**فرایافتن:** تێگەیشتن، تێگەیین، حالیبوون، ڕێتێبردن، پەی پێبردن، فامین، زانین.

**فرایند:** پرۆسە، کۆمەڵە چالاکیگەلێکی جۆراوجۆر کە بۆ گەیشتن بە دەرەنجامێکی تایبەت ئەنجام دەدرێ.

**فربود:** کامڵ، تەواو.

**فربه:** 1) هەملك، تێرگۆشت، گۆشتن، گۆشتێن، قەڵەو. 2) ئاوەدان، بەپیت و بەرەکەت.

**فرتاب:** بڕوانە:"الهام بخش".

**فرت فرت:** توندتوند، خێراخێرا، بەپەلە.

**فرتوت:** 1) پەککەوتوو، زۆرپیر، پیری بەساڵاچوو و لەکارکەوتوو. 2) پرتوکیاگ لەبەر کۆنەبوون.

**فرتور:** وێنە، Image.

**فرج:** (فَ رَ) کرانەوە لە کاردا و لەناوچوونی خەم و ڕەنج. "**فرج بعد از شدّت**": کرانەوەی دوای دژواری، کەوتنە خۆشییەوە.

**فرجاد:** زانا، بیرمەند، تۆرەڤان.

**فرجام:** 1) ئاکام، ئەنجام، کۆتاییکار. 2) پێداچوونەوە بە بڕیاری دادگاوە لە لایەن دیوانی بەرزی وڵاتەوە. "**فرجام خواستن / فرجام دادن**": داوای پێداچوونەوە لە کێشەیەك کە بڕیارەکەی لە لایەن دادگای پارێزگاوە دەرچووە.

**فرجام جو(ی):** دوورنواڕ، دووربین.

**فرجام خواسته:** بڕیاری دادگا کە داوای پێداچوونەوەی تێدا بکری.

**فرجام خوانده:** ئەوەی داوای پێداچوونەوە دژی ئەو دەخرێتەبەرباس.

**فرجام خواه:** ئەوەی داوای پێداچوونەوە بە بڕیاری دادگا دەکا.

**فرجامگاه:** 1) گۆڕ، قەبر. 2) قیامەت.

**فرجامیدن:** بەکۆتاییگەیاندن، کۆتایی پێهێنان.

**فرجامین:** دوایین.

**فرجمند:** هێژا، بەوەج، ڕێزدار، بەنرخ.

**فرجود:** بڕوانە:"اعجاز".

**فرجه:** 1) درز، کەلێن، کەلەبەر. 2) دەرفەتێ بۆ ئەنجامدانی کارێ یان هەنگاوێکی تایبەتی. 3) ڕزگاربوون لە خەم و کەسەر و دژواری، شادی و دڵخۆشی دوای خەم و پەژارە. "**فرجه‌دادن**": مۆڵەت دان، کات پێدان. "**فرجه فرج**": شوێنی تێپەڕین و پێدزکە یان هەلی خەلاس بوون. "**فرجه‌کردن**": سەیرکردن، تواشاکردن.

**فرح:** شادی، شادمانی، دڵخۆشی.

**فرح افزا:** زۆرکەری شادی و خۆشحاڵی، شادیهێن.

**فرحان:** شاد، دڵخۆش.

**فرح انگيز:** شادييەخش، دڵخۆشكەر.

**فرح بخش:** شادييەخش، شاديهێن.

**فرحت:** (فَ.حَ) شادمانی، دڵخۆشی.

**فرحناك:** شاد، خۆشحاڵ، دڵخۆش.

**فرَخ:** (فَ رُ) 1) پيرۆز، موبارەك. 2) بەختەوەر، خۆشبەخت. 3) هێژا، ڕێزدار. 4) دلگير، دڵ پەسند.

**فرخار:** پەرستگە، بوتخانە.

**فرخارديس:** وەك بوتخانە، جوان و ڕازاوە وەك بوتخانە، بەشكۆ.

**فرَخ پی:** 1) بەختەوەر و كامڕەوا. 2) قەدەم خێر، خۆش قەدەم.

**فرختار:** فرۆشەر، فرۆشيار.

**فرختن:** بڕوانە:"فروختن".

**فرخج/ فرخچ:** 1) ناحەز، ناشيرين. 2) پيس، گەمار، ناپاك. 3) بڕوانە:"دست و پا چلفتی".

**فرخجسته:** پيرۆز، موارەك.

**فرَخ ديم:** جوان چاك، سوڕپەری.

**فرَخ زاد:** خۆشبەخت، بەختەوەر.

**فرَخ سير:** ڕەوشت باش.

**فرَخ لقا:** جوان چاك، قەشەنگ.

**فرخميدن:** هەڵلاجيكردن.

**فرخندگی:** پيرۆزی، موارەكی.

**فرخنده:** پيرۆز، موبارەك.

**فرخنده بخت:** بەختەوەر، خۆشبەخت.

**فرخنده پی:** خۆش قەدەم، قەدەم خێر.

**فرخندەرای:** بۆچوون باش، كەسێ كە ڕا و بيرۆكەی باشی هەيە.

**فرخندەطالع:** بەختەوەر، بەختيار، خۆشبەخت.

**فرخندەفرجام:** ئاخرخێر، ئاكام خێر.

**فرخو:** 1) هەڵپەڕتاوتن، تەكميش كردن. 2) بژاركردن.

**فرخويدن:** پەرتاوتن، بڕينی لكی زيادی دار، لێك و لەباركردن.

**فرد:** 1) تاك، هەركام لە تاكەكانی كۆمەڵگای مرۆڤايەتی. 2) تاق، بەرامبەری جووت. 3) بيهاوتا، بێچوون. 4) يەكەی شماردنی ژمارە. 5) كۆپلە شێعرێ كە مانا و مەبەستەكەی تەواو بێت. 6) تەنيا، تاك و تەرا. 7) دوورخراوە، جيا. 8) لێك جيا، بەجيا. 9) بەتاڵ، خاڵی. 10) تەنيا، تەنی. 11) دوور لە خەڵكانی دی، بەتەنيايی. 12) خوای تاقانە. "**فرداعلی**": زۆر باش و بژاردە و بەنرخ. "**فردپرستی**": تاك پەرستی. "**فردفرد**": تاك تاك، گشت. "**فردگرايی**": 1) تاكخوازی. 2) (كۆمەڵناسی) تيۆرييەك كە جەخت دەكاتەوە لەسەر كاريگەری تاك لە گۆڕانكارييە كۆمەڵايەتييەكان. 3) (كۆمەڵناسی) تيۆرييەك كە بوونەقوربانی بەرژەوەندييەكانی تاك لەبەرامبەر بەرژەوەندييەكانی كۆمەڵگا قبووڵ ناكا. "**فرد و زوج**": تاق و جووت.





**فردا:** 1) سێزوو، سۆزی، سۆح، سوە، سوەی، سبە، سبەی، سبەينێ، سبحەی، سبحەينێ، سبيانی، سوا، سوبە، سوبی، سوبيانی، سەوای، سارە، مەستە، مەشت، مەشتە، مەشتی، ورمای، ڕۆژی دادێ. 2) داهاتو. 3) ڕۆژی قيامەت. "**پس فردا**": دووبەيانی، دووسبەی، دووسوو، مەستەبيرۆ، مەستەبێرۆ، مەشتەبێرۆ.

**فرداد:** 1) بڕوانە:"امتياز". 2) بانگەشە، پڕوپاگەندە.

**فردافرد:** تاك تاك، تاك بە تاك، يەكبەيەك.

**فردان:** تاقانە، بيهاوتا، بيوێنە.

**فردانيّت:** تاك بوون، تاكێتی.

**فردايين:** ئەوەی لەپێوەندی دەگەڵ داهاتودايە.

**فردخانە:** خەڵوەت خانە، چلەخانە.

**فردوس:** بەهەشت. باخ، بێستان. "**فردوس مكان**": ئەوەی جێگەی بەهەشتە(بۆ مردووان ئێژن).

**فردوم:** بڕوانە:"ضابطه".

**فردی:** 1) تاكی، تاكەكەسی. 2) تاق يان تەنيابوون. "**فرديّت**": 1) تاكايەتی، تاكێتی، تاقانەيی، تاقانەبوون. 2) كۆمەڵە تايبەتمەنديگەلێكی ڕەفتاری و كەسێتی كە تاك لە ديتران جيا دەكاتەوە."**فردی كردن**": كەساندن، تايبەتيكردن.

**فردين:** سووكەڵەی"فروردين".

**فرز:** 1) گورج، كرژ، چالاك، زيرەك. 2) بە زيرەكی و چالاكی، خێرا.

**فرزام:** 1) شياو، شيان، شايستە. 2) بڕوانە: "استعداد".

**فرزامان:** بڕوانە:"اعلاميه".

**فرزان:** زانا، زۆرزان، فرەزان(وێدەچێ وشەی"فرزان" هەمان فرەزانی كوردی بێ)، ژير، بەئاوەز.

**فرزانه:** فرەزان، فرەزانا، زۆرزان، هۆزان، تێگەيشتوو، چاوكراوە، لەدنيازان. بەشەڕافەت، نەژاد پاك.

**فرزند:** 1) ڕۆڵە، ڕووڵە، زار، زادە، كوڕ يان كچ. 2) بەرهەم، ئاكام. "**نخستين فرزند**": بەرەزا، تۆبەرە.

**فرزندخوانده:** يەخەكێشياگ، كەسی پياو بە كوڕ يان كچی خۆی قبووڵی دەكا.

**فرزندزاده:** نەوە، نەڤی.

**فرزين بند كردن:** خستنەتەنگانەوە يان بەر بە چالاكی ئەو گرتن.

**فرس:** (فُ) ئێرا، ئێرانی، فارسی، زمانی فارسی.

**فرسان:** (فُ) ئەسپ سواران.

**فرسايش:** 1) خوران، كڕانی كەنداڵ بە هۆی ئاوی ڕووبارەوە. 2) ماندوويی و دابەزين(بەرەو لاوازی چوون)ی توانايی جەستەيی يان ڕۆحی. 3) سوان، سێويان، ساويان. 4) كەمبوونەوە و كۆتاييهاتنی سەرچاوە سنووردارە سروشتييەكان. "**فرسايشی**": شەكەتكەر، ماندووكەر.

**فرساييدن:** بڕوانە:"فرسودن".

**فرستادن:** بەڕێکردن، ناردن، هەناردن، هنارتن، ڕەوانەکردن، کلکردن، شاندن، شەهان، شەهاندن، کیاستن، کیاستەی، کیانای. "**بازفرستادن**": ناردنەوە، هەناردنەوە، دووبارە گەڕاندنەوە، دووبارە بەڕیکردن، ڤەشاندن.

**فرستادە:** 1) ناراو، ناردراو، نێردراو، ناردراو، هەناردو، هەناردی، هەناری، هنارتی، ڕەوانەکراو، بەڕێکراو، شاندی، راسپاردە، ڕاسپارە، شیاو. 2) پێغەمبەر. 3) باڵوێز.

**فرستندە:** نێرەر، ڕاسپێر، هەواڵگەێن.

**فرستە:** بڕوانە:"فرستادە".

**فرسخ:** یەکەی پێوانی مەودا نزیکەی شەش کیلۆمیتر.

**فرس مازۆر:** 1) گوشار، زۆر. 2) بڕوانە: "فوری".

**فرسنگ:** پێوانەی مەودا نزیکەی شەش کیلۆمیتر.

**فرسنگ سار:** دارفرسەق، داری چەقاو لە دەم ڕێگە بۆ ماوە دیاریکردن.

**فرسودگی:** بڕوانە:"پوسیدگی".

**فرسودن:** 1) بەرەبەرە سێویان، سوون. 2) پرتوکیان، پۆسیان، ڕزیان، کۆن بوون. 3) بەرەبەرە لەناوبردن. 4) ماندوو یان لاواز و بیهێزکردن لەباری جەستەیی یان ڕۆحییەوە. 5) کەم بوونەوە.

**فرش انداختن:** فەڕش ڕاخستن.

**فرش کردن:** فەڕش کردن، ڕاخستنی فەڕش لە شوێنێ. 2) ڕاخستن، پانکردنەوە. 3) داپۆشینی ڕووی شتێ بە خشت و بەرد و هتد.

**فرشیم:** بەش، پشك، بەهر.

**فرشینە:** مووکێت، بەڕە.

**فرصت:** 1) سونگە، سۆنکە، هەل، هەڵکەوت، دەرفەت، دەلف، دەلیڤە، مەزال، کەیس، کیس، کێس، پەرژ، پەردێژ، دەرب، ئەختان، گورد، کەلێن، هەڤراز، بیڤ، قاف، لیڤ. 2) زەمان، وەخت، کات. "**فرصت دادن**": دەرفەت پێدان، مۆڵەت دان، هەل بۆ ڕەخساندن، کات و دەرفەت دان بە کەسێك بۆ ئەنجامدانی کارێ. "**فرصت داشتن**": دەرفەت هەبوون، هەبوونی کاتی لەبار بۆ ئەنجامدانی کارێك. "**فرصت را غنیمت شمردن**": بە هەل زانین، کەڵك وەرگرتن لە کات یان هەلی لەبار. "**فرصت سر خاراندن**": بریتی لە کەمترین دەرفەتی لەواو، دەرفەتی سەرخوراندن. "**فرصت شدن**": هەل ڕەخسان، دەرفەتی باش هەڵکەوتن. "**فرصت شمردن**": کەڵك وەرگرتنی باش لە کات و هەلی لەبار. "**فرصت یافتن**": کێسانین، دەرفەت دەس کەوتن، کێس لیهێنان، هەل ڕەخسان، هەل ڕەخسین، بۆهەڵکەوتن، لیئانین. "**سر فرصت**": لە کاتی خۆیدا و بەئاسوودەیی. "**منتظر فرصت بودن**": چاو لەدەرفەت بوون، چاوەڕوانی دەرفەت بوون، لێخەفتان، لیخەفتن.





**فرصت طلب:** هەلپەرست، دەگەڵ ڕۆژ بیرگۆڕ، کوڕپیرۆژ، کەیسۆ، دەرفەت هێن، هەلخواز.

**فرصت یابی:** دەرفەت دۆزی، بە شوێن هەل و دەرفەتی گونجاو و شیاوەوە بوون.

**فرض:** 1) وازانین، وێنا، ئەگەر. 2) ئەرکی خوایی. 3) واجب. 4) پێویست. 5) گریمان، گریمانە. 6) گومان. "**فرض عین**": بڕوانە: "واجب عینی". "**فرض کردن**": 1) وادانان، فەرز کردن، گرتن، وازانین، ئاوابیربردن، گومان کردن. 2) واجب کردن. "**فرض کفایت**": بڕوانە:"واجب کفایی". "**فرض گزاردن**": بەجێهێنانی ئەرکە شەرعییەکان. "**بالفرض**": بڕوانە:"فرضاً". "**بر خود فرض کردن**": وەخۆگرتن، لەسەر خۆ پێویست کردن، بەسەرخۆدا سەپاندن."**پیش فرض**": بەرگریمانە، گریمانەی پێش وەخت.

**فرضاً:** هاما، هما، بەڵکوو، بەشکا، بەشکو، گریمان، تەقا، ئەوەهاتوو، گری.

**فرض بر:** ئەوەی بەشەمیراتی لە یاسا دا دیاریکرابی.

**فرضەگاە:** بڕوانە:"بندرگاە".

**فرضیە:** گریمانە، مەزندە و گومان.

**فرط:** 1) زاڵبوون، دەسپێشخەریکردن و لەڕادەتێپەڕین. 2) زێدەڕۆیی، تێپەڕین لە سنوور و ئەندازە. 3) زۆری، فراوانی.

**فرع:** 1) لق، لك، پەل. 2) سوودی پارە. 3) بەرهەم، دەرەنجام.

**فرعی:** 1) لاوەکی. 2) ناسەرەکی. 3) تایبەتمەندی ئەوەی پاژ یان بەشێکە لە شتی سەرەکی.

**فرعیات:** شتە لاوەکی و ناسەرەکییەکان.

**فرغاردن:** تەڕکردن، خووساندن، بارگاویکردن.

**فرغردن:** تەڕکردن، خووساندن.

**فرغند:** پیس، گەمار، بۆگەنیو.

**فرغیش:** کۆنە، پواو، ڕیشاڵ ڕیشاڵ بوو.

**فرفتن:** بڕوانە:"فریفتن".

**فرفر:** (فِ.فِ) خێراخوێندنەوە و خێرانووسین، کارێ کە بەپەلە و لەز بکری.

**فرق:** 1) ناوەڕاستی کەللە، تەوقەسەر. 2) جیایی، جیاوازی. 3) نووك یان بەشی سەرەوەی شتێ. 4) مووی سەر. "**فرق دادن**": لێك جیاکردنەوە، هەڵاواردن، ناسینەوە. "**فرق داشتن**": جیاواز(ی)بوون. "**فرق کردن**": جیاوازبوون، جیابوون. جیاوازیدانان نێوان دوو شت یان دوو کەس. "**فرق گذاشتن**": جیاوازیدانان نێوان دوو شت یان دوو کەس.

**فرقان:** (فُ) 1) جیاکردنەوە، لێك جیاکردنەوە. 2) ئەوەی هەق و ناهەق لێك جیابکاتەوە. 3) قورئان.

**فرقت:** جیایی، دووری.

**فرقه:** گروپ یان کۆمەڵێ کە ئامانج یان تایبەتمەندی یەکسان و هاوبەشیان هەبێ، تاقم. "**فرقەزدن**": بەدوای کردەوە و هەڵسوکەوتی ناحەزەوە بوون.

**فرقەگرا:** تاقم گەرا، خاوەنی مەیل و هۆگری بۆ پێکهێنانی گروپ و تاقم گەلی سیاسی و ئاییني و کۆمەڵایەتی و هتد یان جیابوونەوە لە تاقمە کۆنەکان و پێکهێنانی تاقمی نوێ.

**فرکال:** بڕوانە:"پرگار".

**فرکانس:** فڕێکوێنس، فرەکانس.

**فرکن:** زەوییەك کە سێڵاو گرتبێتییەوە و هەڵیکۆڵیبی و قووڵی کردبێ. جۆگەلەیەك کە تازە دروس کرابێ. کارێز.

**فرکندن:** 1) هەڵکەندن، هەڵقەندن. 2) لێك بڵاوبوون، هەڵوەشان.

**فرگرد:** 1) پار، بەشێ لە کتێب. 2) پڕۆسە، ڕەوت.

**فرگشت:** بڕوانە:"تکامل".

**فرم:** (فَ رَ) خەم، کەسەر، دڵتەنگی.

**فرم:** (فُ) 1) مودێل. 2) فۆڕم، کۆمەڵە تایبەتمەندییەکی پێکهاتەیی بەرهەمێکی ئەدەبی. 3) پێکهاتەی دەرەوە و ڕواڵەتی شتێ. 4) حاڵەت، دۆخ، چۆنیەتی. 5) چۆنیەتی یان شێوەی ئەنجام دانی کارێ، جۆر. "**فرم دادن**": فۆڕم پێدان، شکڵی دڵخواز پێدان. "**رو فرم بودن**": لەبار و ڕێکوپێك بوون. کەیف سازبوون، سەرحاڵ بوون.

**فرمالیتە:** ڕواڵەت سازی، پاراستنی ڕواڵەت، "فۆڕمالیتە".

**فرمالیست:** شێوەخواز، داب و دەستور خواز.

**فرمالیسم:** فۆڕمالیزم، شێوەخوازی، هۆگری زۆر بە داب و دەستوور .

**فرمان:** 1) بڕیار، دەستوور، فەرمان، حوکم. 2) فەرمانی ماشێن و شتی وا. "**فرمان بردن**": بڕوانە:"اطاعت کردن". "**فرمان دادن**": 1) دەستووردان، فەرمان دان، فەرمان کردن، فەرکاندن، بڕیاردان، ئەرك سپاردن بە کەسێك. 2) فەرمان پێدان، ڕێنوێنیکردنی شۆفێر بۆ بردنی ماشێن بەرەو جێیەك کە نایبینێ. 3) ئیزن دان. 4) دەسەڵات پێدان. "**فرمان راندن**": حکوومەت کردن. "**فرمان کردن**": مل ڕاکێشان، پەیرەوی کردن، بەگویکردن، فەرمان بردن. "**فرمان مطلق**": فەرمانی ڕەها. "**فرمان یافتن**": بەدەست گەیشتن یان وەرگرتنی فەرمان. بریتی لە مردن. "**بەفرمان**": بەپێی دەستوور، ملکەچ، بەرفەرمان، ژێرفەرمان. "**پشت فرمان بودن( نشستن)**": لێخوڕین، ئاژۆتن، لە پشت فەرمان دانیشتن.





**فرمانبردار:** بەردەستە، بەربار، ژێردەس، فەرمانبەر، بەرفەرمان، گوێڕایەڵ، گوێبەفەرمان، ژێرفەرمان، ملکەچ، گەردن کەچ، بەردەستە، پێڕەوکار. "**بسیارفرمانبردار**": ستوخوار، زۆر ملکەچ.

**فرمانبرداری:** ملدان، بەقسەکردن، گوێ شل کردن، ملکەچ کردن، گوێڕایەڵی، بەرفەرمانی، ژێردەستی.

**فرمان پذیر:** ملکەچ، گوێڕایەڵ، ئەوەی گوێڕایەڵی فەرمانی گەورەتر لە خۆی بێ.

**فرماندار:** ڕاژۆر، دانێر، دەسەڵاتداری شار، فەرماندار، قایمقام، کەسێك کە لەلایەن وەزارەتی ناوخۆوە کاروباری شارێکی پیدەسپێردری و سەر بە پارێزگارە.

**فرماندە:** فەرماندە، فەرماندەر، کەسێك کە فەرمان بە ژێردەستان دەدا.

**فرمانروا:** دەسەڵاتدار، خاوەن دەسەڵات، حاکم.

**فرمانروایی:** دەسداری، دەست ڕۆیشتن، دەسەڵاتدارەتی، حکوومەت.

**فرمانفرما:** دەسەڵاتدار، بڕیاردەر.

**فرمانفرمایی:** دەسەڵاتدارەتی، حکوومەت.

**فرمان گذار:** فەرماندەر، بڕیاردەر، فەرماندەر، سەرۆك، کەسێك کە فەرمانەکەی جێبەجی دەبی.

**فرمان گزار:** جێبەجێکەری فەرمان، بەجێهێنەری دەستوور، ملکەچ، بەرفەرمان.

**فرمان نیوش:** گوێڕایەڵ، گویڕادێر، گوێبەفەرمان، ئەوەی گوێ بداتە فەرمان.

**فرمایش:** 1) گوتن، ئاخاوتن، پەیوین. 2) وارم، فەرمایشت، فەرموودە، قسەی پیاوی ماقووڵ.

**فرمایشی:** ئەوەی کە بەپێی خواستی کەسێك ئەنجام دەدری و زیاتر بەتاڵە لە ناوەرۆکی ڕاستەقینە و زۆرتر لایەنی ڕواڵەتی و ڕووکەشی هەیە.

**فرمشی:** بڕوانە:"فراموشی".

**فرمگن:** خەمبار، دڵتەنگ.

**فرمناك:** خەمبار، خەمناك، دڵ پڕلەخەم، دڵتەنگ، ناشاد.

**فرمودن:** 1) فەرموون، فەرمین، گوتن، وارمای، قسەکردنی پیاوی گەورە. 2) فەرمان دان، بڕیاردان، دەستووردان، حوکم کردن.

**فرموش:** بڕوانە:"فراموش".

**فرموشیدن:** بڕوانە:"فراموش کردن".

**فرمول:** 1) ڕێسا یان یاسا یان پڕەنسیپێکی گشتی کە بە نیشانە جەبر(لقێکی بیرکارییە) یەکان دەردەبڕدری. 2) سەرچەشن، نموونە، فورمول. 3) پوختە، کورتە.

**فرمول بندی:** 1) فورمولەکردن. 2) شیکردنەوەی شتەکان بەپێی زاراوەگەلێکی سیستم مەند.

**فرمول وار:** بەکورتی، فورمول ئاسا.

**فرناد:** بەشی تەسکایی ڕووبار یان لێواری دەریا.

**فرناس:** (فَ) 1) خافڵ، نەزان. 2) خەواڵوو. 3) بیئاگایی، بیخەبەری. 4) خەواڵووبوون، وەنەوز.

**فرناس:** (فِ) 1) زۆر بوێر، ئازا. 2) شێر. 3) سەرۆکی جووتیاران.

**فرنایش:** بڕوانە: "استدلال".

**فرنگ:** ئورووپا بەتایبەتی فەڕانسە و بریتانیا. ئەم وشەیە لە بنەمادا لە وشەی (فڕانك)ەوە وەرگیراوە کە قەومێك بوون لە نەژادی ژێرمەن. **"فرنگی"**: 1) فەڕانسەیی، ئورووپایی. 2) چێکراو یان سەرچاوەگرتو لە وڵاتانی ئورووپاییەوە. 3) دروست کراو بە شێوەی ئورووپایی. 4) باو لە ئورووپادا. 5) سەربە ئورووپا. **"فرنگی‌مآب"**: 1) فەرەنگییانە، ئەوەی بە نەریتی ئورووپاییەکان دەجووڵێتەوە. 2) ئامادەبوو بەشێوەی ئورووپایی.

**فرنمایی:** جوانکاری، ڕازاندن، هەڵپەرتاوتن.

**فرنود:** بەڵگە، دەلیل. **"با فرنود"**: بڕوانە: "مستدل".

**فرنودآوري:** بەڵگەهێنانەوە.

**فرنودين:** 1) ڕازیکەر، قانعکەر. 2) بڕوانە: "مستدل".

**فرنهاد:** مەسەلە، پرس.

**فروآمدن:** 1) هاتنەخوار، دابەزین. 2) بەزتن، نیشتەجیبوون. 3) بڕوانە: "سازگارشدن". 4) داڕژان، داوەرین.

**فروآوردن:** 1) هێنانەخوار، دابەزاندن. 2) نیشتەجیکردن، جێکردنەوە.

**فروارج کردن:** کەمکردنەوەی پۆست و پایە.

**فرواستادن:** دواکەوتن، بەجێمان.

**فروافکندن:** 1) هەڵواسینی شتی وەك پەردە. 2) داخستن، دانەواندن. 3) خستن.

**فروانداختن:** 1) هەڵاویشتن، خستنەخواروەوە. 2) هێنانەخوار. 3) تێخستن، تێڕۆکردن.

**فرواندیش:** بڕوانە: "پست فطرت".

**فروایستادن:** خۆڕاگریکردن، پایەداریکردن. **"فروایستادن از چیزی یا کاری"**: خۆبواردن لەو کارە یان ئەو شتە.

**فروباریدن:** ڕژان، داڕژان.

**فروبردن:** 1) تێخستن، تێڕۆکردن، بردنەخوار. 2) قووت دان، دابەلاندن. 3) نوقم کردن. 4) لەناوبردن، سڕینەوە.

**فروبستن:** 1) ئاڵۆز و دژواربوونەوە. 2) بەستن، قەپات کردن، بەندکردن. **"دم فروبستن"**: بێدەنگ بوون. **"چشم فرو بستن"**: چاوبەستن، چاولێکنان.

**فروبسته:** 1) ئاڵۆز و تێکەڵاو. 2) لە جووڵە و چالاکی وەستاو. **"فروبسته کردن"**: خەمبار و ناڕەحەتکردن.





**فروپاشی:** هەرەس هێنان، هەڵوەشانەوە.

**فروپوشیدن:** شاردنەوە، حەشاردان.

**فروتابیدن:** خۆر لە زەوی دان.

**فروتر:** نزمتر، نەویتر.

**فروتن:** بیفیز، خۆنەگر، خۆبەزلنەزان، خاکەڕا، خۆشکێن.

**فروجستن:** بازدان بۆ خوارەوە، قەڵەمبازبردن بۆ خوارێ.

**فروچکاندن:** تکاندن، چکاندن.

**فروچکیدن:** دڵۆپەکردن، تنۆك تنۆك ڕژان.

**فروچیدن:** 1) بەڕێکوپێکی دانانی شتێ لە شوێنێ، چنین. 2) هەڵگرتنەوە، چنینەوە. 3) جێبەجیکردن، پێکهێنان، ئامادەکردن.

**فروختار:** فرۆشەر، فرۆشیار.

**فروختگار:** فرۆشیار.

**فروختن:** فرۆشتن، فرۆتن. **"خود را فروختن"**: 1) خۆ فرۆشتن، خۆ خستنە ئیختیار کەسێکەوە لە بەرامبەر پووڵدا. 2) بەرتیل وەرگرتن لە کەسێك و خیانەت کردن بە کەسێکیتر.

**فروختنی:** فرۆتەنی، شتێ کە بۆ فرۆشتن ئامادەیە.

**فروخته:** فرۆشراو، فرۆشیاگ، فرۆشیاو.

**فروخسبیدن:** 1) خەوتن، نووستن. 2) خۆراوابوون، ڕۆژپەڕین.

**فروخواندن:** 1) بانگ کردنی کەسێك، بانگهێشتن کردن. 2) خوێندنەوەی نووسراوەیەك.

**فروخوردن:** 1) خۆخواردنەوە، پیش خواردنەوە لە خەم و خەفەتان. 2) لەناوبردن.

**فرود:** (فُ رُ) 1) نشێو، خوار، ژێر. 2) لە زاراوەی فیزیك دا: جەمسەری نیگەتیڤی جەریانی کارەبا، "کاتۆد". **"فرودِ"**: (فُ.دِ) 1) لە بەشی ناوەوەی شتێ. 2) لەخوارەوەی. 3) بێجگەلە، جگەلە. **"فرودآمدن"**: (فُ رُ) داگەڕان، دابەزین، هاتنەخوار(ەوە)، نیشتنەوە، بەرەوژێربوون، بەرەوخوارهاتن، هاتنەژێر لە سەرڕا، نشایش. خراوبوون و داڕمانی میچ و دیوار و شتی وا، هەرەس. **"فرودآوردن"**: (فُ رُ 1) هێنانەخوار، دابەزاندن، بەرەوخوارهێنان، وارنایش. 2) جێکردنەوە. 3) نرخی شتی هێنانە خوار. 4) نیشتەجێکردن. 5) داکێشان، هێنانەخوار. 6) ناردنە خواری. 7) دیاریکردن. **"فرود از"**: جگەلە، بێجگەلە. **"فرودانداختن"**: هێنانەخوار. ئاوێزان کردن. **"فرود ایستادن"**: وەستانەوە، خۆبواردن. **"فرودخوردن"**: خواردن، ووت دان. **"فرودرفتن"**: چوونەناو شتێ، تێخزان. چوونەخوارێ. **"فرودگرفتن"**: دەسگیرکردن، گرتن. هێنانە خوارێ.

**فرود:** (فَ رُ) تەنیا، تاقانە.

**فرودادن:** 1) خۆخواردنەوە. 2) قووت دان، قووت کردن، قوورت دان، قورتاندن، قورچاندن، هشاڤتن، دابەلاندن.

**فروداشت:** 1) هێنانەخوار، داکێشان. 2) درێغی، کۆتایی. 3) ئاکام و ئەنجامی کار. "**فروداشت کردن**": 1) لۆمەکردن، سەرزەنشت کردن. 2) بەچووك زانین، بەدەستیکەم گرتن. 3) درێغیکردن.

**فروداشتن:** 1) دانەواندن، چەماندن. 2) بڕوانە: "رها کردن". 3) ڕاگرتن، وێستاندن. 4) بە کۆتایی گەیاندنی کارێك بەتایبەتی نواندن و کۆتایی پیهێنانی پارچە مۆسیقایەك.

**فرودافت:** بڕوانە:"تنزل".

**فرودست:** ژێردەست، پەست و داماو. "**طبقات فرودست اجتماع**": چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵ.

**فرودش:** بڕوانە:"تنزل".

**فرودگاه:** فڕۆکەخانە، فڕگە، فڕینگەه، بالافرگە، نهشتۆك.

**فرودوختن:** بەستن، لێکنان(چاو).

**فرودویدن:** ڕەوان بوون.

**فرودیدن:** بە وردی تێڕوانین.

**فرودین:** (فُ رُ.دِ) 1) ژێرەوە، خوارەوە، نزمتر. 2) زەوینی.

**فرور:** جیاوازی.

**فروردن:** بەرهەم هێنان.

**فروردین:** خاکەلێوە، هەوەڵ مانگی بەهار.

**فرورشناس:** بڕوانە:"نکتەسنج".

**فرورفتگی:** داتەپیوی، تەپیوی، قووپاوی، ڕۆچوویی، چاڵایی، چاڵی، قووڵکە.

**فرورفتن:** 1) داچوون، ڕاچوون، ڕۆچوون، نەویبوون و قووپان، داتەپین، داتەپان، تەپین. 2) چەقان، چەقیان، چەقین، تێچەقین، داچەقین، بە عەرزاچوون. 3) خۆراوابوون. 4) مردن. 5) (تێ)چوون (حرف حساب به گوشش فرو نمیرود). 6) لیڕۆیشتن(میخ به دیوار فرو نمیرود). "**در خود فرو رفتن**": نوقم بوون لە خیاڵ و بیرۆکەکانی خۆ، چوونە ناو خۆوە، خۆخواردنەوە. "**درهم فرورفتن**": 1) حاڵەتی مۆنی و ناڕەحەتی بەخۆوەگرتن. 2) نیگەران و خەمبار بوون.

**فرورفته:** 1) قووپاو، ڕۆچوو، چەقیو، تەپیو. 2) نغرۆ، بەعەرزا چووگ. 3) تێپەڕیو، ڕابردو. 4) سەرقاڵ، خەریك. 5) خەمبار، خەمناك.

**فروریختن:** داباران، داباراندن، داباریـن، داوەرین، داوەراندن، داوەرانن، ڕژان، ڕژاندن، داتەپین، ڕووخان، تێك ڕووخان، داڕووخاندن، داڕماندن، ڕمان، ڕمیان، ڕمین، وڕای، تێك تەپێن، تەپیان، وەشین، هەڵ ڕژاندن، هەڵ ڕژتن، ورمان، وەرهین، هەڕماندن، هەڕفتن، هەڕمین، وەراندن. "**فروریخته**": ڕووخاو، تێك تەپیو، ڕماو، ڕمیاگ، داڕماو، داوەریو. "**از هم فروریختن**": 1) وێران بوون، لەناوچوون. 2) لێك هەڵوەشاندن، لێك بڵاوکردن.





**فروریزاندن:** ڕماندن، ڕووخاندن، سەتماندن، هەڕافتن، هەڕفاندن، هەڕفتاندن، داوەراندن، وەرانن، لە ژوور ڕا بەرەو خوار ڕژاندن.

**فروریزنده:** دابارێن، داوەرێن، داڕمێن.

**فروریزی:** داڕمان، داڕمین، داڕووخان، داوەرین، داوەران، وەرین، ڕژان، ڕێزای، لەسەرەوە بۆ ژێرەوە داڕووخان.

**فروز:** ڕووناکی، نوور.

**فروزان:** 1) بەدرەوشین، بەدرەوش، درەوشاوە، بریقەدەر، تابان. 2) داگیرساو، بڵێسەدار، ڕووناك کەرەوە.

**فروزاندن:** ڕۆشن کردن(ەوە)، ڕووناك کردن(ەوە).

**فروزدن:** تێخستن، تێڕۆکردن.

**فروزش:** ڕووناکی، ڕووناکایی، ڕۆشنایی، شۆق، تیشك.

**فروزشگر:** پێکەر، ڕووناك کەرەوە، دروشین.

**فروزنده:** 1) ڕووناك کەرەوە، ڕووناکیدەر. 2) ڕووناك، بەدرەوشین. 3) ڕازێنەرەوە.

**فروزه:** 1) تایبەتمەندی، سرشت. 2) ڕەوشت.

**فروزیدن:** 1) هەڵگیرساندن، پێکردن، هەڵکردن. 2) ڕۆشن بوونەوە، ڕووناك بوونەوە، ڕووناکیدان، درەوشانەوە.

**فروزینگی:** بڕوانە:"تنزل".

**فروزینەکردن:** پلەوپایە کەمکردنەوە.

**فروستردن:** سڕینەوە، پاك کردنەوە.

**فروسرخ:** تیشکی ژێر سوور.

**فروسو:** لای خوارەوە.

**فروسیت:** 1) سوارکاری. 2) ئازایی، دلێری.

**فروشدن:** 1) تێوەچوون، داچەقان، بەزەویداچوون، تێچەقین. 2) نوقم بوون. 3) خۆراوابوون، ونبوون. 4) کوژران یان مردن. 5) خەمۆك و خەمباربوون. 6) گرینگ و بەهێند وەرنەگیران.

**فروش رساندن ــ به:** فرۆشتن.

**فروش رفتن:** فرۆشران.

**فروشگاه:** فرۆشگە، شوێنی فرۆشتن.

**فروشنده:** فرۆشیار، فرۆشەر، فرۆتۆخ، کەسێ کە شت دەفرۆشی.

**فروشیدن:** بڕوانە:"فروختن".

**فروع:** کۆی"فرع".

**فروغ:** 1) ڕۆشنی، تیشك، پڕشنگ. 2) بڵێسەی ئاگر. 3) برەو، درەوشاوەیی. 4) هیوا بە ژیان.

**فروغ آمایی:** "فۆتۆسەنتێز".

**فروفرستادن:** ناردنەخوارەوە.

**فروفشاندن:** 1) پڕژانن، وەشاندن. 2) سڕینەوەی تەپوتۆز لەسەر شتێ یان کەسێك.

**فروکاستن:** هێنانەخوار، کەمکردنەوە.

**فروكاليدن:** هەڵاتن، ڕاكردن.

**فروكردن:** 1) تێخستن، تێڕاكردن، تێڕۆكردن، پیاكردن، پیاچەقاندن، تێچەقاندن، تێهەڵچەقاندن. 2) پانكردنەوە، ڕاخستن. 3) ڕشتن، ڕژتن. 4) كردنەوە. 5) درێژكردن. 6) هێنانەخوار. 7) چنینەوە یان داوەراندنی گوڵ و میوە. "**فروكننده**": پیاچەقێن، تێچەقێن، تێخەر، تێڕۆكەر.

**فروكشتن:** 1) كووژاندنەوەی ئاگر یان چرا، دامركاندنەوە، مراندنەوە، هێوركردنەوە. 2) بێدەنگ كردن.

**فروكش كردن:** نیشتنەوە، كەمبوونەوە، دامران، دامردن، دامردنەوە، دامركان، دامركیان، دامركین، دامركانەوە، لەكەمیدان. وەستانەوە، مانەوە لە شوێنێ.

**فروكشندوبرگشند:** بڕوانە: "جزر و مد".

**فروكشیدن:** 1) هێنانەخوار، بەرەوخوارهێنان. 2) كەمبوونەوە یان لە ناوچوون، خەوتنەوە(سروصدا فروكشید). 3) خواردنەوە. 4) هەڵكەندن. 5) لادان. 6) ڕاگرتن، وەستاندن.

**فروكلاندن:** بڕوانە: "تكاندن".

**فروكوفتن:** 1) بە زەوی دادانی كەسێك، داكوتانی بزمار یان شتیتر لە زەوی، لێدان و تێچەقاندن. 2) دەهۆڵ ژەندن. 3) ورد و خراو كردن. 4) لێدان، كوتەك لێدان.

**فروگذاری:** خەمساردی، كەمتەرخەمی، درێغی، كۆتاهی.

**فروگذاشتن:** 1 ) خستنە پشت گوێ، خۆتینەگەیاندن، گنخاندن، كەمتەرخەمی نواندن، درێغیكردن، تەنەخیكردن. 2) تووڕدان بەرەو خواری. 3) لەبیربردن، فەرامۆش كردن. 4) لێخۆشبوون، لێبوردن. 5) تەرك كردن، وازلێهێنان. 6) ڕەوان كردن. 7) بڕین، پێوان. 8) كێشانی شتی وەك پەردە بەسەر شتێكیدیدا.

**فروگذاشت كردن:** 1) تەرك كردن، پشت گویخستن. 2) درێغیكردن، تەنەخیكردن.

**فروگرایی:** بڕوانە: "افول".

**فروگرفتن:** 1) گەمارۆدان، ئابلۆقەدان، دەورەدان، چواردەورەگرتن. 2) داگیركردن. 3) بەستن، چاولێكنان. 4) پاك كردنەوە، سڕینەوە. 5) هێنانەخوار. 6) بڕوانە: "برداشتن". 7) گرتن، دەستگیركردن. 8) پڕكردن. 9) داخستن، بەستن.

**فروگشادن:** ڕەوان كردن.

**فروگشتن:** 1) خۆراوابوون. 2) ڕەوان بوون.

**فرومالیزم:** ڕێبازی شێوەیی.

**فروماندگی:** داماوی، تێماوی، بێچارەیی، كلۆڵی.





**فروماندن:** 1) دامان، تێمان، دەستەوەستان بوون، عاجزبوون. 2) نەبزووتن، ڕاوەستان. 3) سەرسووڕمان. 4) درزتێكەوتن و ئەنجام نەبوونی كارێ. 5) بێبەش بوون.

**فرومایه:** 1) پەست، نزم. 2) نەدار، دەسكورت. 3) كەم مایە، بیهونەر. 4) كەمووكە و كەم نرخ.

**فرومردن:** كووژانەوەی ئاگر یان چرا.

**فرومولیدن:** درەنگ كردن، پێچوون، خۆوەدواخستن، دواكەوتن.

**فروند:** 1) حەوشە. 2) قەڵا. 3) گۆڕەپان. 4) یەكە بۆ ژماردنی پاپۆڕ یان فڕۆكە.

**فرونشان:** بڕوانە: "مسكّن".

**فرونشاندن:** 1) هێنانەخوار. 2) تەمراندن، تەمرین، دامركاندن، كووژاندنەوەی ئاگر، كەمكردنەوەی تینی ئاگر. 3) سوكناییپێدان، ئارام كردنەوە.

**فرونشستن:** 1) نشتن، نیشتن، كەم كردنی بارستایی ئاو. 2) ڤەنشتن، خرتوخاڵ نیشتن. 3) كووژانەوە، دامركان، كەمبوونەوەی تینی شتی. 4) سوكنایهاتن، ئارام بوونەوە. 5) ڕووخان و داوەرینی دیوار یان میچ. 6) ڕۆچوون، تێچەقین (تیر در قلبش فرو نشست).

**فرونگر:** 1) تێڕوان، ئەوەی بڕوانێتە خوارەوە. 2) بریتی لە چاونەزێر، پایەنزم.

**فرونگریستن:** 1) ڕوانینە خوارەوە یان ناوەوەی شتێ. 2) موتالاكردن، تاوتوێكردن. 3) تێڕوانین، تواشاكردن.

**فرونهادن:** 1) دانان، دانیان، نانەسەر زەوی. 2) 2) دانانی شتێ لە جێیەكی قووڵدا. 3) درێژكردن. 4) پێكهێنان، بنیات نان. 5) پێشێلكردن. 6) ئەنجامدانی كارێك خستنە ئەستۆی كەسێك. 7) بڕوانە: "مطرح كردن". "**فرونهادن و برداشتن**": گفتوگۆكردن، باسكردن.

**فروهشتگی:** داهاتن، داهاتنەوە، داهێڵران، داڵۆچان، داڵۆچیان، داڵۆزان، داوەریان، شۆڕبوونەوە، بەرەوخواربوون، بەرەونزمیبوون.

**فروهشتن:** 1) داهێڵان، دائینان، داهێشتن، داكەواندن، داڵۆچاندن، داڵۆچاندن، دەحلاندان، داڕۆچكان، داڕۆچكاندن، شۆڕكردنەوە، شۆڕەوەكردن، نكساندن، خستنەخوارەوە. 2) دانان، دانیان. 3) هەڵدانی خێوەت و شتیوا. 4) خراوبوون. 5) ئاوێزان بوون، هەڵواسران.

**فروهشته:** داهێڵراو، شۆڕەوەبووگ، شۆڕەوەبوو، داڕۆچكاو، داڕۆچكە، داڵۆچكە، داڵۆزكە.

**فروهلیدن:** 1) بڕوانە: "فروهشتن". 2) تەرك كردن، بەجێهێشتن، وازهێنان، دەست لیبەردان.

**فروهیده:** ژیر، بەئاوەز، زانا. شیاو.

**فرویدیسم:** بنەماکانی بۆچوونی زیگمۆند فرۆید دەروون پزیشکی ئوتریشی کە سەرچاوەی زۆربەی دۆخە ڕۆحی و مەیلەدەروونییەکانی مرۆڤی لە وارسکەی سێکسییەوە دەزانی.

**فرویش:** 1) درەنگ، خافڵان، گوێنەدان بەکار، درێغی و کەمتەرخەمی. 2) (ڕۆژی) پشوو.

**فرهانج:** بڕوانە:"بختك".

**فرهختن/فرهیختن:** پەروەردەکردن، ئەدەب کردن، بارهێنان. "**فرهختە/فرهیختە**": هەڵکەوتوو، خاوەن زانست و فەرهەنگ. پەروەردەکراو، ڕاهێنراو.

**فرهست:** 1) زۆر، فرە. 2) سێحر، جادوو.

**فرهمند:** 1) کاریزما. 2) بەشکۆ، بەشان و شکۆ. 3) زانا، بەئاوەز.

**فرهنج:** بڕوانە:"فرهنگ".

**فرهنجیدن:** 1) ئەدەب کردن، پەروەردەکردن، بارهێنان. 2) تەمبیکردن یان سزادان.

**فرهنگ:** 1) کولتوور، چاند. 2) وشەدان، فەرهەنگ، "قاموس". 3) زانست. 4) ئاوەز، ئەقڵ. 5) تەگبیر، چارە. ئەدەب و شعوور یان پەروەردەی کۆمەڵایەتی. "**فرهنگ عوام**": فولکلۆر. "**فرهنگ کشیدن**": (کشتوکاڵی) خەواندنی لکی دار و خۆڵ کردن بەسەریدا بۆ ڕیشەداکوتان یان نەمام لێکەوتنەوە.

**فرهنگستان:** 1) کۆزمان، ئاکادێمی. 2) قوتابخانە، شوێنی پەروەردە و فێرکردن.

**فرهنگنامە:** 1) ئینسکلۆپیدیا. 2) نامەیەك هەڵگری بابەت گەلی ئەدەبی و زانستی.

**فرهنگ نویس:** فەرهەنگ نووس، قاموس نووس.

**فرهنگی:** 1) کولتووری، فەرهەنگی. 2) ئەوەی لە وەزارەتی پەروەردەوفێرکردن دا کار دەکا، وانەبێژ، مامۆستا. 3) ئاگا لە دابونەریت و ڕێوشوێنەکانی تێکەڵ بوون و هەڵسووکەوت کردن.

**فرهودی:** ڕاستەقینە، واقیعی.

**فرهومند:** بڕوانە:"فرهمند".

**فرهی:** شکۆ.

**فرهیب:** مەکر، فێڵ، فریو.

**فری:** 1) پیرۆز، موارەك. 2) بەشکۆوپیرۆز. 3) سەرسامکەر، سەیروسەمەرە. 4) کاتی هاندان و ئافەرەم پێگوتن دەوترێ، ئافەرەم.

**فریاد:** حەیچە، هاوار، حەوار، حەواری، گازی، هنا، قوول، قوولا، دەنگ بەرزەوەکردنی توند. "**فریادبرآوردن**": هاوارکردن، دەنگ هەڵێنان. یارمەتی خوازتن. "**فریادبرداشتن**": هاوارکردن، قوولاندن. "**فریادبردن**": داوای یارمەتی





کردن. "**فریادخواستن ( جستن، خواندن )**": یارمەتی خوازتن، داوای یارمەتیکردن، هاناویستن. "**فریادداشتن**": هاوارکردن، ناڵەکردن. "**فریادزدن**": 1) هاوارکردن، قوولان(دن). 2) بەڕوونی دەرخستن. "**فریادکردن**": 1) هاوارکردن. ڕاگەیاندنی شتێ لە ناخی دڵەوە بە ڕوونی و ڕاشکاوی. 2) ناڵە و هاوارکردن بە نیشانەی نارەزایەتی یان سکاڵا لە کەسێ یان شتی. "**فریادکشیدن**": هاوارکردن. "**فریادکنندە**": هاوارکەر، هاوارکرۆخ، زیرەکەر. "**بە فریاد کسی رسیدن**": بە هانای ئەو گەیشتن، بەدەنگەوەچوونی ئەو، یارمەتیدانی ئەو.

**فریاخوان:** بڕوانە:"فریادخواە".

**فریادخواە:** دادخواز، دادبەر، شکایەتکەر.

**فریادرس:** دادڕەس، هانابەر، فریاڕەس، بەدادگەیشتوو، غەوس.

**فریادرسي:** بەهانای کەسێك گەیشتن، یارمەتی و دەسگیرۆیی.

**فریادرسیدن:** فریاکەوتن، بەهاناوەچوون، یارمەتیدان.

**فریب:** فێڵ و مەکر، ئۆین، فریو، خاپان، تەفرە، کەتن، لاس، خەڵەت، هەڵخەڵەتان. "**فریب خوردگی**": دەسخەڕۆیی، فریوخواردوویی، خەڵەتان، حاڵەتی هەڵفریواو. "**فریب خوردن**": خڵەتان، خەڵەتان، هەڵخەڵەتان، هەڵفریوان، خڵافان، خڵەفان، فریوخواردن، فریودران، فریویان، بەفریوچوون، لەخشتەچوون، لاس خواردن، غەرین، دەسخەڕۆبوون، تەفرەخواردن. "**فریب خوردە**": خەڵەتاو، خڵەتاو، خەڵەفاگ، خەڵەفاو، خڵافیو، خڵەتیاگ، هەڵخەڵەتاو، هەڵخراو، تەفرەدراو، دەستەشکاو، دەسەشکێن، فێڵ لێکراو، خەرۆ، فریودراو، فریوخواردو، فریوخۆر، خاپاندی، دەسخەڕۆکراو، ئەموست بەستە. "**فریب دادن**": خاپاندن، ڤەخاپاندن، خافڵاندن، خڵافاندن، خڵەفاندن، خڵەتاندن، خەڵەتاندن، خەڵەتانن، فریودان، هەڵفریواندن، لاباندن، کڵاوسەرنیان، لاسدان، لەخشتەبردن، غەڕاندن، دەسخەرۆکردن، تەفرەدان، (کەتن)پێکردن، کەرکردن، بەهەڵەبردن، هەپەنان، شاف پیهەڵگرتن. "**فریب دهندە**": فریودەر، خاپینۆك، گزیکار، دەزبڕ. "**فریب زدن**": بڕوانە:"فریب دادن".

**فریبا:** 1) زۆر جوان و دڵڕفێن. 2) فریبۆك، خاپینۆك. 3) فریوخواردو، خەڵەتاو.

**فریبانیدن:** بڕوانە:"فریب دادن".

**فریبرز:** باڵابەرز، خۆش قەڵافەت.

**فریب ساز:** فریودەر، تەڵەکباز، خەڵەتێن، ئۆین باز، دەسبڕ.

**فريبش:** فريودان، هەڵخەڵەتاندن، خاپاندن، لەخشتەبردن.

**فريبكار:** فريودەر، خاپێن، خڵەتێن، هەڵخەڵەتێن، خاپينۆك، هەڵخەڵەتێنە، كەلاجۆيە، فێڵباز، فريوباز، مەكرباز، درۆهەڵبەست. "**بسيار فريبكار**": خاپينۆك، زۆر دەزبڕ و فريودەر.

**فريبناك:** بڕوانە: "فريبندە".

**فريبندە:** 1) خەڵەتێن، فريودەر، فريبۆك، خاپينۆك، تەفرەدەر. 2) زۆر جوان و دڵگر يان دڵخۆشكەر.

**فريبيدن:** بڕوانە: "فريفتن".

**فريد:** تەنيا، تاقانە، بێوێنە.

**فريز:** كردنەسەهۆڵ يان بوونەسەهۆڵ.

**فريزر:** قەرسينك.

**فريرون:** بڕوانە: "فرارون".

**فريس:** كوژراو.

**فريسە:** نێچير.

**فريش:** (فَ رِ) 1) ئافەرەم، بژى. 2) پەرێشان، بڵاو.

**فريضە:** واجب، ئەرك.

**فريفتار:** فريودەر، خەڵەتێن، فێڵەباز، گەڕساز.

**فريفتگى:** دەسخەڕۆيى، هەڵفريواوى. شەيدايى.

**فريفتن:** 1) فريودان، خڵەتاندن، هەڵخڵەتاندن، كلاولەسەرنان، گومڕاكردن، بەلاڕێدابردن. 2) بڕوانە: "فريب خوردن".

**فريفتە:** 1) خاپاندى، فريبياگ، فريوخواردو، هەڵخەڵەتاو. 2) شەيدا، ئاشق. 3) زيان كردو، زيان ديتو.

**فريق:** دەستە، گروپ.

**فريقين:** 1) دوو گروپ. 2) شيعە و سوننى.

**فريواندن:** بڕوانە: "فريبانيدن".

**فريوتن:** بڕوانە: "فريفتن".

**فريور:** ئەمەگدار، بەوەفا، پابەند.

**فريورى:** بڕوانە: "استقامت". دوگما.

**فريە:** نەحلەت.

**فزار:** ئامراز، كەرەسە.

**فزاييدن:** بڕوانە: "افزودن".

**فزون:** زۆر، فرە، زياد.

**فزون خواهى:** زێدەخوازى.

**فزونژاد:** بڕوانە: "حشرى".

**فزونساز:** ئامپليفاير.

**فزون گسارى:** زێدەڕۆيى، دەست پێوەنگرتن.

**فزون گويى:** درێژدادڕى، فرەوێژى.

**فزون واژى:** درێژدادڕى.

**فزونى:** 1) بڕوانە: "افزايش". 2) لەسەرترى. 3) سامان، دارايى. 4) زێدەخوازبوون. 5) زيادى. "**فزونى گرفتن**": زياتربوون، زۆربوون، بەرزبونەوە. "**فزونى يافتن**": 1) بڕوانە: "فزونيگرفتن". 2) لەسەرتر و زاڵبوون.

**فژاك:** چركن، چڵكن، چڵيك، چەپەڵ، پيس، پەڵۆخ، قەلێر، گەمار، كەرەھ، پۆخڵ، ناپاك.





**فژاگن:** پيس، پۆخڵ، چڵكن.

**فژگندى:** بڕوانە: "نجاست".

**فژوليدن:** (فَ ژُ.لِ.دَ) بڕوانە: "افژوليدن".

**فژوليدن:** (فِ ژُ.لِ.دَ) بڕوانە: "پژوليدن".

**فژە:** چڵكن، پيس، پەڵۆخ.

**فساحت:** 1) هەراوى، بەربڵاوى. 2) توانايى و لێهاتوويى لە ئەنجامدانى كارێكا.

**فساد:** 1) (ئابوورى) گەندەڵى. 2) فيتنە و ئاژاوە. 3) كەم نرخ بوونەوە يان لەناوچوونى بنەما ئەخلاقى و پەروەردەييەكان. 4) ڕزاوى، پواوى، خراوى. 5) ئەنجامدانى كردارى دژەئەخلاقى يان دژەئاييني. "**فساد انگيختن**": گێچەڵ و ئاژاوەنانەوە. "**فسادكردن**": 1) فيتنە و ئاژاوەنانەوە. 2) شۆفاريكردن و دوژمنايەتى سازكردن. 3) تووشى كردارى دژئيەخلاقى يان دژەئاييني بوون. "**فساد كشيدن**": بڵاوكردنەوە و پەرەپێدانى گەندەڵى و خراپەكارى لە شوێنێ.

**فسانە:** بڕوانە: "افسانە". "**فسانەشدن**": 1) ناوبانگ ڕۆيشتن، ناودەركردن. 2) كۆن بوون و لەبيرچوونەوە.

**فسانيدن:** ساوين، هەساوين، هەسان لێدان.

**فسايدن:** جادووكردن. دەستەمۆكردن.

**فستينگ:** (پزيشكى) پێش نان خواردن، لەخورێنى.

**فسخ:** 1) پووچەڵ كردنەوە، هەڵوەشاندنەوە، تێكدانى مامڵە. 2) چوونى ڕۆح لە لەشى مرۆڤەوە بۆ ناو جەستەى گەناور. "**فسخ عزيمت**": وازهێنان لە بڕيار يان بۆچوونى خود.

**فسرانيدن:** 1) كردنەسەهۆڵ، قراندن. 2) خەست كردنەوە.

**فسردن:** 1) بڕوانە: "خاموش شدن". 2) سەهۆڵكردن. 3) سڕبوون، تەزين. 4) نارەحەت بوون.

**فسق:** (فِ) دەرچوون لە فەرمانى خوا، دەرچوون لە ڕێگەى هەق و ڕاستى. هەر كارێكى ناحەز و غەيرەئەخلاقى و حەرام، خراپەكارى. "**فسق و فجور**": كارگەلێ كە ئەنجامدانى ياساغ يان گوناحە.

**فسونگر:** بڕوانە: "افسونگر".

**فسيح:** هەراو، بەرين، بەربڵاو.

**فسيل:** لە زاراوەى زەويناسيدا: بريتييە لە ئاسەوار و پاشماوەى بوونەوەرانى زيندووى سەردەمانى كۆن "ئاژەڵ يان ڕوەك" كە ساڵانێكى زۆر لە چينەكانى زەويدا ماونەتەوە، فوسيل. "**سوختهاى فسيلى**": نەوت و بەرد و ڕەژى.

**فسيل شناسى:** بڕوانە: "ديرين شناسى".

**فشار:** (فُ) قسەى بيبناغە.

**فشار:** گوشار، زەخت، تین، تەوژم، حوججەت، حونجەت، گڤاش، گەرمش، پاڵەپەستۆ، نهێم، لێش، زۆر، بەهێز و قوەت. **"فشارآوردن"**: تەوژم دان، زۆر بۆ هێنان، زوربەساندن، هێرش هێنان، تین هێنان، سەرداگرتن، گەرمەشاندن، ڕێکهێنان. **"فشاردادن"**: 1) گوشین، کوشین. 2) نزیك کردنەوە و پێکەوە چەسپاندن بە گوشار. 3) ئازاردان. **"زیر (تحت) فشار بودن"**: لەژێر گوشار دابوون.

**فشارخون:** خوێن جمان، تەوژمی خوێن، پەستانی خوێن، پاڵپەستۆی خوێن.

**فشاردن:** 1) گوشین، کوشین. 2) خستنەژێر گوشارەوە یان خستنە تەنگانەوە.

**فشارسنج:** ئامرازی پێوانی گوشار، گوشارپێو.

**فشارش:** کردەی گوشین.

**فشارنگار:** ئامێرێکە بۆ کێشانی تەوژمی هەوا، "بارۆگراف".

**فشانش:** بڕوانە:"فوران".

**فشردن:** 1) وشاردن، وشین، حەشکاندن، گلۆفین، گڤاشتن، هەل گوڤاشتن، گۆڤشاندن، هل گوهاشتن، هەڵ گلۆفان، هەڵ گولۆفان، هەڵگلۆفین، گواشتن، گوشیان، گوشین، گۆشین، کوشین، تەوژم دان، خوشار. 2) خستنەژێرکاریگەری و نارەحەت کردن. 3) خۆبواردن لە خەرجکردن، قرنیسی. 4) ئازاردان، ئەشکەنجەکردن. **"درهم فشردن"**: ڕێك گوشین، ڕێکهێنان.

**فشردنی:** گوڤشك، هەر شتێ کە دەبێ بگوشرێ.

**فشرده:** 1) بڕوانە: "فشردەشدە". 2) پوختە، کورتە. 3) کەم، کورت یان بەرتەسك. 4) خەمبار، نیگەران. 5) بەشێوەی پوخت و کورت.

**فشردهشدن:** گوشران، کوشران، گلۆفان، وشان، تێك ترنجان، وێکهاتن، تێك پەستێوران.

**فشردهشده:** گوشراو، کوشراو، گلۆفیاگ، وشاو، وشای، وشیا.

**فشل:** 1) ترس، خۆف. 2) سستی، تەوەزەلی.

**فصاحت:** قسەڕەوانی، ڕەوانبێژی، زمان پاراوی، دەم و دوو، دەم و پل.

**فصال:** (فِ) لە شیربڕینەوەی منداڵ.

**فصل:** 1) جیاکردنەوە، بڕین و لێکردنەوەی شتێ، جیکردنەوەی هەق و ناهەق. 2) پار، نەکسە، بەش. 3) بەربەست، لەمپەر. 4) دەورە، قۆناغ. **"فصل به فصل"**: لە مەوداگەلێکی کاتی کەمدا، پشت سەرییەك. **"فصل سال"**: وەرز، کژ، هەڤرونگ. **"فصل کردن"**: بڕین، پچڕین. یەکالاکردنەوە و بەئەنجام گەیاندن.





**فصل الخطاب:** ئەوەی نێوان هەق و ناهەق یان دروست و نادروست جیابکاتەوە.

**فصل بندی:** پاربەندی.

**فصل نامه:** وەرزنامە، بڵاوکراوەیەك کە هەر وەرزەی جارێك دەردەچی.

**فصلی:** وەرزی.

**فصول:** کۆی"فصل".

**فصیح:** 1) وتەپاراو، دەماوەر، قسەڕەوان، ڕەوانبێژ، بەدەم، بەدەم و پل، لەبلەبان، دەم پاراو، زماندار. 2) بەشێوەی ڕوون و ئاشکرا، دوور لە لێڵی و ناڕوونی. 3) ڕەوان و پاراو.

**فضاء:** کەش، بۆشایی، فەزا. شوێنی بەربڵاو، هەراویی زەوی. **"فضای مه‌آلود"**: خەور، دنیای بەتەم و مژ.

**فضائل:** کۆی"فضیلت".

**فضاحت:** بڕوانە:"رسوایی".

**فضانورد:** کەش پێو، بۆشاییگەڕ، ئاسمان گەڕ، ئەوەی بۆ دەرەوەی کەشی زەوی سەفەر دەکا.

**فضل:** لەسەرتری لە زانست و ئاکار یان هونەردا. 2) زانست، زانیاری. 3) سەرنج، بەزەیی، چاکە(چاکەیەك کە لە خوداوە دەگا). 4) بڕوانە:"افزونی". 5) دڵاوایی و بەخشندەیی. **"فضل فروختن"**: خۆ لە کەسانیتر لەسەرتر و بانتر دانان.

**فضلا:** 1) زاناکان، بیرمەندان، خاوەن زانیارییەکان. 2) ئەوانەی لە زانست و ئاکار یان هونەردا لە خەڵکانی دیکە لەسەرترن.

**فضل فروش:** خۆنوێن بە زانست و زانیاری، ئەوەی کە زانست و زانیاری خۆی بە ڕووی خەڵکانی دیکەدا دەداتەوە.

**فضوح:** بڕوانە:"رسوایی".

**فضول:** 1) دڕدوك، هەڵقوتێن، خۆتێهەڵقوتێن، لاپرەسەن، لاپرەسەنگ، لاپلەرسەنگ، لاپواز، لاکوت، لابەلا، لابەلایی، سەنگەڵ قۆ، دەست بشول، ڕەگەڵ ڕەگەڵ. 2) قسەی قۆڕ و بیهوودە. 3) هەواوهەوەس. 4) زێدەخوازبوون، بەئێرەیی، تەماکاری. 5) هەرشتێکی زیادی و بیکەڵك و بۆ فڕێدان بشی. **"فضول ناشناس"**: لاپواز، لاپلار، خۆتێهەڵقوتێنی سەربەخۆ.

**فضولات:** 1) هەرشتێکی زیادی و بیکەڵك و بۆ فڕێدان بشی. 2) ئەو شتانەی لە دەرەوەی پێویستییەکانی ڕۆژن. 3) چەنەلێدانەکان، درێژدادرییەکان.

**فضولانه:** لاپرەسەنانە، خۆتێهەڵقوتێنانە.

**فضولی:** 1) سەرکێشان، خۆتێهەڵقوتاندن، سەرەتاتکێ کردن، قوتەقوت، کاری لاپرەسەن. 2) بڕوانە: "یاوەگو". 3) زێدەخواز، فرەخواز.

**فضیحت:** 1) بڕوانە:"رسوایی". 2) قسەی ناحەز و بێئەدەبانە. **"فضیحت کردن"**: 1) ئەنجامدانی کاری ناحەز و ناڕەوا. 2) بەدناو یان بێئابڕووکردنی خۆ یان کەسانی دیکە.

**فضیلت:** لەسەرتری لە زانست و هونەر یان ئاکاردا. 2) نرخ و گرینگی، شەرەف. 3) تایبەتمەندییە باشە ئەخلاقییەکان.

**فطانت:** 1) تێگەیشتن، سەردەرکردن. 2) زیرەک و بیرتیژبوون، زیرەکی.

**فطر:** بەربانگ کردنەوە، ڕۆژووکردنەوە.

**فطرت:** 1) تایبەتمەندییە جەوهەرییەکان، سرشت. 2) بڕوانە:"آفرینش".

**فطرتاً:** بەشێوەی سرشتی.

**فطری:** سرشتی.

**فطریە:** 1) سەرفترە، سەروترە، باجی گەنم یان دانەوێڵە بەهەر موسوڵمانێ. 2) سرشتی.

**فطن:** هوشیار، وریا، زیرەک و زانا.

**فطور:** بەربانگ کردنەوە.

**فطیر:** 1) (بۆ هەویر)هەڵ نەهاتوو. 2) کاڵ، ناتەواو، کەم نرخ.

**فعال:** (فِ) کۆی"فعل"، کارەکان، کردارەکان.

**فعال:** (فَ) کاریچاک، جوامێری.

**فعّال:** (فَ) 1) کارا، کارکو، پرکار، بەکار، چالاك، چالاکوان، هەڵسووڕ(او)، ئەکتیف. 2) لە حاڵی چالاك(کار)ی یان ئامادە بۆ کاری(بازار فعال، سایت فعال، مین فعال). **"حضورفعّال"**: بەشداری چالاکانە.

**فعالیّت:** 1) چالاکی، هەوڵ و تەقەلای زۆر، بەکاری. 2) خەریك بوون بە کارێکەوە، مژوولی. 3) کار، ئیش. **"فعالیّت داشتن"**: 1) هەوڵدان، تێکۆشان. 2) خەریك بوون بە کارێکەوە. 3) چالاك بوون، هەڵسووڕبوون.

**فعل:** 1) کار، ئیش. 2) (لە ڕێزماندا) فرمان، کار. 3) کردار، ڕەفتار. 4) مەکر، فێڵ. **"فعل کردن"**: ئەنجام دان، جێبەجێکردن. **"فعل و انفعال"**: 1) کاریگەری دوولایەنە، کردەوە و دژکردەوە، کارتێکردن و کارتێکران. 2) بڕوانە: "عملکرد". **"به فعل آوردن"**: جێبەجێکردن، خستنەخانەی کردەوەوە.

**فعلاً:** 1) بەکردەوە، لەڕێگەی کار و کردەوەوە. 2) بڕوانە:"اکنون".

**فعلە:** کرێکار، کرێگرتە. **"فعلگی"**: کرێکاری، کرێگرتەیی.

**فعلی:** 1) هەنووکەیی، ئێستایی. 2) (لە ڕێزماندا)": فرمان دار. **"جملە فعلی"**: ڕستەی فرمانی، ڕستەی فرمان دار، ڕستەی بەفرمان.

**فعلیار:** بڕوانە:"همکرد".

**فعلیّت:** 1) قۆناغی جێبەجێ بوونی بابەتێ یان کارێ، لایەنی بەکردەیی بوونی شتێ. 2) کار، کردەوە. 3) دەرکەوتنی وزە و توانا شاراوەکان. 5) ئێستاییبوون، سەردەمیبوون. **"فعلیّت دادن( بخشیدن )"**: گەیاندنە قۆناغی جێبەجێکردن، خستنە خانەی جێبەجێکردنەوە، پراکتیزەکردن. **"فعلیّت یافتن"**: دەستەبەربوون، وەدیهاتن، کەوتنە قۆناغی جێبەجێبوون.





**فغاك:** نەزان، گەوج.

**فغان:** داد، هاوار، ناڵە. **"فریاد و فغان"**: گازگاز، داد و هاوار، هەراوهوریا، هاوار و ناڵە. **"بە فغان آمدن"**: کەوتنە ڕەنج و ئازارەوە و هاوار و ناڵەکردن.

**فغستان:** 1) بوتخانە. 2) حەرەمسەرا.

**فغند:** سەما، هەڵبەزدابەز.

**فقاهت:** زانایی لە حوکمە شەرعییەکاندا.

**فقد:** ون کردن، لیونبوون.

**فقدان:** 1) نەبوون. 2) ونبوون. 3) ون کردن، لەدەستدان، لەدەست چوون.

**فقر:** 1) دەسکورتی، دەستەنگی، نەداری، هەژاری. 2) کەمی(فقر معلومات، فقرغذایی). **"فقرزدایی"**: لەناوبردنی نەداری و دەسکورتی لە کۆمەڵگادا، هەژاری سڕینەوە.

**فقراء:** کۆی"فقیر".

**فقرە:** 1) یەکەی ژماردنی بابەتی یان کاری یان ڕووداوی. 2) جار، کەڕەت. 3) بڕوانە:"موضوع". 4) هەرکام لە بەشە دەست نیشان کراوەکانی نووسراوە یان یاسا و هتد، بەند، بڕگە. 5) چووك، سیرەت، کیر. 6) هەرکام لە مۆرەکانی پشتەمازە، بڕبڕە.

**فقط:** تەنیا، بەس. **"فقط و فقط"**: تەنیا و تەنیا.

**فقە:** شارەزایی لە حوکمە شەرعییەکاندا و گونجاندنیان دەگەڵ مەسەلەکانی ڕۆژانەی ژیان، ئایینزانی.

**فقهاء:** کۆی"فقیە".

**فقه‌اللغه:** زمان ناسی.

**فقید:** کۆچکردو، لەدەست چوو.

**فقیر:** دەس تەنك، دەس تەنگ، دەسکورت، نەدار، هەژار، بیماڵ. **"فقیرفقرا"**: نەداران، دەسکورتان.

**فقیە:** زانیار، تۆرەڤان، زانا لە حوکمە شەرعییەکاندا، ئایینزان.

**فکاهت:** گاڵتەبازبوون، قسەی پێکەنیناوی وتن و پێکەنین. گاڵتە، حەنەك، شۆخی.

**فکاهی:** تێکەڵ بە تەنز و شۆخی.

**فکر:** 1) هزر، بیر، فکر. 2) زەین. 3) بەرهەمی چالاکی زەین. 4) ئاوات یان بەرنامە بۆ ئەنجامدانی کارێك. **"فکربکر"**: بیرۆکەیەك کە بە مێشکی کەس نەگەیشتبێ، بیری نوێ. **"فکر کردن"**: بیرکردنەوە، ڕاوێچکەکردن. 2) وازانین، خەیاڵ کردن. **"فکر کسی را خواندن"**: خوێندنەوەی بیر و هزری ئەو. **"فکرهای خود را کردن"**: بەتەواوی سەبارەت بە شتێ بیرکردنەوە و بڕیاری یەکجارەکی دان. **"فکر همه جایش را کردن"**: هەڵسەنگاندنی هەموو لایەنەکان، بیر لە گشت جێیەکی کردنەوە. **"از فکر چیزی(کسی) بیرون آمدن"**: بیر لەو نەکردنەوە، پێوە خەریك نەکردنی زەین. **"بەفکر افتادن"**: کەوتنە فکرەوە، بڕیاردان. **"به فکر فرو رفتن"**: چوونە فکرەوە. **"به فکر کسی آمدن"**: بە زەینی ئەو گەیشتن. **"بەفکر کسی (چیزی) افتادن"**: کەوتنە فکری ئەو، هێنانەوە بیر. **"تو(در) فکر بودن"**: لە فکرابوو. ویستن.

**فکری:** 1) هزری، فکری. 2) سەرسام، واق وڕ(فکریام چگونه این اتفاق افتاد). 3) دەفکرەوەچوو، سەرقاڵ.

**فکسنی:** 1) کۆن، ڕزیو، لەکارکەوتو. 2) کەم نرخ. 3) لاواز، بیهێز.

**فك کسی را پیاده کردن:** بە توندی لێدان.

**فکندن:** بڕوانە:"افکندن".

**فکور:** 1) بەبیر، بەئاوەز، ئاوەزمەند، زانا. 2) لە حاڵی فکر دا.

**فك و فامیل:** خزم و کەسوکار.

**فگار:** بڕوانە:"افگار".

**فگارگر:** ئازاردەر، ڕەنجێن.

**فگانه:** بڕوانە:"افگانه".

**فلات:** 1) ڕایەڵ، تا، هەودا، لۆ. 2) دەشتی بی ئاو و ڕوەك، دەشتی کاکیبەکاکی. 3) بان، بانوو، بوڕگە. "**فلات قارّه**": لەپی دەریای هاوسێی هەر وڵاتێ کە لە بواری سروشتییەوە بەشێکە لەو وڵاتە و مافی کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەی سامانەکانیشی تایبەتە بەو وڵاتە. بەشی لە هەرێمی تەسکی ئۆقیانووس لە لێوارەکەیەوە تا قووڵایی دووسەد میتر کە زۆرتری خرتوخاڵەکان لەوێدا دەنیشنەوە.

**فلاح:** (فَ) ڕزگاری، سەرکەوتن.

**فلاّح:** (فَ) وەرزێر، جووتێر، کشتیار، فەلا.

**فلاحت:** جووتیاری، وەرزێری.

**فلاخن:** بڕوانە:"قلاسنگ".

**فلاد:** بڕوانە:"هذیان".

**فلاده:** بلّح، پووچ، بێهوودە. قسەی بیمانا.

**فلاسفه:** کۆی"فیلسوف".

**فلاسنگ:** بڕوانە:"فلاخن".

**فلاش بك:** گەڕانەوە بۆ ڕابردوو/دواوە لە چیرۆك یان فیلم دا.

**فلاکت:** بێچارەیی، نەداری و بەدبەختی، چارەڕەشی.

**فلان:** کاورا، هین، ئەوەکە، ناوی نادیار، فران، فیسار، فیسارە، فیستار، گۆیین. "**فلانی**": جبۆ، چەتور، حەیرا، کاورا، فلانی، فلانەکەس، فرانەکەس، فیسارەکەس. "**(بە) فلان کسی هم نبودن**": بەتەواوی بەلاوە گرینگ نەبوون بۆ ئەو. "**بە فلان گاو زدن**": خەرجی بێهوودە کردن.

**فلج:** شەپلّەلێدراو، گەپۆل، لەپۆل، کوچ، لەسم، شەهت، دەست و پی شل و بیهەست. لەجێداکەوتن و پەککەوتن. "**فلج شدن**": لە دەست و پی کەوتن، شەپلّەلێدان. ڕاوەستان یان بیبرەوبوون. "**بیماری فلج**": شەپلّە، قرۆپ، قرۆت.

**فلخ:** سەرەتا، دەسپێکی کارێك.

**فلخمیدن:** هەلاجیکردن.

**فلز:** کانزا، ویرە، مێتاڵ. "**فلزی**": کانزایی، لە جنسی کانزا، چێکراو لە کانزا.

**فلسفه:** 1) تێفکرین و قووڵبوونەوە لە پرسە زانستییەکان، زانستێ کە سەبارەت بە بناخە و هەقیقەتی شتەکان و هۆکاری





بوونیان دەدوێ، فەلسەفە. 2) هۆ. "**فلسفه اولی**": (فەلسەفەی کۆن) لقێ لە زانستی کۆن کە سەبارەت بە بابەت گەلێك دەدوێ کە نە لە زەیندا و نە لە دەرەوەدا پێویستی بە مادده نیە. "**فلسفەباڤتن**": بەڵگەگەلی پووچ و بێبناغە هێنانەوە. "**فلسفه عملی**": فەلسەفەی کردەیی، لقێ لە فەلسەفە کە لە کردەوە وەك بناغەی هزر دەڕوانێ. "**فلسفەوجودی**": فەلسەفەیبوون، هۆی سەرهەڵدانی شتێ.

**فلسفەبافی:** فلّتەفلّت، قسەی گران کە تێگەیشتنی دژوارە. ڕادەربڕینی دوور لە لۆژیك، هەوڵدان بۆ سەلماندنی قسە و بۆچوونی خۆ بە بەڵگەگەلی سست و بیبناغە.

**فلسفه پرداز:** فەلسەفەوێژ.

**فلك:** 1) گەردوون. 2) ڕۆژگار.

**فلك زده:** چارەڕەش، بەدبەخت، نەدار. "**فلك زدگی**": بەدبەختی و دەسکورتی.

**فلنگ را بستن:** هەڵاتن بەشێوەی نهێنی، خۆدزینەوە، قوونەدزەکردن، فیزماڵك دان.

**فلوات:** کۆی"فلات".

**فلیو:** پووچ، بیفایدە، بێکارە.

**فمینیسم:** مێخوازی، بزووتنەوەی لایەنگری لە مافە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ژنان.

**فن:** 1) کارێ کە پێویستی بە لێزانی و ئەزموون و ئاگایی هەبێ. 2) تێکنیك، فەن. 3) هونەر. 4) جۆر، چەشن. 5) مەکر، فێڵ، تەڵەکە. "**فن آور**": تێکنۆلۆجیست. "**فن آورانه**": تێکنۆلۆجیکاڵ. "**فن آوری/ فناوری**": تێکنۆلۆژی. "**فن سالار**": تێکنۆکرات. "**فن سالارانه**": تێکنۆکراتیك. "**فن سالاری**": تێکنۆکراسی. "**فن ورز**": تێکنیسیێن.

**فناء:** لەناوچوون، تیاچوون، ئاسەواربڕان. "**فناءشده**": بنەبڕبوو، لەناوچوو، ئاسەواربڕاو، بالمیش.

**فنانا پذیر:** تاهەتا، نەمر، هەرمانی.

**فنانا پذیری:** تاهەتایی.

**فناتیسم:** دەمارگیری وشك و زێدەڕۆیانەی ئایینی

**فناتیك:** دەماروشك، دەمارگرژ، کەسێ کە کوێرکوێرانە پێڕەوی لە مەرامێ دەکا.

**فناکده:** دنیای ناپایەدار.

**فنّان:** هونەرمەند، خاوەن تێکنیك.

**فنجیدن:** باوێشك دان لە حاڵەتی خوماری یان خەواڵوویدا.

**فنداسیون:** بناغە، بنچینە.

**فندمنت:** بناغە، بنچینە.

**فندمنتال:** 1) بنەڕەتخواز، بناژۆ. 2) بنچینەیی، بناغەیی.

**فندمنتالیسم:** بنەڕەتخوازی، بناژۆیی، فەندەمەنتالیزم.

**فنومن:** (فەلسەفە) دیاردە، شوێنەواری سروشتی، ئاسەواری بەرهەست. ئەوەی حاڵەتی ناسروشتی یان سەیری هەبێ. شتی دەگمەن و کەم وێنە.

**فنومنالیزم:** ڕێبازی دیاردەکان.

**فنومنولوژی:** زانستی دیاردەکان.

**فنون:** 1) کۆی"فن". 2) جۆرەکان، چەشنەکان. "**فنون جمیله**": هونەرە جوانەکان وەك مۆسیقا. شیعر. نیگارکێشی.

**فنّي:** فەننی، پسپۆڕانە. لێزان و ئاگا لە تێکنیکێکی تایبەت.

**فوائد:** کۆی"فائده".

**فواحش:** کۆی"فاحشه".

**فوّاره:** کوفارە، فیچقە، قوڵقوڵە، کوڵکوڵە، کفارە، فوارە، فوویرەك، پیت، بەتەوژم بەرەو باڵاچوونی ئاو.

**فواصل:** کۆی"فاصله".

**فواق:** بڕوانە:"سکسکه".

**فوت:** (فُ) 1) فوو، پف. 2) یەکەیەکی پێوانەکردنە بەرامبەر بە 12 ئینچ یان 30.48 سانتیمیتر. "**فوت کردن**": فووکردن، پف کردن، با لەدەم دەرخستن، ڤەزین.

**فوت:** (فَ) کۆچ کردن، کۆچی دوایی کردن، مردن.

**فوتبال:** تۆپیپی، تۆپێن، تۆپێنە، تۆپانێ، تۆپ تۆپێن، گۆگاپی.

**فوتو:** وێنەگر. وێنەگری.

**فوتوالکتریك:** دابینکەری ڕووناکی کارەبا.

**فوتوترا پی:** چارەسەری هەندێ لە نەخۆشییەکان بە هۆی تیشکەوە.

**فوتوژن:** بەرهەمهێنی ڕۆشنایی، نوورهاوێژ، تیشك هاوێژ.

**فوتوسفر:** بەشی درەوشاوەی گۆی خۆر کە بەچاو دەبینرێ، فۆتۆسفێر.

**فوتوفوبی:** ترس لە ڕۆشنایی، حاڵەتێ کە کەسی نەتوانێ لە بەرامبەر تیشکدا چاوی بکاتەوە، چاو بە شەوارە کەوتن.

**فوتوگراف:** وێنەگر، وێنەهەڵگرەوە.

**فوتوگرافی:** وێنەگری، وێنەهەڵگرتنەوە.

**فوج:** گروپ، دەستە، پۆل، بەشێك لە سوپا. "**فوج(به)فوج**": گروپ گروپ، دەستەدەستە.

**فود:** بڕوانە:"پود".

**فودج:** کەژاوە.

**فوراً:** جێبەجێ، دەس بەجێ، دەزبەجێ، هەرلەجێ، لەجێ، خێرا، دگاویدا، هەرئێستا، گورجێ، هادر، هادری، لەزکی، هەم دام دا، جاوەجا، حادری، دسەردە، دەم و دەس، یەکەندەردوو، بێدرەنگ کردن، لەدەم، لەدەما، هەنهۆ.

**فورامن:** کونی ورد لە لەشی بوونەوەراندا.

**فوران (کردن):** بازرەقە، هەڵ قوڵان، هەڵ قوڵین، قوڵین، فوویر، فوویریان، فیچقەکردن، جۆشان، کوڵان، هەڵچوون، فیچقەی ئاو لە زەوی.

**فوردین:** بڕوانە: "فروردین".

**فوری:** 1) بڕوانە: "فوراً". 2) خێرا. 3) تایبەتمەندی ئەوەی خێرا دەبێ ئەنجام بدرێ.





**فوريت:** 1) دۆخ یان حاڵەتێ کە پێویستی بە هەنگاوی خێرا هەیە، خێرا، زوو. 2) (سیاسی) ڕادەی خێرایی لە تاوتوێکردنی گەڵاڵە یان گەڵاڵەپێشنیار لە پاڕلماندا. "**فوريت داشتن**": پێویست بە هەنگاوی خێرا هەبوون. "**به فوريّت**": بڕوانە: "فوراً".

**فوز:** (فَ) 1) سەرکەوتن. 2) ڕزگاری.

**فوژان:** گوڕە، نەڕە، نەعرەتە.

**فوق:** سەر(وو)، بان، ژوور(وو). "**فوق برنامه**": ئەوەی جوزوی بەرنامەی سەرەکی یان پێشبینیکراو نەبێ. "**فوق هادی**": بڕوانە:"ابررسانا".

**فوق الذکر:** لەسەرەوە باسکراو، لە سەرەوە ئاماژەپێکراو.

**فوق العاده:** 1) زۆر، فرە، فراوان. 2) سەراسایی، سەرسامکەر، سەیر و سەمەرە. 3) لە دەرەوەی بەرنامەی ئاسایی، تایبەت. 4) زۆرباش، دڵگر، دڵنشین. 5) ڕۆژنامە یان بڵاوکراوەیەك کە لە کاتی خۆیدا دەرنەچێ.

**فوق الوصف:** پەسن هەڵنەگر، لە وەسف نەهاتو.

**فوقانی:** سەرەوە، ژوورەوە.

**فول:** (فَ) لە تۆپێندا: خەتاکردن یان فێڵ کردن لە کایەدا، پاشقول دان، مست لێدان، پاڵ پێوەنان.

**فول (اتومات/اتوماتیك):** تەواو ئۆتوماتیك.

**فولادین:** پۆڵایین، لە پۆڵا چیکری. 2) ڕەق، پتەو. 3) نەرمیهەڵنەگر، چەم هەڵنەگر.

**فول تایم:** تەواو وەخت.

**فولکلور:** فولکلۆر، کۆی بڕوا و ئەفسانە و گۆرانییەکانی ناوچەیەك.

**فون:** یەکەی هێزی دەنگ، یەکەی پێوانی بەرزی و نزمی دەنگ.

**فونتیك:** دەنگدار، زانستی تێکەڵاوکردنی دەنگەکان. دەنگ ناسی.

**فونومتر:** ئامرازێکە بۆ دیاریکردنی لەرەی دەنگەکان.

**فهام:** زۆر زانا و فامیدە.

**فهرست:** 1) پێڕست، فێرست. 2) پوختە، کورتە. "**فهرست هزینه**": فاکتۆر، لیستە، سیایی.

**فهرست نویسی:** دەرهێنانی ناونیشانی کتێبەکان و ڕێکوپێك کردنیان بە پیتی ئەلف و بێ، پێرست بەندی کتێبەکان.

**فهرست وار:** بە شکڵی پێرست، بەکورتی.

**فهم:** تێگەیشتن، زانین، فام، ئاوەز، سەروەدەر، سەرودەروو، سەرەدەر. "**غير قابل فهم**": قلیوبلی".

**فهماندن:** تێگەیاندن، حاڵیکردن، زاناندن، گەشتاندن، دان سەح کرن، ڤەپێچرین.

**فهمستن:** بڕوانە:"فهمیدن".

**فهمیدگی:** فامیدەیی، تێگەیشتوویی، زانایی.

**فهمیدن:** 1) تێگەیشتن، تێگەشتن، تێگەیین، گەشتن، حاڵیبوون، فامین، سەرلیدەرکردن، سەرلیدەرچوون، وەرەی ئامایش. 2) زانین یان زانیاری وەدەست خستن. 3) هەست کردن، هەست پێکردن.

**فهمیده:** تێگەیشتوو، تێگەیشتی، تێگەیو، حاڵیبووگ، بەزانست، ژیر، فاما، فامی، فامیە، فامیدە، سالۆر، بەئاوەز، حاڵی.

**فهیم:** فامیدە، زانا، تێگەیشتوو، بیرتیژ.

**فی:** نرخ، قیمەت.

**فیار:** کار، پیشە.

**فیّاض:** 1) جۆگەلە یان کانی پڕئاو. 2) جوامێر، مێرخاس، پیاوخاس، بەخشندە. 3) بەپیت، بەبەرەکەت.

**فی البداهه:** بەبی‌بیرکردنەوە و تێرامان، قسە یان شێعرێ کە بەبێ تێرامان بوترێ.

**فی الجمله:** پوختەی ئاخاوتە. کەمێك، کەمەکی، تۆزێك، لەسەریەك.

**فی الحال:** لە هەمان کاتدا، بیدرەنگ کردن، دەزبەجێ.

**فی الحقیقه:** لە ڕاستیدا.

**فی الفور:** بڕوانە:"فوراً".

**فی المجموع:** سەرجەم.

**فی المجلس:** 1) لە هەمان مەجلیس، لەوێ. 2) بڕوانە:"فوراً".

**في ا لمثل:** بۆ نموونە.

**فی الواقع:** لە ڕاستیدا، لە واقیعدا.

**فیاوار:** شوغڵ، کار، پیشە.

**فیبر:** (پزیشکی) ڕیشاڵ. **"فیبرین":** ریشاڵین.

**فیبرینوژن:** ریشاڵینە پێکهێنە.

**فیدل:** بەئەمەگ، وەفادار.

**فیروز:** سەرکەوتو.

**فیریدن:** 1) خلنگین، بە ناز و لەنجەولار ڕۆیشتن. 2) گەمە پێکردن، تیتاڵی پێکردن.

**فیزیسین:** فیزیك زان، شارەزا لە زانستی فیزیا دا.

**فیزیك:** زانستێ کە سەبارەت بە جسمە سروشتییەکان دەدوێ، فیزیا، فیزیك.

**فیزیوتراپی:** چارەسەری لە ڕێگەی هۆکارگەلێکی فیزیکی وەك تیشك.تین. وەرزش.

**فیزیوکرات:** لایەنگری فیزیۆکراسی.

**فیزیوکراسی:** تیۆرییەکی ئابووری کە لایەنگرەکانی لەو بڕوایەدان کە سامانی ڕاستەقینە یان تەنیا سەرچاوەی سامانی وڵات ئاو و زەوی و بەرهەمی کشتوکاڵییە و زێڕو زێو وەك سامانی ڕاستەقینە ناژمێردری و تەنیا ئامرازێکە بۆ ئاسانکاری لە مامڵەکردندا.

**فیزیولوژی:** (پزیشکی) کارئەندام زانی، زانستی تاوتوێی کردەوەی سروشتی خانەکان و چنراوەکانی لەش. زانستێ کە سەبارەت بە شێوەی کاری ئەندامان و دەزگاکانی لەشی بوونەوەران و پێوەندی ئەوان دەگەڵ یەکدی دەدوێ.

**فیزیولوژیست:** پسپۆڕ لە فیزیۆلۆژیدا.





**فیزیولوژیك:** سروشتی، ئاسایی، ئەوەی کە دەگەڵ جەریانی ئاسایی ئەرکەکانی لەش دا هاوئاهەنگ بێ.

**فیزیونومی:** سیما، ڕوخسار، دیمەن.

**فیس:** فیز، فیس، دەعیە، لووت بەرزی.

**فیسور:** کەلەبەری چووکە، درز.

**فیسیون:** (فیزیا) کردەی تلێشانی ناوەکی.

**فیصله:** 1) دادوەر، حاکم. 2) ناوبژیوانی نێوان هەق و ناهەق. 3) ئەوەی نێوان دوو شت جیابکاتەوە، بڕندە. **"فیصلەدادن":** یەکلاکردنەوە، کۆتایی پێهێنان، بەئەنجام گەیاندن. **"فیصلەیافتن":** کۆتاییهاتن، ئەنجام بوون، یەکالابوونەوە.

**فیض:** 1) بەهرە یان قازانج یان خۆشەویستی کەسێك بۆ کەسێکیدی. 2) ڕەوان بوونی ئاو. 3) ئاوی بەخوڕ. 4) زۆر، لێشاو. 5) بڕوانە:"بخشش". 6) ئەوەی بەشێوەی سروش دەگاتە دڵی عارف. **"فیض بردن":** کەڵك یان قازانجی ماددی یان مەعنەوی بردن.

**فیکس:** نەگۆڕ، فیکس.

**فیلارمونیك:** ئورکستێری سەمفۆنی گەورە.

**فیل افکن:** دلێر و زۆربەهێز.

**فیلتر:** بڕوانە:"صافی".

**فیلسوف:** فەلسەفەدۆست، زانا لە فەلسەفەدا، حەکیم، فیلسووف.

**فیل کس:** (ك) جلّف و سووك و بیشەرم.

**فیلم:** 1) فیلم. 2) خاوەنی هەڵسوکەوتی سەیروسەمەرە و شانۆئاسایی و ناڕاستەقینە. 3) هەر جۆرە گوتار و ڕەفتارێکی دەسکرد و ناڕاستەقینە و فریودەرانە. **"فیلم بازی کردن":** لەئەستۆبوونی ڕۆڵی سینەمایی، ڕۆڵ گێڕان، دەورگێڕان لە فیلم دا. 2) بە شێوەی درۆیین و شانۆیی هەڵسوکەوت کردن، ڕواڵەت سازیکردن. **"فیلم پوزیتیو":** (وێنەگری) فیلمێ کە وێنە و ڕەنگەکەی دەڵ بابەتەکە بێتەوە. **"فیلم دادن":** پیشاندانی فیلم، خستنە سەر پەردەی سینەما. **"فیلم گذاشتن":** بڕوانە: "فیلم دادن". **"فیلم گرفتن":** فیلم هەڵگرتنەوە لە کەسێ یان شتێ بە کامێرا، فیلم گرتن. **"کسی را فیلم کردن":** کردنە دەسکەلا و گاڵتەجاڕی خۆ.

**فیلم بردار:** فیلم هەڵگرەوە، وێنەهەڵگرەوە. **"فیلم برداری":** فیلم هەڵگرتنەوە.

**فیلم نامه:** سیناریۆ، فیلم نامە.

**فیلم نامەنویس:** نووسەری فیلم نامە، سیناریست.

**فیلولوژی:** وشەناسی.

**فیلەور:** بڕوانە:"پیلەور".

**فیمابین:** لەنێوان(دا)، لەبەین(دا).

**فینال:** کۆتایی، فینالّ.

**فی نفس الامر:** لە هەقیقەت دا.

**فی نفسه :** خۆیلەخۆیدا، لەخۆیدا.

**فیوض:** کۆی"فیض".

**فیومه :** بڕوانە:"بهانه".



**قائـد:** 1) پێشەنگ، پێشڕەو، ڕێبەر، ڕابەر. 2) جڵەوکێش. 3) قافڵەسالار، سەرۆکی قافڵە. 4) سپاسالار، فەرماندەری سپا. 5) ئەوەی کوێر ڕینوێنی دەکا.

**قائل/قایل:** 1) بێژەر، وتەبێژ، قسەکەر، واتیار. 2) بڕوامەند، بەبڕوا، باوەڕدار. "**قائل بودن**": لەبەرچاوگرتن، دانان. بڕوامەندبوون، بەبڕوابوون. "**قائل شدن**": لەبەرچاوگرتن و وێناکردن. دانان.

**قائم/ قایم:** 1) وەستاو، ڕاوەستاو. 2) پایەدار، بەردەوام، هەمیشەیی. 3) بە شێوەی ستوونی. 4) ئامادە بۆ ئەنجامدانی کارێك. 5) بەهێز، بەئیرادە. 6) کیسەکێش، ناتر. 7) بەستراوە، پشت ئەستوور(خداوند قائم بە زمان و مکان نیست). "**قائم بالذات**": ئەوەی بوونەکەی بە کەس یان شتیدی نەبەستراوەتەوە، هەربوو، جەوهەر. "**قائم داشتن**": سازدان، بەڕێوەبردن، وەڕێخستن. "**قائم شدن**": 1) پتەوبوون، قایم بوون. 2) خۆشاردنەوە، پەناگرتن. 3) دامەزران، بەرپابوون. "**قائم کردن**": 1)پتەوکردن، قایمکردن. 2) جێگیرکردن، دامەزراندن، سازدان.3) شاردنەوە. 4) بڕوانە: "نصب کردن".

**قائم الزاویە:** شکڵێ کە گۆشەی نەوەد پلەی هەبێ، گۆشەستوون.

**قائم اللیل:** شەونخوون، شەوبێدار.

**قائم مقام/قایم مقام:** 1) جێگر، جێنشین. 2) بەڕێوەبەری شار یان ناوچەیەك.

**قائمە:** 1) ستوون، کۆڵەکە، پایە. 2) پێڕست. 3) گۆشەی نەوەد پلە. 4) پتەو، قایم.

**قاب:** هێندە، ئەندازە. چوارچێوە. "**قاب قوسین**": 1) بە ئەنازەی دوو کەوانە. 2) بریتی لە نزیکی.

**قاب بازی:** جگێن، قاپانە، قاپانێ، قاپێن، میچێن، کابانێ، کاپانێ، کابەی.

**قابض:** 1) وەرگر، ستێن، بگیر. 2) مەئمووری وەرگرتنی مالیات. 3) دەوایەك کە زگەشۆرە چاك دەکاتەوە. "**قابض الارواح**": گیان ستێن، ڕۆح ئەستێن، ئیزڕاییل.





**قابل:** 1) شیاو، شایان. 2) کارکردە، کاردیتو، لەکاردەرهاتو، کارامە. 3) بەنرخ، گرانبایی یان شیاوی سەرنج و گرینگی. 4) قبووڵکەر، وەرگر. 5) زۆر، فرە. "**قابل اجراء**": شیاوی جێبەجێبوون، شتێ کە بۆ جێبەجێبوون دەبێ. "**قابل اشتعال**": بسووت، سووتۆك. "**قابل تغییر**": شیاوی گۆڕان، گوهێڕبار."**قابل داشتن**": بەنرخ بوون. "**قابل دانستن**": بە لایق و شیاو دانان. "**قابل قبول**": بڕوایی، شیاوی باوەڕکردن. "**قابل کسی را نداشتن**": شیاوی ئەو نەبوون، شایانی ئەو نەبوون.

**قابلە:** 1) ژنی شیاو. 2) دایان، مامان. 3) قبووڵکەر.

**قابلیت:** لێهاتوویی، لەباربوون، شیاوی، ژێهاتوی، گێروفەن، هێگنی، توانایی پێویست بۆ ئەنجامدانی کارێك، ئامادەیی بۆ قبووڵ کردنی کارێ.

**قابو:** هەل، دەرفەت.

**قاپ کسی خر آمدن:** تووشی بەدبەختی هاتن.

**قاپ کسی را دزدیدن:** بۆچوون و سەرنجی ئەو بەلای خۆدا ڕاکێشان.

**قاپو:** دەرگا، قاپیە.

**قاپوچی:** دەرکەوان، قاپیەوان.

**قاپیدن:** فڕاندن، ڕفاندن بە فرزی. "**در هوا قاپیدن**": قۆستنەوە، قۆزتنەوە، لە حەوا گرتنەوە.

**قاتل:** کوژەر، بکوژ، مێرکوژ، پیاوکوژ، کشتۆخ، خوێنکەر، خووینی.

**قاتمە:** داموسك، هۆندراو لە داموسك.

**قاچ:** 1) قاش. 2) کەلێن، درز. "**قاچ خوردن**": قلێشان، درزتێکەوتن. "**قاچ دادن**": قەڵشاندن، تلێشاندن، درز تێخستن. "**قاچ قاچ**": قاش قاش. "**قاچ کردن**": قاش کردن، کووزکردن.

**قاچاق:** قاچاخ، قاچاغ، کڕین و فرۆشتنی کاڵاگەلێ کە لە پاوانی دەوڵەت دایە و یان مامڵەکردنیان یاساغە. "**قاچاق شدن**": قاچاغ بوون، تەرەبوون، هەڵوەدابوون. "**قاچاق کردن**": کاری قاچاغ کردن، ڕاگواستن و کڕین و فرۆشتنی کەلوپەلی ڕێپێنەدراو.

**قاچاقچی:** قاچاخچی، فرۆشیاری کەلوپەلی قاچاخ.

**قاچاقی:** 1) قاچاغی، کڕاو و فرۆشراو بەشێوەی نایاسایی. 2) بەنهێنی، نایاسایی.

**قادر:** 1) بەهێز، بەتوانا. 2) لە ناوەکانی خوا.

**قادم:** 1) داهاتوو، پاشەڕۆژ. 2) ڕێبوارێ کە لە سەفەر بگەڕێتەوە. 3) پێشڕەو.

**قارت:** لەکارکەوتو.

**قارون:** زۆر دەوڵەمەند، دارا، زەنگین.

**قارّە:** قوڕنە، قاڕڕە، کیشوەر. "**قارّە سیاە**": ئەفریقا.

**قاسر:** بە زۆر ناچارکەر بە کارێك.

**قاسط:** هەڵگەڕاوە لە هەق، ستەمکار.

**قاسم:** بەشکەر، دابەشکەر.

**قاسی:** دڵڕەق، بێبەزەیی.

**قاشق پستایی:** هاونشینی، تێکەڵی.

**قاصد:** 1) نامەبەر، نامەگەێن. 2) بەمەبەست، بەئانقەست.

**قاصدك:** پشیلەپایزە، کەوکەڤۆك، باویلکە، بایلکە، تەتەرۆکە.

**قاصر:** 1) داماو، بێتوانا. 2) درێغیکەر، کەمتەرخەم.

**قاصف:** شکێنەر، شریخە، دەنگی بەرزی هەورەتریشقە.

**قاصم:** تێك شکێنەر، نابوودکەر.

**قاصی:** دوور.

**قاضی:** 1) دادگەر، دادوەر، دادپرس، حاکم. 2) داوەر، ناوبژیوان. 3) پاروو، تیکە. "**قاضی کردن**": پارووگرتن.

**قاضی الحاجات:** بەجێهێنانی پێداویستی و نیازەکان.

**قاضی القضات:** سەرۆکی دادوەرەکان.

**قاطبه:** گشت، تەواو.

**قاطع:** 1) تیژ، بڕەر، ببڕ، بڕندە، جیاکەرەوە. 2) نەگۆڕ، حەتمی. 3) بەبڕشت، لێبڕاو، بەزاکوون. 4) دیاریکەری بنەڕەتی. 5) کاریگەری دایمی. 6) بەلێبڕاوی. 7) (بیرکاری) سیکەند، بڕەر. "**قاطع الطریق**": بڕوانە: "راهزن".

**قاطعانه:** لیبڕاوانە.

**قاطعیّت:** بڕ، بڕشت و کار ڕاپەڕاندن، لێبڕاوی، بەزەبروزەنگی، بەزیپك، سووربوون لەسەر دەنگ و بۆچوون و بڕیاری خۆ.

**قاطی:** 1) تێکەڵ، تێکەڵاو، ئاوێتە. 2) پەرێشان، پەشۆکاو. "**قاطی داشتن**": 1) ناپوختی و لێکنەچوویی. 2) تووشی پەرێشانی و بیربڵاوی بوون، تێکەڵ کردن(لە کوردیدا دەڵێن تێکەڵی دەکا). "**قاطی زدن**": تێکەڵ کردنی شتی ناپوخت دەگەڵ جنسی بەڕمێن. "**قاطی شدن**": هاتنەناو، تێکەڵاوبوون. "**قاطی کردن**": 1) تێکەڵ کردن، بەیەکادان. 2) شێواندن، پەرێشان کردن. 3) تێکەڵ کردنی بابەتگەلی جۆراوجۆر لە زەین دا، لێك جیانەکردنەوەی دوو یان چەند شت لەیەکتر. 4) لەدەست دانی هاوکێشی دەروونی، شێوان، بیربڵاوبوون. "**قاطی کسانی شدن**": تێکەڵ ئەوان بوون، چوونە پاڵ ئەوان، ڕەگەڵ ئەوان کەوتن. "**قاطی مرغها شدن(رفتن)**": بریتی لە ژنهێنان. "**خود را قاطی چیزی کردن**": دەم تێوەردان، خۆتێهەڵقوتاندن.

**قاطی پاتی:** 1) پڵۆز، تێکەڵ پێکەڵ، تێکەڵاوپێکەڵاو. 2) شێواو، پەرێشان.

**قاعد:** 1) دانیشتوو. 2) ئەوەی شەڕ و خەزای نەدیوە.

**قاعدتاً:** بەپێی یاسا و شێوازی باو.





**قاعدگی:** بێ نوێژی ژن، بەخوێن بوونی ژن، خوێنی مانگانە، عادەتی مانگانەی ژنان کە هەر بیست و هەشت ڕۆژ جارێك و بۆ ماوەی پێنج تا حەوت ڕۆژ ڕوودەدا.

**قاعده:** 1) ڕێسا، یاسا. 2) شێوە و نەریتی باو. 3) ژن یان کچێ کە عادەتی مانگانە تێدەپەڕێنێ. 4) بنەما، بنەڕەت، بنچینە. 5) پێتەخت یان گەورەترین شاری وڵاتێ. 6) (بیرکاری) بنك، بنە، بنواشە. "**قاعده‌شدن**": دەسپێکرانی عادەتی مانگانە لە کچ یان ژنێ کە سکی نیە. "**باقاعده**": دروست و لۆژیکی، لەسەر بنچینەی ڕێساکان. "**به قاعده**": بە دروستی و یاسایی. بەپێی ڕێسا، بە شێوازی دروست. "**به قاعدهٔ**": وەکوو.

**قاعده‌افزایی:** ڕێسازیادکردن.

**قاعده‌مند:** ڕێسامەند، ڕێساڕێژ، بە ڕێسا و شێوازی دیاریکراو.

**قافله:** بڕوانە: "کاروان".

**قافله‌سالار:** 1) بارگەچی، سەرقافڵە، سەرقەتار، ڕچەشکێن، سەرپەرشتی کاروان. 2) ڕێبەر و پێشڕەو لە کارێکا.

**قافیه:** 1) کۆتایی شتێ. 2) سەروا، بەشاوەند، پاشڵی شێعر. "**قافیه‌تنگ بودن**": کەم بوونی وشەگەلی هاوسەروا بۆ سەروا دانان. "**قافیه را باختن**": هەڵەکردن و لەدەست دانی پێگەی خۆ. "**قافیه سنجیدن**": ڕەخنەگرتن و تاوتوێکردنی دروستی و نادروستی سەرواگەلی شێعرێك. شێعر هۆنینەوە یان گۆرانی چڕین.

**قافیه‌باف:** شاعیر بەتایبەتی شاعیرێ کە زۆرتر گرینگی بە سەروا دەدا تا مانا و ناوەرۆکی شێعر.

**قافیه‌بند:** بڕوانە: "قافیەباف".

**قافیه پرداز:** بڕوانە: "قافیەباف".

**قافیه‌سنج:** 1) شاعیر، هەڵبەس وان، هۆزان. 2) ڕەخنەگری شێعر. 3) سروود خوێن، ئاوازخوێن.

**قاقاله:** ڕەق، وشك.

**قاقاله‌خشکه:** 1) پێستی خۆش نەکراو و وشکەوەبوو. 2) ڕەقەڵە و چرچ هەڵگەڕاو.

**قال:** 1) باس و ڕاوێژ، ئاخاوتن. 2) هاتوهاوار، هەرا و هوریا، قوولەقوول. "**قال چاق کردن**": هاتوهاوارکردن، هەرا و کێشەنانەوە. "**قال خوابیدن**": تەواوبوونی زەنازەنا و هەراوهوریا. "**قال کردن**": هەراوهوریاکردن، قوولەقوول کردن. "**قال و قال**": قاڵەقاڵ، قوولەقوول. "**قال و قیل**": گوڕە و هەرا، چەقە، چەقەچەق، قاڵەقاڵ، قوولەقوول، قسەوباسی تێکەڵ پێکەڵ. "**قال و مقال**": 1) قوولەقوول و هاتوهاوار. 2) گفتوگۆ، پەیڤین.

**قال:** دەزگایەك بۆ پوختەكردنی زێڕ و زێو. "**قال(قال قضیه) را كندن**": یەكالاكردنەوە یان كۆتایی پێهێنان بە بابەت یان كێشەیەك. "**قال كسی را كندن**": بێدەنگ كردنی ئەو بە كوشتنی. "**قال گذاشتن**": 1) چاوەڕوان هێشتنەوەی كەسێك لە شوێنێك. 2) جێهێشتنی كەسێك لە شوێنێك بە بێخەبەری و چاوەڕواننەكراو. "**از قال بیرون آمدن**": قالبوون، لە تاقیكردنەوە دەرچوون، سەربەرزبوون.

**قالب:** قاڵب، شتێ كە كانزای تاویاوی تێدەڕێژن. "**قالب تهی كردن**": بریتی لە مردن. "**قالب چیزی بودن**": پڕ بە بەر بوون. "**قالب زدن**": 1) دەقاڵب دان. 2) بە زمان دا هاتنی قسەیەكی ناڕاستەقینە یان بێهوودە. 3) ساختەكاری. 4) بڕوانە: "جازدن(3)".

**قالب ریزی:** داڕژاندن، داڕژتن، دارێتن، دەقاڵب كردن.

**قالب شكنی:** نەریت شكێنی، پێڕەوی نەكردن لە دابونەریتی ڕابردوان و شتی نوێ هێنان.

**قالب گرایی:** بڕوانە: "فرمالیسم".

**قالب گیری:** 1) سازكردنی قاڵب. 2) كارگەی قاڵب سازكردن. 3) شكڵ پێدان(دەق پێدان) بە هۆی قاڵب.

**قالبی:** 1) دەق گرتو و دروست كراو لە قاڵبدا. 2) كلیشەیی، چەند پاتكراوەیی. 3) یەك فۆڕم. 4) بە شێوەی قاڵب.

**قالپاق دزد:** 1) ئەوەی كەلوپەلی دەرەوەی ماشێن دەدزێ. 2) ئەفتاوەدز.

**قالگری:** بێخەوش كردنی زێڕ و زێو.

قام: جادووگەر.

**قامات:** كۆی"قامت".

**قامت:** قەلافەت، بڵندی بالا، بەژن و بالا.

**قامت بستن:** دەس بە نوێژ كردن.

**قاموس:** 1) وشەدان، فەرهەنگ. 2) دەریا، دەریای گەورە. 3) سرشت، سروشت. 4) زەینییەت.

**قانت:** 1) فەرمانبەر، گوێڕایەڵ، ملكەچ. 2) نوێژخوێن.

**قانص:** بڕوانە: "شكارچی".

**قانط:** ناهومێد، هیوابڕاو.

**قانع:** دڵ تێر، چاوتێر، بێتەماح، بۆین، شوكرانەبژێر، ڕازی بە بەش، قنیاتكەر، كەم قنیات.

**قانون:** 1) یاسا، قانوون، ڕێزك. 2) بنچینە و پێوانەی شتێ. 3) داب، باو. 4) تڕو تفاق، ئامراز و كەلوپەل. 5) جۆرە ئامێرێكی مووسیقایە. "**قانون اساسی**": یاسای بنەڕەتی.

**قانوناً:** بەپێی یاسا، لە باری یاساییەوە.

**قانون دان:** یاسازان، مافزان.

**قانون شكن:** پێشێلكەری یاسا، یاساشكێن.





**قانون گذار:** یاسادانەر، یاساداڕێژ.

**قانون محور:** یاساتەوەر.

**قانونمند:** یاساڕێژ، یاسامەند، گونجاو دەگەڵ یاسا.

**قانونی:** یاسایی، بەپێی یاسا، لەسەر بنەمای یاسا.

**قانی:** سووری تۆخ.

**قاهر:** زاڵ، بالادەست. "**قاهرشدن**": زاڵبوون.

**قایق:** بەلەم، قەیاخ، لۆتكە.

**قایقچی:** بڕوانە: "قایق ران".

**قایق ران:** قەیاخەوان، بەلەم ئاژۆ.

**قایم انداز:** شەترەنج بازی بێهاوتا.

**قایم باشك:** بڕوانە: "قایم موشك".

**قایمكی:** بەنهێنی، پەنامەكی.

**قایم موشك:** قەرەقەرە، قەرەقەرێ، قولولو، گەمەی چاوشاركێ.

**قایمی:** بڕوانە: "قایمكی".

**قبایل:** كۆی: "قبیله".

**قبابستن:** ئامادەبوون بۆ كارێ یان خزمەتێ.

**قبا پوشیدن با كسی:** گەرموگوڕبوون دەگەڵ ئەو.

**قباحت:** 1) درزێوی، ناحەزی، ناشیرینی. 2) بڕوانە: "رسوایی".

**قبا دریدن بر خویشتن:** بریتی لە بێ ئۆقرەییكردن.

**قباسوخته:** بەدبەخت و چارەڕەش كە خۆی خۆشحاڵ نیشان دەدا.

**قبا كردن:** دڕاندن، دادڕێن.

**قباگشادن:** بڕوانە: "جلوەكردن".

**قبال:** بەرامبەر. "**در قبالِ**": لە بەرامبەر.

**قباله:** قەواڵە، تاپۆی ملك.

**قبایل:** كۆی"قبیله".

**قبح:** درزێوی، ناشیرینی.

**قبراق:** 1) چالاك، زركوزینگ، گورجوگۆڵ. 2) شاد و كەیف ساز، سەرحاڵ.

**قبرستان:** بڕوانە: "گورستان".

**قبركن:** بڕوانە: "گوركن".

**قبض:** 1) گرتن، وەچنگ هێنان. 2) گرفت، سك وێستان. 3) دڤانەك، فاكتۆر، ڕەسید، پسوولەی حەساو. 4) گرتن، حەفس كردن. 5) مۆنی، مڕومۆچی. "**قبض رسید**": فاكتۆری درانی پارە یان ماڵێك. "**قبض روح**": گیان لێ ساندنی كەسێك. "**قبض روح شدن**": 1) گیان دان، مردن. 2) زۆرترسان، زراوچوون، زەندەق چوون، تۆقان. "**قبض كردن**": 1) گرتن. 2) داگیركردن. "**قبض و اقباض**": گۆڕینەوەی بەڵگە و قەواڵە. "**در قبض آوردن**": 1) داگیركردن، زەوت كردن. 2) خستنە ژێر چاوەدێری.

**قبضه:** 1) مشتێك لە شتێك. 2) مشتوی دەمانچە و شمشێر و خەنجەر، قەبزە. 3) چوارچێوەی دەسەلات. 4) پەنجە، دەست، مست. "**قبضەكردن**": مۆنۆپۆل كردن، داگیركردن و خستنە ئیختیار خۆ.

**قبل:** پێش، بەردەم.

**قبلاً:** پێشەکی، لەپێشوودا، چەلان، جاران، لەمەبەر، لەمەوبەر.

**قبله:** ڕووگە، قیبلە، قوبڵە، کابە. "**قبلەآمال**": ئەوەی زۆر خۆشەویست و دڵخوازە، ڕووگەی ئاواتەکان. "**قبله زردشت**": ئاگر. "**قبلەعالم**": پاشا. "**قبلەکردن**": وەك ئەوپەڕی ئاوات و ئامانجی خۆ دانان. "**قبلەگرفتن**": بوونە موسڵمان.

**قبلەگاه:** بڕوانە:"عبادت گاه".

**قبول افتادن:** وەرگیران، قبووڵ کران.

**قبولاندن:** سەلماندن، ناچار بە قبووڵ کردن.

**قبول شدگان:** وەرگیراوان.

**قبول شدن:** وەرگیران، قبووڵ کران.

**قبول کردن:** ملدان، ڕازیبوون، بەدڵ بوون، قبووڵ کردن. وەرگرتن.

**قبولی:** 1) قبووڵکران، وەرگیران. 2) وەرگیراو. 3) قبووڵی، پڵاوی بێ پاڵافتن.

**قبیح:** ناحەز، دزێو، ناپەسند. "**قبیح المنظر**": بێ بەش لە جوانی، نازەریف، کرێت. "**ازکسی قبیح بودن**": بۆ ئەو دوور لە چاوەڕوانی بوون، لەو نەشیانەوە.

**قبیل:** جۆر، چەشن. "**ازاین قبیل**": وەك ئەم. "**ازقبیلِ**": وەك، وەکوو.

**قبیله:** تیرە، بەرەباب، قەبیلە، گرووپێ لە خەڵکانی خاوەن نەژاد و نەریت و ئایین و کولتووری هاوبەش.

**قتال:** شەڕ و کوشتار، کوشت و کوشتار.

**قتّال:** زۆر کوشندە.

**قتل:** پیاوکوژی، کوشتن، قەتڵ. "**قتل از روی ترحم**": بڕوانە:"اتانازی". "**قتل خطا**": کوشتنی نازانستە یان نائانقەست." **قتل عام**": کوشتاری بە کۆمەڵ، ڕەشەکوژی. "**قتل عمد**": کوشتنی بەئانقەست. "**قتل غیله**": لەنکاوکوشتن، تیرۆر. "**قتل کردن**": پیاوکوشتن، ئینسان کوشتن. "**قتل مثقل**": کوشتن بە بەرد و شتیوا. "**قتل نفس**": کوشتنی ئینسان. "**بەقتل رساندن**": کوشتن. "**به قتل رسیدن**": کوژران.

**قتلگاه:** شوێنی کوشتن، کوشتارگە.

**قتول:** زۆر کوژەر.

**قتیل:** کوژراو.

**قحط:** 1) وشکەساڵی، ڕەشەساڵی، بێبارانی. 2) دانسقە، گیرنەکەوتوو، قات، نایاب. "**قحط افتادن**": هاتنی وشکەساڵی. "**قحط شدن**": 1) قات یان نایاب بوون. 2) ڕوودان وشکەساڵی و قات بوون یان دەست نەکەوتنی خواردەمەنی."**قحط و غلا**": وشکەساڵی و گرانی.

**قحط سال:** وشکەساڵی و بێ داهاتی. 2) قاتی، نایابی، دانسقەیی.

**قحط سالی:** سەرهەڵدانی قاتوقڕی بە هۆی وشکەساڵی.

**قحطی:** 1) وشکەساڵی و قاتبوون یان کەمبوونەوەی خواردەمەنی. 2) قاتی، قاتوقڕی، کولب.





**قحطیزده:** تووشی وشکەساڵی و قاتوقڕیبوو.

**قد:** 1) بەژن، باڵا، قەڵافەت، قام، قەد. 2) ئەندازە. 3) بەرزی، بڵیندی. 4) هاوتەمەن. "**قدبرافراشتن**": ڕاست وێستان. 2) هەڵدان، باڵاکردن. "**قد دادن**": بەس بوون، گەیشتن. "**قد راست( علم ) کردن**": 1) ڕاست وەستان. 2) نیشاندانی توانایی و لێوەشاوەیی خۆ. 3) بە ئیرادەوە خەریکی کارێك بوون بە تایبەتی دوای سەرنەکەوتن. 4) هاتنە بان، بە سەرکەوتن گەیشتن. "**قدکشیدن**": 1) هەڵدان، باڵاکردن. 2) خۆنوێنیکردن. "**قدگرفتن**": ئەنازەی بەژن و باڵاگرتن. "**قدوقامت( قدوبالا )**": بەژن و باڵا، تەلوبال. "**قدوقواره**": بەژن و باڵا. "**قد و نیم قد**": 1) گەورە و چووکە. 2) کورت و بڵیند. "**بچەهای قدونیم قد**": مناڵە ورکە، مناڵە ورتکە.

**قداست:** پاکی، پیرۆزی.

**قدام:** پێش، بەرۆ.

**قدبلند:** باڵا بەرز.

**قدح:** (قَ) 1) لۆمەگرتن، ئیرادگرتن. 2) پێکردن، هەڵکردنی ئاگر.

**قدح:** (قَ دَ) 1) قاپی گەورە. 2) پیاڵەی شەڕاب. 3) شەڕاب. "**قدح بر روی کسی پرداختن**": بە سڵامەتی ئەو خواردنەوە.

**قدح باره:** مەیخۆرەوە، مەینۆش.

**قدح پیما:** شەڕاب خۆر.

**قدح نوش:** شەڕاب خۆر(ەوە).

**قدر:** (قَ) 1) ئەنازەگرتن، پێوان. 2) ئەندازەی شتێ. هێز، توانایی، تاقەت. 3) ڕێز، حورمەت، سەنگ. 4) بەها، نرخ. "**قدر مسلّم**": ئەوەی مسۆگەر و یەکجارەکییە. "**قدرنهادن**": ڕێزلێگرتن. "**قدرو قیمت( قدرو منزلت )**": نرخ و ڕێز. "**قدری**": تۆزێك، کەمێك. "**بە قدرِ**": بەئەنازەی، بەڕادەی.

**قدر:** (قَ دَ) 1) ئەندازە، پێوانە. 2) کەللەڕەق و بەهێز و خۆڕاگر لە خەبات یان کێبەرکێدا. 3) چارەنووس. 4) ئیختیار.

**قدرت:** 1) هێز، توانایی، تین، تاو، تابشت، ستین. 2) زاڵی و دەستڕۆیشتوویی. 3) (سیاسی) دەسەڵات، دەسەڵاتداری، هێزی نیزامی یان ئابووری کە توانای زاڵبوون بەسەر کۆمەڵگای دا هەیە. 4) (کۆمەڵناسی) ئەگەری داسەپاندنی ویستی کەسێك بەسەر ڕەفتار و کرداری دیتراندا. "**قدرت جاذبه زمین**": هێزی ڕاکێشی زەوی. "**قدرت داشتن**": بەهێزبوون، هەبوونی توانایی ئەنجامدانی کارێك.

**قدرت بیان:** دەم و دوو، دەم و دوان، دەم و پل، قسەڕەوانی.

**قدرت طلب:** دەسەڵات خواز، دەسەڵات سەپێن.

**قدرتمند:** بەهێز، بەدەسەڵات، دەسەڵاتدار، خاوەن زۆر، پڕزۆر، توانا.

**قدرت نمایی:** نیشاندانی دەسەڵات و هێز و توانایی خۆ، دەسەڵات نوێنی.

**قدرتی:** 1) بەهێز و قورس. 2) سروشتی.

**قدردان:** ئەمەگناس، قەدرناس. "**قدردانی**": ئەمەگناسی، پێزانین.

**قدرشناس:** ئەمەگدار، قەدرناس، پێزان، بەماریفەت.

**قدرقدرت:** بەتوانا و بەهێز، ئەوەی هێزێکی بەقەرای هێزی قەزا و قەدەر هەیە.

**قدرمایە:** کەم، کەمووکە.

**قدرنشناس:** سپلە، بێ ئەمەگ، بێوەفا، پێنەزان، ناشکور، ناشکیر.

**قدری:** 1) کەمێ، کەمەکێ. 2) تا رادەیەك.

**قدریە:** گروپێك کە بڕوایان بە قەزا و قەدەر نیە و دەڵێن مرۆڤ لە کار و کرداری خۆیدا ئازادە و دەتوانێ کارێ بە ویستی خۆی ئەنجام بدا، پێچەوانەی "جبریە".

**قدس:** (قُ) 1) پاکی، پیرۆزی. 2) جیهانی غەیرە ماددی. 3) داوێن پاکی، بێ گوناحی.

**قدسی:** 1) پاك و پیرۆز، بەهەشتی. 2) فریشتە. "**قدسیان**": پیاوچاکان و چاکەکاران. "**حدیث قدسی**": حەدیسێ کە خوا فەرموویەتی و لە قورئان دا نیە.

**قدسیّت:** پیرۆزی، مەعنەوییەت.

**قدغن:** قاخە، قۆرغ ، یاساغ، یاساخ، ڕێ نەدراو. "**قدغن کردن**": قۆرغ کردن، کردنە پاوان، هەماندن.

**قدقد:** (قَ.قَ) پارچەپارچە، تیکەتیکە.

**قدکوتاه:** کورتەباڵا، بەژن کورت.

**قدم:** هەنگاو، شەقاو، قەدەم. "**قدم اوّل**": سەرەتای ڕێگا، یەکەم هەنگاو. "**قدم بر آتش بودن**": برتی لە بێئۆقرە و نائارام بوون. "**قدم برداشتن**": ڕێڕۆیشتن. هەنگاونانبەرەوپێش چوون لە کارێك یان گەیشتن بە ئامانجێ. "**قدم برداشتن برای کسی(چیزی)**": ئەنجامدانی کارێ یان خزمەتێ بۆ ئەو. "**قدم برگرفتن**": بڕوانە:"قدم برداشتن". "**قدم بە قدم**": هەنگاو بە هەنگاو. "**قدم پیش گذاشتن**": دابین کردنی پێشەکییەکانی کارێ. هەنگاونان، دەست بردن. "**قدم جفت کردن( نمودن )**": ئامادەبوون بۆ ئەنجامدانی کارێك. "**قدم جنباندن**": بزووتن، ڕێکەوتن. "**قدم داشتن**": ڕاوەستاوی و خۆڕاگری هەبوون. "**قدم درکشیدن**": ڕوو وەرگێڕان، پشت تێکردن. "**قدم زدن**": پیاسەکردن، قەدەم لێدان، گاڤان، گاڤدان. چوونە پێش. "**قدم فراتر( بالاتر ) گذاشتن**": ڕازی نەبوون بە قۆناغێ لە کار و چوونە پێشتر. "**قدم فشردن( افشردن، فشاردن )**": پێداگریکردن، شێلگیربوون. "**قدم کردن**": ئەنازەگرتن بە





هەنگاو. "**قدم گذاشتن**": هاتنەناو(ەوە)، هەنگاونان. "**قدم گشادن**": بریتی لە ڕێ ڕۆیشتن. "**قدم نهادن**": ڕێڕۆیشتن و پێنانە شوێنێ، پانان، هەنگاونان. "**زیر قدم آوردن**": بەزاندن، تێکشکاندن، شکست پێدان. "**سر قدم رفتن**": دەست بە ئاو گەیاندن. وتن یان نووسین.

**قدماء:** کۆی"قدیم"، پێشینیان.

**قدمت:** 1) پێشینە، مێژینە. 2) زات، بوێری، وێران.

**قدم شمار:** ڕێکوپێك و هاوئاهەنگ.

**قدمگاە:** 1) شوێنی پیاسەکردن. 2) شوێنی ژیان. 3) دەرگا، بەردەرك، بەرماڵ.

**قدنما:** باڵانوێن، تەواونوێن.

**قدّوس:** پاك و خاوێن لە هەر عەیب و کەموکوڕییەك.

**قدوم:** هاتنەوە، لە سەفەر گەڕانەوە.

**قدوە:** پێشەوا، ڕێبەر. "**قدوەالحکما**": پێشەوای فیلسووفەکان.

**قدی:** لاساری، سەرسەختی، پێچەقێنی.

**قدیر:** خاوەن هێز، بەتوانا.

**قدّیس:** پاك و بێگەرد، زۆر پاك داوێن و بەبڕوا.

**قدیم:** کۆن، دێرین، دێرس، پێشوو، کەونارا، لەمێژینە، قەدیم. "**قدیم(و)ندیم**": سەردەمانی پێشوو، ڕابردوو. "**قدیم ها**": لەڕابردوودا، پێشوو.

**قدیم الایّام:** ڕۆژگاری ڕابردوو. جاران، جاریجاران، پێشوو، پێشتر.

**قدیم ساز:** ئەوەی لە پێشوو دا ساز کراوە.

**قدیمی:** 1) بەساڵاچوو، بەتەمەن. 2) کۆن، کۆنە، کەون، کەیەن، کوهۆن، کەونارایی. 3) ئەوەی لە سەردەمانی پێشوو دا ژیاوە.

**قذر:** پیسی، ناپاکی.

**قذف:** 1) ڕەپاڵ دانی زیناح بە کەسێك. 2) ڕشانەوە، هەڵێنانەوە. 3) جوێن دان. 4) بەردخستن. "**قذف کردن**": 1) خستنە دەرەوە، ئاشکرا کردن. 2) جنێودان.

**قرائت:** خوێندنەوە.

**قرائح:** کۆی"قریحە".

**قرائن:** کۆی"قرینە". بەڵگەکان، دەرکەوتەکان.

**قرابت:** 1) نزیکی، خزمایەتی. 2) بەستراوەیی.

**قرابە بر سنگ زدن:** بەجێهێشتنی کەسێك یان جێیەك و لەبیر کردنی.

**قرار:** 1) کات یان شوێنی چاوپێکەوتن (قرار ما، قلعە ساعت...). 2) ئۆقرە، ئاسوودەیی، ئارامی، ئۆخژن. 3) بڕیار. 4) وادە، بەڵێن، گفت. 5) دۆخ، حاڵەت، چۆنیەتی(همە چیز بە همان قرار قبلی است). "**قرار بودن**": بڕیاربوون. "**قراردادن**": 1) دانان، جێکردنەوە. 2) ڕێکەوتن. 3) بەڵێن دان، وادەدان. "**قرار داشتن**":

1) هــــەبوونی ئاســـوودەیی، هـــەبوونی ئـــــــۆقرەیی. 2) هــــــەبوونی وادەی چاوپێکەوتن. 3) بەنیازبوون، سووربوون. **"قرار صادرکردن"**: بڕیار دەرکردن. **"قرار گذاشتن"**: وادەدانان، بەڵێن دان. **"قرار گرفتن"**: 1) دانران. 2) پتەوبوون، قایم بوون. 3) جێگرتن. 4) ئۆقرەگرتن، ئارام بوونەوە. 5) بڕیاردران، وەدواخران. **"قرار(و)مدار"**: بڕیارێ کە دەگەڵ کەسێ یان کەسانی دیکە سەبارەت بە شتێ دەدرێ. کەین و بەین، ساتوسەودا. **"از این قرار"**: بەمجۆرە. **"از چە قرار"**: چۆن.

**قرارداد:** 1) گرێبەست. 2) پەیمان، پەیماننامە، ڕێکەوتن. 3) ڕێسا، یاسا.

**قرارگاه:** 1) بنکە. 2) ماڵ، خانوو، شوێنی ئارام گرتن و داسەکنین.

**قرارنامە:** 1) پەیماننامە. 2) گرێبەست. 3) بەخشنامە.

**قراضە:** 1) ئاسنەواڵە، ئاسنجاو، قوڕادە، سەقەت. 2) بڕوانە:"مستعمل". 3) ڕواڵەتی شپرزە و ئاڵۆز یان بێ هێز و لەکارکەوتو. 4) وردەپووڵ، پارەی کەم نرخ. 5) بەرماوە.

**قراضەچین:** 1) ئەوەی ئاسنەواڵە کۆدەکاتەوە. 2) ئاتاج، دەستکورت.

**قراضەفروش:** سەقەت فرۆش، ئاسنەواڵە فرۆش.

**قراول:** 1) ئێشک گر، پاسدەر، نگابان. 2) جڵەودار.

**قراولخانە:** بنکەی پاسدەران/نگابانان.

**قرایی:** بڕوانە:"پارسایی".

**قرب:** (قُ) نزیکی. 2) نرخ و گرینگی، پلەوپایە. **"قرب"**: (بِ) نزیک بە. نزیکی. **"قرب جوار"**: نزیکی بە هۆی هاوسێیەتی، جیرانەتی. **"قرب داشتن"**: گرنگ و بەنرخ بوون، پێگە و پلەوپایە هەبوون.

**قربان:** 1) نزیک بوونەوە. 2) گۆشتی خێرێ لە جێژنی قوربان دا. 3) هەر شتێ کە بەو هۆیەوە مرۆ لە خوا نزیك بکاتەوە. 4) دەسەرگەڕان، سەرگەرد، بەلاگێڕ، گۆری، گوهری، قوربان. **"قربان و صدقە رفتن"**: دەبەرمردن، دەدەورگەڕان، دەسەرگەڕان، دەسەرگێڕان، بەقوربان بوون.

**قربانگاه:** شوێنی قوربانی کردن.

**قربانی دادن:** قوربانی دان.

**قربانی شدن:** بوونەقوربانی، کوژران، لەناوچوون.

**قربانی گرفتن:** بەکوشت دانی کەسێك، کوشتنی کەسێك.

**قربت:** 1) نزیکی. 2) نزیکی لە خودا.

**قرت:** جلف، بلچ، خونك، قرت.

**قردادن:** قنگ بادان، قڕدان.

**قرص:** 1) حەبی دەرمان. 2) پتەو و سفت. 3) لەسەرەخۆ و بەحورمەت. 4) ئاسوودە و ئەرخەیان. **"قرص کردن"**: پتەو و قایم کردن. **"قرص و قایم(قرص و محکم)"**: پتەو و قایم، قورس و قۆڵ. **"دو قرص کردن"**: پتەوکردنی کارێك، قایمکاری.





**قرض:** قەرز، وام. 2) بڕین، پچڕین. 3) پاداشت دان. **"قرض بالاآوردن"**: زۆر قەرزدار بوون. **"قرض دستی"**: دەست قەرز.

**قرض الحسنه:** قەرزی بێ بەهرە.

**قرض الشعر:** هەڵسەنگاندنی شێعر لە باری جوانیناسیەوە.

**قرض گیری:** (زمانناسی) وەرگرتنی وشەیەك لە زمانێکیترەوە.

**قرضە:** قەرز، وام. **"قرضەملی"**: وامێ کە دەوڵەت لە خەڵکی دەستێنێ.

**قرعە:** تیروپشك، پسوولەی خەوت و بەختت. بەش، پشك. **"قرعە بە نام کسی درآمدن(افتادن)"**: هەڵبژێرانی کەسێك لە ڕێگەی تیروپشکەوە. **"قرعە زدن"**: بڕوانە: "قرعەکشی". **"قرعەکشی"**: پشك هاویشتن، پشکخستن، قوڕعەکێشان، ڤژاگ، ڤژانگ. **"بە قید(بە حکم)قرعە"**: لە ڕێگەی قوڕعەکێشانەوە، لە ڕێگەی پشك خستنەوە.

**قرق:** (قُ رُ) 1) شوێنێ کە تەنیا کەسانێکی تایبەتی ئیزنی چوونیان هەیە. 2) بڕوانە:"ممنوع".

**قرمز:** سوور.

**قرمساق:** دەویت، دەیوس، ژن بەمز، جاکەش، بێناموس، قوزکەش، گەوواد، قوڕمساغ.

**قرن:** سەدە، گەڕ، چەرخ، خولێکی سەد ساڵە.

**قرنبیدن:** بڕوانە:"غرنبیدن".

**قرنطینە:** دابڕگە، وێستگەی تەندروستی.

**قرنیە:** ڕەشێنە/ڕەشکێنەی چاو.

**قروض:** کۆی"قرض".

**قرون:** کۆی"قرن". **"قرون وسطی"**: سەدەکانی ناوەڕاست.

**قرە:** ڕۆشنی، ڕووناکی. **"قرە باصرە"**: ڕووناکی چاو، مناڵی زۆر خۆشەویست.

**قرەجە:** بڕوانە:"سیاهك".

**قرەقاطی:** ناڕێکوپێك، پەرێشان و شێواو.

**قریب:** 1) نزیك. 2) خزم، کەسوکار، فامیل. **"قریب"**: (بِ) نزیکەی. **"قریب بە اتفاق"**: نزیك بە هەمووی، بەشی زۆری، زۆرینەی.

**قریب‌الوقوع:** ئەوەی کاتی ڕوودانی نزیکە، بەو زووانە.

**قریح:** 1) بریندار، زامدار. 2) ئاوی پاك.

**قریحە:** 1) بڕوانە:"استعداد". 2) وزەی زەینی بۆ تێگەیین لە مەسەلەکان بەتایبەتی تێگەیشتن لە بەرهەمە هونەرییەکان. 3) زەوق و بەهرەی شێعری و کاری نووسین، تەبعی شێعر.

**قرین:** 1) نزیك، وێکچوو. 2) هاودەم، هاوسەر، هاوەڵ، هاوڕێ. **"قرین چیزی کردن"**: کردنە هاوڕێی ئەو شتە، ڕەگەڵ خستن. **"قرین شدن"**: 1) بوونە هاوڕێ، ڕەگەڵ کەوتن. 2) بوونە هاونشین.

**قرینە:** مێینەی"قرین"، ژن، خێزان. هێمایەك کە ببێتە ئاماژە بۆ ڕوونی شتێك، مەبەستەوان. **هاوێنە**، **هاوخشت**.

**قریە:** گوند، دێ، ئاوایی.

**قزل قورت:** جوێنێکە، قوزەڵقورت، قززەڵقورت، ژەهرەمار.

قزمیت: (قُ) بێ نرخ، بیکەڵك، بەدەردنەخۆر.

**قسّاس:** بڕوانە: "نمّام".

**قسّام:** دابەشکەر.

**قسامە:** کۆمەڵێ کە بۆ وەرگرتنی شتێ سوێند دەخۆن و وەریدەگرن.

**قساوت:** دڵڕەقی، بێڕەحمی، بێبەزەیی.

**قسر در رفتن:** بەڕێکەوت ڕزگاربوون لە کێشە و گرفتارییەکان، دەرچوون لە گێچەڵ و تالوکە، دەزگیرنەکران.

**قسط:** 1) پاژ، پارچە، پشك، بەش، قنس. 2) داد. 3) بڕ، هەند، ڕادە. 4) بەشێ لە وام کە بە چەند بەش دابەش بووە و هەر بەشەی لە ماوەیەکی دیاریکراودا دەدرێتەوە، قەرزدانەوەی پاژپاژ، قیست.

**قسم:** (قِ) 1) جۆر، چەشن. 2) شێوە، شێواز. 3) بەش، پشك. ڕسق، ڕۆزی، بژیو.

**قسم:** (قَ سَ) سوێند، سۆند. "**قسم خوردن**": سوێندخواردن. "**قسم دادن**": سوێنددان. "**قسم یاد کردن**": سوێند خواردن.

**قسمت:** بەهر، بەحر، پار، سەری، قەتۆ، بەش، بێش، پشك. چارەنووس، قسمەت، بەشێ کە خوا دەیدا. "**قسمت پذیرفتن**": دابەش بوون، دابەش کران. "**قسمت خوردن**": بەش پێگەیشتن، پێبڕان. "**قسمت شدن**": پێ بڕان بەپێی چارەنووس، بەقسمەت بوون. "**قسمت کردن**": بەشکردن، دابەشکردن.

**قسوّت:** بڕوانە:"قساوت".

**قسّی:** ڕەق، دڵڕەق. "**قسّی القلب**": دڵڕەق، بێڕەحم.

**قسیم:** 1) بەش، پشك، پار. 2) بەشکەر، دابەشکار. 3) هاوسوێند، هاوپەیمان. 4) کەسی خوشیك و قەشەنگ. 5) بڕوانە:"شریك".

**قشر:** توێژ، توێکڵ، تێکوڵ، تۆکڵ، توێخڵ، تێخوڵ، کەواخە، قاپۆڕ، قاپیلك، قەپیلك، تۆفل، شکولك، قاشل. ڕووکەش. "**قشری**": 1) ڕووکەشی، ڕواڵەت. 2) بەبێ وردبوونەوە یان قووڵبوونەوە. 3) وشك و دەمارگرژ.

**قشقرق:** بڕوانە: "الم شنگە".

**قشلاق:** ئاران، گەرمێن، گەرمانی، گەرمیان. "**قشلاق کردن**": جووڵان بەرەو گەرمێن لە زستاندا.

**قشلامیشی:** چوونە گەرمێن، لە گەرمێن مانەوە(لە زستاندا).

**قشو:** ڕنەك، قاشاو، قەشاویش، قاشاغ، محەس. "**قشوکردن**": ڕنەك کردن، خوراندن و پاك کردنەوەی پێستی ئەسپ و مەڕ و شتیوا.

**قشور:** 1) کۆی"قشر". 2) مرۆڤە بێ ناوەرۆك و بەتاڵ لە هەقیقەتەکان. 3) کاروباری ڕووکەشی یان شتە بێ ناوەرۆکەکان.

**قشون:** ئەرتەش، کۆی سپاگەلی وڵاتێ، لەشکر.





**قشە:** بڕوانە:"مسابقە".

**قصائد:** کۆی"قصیدە".

**قصار:** (قَ) ئەوپەڕی هەوڵ و تەقالا، کۆتایی کار.

**قصار:** (قِ) کۆی"قصیر".

**قصار:** (قُ) دریغی و خاوەخاوی و تەمبەڵی.

**قصّاص:** (قَ) چیرۆك بێژ، گێڕەوە.

**قصاص:** (قِ) تۆڵە، حەیف، سزا، کوشتنەوە، کوشتن لە تۆڵەی کووژراودا. "**قصاص پس دادن**": سزادران، بە سزای خۆ گەیشتن. "**قصاص قبل از جنایت**": تەمبێ یان سزای پێش لە تووشبوون بە خەتا، سزای پێش تاوان. "**قصاص کردن**": خۆشەوکردن، خۆشەوەکردن، تۆڵە و قەرەبووی خراپ کردن، کوشتنەوە.

**قصبە:** 1) شارۆکە، بەخش.2) ناوەندی ناوچەیەکی جوغڕافیایی.

**قصد:** نیاز، مەبەست، ئامانج، قەست، غەرەز. "**قصد جان کسی را کردن**": بە نیازی کوشتنی ئەو بوون. "**قصد جایی (را) داشتن (کردن)**": بە نیازی چوونە ئەو شوێنە. "**قصدداشتن**": بە نیازبوون، ویستن. "**قصد سوء**": بە نیازی کوشتنی کەسێك یان ئازارپێگەیاندن بەو بوون، مەبەستی خراپ. "**قصد قربت**": بە نیازی کاری چاکەبوون بۆ نزیك بوونەوە لە خوا. "**قصد کاری (را) داشتن**": بەنیازی ئەنجام گەیاندنی ئەو کارە بوون. "**قصد کاری کردن**": بە نیازی ئەنجامدانی ئەو کارەبوون. "**قصد کردن**": ویستن و ئیرادەکردن بۆ ئەنجامدانی کارێ. ئازار گەیاندن بە کەسێك یان کوشتنی ئەو. "**قصد کسی کردن**": بە نیازی ئازاردان یان کوشتنی ئەو بوون. "از قصد(**بەقصد**)": بڕوانە:"عمداً". "**بە قصدِ**": بەمەبەستی.

**قصر:** (قَ) 1) کورتکردنەوە. 2) نوێژی چوار ڕکاتی بە دوو ڕکات خوێندن لە کاتی سەفەردا. 3) کەموکورتی. 4) کورت بوون. 5) کۆشك. 6) بڕوانە:"انحصار".

**قصص:** کۆی"قصە".

**قصور:** 1) کۆتاییکردن، هێڤشاندن، درێخی، کەمتەرخەمی. 2) بڕوانە: "کاهش". 3) گوناح، خەتا.

**قصّە:** 1) چیرۆك، چیرچیرۆك، سەربوردە، نەقڵ و نەزیلە، هەقایەت، کەڤنەشۆپ. 2) عەرزوحاڵ، شکایەتنامە. 3) قسە، پەیڤ. "**قصەبرداشتن(بردن)**": عەرزوحاڵ نووسین، شکایەتنامەنوسین، شکایەت کردن. "**قصەخواندن**": چیرۆك خوێندنەوە. "**قصە دراز کردن**": قسە درێژ کردنەوە، لەسەر ڕۆیشتن. "**قصە رفع کردن**": بڕوانە: "قصە برداشتن. "**قصەکردن**": هەقایەت کردن. شیکردنەوە و لێکدانەوە. "**قصە گفتن**": هەقایەت گوتن، چیرۆك گێڕانەوە، چسرۆك گوتن، قەستاکرن. "**قصە نوشتن**": دانی عەرزوحاڵ.

**قصّە پرداز:** چیرۆك گێڕەوە.

**قصەدار:** بڕوانە:"قصەرسان".

**قصەرسان:** کەسێ کە سکاڵا و عەرزوحاڵەکان بە بەرپرسانی سەرەوە دەگەیەنێ.

**قصّەگو:** چیرۆك ڤان، مێژبێژ، گێڕەوە.

**قصەنویس:** چیرۆك نووس.

**قصەنیوش:** گوێگری چیرۆك و هەقایەت.

**قصید:** کۆی"قصیده".

**قصیده:** قەسیدە، قەسیە، پارچەشێعری درێژ، هۆزان.

**قصیدەسرا:** قەسیدەوێژ.

**قصیر:** کورت. "**قصیرالقامه**": کورتەباڵا.

**قضاء:** 1) بەجێهێنان، ڕایی کردن. 2) کارێکی واجب کە لە کاتی دیاریکراودا جێبەجێ نەبووە. 3) دادوەری. 4) مردن، کۆچیدوایی کردن. 5) قەزا، بەلا، بەسەرهاتی ناخۆش. 6) حوکمی خوا، قەزا، چارەنووس. "**قضا را**": بەڕێکەوت. "**قضا راندن بر سر کسی**": دیاریکردنی چارەنووس بۆ ئەو. "**قضاشدن**": لەدەست چوونی کارێکی واجب کە دەبوایە لە کاتی خۆیدا ئەنجام بوایە. "**قضاکردن**": بەجێهێنانەوە. ئەنجامدانی کارێك کە لە کاتی خۆیدا جێبەجێ نەبووە. "**قضاوقدر**": قەزاوبەلا، قافل قەدا، قەزاوقەدەر، چارەنووس، بەلا و نەهاتی لە خواوە، وەلجاخ، وەلەجاخ. "**قضای حاجت**": دەست بە ئاو گەیاندن. بەجێهێنانی نیاز و پێویستی. "**قضای مبرم**": ئەوەی ڕوودانەکەی حەتمی و مسۆگەرە. "**از قضا**": بەڕێکەوت.

**قضات:** کۆی"قاضی".

**قضاگردان:** بەلاگێڕ، قەزاگێڕەوە.

**قضاوت:** داوەری، ناوبژیوانی نێوان دوو یان چەند کەس، هەڵسەنگاندن.

**قضایا:** کۆی"قضیه".

**قضیه:** 1) ڕووداو، پێشهات. 2) کێشە، دۆز، پرس، مەسەلە. 3) فەرمان، بڕیار. 4) لە لۆژیکدا: گوتارێ کە هەر دوو ئەگەری ڕاستی و ناڕاستی تێدابێ.

**قطارکردن:** ڕیزکردن، خستنە پشت سەری یەك.

**قطاع:** برگە، لەتۆکە، قاش. کەرت. "**قطاع خاص**": کەرتی تایبەت.

**قطاعی:** کردەی بڕین.

**قطب:** 1) جەمسەر، پۆڵ. 2) تەوەرە. 3) چینی کۆمەڵایەتی یان قۆڵی سیاسی (قطب حاکم، قطب مخالف). "**قطب مثبت**": (شیمی) پۆڵی پۆزێتیڤ، پۆڵی گەرم، "ئانۆد". "**قطب منفی**": (شیمی) پۆڵی نەگەتیڤ، پۆڵی گەرم، "کاتۆد".

**قطب بندی:** دابەش کردنی دیاردەیەك وەك کۆمەڵ بە بەش گەلی لێکدژ و لەبەرامبەر یەکدا، جەمسەربەندی.

**قطبی شدن:** 1) (کۆمەڵناسی) لەباری ئابوورییەوە چڕبوونەوە، کۆجێییبوون. 2) (فیزیك) جیابوونەوەی بارە موسبەت و مەنفییەکانی مولوکول، "پولاریزاسیۆن".

**قطر:** (قُ) 1) کۆتەرە، کۆپەرە، ڕەوق، بارست، ئەستوورایی، گێپەڕ، گێپەڕە، شاقەڵ، "کالیبر". 2) ناوچە، سەرزەوی، هەرێم. 3) (بیرکاری) تیرە، "**قطر دایره**": تیرەی بازنە، تیرەی جەغز.





**قطرات:** کۆی"قطره".

**قطران:** تکان، چۆڕان، تنۆك تنۆك هاتنە خوار.

**قطره:** چۆڕ، دڵۆپە، تنۆك، تك، تکە، لۆك. "**قطرەقطره**": چۆڕچۆڕ، دڵۆپ دڵۆپ، تنۆك تنۆك.

**قطع:** 1) بڕین و جیاکردنەوەی شتێ لە جێیەك. 2) ڕاگیرانی ڕەوتی شتێ. 3) ڕاگیراو، بڕاو، لە جەریان کەوتو. 4) پێوان، بڕین. 5) لەناوبردن. 6) لە دین دابڕان، بێ دینی. 7) قەوارە (در قطع جیبی و ...). "**قطع امید کردن از کسی(چیزی)**": ناهومێدبوون لەو، هیوابڕان لەو کەسە. "**قطع داشتن**": ئەرخەیان بوون، خاترجەم بوون. "**قطع رابطه**": نەمان(بڕانی)ی پێوەندی. "**قطع رحم**": پسانی پێوەندی دەگەڵ خزمان. "**قطع شدن**": 1) بڕان، پچڕان، پسان، قەتان، کەتان، پەڕین، لێکرانەوە، لێبوونەوە. 2) بڕوانە: "بندآمدن". 3) تەواوبوون، بەکۆتایی گەیشتن. "**قطع طریق**": چەتەیی، ڕێگری. "**قطع کردن**": 1) بچڕاندن، بچڕین، بڕاندن، بڕین، پچڕاندن، پساندن، کەتاندن، لێکردنەوە، قرتاندن، قەتاندن، قوتانن، فەکاندن، پەڕاندن، قەڵەم کردن. 2) پێش لە بەرەوپێش چوونی کارێك گرتن، ڕاگرتن، وەستاندن. 3) خاترجەم بوون، دڵنیابوون. 4) پێوان، ڕێگەبڕین. 5) یەکالاکردنەوە، بەئەنجام گەیاندن. 6) چەتەگەری، دزی و تاڵان کردنی کەلوپەلی ڕێبوارنی ناو ڕێ. "**قطع وفصل**": یەکالاکردنەوە. "**قطع ویقین**": خاترجەمی، دڵنیایی. "**بەطورقطع**": بە خاترجەمی تەواوەوە، بەبێ هیچ گومان و دڕدۆنگییەك.

**قطعاً:** بەتەواوی، بێ ئەولاولا، ژبن، بەبێ دڕدۆنگی.

**قطعات:** کۆی"قطعه"، پارچەکان، کەرتەکان، پاژەکان.

**قطعنامه:** بڕیارنامە.

**قطعه:** پارچە، کەرت، پاژ، لەت، لەتك، لەتە، لیمە، کوت، کەرك، دابڕ، بڕ، قوتەکە، پەنچك، فەلق، گەزخ، گن،لەه. دانە. قاب. "**قطعەشعر**": پارچەشێعر. "**یك قطعه**": کەرتەك، لەتکێ، پارچەیەك.

**قطعەقطعه:** پارچەپارچە، پاژپاژ، بژبژ، لەت لەت، لەتەلەتە، لەت و کوت، شەقەبەقە، کوت کوت، کوت کوتە، کەت کەتە، گنگن. "**قطعەقطعەشدن**": پارچەپارچەبوون، کەرت کەرت بوون، لەت لەت بوون، لەت و کوت بوون، دابەش بوون، جوێ جوێ و بەش بەش بوون، هل پەکاندن.

**قطعەبندی:** 1) دابەشکردنی زەوی بە ئەنازەی جۆراوجۆر، بەش بەشکردن. 2) سوارکردن، مونتاژکردن.

**قطعی:** 1) یەکجارەکی، بەتەواوی، مسۆگەر. 2) بڕاوە، شتێ چەنەچەنی نەوێ، بەکۆتایی گەیشتو. 3) بڕان، پچڕان. 4) هەمیشەیی، دایمی.

**قطعیّت:** 1) یەکجارەکی بوون، مسۆگەربوون. 2) بڕان، پچڕان، پسان.
**قطور:** ئەستوور، ستوور.
**قطیعت:** پساندنی ڕشتەی پێوەندی و دۆستایەتی.
**قعر:** 1) بن، بێخ، بنج. 2) قووڵایی.
**قعود:** 1) دانیشتن. 2) بڕوانە:"اقامت".
**قفا:** پشتەسەر، دواوە. پشتەمل.
**قفل:** قفڵ، قوفڵ. **"قفل بر لب زدن"**: بریتی لە بێدەنگ بوون، متەق لێوەنەهاتن. **"قفل بودن"**: قوفڵ بوون، قفڵ دران، داخران. ڕاوەستان. **"قفل زدن"**: قوفڵ کردن و بەستن، قفڵ دان، قفڵ لێدان، داخستن بە قفڵ، کلیل دان.
**قلاب سنگ:** بڕوانە:"قلاسنگ".
**قلاّبی:** دەسکرد، ساختەیی، جەڵەبی، ڕەشۆکی، بەدەڵ.
**قلاسنگ:** قەڵماس، قەڵماسك، قاڵماسك، قەڵماسەنگ، قۆچەقانی، بەرەقانی، کلاشینگە، کەلاسینگ، کەلاسونگ، کەلەسونگ، کەفکانی، کەڤرکانی، کەوان پیتك، کەهنیك.
**قلاّش:** 1) فێڵباز، تەڵەکەباز. 2) ئابڕووتکاو، بێ ئابڕوو، ناوزڕاو. 3) مەست.
**قلب:** 1) دڵ. 2) ناوەند، چەق، ناوەڕاست (قلب آفریقا). 3) هەڵگەڕاندنەوە، ئاوەژووکردنەوە. 4) زەغەڵ، زڕ، ناعەسڵ. **"قلب کردن"**: گۆڕین، هەڵگەڕاندنەوە. **"قلب کسی گرفتن"**: 1) دڵ وەستان، تووشی سەکتەی دڵ بوون. 2) دڵگیران، دڵ تەنگ بوون. **"قلب ماهیّت"**: گۆڕانکاری لە سرشت و جەوهەری شتێ یان کەسێکدا.
**قلباً:** لە ناخی دڵەوە.
**قلب زن:** چێکەری زێڕ و زێوی ساختەیی.
**قلب شناس:** 1) ئەوەی زێڕ و زێوی زڕ و بێ خەوش لێك جیابکاتەوە. 2) جیاکەرەوەی هەق و ناهەق. 3) کەسێ کە خەڵکی ڕیاباز بناسێتەوە.
**قلبگاه:** نێوان، ناوەڕاست.
**قلبی:** 1) لە پێوەندی دەگەڵ دڵدا. 2) هەستیاری، سۆزداری. 3) هەڵقوڵاو لە نیازپاکی و ڕووڕاستی.
**قلپ:** (قُ لُ) بڕوانە:"جرعه".
**قلّت:** کەم بوون، کەممی.
**قلچماق:** قەبە و بەهێز.
**قلدر:** شەلاتی، ملهوڕ، ملقەوی، قولدوڕ، زۆرلێکەر، لاوازکوژ، پیاگی زۆردار و مل ئەستوور و خۆسەر. **"قلدرمآبانه"**: ملهوڕانە، قولدورانە.
**قلع:** 1) هەڵکەندن، ڕیشەکێش کردن، لە ڕەگەوە دەرهاوردن. 2) قەلایی، قەلای. **"قلع و قمع"**: ڕیشەکێش کردن و بنەبڕکردن.
**قلعه:** قەڵا، قەلات، دژ.
**قلعەبان:** پاسەوانی قەڵا، نگابانی قەڵا.
**قلعەبیگی:** قەڵاچی، پاسەوانی قەڵا، دژدار.
**قلق:** (قَ لَ) نیگەران بوون، پەرێشان بوون، وەدڵەتەپیکەوتن. بێ ئۆقرەیی، ترس و لەرز.





**قلق:** (قِ لِ) 1) شێوە، فووت و فەن، تێکنیك. 2) خولق و خوو.
**قلقلی:** خڕ، گرۆڤەر.
**قلم:** 1) پێنووس، قەڵەم. 2) نووسین. 3) یەکەی ژماردنی هەندێ لە شتەکان. 4) جۆر، چەشن. **"قلم بردن در چیزی"**: گۆڕینی ئەو(دەق، نووسراوە). **"قلم بر کسی نبودن"**: بڕیاری شەرعی ئەو نەگرتنەوە، لێپێچینەوە لێنەکران. **"قلم بطلان بر چیزی کشیدن"**: پووچەڵ کردنەوە یان هەڵوەشاندنەوەی ئەو، هێڵی سوور پێداهێنان. **"قلم به دست گرفتن"**: دەسپێکردنی نووسین، خەریکی نووسین بوون، دەست بۆ قەڵەم بردن. **"قلم خوردن"**: خەت دران (بەسەر کاغز یان نووسراوەدا) بە نیشانەی پووچەڵ بوونەوەی. وەلانران، لابران. **"قلم راندن"**: نووسین. **"قلم راندن بر کسی"**: بڕیار دەرکردن سەبارەت بەو. **"قلم رفتن"**: بەحەساو هاتن، حەساو بۆ کران، لەبەر چاوگیران. **"قلم رفتن به(بر) چیزی"**: دیاریکرانی چارەنووسی ئەو. **"قلم زدن"**: نووسین یان نیگار کێشانەوە. هەڵکۆڵین، هەڵکەندنی نەخش لەسەر کانزاکان. خەت دان و وەلانان. **"قلم سر کردن"**: قەڵەم دادان/ تراشین، تاشینی نووکی پێنووس و ئامادەکردنی بۆ نووسین. **"قلم شدن"**: بڕان، پەڕان. **"قلم کردن"**: بڕین، پەڕاندن. **"قلم گرفتن"**: لە خۆش نووسیدا گرتنی قەڵەم قامیش بە شێوەیەکی تایبەت. سڕینەوە، پاك کردنەوە. **"قلم گرفتن دور چیزی"**: وازهێنان لێی. **"از قلم انداختن"**: لە قەڵەم خستن. **"به زیر قلم آوردن"**: داگیرکردن، هێنانە ژێر کۆنترۆڵ و دەسەڵاتدارەتی خۆ. **"به قلمِ"**: بەرهەمی، نووسراوەی. **"به قلم دادن"**: لەبەرچاوگیران، بەحەساوهاتن، ژمێرران.
**قلماسنگ:** بڕوانە:"قلاب سنگ".
**قلم انداز:** 1) خێرا و بەپەلە و بێ وردبینی. 2) نووسەرێ کە بەپەلە و بێ وردبینی دەنووسێ. 3) بەپەلە و بێ وردبینی نووسراو.
**قلمبه:** 1) قیت، زەق، دەرتۆقیو. 2) دژوار، سەرلێدەرنەکران، قلی بلی، قلی وبلی. 3) زۆر، کەڵان. **"قلمبه شدن"**: لەسەر یەك کەڵەکەبوون. خڕبوونەوە، کۆبوونەوە.
**قلمتراش:** قەڵەمبڕ، قەڵەمتراش.
**قلمدادشدن:** بەژمارهاتن، بەحەساوهاتن.
**قلمدادکردن:** بە حەساو هێنان، بەژمارهاوردن، ژمێران.
**قلمدست:** نووسەر، نیگارکێش.
**قلمدوش:** قەڵادۆش، قەڵاندۆش، قەڵاندۆشك، قەڵاندۆشکان، ناوشان، کەپۆڵ.
**قلم دیده:** نووسراو، بەرهەمگەلی بەنووسراوە.

**قلمرو:** چوارچێوە، مەڵبەند، قەڵەمڕەو، بیاڤی دەسەڵاتدارەتی، ئەو زەوینانەی لە ژێر دەسەڵاتی کەسێ یان دەوڵەتێك دایە.

**قلمزن:** 1) نووسەر. 2) نیگارکێش. 3) کۆڵیار، کەندۆخ.

**قلمزنی:** کاری نووسین. پێکهێنانی نەخش و نیگار لەسەر کانزاکان.

**قلم فرسایی:** نووسین، کاری نووسین، درێژدادڕی بە بابەتێ لە نووسیندا.

**قلمکاری:** نیگارکێشی، هەڵکۆڵین لەسەر کانزا یان دار یان بەرد.

**قلمە:** داررووکەی بێڕیشە بۆ چاندن، قەڵەمە، قەرەمە.

**قلمەزدن:** قەڵەمەلێدان، شفتیك.

**قلمی:** 1) بەنووسراوە. 2) کێشراو و باریك. 3) کز و باریك، قەڵەمی. 4) ئەوەی دەگەڵ پێنووسدا سەروکاری هەیە. **"قلمی کردن"**: 1) نووسین. 2) نەخشاندن، کێشانەوە.

**قلندر:** 1) دەروێش، عەبدالْ، پیاوی سەڵت و لە دنیا دابڕاو. 2) کەمتەرخەمی، گەللایی.

**قلوە:** بڕوانە:"کلیّە".

**قلوەای:** قوت و خڕ.

**قلوەسنگ:** خڕکەبەرد، کوچك، مزگال، خیزی پڕ بە مشت.

**قلّە:** لوتکە، تروپك، دوند، سەرقۆپ، سەرقەل، قەلەپۆپە، گۆپك، گل، بەرزترین شوێنی هەر شتێ.

**قلیدن:** قوڵت دان، کوڵان.

**قلیل:** کەم، بەحالْ، تۆزقالْ.

**قلیەکردن:** پارچەپارچەکردن.

**قماش:** 1) کووتالْ، پارچە، قوماش. 2) جۆر، چەشن. 3) پەست، بێنرخ. **"از یك قماش بودن"**: لە یەك قوماش بوون، وەك یەك بوون.

**قمبلی:** خڕ، قوت.

**قمر:** مانگ، هەیڤ. **"قمرمصنوعی"**: ماهوارە، سەتەلایت.

**قمری:** مانگی، هەیڤی.

**قمیش:** ناز، عیشوە.

**قنات:** کارێز.

**قنّاص:** بڕوانە:"شکارچی".

**قناعت:** 1) ڕازیبوون بە بەش. 2) بڕوانە: "صرفەجویی".

**قنق:** (قُ نُ) 1) ڕێبوار. 2) میوان.

**قنوات:** کۆی"قنات".

**قوا:** کۆی"قوە".

**قوارە:** 1) قەوارە، قەبارە، بارست. 2) سەرپۆتراك، سەروگوێلاك. 3) شیاو و لەبار.

**قواعد:** کۆی"قاعدە".

**قوافل:** کۆی"قافلە".

**قوافی:** کۆی"قافیە".

**قوّال:** 1) قسەخۆش. 2) زۆربلێ، فرەوێژ. 3) گۆرانیبێژ.





**قوالب:** کۆی"قالب".

**قوام آمدن:** خۆگرتن و نزیك بە پێگەیشتن.

**قوام دادن:** پتەوکردن، قایم کردن.

**قوام یافتن:** سەقامگیربوون، پتەوبوون.

**قوانین:** کۆی"قانون".

**قوت:** (قُ) بژیو، داژیار، ڕسق، خواردەمەنی، ئەوەی مرۆڤ دەیخوا.

**قوّت:** (قُ وَ) 1) توانا و وزەی جەستەیی، گوڕ، هێز، وزە، توان و تاقەت. 2) متمانە، خاترجەمی. 3) وزەبەخش. **"قوّت دادن"**: وزەپێدان، بەهێزکردن. **"قوّت قلب"**: ورە، هێزی دڵ، پشتووری، هەترە، هەترەش، ورینگ. **"قوّت کردن"**: زۆر هێنان. بەهێز و پتەو کردن. **"قوّت کردن با کسی"**: دەگەڵ ئەو زۆرەزمێ کردن. **"قوّت گرفتن"**: بەهێزبوون. زۆربوونی(هەوالْ، دەنگۆ و شتی وا).

**قوت:** خۆراك بەڕادەیەك کە لەش پێویستی پێیەتی. **"قوت غالب"**: خۆراکی سەرەکی خەڵکی. **"قوت لایموت"**: خۆراکی نەمرنەژی.

**قورت انداز:** خۆهەڵکێش و فیشاڵچی.

**قورت دادن:** 1) داعووران، داقورچاندن، قورچاندن، قووت دان، قویت دان. 2) بوونە خاوەن. 3) خۆخواردنەوە.

**قوز:** 1) بڕوانە:"گوژ". 2) پشت چەماوە، پشت کووڕ. **"قوزبالا(ی)قوز"**: سەربار، زەحمەتی زیادی، کێشەی دوای کێشە. **"قوزدرآوردن"**: پشت چەمانەوە. **"قوز کردن"**: دانیشتن بە حاڵەتی چەماوە یان ڕێڕۆیشتن. **"رو قوز انداختن"**: بە هەڵسوکەوت یان گوتارێ ناچارکردنی کەسێك بە لاساری و دژایەتی. **"سر قوز افتادن"**: پێداگری لە بڕوا و بۆچوونی خۆدا.

**قوزی:** پشت کووڕ.

**قوس:** کەوان. چەماوەیی. **"قوس دایرەای"**: کەوانەی بازنەیی. **"قوس معکوس"**: پەرچەکەوان. **"قوس منتظم"**: کەوانەی ڕێك.

**قوس قزح:** بڕوانە: "رنگین کمان".

**قوسی:** کەوانەیی، بەشکڵی کەوان، چەماوە.

**قول:** 1) گوتە، وتە، ئاخاوتە. 2) بەڵێن، گفت، گفتە، پەیمان، وادە، قەول، سۆز، سۆست. 3) بڕوا، باوەڕ. **"قول بی عمل"**: بەڵێنی بیکردار، گووپی. **"قول دادن"**: وادەدان، بەڵێن دان، گفت دان، قەول دان. **"قول گرفتن"**: وادەسەنن، بەڵێن لە کەسێ ساندن. **"قول و غزل"**: قسەگەلی خۆش و گاڵتە. **"از قول کسی"**: لە زمانی ئەوەوە، بە نوێنەرایەتی لە لایەن ئەوەوە. **"بە قول کسی"**: بەپێی قسەی ئەو. **"زیر قول خود زدن"**: شکاندنی پەیمانی خۆ، نەبردنە سەری پەیمان. **"سر قول خود ایستادن"**: پابەندبوون بە وادە و بەڵێنی خۆ.

**قولنامە:** قەرارنامە، بەڵێن نامە، نووسینی ئەو شتەی کە دوو یان چەند کەس لەسەری پێك هاتوون.

**قولنج:** کۆڵنج، قۆڵنج، سانجن، ژانی ناوشان.

**قوم:** 1) قەوم، قۆم، گروپێ لە خەڵکی کە خاوەنی تایبەتمەندی مێژوویی و نەژادی و زمانی هاوبەشن. 2) خزم(ان)، کەسوکار. 3) کۆمەڵێ لە خەڵکی، دەستە، گروپ. 4) نزیکەکانی کەسێك. 5) ژن، هاوسەر.

**قومش:** بڕوانە: "مقنی".

**قوم شناسی:** بڕوانە:"اتنوگرافی".

**قوّە:** 1) هێز، تین و وزە، توانایی، دەسەڵات. 2) ئامادەیی زەینی. 3) (سیاسی) هەر کام لە سێ بنیاتی حکوومەتی لە حکوومەت گەلێ کە لەودا یاسادانان لەئەستۆی پارلمانە. "**قوّە جاذبە**": هێزی ڕاکێشان. "**قوّە دافعە**": هێزی پاڵنەر، پاڵهێز. "**قوەقضائیە**": دەسەڵاتی دادپەروەری. "**قوە قهریە**": کار یان کردەوەیەك کە بە سەرکوت و گوشار و زۆر دەچێتەپێش. "**قوەمجریە**": دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن/بەڕێوەبردن. **قوە محرکە**": هێزی بزوێن. "**قوەمقننە**": دەسەڵاتی یاسادانان. "**از قوە بە فعل آمدن**": دەستەبەربوون، جێبەجێبوون.

**قویّ:** 1) خورت، بەهێز، بەتوانا، قەوی. 2) زۆر (احتمال قوی). 3) خاوەنی زانیاری زۆر و ئامادەیی بۆ وڵام دانەوە. 4) کاریگەر (داروی قوی). 5) پتەو، قایم. 6) توند. 7) هیوادار. 8) بەتوندی، بە تەواوی. "**قوی کردن**": بەهێزکردن.

**قویاً:** بەتوندی، بەخورتی.

**قوی النفس:** بەئیرادە، ئیرادە بەرز.

**قوی دست:** 1) زۆر بەتوانا، لێزان، شارەزا. 2) زۆرویژ، زاڵم.

**قوی دل:** 1) ئازا، بوێر. 2) خاترجەم و ئەرخەیان.

**قهّار:** 1) زۆر بەئەزموون و شارەزا لە کارێکا. 2) بەهێز، پڕزۆر. 3) زاڵ، باڵادەست. 4) بڕوانە:"کینەورز".

**قهر:** 1) زیزی، زویری، دەنگ داگۆڕین، دەنگ بڕین. 2) دوزاخە، وەڕەزی، جاڕزی، قەڵسی. 3) تووڕەیی و توندوتیژی. 4) زاڵی، باڵادەستی. 5) زۆر و گوشار، ستەم. 6) تەمبێ. "**قهرکردن**": 1) تۆران، تۆرین، زیزبوون، زویربوون، لالووت بوون، لالووتی شاندان، لووت هەڵکردن، دڵ ئێشان، دەنگ بڕین، دەنگ لێگۆڕین. 2) تووڕەبوون. 3) شکست دان، بەزاندن، تەرتوتوناکردن. "**قهر کردە**": زیز، زویر، تۆراو، ڕەنجاو، قەڵس، تووڕە، لووتخوار، ناڕازی، دڵپڕ. "**قهر و تهر(طهر)**": بەدخوڵقیکردن. "**قهر ورچسوندن**": زیزبوونی لەخۆڕا. "**با خود قهر بودن**": مۆن و بەدخوڵق بوون.

**قهرآمیز:** تێکەڵ بە توندوتیژی و زۆر.

**قهراً:** زۆرەکی، زۆرەملێ، زۆرملێ، بەناچار، بەزۆر، بەزەبری هێز، بەدەستی زۆر، بەخورتی.





**قهرمان:** 1) قارەمان، پاڵەوان، گورد، دلێر. 2) خەزێنەدار، گەنجینەوان. 3) نگابان. "**مخالف قهرمان**": (ئەدەبیات) دژەپاڵەوان.

**قهرمان پرستی:** قارەمان پەرەستی، مەیلی لەڕادەبەدەر بۆ پێڕەوی کردن لە کەسایەتییە هەڵکەوتەکان.

**قهرمان پرور:** قارەمان پەروەر.

**قهری:** 1) نائیرادی، ئەوەی پێوەندی بە مەیل و ویستی کەسەکەوە نیە. 2) بەپێی ویستی قانوون، دیاریکراو لەسەر بنەمای یاسا.

**قهریە:** 1) نائیرادی. 2) پشت ئەستوور بە زۆر، لەسەر بنەمای زۆر.

**قهقرا:** گەڕانەوە بۆ دواوە.

**قهقرایی:** گەڕاوە بۆ دواوە، ڕوو لە دابەزین.

**قهقهە:** قاقا، تریقە، ترقە، لق لق، هنگ هنگ، هنگی، حیلکەحیلك، پلمە، پڕمە، کەنینی بە دەنگ.

**قی(کردن):** هەڵاوردن، هەڵ هاوردنەوە، هێنانەوە، هێڵنجدان، نشر، نشراندن، دڵ ڕابوون، ڕشانەوە، وەڕشان، وەڕشیان، وەڕشین، ڤەڕشان، ڤەڕشین، ڤەڕشیان، ڤەڕەشان.

**قیاد:** لغاو، جڵەو. "**سهل القیاد**": ملکەچ و ڕام کە بە ئاسانی بۆ هەر جێیەکی ببەن.

**قیادت:** 1) ڕێبەریکردن، ڕێنوێنیکردن، پێشەوایەکردن، بوونە پێشڕەو. 2) قوڕمساغی، جاکەشی.

**قیاس:** 1) ئەنازەگرتن، بەراوردکردن، هەڵسەنگاندن. 2) مەزندە، تەخمین. 3) ئەنازە، پێوان. "**قیاس بە نفس کردن**": داوەریکردن سەبارەت بە حاڵ و وەزعی دیتران لەسەر بناغەی حاڵ و وەزعی خۆ. "**قیاس کردن**": 1) بەراوردکردن، هەڵسەنگاندن. 2) شوبهاندن، وێکچواندن. 3) بڕیاردان بەپێی"قیاس". "**قیاس مع الفارق**": بەراوردکردنی شتێ دەگەڵ شتێکی دی بێ ئەوەی لێك بچن.

**قیاسی:** پێوانەیی. بەراوردکارانە.

**قیافە:** بیچم، بەچك، فەساڵ، قیافە، سیما، قەلافەت، دیمەن، شکڵ. "**قیافەگرفتن**": ژێست گرتن، قیافە گرتن. خۆنواندن، وانواندن.

**قیام:** 1) ڕاپەڕین، هەڵتەزینەوە، شۆڕش کردن. 2) هەڵسان، ڕاست بوونەوە. 3) دەست بردن بۆ کارێك، هەنگاونان. 4) ڕاوەستاوی و پایەداری. "**قیام قیامت**": ڕۆژی پەسڵان.

**قیامت:** 1) ڕۆژاسڵاتی، ڕۆژیپساتێ، ڕۆژی پەسڵان، ڕۆژاپاشین، هەستانەوەی دوای مردن، سەڵا، قیا، قیامەت. 2) زۆر قەرەباڵغ و پڕحەشیمەت. 3) هەر شتێکی جوان و بەشکۆ یان دەگمەن. 4) زۆر، لەڕادەبەدەر. "**قیامت شدن**": 1) هاتنی قیامەت. 2) قەرەباڵغ بوون، بەرزبوونەوەی هاتوهاواری زۆر و خڕبوونەوەی لەڕادەبەدەری حەشیمەت.

**قیتول:** ئوردوگا.

**قید:** 1) زیادکردن، یاداشت. 2) بەن، بەند، زنجیر. 3) گرتووخانە، بەندیخانە. 4) هەوسار. 5) گرفتارکردن، لە داو خستن. 6) نەریت و باو و ڕێسای کۆمەڵایەتی. 7) لە ڕێزماندا: ئاوەڵکردار، ئاوەڵکار، ئاوەڵفرمان. "**قید چیزی(کسی) را زدن**": وازهێنان لێی. "**قیدکردن**": 1) وتن یان نووسینی بابەتێ، باسکردن. 2) مەرج دانان، پەیمان بەستن. 3) خستنەداوەوە، خستنە بەندەوە. "**قیدوبند**": کۆتوبەند، بەندوبار، بەستراوەیی، سنووردارێتی. "**قید و شرط**": پابەندی بە کارێ یان بابەتێ. "(**بە**) **قید چیزی**": بەمەرجی ئەو شتە. بە باسکردنی ئەو شتە، بە وتن یان نووسینی ئەو شتە. "**در قید چیزی بودن**": سەبارەت بەو هەست بە بەرپرسیارەتیکردن یان پابەندبوون بەو شتە. "**در قید حیات بودن**": زیندووبوون.

**قیراندود:** قیرینە، قیر تێهەڵسواو، داپۆشراو بە قیل، قیلەتاوکراو.

**قیرستان:** شوێنی زۆر تاریک. "**قیرستان ظلمانی**": جیهانی ماددە.

**قیف آمدن(گرفتن):** فیز و دەعیە نواندن.

**قیلوله:** خەوی نیوەڕۆ.

**قیّم:** سەرپەرشتی خێزانی مردگ، سەروەسیەت، کارتیک، سەرپەرشتیار، قەویت. "**قیّمی**": قەویتی، سەرپەرشتی، کاری قەویت.

**قیمت:** 1) نرخ، قیمەت، بەها، بایی. 2) نرخ، گرینگی. "**قیمت پیداکردن**": بەنرخ بوونەوە، قیمەت چوونە سەر. "**قیمت چیزی را شکستن**": هێنانەخواری نرخی ئەو شتە، داشکاندنی نرخی ئەو شتە، هەرزان کردنی ئەو. "(**بە**) **قیمت خون بابا** (**پدر**)": زۆر گران. "**قیمت داشتن**": بەنرخ بوون، بایەخداربوون، بەهاداربوون. "**قیمت کردن**": پرسینی نرخی شتێ. دیاریکردنی نرخی شتێ. "**بە قیمت جان کسی تمام شدن**": بوونە هۆی مەرگی ئەو. "**بە قیمت چیزی**": لە بەرامبەر لەدەست دانی ئەودا.

**قیمت گذاری:** نرخ دانان، نرخ دیاریکردن.

**قیمتی:** بەنرخ، گران، قیمەتدار.

**قیمومت:** 1) سەرپەرشتی. 2) (ڕامیاری) سەرپەرشتی سیاسی وڵاتێکی بەهێز بەسەر وڵاتێکی لاوازدا.

**قیمومیت:** بڕوانە: "قیمومت".

**قیمەقیمەکردن:** لەت و پەت کردن، لەت و کوت کردن، شەق و پەق کردن، پارچەپارچەکردن.

**قینات:** ژنانی چاوەش.

**قیود:** کۆی "قید".

**قیوم:** 1) تایبەتمەندی کەسێك کە هەر کارێك بەتەواوی و لەوپەڕی ڕاستیدا ئەنجام دەدا. 2) هەربوو، نەمر، پایەدار.

**قیومیّت:** ئەنجامدانی کارەکان بەتەواوی و بەوپەڕی باشی.

**کائنات:** هەمگەل، هەرچی خوا دروستی کردوە.

**کابانیدن:** بڕوانە: "کاویدن".

**کابوس:** 1) شەوە، شەوێ، شەڤ پەست، مۆتە، مۆتەکە، مێردەزمە، ئارختك، خەفچ، خەفتوو، بەرخەفچ، سرنجك، کاوس، ئەوی لە خەودا دەت ترسێنێ و هاوارت بۆ ناکرێ. 2) حاڵەتی گوشار و هەناسەبڕکێ و بێهێزی لەکاتی خەودا. 3) بیر و خەیاڵی ناخۆش و ناڕەحەتکەر. **"کابوس در خواب دیدن"**: شەوەبینین، مۆتەکە لە خەودا دیتن.

**کابوی:** گاوان، گایەل لەوەڕێن.

**کابیدن:** بڕوانە: "کاویدن".

**کابین:** 1) مارەیی، ماکەلە. 2) هەر کام لە ژوورەکانی ناوەوەی کەشتی. **"کابین کردن"**: مارەکردن.

**کابینە:** 1) دەفتەر، ژووری کار. 2) کابینەی دەوڵەت، کابینەی وەزیران.

**کاپیتال:** 1) سەرمایە، دارایی. 2) بنەڕەت، بناغە، مەرجی بنەڕەتی.

**کاپیتالیست:** سەرمایەدار، لایەنگری کاپیتالیزم.

**کاپیتالیسم:** سەرمایەداری، بورژوازی.

**کاپیتولاسیون:** گرێبەستێ کە دەگەڵ دوژمن دا دەبەسترێ سەبارەت بە کۆمەرجەکانی وازهێنان لە شەڕ یان خۆبەدەستەوەدان یان دەس هەڵگرتن لە دوایین شەڕی یەکجارەکی. مافێ کە بۆ هاووڵاتیانی دەوڵەتێکی بێگانە لە وڵاتێکیتر دا لەبەرچاودەگیرێ کە ئەگەر بێتوو لەو وڵاتەدا ڕووبەڕووی دادگابوونەوە لە وڵاتەکەی خۆیان دادگایی بکرێن.

**کاتابولیسم:** شیبوونەوەی مولوکولە ئاڵۆزەکان بە مولوکولی سادەتر لە پرۆسەی مێتابولیسم دا کە زۆرتر ئازادبوونی وزەی بە دواوەیە.

**کاتالپسی:** حاڵەتی تەزیوی و سڕی دەست یان پێ یان بەشێك لە ئەندامەکان.

**کاتالوگ:** کاتالۆگ، پێڕست.

**کاتالیز:** گۆڕانی خێرای کاردانەوە شیمیاییەکان بەهۆی ئامادەبوونی ماددەگەلێ کە پێکهاتە شیمیاییەکەیان لە ماوەی تێکەڵبووندا ناگۆڕێ.





**کاتالیزور:** ئاریکار، پاڵنەر، کاتالیزۆر، ماددەیەك کە خێرایی کاردانەوە شیمیاییەکان دەباتە سەرێ و خۆی دوای ئەو پرۆسەیە بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە.

**کاتب:** 1) نووسەر. 2) خۆشنووس. 3) لەبەرگرەوە، کۆپیهەڵگرەوە.

**کاتم:** 1) وەشێر، داپۆشەر. 2) ڕازدار، ڕازڤان.

**کاتورە:** سەرگەردان، سەرلێشێواو، گێژ، وڕ.

**کاتوزی:** خۆپارێز، خواپەرست.

**کاتولیسیسم:** پێڕەوی لە ئایینی کاتۆلیك، ئایینی کاتۆلیك.

**کاتولیك:** یەکێك لە لقە گرینگەکانی مەسیحییەت کە پێڕەوی لە پاپ دەکەن.

**کاثر:** زۆر، فرە.

**کاج:** 1) داری کاج. 2) زللە، شەپلاغە. 3) خێل. 4) خۆزگە، بریا.

**کاجیرە:** کاخڵی، قاخڵی، کاژێڵە.

**کاچە:** چەناگە، ئەرزینگ. خۆشی، شادی.

**کاخ:** کۆشك، قەسر. **"کاخ نشین"**: کۆشك نشین.

**کاخە:** زەردوویی، بەزەك.

**کادر:** 1) چوارچێوە، شیپانە، کادر، قاپی وێنە، سنوور. 2) کادر، پلەیەکی نیزامییە. 3) لێژنەی بەڕێوەبەری فەرمانگە یان نووسینگەیەك. 4) هەرکام لە وێنەکانی ئاڵقە فیلمێك.

**کادو:** دیاری، پێشکەشی.

**کاذب:** 1) درۆیی، درۆیین، ناڕاستەقینە. 2) درۆزن. **"فجر کاذب"**: کازیوە، کازێوە، بوولێڵەی بەیان.

**کار:** 1) کار، ئیش، پیشە، شوول، خەبات، فرمان، هەرمان، گورە، گورووە. 2) بەرپرسایەتی، ئەرك. 3) سەنعەت، پیشە، هونەر. 4) گرفتاری، دژواری، کێشە. 5) حاڵ، بارودۆخ. 6) مەسەلە، بابەت. 7) بەرهەم( این تابلو کار داوینچی است). 8) بەستتراوەیی، پێوەندی. 9) هەڵسوکەوت، ڕەفتار. 10) شەڕ، جەنگ. 11) ڕووداو، پێشهات. 12) مەرگ. 13) بینا، خانوو. **"کارآب"**: خواردنەوەی شەڕاب. **"کار آن دارد"**: گرینگ ئەوەیە، ئەسڵی کار ئەوەیە. **"کار از پیش بردن"**: ئەنجامدانی کارێك بەباشی و ئاکامی دڵخواز وەرگرتن لێی. **"کار از خرك دررفتن"**: تێکچوونی دۆخەکە. **"کار از کار گذشتن"**: کار لە کار ترازان، تێپەڕبوونی کاتی لەبار بۆ ئەنجامدانی کارێ و بێفایدە بوونی هەوڵ و تەقالا. **"کار از (بر) کسی رفتن"**: سەروبەربوونی کارەکان بەهۆی ئەوەوە، یەکلابوونەوەی کارەکان لە لایەن ئەوەوە. **"کار افتادن"**: ڕوودانی ڕووداو، هاتنەپێشی کارێ. **"کار برآراستن"**: 1) تەکووزیدان بە ڕەوتی کاروبارەکان. 2) ئامادە و تەیاربوون. **"کار برآمدن"**:

بەمەبەست گەیشتن. "**کاربردن**": 1) کەڵك لێوەرگرتن. 2) هەوڵ و کات ویستن. 3) تەکووزی و ڕێکوپێکی دان بە کارەکان. "**کار برگزاردن**": دەست بردن بۆ کارێك و بەئەنجام گەیاندنی. "**کار بریدن**": لابردنی لەمپەر و کۆسپەکان و بەرەوپێش بردنی کارەکە بە خێرایی و بەجیددی. "**کار بسته**": کاریٚ کە تووشی گریٚ و گرفت بووە. "**کار بە آب دیدن**": پەسند و قبووڵ کردنی کاریٚ. "**کار بە آخر آمدن**": بەکۆتایی گەیشتنی تەمەن. "**کار بە جان آوردن( ساختن )**": مایەدانان لە گیانی خۆ بۆ کاریٚ. "**کار بە جان رسیدن**": وەزاڵەهاتن، وەئامان هاتن. "**کار بە جای باریك( نازك ) رسیدن( کشیدن )**": گەیشتنە قۆناغی هەستیار و قەیراناوی. "**کار بی تربیتی کردن**": ڕیان یان میزکردن. "**کار بیخ پیدا کردن**": دەگەڵ کێشە و گیروگرفت ڕووبەڕووبوون. "**کار تمام بودن**": 1) بەکۆتایی گەیشتنی کار، تەواوبوونی کار. 2) بەپێی ویست و ئارەزوو بوون. 3) دژوار و قەیراناوی بوون. "**کار تنگ شدن**": قەیراناوی بوونی بارودۆخ. "**کار چاق کردن**": بوونە دەلاڵی کارێك و جێبەجیٚ کردنی. "**کار چون زر شدن**": برەوسەندنی کاروباری ئەو. "**کار حضرت فیل**": زۆر سەخت و دژوار. "**کار خاستن**": ڕوودانی ڕووداویٚ، پێشهاتنی گرفتارییەك. "**کار در پیوستن**": جێبەجێبوونی ڕەوتی کاروبارەکان. "**کار در حساب گرفتن**": پەی بردن بە گرینگی کاریٚ. "**کار در کار افتادن**": لێکدا لێکدا یان هاوکات سەرهەڵدانی کێشە و گرفت. "**کار در گره افتادن**": گریٚ و کۆسپ هاتنەڕیٚ. "**کار دست خود دادن**": خۆخستنە گێچەڵەوە. "**کار را از پیش بردن**": ئەنجامدانی ئەو کارە. "**کار را بر کسی تنگ گرفتن**": خستنە تەنگانەوە. "**کار را بودن**": ئامادەبوون. "**کار را لنگ کردن**": قۆرت تێخستن لە کار، ئاستەنگی خستنە ڕەوتی کارەوە. "**کار راندن**": بەرەوپێش بردنی کار. "**کار رفتن**": 1) بە مەبەست گەیشتن. 2) ڕوودانی ڕووداوی سەیروسەمەرە. "**کار زورکی**": کەڵەزەڕی، سۆغرە، کاری بەزۆر. "**کار ( بر ) ساختن**": هەنگاونان بۆ کاریٚ، ئامادەکردنی پێشەکییەکانی کارێك. "**کار سیاه**": کاری ڕەش، کاری نایاسایی. "**کار فرمودن**": بە کار هێنان، ناچار بە ئەنجامدانی کاریٚ کردن. "**کار کسی از سکه افتادن**": لە برەوکەوتنی کاروکاسپی ئەو. "**کار کسی بە کسی افتادن**": نیازمەندبوون بە ئەو، کار کەوتنە لای ئەو. "**کار کسی تمام بودن**": 1) دژوار و قەیراناوی بوونی بارودۆخی ئەو. 2) مسۆگەربوونی مەرگی ئەو. "**کار کسی درآمدن**": تووشی زەحمەت و گرفتاری بوونی ئەو. "**کار کسی را تمام کردن**": کوشتنی ئەو. "**کار کسی را راەانداختن**": 1) چارەسەرکردنی کێشەی ئەو. 2) بەجێهێنانی داخوازی ئەو. "**کار کسی را





ساختن**": کوشتنی ئەو یان خولڤاندنی ژانەسەر بۆ ئەو. "**کار کسی را یکسرە کردن**": کۆشتنی ئەو. سەبارەت بە داواکاری ئەو بڕیاری کۆتاییدان یان ئەنجامدانی کارەکەی. "**کار کسی ساختە بودن**": حاڵ و دۆخی ئەو بە قۆناغێکی خراپ گەیشتن، لە کوردیدا دەڵێن کاری تەواوە. مردنی ئەو، کوشتنی ئەو. "**کار کسی گرفتن**": باشتربوونی حاڵ و دۆخی ئەو بە تایبەتی لەباریماڵییەوە، برەوسەندنی کار و کاسپی ئەو. "**کار نهادن**": کار پێدان، پیٚسپاردنی کار. "**کار و امور اجتماعی**": کاروباری کۆمەڵایەتی. "**کاروکشت**": کشتوکاڵی، وەرزێری. "**کاروکیا**": 1) هێز و شکۆ. 2) دەسەڵاتدارەتی. "**کاری کردن**": 1) دەست بردن بۆ کارێك بە تایبەتی بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەك. 2) تووشی هەڵەیەك بوون. "**از کار بردن**": 1) بیٚ کەڵك کردن، لەکارخستن. 2) ناهومێدکردن. "**از کار بی کار شدن**": لەدەست دانی کار و شوغڵی خۆ. "**از کار درآمدن**": لە ئاو دەرهاتن. "**از کار ماندن**": 1) لەکارکەوتن. 2) لەکاربوون، بۆ ئەنجام نەدران. "**بر کار بودن**": کارکردن، لەسەرکاربوون. "**بر کار داشتن**": هاندان بۆ ئەنجامدانی کارێك. ناچارکردن. "**برکار گرفتن**": بەکارهێنان، بەکاربردن. "**بر کار نشاندن( نهادن )**": دانان، خستنەجیٚ.

"**بەکار**": 1) باو. 2) بەکار، ئازا لەکار. 3) پێویست. 4) شیاو، لەبار. "**بە کار آمدن**": بەکارهاتن، بەدەردخواردن، بەکەڵك هاتن، کەلهاتن، کێراتن، کێرهاتن. "**بە کار افتادن**": کەوتنەکار، دەست بەکار کردن. بەکەڵك هاتن. "**بەکار انداختن**": وەگەڕخستن، خستنەگەڕ. بەکارهێنان.

**کارآزما( ی )**: 1) ئەزموونکەر، تاقیکەرەوە. 2) بەئەزموون، کاردیتوو، ڕاهاتوو لە کار. 3) شەڕکەر، جەنگاوەر.

**کارآزمایی**: ئەزموون، تاقی، پڕۆڤە، ڕاهێنان.

**کارآزمودگی**: دەرهاتن، ڕاهاتن لەکار.

**کارآزمودە**: دەرهاتوو، ڕاهاتو لە کار دا، ئەزموون دیتو، بەئەزموون، کارکردە، کاردیتوو، کاردیتی، کاردیە.

**کارآشوبی**: کارشکێنی و خراپکاری.

**کارآفرین**: دابینکەری کار. خوا.

**کارآگاە**: 1) کەسێك کە لە جینایەت دەکۆڵێتەوە. 2) سیخوڕ، زیرەوان، نهێنبەر. 3) زانا، ئاگا.

**کارآمد**: بەبڕشت، بەزاکوون، کار لە دەست هاتو، لە کار زان، کاررزان، زانەڤان، کارامە، خاراو لە کاردا، ئازا لە کار، کارکوشتە، قاڵ، چیٚ، چنگە، لێوەشاوە، شیاو.

**کارآمدگرایی**: کارامەگەرێتی.

**کارآموز:** 1) قوتابی، فێرخواز، کەسێ کە خەریکی فێربوون و پڕۆڤەکردنی کارێکە. 2) فێرکار، ڕاهێن، ڕاهێنەر. "**کارآموزی**": کارفێربوون، خولێ کە لەودا خوازیاریی کار لە شوێنێك دا بەبێ **هە**قدەست ئیش دەکا تا کاتێ کە دەگەڵ کارەکەی ڕادێ.

**کارآور:** کاررزان، زانا لەکار، خاوەن کار.

**کارا:** کارامە، کارکو، کۆشیار، بەکار، بەکەل، زۆر کارکەر، زۆر شوولکەر. "**بسیار کارا**": کرمکار، زۆربەکار.

**کار افتادە:** کاردیتوو، بەئەزموون. ئاشق و شەیدا.

**کارافزا:** بڕوانە:"مزاحم".

**کاراکتر:** کاراکتەر، ئەکتەر. ڕەوشت.

**کارایی:** کاریگەربوون، بەکەڵك هاتن، لێهاتوویی، کارامەیی، کارایی. "**کارایی اقتصادی**": کارامەیی لە بەکارهێنانی سەرچاوەکانی بەرهەمهێنان.

**کاربر:** (بَ) بەکارهێنەر.

**کاربر:** (بُ) ئەوەی کێشەکانی سەر ڕێی کارێك لادەبا و کارەکە بەرەو پێش دەبا، کەسێك کە کارێ بە چاکی و بە خێرایی جێبەجێ بکا.

**کاربرد:** (بُ) بەکارهێنان. "**کاربرد داشتن**": کارایی(**هە**بوون).

**کاربردی:** کردەیی، پڕاگماتیك.

**کاربست:** بەکاربردن، بەکارهێنان، بەجێهێنان.

**کاربشول:** کارساز، کاررزان، خاوەن کار، ئەوەی کارێ بە باشی ئەنجام بدا.

**کاربندی:** بەکارهێنان، بەکاربردن.

**کاربهر:** بەهرەی کار.

**کاربین:** کارناس، کاررزان.

**کارپرداز:** 1) کارمەندی بەشی تەداروکات. 2) کونسول. 3) جێبەجێکەری کارێ یان دابینکەری پێداویستییەکانی کارێ. "**کارپردازی**": تەگبیرکردن لە کارێك و ئەنجامدانی.

**کارپژوه:** پشکن، پشکنەر.

**کارپیرا:** کارساز، ڕێکخەر، وەڕێخەر، ئەنجامدەری کار.

**کارت برندە:** بەرگی براوە.

**کارتن کردن:** پێچانەوە و دەکارتۆن نان.

**کارجو:** خوازیاری کار، ئەوەی بە دوی کارێکەوەیە.

**کارچاق کن:** دەلاڵ، ناونجیکەری مامڵە.

**کارخانە:** کارخانە، فابریقە، شوێنی پیشەسازی، جێگەی کاری پیشەسازان. "**کارخانەچی**": کارخانەدار، کەسێ کە کارخانەیەك بەڕێوەدەبا. "**کارخانەدار**": کارخانەدار، خاوەن کارخانە.

**کار خرابی:** خاوکاری، خەتا، **هە**ڵە. ڕیان، میزکردن.

**کاردار:** جێگری باڵوێز، مەئمووری سیاسی کە لە باڵوێزخانە دوای باڵوێز کاروبارەکانی ئەو شوێنە بەڕێوە دەبا. مەئموور، دانراو.





**کاردان:** 1) کاربین، کاررزان، زانالەکار، لێزان، کارامە، کاردروست، گۆران، پسپۆڕ، **هو**نەرمەند، زیرەك، ژیر و زانا. 2) خزمەتکار. 3) کەسێك کە پەیمانگەی تەواو کردبێ.

**کاردگر:** کارت ساز، چەقۆساز.

**کاردستی:** دەسکار، کاری دەستی، دەسوکار، سنعاتێ بە دەس کرابێ.

**کارد و کفن برگرفتن:** ئامادەی **هە**ر جۆرە سزایەك بوون، ملدان.

**کاردی:** 1) پارچەپارچە. 2) بریندار. "**کاردی کردن**": 1) چەقۆلێدان، بریندارکردن. 2) ئامادەکردنی گۆشت بۆ کەباب کردن.

**کاردیدە:** کاردیتوو، کاردیتی، بەئەزموون. شەڕدیتوو، شەڕڤان.

**کارران:** گزیر، پاکار، بریکار، کارگێڕ.

**کارراەانداز:** 1) کارڕێکخەر، کارساز. 2) بڕوانە: "**هرزە**".

**کاررس:** ئەوەی بە کارێ ڕابگا.

**کاررفتە:** لەکارکەوتو.

**کاررو‌ا:** بەکەڵك و بەقازانج بۆ بەرەوپێش بردنی کار، شیاو بۆ کارێ.

**کارزار:** 1) شەڕ، جەنگ. 2) شەڕگە، گۆڕەپانی شەڕ.

**کارساز:** 1) گرێکەرەوە، کارڕێکخەر، چارەدۆز. 2) کاریگەر، بەکەڵك. 3) خودا. 4) کاربەدەست، کارگێڕ. "**کارساز آمدن**": چارەسەرکردنی کێشە.

**کارسازی:** 1) دان، دانەوەز 2) کارسازی، کارڕێکخەری. 3) شەڕ، جەنگ.

**کارستان:** 1) کارگە، شوێنی کار. 3) کاری گەورە و بەرچاو، کار و بەسەرهاتی کەسانێ کە کاری گەورەیان کردوە. 3) **هە**قایەت، چیرۆك، سەربوردە.

**کارسنج:** کار **هە**ڵسەنگێن، کارنرخێن، کاراگا، کاردیتوو.

**کارشکن:** کارشکێن، ئەوەی کۆسپ دەخاتە بەردەم کار.

**کارشناس:** 1) کارناس، دورناس، **هێ**کار، کاررزان، زانا لە کار، گۆرە، پسپۆڕ. 2) کەسێك کە خوێندەواری لیسانسی **هە**یە.

**کارشناسی:** 1) کارناسی، پسپۆڕی، شوغڵ و کاری کارناس. 2) خولی چوارساڵەی خوێندنی زانکۆ. "**کارشناسی ارشد**": ماجستێر.

**کارطراز:** کارڕێکخەر، کارساز، کارجێبەجێ کەر.

**کارفرما:** 1) خاوەن کار، خاوەن فەرمان، خاوەن کارخانە. 2) کاریگەر، کارتێکەر. 3) دەسەڵاتدار، میر، ڕاژۆر. 4) کارگێڕ، بەڕێوەبەر. 5) کەلوپەلی ناوماڵ.

**کارفزا:** کارتاش و گرفتاری خولقێن، مایەی ژانەسەر.

**کارکرد:** 1) کار، کردەوە، کردار، "function". 2) کاردا، بەهرەی کار، ئەو کارەی کراوە.

**کارکردگرایی:** تیۆرییەك کە بەپێی ئەو لایەنە کردەییەکان فۆرمی شتەکان پێك دێنن، "functionalism".

**کارکردن:** 1) خەریك بوون بە کارێکەوە، گرفتاربوون. 2) ئەنجامدانی کارێ. 3) هەوڵدان، زەحمەت کێشان. 4) بەکارهێنان. 5) کار، کردەوە. 6) کاریگەری دانان. 7) بڕوانە:"عمل کردن". 8) شەڕکردن.

**کارکردە:** 1) کاردیتوو، کارکردە، بەئەزموون بە تایبەت لە شەڕدا. 2) کۆنە و پرتوکیاگ، شتی دەکارکراو. 3) زبر و نارێك.

**کارکشتە:** لەکاردەرهاتوو، کارامە، خارا، غارا.

**کارکن:** 1) کرێکار، بەکار، ئازا لە کار، چالاك و زەحمەتکێش. 2) دەرمانی ڕەوانی زگ. 3) کارگێڕ، بەڕێوەبەر.

**کارکنان:** 1) فەرمانبەران، کارگێڕان، پێرسونێل. 2) کرێکاران.

**کارکیا:** سەروەر، پاشا. کارزان. "کارکیایی": کارزانی. سەروەری، پاشایەتی.

**کارگاە:** کارگە، کارگا، جێگەی پیشەسازی، شوێنی کارکردنی کرێکاران.

**کارگذار:** ئەوەی بە فرزی و کارامەیی کار بکا، ئەوەی بە باشی لە عۆدەی کارێ بێ.

**کارگذاشتن:** خستنەجێ، دانان، دامەزراندن.

**کارگر:** 1) کرێکار، کارکەر، فرمانکەر، شوولکەر، پاڵە، فەعلە، خەباتچی، خەباتکار. 2) کاریگەر، کارتێکەر، شوێندانەر. 3) بەهێز، بەتوانا. 4) بەردەست. 5) ئەوەی لە پیشە یان تێکنیك یان هونەرێك دا شارەزایە، پیشەگەر، سنعاتکار، هونەرمەند. "**کارگرآمدن**": کاریگەربوون، شوێن دانان. "**کارگر حمام**": دەلاك، ناتر، کیسەکێش. "**کارگر روز مزد**": ڕۆژبڕ، ڕۆژمز، ڕۆژمزە. "**کارگر ساعت کار**": بەرکاتی، کرێکاری بە وەخت. "**کارگرشدن**": کاریگەریدانان، کارتێکردن، شوێن دانان. "**کارگر کارخانە**": کارگەچی، پاڵەی کارخانە.

**کارگردان:** 1) (سینەما، شانۆ) دەرهێنەر. 2) کەسێك کە کارێ بەڕێوەدەبا، کاربەڕێوەبەر.

**کارگرداندن:** بەڕێوەبردنی کاروبارەکان.

**کارگروە:** کۆمیتە.

**کارگزار:** فرمانگوزار، کارپێکهێنەری بەردەستی دەسەڵاتدار، مەئموری دەوڵەت یان حکوومەت، کارگێڕ، جێبەجێکەری کار، سووریاش، کەسێ کە دەلالی دانوستان یان ئەنجامبوونی کارێکە. نوێنەر. نۆکەر، خزمەتکار.

**کارگشا:** 1) کارڕێکخەر، کارساز، تێگیراوی ڕەوێنەوە. 2) خودا. "**کارگشایی**": کارڕێکخەری، کارپێکهێنەری، کارسازی.





**کار گل:** (ر.گ.) کاری بینا، قوڕتێساوین، قوڕەکاری.

**کارمایە:** 1) هێز، وەز، توانایی. 2) مایەی سەرەکی، ماددەگەلی سەرەکی. 3) (فیزیك) ئێنێرژی.

**کارمزد:** هەقدەس، مز، هەقی کارکردن.

**کارمند:** فەرمانبەر، مووچەخۆر، ئەندامی فەرمانگە، کارمەند.

**کارناآزمودە:** کارنەدیتوو، بێ ئەزموون.

**کارنامە:** 1) گۆڤان نامە، باوەڕنامە، بڕوانامە، پسوولەی گەوایی خوێندن، کارنامە. 2) پسوولەی سیایی کارێ کە کراوە. 3) مێژوو و بەسەرهاتی کەسێك. 4) کۆمەڵێك وێنە.

**کارنامەخوان:** ئەوەی بەسەرهات یان چیرۆکێ لە ڕووی کتێبەوە دەخوێنێتەوە.

**کارناوال:** 1) کارناواڵ، کاروانی شادی. 2) کۆتەڵێ کە بە شکڵێکی سەیر و پێکەنیناوی بۆ خۆشی سازی دەکەن.

**کارنکردە:** 1) کارنەکردو، نوێ. 2) بێ ئەزموون.

**کارنگ:** زمان چەور، زمان تەڕ، زمان پاراو.

**کارنما:** پەراویلکەیەك کە شێوەی کاری دەزگایەك نیشان دەدا، کاتالۆگ.

**کارنە:** پەراویلکە، کتێبۆکە.

**کاروان:** کاروان، کاربان، کارڤان، قافڵە.

**کاروانخانە:** بڕوانە:"کاروانسرا".

**کاروان رو:** کاروان ڕەو، ڕێیەك کە کاروان پێیدا تێدەپەڕێ.

**کاروان زن:** دزێ کە لە کاروان دەدا.

**کاروان سالار:** قافڵەسالار، سەرۆکی قافڵە، ڕێنوێیکەری قافڵە.

**کاروانسرا:** خان، کارمسەرا، کاروانسەرا، جێگەی پشوودانی قافڵە.

**کاروانسرادار:** خانچی، کارمسەرادار، نگابانی کاروانسەرا.

**کاروان شادی:** کارناواڵ، کاروانی شادی.

**کاروانکش:** (کَ) بڕوانە:"کاروان سالار".

**کاروانکش:** (کُ) کاروانقڕان، کاروانکوژ، کاروانکوژە، کارڤانکوژ، ئەستێرەی ڕۆژێ.

**کاروانگاە:** شوێنی کاروان، جێگەی وەستانەوەی کاروان، کاروانسەرا.

**کارور:** ئۆپێڕاتۆر.

**کارورز:** 1) فێرخواز، کەسێ کە خەریکی فێربوون یان پڕۆڤەکردنی کارێکە. 2) پیشەگەر، سنعاتکار.

**کاروری:** بەقازانج بوون، بەکەڵك بوون.

**کاروژول:** خاوەن کار، سەرکرێکار.

**کاروکاچار:** کار و کەرەستەی کار.

**کاروکر:** کار و وزە، مراد و مەبەست.

**کاروکیا:** کار و توانایی، دەسەڵاتدارەتی، فەرمانڕەوایی.

**کارویژە:** کاردا، بەهرەی کار، ئەرك، "function".

**کارە:** (رَ) کاری، کارامە، ئەوەی کاری لە دەس دێ.

**کاری:** 1) بەکار، وەکار، ئازا لە کار، کاری، چیێ، تێکۆشەر، بەدەست و برد. 2) کاریگەر، شوێندانەر. 3) شەڕکەر، ئازاو جەنگاوەر. 4) قووڵ یان مەترسیدار و کوشندە.
**کاریابی:** 1) دامەزراوەیەك کە کار بۆ بێکاران دەدۆزێتەوە. 2) دۆزینەوەی کار.
**کاریدن:** چاندن، زەرعات کردن.
**کاریر:** پێشینەی شوغڵی.
**کاریز:** کارێز. "**کاریزگر**": کارێزکەن، کەسێ کە کارێز لێدەدا.
**کاریزما:** کاریزما.
**کاریکاتور:** کاریکاتۆر، وێنەی پێکەنیناوی.
**کاریکاتوریست:** کاریکاتۆریست، کەسێ کە کاریکاتۆر دەکێشێتەوە.
**کاریگر:** 1) کرێکار. 2) سنعاتکار. 3) چالاك. 4) کاریگەر.
**کاژ:** بڕوانە:"احول".
**کاژیره:** بڕوانە:"کاجیره".
**کاس:** قووپیو، قووڵ، چاڵ.
**کاسب:** وەدەسهێنەر، دەستەبەرکەر، کاسب، کاسبکار، کەسێ لە ڕێگەی کڕین و فرۆشتنەوە دەژی و بە بازرگان ناژمێردرێ.
**کاسبرگ:** قەپووچکە.
**کاست:** 1) کەمی، کەموکورتی. 2) ناتەواو، بەکەموکووڕی. "**کاست شدن**": کەمبوونەوە. "**کاست کردن**": کەم کردن. "**کاست گرفتن**": کەمبوونەوە، کز و لاوازبوون.
**کاستن:** شکانەوە، شکیانەوە، کەمکردن(ەوە)، کێم کرن. کەمبوونەوە.
**کاستی:** 1) عەیب و کەمایەسی، کەمی، کەم کردن، لەکەمی دان، کەموکووڕی، کێموکووڕی، کەموکورتی، کێمی، کێمیایی، کەمایەتی، کێماتی، کێماسی، کێماهی، کێمی، عەلەم، شکستی، ناتەواوی، نوقوستانی. 2) کەم نرخ بوونەوەی بنەما ئەخلاقییەکان، لادانی ئەخلاقی.
**کاستی یابی:** ئیرادگیری، وردەگیری.
**کاسد:** بێ برەو، کەساس.
**کاسر:** شکێنەر.
**کاسه:** 1) قاپ، کاسە. 2) هەرشتێکی وەك کاسە. "**کاسه از کیسه دیگران چرب کردن**": لە زەحمەتی دیتران بەهرەمەند بوون، مفتەخۆری کردن. "**کاسه‌ای زیر(نیم) کاسه بودن**": پیلان یان مەسەلەیەکی شاراوە لە ئارادابوون، لە کوردیدا دەڵێن ئەو ماستە بێموو نیە. "**کاسه کجا نهم**": خۆتێهەڵقوتێن لە کارێکا بەمەبەستی خۆنوێنی. "**کاسه(و)کوزه(ها) را سر کسی(چیزی) شکستن**": هەموو خەتاکان خستنە ئەستۆی ئەو. "**کاسه لیسیدن**": زمان لووسی کردن. کاسە لێستنەوە. "**تو(ی) یك کاسه آب گوشت خوردن**": زۆر گەرموگوڕبوون.





**کاسه‌سرنگون:** 1) داینـدە، بەخشندە. 2) نەدار، دەسکورت.
**کاسه‌سیاه:** بریتی لە بەغیل، قرنیس، لەچەر، دەس قووچاو.
**کاسه‌گر:** هەوڕگەر، کاسەکەر.
**کاسه‌گردان:** سواڵکەرێ کە بە ماڵانا دەگەڕێ و خۆراك وەردەگرێ.
**کاسه‌گردانی:** چڵانە، بەماڵانەوە گەڕان و خۆراك وەرگرتن.
**کاسه‌لیس:** 1) کاسەلێس، کەسی چەورە و چڵێس، چڵکاوخۆر. 2) بریتی لە سواڵکەر، برسی، تێرنەخۆر و چاوچنۆك. 3) زمان لووس، مەرایی کەر.
**کاش:** بڕوانە: "کاشکی".
**کاشتن:** 1) چاندن، چانن، چەندن، چەقانن، ناشتن، دابنارتن. 2) ئەنجامدانی کارێك بەشێوەی خوازراو یان نەخوازراو: (واقعاً کە شیرینی کاشتی. گل کاشتی). "**کسی را جایی کاشتن**": لە چاوەڕوانیدا هێشتنەوە و نەچوونە سەر قەرار.
**کاشتنی:** چاندنی، چێنراو، شیاوی چاندن.
**کاشح:** ئەوەی دوژمنایەتی خۆی دەشارێتەوە، دوژمنی کینەکێش.
**کاشف:** 1) دۆزەر(ەوە). 2) دەرخەر، ئاشکراکەر. "**کاشف بە عمل آمدن**": ئاشکرابوون، زانران.
**کاشف الاسرار:** ئاشکراکەری ڕازەکان.
**کاشفه:** 1) مێینەی"کاشف". 2) ناوزڕان، خەنزاری.
**کاشکی:** بریا، بریکا، بریکەنێ، خۆزگە، خۆزگا، خۆزی، خۆزیا، کاشکا، کاشکای، کاشکایە، کاشکایەکو، کاشکایەکی، غەزگاڵ.
**کاشه:** جەڵغە، توێخ، توێژاڵ، تیفشال.
**کاظم:** خۆخواردنەوە، بێدەنگ، کپ.
**کاغذ:** کاغز، قاقز. نامە. "**کاغذ پرداغ**": سماتە، سیم پارە. "**کاغذ سیاه کردن**": نووسین. ڕەشکردنەوە. "**روی کاغذ آوردن**": نووسین یان کێشانەوەی شتێ لەسەر کاغز.
**کاغه:** گەوج، گەمژە، ساویلکە. "**کاغه‌کردن**": خۆ لە گەوجی دان.
**کاف:** 1) درز، کەلەبەر، کەلێن. "**کاف ران**": زێ، خەمشە.
**کافتن:** 1) بڕوانە: "شکافتن". 2) کون کردن، سمین. 3) هەڵکەندن، هەڵقەندن.
**کافر:** 1) بێ دین، دین سز، زندق، بێبڕوا بە خوا، خوانەناس، کافر. 2) ستەمکار و بێ بەزەیی. 3) ناشکور. "**کافر حربی**": کافرێ کە شەڕکردن لەگەڵی واجبە. "**کافر ذمی**": کافرێ کە ئیسلام گیان و ماڵی پاراستوە. "**کافر شدن**": لە دین وەرگەڕان، لەدین دەرچوون، کافربوون، بوونە کافر.
**کافرانه:** وەك کافران.
**کافردل:** دڵڕەق، بێ بەزەیی، ستەمکار.
**کافرستان:** کافرسان، کافرستان، شوێنی کافران و خوانەناسان.
**کافرکیش:** بێ بڕوا، بێ دین، بێ ئایین.

**کافرنعمت:** ناشکور، بێئەمەگ، پێنەزان.

**کافل:** دەستەبەر، زامن.

**کافی:** 1) سەرومڕ، بێ کەم و زیاد، سەروزیاد، تەواو، یەزی، بەس، بەسە. 2) شیاو، کارامە. 3) کارگێڕ.

**کافیدن:** بڕوانە:"شکافتن".

**کال:** 1) قووڵکەی گەورە، زەوییەك کە ئاو هەڵیکۆڵی بێ و قووڵی کردبێ. 2) لار، چەماوە. 3) کرچ، خرچ، کاڵ، نەگەیو، نەگەیشتو.

**کالا:** کاڵا، شتومەك، کەلوپەل.

**کالابرگ:** کۆپین.

**کالار:** تەختە بەردی پان و ناسك.

**کالانما:** پێڕستی کاڵاکان، کاتالۆگ.

**کالبد:** 1) کەلەستە، کەلەخ، قلاپیك، قاڵب، گیان، یۆرت. 2) مناڵدان، زاگە، زێدان. 3) قاڵب. 4) بڕوانە:"شبح". "**کالبد خالی کردن**": زۆر ترسان. مردن.

**کالبدشکافی:** توێکاریی ئەندام، شیکردنەوەی زانستی لەش بۆ تاوتوێکردنی ئەندامەکانی ناوەوە.

**کالبدشناس:** پسپۆڕی توێکاری.

**کالبدشناسی:** زانستی توێکاری، ئاناتۆمی.

**کالبدگر:** پەیکەرساز، کۆتەڵ ساز، نیگارکێش.

**کالبدگشایی:** توێکاری تەرم بۆ زانینی هۆی مەرگ، تەرم پشکنی.

**کالج:** کۆلێژ، زانینگە، بەشێکی تایبەتی لە زانستگە.

**کالجار:** بڕوانە:"کالنجار".

**کالری:** یەکەی پێوانەی تین.

**کالفتن:** شڵەژان، پەشۆکان، شەیدا و پەرێشان بوون.

**کالم/کالمه:** بێوەژن.

**کالنجار:** بڕوانە:"کلنجار".

**کالوس:** 1) گەوج، نەزان. 2) خەمبار، دڵتەنگ.

**کاله:** 1) کاڵا، شمەك. 2) کاڵ، کرچ. 3) کاسەی دارینە یان لە هەڕگ چێکراو. 4) پارچەیەك زەوی کە لەو دا شتێ بچێنرێ.

**کالی:** نگابان، پارێزەر.

**کالیدگی:** مایەی ئابڕوچوون، شکستی ئابڕووبەرانە.

**کالیدن:** 1) شێوان، پەشۆکان، شڵەژان، ئاڵۆزبوون، پەرێشان بوون، نیگەران بوون. 2) هەڵاتن، ڕاکردن.

**کالیو:** 1) سەرگەردان، سەرلێشێواو، گەوج، گەمژە. 2) دواکەوتووی زەینی. 3) کەڕ.

**کالیوگی:** گەوجی، گەمژەیی، بێئەقڵی.

**کام:** 1) مراز، ئارەزوو، خواست، ئیرادە. 2) هەوا و هەوەس. 3) هێز، توانایی. 4) فەرمان، دەستوور. 5) بڕوانە: "معشوق". 6) کردەی سێکسی، هاونوێنی. 7) خۆشی، چێژ. "**کام بر گرفتن**": بە ئاوات گەیشتن، بە مەبەست





گەیشتن. دەگەڵ کەسێك جووت بوون، هاوجێییکردن. "**کام جستن( خواستن )**": بەدوای وەدەست خستنی ئاوات و ئارەزووەوە بوون، تێکۆشین بۆ وەدەست هێنانی خواست و ئاواتەکان. "**کام دادن**": بە ئاوات گەیاندن. "**کام راندن**": وەدیهێنانی ئاواتەکانی خۆ، ژیان کردن بە پێی ئاوات و ئارەزووەکان. خۆش ڕابواردن، لە کەیف و خۆشیدا بەسەربردن. "**کام (بر) گرفتن از کسی**": بەو گەیشتن و دەگەڵ ئەو هاوجێیی کردن. "**کام گرفتن(کشیدن )**": بە کام گەیشتن، گەیشتن بە مەبەست و ئاواتی خۆ. "**کام و گر(کر )**": خواستراو، مەبەست، ئامانج. "**کام و ناکام**": بڕوانە :"خواەناخواە". "**کام یافتن( دیدن )**": بە ئاوات گەیشتن، سەرکەوتن. "**با کام**": بەپێی ئاوات و ئارەزوو. "**به کام دل**": بەپێی ویست و ئارەزوو. "**به کام دل رسیدن**": بەئاوات گەیشتن، سەرکەوتن.

**کام:** (مِ) زار، ناوەوەی دەم. "**کام کسی( چیزی ) خاریدن**": وەهەوەس کەوتنی ئەو. "**کام گرفتن**": مژلێدان لە جگەرە و شتیوا. "**به کام مرگ رفتن**": مردن یان کەوتنە مەترسی مەرگەوە. "**چیزی رابه کام کسی تلخ کردن**": بەقوزەڵقورت کردن، چێژ و خۆشی ئەو شتە لەناوبردن، لێکردنە ژەهری مار.

**کاما:** کاما، ویرگوول.

**کام انجامی:** سەرکەوتن.

**کام بخش:** بەجێهێنەری خواست و ئارەزوو.

**کام بخشی:** بە ئاوات گەیاندن. دڵاوایی و جوامێری.

**کامبرین:** قۆناغی یەکەم لە دەورانی هەوەڵی زەویناسی.

**کامجو:** بڕوانە:"عیّاش".

**کامران:** 1) خەنی، بەئارەزوو گەیشتو، کامڕەوا، خۆش ڕابوێر، بەختەوەر. 2) سەرکەوتو. 3) زاڵ، باڵادەست. 3) بەبەختەوەری و سەرکەوتن.

**کامرانی:** 1) بەختیاری، کامڕەوایی، خاوەن بەختی. 2) بڕوانە:"عیّاشی".

**کامروا:** بەختەوەر، بە ئاوات گەیشتو، غەنی، کامڕەوا. "**کامروا شدن**": بەکام گەیشتن، بەکام گەیین، بەختەوەربوون.

**کامستن:** نزیك بوون.

**کامش:** ئاسوودەیی و خۆشی.

**کامکار:** کامڕەوا، بەختەوەر، خۆشبەخت، سەرکەوتو.

**کامل:** 1) تەواو، بێکەموکووڕی، بێکەمایەسی، کامڵ، دروس، دروست. 2) زۆر، فرە. 3) پڕ، لێوڕێژ، دارماڵ. 4) بەساڵاچوو، بەتەمەن. 5) زانا. "**کامل کردن**": 1) تەواوکردن، بەئاستی دڵخواز گەیاندن. 2) لابردنی کەموکووڕییەکانی شتێ.

**کاملاً:** 1) هەمووکی، بەتەواوی، بێ کەموکووڕی، بێ زیاد و کەم، یەکجێ، سپ. 2) بەباشی.

**کامل عیار:** 1) بێ خەوش. 2) بێ کەموکووڕی، تەواو.

**کامل مرد:** پیاگی بەساڵاچوو و بەئەزموون.

**کامن:** شاراوە، نهێنی.

**کام ناکام:** بتەوێ نەتەوێ، بڤێ نەڤێ، چاری ناچار.

**کامنولت:** سامانی گشتی، بەرژەوەندی هاوبەش، وڵاتانێ کە دەگەڵ بریتانیادا بەرژەوەندی هاوبەشیان هەبووە.

**کامور:** بڕوانە:"کامیاب".

**کامە:** مراز، مەبەست، ئاوات.

**کامیاب:** خەنی، کامڕەوا، بە ئارەزوو گەیشتوو، سەرکەوتوو، بەختەوەر. "**کامیاب شدن**": سەرکەوتن، بەکام گەیشتن، بە ئاوات گەیشتن. "**کامیابی**": خۆبەستن، سازبوون و بێ نیازبوون، خۆگرتن، کامڕەوایی.

**کان:** 1) بڕوانە:"معدن". 2) سەرچاوە، ژێدەر.

**کانا:** نەزان، گەوج، گەمژە، ناتێگەیشتو.

**کانال:** 1) نۆکەن، نۆکەند، کاناڵ، کەنداو، جۆگە، کارێز. 2) کاناڵی تەلەویزیۆنی. 3) ڕێگە یان ئامرازی پێوەندی.

**کاندیدا:** ناودێر، ناڤدایی، ناوڕاگەیەنراو، ناولەسەر، دیاریکراو بۆ کارێکی باش، پاڵێوراو، بەرئەندام، کاندیدا.

**کان شناس:** کانگاناس، ئاشنا بە کان و ئەو ماددەگەلەی تێیدایە.

**کانون:** 1) چەق، ناوەند. 2) شوێنی خڕبوونەوەی گروپێکی تایبەت، ئەنجومەن. 3) ئاگردان، تەزگا، کوورە. "**کانون خانوادگی( خانوادە )**": کۆی تاکەکانی بنەماڵە، کۆڕی بنەماڵە. "**کانون زلزلە**": ناوەندی بوومەلەرزە. "**کانون ساز**": چەقساز، چەق خولقێنەر. "**کانون گریز**": چەقبێز.

**کانی:** 1) بڕوانە:"معدنی". 2) دەرهێنراو لە کاندا.

**کاو:** بڕوانە:"مقعر".

**کاواك/کاوك:** 1) بۆشایی، بەتاڵایی، والایی، هلۆڵ، هەلۆڵ، ناوبەتاڵ، قلۆر، قولۆر، بێناوك. 2) کون، سیلا، سیلاخ.

**کاوالیە:** سوارە، سوارێ کە ئەسپی هەیە. پیاوێ کە لە سەمادا ژنێ هاوڕێیەتی بکا.

**کاوان:** هەڵ کوڵۆش، هەڵقەن، لە حاڵی هەڵکۆڵین دا.

**کاوستن:** توانایی هەبوون، تاقەت هەبوون.

**کاوش:** کنەکردن، کۆڵینەوە، کۆڵاینەوە، تاوتوێ، توێژینەوە، تۆژینەوە، گەڕانی بەردەوام. ڕەخنە، پێدزکە.

**کاوشگر:** کۆڵەر، زەوی دەرەوە، توێژەر، تۆژەر.

**کاوکاو:** 1) توێژینەوە، گەڕان، پشکنین و بە دواداگەڕان. 2) باس و دمەقاڵە، مقۆمقۆ.

**کاوگر:** بڕوانە:"حفار".





**کاوندە:** هەڵ کوڵۆش، هەڵقەن، کەن، زیندەوەرێ کە ئەکۆڵێ.

**کاویدن:** 1) گەڕان، پشکنین، هەڵکۆڵینی زەوی بۆ گەڕان و دەرهاوردنی شتێ. 2) مقۆمقۆکردن، سەرخستنەسەر.

**کاوین:** بڕوانە:"مهریە".

**کاهاندن:** کەم کردن، هێنانەخوار.

**کاهدان:** کادێن، کادین، کادان، کایەن، کەدوو، کەیو. "**بە کاهدان زدن**": ناشیانە دزی کردن.

**کاهش:** 1) کەمی، کەمبوونەوە، هاتنەخوار. 2) کزی، لەڕی، لاوازی. "**کاهش دادن**": کەم کردنەوە، داشکاندن. "**کاهش یافتن**": کەمبوونەوە، داشکان.

**کاهکشان:** بڕوانە:"کهکشان".

**کاهگل:** کاگڵ، قوڕ و کا بۆ سواغ.

**کاهل:** 1) بێ توان، سست و تەوەزەل، داهێزاو. 2) ناوشان، پشتەمل. 3) ڕەش و سپی. 4) بەرەبەیان، بەیانەکی.

**کاهن:** 1) پیوارۆێژ، غەیب بێژ، نهێنیزان. 2) پیاوی ئایینی لای میسرییە کۆنەکان و جوولەکە و نەساری.

**کاهندە:** کەمکەر(ەوە).

**کاهنگان:** بڕوانە:"کهکشان".

**کاهیدن:** بڕوانە:"کاستن".

**کئیر:** بڕوانە:"کهیر".

**کبار:** (كُ) گەورە، زل. گەورەکان.

**کبارت:** گەورەبوون. گەورەیی.

**کبد:** جەرگ.

**کبر:** (كِ) خۆخوازی، خۆنوێنی، فیز و دەعیە، پۆز.

**کبر:** (كِ.بَ) گەورەبوون، چونەسەری تەمەن. "**کبر سن**": پیر و بەتەمەنی، بەساڵاچوویی.

**کبرە:** قرتماغە، پترۆ، پترۆخە، کەوەرە، توێژاڵکی سەر برین. "**کبرە زدن**": قەتماخەبەستن، توێژ بەسەراهاتن.

**کبریاء:** 1) گەورەیی. 2) لووت بەرزی، بەدەماری. 3) خودا.

**کبس:** پەستان، چەسپان.

**کبکبە:** 1) دەنگی پێی حەشیمەت و چوارپێ. 2) شکۆ و جەلال.

**کبود:** هەشی، هەشین، کەوە، کەوگ، کەوو، بە ڕەنگی شینی تۆخ. "**کبود پوشیدن**": دەبەورکردنی جلوبەرگی ڕەش بەتایبەتی کاتی تازیەباری. "**کبود رنگی**": کەوەیی، شینی تۆخ، هەشینایی. "**کبود شدن**": شین بوونەوە، کەویبوون. "**کبود کردن**": بە خەستی کوتان و شین هەڵگەڕاندن(شین کردنەوە)ی لەشی.

**کبود پوش:** 1) ڕەش پۆش. 2) بڕوانە: "عزادار". 3) سۆفی.

**کبیر:** گەورە، زل: بەڕێز، مەزن.

**کبیسە:** 1) ساڵێ کە سێسەد و شەست و شەش ڕۆژە. 2) لە ئێرانی کۆن دا ساڵێ کە سێزدە مانگە. 3) لەلای عەڕەبان ساڵی مانگی کە سێسەد و پەنجا و پێنج ڕۆژە. "**سال کبیسە**": ساڵی پڕ.

**کپك:** کەڕوو، کەڕەکیفە، برش.
**کپەشدن:** لەسەریەك کەڵەکە بوون.
**کپی:** 1) لەبەرهەڵگرتنەوە، لێگرتنەوە، کۆپی، ڕوونووس. 2) هاوشێوە، بەتەواوی لێکچوو.
**کپیدن:** نووستن، خەوتن.
**کپیست:** لەبەرنووس، کۆپیست.
**کپیه:** 1) بڕوانە: "رونویسی". 2) پێڕەویکردن.
**کتّاب:** (کَ) نووسەران. قوتابخانە.
**کتاب:** (کِ) کتێب، کتێو، کتاو، پەڕتووك، پەڕاو. **"کتاب آسمانی"**: کتێبێ کە لە لایەن خوداوە بۆ پێغەمبەرەکان ناردراوە. **"کتاب دیدن"**: خوێندن(ەوە). **"کتاب کردن"**: کتێو نووسین.
**کتاب باز:** ئەوەی لە ڕادەبەدەر هۆگری بە کتێو بەتایبەتی بە کۆکردنەوەی کتێبێب هەیە.
**کتاب بین:** بڕوانە: "فالگیر".
**کتابت:** 1) نووسین، کاری نووسین. 2) نامە.
**کتابچه:** 1) کتێبۆك، پەڕاوی بووچك. 2) تێنووس، پەڕاویلکە. 3) ڕاپۆرتی بەنووسراوە.
**کتابخانه:** پەڕتووکخانە، کتێبخانە.
**کتاب خوان:** 1) کتیبێ خوێن، ئەوەی کتێب زۆر دەخوێنێتەوە. 2) خوێندەوار.
**کتاب نامه:** پێڕستی سەرچاوەکان.
**کتاب نگاری:** کۆکردنەوەی پێڕستی بەرهەمەکانی نووسەرێك یان گروپێ لە نووسەران یان کۆمەڵە بەرهەمێکی پێوەندیدار بە بابەتێ.
**کتابی:** 1) بەشێوەی نووسراوەیی. 2) کتێبی. 3) لە تەنیشت یەك و بەبێ‌مەودا. 3) جیددی. 4) ناموسڵمانی بڕوامەند بە کتێبی ئاسمانی (جوولەکە، زەردەشتی، فەلا).
**کتب:** کۆی"کتاب".
**کتباً:** بەنووسراوە.
**کتبی:** نووسراو. بەنووسراوە.
**کتره:** دڕاو، دڕیاگ، هەڵدڕاو.
**کتك:** 1) تێلا، کۆپار. 2) کوتەك، زەبر یان زەبرگەلێ کە لە کاتی شەڕ یان تەمبێ کردن/کران وەبەر لەش دەکەوێ. **"کتك خوردن"**: لێدران، وێکەوتن، هاتنەقوتان، کوتەك خواردن. **"کتك زدن"**: لێدان، کوتان، قوتان، دارکاری، لێخستن، ئازاردان بە دار یان بە مست یان بەهەرچی. **"کتك زدن جانانه"**: شلکوتی مەرگ، بە دار شلوکوت کردن، دارکاری زۆر سەخت.
**کتك خور:** شوێنی کوتەك خواردن.
**کتکار:** دارتاش.
**کتگر:** بڕوانە:"کتکار".
**کتل:** کۆتەڵ، ئەسپێ کە لە تازیەدا دەیگێڕن.
**کتمان:** پەردەپۆشی کردن، داپۆشین، شاردنەوە.





**کتیبه:** 1) دەستەیەك لە سوارە. 2) نووسراوی زۆر قەدیم لەبەرد، لەوحە. 3) دروشمی ئایینی کە لەسەر پارچە دەینووسن.
**کثافت:** 1) گەماری، پیسی، چەپەڵی، چڵکنی، تەنوایی، قرێژ، قرێژاهی، ناپاکی. 2) پیسایی، گوو. 3) نزم و بێ‌نرخ. **"به کثافت کشیدن"**: پیس کردن، تێوەردان لە شتی پیسەوە.
**کثافت کاری:** 1) پیس کردنی شوێنێ یان شتێ. 2) ئەنجامدانی کردەیەکی نائەخلاقی کە ببێتە مایی شەرم و ناوزڕان. 3) ئەنجامدانی کاری سیکسی.
**کثرت:** 1) زۆریی، فرەیی، فرەوانی. 2) (فەلسەفەی کۆن)بڕوا بە فرەیی بوونەوەرانی جیهان.
**کثرت گرایی:** زۆرینەخوازی، فرەخوازی، پلۆرالیزم.
**کثیر:** زۆر، فرە.
**کثیرالاضلاع:** چەند پاڵوویی، فرەپاڵوویی.
**کثیرالانتشار:** پڕتیراژ، لە تیراژی سەرەوەدا، ڕۆژنامەیەك کە بە شێوەی بەربڵاو چاپ و بڵاو بێتەوە.
**کثیرالملة:** فرەنەتەوە.
**کثیف:** 1) چڵکن، گەمار، گەڤار، ڤەزخت، چەپەڵ، ڕیڤن، پیس، گلاڤ، گلاو، گەندلخە، لەوت، قلێر، قەرێژ، زیرگ، زیرگن. 2) نەخاوێن، ناپاك. 3) نزم و بێ‌نرخ.
**کج:** 1) چەوێڵ، چەوت، چەفت، خۆهر، خێچ، خوار، خوارەوەبووگ، لار، چەماوە، چەمیو، چەوتاوە، داهاتوو، شەڤ. 2) ناڕاست، لار(راه کج). 3) بەشێوەی نادروست. 4) تێکەڵ بە درۆ و فەندوفێڵ، غەرەزاوی. 5) بڕوانە:"منحرف". **"کج تا کردن با کسی"**: بەدرەفتاری کردن دەگەڵ ئەو. **"کج شدن"**: لاربوونەوە، خواربوونەوە، چەوتانەوە، داکەتن. **"کج کج"**: بە گۆشەی چاو. **"کج(و)مج"**: بڕوانە: "کج و معوج". **"کج نشستن (و راست گفتن)"**: ڕاست وتن، هەقیقەت وتن. **"کج و کوج"**: بڕوانە:"کج و معوج". **"کج و کوله"**: 1) خواروخێچ، خێچ و خوار، خیچ و پاچ، چەپت، چەوت و چەوێڵ، چەپوچەوێڵ، پێچ و پڵووچ، بەرتوڕ، کەلوکۆم، وێڕ، خوارونالەبار، شوورك، شاش و بێش، شاش و وێش. 2) ناحەز، ناقۆڵا. **"کج و معوج"**: 1) چەپوچێڕ، خوارونالەبار، خواروخێچ، یەوکشت. 2) نادروست، ناڕاست. 3) پووچ(خیال کج و معوج). **"بار کج"**: تاسەنگ، لاسەنگ، سەنگەلا، سەنگەلا، باری خوار.
**کج اندیش:** خاوەنی هزری ناڕاست، هزرچەفت.
**کجاوه:** کەژاوە، مەئافە.
**کج بین:** 1) خێل، چاوخوار، چاوچێل. 2) ئەوەی سەرنج دەداتە سفەت و لایەنە خراپەکانی دیتران.

**کج پالان:** 1) کورتان خوار. 2) بەدخولق، بەدرەفتار.

**کج تابی:** بەدخولقی و بەدرەفتاری، لادان.

**کج خیال:** بەدگومان، دوودڵ.

**کج دل:** بێ زەوق.

**کج دهن:** دەم چەوت، دەم چەفت، خێس، دەم و لەوس خوار.

**کج راهە:** 1) ڕێگەی لار، ڕێی چەفت و چەوێڵ. 2) شێوەگەلی هەڵە و لاڕێیانە.

**کج رو:** بەلاڕێداچوو، کەسێ کە بە ڕێی هەڵەدا بڕوا.

**کج فکر:** خاوەنی بیرۆکەی نادروست.

**کج کلاە:** 1) کڵاو لار، شەدەلار، کۆفی کێل. 2) دلبەری جوان و لەخۆبایی.

**کجکی:** بە حاڵەتی لار و تیلاوتیل.

**کج مدار:** بەدرەفتار، ناسازگار.

**کج نظر:** 1) خێل، چاوخوار. 2) بەئێرەیی، بەخیل، چاوچنۆك.

**کج نهاد:** بڕوانە:"بدنهاد".

**کجی:** 1) لاری، خواری، چەوتی، چەفتی، کەچایی، کەچی. 2) لادانی ئەخلاقی.

**کچل:** کەچەڵ، کەچەر، تووك لە سەر وەریو، یاڵ گەنیگ.

**کچیر:** وەزیر، پێشەوا، سەرکردە.

**کد:** (کَ) هەوڵ، تەقالا. "**کد کردن**": وەدەستهێنان، وەدەست خستن. 2) هەوڵدان. "**کد یمین**": زەحمەت، هەوڵ.

**کدام:** چێش، کام، کامە.

**کدبانو:** ژنی ماڵدار، کەیبانوو، کەیوانوو، کەیوانە، کەبانوو، کابان، کەڤانی، کەبانی، کێڤانی، کێڤانیە، زەریان، بناوانی ماڵ، داشیار.

**کدبانوگری:** 1) کەیبانووگەری، کابانی، ئەنجامدانی کاروباری ماڵەوە. 2) توانایی و شارەزایی لە ماڵداریدا.

**کدخدا:** 1) کوێخا، کەیخودا، کەیخوا، کێخا، کیخا، کەهیا، کەیا، کەفخوێ، کەفخۆی، قۆخا، قوێخا، قەیخا. 2) کەسی باوەڕپێکراو. 3) خاوەن ماڵ. 4) خاوەن ئیختیار. 5) گەورە، سەرۆك. 6) نگابانی شار، دارۆغە. 7) پاشا، دەسەڵاتدار. 8) گزیر، کاربەدەست، سووڕباش. 9) زاوا. "**کدخدا(ی) شدن**": بوونە زاوا.

**کدخدامنشی:** کوێخایانە، کاری پیاوانە، چارەسەرکردنی کێشە و ناکۆکی خەڵکی لەڕێگەی ناوبژیوانی و ئاشتیخوازانەوە.

**کدر:** 1) لێڵ، لێڵایی، شلوێ، لیخن، لیخناو، ناساف، خەور. 2) جسمێ کە تیشکی لێ تێنەپەڕێ. 3) خەمهێن. 4) نارەحەت، پەرێشان.

**کدود:** زەحمەتکێش.

**کدورت:** 1) ڕەنجان، تۆران، زیزبوون. 2) لێڵی، تاریکی، تەم. 3) دڵتەنگی، دڵ گیران، خەمباری. 4) دوژمنی، دوژمنایەتی. 5) پیسی، ناپاکی.





**کدە:** (کَ دِ) 1) خانوو، شوێنی ژیان. 2) دێ، ئاوایی.

**کدی:** سواڵ، پارسەکی.

**کدیور:** 1) جووت بەندە، جووتیار، وەرزێر، کشتیار. 2) خاوەن ماڵ. 3) باخەوان. 4) کەیخودا. 5) بڕوانە: "متنفذ". 6) فەرماندە. 7) سالار.

**کدیە:** سواڵ کردن، دەس پانکردنەوە.

"**کذا فی الاصل**": لە ئەسڵ دا وایە.

**کذا:** وەها، هەروا، هەروایە.

**کذّاب:** فرە درۆزن.

**کذب:** درۆ.

**کر:** 1) کەڕ، گوێکپ. 2) زۆر، هێز، وزە. 3) دڵخواز، ویست. 4) نۆکەر. 5) هێرش، پەلامار. "**کروفر**": 1) شکۆ و جوانی، شکۆ و سەنتەنە. 2) پەلاماربردنەسەر دوژمن و دوایە هەڵاتن.

**کرات:** (کُ) کۆی"کرە".

**کرّات:** (کَ) کەڕەتەکان، چەلەکان.

**کراجیدن:** گاڕەگاڕ کردنی مریشکی ماڵی کاتی هێلکەکردن.

**کرّار:** زۆر هێرشبەر لە شەڕدا.

**کراشیدن:** پەرێشان کردن، ئاڵۆزکردن.

**کراکردن:** هێنان، شیاوبوون.

**کراگرفتن:** بەکرێ گرتن.

**کرامت:** 1) کەرامات، کەرامەت، کاری سەیروسەمەرەی پیاوانی خوا. 2) گەورەیی و جوامێری، بەخشندەیی. 3) ڕێز، ڕێزلێنان. 4) دیاری. 5) کاریزما.

**کرامند:** بەڕێز و قەدر، بەنرخ، گرینگ.

**کران/کرانە:** 1) لێوار، لێوارە، ڕەخ، ڕۆخ، قەراخ، دەم چەم. 2) لا، ئالی. 3) کۆتایی. "**کران آوردن**": بەکۆتایی گەیاندن، تەواوکردن. "**کران کردن**": 1) بەکۆتایی گەیاندن. 2) کلابوون، بەلاداکەوتن. "**کران گرفتن(طلبیدن، گزیدن)**": دووریکردن، کەنارەگرتن. "**از کران تا(بە) کران**": لەم لاوە تا ئەولا، گشت جێیەك. "**با کران آمدن**": دوورکەوتنەوە، جیابوونەوە. "**بر کنار**": جیا، دوور. "**بر(بە) کران رفتن(شدن)**": بە کۆتایی گەیشتن، تەواوبوون.

**کران بستگی:** بڕوانە:"محدودیّت".

**کرانبندی:** بڕوانە:"محدودیت".

**کرانجی:** بێ لایەن، Neutral.

**کرانگین:** بڕوانە:"جانبی".

**کرانمند:** سنوردار، بەرتەسك.

**کرانمندساز/کرانمندگر:** بەرتەسك کەرەوە، سنووردارکەر، Limiting.

**کرانە:** 1) لێوار، لێوارە، لێڤك، قەراغ. 2) لا، ئالی. 3) کۆتایی. "**کرانەداشتن**": لە لاوەبوون، دووربوون. "**کرانەشدن**": کۆچی دوایکردن، مردن. "**کرانەکردن**": دووریکردن، خۆلێبواردن. سەرپێچیکردن. "**کرانەگرفتن (گزیدن)**": کەنارەگیریکردن، دوورکەوتنەوە، دووریکردن. "**کرانەیافتن**": دوورکەوتنەوە.

**کراهت:** 1) ناحەزی، دزێوی. 2) ناڕازیبوون، پێ ناخۆش بوون. "**کراهت داشتن از چیزی**": بێ مەیل بوون سەبارەت بەو یان بەناپەسند زانین و دووریکردن لێی. "**بەکراهت**": لە ڕووی بێ مەیلی و بێزارییەوە.

**کرایە:** کرێ. "**کرایە دادن**": بەکرێدان. دانی کرێ. "**کرایەکردن**": بەکرێگرتن.

**کرایەای:** بەکرێ.

**کرایەنشین:** بڕوانە: "مستأجر".

**کرپا:** گیای ناسك و کورت.

**کرپان:** کەسێ کە گوێی هەیە بەڵام ئاخاوتەی خوا نابیستێ.

**کرت:** کەڕەت، جار، چەل.

**کرتاسە:** قۆناغی سێهەم لە دەورانی دووهەمی زەوی ناسی.

**کرچ:** مەلی کڕکەوتوو، کورك، قورك. "**کرچ شدن**": کڕکەوتن، کورك بوون، قورمین.

**کرچ کرچ:** پارچەپارچە، پاژپاژ.

**کرخ/کرخت:** سڕوتەزیو، پەنج، لەگۆچوو. "**کرخاندن**": بڕوانە: "کرخ کردن". "**کرخ شدن**": تەزان، تەزین، سڕبوون، لەگۆچوون، مروچەکردن، ڕەقبردنەوە، قەفلان، سست بوونی ئەندام. "**کرخ کردن**": 1) تەزاندن، سڕکردن، پەنج کردن، لە گۆبردن، مروچەپێکردن. 2) لەهۆش بردن، نەشئەکردن. "**کرخ کنندە**": سڕکەر، تەزك، لەگۆبەر. "**کرختی**": سڕی، تەزوو. "**کرخیدن**": بڕوانە: "کرخ شدن".

**کرد:** (كُ) نەتەوەی کورد کە لە نەژادی ئاڕیاییە و بەسەر چوار وڵاتی ئێران و ئێراق و تورکیە و سووریەدا دابەشکراوە.

**کردار:** 1) کردار، ئاکار، کردە، کردەوە. 2) شێوە. "**کردار کردن**": کرداری باش لەخۆنیشاندان، هەڵسوکەوت کردن بە خۆش خولقی. "**بە(بر) کردار**": وەکوو، بەفۆڕمێ.

**کردستان:** وڵاتی کوردان، کوردەواری، کوردکانی، کوردسان، کوردستان، نیشتمانێ کە بەسەر چوار وڵاتی ئێران و ئێراق و تورکیە و سوورییە دا دابەش کراوە.

**کردك:** (كِ.دَ) بڕوانە: "لغز".

**کردك:** (كَ.دَ) پارچە، بەش، بەشێ لە کتێو.

**کردگار:** 1) ئەنجامدەر، چالاك. 2) یەکێك لە ناوەکانی خوا. 3) ئافرێنەر، خوڵقێنەر.

**کردگر:** سووکەڵەی "کردگار".

**کردمانند:** (كُ) کوردانە، کوردئاسایی، وەك کورد.

**کردمند:** (كَ.مَ) گورجوگۆڵ، فرز و کرژ، توند و خێرا.

**کردن:** 1) ئەنجامدان، جێبەجێکردن، کردن، کران، کریان، کرن. 2) هەنگاونان بۆ ئەنجامدانی کارێك. 3) کرداری سێکسی ئەنجامدان. 4) تێکەڵ کردن دەگەل شتێك. 5) تێپەڕاندن و گەیاندن. 6) 7) دەبەرکردن، دەپێکردن. 8) پڕکردن. 9) دانان، لەسەرکاردانان. 10) سازکردن، دروستکردن. 11) نووسین. 12) خوڵقاندن، ئافراندن. 13) بەجێهێنان. 14) بەکاربردن، دەکارکردن. 15) خەرجکردن. "**بەهم کردن**": 1) تێکەڵ کردن، ئاوێتەکردن. 2) بەستن. 3) پاشەکەوت کردن. 3) کۆکردنەوە.

**کردنگ:** گەمژە، گەوج، گێل، دەبەنگ، حەپۆل.

**کردومرد:** (كَ.مُ) 1) بێنرخ، نزم. 2) بە بێ پێشەکی، دەزبەجێ.

**کردەکار:** کاردیتوو، ڕاهاتوو لە کار، بەئەزموون، کارزان.

**کردیت:** متمانە. جێ باوەڕی، جێ متمانە.

**کرسی:** 1) کورسی، تەخت، چوارپایەیەك کە لەسەری دادەنیشن. 2) پۆست، پلەوپایە. 3) ڕشتەی پسپۆڕی زانستگایی. 4) ناوەندی شار یان ناوچە یان وڵاتێك. "**کرسی گذاشتن**": کورسی نانەوە لە زستان دا، کورسی هاویشتن. "**کرسی نشین**": ئەوەی لەسەر سەندەڵی دادەنیشێ. خاوەنی پۆست و پلەوپایە. ناوەندی وڵات یان ناوچەیەك. "**بە(بر) کسی نشاندن**": 1) سەلماندن، پێ قبووڵکردن. 2) بردنەسەر.

**کرش:** (كَ.رَ) بڕوانە: "فروتنی".

**کرشمە:** خنج، خنجە، خنجکە، ناز، غەمزە، کریشمە، هێما بە چاو و برۆ. "**با(بە) یك کرشمە دو کار کردن**": بە تیرێك دوو نیشان پێکان.

**کرفت:** پیس، چڵکن.

**کرفە:** کاری باش، چاکە.

**کرکری خواندن:** هاشوهووش کردن، لاف لێدان.

**کرکس:** بڕوانە: "لاشخور".

**کرکم:** بڕوانە: "رنگین کمان".

**کرم:** (كَ.رَ) جوامێری، مێرخاسی، پیاوەتی، بەخشین، دانی بێقەرەبوو.

**کرم:** (كِ.رِ) سپات، سپیواژ، سپیواش، ڕەنگی زەردی ئاماڵ سپی، بە ڕەنگی نۆك.

**کرم:** (كِ) کرم. "**کرم ابریشم**": کرمی ئاوریشم، کرمێ کە لیکاوەکەی دەبێتە هەودای ئاوریشم. "**کرم پلاس کسی بودن**": ئێرادگرتن لەو، ڕەخنەگرتن لەو. "**کرم خاکی**": گڵخۆرکە، گڵەخۆرکە، کرمەسوورە، کرمەسوورکە، کرمی گڵ. "**کرم داشتن**": 1) کرم هەبوون. 2) پەتاهەبوون. 3) هەبوونی مەیلی توند بۆ ئازاردان یان هاندانی دیتران. "**کرم ریختن**": کرم ڕشتن، ئەنجامدانی کارێ بەمەبەستی ئازاردان یان وروژاندنی کەسانی دی. "**کرم زدن**": کرم لێدان، کرمێ بوون. "**کرم شبتاب**": ئەستێرۆك، گوڵەستێرە، گوەستێرە، گووئەستێرە،

گۆستێر، گووستێرك، گۆسارە، كرمێ كە بە شەو دەترووسكێ. "**كرم كدو**": مۆلك، كرمی هەرە درێژی ناو زگ.

**كرم زده/كرمو:** كارمژن، كرمژنە، كرمەژن، كرمەژنە، كرموژن، كرمێ، كرماوی، كرمەڕێز، كرم تێكەوتوو.

**كرنجو:** شەوە، مۆتەكە.

**كرنش:** كۆڕنش، چەمانەوە بۆ ڕێز و حورمەت.

**كرنولوژی:** دەمژمێر، زانستێ كە مێژوو و قۆناغە كاتییەكانی دیاردەكان و ڕووداوەكان تاوتوێ دەكا.

**كروز:** شادی، دڵخۆشی.

**كروی:** خڕ، گر، گردە، گرۆڤەر، گلۆڤەر.

**كرویز:** لۆژیك، بیرسا.

**كرویزگر:** لۆژیك زان.

**كره:** گۆ، تۆپ. "**كرەزمین**": گۆی زەوی.

**كریز:** (كُ) 1)ماڵی چووكە، كونجی ماڵەوە. 2) پەڕ و باڵ وەرینی پەلەوەران.

**كریزی:** (كُ) پیر، پشت چەماوە.

**كریم:** 1) بەخشندە، بەخشەر، دڵاوا. 2) لە ناوەكانی خوا. 3) گرانبایی، بەنرخ. 4) گەورە، مەزن.

**كریه:** 1) ناحەز، ناشیرین. 2) ناخۆش، ناپەسند. "**كریەالمنظر**": دەموچاو ناحەز.

**كزاز:** زك ڕەقی، دەردەكۆپان، نەخۆشییەكە.

**كز( خوردن ):** (كِ) هەڵپڕووزان. "**كز دادن**": هەڵپڕووزاندن.

**كزكردگی:** خۆكزكردن، كروشمە، كورشمە، كۆشكە، ماتە.

**كزكردن:** خۆمات كردن، كڕكردن، مات بوون، بە كزی كروشمەكردن، كورش هەڵاتن، كۆشكەڵاتن، چنگزین، داپسكان، داپسكیان، داپسیان.

**كزكرده:** داماو، كز، كزوولكە، كزولكە، كزكۆڵە، كزەڵۆك، غوژ، مات، كروشمەكردو.

**كژآیین:** بڕوانە: "مرتد".

**كژامید:** بێهیوا، هیوابڕاو.

**كژاندیش:** بڕوانە: "كج اندیش".

**كژاوه:** بڕوانە: "كجاوە".

**كژ برداشت كردن:** بەهەڵە تێگەیشتن.

**كژپنداشت:** بڕوانە: "وهم".

**كژخوی:** كەللەشەق، لاسار، یەك دندە. زووهەڵچوو، تووڕەوتۆسن.

**كژراه:** لاڕێ، گومڕا.

**كژرفت:** بڕوانە: "انحراف".

**كژروی:** بڕوانە: "انحراف".

**كژریخت:** بڕوانە: "بدریخت".

**كژزخمه:** 1) ئەوەی ناتوانێ بەباشی ساز بژەنێ. 2) لە ڕێی ڕاست لادەر.

**كژسخن:** درۆزن.

**كژفهمی:** بە هەڵە تێگەیشتن.

**كژگو:** درۆزن.

**كژمژ:** بڕوانە: "كج و كولە".

**كژنشستن:** كاری نایاسایی‌كردن.

**كژنمود كردن:** بڕوانە: "تحریف كردن".





**كژنهاد:** بڕوانە: "بدنهاد".

**كژنهادن:** فریودان، خەڵەتاندن.

**كژی:** لاری، چەوتی. "**كژی كردن**": درۆ وتن و كاری ناڕەوا ئەنجامدان.

**كس:** (كَ) 1) كەس، تاكێ لە بنیادەم. 2) دانراو، مەئموور. 3) نامەبەر. "**كس و كار**": خزم، فامیل، كەسوكار. "**كس و ناكس**": خەڵكانی چاك و خراپ. "**كسی شدن**": بوونە خاوەنی پێگە و ڕێز.

**كساد:** بێبرەو، بێبازاڕ، لپاش، كەساس، كەسات.

**كسادی:** بێبازاڕی، ناڕەواجی، بێبرەوی، كەساسی، مالەڤین، كز.

**كساردن:** بڕوانە: "گساردن".

**كسالت:** لەش گرانی، لەش داگیران، نەخۆشی، تای سووك، تەخسیر، سستی.

**كسالت بار:** ماندووكەر، ئەوەی لەش تووشی داهێزان دەكا.

**كسب:** 1) وەدەستهێنان، دەستەبەركردن، وەچنگ خستن، دەسگیرخستن. 2) كار، پیشە، شوغڵ. 3) كاسپی.

**كسبه:** كۆی "كاسب".

**كس تركی:** (كُ) بێبناغە، بێبنەما.

**كسته:** خۆیان، كلۆشی گێرەكراوی خڕەوەبووی شەن نەكراو.

**كسر:** 1) كەم. 2) كەممی، كەموكورتی. 3) شكاندن، وردكردن. 4) تێكشكاندن. 4) شكاوی. 5) درز، كەلێن. 6) (بیركاری) كەرت. "**كسرآمدن**": كەم هاتن. "**كسرآوردن**": كەم هاوردن. "**كسر بسیط**": كەرتی سادە. "**كسر بودجه**": كەمی بوودجە، كەممی ڕادەی داهاتەكان نیسبەت بە خەرجییەكان. "**كسر حقیقی**": (بیركاری) كەرتی ڕاستەقینەیی، كەرتی (بە)ڕاستی. "**كسر داشتن**": كەمی هەبوون. "**كسر عشری**": (بیركاری) كەرتی دەیی، كەرتی دەیەكی. "**كسر كردن**": كەم كردنەوە. "**كسر مركب**": (بیركاری) كەرتی ئاوێتە.

**كسره:** ژێر، هیمایەك بەم فۆڕمە(ـــِ).

**كسری:** كورت هێنان، كەم هێنان.

**كس شعر:** (كُ) قسەی هەللەق مەللەق.

**كس كش:** بڕوانە: "جاكش".

**كسل:** (كَ سِ) 1) لەش گران بوون، داهێزان، نیوە نەخۆش، سفتۆبوون. 2) دڵتەنگ، بێ حەوسەڵە.

**كس موش چال كردن:** بریتی لە كاری پڕ و پووچ كردن.

**كسوت:** 1) جلوبەرگ، پۆشاك. 2) ڕواڵەت و حاڵەتی ڕواڵەتی. 3) ریز.

**كسوف:** ڕۆژگیران، خۆرگیران. "**كسوف جزئی**": خۆرگیرانی كەلی، خۆرگیرانی پاژی. "**كسوف كلی**": خۆرگیرانی تەواو.

**كسیب:** وەدەست هاتو. "**كسیب گشتن**": وەدەست هاتن، ڕەنیوهاتن.

**كسیب:** ڕێگری، چەتەیی، تالاَن. "**كسیب كردن**": چەتەیی و تالاَن كردن.

**کسیر:** شکاو، وردبوو.

**کَسی کردن:** یارمەتیدان، یاریدەدان.

**کَش:** (کَ) 1) باش، چاک، جوان. 2) جوان، دڵڕفێن. "**کش و فش**": 1) نازو کریشمە. 2) شکۆ و جەلال.

**کش آمدن:** (کِ) 1) کێشهاتن، کێشران، لەدووهاتن. 2) درێژەکێشانی مەسەلە یان بابەتێك. 3) دڵ بوورانەوە، بێحاڵ بوون، تووشی بێهێزی و بێحاڵی هاتن. 4) پێچ خواردن و خولانەوە و لە حاڵەتی ئاسایی دەرچوون.

**کشاف:** زۆر دۆزەر، دەرخەری وردەکارییەکان.

**کشاکش:** 1) کێشەوبەرە، کێشەوگێرە، گێرمەکێش، کێشەکێش، کەشاکەش، کەشمەکەش، کێشماکێش، بۆ هەر لایەك کێشان، لەهەر لایەکەوە کێشان. 2) بگرەوبەردە، ڕەوتی چوونەپێشی شتێ بە گۆڕانکاری و سەختی و گرفتاری. 3) چەقە و گورە، مقۆمقۆ. 4) هەوڵ، تەقالا.

**کشاله:** ڕاستا و درێژایی شتێ. "**کشاله رفتن**": ئارام و بەئەسپایی خۆ بەرەو لای کەسێك یان شتێ کێشان، بەسینەخشکێ ڕۆیشتن. "**کشاله کردن**": 1) بڕوانە: "کشالە رفتن". 2) خۆکێشانەوە.

**کشاندن:** کێشان، ڕەکێش کردن.

**کشان کشان:** خێشەخێش، ڕەکێش ڕەکێش، ڕاکێشان بە زەویدا، کەشان کەشان.

**کشانەکردن:** کێشان، بەرەو لای خۆهێنان.

**کشانی:** ڕاکێشان، گیرایی، دلگری.

**کشاورز:** جووت بەندە، جووتیار، کشتیار، وەرزێر، فەلەخوێ، فەلا.

**کشاورزی:** وەرزێری، جووتێری، کشتوکاڵ.

**کشباف:** ڕەشتی، شەدە.

**کش پیدا کردن:** درێژبوونەوەی مەسەلە یان بابەتێ، درێژەکێشان.

**کشت:** (کِ) 1) چاندن، چەقاندن، زەرعات. 2) بەرهەم، بەروبوم. 3) مەزرا، مووچە. "**کشت سرمازده**": ڤیاد، زەرعاتی شەختە لێدراو. "**کشت صیفی**": هاوینە، هاڤینی، هاڤین چێن، شیناوەرد. "**کشت و زرع(کشت و کار)**": وەرزێری، کشتوکاڵ.

**کُشت:** (کُ) کوشتن، لەناوبردن. "**کشت و کشتار**": کوشت و کوشتار، کوشتنی ژمارەیەکی زۆر. "**به کشت**": بە هەوڵ و تەقالای زۆر.

**کشتار:** (کِ) ئەوەی لە ڕێگەی زەرعاتەوە وەدەست هاتوە، بەروبوم.

**کُشتار:** (کُ) 1) سەربڕینی بوونەوەران. 2) کوژتار، کوشتار. 3) سەربڕاو. "**کشتارجمعی/دستجمعی**": کۆکوژی، کوشتاری بەکۆمەڵ، قڕکردن، لەناوبردن، هەشافتن.

**کشتارگاه:** جێی کوشتنەوە، کوشتارگە، قەساوخانە، شوێنی سەربڕینی مەڕوماڵات.

**کشتبان:** 1) وەرزێر، جووتێر. 2) گابانی مووچە.

**کشت خان:** بڕوانە: "کشتزار".





**کشتزار:** کێڵگە، مووچەومەزرا، هیگا، هێگا، یانگە، زرعات.

**کشتکار:** (کِ) جووت بەندە، وەرزێر، کشتیار. "**کشتکاری**": وەرزێری، کشتوکاڵ.

**کشت گاه:** بڕوانە: "کشتزار".

**کشت گر:** وەرزێر، جووتێر.

**کشتمان:** زەوییەك کە شتێکیان تێدا چاندبێ.

**کشت مند:** 1) مووچە، کێڵگە. 2) بەروبووم، داهات. 3) جووتیار، وەرزێر.

**کشتن:** (کِ.تَ) 1) کێڵان و چاندن، زەرعات کردن. 2) نزیك کردنەوەی نێر و مێ بۆ ئاوس کردن یان دووگیان کردن.

**کُشتن:** (کُ.تَ) 1) کوشتن، کوژتن، کوژین، مراندن، سپیکردن، سپیکردنەوە، ساردکردنەوە، مەرگ بڕین، کستەنە. 2) سەربڕینی ئاژەڵ (مەڕومالات). 3) لەناوبردن یان سەرکوت کردن. 4) بە سەختی ئازاردان. 5) کوژران، مردن. 6) کووژاندنەوەی چرا. "**کشتن کردن**": کوشتارکردن. "**خود را کشتن**": 1) ڕەنجی زۆر و تاقەت پڕووکێن کێشان یان هەوڵی لەڕادەبەدەردان. 2) قەڵس و نارەحەت بوون. "**به کشتن دادن**": بە کوشت دان.

**کشتنگاه:** جێی کوشتن، شوێنی کوشتار.

**کشت ورز:** 1) وەرزێر، کشتیار. 2) مووچە و مەزرا، کێڵگە. 3) کشتوکاڵ، زەرعات.

**کشته:** (کِ) 1) زەوی چێندراو. 2) بەروبووم، داهات. 3) وشکەوەبوو.

**کُشته:** (کُ) 1) کوژراو، کوژاو، کوژیاگ. 2) ئاشق، شەیدا. 3) کووژاوە. "**کشته‌آمدن**": کوژران. "**کشته‌دادن**": لە دەست دانی کەسانێك و کوژرانیان بەتایبەتی لە شەڕدا. "**کشته‌شدن**": کوژان، کوژیان، کوژران، هاتنەکوشتن. "**کشته(و)مرده**": ئاشق و شەیدا. "**از کشته پشته ساختن(کردن)**": کوشتاری زۆر کردن.

**کُشتی:** (کُ) ملانێ، ملانە، زۆران، زۆرانی، زۆرەبانێ، زۆرەوان، زۆرەوانی، زۆرو، گمش، گولاش، گولەش، گوراش، عەفرە. "**کشتی گیر**": زۆرانباز، زوورەبانباز، زۆرانی گر، کۆچەگرملانێکەر. "**کشتی گیری**": زۆرانبازی، زوورەبانبازی، زۆران گرتن، زۆرانی گرتن.

**کشت یارِ کسی شدن:** لە بابەتێك دا پێداگری زۆرکردن دەگەڵ ئەودا.

**کشتی بان:** کەشتییەوان، کەشتیڤان، گەمیەوان، زەریڤان.

**کشتی بندان:** بڕوانە: "لنگرگاه".

**کشتی شکسته:** سامان دۆڕاو، خەسارەت دیتو.

**کشتی گاه:** بڕوانە: "لنگرگاه".

**کشخان/کشیخان:** جاکەش، دەویت، قورمساغ.

**کش دادن:** 1) درێژکردنەوە. 2) ڕاکێشانی ئەندامەکانی لەش بە مەبەستی ئیستڕاحەت دان پێیان، خۆ لێك کێشانەوە.

**کشدار:** 1) بەکێش، ڤەکێش، چیڕ، چڕ، جیڕ، خۆگرونەپس. 2) پاشڵدار، کلکدار. 3) شتێ کە کێش بێ.

**کش رفتن:** دزران، ڕفێنران، قۆسترانەوە.

**کشسان:** جیڕ، چێر، "ئێلاستیك".

**کشش:** (کُ.شِ) 1) سووکەڵەی "کوشش". 2) قەتڵ، کوشتار. "**کشش کردن**": 1) کوشتارکردن، کوشتن. 2) سەربڕینی مەڕومالات، قوربانی کردن.

**کشش:** ( کَ.شِ) 1) ڕاکێش، کێشەر، دڵ ڕاکێش، گیرایی. 2) بڕوانە:"تحمّل". 3) ڕاگواستن، بردن، کێشان. 4) مەیل، تامەزرۆیی. 5) درێژکردنەوە، ڕاکێشان. 6) بەریان، مەیل بەتایبەتی ڕاکێشانی کەسێك بەرەو لای خۆ. 7) هەوڵ، تەقالا.

**کشف:** 1) دۆزینەوە. 2) ئاشکراکردن، دەرخستن. 3) (مافناسی) دەرخستنی مەبەست و نیازی دوو لایەنی مامەڵە. 4) دەرکەوتنی هەقیقەتە غەیبییەکان بۆ عارف، دیناو. "**کشف شدن**": ئاشکرابوون. دۆزرانەوە. "**کشف صور**": دۆزینەوەی وێنەکان. "**کشف کردن**": 1) ئاشکراکردن. دۆزینەوە. 2) تاقیکردنەوە، ئەزموون کردن. 3) لابردن، سڕینەوە. "**کشف و شهود**": دەرکەوتنی هەقیقەتە پێوارییەکان و جیهانی مەعنەوی بۆ عارف.

**کشفیات:** 1) کۆمەڵە کار و چالاکی گەلێك بۆ دۆزینەوەی دیاردە و شوێنە نوێیەکان. 2) شتە دۆزراوەکان.

**کشك ساییدن:** 1) وردکردن و نەرم کردنی کەشك، کەشك سوونەوە. 2) ئەنجامدانی کاری بێنرخ و بێئاکام.

**کشکی:** 1) سازکراو بە کەشك. 2) بێ پایە و بێ بناغە یان بێ پێشەکی پێویست. 3) درۆیین، پووچ.

**کشمکش:** 1) ململانێ. 2) کێشەکێش، کەشمەکەش، کێشمەکێش، بگرەوبەردە، هاتەهات.

**کشمند:** بڕوانە:"کشسان".

**کشن:** بڕوانە:"گشن".

**کشند:** خێزاو و نیشتاو.

**کشنده:** (کَ) 1) ڕاکێش، ڕاکێش کەر، کێشەر، کێشندە، هۆی ڕاکێشان، کەسێ کە شتێ ڕابکێشێ. 2) سەرکێش. 3) بڕوانە: "مکندە".

**کشنده:** (کُ) کوشندە، کوشننە، کوژەر، کوژەك، بکوژ، ڕۆح ڕەتێن. جەرگبڕ، گورچوبڕ.

**کشواری:** (فیزیك) "ئێلاستیسیتێ".

**کش و تاب:** پێز، کێش و هێز.

**کشور:** وڵات، نیشتمان، سەرزەوییەکی بەرین بریتی لە چەند پارێزگا و خەڵکەکانی سەر بە وڵاتێك بن. "**کشور ویران**": خاپوورە وڵات، وڵاتی وێران. "**وزارت کشور**": وەزارەتی نێوخۆ.





**کشورآرا:** پاشا.

**کشور خدا:** خاوەنی وڵات، پاشا.

**کشورداری:** بەڕێوەبردنی وڵات.

**کشورز:** بڕوانە:"کشاورز".

**کشورستان:** 1) وڵات ستێن، کەسێ کە وڵاتێ بگرێ. 2) بریتی لە زێدەخواز.

**کشورگشایی:** داگیرکردنی وڵاتان، داگیرکاری.

**کش و فش:** 1) بریتی لە شان و شکۆ. 2) کەشوقنگ، فیزوئیفادە.

**کش و قوس:** 1) پێچاوپێچ، پێچ پێچ. 2) حاڵەتی کێشانی ئەندامانی لەش بۆ حەسانەوە. 3) کێشراوی، کێش هاتوویی. 4) ململانێ، مقۆمقۆ. 5) پێچ و پەنا و دژوارییەکانی کارێ یان دڕدۆنگی لە بڕیاردان دا. "**کش و قوس کردن (رفتن، آمدن)**": خۆکێشانەوە.

**کشه:** 1) خێت، خێز، خیچ، کێڕ، شوێن کێشان لە زەوی یان لەسەر کاغز. 2) سواڵکەر.

**کشی:** 1) باشی، خۆشی. 2) ناز، کریشمە. 3) پۆز، فیز و دەعیە.

**کشیدن:** 1) درێژکردن (ەوە)، کێشان، ڕاکێشان، کشاندن، کێش کردن، کێش کرن. 2) مژین، هەڵمژین. 3) بە تەرازوو کێشان. 4) باربردن. 5) کێشان، کێشانەوە. 6) بڕوانە: "تحمل کردن". 7) بەدوای خۆدا هێنان. 8) دەرهێنان ئامرازی شەڕ لە کالان. 9) لادانی پەردە و شتیوا. 10) دەرکێشان شیلە و ماددەی سەرەکی یان ڕۆنی شتێ. 11) جووڵان یان خواربوونەوە بۆ لایەك. 12) درێژ و بەربڵاوبوونەوە. 13) خایاندن. 14) حەزلێبوون، مەیل لێبوون. 15) تێوەردان یان پیسکردن. 16) کەمبوون یان وشك بوونی ئاو یان شێ. 17) پان کردنەوە، ڕاخستن. 18) وە جووڵەخستن، پاڵ پێوەنان. 19) بردنەبان، هەڵدان. 20) خواردنەوە. 21) پێشکەشکردن. 22) هەڵگەڕاندنەوە. 23) بزووتن، ڕۆیشتن. "**کشیدن روی چیزی**": پێوەزیادکردن. "**به هم کشیدن**": بەستن، داخستن، وێکهێنان.

**کشیده:** 1) دڕێژ، بڵیند. 2) کێشراو. 3) زللە، شەپلاغە. 4) لە کالان دەرهاتو. 5) هەڵدراو، بەرزکراو. 6) پێوەکراو، دەداوکێشراو. "**کشیده خواباندن**": زللەلێدان، شەپلاغە لێدان.

**کشیش:** کەشە، قەشە، پیاوی ئایینی خاچ پەرستان.

**کشیك:** کێشك، ئێشك، نگابانی، پاس. "**کشیك دادن**": نگابانی دان، کێشك دان. "**کشیك کسی را کشیدن**": بەنهێنی هەڵسوکەوت و کرداری ئەو خستنەژێر چاوەدێری.

**کف:** 1) لەپ، بەر، بەرە. 2) دەست. "**کف پای کسی خاریدن**": بریتی لە سەفەر کردنی ئەو. "**کف دست خود را بوکردن**": ئاگاداربوونی

پێشەکی لە شتێك. **"کف دست کسی خاریدن"**: وەدەست کەتنی پارە. **"کف دست کسی مو نداشتن"**: واتە زۆر نەدار و هەژار بوون. **"کف رفتن"**: رفاندنی شتێ بەبێ ئاگاداری خاوەنەکەی. **"کف زدن"**: 1) چەپڵەلێدان، چەپك کوتان. 2) زللەلێدان. **"از کف دادن"**: لەدەست دان. **"از کف رفتن"**: لەدەست چوون. **"به کف آمدن"**: وەدەست هاتن. **"به کف آوردن"**: وەدەست خستن، بەدەست هێنان. **"به کف (درکف) گرفتن"**: بەدەستەوەگرتن. **"مثل (عین) کف دست"**: 1) سادە، بێ فرتوفێڵ. 2) ساف و ڕێك. **"یك کف دست"**: بە ئەندازەی بەری دەستێك.

**کف آلود:** کەفاوی.

**کفا:** ڕەنج، مەینەتی.

**کفاءت:** هاوتابوون، لە حاڵ و وەزع دا وەك یەك بوون.

**کفات:** کۆی"کافی"، پیاوانی کارزان و لێوەشاوە.

**کفّار:** کۆی"کافر"، کافران، خوانەناسان.

**کفاره:** تۆڵەی تاوان، هەر کارێ کە بۆ قەرەبووکردنەوەی گوناحێك ئەنجام دەدرێ، "کەفارەت". **"کفاره پس دادن"**: بە سزا گەیشتن، سزادران. **"کفاره دادن"**: خێرکردن یان ئەنجامدانی کارێ بۆ پاك کردنەوەی گوناح. **"کفاره کاری را (پس) دادن"**: سزادران لەبەر ئەنجامدانی ئەو کارە.

**کفاش:** کەوش دروو، پێڵاوکەر، گۆشکار.

**کفاف:** 1) نەکەم نە زۆر، بەس. 2) ڕازی بوون، قایل بوون. **"کفاف دادن"**: بەشکردن، بەسبوون. **"کفاف کردن"**: بڕوانە: "کفاف دادن".

**کفالت:** 1) دەستەبەری، وەئەستۆگرتنی کارێ یان بابەتێ، قبووڵ کردن. 2) سەرپەرشتی بنەماڵە بەجۆرێ کە ببێتە هۆی عەفووکران. 3) گرێبەستێ کە بەپێی ئەو گرێبەستە کەسێك هێنان و ناساندنی کەسێکی دیاریکراو وەئەستۆ دەگرێ.

**کفاندن:** 1) ترەکاندن، قلێشان، تلێشان، درزپێدان، تەقانن. 2) پرژاندن، وەشاندن.

**کفایت:** 1) بەس، تێر، بەش. 2) بەسبوون، بەسێتی، بەشکاری. 3) تەگبیر و کارزانی، لێهاتوویی و شیاوی لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکان، بەڕێوەبردن بە شێوەیەکی زۆر باش. **"کفایت داشتن"**: هەبوونی لێهاتوویی بەتایبەتی لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکان دا. **"کفایت کردن"**: 1) بەشکردن، بەسبوون، بەهەموان گەیشتن. 2) بەئەنجام گەیاندن، جێبەجێکردن. 3) قەرەبووکردنەوە، تێهەڵێنانەوە. 4) بەس کردن، بە کۆتاییگەیاندنی کارێ یان بابەتێ.

**کف بسته:** قرنیس و بەغیل.

**کفتگی:** (کَ.تَ) ترەکیاوی، قەڵشاوی.

**کفتن:** (کَ.تَ) 1) ترەکاندن، تەقاندن، درزپێدان، قەڵشاندن. 2) ترەکیان، قەڵشان، تەقین، تلێشان.





**کف دستی:** 1) زەربەیەك کە بە بەری دەست دەیوەشێنن. 2) بڕوانە:"استمنا". 3) زەربەیەك کە بۆ تەمبێ کردنی قوتابیان لە لەپی دەستیانی دەدەن. 4) شووڵ، شووڵك.

**کفر:** 1) ناسپاسی، پێنەزانی. 2) بێ دینی، خوانەناسین، کوفر. **"کفر ابلیس"**: وەك هێمای ناوداربوون یان ناوبانگ دەرکردن بەکاری دەبەن. **"کفر کسی بالاآمدن"**: زۆر تووڕەبوونی ئەو.

**کفران:** 1) ناسپاسی کردن، ناشکوری کردن. 2) بێ دینی. **"کفران نعمت"**: ناسپاسی لە بەرامبەر نێعمەتدا.

**کفرانه:** قسەیەك کە لە ڕووی ناسپاسییەوە دەوترێ.

**کف روان:** بوونەوەرانێ کە لەسەر بەری پێ دەڕۆن وەك ورچ.

**کفری:** زۆر قەڵس و تووڕە.

**کفریات:** قسەگەلی کوفراوی.

**کف زدن:** چەپك، چەپکوتان، چەپکە، چەپڵە، چەپڵەڕێژان، چەپڵەکوتان، چەپڵەلێدان.

**کف زنی:** 1) دزینی بەدەست و بردی برێ لە پارەی کەسێك کاتی ژماردنی. 2) چەپڵەکوتان، شادی و خۆشی کردن.

**کفشدوز:** 1) کەوش دروو، کەوشدوور، کەسێ کە پێڵاو دروست دەکا. 2) خاڵخاڵۆك، خاڵخاڵۆکە.

**کفشگر:** بڕوانە:"کفشدوز".

**کفك:** کەڕوو، کەڕە، کەڕەوڵ، برش، کەڕەکیفە، کەپرۆکە، کوفك. **"کفك زده"**: کەڕواوی، کەڕووهەڵێناو، برشاوی، برش هەڵێناو، دەزی.

**کفگیر:** کەوگیر. **"کفگیر بە تە دیگ خوردن"**: کەوتنە سەر ساجی عەلی، نەدار و بێ پووڵ بوون.

**کفل:** کلۆت، کەلۆت، کەماخ، سمت، کەفەل. **"کفل گرد کردن"**: قەڵەوبوون، سمت خڕکردن.

**کف لەکردن:** 1) ساوین و نەرم کردنی شتێ لەناو لەپی دەست دا و خستنە ناو دەمەوە. 2) بەزارگرتن و خواردن.

**کف مشتی:** بەرتیل.

**کفن:** (کَ.فَ) کۆچ پۆش، جامەمەرگ، قەرقە، خەڵات، بەرگی مردوو، کراسی مردگ، کەپەن، کفن. **"کفن از مرده (در) ربودن"**: لە قازانج خواستن دا لە هیچ ستەم و زوڵمێك خۆنەبواردن. **"کفن بافتن برای کسی"**: چاوەڕوانی مەرگی ئەوبوون. **"کفن به گردن"**: تەسلیم و ئامادەی سزا. **"کفن پوشیدن"**: ئامادەی مەرگ بوون. **"کفن کردن"**: کفن کردن، دەکفنەوەپێچانی مردو. **"کفن کسی خشك نشدن"**: کاتێکی زۆر لە مەرگی ئەو تێنەپەڕین. **"کفن و تیغ (شمشیر) بەدست گرفتن"**: بەتەواوی ملدان و پەشیمان بوونەوە لە هەڵەی ڕابردوو و ئامادەی سزابوون. **"به دست خود (خویش، خویشتن) کفن دوختن"**: خۆ بە کوشت دان.

**کفن:** (كَ) داپۆشین، كۆچ پۆش كردن، كفن كردن.

**كف نفس:** خۆڕاگرتن، خۆپارێزی، بەربەخۆگرتن.

**کفو:** (كُ) وەك، وێنە، هاوتا.

**کفور:** كافر، ناشكور، پێنەزان.

**كفە:** 1) تای تەرازوو. 2) ڕووی ساف و تەخت. 3) لەپی دەست.

**كف يد كردن:** خۆبواردن لە ئەنجامدانی كارێك، دەست ڕاگرتن.

**كفيدن:** 1) پیشان، پیشیان، هەڵكفین بە تینی گەرما. 2) ترەكیان، درزبردن، قەڵشین.

**كفيز:** پێوانە.

**كفيل:** 1) بڕوانە: "ضامن". 2) ئەوەی بە هۆی سەرپەرشتی بنەماڵەكەی لە خزمەتی سەربازی عەفوودەكرێ.

**كك:** كێچ، قێچ. "**كك توی( بە،در ) تنبان( شلوار، پاچە ) كسی افتادن**": زۆر كەڵكەڵەبوون. كێچ كەوتنە كەوڵەوە، زۆر بێئۆقرە و نیگەران بوونی ئەو.

**كل:** (كَ) 1) سووكەڵەی "كچل". 2) نێری، بتەران. 3) بزنەكێوی. 4) ڕەگەزی نێرینەی چوارپێیان.

**كلّ:** (كُ) گشت، هەموو، تێكڕا، گردین، سەرتاپا، سەرانسەر. "**كلاً**": بەتەواوی، بەشیوەی گشتی. "**بەكل**": بەتەواوی. "**كل نگر**": گشت ڕوان.

**كلّ:** (كَ) 1) كول بوونی شمشێر. 2) لاری، چەوتی.

**كلائت:** پاراستن، ئاگاداری كردن، نگابانی لێدان.

**كلا پيسە:** حەواوی، چاولەحەوا.

**كلاژ:** بڕوانە: "لوچ".

**كلاس:** 1) ژووری وانە، پۆل، كەلاس. 2) ڕیز، پلە.

**كلاس بندی:** پۆل بەندی، دابەشكردنی قوتابیان یان خوێندكاران لە پۆلەكانی وانەوتنەوە.

**كلاس پايين:** بێكەلاس.

**كلاسمان:** تەكووزی، ڕێكوپێكی، پۆلێن بەندی، ڕیزبەندی.

**كلاسنگ:** بڕوانە: "فلاخن".

**كلاسە:** پۆلێن بەندیكردن، ڕێكوپێك كردن. نمرە، ژمارە، ڕیز.

**كلاسيك:** 1) وانەیی، قوتابخانەیی، ئەوەی لە قوتابخانە و زانكۆكان دەخوێندرێ. 2) یەكەمین قوتابخانەی ئەدەبی كە لە ئورووپا سەری هەڵدا و لە ئەدەبیات دا پێڕەوییان لە ئەدەبیاتی یوونان و ڕۆم كرد واتە ئەدەبیاتێ كە دەبێ وەك وانە بخوێنرێ و بكرێتە سەرچەشن.

**كلاّش:** 1) قەلاش، مرۆی سووك و بێكارە، هەڵەگەڕ، مفتەخۆر. 2) جامباز، دەزبڕ، گوێبڕ، ڕیپۆ.

**كلاف شدن:** ئاڵۆزكان، گلۆڵەبوون.





**كلافەشدن:** سەرلێ تێكچوون، سەرلێشێوان، گێژبوون، وەڕەزبوون، جاڕز و قەڵس بوون لەدەست كەسێك.

**كلاك:** (كَ) 1) تۆقی سەر. 2) دەشت و سارا. 3) بیابانێ كە لە وەرزی باران بارین دا سەوز بێ و لە هاوین دا وشك بێ، "ئیستێپ".

**كلاك:** (كُ) 1) بڕوانە: "كاواك". 2) شەپۆلی گەورەی دەریا.

**كلالت:** (كَ) 1) ماندووبوون، شەكەت بوون، كەلەلا. 2) كول بوون. 3) بێباوك بوون. 4) بێمناڵ بوون.

**كلام:** 1) ئاخاوتە، بێژە، "دیسكۆڕس". 2) وشە. 3) (لە ڕێزمان دا) كۆمەڵە ڕستەیەك كە پێكەوە پێوەندییان هەیە و دەربڕی بابەتێكن. "**كلام تزئينی**": ئاخاوتەی ڕازێنەرەوەیی. "**كلام جامع**": قسەی پڕمانا و بەتایبەتی هەڵگری حیكمەت و ئامۆژگاری. "**كلام قدسی**": ئاخاوتەی پیرۆز. "**كلام مطنطن**": ئاخاوتەی دوور و درێژ.

**كلان:** 1) كەڵان، زۆر، فرە(پول كلان، ثروت كلان). 2) زل، قەبە، زەلام، گەورە، گت. 3) بەربڵاو و گشتگیر. 4) بەتەمەنتر. 5) بەرین، بەربڵاو، بەرفرەه. 6) قەڵەو. "**كلان شهر**": گەورەشار.

**كلانتر:** 1) گەورەتر. 2) سەردارۆغە، سەرۆكی كەڵانتەری. "**كلانتر محل( محلە )**": كەسی لاپرەسەن و كونج كۆڵ كە لە گشت ڕووداوەكانی دەورووبەر یان شوێنی ژیانی دەپرسێتەوە.

**كلانسال:** پیر، بەساڵاچوو.

**كلاوە:** سەرلێشێواو، گێژ، هەوڵ، سەرگەردان.

**كلاە:** كڵاو. "**كلاە از بهر كسی دوختن**": نیازی خێر هەبوون بۆ ئەو، یارمەتی كردنی ئەو. "**كلاە( كلە ) از سر فرونهادن( برگرفتن )**": كڵاو داگرتن بە نیشانەی ڕێزلێنان. "**كلاە از سر كسی برداشتن( ربودن )**": مزگێنی ویستن یان گرتن. فرتوفێڵ بەكارهێنان و فریودانی ئەو. سووك كردنی ئەو. "**كلاە بر سر كسی گشاد بودن**": كارێ زیاتر لە ڕادەی توانایی و شیانی ئەو بوون. "**كلاە بر سر كسی نهادن( گذاشتن )**": هێز و شكۆ پێدان. كڵاو لەسەرنان، فرتوفێڵ لێكردن. "**كلاە خود را دودستی نگەداشتن( چسبيدن )**": دەست بە كڵاوی خۆوە گرتن، كاتی دژواری و سەختی پاراستنی بەرژەوەندییەكانی خۆ. "**كلاە كج گذاردن ( گذاشتن، نهادن )**": شانازی كردن. "**كلاە كسی بلند شدن**": سەربەرزبوونی ئەو. "**كلاە كسی پس معركە بودن**": كەمتر لە خەڵكانی دی پێشكەوتن، لە خەڵكانیتر وەدواكەوتن. "**كلاە( بر ) نهادن**": تاج نانەسەر و بوونە پاشا. "**برای كسی كلاە دوختن**": كڵاو بۆ دروون، فریودانی ئەو.

**كلاهبردار:** جامباز، جانباز، ڕیپۆ، ڕیپۆكار، ساختەچی، گوێبڕ، دەزبڕ، دەسبڕ، فێڵباز، گەلاج، خوافرۆش.

**کلاهبرداری:** جامبازی، جانبازی، لۆتی‌خور، فێڵبازی و دەسبڕی، دەزبڕی بێ‌شەرمانە، ڕەنگ کردن.

**کلاهخود:** کڵاوی ئاسنین، کڵاوی لە ئاسن، کڵاوزرێ، کووم زرخ، تاسکڵاو.

**کلاەدار:** کەسێ کە کڵاوی لەسەر دایە. بریتی لە پاشا. **"کلاهداری /کلەداری":** پاشایەتی.

**کلاەسازی:** 1) کڵاو دروستکردن. 2) فێڵبازی، پیلان بازی، کەڵەکبازی.

**کلاەشرعی:** پاساوهێنانەوە بۆ کردارێکی پێچەوانەی شەرع یان یاسا، کرداری ناڕەوا و نائەخلاقی کە ڕواڵەتی شەرعییان پێدابێ.

**کلاهك:** کڵاوە.

**کلاەگیس:** موچاچ، موچاخ، کڵاوقژ، پرچی دەسکار، پرچی بەدەڵ.

**کلاه مخملی:** لاتی گەڕەك، چەقۆکێشی سەرزەیە.

**کلپترە:** قسەی بێ‌مانا، قسەی قۆڕ.

**کلتە:** ئاژەڵی پیر و لەکارکەوتە.

**کلثوم:** کەسێ ڕوخسار و کوڵمەکانی گۆشتن بێ، خڕپن، گوپن.

**کلثوم ننەای:** خورافاتی.

**کلج:** (کُ) پێچەڵاوپێچ، پێچاوپێچ.

**کلجان:** خۆڵەپۆت، خۆڵەپۆتە، خۆڵەپۆتێ، خۆڵەپۆتین، خۆڵەپۆتینە، خۆڵەکەوان، خۆڵەمرە.

**کلروپلاست:** پلاستیدە سەوزەکان.

**کلروفیل:** سەوزەگی.

**کلفت:** (کُ.لُ) ستوور، ئەستوور، قۆڵ، قەوی، قەبا، قەبە، درشت، دژی باریك. **"کلفتی":** ئەستوورایی، قۆڵایی، قەبەیی، ڕادەی ئەستووری.

**کلفت:** (کُ.فَ) 1) کارەکەر، کێرکار، کێرکەر، تەیان، جێری، خزمەتکاری ژن، قەرەواش، کڵفەت، خدام، خدامە، دەستەمۆ. 2) دژواری، چەرمەسەری، مەینەت، دەرد و زەحمەت. 3) قسەی درشت و بەچزوو. **"کلفت بار کسی کردن":** قسەی درشت و زبر پێگوتن، قسەی بەتێکوڵ پێگوتن، لاپلارتێگرتن.

**کلك:** تەڵەکە، کەڵەك، گەڕ، فێڵ. **"کلك چیزی را کندن":** بەتەواوی خواردن، دەکارکردن، خەرج کردن. **"کلك خوردن":** بڕوانە:"فریب خوردن". **"کلك زدن( چیدن )":** بڕوانە:"فریب دادن". **"کلك سوارکردن":** بڕوانە:"کلك زدن". **"کلك کسی را کندن":** کوشتنی ئەو. دەرپەڕاندنی ئەو لە شوێنێك. **"کلك کسی کنده بودن":** لەبەردەم مەترسی یان مەرگ دا بوون.

**کلکسیون:** کۆلێکسیۆن، کۆمەڵێ شتی هاوبنەماڵە.

**کل کل:** زۆروێژی، زۆربلێیی، درێژدادڕی، کۆڵەوێژی. **"کل کل کردن":** چەنەوڕی کردن و سەری یەکتر ئێشاندن.





**کل گرایی:** بڕوانە:"پلوراليسم".

**کلمات:** کۆی"کلمە"، وشەکان، واژەکان. قسەکان، گوتەکان. **"کلمات قصار":** وشەگەلی کورت و پڕمانا. **"کلمات مترادف":** ڕیزهەف، وشە هاوماناکان.

**کلمرغ:** بڕوانە:"کرکس".

**کلمە:** وشە، واژە. گوتە، پەیڤ، ئاخاوتە. **"کلمەبەکلمە":** وشەبەوشە، بەشێوەی ورد.

**کلنجار:** 1) پەنجەشکێنی، جوابەجەنگێ، قۆچ قۆچانی، شەڕەشاخ، ملەجەڕێ، مقۆمقۆ، سەرخستنە سەر سەری کەسێك. 2) خەریك بوون بەکارێکەوە.

**کلندر:** زەلام و بەتاقەت، زنتۆڵ، باهۆدار.

**کلندیدن:** هەڵکۆڵین، هەڵکەندنی زەوی.

**کلوب:** گاستین، گازتین، کلووپ، یانە.

**کلوچ:** کرتەی داکرۆژتن، خرچە. **"کلوچ کلوچ":** خرچ و هۆڕ.

**کلوچیدن:** کورۆتن، کرۆتن، کرۆژتن، کرۆژین، کرۆشتن، کورۆچان، کورۆچانی، کوروژتن، کورۆژین، کۆژتن، کۆژین.

**کلوخە:** کولۆئاسا، وەك کلۆ.

**کلوزاپ:** نمایەك کە لە نزیکەوە فیلمی لێهەڵگیراوە، نمای نزیك.

**کلوستروم:** ژەك، فرچك، هەوەڵ شیر.

**کلوك:** سواڵەت، لەتە خشت.

**کلول:** (کَ.لُ) گاگوز، پۆڵکە.

**کلول:** (کُ.لُ) کول بوون، ئاڵبوونەوە.

**کلوە:** بڕوانە:"کلیە".

**کلّە:** 1) سەر، کەللە. 2) زەین، ناخ. 3) هۆش، ئاوەز. 4) بیرتیژ. 5) بەشی سەرەوەی شتێ. **"کلەآفتاب":** بەیانی زوو. **"کلە پرباد داشتن":** بەفیز و لەخۆباییبوون. **"کلەخر":** گەوج، گەمژە. **"کلە خر خوردن":** مێشکی کەر خواردن، واتە زۆر گەوج بوون. **"کلەخشك":** کەللە وشك، کەم زەین و نەگۆڕ. یەك دندە. **"کلە خلوتیان":** کەچەڵ. **"کلە سحر":** سەگر، سەوگور، کازیوەی بەیانی. **"کلەکدو":** 1) کەللە بۆش و بێمێشك. 2) کەچەڵ. **"کلەکردن":** 1) وەرگەڕاندن، ئاوەژووکردنەوە. 2) بڕوانە: "دك کردن". 3) وەرگەڕان. 4) دەزبەجێ گەڕانەوە. 5) بڕیاری کتوپڕدان. **"کلە کسی بوی قرمەسبزی دادن":** بەدوای ژانەسەرەوەبوون بە وتنی قسەگەلی سیاسی دژی حکوومەت، سەر لە کێشە خوران. **"کلە کسی داغ شدن":** ناڕەحەت و تووڕەبوونی ئەو، سەرخۆش بوونی ئەو، کەللە گەرم داهاتن. **"کلە کسی را ترکاندن":** مێشك بردن بەتایبەتی بە زۆر قسەکردن. **"کلە کسی سوت کشیدن":** تووشی سەرسوڕمان هاتنی ئەو. **"کلە کسی گرم شدن":** سەرخۆش بوونی ئەو، سەر گەرم داهاتنی ئەو. سەرگەرمی قسەکردن بوون. **"کلە کشیدن":** بڕوانە: "سرك کشیدن". **"بە کلە کسی زدن":** 1) لەکەللەدانی ئەو(داویە لە کەللەی)، شێت بوونی ئەو. 2) گەیشتنی شتێ بە زەینی ئەو.

**کلەبازی:** سەربازی، گیانفیدایی.

**کله بە طاقی:** خۆسەر، سەرەڕۆ.

**کله پا:** 1) ئاوەژوو، بەراوەژوو، وەرگەڕان. 2) نەخۆش، ئەوەی حاڵی تێکچووە.

**کله پوك:** زەین کوێر، مێشك بەتاڵ، گەمژە.

**کلەدار:** بەبیر، بیرتیژ، بەهۆش.

**کلّەشق:** سەرکێش، سەربزێو، نافەرمان، کەللەشەق.

**کلەکن:** 1) بێ حەیا و بەدئەخلاق. 2) سەربڕ، میرغەزەب.

**کلەگندە:** 1) سەرزل، سەرتۆپز، کەللەچاخ. 2) دەوڵەمەند یان خاوەنی پۆست و دەسەڵات.

**کله معلق شدن:** بە کەللەوە بەزەوی دادران.

**کلی:** 1) گشتی، هەمەکی. 2) تەواو. 3) چڕ، زۆر، فرە. 4) بەتەواوی. **"بە کلی":** بەتەواوی. **"بە کلی سرَی":** بەتەواوی نهێنی.

**کلّیات:** 1) کاروباری گشتی، شتە گشتییەکان، هەمەکییەکان. 2) کۆمەڵە شێعر یان بەرهەمگەلی شاعیر یان نووسەرێك.

**کلیاوە:** گێژ، سەرلێشێواو.

**کلّی بافی:** 1) دژواربێژی، ئاڵۆزکردنەوە. 2) سەریەك خستنەوەی مەسەلە دواکەوتوەکان و قبوولکراو لە لایەن هەموانەوە.

**کلّیت:** گشتێتی، گشتی بوون.

**کلیدی:** سەرەکی، گرینگ.

**کلیسا:** کەنیسە، کلیسا، کلێسە.

**کلیشە:** 1) چەندپاتکراو، کلیشە. 2) نووسراوە یان وێنەیەك کە لەسەر دار یان کانزا هەڵیدەکەنن بۆ چاپ کردن.

**کلی فروشی:** کۆفرۆشی.

**کلیك:** (کَ.لِ) بڕوانە:"کلاژ".

**کلیك کردن:** (کامپیۆتێر) تترووکاندن، "کلیك"کردن.

**کلیگویی:** دەربڕینی شتە گشتییەکان و باس نەکردنی وردەکارییەکان، گشتیبێژی.

**کلیل:** (کَ.لِ) عاجز، داماو، سست. کەسێ کە چاوی بە باشی نەبینێ.

**کلیمی:** پێڕەوی حەزرەتی مووسا، جوو، جوولەکە.

**کلّی نگری:** گشت ڕوانی، بەهێندگرتنی شتە گشتییەکان و خەریك بەبوون بە وردەکارییەکانەوە.

**کلینیك:** نەخۆشخانە، دەرمانگە.

**کلیە:** خناوکە، گورچك، گورچیلە، گورچیلك، گرچوو، گورچو، گورچەویلە، گورچەوێڵە، گولچیسك، گوردالّە، گەرگو.

**کم:** 1) کەم، کم، پیچ، بەرانبەری فرە. 2) بێوێنە، دەگمەن. 3) لە بەین چوو، لەناوبراو. **"کم آمدن":** کەم هاتن. کەم بوونەوە. **"کم آوردن":** کەم هێنان. بەجێمان لە خەنیم و پێ نەوەستان. لە ئەستۆ





نەهاتن، لەعۆدەنەهاتن. **"کم از":** لانیکەم، هیچ نەوێ. **"کم بە کم":** کەم کەمە، وردەوردە، چکەچکە. **"کم داشتن":** 1) تەواونەبوون. 2) کەمی هەبوون، گەوج بوون. **"کم دیدن":** خۆ بە کەم گرتن. **"کم زدن":** 1) خاکەڕاییکردن، وەلانانی لووت بەرزی و بەدەماری. 2) دواکەوتن لە کارێك دا. **"کم شدن":** کەم بوونەوە، کەم کردن. **"کم شدن کسی":** لەناوچوونی ئەو، کوژرانی ئەو. **"کم کردن":** 1) (لێ) کەمکردنەوە، لێگێڕانەوە، دەراویتن، دەراڤیتن. 2) بەجێنەهێنانی هەقی کەسێك بەوجۆرەی کە پێویستە. **"کم گذاشتن":** 1) کەم کردنەوە، دەراویتن. 2) درێغیکردن. **"کم ماندن":** نزیك بوون. **"کم و بیش":** کەم تا زۆر، کەم تاکورت. نزیکەی. **"کم و کاست":** ناتەواوی، کەموکورتی. **"از کسی کم آمدن(شدن)":** زیان پێگەیەنران بەو. **"بی کم و کاست":** بەتەواوی، بێکەموکورتی. **"چیزی را کم زدن":** کەمتەرخەمی کردن سەبارەت بەو، وازهێنان لێی. **"کسی را کم گرفتن":** بەسووك دانانی ئەو، گرینگی پێنەدان بەو، بە کەم گرتنی ئەو.

**کم آمد:** کەمی، کەموکووڕی.

**کما:** (کُ) بڕوانە:"اغما".

**کما:** (کَ) هەروا، هەروەکوو، هەرچۆن. **"کمافی السابق":** وەك پێشوو، وەك ڕابردوو. **"کماکان":** هەروا.

**کمابیش:** کەم و زۆر.

**کم ادعا:** خاکەڕا، بێ دەمار.

**کمال:** 1) دوایین ڕادەی شتێك. 2) تەواوبوون، کاملّبوون، بێکەموکووڕی بوون، بێکەمایەسیبوون. 3) ئاوەزمەندی و زانایی، ژیری. 4) تەواو، مرۆی پێگەیشتوی تێگەیشتوو. 5) بێکەمایەسی ترین و باشترین حاڵەتی شتێك. **"کمال بخشیدن":** تەواوکردن، کامڵ کردن. **"کمال گرفتن(پذیرفتن)":** کاملّبوون. **"کمال یافتن":** کامڵ بوون، کەموکووڕی نەمان. **"بەکمال (برکمال)":** تەواو، کامڵ، بێکەمایەسی. **"بە کمال رسیدن":** کاملّبوون.

**کمال جو:** کامڵ خواز، ئەوەی بەدوای "کمال"ەوەیە.

**کمال گرا:** کاملّخواز، کەسێك کە دەیەوێ بگاتە دوایین ئاستی شتێ.

**کمالیّت:** کاملّبوون.

**کمان:** کەوان، کەمان. **"کمان افراشتن":** ئامادەکردنی کەمان بۆ تیرهاویشتن. **"کمان بە(بر) بازوی کسی نبودن":** لە عۆدەی کار نەهاتن. **"کمان بە خم آوردن":** بڕوانە:"کمان افراشتن". **"کمان درکار شکستن":** هەوڵدان بۆ گەیشتن بە مەبەست. **"کمان را پر کردن":** تیر خستنەکەوان بۆ هاویشتن. **"کمان رستم":** بڕوانە:"قوس قوزح". **"کمان زدن":** هەللاجی کردن. **"کمان شیطان":** (زانستەکانی زەوی) بڕوانە:"رنگین کمان". **"کمان کسی(چیزی) را کشیدن":** لە ئەستۆی ئەو هاتن، توانایی بەربەرەکانی دەگەڵ ئەودا هەبوون.

**کماندان:** (نیزامی) فەرماندەر، سەرکردە.

**کمانگر:** کەمانگەر، کەسێ کە کەمان چێدەکا.

**کمانە:** 1) بازرە، باژێڵە، کەوانە، زڤرانی هاوێژراو کە وەشتێ دەکەوێ. 2) چاڵێ کە چاڵکەن بۆ تاقیکاری لە زەوی هەڵی دەکۆڵێ. 3) وەك کەمان. 4) بڕوانە: "مقنی". "**کمانە کردن**": کەوانە کردن(ەوە)، بازرەکردن.

**کماهە:** جادووبەن، نووشتەی جادووبەتاڵکەر.

**کم بنیە:** ئەوەی توانایی جەستەیی کەمە، کەم هێز، لاواز.

**کمبود:** کەمبوون، کەمی، ناتەواوی.

**کمبودە:** نزم، پەست.

**کم بین:** کەم حوکم، چاوکز، کەسێ کە بینایی لاوازە.

**کم بها:** بازاڕی، کەم نرخ.

**کمپ:** کەمپ، ئوردوگا، خێوەتگە.

**کمپانی:** شەریکە، بەشدارگە، شیرکەت، کۆمپانی.

**کمپلت:** کۆمپلێت، یەکجێ، بەتەواوی.

**کمپلکس:** 1) تێکەڵاو، جۆراوجۆر. 2) توخمە زەینی و سۆزدارییە سەرکوتکراوەکان کە ئاسەوارەکەی لە ڕەهەندەکانی تری ژیاندا دەردەکەوێ.

**کمپوزیتور:** ئاهەنگ ساز.

**کم پیدا:** دیارنەبوو.

**کمپیر:** پیری بەساڵاچوو و پەککەوتە.

**کم توجهی:** کەمتەرخەمی، خەمساردی.

**کم جان:** شلوکوت، بێهێز.

**کم جرئت:** قزە، ترسەنۆك، بێجەرگ.

**کم جنبە:** بڕوانە: "کم ظرفیت".

**کم جوش:** ئەوەی زۆر تێکەڵاوی کەسانی دی نابێ.

**کم حرف:** کەم قسە، کەم دوو.

**کم حوصلە:** بێبین، بێبێهن، بێ پشوو، کەم حەوسەلە.

**کم خدمتی:** درێغی کردن لە ئەنجامدانی ئەرکدا.

**کم خور:** کەم خۆر، دژخۆر.

**کمداشت:** کەمی، کەم بوون.

**کم دل:** بریتی لە ترسەنۆك، نەوێر، بێزات، قزە.

**کمدی:** کومێدی، شانۆ یان نووسراوەی پێکەنینی یان تەنزاوی.

**کمدی درام:** (شانۆ) جۆرێ بەرهەمی کومێدی کە مەبەستی نووسەر لەودا دەربڕینی ژان و ڕەنجی ئینسانەکانە.

**کمدین:** ئەکتەرێ کە ڕۆڵی کومێدی دەگێڕێ.

**کمر:** ناوقەد، ناوەڕاسی بەژن، سێوەنگ، سێبەندە، کەمەر، کەمبەر. پشتوێن، کەمەربەند. ناوقەدی کێو. "**کمر بر میان**": 1) پشتێن لە کەمەر بەستو. 2) ئامادەی خزمەتکردن، ملکەچ. "**کمربستن**": 1) پشتێن بەستن، کەمەربەندبستن. 2) بریتی لە سوور و ئامادەبوون بۆ





کارێك. "**کمربستە**": 1) بریتی لە نۆکەری ئامادە بە خزمەت. 2) ئەوەی کەوتۆتە بەرسەرنجی پیاوانی ئایین. "**کمر خم کردن**": تاقەت نەمان، لەپێکەوتن. چەمانەوە. "**کمر راست کردن**": وەدەست خستنەوەی توانایی بۆ قەرەبووکردنەوەی شکست یان ڕەواندنەوەی کێشەیەك. "**کمر سخت کردن**": ئامادەی کارێك بوون. "**کمر غول را شکستن**": ئەنجامدانی کارێکی گرینگ. "**کمر کردن**": وەك پشتوێن دەوری شتێك دان، ئاخڵەدان. "**کمر کسی را خم کردن**": شکست دانی ئەو، بەزاندنی ئەو. "**کمر کسی شکستن**": لەپێکەوتن، نەمانی تاقەت و توانایی. "**کمر کوە**": قەدپاڵ، قەدپارە، گەوە، بەروار، بەروال، بڕوار، لاپا، لاپار، لاپاڵ، کەزی، قەدپاڵی کێو. "**کمر گرفتن**": بەچۆك داهێنان، بەزاندن. "**کمرگشادن**": دواکەوتن لەکاردا، چالاکی نەکردن. "**کمر همّت بستن**": بڕیاری جیددی دان، هیممەت کردن. "**از کمر افتادن**": تووشی ژانی کەمەر بوون یان لەپێکەوتن بەهۆی ماندوویی زۆر، بێ هێزبوون، هێز و وزە تێدانەمان. "**بە کمر کسی زدن**": شکاندنی کەمەری ئەو و لەناوبردنی. "**در کمر کردن**": لەبەرامبەر یەکتری دانان، هاوشان کردن.

**کمرباریك:** بەلەباریك، ناوقەدباریك، بەژن زراڤ، میانەباری.

**کمربند:** پشتێن، پشتێند، پژبێن، پژتێن، پژوێن، قەڵبەن، کەمەربند. "**کمربند امنیّتی**": پشتێنەی ئەمنی، ناوچەیەك کە چاوەدێریکردنی بۆ پاراستنی ئاسایشی وڵات یان ناوچەیەك پێویستە. "**کمربند زدن**": جەغزئاسا ڕیزبوون. "**کمربندها را سفت کردن**": ئامادەی ئەنجامدانی کارێك بوون بەتایبەتی بۆ ڕووبەڕووبوونەوە دەگەڵ کەسێك یان دۆخێکی دژوار، توندکردنەوە پشتێنەکان.

**کمربندی:** 1) پشتێنە، پشتێندە، دەورە، کەمەربەندی. 2) سووربوون بۆ ئەنجامدانی کارێك. "**کمربندی کردن**": خەریکی خزمەتگوزاری بوون.

**کمردار:** خزمەتکار، ملکەچ، گوێڕایەڵ.

**کمرسخت:** پێداگر، قیڕسیچمە، سوور لەسەر بڕیار.

**کمرسنگ:** بڕوانە: "صخرە".

**کمرشکن:** کەمەرشکێن، بریتی لە کاری دژوار یان زۆر قورس، لەتاقەت بەدەر، تاقەت پڕووکێن.

**کمرکش:** 1) ئامالْ هەوراز، دەستە و سەرەژوور، کەمەرکێش، ناوقەدی کێو. 2) پیاوی ئازا و دلێر و قارەمان. 3) بەرز، بڵیند.

**کمرگاە:** 1) شوێنێ کە کەمەربەندی لێدەبەستن. 2) ناوەڕاست، ناوقەد.

**کم رستە:** بڕوانە: "کوتولە".

**کم رو:** شەرمن، شەرمێون، ڕوودەربایس، بەڕووتەنك، خەجاڵەت لە ڕووی خەڵکا، کەم ڕوو.

**کمرە:** قەدپاڵ، گەوە، ناوقەدی کێو.

**کم زده:** 1) لە دین دەرچوو، گومڕا. 2) ئاوارە، سەرلێشێواو.

**کمزن:** 1) خاکەڕا، خۆشکێن، بێدەمار. 2) فێڵکەر لە قوماردا. 3) بێشانس، کەسێ کە هەمیشە لە قوماردا دەیدۆڕێنێ. 4) دووڕوو، ڕووبین.

**کم سال:** کەم تەمەن، لاو.

**کم سخن:** کەم قسە، کەم دوو.

**کم سن:** کەم تەمەن، منالّ.

**کم سو:** 1) کەم نوور. 2) کەم حوکم، چاوکز. "**چشم کم سو**": چاوی کەم حوکم، کوێرەمووشە، چاوپرووش، کۆرەك، نیوەکوتر.

**کم ظرفیت:** کەم جیگلدانە، بێحەوسەلە، کەم پشوو، فرش تەنگ.

**کم عرض:** تەسك، کەم بەر، بەرانبەری بەرپان.

**کم عقل:** کێم ژمێر، کەم ئاوەز، نەزان، گەوج، گەمژە.

**کم عمق:** 1) پەل، ڤێل. 2) سست، ناپتەو. "**آب کم عمق**": تەنکاو.

**کمك:** (كَ مَ) زۆر کەم.

**کمك:** (كُ مَ) یاریدە، یاریە، یارمەتی، ئاریکاری، هاریکاری، بارەبوو، کۆمەگ. "**کمك پشت جبهه**": بەرگرانە، یارمەتی بۆ شەڕکەرە چەکدارەکان. "**کمك خواستن(طلبیدن)**": یارمەتی ویستن. "**کمك رساندن**": یارمەتی دان، یاریدەدان. "**کمك کردن**": یاریدەدان، یارمەتیدان، یارمەتی کردن، ئاریکاری کردن، هلشتن، دەسگرتن. "**کمك کننده**": ئاریکار، هاریکار، هاریکەر، یارمەتیدەر، یاریدەدەر، دەسگیر، دەسگیرۆ. "**کمك مالی**": دەسگیرۆیی، دەسگیری، یارمەتی مالّی. "**کمك متقابل**": دەست قەرز، دەستەواو، پوولّ بە قەرزدان. "**به(با) کمك**": بەکەلّك وەرگرتن لە، بەیارمەتی.

**کم کار:** کەم ئەرك، سەرسڤك، سەرسووك، کەمکار، کەسێ ئیشی کەم دەس ئەکەوێ. تەوەزەل و بێکارە.

**کم کاسه:** قرِنیس، بەخیل.

**کم کم:** بڕوانە:"اندك اندك".

**کمك هزینه:** کۆمەگ خەرجی.

**کمکی:** (كَ مَ) کەمێ، تۆزێ.

**کمکی:** (كُ مَ) یاریدەدەر، یارمەتیدەر.

**کم گساری:** بڕوانە:"صرفەجویی".

**کم گو:** 1) بڕوانە:"کم حرف". 2) خاوەنی شێعری کەم.

**کم مایه:** 1) خاوەنی سەرمایەی کەم. 2) تراو، شل. 3) بێبەش لە سەرمایەی فیکری یان کۆمەلّایەتی. 4) کەم، کەموکە.

**کم محلی:** بەهێند نەگرتن، بایەخ پێنەدان، وەرنەگرتن.

**کم مخارج:** کەم خەرج، هاسان بژیو.

**کم مغز:** بێئاقلّ، نەزان.

**کم نظیر:** بژاردە، کەموێنە، بێوێنە، کەم تا، تەروەندە.





**کمون:** (كُ.مُ) خۆشاردنەوە، خۆحەشاردان، وەشێران.

**کمون:** هاوبەش، گشتی، کۆمەڵگا یان گروپێ کە لەودا خاوەندارێتی کەسێنی نیە و بنەمای ژیان لەسەر هاوکاری و هەرەوەزییە. "**کمون اولیّه**": کۆمۆنی سەرەتایی.

**کمونیست:** پێڕەوی کومۆنیسم.

**کمونیسم:** ڕێبازی هاوبەشێتی، مەرام و ڕێبازێ کە ئامانجی هەڵوەشاندنەوەی خاوەندارێتی کەسێنی و لەناوبردنی بنەماکانی سەرمایەدارییە. تیۆرییەك لەسەر بنەمای هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگای چینایەتی و بەتایبەتی کۆمەڵگایەك کە هەرکەسە و بەپێی توانایی و بەهرەی خۆی کار بکا و بە ئەنازەی پێویستیش لە ئامراز و کەلوپەلەکان کەڵك وەرگرێ.

**کمه:** کوێربوون. کوێری، شەوکوێری.

**کم هوش:** کەم زەین، کەم بیر، بیرکەم.

**کمی:** 1) کەمێ، کەمەکێ. 2) کەم بوون. 3) کەم ڕێزبوون، نزمی، پەستی. 4) کەمی، کێمی، ناتەواوی، نوقوستانی. 5) بڕوانە: "فروتنی".

**کمّی:** لەباری چەندایەتییەوە.

**کمیاب:** دەگمەن، کلك نیشان، شتی زۆر سەیر یان زۆر باش.

**کمیّت:** (كَ.یَ) چەندی، چەندایەتی، چەندێتی، گورانی. ئەندازە، ڕادە.

**کمیت:** (كُ مَ) ئامالّ سوور. شەڕاب. "**کمیت چیزی لنگیدن**": ناتەواوبوونی ئەو. "**کمیت کسی لنگیدن(لنگ بودن)**": توانایی یان دەسەلّاتی زالّبوون بەسەر کارێکدا نەبوون، لەئەستۆنەهاتنی کارێك.

**کمیته:** ئەنجومەنی تایبەتی، ژمارەیەکی تایبەتی لە حیزبێ یان کۆمەڵەیەك، کۆمیتە.

**کمیزدان:** میزەڵدان.

**کمیسر:** کۆمیسێر، مەئمووری پۆلیس.

**کمیسیون:** 1) لیژنە یان ئەنجومەنێ پێکهاتوو لە چەند کەس بۆ پێڕاگەیشتن بە کارێك، کۆمیسیۆن. 2) کۆڕ، کۆبوونەوە، دانیشتن. 3) هەقی دەلّالّی. "**کمیسیون کردن**": پێکهێنانی کۆبوونەوە.

**کمیسیونر:** کۆمیسیۆنێر، دەلّالّ، دانراو.

**کمیك:** پێکەنیناوی، ئەکتەر یان نووسەری کومێدی.

**کمین:** 1) بۆسە، سیپە، خەلّ، کولتەنە، پارێز، ڕەبەت، چەپەر، سپێر، کەلێن، مردەوزیندە. 2) کەمترین، کەم نرخ. "**کمین آوردن**": خافلّگیرانە هێرش کردن. "**کمین گرفتن**": بۆسەگرتن، بۆسەخواردن، لە سیپەدا دانیشتن. "**کمین(بر) گشادن**": لە بۆسە هاتنەدەر و پەلامار بردن. "**در کمین چیزی(کسی) بودن**": بۆسە بۆ دانان، چاوەڕوان مانەوە بۆ وەدەستهێنانی هەلی لەبار بۆ هێرش بردنی کتوپڕ بۆ سەر ئەو.

**کمینگاه:** بەرەڕەت، **هە**شارگە، حەشارگە، قوڵکە و چاڵی سەر ڕێبازی نەچیر.

**کمینه:** 1) کەمتر، کەمترین. 2) (بیرکاری) مینیمم. 3) چووکترین، نزمترین.

**کنار:** 1) ڕەخ، ڕۆخ، قەراغ، قەراخ، لێوار. 2) کەنار، کەنارە، پەراوێز. 3) کن، پاڵ، تەنیشت. 4) کۆتایی شوێنێ یان شتێ. "**کنار آب**": مەبال، ئاودەست. "**کنارآمدن**": سازان، پێکهاتن، پێکەوەگونجان. "**کنار انداختن**": خستنە لاوە، خستنە دوور یان تەرك کردن. "**کناربرکنار**": شانبەشان، زۆر نزیك، لەتەنیشت یەکدا. "**کنار رفتن**": دوورکەوتنەوە، **هە**لاکەوتن، وەلاکەوتن، لاچوون، چوونە لاوە. دەست کێشانەوە لە پۆستێ یان وازهێنان لە ئەنجامدانی کارێك. "**کنار زدن**": 1) لاخستن، لادان، لاوەدان، خستنەکەنارەوە، **هە**لدان. 2) لەسەر کارلابردن. 3) دوورخستنەوەی کەسێ یان شتێ لەسەر ڕێگەی خۆ. "**کنار کشیدن**": 1) لێ دوور خستنەوە، بردنە لاوە. 2) دووریکردن، مەوداگرتن. 3) تەرکی ئاموشۆکردن. 4) خۆبواردن لە دەستێوەردان لە کارێك دا. "**کنارگذاشتن**": 1) پەساردن، وەلانان، بەلاوەنان، لە لاوەدانان. 2) تەرك کردن، وازهێنان. 3) لەسەرکار لابردن، دەرکردن. 4) لەبەرچاونەگرتن، بەحەساو نەهێنان. "**کنارگرفتن**": 1) گۆشەگیریکردن. 2) لەتەنیشت خۆ جێکردنەوە. 3) لە باوەش گرتن. "**کنارگرفتن ازکسی**": دووری لێکردن. "**کنار گود نشستن**": تێوەنەگلان لە کارێك و لە دوورەوە چاوەدێریکردنی. "**برکنار گرفتن**": 1) دوور ڕاگرتن. 2) لەباوەش گرتن. "**به کنارآمدن**": بە کۆتایی گەیشتن.

**کنارنگ:** دەسەڵاتداری ناوچەیەوك لە وڵات، فەرماندار.

**کناره:** 1) لێوار، لێوارە، ڕەخ، قەراغ، لێڤك، زێوار، پەڕاوێز، کەنارە. 2) لە دەرەوەی ڕەوگەی سەرەکی. 3) شوێنێ لە دەورووبەری شتێ یان کەسێك و زیاتر نەناسراو. 4) کۆتایێ شتێ یان جێیەك. 5) گروپ، بەش. "**کناره داشتن**": دووری کردن، هاتنەلاوە. "**کناره شدن**": مردن. "**کناره کردن**": دووری کردن. دەست لە کارکێشانەوە. "**کناره گرفتن(جستن)**": هاتنەلاوە، دوورکەوتنەوە لە شتێ، دووری کردن، گۆشەنشین بوون. "**کناره گرفتن کشتی(قایق)**": ڕاوەستانی پاپۆڕ یان بەلەم لە لێوار یان لەنگەرگەدا.

**کنارەجویی:** بڕوانە:"کنارەگیری".

**کنارەگیر:** دوورەپەرێز، (لا)تەریك، گۆشەنشین، لاپەڕ، کلا، کەلا، کەنارەگیر.

**کنارەگیری:** دوورەپەرێزی، کەنارەگیری، کەنارەگرتن، قەراغ گرتن، بێلایەنی، لابوون، گۆشەنشینی، دەست بەرداربوون، دەست هەڵگرتن، دەست لەکارکێشانەوە.





**کناری:** تەنیشت(اتاق کناری).

**کنانه:** (کَ.نَ) کۆن، دژی نوێ.

**کنانه:** (کِ.نَ) بڕوانە: "تیردان".

**کنایات:** 1) کۆی"کنایە"، تانەکان، تەشەرەکان. 2) داپۆشراوەکان.

**کنایه:** 1) برێتی، بریتی، هێمای بە واتا. 2) قسەی تێکەڵ بە تەوزە و سووکایەتی، تەشەر، تەوس، تانە. 3) (ڕێزمان) درکە، وشەیەك کە دوو واتای هەیە یەکی دوور و یەکی نزیك. "**کنایه زدن**": تەوس لێدان، تەشەر لێدان. "**به کنایه**": داپۆشراو، بەشێوەی نائاشکرا.

**کنایەآمیز:** تەشەراوی، تەوساوی.

**کنبور/کنبوره:** مەکر، فریو، تەڵەکە.

**کنتاکت:** لێککەوتن، بەرکەوتن، لێکدان.

**کنترات:** گرێبەست، پەیمان، بڕە، کردنی کارێك لەبڕ، مەختە، قەبەڵ، قۆنتەرات.

**کنترل:** کۆنترۆڵ، پشکنین. "**خود را کنترل کردن**": بەسەر خۆدا زاڵبوون، خۆکۆنترۆڵ کردن.

**کنترلر:** پشکن، پشکێنەر، جیاکەرەوە.

**کنج:** 1) گۆشە، سووچ، قوژبن. 2) شوێنی دوور و پەسێو. 3) بە چرچ و لۆچ.

**کنجك:** تازە، نوێ.

**کنجکاو:** کونجکۆڵ، کونج پشکن، کونجکاو، کۆڵەرەوە، تۆژەرەوە، پەرسا، پەیجور.

**کنجل:** لەحیم کردن، لێك جۆشدان.

**کنجلەکردن:** هەڵ گلۆفین، هەڵ پشاوتن.

**کند:** 1) تەڤلار، کول، تیغێ کە نابڕێ. 2) کەس یان شتێ کە بە ئەسپایی و ئارام ئارام بڕوا. 3) خاوەنی هۆش و توانایی و بەهرەی کەم. 4) سست، ناپتەو. "**کندشدن دندان**": هاڵ بونەوە، هاڵەوبوون، ئاڵبوونەوە. لەدەست دانی توانایی و لێبڕاوی.

**کندا:** (کُ) زانا، فیلسووف. ئەستێرەناس. سێحرباز.

**کنداگر:** زانا، هۆزان. ئازا، دلێر.

**کنداور:** دلێر، پاڵەوان، شەڕکەر، ئازا.

**کندذهن:** زەین کوێر، کون زەین، کەم زەین، بیرکۆڵ.

**کندر:** (کَ دَ) شار.

**کند رای:** کەم زەین، کەم هەواس.

**کندرو:** تەپ، تەوەزەل لە ڕۆیشتندا، سست و خاو.

**کندز:** قەڵای دێرین.

**کند فهم:** کەم زەین، کەم بەهرە.

**کندك:** (کُ دَ) وردکەنان، ڕێزەنان، کورتێل.

**کندمند:** (کَ.مَ) وێران، خاپوور.

**کندن:** 1) هەڵقەندن، هەڵکەندن، هەڵکۆڵین، هەڵکولین، کەنەوە، هەقاندن، دانەوە، شکاوای، جیاکردنەوە، لێکردنەوەی شتێ کە بە شتێکیدیکەوە لکابێ. 2) داکەندنی کەوش یان جلوبەرگ. 3) بڕینی پێوەندی، تەرککردن. 4) بریندارکردن، ڕووشاندن. 5) خراوکردن، وێران کردن. 6) لەسەرکار لابردن، لێخستن. "**کنده**": 1) جیابۆوە. 2) دەرکێشراو. 3) قووڵکە، چاڵ. 4) خەندەك.

**کندوکاو:** توێژینەوە، هەڵکۆڵین و تۆژینەوە، کنە، کۆڵینەوە.

**کندوکوب:** ئاژاوە، پەشێوی و دڵەڕاوکێ.

**کندەکاری:** نەخش و نیگار هەڵکۆڵین لەسەر بەرد یان دار یان کانزا، کەندەکاری.

**کُندە کسی را کشیدن:** نزیکی کردن دەگەڵ ئەو.

**کندەورش:** (کَ.دَ.وَ رَ) قووڵ و بەرز، هەوراز و نشێوی زەوی.

**کندی:** 1) کولی، نەبوونی تیژی و بڕی. 2) ئەسپایی، بەلەسەرخۆیی. 3) نەبوونی توانایی یان هۆش و بەهرەی پێویست. 4) تەمبەڵی، تەوەزەلی. "**بە کندی**": بەئەسپایی، بەشێنەیی.

**کنسرت:** کۆنسێرت، هاوئاهەنگی، هاوڕیتمی، ساز و ئاوازی هاوئاهەنگ.

**کنسرسیوم:** کۆمپانیا، شەریکەی گەورە.

**کنسرواتور:** فێرگەی گشتی، فێرگەی تایبەتی شانۆ یان مووسیقا.

**کنسك:** بڕوانە:"خسیس".

**کنسل:** کانسێل، هەڵوەشاندنەوە، پووچ کردنەوە.

**کنسول:** شابەندەر، کونسوول، بەردەستی باڵوێز لە وڵاتی بێگانە، نوێنەری دەوڵەت لە یەکێ لە شارەکانی وڵاتێکی بیانی کە ئەرکی پێڕاگەیشتن بە کاروباری هاووڵاتیانیەتی.

**کنسولات:** پۆستی کونسوول.

**کنسولتاسیون:** ڕاوێژ، تەگبیر، شێور.

**کنسولیار:** جێگری کونسوول.

**کنش:** 1) کرداری چاك یان خراپ، کردەوە، کارلێك. 2) (زمانناسی) بەکارهێنانی زمان لە ژیانی ڕۆژانەدا یان ڕەفتاری زمانی ڕاستەقینە. "**کنش پذیر/کنش گیر**": پاسیڤ، ناچالاك. "**کنش ور**": 1) خەریك بەکار، کەسێ کە بەکارێکەوە خەریکە. 2) چالاك.

**کنشت:** ئاتەشگە، کەنشتە، تەوسکە، پەرستگای جوولەکان.

**کنشتی:** ناموسڵمان بە تایبەتی جوولەکە.

**کنشگر:** بڕوانە:"مؤثر".

**کنف:** (كِ نِ) تەریق، سووك کراو. "**کنف شدن**": گاڵتەپێکران و تەریق بوونەوە، خیت بوونەوە.

**کنفدراسیون:** یەکیەتی، یەکیەتیی چەند ناوچە یان وڵات کە خاوەنی دەوڵەتی خۆیان بن بەڵام هەرکام لەوان سەربەخۆیی ناوخۆیی و خودموختاریشیان هەبێ.

**کنفرانس:** کۆنفڕانس، کۆبوونەوە بۆ باس کردن لە مەسەلەیەك. ئاخێوەری، لێدوان. "**کنفرانس خبری**": کۆنفرانسی ڕۆژنامەوانی، کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسی/ڕۆژنامەگەری. "**کنفرانس دادن**": کۆنفڕانس دان، ئاخێوەری کردن. قسەی زۆرکردن دەگەڵ خۆهەڵکێشان و پێوەنان.

**کنك:** قرنیس، دەس قووچاو، لەچەر، ڕژد. گوێزی ڕەق.





**کنکاش:** 1) کۆڵین، کۆڵینەوە، ڤێکەتن، ڤێکەفتن، پرسیار و توێژینەوە، خپر. 2) ڕاوێژ، تەگبیر، شێور. "**کنکاش زدن**": ڕاوێژکردن، تەگبیرکردن.

**کنکاشستان:** جێگەی تەگبیر و ڕا.

**کنکاشگر:** 1) گەڕێن، پەیدۆز، پشکێن. 2) سیخوڕ، زوانگر، زیرەوان. 3) ڕاوێژکەر، ڕاوێژیار.

**کنکور:** 1) قەرەپەستان و کۆوەبوونی ژمارەیەك لە خەڵك کە نیازی شوێنێکیان هەیە. 2) هاوئاهەنگی، هاوکاری. 3) کێبەرکێ، پێشبڕکێ، کۆنکور.

**کنگر:** کەنگر، قنگر. "**کنگر خوردن و لنگر انداختن**": بۆ ماوەیەکی زۆر لە شوێنێك مانەوە، داکوتان لە شوێنێك.

**کنگر:** (كُ.گُ) چەلوز، خۆهستەگ.

**کنوانسیون:** بەڵێننامە، پەیماننامە.

**کنود:** (كُ نُ) ناشکور، ناسپاس، پێنەزان.

**کنورتیسور:** کەسێ کە ڕاوبۆچوون و ڕێبازی خەڵکانی دی بگۆڕێ.

**کنوریدن:** دەسبڕی کردن، جامبازی کردن، فریودان.

**کنوکسیون:** بڕوانە:"همرفت".

**کنون:** بڕوانە:"اکنون".

**کنونی:** هەنووکەیی، ئێستایی، ئەمڕۆیی.

**کنە:** 1) بنەما و جەوهەر و هەقیقەت و کۆتایی شتێ. 2) قووڵایی. 3) بڕوانە: "سمج".

**کنیز:** ژنی بە پارە کڕدراو، ژنی خزمەتکار.

**کنیسە:** بڕوانە:"کلیسا".

**کواژ:** تانە، لۆمە، سەرزەنشت، شۆخی.

**کواش:** سفەت، چەشن، شێوە، شێواز.

**کوالیدن:** بڕوانە:"گوالیدن".

**کوب:** 1) کوتراو، زیان. 2) شەش گۆشە، شەش پاڵوو. 3) هێرش، پەلامار.

**کوبان:** 1) لە حاڵی کوتانەوەدا. 2) لەحاڵی سەمادا.

**کوبش:** کوتران(ەوە)، زەربە، لێکدرانی دوو شت.

**کوبشگر:** کوتەر، لێدەر.

**کوبشی:** زەربەیی.

**کوبندە:** 1) کوتەر، لێدەر، کەسێ کە ئەکوتێ. 2) توند.

**کوبیدن:** 1) کوتان، کوتیان، کوتانەوە، کتان، داتەپان، داتەپین، هەلساندن، هاڕینەوە، وردکردن وەك کوتانی گەنم. 2) لکاندنی شتێ بە ڕوویەکەوە، داکوتان (قاب عکس را بە دیوار کوبید). 3) وێکەوتنی توندی ئامرازێك لە شتێ. 4) بە توندی دانەبەر هێرش. 5) بە توندی دانەبەر ڕەخنە. 6) پێوانی ڕەوگەیەك بە خێرایی و بەبێوچان. 7) سەما و هەڵپەڕکێکردن. "**کوبیدن خرمن**": گێرەکردن. "**کوبیدن قلب**": لێدانی دڵ. "**بە هم کوبیدن**": پێوەدانی دەرگا و پەنجێرە بە توندی. خراوکردن، وێران کردن. "**درهم کوبیدن**": تێکوپێك دان، بەتەواوی خاپوورکردن، بەتەواوی لەناوبردن. "**کسی را کوبیدن**": 1) لێدان لەو، ئەو کوتان. 2) ڕەخنەگرتن و سەرزەنشت کردنی ئەو.

**کوبیده:** 1) کوتراو، کوتێنراو، هاڕدراو، نەرمکراو. 2) زیان دیتوو.

**کوپ:** بڕ، برگە.

**کوت:** 1) کۆمەڵە شتێکی لەسەریەك کەڵەکەکراو. 2) بە شێوەی چڕ و کەڵەکەکراو.

**کوتار:** کۆڵانی تەسك و سەرداپۆشراو، دالان.

**کوتاه:** 1) کورت، کن، کنك، کوتەر، کوڵ، کوڵە، قوڵ، قوڵە، گورج، بەرانبەری درێژ. 2) نزم، نەوی. 3) کەم. 4) بیرکورت، نەزان. "**کوتاه آمدن**": دانەواندن، کۆتاهاتن. درێغیکردن. "**کوتاه آوردن**": کەم هێنان، کورت هێنان، لێ بڕان، ڕانەگەیشتن، درێژنەکردنەوەی قسە. "**کوتاه انداختن**": کۆتاهاتن. "**کوتاه(و)بلند**": بەرز و نزم، کورت و نەوی. "**کوتاه شدن**": کورتبوون(ەوە)، لە درێژییەوە کوتابوون. "**کوتاەکردن**": کورت کردنەوە، کورتەوکردن، کورتەوەکردن، کلمەی. بەکۆتایی گەیاندن. "**کوتاەکردن سخن**": کورتبڕی. "**کوتاە گرفتن**": دانەواندن، هێنانەخوار.

**کوتاه بین:** بیرکورت، بیرتەسك.

**کوتاەخرد:** کەم ئەقڵ، نەزان.

**کوتاه دست:** 1) نزم، نەوی. 2) دەسکورت و نەدار.

**کوتاەدیده:** بیرکورت، بیرتەسك.

**کوتاه زبان:** تایبەتمەندی کەسێك کە لە باس و گفتوگۆ دەگەڵ دیتران دا تەنانەت ئەگەر هەق بەویش بێ خۆدەبوێرێ.

**کوتاەقد:** کورتەباڵا، بەژن کورت، بەژن کنك، کورتەڵە، سێبست، گردەپیاو، گردەژن، گونەگیسك. "**کوتاەقد چاق**": کورتەبنە، کوڵەبنە، کوڵەپرە، گنتەڵ، گونە، گێزە، لاپۆلی، خڕیلە، کورتەباڵای گۆشتن، کورتەباڵای قەڵەو، کورتەباڵای خڕکەڵە.

**کوتاەفکر:** بیرکورت، بیرتەسك.

**کوتاەمدت:** کورت خایەن، کورت ماوە، ماوەکورت، بەرانبەری درێژخایەن.

**کوتاەنظر:** بیرکورت.

**کوتاەنوشت:** کورت بێژی، کورت بڕی.

**کوتاهی:** 1) کورت بوون، کورت بین. 2) تەنەخی، هێڤشاندن، درێغی، کۆتایی.

**کوتوله:** بستەباڵا، باڵابۆست، نیوبست، بابەعەمرە، باوەعەمرە، باواقۆرەت، باواقۆت، چڵەتۆك، بەتەمەنی دەباڵانەکردو، باڵافس، گونەگیسك، گونجۆڤر، کۆتاڵە، کورتیلە، کوندڵفس، کوندەفسك، کورتەباڵا. "**کوتوله چاق**": خشپن، خرپن، قەڵەوی کورت.

**کوته:** بڕوانە: "کوتاه".

**کوتەدم:** بێئاکام.

**کوتەزی:** تەمەن کورت.

**کوتهوار:** بڕوانە: "خلاصه".





**کوتهواره:** بڕوانە: "مخفف".

**کوچ :** 1) کۆچ کردن، بارکردن، بارلێنان، کۆچان، کۆچ لێنان، وەنایش. "**کوچ بر کوچ**": پەیتاپەیتا و بێ پسانەوە، بێ وچان. "**کوچ دادن**": بڕوانە: "کوچ دادن".

**کوچاندن:** کۆچ پێکردن، ڤەکۆچاندن، بردنی کۆمەڵە خەڵکێ لە سەرزەوییەکەوە بۆ سەرزەوییەکیتر، ڕاگواستن، گوێزانەوە.

**کوچك:** 1) چکەلە، چکەڵە، چکۆڵە، چکۆڵانە، چکۆلۆکە، بووچك، پچووك، بیچکەڵە، کوچکۆك، گچك، گچکۆ، گچکۆکە. 2) کەم تەمەن. 3) کەم(سرمایە کوچك). "**کوچك داشتن**": بەکەم گرتن، بەسووك دانان. "**کوچك شدن**": 1) چووك بوونەوە. 2) هاتنەخواری ڕێز و حورمەتی کەسێك.

**کوچك دل:** خۆش ئەخلاق، دلۆڤان.

**کوچك مغز:** کەم ئەقڵ، نەزان.

**کوچك نواز:** گەورە و دلۆڤان.

**کوچکین:** گچکەترین، بچووکترین.

**کوچ گاه:** 1) شوێنێ کە دەبێ لەوێوە کۆچ بکەی و بڕۆی، شوێنی جێگیربوونی پەنابەران و کۆچەران و هتد. 2) دنیا.

**کوچ نشین:** کۆچەر، خێڵەکی، گەڕۆك.

**کوچولو:** گچکەڵە، گچکۆڵە، پچکۆلانە، بچکۆڵە، بیچکەلانە، چکوولۆکە، بوچکەلە، قچك، وەردی، وردیکڵا. "**کوچولوی دوست داشتنی**": خنجیلانە، خنجیلە، خنجەلە، خونجیلە، خشپیلە، خشپیلانە، خشتیلە، جوانکەڵە، جوانکیلانە، چکۆڵەی جوانکیلەی خوێن شیرین. "**کوچولوی چاق**": خپلە، کورتەباڵای قەڵەو. "**بسیار کوچولو**": وردیلەکە، زۆر چکۆڵانە.

**کوچه:** کۆڵان، کۆران، کاپان، کووجی. "**کوچه آشتی کنان**": کۆڵانێکی تەنگەبەر کە دوو کەس بە ڕاحەتی ناتوانن لێیەوە دەربچن. "**کوچه دادن**": ڕێگەکردنەوە. "**کوچه غلط دادن**": فریودان و بەلاڕێدابردن یان سەرلێشێواندن بە دانی زانیاری هەڵە. "**بر (به) کوچه چیزی زدن**": خۆنوێنیکردن بەوەوە. "**پس کوچه**": لاکۆلان. "**خود را به کوچه علی چپ زدن**": لەخۆگۆڕین، خۆلەگێلیدان، خۆگێل کردن، خۆ لە بێ خەبەریدان.

**کوچەبازاری:** لەمۆدکەوتو، باو.

**کوچەبندکردن:** چەپەرکۆڵێن لە کۆڵان دا.

**کوچەراه:** ڕێگەی باریك یان کورت.

**کوچه قجری:** ژنی گەڕاڵ، ژنی ماڵانگەڕ.

**کوچەگرد:** 1) کۆڵان کوت، کۆڵانگەڕ. 2) ماڵ لەکۆڵ، بێ سەر و سامان. 3) دەستگێڕ.

**کوچنده:** کۆچەر، ڕەوەند، گەڕۆك، خێڵات. "**از ایل کوچنده**": کۆچەری، کۆچەراتی، سەر بە ڕەوەند.

**کوچیدن:** کۆچ کردن، کۆچ و ماڵ کردن، کۆچان، بارکردن.

**کوخ:** کۆخ، قولێت، کەپڵ، کەوێڵ، خانووی چکۆڵە.

**کودتا:** هەڵگەڕانەوە، کوودەتا، هەنگاوی کتوپڕی گروپێك لە چینی دەسەڵاتدار (لە ڕێگەی نیزامییەوە) دژی گروپێکیتر بەمەبەستی لەسەرکارلابردنی ئەوان و پێکهێنانی دەوڵەتی نوێ.

**کودك:** منداڵ، زارۆ، زاروو، زارۆك، زاوڵە.. **"کودك افکندن"**: بەرخستن، لەباربردن. **"کودك بدقدم"**: سەرخۆر، سەرەخۆرە، منداڵی شووم و بێفەڕ. **"کودك کودن"**: لالەوڕ.

**کودکانە:** منداڵانە، وەك زارۆکان.

**کودکستان:** باخچەی ساوایان.

**کودکی:** 1) زارۆتی، زارۆکی، منداڵی، منداڵی. 2) بێئاگایی، بێخەبەری.

**کودن:** زەین کوێر، سەرکوێر، کەم زەین، لۆقلۆق، دەبەنگ، تێنەگەیشتو، گێل و حۆل، شاڤێڕ، شاوێڕ، سەروشك، کەم ئاوەز، کەم زەین.

**کور:** 1) کوێر، کۆر، کۆرە، بێچاو. 2) داخراو (راە کور). 3) بەدوور لە ئاگایی و ناسین، بەبێ عەقڵانییەت(تروریزم کور، عشق کور). **"کور اصلی"**: کوێری زکماك. **"کور برداشتن"**: خەیاڵی پووچ کردنەوە، بەهەڵە تێگەیشتن. **"کور شدن"**: 1) کوێربوون، لێڵاوی داهاتن، لێڵاییداهاتن، موقرایی داهاتن. 2) درخران، بەستران. 3) وشك بوون. 4) کوێربوونەوە، لە ناوچوون. **"کور کردن"**: 1) کوێرکردن(ەوە). 2) لاوازکردن، لەکارخستن. 3) بەستنی لوولە یان ڕەوگەی تێپەڕینی ئاو و گاز و شتی وا. **"کور مادرزاد"**: کوێری زگماکی. **"کوروکبود"**: 1) تاریك و لێڵ. 2) ناحەز و ناتەواو. 3) زیان دیتو و پەشیمان و سەرشۆڕ. **"کور و کچل"**: 1) مرۆی خۆڕی و تۆڕی. 2) ڕۆڵە، منداڵ.

**کوراب:** تراویلکە، شۆرەکات.

**کوراجاق:** وەجاخ کوێر، وارکۆر، نەزۆك.

**کوران:** 1) جەریانی هەوا یان برق. 2) ڕەوت، جەریان.

**کورانە:** کوێرانە، وەك کوێر.

**کورباطن:** 1) دڵ ڕەش، ئەوەی هەر شتێ ڕەش ببینێ، دڵ کۆر. 2) زەین کوێر، نەزان.

**کوربخت:** بڕوانە:"بدبخت".

**کورتاژ:** بڕوانە:"سقط جنین".

**کوردل:** زۆر نەزان، نەفام، کەم فام، دەبەنگ، ناتێگەیشتو، دڵ کۆر، کۆردل، کوێردڵ.

**کوردیپلماتیك:** لێژنەی دیپلۆماتیك، لێژنەی نوێنەرانی سیاسی ولاتێك لە پێتەختی ولاتێکی تر.

**کورسو:** نووری زۆرکەم و کز.

**کورسواد:** نەخوێندەوار یان خوێندەواری کەم.

**کورسوی:** نەبین.

**کورکورانە:** کوێرکوێرانە، کوێرانە، بەبێ فیکر و هزر.





**کورکورکی:** 1) بە نوورێکی کەم. 2) پەلەکوتێ.

**کورمال کورمال:** پەلەکوتێ، پەلکوتان، دەستەکوتە، دەست گێڕان لە تاریکی دا.

**کورمکوری:** (چاو) کوێرەمووشە، کەم حوکم.

**کورە در رفتن ـــ از:** زۆر تووڕەبوون.

**کورەدرد:** ژانی بەئاستەم و نادیار و درێژخایەن.

**کورەدە:** کوێرەدێ، کۆرەدێ، دێی چەپەك و پچووك.

**کورەراە:** کوێرەڕێ، کۆرەڕێ، ڕەپێڵە، ڕەپێڵگە، باریکەڕێ، بزنەڕێ، ڕچە، ڕێچکە. **"کورەراە دشوار"**: لاپێ، کوێرەڕێی سەخت.

**کوری:** کوێری، کوێرایی، کوێرایەتی، کوێرێتی، کوێریەتی، موقرایی. **"(از،بە) کوری چشم کسی"**: بە کوێرایی چاوی کەسێك، بەپێچەوانەی مەیلی ئەو. **"کوری و کبودی"**: ناحەزی و ڕیسوایی.

**کوریدور:** کوریدۆر، داڵان، ڕێڕەو.

**کوریزا:** بڕوانە:"زکام".

**کوز:** بڕوانە:"کوژ".

**کوزر:** چەلۆك، کێزر، کۆزەر، چەت، کۆتەڵی خەرمان.

**کوزە:** گۆزە، کووزوو، کووزی. **"کوزە کسی خیلی آب گرفتن"**: دەوڵەمەندبوون یان دەست ڕۆیشتنی ئەو. **"کوزە کسی را لب سقاخانە گذاشتن"**: یارمەتی ئەودان، چارەسەرکردنی کێشەی ئەو. **"در کوزە فقاع کردن"**: خستنە تەنگانەوە.

**کوژ:** چڤی، چەماو، چەمیو، داچەماو، خوارەوەبوو، داهاتوو، قۆز، کووڕ، کۆم.

**کوژپشت:** خوز، خووژ، خوول، نوخ، کۆم، قەمبوور، قەموور، قوولووز، پشت چەماو، پشت کووڕ.

**کوس:** دەهۆڵ. زیان، زەبر. **"کوس بستن( برداشتن )"**: پەلامارهێنان. **"کوس چیزی را زدن( فروکوفتن،کوفتن، نواختن )"**: 1) لافی ئەوە لێدان. 2) ڕاگەیاندنی ئەو شتە. **"کوس رسوایی( بدنامی ) کسی را زدن"**: بەبووك بردن، بەدناو و بێئابڕووکردن. **"کوس زدن( کوبیدن، فروکوفتن )"**: دەهۆڵ لێدان. **"کوس کردن"**: 1) دەهۆڵ لێدان. 2) دەگەڵ یەك زۆرەزمێ کردن، خۆلێکدان بە نهێم. **"کوس لمن الملکی زدن"**: ئیددیعای پاشایەتی کردن.

**کوست زدن:** زیان لێدان.

**کوستن:** کوتان(ەوە)، ڕەنجاندن، لێدان.

**کوسگر:** دەهۆڵ ژەن.

**کوسە:** دەکەل، بێموو، کۆسە، پیاوی موو لێ نەهاتگ.

**کوشا /کوشان:** جیددی، سوور لەسەر کار، هەوڵدەر.

**کوشش:** کۆشەوە، تێکۆشان، خەبات، تەقالا، تەقەللا، هەوڵ، حەول، کەفتولەفت.

**کوشیدن:** خەبتان، خەبتین، تێکۆشان، تێکۆشین، هەوڵدان، تەقالادان، کۆشان، کۆشین، خەبات کردن، کارکردن.

**کوفت:** 1) جوێنێکە، قزەڵقورت، قوزەڵقورت، ژەقنە، ژەهرەمار، سندان، دڵەدەرد، دەردی بێ دەرمان. 2) نەخۆشی، ژان، کوترانەوە. 4) نەخۆشی سیفلیس. **"کوفت خوردن"**: ژەهرەمارخواردن، قوزەڵقورت خواردن. زەربەوێکەوتن، زیان دیتن. **"کوفت رفتن"**: تووشی جەمام هاتن، کوترانەوە. **"کوفتِ کاری"**: ژەهرەمار، دەردی بێدەرمان. **"کوفت کردن"**: بە قوزەڵقورت کردن. **"کوفت گرفتن"**: تووشی نەخۆشی سیفلیس بوون. مردن. **"کوفت و رفت"**: 1) کوترانەوە. 2) لۆمە، سەرزەنشت.

**کوفت کاری:** کوتانی کانزایەکی بەنرخ بەسەر شتێك دا.

**کوفتگی:** 1) جەمام، کوتران(ەوە)، زەرپ، ڕەق بوون و ئاوسانی ئەندام، شەکەتی، ماندوویی. 2) سەرکۆنەکران.

**کوفتن:** 1) لێدان، کوتان، کوتانەوە و وردکردن، هاڕینەوە. 2) ڕەنجاندن، ئازارپێگەیاندن.

**کوفته:** 1) کوتراو، هاڕدراو. 2) شەکەت، ماندوو. 3) زیان پێگەیشتوو، ئازارپێگەیشتو. 4) کوترانەوە و شەکەتی. **"کوفتەشدن"**: 1) ماندوو و بێ هێزبوون. 2) کوتراوی، لێدراوی، زەرپیان. 3) کەوتنەژێر گوشار یان زەربەوە. 4) ڕەنجان، ڕەنجیان.

**کوفتی:** 1) نەحلەتی، لەعنەتی. 2) تووشبوو بە سیفلیس.

**کوك زدن:** تەقەڵ لێدان، تەقەڵ تێهەڵدان.

**کوك شدن:** قورمیش کران. بریتی لە تووڕەبوون.

**کوك کردن:** 1) ڤەنانـدن، قورمیش کردن، کۆککردن. 2) ئامادەکردن. 3) هەراکردن، بانگ کردن. **"کوك کردن کسی"**: وروژاندنی ئەو، هەڵخڕاندنی ئەو.

**کوك کسی پر بودن:** زۆر قەڵس بوونی ئەو، چاوەڕێی بیانوویەك بوون بۆ لێقەڵس بوون.

**کول:** کۆڵ، سەرشان، قەڵاندۆش. **"کول کردن"**: 1) کۆڵ کردن، لەسەر پشت دانان، قەڵاندۆش کردن. 2) بە شان دادانی عەبا و شتی وا. **"از کول کسی بار گرفتن (بار کشیدن)"**: چەوساندنەوەی ئەو کەسە. **"به کول کشیدن(گرفتن)"**: کۆڵ کردن.

**کولاب:** تاڵاو، هەسێڵ.

**کولاك:** ڕۆڤە، باداوە، بادەوە، باوبۆران، باسریشك، باکوزیرك، باکوت، باپوك، پوك، تۆف، شاپە، کڕێوە، کڕێڤە، کروڤە، کەڕۆڤە، کەڤێلە، کلێڵە، پەلەتاتە، وەلەك، بەفری بەباوە. **"کولاك کردن"**: 1) کڕێوە کردن. 2) ئەنجامدانی کاری شیاو و گرینگ. 3) گۆڕان، تێکچوون و تووڕەبوون، هەڵچوون.

**کول بار:** بڕوانە: "کولەبار".

**کولش:** زەوی دانەوە، هەڵکۆڵین.





**کولنج:** بڕوانە: "قولنج".

**کولنگ:** دەمڕووت، سابوورە، هیزەکە.

**کولەبار:** باری کۆڵ، کۆڵ و بار، تێلەکە، پشتە.

**کولی:** 1) قەراجەدار، کۆچەر، ڕەوەند، خێڵاتی، دۆمی، قەرەچ، قەرەج، قەرەچی، کێوەلی، کاولی، کێوەلی، چۆڵپەرەست، هۆزێکی گەڕۆکە. 2) هاتوهاوارکەر و بێ شەرم.

**کولی بازار:** هاتوهاوار و هەراوهوریا.

**کولیدن:** دانەوە، کۆڵین، قووڵ کردن، شۆبڕینی زەوی.

**کولی گیری:** هەراوهوریا، هەیتەهەیت، هەراوکێشە.

**کومش:** بڕوانە: "مقنی".

**کومەکردن:** لەسەریەك کەڵەك کردن، نیانە بانم یەك، هەڵچنین.

**کون:** (کَ) 1) بوون. 2) وەدیهاتن، هاتنەدی.3) جیهان، دنیا. **"کون فساد"**: (فەلسەفە) هاتنەدی و زایەبوون، گۆڕانی هەمیشەیی بوونەوەران. **"کون و مکان"**: هەر دوو جیهان، دنیا و قیامەت.

**کون:** (کُ) 1) قوون، قنگ. 2) بن، ژێر. **"کون ترازو زمین زدن"**: بیانووهێنانەوە بۆ ئەنجامدانی کارێك بۆ وەرگرتنی قانی زیاتر. **"کون چیزی بالاآمدن"**: تەواوبوونی ئەو، بەکۆتایی گەیشتنی ئەو. **"کون خر"**: مرۆی گەمژە و نەزان. **"کون خروسی"**: چووکە، ورد. **"کون خود را پاره کردن"**: قنگ دڕاندن واتە زۆر زەحمەت کێشان. **"کون خود را هم کشیدن"**: زەحمەت بەخۆدان، وەلانانی تەمبەڵی. **"کون دادن"**: قووندان، قنگ دان، گاندانی نێر، حیزایەتی نێر. **"کون زدن"**: جووڵانی لەنکاوی ماشێن. **"کون کسی گهی بودن"**: تاوانباربوونی ئەو، بەدناوبوونی ئەو. **"کون نشیمن نداشتن"**: بێئۆقرەبوون، لە یەکجێ نەمانەوە. **"کون و پیزی کاری را نداشتن"**: نەبوونی هیممەت و ئیرادەی ئەنجامدانی ئەو کارە. **"کون و کچول کردن"**: سەماکردن. **"از کون کسی خوردن"**: منەتی ئەو کێشان. **"از کون نفس کشیدن"**: لەخۆچوون، لەسەرخۆچوون، بێهۆش بوون. **"به کون کسی چسبیدن"**: لە هەموو شوێنێ بەدوای ئەوەوەبوون یان دەگەڵ ئەو بوون، بە قوونەوە چەسپان. **"دنبال کون کسی راه افتادن"**: پێڕەوی کردنی بێئەملاوئەولا لە ئەو، لایەنگریکردن لەو.

**کون برهنه:** 1) قوون ڕووت. 2) نەدار، بێ سەروپێ.

**کون دریده:** 1) قووندەر. 2) بێشەرم، بێ حەیا.

**کونده:** قنگدە، قنگدەر، قووندە، قووندەر، کوونی، نێری حیز.

**کون کن:** بکەر، منالبّاز، هەتیوباز.

**کونك:** بناغە، بنێشە، ڕیشە.

**کون گشاد:** تەمبەڵ، تەوەزەل، قوون گران.

**کون لیسی:** بڕوانە: "تملّق".

**كونى:** بڕوانە:"كوندە".

**كونين:** (كَ) هەر دووك جيهان.

**كونيە:** ماددی، دونيايی.

**كوە:** كێو، كێف، كێڤ، كەژ، چيا. "**كوە در سوراخ سوزن رفتن**": ڕوودانی شتێكی ئاستەم. "**كوە را كاە كردن**": بەئاسانگرتنی كاری سەخت. "**كوەكوە**": زۆر، زياد. "**كوە و كمر**": چڕوكێو، شاخ و داخ. "**از پشت كوە آمدن**": بێخەبەربوون لە پرسەكانی ڕۆژ، لە پشت كێوەوە هاتن.

**كوهان:** كۆپار، كۆپارە، كۆپانە، دووگی وشتر.

**كوهپايە:** 1) داوێنی كێو. 2) ناوچەی بڵيند، ناوچەی كوێستانی.

**كوە پيمايی:** بڕوانە:"كوەنوردی".

**كوەزايی:** پڕۆسەی دروست بوونی كێو لەسەر توێژاڵی زەوی.

**كوهسار:** بڕوانە:"كوهستان"."**كوهساران**": سلان، سەلان، هەردەبانان، سەركاوان، كێوات، كۆساران، جێگەی زۆر چيايان.

**كوهستان:** كوێستان، كوێسان، كێوسار، كۆسار، كێولان، كێوان، كێوات، كێفسان، زۆزان، چيای زۆر، ناوچيا.

**كوهستانی:** 1) كوێستانی، كێوسانی. 2) خەڵكی كوێستان.

**كوەكاف:** كێوكۆڵ، كێوكەن.

**كوهكان:** بڕوانە:"كوهكن".

**كوهكن:** كێوكەن، كێوهەڵقەن، كەسێك كە كاری كێو هەڵكەندنە. نازناوی "فەرهاد"ی گراوی شيرين.

**كوەلاخ:** بڕوانە:"كوهستان".

**كوەمال:** بڕوانە:"كوهنورد".

**كوهنورد:** ڕازەوان، شاخەوان، زەردەوان، بەردەوان، كەژەوان.

**كوهە:** 1) بەرزايی و زەقايی شتێ. 2) شەپۆل، پێل. 3) زينی ئەسپ. 4) دوند، ترۆپك، لوتكە. 5) بڕوانە: "كوهان". 6) پەلامار، شاڵاو. "**كوهە زدن**": 1) شالاو بردن، پەلاماردان. 2) شەپۆل دان، پێل دان.

**كوهەزن:** شەپۆلدەر، پێلدەر.

**كوهی:** 1) كێوی، كۆڤی، كوويی، كێفی، كێفيلە، سەربەكێو، ئەوەی لە كوێستان دەژی. 2) هەڵكەوتوو لە كێو. 3) ساويلكە و بێ خەبەر.

**كوی:** 1) گەڕەك، تاخ. 2) بڕوانە:"قلمرو". 3) شارێ، شارێگە.

**كوير:** دەشتی چۆڵ و هۆڵ، زەوی شۆرەكات.

**كويز:** 1) بڕوانە:"گنجايش". 2) دان بەخۆداگرتن و پشوودرێژی.

**كويزدن:** گونجان، جێبوونەوە.

**كويستن:** كوتانەوە، هاڕين.

**كهادە:** كەمايەتی، ژمارەيەكی كەم.

**كهادی:** كەم تەمەنی، مناڵی.

**كهانت:** غەيب وێژی، پێشبينی.





**كهبد:** 1) سەرەكی. 2) ڕێبەر، پێشەوا.

**كهبر:** بڕوانە:"كوهنورد".

**كهبل:** نەزان، گەوج، گەمژە.

**كهتر:** 1) چووكەتر، گچكەتر. 2) ژێردەست.

**كهسار:** بڕوانە:"كوهسار".

**كهف:** 1) ئەشكەوت. 2) حەشارگە.

**كهكان:** بڕوانە:"كوهكن".

**كهكشان:** كەشكەشان، كاكەشان، كاكێش، كاكێشان، كاكشان، كەشكەلان، كادز، كۆمك، كۆمكاسێويان، ڕەيا كاروان، كۆمەڵە ئەستێرەی كۆ.

**كهموج:** "مايكرۆوەيڤ".

**كهن:** 1) كۆن، قەديمی، دێرين. 2) بەساڵاچوو. 3) كۆنە، ڕزاو، پرتوكياگ. 3) ڕابردوو، پێشوونە. 4) بەپێشينە و بەئەزموون لە كاردا. 5) بڕوانە: "مزمن".

**كهندژ:** قەڵای دێرين.

**كهنسال:** 1) پير، بەساڵاچوو، بەتەمەن داچوو. 2) كەونارايی، قەديمی."**زن كهنسال**": كەڤنەژن.

**كهن سرا:** شاعيرێ كە بەپێی ڕێسا و بنەماكانی شێعری كۆن شێعر دەهۆنێتەوە.

**كهن گرايی:** بڕوانە:"باستان گرايی".

**كهنگی:** 1) كۆن بوون، كۆنەيی، لە كار كەوتن. 2) تێپەڕينی كاتێكی زۆر بەسەر شتێكا، مانەوە. 3) پێشينە، مێژينە.

**كهنە:** 1) كۆن، كۆنە، كهانەی، كەڤن، كەبەن، ڕزاو و ڕەنگ پێوەنەماو، كاركردوو، دەكاركراو. 2) پێشينە، لەمێژينە. 3) بەتەمەن. 4) قەديمی، كۆنە. 5) پێشينەدار و بەئەزموون لە كاری خۆدا. "**كهنە پيرا**": 1) نووژەنكەرەوەی شتە كۆنەكان. 2) سروشت ."**كهنە پيلە**": كۆنەپەڕۆ، پەڕۆی كۆن، سپياڵ، شڕوشاتاڵ. "**كهنە پوش**": خڕماڵ، كۆنەپۆش. "**كهنەخر**": كۆنەكڕ. "**كهنەرباط**": بريتی لە دنيا.

**كهنە پرست:** كۆنەپەرست، كۆن پارێز.

**كهوف:** كۆی"كهف".

**كهولت:** 1) پيری، پيرێتی، بەساڵاچوويی. 2) پيربوون.

**كهەزدن:** كۆخين.

**كهير:** لير، زيپكەی پانكە لە سەر پێست. "**كهير زدن**": ليردەركردن. زۆر زۆر جاڕز و قەڵس بوون لە دەست كەسێك.

**كهين:** چووكە، گچكەتر، لاوتر. لەخوارتر.

**كهينە:** بڕوانە:"حداقل".

**كيا:** 1) پاشا. 2) دەسەڵاتدار، مير، حاكم. 3) سەروەر، گەورە. 4) حورمەت. 5) جەوهەر، چييەتی. "**كيايی**": پاشايەتی. گەورەيی، سەروەری.

**كيا(و)بيا:** شان و شكۆ، دام و دەزگا، پرستيژ و دەست ڕۆيشتوويی.

**كياخن:** نەرمی، ئارامی.

**کیادگی:** بەدناوی، بێئابڕوویی.

**کیادە:** بەدناو، ناوزڕاو، بێئابڕوو.

**کیار:** تەوەزەلی، تەمبەڵی. "**بی کیار**": دەسبەجێ، خێرا، زووبەزوو.

**کیارا:** (کَ) 1) خەم، کەسەر. 2) تاسەنە، پشوونەمان.

**کیاست:** 1) زیرەکی، وشیاری، بیرتیژی. 2) زانایی.

**کیاگرایی کردن:** سووربوون لەسەر بنەماکان، سووربوون لەسەر جەوهەر و چییەتی شتەکان، "Essentialize".

**کیاگن:** 1) درشت، ناقۆڵا، نالەبار. 2) دژ، ناهاوڕا، ناکۆك.

**کیان:** 1) قەوارە. 2) مان و نەمان، بوون. 3) سروشت.

**کیانا:** دەست لێنەدراو، نەچێنراو، سروشتی.

**کیبانیدن:** بەلاڕێدابردن، لەڕێ دەربردن، چەواشەکردن.

**کیبیدن:** بەلاڕێداچوون، لاڕێبوون، لە ڕێگە کلابوون.

**کیپ:** پڕ، لیپاولیپ، کیپ.

**کید:** 1) مەکر، تەڵەکە، فێڵ. 2) شەڕ.

**کیر:** کیر، کێر، چووك، سیرەت. "**کیرخر**": بریتی لە نەزان، گەمژە. "**کیرگاو**": بریتی لە شەللاق، قامچی. "**به کیر گاو زدن**": حەرام کردن، بەفیڕۆدان.

**کیس:** 1)چرچولۆچی و ناڕێکی. 2) کیسە، توورەکە. "**کیس کردن**": بڕوانە: "چروکیدن".

**کیسە:** 1) کیسە، توورەکە. 2) سامان، پارە، دارایی. "**کیسەبریدن**": دزی کردن، گیرفان بڕین. "**کیسه به تن کسی کشیدن**": سەرکۆنەکردنی ئەو، قسەی زبر و ناخۆش پێگوتن. "**کیسه به صابون زدن**": بەتاڵ کردنی کیسە، خەرجکردن. "**کیسه پرداختن**": خەرجکردنی گشت پارەکە. "**کیسه دوختن**": کیسە بۆهەڵدروون، بەتەمای شتێ بوون. "**کیسه کسی را خالی کردن**": وەرگرتنی پارەی زۆر لەو. "**کیسه وفا نکردن**": پارە بەشنەکردن، تەواوبوونی پارە، بەتاڵبوونی گیرفان. "**ازکیسه خلیفه بخشیدن**": لە سامان و دارایی کەسێکی دی بەخشین. "**ازکیسه کسی رفتن**": زەرەرکردنی ئەو، خەرجی بێجێکردن. "**ازکیسه کسی رفتن چیزی(کسی)**": بێبەشبوونی ئەو لەو شتە. "**به کیسه کسی رفتن**": بەو گەیشتن، چوونە کیسەی ئەوەوە. "**توکیسه کردن**": کۆکردنەوە، وەرگرتن.

**کیسەبر:** بڕوانە: "جیب بر".

**کیسه بیمار:** بێپارە، نەدار.

**کیسه پر:** دەوڵەمەند.

**کیسه پرداز:** 1) بەخشندە، دایندە، دەست و دڵ ئاوەڵە. 2) ئەوەی گشت سامانەکەی بەخشیوە، دەست بەتاڵ.

**کیسەدوز:** 1) کیسەدروو. 2) چاوەڕوان، هیوادار.





**کیش:** نەریت، ئایین، ڕێباز. "**کیش شخصیّت**": (کۆمەڵناسی) بڕوای جەماوەر بە هێژموونی ڕێبەری سیاسی.

**کیشی بە فیشی شدن:** هاتنەپێشی چووکترین گۆڕانی نەشیاو.

**کیف:** (کَ) خۆشی و چێژ، شادی، کەیف. "**کیف بردن**": چێژبردن. "**کیف چیزی را کردن**": چێژبردن لەو. "**کیف داشتن**": چێژهەبوون، کەیف هەبوون. "**کیف کردن**": بە دڵخۆشی ڕابردن، خۆش ڕابواردن، چێژبردن، کەیف کردن، شەوق کردن. "**کیف کسی کوك بودن**": دابین بوونی ئامرازی ئاسوودەیی و خۆشی بۆ ئەو، بکەیف ساز و خۆشحاڵ بوونی ئەو. "**سرکیف**": بەکەیف، خۆشحاڵ، شاد. "**سرکیف آمدن**": خۆشحاڵ بوون، کەیف سازبوون.

**کیف آور:** چێژبەخش، ئەوەی چێژ و دڵخۆشی لە کەسێك دا سازدەکا.

**کیفر:** تۆڵە، حەیف، قەساس، سزا. "**کیفر بردن**": بە سزای کرداری خۆ گەیشتن، سزادران. "**کیفر دادن**": سزادان. "**کیفر دیدن**": بە سزا گەیشتن. "**به کیفر رسیدن**": سزادران، بە سزای خۆ گەیشتن.

**کیفرخواست:** سزانامە، ئیددیعانامەی دادستان کە پێشکەش بە دادگا دەکرێ و لەودا هۆکارەکانی تاوانباربوون بە بەڵگەوە دەسەلمێنرێ.

**کیفور:** سەرخۆش.

**کیفی:** لەباری چۆنایەتییەوە.

**کیفیّت:** 1) چۆنیەتی، چلۆنایەتی، چلۆنەتی، کتۆیی. 2) ڕادەی باشی و بەکەڵکی شتێك، پلەی بەڕمێن بوون. 3) چێژ و خۆشی، کەیف. 4) مەستی، سەرخۆشی. "**کیفیّت داشتن**": بەڕمێن بوون، ڕووبازاڕیبوون، لە جنسی باش بوون.

**کیل:** 1) کیلە. 2) پێوانە. 3) بڕوانە: "سنجش". "**درکیل آوردن**": کێشان، هەڵسەنگاندن.

**کیمیا:** 1) ئێکسیر. 2) هەر شتێکی دەگمەن و گیرنەکەوتو. 3) کیمیا، شیمی، زانستێکە. 4) مەکر و فێڵ. "**کیمیا جستن**": فرتوفێڵ کردن، فاك و فیك کردن. "**کیمیاشدن**": قات بوون، دەست نەکەوتن. "**کیمیا کردن**": فرتوفێڵ کردن، فەندوفێڵ کردن. "**کیمیای سعادت**": ئامرازی وەدەست خستنی بەختەوەری.

**کیمیاگر:** کیمیاگەر، زانای کیمیا.

**کین:** 1) ڕق، ڕك، بوغز، عەنت، ناخۆشەویستی، دوژمنایەتی. 2) تۆڵە، حەیف. 3) شەڕ. "**کین آوردن**": شەڕکردن. تۆڵەسەندن. "**کین آختن**": ڕکەکێشان، تۆڵەسەندن، شەڕکردن.

**کینونت:** 1) بوون، بوونێتی. 2) هاتنەدی، پێکهاتن، ئافران.

**کینە:** بڕوانە: "کین". "**کینەتوختن**": تۆڵەکردنەوە. "**کینە داشتن**": دوژمنایەتیهەبوون، ڕق و کینە هەبوون. "**کینە دردل گرفتن**": ڕك لە دڵا هێشتنەوە، قین هەڵگرتن. "**کینەساختن**": شەڕکردن. "**کینە شتری**": دوژمنایەتی قووڵ و بەردەوام.

**کینەای:** بڕوانە: "کینەتوز".

**کینەتوز:** بەڕق، لەڕق، ڕق جوین، ڕق لە سك، ڕك لە زگ، ڕككو، ڕكوونی، ڕككین، ڕك لە سگ، ڕك هەڵگر، بوغز لە زك، دەخەس، قین لە دڵ، قین لەبەر، لەنجباز، کینەکێش، بەکینە. "**کینەتوز تودار**": پیش خۆرەوە، ڕك هەستاوی دەرنەبڕ.

**کینەجو:** بڕوانە: "کینەتوز".

**کینە کش:** 1) بڕوانە: "کینەتوز". 2) شەڕکەر، جەنگاوەر.

**کینەگاه:** شەڕگە، گۆڕەپانی شەڕ.

**کینەگزار:** بڕوانە: "کینەتوز".

**کینەور:** ڕقاوی، ڕكوونی، قیناوی، قین لە دڵ، قین لە سگ، قین ون، قینەون، کینۆ، بوغزلەزگ.

**کینەورز:** بڕوانە: "کینەتوز".

**کیهان:** جیهانی مەزن، گەردوون. ڕۆژگار. کەش، فەزا.

**کیهان خدیو:** پاشای گەورە.

**کیهان شناسی:** گەردووونناسی.

**کیهان نورد:** کەش پێو.

# گ

**گاج:** خێل، چاوخوار.

**گاراج زدن:** 1) ماشێن ڕاگرتن لە گاراجدا. 2) دەست لەکارکێشانەوە بە هۆی نەبوونی توانایی. 3) ڕوو کەم کردنەوە.

**گارانتی:** دەستەبەری، گەرەنتی.

**گارد:** پاسەوان، پارێزەر، ئیسکۆرت، گارد.

**گاردن پارتی:** جێژن لە باغدا، پێداویستی سەیران و سەرگەرمی کە لە باغ یان سەیرانگە گشتییەکاندا دابین دەکرێ.

**گارسون:** سفرەچی، گارسۆن، خزمەتکارێ کە بە نان و خوان ڕادەگا.

**گاز:** 1) گاز، بۆخی ئاگر و هتد. 2) گاز، قەپ، قەپاڵ، بەددان گرتن. 3) گازی سروشتی. **"گاز اشك آور"**: گازی فرمێسك ڕێژ. **"گازگرفتن"**: گازگرتن، گەزتن، گەزین، گەستن، گەژین، قەپ گرتن، قەپ لێگرتن، قەپ داگرتن، قەپاڵ گرتن، قەپاڵ لیدان، بە ددان گرتن.

**گاس:** لەوانەیە، ڕەنگە، وێدەچێ.

**گاشتن:** 1) سووڕپێدان، خولدان، خولاندنەوە. 2) بڕوانە: "برگرداندن". 3) ڕەواندنەوە، دوورخستنەوە.

**گاف کردن( دادن ):** گاف لێدان، ئەنجام دان یان وتنی کارێ یان قسەیەك (لەڕووی بێ فیکری یان ناپارێزییەوە) کە نابێ بکرێ یان بوترێ.

**گاگول:** گێژ، گەوج، دەبەنگ، کەم زەین.

**گالری:** (ل) 1) دالان، دالو، ڕاڕەو، کوریدۆر. 2) تالار، گەلەر.

**گال زدن:** هەراکردن، هاوارکردن.

**گالش:** گاوان، شوانی گاڕان.

**گالن:** پێوانەیەکە نزیکەی چوار لیتر و نیو.

**گاله:** دوور. **"گالەکردن"**: دوورخستنەوە، جیاکردنەوە.

**گالیدن:** 1) ڕاکردن، هەڵاتن، دەرچوون، دورکەوتنەوە. 2) هاوارکردن، هەراکردن.

**گام:** 1) هەنگاو، هنگاڤ، هنگاو، هەنگاڤ، گاڤ، پێنگاڤ، پیاسە، لۆق، لۆقاو. 2) فاز، بەش یان قۆناغێکی تایبەت لە کارێك. **"گام بازپس نهادن"**: گەڕانەوە بۆ دواوە. **"گام باز گرفتن از کسی"**: نەچوونەلای ئەو، تەرکی لای ئەو کردن. **"گام برداشتن"**:





1) هەنگاونان، دەست بردن، کارکردن. 2) هەنگاونان، هەنگاو هەڵێنان، شەقاونان، شەقاو هاویشتن، لۆق هەڵێنان، لۆق هەڵێنانەوە، پا گوێزانەوە لە زەوی. **"گام برگرفتن"**: 1) ڕێ ڕۆیشتن. 2) بڕوانە: "عمل کردن". **"گام بلند"**: شەقاو، لۆقلۆقی، هەنگاوی زل، گاڤ گوشاد. **"گام بە گام"**: هەنگاو بەهەنگاو. **"گام بیرون نهادن"**: 1) ڕۆیشتنەدەر، (دەر) چوونەدەر. 2) سەرپێچیکردن. **"گام پیش (فرا) نهادن"**: 1) هاتنەبەرۆ، هاتنەپێشەوە. 2) بڕوانە: "عمل کردن". **"گام زدن"**: پیاسەکردن، ڕێ ڕۆیشتن. **"گام گام"**: هەنگاوبەهەنگاو. **"گام گذاردن (گذاشتن)"**: 1) گەیشتن، هاتنەبەرەوە، هاتنەناوەوە، هاتنەژوورەوە. 2) ڕێ ڕۆیشتن، چوونەپێش.

**گاما:** پیتی سێهەمی ئەلف و بێی یوونانی.

**گاماس گاماس:** هێواش هێواش، هێدی هێدی، سەبرسەبر.

**گام زن:** 1) تیژڕۆ، خۆشبەز، ئەوەی بەخێرایی دەڕوا. 2) بەئیرادە، مرۆی بەکردەوە.

**گانگرین:** لاڕەشە.

**گانگستر:** ئەندامی گروپی جەنایەتکاران، دزی چەکدار.

**گاو:** 1) گا، مانگا. 2) نەزان، گەوج، نەفام. 3) قەبە و قەڵەو. 4) پاڵەوان، دلێر. **"گاوآوردن"**: خەڵەتاندن، فێڵبازیکردن. **"گاوبستن"**: بڕوانە: "گاوبندی". **"گاو بی شاخ ودم"**: زل و نەزان و گەوج. **"گاو حاج میرزا آقاسی"**: ئەوەی بێخەبەر و لەناخافڵ سەر بە هەموو جێیەك دادەکا. **"گاوشیردە"**: 1) مانگایەك کە شیری زۆر بدا. 2) کەسێك کە خەڵکانیدی بەرهەمی ڕەنجی دەخۆن و لە ئەو وەك سەرچاوەی داهات کەڵك وەردەگرن. **"گاو کسی بە چرم (اندر) بودن"**: دیارنەبوونی کۆتایی کاری ئەو. **"گاو کسی زاییدن (زادن)"**: 1) زیان یان گرفتێك بۆ ئەو هاتنەپێش. 2) بە سەروەت و سامان گەیشتنی ئەو. **"گاو نە من شیر"**: ئەوەی کە ئاسەواری کارە باشەکانی خۆی بە کارێکی خراپ لەناو دەبا.

**گاوبارە:** گاوان.

**گاوبندی:** 1) کەین و بەین کردن، ساتوسەوداکردن، هاودەستی کردن. 2) (کشتوکاڵی) گرێبەستێکی نێوان خان و وەرزێر کە بەپێی ئەو گرێبەستە جووتیارەکە هەر ساڵە لەسەر ئیزنی خان بڕێك زەوی دەچێنێ و کەڵکی لێوەردەگرێ. **"با کسی گاوبندی داشتن"**: هاودەست بوون دەگەڵ ئەو.

**گاوپیسە:** گای بەڵەك، گایەك کە پەڵەی ڕەش و سپی پێوەبێ. **"گاوپیسە بە چرم (اندر) بودن"**: سەرەنجامی کاری ئەو دیارنەبوون.

**گاوپیکر:** بەشکڵی گا، بەشکڵی سەری گا.

**گاوچاە:** چاڵی قووڵ و بەرین.

**گاوچران:** گاوان، گاڤان، گاچەڕێن، گاچێڕ، گادێر، گالو، گاوۆ، گاوۆن، شوانی گاران، شوانی گایەل. "**مزد گاوچران**": گاڤانی، گاوانی، کرێی شوانی گاڕان.

**گاوچشم:** چاوگا، چاوگەورە.

**گاوخانی:** حەوزی گەورە.

**گادار:** گادێر، خاون گا. "**گاوداری**": گادێری، کاری ڕەشەوڵاغ ڕاگرتن.

**گاودل:** 1) نەزان، گەمژە. 2) ترسەنۆك، قزە.

**گاوروان:** گاوان.

**گاوریش:** گەوج، نەزان، بێئاقڵ.

**گاوزهره:** بریتی لە ترسەنۆك، بێجەرگ، نەوێر، قزە.

**گاوگون:** تاریك و ڕوون.

**گاویار:** گاوان.

**گاه:** 1) وەختێ، زەمانێ. 2) دەم، کات، سات، وەخت، جار. 3) هەندێ جار. 4) وەرز، کژ. 5) دەورە، سەردەم. 6) شوێن، جێگە، تەختی پاشایەتی. "**گاەبگاه**": جاربەجار، جارنان، دەمادەم، وەخت بە وەخت. "**گاەوبیگاه**": 1) وەخت و ناوەخت، لە کاتی لەبار و نالەبار دا. 2) هێندێ جار، هەندێ وەخت. 3) بەردەوام، هەمیشە. 4) هەموو کاتەکان.

**گاهشمار:** "کرۆنۆلۆژی"، دەمژمێر.

**گاهشماری:** ڕاگرتنی حەساوی ساڵ و مانگ و ڕۆژ، ڕۆژژمێر، ساڵ پێو.

**گاهگاه:** جارجارە، جاروبار(ە)، جارجار(ە)، چەل چەلە، گاڤانێ، گاڤگاڤ، گەگانە، گابەگایی، گلانگا.

**گاهگاهی:** جاروەجارێ، جارجارێ، وەختاوەخت، وەختاووەخت، ناوناو، ناوناوە، ناوبەناو، گاگایێ.

**گاەگدار:** گاگا، گاگوار، جارجار، جاربەجار، چەل چەلە.

**گاهگیر:** 1) خافڵگیر. 2) کەسێك کە لە کارەکان دا جیددی نیە و تەنیا هەندێ جار دژکردەوەی جیددی لە خۆ نیشان دەدا. 3) لە پزیشکیدا: حاڵەت یان نەخۆشییەك کە جارناجار سەرهەڵ بدا.

**گاهوار:** بڕوانە:" متناوب".

**گاهواره:** لانك، لانکە، لاندك، بێشکە، دەرگوش، دەیدیك.

**گاهواری:** بڕوانە:"تناوب".

**گاهی:** جاربەجار، هێندێ جار.

**گایشی:** بڕوانە:"شهوانی".

**گاییدن:** 1) گایین، ئیلاقەکردن، گان. 2) ماندووکردن لەبەر دووپات کردنەوەی زۆری شتێك.

**گبر:** 1) زەردەشتی، پێڕەوی زەردەشت، گاور، ئاگرپەرست. 2) کافر، ناموسڵمان.

**گبز:** زل، قەبە، ئەستوور.

**گپ:** 1) گاڵتە، شۆخی، گەپ. 2) بڕوانە: "لاف و گزاف".

**گت:** گەورە، قەبە، تاپاز.





**گجسته:** 1) ناپاك، نیازخراپ. 2) گەمار، گلاو. 3) بڕوانە:"شوم".

**گدا:** چاسر، پارسەك، سواڵکەر، خوازەلۆك، دەرۆزەکەر، گەدا. "**گدای سمج**": چەلوز، خۆهستەگ، پارسەکی بەگیرەونیرە.

**گدابازی:** ڕژدی یان قرنیسی لە خۆنیشان دان، دەست پێوەگرتنی لەرادەبەدەر لە خەرج کردن دا.

**گداچشم:** بەرچاوتەنگ، چاوچنۆك، تەماکار.

**گداخت:** کردەی تاواننەوە. "**گداخت هستەای**": هاوجۆشی، "فیوژن".

**گداختن:** 1) تاوان، توانەوە، تاوانەوە، تواندنەوە، حەلین، حەلبوون، حەلاندن، بهیتن، بەهتین، هەلاندن، قەلین، بوونەئاو. 2) هەڵچۆقان، قژڵان. 3) کزولاوازبوون یان کزولاوازکردن بە خەم یان نەخۆشی. 4) سووتان و لەناوچوون. 5) هەڵتاواندن، هەزم کردن. "**گداختە**": 1) تاویاوە، تواوە، تاواوە. 2) داغ کراو، سووربۆوە بەهۆی تین. 3) کز و ڕەقەڵە، زەردەڵە.

**گدار:** 1) بوار، بگار، دەراو، دەراڤ، پاگا، بازەبەر، پردەباز، بەردەباز، پێباز، بڕ، بەردی پەڕینەوە لە جیاتی پرد، تەسکایی ڕووبار. 2) بڕوانە:"معبر".

**گدارو:** 1) سەرسواڵکەر، خازخازۆك. 2) چەلوز، سواڵکەری بەگیرەونیرە.

**گداز:** تاوانەوە، توانەوە، بوونە ئاو. 2) کزبوون، لاوازبوون، کزی و لاوازی. 3) خەم، ژان، ڕەنج. 4) ناڵە و پاڕانەوە.

**گدازان:** 1) لە حاڵی توانەوەدا. 2) بڕوانە: "سوزندە". "**گدازان شدن**": توانەوە، تاویانەوە.

**گدازش:** کردەی توانەوە، تاویانەوە، حەلبوون.

**گدازشگر:** بڕوانە: "ریختەگر".

**گدازندە:** توێنەرەوە، توێن، توێنەوە، تاوێنەوە.

**گدازیدن:** بڕوانە: "گداختن".

**گداصفت:** سەرسواڵکەر، ئەوەی خوو و عادەتی سواڵکەرانی هەیە، قرنیس، پیسکە، لەچەر.

**گداگدوری:** دەست تەنگ و نەدار، تەواو ڕووت و نەدار.

**گدامنش:** تۆرتۆرە، خوازۆك، خوازەلۆك، خواستۆخ، سەرسواڵکەر(ە)، چاو لەدەستی خەڵك، خازخازۆك.

**گدایی:** سواڵ، سواڵ کەری، لەتەچنی، پارسە، پارسەکی، دەرۆزە، خوازەلۆکی، گەداندن، چلانە، دەس پانکردنەوە، ماڵەوماڵ کردن.

**گدویی:** بستۆی کێو، زینۆ.

**گذار:** 1) تێپەڕین، تێپەڕبوون. 2) بڕوانە:"معبر". 3) کردەی بڕین، بڕینەوە. "**گذارآوردن**": تێپەڕین، ڕەدبوون، بوورین. "**گذاردادن**": تێپەڕاندن، دەرچواندن. "**گذارکردن**": تێپەڕین، ڕەت بوون، ڕابردن. "**گذار کسی به جایی افتادن**":

لەو شوێنەوە تێپەڕین یان بەڕێکەوت و پێشبینینەکراو سەردانی ئەو شوێنەکردن. "**گذاریافتن**": سەرپێچیکردن، نافەرمانیکردن. "**در گذار بودن**": لە حاڵی تێپەڕین دابوون.

**گذارد:** کردەی تێپەڕکردن و دەرچواندن.

**گذاردن:** دانان، دانیان، نانە سەرزەوی.

**گذاردن:** تێپەڕاندن، ڕەت کردن، دەرچواندن.

**گذارنده:** دانەر، کەسێ شتێ ئەنێتە بان زەوی یان سەر شتی دی.

**گذاره:** 1) تێپەڕین لە شوێنێکەوە، ڕابردن. 2) بڕوانە: "گذرگاە". 3) کون، درز، کەلێن. 4) ڕێبوار، ڕێڕەو. "**گذارەآمدن**": تێپەڕین، دەرچوون. "**گذارەکردن**": تێپەڕین، ڕابردن. 2) تێپەڕاندن، دەرچواندن. 3) وازهێنان، چاوپۆشی لێکردن. 4) کون کردن، سمین. "**گذارەیافتن**": تێپەڕین، ڕەت بوون.

**گذاشتن:** 1) دانان، دانیان. 2) ڕێدان، ڕێگەپێدان، ئیزن پێدان. 3) بەجێهێشتن، وێڵکردن. 4) وەلانان، خستنەلاوە. 5) هێشتنەوە. 6) خستنە دۆخی ناخۆشەوە. 7) سەبرکردن، چاوەڕوان مانەوە. 8) زایین یان هێلکەکردن. 9) ناردن، ڕەوانەکردن. 10) بە توندی زەربە لێدان، کوتان(با مشت گذاشت توی دهنش). 11) دانان، دامەزراندن.

"**گذاشتن پشت چیزی**": درێژەدان بە شێلگیری و نەبەزی. "**به(روی) هم گذاشتن**": لەسەریەك دانان، وێکنان، بەستن. "**خود را جای کسی گذاشتن**": خۆ لە جێی ئەو دانان. "**رو به چیزی گذاشتن**": بەرەو لای ئەو چوون. "**روی هم گذاشتن**": 1) خستنە سەر یەك، خستنە بان یەك. 2) وێکنان، بەستن. 3) هەمبارکردن، پاشەکەوت کردن، خڕکردنەوە.

**گذر:** 1) بگارە، دەرباز، ڕابردن، بوردن، تێپەڕبوون لە جێیەکەوە. 2) جێگەی تێپەڕین. 3) چارە، چارەسەر. 4) ڕاستە بازاڕی سەرداپۆشراو. "**گذر دادن**": 1) گەیاندن، گەهاندن. 2) ڕێگەدان، ئیزنی تێپەڕبوون دان. "**گذرکردن**": 1) ڕەدبوون، ڕەدبین، ڕابردن، بووردن، تێپەڕبوون، هاتن و ڕۆیشتن. 2) چوونەجێیەکەوە، دزەکردن. 3) سەرپێچیکردن. "**گذر کسی به جایی افتادن**": لەو شوێنەوە تێپەڕین. "**گذر یافتن**": 1) تێپەڕین، چوون. 2) ڕزگاربوون.

**گذرا:** 1) تێپەڕ، نابەردەوام، ناپایەدار، کاتەکی. 2) خێرا، لەحاڵی تێپەڕین دا. 3) لە ڕێزمان دا: تێپەڕ.

**گذران:** 1) تێپەڕ، ناپایەدار، نابەردەوام. 2) هەڵ، ڕابواردن. 3) ژیان، بژیوی. "**گذران زندگی**": هەڵکرد، گوزەران و ڕابواردن. بژیوی ژیان. "**گذران کردن**":





1) ڕابواردن، تەمەن ڕابواردن، ژیان بەسەربردن. 2) وەدەست خستنی بژیوی ژیان.

**گذراندن:** 1) تێپەڕاندن، دەرچواندن، ڕەت کردن. 2) تێپەڕاندن، بردنەسەر، ڕابواردن. 3) پێوان، بڕینی ڕێ. 4) تێپەڕین و بەجێهێشتن. 5) تێپەڕاندنی شتێ لە شوێنێکەوە. 6) ڕێگەپێدان، ئیزن پێدان. 7) لێبوردن، چاوپۆشی لێکردن. 8) لەسەرتردانان. 9) بڕوانە: "رسم کردن". "**زندگی را گذراندن**": هەڵ کردن، هەڵ کرن، گوزەران کردن، ژیان بەسەربردن، ژیان ڕابواردن. 3) ئەنجامدان، بەڕێوەبردن. 4) پەسندکردن. 5) زێدەڕۆییکردن لە ئەنجامدانی کارێکا.

**گذربند:** لەمپەر، کۆسپی سەر ڕێ.

**گذرگاه:** شوێنی تێپەڕبوون، تێپەڕگە.

**گذرنا پذیر:** بێ گوزەر، تێنەپەڕ، جێگەی ئاسێ و ئاستەم.

**گذرنامه:** تێپەڕنامە، ڕێنامە، پاسپۆرت.

**گذرنده:** 1) تایبەتمەندی ئەوەی تێدەپەڕێ. 2) بڕوانە: "عابر". 3) ناپایەدار، نابەردەوام، لەناوچوو، تێپەڕ.

**گذری:** 1) بەڕێکەوت، بەهەڵکەوت. 2) کورت. 3) بڕوانە: "عابر".

**گذشت:** 1) بەرەوپێش چوون، تێپەڕین، ڕەت بوون. 2) تێپەڕی، ڕابرا، ڕابرد، چوو، بەسەرچوو، ڕۆیشت، ڕوالا، بهوورد، بووری. 3) بەخشین، لێخۆش بوون، لێبوردن. 4) وازهێنان لە شتێ، چاوپۆشیکردن. "**گذشت از**": جیالەو، بێجگە لە، جگە لە. "**گذشت داشتن**": هەبوونی خەسڵەتی چاوپۆشی کردن لە هەڵە یان گوناحی دیتران و بەخشینیان. "**گذشت کردن**": بووردن، بوورین، بەخشین، چاوپۆشیکردن، بگردن. "**از گذشت**": بڕوانە: "گذشت از".

**گذشتگان:** پێشینیان، کۆچکردوان، ڕابوردوان، وەرینان، قەدیمیان.

**گذشتن:** 1) ڕەت بوون، ڕابردن، بووردن، بوورین، تێپەڕین، تێپەڕکردن، چوون و ڕۆیشتن، وێردن، ویەردەی. 2) بەسەرچوون، تێپەڕینی کات، کات نەمان، بەکۆتایی گەیشتنی کات. 3) بووردن، بەخشین، لێخۆش بوون، عافووکردن. 4) وتران، نووسران، دەربڕان، باسکران، گێڕدرانەوە(چنان کە گذشت). 5) پەسندکران، پەسندبوون. 6) بەئاکام گەیشتن، کۆتایی هاتن. 7) هاتن، بەزەیندا هاتن. 8) دابین بوون، سەروبەربوون. 9) هەزم بوون، هەرس بوون. 10) لەدەست چوونی دەرفەت، درەنگبوون. 11) ڕەوانبوون. 12) مردن. 13) پێوان یان تێپەڕاندنی قۆناغ یان دەورەیەك. 14) ڕێ ڕۆیشتن. 15) چوون، ڕۆیشتن، ڕەوانەبوون. 16) ڕوودان، پێشهاتن، بەسەرهاتن. "**از جایی**

**گذشتن"**: 1) له شوێنێكەوه تێپەڕین. 2) پێوان/بڕینی ئەو شوێنە. **"از چیزی گذشتن"**: وازهێنان لێی، چاوپۆشیكردن لێی. لێیەوەتێپەڕین. لەو بانترچوون، لەو تێپەڕاندن. **"از مجلس( پارلمان...) گذشتن"**: پەسندكران. **"بر كسی گذشتن"**: 1) بەسەرهاتن. 2) چوونە لای ئەو. 3) لە نزیك یان بەرامبەری ئەوەوە تێپەڕین. 4) بۆ ئەو ئاسان بوون(ەوە). 5) لەو زیاتر چوونە بان یان بەسەر ئەو دابوون. **"بگذریم"**: بەكورتی. لێی گەڕێ.

**گذشته**: ڕابردوو، ڕابوردوو، ڕابوردە، ڕابوردی، ڕابردە، ڕابووری، بووردە، ڕۆژگاریبووری، ڕووداوی نەماو، ڕۆیشتوو، و یاردە، وێردە، ویەردە. **"گذشته از"**: 1) جیالە، بێجگەلە. 2) سەرەڕای. **"گذشته شدن"**: كۆچكردن، مردن. **"از این(آن) گذشته"**: 1) دوای ئەوە (ئەمە). 2) جیالەوە، جگەلەوە.

**گذشتەگرایی**: ڕابردووخوازی.

**گذشتەنگر**: ئەوەی هەوڵ دەدا پێڕەوی لە نەریت و ڕێوشوێن و فەرهەنگی پێشینیان بكا.

**گر**: (گ) بلێسە، بلێزە. **"گر زدن"**: بلێسەسەندن، كلپەساندن. **"گر گرفتن"**: 1) ئاورگرتن، هەلایسان، بلێسەسەندن. 2) تووڕەبوون و هەڵچوون.

**گراته**: گرفت، كێشە، كۆسپ، تەگەرە. **"گراتەانداختن"**: كۆسپ و ئاستەنگی نانەوە لەبەرەوپێش چوونی كارێك. **"گراته شدن"**: تووشی كێشە و كۆسپ بوون، گرێ تێكەوتن لە كارێكا.

**گرازیدن**: خلنگین، بەناز ڕۆیشتن، بەلەنجەولار ڕۆیشتن.

**گراس**: (گُ) پاروو، تیكە.

**گراشیدن**: 1) بڕوانە: "كراشیدن". 2) دەسبڕیكردن، جامبازیكردن.

**گرامر**: ڕێزمان، ڕێساكانی زمان.

**گرامی**: خۆشەویست، بەڕێز، ڕێزدار، هێژا. **"گرامی داشتن"**: ڕێزگرتن.

**گرامی داشت**: بەرزنرخاندن، بەرزڕاگرتن، ڕێزلێنان.

**گران**: 1) قورس، بەكێش، گران، بەرامبەری سووك. 2) گران، بەنرخ، نرخدار، نرخ زۆر. 3) ناخۆش، ناپەسند، دڵازار. 4) قووڵ و قورس(خەو). 5) دژوار، تاقەت پڕوكێن. 6) كاری، كاریگەر(برین). 7) توند، سەخت. 8) گەورە، مەزن. 9) چڕ، فراوان. 10) گیرا، مەستیهێن. 11) قورس، شتێ كە بەدرەنگی هەزم دەبێ. 12) كەسێ كە درەنگ دەبیستێ، گوێگران. **"گران آمدن"**: 1) قورس بوون، قورساییكردن. 2) پەسندنەكران، قبووڵ نەكران. 3) لەتاقەت نەهاتن، لەتاقەت بەدەربوون. **"گران تمام شدن"**: گران كەوتن، گران بۆ تەواوبوون، خەرجی زۆر هەڵگرتن. دەرەنجامی خراپ لێكەوتنەوە. **"گران داشتن"**: بوونە هۆی زەحمەت پێدان. **"گران شدن"**: 1) گران بوون، نرخ چوونە بان. 2) ناخۆش و ناسازگاربوون. 3) بەئەسپایی ڕۆیشتن. **"گران شدن بر كسی"**: بەدخولقیكردن دەگەڵ ئەو. **"گران كردن"**: 1) گرانكردن، بردنەسەری نرخ. 2) سەخت و دژواركردن(ەوە). **"گران گرفتن"**: بەناخۆش و ناپەسند دانانی شتێ. **"گران گرفتن كسی"**: بەهێندنەگرتنی ئەو، كەمتەرخەمی نواندن سەبارەت بەو.

**گرانبار**: 1) مرۆ یان ئاژەڵێ كە باری قورسی لەسەر پشت بێ، بارقورس. 2) داری پڕبار. 3) قورس و دژوار. 4) ئاوس، دووگیان. 5) ناڕەحەت، خەمبار، دڵتەنگ.

**گرانبندكردن**: بەرتەسك كردنەوە، خستنە تەنگانەوە.

**گرانبها**: زۆر بەنرخ، گرانبایی، ئەوەی نرخ و بەهای زۆری هەبێ.

**گران پایه**: پایەبەرز.

**گرانجان**: 1) خوێنتاڵ، هەستیگران، ڕەزاگران، ڕەزاقورس، زەڕەتاڵ، ئێسك قورس، گۆشت تاڵ، گۆشت گران. 2) زۆر پیر و بەساڵاچوو. 3) كەسی نەدار و نەخۆش و لە گیان تێربوو. 4) بڕوانە: "خسیس". 5) نەچەمیو و خۆڕاگر.

**گران خیز**: دێراخێز، لەش گران.

**گراند**: گەورە، كەڵان.

**گران دست**: ئەوەی كارێ بە شێنەیی و ڕامان و زۆر بە درەنگی جێبەجێ دەكا.

**گران سایه**: 1) خاوەنی پلەوپایە، پایەبەرز. 2) قورس و قۆڵ، ماقووڵ. 3) تاریك و درێژ(شەو).

**گران سر**: 1) بریتی لە فیزن، بەدەمار، خۆخواز، خۆسەر.2) مەست، سەرخۆش. 3) تووڕە، قەڵس.

**گران سنگ**: 1) قورس. 2) قورس و قۆڵ، گران مێر، لەسەرەخۆ. 3) قووڵ و قورس(خەو). 4) ڕادەی باشی و بەڕمێن بوونی شتێ.

**گرانش**: (فیزیك) وزەی ڕاكەش.

**گران قدر**: بەڕێز، ڕێزدار، هێژا.

**گران قیمت**: گران بەها، گرانبایی.

**گران كابین**: 1) ژنێ یان كچێ كە مارەییەكەی زۆر بێ. 2) بەنرخ و هێژا.

**گران گوش**: گوێگران.

**گرانمایه**: 1) گرانبایی، قیمەتی. 2) خۆشەویست. 3) فراوان، زۆر و زەوەند. 4) هێژا، پایەبەرز.

**گرانی**: 1) گرانی، نرخی بەرەژووری. 2) قورسی، گرانایی. 4) لەفیزیك دا: قورسایی. 4) ڕەزاگران و ئێسك قورس، كەسێك كە تێكەڵی دەگەڵ ئەودا ناخۆشە. 5) زەحمەت، ژانەسەر. 6) خەستی، تیری. 7) سستی، خاوەخاوی. 8) زۆری، فرەیی. 9) قورس بوون، درەنگ هەزم

بوون. 10) ئەسپایی، بەلەسەرخۆیی. 11) کەمتەرخەمی، بەهێندنەگرتن، گوێ پێنەدان. 12) دژواری لە دەربڕین دا. **"گرانی بردن"**: زەحمەت کەم کردن. **"گرانی کردن"**: قورساییکردن. 2) ئازاردان. خۆڕاگریکردن، ڕاوەستان. 3) کەسێك کە تێکەڵی و هەڵکردن دەگەڵ ئەو ناخۆشە. **"گرانِ گوش"**: گوێگرانی، گوێقورسی.

**گرانیگاه:** 1) لە فیزیك دا: چەقی قورسایی. 2) جێگەی گرینگ.

**گراهش:** بڕوانە: "گرایش".

**گراهیدن:** بڕوانە: "گراییدن".

**گرایستن:** بڕوانە: "گراییدن".

**گرایش:** 1) بەریان، مەیل، گرۆیی، سۆز، ڕووکردن، ڕووتێکردن، لایەنگری. 2) نزیك بوونەوە لە کەسێك یان جێیەك.

**گراییدن:** ویستن، مەیل و حەزکردن، مەیل و هۆگری پەیاکردن سەبارەت بە کەسێك یان شتێ، مەیل لێبوون.

**گُربُز:** (گ.بُ) 1) زیرەك، زانا، وریا. 2) ئازا، بوێر، دلێر. 3) فێڵەباز، فێڵەزان.

**گربك:** پشیلەی گچکە.

**گربە:** پشی، پشیلە، پشیك، کتك. **"گربە از بغل افکندن"**: وازهێنان لە فرتوفێڵ. **"گربە بە شانە کردن"**: مەکر و فڕوفێڵ بەکاربردن، فریودان. **"گربە درانبان"**: تەڵەکەباز، فێڵباز. 2) زیندانی و بێچارە. 3) فێڵبازی، کەڵەکبازی. **"گربە رقصاندن"**: ئەمڕۆ و سبەی پێکردن، تەفرەدان. **"گربە شاندن"**: فریوخواردن، هەڵخەڵەتان. **"گربە کجا تخم می گذارد؟"**: وەزعەکە چۆنە، وەزعەکە لەچی دایە. **"گربە مرتضی علی"**: کەسێك کە هەرگیز فریو ناخوات و هەردەم بەقازانجی خۆی کار دەکات. **"موسم جفتگیری گربەها"**: گڕنەوت.

**گربەچشم:** 1) چاو کەوگ. 2) بڕوانە: "بدذات".

**گربەرو:** ناسپاس و سپڵە.

**گربەسان:** لەتیرەی پشیلە، وەك پشیلە، پشیلەئاسا.

**گربەشانی:** فرتوفێڵی، فەندوفێڵی.

**گربەشور:** بریتی لە شۆردن یان حەمام کردنی خێرا و بەپەلە بەجۆرێ کە بەتەواوی خاوێن نەبیەوە.

**گربەکورە:** ناسپاس و سپڵە، بێچاوەڕوو.

**گرتەبرداری:** 1) وەرگێڕانی وشەبەوشە کە لەودا وشە خۆجێییەکان جێی وشە دەرەکییەکان دەگرنەوە. 2) لاساییکردنەوە یان لەبەرهەڵگرتنەوەی وێنە و هتد.

**گرختن:** بڕوانە: "گریختن".

**گرد:** (گ) 1) گەڕان، سووڕانەوە. 2) ئاسمان، ڕۆژگار، سەردەم.

**گرد:** (گَ) 1) خاکی نەرم، غومار، تۆز. 2) جۆرێ ماددەی سڕکەر. 3) گۆڕ، قەبر. 4) زەوی. 5) ئاسەوار، نیشانە. 6) خەم، خەفەت. 6) بەهرە، قازانج، سوود. **"گرد آوردن"**: بوونە هۆی دەرد و ڕەنج. **"گرد از چیزی افشاندن(نشاندن)"**: سڕینەوەی تەپوتۆز لێی. **"گرد از چیزی(کسی) برآوردن"**: پاك کردنەوەی تەپوتۆز لێی. تەرتوتووناکردنی ئەو. **"گرد داشتن"**: خەمناك بوون، خەم و خەفەت هەبوون. **"گرد کافور"**: مووی سپی. **"گرد کردن"**: 1) تۆزکردن، تۆزهەستاندن. 2) بەهرەدان، خێردانەوە. **"گردوخاك"**: هەڕ و وەل، تەپوتۆز، تۆز و خۆڵ. بە مانای ئاسمانیش هاتووە. **"گرد و خاك کردن (راه انداختن)"**: تەپوتۆزکردن. 2) هاتوهاوار وەڕێخستن. 3) خۆ نوێنیکردن، زۆر چالاك و بەکاربوون لە کاردا و ئازایەتی خۆ بە ڕووی کەسانیتردا دادانەوە. **"گردوغبار"**: تۆزوغومار، تۆزوخۆڵ، گڵۆخۆڵ، گەردوخۆڵ، گەرت. **"از گرد راه رسیدن"**: 1) تازە لە شوێنێکەوە هاتن. 2) بەتازەیی چوونەپاڵ گروپێکەوە.

**گرد:** (گِ) 1) خڕ، گرۆڤەر، هەرشتێکی بە شکڵی بازنە. 2) دەوران پشت، دەوران دەور. **"گردآمدن"**: 1) تێوروکان، تێمروکان، کۆبوونەوە بە دەوری شتێکا، لە دەوری یەك خڕبوونەوە. 2) کۆگاکران، کەڵەکەکران، هەڵچنران. 3) هاونوێن بوون، جووت بوون. 4) تێکەڵ بوون، بوونە هاوڕێ. **"گردآمدن کسی را"**: هاودەستی کردن بەدژی ئەو. **"گردآوردن"**: کۆکردنەوە، یەکەونیان، کەڵەکەکردن، کۆماکردن. لە دەوری یەك خڕکردنەوە. **"گرداندرگرد"**: بڕوانە: "گرداگرد". **"گرد برگشتن(گشتن)"**: بەمڵاولادا ڕۆیشتن، سووڕانەوە. 2) دەورلێدان، خولانەوە. **"گرد پای حوض گشتن"**: بە پێشوازی مەترسییەوە چوون. **"گردتاگرد"**: دەوراندەور، دەورووبەر، دەوران پشت. **"گرد چیزی برآمدن"**: لە دەورووبەری ئەودا سووڕانەوە. **"گرد چیزی(کسی) گشتن(گردیدن)"**: 1) بە پەیسەری ئەودا چوون، سەروکەللە پەیاکردن دەگەڵ ئەو. 2) بە دەوری ئەودا سووڕانەوە بە نیشانەی ڕێزگرتن، دەبەر ئەو مران. **"گرد خود برآمدن"**: دەفکرەوە چوون، بیرکردنەوە، ڕاوێچکەکردن. **"گرد خود گشتن(طواف کردن)"**: دە فکر ڕاچوون، بەهێندگرتنی کاری خۆ. **"گرد دل کسی برآمدن"**: دڵدانەوەی ئەو. **"گرد شدن"**: لە دەوری یەك خڕبوونەوە، کۆبوونەوە. **"گرد کردن"**: 1) خلێرەوکردن، خڕکردن، خڕکردنەوە. 2) خڕکردن، بە شکڵی بازنە دەرهێنان. **"گرد کسی را فراگرفتن"**: دەوری ئەو گرتن، بە دەوری ئەودا کۆبوونەوە. **"گردگرفتن"**: چواردەورەدان، گەمارۆدان، ئابلۆقەدان. **"گردگرد"**: گرۆڤەر، خڕ، گلۆر، بازنەیی. **"گرد (اندر) گرفتن"**: گەمارۆدان، دەورەدان. **"گرد نشستن"**: دانیشتن بە چوارمەشقی. **"گرد و قلمبە"**: کورتەبنە، کوڵەبنە، کوڵەپڕە، کورتەباڵای قەڵەو. **"گرد هم"**: لە دەوری یەکتر. **"گردهم آمدن"**: لە دەوری یەك کۆبوونەوە، پێکەوە کۆبوونەوە. **"گردهم آوردن"**: خڕکردنەوە.لێك کۆم کردنی گیانداران، کۆکردنەوە. **"بە هم گردآوردن"**: کۆکردنەوە.

**گرد:** (گُ) دلێر، ئازا، پاڵەوان.

**گردآلود:** (گَ) تۆزاوی، خۆڵاوی، خۆراوی، گەرداوی، تۆز لێنیشتوو.

**گردآمدگان:** بەشداران، بەشداربوان، ئامادەبوان.

**گردآورد:** کۆمەڵەیەکی فرەچەشن.

**گردآوری:** کۆکردنەوە، خڕکردنەوە.

**گرداب:** 1) گێژاو، گێژاڤ، گەرداڤ، گەڕاڤ، گەرداو، گێجاو، گێڕک، گێژك، گراداڤ، کەندال. 2) بارودۆخی مەترسیدار. "**گرداب مهلك**": گەڕێنەك.

**گرداگرد:** دەورادەور، دەوراندەور، دۆرمادار، بە هەموو لادا، دەوروپشت.

**گردالی:** خڕ، گرۆڤەر.

**گردان:** (گُ) 1) پاڵەوان. 2) لە زاراوەی ئەرتەش دا: سێ گرووهان.

**گردان:** (گَ) 1) لە حاڵی خولانەوەدا، لە حاڵی سووڕانەوەدا. 2) وەرچەرخاو، وەرگۆڕاو. "**گردان شدن**": ڕەوان بوون. "**گردان کردن**": وەسووڕان خستن، خول پێدان. "**گردان گردان**": کەم کەم، کەمکەمە، بەرەبەرە.

**گرداندن:** 1) سووڕاندن، سووڕاندنەوە، سووڕاننەوە، وەرسووڕاندن، هەڵسووڕاندن، خولاندنەوە، خول پێدان، چەرخاندن، زڤراندن. گەشت پێکردن، گێڕان، گەڕاندن.2) گۆڕین. 3) دوورخستنەوە، پاڵ پێوەنان، ڕادان. 4) وەرگرتنەوە، لێ سەندنەوە. 5) وازپێهێنان. 6) وەرگێڕان.

**گرداننده:** هەڵسووڕێن، هەڵسووڕێنەر، کارگێڕ.

**گردباد:** باهۆز، گێژەڵووکە، گێژەڵە، گژۆلەك، گێجەڵووکە، باگەڕ، باگێژە، باگرۆکە، گردەبا، گەردەبا، گەردەلوور، گەردەلوول، گەردولوول، گرپێچ، گەڕەپێچ، گەڕەپێچە، گێجەبا، گیدۆ، وەلەك، تەنوورە، زڤیرك، شایی جندۆکان، داوەتەجنۆکە، بابلیسك، عێوارەش.

**گردبان:** کۆپانەی وشتر، دووگە وشتر.

**گردبرگرد:** بڕوانە: "گرداگرد".

**گردبرگردان:** دەوروپشتەکان، نزیکەکان.

**گرد پا(ی):** چوارمەشقە، چوارچمکە.

**گرد پیچ:** ئابلۆقە، گەمارۆ.

**گردر:** زەوی ناڕێك و بەرز و نزم.

**گردش:** 1) گەڕان، گەڕیان، گێڵە، ڕۆیشتن، هاتوچۆکردن. 2) سووڕان، خول، گەڕان(گردش خون). 3) جێگۆڕکێ. "**گردش تفریحی**": هەلفۆنە، پیك نیك، خواردن و سەیران لە دەشت. "**گردش خون**": سووڕی خوێن. "**گردش دادن**": گەڕاندن، گێڕان، گەشت پێکردن، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بردن. "**گردش رفتن**": چوونە سەیران و هەواخۆری. "**گردش کار**": ڕەوت و جەریانی ئەنجامی کار. "**گردش کردن**": گەڕان، سەفەرکردن. چوونە سەیران و هەواخۆری. سووڕانەوە یان جووڵان لە ڕەوگەیەکی دیاریکراودا. "**در گردش بودن**": لە حاڵی خولانەوەدا بوون. لەکاردابوون، لە گەڕدا بوون.

**گردشگاه:** سەیرانگە، شوێنی سەیران.





**گردشگر:** توریست، گەشتیار، گەڕیدە.

**گردشگری:** توریسم، گەشتیاری.

**گردگاه:** بڕوانە: "تهیگاه".

**گردگیر:** (گُ) ئازا، دلێر، بوێر.

**گردگیر:** (گَ) تۆزگیر. "**گردگیری کردن**": 1) پاك کردنەوەی تەپوتۆز لەسەر شتێك، تۆزگیریکردن. 2) شلووقیکردن و زۆرهێنان و لە مەیدان دەرکردن.

**گردماه:** 1) مانگی شەوی چواردە. 2) جوان چاك، سوڕپەری.

**گردن:** ئەستۆ، ئەستوو، ستوو، مل، گەردن. "**(به) گردنِ**": لە ئەستۆی. "**گردن افراختن(افراشتن، برافراشتن)**": مل هەڵێنان، مل بەرزکردنەوە. 2) خۆنوێنیکردن. 3) هێز و دەسەڵات لە خۆنیشاندان، ڕاوەستان و خۆڕاگری. 4) شانازی کردن. 5) سەربزێویکردن. "**گردن افراشتن(برافراشتن) بر چیزی**": بەرابەریکردن دەگەڵ ئەو. "**گردن به کاری (چیزی) دادن(گزاشتن، نهادن)**": ملدان، قبووڵکردن. "**گردن پیچاندن به چپ و راست**": دوودڵ و دڕدۆنگ بوون، مل بادان بەملاولادا. "**گردن پیچیدن(تافتن)**": سەرپێچیکردن. "**گردن خاریدن**": بیانوو هێنانەوە. تووشی سەرسوڕمان و سەرگەردانی هاتن. "**گردن دادن**": ملدان، ملنیان، سەرنەویکردن، تەسلیم بوون. "**گردن زدن**": مل لێدان، کوشتنی کەسێك و مل لێکردنەوە. "**گردن کسی آزاد بودن**": ڕزگاربوون لە کۆتوبەند. "**گردن کسی را نرم کردن**": دەستەمۆ و مل پێکەچکردن. "**(به)گردن کسی گذاشتن(گذاردن، نهادن)**": خستنە ئەستۆی ئەو، بەسەر دابڕین. "**گردن کشیدن**": 1) مل کێشان. 2) هەنگاونان، دەست بردن بۆ کارێك. 3) سەرپێچیکردن. "**گردن گرفتن**": لە ئەستۆگرتن، قبووڵ کردن. 2) دان پێدانان. "**گردن نهادن**": خۆبەدەستەوەدان، ملدان، ملشۆڕکردن، سەرنەویکردن. "**از گردن خود برداشتن**": خۆدەربازکردن لە دەروەستی یان بەرپرسێتی، لە کۆڵ خۆ کردنەوە. "**به گردن(برگردن) افتادن**": سەرنخوون بوون، بەملەوە کەوتن، بەملاکەوتن. "**بەگردن داشتن**": دەروەست بوون، لەئەستۆبوون. "**بەگردن(درگردن) کسی بودن چیزی**": لە ئەستۆی ئەوبوون. "**بەگردن (برگردن، درگردن) گرفتن چیزی (کاری)**": وەئەستۆ گرتنی ئەو کارە.

**گردن آور:** بەهێز و دلێر.

**گردنا:** بڕوانە: "مدوّر".

**گردناك:** (گِ) تۆزاوی، تۆز لێنیشتوو.

**گردنامه:** (گُ) بڕوانە: "حماسه".

**گردنبند:** ملوانکە، ملیوانە، ڕستك، گەردانە، خشڵی ئەستۆ.

**گردن شخ:** بریتی لە کسی بەدەمار، خۆبەزل زان و سەرکێش.

**گردن شکسته:** مل شکاو.

**گردن فراز:** 1) سەربلّیند، سەربەرز، گەورە. 2) خۆپەسند، لووت بەرز، بەدەمار. 3) بەهێز، پالّەوان.

**گردنکش:** 1) سەربزێو، سەرزەیە، خۆسەر، سەرکێش، نافەرمان. 2) بەهێز، دلێر، پالّەوان. 3) سەربلّیند، گەورە.

**گردن کلفت:** خپشەملە، خرتی، خووگەملە، گێزەمل، مل قەوی، مل ستوور، مل ئەستوور، ئەستۆئەستوور، مل وڕ، ملهوڕ، پاتك پان، گیزەمل، شەڕلاتان، شەلاتی، قەبەدای، هەفك ئەستوور، کۆتەك، زۆردار. خاوەنی پۆست و دەسەلّاتی کۆمەلّایەتی.

**گردنگ:** بڕوانە:"کردنك".

**گردنگاه:** بڕوانە:"گردنە".

**گردن گیر:** بڕوانە:"گریبان گیر".

**گردنە:** بستوو، زینوو، کەل، ملەیکێو، گەروو، گیڕ، سەریالّ.

**گردنەگیر:** سەرملەگیر، دزگەردەنە، چەتە.

**گردون:** هەرچی بە دەوری خۆی یان بە دەوری تەوەرەکەی دا بخولێتەوە، چەرخ.

**گردونە:** 1) ڕەوڕەوە، بازنە، چەرخ، عەڕابە، گاری، هەرشتێکی وەك چەرخ کە بە دەوری خۆیدا بسووڕێتەوە. 2) ڕەوت و ڕەوالّی کار یان چالاکی شتیّ.

**گردە:** (گِ دَ) 1) هەرشتێکی خڕ و گرۆڤەر. 2) برنجی گردە.

**گردە:** (گَ.دَ) پلانی نیگارکێشی، نەخشە یان وێنە یان نووسراوەیەك کە لە ڕوویەوە نەخشە یان وێنە یان نووسراوەی تری لیّ بگرنەوە.

**گردە:** (گُ) نێوان دوو شان، گوردی، کۆلّ، پشت. "**گردە کسی بە خاك آمدن**": شکست خواردن و دۆڕاندنی ئەو. "**از گردە کسی کار کشیدن**": ناچارکردنی کەسێك بە ئەنجامدانی کاری سەخت و بۆ قازانجی خۆ. "**بر گردە کسی سوار شدن**": گرتنەدەستی دەسەلّات و ئیختیاری ئەو کەسە و بەقازانجی خۆ کارلێکێشانەوە.

**گردەبان:** بڕوانە:"گردبان".

**گردەبرداری:** بڕوانە:"گرتەبرداری".

**گردەگاە:** جێگەی گورچیلە لە لەش دا.

**گردهمایی:** کۆبوونەوەی بەکۆمەلّ، کۆوەبوون، کۆم بوون، لێك خڕبوونەوە، جڤات، چەپەربەندان.

**گردیدن:** 1) سووڕخواردن، سووڕانەوە، خولانەوە، خول خواردن، خولدان، گەڕیان، دەورلێدان. 2) بوون، چوونە سەر حالّەتیّ، گەڕیان. 3) گەڕان، سەفەرکردن. 4) پیاسەکردن، قەدەم لێدان. 5) گۆڕان. 6) ئاراستە گۆڕین. 7) پشکنین، گەڕان. 8) ڕوو وەرگێڕان. 9) ئاوەژووبوون، وەرگەڕان. 10) دابەش بوون. 11) خزان، خلیسکان.

**گرزش:** گلەیی، سکالّا، شکایەت.

**گرزمان:** 1) ئاسمان. 2) بڕوانە:"عرش". 3) بەهشت.

**گرزیدن:** سکالّاکردن، شکایەت کردن، تۆبەکردن.





**گرست:** ڕەشەمەست.

**گرستگر:** مەستیهێن، سەرخۆشکەر.

**گرستن:** بڕوانە:"گریستن".

**گرسنگی:** برسیەتی، برسیاتی، برسیایەتی، برسێتی، نێزاتی، نێزی، برچێنی، ئاورای، هەورایی، بیّنانی، ورگ بەتالّی.

**گرسنە:** 1) برسی، برچی، نێز، هەورا، ئاورا، ورگ بەتالّ، گێست، دژی تێر. 2) چاوچنۆك، چاونەزێر، بەتەماح.

**گرسنەچشم:** چاوبرسی، چاوچنۆك، تێرنەخۆر.

**گرفت:** 1) گرتن. 2) گیرۆدەیی، گرفتاری. 3) تووش کردن، پێوەکردن، گرفتارکردن. 4) کاریگەری دانان، شوێن دانان. 5) گیرانی مانگ و ڕۆژ. "**گرفتِ خورشید**": ڕۆژگیران، خۆرگیران. "**گرفت گرفتن**": ئیرادگرتن، وردەگرتن. "**گرفتِ ماە**": مانگ گیران. "**گرفت و گیر**": 1) قۆلّبەست کردن و گرتنی ژمارەیەکی زۆر لە خەلّکی، بگرەوبەردە. 2) تێکهەلّچوون، کێشمەکێش. 3) باجگرتن، بەزۆر سەندن، زەوت کردن. 4) (نیگارکێشی) دیمەنی یەکتر پەلاماردانی گیانلەبەران.

**گرفتار:** 1) پێوەبوو، تووشبوو، تووش هاتوو، تووش هاتگ، ئەوق، قەتیس، دەرەتان لیّ بڕاو، گیرخواردوو، گرفتار. 2) دیل، یەخسیر، قۆلّبەست کراو، گیراو، گیریاگ. 3) سەرقالّی کار. 4) تووشبوو بە ماددە بێهۆشکەرەکان. 5) ئاشق، شەیدا. "**گرفتارشدن**": دامێن/داوێن گرتن، پێوەبوون، تووشبوون، تووش هاتن، حاوقان، حەوق بوون، قەتیس مان، گیرۆدەبوون، گرفتاربوون، گیرخواردن، گیرهاتن، گیران، گیریان، دەگیرکەوتن، قۆلّبەست کران.

**گرفتاری:** 1) تەنگوچەلّەمە، گیروگرفتی، گیرۆدەیی، گێرەوکێشە، دەردەسەری، گرفتاری، حەوق، داف. 2) سەرگەرمی، مژولاهی، مەشخەلە، کار، پیشە. 3) لە دەست دانی سەربەستی یان ئاسوودەیی. 4) بەستراوەیی، هۆگری. 5) بڕوانە: "اسارت".

**گرفتگی:** 1) بەستران یان داخرانی شتیّ یان جێیەك، گیریان، کپ بوون. 2) خەمۆکی و خەمباری. 3) چوونەیەك، وێکهاتن، گیران، گیریان. 4) خۆرگیران یان مانگ گیران. "**گرفتگی عضلات**": بە جەمام کەوتن، لەش گیران.

**گرفتن:** 1) گرتن، (لیّ)وەرگرتن، وەرگیران، سەنن، سەندن، ساندن، ئەستاندن، ستاندن، هەستاندن، وەچنگ خستن، خستنە ناودەست، هلانین. 2) بە زۆر زەوت کردن یان بیّبەشکردنی کەسێك لە شتێك. 3) لیّ وەرگرتن، وەرگرتن. 4) خستنە ژێر کاریگەری، ڕاکێش کردن.

5) داگرتن، زاڵبوون. 6) داگیرکردن، خستنە ژێر کۆنترۆڵی خۆوە. 7) وەدەست هێنان، وەدەست خستن. 8) پڕکردن، گرتنەوە، داگرتن. 9) بەکرێگرتن. 10) لێبڕین، لێسەندن. 11) هەڵگرتنەوە یان لەناوبردنی شتی زیادی، کردن(ناخن هایم را گرفتم). 12) دیاریکردن، هەڵبژاردن. ) وادانان، وازانین. 13) زیادکردنی شتێ بەسەر شتێکی دیدا (روی برنج روغن بگیر). 14) کڕین، سەندن. 15) تێگرتن(عکس را قاب گرفتم). 16) دەورەدان، دەورەگرتن. 17) درێژەپێدان. 18) لادان یان دەرهێنانی شتێ لە جێیەك (چادر را از سرش گرفت). 18) داپۆشین. 19) بەستن، گرتن. 20) لەسەرکاردانان، دامەزراندن. 210) تێگەیشتن، سەرلێدەرکردن. 22) فیلم هەڵگرتنەوە یان وێنەگرتن لە کەسێ یان شتێك. 23) گاڵتەپێکردن، تیزپێکردن. 24) کێشان، خایاندن. 25) تێداجێبوونەوە، گرتن. 26) گرفتارکردن. 27) بەڕێوەبردن، ڕێوڕەسم گرتن. 28) کەم کردنەوە. 29) ڕێزێرف کردن. 30) گیرکردن. 31) گیران، بەستران. 32) گیران، گیریان، وێکهاتن، چوونەیەك. 33) سفتەوەبوون. 34) داکردن (باران گرفت). 35) کاریگەربوون، گرتن(نقشەی ما حسابی گرفت).36) وێکەوتن، لێدران (گلوله به بازویش گرفت). 37) تێکچوون یان لە کار جێمان. 38) برەو سەندن. 39) ئاگرگرتن، بڵێسەسەندن. 40) خواردن، خواردنەوە. 41) ژەنین، لێدان. 42) هەڵکردن، پێکردن. 43) بڕوانە: "فروبردن". 44) ئیرادگرتن. **"گرفتن (به قصد ربودن)"**: پڕپیاکردن، پڕدان. **"گرفتن زبان"**: بڕوانە: "لکنت". **"گیرم(گیریم)"**: گریمان، ئەوەهاتو، وامان دانا، گیرام، گرتم. **"به(در) چیزی گرفتن"**: ئاگرتێبەردانی ئەو شتە، سووتاندنی ئەو شتە. **"به خود گرفتن"**: ڕەپاڵ خۆدان. بەخۆوەگرتن. **"به دل گرفتن"**: گرتنە دڵ، دەدڵ ڕاگرتنی ڕك یان قسەیەك. **"خود را گرفتن"**: 1) سفتەوەبوون، خۆگرتن. 2) تووشی خۆپەسندی و لەخۆباییبوون. 3) بەسەر خۆدا زاڵبوون. 4) خۆ بە جیددی نیشان دان و گەرموگوڕ و خۆمانە نەبوون، خۆگرتن. **"در کسی گرفتن"**: تووشی سزادان کردن. **"در میان گرفتن"**: دەورەدان، گرتنەناو. **"کسی یا چیزی را در چیزی گرفتن"**: تێوەپێچان، پێداپۆشین.

**گرفته**: 1) خەمبار، ناڕەحەت. 2) خەمهێن. 3) گیراو، بەستراو. 4) دەنگی خەفە یان گیراو. 5) گرفتار، تووشبوو، گیرۆدە. 6) سەرزەنشت.





**"گرفته زدن"**: 1) سەرزەنشت کردن، تانەلێدان. 2) لاف لێدان، خۆ هەڵشرنگاندن، شاتوشووت کردن.

**گرگ آشتی**: بریتی لە ئاشتی دووڕوویانە.

**گرگ باران دیده**: ساردوگەرم چەشتو، بەئەزموون، گورگی داو دیدە.

**گرگ بند**: بریتی لە گرفتار و یەخسیر و دەس و پێ بەستراو.

**گرگسار**: وەك گورگ، گورگ ئاسا.

**گرگ و میش**: بریتی لە تاریك و ڕوون، تاریك و ڕوونە، تاریك و ڕوونی، تاریك و لێڵ، بەرەبەیان، بوولێڵە.

**گرم**: گەرم، گەرمن، تەوژمی تینی خۆر و ئاگر، دژی سارد. **"گرم بودن"**: گەرم بوون، هەست بە گەرما کردن. **"گرم چیزی(کاری) بودن(شدن)"**: سەرگەرمی ئەو بوون، سەرقاڵی ئەو بوون. **"گرم شدن"**: 1) گەرم بوون، تین تێگەڕان، چوونە سەری پلەی گەرما. 2) حاڵەتی خۆمانە و گەرموگوڕ پەیاکردن. 3) برەوسەندن. 4) حاڵەتی چالاك و کارامە پەیا کردن لە کار دا. 5) شەوق و شادی پەیاکردن. **"گرم شدن بعد از سرما"**: گەرم بوونەوە. **"گرم کردن"**: 1) گەرم کردن، گەرماندن، بردنەسەری پلەی گەرما. 2) برەودان بە شتێك. 3) ئامادەکردنی کەسێك بۆ ئەنجامدانی کارێك. 4) هیوادارکردن. 5) ئامادەکرنی لەش پێش لە ئەنجامدانی کایە. 6) توندترکردنەوە. 7) خێرا و بەپەلە بزاوتن، توند لێخوڕین. 8) تووڕەکردن. 9) شەوق و شادی دان بە کۆڕ. **"گرم گرفتن"**: بە جیددی گرتن. **"با کسی گرم گرفتن"**: دەگەڵ ئەو پێوەندی گەرموگوڕ سازکردن. **"بخار گرم"**: گەرمەبۆق، بۆخی گەرم.

**گرما**: گەرما، گەرمن، تینی خۆر و ئاگر، شەول. **"گرمای گرم"**: زۆر گەرم. **"شدّت گرما"**: گەرمەوزە، گەرمەوەزە، گەرماهی، تین، تەوژمی گەرما.

**گرمابه زدن**: حەمام کردن.

**گرمازدەشدن**: گەرمخان، لەگەرمان وەڕەزبوون، داهێزان، گەرماژۆبوون. **"گرمازدگی"**: گەرماژۆیی، داهێزان لە گەرمان.

**گرماسنج**: گەرم ژمێر، گەرماپێو.

**گرماگرمِ**: 1) لەگەرمەی، لەجەنگەی، لە کوڵەکوڵی. 2) ساردنەبۆوە. 3) بەخێرایی، دەزبەجێ، گورجێ. 4) زۆرگەرم. 5) توند، گرینگ، کاریگەر. 6) بە شەوق و تاسەوە.

**گرمایش**: گەرمکردنەوەی هەوای ناوەوە بینایەکان.

**گرماییشدن**: تووشی گەرماژۆیی بوون.

**گرم تاز**: بەزا، تیژڕەو، خۆشڕەو.

**گرم جوشی**: تێکەڵی و گەرموگوڕی.

**گرمخانه**: 1) شوێنی گەرم، ماڵی گەرم. 2) گوڵخانە.

**گرم خو:** خۆش خولّق، خۆش ئەخلاق.

**گرم خیز:** خۆشڕەو، فرز، چالاك.

**گرم دار:** (گَ) وەشەوق هێن.

**گرم دار:** (گُ) 1) خەمبار، خەفەتبار. 2) خەمخۆر، جگەرسۆز.

**گرم دل:** 1) دڵگەرم، پشت گەرم. 2) دڵدار، ئەویندار، ئاشق.

**گرم دماغ:** مەست، سەرخۆش.

**گرم سری:** 1) خۆشەویستی، دلۆڤانی. 2) بەدمەستی، مەستی و نەڕاندن.

**گرمسیر:** گەرمیان، گەرمێن، گەرمانی، گەرمۆك، وڵاتی گەرم، بەرانبەر بە کوێستان.

**گرمگاه:** کاتی نیوەڕۆ کە هەوا زۆر گەرمە.

**گرمی:** 1) گەرم بوون، گەرمی، گەرمایی، تەوژمی گەرما، تین. 2) خۆمانەییبوون، گەرموگوڕی. 3) خێرایی، پەلە، لەز. 4) تووڕەیی، قەڵسی. **"گرمی بازار"**: بازاڕگەرمی، برەو.

**گرنجار:** بڕوانە:"شالیزار".

**گرو:** 1) گرێو، مەرج، شەرت. 2) مان گرتن، دەس لە کار کێشانەوە. 3) گیرۆدەیی، گرفتاری. **"گرو بردن"**: 1) گرێوبردنەوە، مەرج بردنەوە لە کێ بەرکێدا. 2) کەوتنە بەرۆ، کەوتنە پێشەوە. **"گروبستن"**: گرێوکردن، گرۆکردن، مەرج دانان، مەرج بەستن. **"گروگذاشتن (گذاردن)"**: 1) گرێودانان، دەگرێونان، پەیدانان. 2) لە دەست دان. **"گرو گرفتن"**: وەدەست خستنی شتێ وەك گرێو.

**گروپ:** بڕوانە:"گروە".

**گروس:** برسییەتی.

**گروش:** 1) بڕواهێنان، هۆگری پەیاکردن، ڕووکردن(ە). 2) بڕوا، باوەڕ.

**گروگان:** 1) بارمتە، گرۆ، گرێو، شتێك لە باتی شتێکی تر بە ئەمانەت دانرابێ. 2) دیل، یەخسیر. **"گروگان بستن"**: گرێوکردن، مەرج دانان. **"گروگان گرفتن"**: (بە) بارمتە گرتن. **"بە گروگان"**: لە بەرامبەر.

**گروگانگیری:** بارمتەگرتن.

**گروە:** گروپ، دەستە، کۆمەڵ، جەڵەب. **"گروەگروە"**: کۆمەڵ کۆمەڵ، گروپ گروپ، گوردم گوردی.

**گروهاگروە:** گروپ گروپ، دەستەدەستە.

**گروهان:** کۆی"گروە". لە زاراوەی ئەرتەشدا: گروپێ سەرباز لە 140تا 170 کەس. کۆ، کۆمەڵ.

**گروەبندی:** گروپ بەندی، گروپگروپێن.

**گروەواژە:** کۆمەڵێ واژەگەلی پێکەوە بەستراو و بێ فرمان وەك: زانکۆی ئەدەبیات و زانستە سیاسییەکان.

**گروهە:** گلۆڵە، گولۆڵە، گولۆڵك.

**گرویدن:** 1) ڕووکردن(ە)، بڕواهێنان، باوەڕهێنان، ئیمان هاوردن. 2) پشت ڕاست کردن، تەسێق کردن. 3) بڕوانە: "گراییدن".

**گرویی:** ئەوەی وەك گرێو وەردەگیرێ.





**گرە:** 1) گرێ، بەند. 2) کاری دژوار. 3) بڕوانە: "لکنت". 4) بڕوانە:"عیب". **"گرە از کار کسی کشیدن(بازکردن)"**: چارەسەرکردنی کێشەی ئەو. **"گرە بر آب بستن (زدن)"**: سێحربازیکردن یان بە مەکر و فێڵ کاری زۆر سەخت ئەنجامدان. **"گرە بر(بە) باد زدن"**: 1) کاری پووچ کردن. 2) متمانەکردن و پشت بەستن بە شتی ناپایەدار. **"گرە بستن"**: 1) گرێلێدان. 2) قایم و پتەوکردن. **"گرە خوردن"**: 1) گرێ خواردن، گرێ دران. 2) دەگەڵ کێشە ڕووبەڕووبوون. 3) پێوەنددران. 4) گیرخواردن. 5) لێکدران، یەکگرتنەوە. **"گرە در دل گرفتن"**: ناڕەحەت بوون، خەمباربوون. **"گرە زدن"**: 1) گرێدان، توند لێك بەستن. 2) پێوەند دان. **"گرە کردن ابرو"**: لچ و لێو گرژ کردن، ڕووگرژ کردن، ڕوو ترش کردن، مڕومۆچ بوون. **"گرەکور"**: گرێپووچکە، گریکوێرە، گریکۆرە، گرێشك، گریکوتك، لکەکۆرە، لکەکۆرێ، گرفنج، دوگون. 2) کاری زۆر دژوار و چارەهەڵنەگر. **"گرە(بر)گشودن"**: 1) کردنەوەی گرێ. 2) چارەسەرکردن و یەکالاکردنی کێشەیەك.

**گرە پیشانی:** ڕووگرژ، ڕووترش، ڕووتاڵ، ڕوودرژ، خوێنتاڵ، ناوچەوان ترش، ناوچەوان دێز، نمرچ، مۆن.

**گرەگاە:** خاڵە هەستیار و گرفت سازەکانی کارێ یان بابەتێ.

**گرەگشا:** گریکەرەوە، ئاسانکەرەوە، تێگیراوی ڕەوێنەوە.

**گرەگولە:** 1) هەرشتێکی خڕ و بەشکڵی گلۆڵە دەرهاتو. 2) قیتاییە ناڕێکەکانی سەر شتێك.

**گرەگیر:** 1) ڕاوەستاو، قایم. 2) بە چین و گنج.

**گرهە:** بڕوانە:"گروهە".

**گری:** پێوانە، کیلە.

**گریان:** لە حاڵی فرمێسك هەڵوەراندندا، ئاو لە چاو هاتنەخوار، گریان. **"گریان شدن"**: وەگریان کەوتن، گریان.

**گریاندن:** وەگریان خستن، گریاندن، گریانن، گیراندن.

**گریبان:** بەرو، بەرۆك، پێسیر، سوکر، یەخە، یاخە. "گریبان چاك زدن(کردن)": یەخە دڕاندن. **"گریبان خود را رهاندن(خلاص کردن)"**: خۆ ڕزگار کردن. **"گریبان رهاکردن"**: بەرۆك بەردان، لەکۆڵ کەوتن، دەڤ ژێبەردان. **"گریبان کسی را گرفتن"**: 1) یەخەی ئەو گرتن بۆ دەگژڕاچوون. 2) تووش کردنی ئەو، گرفتار کردنی ئەو. 3) خستنە ژێر ڕکێفی خۆوە. **"گریبان گرفتن"**: بەرۆك گرتن، تەشقەڵەپێکردن، شەڕپێفرۆشتن، گەڕتێ هاڵاندن.

**گریبان گیر:** داوێنگیر، دامێنگیر، تووش هاتوو، یەخەگر، بەرۆك گر. **"گریبانگیر کسی شدن"**: 1) داوێنگیری ئەو بوون، ئەو تووشکردن، گیرۆدەکردنی ئەو. 2) خستنە ژێر ڕکێفی خۆوە.

**گرییانگیری:** یەخەگرتن، بەرۆك گرتن، کێشە تێ هاڵاندن.

**گرییاژکردن:** گرییاچ کردن، تیامان.

**گریختگاە:** بڕوانە:"مخفیگاە".

**گریختن:** هەڕاکردن، ڕاکردن، دەرچوون، خۆڕاپسکان، خۆڕاپسکاندن. "**گریختن در کسی(چیزی)**": پەنابردنە بەر ئەو.

**گریز:** 1) دەرچوون، ڕاکردن، هەڵاتن. 2) ڕزگاری، خەلاسی. "**گریز ازمرکز**": ناوەندبێز، ناوەندبەزێن. "**گریز زدن**": 1) کاتی ئاخاوتن یان نووسین لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی تر بازدان. 2) چوونە جێیەك.

**گریزآمیز:** بازدەرانە، دەربازکەرانە.

**گریزاگریز:** ڕاکردن بەبێ ماتڵی و پشوو.

**گریزان:** 1) لە حاڵی هەڵاتن دا، هەڵاتوو، دەرچوو. 2) دووریکەرڤ، بێزار، تەوەلا، ڕەویو.

**گریزاندن:** 1) دەرچواندن، ناچار بە هەڵاتن کردن، ڕەتاندن. 2) قاچاخ کردن.

**گریزپا:** 1) واپۆك، ڕەمۆك، قوشقی و سڵ، کەسێك کە زوو لە بەرامبەر کەسێ یان شتێکا دەربچێ. 2) تێژتێپەڕ. 3) ناجێگیر، خۆڕانەگر، نابەردەوام.

**گریزجویانە:** بڕوانە:"گریزآمیز".

**گریزش:** هەڵاتن، ڕاکردن.

**گریزگاە:** ویستە، دەرەتان، ڕێگەی دەرچوون، شوێنی هەڵاتن.

**گریزگر:** خۆبەدەستەوەنەدەر، خۆدەربازکەر، بازدەر.

**گریزگری:** دەرچوون لەژێر باری کارێ یان بەرپرسیارییەتییەك، خۆدزینەوە لە شتێ یان لە کارێ، خۆپەڕاندنەوە، درێخیکردنی بەئانقەست.

**گریزناپذیر:** بێ دەرەتان، بێ دەرچوون، بێ دەربازبوون.

**گریزندە:** 1) هەڵاتو، ڕاکردو. 2) تیژتێپەڕ. 3) ترسەنۆك.

**گریستن:** 1) گرین، گریکرن، گریان، گیران، گیریان، گیرین، گرەوای، ئاو لەچاو هاتن لە خەفەتان، ئەسرین ڕشتن. 2) باران بارین، بارین.

**گریسنگ:** قووڵکە.

**گریسە:** تەگبیر، فێڵ.

**گریسیدن:** مەرایی، زمان لووسی، ماستاوکردن.

**گریغ:** هەڵاتن، ڕاکردن.

**گریو:** بڕوانە:"گردنە".

**گریوان:** بڕوانە:"گریبان".

**گریە:** گریان، گرین، گری، گریوە، گیریست. "**گریە شدید**": کوڵیگری(ان)، قوڵپی گریان. "**گریە...گرفتن**": وەگریان کەوتن. "**گریە گرفتن ازکسی**": وەگریان خستن. "**گریە و زاری**": گریان و ناڵە، گریان و ناڵین، گریان و دەردەدڵ کردن، گریە و گۆ، ژاری. "**بە گریە افتادن**": وەگریان کەوتن، گرین. "**بە گریە انداختن**": گریاندن،





گیراندن، وەگریان خستن. "**زیر گریە زدن**": لە قوڵپەی گریان دان.

**گریەای:** 1) گریاناوی. 2) گرۆك، گرینۆك.

**گریەرو:** بڕوانە:"گریەئو".

**گریەئو:** گرینۆك، گرۆك، قەرەزاخ، قەرەقاژر، کەسێ کە زۆر دەگری.

**گرییدن:** بڕوانە:"گریستن".

**گز:** یەکەی پێوان بەرامبەر بە 104 سانت. "**گز کردن**": ڕێ ڕۆیشتن بەپێ، پێوانی ڕێگەیەك، پیادەڕەویکردن. "**گز نکردە پارە کردن**": نەهزراو/هەڵنەسەنگێنراو ئەنجامدان.

**گزاردن:** 1) بەجێهێنان، ئەنجامدان، جێبەجیکردن. 2) دان، دانەوە. 3) گەیاندن. 4) شیکردنەوە. 5) شرۆڤەکردن. 6) لێکدانەوە، ڕاڤەکردن. 7) وەرگێڕان. 8) بڕوانە: "طراحي کردن".

**گزارش:** 1) ڕاپۆرت، خەبەردان، جوڕەنان، شیکردنەوە و لێکدانەوەی هەواڵ یان کارێ کە ئەنجام بووە. 2) شڕۆڤە، پایژی، وەرزین. 3) بەجێهێنانی هەقی شتێك. 4) وێنەی سەرەتایی یان فۆڕمی گشتی شتێ کە بە خەتی کەمڕەنگ دەیکێشنەوە. "**گزارش چیزی را دادن**": ڕاپۆرت دانەوە، بەتێروتەسەلی شیکردنەوە. "**گزارش دادن**": ڕاپۆرت دان، خەبەردان، ئاگادارکردنەوە. "**گزارش کتبی**": گرێبەند، ڕاپۆرت بە نووسراوە. "**گزارش کردن**": 1) خەبەردان، ئاگادارکردن. 2) لێکدانەوە، شیکردنەوە، ڕوونکردنەوە. 3) شرۆڤەکردنی خەو. 4) نەخش سازکردن لەسەر شتێکا، نەخشەکێشانەوە.

**گزارشگر:** 1) هەواڵدەر، هەواڵنێر، پەیامنێر، ڕاپۆرتچی، ڕێپۆرتەر. 2) مێژووزان. 3) شرۆڤەکەر، لێکدەرەوە. 4) پلان داڕێژ، بەرنامەداڕێژ.

**گزارشن:** شرۆ، شرۆڤە، خەولێکدانەوە.

**گزارندە:** جێبەجیکەر، بەجێهێنەر.

**گزارە:** 1) خەبەرێك کە دەربارەی "مسندالیە" ی ڕستەوە دەدرێ. 2) ڕاڤەکاری، لێکدانەوە، شیکردنەوە و مانالێکدانەوەی پرس یان مەسەلەیەك.

**گزاریدن:** بڕوانە:"گزاردن".

**گزاف/گزافە:** 1) درۆیهەڵبەستە، شاتوشووت، شووت، شووتە. 2) بێ حەساو، بێسنوور، زۆر. 3) بێهوودە، بێهۆ. 4) گۆترەیی، بەگۆترە، نەکێشراو.

**گزافکار:** پێوەنەر، بافیشکار، زێدەڕۆ و سنوور بەزێن.

**گزافگو:** فیشاڵباز، فیشاڵچی، هاشەکەر، بەشات و شووت، چەنەبازی قسە بێتام، چەڵتەباز.

**گزافگویی:** درێژدادڕی، زۆربێژی، چەنەلێدان، پێوەنان، شاتوشوت کردن، خۆهەڵشرنگاندن، خۆهەڵنان.

**گزایان:** ئازارهێن، ئێش هێن.

**گزایش:** گەزتن، ئازاردان.

**گزاییدن:** گەستن، پێوەدان، ئازار پێگەیاندن.

**گزران:** بەئازادی، بەسەربەستی.

**گزرد:** چارە، دەرمان.

**گزردن:** بڕوانە:"گزیردن".

**گزش:** 1) گاز گرتن، پێوەدان. 2) گەزتران، پێوەدران.

**گزك:** 1) چێژ، تام. 2) هەل و کاتی لەبار بۆ ئەنجامدانی کارێك. 3) سەرما، سەرمابردوو. 4) نۆبەی ئاو لە زرعاتدا. **"گزك (به) دست كسی دادن"**: بیانوو دانە دەست ئەو.

**گزمه:** کێشکچی شەوانە.

**گزند:** وەزەنگ، پێوەر، ئازار، بەلا و دەرد و زیان، پەتا، چاوەزار. **"گزند آمدن"**: ئێش و ئازار پێگەیشتن، ئازاردران.

**گزندنا پذیر:** پارێزراو، بەباشی ڕاگیراو.

**گزیت:** بڕوانە:"جزیه".

**گزیدن:** (گَ.زِ.دَ) 1) گەستن، گازگرتن، بەددان گرتن، پێوەدان. 2) ئازاردان، ئازارپێگەیاندن. **"گزنده"**: 1) پێوەدەر، گەزە، گەزەك، گازگر، بوونەوەری چز و بەژەهر، گیانلەبەری ژەهردار. 2) زۆر ئازاردەر(سرمای گزنده). 4) تیژ و توون(طعم گزنده). 5) بوونەوەری مزیر کە توانای گەزتنی هەیە. **"گزیده"**: پێوەدراو، گەستراو، قەپ لێگیراو.

**گزیدن:** (گُ.زِ.دَ) 1) هەڵبژاردن، بژاردن، دانەبژێرکردن، پەسندکردن و جیاکردنەوەی شتێ یان کەسێك لە نێوان چەند شت یان چەند کەس دا. 2) بەجێهێنان، کردن. 3) ناسینەوە، جیاکردنەوە. **"گزیننده"**: هەڵبژێر، هەڵبژێن. **"گزیده"**: 1) بژاردە، هەڵبژاردە، هەڵبژێراو، پەسندکراو، نەقاندی. 2) بەنرخ و گرانبایی. **"گزیدەکردن"**: بڕوانە:"برگزیدن". **"كسی (چیزی) را بر دیگری گزیدن"**: لەسەرترداناني ئەو، بەسەردا پتر کردن.

**گزیدەگو(ی):** دەماوەر، قسەڕەوان، بەدەم و پل، لەبلەبان.

**گزیر:** چارە، چارەسەر، دەرمان. **"گزیر نبودن از كسی (چیزی)"**: زۆر ئاتاجی ئەوبوون و چارەنەبوون لە قبووڵ کردن یان هەبوونی ئەو.

**گزیردن:** 1) چارەکردن، چارەسەرکردن، تیمارکردن. 2) دۆزینەوەی ڕێگەچارە بۆ دەربازبوون لە بارودۆخێکی نالەبار.

**گزین:** 1) زۆر باش، پەسندکراو. 2) هەڵبژێراو لەباری باشییەوە. 3) بەنرخ و گرانبایی. 4) کەسی هەڵکەوتە و مەزن.

**گزینش:** 1) هەڵبژاردن، قبووڵ کردن. 2) تاوتویکردنی شیاوی و لێهاتوویی خوازیارانی دامەزران لە دەزگا دەوڵەتییەکان یان ئەوانەی دەچنە زانکۆکان، هەڵاواردن، هەڵوەژاردن، تەتەڵەکردن، لە بێژنگدان.

**گزینشگر:** هەڵوەژێر.

**گزینگر:** 1) هەڵبژێر، هەڵوەژێر. 2) دەنگدەر.





**گزینه:** 1) خاڵ، هەرکام لە وڵامە شیمانەییەکانی ئەزموونی تێستی. 2) بژێرە، بەربژار، بەربژێر. 3) هەڵبژێراو، بژێراو (گزینه ادب فارسی). 4) ئاڵترناتیو، بەدیل، جێگرەوە. 5) کەسی هەڵکەوتە و بەرچاو.

**گساردن:** 1) خواردن(ەوە)، مەی خواردنەوە، خەم خواردن. 2) ئاو بە دەستی کەسێك دا کردن. 3) گێڕاندن. 4) سڕینەوە، پاك کردنەوە. 5) لابران، وەلانران.

**گساردن:** تێپەڕاندن، پێوان.

**گسارگر:** بڕوانە: "مصرف كننده".

**گست:** 1) ناحەز، ناشیرین. 2) کەسی چەپەڵ و دەروون پیس.

**گستاخ:** 1) چاونەترس، دەل، بوێر، دەم سوور. 2) بێشەرم و حەیا، شەرم نەکەر، دەلوقەل، ڕیلاس، ڕووقایم، ڕووداماڵیاگ، ڕووهەڵماڵراو، بێ ئەدەب. 3) بێ شەرمانە، بێئەدەبانە. 4) گەرموگوڕ و خۆمانەیی. 5) ڕەپ و ڕاست، ڕاست و ڕەوان، بەئاشکرا.

**گستاخی:** نەترسی، بوێری، سرتی. 2) بێ شەرمی، بێ چاوەڕوویی، بێ ئەدەبی. 3) هۆگری، دۆستایەتی گەرم.

**گستراندن/گسترانیدن:** پان کردنەوەی ڕایەخ، ڕاخستن، فەڕش کردن.

**گستران گر:** پەرەپێدەر.

**گستردگی:** بەربڵاوی، بەرفراوانی.

**گستردن:** 1) ڕاخستن، ڕاخران، داخستن، داکێشان، پان کردنەوەی ڕایەخ. 2) لە تەنیشت یەکەوە هەڵچنین. 3) پەخش کردنەوە، بڵاوکردنەوە. 4) پەرەپێدان، باوکردن. 5) دانان، دانیان. 6) بڵاوکردنەوە، پڕژاندن، وەشاندن. 7) بڵاوبوونەوە، هەمووڵاداگرتن.

**گستردنی:** ئەوەی بۆ ڕاخستن لەسەر زەوی بێ وەك: ڕایەخ و فەڕش و هتد.

**گسترده:** 1) ڕاخراو، داخراو، فەڕش کراو. 2) بەربڵاو، بەرین، بەرفرە. **"گستردەشدن"**: 1) ڕاخران، داخران، پان کرانەوەی ڕایەخ لەسەر زەوی. 2) بڵاوبوونەوە، پەرەگرتن.

**گستردەاندیش:** لیبڕاڵ، ئازادبیر، بیرفراوان.

**گسترش:** 1) پەرەپێدان، برەوپێدان. 2) پەرەسەندن، پەرەگرتن، پەلوپۆهاویشتن، بڵاوبوونەوە. 3) هەرجۆرە ڕایەخێك. **"گسترش دادن"**: پەرەپێدان. برەوپێدان. **"گسترش یافتن"**: پەرەسەندن، بڵاوبوونەوە. برەوسەندن.

**گسترش وری:** پەرەپێدەری.

**گسترنده:** 1) ڕاخەر. 2) پەرەپێدەر، بڵاوکەرەوە.

**گستره:** پانتایی، کەشی بەربڵاو و کراوە. ڕووی تەخت و بەرین.

**گسته:** 1) ناحەز، دزێو. 2) تەرسەقول.

**گسستگی:** لێك ترازان، لێك پچڕان، لەبەریەك بران، لەبەریەك چوون، پسان، وەرسان.

**گسستگی‌ناپذیر:** لەپسان نەهاتوو، نەپسێن، بێپسان.

**گسستن:** 1) (لێك)پچڕان، پچڕین، چڕین، بچڕان، بچڕیان، پسان، پساندن، قرتان، قرتیان، قرتاندن، قەتاندن، قەتیان، کەڕاندن، وەرساندن، بزدان، چڕین، نسلین، هەڵپچڕکان، بڕان، بڕین، (لێك) جیاکردنەوە. 2) بڕوانە:"پراکندن". 3) شکاندن و وێران کردن. 4) کۆتایی هاتن، بەکۆتایی گەیشتن. 5) تێکشکان و کەوتنەخوارەوە. 6) لەناوبردن. 7) لەبەر ماندوویی و شەکەتی زۆر لەخۆچوون و لەدەست دانی هێز و توانانی خۆ. **"دوبارە گسستن"**: پسانەوە، پچڕانەوە.

**گسستە:** 1) بڕاو، پچڕاو، پچڕیاگ، پچڕپچڕ، پساو، وەرسایی. 2) بەبێ پێوەندی و بەردەوامی. 3) جیابۆوە، دوور خراوە. 4) لەبەر شەکەتی لەخۆچوو، هێز و تابشت لەدەست داو.

**گسستەخرد:** نەزان، کەم ئاوەز.

**گسستەدل:** ڕەنجاو، دڵ ئێشاو، دڵشکاو.

**گسستەدم:** تووشی نەخۆشی تەنگەنەفەسی بوو.

**گسستەروان:** خەمبار، خەفەتبار، نیگەران.

**گسستەعنان:** هەوسارپچڕاو، سەرکێش.

**گسلاندن/گسلانیدن:** پچڕاندن، پچڕانن، هەڵپچکڕاندن، بزداندن، قرتاندن، پساندن، پسانن، لەبەریەك بردن، هەڵ وەشاندن، هل شاندن. (لێك)جیاکردنەوە.

**گسلندە:** پچڕێن، پسێن، قەتێن.

**گسلیدن:** 1) پچڕاندن، پساندن. 2) جیاکردنەوە. 3) پێوان، بڕین. 4) پچڕان، پسان. 5) جیابوونەوە. 6) پچڕان و درێژەنەکێشان. 7) شکان، شکیان. 8) تەواوبوون، یەکلابوونەوە. **"گسلیدن از کسی(چیزی)"**: تەرك کردنی ئەو، پێوەندی پسان لەگەڵ ئەو. **"از هم گسلیدن"**: پچڕان یان پسان، لێك هەڵوەشان، لەبەریەك هەڵوەشان، لەبەریەك هەڵتەکان.

**گسنە:** بڕوانە:"گرسنە".

**گسی:** بڕوانە: "گسیل".

**گسیختگی:** پارچەپارچەیی، لێك ترازاوی، لێك پچڕاوی، نابەردەوامی.

**گسیختن:** 1) پچڕان، پسان، قرتیان. 2) شکان، وردبوون. **"ازهم گسیختن"**: لەبەریەك چوون، لەبەریەك هەڵوەشان.

**گسیل:** 1) ڕەوانە، نێردراو، فڕێ. 2) (فیزیك) کردە یان پڕۆسەی پەخش بوونەوە. **"گسیل کردن/گسیل داشتن"**: ناردن، ڕەوانەکردن.

**گسیلیدن:** جیاکردنەوە، پچڕاندن.

**گشاد:** 1) داهۆڕ، هەراو، دەڵپ، دەڵب، زڕ، زڕت، ڕەهندە، ڕەهەندە، خل، بڵاو، گوشاد، فت، فرت، فرەه، ڤرت، فۆل، فش، بەرانبەری تەسك. 2) دوور و درێژ، تێروتەسەل. 3) تەمبەڵ، قوون گران. 4) کرانەوە، ئاوەڵەبوون. 5) کردنەوە، ئاوەڵەکردن. 6) چارەسەرکردنی دژواری. 7) ڕووخۆشی. 8) دڵخۆشی، شادمانی.





**"گشاد جبین"**: ڕووخۆش، ڕووگەش. **"گشاد دادن"**: دانانی مۆرە بە تاك لە تەختەنەرددا. تەقەکردن، هاویشتن، پێوەنان. **"گشاد شدن"**: فرت بوون، فشبوون، فلبوون، خل بوونەوە، هەراوبوون(ەوە)، بەرین بوونەوە، لێك ڕەوینەوە، کرانەوە. **"گشاد کردن"**: فش کردن، گوشادکردن، فرەوان کردن، هەراوکردنەوە، بەرین کردن(ەوە). خۆشحاڵی دەربڕین، شادیکردن. **"گشاد یافتن"**: هاوێژران، خستران. **"بسیارگشاد"**: دەڵپ و داهۆڕ، دەڵپ و دۆپ، فرەهەراو.

**گشادبازی:** دەس بڵاوی، ماڵ بە خۆرایی خەرج کردن، باش و بۆشی، هەڵەخەرجی، چەنگ لفە، خۆبەردان. 2) گەللایی، لاساری، بێگەڤی، بێسەرەوبەرەیی.

**گشادگی:** 1) هەراوی، بەرفرەهی، پانوبەرینی. 2) کرانەوە، پەیابوونی ڕێگەچارەیەك بۆ کێشەکان. 3) ڕووخۆشی، ڕووگەشی. 4) خۆشی، شادمانی. 5) فرەیی، زۆری نێعمەت. 6) دووری، جیایی. 7) شوێنی بەتاڵ، فەزا. **"گشادگی دست"**: بڕوانە: "سخاوت".

**گشادن:** 1) کردنەوە، ئاوەڵاکردن، واڵاکردن، واکرن. 2) گرتن، داگیرکردن. 3) ڕۆژووکردنەوە، بەربانگ کردنەوە. 4) داکەندن، دەرهاوردن. 5) خستن، فڕێدان. 6) ڕەوان بوون، ڕەوان کردن. 7) ئازادکردن. 8) کردنەوە، دامەزراندن. 9) ئاشکراکردن، خویاکردن. 10) لابردن یان لابران، چاك کردنەوە یان چاك بوونەوە. 11) وڵامدانەوەی مەتەڵ و شتیوا. 12) یەکلاکردنەوە، بە کۆتایی گەیاندن. 13) لەناوبردن، تێکدان. 14) جیابوونەوە، هاتنەدەر. 15) لاچوون، چوونەلاوە، هەلاکەوتن. 16) بەرهەمهاتن، ئاکام لێوەرگرتن. 17) یەکلابوونەوە، کرانەوە، دروست بوون. 18) ڕەوینەوەی تارمایی ڕۆژ یان مانگ گیران. **"گشادن چهر"**: ڕووی خۆش نیشان دان.

**گشادنامە:** نامەی سەرئاوەڵە. بڕیار، دەستوور. ناوی کتێب یان نامە، پێشەکی کتێب.

**گشادە:** 1) ئاواڵە، واڵا، کریاوە. 2) بەخشندە، دایندە. 3) ساف، پاك، بەبێ فرتوفێڵ. 4) ئاشکرا و ڕەپ و ڕاست. 5) بڕاو. 6) ئازاد، بەبیکۆتوبەند. **"گشادەشدن"**: 1) کرانەوە، ئاوەڵەبوون. 2) شادبوون، دڵخۆش بوون. 3) بڕان. 4) ئازادبوون.

**گشادەبنان:** دایندە، بەدڵ، دڵاوا، بەخشندە.

**گشادەپیشانی:** ڕووگەش، ڕووگەش.

**گشادەدست:** دڵاوا، بەخشندە.

**گشادەدل:** دڵاوا، دلڤال، دلڤەکری. شاد، خۆشحاڵ.

**گشادەرو:** دەم بەپێکەنین، ڕووخۆش، ڕووگەش، ڕوولکەن.

**گشادەزبان:** قسەڕەوان زمان پاراو، گفت و لفت خۆش، شەکرلێو، قسەخۆش.
**گشادە طبع:** ڕووخۆش، خۆش ئەخلاق.
**گشادەکار:** ئەوەی لە ئەنجامدانی کارێکا بوێری بەخەرج بدا و لەئەستۆی بێ.
**گشادی:** هەراوی، پان و بەرینی، پانایی، بەرینایی، هەرایەی.
**گشامار:** برسی بوون، برسێتی.
**گشایش:** 1) کرانەوە، ئاوەڵابوون، ڤەبوون. 2) چارەسەربوون، یەکلابوونەوە، هاتنەدی دۆخێکی باشتر. 3) بەربڵاوی. 4) بڕوانە: "وسعت". 5) گرتن، داگیرکردن. "**گشایش دادن**": نێعمەت دان، دابین کردنی ژیانی باشتر.
**گشایندە:** وازکەر، واکەر، واڵاکەر، ئاوەڵەکەر، کەرەوە.
**گشاییدن:** بڕوانە: "گشودن".
**گشت:** 1) گەڕان، گەڕیان، گێڵان، گێڵای، گێڵە، گەشت، سەیرانکردن، بایبالدان. 2) گۆڕان، گۆڕانکاری. 3) چوونە سەفەری گروپێك کە لەودا سەردانی شوێنی جۆراوجۆر دەکەن، تۆڕ. "**گشت بر گشت**": پێچاوپێچ. "**گشت زدن**": 1) گەشت لێدان، هاتوچۆکردن لە شوێنێکی دیاریکراودا. 2) بڕوانە: "گشت کردن". "**گشت و گذار**": گەڕان و سەیران.
**گشتا:** بەهشت.
**گشتن:** 1) خولانەوە، گەڕان، گەڕدان، دەورلێدان، تواشاکردن، سەیرکردن. 2) بوون، چوونە سەر حاڵەتێ. 3) گەڕانەوە، ڤەگەڕیان. 4) لەرێکلابوون، لەرێ دەرچوون. 5) وازهێنان. 6) ڕاگواستران، گەیشتن.
**گشتەسر:** سەرگەردان، سەرلێشێواو.
**گشن:** (گَ) 1) زۆر، فرە، پڕایی، چڕی. 2) قەڵەو، باهۆدار، کەڵین.
**گشن:** (گُ) 1) نێر، ئاژەڵی نێر. 2) بڕوانە: "لقاح". "**گشن دادن**": لێ چاك کردن، کەڵدان، چێڵ لە کەڵ کێشان، گادان، فالگرتن. "**گشن کردن**": پڕبارکردن، بەبەرکردن. "**گشن گرفتن**": زکپڕبون، ئاوس بوون.
**گشنامار:** برسیبوون، برسێتی.
**گشن پذیری:** بەپیت و بەرەکەتی، پڕباری.
**گشن سار:** چڕ، فراوان.
**گشنگی:** بڕوانە: "گرسنگی".
**گشن گیری:** جووتگیری، جووت بوونی ئاژەڵی نێرومێ.
**گشنە:** بڕوانە: "گرسنە".
**گشنی:** جووت گیری، جووت بوونی نێر و مێ بۆ زاوزێ.
**گشودگی:** ئاوەڵابوون، کراوەیی.
**گشودن:** کردنەوە، واڵاکرن، ئاوەڵاکردن.
**گشودە:** ئاواڵە، ڤالا، وەکری، کراوە، ڤەکری.
**گشودەشدن:** کرانەوە، ڤەبوون.





**گفت:** 1) گوتە، ئاخاوتە. 2) قسەکردن، ئاخاوتن. "**گفت و پرس**": گفتوگۆ، پرسیار و وڵام. "**گفت و شنود**": وتن و بیستن، پەیڤین.گفتوگۆ، دیالۆگ. "**گفت و کرد(گفت و قدم)**": گوتار و کردار، قسەکردن و جێبەجێکردن. "**گفت و واگو**": باس و گفتوگۆ، دەمەقاڵە، مشتومڕ.
**گفت آورد/گفتاورد:** بڕوانە: "نقل قول".
**گفتار:** 1) ئاخافتن، قسەکردن. 2) گۆتی، گوتە، وتە، گوتار، وتار، پەیڤ، بێژە، وێژە، قسە، قسیە. 3) بەش، پار.
**گفتاری:** 1) گوتاری، گوتەیی. 2) بڕوانە: "حرّاف".
**گفت شناس:** ڕێزمان، سێنتاکس.
**گفتگو:** 1) قسەکردن دە گەڵ یەکدی، پەیڤین، گفتوگۆ، ئاخافتن، باسکردن، وتووێژ، واتەی. 2) بەدگۆیی، ئیرادگیری.
**گفتمان:** ئاخێو، باس و گفتوگۆ، دیسکۆرس، گوتار. "**گفتمان غالب**": ئاخێوی زاڵ.
**گفتن:** 1) دوان، گوتن، وتن، قسەکردن، ئاخافتن، بێژتن، پەیڤین. 2) دەربڕین، ئاشکراکردن. 3) ناونان، ناولەسەنان. 4) لێگێڕانەوە، داوەتکردن. 5) هۆنینەوە. 6) زانین، پەیبردن، تێگەیشتن. 7) ئاگاداریدان، ڕاگەیاندن. 8) باوبوون. "**گفتن نداشتن**": ئاشکرابوون، بەڵگەنەویستن. بۆ گوتن نەشیان. "**کسی را گفتن**": متمانەپێکردن بەو و بە پشتیوانی خۆدانان.
**گفتنی:** گوتەنی، گۆتەنی، واتەنی، شیاوی گوتن، بۆ وتن.
**گفتە:** 1) گوتە، ئاخاوتە. 2) گوتراو، هۆنراو.
**گل:** (گَ) بەشی سەرەوەی شتێ. "**گلِ**": 1) سەرەوەی. 2) بەدەوری. "**گل (و) گشاد**": 1) دەڵپ و ناقۆڵا. 2) پان و بەرین، بەرفرە. "**گل و گل**": کاتی نزیکبوونەوەی زایین. "**گل هم انداختن**": خستنە پشت یەك یان سەریەك. "**گل هم کردن**": لەتەنیشت یەك دانان. ئەنجامدانی کارێك بەکەمتەرخەمی و بێ بیر لێکردنەوە. "**از گل هم برآمدن**": توانای بەربەرەکانی دەگەڵ یەك هەبوون، بەیەکتر وەستان.
**گل:** (گُ) 1) گوڵ، خونچەی پشکوتوو. 2) بەشی باش و بەڕمێنی هەر شتێك. 3) پۆلوو، سکڵ، بڵێسە. 4) خۆشەویست، دۆست. 5) لەبەردڵان، خوێن شیرین. 6) دەموچاوی جوان. 7) ئاکام. "**گل آتش**": ڕەژی سوورەوەبوو. "**گل از گل کسی شکفتن(بازشدن)**": زۆر خۆشحاڵ بوونی ئەو. "**گل از گل کسی نشکفتن**": لاوبوونی ئەو، لە سەرەتای لاوێتی ئەو دابوون. "**گل اطلسی**": گوڵی شەیپووری، گولبۆری. "**گل انداختن**": 1) بەتەواوی سووربوونەوەی ڕەژی. 2) سوور هەڵگەڕان. 3) گوڵ کردن.

4) بلۆق کردن. **"گل بابونه"**: گوڵەچاوێشە. **"گل تاج خروس"**: پۆپەکەڵەشێرە، گول مەخموور. **"گل چیدن"**: گوڵ چنین. بەهرەگیرهێنان. **"گل حسرت"**: گوڵەپاییزە، گولاپاییزێ. **"گل ختمی"**: گوڵەهێرۆ. **"گل داودی"**: گیامێش. **"گل دختری را چیدن"**: دەگەڵ ئەو هاوجێ بوون و پەردەی کچێنی لابردن. **"گلِ رنگ"**: بڕوانە:"کاجیرە". **"گل سرنگون"**: گوڵی شلێرە، گولاپێخەمبەر. **"گل کردن"**: 1) گوڵ کردن، گوڵ دان. 2) سووربوونەوە، سوورهەڵگەڕان. 3) برەو پەیاکردن، بوونە جێی سەرنج. 4) بڕوانە:"شکوفا شدن". **"گل گاوزبان"**: زوانەگا، گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ. **"گل ماهوتی/گل ماهور"**: گول بهار. **"گل محمدی"**: گوڵەباغ، گوڵی گوڵاو، گولاسوور. **"گل میخك"**: گوڵمێخەك. **"گلنار"**: گوڵەنار.

**گل آلود**: (گِ) لیخن و پڕلم و لیتە، قوڕاو(ی)، حەڕی پێوەنووساو.

**گل آذین**: (گُ) لە زارەوەی ڕوەك ناسیدا: شێوەی جێگرتنی گوڵ لە سەر چڵ و لکەکان.

**گلاب**: گوڵاو، گولاڤ.

**گلاب پاش**: گوڵاوپاش، گوڵاوپژێن.

**گلابتون**: گوڵاواتون، گوڵاباتون، گوڵاوەتون.

**گلابدان**: گوڵادان، دەفری گوڵاو.

**گلابگیر**: گوڵاوگر. **"گلابگیری"**: گوڵاوگرتن.

**گلابه**: (گِ) قوڕ و لیتە.

**گل افشان**: 1) پڕژێن یان داوەرێنی گوڵ. 2) بڕوانە:"فروزان".

**گلاند**: (پزیشکی) ڕژێنە.

**گل اندام**: (گُ) لەش ناسك، کەسێ کە لەشێکی نەرم و ناسکی وەك گەڵای گوڵ هەیە. ناوێکی ژنانەیە.

**گلاندن**: (گَ) ڕاوەشاندن، وەراندن، تەکان دانی دار.

**گل اندود**: (گِ) سواخ، سواغ، سواق، حەڕی پیامالێن، قوڕتێهەڵسوونی بان و دیوار. **"گل اندود کردن"**: سواخ دان، سواغ کێشان، قوڕساوین بە دیوارا، حەڕی مالێن بە دیوار و خانوودا.

**گلاویز**: (گَ) ئاوقا، بەرەنگار، ئامباز، لەگژ، بە تەوژم دەستەملان بوون، تێك هالانی دوو زیندوو، دەباوەش گرتن، هەلباسك. **"گلاویزشدن"**: ئامبازبوون، ئاوقابوون، تێکەوەگلان، ڕژانەیەك، ڕژیانەیەك، ڤەگەڤزاندن، مل دەبەرملنان، نیشتنەمل، دەسەویەخەبوون، بچەنگانێ، بەرەنگاری، بەژگ داهاتن، بەگژاپەڕین، بەگژا(یەکدا)چوون، بەگژاهاتن، بەگژداهاتن، دەگژڕاچوون، پێك هەڵپڕژان، پێکاچوون، پێك وەربوون، تێك هەڵچوون، شەڕپێ فرۆشتن، کەتن هەڤ، چنگاوەش، چنگەپرچێ.

**گلایه**: (گِ) گلەیی، گلێیی، گلی، گازن، گازندە، سکاڵا.





**گل باران**: گوڵباران، گوڵ هەڵاویشتن بەسەر کەسی خۆشەویست دا.

**گلبام**: (گُ) بڕوانە: "گلبانگ".

**گلبانگ**: (گُ) دەنگی بەرز، ئاوازی ڕەسا. **"گلبانگ بر قدم زدن"**: بەپەلە ڕۆیشتن. **"گلبانگ مسلمانی"**: بانگ.

**گل بدن**: خاوەنی لەشی نەرم و ناسك وەك گوڵ.

**گلبرگ**: (گُ) 1) گەڵای گوڵ. 2) دەموچاو، ڕوخسار.

**گلبن**: (گُ) چڵی گوڵ، پنچکی گوڵ.

**گلبند**: (گُ) 1) باخەوان. 2) جۆرە قوماشێکە.

**گل بو(ی)**: 1) بۆنخۆش. 2) وەك گوڵ.

**گلبول**: خڕۆکە. **"گلبول های سفید"**: خڕۆکە سپییەکان. **"گلبول های قرمز"**: خڕۆکە سوورەکان.

**گل بەسر**: 1) گوڵ بەسەر. 2) جوان و خوێن شیرین، لەبەردڵان.

**گل بیز**: بۆنخۆش.

**گل پیرا**: (گُ) باخەوان، گوڵکار، کەسێ کە گوڵ دەڕوێنێ.

**گل چهره**: (گُ) جوان، قەشەنگ، سوورگوڵ، ڕوخسار وەك گوڵ.

**گلچین**: گوڵبژێر، گوڵچن، کەسێ تێدەکەوێ شتی هەرەباش هەڵدەبژێرێ، هەرشتێکی هەڵبژێراو. **"گل چین گل چین"**: بەئەسپایی، ئارام ئارام، هێدیهێدی.

**گلخانه**: گوڵخانە، گوڕنی، جێگەی شەتڵەگوڵ.

**گلخوار**: خۆڵخۆر، کەسێ کە خووی بە خۆڵخواردن گرتوە.

**گلدوزی**: دورینی نەخش و نیگار لەسەر قوماش، گوڵدوری.

**گلدیس**: وەك گوڵ.

**گلرخ**: بڕوانە:"گل چهره".

**گلرنگ**: 1) بەڕەنگی گوڵ، گوڵڕەنگ. 2) سوور.

**گل ریزان**: گوڵباران، ڕێوڕەسمی گوڵ هەڵاویشتن بەسەر بووك و زاوادا، پێشکەشکردنی گوڵ بە پاڵەوانە ناودارەکان بە مەبەستی ڕێزگرتن لێیان.

**گلزار**: گوڵجاڕ، گوڵەك، گوڵزار، گوڵستان، گوڵسان، چیمەنی پڕگوڵ، شوێنێ کە گوڵی زۆری لێڕواوە.

**گلزن**: گوڵکەر.

**گلسان**: گوڵ ئاسا، وەك گوڵ.

**گلست**: (گَ.لَ) زۆر مەست.

**گلستان**: بڕوانە:"گلزار".

**گل سرسبد**: 1) گوڵی جوان و هەڵبژاردە، سەرگوڵ، گوڵی سەرتۆپ، جوانتر لە ناو شتی دەوروبەردا. 2) کەسی هەڵبژاردە و خۆشەویست.

**گل سنگ**: کرێژەبەرد، قرێژەبەرد، قەوزەکەڤر، گول کەڤرۆك، قۆزەبەرد، گڵەوەز، گوڵ کوچك، خەنەتیلکە.

**گل سوری**: گوڵی سوور، گوڵی ئاگرین.

**گلشن**: 1) بڕوانە:"گلزار". 2) ماڵ، خانوو.

**گلعذار:** بڕوانه:"گل چهره".

**گلفام:** گولباڤ، سووری ئاڵ بە ڕەنگی گوڵ.

**گلكار:** (گُ) باغەوان، گوڵكار، كەسێ كە گوڵ دەڕوێنێ. ڕەنگڕێژ، خومچی.

**گلكار:** (گِ) هەڕیكار، كەسێ كە كاری قوڕ دەكا. **"گلكاری"**: قوڕەكاری، هەڕیكاری.

**گلكوبی:** (گُ) ژێرپێنانی گوڵ، سەیران و گەڕان لە ناو گوڵجاڕدا.

**گل گندم:** گوڵ گەنم، جێگەی دەنك و دان لە چڵەگەنم دا.

**گل كيپر:** دەروازەبان، گۆڵێر.

**گلگشت:** 1) گەڕان لە ناو گوڵجاڕدا. 2) جێگەی گەڕان و سەیران لە سارا و گوڵەك دا.

**گلگون:** ئامالْ سوور، سوورباو، سۆرینگ. **"گلگون كفن"**: سوورخەڵات.

**گلگونه:** 1) وەك گوڵ، بەڕەنگی گوڵ. 2) كولْمە یان ڕوخساری سوور. 3) سووراو. **"گلگونەكردن"**: سووراوكردن.

**گل مژه:** باپشكێو، چینچكەسڵاو، زیتكەزەلام، زیتكەسڵام، سیتكەزەلام، سیتكەسەلام، سیتكەسڵاو، سیتكەسڵاوە، سیچكەسڵاو، سیچكەسڵاوە، سیچەسڵاوە، سینچكەسڵاو، قنچكەسڵاو، قنچكەسڵاوە، قلینچكەسڵام.

**گلناك:** (گِ) قوڕاو، پڕ لم و لیتە.

**گلو:** قوڕگ، قوڕقوڕاچكە، قڕگ، گەروو، بەرمل، ئەوك. **"گلوی كسی را گرفتن"**: 1) بەربین گرتنی ئەو بەمەبەستی تەمبێكردن یان تۆڵەلێ ساندنەوە. 2) تووشی كێشە و ژانەسەركردن. 3) لێ تالْ و حەرامكردن. **"گلوی كسی گرفتن"**: بین گیران، قڕقڕاگەگیران، گەرووگیران. **"از گلوی كسی بریدن"**: لە گەروو گرتنەوەی ئەو، بێ بەشكردنی ئەو لە شتێك، نەدانی هەقی ئەو.

**گل واژه:** وشەی جوان.

**گلوباليزاسيون:** بەجیهانیبوون، جیهان گیری.

**گلوباليزم:** جیهانیبوون.

**گلوبنده:** زۆرخۆر، زگ لەوەڕێن، چەورە، چڵێس.

**گل ورچين:** هەڵبژێراو، گوڵچین.

**گلوسوز:** گەرووسووتێن.

**گلوكوم:** (پزیشكی) ئاوی ڕەش.

**گلوگاه:** شوێنی چوونەناوەوە.

**گلوگرفتگی:** گەرووگیران، شت دەگەروودا قەتیس بوون.

**گلوگرفتن:** دەست بردنە ژێر چەناگە بەنیشانەی خوایشت كردن.

**گلوگير:** 1) گەرووگیر، گەرووگر، قوڕگگیر. 2) پارووی گەورە كە لە گەروو نەچێتە خوار. 3) بێدەنگ كەر.

**گلوله:** 1) گوللە، گولۆڵی، فیشەك، بەرك. 2) گلۆڵە، گولۆڵە. 3) هەرشتێكی خڕ. 4) پاروو، تیكە. **"گلوله خرج (حرام) كسی كردن"**: كوشتنی ئەو، فیشەك تێدا خەسار كردن. **"گلوله خوردن كسی (چيزی)"**: وەبەر فیشەك كەوتنی ئەو. **"گلوله كردن"**: 1) هەڵكردن، هەڵكریان. 2) خێرا ڕۆیشتن، بەپەلە ڕۆیشتن.





**گلووند:** دیاری، پێشكەشی.

**گله:** (گِ.لَ) گلەیی، گلێیی، گازندە. **"گله داشتن"**: گلێیی هەبوون، گازندەهەبوون. **"گله دوستانه"**: وردەگلەیی، گلێیی دۆستانە.

**گله:** (گَ.لَ) ڕەڤە، ڕەوە، ڕەڤدە، ڕێن، مێگەل. بۆ مانای زیاتر بڕوانە:"رمه".

**گله‌بان:** (گَ.لَ) شوان، شڤان.

**گله‌دار:** (گَ.لَ) مەڕدار، ئاژەڵدار.

**گله‌داری:** (گَ.لَ) مەڕداری، ئاژەڵداری، تەرشداری.

**گله‌گزار:** (گِ.لَ.گُ) گلەییكەر، گازندەكەر.

**گله‌مند:** (گِ.لَ) بەگلەیی، بەگازندە، گازنكار.

**گليز:** بڕوانە:"غليز".

**گليگر:** گڵكار، وەستاكار، كرێكارێ كە لە كاری بینادا ئیش دەكا.

**گلين:** (گِ.لِ) هەڕگین، لە قوڕ دروست كراو.

**گلين:** (گَ.لِ) بووك، وەوی.

**گلين:** (گُ) بە ڕەنگی گوڵی سوور، وەك گوڵ.

**گم:** 1) ون، وندا، بزر، گوم، نادیار. 2) بەلاڕێداچوو، گومڕا. 3) سەرلێشێواو، سەرگەردان. **"گم شدن"**: 1) ون بوون، وندابوون، وندابین، بێ سەروشوێن چوون، گمبوون، گومبوون، نادیاربوون. 2) نوقمی كارێك بوون. 3) دووركەوتنەوە، جیابوونەوە. **"گم كردن"**: 1) گوم كردن، ونداكرن، هێلین، لەدەست دان. 2) زایەكردن. 3) گومڕاكردن، بەلاڕێدابردن. **"گم و گور"**: شرت و گوم، بەڵگوبن، بێسەروشوێن. **"خود را گم كردن"**: 1) بادیهەوابوون، خۆلێ گۆڕان. 2) هەولْبوون، حەپەسان، سەرلێ تێكچوون. 3) خۆون كردن، خۆشاردنەوە.

**گماردگر:** دیاریخەر، دەرخەر، پیشاندەر.

**گماردن:** بڕوانە:"گماشتن".

**گمارش:** 1) بڕوانە: "انتصاب". 2) دامەزراندن، خستنەبەركار. 3) مەئمووریيەت.

**گماريدن:** 1) دانان. 2) باڵادەست كردن. 3) پێكەنین. 4) بڕوانە:"شكفتن".

**گماشتن:** 1) دانان، خستنە سەركار. 2) ئاراستەكردن، چڕكردنەوە. 3) زاڵكردن، باڵادەست كردن.

**گماشته:** 1) دانراو، لەسەر كار دانراو، مەئموور. 2) خزمەتكار، نۆكەر.

**گمان:** دوودڵی، گومان، شك، سۆ، هەدان، هێدان، ڕوێز، وەهم. خەون، خەیالْ. **"گمان بردن"**: گومان كردن، گومان بردن، وازانین، وێناكردن. **"گمان داشتن"**: 1) گومان هەبوون. 2) ترس و نیگەرانی هەبوون. **"گمان رفتن"**: وێچوون. **"گمان كردن"**: گومان كردن، شك كردن. وازانین، وێناكردن.

**گمان پریشی:** بڕوانە:"وهم".
**گمان ساخت:** بڕوانە:"توهم".
**گمانە:** گومان، وێنا، مەزندە. "**گمانەزدن**": دیاریکردنی قووڵایی چاڵ، دانەوەی چاڵ بۆ پەیبردن بە ئاو یان کانزا یان شوێنەواری کۆن . "**گمانەکردن**": وێناکردن، گومان بردن.
**گمانەزنی:** 1) دانەوەی چاڵ. 2) پێشبینی یان مەزندەکردن بە کەڵك وەرگرتن لە بەڵگە و دەرکەوتەکان.
**گمانیدن:** گومان کردن، وازانین، خەیاڵ کردن(ەوە).
**گمراه:** ئاڤاڕێ، لەڕێدەرچووگ، لەڕێلادەر، لاڕێ، ڕێگەی ڕاست ون کردو، ڕێلێگۆڕاو، بێقام، گومڕا، لێچ، هەتڵە، سەرڕێداچوو، سەرلێشێواو. "**گمراەشدن**": لە ڕێدەرچوون، ڕێ لێگۆڕان، لاڕێبوون، لێچ بوون، گومڕابوون. "**گمراه کردن**": لە ڕێ دەرکردن، لاڕێکردن، گومڕاکردن، سەرلێشێواندن.
**گمراهی:** 1) نەبوونی ڕاستی و دروستی یان ویژدانی ئەخلاقی لە کەسێکدا. 2) گومڕایی، بێ دینی. 3) سەرلێشێواوی، سەرگەردانی. 4) ڕێ ون کردن.
**گمردن:** بڕوانە: "گماردن".
**گمرك:** گومرك، گومریك، باج لەسەر کاڵای هاوردە.
**گمنام:** ون، بێناو، کەس نەناس، نەبناڤ، بۆرەپیاگ، بێ دەنگ وناو، بێناوونیشان.
**گمیختن:** 1) تێکەڵاوکردن، ئاوێتەکردن. 2) میزکردن.

**گمیز:** میز. "**گمیزکردن**": میزکردن. "**گمیزگرفتن**": میزگیران، نەخۆشی میز بۆ نەکران. "**گمیزدان**": میزڵدان، میزەڵدان، مسوڵدان.
**گمیزە:** ئاوێتە، تێکەڵاو.
**گناه:** گونا، گوناح، گوناسا، گوناسە، تاوان، سووچ، قۆڕن، ئۆباڵ، وەباڵ، ئاز و بەزە. هەڵە، خەتا. "**گناه داشتن**": 1) شیاوی بەزەیی پیاهاتن بوون، گوناح بوون. 2) تووشی گوناح بوون، گوناحباربوون، تاوانباربوون. "**گناه را بە گردن کسی انداختن (دانستن)**": تاوانبارکردنی ئەو، ئەو خەتابارکردن. "**گناه صغیرە**": گوناحی چووکە وەك بەغیلی و بەئیرەیی. "**گناە کبیرە**": گوناحی گەورە وەك کوشتن و زیناح. "**گناه کسی را شستن**": تۆمەتی ناڕەوا لەو دان.
**گناهکار:** تاوانبار، تاواندار، خەتاکار، سووچبار، سووچدار، گوناحبار، گوناحکار، گونابار، گوناکار.
**گنبد:** 1) گومبەز، گونبەز، گومەز، گومز، کومبەت، قوب، قوببە. 2) ئاسمان(گنبد اخضر، گنبد خضراء، گنبد آبگون). 3) خونچە، بشکۆژ، پشکۆژ. 4) جیهان، دنیا. 5) پەرستگە. "**گنبد آذر**": پەرستگەی زەردەستییەکان، ئاتەشگا. "**گنبدکردن (زدن)**": هەڵبەزدابەزین، خۆهەڵدان، بازبازان. "**گنبدی شکل**": گومەزە.





**گنج:** (گَ) 1) خەزێنەی نەختینە، گەنج، گەنجینە. 2) هەر شتێکی بەنرخی ماددی یان مەعنەوی. 3) سامانی زۆر. 4) شوێنی پاراستن یان ڕاگرتنی شتێ، هەمبار. "**گنج روان**": هەرکەس یان هەرشتێکی بایەخدار و خۆشەویست. "**گنج شایگان**": هەر کەس یان هەر شتێکی بەنرخ و گرینگ کە شیاوی پاشاکان بێ. "**گنج کردن**": پاشەکەت کردنی ماڵ و سامانی زۆر. "**گنج نهادن**": بڕوانە:"گنج کردن". "**روی (سر) گنج (گنج قارون) خوابیدن (نشستن)**": هەبوونی ماڵ و سامانی زۆر، لە سەر گەنجی قاڕوون دانیشتن.
**گنج:** (گُ) بڕوانە:"گنجایش".
**گنج آگن:** قڕنیس، بەرچاوتنگ.
**گنجاندن/گنجانیدن:** گونجاندن، خونجانن، جێبۆکردنەوە، جێگاتێداکردنەوە.
**گنجایش:** 1) خونج، خونجان، خونجیان، گونجان، گونجین، (تێدا)جێبوونەوە، جێگا تێدابوونەوە، جێگەبوونەوە، جێگاتێداکردنەوە، جێگە بۆ تێخستنی شتێ، دێران، دەفرایەتی. 2) توانایی، توانین، شیان. "**گنجایش داشتن**": 1) بڕوانە: "گنجایش(1)". 2) شیان، لێ وەشانەوە، لێهاتن. "**گنجایش گاه**": خونج گاە، شوێنی تێداجێ بوونەوە.
**گنجایی:** 1) توانایی جێکردنەوەی شتێك لەخۆدا. 2) توانایی، دەفرایەتی. "**گنجایی داشتن**": 1) گونجان، جێبوونەوە.

2) مەیسەربوون، لوان.
**گنجبار:** شوێنی گەنج، خەزێنە.
**گنجبان:** خەزێنەدار، گەنجینەوان، نگابانی خەزێنە.
**گنج بخش:** دلاوا، بەخشندە.
**گنج خانە:** خەزێنە، شوێنی ڕاگرتنی گەنج.
**گنجدان:** بڕوانە: "خزانە".
**گنجشك روزی:** کەم ڕسق و داهات.
**گنجشکی:** کەم، کورت.
**گنجلە:** بڕوانە:"مچالە".
**گنجور:** پاسەوانی گەنج، خەزێنەدار.
**گنجیدن:** 1) خونجان، گونجان، گونجین، جێبوونەوە. 2) دروست بوون، دروست دەرهاتن.
**گنجینە:** 1) خەزێنە، خزنە، خەزنە، سامانگە. 2) کۆمەڵێ لە شتە بەنرخەکان. 3) مووزە. 4) ئەمبار، هەمبار. 5) شتی بایەخدار.
**گند:** (گَ) بۆنی ناخۆش. "**گند زدن**": 1) پیس کردن. 2) تووشی هەڵەی گەورەبوون، تێکدان. "**گندش بالاآمدن**": دەرکەوتن و ئاشکرابوونی گەندەڵی شتێك. "**گندش را درآوردن**": خراوکاریکردن، ڕیسوایی بارهێنان. "**گند گرفتن چیزی**": پیس و بۆگەن بوونی ئەو شتە.
**گند:** (گُ) هێلکە، گون. سپا، لەشکر.

**گنداب:** گەنکاو، گەنداو، تالاو، ئاوی بۆگەنیو.

**گندآور:** 1) بڕوانە:"کنداور". 2) فیشاڵچی و لەخۆبایی.

**گندا:** 1) بۆگەن، بۆگەنیو. 2) بێزهەستێن و قێزەون.

**گنداندن:** گەناندن، بۆگەن کردن، گنخاندن.

**گنددماغ:** بڕوانە:"گندەدماغ".

**گندزدا:** دژگەن، گەنیو سڕێن. **"گندزدایی"**: لەناوبردنی بۆنی ناخۆش و میکروبەکان بە دەرمانی تایبەتی، گەن سڕینەوە.

**گندکاری:** ئەنجامدانی کاری ناحەز و ناڕەوا یان هەڵە و کەمتەرخەمی لە کارێکا بە جۆرێك کە ببێتە هۆی ناوزڕان.

**گندله:** (گ ُ.د ُ.لَ) 1) خڕ، هەرشتێکی خڕ وەك گلۆڵە. 2) خەپەتۆڵە، گردەڵ.

**گندمگون:** ئەسمەر، گەنم ڕەنگ، بەڕەنگی گەنم، گەنمی، کەرەن زەر، سپی و زەردی ئامالّ ڕەش. **"دختر گندمگون"**: گەورۆك.

**گندم نما:** ڕیاباز، دووڕوو.

**گندمین:** 1) گەنمی. 2) لە گەنم دروست کراو. 3) شیرین و بەتام.

**گندو:** بڕوانە:"متعفن".

**گندومند:** بیکەڵك، خراو و خەوشدار.

**گنده:** (گ ُ.دَ) 1) تاپاز، زەبەلاح، زلحۆرت، زڕت، قەبە، گانوگۆشت، زەلام و ئەستوور. 2) خاوەنی پۆستی بەرز یان دەوڵەمەند.

**گنده:** (گَ.دَ) بۆگەن، بۆگەنیو، گەنیو، هەر شتێ کە بۆنی بۆگەنیو بدا.

**گندەبك:** قەبە و باهۆدار، مل قەوی، مل ئەستوور.

**گندە پران:** ئەوەی قسەکانی نەهزراو و گەورەتر لە خۆیەتی.

**گندە پیر:** پیر و بەتەمەن، بەساڵاچوو.

**گندەدماغ:** خۆپەسند و لەخۆبایی.

**گندەمغز:** مێشك گەنیو، نەزان، گەوج، لەخۆبایی.

**گندیدن:** گەنین، بۆگەن بوون، بۆن کردن، کوففك بوون، خراوبوون.

**گندیده:** گەنی، گەنیك، گەنیو، گەندڕ، گنخاو، بۆگەنیوبووگ، ڕزیو لە تەڕایی‌دا، کوففك، کێفکی، هەفنی.

**گنگ:** (گَ) 1) چەماوە، لار. 2) کووڕ، پشت چەماوە. 3) دوڕگە. **"گنگبار"**: کۆمەڵە دوڕگە.

**گنگ:** (گ ُ) 1) بێ زمان، لاڵ. 2) لێڵ، نادیار، گۆم، مانا نەزانراو. **"گنگ گویی"**: بڕوانە:"دوپهلوگویی".

**گنگلاج:** بڕوانە:"الکن".

**گنهکار:** بڕوانە:"گناهکار".

**گو:** (گَ) دلێر، قارەمان، گەورە.

**گوا:** بڕوانە:"گواه".

**گواتر:** ئاوسانی ڕژێنی ملەقۆرتە.

**گوارا:** ڕەوان، بێگیرکردن، نۆش، تراوی بە گیان خۆش، فێنك و سووك، بەچێژ، بەتام، هەرجۆرە خواردەمەنی یان خواردنەوەیەکی خۆش و بەتام. **"گوارای وجود"**: نۆشی گیان.





**گواردن/گواریدن:** بەباشی هەزم بوون، هەرس بوون لە ناو گەدەدا. بەتام و چێژبوون.

**گواردنی:** شیاوی هەزم بوون.

**گوارش:** هەڵتاوین، هەرسەك، تاوانەوەی خۆراك لە ورگدا. **"دستگاه گوارش"**: کۆئەندامی هەرس.

**گواژه:** 1) تانە، سەرزەنشت. 2) شۆخی، گاڵتە. 3) ئاماژە.

**گواژه‌آمیز:** تەشەراوی، تێکەڵ بە تانە و تەشەر.

**گواژه‌گر:** کەسێ کە تانە و تەشەر داوێ. قسەخۆش، شۆخ، جۆك بێژ.

**گواش:** شێواز، مێتۆد.

**گواشتن:** بڕوانە:"گواریدن".

**گوالش:** بڕوانە: "گوالیدن(1)".

**گوالیدن:** 1) گەشەکردن، بالاکردن، نەش و نماکردن، هەڵدان. 2) پاشەکەت کردن، هەمبارکردن.

**گوانجی:** فەرماندەر، سپاسالار. پێشەوا.

**گواه:** 1) شادە، شایەت، شایەتحاڵ، گۆڤا، گوڤا، ئاگادار لە ڕووداو. 2) بەڵگە، دەلیل. **"گواه داشتن"**: بەڵگە و دەلیل هەبوون. بە شایەتی گرتنی کەسێك. **"گواه کردن"**: بڕوانە: "گواهگرفتن". **"گواه گرفتن"**: بە شایەتی گرتنی کەسێك.

**گواهی:** شایەتی، شەهادە، ئاگاداری لە ڕووداو، گۆڤانی، ستوو، ستووڤ، گەوایی. **"گواهی دادن"**: 1) شایەتی‌دان، شادەدان، ستووڤدان، ستووڤەدان، ستوودان، ئاگایی دان لە کارێك. 2) پشت ڕاست کردنەوە، تەسێق کردن. **"گواهی دادن بر چیزی"**: پشت ڕاستکردنەوە و تەسێق کردنی ئەو شتە. **"گواهی کردن"**: شایەتی‌دان.

**گواهی نامه:** بڕوانامەی خوێندن، گەوایی نامە.

**گوبان:** گاوان.

**گود:** 1) ڕۆچوو، قووپاو، تەپیو. 2) قووڵ، قویل، چاڵ، ساکوڵ. **"گود افتادن"**: قووپان، تەپین. چاو یان گۆنا بەقووڵاچوون. **"گود بی پهلوان"**: مەیدانی خاڵی لە خەنیم و جێیەك کە بەبێ ترس بتوانرێ هاشوهووشی تێدا بکرێ. **"گود رفتن"**: بەقووڵاچوون، بەچاڵداچوون. **"گودشدگی"**: قووپان، داکەفتگی، قووڵ بوون. **"گودشدن"**: قووڵ بوون، چاڵ بوون. **"گود کردن"**: چاڵکردن، قووڵ کردن. **"گود نشستن"**: داچوون، داتەپین، تەپین. بەقووڵاچوون. **"کنار گود نشستن"**: خۆلێنەدان یان خۆتێوەرنەدان و تەنیا لە دوورەوە چاوەدێری کردن.

**گودال:** قووڵکە، قووتە، چالایی زەوی. **"گودال عمیق"**: کەندڕ، بوودڕ، قووڵکەی زۆر قووڵ.

**گودنگاری:** هەڵکۆڵین، کەندەکاری.

**گودە:** 1) هەرجۆرە دەفرێکی قووڵ لە سەنعەتدا. 2) لەش، ئەندام.

**گودی:** قووڵك، قووڵایی، قووڵی، چاڵایی هەر شتێك.

**گور:** 1) گۆڕ، قەبر، گڵکۆ. 2) شوێن، جێ(معلوم نیست کدام گوری رفته). **"گور خود را کندن":** بریتی لە خۆخستنە مەترسییەوە. **"گور خود را گم کردن":** گۆڕ ون کردن(بڕۆ گۆڕت ون کە)، لە کۆڵ بوونەوە. **"گور کردن":** لە گۆڕ نان، ناشتن. **"(بە) در گور کردن":** ناشتن. **"کسی را تو(ی) گور کردن":** 1) کوشتنی ئەو. 2) زیندووماندنەوە دوای مردنی کەس یان کەسانێك.

**گوراب:** 1) بڕوانە:"سراب". 2) گومەزی سەر قەور.

**گوراگور:** بەخێرایی، بەکرژی.

**گوراندن:** لێك ئاڵاندن، ئاڵۆزکردن(پەت یان پرچ).

**گوربەگوری:** نەحلەتی، لەعنەتی.

**گورخانە:** جێیگۆڕ، گڵکۆ.

**گوردان:** بڕوانە:"گورستان".

**گورزا:** 1) منداڵێ کە دوای مەرگی دایکی لە دایك دەبێ. 2) کەسی زۆر کورتەباڵا، بستەباڵا، نیوبست، باڵافس.

**گورزایی:** باڵابۆستی، نیوبستی، باڵافسی، کورتیلەیی، کورتەباڵایی.

**گورستان:** سەرقەبران، گۆڕسان، گۆڕستان، قەوران، قەبرستان. **"نگهبان گورستان":** زێوان، زێدەوان، گۆڕەڤان، گۆڕەوان، ئاگاداری گۆڕستان.

**گورگاه:** بڕوانە:"گورخانە".

**گورکن:** قەبرکەن، قەبرەڵکەن، قەبرەڵقەن، قەبرهەڵقەن، گۆڕکۆڵ، گۆڕهەڵکەن. 2) چاڵگ، چالە، چوالوو، کوڕەبەش، کوڕەبەشە، کوڕەبەشەك، گۆڕهەڵکەنە، قوڕەبەشە.

**گوریدگی:** پێکداچوو، لێك ئاڵاو، گرێخواردوو، گرفتاری.

**گوریدن:** پێکاچوون، لێك ئاڵان، گرێ خواردن.

**گوز:** تڕ. **"گوز آخر را کندن":** بریتی لە مردن، لە کوردیدا دەڵێن تڕی ئاخر کەندن. **"گوز دادن":** بڕوانە:"گوزیدن". **"بە گوزگوز افتادن":** وەتڕەتڕکەوتن. لەدەست دانی توانایی یان کارایی بۆ ئەنجامدانی کارێك، پێ فل بوون، پێ شلبوون.

**گوزپیچ شدن:** سەرلێشێوان، سەرلێتێکچوون، گێژبوون.

**گوزچی:** مەئموور نهێنی.

**گوزمال شدن:** بە ناڕەوا لەدەست چوون، زایەبوون، وەك تڕی بن گۆم چوون.

**گوز معلق شدن:** 1) لە شوێنێکەوە بەربوونەوە، سەراونخوون بوون. 2) نەخۆش کەوتن.





**گوزو:** تڕکەن.

**گوزیدن:** تڕین، تڕان، تڕبەردان، تڕکەندن.

**گوزینە:** کەسی پەست و نزم و خوێڕی.

**گوژ:** بڕوانە:"کوژ".

**گوش:** 1) گوێ، گویە، گۆ، گوە، گوێچك، گوێچکە، گوچك، گۆچك، گێچکە. 2) گۆشە، سووچ، قوژبن. 3) سیخوڕ، زوانگیر، گوێ بیس، گوێ بەل. **"گوش انداختن":** بە وردی گوێ لێ ڕاگرتن، گوێ بۆ ڕاداشتن. **"گوش ایستادن":** گوێ هەڵخستن، بەدزییەوە گوێ لە قسەی خەڵك گرتن، گوێقوت کردن بۆ قسەی خەڵك. **"گوش باز کردن":** گوێ شل کردن، بە وردی گوێدان. **"گوش با کسی داشتن(کردن)":** گوێدان بە قسەی ئەو. **"گوش بر چیزی داشتن":** 1) قبووڵ کردنی ئەو. 2) چاوەڕوانی بیستنی ئەو شتە بوون. **"گوش بر در بودن":** چاوەڕوانی بیستنی خەبەرێك بوون. **"گوش بر کشیدن":** گوێچکە کێشان بەمەبەستی تەمبێ کردن. **"گوش بودن":** بێدەنگ بوون، تەنیا گوێدان. **"گوش بە جایی داشتن":** چاوەڕوانی خەبەرێك لەو شوێنەوە بوون. **"گوش بە خود داشتن":** ئاگاداری خۆ بوون. **"گوش بە در داشتن(بودن)":** چاوەڕوان بوون. **"گوش بە کسی سپردن":** گوێلێڕاگرتن، بە وردی گوێدانە ئەو. **"گوش بە گوش":** لە کەسێکەوە کە بیستراوە بۆ کەسێکی تر، زاربەزار. **"گوش تیز کردن":** 1) گوێ شلکردن، گوێ هەڵخستن. 2) ئامادە و چاوەڕوانی هەلی لەباربوون. **"گوش چیزی آکندن":** گوێلێئاخنین. **"گوش خاراندن":** درەنگ کردن و چوونە فیکرەوە. **"گوش خواباندن":** 1) بەوردی گوێهەڵخستن، گوێڕاداشتن. 2) بریتی لە سەبرکردن و چاوەڕوانی هەل بوون. 3) گوێ داخستنی ئاژەڵ. **"گوش دادن":** بڕوانە:"گوش فرا دادن". **"گوش داشتن":** گوێگرتن، 1) گوێ ڕاداشتن، بیستن. 2) بەدزییەوە گوێ ڕاگرتن، گوێ هەڵخستن. 3) بڕوانە: "پذیرفتن". 4) پاراستن. 5) ڕاگرتن. 6) سەرنج دان، ڕووتێکردن. 7) هیواداربوون. 8) چاوەڕێ بوون. **"گوش(و)دماغ کردن":** بڕینی گوێ و لووتی کەسێك. **"گوش دوختن":** گوێ دان، گوێ ڕاگرتن. **"گوش سپردن":** بە جوانی گوێدان، گوێڕاداشتن. **"گوش فرادادن":** گوێ هەڵخستن، گوێچکە شلکردن، گوێدان بە قسە، گوێ بۆ قسە ڕاگرتن، گوێگرتن، گوێچکە تەکاندن. **"گوش فرا داشتن":** 1) گوێ هەڵخستن، بەدزییەوە گوێ ڕاداشتن. 2) ئاگالێبوون، ئاگاداربوون. **"گوش فکندن":** بڕوانە: "گوش فرادادن". **"گوش کردن":** 1) گوێدان، گوێگرتن، گوێ ڕاگرتن. 2) قبووڵ

کردن و بەکارهێنان، بەگویکردن. 3) چاوەڕوانی شتێك بوون. 4) گرتنەپێشی هەڵسوکەوت یان شێوازێك. **"گوش کسی ایستادن"**: چاوەڕێی ئەو بوون. **"گوش کسی بدهکار نبودن"**: گویٚ لیٚخەواندن، کەمتەرخەمی کردن. **"گوش کسی تر شدن"**: چێژ (لیٚ)بردنی ئەو. **"گوش کسی را بازکردن"**: بڕینی گوێچکەی ئەو وەك تەمبیکردن. **"گوش کسی را بردن"**: ناڕەحەت کردنی ئەو بە هەرا و دەنگی بەرز، مێشك بردن. **"گوش کسی را بریدن"**: 1) بڕینی گوێی کەسێك بە مەبەستی تەمبیکردن. 2) بە فرتوفێڵ پارە و ماڵ لیٚسەندن. **"گوش کسی را پیچاندن( پیچ دادن، کشیدن )"**: گویٚ بادان، گویکێشان(بۆ تەمبیکردن). **"گوش کسی( چیزی ) را مالیدن"**: تەمبێکردنی ئەو، ڕام و دەستەمۆکردنی ئەو. ئازارپێگەیاندن بەو. **"گوش کسی سنگین بودن"**: گویٚقورس بوون، گویٚگران بوون، گوهگران بوون. **"گوش کشیدن"**: 1) بەجوانی گویٚ هەڵخستن، بەوردی سەرنجدانە قسەیەك. 2) تەمبیٚ کردن، گویکێشان. **"گوش گران کردن"**: خۆ لە نەشنەفتن دان. **"گوش گرفتن"**: 1) بڕوانە: "گوش فرادادن". 2) قبووڵ کردن، بەگوێکردن. 3) گرتنی گویٚ بە دەست یان بە شتێکیتر بۆ نەبیستن. **"گوش گماشتن"**: گوێدان، گویٚگرتن. **"گوش نشستن"**: 1) ئارام دانیشتن و گویٚڕادێران. 2) گویٚ هەڵخستن، گویٚ دان بە دزییەوە. **"گوش نهادن"**: 1) گوێگرتن، گویٚ دان. 2) چاوەڕیٚبوون. **"گوشِ هوش"**: هەواس لەسەرخۆ، وشیاری. **"از گوش افتادن حرف( سخن، مطلب،... )"**: نەبیستنی ئەو. **"به گوش خوردن"**: بیستران. **"به گوش رسیدن"**: بیستران، بەگویٚگەیشتن. **"به گوش کردن"**: بەگوێکردن، قبووڵ کردن. **"به گوش کسی باد بودن"**: کارتێنەکردن لەو. **"به گوش کسی خواندن"**: بەگویٚدادانەوە بە ئەو، وەبیرهێنانەوە. **"به گوش کسی رسیدن"**: بیستنەوە لە لایەن ئەو کەسەوە، بە گویٚ گەیشتنەوە، ئاگاداربوونەوە. **"به گوش کسی رفتن( فرورفتن )"**: وەرگرتن(قبووڵ کردن) لە لایەن ئەوەوە. **"به گوش( توی گوش ) کسی فروکردن"**: بەگوێدادان، تیگەیاندن. **"به گوش کسی کردن"**: بە گوێدادانەوە. **"به گوش گرفتن"**: بەگویکردن. **"پشت گوش انداختن"**: خستنە پشت گویٚ، گویٚ لیٚئاخنین، گویٚلیٚخەواندن، گویٚپێنەدان. گرینگی پێنەدان. **"پشت گوش کسی"**: نزیك بە ئەو، بناگویٚ. **"تو( ی ) گوش چیزی زدن"**: 1 ) بوونە خاوەنی ئەو یان وەدەست خستنی.





2) خواردنی شتیٚ بەجورێك هیچی لیٚنەمێنێتەوە. **"در گوشِ"**: لە چاوەڕوانی دا. **"در گوش پیچیدن"**: دەنگدانەوە، گویٚ زرینگانەوە. **"در گوش نهادن"**: بەگویٚکردن، قبووڵکردن.

**گوش آکنده:** 1) کەڕ. 2) نەسیحەت هەڵنەگر.

**گوشاسب:** خەون، خەونی خۆش.

**گوشاگوش:** زاربەزار. **"گوشاگوش افتادن"**: زاربەزار بڵاوبوونەوە.

**گوش بر:** بریتی لە دەسبڕ، قۆڵبڕ، خاپینۆك، کەسیٚ کە بە فێڵ شتیٚ لە کەسێك دەسێنیٚ.

**گوش بەزنگ:** گویٚقولاغ، گویٚقولاخ، لەسەر هەست، هاگی دار، وازر، گوهکون.

**گوش بەفرمان:** گوێڕایەڵ، گویٚلەمست، گویٚ بە فەرمان، گەردن کەچ، ملکەچ، ژێرفەرمان، بەرفەرمان.

**گوش بین:** ئوتۆسکۆپ.

**گوشت:** گۆشت. **"گوشت آوردن"**: قەڵەوبوون. **"گوشت به بدن( تن ) کسی نماندن"**: لاوازبوونی ئەو، لەڕبوونی ئەو. **"گوشت تن کسی را لرزاندن"**: زۆر ئازاردانی ئەو. **"گوشت خود را تلخ کردن"**: خۆ ناڕەحەت کردن، خۆتاڵ کردن. **"گوشت را به گربه سپردن"**: سپاردنی ئەمانەتی یان شتیٚ بە کەسی ناڕاست و بیٚبەقا. **"گوشت کسی آب شدن"**: 1) کز و لاوازبوونی ئەو. 2) زۆر ترسانی ئەو. **"گوشت گرفتن"**: گۆشت گرتن، قەڵەوبوون. **"گوشت نو بالاآوردن"**: 1) قەڵەوبوونەوە. 2) گۆشتەزوون هێنانەوە، سارێژبوونەوەی برین.

**گوشت آور:** گۆشتن، پڕگۆشت، قەڵەو.

**گوشتالو:** پڕگۆشت، تێرگۆشت، گۆشتن، قەڵەو، تفقی.

گوشت تلخ: گۆشت تاڵ، بەدخولق، نمرچ.

**گوشتخوار:** گۆشتخۆر، هەر بوونەوەریٚ کە بە گۆشت خواردن فێرە.

**گوشت دار:** 1) پڕگۆشت، گۆشتن. 2) ئەستوور.

**گوشتی:** 1) لە گۆشت سازکراو. 2) گۆشتن، قەڵەو. 3) گۆشتی. 4) ئامادەکراو لە گۆشت. 5) حەڵاڵ گۆشت.

**گوش تیز:** گویٚسووك، گۆبەل، لەسەر هەست.

**گوشتین:** 1) سازکراو لە گۆشت. 2) گۆشتن، قەڵەو.

**گوشچیگری:** بڕوانە: "جاسوسی".

**گوش خراش:** دەنگی زبری بەگویٚ ناخۆش، گویٚ ڕووشێن.

**گوش دار:** 1) بیسەر، گوێگر. 2) خۆگرتوو، گوێگر لە قسەی خەڵکی.

**گوشزدکردن:** بەگوێدادان، بەگویٚ هەڵێنان، بیرخستنەوە، ئاگادارکردنەوە.

**گوش گذار کردن:** بەگویٚگەیاندن.

**گوش گیر:** ئازاردەر.

**گوشمال:** تەمبیٚ. **"گوشمال خوردن( دیدن )"**: تەمبیٚ کران، ئەدەب کران. **"گوشمال دادن"**: تەمبیکردن، ئەدەبکردن.

**گوش نواز:** خۆش وەک چریکە.

**گوشوان:** ڕاگر، پارێزەر.

**گوشور:** 1) ژنەوا، گوێبیس. 2) گوێ زل.

**گوشە:** 1) سووچ، قوژبن، قولینچک، قوڕنە، قونج، گەڤەر، کووژی، کوژیرک، کاژێر، تیلا، گۆشە. 2) کەنارە، لێوارە. 3) بەشێ یان پاژێ لە شتێ. 4) لا، ئالی. 5) بەشێک لە سەرزەوینێک، ئیالەت. **"گوشە ابرو را بلند کردن"**: 1) بێ حەوسەڵەبوون. 2) بە نیشانەی سەرسووڕمان برۆ هەڵتەکاندن. 3) ئاماژەکردن. "گوشە ابرو نمودن": خۆنوێنیکردن. **"گوشە چشم بە کسی داشتن"**: بەهێندگرتنی ئەو، ئاوڕلێدانەوە. **"گوشەدنج"**: پەناپەسیو. **"گوشە زدن بە چیزی"**: ئاماژەکردن بەو بەتایبەتی بە تەنز و تەوس. **"گوشە زدن بە کسی"**: قسەی تەوساوی وتن سەبارەت بەو، تانەلێدان لەو. **"گوشە کاری را گرفتن"**: وەئەستۆگرتن و ئەنجامدانی بەشێک لەو. **"گوشە کردن"**: 1) چڵک کردنی گۆشەی نینۆک لەبەر تێچەقینی نینۆک لە گۆشت. 2) چوونەلاوە، دووریکردن. **"گوشە (و) کنایە"**: قسەی تەوساوی، تانە. **"گوشەگرفتن"**: گۆشەنشینیکردن، تەریک بوونەوە. **"گوشە نان شکستن"**: بوونە میوان، خواردنی نان و نمەکی کەسێک. **"گوشە نان کسی را نشکستن"**: زۆر قرنیس بوونی ئەو. "از **گوشە چیزی زدن**": کەمکردنەوەی بەشێک لەو.

**"با گوشە چشم"**: بەلاچاو، بەتیلی چاو، بەگۆشەی چاو.

**گوشەدار:** 1) گۆشەدار، هەرچی تیلە و سووچی هەبێ. 2) تەوساوی، تەشەراوی(قسە). 3) گۆشەنشین، تەریک.

**گوشەزنی:** بڕوانە:"کنایە".

**گوشەگیر:** هەڵ کورماو، گۆشەگر، گۆشەگیر، گۆشەنشین، لاپەڕ، دەرکەنار، واردس، تەریک، دوورەپەرێز، دوورە خەڵک، خۆ دەکار نەگەیێن.

**گوشەگیری:** گۆشەگیری، گۆشەنشینی، دوورەپەرێزی، تەریکی.

**گوشەنشین:** بڕوانە:"گوشەگیر".

**گوشی:** بیستۆک(ە)، دەسک، هەند. **"گوشی دست کسی بودن"**: ئاگا(دار)بوون لەو، لە جەریانی وردەکارییەکانی کارێ یان بابەتێکا بوون.

**گوشیدن:** 1) گوێدان، گوێڕاگرتن، گوێچکە گرتن. 2) پاراستن، ڕاگرتن.

**گوگلە:** ڕەوەی گاڕان، گایەل، گاگەل. **"گوگلەکردن"**: چوار دەست و پێ ڕۆیشتن.

**گوگلی:** 1) گاوان. 2) خاوەنی پیشەی نزم.

**گول:** 1) گەمژە، گەوج، نەزان. 2) مەکر، فریو، فێڵ. 3) سەرگەردان. **"گول خوردن"**: خەڵەتان، هەڵخەڵەتان، هەڵفریوان، خلافان، خلەفان، فریوخواردن، فریودران، بەفریوچوون، لەخشتەچوون. **"گول زدن"**: فریودان، خەڵەتاندن، خاپاندن.





**گول زنک:** فریودەر، خەڵەتێن.

**گول گیر:** 1) ئەوەی دیتران بە گەوج و نەزان بزانێ. 2) ئەوەی گەمژە بخاتە هەڵەوە.

**گونا:** جۆر، چەشن.

**گوناب:** سووراو.

**گوناگون:** جۆراوجۆر، فرەچەشن، ڕەنگاوڕەنگ.

**گونە:** 1) ڕوومەت، دەموچاو، لایەکی ڕوو، کوڵم، کولمە، گۆنا. 2) ئامال، مەیلەو، جق، ڕەنگ، چەشن. 3) شێوە. 4) شکڵ. **"گونەگونە"**: 1) جۆراوجۆر. 2) ڕەنگاڵە، ڕەنگاوڕەنگ. **"از این گونە"**: لەم چەشنە.

**گونەسازی:** نیگارکێشی، کێشانەوەی دەموچاو.

**گونەشناسی:** چەشن ناسی.

**گوهر:** 1) گەوهەر، گەوەر، بەردی زۆر بە نرخ، ئەڵماس، مرواری. 2) نەژاد، ڕەچەڵەک. 3) سرشت. 4) بنچینە، سەرچاوە. 5) سروشت. 6) هەر شتێک یان هەر کەسێکی بەرز و بەنرخ. 7) فرمێسک. 8) هەرکام لە چوار توخمی(ئاو، خاک، با، ئاگر). 9) جەوهەر، ئەوەی وەدیهاتنی لە دەرەوە نیازمەندی شتیتر نیە. **"گوهر بە رشتە کشیدن"**: قسەی ڕەوان و پاراو گوتن. **"گوهر خود را بر سنگ زدن"**: خۆ سووک کردن.

**گوهرآگین:** گەوهەردار، گەوهەرنیشان.

**گوهرآما(ی):** 1) مرواری دەداو کێش/ پێوەکەر. 2) ئافرێنەر.

**گوهربار:** 1) کەسێک کە گەوهەر دەبەخشێتەوە. 2) گریان.

**گوهرمایە:** توخم.

**گوهرنشان:** گەوهەرنیشان، گەوهەردار. خاوەنی دیانی بەدرەوشێن.

**گوهرنگار:** 1) گەوهەرنیشان. 2) گریان.

**گوهری:** 1) گەوهەرفرۆش، گەوهەرساز. 2) گەوهەردار، گەوهەرنیشان. 3) ڕەسەن، بنەچەدار. 4) سروشتی.

**گوهرین:** گەوهەرنیشان.

**گوی:** 1) گۆ، هەر شتێکی گردیلەی چکۆلە. 2) تۆپی دارینی کاشۆبازی. 3) دوگمە، پشکۆژ. **"گوی از آب برداشتن"**: ئەنجامدانی کاری دژوار بەدەست و برد، کارامەیی و زانایی نیشان دان. **"گوی از کسی بردن(ربودن)"**: کەوتنە بەرەوەی ئەو. **"گوی باختن(بازیدن)"**: کاشۆبازیکردن. **"گوی بردن"**: کەوتنەبەرەوە، سەرکەوتن. **"گوی ربودن"**: کەوتنە پێشەوە. **"گوی گریبان"**: دوگمەی یەخە. **"گوی مغبر"**: گۆی زەوی.

**گویا:** 1) ڕەنگە، وێدەچێ، وادیارە، شاکم، گوایە، گۆیا. 2) ڕەوان، ڕوون، ئاشکرا. 3) دەربڕ، نیشانە. 4) قسەکەر، وێژەر.

**گویان:** لە حاڵی وتندا.

**گویایی:** 1) قسەکردن، ئاخاوتن. 2) ڕەوانی و پاراوی.

**گویچە:** بڕوانە:"گلبول".

**گویش:** 1) شێوە ئاخاوتن، شێوەزار. 2) گوتار، پەیڤ، قەول.

**گویندگی:** بێژەری، وێژەری.

**گویندە:** 1) واتیار، ویتیار، وێژننە، وێژنە، وێژەر، بگۆ، قسەکەر، بێژەر. 2) شاعیر، هەڵبەست وان، بوێژ. 3) بێلتیڤان، بەزمگێڕ. 4) گتێڕەوە، چیرۆك بێژ. 5) گفت و لفت خۆش، دەمەوەر. 6) خۆش ئاهەنگ. 7) قسەزان، بەدەم و دوو. 8) مرۆ، ئینسان. 9) زمان. "**گویندە لاالەالاالله**": موسڵمان.

**گویە:** گوتن.

**گهر:** (شاعیرانە) بڕوانە: "گوهر".

**گەکاری:** گووکاری، گووتێکردن، کاری خراپ کردن.

**گەگیجە:** دوودڵی، دڕدۆنگی، سەرلێشێواوی. "**گەگیجەگرفتن**": ون کردنی دەست و پێی خۆ، هەوڵ بوون.

**گەگیر:** دێز، سەرکێش.

**گەمال کردن:** (گ) بە جوانی نەشۆردن.

**گەمرغی:** 1) بەدخولق، مڕومۆچ. 2) پەرێشان، خراو.

**گهوارە:** لانك، لاندك، لانکە، بێشکە، دەرگووش، گەرگووش، دەیدیك.

**گهولش:** بڕوانە:"تناوب".

**گهولیدن:** بڕوانە:"تعویض".

**گیابن:** بنچکی گیا.

**گیاری:** بڕوانە:"تنبلی".

**گیازار:** گیاجاڕ.

**گیاە:** ڕوەك، گیا، گەیا.

**گیاەشناسی:** ڕوەك ناسی، زانستیٚ کە سەبارەت بە چۆنیەتی گیا جۆراوجۆرەکان دەدویٚ.

**گیتاشناسی:** جوغڕافیا.

**گیتی:** 1) گەردوون. 2) دنیا، جیهان، ڕۆژگار. 3) حاڵەت و چۆنیەتی ڕووداوەکانی مێژوو، بارودۆخی ڕۆژگار. 4) دەسەڵات و حکوومەت یان سامان کە بۆ کەسێك ڕەنیو دیٚ. "**گیتی خوردن**": بەهرەمەندبوون لە نێعمەتە مادديیەکانی جیهان.

**گیتی فروز:** ڕووناك کەرەوەی جیهان.

**گیتی نورد:** بڕوانە:"جهانگرد".

**گیج:** گێژ، گێج، سەرشێت، هیر، واژ. "**گیج خوردن (رفتن) سر کسی**": تووشی سەرەگێژەهاتنی ئەو، سەر لە گێژەوە هاتن. "**گیج شدن**": کاسبوون، تاسان، تاسیان، تاسبردنەوە، تاسین، سەرخولانەوە، گێژبوون، گێج بوون، سەرگێژبوون، گێج خواردن، وڕمان، وڕبوون، هوڕمان. "**گیج شده**": تاسا، تاساو، گێژبوو، گێژوهوڕ. "**گیج کردن**": گێژکردن، گێژومات کردن، تاس کردن، تووشی سەرسووڕان کردن، حەپەساندن، هۆش لێسەندن. "**گیج و گنگ**": مات و واق وڕ، وڕ و بێدەنگ. "**گیج وگول (گیج و ویج)**": هوڕبوو، شەلوشێت، پەتیارە، هاژوواژ، گێژوناتێگەیشتوو، گێژووڕ، گێژوهوڕ، گێژوویژ، گێژوحۆل، کاس و وڕ.

**گیجگاە:** لاجانگ، شیشنگ، جاینك.

**گیج گیجە:** گێژی، گێجی.

**گیجیدن:** گێژبوون، تووشی گێژی هاتن.

**گیدی:** بڕوانە:"قرمساق".

**گیر:** 1) دژواری لە کار دا، گریٚ. گرفتار، یەخسیر. 3) چنگ، دەست. 4) گیراوی، بەستراوی. 5) هێز، وزە، توانایی. "**گیرآمدن**": دەس کەوتن، تووش هاتن و بەگیرهێنان، بەرگیرکەوتن، وەبەردەست هاتن. "**گیرآوردن**": 1) دەست خستن، گیرهێنان، وەگیرهێنان، بەگیرهێنان، بەرگیرخستن، ڕادەستکرن. 2) گرفتارکردن، یەخسیرکردن، گرتن. "**گیرافتادن**": 1) گیرخواردن، گیرکردن، گرفتاربوون، هاتنەگرتن، هاتنەگیر. 2) تووشی کێشە و گرفت بوون. "**گیر انداختن**": 1) گیرخستن، گرتن، گرفتارکردن. 2) گیرپێدان، بە پرسیاری دژوار و ئالۆز خستنە تەنگانەوە. "**گیردادن**": 1) بەکۆڵنەدەری و پێداگری زۆرەوە خەریکی کارێك بوون. 2) پێوەگیرکردن، هەڵواسین. 3) گیردان، گیرپێدان، وێستاندن لە ڕۆیین، بیانووپێگرتن، سەرخستنەسەر. "**گیر سە پیچەدادن بە کسی**": لەڕادەبەدەر موزاحیمی ئەو بوون، یان بەلاساری و پێداگری زۆر داوای شت لەو کردن، دەست هەڵنەگرتن. "**گیرکردن**": 1) گیر کردن، مانەوە لە شوێنێك و نەبزووتن لەو شوێنە. 3) گرفتاربوون، گیران. 4) دەورەدران، دەورەگیران، گەمارۆدران. 5) تووشی گیروگرفت بوون. "**گیرگیر**": وەخت، کات. بگرەوبەردە. "**گیرودار**": 1) لە گەرمەی، لەجەنگەی. 2) گرفتاری. 3) بگرەبەردە، بگرەوبەردە، هەڵلا و هەنگامە. "**بە گیر کسی افتادن**": بەو بڕان، وەگیر ئەوکەوتن.

**گیرا:** 1) دڵگر، دڵڕفێن، جوان. 2) کاریگەر، شوێندانەر. 3) سەرنج ڕاکێش، کێشەر، ڕاکێشەر، گیرا. 4) سەرخۆشکەر، مەستی هێن. 5) وەرگر، ستێن. 6) بەهێز، بەقەوەت، خورت. 7) ئامرازی گرتن و ڕاگرتن.

**گیراگیر:** 1) لەجەنگەی، لەگەرمەی. 2) بگرەوبەردە، هەڵلاوهەنگامە. 3) شەڕ، جەنگ. "**گیراگیر کردن**": وەچنگ خستن، گیرهێنان.

**گیراندن:** 1) ئاگرپێکردن، ئاور تێبەردان. 2) بڕوانە:"ملحق کردن".

**گیرایی:** 1) گیرایی، کاریگەری. 2) دڵگری، دڵڕفێنی، گیرایی. 3) وزە، تابشت، توانست، بڕست.

**گیردار:** بڕوانە:"گیرودار".

**گیرش:** کردەی گرتن و ڕاگرتن.

**گیرش گاە:** شوێنی گرتن و ڕاگرتن.

**گیرم:** بەشکم، وامان دانا، بەڵکە، بەڵکو.

**گیرنـــدە:** 1) هەسـتێن، ئەسـتێن، سـتان، ستێن، وەگر، وەرگر. 2) جـوان، دڵـڕفێن. 3) دڵخۆشـــکەر، دڵپەســـند. 4) گـــازگر، قـــەپگر، پێـــوەدەر. 5) گرفتارکـــەر، پێوەکـەر، گیرۆدەکـەر. 6) ڕاوکـەر، لـەبار بـۆ ڕاوکـــردن. 7) تـــوون، تـیژ (چێژ). 8) بڕوانـە:"چسبناك". 9) بـەرتیل خـۆر. 10) هۆکاری خۆرگیران.

**گیس:** پـرچ، کـەزی، کەزیـە، گیـز، گجـك، مـووی درێـژی سـەر. **"گـیس کـردن"**: پـرچ هۆنینەوە. **"گیس گرو گـــذاشتن"**: گرەنتی دان بـە وادە و بـەڵێنی زارەکـی، دەروەسـتی ئەخلاقی دان. **"بە گـیس کـسی خندیـدن"**: بـە ڕیـشی ئـەو پێکـەنین، گاڵتـەپێکردن بـەو. **"بە گیس گرفتن"**: بڕوانە: "بە ریش گرفتن".

**گیس آرا:** بڕوانە:"آرایشگر".

**گیس بریدە:** بەدکارە، بێحەیا.

**گیلاس خـالی کـردن:** هەڵقوڕانـدن و بـەتاڵ کردنـــی گێلاســـی پـــڕ لـــە خواردنـــەوە بەتایبەتی مەشرووب.

**گیـوە:** کـەلاش، کـلاش. **"گیـوە ورکـشیدن"**: 1) پاژنەی کلاش هەڵکێشان. 2) ئامـادەی ئەنجامدانی کارێك بـوون، ئیرادەکـردن بـۆ ئەنجامدانی کارێ.

**گیهان:** جیهان، دنیا.

**گیە:** گیا(شاعیرانە).

# ل

**لابالی:** 1) کەمتەرخەم، کەترەخەم، خەمسار، خۆڵەکاربوێر، گوێ نەدەر، گەللایی، گوەفرە، هۆتۆ. 2) نەترس، بوێر.

**لاحصی:** بێ‌ژمار، لەژمارنەهاتوو.

**لادری:** 1) نەناسراو، نەناس. 2) نازانم، نازانم کاری.

**لادریگری:** بروا بەوەی کە ناسینی دوایین هەقیقەت(وەک خوا) بۆ مرۆ محاڵە.

**لاأقل:** لانیکەم، هیچ نەبێ، دەسکەم، دەس ئاخر.

**لائح:** ئاشکرا، دیار.

**لائحە:** بروانە:"لایحە".

**لائم:** سەرزەنشت کەر، لۆمەکەر.

**لابد:** 1) ڕەنگە، لەوانەیە، وێدەچێ. 2) ناچار، چاری ناچار. 3) حەتمی، مسۆگەر.

**لابدی:** ناچاری.

**لابراتور:** تاقیگا، تاقیگە، ئەزموونگە.

**لابشرط:** مەرجدار بە هیچ شتێك.

**لابلا:** تەنشتاوتەنشت، لاولا، لەسەرلا، لابەلا.

**لابە:** 1) پاڕانەوە، وەپاڕ، ڕاڤەر، کرووزانەوە، لاڤ، لاڤایی، لاڤاهی، لاڤە، لالآن، لاڵە، لاڵیان، لالکە، سکاڵە، شاکە. 2) عوزرخوازی، لێبوردن خوازی. 3) فرتوفێڵ، فریو. 4) نیگەرانی، پەرۆش. 5) بروانە:"تملق". "**لابەکردن**": پاڕانەوە، پاڕیان، پاڕیانەوە، وەپاڕان(ەوە)، لالآنەوە، لوباندن، لەبەیش، تکا و داواکردن. "**لابەکننده**": لالکەر، لالکەهاس، کەسێ کە دەپاڕێتەوە.

**لابەساز:** 1) گریان و لالکەر. 2) ڕووبین، ریاباز، ڕووپاما، مەراییکەر، زمان لووس.

**لابی:** لابی، گروپ یان ڕەوتێك کە هەوڵ دەدا کاریگەری بخاتەسەر دەسەڵاتداران یان کەسانێك لە ئاراستەی بەرژەوەندی یان ئارمانی خۆیاندا.

**لابیدن:** بروانە:"لابەکردن".

**لاپ:** 1) بروانە:"لاف و گزاف". 2) قاش. 3) بەتەواوی، یەکجێ. "**لاپ آمدن**": 1) خۆهەڵکێشان، لاف لێدان، بەخۆهەڵگوتن، شات و شووت کردن. 2) دەبە و تەشقەڵە پێکردن لە گەمەدا، حاشالێکردن.

**لاپایی:** لێخە، ڕێخە، ناوپایی.





**لاپورت:** بروانە:"راپرت".

**لاپوست:** ژێرپێست.

**لاپۆشانی:** داشاردن یان داپۆشینی عەیب و خەتایەك بە زیرەکی و فەندوفێڵ، ماسماڵی، داپۆشین و دەرنەخستنی عەیب و کەموکورتی شتێك.

**لاپە:** قاش.

**لات:** لات.

**لاتاری:** شانس و بەخت تاقیکردنەوە، پشك هاویشتن.

**لاتحصی:** بێ‌ژمار، زۆر.

**لات روبی:** بروانە:"لای‌روبی".

**لاج:** ڕووت، پەتی.

**لاجان:** لاواز و دەردەدار، کز، لەڕ.

**لاجرعەنوشیدن:** فڕکردن، هەڵقوڕاندن، یەکجێ خواردنەوەی تراو.

**لاجرم:** 1) ناچار، ناعیلاج. 2) سەرەنجام، ئەنجام.

**لاد:** 1) بناغە، بنیات. 2) خاك. 3) دیوار.

**لادە:** بێ‌ئەقڵ، گەمژە، گەوج.

**لادین:** بێ‌دین.

**لارج:** بروانە:"لارژ".

**لارژ:** 1) دەست و دڵ ئاوەڵە، بەخشندە. 2) ئەنازەی گەورە.

**لاروبی:** بروانە:"لای‌روبی".

**لاریب:** 1) بێ شك و گومان. 2) جێی بەقا، جیی دڵنیایی.

**لازم:** 1) پێویس، پێویست، پێداویست، لەوەجە، تەوزی، لازم. 2) (ڕێزمان) تێنەپەڕ. "**لازم آمدن**": پێویست بوون. "**لازم الاتباع**": ئەوەی پێویستە پێڕەوی لێ بکرێ. "**لازم الاجراء**": شتێ کە جێبەجێکردنی واجبە. "**لازم داشتن**": 1) پێویستی پێبوون. 2) پێبوونی شتێ. "**لازم شدن**": 1) پێویست بوون، واجب بوون. 2) نیشەجێ‌بوون، دایمی بوون. "**لازم کردن(گرداندن)**": واجب کردن، پێویست کردن. "**لازم گرفتن**": بەردەوام هاوڕێیەتیکردن. "**لازم نکرده**": پێویست ناکا. "**مصدر لازم**": چاوگەی تێنەپەڕیو.

**لاس:** 1) نیازمەندی جووت گیری. 2) دەست گەمە.

**لاسبیلی درکردن:** گوێ پێنەدان بە قسە یان کردەوەی کەسێك و وڵام نەدانەوە پێی.

**لاس زدن:** 1) گفتوگۆ و شۆخی دوو ڕەگەزی نێر و مێ بە مەبەستی چێژی سێکسی. 2) خۆ سەرقاڵ کردن بە شتێکەوە. 3) دۆستایەتی‌کردنی ژێرکایانە و هەڵپەرستانە بە خەنیم یان دوژمن بە مەبەستی بەهرەوەرگرتن بە قازانجی خۆ.

**لاسیدن:** بروانە:"لاس زدن".

**لاسیما:** بەتایبەتی.

**لاش:** تالآن، برۆ، پوور. "**لاش کردن**": تالآن کردن، بەتالآن بردن. "**بەلاش**": تالآنکارانە.

**لاش:** بروانە: "لاشە".

**لاش:** برێکی کەم. "**لاش کردن**": زایەکردن، بەفیڕۆدان.

**لاشبرگ:** گەڵای وەریوی ڕزیو.
**لاشخور:** داڵ، داڵاش، سوورەداڵ، ورخال، خەرتەل، خرتەل، قەرتاڵ، قەرتەل، سیسارك، سیسارکەکەچەڵە، سیسالەك، کەپەنەکداڵ، کەرگەز، لاشخۆر، هەر جانەوەرێ حەیوانی تۆپیو بخوا.
**لاشریك:** تاقانە، یەکانە، بێهاوتا.
**لاشعور:** نەست.
**لاشە:** 1) جەندەك، کەلاك، تەرم، کەلاش. 2) دەزگای لەکارکەوتە و خراو. 3) بلیت و بەڵگە و شتی وا کە ئێعتباری تەواو بووبێ. 4) ئەسپ یان کەری پیر و لەڕ. **"لاشەکردن"**: پووچەڵ کردنەوە، سڕینەوە.
**لاشی:** 1) بڕوانە:"بی بندوبار". 2) تایبەتمەندیی ژنێکی سۆزانی کە بە تێپەڕبوونی زەمان ناحەز و چرچ و نەخۆش دەبێ و وەك جەندەکێکی مردوو وەلادەخرێ.
**لاشیدن:** تالان کردن.
**لاعلاج:** 1) دەستەوەستان، ناعیلاج، ناچار، مەحتەل ماو. 2) لەناچاریدا. 3) بێدەرمان، بێ عیلاج.
**لاعیە:** بڕوانە:"لاغیە".
**لاغ:** 1) گەمە، کایە، شۆخی. 2) فەندوفێڵ، فرتوفێڵ.
**لاغر:** چەنجووز، چیقاڵ، ڕەقاڵ، ڕەقەڵ، ڕەقەڵە، قۆر، قیپ، نزار، کز، لاواز، لەڕ، لەجەر، داڵگۆشت، گوجەر، چرچ. **"لاغر اندام"**: باریکەڵە، باریکەڵانە. **"لاغر بی نمود"**: مردەڵە، مردوڵە، کزوکەنفت. **"لاغرپژمردە"**: قرخۆڵ، داڵگۆشتی سیس و پیس. **"لاغر شدن"**: کزبوون، لەڕبوون، لاوازبوون، قیپ بوون، ڤرچقین، گۆشتی لەش کەمکردن. **"لاغر مردنی"**: کەلەلا، لەڕولاواز، ڕەقوتەق، ڕەقوڕەواڵ، ڕەقووشك، سیخن، سیخنە، سی پۆخ، ڕیقن، ڕیقنە، ڕیقۆ، ڕیقوفیق، ڕیقۆڵە، فێق، فێقن، قارپچۆك، قارووچ، قەڵسۆك، قاڕووعەم، قاریت، مەڕنەمووکە، مەرووز، مردۆخ، مردۆخە، کۆپڵ، گەڕك، گەڕکە، ڕینك، ویسك، بەکلکێ.
**لاغرو:** زۆر کز.
**لاغری:** کزی، لاوازی، لەجەری، چرچی.
**لاغیە:** قسەی قۆڕ و پووچ.
**لاف:** گەف، هەلات، خۆهەڵکێشان، هۆشەکاری، قسەی بێ بنەما، لاف. **"لاف و گزاف"**: بافیش، تاریفیخۆکردن، شات و شووت، فۆرت، خۆهەڵکێشانی بەدرۆ، فیشاڵ، هات وهووت، هارت و هورت، هاشوهووش، هاشەوهووشە، چاپ و چووپ، چاخان و پاخان، درۆودەلەسە، درۆوهەڵبەستە، چاوڕاو، چرپوچاپ.
**لاف زدن:** ددانەدن، داخوڕین، چاپکردن، چاپ لێدان، دەڤ ئاویتن، خۆهەڵکێشان، خۆهەڵدان، خۆهەڵشرنگاندن، پەسنی خۆدان، بەخۆهەڵگوتن، خۆهەڵخستنەوە، شات و شووت کردن، هوشەکردن، درۆهەڵبەستن، لاف لێدان.





**لافزن:** بەدرۆخۆهەڵکێش، زڕتۆك، زڕجان، فیشاڵباز، فیشاڵکەر، فیشاڵچی، هاشەکەر، هوشەکەر، بەشات و شووت، هولباف، چاخان، قسەزل. **"لافزن بیکارە"**: باپیڤ، ڕەشەکە، خۆهەڵکێشی بێهونەر، قسەزلی هیچ کارە.
**لافندە:** بڕوانە:"لافزن".
**لافیدن:** بڕوانە:"لاف زدن".
**لاق:** شیاو، لایق.
**لاقید:** حولحولی، گەللایی، بێبار، قەفال، کەترە، کەترەخەم، کەمتەرخەم، گوێنەدەر، بەڕەڵا، لامل، وڵحێ، شێت و وێت.
**لاك:** 1) قاوخ، قاپووڕ، قاپووڕك. 2) کیسەڵ. **"در (توی) لاك خود بودن (فرورفتن)"**: لە خۆدابوون، تەریك و گۆشەگیربوون.
**لاکردار:** بێ گفتوگۆ، بێ قسە.
**لاك و مهرکردن:** لۆك کردن، داخستن و مۆرکردن.
**لاکون:** کەلێن، بۆشایی.
**لال:** 1) لاڵ، لال، بێزوان. 2) بە ڕەنگی سوور.
**لالایی:** دەلالێ، لالای، لایلایی، لاییلایی، لایلایە، لایەلایە، لۆرك، لوورکنایش، لووریلووری، گۆرانی بۆ دەخەوکردنی منداڵ.
**لال بازی:** تێگەیاندن بە ئاماژەی دەست و دەموچاو. **"لال بازی درآوردن"**: بە ئانقەست خۆ وەك لاڵ نیشان دا، لاسای لاڵەکان کردنەوە.
**لالستان:** 1) بڕوانە:"لالەزار". 2) دەموچاو و ڕوخساری جوان.
**لالکایی:** بڕوانە:"کفاش".
**لالك دوز:** بڕوانە:"کفاش".
**لالمانی گرفتن:** لاڵ بوون، دەنگ لێوەنەهاتن.
**لالو:** شوێنی دوور لە چاوان و شاراوە.
**لالەزار:** شوێنێ کە گوڵەمێلاقە/ڕەبەنۆکی زۆری لێڕوابێ.
**لالەستان:** بڕوانە:"لالەزار".
**لالەفام:** بەڕەنگی ڕەبەنۆك، ئاماڵ مێلاقە.
**لامان:** فریو، درۆ، چاخان و پاخان.
**لامذهب:** 1) بێ دین، بێ باوەڕ. 2) بۆ دەربڕینی تووڕەیی و ناڕەزایەتی بەکاری دەبەن، لامەسەب.
**لامسە:** ساوانی، ساوایی.
**لامصب:** بڕوانە:"لامذهب (2)".
**لامع:** ڕووناك، ڕۆشن، بریقەدار، بەدرەوشین.
**لامکان:** بێ جێوڕێ.
**لامین:** (پزیشکی) تیغە.
**لاندن:** ڕاوەشاندن، تەکان دان، جووڵاندن.
**لانگ شات:** نمای دوور.
**لانەکردن:** 1) هێلانەکردن. 2) جێگرتن.
**لاو:** 1) پاڕانەوە، لاڵیانەوە، مەرایی.

2) لەدەست چوو. "**لاوشدن**": لە دەست چوون. "**لاو دادن ـــ بەلاودادن**": بەخۆڕایی لەدەست دانی شتێك.

**لاولو:** رازونهێنی، سروتڕ.

**لاوه:** بڕوانە:"**لابە**".

**لاهوت:** 1) جیهانی غەیرەماددی، جیهانی غەیب، جیهانی مانا. 2) لایەنی خوایەتی و غەیرەماددی کەسێك یان شتێك. "**علم لاهوت**": زانستێ کە سەبارەت بە بڕواگەلی پێوەندیدار بە خوایەتی و خواناسی دەدوێ.

**لاهوتی:** مەعنەوی.

**لای:** چڵپاو، لیتە. "**لای و لجن**": تلۆل، زلیتاو، شۆقاف، قوڕولیتە، قوڕ و چڵپاو، لماو، لۆستك. "**گل و لای**": قوڕاو، چڵپاو، ئاوی شلوێ، لەنگێز، لەنگێزە، گڕك.

**لایتجزا:** دابەش نەبوو، جیانەبۆوە.

**لایتغیر:** نەگۆڕ، نەگوهێڕ.

**لایتناهی:** بێکۆتایی، بێبڕانەوە، بێ ئەنجام.

**لا یجوز:** ناهەق، نابەجێ، ناڕەوا.

**لا یحتمل:** ناشۆ، نەشیاو، محاڵ، ئەستەم، ڕێتێنەچوو.

**لا یحه:** 1) نووسراوە، نامەی تێروتەسەل. 2) فاکتۆر. 3) گەڵاڵەیەك کە لە لایەن دەوڵەتەوە بە پاڕلمان پێشکەش دەکرێ.

**لای‌روبی:** جۆماڵ، کووزماڵ.

**لایزال:** پایەدار، هەرمان، نەمر.

**لایشعر:** بێشعوور، نەزان.

**لایعد:** بێژمار، بێسنوور.

**لایق:** 1) شیاو، هێژا، لێوەشاوە، لێهاتوو، لێهاتی، لێهاتگ، ژێهاتی، باب، ڕەوا. 2) لەبار.

**لای کش:** شەڕابخۆر.

**لایم:** لۆمەکەر، سەرزەنشت کەر.

**لایموت:** نەمر، هەرمان.

**لاینحل:** چارەهەڵنەگر، چارەسەرنەبوو، دژوار.

**لاینفك:** جیانەبۆوە، نەکراوە.

**لاینقطع:** پەیتاپەیتا، لێکدالێکدا، بێ برانەوە، بێپسانەوە.

**لایه:** توێ، توێخ، لۆخ، چین، لا، لۆچ، قەد.

**لایەبرداری:** سووتاندنی بەشێك لە دەموچاو بە ماددەی تایبەتی بەمەبەستی ساف کردنی پێست و لەناوبردنی زیپکە.

**لایی دادن:** سەرنج نەدان و بەشێوەی سەرچڵی ئەنجامدانی کارێك.

**لاییدن:** 1) ناڵاندن، لووراندن. 2) چەڵتەبازی، کۆڵەوێژی.

**لایی کشیدن:** کەوتنەبەرەوە، کەوتنەپێشەوە، بەخێرایی و بەشەفتووری لە نێوان دوو ماشێنەوە دەرچوون.

**لائیك:** سیکۆلار، لاییك.

**لئامت:** 1) پەستی. 2) بەخیلی، پیسکەیی، ڕژدی.





**لئیم:** بەخیل، پەست، نزم.

**لب:** (لَ) 1) لێو، لەو، لو، لچ. 2) لێوارەی هەر شتێ. "**لب**": (بِ) لێوارەی، کەنارەی. "**لب آراستن**": قسەکردن، ئاخاوتن. "**لب از لب بازکردن (بلندکردن، واکردن، گشودن)**": قسەکردن. "**لب باز(وا) کردن**": ئاخاوتن، قسەکردن. "**لب بر لب**": لێو لەسەر لێو، لە حاڵی ماچ کردن دا. "**لب برین**": لێوی سەرۆ. "**لب فروبستن**": قسەنەکردن، بێدەنگ بوون، متەق لێوەنەهاتن. "**لب بە سخن گشودن**": دەست بە قسە کردن. "**لب به لب**": 1) پڕ، لێوانلێو، لچانلیچ. 2) لەسەر لێوارەی شتێ کەتوو. "**لب به مهر بودن**": نەخواردن و نەخواردنەوە. "**لب ترکاندن**": لێوکردنەوە بۆ وتنی بابەتێ، قسەکردن. "**لب تر کردن**": 1) لێو تەڕکردن، خواردنەوەی تراوێ بە ڕادەیەکی کەم. 2) وتنی قسەیەك بە کورتی، ئاماژەکردن. "**لب جنباندن**": 1) بە ئەسپایی قسەکردن. 2) جووڵاندنی لێوەکان. "**لب چیزی را درز (بخیە) گرفتن**": تەواوکردنی، درێژەنەدانی، بڕینی ئەو. "**لب دادن**": ماچ دان. "**لب دوختن**": دەم دروون، قسە نەکردن، دەنگ نەکردن. "**لب زدن**": 1) لاسای جووڵەی لێوی بێژەر یان ستران بێژێ کردنەوە بە تایبەتی لە فیلم هەڵگرتنەوەدا. 2) کردنەوە و بەستنەوەی زار بۆ هەناسەکێشان. "**لب زدن بە چیزی**": خواردن یان خواردنەوەی کەمێك لەو، لێو بۆ بردن. "**لب کلفت**": لچ ئەستوور، لچ قەوی، لچ کولێرە، لچن، لچۆ، لچە، کولێرەلێو، سێڵێف. "**لب گرفتن**": ماچ کردن. "**لب گزیدن (خاییدن)**": 1) لێو گەستن یان لێو کرۆشتن(زۆرتر لەبەر پەشیمانی). 2) ماچ کردن. "**لب گشودن (گشادن)**": دەست بە قسەکردن، ئاخاوتن. "**لب لب**": لێو، لێوارە، کەنارە. "**لب ورچیدن (برچیدن)**": لچ و لێو تێکنان، لچ و لێو هەڵقرچاندن. "**لب و لنج**": بڕوانە:"لب و لوچە". "**لب و لوچە**": دەم و فلچ، دەم و لەوس، دەم و لێو، لەپ و لەوس، لچ و لێو، قرپوقەپۆز، قورپوقەپۆز، لیمتۆر. "**بە لب گور رسیدن**": بە کۆتایی گەیشتنی تەمەن، لە مەرگ نزیك بوونەوە. "**تا لب گور**": تا کاتی مەرگ، تا وەختی مردن، تا لێواری گۆڕ. "**تو(ی) لب رفتن (شدن)**": ناڕەحەت بوون، قەڵس بوون. "**زیر لب**": لە ژێر لێوانەوە، بەئەسپایی، ئارام.

**لبّ:** (لُ) 1) پوختە و هەڵبژاردەی شتێ. 2) کاکڵی، کاکڵە، ناوك/ناوەرۆکی شتێ. 3) ئاوەز، ئەقڵ. "**لب کلام (مطلب)**": کاکڵی قسە، پوختە و کورتەی ئاخاوتە، کرۆکی بابەت، نێوەرۆکی بابەت. "**لبِ لباب**": چۆڕاوە و شیلەی شتێك، سەرتڵ، سەرچن، پوختە. "**لب و پوست کنده**": پوخت و بێ پەردە.

**لباب:** 1) بژارده و پوخته له هەر شتێك. 2) ناوك، نێوك، ناوەرۆك. 3) ئاوەز.

**لباس:** جلوبەرگ، جلك، پۆشاك. "**به لباس چیزی درآوردن**": به شكڵی ئەو دەرهێنان. "**به لباس کسی درآمدن**": وەك ئەو جلوبەرگ پۆشین و لاسای ئەو كردنەوە.

**لباقت:** جوانی دەموچاو.

**لبالب:** پڕبەپڕ، پڕاوپڕ، لێوانلێو، لێوالێو، لێوڕێژ، لوالەو، لچانلچ، لچانلیچ، لیپان، لیپان لیپ، لیپاولیپ، دەرگاخن، دارماڵ، لەمالەم، تژە.

**لب پر:** (لَ.پَ) شتێ كە لێوەكەی پەڕی بێ یان شكابێ. "**لب پر زدن**": كەلاوكردن یان لێوڕێژبوون. "**لب پرشدن چیزی**": شكانی لەتێكی چووكە له لێوارەكەی.

**لب پریده:** لێوپەڕیو، لێوشكاو.

**لب چسب:** زۆر شیرین.

**لبخند:** دزەخەنە، بزە، بەلێوخەنین، زەردەخەنە، زەردەخۆ، لچ خەنە، گرنژ، گورمز، گورمزین. "**لبخندزدن**": بزەكردن، گرژین، گرژینەوە، گرنژین، گورمزین، ڤەكرژین، بزە هاتنە سەر لێوان.

**لب خوانی:** 1) شێوەیەك بۆ تێگەیاندنی كەڕو لاڵەكان. 2) تێگەیشتن لە قسەی كەسێك لە ڕووی جووڵەی لێوەكانییەوە.

**لب دوز:** زۆر شیرین.

**لبریز:** سەرڕێژ، كەفرێژ، كەفەرێژ، پڕاوپڕ، لێوڕێژ، لێڤ ڕێژ، مەتەلۆس. "**لبریزشدن**": سەرڕێژبوون، كەفرێژبوون، كەلاوكردن.

**لب سوز:** داغ بە جۆرێ كە لێو بسووتێنێ.

**لب شكری:** لێوكەت، لەوشەقاتا.

**لب شور:** كەمێك سوێر.

**لبنیات:** سپیاتی، سپیایی، سپیاهی، شیر و بەرهەمەشیرییەكانی وەك ماست و پەنیر و دۆ.

**لبنیاتی:** 1) شوێنی فرۆشتنی سپیاتی. 2) بەرهەم هاتو لە سپیایی.

**لبه:** لێو، لێوارە، كەنار، كەنارە.

**لبەدار:** لێودار، بەلێوارە.

**لبیب:** ژیر، بەئاوەز.

**لبیدن:** شات و شووت كردن، هارت و هورت كردن، چەڵتەبازیكردن.

**لبیك:** 1) قبووڵی دەكەم، سەرم لەڕێتە. 2) بەڵێ. "**لبیك زدن**": 1) وتنی "لبیك". 3) وڵامی بەڵێ (ڕازی بوون) دانەوە.

**لپ:** (لُ) گۆنا، كولم. "**از لپ كسی خون چكیدن**": بەكەیف و جوان بوونی ئەو، بوونی گۆنای سوور بە ڕەنگی خوێن.

**لت:** 1) تای دەرگا و پەنجێرە. 2) لەت، پارچە، تیكە. "**لت لت**": پارچەپارچە، پاژپاژ، لەت لەت. "**لت و پار**": شڕ و وڕ، شڕوپەتۆر، لەت و پەت، لەت و كوت، شەلوپەت، شەق و پەق، شەق و شۆق، پارچەپارچە، ژڤارژڤار، ونجڕ، هەپروون، ورد و خاش.





**لت:** زللە، شەپلاغە، زەربە. "**لت خوردن**": زللەوێكەوتن، زەربەوێكەوتن. "**لت زدن**": 1) شەپلاغەلێدان، زەربەلێدان. 2) بە توندی لێكدان و تێكەڵكردن. 3) تووڕەبوون و ئازارپێگەیاندن. "**لت كردن**": بە توندی لێكدان و تێكەڵكردن.

**لتارژی:** سڕی، حاڵەتی وەك مەرگ.

**لت انبار:** نەوسن، چڵێس، چەفتلیس، كاسەلێس، زگ لەوەڕێن، زۆرخۆر، هەڵمەتەكاسە.

**لت انبان:** 1) بڕوانە: "لت انبار". 2) بێ پەنا، بێ سەرپۆش.

**لت خوارگیر:** ئەوەی ستەم لە ژێردەستان و ستەم لێكراوان دەكا.

**لت خواره:** خۆڕاگر، بەسەبروپشو، بەگیر.

**لتره:** كۆنە، دڕاو.

**لته:** 1) تای دەرگا و پەنجێرە. 2) پارچەی كۆنە، پەڕۆ. 3) بەرگی كۆنە. "**لته حیض**": كۆنەیەك كە ژنان كاتی عادەتی مانگانە كەڵكی لێوەردەگرن. 2) كەس یان شتی زۆر بێ نرخ. "**لته در حلق ماندن**": بێدەنگ مانەوە، بێدەنگ بوون. "**لته زدن**": پاك كردنەوەی شتێ بە كۆنەپەڕۆی شێدار. "**لته‌لته**": پارچەپارچە، لەت لەت، تیكەتیكە.

**لج:** پێداگری لە دژایەتیدا، پێچەقاندن. "**لج كردن**": بەڕق داچوون، دەركەوەچوون، بەقیناچوون، حەنگرین، یەكپێ لەسەر شتێ سوور بوون، نەهاتنەسەرڕێ، لابوون. "**لج كسی درآمدن**": ناڕەحەت و قەڵس بوونی ئەو. "**با كسی لج بودن**": دوژمنایەتی و دژایەتیكردن دەگەڵ ئەو. "**سر لج افتادن**": قەڵس بوون و پێ چەقاندن.

**لجاجت:** پێداگرتن، پێچەقاندن، لاساری، دالیان، گوێ نەبیسی، ڕەچو، سەرسەختی، گەگری، گەدەبەلی، سەرەخەری، پەڵپ گرتن، سەرگوزری، ژبەرڤەچوون، ملەجووڕێكردن، لابەلایی، سووربوون لەسەر مەبەست، دەس هەڵنەگرتن، یەك دندەیی، نەهاتنەسەرڕێ، لەسەر كار مانەوە.

**لجاره:** بێ حەیا و زمان درێژ(ژن).

**لجام:** بڕوانە: "لگام".

**لجباز:** سەرخەر، مقڕ، سامنج، لاسار، لا، لابەلا، لاڕێ، گوێنەبیس، بەگیرە و سەرسەخت، سەرسەخت و گیڕ، سەرسەخت و نەگونجاو، گیڕ و پەڵپگر، پێچەقێن و نەساز، مانگر، ماڕژ، لەچەر، قیرسیچم و نەگونجاو، كەللەڕەق، كەللەشەق.

**لجبازی:** بڕوانە: "لجاجت".

**لجن:** 1) جلێتاو، زلیتاو، قوڕاو، لیتە، لیتاو، چڵپاو، لیجە، هەرگاو. 2) پەست و گەندەڵ و پیس. "**به لجن كشیدن كسی**": بەدناوكردنی ئەو، ناوزڕاندنی ئەو. "**در لجن فرورفتن**": بە تەواوی تووشی بەدبەختی یان گەندەڵی بوون.

**لجنزار:** 1) تەقن، جێگەی پڕ لە قوڕ و لیتە. 2) فەزایەكی تێكەڵ بە بەدناوی و گەندەڵی.

**لجن مال:** 1) قوڕاوی. 2) ناوزڕاو، بەدناو، ڕیسوا.

**لجنه:** لێژنە، گروپێکی پسپۆڕ و تەرخانکراو بۆ کارێك.

**لجنی:** 1) قوڕاوی، جلێتاوی. 2) سەوزی تۆخ.

**لجوء:** داڵدە، پەنابردنەبەر.

**لجوج:** لاسار، گوێنەبیس، گوێنەدەر، ڕەچوکار، کەللەشەق، کەللەڕەق، سەرسەخت، سەرڕەق، کەمۆت، پەلپگر، پێداگر، پێچەقێن، زارزار، قیڕسیچم، قیڕسیچمە، سرتغ، یەك دندە، نەساز، نەگونجاو.

**لج:** (لَ) دەموچاو، ڕوومەت.

**لج:** (لُ) ڕووت، پەتی.

**لچر:** 1) مرۆی پەست و نزم. 2) پیس، چڵکن، پەڵۆخ. 3) بڕوانە: "شهوانی".

**لحاظ:** 1) بە گۆشەی چاو ڕوانین، چاوەدێریکردن. 2) ڕوانگە. "**از لحاظ**": لەباری، لە بواری، لەڕووی. "**لحاظ کردن**": لەبەرچاوگرتن، بە حەساو هێنان. "**از لحاظ کسی گذراندن**": ئاگادارکردنەوەی ئەو لیی، خستنە بەرچاوی ئەو.

**لحام کردن:** 1) لەحیم کردن، جۆشدان. 2) سارێژکردنەوە.

**لحظات:** کۆی "لحظە".

**لحظه:** چرکەسات، سات، کات، چاوتروکانێك، کێلێك، تاو، دەمووکە. "**لحظەبەلحظه**": سات بە سات، سات دوای سات. "**لحظه واپسین**": دوایین هەناسەکانی ژیان، کاتی مەرگ. "**در لحظه**": دەزبەجێ، جێبەجێ، خێرا.

**لحظەای:** 1) کاتی، کاتەکی، تیژتێپەڕ. 2) لەساتێکی کورتدا، خێرا.

**لحظه شماری:** سات ژمێری، چاوەڕوانیکردن بە تامەزرۆییەوە.

**لحن:** 1) چۆنیەتی دەربڕینی دەنگ. 2) شێوە یان چۆنیەتی دەربڕینی قسە. 3) (مۆسیقا) مێلۆدی. 4) خەتا و هەڵە لە ئاخاوتندا.

**لحیم کردن:** جۆشدان، لەحیم کردن، بەسەریەکالکانی کانزا بە قالآیی و ئاگر.

**لخت:** (لُ) 1) ڕووت، ڕوویت، ، ڕوویچ، ڕوهت، پەتی، ڕووس، زەلوت، شەل، ڤڕێ، بێ پۆشاك، بێ بەرگ. 2) بەتاڵ، خاڵی. "**لخت شدن**": شەلین، شەلان، جل لەبەر خۆداکەندن، ڕووت بوونەوە. "**لخت کردن**": شەلاندن، ڕووت کردن، ڕووت کردنەوە، ڕوهت کرن، قووت کردن، جل لەبەرداکەندن، ژبەرڤەکرن، (لخت کردن از دارایی) سوخت کردن، ماڵ لێ سەندن، تالآن کردن. "**لخت مادرزاد**": 1) ڕووت و قووت، هیچ دەبەردانا. 2) نەدار، فەقیر. "**لخت و پتی**": 1) ڕووت، پەتی. 2) نەدار و دەسکورت. "**لخت و عور**": ڕووت و قووت.

**لخت:** (لَ) 1) پاژ، لەت، تیکە. 2) سست، بێحاڵ، کەم جووڵە. 3) نەبوونی





هەستیاری سەبارەت بە مەسەلە ئەخلاقییەکان، ئاسانگر. "**لخت لخت**": 1) پاژپاژ، لەت لەت. 2) کەم کەم، کەمەکەمە، بڕەبڕە. "**لختی**": 1) تاوێك، دەمووکەیەك، کەمێك، گامێ، هەلی. 2) سستی، بێحاڵی.

**لختك لختك:** کەم کەم، هێواش هێواش.

**لختکی:** کەمێك، کەمەکێ، کەموسکەیەك، هەندەك، هێندێ، هەندێك، چکێ.

**لخته:** 1) دەڵەمە، دۆڵەمە، دۆڵەمێ، مەییو، ڕس، ڕچ. 2) لەت، تیکە. "**لختەشدن**": مەیین، گیرسان، قرتماغەبەستن، ڕسیان، ڕچیان.

**لخچه:** سکڵ، پۆلوو، پشکۆ.

**لخشان:** خز، لووس و خلیسك.

**لخشش:** بڕوانە: "لغزش".

**لخشنده:** خز.

**لخشه:** بڕوانە: "لخچە".

**لخشیدن:** 1) خلیسکان، هەڵخلیسکان، شەمتین. 2) درەوشانەوە، گەشانەوە.

**لخلخ:** لاواز، بێهێز، کز.

**لدغ:** گەستن، پێوەدان.

**لدی:** کن، لای، لەدەو.

**لذایذ:** کۆی "لذیذ"، چێژەکان، تامەکان.

**لذّت:** چێژ، چێژە، بەتامی، خۆشی. "**لذت بردن**": چێژبردن، هەست بە چێژ کردن.

**لذت بخش:** بڕوانە: "لذیذ".

**لذت گرا:** چێژخواز.

**لذت گرایی:** 1) چێژ خوازی، خوازیاری خۆشی و چێژبردن. 2) بڕوانە: "اپیکوریسم".

**لذت نفسی:** چێژی دەروونی.

**لذیذ:** بەلەززەت، بەتام، تامدار، بەچێژ، خۆش چێژە، خۆشتام.

**لرد:** (لَ) سارا، بیابان، گۆڕەپان.

**لرز:** 1) لەرز، لەرزە، لەرە. 2) تا، تاولەرز، چۆق. "**لرز کردن**": تووشی لەرزهاتن.

**لرزان:** لەرزك، لەرزۆك، لەرۆك، لە حاڵی لەرینەوەدا، کەسێ یان شتێ کە دەلەرزێ، (همیشە لرزان) لەرزۆك، لەرۆك، (بسیار لرزان) هژهژۆك.

**لرزاندن/لرزانیدن:** لەرزان، لەرزاندن، لەرزاندنەوە، لەرزاننەوە، لەرزانەوە، وەلەرزەخستن، لەراندنەوە، جووڵاندن، لەنگاندن، هەلاجاندن، هەژاندن، تەکان دان.

**لرزانگر:** شتێ کە دەلەرێتەوە.

**لرزش:** لەرز، لەرزە، لەرزین، لەرە، لەرەلەر، جووڵەجووڵ، جووڵانی بەولاولادا، وەنەنە، دەکو، ژێلی. "**لرزش افقی**": ڕاژان، لۆژ، بزووتن بەولاولادا، لەرینەوە. "**لرزش همیشگی**": هەژهەژۆکی، لەرزینەوەی دایمی. "**بە لرزش درآمدن (درافتادن)**": لەرزینەوە، وەلەرزەکەوتن.

**لرزه:** 1) لەرز، لەرزە. 2) تا، تاولەرز. 3) بوومەلەرزە. "**لرزه افكندن در چيزى**": 1) لەراندنەوە، وەلەرەخستنی ئەو. 2) لەق كردنی ئەو. "**لرزه بر (به) اندام كسى افتادن**": زاڵبوونی ترس و خۆف بەسەر ئەودا، زۆر ترسانی ئەو. "**لرزه پيا پى**": لەرەلەر، لەرەی زۆر. "**لرزه گرفتن**": تووشی لەرز هاتن. "**به لرزه درآمدن**": وەلەرزەكەوتن، لەرزين. "**پس لرزه**": پاش لەرزە.

**لرزەشناسى:** زانستی موتاڵای بوومەلەرزەكان و تاوتوێكردنی پێكهاتەی ناوەوەی زەوی.

**لرزيدن:** 1) لەرينەوە، لەرزانەوە، لەرزين، لەرزينەوە، ڕەجفين، تەكان خواردن، هەژان، هەژهان. 2) زۆر ترسان. "**لرزيدن از سرما**": هەڵ لەرزين، چۆقان، چۆقيان، لەرزين لە سەرما و نۆبەتی. "**بر خود لرزيدن**": تۆقين لە شتێك، زۆر ترسان.

**لرس:** زللە، زەربە، كوتەك.

**لزج:** ليق، ليلق، لينج، لچق، ليچق، لينچق، لينچك، لنج، ليغيز، نەرمەليقە، چلێق، خليچك، چڤر. "**لزجى**": ليچقايی، ليچقی، لينجی، لينچقی. "**مايع لزج**": لينجاو، ليچقاو، لينچقاو، لينچكاو، زنچكاو.

**لزوجت:** لينجی، ليچقی.

**لزوم:** 1) پێويستی، پێويست بوون. 2) بەردەوام لە تەك كەسێك يان شتێك بوون. "**لزوم داشتن**": پێويست بوون.

**لزوماً:** حەتمەن، بەپيی پێويستی.

**لژن:** بڕوانە: "لجن".

**لس:** (لَ) 1) شەپڵەلێدراو، دەست و پێ شل و بێ هەست. 2) سست، شل.

**لس:** (لُ) كوتەك، زەبر. "**لس خوردن**": كوتەك خواردن، زللەخواردن.

**لسان:** 1) زمان. 2) قسە، پەيڤ، ئاخاوتە.

**لسانى:** 1) زمانی. 2) گوتاری، زارەكی، لەبزی، دەڤكی.

**لش:** 1) تەرم، جەندەك، كەلاك. 2) ئاژەڵی كەوڵ كراو. 3) بێكارە، تەوەزەل. 4) بلّح، ولّحێ، چەورە، ماڵانگەڕ. 5) قەوارەی خراو و لەكاركەوتو يان كۆنەی ماشێن. "**لش و پش افتادن**": سست و بێحاڵ كەوتن لە شەكەتيان. "**لش ولوش**": 1) بێ سەروبەر، بێغيرەت. 2) لات و بێ سەروپێ.

**لشتن:** بڕوانە: "ليسيدن".

**لشكرآرا:** فەرماندەری لەشكر، ڕازێنەوە و تەكووزكەری لەشكر.

**لشكرآراستن:** ڕێكوپێككردن و ئامادەكردنی لەشكر بۆ شەڕكردن دەگەڵ دوژمن.

**لشكرشكن:** لەشكرشكێن، زۆر دلێر و شەڕكەر.

**لشكرشكوف:** لەشكرشكێن، دلێر.

**لشكركشى:** سپاڕانی، لەشكركێشی.





**لشكرگاه:** ئوردوگا، لەشكرگا، شوێنی لەشكر لە گۆڕەپانی شەڕدا. "**لشكرگاه زدن**": مانەوەی لەشكر لەجێيەك.

**لشكرنويس:** خەزێنەداری لەشكر.

**لشكرى:** سەرباز، نيزامی، سپايی، چەكداری لەشكر.

**لش كش كردن:** بەشان دادانی كەسێك بەشێوەی جەندەك.

**لش مرده:** جەستەی بێگيان.

**لشن:** 1) تەخت، ساف. 2) ساكار و بێ نەخش و نيگار.

**لشى:** بڕوانە: "رخوّت".

**لطافت:** 1) نەرمی و ناسكی، نەرمونيانی. 2) گەشی و شلكی وجوانی، قەشەنگی. 3) سووك بوون(هەوا). 4) تامدار و بەگيان خۆش. 5) دلۆڤانی، دڵنەرمی. 6) ناسكی، جوانی. "**لطافت دادن**": گەشاندنەوە و جوانكردن. "**لطافت داشتن**": جوان و خەياڵ ورووژێنەر بوون. "**لطافت نظر**": وردبينی، باريك بينی.

**لطايف:** 1) خاڵە ورد و ناسكەكان. 2) قسەگەلی نەرم و دڵپەسند. 3) ناسك كاری. 4) هەقايەتەكورتەكانی تێكەڵ بە پەند و نوكتە. 5) شتە جوان و باشەكان. 6) تەگبيرگەلی زيرەكانە.

**لطف:** (لَ طَ) نەرمی. "**لطف كردن**": نەرمی نواندن.

**لطف:** (لُ) 1) دلۆڤانی، چاكێتی. 2) نەرمی، نەرمكێشی، مدارا. 3) يارمەتی، ياريدە. 4) ناسكی و جوانی. 5) سووكی(هەوا). 6) لێبوردن، بەخشين. 7) بەخششش، بەخشين. "**لطف داشتن**": 1) خۆش بوون، جێگەی دڵخۆشی بوون. 2) خۆش ويستن، دلۆڤانیكردن. 3) ناسك و جوان بوون. "**لطف طبع**": 1) ناسكی و جوانی سروشتی. 2) خۆش تەبعی لە شاعيريدا. "**لطف كردن**": خۆشويستن يان دەربڕينی خۆشەويستی. 2) دان، بەخشين. 3) خێركردن، بەخشينەوە. 4) بڕوانە: "گراييدن".

**لطفاً:** تكايە. "**لطفاً و عنفاً**": بە دلۆڤانی و قەڵسی، بە لەسەرخۆيی و تووڕەيی، بتەوێ و نەتەوێ.

**لطمات:** كۆی"لطمە"، ئازارەكان، ئێشەكان. زەربەكان، زللەكان.

**لطمه:** 1) زەربە، ئازار، ئێش. 2) خەسار، زيان. 3) زللە، شەپڵاغە. "**لطمه خوردن**": زەربەوێكەوتن (زەربەخواردن) و ئازارپێگەيشتن. وەبەر زللەدران، شەپڵەخواردن. "**لطمه زدن به كسى(چيزى)**": 1) زەربە و ئازارپێگەياندن بەو، زەرەردان لەو. 2) شەپڵاغەدان لەو. "**لطمه وارد آمدن(شدن) به كسى (چيزى)**": زەربە و ئازارپێگەيشتن، زەرەرپێگەيشتن.

**لطمور:** زۆرقەڵەو.

**لطیف:** 1) نەرم و ناسك، نەرمونیان. 2) ناسك و جوان. 3) نەرم و خۆش ئاهەنگ(دەنگ). 4) پاكژ و سووك(هەوا). 5) فرز و لێزان لە ژەنین دا (سان). 6) ناسك، هەستیار(روح لطیف). 7) لە ناو و سفەتەكانی خوا. 8) بڕوانە: "خوش گوار". 9) هەڵسەنگێنراو و ورد. 10) بڕوانە: "نكتەسنج". 11) (فەلسەفەی كۆن) غەیرەماددی. 12) ناسككار و لێزان.

**لطیف الاعتدال:** بەژن و باڵای ڕێكوپێك و لەبار.

**لطیف طبع:** خۆش تەبع.

**لطیفە:** 1) فشەگاڵتە، نكتە، كوراتا، قسەی خۆش، قسەی گاڵتە، پێكەنینۆك، تیتاڵ. 2) بابەتێكی زۆر ورد و ناسك سەرێلێدەردەكرێ بەڵام پێناسە ناكرێ. 3) (فەلسەفەی كۆن) شتی غەیرەماددی وەك ڕۆح. 4) هەڵبژاردە، پەسندكراو.

**لعاب:** (لُ) 1) لینجاو، لوعاب، لیاو. 2) هەر تراوێكی خەست كە بكرێ بەو جێیەك سواغ بدرێ. 3) شۆ، كەتیرە. 4) هەر جۆرە سەرپۆشێ كە شتێ لە بن خۆیدا بشارێتەوە. **"لعاب انداختن":** كوڵانی تراوێ كە ماددەی خواردەمەنی یان دەرمانی تێدایە بەڕادەیەك كە ماددەكە لە ناوتراوەكەدا بتوێتەوە و تراوەكە خەست بێتەوە. **"لعاب دادن":** 1) لوعاب لێدان. 2) بڕوانە: "لعاب انداختن".

**لعاب دار:** (ل) دووتوێ، ڕووكێش دار.

**لعب:** كایە، گەمە، قومار. **"لعب باختن":** گەمەكردن، قوماركردن.

**لعبتك:** دەسكەلا، كایەكلێ، لەیستۆك.

**لعب گر:** چاوبەست، كەڵەكباز.

**لعنت:** لەعنەت، لەحنەت، نەحلەت، بێبەش لەبەزەیی، نەفرین كردن، تووك لێكردن. **"لعنت فرستادن(كردن)":** نەحلەت كردن، تووك لێكردن.

**لعنتی:** 1) بەنەحلەت كراو، نەحلەتی. 2) خراو، ئازاردەر.

**لعین:** نەحلەتی، بەنەحلەت كراو، نفرەلێكراو.

**لغ:** هەرشتێ كە لەجیی خۆی قایم نەبێ و تەكان بخوا. **"دهان لغ":** تێدانەوەستاو، قسەگێڕەوە، زاردڕاو.

**لغات:** كۆی"لغت".

**لغام:** بڕوانە:"لگام".

**لغایت:** تا كۆتایی.

**لغت:** واژە، وشە، زمان و ئاخاوتەی هەر نەتەوەیەك كە قسەی پێدەكەن.

**لغت شناختی:** واژەناسانە.

**لغت شناسی:** 1) واژەناسی. 2) زمان ناسی.

**لغت معنی:** پێڕستی وشەكان دەگەڵ ماناكەیان كە لە ژێرەوەی لاپەڕەكان یان لە كۆتایی كتێودا دەینووسن.





**لغتنامە:** وشەدان، فەرهەنگ، فەرەنگ، قامووس. **"لغتنامه مختصر":** فەرهەنگۆك.

**لغت نویس:** فەرهەنگ نووس.

**لغز:** مەتەڵ، مەتەڵۆكە، مەتەڵە، دەناچیە، لیچاڕ، لەگەز. **"لغز فروختن":** سەرداپۆشراو قسەكردن بە نیازی خۆنوێنیكردن.

**لغزان:** خز، لووس و خلیسك، ساف و خز، لە حاڵی خلیسكاندا.

**لغزاندن:** خزاندن، خلیسكاندن، خەشكاندن، ڕەت پێدان، شەمتاندن.

**لغزش:** 1) فسك، خلیسك، خلیسكان، شەمت، شەمتین، لاسوڕ، هەڵلە، شلەپ. 2) هەڵە، خەتا. 3) گوناح.

**لغزنده:** خز، لووس و خلیسك، جێگەی تەحس یان خلیسك.

**لغزه:** قاش.

**لغزیدن:** 1) خلیسكان، هەڵخلیسكان، هەڵخلیسكین، شەمتین، شلەپین، تەحسین، دەرحەسین، خزین، زەلین. 2) لە ڕێگای ڕاست كلابوون، تووشی خەتا و هەڵەبوون.

**لغ ملغی:** لەرزۆك، ناپایەدار، سست.

**لغو:** 1) هەڵوەشاندنەوە، پووچكردنەوە، پووچەڵ كردنەوە.2) قسەی پڕوپووچ.

**لغوی:** كەسێ كە زانستی وشە دەزانێ، وشەزان، زمان ناس.

**لغویون:** زمان ناسەكان.

**لغیدن:** بڕوانە:"لقیدن".

**لفاظ:** كەسێك كە لە قسەكردن دا وشەی جوان یان دژوار بەكار دەبا و كەمتر گرینگی بە مانا دەدا، درێژدادڕ.

**لفافە:** ئەوەی شتێكی تێدا وەپێچن، ئەوەی بەسەر شتێكیدا بپێچن، پەڕۆیەك كە لە شتیەوە دەپێچن.

**لفت دادن:** 1) درێژدادڕی بە بابەتێك. 2) گنخاندنی كارێك، درێژكردنەوەی كارێك.

**لفت و لعاب:** 1) داب و دەستوور. 2) درێژدادڕی.

**لفت و لیس:** 1) كەڵك وەرگرتنی ماڵی گچكە و ناڕەوا یان نامەشروع. 2) بەچێژ و چاوچنۆكی خواردن و خواردنەوە.

**لفج:** لێوەستوور، لچ كولێرە.

**لفظ:** 1) وتە، بێژە، لەبز، وشە. 2) زمان.

**لفظی:** وشەیی، زارەكی، لەبزی، بێژەیی.

**لفیف:** تێكەڵاو و لێك ئاڵۆزكاو. دارستانی چڕ و لێك ئاڵاو. گروپێ لە خەڵك كە لە شوێنێكدا كۆببینەوە.

**لق:** 1) لەق، سست. 2) گەندەڵ، خراو.

**لقاء:** 1) چاوپێكەوتن، بینین، دیداركردن. 2) ڕوخسار، دەموچاو. **"به لقاءالله پیوستن":** كۆچیدوایی كردن، مردن.

**لقاح:** 1) ئاوس بوون، زگ پڕبوون. 2) تێكردنی تۆوی نێرینە لە تۆڵدانی مێینە، كوتئاو، ماكوتە.

**لقب:** سەرناو، بەرناڤ، کەسناو، نازناو، لەقەم. "**لقب دادن**": بەخشینی کەسێك بە نازناوێك. "**لقب زشت**": ناووناتۆرە، سەرناوی پیس و ناپەسند.

**لقب تاش:** هاونازناو، هاوسەرناو.

**لق لقو:** درێژ و ڕەقەڵە.

**لقمه:** 1) پاروو، تیکە. 2) لەتی چووکە، تیکە. 3) خۆراك. "**لقمه از آهن چشیدن**": برینداربوون. "**لقمه اندوختن**": سوالکردن. "(**یك**) **لقمه چپ کردن کسی را**": 1) بەیەکجار خواردنی ئەو. 2) شکست دانی ئەو، تەفروتووناکردنی ئەو. "**لقمه چیدن**": سوالٚ کردن. "**لقمه‌حیا**": دوایین پاروو لە خۆراکی هاوبەشی نێوان دوو کەس. "**لقمه را دهن کسی گذاشتن**": ئەنجامدانی کارێك بەتەواوی بۆ ئەو. "**لقمه‌کردن**": بە شکڵی پاروو دەرهێنان، کردنە پاروو. "**لقمه کسی بودن**": شیاوی ئەو بوون، لە کوردیدا ئێژن ئەوە پارووی من نیە یان قەپانەکەی من نایخوێنێتەوە. "**لقمه کله گربه**": پارووی زۆر گەورە. "**لقمه گرفتن**": پاروو گرتن. "**لقمه گرفتن برای کسی**": 1) دەبەرچاوگرتنی شتێ یان کەسێك بۆ ئەو یان داسەپاندن بەسەریدا. 2) نیازی کوشتنی ئەو هەبوون، کەین و بەین کردن دژی ئەو. "**لقمه گنده‌تر** (**بزرگ تر**) **از دهن خود برداشتن**(**ورداشتن**)": لەئەستۆگرتنی کارێ کە لە توانایی بەدەرە یان بە دوای ئامانجێکی گەورە و وەدەست نەهاتووەوە بوون. "**لقمه‌لقمه**": پارچەپارچە، تیکەتیکە. پاروو پاروو.

**لقمه‌بری:** چاوچنۆك بوون لە خواردن دا.

**لقیدن:** لەقان، لەقین، شل بوون و لەرزین لە بن سستی.

**لك:** 1) قسەی پڕوپووچ، ڕاوە، وڕێنە. 2) گەمژە، گەوج، نزم. 3) سەدهەزار لە شتێ. 4) داغ و خالٚ. 5) پەڵە. 6) بەرگ یان قوماشی کۆنە و شڕ. 7) شڕۆڵ، کۆنەپۆش. 8) بەشێك لە میوە کە خراو و ڕزیوە.

**لکات/لکاته:** 1) بەستۆك، ژنی داوێن تەڕ، ژنی بێ شەرم و بێ حەیا. 2) هەرشتێکی پەست و داماو.

**لکاس:** قەرەوپوولٚ، وردەپوولٚ.

**لکالك کردن:** چەنەلێدان.

**لکام:** بێ شەرم.

**لك درا:** بڕوانە:"بیهودەگو".

**لك(و)لك:** 1) هێواش هێواش و بەزەحمەت. 2) هەڵکرد، ڕابواردنی ژیان.

**لك لکانه:** بەرتیل، ڕێزانە، خەڵات.

**لك لکه:** دادوهاوار، دەنگەدەنگ.

**لکن:** بەڵام، بەڵان.

**لکنت:** گیرانی زمان کاتی قسەکردن، زمان گرانی، زمان قورسی، وەپرتەپرت کەوتن لە کاتی ئاخاوتندا.

**لکنتو:** پرتوکیاگ و کارکردە.

**لکنته:** 1) بڕوانە:"لکنتو". 2) لەکار کەوتوو، لەکارتە، پەك کەوتە، لاواز و بێ هێز.

**لکندو:** بڕوانە:"لکنتو".





**لك و پك:** (لَ. كُ.پَ) 1) کەلوپەلی ناومالٚ لە کاسە و کووزە و فەڕش. 2) هاتوچۆ و هەلوەلا.

**لك و پك:** (لُ.كُ.پُ) زل، قەبە، ناقۆڵا، بەکەندوکۆ.

**لکوپلاست:** پلاستیدی بێڕەنگ.

**لك و لوچه:** بڕوانە:"لب و لوچە".

**لکه:** پنۆ، پنۆك، پەڵە، خالٚ. "**لکه بردامن کسی گذاشتن**": ناوزڕاندن و بەدناوکردنی ئەو. "**لکه شدن**": دروست بوونی پەڵە لەسەر شتێك، پەڵاویبوون. "**لکه گرفتن**": پاك کردنەوەی پەڵە لەسەر شتێك. "**لکه ننگ**": پەڵەی ڕەش. "**دارای لکه‌های زیاد**": خالٚ خالٚ، پەڵەپەڵە، پنۆك پنۆك.

**لکه‌برداری:** هەڵگرتنەوە و سڕینەوەی پەڵە لەسەر شتێك.

**لکه‌دار:** پەڵاوی، بەپەڵە، لەکەین. "**لکه‌دار شدن حیثیت** (**شرافت، وجدان،...**)": ناوزڕان و بێ ئابڕووبوونی ئەو. "**لکه‌دارکردن**": 1) ناوزڕاندن، ئابڕووبردن. 2) پەڵاویکردن.

**لکه‌گیری:** پەڵەهەڵگرتنەوە، پەڵەگیری.

**لکیس:** وردەپوولٚ.

**لگ:** (لَ) گرتووخانە، بەندیخانە.

**لگام:** لغاو، لەغاو، لەخاف، لەخاڤ، لغاڤ. "**لگام بر** (**به**) **چیزی زدن**": خستنە ژێر دەسەڵاتی خۆر، کۆنترۆڵ کردن. "**لگام پیچیدن**(**خاییدن**)": سەرپێچیکردن. "**لگام دادن به جایی**": هێرش بردنە سەر ئەوێ.

**لگام گسیخته:** لەغاوپچڕاو، کۆنترۆڵ نەبوو، بەرهەڵدا.

**لگام ناپذیر:** سەرکێش، نافەرمان.

**لگد:** لەقە، جووتە، لووشکە. پێلاقە. "**لگد انداختن**": لووشکەخستن، لووشکەهاویشتن، لەقەخستن، جووتەوەشاندن. 2) نەچوونە ژێر باری کارێکەوە، سەرپێچیکردن. "**لگد به** (**بر**) **بخت خود**(**خویش**) **زدن**": لەدەست دانی هەلی لەبار و باش. "**لگد به گور کسی زدن**": کەوتنەبەر ئەوەوە لە کارێکا. "**لگدخوردن**": وەبەر لەقەدران، لەقەوێکەوتن. "**لگد زدن**": 1) لەقەلێدان. 2) کاتی تەقەکردن بە قۆنداغە تفەنگ لە شان و سینگی تیرهاوێژدان. "**لگد کردن**": 1) پێشێلکردن، پێڕێخستن. 2) بە زەربەی لەقە لە ژێر پێ کوتان. "**لگد کوبیدن**": بڕوانە:"لگدزدن".

**لگد پران:** چەڕوەشێن، لووشکەهاوێژ، لووشکاوێژ، جووتەوەشێن، جفتەوەشێن، لەقەوەشێن، لەقەهاوێژ، دورمەح.

**لگد پرانی:** جفتەوەشانن، جفتەهەڵخستن، لوشکەهاوێژی، جووتەهاوێژی، هێسترانی.

**لگدکوب کردن:** پاپیانان، پاپیاساوین، پێ ڕێخستن، پێ خوست کردن، پێ لێنان، لەقەشێل کردن.

**لگدمال:** پاشێل، پێشێل، پێخوست، پاکوت، بەپاکوتراو، بەرپێدراو.

**لگوری:** بڕوانە:"فاحشە".

**لماز:** بڕوانە:"نمام".

**لمالم:** بڕوانە:"لبالب".

**لمباندن:** پارووی گەورە گرتن، بەئێرەیی و چاوچنۆکی خواردن.

**لمبر:** تەکان، لەرە، لەرزە.

**لمپن:** دواکەوتووترین کەسەکانی ناوکۆمەڵگا وەك لاتولووت و دزەکان کە لە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکاندا ڕۆڵی نەرێنی دەگێڕن.

**لمتر:** 1) قەڵەو، گۆشتن، زل، ناقۆڵا، تەوەزەل. 2) تەوەزەل، تەمبەڵ.

**لم دادن:** پاڵدانەوە، پاڵۆدان، پشت لێدانەوە، ئاسوودەبوون، ئیسراحەت کردن.

**لمز:** ئاماژەکردن بە چاو و سەر و شتی وا.

**لمس:** 1) بەرکەوتن، دەست لێدان. 2) بەتەواوی تێگەیشتن لە هەل و بارودۆخێك. 3) جووت بوونی سێکسی.

**لمع:** بڕوانە:"درخشش".

**لمعان:** بڕوانە:"درخشندگی".

**لم لمه:** پڕایی و قەرەباڵغی.

**لمن الملك زدن:** ئیددیعای پاشایەتیکردن.

**لمن الملکی:** پاشایەتی، دەسەڵاتدارەتی.

**لمیدن:** بڕوانە:"لم دادن".

**لم یزال:** بڕوانە:"جاودان".

**لم یزرع:** دەغ، بوور، بایر، زەوی نەچێندراو.

**لم یزل:** نەمر، پایەدار، هەربوو.

**لنب:** (لُ) قورس و گەورە.

**لنبه:** قەڵەو، گۆشتن.

**لن ترانی:** 1) قسەی تەوساوی و ناخۆش. 2) هەرگیز من نابینی. "**لن ترانی بار کسی کردن**": تانەلێدان لەو، قسەی ناحەز و ناخۆش بەو وتن. "**لن ترانی خواندن**": وتنی قسەی ناحەز و نارەحەتکەر، تەوس لێدان.

**لنج:** (لَ) هەڵسوکەوتی تێکەڵ بە ناز و بایيبوون. "**به لنج زدن**": لە ڕووی بایيبوون و بەدەمارییەوە کەمتەرخەمیکردن لە کارێك دا کە کەسێك وەئەستۆی گرتوە.

**لنج:** (لُ) لێو و زار. "**لنج آویختن**": ناوچاوتورشاندن، خۆ مڕومۆچ کردن. "**لنج پر باد کردن**": بەپۆزبوون، بایيبوون، لەخۆگۆڕان.

**لنجارەکش:** ڕاکێشان بە زەوی‌دا. "**لنجارەکش کردن**": بە خێشەخێش بردن.

**لنجەکردن:** چەنەلێدان لەبابەت نرخی شتێ دوای مامڵەکردنی.

**لنجیدن:** 1) دەرهاوردن، دەرهێنان، دەرکێشان. 2) بە ناز و لەنجە ڕۆیشتن.

**لند:** ورت، ورتە، پرتە، فرتە، قسەی لە ژێر لێوانەوە. "**لندلند**": ورتەورت، پرتەپرت.

**لندنیکاری:** بەکارهێنانی ڕەنگ لە گێچ بڕیدا.

**لندوك:** 1) درێژ و ڕەقەڵە. 2) جووچکەیەك کە تازە سەری لە هێلکە دەرهێناوە.

**لندهور:** لۆزەندەر، زەبەلاح و تەژە، کەتە، کەتوکڵفت، زرتەزەلام، زڕەمێر، زرتك، زڕتەبۆر، زەپ زەپە، زەگزەگە، زەگەردوگ، قۆقۆ، زلحۆ، زلحۆرت، فیلۆ، فیلەندەر، گۆپۆ، گەلۆر، گەلۆرە، گەوەزە، لۆزەندەر، لهیتەك، باقۆڕە، پان و پۆڕ، حوت، حەپەشی، دەگەنەك. "**لندهور بدریخت**": ترچماق، زەلام و زەبەلاحی ناقۆڵا، تەژەی ناقۆڵا. "**لندهور بیکارە**": حەپۆل، حەپولە، چەکەرداسی.





**لندیدن:** پرتاندن، بۆڵەی بن لێوان، فنەفن، ورتاندن، پرتەوبۆڵەکردن، کورکاندن، کورکیان.

**لنکاك:** قسەی ناحەز و ئازاردەر.

**لنگ:** (لَ) 1) شەل، نجمی، لەنگر، لە پا سەقەت. 2) نەبوونی جووڵە و چالاکی ئاسایی و دڵخواز، ماتڵ، مەحتەل. 3) پەککەوتن. "**لنگ چیزی شدن(بودن)**": 1) ماتڵی ئەو بوون. 2) بەهۆی ئەوەوە زەربە و زیان وێکەوتن. "**لنگ زدن**": شەلین، لەنگین. "**لنگ شدن**": شەل یان سەقەت بوونی پیی کەسێك یان ئاژەڵێك. "**لنگ شدن چیزی**": ڕاگیرانی چالاکی یان جووڵەی ئاسایی و دڵخوازی ئەو شتە، پەککەوتن. "**لنگ کردن**": 1) لەچالاکی یان لە جووڵە خستن. 2) ماتڵ بوون. 3) نیشتەجێبوون لە جێیەك. 4) دەست لە کار کێشانەوە، ڕاوەستانی کاروان لە ناو ڕێگادا. "**لنگ گذاشتن**": ڕاگرتن و هەڵپەساردنی شتێ یان کارێك. "**لنگ ماندن**": ماتڵ مانەوە. وەستان و ڕاگیران. "**لنگ مانند**": شەلانە، وەك شەلان. "**لنگ و لوك**": داماو و بێ دەسەڵات. "**زندگی کسی لنگ زدن(بودن)**": بە دژواری تێپەڕبوونی ژیانی ئەو، شپرزە و پەشێوبوونی ژیانی ئەو. "**کار کسی لنگ زدن**": بە باشی ئەنجام نەدرانی کاری ئەو و تووشی ئیراد و گرفت بوونی ئەو، بە چاکی نەچوونەپێشی کاری ئەو.

**لنگاك:** قسەی ناحەز.

**لنگ:** (لِ) 1) پێ لە سەرووی ڕان تا سەری قامك، لاق، لۆق، لنگ، لینگ. 2) تا. 3) فەننێکە لە زۆرانبازی‌دا. "**لنگ چیزی(کسی) به هوا بودن**": لێڵ و ناڕوون بوونی بارودۆخی ئەو. "**لنگش کن**": 1) بە زەوی دادە. 2) کاتێ دەوترێ کە کەسێك لە دوورەوە سەبارەت بە پرسەکان داوەری بکا بەبێ‌ئەوەی ئاگای لە سەختییەکانیان بێ. "**لنگ ظهر**": کاتی نیوەڕۆ، ناوەڕاستی ڕۆژ. "**لنگ کردن**": لە زۆرەوانی دا بەکارهێنانی فەننی "لنگ". "**لنگ و پاچە**": پێ، ڕان. "**لنگ و لگد انداختن**": 1) لەقەخستن. 2) سەرکێشیکردن.

**لنگالنگ:** (لَ.لَ) بڕوانە:"**هیاهو**".

**لنگان:** (لَ) لە حاڵی شەلین دا.

**لنگ دراز:** (لِ) لۆقلۆقی، لۆقن، لینگ درێژ، لاق درێژ، لەگە، کەڵەگەتی کز و باریك.

**لنگ در هوا:** بڕوانە:"پادرهوا".

**لنگر:** 1) لەنگەر، ئاسنی سەر بەقولاپی بەزنجیرەوە بۆ وێستانی گەمیە دەخرێتە دەریاوە. 2) کەس یان شتێك کە مایەی خۆڕاگری یان ڕاوەستانە. 3) خانەقا. 4) پاندۆڵ. "**لنگرانداختن**": 1) لەنگەرئاوێتن، لەنگەر هاویتن، لەنگەرخستن، لەنگەرگرتن، لەنگەرهاویشتن، ڕاوێستانی کەشتی لە

قەراغ دەریا. 2) لەجێیەك نیشتەجێبوون و بۆ ماوەیەكی زۆر لەوێ مانەوە. "**لنگرباختن**": حەپەسان، پەشۆكان، تاسان، نیگەران بوون. "**لنگر برداشتن**": 1) دەهاوردنی لەنگەر لە ئاو بە مەبەستی جووڵاندنی پاپۆڕ. 2) بزووتن، تەكان خواردن. "**لنگرخوردن**": تێكچوونی هاوسەنگی. "**لنگردادن**": 1) جووڵاندن بەملاولادا. 2) ڕاگرتن، لەجووڵەخستن. 3) قورسایی و كێشی خۆ خستنە سەر شتێك. "**لنگر زدن**": تەكان خواردن بەملاولادا. "**لنگر كردن**": 1) ڕاوەستان. وێستان. 2) قورسایی خۆ خستنە سەر جێیەك و ڕاوەستان. "**لنگر نهادن**": وێستان(ەوە)، مانەوە. "**با لنگر رفتن( حركت كردن )**": بە شێنەیی و هێواش ڕۆیشتن. "**بر لنگر**": ڕاگیراو، ڕاوێستاو.

**لنگرانداز:** بڕوانە:"لنگرگاە".

**لنگردار:** 1) لەنگەردار. 2) لەسەرخۆ و مەند. 3) قورس.

**لنگرگاە:** لەنگەرگا، لەنگەرگە، تابگە.

**لنگری:** 1) دەوری زۆر گەورە. 2) قورس. "**لنگری كردن**": ڕاوەستان، وێستان.

**لنگ زن:** (لُ) ئەوەی لە حەمام دزی دەكا.

**لنگش:** شەلین، لەنگین.

**لنگ لنگان:** لە حاڵی شەلین دا.

**لنگە:** 1) تا، لەنگە. 2) هاوتا، وەك. 3) تاق، بەرامبەری جووت. "**لنگەبەلنگە**": تاوتا. "**لنگە كفش كهنە**": بریتی لە لایەنگر و پشتیوان. "**لنگە نداشتن**": هاوتا نەبوون، وێنە نەبوون.

**لنگی:** شەلی، شەلیای، پاسەقەتی، لەنگی.

**لنگیدن:** شەلین، لەنگین، لنگرین، قرنگ، بەشەلەشەل ڕۆیشتن.

**لوائح:** كۆی"لائحە".

**لوا:** ئاڵا، بەیداخ. "**لوای چیزی را برافراشتن( افراختن )**": هەنگاونان بۆ ئەو شتە، دەست بردن بۆ ئەو شتە. "**(در) تحت لوای كسی( چیزی )**": 1) فەرمانبەر و ملكەچی ئەو. 2) بەپیی ئەو. "**كسی را زیر لوای خود قرار دادن**": پشتیوانی لێكردن، پاڵپشتی لێكردن.

**لوازم:** ئامرازەكان، پێداویستییەكان.

**لواط:** نێربازی، گانی نێر، قوونەگان.

**لوامە:** لۆمەكەر، سەرزەنشتكەر.

**لوت:** 1) ڕووت، پەتی. 2) خۆراك، خواردەمەنی. 3) بڕوانە:"امرد". "**لوت و عور**": ڕووت و قووت.

**لوت بارە:** نەوسن و زۆرخۆر.

**لوترە:** تەوەزەل، تەمبەڵ.

**لوث:** پیسی و خراوی، ئالوودەیی.

**لوچ:** خێل، خوێل، چاوخوار، هەڵجەڕ، چاوچێل، چاوشاش، خیچ، كاژ، كیل.

**لوچە:** لێو. "**لوچەهای كسی آویزان بودن**": نارەحەت و مۆن بوونی ئەو، لچ و لێو تێكنان.





**لوچە پیچك:** بڕوانە:"دهن كجی".

**لوچی:** خێلی، چاوخواری.

**لوح:** تەتەڵە، دەپ، تەختە، لەوح، لەوحە. "**لوح تقدیر**": لەوحەی ڕێزلێنان/ڕێزلێگرتن. "**لوح جبین( پیشانی )**": چارەنووس. "**لوح سنگین**": بەردی گۆڕ. "**لوح فشردە**": سی دی. "**لوح محفوظ( آفرینش )**": لەوحەیەك لە ئاسمان دا كە ڕووداوەكانی ڕابردوو و داهاتووی تێدا تۆماركراوە. "**لوح مزار**": بەردە گڵكۆ. "**لوح و قلم**": چارەنووس.

**لودادن:** ئاشكراكردنی ڕاز یان گوناح یان شوێنی خۆشاردنەوەی كەسێك. "**لودادن چیزی**": لەدەست دانی ئەو. "**خود را لودادن**": 1) خۆ ئاشكرا كردن، ئاشكراكردنی ڕازی خۆ. 2) لەدەست دانی پەردەی كچێنی پێش لەشووكردن.

**لودە:** 1) نكتەبێژ، نوكتەباز، قۆشمە، قەرفۆك، فەنەك، حەنەكچی، تیتاڵباز، قسەخۆش، گاڵتەچی، گاڵتەبێژ، قسەسەیر، لێبۆكێ، قولچماغ. 2) ناجیددی و تەنزاوی.

**لودی:** جوامێر و بەغیرەت، نەترس.

**لورفتن:** ئاشكرابوون. "**لورفتن چیزی**": لەدەست دانی ئەو.

**لوری:** 1) بڕوانە:"كولی". 2) دز، چەتە، ڕێگر.

**لوزالمعدە:** شیلك، "پانكریاس".

**لوزتین:** ئاڵوو، ئاڵك، گلالە، بادامە، گۆشەك، گۆشەگەرو، گەلالوچك، گەلالووچك، مەلاژە، لكمل.

**لوزە:** ئاڵوو، لەوزە، بادامەی گەروو لە بن چەنە.

**لوس:** 1) زوان لووس، تەڕزوان، مەراییكەر. 2) زوان چەوری، تەڕزوانی خۆڕێكخەر. 3) ناخۆش، جڵف و نالۆژیكی. 4) لووس. "**لوس و لابە**": زوان لووسی، مەرایی، ڕیایی، كلكەسووتە.

**لوسانە:** بڕوانە:"چاپلوسی".

**لوسیدن:** 1) بڕوانە: "گریسیدن". 2) بڕوانە: "فریب دادن".

**لوشانە:** چەور و شیرین.

**لوش:** 1) زارخوار. 2) لەت. "**لوش لوش**": لەت لەت.

**لوطی:** 1) بڕوانە:"لودی". 2) نەزان، نەفام. 3) شایەر، بەزمگێڕ، لۆتی. 4) بڕوانە:"غلامبارە". "**جلو لوطی معلق زدن**": خۆنوێنیكردن لەبەرامبەر كەسی بەهێزتر یان زیرەكتر لە خۆ.

**لوطی بازار:** شوێنی بێسەرەوبەرە و ئاڵۆز.

**لوطی گری:** 1) لۆتیسفەتی، جوامێری، پیاوەتی. 2) بڕوانە:"لواط".

**لوغیدن:** نۆشین. دۆشین.

**لوفرض:** بڕوانە:"فرضاً".

**لوکە:** ناڵە، لوورە. "**لوکەکشیدن**": ناڵاندن، لووراندن، زوورین.

**لوکیدن:** گاگۆڵکەکردن، گاگۆڵکێ، گاگۆڵە، گاولکە، قوون کشکێ، بە چوار دەست و پێ ڕۆیشتن.

**لول:** سەرخۆش، خۆشحاڵ. بێشەرم.

**لولو:** ئایشەگوێدرێژ، خۆخۆڵێ، شەولەبان، منداڵ ترسێن. "**لولوی سرخرمن**": 1) بڕوانە: "مترسك". 2) کەسی بێکەڵك، خوێڕی.

**لولوخورە:** بڕوانە: "لولو".

**لولەکردن:** 1) لوولەکردن، بە فۆڕمی لوولە دەرهێنان. 2) بە توندی شکست پێدان، بەزاندن.

**لولی:** 1) بڕوانە: "کولی". 2) کەسی جوان چاك، سورپەری.

**لولیدن:** جووڵان و بە لابەلای گروپێکدا بەملاولادا ڕۆیشتن.

**لوم:** لۆمە، سەرزەنشت.

**لون:** 1) ڕەنگ. 2) چەشن، جۆر.

**لوی لوی:** بڕوانە: "همهمە".

**لهب:** بڵێسە، کڵپە.

**لهبلە:** نەزان، گەوج، گەمژە.

**لهجە:** شێوەی زمان، زار، زاراوە.

**لهذا:** بەم هۆیە، بەم پێیە.

**لەشدن:** داقنان، داقنین، داڕزان، بەژڤین، جیق دەرهاتن، پڵیشان، پڵیشانەوە، پلیخانەوە، پەلخان، پڵیخان، پلیخانەوە، ژلیقان، فلێقان، فلیقان، فلیقانەوە، فلێقیان، شلێقان، شلێقیان، داشلێقان، پان و فلچ بوونەوە، فلچ بوونەوە، ڤرچقین، هەلژیویان.

**لەکردن:** دافرەقانن، هەرژاندن، هەڵ پلووخاندن، هەڵ فلیقاندن، فلیقاندن(ەوە)، فلێقاندنەوە، فلیقانن، فلێقانن، فلیقاننەوە، فلێقاننەوە، پان و فلچ کردنەوە، ژلیقانن، ڤرچقاندن، پلێخاندن، پڵیشاندنەوە، شلێقانن، دەبەر پێ دا پان کردنەوە.

**لەلەزدن:** 1) وە هەسکەهەسك کەوتن. 2) زۆرتوونی بوون. 3) تامەزرۆبوون، زۆر خوازیاری شتێ بوون.

**لەولوردەشدن:** هەلاهەلابوون، هەپڕوون (بە) هەپڕوون بوون، پلیشانەوە، هەرژین.

**لهیب:** بڵێسە، کڵپە، گڕ، گڵ، گەرمی ئاگر.

**لهیدن:** گەنان، ڕزین، خەساربوون، زایەبوون، پلیشانەوە، فلیقانەوە.

**لهیدە:** پلیخاو، پڵیخ، فلچ، بڵ، مڵ، ڕزی، ڕزیاگ، ڕزیو، داڕزاو، گەندە، پان و فلچ بۆوە.

**لیاقت:** شیاوی، شایەن، شیان، سەوچ، ژێهاتوی، هێژایی، پێکەوتن، گێروفەن، ڕا.

**لیانگر:** بڕوانە: "نورانی".

**لیبرال:** ئازادیخواز، لیبڕاڵ.

**لیبرالیسم:** ئازادیخوازی، لیبڕالیزم.

**لیبل:** بڕوانە: "برچسب".

**لیت:** بڕوانە: "کاشکی".

**لیتك:** ڕووت و نەدار، بابردە، مایەپووچ.





**لیدر:** 1) ڕێنوێن، ڕێنما. 2) پێشەوا، سەرۆکی حیزب.

**لیریك:** لیریك، تایبەتمەندی هەر بەرهەمێکی هونەری کە هونەرمەند ئاگایانە یان نائاگایانە هەست و کوڵیە هەناوی خۆی دەردەبڕێ.

**لیز:** حولی، تەحس، خاژ، خریك، خولیسك، خەزگ، زەوی تەڕ و خز. (پزیشکی) شیکردنەوە. "**لیزخوردن**": هەڵخلیسکان، خلیسکان، خلیسکین، ڤەخلیسکان، خەشکین، فسکین، چلیان، چەڕخین، تەقلین، شەمتین، شەمیتین، تەهسین، خاژبوون.

**لیزابە:** هەر تراوێکی خەست و لینچق.

**لیزاندن:** بڕوانە: "لغزاندن".

**لیزگاە:** خز، خزگە، خزیلك، خزۆك، خیسەڵان، شەمت، شەمیتۆك، هەڵخلیسك، تورتەماڵ، زەل، لاسوڕ، جێگەی خلیسکان.

**لیزوزوم:** (پزیشکی) تەنۆچکە شیکارەکان.

**لیزیدن:** بڕوانە: "لیزخوردن".

**لیست:** لیست، سیایی، پێرست. "**لیست کردن**": پێرست کردن.

**لیس زدن:** بڕوانە: "لیسیدن".

**لیسیدن:** لستن، لێستن، لستنەوە، لیستنەوە، لێساننەوە، لێسانەوە، ڤەلیستن، لشتش، لشتن، زمان بە شتێك داهێنان، پاك کردنەوەی شتێ بە زمان. "**کاملاًلیسیدن**": لستەوپستە(دان)، پاك لستنەوە.

**لیف زدن:** لەش شۆردن بە لفکە و سابوون.

**لیف کردن:** شاردنەوە(مادده سڕکەرەکان).

**لیف کشیدن:** 1) بڕوانە: "لیف زدن". 2) گازگرتنی شتێ یان بە دیان کێشان.

**لیك:** سووکەڵەی "لیکن".

**لیکن:** بەڵام.

**لیل:** شەو. "**لیل و نهار**": 1) شەو و ڕۆژ. 2) ڕۆژگار.

**لی لی رفتن:** (لَ.لَ.رَ.تَ) انی، لنگەشەلێ، لنگەشەلە، لەنگڕۆ، کولیکولی، بەهەنگڵەشەلەڕۆیشتن.

**لی لی بە لالای کسی گذاشتن:** لەبەرچاونەگرتنی کەموکووڕییەکانی ئەو، جێبەجێکردنی داواکارییە نابەجێیەکانی ئەو، خزمەتکردن بەو.

**لیمفوسایت:** (پزیشکی) لیمفۆسیت، لیمفەخانە، لەنفۆسایت.

**لیمفوما:** (پزیشکی) شێرپەنجەی لیمفەخانەکان.

**لینت:** ڕەوانی، نەرمی.

**لیو:** خۆر، ڕۆژ.

**لیوکیمیا:** (پزیشکی) شێرپەنجەی خوێن.

**لیوە:** 1) زمان لووس، فریودەر. 2) ڕەفتاری تێکەڵ بە شۆخی و چەڵتەبازی.

**لییدن:** بڕوانە: "جویدن".

# م

**مآب:** شوێنی گەڕانەوە. 2) گەڕیانەوە. **"مآب کردن"**: جێگیربوون، نیشتەجێبوون.

**مآثم:** کۆی "مأثم"، خەتاکان، هەڵەکان، تاوانەکان.

**مآخذ:** کۆی "مأخذ"، سەرچاوەکان، ژێدەرەکان.

**مآکل:** کۆی "مأکل"، خواردەمەنییەکان، خۆراکەکان.

**مآل:** 1) سەرەنجام و کۆتایی کارێ. 2) ئاکام. 3) شوێنی گەڕانەوە.

**مآلاً:** سەرەنجام، لەکۆتاییدا.

**مآل اندیش:** تێبین، دوورنوارِ، پاشەڕۆژبین، ئەوەی کە بیر لە ئەنجامی کارێك دەکاتەوە.

**مابعد:** ئەوەی لە پاش شتێکەوەیە، دوای ئەو، پشتی وی چ.

**مابعدالتکوین:** پاش پێکهێنان/ ڕسکاندن.

**مابعدالطبیعه:** مێتافیزیك، ئەوەی کە لە سەروو سروشتەوەیە، زانستی ئیلاهی.

**مابقی:** ماوە، بەجێماوە.

**مابون:** حیز، نێرەمووك.

**مابەالاحتیاج:** ئەوەی کە پێویستە، هەرچی پێی نیازمەند بن.

**مابەالاختلاف:** مایەی ناکۆکی، مایەی ناسازگاری.

**مابین:** 1) نێوان، بەین، ناڤبەر، ناوەڕاست. 2) جیاوازی.

**مات:** 1) سەرگەردان، سەرسوڕماو، دۆش داماو، کز، کروشمەکردوو. 2) ڕەنگی بێ بریقە، مات. 3) دۆڕاو لە کایەی شەترەنجدا. 4) وشەیەکە بۆ لەکارکەوتنی شای شەترەنجی دەڵێن. **"مات و مبهوت"**: حەپەسیو، حەپەساو، حەیری، واق وڕ، سەرسوڕ، کڕومات.

**ماتادر:** (دُ) 1) کەسێ کە لە شەڕکردن دەگەڵ گا دا گاکە بکوژێ. 2) کەسی گرینگ و جێی باوەڕ.

**ماترك:** کەلووپەلێ کە لە مردوو جێ مابێ، میرات، کەلەپوور.

**ماتریارکی:** ژن سالاری.

**ماتریال:** 1) ماددە، شت، جنس. 2) زانیاری، بابەت، بەڵگە. 3) ماددی. 4) گرینگ، بنەڕەتی، بنگەهین، پێویست.





**ماتریالی:** لەباری ماددییەوە، لە باری ناوەرۆکەوە، لە بنەڕەت ڕا.

**ماتریالیزه:** 1) فۆڕمی دەرەکی یان بابەتی بەخۆگرتن، بەرجەستەبوون. 2) بوونە واقیعییەت. 3) پڕاکتیزەبوون، وەدیهاتن.

**ماتریالیست:** ماتریالیست، پێڕەوی ماتریالیزم، ماددە/ ماك خواز.

**ماتریالیستیك:** ماددەخوازانە، ماددی، لەسەر بنەمای ماددییەت.

**ماتریالیسم:** مادییەت، ماتریالیزم، ماددەخوازی، ڕەسەنایەتی ماددە، فەلسەفەی ماددی، فەلسەفەیەك کە حاشا لە بوونی ڕۆح و مەعنەوییات دەکا و تەنیا بوونی ماددە دەسەلمێنێ و خولّقاندنی دنیا و تەواوی ڕووداوەکانی سروشت.

**ماتریس:** 1) لە بیرکاری و زانستەکاندا: ماتریس. 2) لە لۆژیکدا: قاڵب، ماتریس. 3) لە پزیشکیدا: منالّدان، ماتریس. 4) لە پیشەسازیدا: قاڵب، ماتریس. 5) چنراوە، قاڵب، جەستە.

**ماتریکس:** (پزیشکی) نێوان پۆپنە.

**ماتقدم:** 1) ڕابردوو، بۆری. 2) کۆن، کەونارا. 3) پێشووتر، لە ڕابردوودا.

**ماتم** : تازیە، تازیمانە، ئازیەت، خەم داگرتن بۆ تازە مردگ، ماتەم، مردەموو، سەرەخۆشی، پرسە. **"ماتم داشتن"**: پرسەهەبوون. **"ماتم کردن"**: خەم خواردن، خەمباربوون. **"ماتم گرفتن"**: خەم داگرتن، خەمباربوون بۆ کەسێ بە جۆرێ کە وابزانرێ ئەو کەسە یەکێك لە کەسەکانی مردووە. **"به ماتم نشستن"**: پرسەگێڕان، تازیەباریکردن.

**ماتماتیك:** زانستی بیرکاری.

**ماتم پرسی:** بڕوانە: "تعزیه".

**ماتم دیده:** بڕوانە: "ماتم زده".

**ماتم زده** : 1) ماتەمی، ماتەمین، تازیەبار، تازیدار، ئازیەت بار، عازیەتبار، خەمباری خۆشەویست مردوو، مردوومراو، مردەمودار، هەش بەسەر. 2) خەمبار، خەمناك.

**ماتمکده:** شوێنی ماتەم، جهێ تازییێ، شوێنی تازیەباری، ماڵێ کە لەودا خەم و خەفەت زۆر بێ.

**ماتیشکا:** بڕوانە:"فاحشه".

**ماتیکان:** پەیڤ، "دیسکۆرس".

**ماجد:** گەورە، مەزن. دڵاوا، جوامێر.

**ماجرا:** 1) ڕووداو، پێشهات، بەسەرهات، بوویەر. 2) مەسەلە، بابەت. 3) مشتومڕ، مقۆمقۆ. **"ماجرا آوردن بر چیزی"**: ئیراد گرتن لەو. **"ماجرا رفتن"**: ڕوودانی پێشهاتێ. **"ماجراکردن"**: مشتومڕکردن، شەڕوکێشەکردن.

**ماجراجو:** 1) سەربەگۆبەند، سەر بە گێچەڵ، گێچەڵ بە قوون، قوون بە

گێچەڵ، دڕوشەڕانی، گورخ، شەڕفرۆش، کەسێك کە سەری لە کێشە دەخورێ، سەگی هار (بریتی/ کینایە). 2) ئاژاوەخواز.

**مأجور:** 1) پاداشت دراو. 2) کرێگرتە، کرێگرتێ.

**مأخذ:** 1) سەرچاوە و بنچینە و ڕیشەی شتێ. 2) سەرچاوە، ژێدەر، چاڤکانی. 3) بنەمای تاوتوێی شتێ.

**مأخوذ:** 1) وەرگیراو لە شتێ یان لە جێیەك. 2) وەدەست هاتو. 3) گیرۆدە، تووشبوو، گرفتار. 4) لەبەردەم لێپێچینەوەدا. **"مأخوذ بەحیا"**: بەشەرم و حەیا، حەیابەخۆ. **"مأخوذ بە سوم"**: (مافناسی) کاڵایەك کە کەسێك وەك کڕیار دەیخاتە ئیختیار خۆی تا تاوتوێی بکا و هەڵیبسەنگێنێ. **"مأخوذ داشتن"**: 1) گرتن. 2) گرفتارکردن، یەخسیرکردن، قۆڵبەست کردن. **"مأخوذ شدن"**: گرفتاربوون. **"مأخوذ کردن"**: 1) گرتن. 2) لێپێچینەوە لێکردن، سزادان.

**ماحصل:** 1) ئەوەی وەدەست هاتوە، داهات، بەرهەم. 2) پوختە و ئاکام.

**ماحضر:** 1) ئەوەی کە ئامادە و هەیە، حازری، خواردەمەنی ئامادە، خۆراکی سادە. 2) بڕێکی کەم. 3) بەبێ پێشەکی.

**ماحی:** سڕێنەر، لەناوبەر، ژناڤبەر، تەفرتووناکەر.

**ماخور:** خەرابات، مەیخانە، مەهخانە.

**ماخولیا:** ئەسپەك، گلاراو، ماخولیا، مەیخوولی، جۆرە نەخۆشییەکە کە مرۆڤ تووشی خەیاڵاتی پڕوپووچ دەبێ و هەندێ جار وەها پەلوپۆ داوێ کە نەخۆش نیسبەت بە هەموو شتێ ڕەشبین و بێ‌متمانە دەبێ و هەندێ جاریش خۆی دەکووژێ. وەهەم. "مالیخولیا"، "ماخول"، "مالنخ"، و "ملانکولی"یشی پێدەڵێن.

**مادام:** 1) تا ئەو کاتەی، تا وایە، هەتا وایە، لەبەرئەوەی، ژبەروێ، مادام. 2) خاتوو، خانم. **"مادام الحیات"**: تا زیندوە، لە ماوەی ژیان دا. **"مادام العمر"**: تا ماوی، تا ماوە/زیندوە، تا کۆتایی ژیان.

**مادح:** ستایشکەر، پیاهەڵدەر، پەسنددەر، پەسنکەر.

**مادر:** 1) دایك، داك، داڵك، ئۆدا، دێ. 2) بنەڕەتی، بنچینەیی سەرەتایی، یەکەمین (صنایع مادر). 3) هاندەر، هەڵخڕێن. 4) بناغە، ڕیشە. 5) زەوی، خاك. **"مادر عروس"**: لاپرەسەنێ کە خۆ لە هەموو کارێك هەڵدەقوتێنێ. **"مادر فولادزره"**: ژنی بەساڵاچووی ناحەزی بەدئەخلاق. **"مادر کسی را بە عزای او نشاندن"**: کوشتنی ئەو. **"مادر ناتنی"**: زڕدایك.

**مادراندر:** زڕدایك، باوەژن.

**مادرانە:** دایك ئاسا، دایکانە، وەك دایك.

**مادربەخطا:** جوێنێکە، دایك قاحبە.

**مادر تباری:** (کۆمەڵناسی) جۆرێ سیستمی کۆمەڵایەتی کە لەودا تاك لەباری خزمایەتییەوە بەستراوە بە بنەماڵەی دایکی بێ.





**مادرحساب:** بڕوانە: "مادرخرج".

**مادرخرج:** ئەوەی تەواوی خەرجی گروپێك کە پێکەوە دەڕۆنە شوێنێ یان خەریکی کارێ دەبن لەئەستۆ دەگرێ و دوایە لە تەك تەکیان دا حەساو دەکا، خەزنەدار.

**مادرزاد:** 1) زکماك(ی)، زکمانگ، سکماك، هەرکە لە دایك بووە، کە لە دایك بووە، وەك لە دایك بووە. 2) تایبەتمەندییەکی نەگونجاو یان خەسڵەتێ کە لە کاتی لەدایك بوونەوە دەگەڵ ئینسان بێ.

**مادرزایی:** بڕوانە: "مادرزاد".

**مادرزن:** خەسوو، خەسی.

**مادرسالاری:** دایك سالاری، دایك سەردەستی.

**مادرسرایی:** (کۆمەڵناسی) جۆرێ سیستمی کۆمەڵایەتی کە لەودا پیاو دوای ژنهێنان تێکەڵ بە بنەماڵە و قەبیلەی ژن دەبوو.

**مادرشاهی:** بڕوانە: "مادرسالاری".

**مادرشهر:** شاری گەورە و سەرەکی لە ناوچەیەك یان لە وڵاتێك.

**مادرمردە:** 1) دایك مردوو، کەسێ کە دایکی مردبێ. 2) بێچارە، چارەڕەش.

**مادرندر:** زڕدایك.

**مادری:** 1) دایکایەتی، دایکێتی. 2) خۆشەویستی و دلۆڤانی بەو جۆرەی کە شیاوی دایکە.

**مادگان:** 1) مێیەکان، مێوینەکان. 2) نەنێر نە مێ و ترسەنۆك.

**مادگی :** 1) مێوایەتی، مێوینەیی، مایك، مایکەی، مایکی. 2) لە زاراوەی ڕوەك ناسیدا: ئەندامی مێینەی گوڵ، بەشی ناوەوەی گوڵ. 3) جێی دوگمە، جهێ پشکوژێ.

**مادون:** 1) ژێر، خوار، بن. 2) نزمتر، لە خوارتر. **"مادون"**: (نِ) جگەلە، بێجگەلە.

**مادە:** مرۆڤ یان ئاژەڵێ کە بزێ یان مناڵی ببێ، بوونەوەرێ کە هێلکە بکا، ما، مایك، مایکە، ماینە، مێ، مێوینە، مێچك، مێچکە، مایەن، مۆن.

**مادّە :** 1) ماك، ماکە، ماتریاڵ، ماددە، کەرەستە، شت، تشت، توخم، هەر ڕەگەز و بنچینەیەك کە شتی لێ پێکهاتوە، هۆی دروست بوون. 2) لە فیزیك دا: شتێ کە کێشی هەبێ و فەزا داگیر بکا و لەوانەیە بە فۆڕمی ڕەق، تراو یان گاز بێ. 3) هەر بەند لە گەڵاڵەیەك یان یاسا وە یان گرێبەستێك. 4) هۆ، ڕیشە، بنەما. 5) بابەت. 6) هەرکام لە وانەکان بە تایبەتی وانەکانی پێش لە زانستگا. **"مادّەاولیّە"**: کالەدەند، کەرستەی خاوی دەکار نەکراو، کەرەستەی سەرەتایی. **"مادە خام"**: کەرەستەی خاوی دەکارنەکراو. **"مادە را غلیظ (غلیظ تر) کردن"**: خەست کردنەوەی بابەت و بە گەورە نیشاندانی. **"مادە کردن"**: پیسکردن.

**مادةالمواد:** (فەلسەفەی کۆن) ماددەی سەرەتایی جیهان.

**مادەانگاری:** (فەلسەفە) ماتریالیسم.

**مادەباوری:** (فەلسەفە) ماتریالیسم.

**مادەپرستی:** (فەلسەفە) ماتریالیسم.

**مادەقانون:** هەر ماددەیەك لە یاسا.

**مادّەگرا:** بڕوانە: "ماتریالیست".

**مادّەگرایی:** بڕوانە: "ماتریالیسم".

**مادەنر:** 1) بڕوانە: "خنثی". 2) ڕاڕا، وازوازی، دوودڵ.

**مادەواحدە:** (مافناسی) یاسایەك كە تەنیا لە ماددەیەكدا پەسند دەكرێ.

**مادی:** 1) سەر بە وڵاتی ماد. 2) ڕووبار، ڕووباری سەرەكی. "**مادی سالار**": مەئمووری دابەشكردنی ئاوی ڕووبارەكان.

**مادّیّ:** 1) سەر بە ماددە، كەرەستەیی، شتێتی، ئەوەی كە لە پێوەندی دەگەڵ ماددە بێ وەك ئاژەڵ و ڕوەك و ڕەقەمەنی. 2) كەسێك كە هەموو شتێ ڕەپاڵ ماددە دەدا و حاشا لە بوونی خوا ئەكا، ماتریالیست، دەهری. 3) پووڵەكی، پووڵ پەرست. 4) ماددەبوون.

**مادیات:** پارە و سامان.

**مادیان:** ماین، ماین، ماهینە، مەهین، هەسپی مێ.

**مادیت:** ماددەبوون.

**مادی گرایی:** 1) (فەلسەفە) ماتریالیسم. 2) ماددی بوون، پووڵەكی بوون.

**مادیگری:** (فەلسەفە) ماتریالیسم.

**مادینە :** لە ڕەگەزی مێو، مێچك، ماینە، ماینە، مۆن، مێ، مێنگە، مێو، مێوەلە، مێوینە، مێینە، مێیە، مێیینە.

**مارافسا:** مارگر، مارگیر، كەسێ كە مار دەگرێ پێوەی نادا.

**مارپیچ:** پێچەڵاوپێچ، پێچاوپێچ، مارپێچ. "**مارپیچ خوردن**": بڕوانە: "پیچ خوردن".

**مارج:** (ڕ) بڵێسەی بەتەوژمی ئاگر، بڵێسەی بێدووكەڵ، پشقەلائاگر.

**مارد:** سەركێش، سەربزێو.

**ماردی:** ڕەنگ سوور، بە ڕەنگی سوور.

**مارسار:** وەك سەری مار.

**مارسانان:** لە زاراوەی بوونەوەرناسیدا: مارئاساكان، ئەو بوونەوەرانەی كە لە مار دەچن.

**مارش:** 1) مۆسیقای نیزامی. 2) سرووود.

**مارفش:** وەك مار، مارئاسا.

**مارك:** نیشان، نیشانە، شوێن، ئاسەوار، جەوار، لەقەم، مارك. "**مارك زدن**": درۆ ڕەپەڵدان، تۆمەت لێدان.

**ماركاژ:** زەلكاو، زەوی زۆنگاوی، قۆپی.

**ماركسیست:** پێڕەوی ڕێبازی ماركسیزم.

**ماركسیسم:** بیروبۆچوونەكانی كارڵ ماركس كە بنەمای كومۆنیزمە، ڕێبازێكە لە سیاسەت و ڕامیاریدا كە دانەرەكەی ماركس بووە و بنەماكانی سوسیالیزمی زانستی شرۆڤە دەكا.

**مارگزیدە:** مارانگاز، مارەنگەز، مارانگەستە، مارپێوەداو، مارپێڤەدایی، مارزەیە، مارگەستی.

**مارە:** دەفتەر حەساو.

**ماری:** كووژراو، لەناوبراو، ژناڤ چووی.





**ماریرە:** زڕدایك.

**ماز:** 1) چین و چرووك. 2) درز، كەلێن.

**مازاد:** زێدەبایی، زیادی، زیاد لە پێویست.

**مازوخیسم:** جۆرێ نەخۆشی دەروونی كە نەخۆش چێژ لە ئازاردانی خۆی دەبا.

**مازە:** بڕوانە: "ستون فقرات".

**ماژ:** خۆشی، ئاسوودەیی، ڕابواردن، رابارتن. سەرگەرمی.

**ماژیك:** 1) سێحراوی، جادوویی، سەیروسەمەرە. 2) جۆرە پێنووسێكی ڕەنگاوڕەنگە بۆ نیگاركێشانەوە، ماژیك.

**ماساژ:** كەفماڵ، لەپماڵ، ماڵشت، مشت ماڵ، وەرژو، پەرخان، ماساژ. "**ماساژدادن**": داشێلان، داماڵان، داماڵین(بەدەست)، ڤەمالین، ماڵشتن، پەرخاندن، مزدان، دەست پێداهێنان و شێلان. "**ماساژقلب**": داماڵینی دڵ.

**ماساژور:** ماڵشتە، ماساژدەر، كەسێ كە كاری ماڵشت دەكا.

**ماساندن:** 1) مەیاندن، ڕچاندن. 2) مەیینی ماست، شیر كردنە ماست. 3) بەئەنجام گەیاندن.

**ماسبق:** پێشینە، پێشوونە.

**ماست:** ماست. "**ماست بستن (زدن)**": دروست كردنی ماست. "**ماست رنگ گرفتن**": مایەی خەجاڵەت بوون. "**ماست ماساندن برای كسی**": دژی ئەو كاركردن. "**ماست وارفتە**": ماستی شل. "**ماست ها را كیسەكردن (انداختن)**": ترسان و حەساوی كاری خۆ كردن، ترسیان و دەست لە كاری خۆ كێشانەوە. "**از سفیدی ماست تا سیاهی زغال**": هەموو شتێ. "**مثل ماست**": 1) زۆر سپی. 2) بێحاڵ و كەم بزوو. "**هیچ بقالی نمی‌گوید ماست من ترش است**": هیچ كەس بە دۆی خۆی ناڵێ ترشە.

**ماست بندی:** 1) كردەی دروست كردنی ماست. 2) شوێنێ كە ماستی تێدا دروست دەكرێ و دەفرۆشرێ.

**ماست مالی كردن:** 1) چاوپۆشیكردن، ماسماڵیكردن، پۆشینی تاوان بە ناڕەوا، ڤەكڕوپاندن. 2) سەرسەری و بەڕواڵەت ئەنجامدانی شتێ.

**ماست مالیزاسیون:** یەكلاكردنەوەی ڕواڵەتی شتێ، سەرسەری و بەڕواڵەت ئەنجامدانی شتێ.

**ماسك:** ماسك، ماسكە، دەمامك، ڕووپۆش، شكلێ كە بە ڕوویەوە دەگرن تا نەناسرێن. "**ماسك كسی را برداشتن**": ئاشكراكردنی قەست و نیازی ئەو، دەرخستنی ڕوخساری ڕاستەقینەی ئەو.

**ماسكە :** 1) ماسك، ماسكە. 2) پووستێر.

**ماسكە :** (سِ) توانایی ڕاگرتنی شتێ.

**ماسوا :** 1) ئەوەی جگە لە خوا بێ، بوونەوەرەكان، هەمگەل. "**ماسوایِ**": جگە(لە)، بێجگە.

**ماسیدن:** 1) سفت بوون/بوونەوە، ڕەقبوون، ڕچیان، بستن و سفت بوونەوەی ڕۆن لە سەر شتێك. 2) وشك

بوون. 3) نەجوولان و مانەوە. 4) قازانج گەیشتن، فایدەهەبوون. 5) بە ئەنجام گەیشتن(حقەاش حسابی ماسیده بود).

**ماشاءالله:** ئەوەی خوا بیەوێ، ئەوەی خوا ویستوویەتی. ماشاڵڵا، وشەی سەیرمان.

**ماشین نویسی:** تایپ.

**ماشینی:** 1) سازکراو یان ئەنجام دراو بەهۆی ماشێنەوە. 2) کارێ کە پێویستی بە فکر نیە، میکانیکی. 3) وەك ماشێن خێرا و یەك ڕیتم.

**ماشینیزم:** 1) دانانی ماشێن لەجیاتی مرۆ لە ئەنجامدانی کاردا. 2) بەکارهێنانی ماشێن بەجێی مرۆ لە سەنعەت دا.

**ماضی:** 1) ڕابردوو، کاتی ڕابردوو، دەما ڕابەهۆری. 2) پێشوو، پێشان. 3) کۆچکردوو، خوا لێخۆشبوو.

**ماعدا:** وشەی هەڵاواردن بە مانای شتی تر، شتی دیکە. "**ماعدایِ**": جگە، بێجگە، مەگەر.

**مافات:** ئەوەی کە گوزەراوە/ ڕابردووە، ئەوەی کە لە دەست چووە.

**مافنگی:** زۆر کز و لاواز.

**مافوق:** باڵادەست، سەر، سەرو، سەرتر، ژۆر. "**مافوق طبیعی**": سەراسایی، سەیروسەمەرە، بان سروشتنی.

**مافیا:** هەر ڕێکخراوێکی تیرۆریستی نهێنی(ئەم وشەیە بۆ یەکەم جار لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم لە دورگەی سیسیل سەریهەڵدا).

**ماقبل:** پێشوو، ڕابردوو، پێش لەوە.

**ماکر:** (كِ) فێڵباز، فریودەر، خەڵەتێن، خاپێنەر.

**ماکروفاژ:** ( پزیشکی) قەپگرەگەورە، قەپگرەکان. خڕۆکەی سپی خوێن.

**ماکزیمم:** لانیزۆر، ئەوپەڕەکەی، زۆرترین ڕادەی گونجاو، ئاڵییێ زۆر، ماکزیمۆم.

**مأکل:** خواردەمەنی، خۆراکی.

**ماکول:** 1) فرەخۆر، خۆرا، دەوریلێس. 2) لکە، پەڵە، خاڵ.

**ماکیان:** مەکە، باڵندەی ماڵی، باڵداری کەوی.

**ماکیاولیسم:** سیاسەتێك کە پابەند بە بنەما و پرەنسیپە ئەخلاقییەکان نیەو هەر کردەوەیەك بۆ گەیشتن بە ئامانجە سیاسییەکان بە ڕەوا دەزانێ، بیروبۆچوونەکانی ماکیاول نووسەر و سیاسەتوانی ئیتالیایی"1469ـ 1527ی زایینی.

**مال:** 1) دەوڵەت و دارایی، سامان، ئەوەی کە ملکی کەسێنی کەسێك بێ. 2) ماڵیات. "**مال غیرمنقول**": ماڵ و سامانێ کە نەکرێ ڕابگوێزرێ وەك زەوی، مردەماڵ. "**مال کردن**": (بیرکاری) بە توانی دوو گەیاندن. "**مال و جهات(متوجه، متوجهات)**": ماڵیاتێ کە دەبێ ڕەعیەتەکان بیدەن. "**مال ورزیدن**": ماڵ و سامان خڕکردنەوە. "**مال و مکنت**": سامان، دارایی. "**مال هدردهنده**": دەست قلپ، ماڵ بە فیڕۆدەر.





**مالاریا:** مەلاریا، تۆبەتێ، لەبنەڕەت ڕا لە دوو وشەی ئیتالی پێکهاتوە Mal واتە خراپ یان پیس و Aria واتە هەوا کە بە یەکەوە مانای هەوای پیس دەدەن.

**مالاکلام:** بێ ئەم لاو ئەولا، بێ گفتوگۆ.

**مال الاجاره:** ملکانە، پارەیەك کە کرێدار لە بەرامبەر کەڵك وەرگرتن لە ملك یان خانوو دەدرێتە خاوەن ملك.

**مال التجاره:** کاڵا/کەلوپەلی بازرگانی.

**مالامال:** دارماڵ ، لێوانلێو ، لێوالێو، لچانلچ، لچانلیچ، لیپاولیپ، لیف و لیف، قەڵاپەچن، قەڵاچن، سەرڕێژ، لێوڕێژ، پڕاوپڕ ، لیپاولیپ، لیپە، لیف ولیف، زەپەزەپ، کەیل، تژی، تژە، زپ نژن، نقانن، ئارەی. بە مانای زۆر و فراوانیش هاتوە.

**مالاندن:** 1) مشتوماڵدان بەدەست. 2) تەختکردن، سافکردن. 3) تەمبێکردن و بەزاندن .

**مال اندوز:** پووڵەکی، پووڵ پەرست، ماڵ کۆکەرەوە.

**مالایطاق:** تاقەت پڕوکێن، لە تاقەت نەهاتو، لە وزە بەدەر.

**مالایعنی:** بێ مانا، بێهوودە.

**مال باخته:** ئەوەی ماڵێکی لێ دزراوە یان بەهۆی ڕووداوێکی وەك ئاگرکەوتنەوە لەناوچووبێ.

**مالدار:** 1) ماڵدار، دەوڵەمەند، زەنگین، خاوەن ماڵ و دارایی. 2) ئەوەی چوارپێی هەیە.

**مال ده:** 1) دەست و دڵ ئاوەڵە، بەخشندە. 2) ماڵیات دەر.

**مالش(دادن):** هەساو، ساوا، ماڵین، پیاماڵین، دەست ڕێخستن، دەست پیاهێنان، ولاوین، شێلان بە دەست، مشتوماڵ، ماساژ، ماڵشت. 2) سزا، تەمبێ، گوێبادان.

**مالش کردن:** 1) پیاماڵین و مشتوماڵدان. 2) تەمبێکردن، گوێبادان.

**مالشگر:** ماڵشتە، دەلاك، مشتوماڵدەر.

**مالش یافتن:** 1) تەمبێکران، سزادران. 2) بروانە :"کوفتەشدن".

**مالك:** 1) خاوەن، خاوەند، خێوەند، خۆدان، خوەدی، داژدار، وەهەر. 2) خان، دەرەبەگ. 3) لە سفەتەکانی خوا. 4) گیان ستێن. "**مالك شدن**": بوونە خاوەن. "**مالك گردانیدن**": خۆدی کردن، بە خاوەن کردن، خوەدی کرن، بە ساحێب کردن.

**مالك الملك:** 1) لە ناوەکانی خوا. 2) خاوەن دەسەلاتی ولاتێ، پاشا.

**مالکیت:** ملکایەتی، خاوەنداریتی، هەبوون.

**مألف:** ئەوەی کە خەڵك خووی پێدەگرن. جێگەیەك کە کەسێك عادەتی پێگرتوە.

**مال مال:** بروانە:"مالامال".

**مألوف:** بروانە: "الفت گرفتە".

**مالیات:** ماڵیات، باجی دەوڵەت، داهاتە."**مالیات بر ارث**": (ئابووری) ماڵیاتێ کە لە دارایی کەسی کۆچکردووی دەگێڕنەوە. "**مالیات بر حقوق**": (ئابووری) ماڵیاتێ کە لە مووچەی مووچەگران و

فەرمانبەرانی دەگێڕنەوە. "**مالیات بردام**": خەمچوور، قەمچوور، پووشانە و سەرانەی مالآت بۆ ئاغا و دەوڵەت. "**مالیات بردرآمد**": داهاتانە، بەشی خاوەن ملك لە دەرامەتی زەوی. "**مالیات بر دارایی**": ماڵیاتێ کە مردەماڵ وەك زەوی و ماڵ و هتد دەگرێتەوە. "**مالیات بستن**": دیاریکردنی ڕادەی ماڵیاتی ملك و سامان یان داهاتی کەسێنی. "**مالیات تصاعدی**: ماڵیاتێ کە بەچوونەسەری داهات یان توانایی کڕین دەچێتەسەرێ، ماڵیاتی بەرزەڕوو. "**مالیات زمین زراعتی**": زەویانە، زەڤیانە، باجی زەوی. "**مالیات سرانە**: (ئابووری) ماڵیاتێ کە دانەکەی پێوەندی بە داهات و خەرجییەکانی کەسەکانەوە نیە و لە هەموان وەك یەك وەردەگیرێ. "**مالیات غیرمستقیم**( **مالیات بر فروش، مالیات بر مصرف** )": (ئابووری) ماڵیاتێ کە لە لایەن دەوڵەتەوە لە بەرهەمهێنەران یان هەناردکارانی کالآوە وەردەگیرێ، بەلآم فرۆشیارەکان بە بردنەسەری نرخی کالآکان دانی ئەو ماڵیاتە قەرەبوو دەکەنەوە. "**مالیات مستقیم**": ماڵیاتێ کە لە داهات یان سامانی کەسەکان یان دامەزراوە تایبەتییەکان وەردەگیرێ.

**مالیات بگیر:** قامچوورچی، پووشانە وەرگر بۆ دەوڵەت، ماڵیات وەرگر.

**مالیخولیا:** بڕوانە: "ماخولیا".

**مالیدن:** 1) ساوان، ساوین، پیاساوین، هەساوین، هەسوون، تێهەڵساوین، تێهەڵسوون، هەڵساوین، هەڵسوون، پیاماڵین، پێداهێنان، پیاهانین، هشکاندن، لێخستن، ڕێخستن، دەست بە سەر شتێك دا هێنان، مشتوماڵدان. 2) پوچەڵبوونەوە، هەڵوەشانەوە( بچەها خوشحال باشید امتحان مالیدە). 3) هەڵەکردن، خەیاڵ کردن. 4) پێشێل کردن، لەقەشێل کردن. 5) گوێبادان، تەمبێکردن. 6) لۆمەکردن، سەرکۆنەکردن. 7) نەرم و ساف کردن. 8) بڕوانە: "جلادادن". 9) پاك کردنەوە، سڕینەوە.

**مالین:** خوێناوی.

**مالیّە:** ئەوەی کە لە پێوەندی دەگەڵ ماڵ و سامان دایە، دارایی، ئابووری، سامانداری، کالآ، کەلوپەل، پووڵی نەخت.

**ماما:** دایان، ماما، مامان، تایەن، هاریکاری دایك لە زاندا. "بازاج و پازاج و پبش نشین"یش هەر بەم مانایەن لە فارسیدا.

**مامان:** 1) دایك. 2) لەبەردڵان، جوان. 3) قەپاتمە، سوتلی. 4) سەرپەرشتی ژنانی خۆفرۆش.

**مامایی:** مامانی، دایانی، تایەنی، کاری مامان.

**مامك:** 1) دایك. 2) وشەیەکی خۆشەویستانەیە بۆ کچ. 3) ژنی پیر.

**مأمن:** پەناگا، لیزگە، ئێڤرگە، شوێنی هێمن و بێترس.





**مأمور:** 1) مەئموور، دانراو. 2) فەرمانبەر، کارمەند. 3) نێردراو، پێسپێردراو، ڕاسپێراو، فەرمان پێدراو. 4) پارێزەر، نگابان. "**مأمورکردن**": ناردن بۆ ئەنجامدانی کارێك، دانان.

**مأموریّت:** 1) کار و ئەرکێ کە لەلایەن کەسێ یان ڕێکخراوێکەوە دەخرێتە ئەستۆی کەسێك، مەئمووریيەت. 2) بەرفەرمانی، گوێڕایەڵی.

**مأمون:** 1) بێ ترس، بێ وەی، ئاسوودە و ئەرخەیان. 2) جێ متمانە، بڕواپێکراو.

**مأنوس:** هۆگر، ئۆگر، خوو پێ گرتوو، ڕاهاتوو، فێرەك، متون، لسکە. بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "الفت گرفته".

**مان:** 1) ماڵ، کەلوپەلی ناوماڵ. 2) وەك، وێنە. 3) ڕاناوی لکاو، یەکەم کەسی کۆ.

**مانا:** 1) هەرماو، پایەدار. 2) وەك، وێنە. 3) ڕەنگە، گۆیا. 4) هەڵبەت.

**مانان:** وەك، وەکوو.

**ماند:** (فیزیك) ئینێرسی.

**ماندab:** گۆلاو، جێیەك کە ئاوی تێدا قەتیس و بۆگەن بێ.

**ماندак:** بڕوانە:"ارث".

**ماندак بر:** بڕوانە:"وارث".

**ماندالا:** بازنەی گەردوون.

**ماندگار:** 1) ئەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر لە شوێنێك بمێنێتەوە. 2) پایەدار، هەرمانی، نەمر، مانگار، ئەوەی بەردەوام لە حاڵێکدا بمێنێتەوە و نەگۆڕێ. "**ماندگارشدن**": بەنبوون، بەندبوون، مانەوە(لەشوێنێك)، نەڕۆیشتن، گرسانەوە، گیرسانەوە، لەنگەرخستن، دامەزران لە شوێنێ، جێگیربوون لە شوێنێ، نیشتەجێبوون. "**مناسب ماندگارشدن**": نیشتەمەنی، شوێنێ کە بۆ لێ ژیان لەبارە.

**ماندگاه:** بڕوانە:"کوچگاه(1)".

**ماندگی:** ماندوویەتی، شەکەتی.

**ماندن:** 1) مانەوە، گلخواردنەوە، تەرك نەکردنی کەسێك یان شتێك. مانەوە، نیشتەجێبوون، جێگرتن. 3) درێژەدان بە ژیان، نەمردن. سەرسووڕمان، واق وڕمان. 4) قایم و ڕاوەستاوبوون، ڕاوەستان. 5) بەجێهێشتن. 6) لە دۆخ یان حاڵەتی پێشوودا ڕاگرتن یان دانان. 7) دانانی شتێ لە شوێنێ. 8) زیندووڕاگرتن. 9) پێ سپاردن. 10) دۆڕاندن. 11) ماندووبوون. 12) بەمیرات گەیشتن. 13) سەبرکردن، دەست پێنەکردن بە کارێ. 14) ڕەنجان، ڕەنجیان. 15) بێبەش بوون، بێنسیب بوون. 16) ئیزن دان. 17) لێکچوون، وێکچوون، وەك شتێك لێهاتن."**ماندن از چیزی( کسی )**": 1) بێبەش بوون لەو، جیابوونەوە لەو. 2) بەجێمان لەو، کەم هێنان لە بەرامبەر ئەودا. "**ماندن از کاری**": تیامانەوە لەو کارەدا، بۆ نەکرانی ئەو کارە. "**ماندن با کسی**": لەتەك ئەو بوون، دەگەڵ ئەو بەسەربردن. "**چیزی نماندە بود**": نزیك بوو، شتێکی نەمابوو.

**ماندنی:** مەندۆخ، مەندەنە، هەرمانی، هەر شتی زۆر بەتەمەن و شیانی مانەوە.

**ماندە:** 1) ڕاوەستاو، پایەدار. 2) پاشماوە، ماوە، باقی ماو، مەننە، مەندە. 3) ماندوو و شەکەت. 4) بێ بەش و بێ نسیب. 5) خزم. 6) زیندوو. 7) بەجێهێڵراو. 8) میرات، کەلەپوور. **"ماندە بر جای"**: زەمینگیر، لەجێدا کەوتو. **"از اینجا ماندە و از آنجا راندە"**: بێبەش لە هەموو شتێك و هەموو جێیەك.

**مانژ:** ڕاهێنانی ئەسپ، فێرکردنی ئەسب سواری، شوێنی تایبەتی بۆ ڕاهێنانی ئەسب.

**مانستگی:** لێکچوویی، وێکچوویی.

**مانستن:** هاوتابوون، هاوشێوەبوون، بوونە هاوشێوەی شتێك، لێکچوون، وێکچوون، وەکهەڤ بوون.

**مانشت:** سەرتیتر، سەرناو، سەردێڕ، مانشێت.

**مانشگاە:** پارکینگ.

**مانشگری:** بڕوانە:"تقلید".

**مانع :** لەمپەر، بەرگر، ڕاگر، بەرلێگر، گیر، گێڕەوە، پێشگر، پێش بەست، پێش لێ گر، قۆرت، تەگەرە، بەربەست، بەرهەڵست، کۆسپ، دارەست، ڕێگری، گەپل، سرتی، سفك، چەت، گرفت، گیر، جڵەوگیر، جڵەوگیرە، وەرگر. **"مانع آمدن"**: بڕوانە:"مانع شدن". **"مانع از سر راەبرداشتن"**: لەمپەرپەڕاندن، کۆسپ لەسەر ڕێگە لابردن، بەرگرنەهێشتن، تەگەرە و قۆرت لابردن، ئاستەنگ هلگرتن، ڕێخۆش کردن. **"مانع سر راە شدن"**: بوونە لەمپەر لە سەر ڕێ، ڕێگرتن، پێشگرتن، بوونە کۆسپی سەر ڕێ، ئاستەنگی نانەوە. **"مانع داشتن"**: گرفت هەبوون، گیرهەبوون. **"مانع شدن"**: بوونە کۆسپ، بەر بە ڕوودانی شتێك گرتن یان پێش بە گەیشتنی کەسێك بۆ شوێنێ گرتن. **"مانعی ندارد"**: قەیناکا، عەیبی نیە، مەسەلەیەك نیە، نەتشتە.

**مانند:** چون، (لە)وێنە، وەك، وەکا، وەکوو، وەکە، ڤەکی، (لە)جۆر، (لە)چەشن(ی)، نۆتل، شب، گۆر، گۆرەبا، گوهارتۆ، گێن، (لە)گوێن، لە تەرزی، نۆلا، نیشە، هەزەی.

**مانداگ:** هاوتا، وێچوو، لێکچوو.

**ماننگی:** لێکچوویی، وێکچوویی. **"ماننگی داشتن"**: 1) لێکچوون، وێکچوون. **"ماننگی کردن"**: وێچواندن، شوبهاندن.

**مانور:** 1) چالاکی شەڕ بە شێوەی ڕاهێنان و تاقیکاری، جووڵەی بەشە جۆراو جۆرەکانی ئەرتەش بۆ ئەنجامدانی نەقشەکانی شەڕ، مانۆڕ. 2) فێڵ و تەگبیر و هەڵسوکەوتی زیرەکانە لە ئەنجامدانی کارێکا. 3) خۆنوێنی، خۆنواندن.

**مانوی:** پێڕەوی ئاینی مانی.

**مانوێت:** پێڕەوی ئاینی مانی بوون.

**مانە :** ماڵ و کەلوپەلی ناوەوەی.

**مانیتیسم:** خەوی مێغناتیسی.

**مانید:** بڕوانە:"تقصیر".





**مانیدکار:** بڕوانە:"مقصر".

**مانیدن:** بڕوانە:"مانستن".

**مانیفست:** بەیاننامە، مانیفێست، مەرامنامەیەك کە گرووپ و حیزبەسیاسی، ئایینی، فەلسەفی و ئەدەبییەکان یان بڵاوکراوەیەك بۆچوون و هەڵوێستی خۆیانی تێدا ڕادەگەیەنن.

**مأوا:** 1) شوێنی مانەوە، ماڵ. 2) پەناگا، حەشارگە، ڤەشارگە. **"مأواکردن( گرفتن، گزیدن )"**: جێگرتن، نیشتەجێ بوون.

**ماوراء:** ئەودیو، ئەوپەڕ، بان، پشتەسەر.

**ماوراء استدلال:** ئەودیوبەڵگاندن.

**ماوراءالطبیعە :** ئەودیو/بان سروشت، مێتافیزیك.

**ماوراء بحار:** ئەوپەڕ دەریاکان، وڵاتانێك کە لە ئوقیانووس و دەریاکان دا هەڵکەوتوون وەك بریتانیا.

**ماە:** 1) مانگ. 2) مانگ، بەشێ لە دوازدە بەشی ساڵ. 3) زۆر باش و لەبەردڵان. 4) جوان، قەشەنگ. **"ماە (را ) بە گل اندودن"**: داپۆشینی هەقیقەت. **"ماەبماە"**: مانگەومانگ، مانگانە، هەر مانگە، مانگ بە مانگ، لەم مانگەوە بۆ ئەو مانگ، هەر بە سی ڕۆژ جارێك. **"ماە تام( تمام، کامل، درست )"**: مانگی شەوی چواردە. **"ماە دو هفتە"**: مانگی شەوی چواردە. **"ماە زیر ابر نماندن"**: دەرکەوتنی هەقیقەت. **"ماە شکستە"**: بڕوانە:"هلال". **"ماە کسی از ابر برآمدن"**: خۆشبوونەوەی حاڵ و وەزعی ئەو. **"ماە کسی سرآمدن"**: کاتی زانی ئەو بوون. **"از ماە تا ماهی"**: تەواوی جیهان، سەرانسەری دنیا.

**ماهانە :** مانگانە، مانگ بە مانگ، مانگی، مەهانی، مەهی، هەیوانە.

**ماهپار/ماهپارە:** جوان و خوشیك وەك مانگ، هەیڤ سفەت.

**ماهتاب:** نوور و ڕووناکی مانگ.

**ماهر:** کارامە، کارا، کارزان، لە کار دەرهاتوو، لە کار دەرهاتگ، لێزان، ژیلافە، شارەزا، تەڕدەس، بەدەست و برد، زەبربەدەست، زەبەردەست، لەکاردەرهاتو، زیرەك و لێهاتوو، وەستا، مەلاح. **"ماهر در تیراندازی"**: نیشانچی.

**ماەرخ:** 1) جوان و قەشەنگ وەك مانگ، لە کوردیدا کەسی جوان و قەشەنگ بە مانگی چواردە دەشوبهێنن. 2) بەئەسپایی و چەماوە. **"ماەرخ رفتن"**: بۆسەدانان و دوایە هەڵمەت بردن.

**ماە سیما :** بڕوانە: "ماەرخ(1)".

**ماەزدە:** شێت، شەیدا.

**ماهگانە :** بڕوانە: "ماهانە".

**ماەگرفتگی:** بڕوانە: "خسوف".

**ماهنامە :** مانگنامە، مەهنامە، هەیڤنامە، گۆڤارێك کە مانگی جارێك دەردەچێ.

**ماەنو:** مانگ/مانگی نوێ، مانگ/مانگی تازە، مانگیلە، مەهانوو، مانگ/ مانگی یەکشەوە، هەیڤایەکشەوی.

**ماهو:** خەملان، ڕازانەوە، زەین، خشکۆك کرن.

**ماهوار:** وەك مانگ، مانگ ئاسا، جوان، خوشیك. بە مانای مانگانەش هاتووە.

**ماهور:** 1) بەرزیونزمی زەوی، زەوی نارێك، شاخی هەڵەمووت. 2) ئاهەنگێکی گۆرانییە.

**ماەوش:** وەك مانگ، جوان و قەشەنگ وەك مانگ.

**ماهوی:** لەپێوەندی دەگەڵ چییەتی و بنچینەی شتێ.

**ماهیانە:** بڕوانە: "ماهانە".

**ماهیّت:** ناوەرۆك، چییەتی، هەقیقەت و جەوهەری شتێك.

**ماهیتاً:** لەبنەڕەت ڕا، لەبناغەڕا.

**ماهیّت گرایی کردن:** بڕوانە: "کیاگرایی کردن".

**ماهیچە:** ماسوولکە، ماسیلکە، مالووسکە، مالۆسکە، ماسۆڵە، گردك. "**تارهای ماهیچە**": ژێیەکانی ماسوولکە.

**ماهی‌خانە:** ئاکواریۆم.

**ماهیگیر:** ماسی‌گر، ماسیەوان، کەسێ ڕاوە ماسی دەکا.

**مایج:** شەپۆل لێدەر، پێل لێدەر.

**مایحتاج:** نیاز و پێویستی، پێداویست، حەوجەهی، ویستەمەنی، ڕسق و ڕۆزی، بژیو.

**مائدە:** خوان، خواردەمەنی، سفرەی ڕازاوە.

**مایع:** تراو، جسمی ڕەوان وەك ئاو. "**مایع لزج**": لینجاو، لینچقاو، لینچکاو، زنچکاو.

**مایعات:** تراوەمەنی، ماددەگەلی تراو و شل.

**مایعرف:** 1) ئەوەی کە ناسراوە، ناسیار. 2) کەلوپەل و شتی ناو ماڵ کە بۆ کەسێك جێمابێ.

**مایل:** 1) مەیل کەر، گرۆیی کەر، پێخۆش، خوازەر. 2) لار، کەج، دوولا، چەمیو. 3) شلومل، بەلەنجەولار. "**مایل بە**": ئاماڵ، وێچوو، هوول (سوورهوول)، نزیك بە، مەیلەو. "**مایل شدن**": بەلاداهاتن، هاتنە لادا، خواربوونەوە بە لای تەنشتا.

**مایلزم:** پێویستی، ئەوەی کە پێویست بێ، پێدڤی.

**مایملك:** دارایی/ سامانی کەسێك.

**مایندر:** زڕدایك.

**مأیوس:** هیوابڕاو، بێهیوا، ناهومێد، بێ هێڤی، دڵسارد، دڵبەدوا، نیگەران. "**مأیوس شدن**": پشت ساردبوونەوە، هیوابڕان، هۆبڕان، بێهیوابوون، ناهومێدبوون.

**مایە:** 1) بنچینە، بناغە، سەرچاوە. 2) هۆ. 3) خوێندەواری و زانیاری، زانست. 4) توانایی، لێهاتوویی. 5) پارە، ماڵ، سامان. 6) سەرمایە(برای این کار، مایە چقدر داری؟). 7) تێچوو، خەرج(مایەاش هزار تومان است. 8) واتا یان ناوەرۆك لە نووسراوە یان شانۆیەك دا(مایە داستان های عاشقانە). 9) بەهرە، نسیب. 10) ماددەی سەرەکی یان کاریگەر کە بە ماددەیەکی تری زیاد دەکەن، هاڤەین، هەوێن، ئامیان، هێڤێن، مأیە. 11) پڕڕوویی. 12) واکسێن. 13) ڕادە، ئەندازە. 14) نرخ و بایەخ، جێگە و پۆست. 15) شیاوی، لێهاتوویی. 16) (فەلسەفەی کۆن) ماددە. 17) هەرکام لە چوار توخمی ئاو و خاك و ئاگر و با. "**مایەبەمایەشدن**": مایەباش هاتنەوە. "**مایە داشتن**": پڕڕووبوون. "**مایە را سفت (زیاد) کردن**": پڕڕوویی‌کردن. "**مایەزدن**": هەوێن لێدان. "**مایەکردن**": کردنە دەسمایە. "**مایە گذاشتن(رفتن)**": مایەدانان، بەکاربردنی وەخت و وزە بۆ بەرەوپێش بردنی کارێ. "**مایە گذاشتن ازکسی (خود)**": لە گیان و سەروسامانی خۆ کەڵك وەرگرتن بۆ بەرەوپێش بردنی کارێ. "**مایە گذاشتن برای کسی**": لانی زۆری توانایی و وەختی خۆ بۆ حاڵخۆشی و بەرەوپێش بردنی کاروباری ئەو تەرخان کردن. "**مایەگرفتن**": سەرچاوەگرتن. "**مایە گرفتن (آمدن) برای کسی**": بەدگۆیی ئەو کردن و خستنە ژانەسەر و گێچەڵەوە.

**مایەتعجب:** سەرسووڕێن، سەرزڤرێن، سەمەرە، مایەی سەرسووڕمان.

**مایەتیلە:** دەزمایەی کەم، سەرمایەی کەم.

**مایەدار:** 1) پڕمایە. 2) تێروتەسەل، دروست و حەساوی. 3) پڕ، سەرڕێژ. 4) خوێندەوار، زانا. 5) سەرمایەدار، ماڵدار، زەنگین. 6) ڕاست کردار و جێمتمانە. 7) پشتیوان. 8) قەبە، زل.

**مایەزندگی:** بژیو، پێبژیو، ژیوار، مایەی ژیان، هەرچی پیاو پێی دەژی، گوزەران.

**مایەزنی:** واکسێن لێدان، واکسیناسیۆن.

**مایەکاری:** 1) نرخی تەواوبووی کاڵایەك بەبێ حەساوکردنی سوود. 2) بەپاکی و بەبێ چاوەڕوانی.

**مایەکوبی:** کوتان، کوتاندن، کوتانن، پەترمە، واکسیناسیۆن.

**مایەور:** 1) دەوڵەمەند، زەنگین. 2) گەورە، مەزن. 3) بەشکۆ، شکۆدار. 4) بەنرخ، بایەخدار.

**مایی:** خۆبینی، خۆخوازی، خۆویستی، بەدەماری، لووت بەرزی، پۆزبلندی.

**مائیت:** پرسیار لە هەقیقەتی شتێك، چییەتی.

**مباثت:** وتنی ڕازی خۆ دەگەڵ کەسێك.

**مباح:** ڕەوا، ڕێپێدراو، حەڵاڵ. "**مباح بودن خون کسی**": ڕەوابوونی کوشتنی ئەو. "**مباح بودن مال کسی**": ڕەوابوونی زەوت یان تالانکردنی ماڵی ئەو. "**مباح کردن**": ڕەواکردن، ڕێپێدان، حەڵاڵ کردن.

**مباحث:** (مَ.حِ) کۆی"مبحث".

**مباحثە:** (مُ.حَ) دەگەڵ یەکدی باس کردن، باس و گفتوگۆ.

**مبادا:** نەبەکۆ، نەکەی، نەوا، نەك، نەوەك، نەوەکا، نەوەکوو، نەوەکی، نەوەکینێ، نەوەکوونێ، مەبادا، نەبادا، خوانەکا. دژواری و کوێرەوەری.

**مبادرت:** 1) دەست پێشخەری لە ئەنجامدانی کارێك، پێش گاڤی. 2) پەلەکردن، بەلەسەبوون، لەزین.

**مبادلات:** ئاڵوگۆڕەکان، دان و ستانەکان.

**مبادله:** ئاڵوگۆر، وەگۆڕ، گۆڕین، شت بە شت گۆڕان، دان و ستان. "**مبادله پایاپای**": تەقاوی، ڕشت، سەربەسەر، سەروەسەر، ماڵ بە ماڵ گۆڕینەوە، شت بە شت وەگۆڕین. "**مبادله کردن**": وەگۆڕین، گۆڕینەوە، گوهەرتن، شتێ لە جیاتی شتێ سەندن.

**مبادی:** 1) سەرەتاکان، دەسپێکەکان. 2) بنچینەکان، بنەماکان. 3) ئاگایی و زانیارییە پێشەکییەکان کە بۆ فێربوونی هەر زانستێ پێویستە. "**مبادی اجسام**": بڕوانە: "عناصر اربعە".

**مبارات:** لە یەکتر بێزار بوون، جاڕزبوون لە یەکتر. "**مبارات کردن**": بەرانبەریکردن لە ڕێز و پلەدا. "**طلاق مبارات**": ئەوەیە کە ژن و مێردێك کە لێك بێزاربوون پێکەوە بڕیار بدەن کە ژن بەشێك لە مارەییەکەی خۆی بە مێردەکەی ببەخشێ و تەڵاق وەرگرێ و پیاوەکەش وازبێنی لەو شتانەی کە پێشتر بۆ ژنەکەی ساندبوو.

**مبارز:** خەباتگێڕ، خەباتکار، تێکۆشەر، شۆڕشگێڕ، شورشڤان. شەڕکەر، جەنگاوەر. "**مبارزاتی**": خەباتگێڕانە، شۆڕشگێڕانە.

**مبارزطلبی:** بانگهێشت کردنی کەسێ بۆ شەڕ و زۆرەزمێ، خەنیم ویستن.

**مبارزه:** 1) ڕاوەستان لە بەرامبەر کەسێك یان شتێك دا و هەوڵدان بۆ تێکشکاندن یان لەناوبردنی ئەو، بەربەرەکانی. 2) خەبات، تێکۆشان، هەوڵدان. 3) کێبەرکێدان لە بەرانبەر خەنیمدا. "**مبارزەسخت**": کێفەرات، ڕەنج و بەربەرەکانی، خەباتی سەخت و دژوار.

**مبارزەطلب:** خەباتخواز.

**مبارك:** فەرخ، فەڕدار، بەبەرەکەت، پیرۆز، موارەك.

**مباسطت:** 1) پێوەندیی دۆستانەی نێوان دووکەس یان گروپێك، گەرموگوڕی، نێوان خۆشی. 2) ڕووخۆشی، ڕووگەشی.

**مباسطه:** بڕوانە: "مباسطت(1)".

**مباشر:** 1) سوورباش، سەرکار، وێرت، دێوان، شانە، قورقوڕبەگ، کاربەدەست، گزیر، مۆ. 2) ڕاستەوخۆ، یەکسەر. 3) بکەر، ئەنجامدەر. 4) ژەنیار.

**مباشرت:** 1) چاوەدێری، چاوێری. 2) گزیری، سەرکاری، سوورباشی. 3) (مافناسی) ئەنجامدانی کردەیەکی حوقووقی لە لایەن کەسێکەوە بەبێ دیاریکردنی نوێنەر. 4) هاوجێییکردن. 5) خەریکی کارێك بوون و ئەنجامدانی. 6) ساز ژەنین، ژەنیاری.

**مباعدت:** دووری، جیایی.





**مبالات:** گرنگیدان بە کارێك، خەمخۆری کردن، گوێپێدان، مشوورلێ خواردن. "**بی مبالات**": کەمتەرخەم، بێمبالات، گەللایی، ڤەرقل، گوێنەدەر بەکار، ساردوسڕ.

**مبالغه :** 1) زێندەگۆیی، پێوەنان، زیادەڕۆیی، زۆرڕۆیی، گرکرن، بڤ کردن، زاڤ شاندان، فڕوفیشاڵ کردن، هاشوهوش کردن. 2) هەوڵدان و پێداگری لە کارێ یان بابەتێکدا.

**مبالغەآمیز:** زیاد لە پێویست، نەجێباوەڕ، تێکەڵ بە تاریف و پەسنی لەڕادەبەدەر.

**مبالغەگو:** قسەزل، بەبافیش، بافیشکار، پێوەنەر.

**مبانی:** 1) بینایەکان، خانووەکان. 2) بنەماکان، بناخەکان.

**مباهات:** 1) شانازی، سەربەرزی. 2) پەسن و ستایش. 3) بەرابەریکردن دەگەڵ کەسێك دا لە چاکێتی و باشێتیدا. "**مباهات کردن**": پێنازین، پێنازان، پێوەنازین، فەخر پێ کردن، شانازیکردن/ پێوەکردن.

**مباهله :** تووك کردن لە یەکتر، بەنەحلەت کردنی یەکتر.

**مباهی:** فەخرپێکەر، شانازیکەر، سەربەرز.

**مبایعت:** 1) پێڕەوی. 2) کڕین و فرۆشتن دەگەڵ یەکدی.

**مبایعه :** بڕوانە: "مبایعت(2)".

**مباین:** جیا، جیاواز، ناکۆك، دژ.

**مباینت:** 1) جیایی، جیاوازی. 2) ناکۆکی، ناتەبایی، دژایەتی. 3) دوژمنایەتی.

**مبتدا :** یەکەم، سەرەتای شتێك.

**مبتدع:** داهێنەر، نوێهێن.

**مبتدی:** دەست پێکەر، تازەکار، نوێکار، تازەفێربوو.

**مبتذل:** شتێ کە هەمووکەس دیبێتیان، لە مۆدکەوتوو، دێمۆدە، بێنرخ، بێ قیمەت، تەڕەماش.

**مبتّر:** (مُ.بَ.تَ) کلك بڕاو، بڕاو و کەمووکووڕیدار، دوابڕیاگ، وەجاخ کوێر.

**مبتکر:** داهێن، داهێنەر، کەسێك شتی تازە دابێنێ.

**مبتلا:** 1) تووش(هاتگ)، تووشیار، گیرۆدە، هەڤریش، گرفتار. 2) دڵدار، ئەویندار، ئاشق. 3) نەخۆش، داماو، سەقەت. "**مبتلا شدن**": تووش بوون، تووشیاربوون، گیرۆدەبوون، هەڤریش بوون، گرفتاربوون، پێوەبوون، تێوەگلان، کەوتنە بەڵا و مەینەتییەوە.

**مبتنی:** 1) بیناکەر، چێکەر. 2) پشت ئەستوور، (مبتنی بر) لەسەر بنەمای.

**مبتهج:** خۆشحاڵ، شاد، دڵخۆش، کەیفخوەش.

**مبثوث:** بەربڵاو، پڕژوبڵاو، بڵاوبۆوە.

**مبحث:** بابەت، باس، باس و خواس، جێی لێدوان، جێی باس، تەوەرەی باس.

**مبدأ:** 1) سەرەتا، شوێنی دەسپێکی شتێ. 2) شوێنی سەرهەڵدانی شتێ. 3) هۆ و سەمەدی سەرهەڵدانی شتێ. 4) بناغە، بنەما. 5) بیروباوەڕ، ڕێباز. 6) ئافرێنەر، خولقێنەر. "**مبدأ اوّل(اعلا، کل، وجود)**": (فەلسەفەی کۆن) خودا. "**مبدأ و معاد**": 1) سەرەتا و سەرەنجام. 2) خودا و ڕۆژی پەسڵان.

**مبدأالمبادی:** خودا، دەسپێکی گشت دەسپێکەکان.

**مبدع:** 1) داهێنەر. 2) ئافرێنەر، خولقێنەر.

**مبدّل:** گۆڕاو، گۆڕیاو، کۆپیکراو. "**مبدّل شدن**": گۆڕان. "**مبدّل کردن**": گۆڕین.

**مبدی:** ئاشکراکەر، دەرخەر.

**مبذّر:** بەفیڕۆدەر، دەست پێوەنەگر، هەڵەخەرج، دەست بڵاو.

**مبذول:** بەخشراو. "**مبذول داشتن(کردن)**": 1) بەکاربردن. 2) دان، بەخشین. 3) قبووڵکردن.

**مبرّا:** ئازادکراو، بێتاوان، بێ گوناه، پاك. "**مبراکردن**": بڕوانە:"تبرئەکردن".

**مبرّد:** ساردکەرەوە، فێنك کەرەوە.

**مبرّز:** ئاشکرا، بەرچاو، دیار.

**مبرقش:** ڕازاوە بە ڕەنگی جۆراوجۆر، نەخشاو، ڕەنگاوڕەنگ.

**مبرم:** (مًُ.رَ) 1) توند، زیاد. 2) قایم، پتەو. 3) لێبڕاو، بەبڕشت.

**مبرور:** خوالێخۆشبوو.

**مبرهن:** 1) ئاشکرا، دیار. 2) سەلمێنراو بەبەڵگە.

**مبسوط:** 1) ڕاخراو، پان کراوە، کراوە. 2) تیروتەسەل، چڕوپڕ، شرۆڤەکراو.

**مبشّر:** مزگێنیدەر، مژدەدەر.

**مبطل:** پووچکەرەوە، هەڵوەشێنەر، کانسێڵ کەر. خەتاکار.

**مبعوث:** 1) نێردراو، ناردراو، ڕەوانەکراو. 2) هەڵبژێراو.

**مبغّض:** بێزراو، قێزەون.

**مبغوض:** کەوتنە بەر ڕق و کینەوە.

**مبلّغ:** (مًُ.بَ.لِ) 1) پڕوپاگەندەکەر، بانگەشەکەر. 2) گەیەنەر، پێڕاگەیەنەر.

**مبلغ:** (مَ.لَ) 1) نرخ، قیمەت، بڕ، کرت، ئەندازە. 2) ئەوپەڕی، کۆتایی.

**مبلول:** شێدار، شەدار، نمدار، تەڕبوو.

**مبنا:** بناخە، بنەما، پایە.

**مبهم:** نادیار، ناڕوون، کەس نەزان، ئاڵۆز، لێڵ، تەمومژاوی. شاراوە، وەشارتوو.

**مبهوت:** حەپەساو، حەپەسیو، حەپەسای، عەبەساو، کاس، وڕ، واق وڕ، سەرسام، سەرسووڕماو، سەرگەردان، چوارچاو، چەنگ، مات و پەشێو. "**مبهوت شدن**": حەپەسان، حەپەسین، عەبەسان، واق وڕمان، سەرسووڕمان، سەرسام مان، لەجێ وشك بوون، تاسان، تاسیان، زەندەمان، مات بوون.

**مبین:** (مُ.بِ) ئاشکراکەر، ڕوونکەرەوە، خویاکەر، دەرخەر.





**مبین:** (مُ) دەربڕ، دەرخەر، ئاشکراکەر. 2) ئاشکرا، ڕوون، دیار. 3) ڕۆشن، بەدرەوشین.

**مبیّن:** (مُ.بَ.یِ) 1) ئاشکرا، دیار. 2) ڕون و بەدوور لە لێڵی و ئاڵۆزی.

**متاب:** 1) گەڕانەوە بۆ لای هەق. 2) تۆبەکردن.

**متابع:** پێڕەو، فەرمانبەر.

**متابعت:** 1) پێڕەویکردن، دووکەوتن. 2) بەدواداچوون، ل دووکەتن.

**متابولیسم:** لە زاراوەی فیزیۆلۆژی دا بریتییە لە گۆڕانی شیمیایی مەوادی غەزایی لە ناو لەش دا کە وزە و هیزی پێویست بۆ بەهێزکردنی ئەندامەکانی لەش دابین دەکا، بەم پڕۆسەی بەرهەمهێنانی وزە و تین و گوڕ پێ بەخشینە مێتابۆلیسم دەڵێن.

**متأثر:** 1) کارتێکراو، کاریگەری وەرگرتو. 2) نیگەران، مەلوول، خەمبار. "**متأثرشدن**": کەوتنە ژێر کاریگەری، کارتێکران، زك پێ سووتان، زك پێشەوتین، بەزەیی پێداهاتنەوە، بەرخواردن (پێم بەری خوارد). "**متأثرکردن**": خستنەژێرکاریگەری، کارتێکردن.

**متأخر:** 1) نزیك بە کاتی ئێستا، نوێ. 2) دواکەوتوو، پاشکەوتوو، جێماو.

**متأذی:** ئازاردیتوو، ئازارپێگەیشتوو، ڕەنجاو.

**متارکە:** 1) بەجوێ ژیانی ژن و مێرد لەیەکتر، پێوەندی پچڕانی ژن و پیاو. 2) تەرك کردن و وازهێنان لەشەڕ بۆ ماوەیەکی کاتی. 3) جیایی.

**متأسف:** بەداخ، خەمبار، کەسێ کە خەم و پەژارە دەخوا. "**متأسف شدن**": بەداخ بوون، خەمباربوون.

**متأسفانە:** بەداخەوە، داخەکەم، داخم ناچێ، مخابن، حەیفێ، دەستی شکاوم.

**متأسی:** پێڕەو(یکەر)

**متأصل:** قایم و بنەچەدار، رەسەن.

**متاع:** کاڵا، کەلوپەل، ئەوەی بەهرەی لێ ببەن جگە لە زێڕوزێو.

**متاعب:** سەختییەکان، دژوارییەکان.

**متافیزیك:** (فەلسەفە) مێتافیزیك، ئەوەی بانتر لە جیهانی سروشت و مادده بێ وەك خوا و ڕۆح و هتد، ناسینی هۆکار و بنەما سەرەتاییەکان.

**متأکّد:** 1) دڵنیا، خاترجەم. 2) پتەو و قایم.

**متألّم:** دەردبار، دەردەدار، لەش بەبار، ئێشدار، بەژان.

**متالوژی:** زانست و تێکنیکی دەرهێنان و پاڵاوتن و فۆڕم پێدان و تاوتوێی پێکهاتەو تایبەتمەندیی کانزاکان.

**متأله:** بیرمەندی زانستە ئایینییەکان.

**متأمل:** ئەوەی لە شتێك دەڕوانێ و بیری لێدەکاتەوە، هزرڤان.

**متامورفوز:** گۆڕان، گۆڕانی فۆڕم، بیچم گۆڕان.

**متانت:** 1) قایمی، پتەوی. 2) گەردەنیش، پشوو لە سەر خۆیی، سەبروحەوسەلە، قورساخ، قورساغ، سەنگینی و گرانی مرۆ.

**متأهب:** ئامادە و تەیار بۆ ئەنجامدانی کارێك.

**متأهل:** زەدار، خاوەن ژن، ژن و منالّ دار، خێزاندار، زەوجی، ژندار، ژنیای، خێزاندار.

**متبادر:** هاتنەزەینەوە، شتێ کە کوتوپڕ بێتەوە یاد. "**متبادر شدن**": بە زەین گەیشتن، بە مێشك دا هاتن.

**متبادل:** ئالوگۆڕکراو.

**متباعد:** دوور لە یەکتر.

**متباین:** جیاواز، جودا، دژی یەکتر.

**متبحّر:** خاوەنی زانست و ئاگایی، فرەزانا، تێگەیشتوو.

**متبدد:** جیا، پەرتەوازە، پەرێشان.

**متبرّك:** متفەرك، موفەرك، بەبەرەکەت، پیرۆز.

**متبرّم:** مەلوول و ڕەنجاو، دلّتەنگ.

**متبصر:** بڕوانە:"بصیر".

**متبلج:** شاد و دەم بەپێکەنین.

**متبلور:** 1) بە فۆرمی بلوور دەرهاتو. 2) دیار و ئاشکرا. "**متبلورشدن**": بەرجەستەبوون، بوونە بلوور، دەرکەوتن.

**متبوع:** پێڕەوی(لێ)کراو.

**متبیین:** ئاشکرا، دیار.

**متتابع:** پەیتاپەیتا، لێکدالێکدا، دوابەدوا، یەك بە دوای یەك دا.

**متتبع:** خوازیار، پەیجۆر.

**متجاسر:** 1) بوێر، نەترس، بەجەرگ. 2) سەرکێش، سەرپێچیکەر.

**متجانس:** چوونیەك، هاوچەشن، هاوفۆڕم، یەك دەست. هەماهەنگ.

**متجاوز:** دەستدرێژکەر، دەستدرێژیکار، سنوورشکێن، هەلّەمارکەر، پەلاماردەر، کەسێ کە لە سنوور و ڕادەی خۆی تێپەڕێ، وەسەرپەڕ، عایل، زالّم، ناهەق. زیاتر. "**متجاوز از**": زیاتر لە. "**متجاوز چیزی شدن**": لەو تێپەڕین.

**متجاهر:** کەسێك کە بە ئانقەست کار و کردەوەی خۆی ئاشکرا بکا.

**متجاهل:** نەزانم کار، زانای خۆ گێل کەر، خۆنەزانکار، کەسێك کە خۆی لە نەزانی بدا.

**متجبر:** 1) بڕوانە:"متکبر". 2) ستەمکار، زالّم.

**متجدّد:** نوێخواز.

**متجرّد:** ڕووت و پەتی.

**متجسّد:** بەرجەستەکراو.

**متجسّس:** 1) گەڕێن، لێگەڕ، پەیدۆز، پەیجۆر. 2) سیخوڕ، زیرەوان، بەزاخ.

**متجلّی:** دیار، ئاشکرا، خویا، ڕوناك، دیارکەوتوو. "**متجلّی شدن**": دیارکەوتن، ئاشکرابوون.

**متجمّل:** 1) خۆڕازێنەوە، ڕازاوە و خەملاو. 2) شکۆدار.





**متجنّب:** خۆپارێز، خۆلادەر، خۆبوێر، کەنارەگیر.

**متحارب:** دوژمن.

**متحالف:** هاوپەیمان، سوێندخۆر.

**متحتم:** 1) پێویست، حەتمی. 2) ئاشکرا، روون.

**متحجّر:** 1) دوگم، کۆنەپەرست. 2) وەك بەرد لێهاتوو.

**متحّد:** یەکگرتوو، یەکترگرتوو، یەکگرتی، پێکەوە هاوخەبات، هەڤگر، تەبا. "**متحّد شدن**": یەکگرتن، یەکترگرتن، هەڤدوگرتن، هەڤ گرتن، یەکیەتیکردن، یەوبینان گرەوتش. "**متحّد کردن**": یەکخستن، کردنەیەك.

**متحدالشکل:** هاوفۆرم، هاوشکلّ، یەك بەرگ.

**متحدالمرکز:** هاوچەق.

**متحدالوزن:** هاوکێش، لەکێش دا یەکسان.

**متحدّث:** بڕوانە:"راوی".

**متحذّر:** خۆپارێز، خۆبوێر.

**متحرز:** خۆڕاگر، خوددار، بەربەخۆگر، خۆپارێز.

**متحرّك:** بزۆك، بزێو، جوولێن، جوولەکەر، گەڕۆك. "**بسیار متحرّك**": لەبتۆك، زۆر بە جوولە. "**غیرمتحرك**": نەبزۆك، نەبزوو، بێ جوولە، چەق، سنگەپێ، مات.

**متحزن:** خەمبار، نارەحەت.

**متحسّر:** بەداخ و کەسەر، حەسرەت خۆر.

**متحصّن:** مانگر، مانگرتوو. پەناگرتوو، چوونە ژێر دالّدەی کەسێك.

**متحقق شدن:** وەدیهاتن، هاتنەدی.

**متحلّل:** تواوە و حەل بوو، حەلیایی. "**متحلل شدن**": داخوران، بەرەو لاوازی چوون.

**متحلّی:** ڕازاوە، خەملاو.

**متحمّل:** 1) هەلّگر، لەخۆگر. 2) بڕوانە: "بردبار". "**متحمل شدن**": 1) بڕوانە: "تحمل کردن". 2) سەرنج پێدان، گرینگی پێدان. "**غیرمتحمل**": بەرگەنەگر، دەرنەبر، بێ چیکەلّدانە.

**متحوّل:** وەرگۆڕاو، وەرچەرخاو. "**متحوّل شدن**": گۆڕان.

**متحیّر:** سەرسوڕماو، واق وڕ، سەرسام، مات، سەرگەردان، حەپەساو، حەپەسیو، حەیری مایی، عەبەساو. "**متحیّرشدن**": سەرسام مان، سەرسووڕمان، ڕامان، تیاڕامان، ڤەتەوشین، سەرزڤرین، سەرزڤران، واق وڕمان، وڕبوون، حەپەسان، حەیری مان، هەوەسیان، شەرپلان، شەرپلین. "**متحیّر ماندن**": بڕوانە: "متحیّرشدن".

**متخاصم:** دوژمن، لێکدژ، کەسێ کە دەگەلّ کەس یان کەسانی دی دوژمنایەتی و شەڕبکا.

**متخذ:** وەرگیراو.

**متخصّص:** کارناس، پسپۆڕ، شارەزا.

**متخلخل:** فشەلّ، فشەلّۆك، فشەلّە، پفەلّ، تل، خل، کەفەلّۆك، کەفەلّووك، کەفەلّووکە، شاش، ناپتەو، سست.

**متخلّص:** کەسێ کە نازناوی بۆ خۆی هەڵبژاردبێ .

**متخلّف:** 1) بڕوانە: "خلافکار". 2) دواکەوتو، بەجێماو.

**متخلّق:** 1) خووگرتوو، عادەت کردوو. 2) خۆش خولّق، هەڵسوکەوت جوان.

**متد:** مێتۆد، شێوە، شێواز، ئوسلّووب. **"متد بدیهی"**: مێتۆدی بەلّگەنەویست.

**متداعی:** 1) (دەروونناسی) تایبەتمەندی مانایەك کە مانایەکی تر بخاتەوە یاد. 2) بانگهێشت کەر، داواکار. **"متداعی گشتن"**: 1) یەکتر بانگ کردن. 2) لێك بڵاوبوون و وێران بوون.

**متداول:** باو، ئاسایی. **"متداول کردن"**: دائیخستن، کردنە باو.

**متدبر:** بەهزر و تەگبیر، ئاوەزمەند.

**متدرّب:** ڕاهاتوو، راهاتی، فێر.

**متدرّج:** 1) ئەوەی کە هێدی هێدی و بەئەسپایی بچێتە بەرەوە. 2) پلەبەپلە.

**متدرجاً:** هێدی هێدی، هێواش هێواش.

**متدلوژی:** مێتۆدۆلۆژی، شێوازناسی، شێوەی لێکۆڵینەوە لە زانست.

**متدیك:** مێتۆدیك، شێوازمەند.

**متدیّن:** بەدین، دیندار، نوێژوڕۆژووپاك، لە خواترس، خوەدێترس، خواپەرستی ڕاست.

**متذبذب:** وازوازی، هەروەختە لە سەر هەوایێك، ڕاڕا، دوو دڵ.

**متذرّع:** پەڵپگر، گڕووگر.

**متذکر:** وەبیرهێنەوە، یادکەرەوە. **"متذکر شدن"**: وەبیر خستنەوە، بیرهێنانەوە.

**متراجع:** پاشگەزبۆوە، گەڕاوە.

**مترادف:** 1) هاوواتا، هاومانا، هەڤ واتە. 2) پەیتاپەیتا، پشت سەرییەك. 3) لە یەك ڕیزدا.

**متراژ:** پێوان بە میتر.

**متراکم:** پەستواو، لەسەریەك کەڵەکەبوو، لەسەریەك تۆپەڵ بوو، بەسەر یەکتریدا کەوتوو، کۆما.

**متربّص:** 1) چاوەڕوان، چەشرێ. 2) بڕوانە: "محتکر".

**مترتب:** 1) جێگیر، سەقامگیر. 2) جێگرتو لە جێ و ڕێی خۆدا. **"مترتب بودن (شدن) بر چیزی"**: ئاکام لێوەرگرتن یان ڕەنیوهاتن لەو. **"مترتب شدن"**: وەدەست هاتن.

**مترجِم:** (مً.تَ.جِ) وەرگێر، وەرگەڕ، دیلمانج، دیلبەند، تەرجمان، تەرجممان، تەرجومان، پاچڤەکەر/ کار، پاچڤان، چێورکار.

**مترجَم:** (مً.تَ.جَ) وەرگێڕاو، وەرگێڕدراو.

**متردد:** 1) دڕدۆنگ، دوودڵ، دەردۆك، ڕاڕا، بەگومان، دووگومان، سەددڵ، وازوازی، سەرسەری، وسواسی، هەردەبیر، هەردەمی. 2) هاتووچۆکەر، کەسێ کە هاتووچۆ بکا.

**مترس:** (مِ.رِ) قەپاتمە، سوتلی، ژنی بێ مارەیی ڕاگرتن بۆ دەگەڵ ڕابواردن.





**مترس:** (مَ.رَ) داوەڵ، داوڵ، داهۆڵ، دالّۆ، دالّهۆ، قەیلۆك، لۆپك، چاتۆڵ. "مترسك و هراسە و داهل و افچە"ش هەر بەم مانایەن.

**مترسك:** 1) بڕوانە: "مترس". 2) کەسی بێ ئیرادە.

**مترسل:** نووسەر، سکرتێر.

**مترشّح:** 1) دەڵێن، نمدەر، شێدار، شەهدار، ئاودادەر، ئاودەڵێن. 2) پەروەردەکراو و شیاو بۆ ئەنجامی کارێ.

**مترصّد:** ئەوەی گوێقولاغ و وریا لە چاوەڕوانی ڕوودانی شتێك دابێ، هەست ڕاگر، بۆسەگرتوو، خۆمات کردن لە شت، فتراق، چاوەڕوان، چاولەڕێ.

**مترقب:** چاوەڕوان، چاوەنۆڕ.

**مترقبه:** چاوەڕوان کراو، ڕێتێچوو.

**مترقی:** پێشکەوتوو، پێشکەفتی، پێشکەوتنخواز. خاوەنی حەرەکەتی ڕووبەرەو ژوور.

**مترمل:** خوێناوی، بریندار.

**مترنّم:** سۆزەکەر، لۆرەکەر، گۆرانی بێژ.

**مترمربع:** میکاب، میتری چوارگۆشە، میتری دووجا.

**مترمکعب:** میتری سێ جا.

**متروپل:** مێترۆپۆل، کەلان شار، پێتەخت، شاری سەرەکی وڵاتێ یان مەڵبەندێك. حاڵەتی دەوڵەت یان وڵاتێ نیسبەت بە کۆلۆنییەکانی.

**متروك:** چۆڵکراو و بێ ئاوەدانی، تەرك کراو، بەجێهێڵراو، ڤەهێلای، کەلاوە، مارزیای.

**متروکات:** میرات، کەلەپوور .

**مترهب:** 1) پەرسیار، پەرەس. 2) ترسێنەر، زات بەر.

**متریك:** مێتریك، میتری.

**متزعزع:** لەق، لەرزۆك، جوولّەکەر.

**متزلزل:** 1) خۆڕانەگر، نابەردەوام، ناجێگیر، لەق، لەرزۆك. 2) دوودڵ، دڕدۆنگ. **"متزلزل شدن"**: لەقبوون، شلبوون، لەرزۆك بوون. 2) سست بوون، لاوازبوون. 3) دوودڵ بوون، تووشی دڕدۆنگی بوون. 4) لێك بڵاوبوون.

**متزوّج:** ژندار، خێزاندار.

**متزهد:** بڕوانە: "پارسا".

**متزین:** ڕازاوە، خەملاو، جوانکراو.

**متسالم:** تایبەتمەندی ئەو شتانەی سازگار و پێك تەبان.

**متساوی:** یەکسان، وەك یەك، وەکهەڤ. **"متساوی الزوایا"**: هەڤ قۆزی، هەڤ کونجی، هاوکونج.

**متسرّب:** تەشەنە، بڵاوبوونەوە.

**متسّع:** 1) والا، پان و بەرین. 2) درێژ.

**متسلسل:** پەیتاپەیتا، لێکدالێکدا، پشت سەری یەك.

**متسلی:** سوکنایی‌داهاتو، ئۆقرەگرتو.

**متشائم:** کەسێ کە بیری خراو دەکاتەوە و فاڵی خراو دەگرێتەوە، ڕەشبین.

**متشابه:** وەك یەك، وێكچوو، لێكچوو، هاوشێوە.

**متشارك:** هاوبەش.

**متشاعر:** کەسێك کە خۆی وەك شاعیر بنوێنێ، شاعیرنوێن.

**متشاغل:** ئەوەی کە خۆی بە کارێکەوە خەریك بکا. "**متشاغل گشتن از چیزی**": ڕوو وەرگێڕان لەو، خافڵ بوون لەو.

**متشبث:** داوێنگر، دەستەوداوێن بوو. "**متشبث شدن**": دەستەوداوێن بوون، پەنابردنەبەر.

**متشتّت:** 1) پرش و بڵاو، پەرەم پەرەم. 2) پەرێشان، ئاڵۆز.

**متشخص:** بەشەخسییەت. گەورە کەسایەتی.

**متشرّع:** پێڕەوی شەرع، بڕوامەند بە ئایین و شەریعەت.

**متشکّر:** سوپاسگوزار، سوپاسکار. "**متشکر بودن از خود**": خۆ لەسەرتر دانان، خۆپەسندبوون.

**متشکّل:** 1) پێکهاتوو. 2) فۆڕم وەرگر، شتێ کە بە فۆڕمێکی تایبەتی دەرهاتبێ.

**متشکّی:** شکایەتکەر، گلەییکەر.

**متشمّر:** ساز و ئامادە.

**متشنّج :** کرك، وێك هاتووی بەلەرزە، ئاڵۆز و تێکەڵ پێکەڵ، گرژ، کۆڵنج کردوو.

**متشوق:** ئاواتەخواز، تاسەمەند، خوازیار.

**متشیّع:** پێڕەوی ئایینی شێعە.

**متصادف:** ڕووبەڕووبۆوە، کەسێ کە دەگەڵ کەسێ یان شتێکی دی ڕووبەڕوو بێتەوە، تووشهاتوو.

**متصادم:** بەریەك کەوتوو، وێك کەوتوو، تێك هەڵەنگوتوو، تێك کوتراو.

**متصاعد:** بەرەوژوورچوو، سەرکەوتوو.

**متصدّی:** وەئەستۆگر، کەسێ کە کاربەدەستی ئیشێکە، کارگێڕ، بەرعۆدە، بەرپرس.

**متصرّف:** 1) خاوەنی توانایی کاریگەری دانان و گۆڕانکاری لە شتێك دا. 2) زەوتکەر، داگیرکەر، دابڕکەر.

**متصرفه:** داگیرکراو، زەوتکراو.

**متصف:** وەسف کراو.

**متصّل:** 1) پێکەوەبەستراو، لێك جۆشدراو، لکاو، نوساو. 2) پەیتاپەیتا، پشت سەری یەك. 3) خزم. "**متصل بەهم**": 1) بێ پسانەوە، بەردەوام، پەیتاپەیتا. 2) بڕوانە: "متصل(1)". "**متصل شدن**": پێکەوەبەستران، پێکەوەلکان، لێك جۆشدران. "**متصل کردن**": لکاندن، لێك جۆشدان، چەسپاندن.

**متصلّب:** 1) ڕەق هەڵاتوو، سفت بۆوە. 2) دەمارگرژ، وشك.

**متصل نویسی:** بەسەریەکەوەنووسین.

**متصنّع:** 1) ئەوەی بە زۆر و بۆ خۆنوێنی لە قسەکانی دا زۆر لە سەنعەتە ئەدەبییەکان کەڵك وەردەگرێ. 2) دەسکرد.





**متصوّر:** (مُ.تَ.صَ.وَ) وێناکەر، کەسێ کە وێنەی کەسێك یان شتێك بە خەیاڵ دێنێتە پێش چاو. "**متصور شدن**": ئاگاداربوون.

**متصوّر:** (مُ.تَ.صَ.وِ) وێناکراو، گومان براو، وادانراو، وازانراو. "**متصورشدن**": بە زەین داهاتن، وێنابوون.

**متصوف:** 1) ئەوەی خۆی بە سۆفی دەزانێ یان خۆی وەك سۆفی دەناسێنێ. 2) سۆفی.

**متضاد:** لێکدژ، دژبەیەك، دژی یەکتر، دژی هەڤ.

**متضاعف:** دووقات، دووبەرابەر.

**متضرر:** زیان لێکەوتوو، زیان پێگەیشتوو، تووشی خەسارەت بوو.

**متضرّع:** کەسێك کە دەکڕووزێتەوە و دەلالێتەوە.

**متضعف:** بێهێز، لاواز.

**متضمن:** لەخۆگر، هەڵگر، هلگر، بریتی.

**متطابق:** یەکسان، بەرابەر، وەکهەڤ.

**متطرّف:** 1) پەڕگر. 2) تیژڕەو.

**متطلع:** نیگەران و چاوەڕوان.

**متظاهر:** خۆنوێن، وادەرخەر، وانوێن، ڕواڵەتباز، ڕواڵەت نوێن.

**متظاهره:** پەیتاپەیتا، پشت سەرییەك.

**متظلم:** زوڵم لێکراو، دادخواز، شکایەتکەر.

**متعادل:** هاوتەراز، هاوسەنگ، هاوکێش، یەکسان، ناوەنجی، بەینابەینی، نەزیادنەکەم.

**متعارض:** لێکدژ، جیاواز و ناکۆك.

**متعارف:** 1) کاتی ناسین و ئاشنایەتی دەگەڵ یەکتر. 2) باو، گونجاو دەگەڵ دابونەریتی کۆمەڵگایەك. "**غیرمتعارف**": ناباو.

**متعارفی:** باو، ئاسایی.

**متعاضد:** یارمەتیدەر.

**متعاقب:** پاش، دوا، دواتر، دوابەدوا، پشت سەرییەك.

**متعاقباً:** بەزوویی، دوای ئەمە.

**متعال:** زۆر بڵیند، بەرز، یەکێك لە سفەتەکانی خوا.

**متعالی:** باڵاڕۆیی، باڵایی، پایەبەرز، بەرز و بڵیند.

**متعامل:** لایەنێك لە دوو لایەنی مامەڵە، کڕیار یان فرۆشیار.

**متعاون:** هاوکار و یارمەتیدەری یەکتر.

**متعاهد:** لایەنێك لە دوو لایەنی پەیماننامە یان گرێبەست.

**متعبّد:** پەرسیار، پەرست.

**متعجّب:** سەرسووڕماو، سەرسام، واق وڕماو، حەیری‌مایی.

**متعدّد:** فرە، زۆر، زاف.

**متعدّی:** 1) دەست درێژەکەر، سنووربەزێن، پەلاماردەر، هەڵەمارکەر، زاڵم، ناهەق. 2) (لە ڕێزمان دا) تێپەڕ.

**متعذّر:** 1) بیانووهێنەوە، کەسێ کە عوزر و بیانوو بێنێتەوە. 2) دژوار، سەخت. 3) محالّ و ئەستەم. "**متعذر بە امری بودن**": کردنە بیانوو. "**متعذر شدن**": 1) بیانووهێنانەوە. 2) دژواربوون(ەوە).

**متعرّب:** کەسێك کە خولْق و خووی عەرەبی گرتبێ و خۆی وەك عەرەب لێکردبێ.

**متعرِّض:** 1) جلەوگیر، بەرهەڵست. 2) وەبیرخەرەوە. 3) مایەی ئازار و ژانەسەر. 4) دەستدرێژیکار، پەلاماردەر. 5) خوازیار، داواکار. "**متعرض چیزی شدن**": 1) وبیرخستنەوەی ئەو شتە. 2) خوازیاری ئەو شتە بوون. "**متعرض شدن**": وەبیرخستنەوە، وەبیرهێنانەوە. 2) خستنەبەر رەخنە و پرۆتێستۆ کردن. 3) دەست هەڵنەگرتن، تەنگ پێهەڵچنین، ژانەسەر و زەحمەت سازکردن، دەست درێژی کردنە سەر. "**متعرض کسی شدن**": ئازار و جەزرەبەدانی ئەو.

**متعرّف:** پەیدۆز و خوازیاری شتێ بە مەبەستی ناسینی.

**متعزّز:** خۆشەویست و رێزدار.

**متعسّر:** دژوار، سەخت، گران.

**متعسّف:** لادەر، کەسێ کە بە لارێ دا بڕوا، گومڕا.

**متعصّب:** دەمارگرژ، دەمارگیر، دوگماتیك، سەرحشك، وشك.

**متعظ:** بڕوانە: "پندپذیر".

**متعفّن:** بۆگەن، بۆگەنتك، بۆگەنیو، گنخاو.

**متعقّل:** ژیر، بەئاوز، مەژودار.

**متعلّق:** 1) بڕوانە: "متصل (1)". 2) کەسی نزیك یان سەربە کەسێك. 3) هەڵواسراو، هلاویستی، دالەقاو، شۆڕەوەبوو، پێوەبەستراو. "**متعلق بە...**": سەر بە، دەپێوەندی.

**متعلقان:** خزمان، نزیکان.

**متعلّق شناسایی:** بەرناس، ئۆبژە.

**متعلقە:** مێینەی"متعلّق"، ژن.

**متعلّم:** قوتابی، زانست خواز.

**متعمّد:** ئەوەی بە ئانقەست کارێك ئەنجام بدا، بەهەوەس.

**متعمّق:** تێبین، دوورنوار، قوولْ ڕوان، دوورمێژە، ئەوەی کە بە قووڵی دەڕوانێتە کارێ.

**متعمّل:** تەقالاکار لە کار دا، سەختیکێش.

**متعنّت:** ئیرادگر و تانەلێدەر.

**متعهّد:** بەرعۆدە، دەستەبەر، دەروەست، دەربەست، ڤەخۆگرتی، قەبال، قەسەم خۆر، قەسەم هار، سوێندخۆر، بەڵێندەر، پەیماندەر. "**متعهّد شدن**": وەئەستۆگرتن، دەستەبەربوون، بەرعۆدەبوون، گرتنەمل، لخۆگرتن، بڕیاردان.

**متعهّدلە:** کەسێك کە پەیمان و بەڵێن بە قازانجی ئەو بەستراوە.

**متعیّن:** دیار و ئاشکرا. دیاریکراو، دیاریکری، دەست نیشانکراو، دانراو. "**متعیّن شدن**": ئاشکرابوون، زانران.





**متعینات:** بوونەوەرانێ کە بوونی چاوەکی و هەست پێکراویان هەیە.

**متغابن:** زیانمەند.

**متغایر:** دژییەك، ناکۆك، ناجۆر، جیاواز.

**متغیّر:** 1) بگۆڕ، لە گۆڕان، تووشی گۆڕان و ناجێگیری. 2) تووڕە، قەڵس. 3) توشی نیگەرانی و ناڕەحتی بوو. "**متغیر شدن**": گۆڕان، گۆڕیان، بارەوبارەبوون، لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی ترچوون.

**متفاخر:** شانازیکەر.

**متفاعل:** کارلێککردو.

**متفاوت:** جیاواز، جیا، جیاکار، بەجیا، ناهاوچەشن.

**متفتّت:** هەڵوەریو، وردبوو.

**متفجّع:** لێقەوماو، بەڵاڵێدراو، بەلالێدایی، تووشی کارەسات هاتوو.

**متفحّص:** پشکێنەر، لێکۆڵەر، توێژەر، پەیجۆر، پەیدۆز.

**متفرّد:** 1) تاق و تەنیا. 2) تاقانە، شاز و بەرچاو. "**متفرد شدن بە چیزی**": لە ئیختیارگرتنی ئەو بەتەنیایی.

**متفرّع:** پەرتەوازە، لك لك بوو، لق هاویشتو، جیابۆوە.

**متفرعن:** لووت بەرز و بە فێز ، لووت زل، بەرزەلووت، بەرزەدەماخ، بە فێز و لە خۆگۆراو، خۆبین، خۆخواز.

**متفرّق:** دانگو، جیاجیا، بلاو، پەرتەوازە و دوور لە یەك. "**متفرّق شدن**": بلاوبوون، بلاوەلێکردن.

**متفرّقە:** بلاو، جیاجیا، جیابەجیا، جۆربەجۆری.

**متفطّن:** زیرەك و بەمشوور.

**متّفق:** 1) هاوڕا، یەك دلْ و یەکگرتوو. 2) پێکهاتوو، ڕێککەوتوو. 3) هەوڵدەر، پێداگر. 4) پێکەوە، هەموو. "**متّفق الرأی**": هاوبیروباوەڕ، هاودەنگ. "**متّفق القول**": هاوپەیمان، هاوبەڵێن، هاوڕا. "**متّفق الكلام**": هاوئاخاوتە، یەك قسە. "**متفق علیە**": جێ‌پەسندی هەموان.

**متفقاً:** پێکەوە، بەیەکەوە.

**متفقه:** 1) فەقێ. 2) زانا، فرەزان.

**متفکّر:** بیرەوەر، بیریار، بیرمەند، بیرکەرەوە، ویردار، بیرا، بەبیر و هۆش، خودان هزر، خاوەن فکر و بەزەین.

**متفکره:** هێزی تێفکرین.

**متفنّن:** ئەوەی خاوەن زانست و پیشەی جۆراوجۆر بێ، هونەرمەند.

**متقابل:** 1) بەرامبەر، بەرانبەر، ڕووبەڕوو. 2) دوولایەنە.

**متقابلاً:** لەبەرامبەردا.

**متقادم:** ڕابردوو، پێشوو، پێشوونە، بەرێ، دێرین.

**متقارب:** لێك نزیك، لەتەنیشت یەك.

**متقارن:** 1) هاوخشت، لێك نزیك. 2) هاوکات، هەڤدەم.

**متقاصر:** کورت. "**متقاصر شدن (آمدن)**": کورت بوونەوە.

**متقاضی:** خوازیار، خوازەر، داخوازکەر، داواکار.

**متقاطع:** یەکتربڕ، هەڤبڕ.

**متقاعد:** 1) ڕازی، قایل، قانع. 2) خانەنشین، ماڵنیش، گردەنشین، خانگار، کارکەنار، هەڵپەسێراو، تەقاویت. "**متقاعد شدن**": 1) قبوولکردن، ڕازیبوون، باوەڕهێنان. 2) خانەنشینبوون، کارکەناربوون. "**متقاعد کردن**": باوەڕپێهێنان، ڕازیکردن.

**متقبّل:** قبوولکەر، وەرگر، وەخۆگر، بەرعۆدە. "**متقبّل شدن**": وەئەستۆگرتن، بەرعۆدەبوون.

**متقدّم:** 1) ئەوەی لە ڕابردوودا ژیاوە. 2) ڕابردوو، پێشوو. 3) پێشڕەو.

**متقسم:** پڕش، بڵاو.

**متقطّع:** 1) ناوبەناو، جاربەجار. 2) پچڕپچڕ، بچڕبچڕ.

**متقلّب:** 1) فێڵباز، خاسووك، دەغەڵ، عۆین باز، کای کەردۆخ. 2) گۆڕاو، تێکچوو.

**متقن:** پتەو، قایم، قاحیم، ڕاوەستاو.

**متّقی:** بڕوانە: "پرهیزکار".

**متکاثر:** زۆر، بێ ژمار.

**متکاثف:** قەبەبوو، تۆپەڵ بوو.

**متکافی:** چوونیەك، یەکسان، هاوچەشن.

**متکامل:** کامڵ و تەواو.

**متکبّر:** خۆگر، فیزن، بەفیز، بەفیزودەعیە، بەفێزو لەخۆگۆراو، لووت بەرز و بەفێز، لووت زل، بەرزەلووت، بەرزەدەماخ، دەمارزل، بەدەمار، ڕۆح زل، بەدەحیە، بەدەعیە، بادی هەوا، بایی، لەخۆبایی، لەخۆڕازی، خۆهەڵکێش، کلاچ، خۆبەزلزان، ڕۆح زل، قاپان، قورە، قۆڕەدەماخ، قۆڕەدەماغ، قودە، پۆزبلند، ژخوەڕازی، کەشخەیی، هوشگ، هۆڤەبەر، گەبەزە، گەوەزە، ڕایمەزن، زڕتك، مەنەری.

**متکثر:** چەندلایەنە، زۆرینە، فرەچەشن.

**متکدّی:** سواڵکەر، دەرۆزەکەر، خازۆك.

**متکرّر:** 1) دووپاتەکراو، دووبارەوەبوو. 2) دوودڵە، دووشکە.

**متکسّر:** شکاو، شکەستی.

**متکفّل:** قبوولکەر، وەرگر، بەرعۆدە، وەئەستۆگر.

**متکلّف:** 1) کەسێك کە کارێ وەئەستۆ بگرێ و خۆی بخاتە سەختی و دژوارییەوە. 2) ڕازاوە، خەملێو.

**متکلّم:** 1) قسەکەر، بێژەر. 2) وتاربێژ، ئاخێوەر. "**متکلّم وحده**": یەکەم کەسی تاك. "**متکلَم مع الغیر**": یەکەم کەسی کۆ.

**متّکی:** پشت ئەستوور، پاڵپێوەدەر. "**متکی به خود(متکی به نفس)**": پشت ئەستوور بە خۆ.

**متلاشی:** لێك هەڵوەشاو، لەبەریەك هەڵوەشاو، لێك بڵاو، لەبەریەك چوو، لەبەریەك هەڵتەکاو، هلوەشیایی. "**متلاشی شدن**": هەڵوەشان، هلوەشیان، لێك هەڵوەشان، لەبەریەك هەڵوەشان، لێك





بڵاوبوون، لەبەریەکچوون، لەبەریەك هەڵتەکان، هەڵتەکین، هەڵتەکیان. "**متلاشی کردن**": تێك و پێك دان، (لەبەریەك)هەڵتەکاندن، هەڵتەکانن، هەڵوەشاندن، هلۆشاندن، لێك هەڵوەشاندن، لەبەریەك بردن.

**متلاصق:** پێکەوەچەسپاو/لکاو.

**متلاطم:** پڕشەپۆل، شەپۆلاوی، بەپێل، پێلدار. "**متلاطم شدن**": وەجۆش و خرۆش کەوتن، وەکەفوکوڵ کەوتن، هەڵچوون.

**متلاقی:** بەیەك گەیشتوو، پێك گەیشتوو، دووشت کە لە شوێنێکدا پێك بگەن.

**متلالی:** ڕووناك و بەدرەوشین، شەوقدار، چریسکێنەر.

**متلبّس:** جلوبەرگ پۆشیو، بەرگ پۆشی.

**متلذذ:** چێژبەر.

**متلف:** بەفیڕۆدەر، زایەکەر، نابوودکەر.

**متلك:** تڤنك، زیپك، قسەی بە تێکوڵ، لابڕدنگ، لاتاو، لاپلار، وەلاق، ساچمە، شاتاول، قسەی بە تێکوڵ، تانەی دە پەردەدا. "**متلك گفتن**": زیپك (پێدادان/ تێگرتن)، پلارتێگرتن، قسەی بە تێکوڵ وتن بە کەسێك، قسەی گاڵتە پێ کردن.

**متلوّن:** بۆقلەسفەت، ڕەنگ گۆڕ، هەردەبیر، هەردەمی، کەسێ کە هەر کاتژمێرەی بە ڕەنگێ دەربێ و بیروبۆچوونی بگۆڕێ. جۆراوجۆر. "**متلوّن المزاج**": لێزۆکی، پیاوی وازوازی و هەردەمە لەسەر هزرێك.

**متلهّب:** هەڵایساو و کڵپەسەندوو.

**متماثل:** وەك یەك، چوونیەك، وەکهەڤ، لێکچوو.

**متمادی:** دایمی، هەمیشەیی، هەرتمی، دوور و درێژ، درێژخایەن.

**متمارض:** کەسێ کە خۆی لە نەخۆشی بدا، خۆنەخۆش خستن.

**متماسك:** 1) گیرساوە. 2) بڕوانە: "خویشتن دار".

**متمایز:** لێك جیا، جیاواز، لێك نەچوو، نەوەکهەڤ.

**متمایل:** لارەوەبوو، چەماوە. مەیلکەر، گرۆییکەر. "**متمایل به**": مەیلەو، ئامال. "**متمایل کردن**": بەلاداخوارکردنەوە، چەماندنەوە، ماڵ کردن.

**متمتّع:** بەهرەمەند، بەبەهرە، خاوەن بەهرە، بەهرەدار.

**متمثّل:** 1) بەزەین داهاتوو، وێنابوو. 2) نموونە هێنەوە. 3) وەك، وەکوو. "**متمثل شدن**": 1) وێنابوون. 2) نموونە هێنانەوە.

**متمدّن:** شارنشین، شاری، خاوەن شارستانێتی، خاوەن ژیوەر، پێشکەوتو.

**متمرّد:** سەربزێو، سەرپێچ، سەرکێش، شیوارە، یاخی، یاغی، ئەشقی، شەقی، کەنهەش، عاسێ.

**متمرکز:** کۆجێ، خڕبۆوە لە جێیەکدا، چڕبۆوە، چەقگیر، هاوچەق. "**متمرکزشدن**":

کۆجیّ بوون، جێگیربوون، چڕبوونەوە. "**متمرکزکردن**": چڕکردنەوە، جێگیرکردن، سانترالیزەکردن.

**متمزّق**: شڕوپەتۆر، پارچەپارچە، ڕێزەڕێزە.

**متمسّك**: دەستەوداوێن، چنگ لێدەر، کەسێك کە بۆ شتێك چنگ باویّ. "**متمسك شدن**": دەستەوداوێن بوون، پەنابردنەبەر.

**متمکّن**: 1) دارا، دەوڵەمەند. 2) بەتوانا، بەهێز. 3) جێگیر، سەقامگیر.

**متملّق**: دەڵەچە، ڕووبین، ریاباز، ڕووپاما، مەراییکەر، ڕووپاما، لالکەر، هولیسك، زمان لووس، کلکەسووتەکەر، شالووز، کیسەکێش، هەفت ڕوو.

**متملّك**: ماڵ، ئەوەی زەوت و داگیر بکریّ.

**متملکات**: ماڵ و زەوییەك کە کەسێك زەوتی کردبیّ.

**متمّم**: 1) تەواوکەر، کامڵکەر. 2) هاوپێچ کراو، پەیوەست کراو.

**متمنّی**: ئاواتخواز، ئارەزووکەر، خوازیار.

**متموّج**: 1) شەپۆلاوی، شەپۆلدەر، بەپێل. 2) ئاڵۆز، پەشێو.

**متموّل**: مالاقا، دارا، دەوڵەمەند، مرۆی زەنگین و ماڵ خۆش.

**متمیّز**: 1) جیا، جیالەیەك. 2) هەڵبژێراو، سەرتڵ.

**متن**: 1) دەق، نووسراوە. 2) بەشی ئەسڵی ڕوو یان لاپەڕەیەك کە بەهۆی پەراوێزەوە دەورەی گیراوە. 3) ناوەوە و ناوەڕاستی شتیّ(متن طبیعت). "**متن ارجاعی**": دەقی گەڕانەوەیی. "**متن اصلی**": دەقاودەق، دەقی بابەت. "**متن خواندنی**": دەقی خوێنەرانە. "**متن نوشتنی**": دەقی نووسەرانە. "**متنی**": دەقێتی.

**متناسب**: 1) شیاو بۆ یەکتر، هاوڕێز، هاوڕێزە، هاوڕێژە، هاوتا، هاوڕێك، پێك بڕان، بەیەك ئەندازە هاتنەوە، گونجاو. 2) جوان و لەبار، ڕێك و قۆڵا (اندام متناسب).

**متناظر**: وێکچوو، وەکوو، هاوتا.

**متناقض**: لێکدژ، دژەیەك، دژی هەڤ، پێك ناکۆك، نەسازاو، ناسازگار.

**متناوب**: یەکنایەك، یەك لە دوای یەك، بەنۆرە، دەورەیی.

**متناول**: خۆر، خۆرە، ئەوەی دەخوا. وەرگری شتێك.

**متناوم**: خۆلەخەوکەر، کەسیّ کە خۆی بە خەوتوو نیشان بدا.

**متناهی**: کۆتایی هاتوو، بەکۆتایی گەیشتوو.

**متنبّه**: لەخەوهەستاو، ڕابوو، ئاگا، وشیار. "**متنبّه‌شدن**": چاوشکان، پەند وەرگرتن و تەمبیّ بوون.

**متنبّی**: کەسیّ کە داوای پێغەمبەری بکا.

**متندّم**: پەشیمان.





**متنزّه**: شوێنی پاك بوونەوە، شوێنی گەشت و سەیران، سەیرانگە.

**متنسّك**: پەرسیار، بەئایین، خۆپارێز.

**متنعّم**: خواپێداو، پۆشتەوپەرداخ، حاڵ خۆش. بەهرەمەند.

**متنفّذ**: بەدەسەڵات، دەسەڵاتدار، باڵادەس، دەست ڕۆیشتوو، خاوەن هێز، بەحوکم.

**متنفّر**: بێزار، وەڕەز، جاڕز. "**متنفّربودن**": بێز نەهاتن، دڵ لیّ شێوان، خۆش نەویستن.

**متنفّس**: گیاندار، زیندوو، هەناسەدەر.

**متنکّر**: کەس نەناس، نەناسراو، کەسیّ کە خۆی جۆریّ لێکردبیّ کە نەناسریّ.

**متنوّع**: جۆراوجۆر، هەمەجۆرە، جور ب جور، ڕەنگاڵە، ڕەنگاوڕەنگ، فرەچەشن، تێکەڵە.

**متواتر**: پەیتاپەیتا، پەستاپەستا، بیّپسانەوە، لێکدالێکدا، لەسەریەك، یەك لە دوای یەك.

**متوارد**: بەردەوام و بیّپسانەوە. بیرۆکە یان واتایەك کە لە یەك کات دا بگات بە مێشکی دوو کەس.

**متواری**: 1) ڕاکردو، هەڵاتوو، هەڵۆەدا، تەرە لە وڵات و مەڵبەند، ئاوارەی دەشت و کێو، تەقیو. 2) سەرگەردان، ئاوارە. 3) حەشاردراو، شێردراوە، شێراوە. "**متواری داشتن**": داشاردن، حەشاردان، وەشارتن. "**متواری شدن**": 1) قەلفڕکردن، ڕاکردن، ئاوارەبوون، تەرەبوون، زرووقان، بازرەبوون، ڤاریبوون. 2) گوم بوون لە بەرچاو، دیار نەبوون، خۆحەشاردان.

**متوازن**: هاوکێش، هاوسەنگ، بارتەقا، هاوتا. "**غیرمتوازن**": لاسەنگ، تاسەنگ، ناهاوسەنگ.

**متوازی**: (هاو)تەریب، هاوڕێك. بەرابەر. "**متوازی الاضلاع**": لاتەریب، پەل تەریب.

**متواضع**: بیّدەمار، خۆبەزل نەزان، خۆبەکەم زان، خۆشکێن، خاکەڕا، خاکی.

**متوافر**: زۆروزەبەند، زۆروزەوند، بیّ ژومار.

**متوافق**: دەگەڵ یەك سازاو و هاوڕا.

**متوالی**: بەرودوا، یەك لە دوای یەك، پشت سەری یەك، پەیتاپەیتا، بیّپسانەوە، لەسەریەك، ئازگار، پەسا، پەستاپەستا.

**متوانی**: سست و ماندوو.

**متوجّه**: سەرنجدەر، ڕووتێکەر، لالێکەرەوە، سەراپیّ، لەسەرهۆش، ئاگالێبوون. "**متوجّه‌شدن**": 1) تێگەیشتن، حاڵیبوون. 2) پێزانین. "**متوجّه‌کردن**": ئاراستە کردن، تێگەیاندن، ورياکردنەوە، وشیارکردنەوە. "**متوجّه متن**": ڕووەو دەق، دەق مەڵبەند.

**متوحّد**: 1) تەنیا، تاقانە، یەکە. 2) گۆشەنشین.

**متوحّش**: 1) ترساو، ترسیاو. 2) شوێنی خاپوور و چۆڵکراو، کەلاوە. "**متوحش شدن**": ترسان، خۆف کردن.

**متورّع:** بڕوانە: "پارس".

**متورّم:** بڕوانە: "آماسیدە". "**متورم شدن**": بڕوانە: "آماسیدن".

**متوسّط:** 1) ناڤنج، مام ناونجی، نێونجی، ناونجی، ناوەڕاست، نیڤی، دەستە. 2) نە باش نە چاك، نە بەرز و نە نەوی.

**متوسّع:** بەربڵاو، پانوبەرین، بەرفرەه.

**متوسّل:** دەستەوداوێن، داوێنگیر. "**متوسّل شدن**": پەنابردنە بەر، دەستەوداوێن بوون.

**متوشّح:** ڕازاوە، خەملّیو.

**متوطّن:** نیشتەجێ.

**متوفّر:** 1) زۆروزەوەندە. 2) ئەوەی کە تەواوی وەخت و هەوڵی خۆی لە کار یان بابەتێك دا خەرج بکا.

**متوفّی:** کۆچکردوو، مردوو، نەماو، نەمایی.

**متوقّع:** چاوەڕوان، بەتەما، هیوادار، ب هیڤی.

**متوقّف:** 1) ڕاگیراو، وەستاو، ڕاوەستاو، وێستاو، وێساگ. 2) داماو. "**متوقّف شدن**": ڕاگیران، پێش گیران، بەرگیران، وەستان، وێستان. بەستران، داخران. "**متوقّف کردن**": ڕاگرتن، ڕاگیرکردن، وەستاندن، وێساندن، وێسانن، وێستاندن، ڕاوەستاندن، ڤەستاندن، ڤەڤەستاندن، بەربەست کردن، قەفالتن، بەستن، وناڕای.

**متوکّل:** پشت ئەستوور، پشت قایم، پاڵپشت، کەسێ کە بە خوا پشت ببەستێ.

**متولّد:** لە دایك بوو، بەدنیاهاتوو، زاو. وەدیهاتو. "**متولّدشدن**": زاین، زایین، زان، لە دایك بوون، بەدنیاهاتن، چاو بە دنیا هەڵێنان/پشکوتن. وەدیهاتن.

**متولّی:** بەرعۆدە و سەرپەرشتی شتێ، کەسێ کە کارێکی پێسپێردراوە.

**متون:** کۆی "متن".

**متوهّم:** 1) تووشی وەهم و خۆش باوەڕی. 2) خەیاڵاتی.

**متّە:** سمەك، سمۆ، مەتکەو، کونکەر، شخاڤ، شخاب، شغاب، درەوشە.

**متهاجم:** بڕوانە: "حملەور".

**متهاون:** سست، کەمتەرخەم، پشت گوێخەر.

**متهتّك:** پیاوێ کە ترسی لە ئابڕووچوون و ناوزڕان نەبێ.

**متهجّد:** شەونخوون، شەوبێدار.

**متّهم:** تۆمەتبار، گومانبار، بەرگومان، جێگەی گومان. "**متّهم کردن**": تۆمەت پاڵدان/نانەپاڵ، تاوانبارکردن.

**متهوّر:** بالۆلی، گوێ نەدەر و شەڕکەر، بوێر، زاتدار، بەزات، ئازا، نەترس، دلێر.

**متیقّن:** دڵنیا، بێ شك و گومان.

**متیمّن:** متفەڕك، بەبەرەکەت.

**متین:** 1) پتەو، قایم، جێگیر، نەگۆڕ. 2) قورس و قۆڵ، لەسەرخۆ.

**متینگ/میتینگ:** مێتینگ، کۆبوونەوەی گرووپێ لە خەڵکی بۆ دەربڕینی داخوازی و





بۆچوونەکانیان سەبارەت بە مەسەلەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی، جڤین.

**مثاب:** پاداشت گرتوو، پاداشت پێدراو.

**مثابە:** 1) ئەندازە. 2) جێگە، شوێنگە. 3) شکڵ. "**بمثابە**": وەك، وەکو، لەباتی.

**مثال:** 1) نموونە. 2) وێنە، شکڵ. 3) ئەندازە، ڕادە، بڕ. 4) پەیکەر، کۆتەڵ. 5) فەرمان، حوکم. "**مثال دادن**": فەرمان دان، ئیزن دان. "**مثال گرفتن**": دەستوور وەرگرتن. "**برمثالِ(بەمثال)**": وەکوو.

**مثالی:** نموونەیی، نموونەگەری، سەرچەشنانە.

**مثانە:** میزدان، میزدانك، میزڵدان، میزەڵدان، گمێزدان، مسوڵدان، موسڵدان، میسمیسك، ڕوودێن.

**مثبّت:** 1) شیاوی سەلماندن(علوم مثبت). 2) ئەرێنی، پۆزەتیڤ، باش، چاك. 3) تۆمارکراو، نووسراو. "**مثبت گرداندن**": تۆمارکردن.

**مثل:** (مَ.ثَ) 1) نموونە. 2) دۆخ، بارودۆخ. 3) چیرۆك. 4) بۆ نموونە، وەك نموونە.

**مثل:** (مِ) بڕوانە: "مانند".

**مثلاً:** (مَ.ثَ) بۆ نموونە، وەکوو ئەوە، بۆمیناك.

**مثلّث:** سێ چوکلە، سێ سووچ، سێ گۆشە، سێکۆچە، سێکۆچك. "**مثلث مختلف الاضلاع**": سێ گۆشەی لاجیاواز/ جیالا. "**مثلث متساوی الساقین**": سێ گۆشەی دوو لا یەکسان. "**مثلث قائم الزاویە**": سێ گۆشەی گۆشەوەستاو. "**مثلث منفرج الزاویە**": سێ گۆشەی گۆشەکراوە.

**مثلە:** 1) بڕینی گوێ و لووت یان لێوی کەسێك بۆ سزادان. 2) بڕانی لووت و گوێ. "**مثلە شدن**": 1) بڕانی لووت و گوێ. 2) خراو و ناتەواو بوونی نووسراوە یان بەرهەمێکی هونەری یان شتی دیکە بەهۆی دەسکاری و کەمکردنەوەی بەشگەلێ لەو.

**مثمر:** 1) بەردار، بەبەهرە، بەکەڵك، بەقازانج، ب مفاح. 2) وەدیهێن.

**مثمّن:** 1) هەشت سووچ، هەشت چوکلە. 2) بەنرخ، قیمەتی.

**مثنوی:** دووخشتەکی، تاکە شێعرێك کە دوو لەتەکەی هاوسەروا بن.

**مثنّی:** دوو، دووبەرابەر. دووبارە.

**مثول:** لە خزمەت دا ڕاوەستان.

**مثوی:** ماڵ، بنکە.

**مجاب:** قانع بوو، کەسێك کە وڵامەکەی وەرگرتۆتەوە، بەرسڤ دایی. "**مجاب کردن**": قبووڵاندن، ناچارکردن، وڵامدانەوە، بەرسڤ دان.

**مجادلە**:شەڕەقسە، قڕوچیڕەك، دەمەقاڵە، گێرە و کێشەکردن، کێشە و دم بە دمەکردن، مشتومڕکردن، کێشمەکێش کردن، باس و گفتوگۆکردن.

**مجاذبە:** یەکترکێشان، دەگەڵ یەك شەڕ و کێشە کردن.

**مجارات:** 1) خۆ دەگەڵ کەسێکی تر بەرابەردانان. 2) باس و گفتوگۆکردن.

**مجاز:** (مُ) ئیزن پێدراو، ڕێپێدراو، ڕێدراو، ڕێدایی، ڕەوا. "**مجازبودن**": ڕەوابوون. "**مجازشدن**": ڕێپێدران، ئیزن پێدران.

**مجاز:** (مَ) 1) مەجاز، بەکارهێنانی واژە لە مانایەك بێجگە لە مانای ڕاستەقینەی خۆی. 2) ناڕاست، ناڕاستەقینە. "**برمجاز**": ناڕاستەقینە.

**مجازات:** 1) سزای کاری خراو. 2) سزادانی کەسێك کە کردەوەی پێچەوانەی یاسای ئەنجام دابێ. 3) پاداشتی کاری باش. "**مجازات شدن**": سزادران. "**مجازات کردن(دادن)**": سزا دان، تەمبێکردن."**به مجازات رساندن**": سزادان.

**مجازی:** 1) (ئەدەبی) مەجازی. 2) ناڕاستەقینە.

**مجال:** 1) دەرفەت، دەرەتان، مۆڵەت، دەلیڤە، ماوە، هەل، بوار. 2) شوێن، جێگە. "**مجال دادن**": بگارەدان، ڕێگە پێدان، هەل بۆ ڕەخساندن، دەرفەت/ مۆڵەت/ دەرەتان پێدان. "**مجال شدن**": هەل ڕەخسان، وەدەستهاتنی وەخت یان هەل. "**مجال یافتن**": دەرفەت پەیداکردن، پێکران، دەست پەرژان، دەس پەرژیان.

**مجالس:** (مَ.لِ) 1) کۆی "مجلس". 2) وتەکان، قسەکان.

**مجالس:** (مُ.لِ) هاونشین.

**مجامع:** کۆی"مجمع".

**مجامعت:** (مُ) نهاندن، ئیلاقەکردن، هاونوێن بوون دەگەڵ ژن، هەڤنڤین.

**مجامله:** 1) ڕووخۆشی، خۆشڕەفتاری. 2) زمان لووسی.

**مجاناً:** بەلاش، مفتێ، بەخۆڕایی.

**مجانبت:** دووریکردن، پشت تێکردن، ڕووڵێ وەرگێڕان.

**مجانس:** هاوچەشن، هاوجۆر، چوونیەك، لەیەکچوو.

**مجانست:** هاوچەشنی، چوونیەکی.

**مجانی:** خۆڕایی، بەلاش، مفتێ، ونا.

**مجانین:** کۆی"مجنون"، دێوانەکان.

**مجاور:** 1) هاوسێ، دراوسێ، جیران، جینار. 2) تەنیشت، پاڵ. 3) هاونشین. 4) نیشتەجێ.

**مجاورت:** هاوسێیەتی، دراوسێیەتی، جیرانەتی، جینارەتی.

**مجاهد:** 1) هەوڵدەر، تەقالاکەر. 2) خەباتکار، تێکۆشەر.

**مجاهدت:** 1) هەوڵ و تێکۆشان. 2) شەڕ و خەزا کردن لەڕێگەی ئایینی ئیسلامدا.

**مجاهرت:** بەڕاشکاوی دوژمنایەتیکردن. "**مجاهرت کردن به چیزی**": ئاشکراکردنی ئەو.

**مجاهره:** 1) بڕوانە: "مجاهرت". 2) ئاشکرابوون.

**مجبور:** ناچار، زۆرلێکراو، بێدەسەڵات. "**مجبور کردن**": ناچارکردن، مل بادان.

**مجتبی:** هەڵبژاردە.





**مجتمع :** 1) کۆمەڵ، کۆمەڵگە، جڤاك، شەماتە، خەڵك و ئاوایی. 2) کۆڕ، ئەنجومەن.

**مجتنب:** دووریکەر، خۆبوێر، خۆپارێز.

**مجتهد:** هەولدەر، کۆشیار، کۆشەر.

**مجد:** (مَ) گەورەیی، جوامێری.

**مجدّ:** (مُ.جِ) تێکۆشەر، هەولدەر.

**مجدد:** 1) نوێ، تازە. 2) دووبارە.

**مجدداً:** سەرلەنوێ، دیسانەوە.

**مجدّر:** بڕوانە: "آبلەدار".

**مجدود:** بەختیار، خۆشبەخت.

**مجدور:** 1) شیاو، شایان. 2) بڕوانە: "آبلەدار".

**مجذوب:** 1) ڕاکێشراو، ڕاکێش بوو، کێشراو. 2) شەیدا، شێت و شەیدا. "**مجذوب شدن**": زۆر هۆگربوون بە کەسێ یان شتێ، شەیدابوون. "**مجذوب کردن**": زۆر هۆگرکردن بەخۆ، ڕاکێش کردن، بەرەوخۆهێنان.

**مجرا:** (مَ) 1) ڕەهەند، گونجە، ئاوەڕۆ، شاڕەهەن. 2) گوزەر، شوێنی تێپەڕین.

**مجرا:** (مُ) بەڕێوەچوو، جێبەجێبوو.

**مجرّب:** بەئەزموون، ساردوگەرمی ڕۆژگار چەشتو، کارامە، ب کار هاتی، شارەزا.

**مجرّد:** 1) ڕەبەن، سەڵت، بێژن، زگورد، بێ ماڵ و حاڵ، سۆبا، سوبات، سپات، سپاتە، عازەب، قازاخ، هورم، هەوان. 2) تەنیا. 3) ڕووت، پەتی. 4) ئەبستراکت، هەرشتێکی لە زەین دایە بەڵام بوونی دەرەکی نیە. 5) بەتاڵ، خاڵی. 6) نەبوونی لایەنی جەستەیی، غەیرەماددی.

**مجردات:** شتە بەتەواوی غەیرەماددییەکان وەك گیان و ئەقڵ.

**مجرگ/مچرگ:** بێگاری، سۆخرە.

**مجرم:** تاوانبار. گوناهکار. خەتاکار.

**مجروح:** 1) بڕوانە: "زخمی". 2) زۆر ڕەنجاو یان ئازاردیتو.

**مجرور:** 1) کێشراو. 2) ژێر بۆ پیت.

**مجره:** بڕوانە: "کهکشان".

**مجری:** (مُ) بەڕێوەبەر، پێشکەشکار، نوانەر.

**مجریه :** بەڕێوەبەری.

**مجزا :** پاژپاژ، بەش بەش، کەرت کەرت، لێك جیا. "**مجزاشدن**": بەشبوون، پاژبوون، پارچەپارچەبوون.

**مجزوم:** یەکجارەکی، حەتمی.

**مجسّم:** بەرجەستە، وێناکراو، هێنانەبەرچاو، هەرشتێ کە پانایی و درێژایی و بەرزایی هەبێ.

**مجسّمه :** بڕوانە: "تندیس". "**مجسمەشدن**": نەبزووتن، نەجووڵان.

**مجعول:** گوماناوی، بڕواپێنەکراو، دروست کراو، دەسکرد.

**مجلّد:** بەرگ تێگیراو، بەرگ تێکێشراو. "**مجلّد کردن**": بەرگ تێگرتن، بەرگ تێهەڵکێشان.

**مجلس:** 1) شوێنی دانیشتن، کۆڕگە، جێگەی کۆبوونەوە، مەکۆ. 2) ئەنجومەن، پاڕلمان، مەجلیس. 3) پەردەیەك کە وێنەی چیرۆکێ بەتایبەتی چیرۆکی ئایینی یان حەماسی لەسەر کێشرابێتەوە. 4) دانیشتن، کۆبوونەوە. 5) سەندەڵی. 6) جار، چەل، کەڕەت. "**مجلس آراستن**": کۆڕ ڕازاندنەوە،

وەرێخستنی بەزم و ڕەزمی جێژن و شادی. "**مجلس کردن**": کۆبوونەوە گرتن بۆ ڕاوێ یان وتوویژ و سەیران و شتیوا. "**مجلس گفتن**": لێدوان و قسەکردن بۆ کەسانێ کە کۆبوونەتەوە. "**مجلس نهادن**": وەرێخستن یان جێبەجێکردنی کۆڕی پەند و ئامۆژگاری. "**به مجلس نشستن**": بڕوانە: "مجلس گفتن".

**مجلس آرا:** گوڵی مەجلیس، کۆڕ ڕازێنەوە، مرۆی قسەخۆش.

**مجلس استشاره:** ڕابێژگە، ڕاوێژگە، کۆڕی تەگبیر لە کارێ کردن.

**مجلس افروز:** بڕوانە: "مجلس آرا".

**مجلکا(ە):** بەڵێن نامە.

**مجلل:** بەرز وتەرز، شکۆمەندانە، بەشکۆ، شایانە، گەورە.

**مجلّه:** کۆڤار، گۆڤار.

**مجلّی:** ئاشکراکەر، پیشاندەر.

**مجمع:** کۆمەڵە، کۆڕ، ئەنجومەن، شوێنی کۆبوونەوە. "**مجمع تشخیص مصلحت نظام**": کۆڕی دیاریکردنی بەرژەوەندییەکانی نیزام. "**مجمع عمومی سازمان ملل**": کۆڕی گشتی ڕێکخراوی نەتەوەکان. "**مجمع کردن**": کۆبوونەوە.

**مجمل:** کورت، کورتە، پوخت، قسەی درێژی کورتەوەکراو. بەکورتی.

**مجموع:** 1) تێکڕا، بەگشتی، سەرجەم، کۆ. 2) جەموجۆر. 3) خاترجەم، ئەرخەیان. 4) کۆکراوە، خڕکراوە. "**مجموع آمدن**": کۆبوونەوە، خڕبوونەوە. "**مجموع شدن**": بڕوانە: "مجموع آمدن". "**مجموع کردن**": کۆکردنەوە. "**مجموع نشستن**": ئەرخەیان بوون، ئاسوودە ژیان.

**مجموعاً:** لەسەریەك، بەگشتی.

**مجموعه:** کۆکراوە. سەرجەم، کۆ. کۆمەڵ، کۆمەڵە. کۆلێکسیۆن. "**مجموعه تهی**": کۆمەڵەی بەتاڵ، کۆمەڵەیەکی گریمانەیی کە هیچ ئەندامێکی نەبێ. "**مجموعه شمسی**": کۆمەڵەی خۆر، کۆمەڵی خۆری. "**زیرمجموعه**": بەشەکۆمەڵە، ژێرکۆما.

**مجموعیّت:** کۆبوون، یەکپارچەیی.

**مجنون:** دێوانە، شێت، دین و هار.

**مجوّز:** مۆڵەت، ئیزن، ڕێپێدان.

**مجوس:** پێڕەوی ئایینی زەردەشت.

**مجوسیّت:** بڕوانە: "ثنویّت".

**مجوّف:** بڕوانە: "میان تهی".

**مجهّز:** پۆشتەوپەرداخ، پڕچەك، ئامادە، ساز، تەیار. "**مجهّزکردن**": پڕچەك کردن، پۆشتەوپەرداخ کردن، سازوتەیارکردن.

**مجهود:** هەوڵ، تەقالا. "**مجهود بذل کردن**": هەوڵی زۆر دان.

**مجهور:** ئاشکرا.

**مجهول:** 1) نادیار، نەزانراو، نەناسراو. 2) بڕوانە: "گمنام".

**مجهول العین:** نەناسراو.

**مجهول الهویه:** گوم ناو، بێناو و نیشان، نەناسراو. بێ ناسنامە.

**مجیب:** وڵامدەر(ەوە)، پەرسڤدەر. "**مجیب شدن**": وڵام دانەوە.





**مجید:** گەورە، مەزن، پایەبەرز، خۆشەویست.

**مجیدن:** دەست لێدان، دەست پیاهێنان.

**مجیر:** بڕوانە: "فریادرس".

**مجیز:** ئیزندەر، ڕێپێدەر. "**مجیز کسی را گفتن**": بەدرۆ پیاهەڵگوتن بۆ گەیشتن بە ئامانجێ، زمان لووسی بۆ ئەو کردن.

**مچ:** (مُ) مەچەکی دەست، قولاپە، قولاپەی پێ.

**مچاله:** فەرك، گوشین، قرمچ، کلۆف، کولۆف، گلفچ، پشاوتن، گلۆف، گولۆف، کوشران، مچۆڵە، ملۆچە، میچۆڵکە، میچۆڵە، لە دەست دا گلۆفیاو، گلفچ. "**مچالەکردن**": هەڵپشاوتن، هەڵپشافتن، هەڵشلەپاندن، کولۆفتن، گولۆفتن، گلۆفین، گولۆفتن، هەلگلۆفین، گلفچاندن، گلوچاندن، کوشین، گوشین، ڕێك گوشین لە نادەست دا، پشافتن، پشاوتن، فەرکان، قرمچاندن، مچاندن، مرچقاندن، پەرەخاندن، ولین، وەرافتن، مەرسین، هەسکاندن.

**مچل:** بڕوانە: "تمسخر".

**مچول:** چووکە، ناسك، جوان، قەشەنگ.

**مچیدن:** بڕوانە: "خرامیدن". بە مانای دیتنیش هاتووە.

**محابا:** لایەنگریکردنی کەسێ یان شتێك و لەبەرچاونەگرتنی هەقیقەت، تێبینی. 2) ترس. 3) لایەنگری، پشتیوانی. "**محابا داشتن**": بڕوانە: "محاباکردن". "**محاباکردن**": 1) تێبینی لەبەرچاوگرتن، قایمکاریکردن. 2) ترسان، ترسیان. "**کسی را محاباکردن**": پشتیوانی لێکردن.

**محاجّه:** باس و گوفتوگۆکردن بە بەڵگەهێنانەوە یان بە هەراوهوریا.

**محادثت:** 1) گفتوگۆ، وتوویژ، گوت و بێژ، ئاخاوتن دەگەڵ یەکدی. 2) تیژکردن یان زاخاودانی شمشێر و هتد.

**محاذی:** ڕووبەڕوو، بەرامبەر، هەمبەر.

**محارب:** 1) لە حکوومەتی ئیسلامیدا تاوانبارێ کە دژی حکوومەتی ئیسلامی یان ڕێوشوێنە ئیسلامییەکان ڕاپەڕیوە و کوژرانی واجبە. 2) شەڕکەر، جەنگاوەر، خەباتکار.

**محاربه:** 1) شەڕکردن، جەنگان. 2) (مافناسی) تێکدانی ئاسایش و نەزمی گشتی لە ڕێگەی بەکارهێنانی چەکوچۆڵ یان بەبێ ئەو.

**محارم:** کۆی "محرم".

**محاسب:** ژمارەگەر، ژماریار، ژمێریار، دەفتەردار، هوومارتۆخ.

**محاسبه:** 1) ژمێریاری، هەژماردن، دەفتەرداری، حەساوکردن دەگەڵ کەسێك. 2) لێپێچانەوە، (لێ)پرسینەوە، لێکۆڵینەوە، تاوتوێ.

**محاصره:** گەمارۆ، ئابلۆقە، دورپێچ. "**محاصرەشدن**": ئاسێبوون، حاسێبوون،

لەگەمارۆکەوتن، گەمارۆدران، دەورەگیران، حەڵقەدران. "**محاصرەکردن**": ئابلۆقەدان، گەمارۆدان، دەورەدان، حەڵقەدان، حاسێکردن، لەگێرخستن.

**محاضره:** 1) پرسیار و وەڵام کردن، باس و گفتوگۆکردن. 2) وانەبێژی.

**محاط:** گەمارۆدراو، دەورەگیراو.

**محافظ :** پارێزەر، پارێزگار، گێڕەوە، چاودێریکەر، نگابان.

**محافظت:** ئاگالێبوون، ئاگاداریکردن، ئاگاداری لێکردن، پارێزگاریکردن، پاراستن، پارازتن، ڤرسهاندن، حاواندنەوە، نێ پاوتا، نێ پەوتا.

**محافظەکار:** 1) خۆپارێز، لاپارێز، قایمکار. 2) کۆنەپارێز، کەسێ کە لایەنگری بڕوا و نەریتە کۆنەکانە. 3) (سیاسی) ئەوەی دۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئێستایی ناو کۆمەڵگا پشت ڕاست دەکاتەوە و دژی گۆڕانکارییە، دەستەڕاستی، پارێزکار، بەپارێز.

**محافل:** 1) کۆڕەکان، ئەنجومەنەکان. 2) کارناسان یان خاوەن ڕایانی بەرچاو.

**محاق:** دۆخی مانگ لە سێ شەوی کۆتایی مانگ دا(قمری) کە زۆر باریك دەبێتەوە و لە زەوی‌ڕا نابینرێ. "**بە محاق پیوستن**": لەناوچوون، مردن. "**بە محاق کشیدن**": لاوازبوون و لەناوچوون.

**محاکا:** باس و گفتگۆ یان مشتومرکردن.

**محاکات:** 1) بڕوانە:"محاکا". 2) لاسایی، دەمەلاسکە، چاولێکەری.

**محاکم:** کۆی"محکمە". "**محاکم شرعی**": دادگا شەرعییەکان.

**محاکمت:** دوژمنی، دوژمنایەتی.

**محاکمە :** دادگایی کردن، دانێرکرن، دادپرسین، لێپرسینەوە. "**بە محاکمە کشیدن کسی را**": دادگایی کردنی ئەو.

**محال :** (مُ) 1) شتی نەشیاو، لە کردن نەهاتوو، محاڵ، ئەستەم. 2) نادروست، خەتا. 3) قسەی بێسەروبن، قسەی بێمانا. 4) ناحەز، خراو.

**محالفت:** پەیمان بەستن.

**محاله:** توانایی، لێهاتوویی، هێز، چارە. "**لامحاله**": ناچار.

**محامات:** پشتیوانیکردن، لایەنگریکردن.

**محامی:** پارێزەر، بەرگر.

**محاوره:** دمەتەقە، دەمەتەقە، دەمەتەقێ، دمەتەقێ، گفتگۆی نێوان دووکەس، وڵامدانەوە بە یەکتر.

**محاولات:** خواستەکان، داخوازییەکان .

**محاولە:** 1) تەقالا، کۆشش، هەوڵ. 2) بڕوانە:"دسترسی". 3) بەئیرادە و ویستی خۆ، خۆبەخشانە.

**محبّ:** بڕوانە: "دوستدار".

**محبّت:** خۆشەویستی، خۆشەویسی، ئەڤین، ئەوین، دڵداری، دۆستایەتی، مۆڤەت.





**محبّت آمیز:** تێکەڵ بەخۆشەویستی، بەخۆشەویستییەوە.

**محبتی:** پێشکەشی.

**محبس:** زیندان، بەندیخانە، گرتیگەه.

**محبوب:** خۆشەویس، خۆشەویست، خۆشتەوی، خۆشەوی، دڵبەر، گراوی، لەبەردڵ، نازدار، کزەی جەرگ، کزەی جەرگان، مێریڤان.

**محبوب القلوب:** بڕوانە: "دوست داشتنی".

**محبوبه :** مێینەی"محبوب".

**محبوبیّت:** خۆشەویست بوون.

**محبوس:** بەندکراو، بەندی، گیراو، زیندانی، حەپسی.

**محتاج :** ئاتاج، هەژارونەدار، چاولەدەست، دەست کورت، نەتێر، هەوجەدار، ئەوەجە. "**محتاج شدن**": کەڵك تێکەوتن، کەل لێکەوتن، چاولەدەست بوون، ئاتاج بە کەسێ بوون.

**محتاط:** قایمکار، پتەوکار، لاپارێز، دوورنواڕ.

**محتاطانە :** هوشیارانە، بەپارێزەوە، لاپارێزانە.

**محتال:** بڕوانە: "حیلەگر".

**محتبس:** گیراو، زیندانیکراو، بەندکرا، بەندی.

**محتجب:** کەسێ کە پەچە و چارشێو دەپۆشێ، چارشێوپۆش. نادیار و گۆشەنشین.

**محترز:** خۆپارێز، خۆبوێر، پارێزکەر، دوورەپەرێز.

**محترف:** خاوەن پیشە، پیشەدار، بوونە پیشەوەر.

**محترق:** سووتاو، ئاگرگرتوو، ئاگرتێبەربوو. "**محترق شدن**": سووتان، شەوتین.

**محترم:** بەرێز، ڕێزدار، بەحورمەت، بەقەدروحورمەت، هێژا، کبار، لپێش، لەڕوو، ماقووڵ، ماقوور، جادار، بەڕێ. "**محترم پنداشتن**": بەگەورە زانین، گرساندن. "**محترم شماردن(داشتن)**": ڕێزلێ گرتن، ڕێزلێنان.

**محتسب:** ژمێریار. چاودێر، کوێخا، داروغە، نگابان.

**محتشدشدن:** ئامادەبوون.

**محتشم:** 1) گەورە و ماڵدار و دەوڵەمەند. 2) بەشکۆ، شکۆدار.

**محتضر:** (مُ.تَ.ضَ) گیانەلا، سەرەمەرگ، ئاویلکە.

**محتضر:** (مُ.تَ.ضِ) شارنشین.

**محتقر:** سووك کەر، لەبەرچاوان خەر.

**محتکر:** مالگر، قۆرخکار، پاوانکار، دەست بەسەراگر، بڕدەر، کەسێ شتێ دەشارێتەوە بۆ گران بوون.

**محتلم:** شەیتانی‌بوو، بالق، کەسێ کە لە خەو دا ببینێ خەریکی گان کردنە.

**محتمل:** ڕێ تێچوو، گونجاو، شیاو، مەیسەر.

**محتوا:** ناڤەرۆك، ناوەرۆك، ناوەرۆکە، کورەك، ناواخن، ناوك، ناو، کاکڵ، کاکڵە، هش.

**محتوم:** حەتمی، چارەنووس. پتەو و خۆڕاگر.

**محتوی:** هەڵگر، لەخۆگر.

**محجوب:** 1) بەحەیا، حەیابەخۆ، بەشەرم، شەرمن، شەرمێن، بەحەیا، فهێت کار. 2) داپۆشراو، پۆشراو، شاراوە. 3) نەهێڵراو، ڕێگەپێنەدراو. 4) بێ خەبەر، بێئاگا.

**محدَب:** قۆقز، قیت، دەرپەڕیو، زەق، زۆپ، کووڕ، پشت چەماو.

**محدَث:** (مُ.دَ) تازە و نوێ کە ناتەبا دەگەڵ نەریتە پەسندکراوەکان بێ.

**محدِّث:** (مُ.حَ.دِ) حەدیس گێڕەوە، ئەوەی حەدیسی پێغەمبەر دەگێڕێتەوە.

**محدثیت:** هاوئاخاوتەبوون، گفتوگۆکردن.

**محدود:** 1) سنوردار، چوارچێوەدار، کەوشەن دیاریکراو، بەرتەسك. 2) کەم و کورت، کەم. 3) کورت. 4) چووکە، گچکە. 5) بڕوانە: "مقید". 6) بێبەش، بێبەری. "**محدود بە جایی بودن**": هەبوونی سنووری هاوبەش دەگەڵ ئەو. "**محدودشدن**": 1) سنووردااربوون، بەرتەسك بوونەوە. 2) کەمبوونەوە. "**محدودکردن**": سنووردارکردن، بەرتەسك کردنەوە، خستنە تەنگانە و کۆتوبەندەوە.

**محدودە:** چوارچێوە، پاوان، پاون، پاوەند، قۆرغ.

**محدودیّت:** 1) سنورداربوون، سنووردارێتی. 2) بڕوانە: "تنگنا".

**محذور:** 1) بڕوانە: "مانع". 2) گرفتاری و کێشە. 3) ئەوەی کە دەبێ خۆی لێ بپارێزن، ئەوەی لێیدەترسن، مەترسی.

**محذوف:** وەلانراو، لابردراو، دەرهاویشتراو، بڕاو، قرتێنراو.

**محراب:** سەرووی ماڵ، سەرەوەی کۆڕ. پەرستگە. قیبلە، ڕووگە. "**محراب مسجد**": مێراو، مێحراب، جێگەی پێش نوێژ لە مزگەوتا، ڕووگە.

**محرِّر:** 1) نووسەر. 2) دەربازکەر، قوتارکەر.

**محرز:** مسۆگەر و بەڵگەنەویست، ئاشکرا.

**محرِض:** هاندەر، هانەدەر، دنەدەر، بزوێنەر، وروژێنەر.

**محرِّف:** (مُ.حَ.رِ) چەواشەکار، بەلاڕێدا بەر، گۆڕێن، کەسێ کە ئاخاوتەیەك بگۆڕێ.

**محرَّف:** (مُ.حَ.رَ) چەواشەکراو، گۆڕاو.

**محرَّق:** (مُ.حَ.رَ) سووتاو، سووتیاگ.

**محرِّق:** (مُ.حَ.رِ) سووتێن، سووتێنەر. ئەوەی دەبێتە هۆی توونیایەتی.

**محرِّك:** دنەدەر، هانەدەر، هاندەر، جوولێنە، هەڵخرێن، جوولێن، هێڤۆژە، پاڵنەر، سەربەگێچەڵ، سەربەگۆبەند داینەمۆ، بزوێنەر.





**محرکات:** هۆکارە هاندەرەکان.

**محرم:** (مَ.رَ) مەحرەم، خۆیی و خزم و ئەندامی بنەماڵە کە پێك ناشێن، ژن و پیاوێ کە دەست نوێژیان لە یەکتر ناشکێ.

**محرَّم:** (مُ حَ رَ) قەدەغە، مانگی موحەڕەم، مانگێ کە عەرەب شەڕکردنیان تێدا قەدەغە کردوە.

**محرمانە:** بەنهێنی، نەپەنی، ژێرجلەکی، بێ ئەوەی کەس بزانێ.

**محرور:** 1) گەرم. 2) گەرماژۆ.

**محروس:** پارێزراو، ڕاگیراو. "**محروس داشتن**": پاراستن.

**محروم:** بێبەش، بەشخوراو، بێبەری، بێوەری، بێ پشك، ماف خوراو، ناهومێد. "**محروم شدن**": بێبەش بوون، بێ بەریبوون. "**محروم کردن**": بێبەش کردن، بێ بەریکردن، بێپشك کرن، بێمافکرن، حەرماندن، هەرماندن.

**محرومیت:** بێبەش بوون، بێبەشی، بەشخوراوی.

**محزون:** بڕوانە: "اندوهگین".

**محسن:** چاکەکار.

**محسنە:** ڕازاوە و جوان.

**محسوب:** ژمێرراو، لە قەڵەم دراو. "**محسوب شدن**": لەقەڵەم دران، ژمێردران.

**محسود:** ئێرەیی پێ براو.

**محسور:** حەسرەت بەر.

**محسوس:** 1) هەست پێکراو، بەرهەست. 2) ئاشکرا، دیار. "**محسوس شدن**": هەست پێکران، دەرك پێکران.

**محشا/محشی:** پەراوێزنوسیکراو.

**محشر:** 1) شوێنی کۆبوونەوەی خەڵك، ڕۆژی پەسڵان، سەڵا. 2) ئاپۆرە و هەنگامەی زۆر. 3) زۆر باش. "**محشر اکبر**": ڕۆژی قیامەت. "**محشر برپا (به پا) کردن**": قەرەباڵغی و هەیتەهەیت نانەوەی زۆر. "**محشر خر**": قەرەباڵغی و پشێوییەك کە کەس بە کەس نەبێ، کەربازاڕ. "**محشر کردن**": 1) قەرەباڵغی و دەنگ و هەرای زۆر نانەوە. 2) ئەنجامدانی کارێ بەشێوەی باش، کاری سەیر و سەرنج ڕاکێش کردن.

**محشور:** لە دەوری یەك کۆوەکراو، هاودەم، هاوڕێ.

**محصِّل:** 1) قوتابی، خوێندەوار، دەرس خوێن. 21) خوازیاری زانست. 3) لێکۆڵەر، لێکۆڵەرەوە.

**محصن:** (مُ.صَ) پیاوی ژندار.

**محصَّن:** (مُ حَ صَ) پتەو، قایم.

**محصنات:** 1) ژنانی بەمێرد. 2) ژنانی داوێن پاك.

**محصور:** 1) گەمارۆدراو، ئابلۆقەدراو، دەورەگیراو، دەورەدراو، ئاسێبوو، قەتیس بوو، پەنگ خواردو، کلیدە. 2) گرفتار، بەخسیر.

**محصوری:** گەمارۆدان و گرفتارکردنی کەسێك.

**محصول:** بەرهەم، وەرهەم، ڕەنێو، هەل بەر، بەروبووم، داهات، دەستکەوت، حاسڵ. "**محصول برداشتن**": 1) بەروبووم هەڵگرتن، خەلەوخرمان هەلگرتن. 2) کۆکردنەوە و وەدەست خستنی بەرهەمی شتێ یان کارێ. "**محصول جالیز**": تەرەکاری، میوەی بێستان و سەوزیجاتی هاوێنە. "**محصول دادن**": بەردان، بەرهم دان. "**محصول زراعت**": بەرجفت، ئاژار، داهاتی زەوی و زار. "**محصول قطعی**": (ئابووری) بەرهەمی ئامادەی بەکاربردن (مصرف) کە جارێکی تر نەکەوێتەوە پرۆسەی بەرهەمهێنان.

**محصون:** پارێزراو و توندوقایم.

**محض:** 1) پوخت، ناتێکەڵاو. 2) بێ ئەملاو ئەولا، حەتمی، مسۆگەر. 3) پەتی، ڕووت. 4) تایبەتمەندی زانستێ کە لایەنی تیۆری هەیە(فیزیک محض). "**محضِ**": بۆ، لەبەر. "**بەمحض**": 1) هاوکات دەگەڵ، هەر بە، هەر خێرا بەدوای. 2) بۆ.

**محضر:** هەنتەش، شوێنی ئامادەبوون، دەفتەری مارە و تەڵاقان، شوێنی نووسینی بەلگە و بڕیارەکان. بارەگا. گەوایی، شایەتی.

**محضرنامه:** گەوایی نامە.

**محط:** شوێنی هاتنەخوارەوە، وێستگە، ئێستگە، ماڵ.

**محظور:** حەرام، قەدەغە، ناڕەوا. "**محظور داشتن**": هەبوونی گرفتاری. "**از خود رفع محظور کردن**": خۆدەربازکردن لە شتی ناخۆش و گرفتارکەر.

**محظوظ:** خۆشبەخت، بەختیار، بەهرەمەند.

**محفل:** کۆڕ. ئەنجومەن.

**محفوظ:** پارێزراو، نگاداریکراو، ڕاگیراو.

**محقّ:** خاوەن هەق/ماف، هەقدار، مافدار.

**محقّر:** پچووک، ورد، سووک، نزم.

**محقرات:** شتە چووک و بێ نرخەکان.

**محقِّق:** (مُ.حَ.قِ) لێکۆڵەر، لێکۆڵیار، تۆژەرەوە، هوورەنێر، کەسێك کە بە حەقیقەتی شتێك بگا. "**محققانه**": لێکۆڵەرانە.

**محقَّق:** (مُ.حَ.قَ) سەلمێنراو، یەکجارەکی و بەلگەنەویست. "**محقق شدن**": 1) سەلمێنران، وەدیهاتن، دەستەبەربوون. 2) زانران. "**محقق ساختن**": (مُ.حَ.قَ) دەستەبەرکردن، وەدەست خستن.

**محقون:** ڕاگیراو، پارێزراو. "**محقون الدم**": ئەوەی کوشتنی ڕەوا نیە.

**محك:** تێساو، ئامرازی ئەزموونی زێڕ، پێوەر. "**محك خوردن**": دیاریکرانی عەیاری زێڕ و زێو.

**محکم:** پتەو، بتەو، قایم، قاهیم، قەرت، خۆگر، سفت، سفتوسۆڵ، توند، بەناف، پشتدار، توندوگورج، توندوتۆڵ، ڕەختە، ڕیختە، قەرت، تۆکمە، گورخ. "**محکم بستن**": شەتەکدان، شەتەن دان، شەداندن،





داپێچانی توند، توندبەستن، ئێشکدان، خڕداخستن، دابەستن، داوەستن، هەڵبەستن، داپێچاندن، داپێچان، داپێچین، جیڕەبابە. "**محکم زدن**": حەترەك، بەتوندی لێدان، قەوی لێخستن. "**محکم شدن**": 1) پتەوبوون(ەوە)، قایم بوونەوە. 2) توندبوونەوە. 3) جێگیربوون، بەهێزبوون. "**محکم و سنگین**": قورس و قۆڵ، قایم و توند و بەکێش.

**محکم کاری:** کار قایمی، قایمکاری، قایمەکاری.

**محکمه:** دادگا، دیوەخانی قازی، دیوانی بە شکایەت ڕاگەیشتن، شوێنی دادپرسین. "**محکمه استیناف**": دادگای پارێزگا. "**محکمه بدایت**": دادگای شارستان. "**محکمه صلح**": دادگای بەخش.

**محکمه پسند:** جێی قبووڵی دادگا، لۆژیکی و بەلگەمەند.

**محکوك:** هەڵکەنراو، رووشاو، تاشراو.

**محکوم:** بەتاوانبار ناسراو، حوکم دراو، چەکدراو، مەحکووم. "**محکوم به**": ئەو شتە یان کێشەیەی کە بڕیاری دادگای لە سەر دەرچووە. "**محکوم علیه**": کەسێك کە بڕیارەکە بە زیانی ئەو دەرچووە. "**محکوم کردن**": ئیدانەکردن، پڕۆتێستۆکردن، مەحکووم کردن. "**محکوم کردن در بحث**": قسەپێنەهێشتن، ڕامل خستن. "**محکوم له**": کەسێك کە بڕیارەکە بە قازانجی ئەو دەرچووە.

**محکومیّت:** 1) مەحکووم بوون. 2) مەحکووم کران. 3) ماوەی حەپس.

**محل:** 1) شوێن، جێ، جێگە. 2) گەڕەك. 3) هەبوو، بوون و نەبوون (از محل صندوق پرداخت شود). 4) پێگە. 5) هەل، دەرفەت. 6) ئەندازە. 7) وەخت، کات. "**محل اتصال**": جەمسەر، جێگەی پێکەوە لکانی دوو شت. "**محل تلاقی**": شوێنی پێکگەیشتن. "**محل داشتن**": 1) بەجێبوون، لەباربوون. 2) ئێعتبار هەبوون. 3) دەرفەت هەبوون، هەل هەبوون. "**محل سگ به کسی گذاشتن**": کەمترین بایەخ پێدان بەو، حەساوی ئەوتۆ بۆ نەکردن. "**محل شدن**": هەل ڕەخسان، دەرفەت پێشهاتن. "**محل کردن**": گرینگی پێدان، بایەخپێدان، بەهێندگرتن. "**محل گذاشتن**": بایەخ پێدان، بەهێندگرتن. "**محل نهادن**": 1) بڕوانە: "محل گذاشتن". 2) بڕوانە: "توجیەکردن". "**محلی از اعراب نداشتن (پیدانکردن)**": بایەخ و گرینگی نەبوون، بێ بایەخ بوون. "**به محلِ**": بەجێی. "**در محل**": بەجێ.

**محلل:** 1) جاش، پیاوێ ژن بە وادە مارە دەکا و کرێ دەستێنێ. 2) بەرەو لاوازی بەر، داخورێنەر. 3) حەڵاڵکەر. 4) شیکارگەر، لێکدەرەوە، ڕاڤەر.

**محلوج:** هەلاجیکراو.

**محلول:** گیراوه، حەل کراوه، تواوه، شلاوك، شتێ كە لە تراوێك دا توابێتەوە. "**محلول آب نمك**": خوێواوك. "**محلول شدن**": 1) حەلبوونی یەك ماددە لە تراوێك دا. 2) لەناوچوون.

**محله:** گەڕەك، تاخ.

**محلّی:** خۆماڵی، خۆجێیی.

**محمل:** 1) كەژاوە. 2) هۆ، سەمەد. "**محمل بستن** (**بربستن**)": دابستنی كەژاوە لەسەر پشتی چوارپێ بۆ سواربوون. 2) ئامادەی سەفەربوون. "**محمل داشتن**": ڕاگرتنی چوارپێی كەژاوە هەڵگر.

**محمل نشین:** ڕێبوارێ كە بە كەژاوە سەفەر دەكا.

**محمود:** ستایشكراو، سوپاسكراو.

**محمول:** 1) هەڵگیراو، باركراو. 2) ڕاڤەكراو.

**محمولات:** بارەكان.

**محموله:** بار، ئەوەی لە لایەن كەسێكەوە ڕادەگوێزرێ.

**محموم:** تۆبەتێ دار، یاودار.

**محنت:** مەینەت، بەڵا، چەرمەسەری، سەختی.

**محنت آباد:** 1) مەینەتاوا، شوێنی ڕەنج و سەختی. 2) دنیا.

**محنت بار:** پڕچەرمەسەری، مەینەتبار.

**محنّت زده:** تووشی مەینەتی هاتو، تووشی ڕەنج و سەختی.

**محنت كش:** مەینەتی كێش، تووشی ڕەنج و سەختی.

**محنتی:** بڕوانە: "محنت كش".

**محو:** 1) سڕینەوە، قەڵاچۆكردن، لەناوبردن، لەبەین بردن، شوێنەواربڕین، مەفح/ مەفع كردنەوە. 2) بەحاڵەتی كەمڕەنگ و ناڕوون. "**محو كسی** (**چیزی، كاری**) **شدن**": چوونە ناخی ئەوەوە، زۆر سەنجدانە ئەو، چاو تێبڕین.

**محور:** 1) ڕێگە، جاددە( محور تهران ـــ كرج). 2) تەوەرە. 3) (سیاسی) پێوەندیی ڕاستەوخۆ یان دۆستانەی نێوان دوو وڵات یان دوو سەرزەوی. 4) شافت. 5) بنەما، بنچینە. 6) خولگە. "**محور جانشینی**": تەوەرەی جێنشینی. "**محور همنشینی**": تەوەرەی هاونشینی.

**محوری:** بنەڕەتی، بنچینەیی، كاریگەر. چەرخان، چەرخین. هەڵكەوتوو لە تەوەرەدا.

**محوطه:** زەوییەك كە دەورەكەیان دیوار كێشابێ، دەورووبەر، چوارچێوە، فەزا.

**محوّل:** (مُ.حَ.وِ) گۆڕێن، ڕاگوازەر، ڕاگوێزەر، گوێزەرەوە.

**محوّل:** (مُ.حَ.وَ) 1) هەڵگەڕاوە، ژێرەو ژووربوو. 2) پێ سپێردراو. "**محوّل كردن**(**داشتن**)": پێ‌سپاردن.

**محیّر:** سەرسام، مات و سەرگەردان. "**محیّرالعقول**": سەرسامكەر، سەرگەردانكەر. زۆر سەیروسەمەرە.





**محیص:** بڕوانە: "گریزگاه".

**محیط:** 1) شوێنكار، شوێنێ كە مرۆڤی تێدا بژی، دەڤەر. 2) شتێ كە دەورووبەری شتێكی دی بگرێ، داگر، داگرتوو، چوارلاگر، دەورەدەر. 3) چوارچێوە، فەزا. 4) ئاگا و بەخەبەر. 5) (جوغرافیا) زەریا، ئوقیانووس. 6) (بیركاری) چێوە، كەمەرە "**محیط زیست**": ژینگە. "**محیط دایره**": چەنبەر، كەمە. "**محیط شدن بر چیزی**": لەخۆگرتنی ئەو، دەورەگرتنی ئەو.

**محیط بانی:** پارێزگاری لە ژینگە.

**محیل:** بڕوانە: "حیلەگر".

**محیی:** زیندووكەرەوە.

**مخابرات:** 1) بەدالە، ئیدارەی تەلەفوون و تیلێگراف. 2) (نیزامی) دەزگای هەواڵگر/هەواڵچنی، دەزگەها ئەولەكارییێ.

**مخابره:** پێڕاگەیاندن، هەواڵ پێدان، هەواڵ وەرگرتن، ناردنی هەواڵ، قسەكردن بە تەلەفوون یان تێلگراف.

**مخاتله:** یەكتر خەڵەتاندن.

**مخادع:** خەڵەتێن، فریودەر، فێڵباز.

**مخادعه:** یەكتر فریودان، فرتوفێڵ كردن.

**مخارج:** خەرجەكان، مزەختەكان، تێچووەكان.

**مخازن:** كۆی:"مخزن".

**مخاصم:** شەڕانی، دژایەتیكار، دژبەری، دوژمنایەتیكەر.

**مخاصمات:** دوژمنایەتییەكان، دوژمنكارییەكان.

**مخاصمه:** دوژمنایەتیكردن، دوژمنكاری، دژایەتیكردن.

**مخاط:** (مُ) لینج، لینجە، "مووكووس". "**غشاء مخاطی**": لینجەپەردە.

**مخاطب:** (مُ.طَ) بەردەنگ، بەربانگەواز، قسەبۆكراو، كەسی گوێگر، بژنەو، وەرگر. "**مخاطب ساختن** (**قراردادن**) **كسی را**": ڕووتێكردن، لە ڕووی كەسێ قسەكردن، قسە لە گەڵ كردن، دواندن.

**مخاطب:** (مُ.طِ) ئەوەی دەگەڵ كەسێكی تر قسەدەكا، دوێنەر، پەیڤەر.

**مخاطبات:** نامەكان.

**مخاطبه:** 1) ڕووبەڕوو قسەكردن دەگەڵ كەسێك، گفتوگۆكردن. 2) لێپرسینەوە و سەرزەنشت كردن.

**مخاطر:** مەترسییەكان، تەلەزگەكان، كەسێ كە خۆی بخاتە مەترسییەوە.

**مخاطره:** 1) مەترسی. 2) خۆ خستنە مەترسییەوە. 3) مەترسیدار. "**مخاطره كردن**": بڕوانە:"مخاطره(1)". "**به مخاطره افتادن**": كەوتنە مەترسییەوە.

**مخاطرەآمیز:** مەترسیدار، پڕ مەترسی.

**مخافت:** 1) ترس، خۆف. 2) ترسناك بوون، پڕمەترسیداربوون.

**مخالصت:** دۆستایەتی پاك و بێ‌خەوش.

**مخالطت:** دۆستایەتی و تێكەڵی.

**مخالطه:** 1) تێكەڵ كردن، ئاوێتەكردن، ئامێژەن كردن. 2) تێكەڵاوی، دەگەڵ یەك هەستان و تێكەڵ بوون.

**مخالف:** دژ، نەیار، نەرێن، دژکار، دژبەر، بەرهەڵستکار، ئۆپۆزیسیۆن، ناسازگار. پێچەوانە. جۆراوجۆر، ڕەنگاوڕەنگ.

**مخالفت:** دژایەتی، دژێتی، دژکاری، بەرهەڵستی، بەرەنگاری، ناسازگاری، موود، نەیاری، نەرێنی، نەیین. "**مخالفت شدن با امری**": دژایەتی لەگەڵ کران، پەسندنەکران. "**مخالفت کردن**": دژایەتیکردن، بەرهەڵستیکردن، کلك هەڵسووڕاندن، بەقسەنەکردن.

**مخالف خوان:** دژخوێن .

**مخاوف:** ئەو شتانەی کە ببنە هۆی ترس و خۆف، جێگەترسناکەکان.

**مخبر:** (مُ.بِ) هەواڵگەێن، پێڕاگەێن، ڕاگەێن، پەیامبەر، ڕاپۆرتدەر، ئاگاکەرەوە.

**مخبر:** (مَ.بَ) 1) دەروون و ناخی کەسێك. 2) ئەوەی هەواڵێ لەبارەی ئەوەوە دەدەن. 3) ناوبانگ، ناڤدەنگ.

**مختبر:** تاقیگە، ئەزموونگە.

**مخبط:** هەواس پەرت، بیربڵاو.

**مختار:** 1) سەربەست، سەرپشك، هەڵبژێر، خاوەن ئیختیار. 2) هەڵبژێردراو. 3) شاز، بژاردە، هەڵبژاردە و جیاکراوە، هەرەچاك، دانسقە. "**مختار ساختن کسی**": سەرپشك کردنی کەسیك، سەربەست کردنی کەسێك.

**مختاریّت:** سەرپشکی، سەربەستی.

**مختال:** پیاوی خۆپەسند و بەدەمار.

**مخترع:** (مُ.تَ رِ) داهێن، داهێنەر، وەدیهێن.

**مختص:** تایبەت، تەرخانکراو. "**مختص کردن**": تەرخان کردن.

**مختصر:** کورت، کورتە، قسەی درێژی کورتەوەکراو، قوڵەوەکراو، پوخت، کەم و کورت، ڕێك و ڕاست. کورتبڕی. کەم، کەم نرخ. "**مختصر کردن**": کورت و پوخت کردن. "**مختصر کلام**": کڕاقالی، پوختەی بێژە، پوختەی ئاخاوتە.

**مختصرك:** زۆر کەم.

**مختل:** تێکدراو، تێکچوو، خەرا. شێواو، شپرزە.

**مختلس:** (مُ.تَ.لِ) ڕفێنەر، فڕێنەر، کەسێ کە بە فرتوفێڵ لە دامەزراوە یان لە کەلوپەلی کەسێك شت دەدزێ.

**مختلط:** تێکەڵاو، ئاوێتە، دەرهەم، تێك ئاڵۆزاو، تێکەڵ پێکەڵ. "**مختلط بودن**": تێکەڵاوی و نزیکی. "**مختلط شدن**": ڤەخومان، تێکەڵ پێکەڵبوون، تێکەوەگلان، تێك ئاڵۆزان.

**مختلف:** جۆراوجۆر، جۆربەجۆر، فرەچەشن، هەمەچەشن، جیاواز. "**مختلف اللون**": بڕوانە: "رنگارنگ".

**مختوم:** مۆرکراو، بە کۆتایی گەیەنراو.

**مختون:** خەتێنەکراو، سوننەت کراو، سنەت کری.

**مخچه:** مێشکۆڵە، زۆپایی پشتەسەر.





**مخدّر:** سڕکەر، هۆشبەر، بێهۆشکەر، سست کەر.

**مخدره شدن:** خۆداپۆشین.

**مخدوش:** خەوشدار، عەیب دار، زەدەدار، رووشاو. "**مخدوش کردن**": شێواندن، ڕووشاندن، خەوشدارکردن.

**مخدوع:** بێبرەو، بێنرخ.

**مخذول:** سەرشۆڕ، کەسێ کە لە کایەکردن لە گەڵ ئەو خۆ دەبوێرن.

**مخرّب:** تێکدەر، ڕووخێنەر، وێرانکەر، کاولکەر.

**مخرج:** شوێنی دەرچوون، شوێنی چوونە دەرەوە.

**مخروبه:** خاپوور، وێرانە، کاولکراو.

**مخروط:** 1) تاشراو، خەڕاتی کراو. 2) شکلێکی هێندسییە، قووچ، قوویچ، قوویچك، قووچەك، کەللەقەندی.

**مخروطی:** قووچ هەڵکەوتوو، هوللکن، کۆڤك، هەرچی وەك ڕەحەتی بێ.

**مخزن:** خەزێنە، گەنجینە، ئەمبار، شوێنی پاشەکەوت کردن و ڕاگرتن.

**مخزوم:** کون کراو.

**مخزون:** پاشەکەوت کراو.

**مخصوص:** تەرخانکراو، تایبەتیکراو، تایبەتی، هۆمایی، خۆماڵی. "**مخصوص داشتن**": تەرخان کردن بە کەسێ یان بە شتێ. "**مخصوص شدن**": 1) تەرخان بوون. 2) خاوەنی هەڤیازی و لەسەرتری بوون. "**مخصوص کردن**": تایبەتیکردن، تەرخان کردن بە کەسێ یان بە شتێ.

**مخصوصاً :** 1) بەتایبەت، بەتایبەتی، خاسما، گەوشینی. 2) بڕوانە:"عمداً".

**مخطط:** ڕێ ڕێ، هێڵ هێڵ کراو، هێڵدار، خەتدار، میلدار.

**مخطوب:** خوازبێنیکراو.

**مخطّی:** بڕوانە: "خطاکار".

**مخفّف:** (مُ.خَ.فِ) سووك کەرەوە، کەمکەرەوە، داشکێن.

**مخفّف:** (مُ.خَ.فَ) 1) سووکەڵەناو، سووکەناو. 2) سووك کراو، داشکاو.

**مخفی:** نهێنی، شاراوە، نادیار، نەپەنی. "**مخفی شدن**": بڕوانە:"پنهان شدن".

**مخفیات:** شتە نهێنییەکان.

**مخفی‌التناسل:** بڕوانە: "نهانزا".

**مخفیانه:** بەنهێنی، پەنامەکی.

**مخفیکاری:** ئەنجامدانی کارێ بەشێوەی نهێنی.

**مخفیگاه:** حەشارگە، پەناگە، جیگەی خۆتێدا شاردنەوە.

**مخلّ:** بڕوانە: "اخلالگر".

**مخلاّ:** 1) خاڵی، بەتاڵ. 2) ئازاد و وێڵ بوو. "**مخلا به طبع**": ئارام و بێدەنگ و بەپێی مەیل.

**مخلّد:** بڕوانە: "جاویدان".

**مخلص:** (مُ.لِ) موخلیس، هەواڵی پاك و بێڕیا، دڵپاك، دڵسۆز، خزمەتکاری بە ئەمەگ.

**مخلص:** (مَ.لَ) 1) شوێنی ڕزگاربوون، شوێنی قوتاربوون. 2) کورتە و پوختەی قسە، پوختەی وتار. "**مخلص سخن (کلام)**": بەکورتی.

**مخلص:** (مُ.لَ) پاك کراو، خاوێن کراو، پوختەکراو.

**مخلف:** (مُ.لِ) 1) ئەوەی کەسێك دەکاتە جێنشین. 2) گیایەك کە دووبارە گەڵای کردبێتەوە. 3) کوڕی جوان و قەشەنگ.

**مخلّف:** (مُ.خَ.لَ) باقیماو، بەجێماو.

**مخلوط:** ئامێتە، تێکەڵاو، تێکەڵە.

**مخلوع:** وەلانراو، هەڵقەنراو، لە سەر کار دەرکراو.

**مخلوق:** 1) خوڵقاو، خوڵقێنراو، ئافرێنراو. 2) مرۆ، ئینسان.

**مخلی/مخلا:** بەتاڵ بوو، شوێنی بەتاڵ.

**مخمّر:** (مُ.خَ.مَ) 1) هەڵاتوو، بوونەهەویر. 2) کوڵاو و گەیشتو. 3) شیاوی فام و تێگەیشتن. "**مخمرشدن**": 1) هەڵاتن، بوونەهەویر. 2) تێگەیشتن، بوونە مەلەکەی زەین.

**مخمّس:** پێنج خشتەکی، بەندە شێعرێکی پێنج لەتی. پێنج کونج. (بیرکاری) پێنج لا.

**مخمصه:** 1) برسێتی زۆر. 2) ژانەسەر، گێچەل، هەچەڵ، دەردی سەر، قەرقەش، گێرەوکێشە، گرفتاری، دژواری.

**مخملك:** مێکوت، مێکوتك، مێکوتە، میرکوت، نیرگوتك، نەخۆشییەکی زارۆکانە زیبکە دەردەکەن.

**مخملی:** 1) مەخمەری. 2) نەرم و ئارام، نەرمونیان.

**مخمور:** سەرخۆش، مەست.

**مخنّث:** 1) سابوورە، مێرمەندۆك، نێرەمووك، نەنێرنەمێ. 2) هیزەکە، پیاوی حیز. 3) ژنانی، ژنانیلێ.

**مخنّق:** خنکێنەر.

**مخوف:** ورەبەر، سامناك، ترسێنەر، ترسناك، هۆڤ، پڕ ترس و خۆف، زراوبەر.

**مخیدن:** 1) جووڵان، بزووتن. 2) چوون بەدوای کەسێکا. "**مخیدن درکسی**": پێڕەویکردن لەو.

**مخیّر:** خاوەن ئیختیار، سەرپشك. هەڵبژێراو.

**مخیله:** ناوەندی خەیاڵ لە سەر دا، مێشك، زەین، خەیاڵ.

**مخیم:** خێوەتگە.

**مد:** (مُ) باب، باو، ڕمێن، شێوە، شێواز، داب، مۆد، مۆرە. "**مدشدن**": داکەفتن، داکەوتن، بوونە مۆد.

**مدّ:** (مَ) 1) خێزاو، ڕادان، هەڵکش، هەڵکشە، هەڵکشیان، هەڵکشین، هەڵکشاو، هەڵکشاوە، هەڵکشاوی، هەڵکشانی ئاوی دەریا. 2) کێشان، درێژکردنەوە. 3) کێشران. 4) کەشە، هێمایەك بەم فۆڕمە(~). 5) دیاری، پێشکەشی. "**از مد نظر دور داشتن امری**": بەهێند نەگرتنی ئەو.





**مداجات:** مداراکردن دەگەڵ دوژمن، شاردنەوەی دوژمنایەتی.

**مدّاح:** بەندبێژ، بێژەری شێعری پیاهەڵدان، لاون، لاوێنەر، پەسندەر، پەسندار، تاریفدەر، ستایشکەر، چاوش ئاسا.

**مداخل:** 1) ڕێگەکانی چوونە ناوەوە، دەروازەکان. 2) بەرتیل. 3) داهاتەکان. "**مداخل کردن**": وەدەست خستنی پارە و سامان لەڕێگەی نایاساییەوە.

**مداخله:** دەست تێوەردان، دەست تێخستن، خۆتێهەڵقوتاندن، خۆتێخستن، دەم تێوەدان.

**مداخله‌گر:** دەست تێوەردەر، دەست تێخەر، خۆتێهەڵقوتێن، دەم تێوەردەر.

**مدادتراش:** خۆتاش، خۆتراش.

**مدار:** 1) خولگە، سوڕگە، تەوەرە. 2) گۆڕەپان، چوارچێوە. 3) ناوەند، چەق. "**مدار گذراندن**": دابین کردنی خەرجییەکانی ژیان. "**مدار مجتمع**": ئای.سی.

**مدارا:** مدارا، نەرمکێشی، هەڵکردن، حاوانەوە، سەبروحەوسەلە، بە نەرمی و خۆشخوڵقی هەڵسوکەوت کردن، تۆلێرانس. "**مداراکننده**": نەرمکێش، بەسەبر و پشوولەسەرخۆ، مداراکەر.

**مدارس:** کۆی"مدرسە".

**مدارك:** کۆی"مدرك".

**مدارکه:** پەیتاپەیتا هێنان. "**بر مدارکه**": دەزبەجێ، بەبێماتڵی.

**مداعبه:** گاڵتەوگەپ کردن، شۆخیکردن.

**مدافع:** داکۆکیکەر، بەرگر، بەرگیر، بەرگریکار، بەرەڤانکەر.

**مدافعه:** 1) بەرگریکردن، داکۆکیکردن، پشتیوانی و لایەنگری لێکردن. 2) کەمتەرخەمی نواندن لە ئەنجامدانی کارێك یان بیانووهێنانەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو. 3) دان.

**مداقه:** وردبوونەوە، باریك بینی.

**مدالست:** فریودان، خڵەتاندن، خاپاندن.

**مدام:** 1) بەردەوام، هەمیشە، پەیتاپەیتا. 2) مەی، شەڕاب.

**مداوا:** دەرمان کردن، تیمارکردن، چارەکردن.

**مداولت:** گێڕان، چەرخان.

**مداوم:** لەسەریەك، بەردەوام، پەیتاپەیتا، لێکدالێکدا.

**مداومت:** بەردەوامی، درێژەپێدان، دەوام پێدان، لە سەر ڕۆیشتن، دەست هەڵنەگرتن، پایەداری. "**مداومت داشتن**": درێژەهەبوون، بەردەوام بوون.

**مداوی:** دەرمانکەر، تیمارکەر.

**مداهنه:** 1) تەڵەکەبازی، فێڵبازی، دووڕوویی. 2) بڕوانە: "چاپلوسی".

**مدایح:** کۆی"مدیح".

**مداینت:** وام بەیەکتر دان.

**مدبر:** (مُ.بِ) بەرەودواوەچوو.

**مـــــدبّر:** (مُ.دَ.بِ) بــــەڕا، بــــەردەبار، زاناوبەتــەگبیر، بەتــەگبیروڕا، بەمــشوور، قایمکار، تیٚبین، دووربوان.

**مـــدّت:** 1) مـــاوە، تـــاو، دەم، کـــاتی دیاریکـراو. 2) مۆڵـەتی ژیـان، تەمـەن. 3) ڕۆژگـــــار، دەوران. "**مـــدّت بـــردن**": درێژەکێشان. "**مدّت گرفتن**": درێژە کێشان. "**مدّت مدید**": مـاوەی دوور و درێـژ، مـاوەی زۆر. "**مـدّت یـافتن**": تەمــەن کــردن یــان لەماوەی تەمەن دا هەل ڕەخسان.

**مـدت العمـر:** 1) مـاوەی ژیـان، مـاوەی تەمەن. 2) لە مـاوەی ژیانـدا، لـە تـەواوی ژیاندا.

**مدّت دار:** ماوەدار.

**مـــدّتی:** چـــەندیٚ، دەمێـــك، دەمـــەك، سەروەختیٚ، ماوە لە زەمان، قەیدیٚ.

**مـدح:** پیاهـەڵگوتن، پیاهەڵـدان، هەڵـدان، هـەڵ نـان، پەسـن دان، هەڵکێشان، هـەڵ کێشیان، تـاریف کـردن، بەبـەژن و بـاڵا هـەڵکوتن، سـتایش کـردن. "**مـدح دروغـین**": زمان لێدان، تـاریف کردنـی بـە درۆ، فـوو پێداکردن.

**مدح خوان:** بڕوانە: "مدیحەسرا".

**مـــدخل:** 1) ڕێگـــەی چـــوونە نـــاوەوە، دەروازە. 2) پێـــشەکییەك بـــۆ چـــوونە نـاوەوەی باسـێك. 3) داهـات. 4) ئـیراد، وردەگـیری. "**مـدخل کـردن**": ڕەخنـەکردن، چوونەناوەوە.

**مدد:** ئاریکاری، هاریکاری، یاریدە.

**مددکار:** ئاریکار، یارمەتیدەر، فریاڕەس، دادڕەس.

**مددگر:** بڕوانە: "یاور".

**مددمعاش:** پـارە یـان پـووڵیٚ کـە جگـە لـە مووچە وەك یارمەتی بە کەسێك دەدریٚ.

**مـدرّب:** (مُ.دَ.رِ) ڕاهێنـەر، مەشـق پێکـەر، هێن کەر.

**مـــدرّب:** (مُ.دَ.رَ) بەئـــەزموون، ســـەختی چەشتو.

**مدرج:** (مَ.رَ) ڕێباز، ڕێڕەو.

**مـــــدرّج:** (مُ.دَ.رَ) پلەپلـــــە، نقرنقـــــر. پلەبەندیکراو.

**مـــدرّس:** وانەبێـــژ، مامۆســـتا، فێرکـــار، دەرزبێژ، سەیدا.

**مدرســـە:** قوتابخانـە، خوێنـدنگا، شـوێنی وانـە خوێنـدن، شـوێنی وانـە گوتنـەوە. "**مدرسه ابتـدایی**": قوتابخانـەی سـەرەتایی. "**مدرســه راهنمــایی**": قوتابخانـەی ناوەنـدی. "**مدرســـــه عـــــالی**": قوتابخانـــەی بـــەرز، دامەزراوەیەك کە لەودا لە ئاستی لیسانس وانـە دەوترێتـەوە. "**مدرســه غیرانتفــاعی**": قوتابخانـەی تایبـەتی کـە بـەوەرگرتنی تازیـــاری لـــە وەزارەتـــی پـــەروەردە و فێرکـردن دادەمـەزریٚ و بـە وەرگرتنـی مانگانـە لـە قوتابیـان بـەڕێوە دەچـیٚ. "**مدرسه متوسطــه**": قوتابخانەی دواناوەندی.

**مدرسه رفته:** دەرس خوێندو و خوێندەوار.

**مدرسەرو:** قوتابی.

**مـــدرك:** (مَ.رَ) بەڵگـــە، شـــانەك، شـــانی، شانیك، نیشانە، دەلیل، نقیسك.

**مدرك:** (مُ.رِ) تێگـەیو، زیـرەك، زۆرزان، مەژودار.





**مـــدرن:** مـــودێڕن، پێـــشکەوتوو، نـــویٚ، تازەباو، ئیمڕۆیی.

**مدرنیتـــــه:** مودێڕنیتـــە، مـــودێڕنیتی، "مودێڕنیزم".

**مدرنیزاســیون:** مودێڕنیزاسیۆن، وەرگـرتن یان قبـووڵ کردنـی شـێواز و بڕواکـان یـان شێوازە نویٚ و مودێڕنەکان.

**مدرنیـــــست:** نوێخـــــواز، نووخـــــواز، مودێڕنیست.

**مدرنیستی:** نوێخوازانە.

**مدرنیسم:** نوێخوازی، نووخوازی، شـێوازی نویٚ، مودێڕنیزم.

**مدعوّ:** داوەت کراو، بانگ کراو، بانگهێشت کراو، گازیکری.

**مـــدّعی:** 1) ئیددیعاکـــەر. 2) لاف لێـــدەر، هاشەکەر، بەشات و شـووت. 3) پێـشمار، داواکار لە دادگا، خوازیار.

**مدعی‌العموم:** دادستان، داواکاری گشتی.

**مدعی به:** خوازراو، ئـەوەی کـە ئیـددیعای لەسەرە.

**مـــدعی علیـــه:** شـکایت لێکـراو، پاشمـار، داواکراو.

**مـــدفن:** گۆڕســـتان، قەبرســـتان، قـــەبران، شوێنی ناشتن.

**مـــدفون:** ژێـر خـاك کـراو، نـاژراو، بـە خـاك سپێراو، بن ئاخ کری.

**مدقّق:** وردبین، سەرنجدەر.

**مدگرایی:** مۆدخوازی، پێڕەویکردن لە مۆد.

**مــــدل:** (م.د) 1) مودێـــل. 2) شـــێوازی ئەنجامی کاریٚ.

**مدلّس:** خەڵك خەڵەتێن، فریودەر، کەسێك کـە عەیبـەکانی خـۆی یـان شمەکـەکانی بشارێتەوە.

**مدلّل:** ئەوەی بەبەڵگەوە بیٚ، سـەلمێنراو. "**مدلل کردن(داشتن)**": سەلماندن.

**مـــدلول:** 1) مانـــا، واتـــا. 2) (لۆژیـــك): تایبەتمەنـدی دیاردەیـەك کـە پیـشاندەری دیاردەیـــەکی تـــر بـــیٚ وەك ئـــەوەی کـــە دووکەڵ "دال" و ئاگر "مدلول"ە.

**مـدمغ:** 1) ڕەنـجـاو و ناڕەحـەت و مـۆن. 2) لەخۆڕازی، لەخۆبایی، بەدەمار، بەفیز، ڕۆح زل.

**مدنی:** شارستانی، مەدەنی، سیڤیل.

**مـدنیّت:** شارسـتانیبـوون، شارسـتانێتی، ژیاری.

**مـدوّر:** گرۆڤـەر، خـڕ، گورمـك، گولۆڤـەر، گلۆڤەر، گر، گردە، گلۆر، سەل، بازنـەیی، پێـــچکەیی. "**مـــدوّربـــودن**": گرۆڤـــەربوون، خڕبـوون. "**مـــدورکوچـــك**": گردیلـــە، گولـــو، گولۆك، گزموولە، خڕیلە، خڕی پچکۆڵە.

**مدوّن:** نووسراو، کۆنووس کراو، کـۆکراوە، داڕێژراو. "**مدون کردن**": 1) کۆنووس کـردن، داڕشتن. 2) تۆمارکردن، نووسین.

**مده:** بڕوانە: "مدت".

**مـدهش:** (مُ.هِ) سەرسـامکەر، سەرسووڕهێنەر، واق وڕکەر.

**مـــدهن کـــردن:** ڕۆن لێـــدان لـــە شـــتیٚ، چەورکردن.

**مدهوش:** 1) سەرگردان، سەرلێشێواو، واق وڕماو، سەرسووڕماو. 2) نهش، نەهش، بێهۆش، دڵ بووراوە. **"مدهوش شدن"**: 1) دڵ بوورین، لەخۆچوون، لەهۆش چوون، لەهۆش خۆچوون. 2) سەرلێشێوان، واقوڕمان.

**مدهون:** چەورکراو، ڕۆن لێدراو.

**مدیاتور:** بڕوانە: "میانجی".

**مدیحه:** بەندەهەلگوتن، پێداهەلگوتن.

**مدیحەسرا:** بەندبێژ، بێژەری شێعری پیاهەڵدان، ستایشکەر.

**مدید:** 1) درێژ. 2) کێشراو.

**مدیر:** بەڕێوەبەر، بگێڕ، کارگێڕ، فەرمانگێڕ، هەڵسووڕێن، هەڵسووڕێنەر، سەرپەرستی کاروبار. شیاو و بەتوانا لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکان دا. **"مدیر کل"**: بەڕێوەبەری گشتی.

**مدیریّت:** 1) بەڕێوەبەری، بەڕێوەبەرێتی، کارگێڕی. 2) بەڕێوەبردن. 3) توانایی، لێهاتوویی.

**مدیست:** مۆدساز.

**مدین:** بڕوانە:"بستانکار".

**مدینه:** شار. **"مدینه فاضله"**: کۆمەڵگای ئارمانی، یۆتۆپیا، بەهشتی سەرزەوی.

**مدیون:** بڕوانە: "بدهکار".

**مذاب:** تواوە، حەلیایی.

**مذاق:** 1) هەستی چێژپێکردن. 2) تام، چێژ. 3) زەوق، تەبع.

**مذاکره:** وتووێژ، گفتوگۆ، گوت و بێژ. **"مذاکره کردن درس"**: خستنەبەر باسی ئەو.

**مذاهب:** کۆی"مذهب".

**مذبح:** 1) کوشتارگە، قەسابخانە. 2) بڕوانە:"عبادت گاه".

**مذبذب:** 1) دوودڵ، دەردۆك، ڕاڕا، بەگومان، سەددڵ، وازوازی. 2) شوفار، دووزمان، دووڕوو.

**مذبوح:** 1) سەربڕاو، کوژراو. 2) بەهەوڵ و تەقالای زۆر و بێ‌فایدە.

**مذبوحانه:** سەرشۆڕانە، زەبوونانە، زەبوون ئاسا.

**مذکّر:** (مُ.ذَ.کَ) نێر، نێرینە.

**مذکّر:** (مُ.ذَ.کِ) 1) وەبیرهێنەوە، وەیادهێنەوە. 2) ئامۆژگاریکار، ئامۆژیار، مۆژیار، پەندێر، نسحەتکەر.

**مذکور:** 1) ناوبراو، باسکراو، ناڤ هاتی. 2) ناودار، بەناوبانگ. 3) نوسراو، وتراو.

**مذلّت:** نزمی، پەستی، زەبوونی.

**مذلل:** ملکەچ، ڕام.

**مذمّت:** زەم کردن، بەدبێژی، بەدگۆیی، خراپەوتن، خراوێژی. سەرزەنشت، لۆمە.

**مذموم:** 1) زەمکراو، سەرزەنشت کراو، لۆمەکراو. 2) ناحەز، ناپەسند.

**مذنب:** (مُ.نِ) گوناهکار، تاوانبار.

**مذنّب:** (مُ.ذَ.نَ) بڕوانە: "دنبالەدار".





**مذهب:** 1) ڕێوشوێنی ئایینی، ئایین. 2) هەرجۆر قوتابخانەیەکی فیکری یان بڕوایی، ڕێباز، ڕێبازگە، ڕێچکە، دیژە، ڕەوشت.

**مر:** (مَ) حیساو، ژمار، ژمارە.

**مرّ:** (مُ) تاڵ. توند.

**مرابحه:** 1) سپاردنی سەرمایە بە کەسێ یان دامەزراوەیەك لەباتی وەرگرتنی سوودی دیاریکراودا. 2) قازانج بردن، سوودبردن.

**مرآت:** کەڕەتەکان، چەلەکان.

**مراتب:** کۆی"مرتبە". پلەوپایەکان. **"مراتب اجتماعی"**: پلە(پێگە) کۆمەڵایەتییەکان. **"به مراتب"**: زۆر.

**مراتع:** کۆی"مرتع".

**مراثی:** کۆی"مرثیە".

**مراجع:** (مُ.جِ) 1) ژنێ کە دوای مەرگی مێردەکەی بگەڕێتەوە ماڵی کەسوکارەکەی. 2) کەسێ کە سەردانی شوێنێ یان کەسێك دەکا، سەردانکەر.

**مراجع:** (مَ) کۆی"مرجع". **"مراجع آسیاب"**: باراش هاڕ، باراش هێڕ. **"مراجع تقلید"**: زانایانی ئایینی کە خەڵك لە ئەرکە شەرعییەکان دا پێڕەوییان لێدەکەن.

**مراجعت:** 1) گەڕانەوە، ڤەگەڕیان. 2) پێداچوونەوە، چاوپیاخشاندنەوە. 3) تۆبەکردن.

**مراجعه:** 1) سەردان، چوون. 2) پرسیار و وڵام.

**مراحل:** کۆی"مرحله".

**مراد:** 1) مراز، نیازی دڵ، ئارەزووی دڵ، مراد، خواست. 2) مەبەست، ئامانج. 3) ئیرادە. **"مراد برآمدن"**: کامڕەوا و سەرکەوتن. **"مراد برداشتن"**: 1) بە مەبەست و مرازی دڵ گەیشتن. 2) ناهومێدبوون، هیوابڕان. **"مراد کسی را دادن"**: بەجێهێنانی خواست و ئاواتی ئەو. **"مراد یافتن"**: بە خواست و ئارەزوو گەیشتن، کامڕەوابوون. **"بر وفق مراد"**: بەپێی ویست و ئارەزوو.

**مراد بخش:** ئەوەی خواست و ئارەزووی کەسێکیتر وەدیدێنێ.

**مرادف:** 1) بڕوانە:"همسان". 2) هاوڕێز. 3) هاوواتا، هاومانا.

**مرارت:** 1) کوێرەوەری، چەرمەسەری، دژواری. 2) تاڵ بوون، تاڵی.

**مراس بربستن:** چارەدۆزیکردن.

**مراسله:** نامەنووسین بۆ یەکتر. نامە ناردن.

**مراسم:** ڕێوڕەسم، ڕێتواڵ. **"مراسم عزاداری حسینی"**: قەتڵ بڕینەوە.

**مراشد:** ڕێگەڕاستەکان.

**مراعات:** ئاگا لێ بوون، ئاگا لەیەك بوون، ڕاگرتن و پاراستنی شتێك، چاوەدێریکردن، ڕەچاوکردن.

**مراعی:** لەوەڕگەکان، جهێ چەرینا ئاژەلان.

**مراغه:** شوێنی خۆگەوزاندنی چوارپێیان. **"بی خاك مراغه کردن"**: بەبێ بیانوو مەبەست

و نیازی خۆ جێبەجێکردن(چ بگا بەوەی بیانوویەك لەدەست دابیێ).

**مرافعت کردن:** دادخوازیکردن بە نووسینی نامە و ناردن یان دانی نامەکە.

**مرافعە:** دەگەڵ یەك دوژمنایەتی و تێکهەڵچوون و دمبەدمە هەبوون. 2) ئیددیعا و شکایەتێ کە لە لای دادوەر یان لە دادگادا دەخرێتەروو. 3) یەکلاکردنەوەی کێشە لەلای دادوەر یان لە دادگادا. "**مرافعەداشتن**": ناکۆکی و دمبەدمە و دوژمنایەتی هەبوون.

**مرافق:** ئەو شتانەی کە قازانجی لێدەبەن. 2) ئامرازی ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی.

**مرافقت:** بوونە هەواڵ، بوونە هاوڕێ و هاوسەفەر، هاوڕێیەتی، دەگەڵدابوون.

**مراقب:** چاوێر، چاوەدێر، چاودێر، چاڤێر، کەتوان، نهێرتۆك، سەخبیر، هەڤچاڤ، ئاگادار، نگابان، زێرەڤان.

**مراقبت(کردن):** چاوەدێری، (خستنەژێر)چاودێری، چاڤێری، ئاگالێ بوون، حەوان، خۆدیکردن، سەرپەرشتی، خەمخۆری، کەتوانە، کەتوانی، هەڤچاڤی. دیدەوانی، نگابانی، (ئابووری) هاوچاویکردن. "**مراقبت های ویژە**": "ئای.سی.یو".

**مراکز:** کۆی"مرکز".

**مرام:** 1) ئیدئۆلۆژی. 2) دۆز، مەرام، ڕێبیر، کاربەند، مەبەست لە ژیان، ئارمانج، ئامانج، خواست.

**مرامات:** ئامانجەکان، مەبەستەکان .

**مران:** لەنەمان، بەرەونەمان .

**مراوده:** 1) ویستن، خوازتن. 2) دەگەڵ یەك تێکەڵی و هاتوچۆ هەبوون.

**مراهق:** هەرزەکار، تازەپێگەیشتوو.

**مراهنه:** بەگرێودانانی شتێ.

**مرايات:** ڕیاکاری، ڕیابازی، ڕووبینی.

**مرائی:** خۆنوێن، ڕیاباز، ڕووبین.

**مربّع:** چوارچمك، چوارگۆشە. "**مربع کردن**": (بیرکاری) لێکدانی ژمارەیەك لە خۆی. "**مربع نشستن**": چوارمەشقە دانیشتن.

**مربوبیّت:** بەندەیی، ملکەچی.

**مربوط:** پەیوەست، پەیوەند(ی)."**مربوط به**": سەربە، لە پێوەندی، پێوەندی بە، سەبارەت بە....

**مربّی:** فێرکەر، ڕاهێن، ڕاهێنەر، هەڤۆتکار، پەروەردەکار.

**مربی گری:** ڕاهێنەری، فێرکاری.

**مرتاح:** ئاسوودە.

**مرتاض:** چلەکێش، کەسێك کە بۆ پاك کردنەوەی دەروون ڕەنج و سەختی دەکێشێ.

**مرتّب:** بەرێوشوێن، تەکوز، تەکوویز، تەکوویس، ڕێکوپێك، نەشێواو، لەبار و بێکەمایەسی. "**مرتب کردن**": 1) ڕێکوپێك کردن، تەکووزکردن. 2) ڕازاندنەوە، خەملاندن. 3) بڕوانە:"تدوین". "**نامرتب**": نەتەکووز، تێکەڵ و پێکەڵ، ناڕێکوپێك، شێویاگ، شلوشەوێق.





**مرتّباً:** پەیتاپەیتا، پەستاپەستا، بێپسانەوە، بەردەوام، زووزوو.

**مرتبط:** ئەوەی پێوەندی بە کەسێك یان شتێکیترەوە هەیە، پێوەندیدار، گرێدایی.

**مرتبه:** 1) پلە، پایە. 2) پۆست، پێگە. 3) جار، کەڕەت. 4) نهۆم، قات.

**مرتجع:** کۆنەپەرست، کەللەکۆن، کۆن پارێز، کۆنەپارێز، کۆنەپەسند، کەسێ کە بە تازەداهاتوان ڕازی نیە، دژی نوێخواز.

**مرتجل:** شێعر یان قسەیەك کە بەبێ ڕامان و بیرکردنەوە بوترێ.

**مرتجی:** هیوادار، بەهومێد، بەهیوا، ب هێڤی، هێویدار.

**مرتد:** هەڵگەڕاوە، هەڵگەڕیاگ، هەلگەریایی، وەرگەڕاوە، لاداو لە دین. "**مرتد شدن**": هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام و واز لە موسڵمانەتی هێنان. "**مرتد فطری**": ئەوەی لە دایك و بابی موسڵمان لە دایك بووە و خۆشی موسڵمان بووە و دوایە لە ئاییني ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە. "**مرتد کردن**": هەڵگەڕاندنەوە لە ئیسلام، لە دین دەرکردن.

**مرتدع:** خۆبوێر لە ئەنجامی کارێ.

**مرتشی:** بەرتیل خۆر.

**مرتع:** چایەر، جیلەوەڕ، لەوەڕگە، لەوەڕگا، باسەرە، گیاجاڕ، چێری، کۆز، مەرگە، گۆڕان، مێرگ و بژوێن.

"**مرتع اختصاصی**": مەخەڵ، لەوەڕگەی تایبەتی. "**مرتع تابستانی**": هاڤینەچەڕ، لەوەڕگەی پووش و پار، درانگ.

**مرتعب:** ترساو، ترس هێنەر، ترسێنەر.

**مرتعش:** لەرزۆك، لەرۆك.

**مرتفع:** 1) سەماك، تیرەگە، زۆربەرزو بڵند، درێژایی لە بەرزاییدا. 2) لابراو، وەلانراو. 3) بەنرخ، گرانبایی. "**مرتفع شدن**": 1) لە بەین چوون. 2) بەرزبوونەوە، چوونەبان. 3) لابران، چارەسەربوون، ڕەوینەوە. "**مرتفع کردن**": لابردن، لەبەین بردن. "**بسیار مرتفع**": کومبەت، هەرەبەرز.

**مرتکب:** دەستبەر بۆ کارێك، هەنگاونەر بۆ ئیشێك، کەسێك کە کارێك ئەنجام بدا یان گوناهێك بکات. "**مرتکب شدن**": تووشبوون، گیرۆدەبوون، ئەنجامدانی کارێ بەتایبەتی کاری خراو و نەشیاو.

**مرتهب:** بڕوانە:"ترسناك".

**مرتهن:** بارمتە.

**مرثیه:** 1) دورك، شین، شیوەن، شین و شەپۆڕ، شین و ڕۆڕۆ. 2) شین نامە، شیوەن نامە، بەمردوو هەڵگوتن. 3) بڕوانە: "عزاداری". "**مرثیه کسی را خواندن**": چاوەڕێ یان ئارەزووی تیاچوونی ئەو کردن.

**مرثیه خوان:** شین گێڕ، پرسەگێڕ، لاوێنەوەی مردوو بە بەندوباو.

**مرثیەسرا(ی):** شاعیرێ کە بەندوباو بە مردوودا هەڵدەدڵێ.

**مرج:** 1) بڕوانە:"هرج و مرج". 2) مێرگ و بژوێن، لەوەڕگە.

**مرجح:** لەسەرتر دانراو.

**مرجع:** 1) شوێنی گەڕانەوە، شوێنی سەردانەوە. 2) سەرچاوە، ژێدەر، چاڤکانی.

**مرجو:** هیوادار، بەهیوا، ب هێڤی.

**مرجوح آمدن:** شکست خواردن، تێکشکان.

**مرجوع:** گەڕێنراوە. **"مرجوع داشتن":** 1) گەڕاندنەوە، وێدانەوە. 2) پیٚسپاردن. **"مرجوع شدن":** 1) گەڕێنرانەوە، وێدرانەوە. 2) پیٚسپێران. **"مرجوع کردن":** گەڕاندنەوە، دانەوە.

**مرجوم:** نفرەلێکراو، بەنەحلەت کراو، تووك لێکراو، ڕادراو، بەردەباران کراو.

**مرح:** شادمانی و خۆشحاڵی فرە.

**مرحله:** 1) قۆناغ، پلە، ماوە. 2) ماڵ. **"از مرحله پرت بودن (دور افتادن)":** بیٚخەبەربوون لە کارێ یان لە بابەتێ، شووت بوون.

**مرحمت:** بەزەیی، دلۆڤانی، ئاوڕ وەسەردانەوە.

**مرحوم:** خوالێخۆشبوو، کۆچکردوو، ڕەحمەتی، مردوو.

**مرخشه:** دۆبڕ، قەشان، بیٚفەڕ.

**مرخَص:** ئیزن دراو، ئیجازەدراو، ڕێگەدراو.

**مرخم:** (ڕێزمان) وشەیەك کە لە ئاخرەوە پیت یان پیت گەلێکی لێکرتابیٚ. **"مصدر مرخم":** چاوگەی کرتاو(قرتاو).

**مرد:** 1) مرۆی نێرینە، پیاو، پیاگ. 2) شوو، مێرد، هاوسەری ژن. 3) مرۆ بەشێوەی گشتی، کەس. 4) جوامێر، مێرخاس. 5) نێرینەیەك کە توانایی کرداری سێکسی هەبیٚ. 6) ئازا، بوێر، پاڵەوان. 7) عارفی تەواو. 8) نێردراو، مەئموور، دانراو. **"مردان راه (ره)":** عارفەکان. **"مردان کار":** شەڕکەران. **"مردان مرد":** بوێران، پیاوانی ئازا. **"مرد حق(خدا)":** عارف، مرۆی کامڵ. **"مردزن نما":** سەرژنانە، ژنانیلە، ژنانیلیٚ، ژنانی، ژنەڕەنگە، ئاڵی پیواز، یۆسف ئەفەندی، قالەژنانی، بلەکناچی، ئاریلە، سەرەژنك. **"مرد شدن":** 1) بوونە پیاو، گەورە و ئاقڵ بوون. 2) بوونە خاوەنی پێگە و پۆست. **"مرد کار":** 1) پیاوی کارا و چالاك. 2) نیزامی، سپایی. **"مرد گرفتن":** هاوسەر هەڵبژاردن. **"مرد مردانه":** بوێرانە و ئازایانە. **"مرد میدان":** 1) خەنیم، هاوتا. 2) شیاوی کارێ یان ئامادە بۆ ئەو کارە. 3) پیاوی مەیدان، کوڕی ڕۆژ، جێگەی هومێد و هانا.

**مرداب:** گەبەڵ، گەنداو، گەناو، زەلکاو، تالاو، قۆپی، مرداو، مردواو. هاتنە پێشی ئاوی دەریا لە وشکاییدا.

**مرداد:** مانگی گەلاوێژ، نێوەڕاست مانگی هاوین.





**مردار:** 1) تۆپیو، تۆپیگ، مردارەوەبووگ، مردارەوەبوو، مندارەوەبوو، سەقەت، سەکەت. 2) گڵاو، پیس. **"مردار دنیا(دنیوی)":** ماڵ و سامان. **"مردارشدن":** تۆپان، تۆپین، مرداربوونەوە، مردارەوەبوون، منداربوونەوە، فەتین، جهمین، کەوتین، سەقەت بوو. **"مردارکردن":** تۆپاندن، تۆپانن، کەوتاندن، سەقەت کردن، مردارکردن، مردارکردنەوە، ماراندنی ئاژەڵ بیٚ سەربڕین.

**مردارخوار:** 1) لاشخۆر، هەر بوونەوەریٚ کە ئاژەڵی تۆپیو بخوا. 2) بەرخۆر.

**مردافکن:** 1) ئەوەی پیاوان بە زەویدا دەدا و دەیانبەزێنیٚ. 2) بەهێز، خورت، بەتاقەت. 2) ئەوەی دەبێتە هۆی مەستی زۆر. 4) ئەوەی پیاو سست دەکا و لەپێی دەخا.

**مردانداز:** 1) گرفتارکەر. 2) بڕوانە: "مردافکن(3)".

**مردانگی:** پیاوەتی، پیاگەتی، مێرانی، مێراتی، مێریتی، مێرێنی، قەنجانی، مەردایەتی، مەردازایی، کاری مەردانە، جوامێری، جامێری، چاکە، غیرەت.

**مردانه:** 1) پیاوانە، مەردومەردانە، مێرانە، مێرەکی. 2) شیاوی پیاوان، پیاوانە. 3) وەك پیاوان، پیاوانە. 4) لە ڕووی مەردایەتییەوە، ئازایانە.

**مرداوژن:** بڕوانە:"مردافکن(1،2)".

**مردبندی:** ڕاگرتنی وزەی سێکسی پیاو بە سێحر تا نەتوانیٚ ژن بێنیٚ.

**مردَد:** دڕدۆنگ، دوودڵ، ڕاڕایی، سەرگەردان.

**مردرنگ:** جوامێر، ئازا.

**مردسالاری:** (کۆمەڵناسی) پیاو سالاری.

**مردك:** مێردەك، بۆرەپیاو، بۆرەپیاگ.

**مردگی:** مردوویی، مردوبوون.

**مردم آزار:** ستەمکار، زاڵم، بیٚبەزەیی، خەڵك ئازار، ئازاردەری خەڵك، بەئازار و بەدکار، زیانەخورۆ، گورگی هار.

**مردم آمیز:** هاونشین و تێکەڵ.

**مردم افکن:** بەهێز و بەقەوەت.

**مردم بەدور:** بڕوانە:"مردم گریز".

**مردم پسند:** خەڵك پەسند.

**مردمحور:** نێرتەوەر، پیاوتەوەر. **"مردمحوری":** نێرتەوەری، پیاوتەوەری.

**مردم خوار:** 1) ئەوەی لە گۆشتی مرۆڤ دەخوا. 2) دڕندە و خوێن خۆر.

**مردم دار:** بەئاکار، ئاکارچاك، خۆش ڕەفتار.

**مردم ربا:** 1) خەڵك ڕفێن. 2) هێزان، بەهێز.

**مردم رنگ کن:** خەڵەتێن، فریودەر.

**مردمسار:** خەڵك ئاسا، مرۆڤ ئاسا. خاوەنی سروشتی ئینسانی.

**مردم سالاری:** خەڵك سالاری، دیمۆکراسی.

**مردم سالاریار:** جێگری سەرۆك کۆمار.

**مردم ستانی:** خۆش ڕەفتار بوون دەگەڵ خەڵك.

**مردم سنجی:** زانست و شێوەی ئەندازەگرتنی لەشی مرۆ لەباری ڕەهەند و ڕێژەکانەوە.

**مردم شناسی:** خەڵك ناسی، "ئەنترۆپۆلۆژی".

**مردمك:** گلارە، گلێنە، گللـی، گوللی، ڕەشکێنە، بیلبیلە، گزینگ.

**مردم کش:** بڕوانە: "قاتل".

**مردمگان:** نەتەوە.

**مردمگانی:** نەتەوەیی.

**مردم گریز:** ئەوەی دەگەڵ خەڵك تێکەڵ نابێ و لێیان تەریك دەبێتەوە، خەڵك بێز.

**مردم گزا:** 1) ئەوەی بە خەڵکەوە دەدا. 2) خەڵك ئازار، ستەمکار.

**مردم نژاد:** ئەوەی لە نەژادی ئینسانە، مرۆڤـ.

**مردم نشین:** ئاوەدان.

**مردم نگاری:** ڕشتەیەکی زانستییە کە موتاڵای فەرهەنگە سەرەتاییەکان دەکا.

**مردم نواز:** خەڵك لاوێنەوە، خەڵك خۆشەویست، دلۆڤان سەبارەت بە خەڵکی.

**مردمه:** بڕوانە: "مردمك".

**مردمی:** 1) جەماوەری، خەڵکی. 2) مرۆڤایەتی، مرۆڤانی، مرۆگی، پیاوەتی، مەردایەتی. 3) فولکلۆریك. "**مردمی شدن جایی**": گونجانی ئەو شوێنە دەگەڵ داخوازییەکانی خەڵکی. "**مردمی کردن**": 1) پیاوەتی کردن، مەردایەتیکردن. 2) دلۆڤانیکردن.

**مردن:** 1) مردن، ڕۆح کێشان، گیان کەندن، تیاچوون، سەرنانەوە، هاتنەلا، هەڵ پلۆسکان، گاندایش، گان ڤەتش، ماردش، بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "جان دادن". 2) کووژانەوە، دامرکان. "**برای کسی (چیزی) مردن**": هۆگری زۆر بۆ ئەو هەبوون.

**مردنی:** لەنەمان، بەرەونەمان، نزیك بە مردن، جووقن، جیقن، لاوازی بێهێز.

**مردود:** 1) ڕەدبۆوە، قبووڵ نەکراو. 2) ڕادراو، دەرکراو. "**مردود آمدن**": ڕادران، دەرکران. "**مردود شدن**": 1) ڕەدبوونەوە، نمرەی قبووڵی نەهێنان. 2) دەرکران. "**مردود کردن**": ڕەدکردنەوە، قبووڵ نەکردن لە تاقیکاریدا.

**مردودی:** ڕەدبۆوە(لە تاقیکاریدا)، دەرنەچوو.

**مرده:** 1) مردوو، مردگ، مریك، مەردا، مەردە، مەردەی، مەردش، گیان تیانەماو. 2) بێ هەست و جووڵە. 3) بێ هەست و شەوق. 4) تاریك و لێڵ (رنگ مرده). 5) کۆن و لەبیرچۆوە(زبان های مرده). 6) بڕوانە: "خاموش". 7) ڕەوانەکراو. 8) تەسلیم، بێ ئیختیار. 9) ئاشق. 10) وشك، بووره. "**مرده باد**": بمرێ، بکەوێ، یوهـ کەردش. "**مرده چیزی (کسی) بودن**": زۆر هۆگری ئەو بوون. "**مرده متحرك**": زۆر لاواز بێ هێز یان بێ ئیرادە و لە حاڵەتی ملداندا. "**مرده من زنده تو**": من مردوو و تۆ زیندوو.





**مردەبازی درآوردن:** خۆ لە مردن دان.

**مردەدل:** خەمبار، بێحاڵ، مات و کز.

**مردەریگ:** 1) میرات، کەلەپوور. 2) کەم نرخ، پەست و نزم. 3) بڕوانە: "وارث".

**مردەسان:** مەردەکی، وەك مردوو، مردووئاسا.

**مردەسوزی:** سووتاندنی تەرمی مردووەکان.

**مردەشو/شور:** مردووشۆر.

**مردەکش:** مردووبەر، مردووڕاگوێز.

**مردی:** 1) پیاوبوون، پیاوەتی. 2) جوامێری، پیاوەتی. 3) ئازایەتی، بوێری. 4) ڕاوەستاوی، خۆڕاگری. 5) ئەندامی جووت بوونی پیاو. 6) وزەی سێکسی. "**مردی کردن**": پیاوەتیکردن. ئازایەتی و بوێری نیشان دان. "**از مردی افتادن**": لە پیاوەتی کەوتن، لە دەست دانی وزەی سێکسی. "**به مردی رسیدن**": پێگەیشتن، باڵق بوون.

**مرز:** سنوور، سینۆر، سەرحەد، سەرخەت، کەوشەن، تاڵغ، کەرخ، تخوب، توخوب، تخوم. "**مرزوبوم**": وڵات، سەرزەوینی جێگەی ژیان. "**مرزی**": سەرسنوور.

**مرزبان:** 1) سنووڕپارێز، پارێزەری سنوور، کێشکچی سنوور. 2) دەسەڵاتداری ناوچەیەکی وڵات. 3) شەرکەر، پاڵەوان. 4) نگابان.

**مرزبانی:** 1) سنووڕپارێزی. 2) حکوومەت، دەسەڵاتدارەتی.

**مرزبندی:** سنووربەندی، دیاریکردنی سنوور.

**مرزداری:** 1) (کشتوکاڵی) دابەشینی زەوی زەرعاتی بە پارچەگەلێ. 2) پاسەوانی لە سنوور، سنووڕپارێزی.

**مرزش:** نهاندن، ئیلاقەکردن، هاونوێن بوون دەگەڵ ژن.

**مرزکشی:** بڕوانە: "مرزبندی(1)".

**مرزنده:** گانکەر، ئیلاقەکەر.

**مرزوق:** 1) ڕزق و ڕۆزی پێدراو. 2) بەهرەمەند.

**مرزیدن:** 1) بڕوانە: "لمس کردن". 2) لێك جووت بوونی ژن و پیاو، نێزیکی، گان کردن، ئیلاقەکردن.

**مرسل:** (مُ.سَ) 1) ناردراو، نێردراو، ڕەوانەکراو. 2) سادە، ڕەوان(نثر مرسل).

**مرسل:** (مُ.سِ) نێرەر، ڕەوانەکەر.

**مرسول:** 1) ناردراو، ڕەوانەکراو. 2) نامە.

**مرسولات:** ناردراوەکان، نێردراوەکان.

**مرسوم:** 1) باو. 2) جیرە.

**مرش:** (مَ) 1) ڕووشاندن، ڕووکاندن. 2) ڕووش، ڕووك.

**مرشح:** 1) پەروەردەکراو. 2) پاڵێوراو. "**چیزی را مرشح گشتن**": گەیشتن بەو.

**مرشد:** 1) پیر(ی تەریقەت)، ڕابەر. 2) ڕێ نیشاندەر، ڕێنوێن.

**مرصاد:** نێرەگە، ڕوانگە، کەمینگە.

**مرصد:** ڕوانگە، جێگەیەك كە لێیەوە دەڕوانن.

**مرصّع:** گەوهەر نیشان، گەوهەردار.

**مرصع خوانی:** 1) وتنی قسەگەلی ڕەوان و ڕازاوە. 2) پێشەكی‌كێشان بۆ قسە كردن.

**مرض:** بڕوانە: "بیماری". "**مرض داشتن**": نەخۆش بوون. "**مرض قند**": شەكرمز، نەخۆشی شەكرە، دیابێت. "**مرض مقاربتی**": (پزیشكی) نەخۆشییەك كە لە ئەنجامی جووت بوون دا دەردەكەوێ.

**مرطوب:** شێدار، شەدار، شەهدار، نمدار، هوتن، هیت، تەڕ.

**مرعوب:** ترساو، ترسیاو، زەندق چوو، وازرە.

**مرغ دل:** بڕوانە: "ترسو".

**مرغزار:** گیاجاڕ، مێرگ و گیاجاڕ، سەوزەلانی، چیمەن.

**مرغوب:** بەڕمێن، پەسند، تازە، ڕووبازاڕی، زۆرباش.

**مرفوع:** 1) هەلگیراو، هەلێنراو، بەرزكراوە. 2) لەبەین چوو. 3) وشەی عەرەبی كە پیتی كۆتاییەكەی "بۆر"ی گرتبێ.

**مرفه:** پڕوپۆشتە، پۆشتەوپەرداخ، تەڕپۆش، خۆش بژیو، حاڵ خۆش، سازوتەیار، تێروتەسەل، كۆك، ئاسوودە.

**مرقد:** 1) خزن، قسن، گڵكۆ. 2) خەوگە، جێی خەو و ئاسوودەبوون. 3) بڕوانە: "تابوت".

**مرقّع:** 1) ئالبۆمی خەت و نیگاركێشی و شتی وا. 2) كاغزی خۆش نووسی. 3) پینەدار، پڕپینە.

**مرقوم:** نووسراو(ە)، هێڵدار. "**مرقوم داشتن**": نووسین.

**مركّب:** (مُ رَ كَ) 1) گیراوە، تێكەڵاو، لێكدراو. 2) پێكهاتوو. 3) جەوهەر. 4) (ڕێزمان) لێكدراو. "**اسم مركب**": (ڕێزمان) ناوی لێكدراو. "**مصدر مركب**": (ڕێزمان) چاوگەی لێكدراو.

**مركّبات:** 1) لێكدراوەكان، تێكەڵ كراوەكان. 2) مزرەمەنی وەك پرتەقاڵ و لیمۆ و هتد.

**مركز:** 1) ناوەند، ناوەڕاست، كوڕەك، چەق، جەرگە، وەردێنك، هەلێر، مۆنە. 2) شوێنی نیشتەجێبوونی ڕاژۆر یان دەسەڵاتدار، پێگە، مەڵبەند، گلێرگە. 3) شوێن، جێگە. 4) جیهان، دنیا. "**مركز اجتماع**": جڤینگە، جێگەی كۆبوونەوە. "**مركز اغبر (خاك، خاكی، غبرا)**": گۆی زەوی. "**مركز ثقل**": 1) چەقی قورسایی. 2) جێگەی سەرەكی و گرینگی شتێ.

**مركزگرا:** چەقخواز، ناوەندخواز.

**مركزگرایی:** چەقخوازی، ناوەندگەرێتی، سانترالیزم.

**مركزگریز:** چەقبێز، ناوەندبێز.

**مركزی:** ناوەندی، ناوەنگی، شتێ كە لە ناوڕاست دا بێ. "**لامركزی**": ناناوەندێتی.





**مركزیّت:** 1) ناوەندێتی، چەقێتی، جێگیربوون لە ناوەنددا، بە ناوەندی بوون. 2) ڕێبەری.

**مركوب:** هەر شتێ كە مرۆڤ سواری ببێ وەك ئەسپ و ماین و هێستر.

**مركوز:** جێگیر و دامەزراو، جێگرتوو.

**مرگ:** مەرگ، مردن، مەردەنە. "**مرگ آمدن كسی را**": بەكۆتایی گەیشتنی ژیانی ئەو، مردنی ئەو. "**مرگ بەسر درآمدن**": گەیشتنی كاتی مەرگ. "**مرگ مفاجا (مفاجات)**": دڵ وەستان، مردنی كتوپڕ. "**مرگ نداشتن چیزی**": زۆر خۆڕاگر و بەدەوام بوونی ئەو. "**مرگ نو مبارك باد**": كاتێ دەوترێ كە ئاژاوەیەكی تازە سەرهەڵبدا. "**مرگ ومیر**": قڕان، قڕكردن، قڕپیۆوەربوون، قڕتێكەوتن، قڕهاتن، مردنی بە كۆمەڵ، نەخۆشی گشتی. "**مرگ و میر گاوها**": گاقڕ، گاقڕان. "**میان مرگ و زندگی**": مەرگوژی، لە نێوان مان و نەماندا.

**مرگ آور:** مەرگ هێن.

**مرگ ارزانی:** مەحكووم بە لە سێدارەدان.

**مرگامرگ:** مردنی بەكۆمەڵ، قڕتێكەوتن.

**مرگبار:** 1) مەرگ هێن، ئەوەی دەبێتە هۆی مەرگ. 2) ترسناك، خۆف هێن.

**مرگ بدسگال:** مردنی ناخۆشەویست، سلساردبوونەوە، سلسەردەوبوون.

**مرگی:** 1) مەرگ، مردن. 2) مەرگی گشتگیر بەهۆی پەرەسەندنی قاتوقڕی و نەخۆشی، قڕپێ وەربوون.

**مرمت:** سازكردنەوەی ڕووخاو یان دڕاو، نووژەن، پینەوپەڕۆ، هەندو، كەڵتە، دەمەزەرد، گوندەڵبەست، گونەڵبەست. "**مرمت شدن**": تازەبوونەوە، نووژەن بوونەوە، چاك بوونەوە، كۆنی دەسكاریكراو. "**مرمت كردن**": چاكردنەوە، چاك كردنەوە، گوندەڵبەست، نوێكردنەوە، نووژەنكردنەوە، كەڵتەكردنەوە، دروستكردنەوەی خراوبووگ، سەركرن، دەمەزەردكردنەوە.

**مرموز:** گوماناوی، نهێنیئامێز، ڕەمزاوی.

**مرموق:** جێی سەرنج. "**مرموق شدن**": سەرنج پێدران.

**مروّت:** جوامێری، مێرخاسی، پیاوەتی، مێرانی، مێریتی، دڵنەرمی. "**مروت كردن**": بە ئینسافەوە هەڵسوكەوت كردن.

**مروّج:** وەبرەوخەر، برەوپێدەر، وەڕمێن خەر.

**مرور:** 1) پێداچوونەوە، كورتە پێداچوونەوە، چاوپیاخشاندن، ڕوانینی سەرپێیی. 2) هاتوچۆ، تێپەڕبوون، تێپەڕین.

**مروسیدن:** ڕەنج كێشان لە كارێكدا یان بۆ شتێك، بە سەختی كار كردن. خووگرتن بە شتێك.

**مروّع:** ترساو، ترس ڕێنیشتوو، تووشی ترس هاتوو.

**مروّق:** پالێوراو، لە سافیدراو، پارزین كری.

**مرویّ:** ڕەوایەت کراو.

**مره:** 1) جار، چەل، کەڕەت. 2) ژمارە. 3) ڕیٚ. "**مرەبەمره**": بڕوانە: "اندك اندك".

**مرهم:** چرك، مەرهەم، مەڵحەم، مەلەم، هەتوان، ئەتوان، دەرمانی تیٚهەڵسوان. سوكناییدەر. "**مرهم پذیرفتن**": چارەبوون، تیمار بوون/كران. "**مرهم كردن**": 1) ئامادەكردنی مەڵحەم. 2) دەرمانكردن، تیماركردن. "**مرهم گذاشتن (نهادن)**": مەڵحەم لەسەر برین دانان. "**مرهم نهادن بر دل (خاطر،...)**": سوكنایی پیٚداهیٚنان، هیٚمنایی پیٚداهیٚنان.

**مرهم مالی:** مەڵحەم تیٚ هەڵساوین.

**مرهون:** بارمتە، (لە) گریٚو، بە ئەمانەت دانراو.

**مرهونیّت:** لەگریٚودابوون.

**مری:** سوریٚنچك.

**مرید:** (مُ.رِ) 1) مرید، تۆبەكاری سەر دەستی شیٚخ. 2) بڕوانە: "علاقەمند". 3) لە ناو و سفەتەكانی خوا، ئیرادەكەر.

**مرید:** (مَ.رِ) سەركیٚش، یاغی.

**مریض:** بڕوانە: "بیمار".

**مرئوس:** ژیٚردەست، ئەوەی پیٚڕەوی لە سەرۆك دەكا.

**مرئی:** دیار، بەرچاو، ئەوەی بەچاو دەبینریٚ.

**مزّ:** (مُ) ترش و شیرین، مەیخۆش.

**مزاج:** سرشت، خوو، تەبیات، حاڵەتی سروشتی لەش. تایبەتمەندییەكانی ڕۆحی و جەستەیی. "**مزاج پذیرفتن**": حەلبوون، ئاویٚتەبوون. "**مزاج كسی شیرخشتی بودن**": نیٚربازبوونی ئەو. "**مزاج كسی (را) نگاه داشتن**": بەپیٚی ویست و مەیلی ئەو قسەكردن و هەڵسوكەوت كردن. "**به مزاج كسی ساختن**": دەگەڵ تەبعی ئەو هاتنەوە.

**مزاج دانی:** ئاگاداربوون لەگەڵ خوو و سرشتی خۆ یان كەسیدی.

**مزاج گویی:** بەپیٚی تەبع و مەیلی ئەو قسەكردن، زمان لووسیكردن.

**مزاج گیر:** شویٚن دانانەسەر كەسیٚك، كارتیٚكەر.

**مزاح:** (مُ) 1) لادراو، دوورخراوە. 2) شۆخی، قەشمەری، حەنەك.

**مزاح:** (مِ) گاڵتە، گەمە، حەنەك، شۆخی، لەق.

**مزاحم:** دەست هەڵنەگر، بەمل داهاتوو، سنگ داكوتاو، لە كۆڵ نەبۆوە، تەنگ هەڵچن، سەربار، خویٚنتاڵ، زەحمەت پیٚدەر، ئازاردەر. "**مزاحم گرانجان**": زەچ، سپڵی لاورگ، ڕەزاگرانی دەست هەڵنەگر، خویٚنتاڵی خۆنزیك كەر.

**مزاحمت:** سنگ داكوتان، زەلانەوە، لە كۆڵ نەبوونەوە، تەنگ پیٚهەڵچنین، خۆ بە سەر خەڵك داسەپاندن بۆ خواردن و نووستن، بەسەرداكەوتن، زەحمەت.

**مزاد:** 1) هەڕاج، مەزات، فرۆشتنی بە





جاڕدان كە هەر كەس زیاتری بدا بۆ ئەو بیٚ. 2) زیادی. "**مزاد كردن چیزی**": بردنەسەری نرخی ئەو شتە. "**در مزاد دادن**": خستنە مەزاتەوە.

**مزار:** 1) شویٚنی زیارەت، زیارەتگا، چاك و پیر، قسن، مەرزەڵ. 2) گۆڕ، گڵكۆ، قەبر. "**مزار متبركه**": بڕوانە: "امامزادە".

**مزارستان:** بڕوانە: "گورستان".

**مزارع:** كۆی "مزرعە".

**مزارعه:** نەزمی شەریكەبەشی، وەرزیٚری هاوبەش بە پیٚی گریٚبەستی دیاریكراو.

**مزاوجت:** دەگەڵ یەك جووت بوون، هاوجیٚیی، پیٚكهیٚنانی ژیانی هاوبەش.

**مزاولت:** پرۆڤەكردن، ڕاهیٚنان.

**مزایا:** كۆی "مزیّت".

**مزایده:** هەڕاج، مەزات، زۆرگری.

**مزبور:** نووسراو، نووسراوە، ئاماژەپیٚكراو، ناوبراو، ناوهاتوو.

**مزج:** تیٚكەڵ كردن، ئاویٚتەكردن.

**مزخرف:** 1) ڕازاوە بە شت گەلی خەڵەتیٚنەر. 2) پووچ و بیٚنرخ. 3) قسەی هەڵیت و پڵیت/ هەللەق مەللەق و بیٚبناغە، قسەی قۆڕ. "**مزخرف باختن**": پەیتاپەیتا قسەی قۆڕ و بیٚ مانا وتن.

**مزخرفات:** 1) قسەگەلی قۆڕ و بیٚ بناغە. 2) شت گەلی بیٚ نرخ. 3) جوانییە ڕواڵەتییەكان.

**مزد:** 1) هەق، هەقدەست، هاقە، كریٚ، كرا، كراهە، ماجو، مز، مزە، ئاوان، پاداشت. 2) بڕوانە: "صدقە". "**مزد آسیا**": ئاشانە. "**مزدآسیابان**": ئاواناش، مزاش. "**مزد بردن**": 1) هەقدەست وەرگرتن. 2) پاداشت وەرگرتن. "**مزدچوپانی**": شوانانە، مزی شوان. "**مزد حمالی**": هەمالیا، مزی حەممالی. "**مزد دعانویس**": سەرقەڵەمانە، ولفەت، ولیٚفەت، ولیٚفەتانە. "**مزددلال**": دەلاڵی، مزی دەلاڵ. "**مزددلالی**": دەلاڵانە، دەست بوها، مزی دەلاڵیكردن. "**مزدعسس**": شەڤانە. "**مزدماهیانه**": مانگانە. "**مزددهنده**": مزدە، مزدەر. "**مزد میراب**": حەوزانە، پیتاكی میراو. "**مزد نقدی**": وشكەسی، وشكەمز، وشكەمس، هشكەمز، ئیشكەمز، ئیشكەمس، ویشكە. "**به مزد دادن**": بەكریٚدان. "**به مزدگرفتن**": بەكریٚگرتن. "**بی مزد و منّت**": بیٚ بەر، بیٚ فایدە.

**مزدا:** 1) ئافریٚنەر، زانای بیٚ هاوتا. 2) ئەهورامەزدا.

**مزدبگیر:** مزیار، مزبەر.

**مزدمند:** شیاوی پاداشت.

**مزدوج:** جووت، دوانە.

**مزدور:** 1) كریٚ گرتە، بەكریٚگیراو، مزی، مزیار، مزبەر. 2) جاش، بەكریٚگیراو. 3) خزمەتكار. 4) كریكار. 5) نگابان، مەئموور.

**مزدیسن:** مەزداپەرست، زەردەشتی.

**مزدیسنی:** زەردەشتی. "مزدیستی"شی پیٚ دەڵیٚن.

**مزرعه:** زەوی، مەزرا، ، مەزرە، کێڵگە، هیگا، هێگا.

**مزعج:** وەڕەزکەر، جاڕزکەر، هەراسانکار.

**مزقان:** 1) moorزیک. 2) ئامێری مۆسیقا. "**مزقان برای کسی کوک کردن**": پیلان گێڕان دژی ئەو، نەخشەکێشان دژی ئەو. "**مزقان زدن**": ژەنینی ئامێری مۆسیقا.

**مزقان چی:** ژەنیار.

**مزکّی:** پاك، پاك کراوە. زەکات دراوە.

**مزلّت:** خلیسکان و کەوتن. خەتا، سووچ.

**مزله:** خلیسکە، شوێنی خلیسکێن، زەزەلۆك.

**مزمزان:** لە حاڵی مژین یان چەشتن.

**مزمزه:** چێشتنی تامی شتێك، تام کردن.

**مزمن:** کەونار، نەخۆشی درێژخایەن/ زۆرخایەن، بنەسییبووی، (پزیشکی) "کرۆنیك". "**مزمن شدن**": بۆ ماوەیەکی زۆر درێژەکێشان(نەخۆشی)، کۆن بوون (نەخۆشی).

**مزنده:** مژن، مژلێدەر.

**مزور:** (مَ.زُ) زیارەتکراو.

**مزوّر:** (مُ.زَ.وِ) ساختەکار، دووڕوو، درۆزن، فێڵباز، دۆدەڤ.

**مزوّر:** (مُ.زَ.وَ) دەستهەڵبەست، قەڵب، درۆیی.

**مزورات:** شتە دەست کردەکان.

**مزون:** بڕوانە:"مؤسسه".

**مزه:** 1) چەش، چێژ، چێژە، چەژە، تام. 2) هەستی خۆشی. 3) سوود، قازانج. 4) بەهرە، نسیب. 5) پاداشت. "**مزه دادن (داشتن)**": بەچێژبوون. "**مزه ریختن**": قسەی بەتام و جۆك ئاسا وتن. "**مزەکردن**": 1) چەشتن، چێشتن، چێژکردن، تام کردن. 2) چێژپێدان. "**مزه یافتن**": هەست بەچێژ کردن. "**از مزه افتادن**": لەچێژکەوتن، ناخۆش بوون.

**مزیّت:** لە باری زانست و ئاوەز یان بوێری و کەم و زۆرییەوە لە سەرتر بوون، بەسەردابوون، بەسەرەوەبوون، تازیاری، هەڤیازی. "**مزیَت دادن**": لەسەرتردانان. "**مزیّت داشتن**": لەسەرتربوون، سەرتۆپ بوون.

**مزید:** 1)زیادبوون، زۆربوون، پتربوون. 2) زۆری، فرەیی. "**مزید بر**": بێجگەلە، وێڕای. "**مزید بر علّت شدن**": بە کێشە و گرفتەکانی پێشوو زیاد بوون. "**مزید مقدم**": پێشگر. "**مزید مؤخر**": پاشگر. "**بر مزید**": ڕوو لە زیاد بوون.

**مزیدن:** 1) چەشتن، چێژتن. 2) مژین، مژتن.

**مزیّن:** (مُ.زَ.یَ) ڕازاوە، خەملێو، جوانکراو.

**مزیّن:** (مُ.زَ.یِ) ڕازێنەوە، ڕازێنەر، جوانکار، خەملێن، سەرتاش.

**مژدگانی:** شادیانە، مزگێنی، مزگانی، مزگین، مژدانە، مژدانی، مژدیان، مژدە، شیرانی، نزانی، موشتولق، خەبەری خۆش.





**مژده:** چاوڕۆشنی، خەبەری خۆش، مزگانی، مزگێنی، مژدە، نزان، نێد.

**مژده‌خواه:** 1) مزگێنی خواز. 2) خەبەربەر، سیخوڕ.

**مژده‌رسان:** مزگێنیدەر، ئەوەی خەبەری خۆش دەدا .

**مژه:** مژۆڵ، بژۆڵ، برژۆڵ، برژانگ، بژانگ، میژۆل، میژولانك. "**مژه برهم زدن**": نیشان دانی کەمترین دژکردەوە. "**مژه خواباندن**": چاولێکنان. "**مژه در چشم شکستن**": 1) برژانگ چوونە چاوەوە بەهۆی گریان. 2) زۆر گریان. "**مژه زدن**": 1) کردنەوە و لێکنانی بێ ئیرادەی پێڵووی چاو. 2) خەوتن. "**مژه گشادن**": تواشاکردن. "**مژەها روی هم رفتن**": خەوتن، نووستن .

**مسابقت:** 1) بڕوانە:"مسابقه". 2) کەوتنە پێشەوە، دەسپێشخەریکردن.

**مسابقه:** کێبەربەکێ، پێشبڕکێ، ڕکە، ڕك بەرکێ، ڕك بەری، بەرامبەرکێ، بەربەرەکانێ، ملە، ملبەملە، ملەملە، مل بە ملێ، ملێملێ، بۆڕێن، شەقین، هەڤدوبرن. "**مسابقه اسب دوانی**": پڕتافێن، ماهینانێ، گرێوەغار، قۆشەنیان. "**مسابقه‌تیراندازی**": کێلانێ. "**مسابقه‌دو**": شەقاندن، خارخارێن، غارغارێن، گسنەچڕ، ڕاکردن، لنگاران. "**مسابقه را واگذار کردن**": دۆڕان. "**مسابقه‌طناب کشی**": دابڕانێ، گوریس کێشکێ، گوریس کێشەکێ، گوریس کێشی. "**مسابقه گذاشتن**": کێبەرکێکردن، پێشبڕکێ کردن/دانان.

**مساجد:** کۆی"مسجد".

**مسّاح:** ڕووپێو، زەویپێو، زەڤیپیڤ، کەسێ کە زەوی لە گەز دەدا.

**مساحت:** 1) ڕووبەر، پانتایی. 2) پێوان، ئەندازەگرتن. "**مساحت شدن**": ئەنازەگیران، پێوران.

**مساحت گر:** ڕووپێو، زەویپێو.

**مساحقه:** پانپانۆکێ.

**مساحی:** 1) نەخشەهەڵگرتنەوە. 2) پێوانی زەوی. 3) زانستی پێوانی زەوی.

**مسارعت:** پەلە، بەلەز. "**به مسارعت**": بەپەلە، خێرا.

**مساس:** دەست پیاهێنان، پیاماڵین، پێداهێنان، لێخستن.

**مساعد:** 1) یاریدەدەر، هاریکار. 2) لەبار، شیاو، باش.

**مساعدت:** یارمەتیدان، یاریدەدان، هاریکاریکردن، دەزگیرۆیی، دەزگیری. هاوڕێیەتی کردن.

**مساعده:** 1) ئاریکاری، هەڤکاری، کۆمەك، یاریدە، مەهەت. 2) پێشمز، پێشەکی.

**مساعی:** کۆی"مسعی"، هەوڵەکان، تەقالاکان.

**مسافت:** ماوە، مەودا، دووری، درێژی ڕێگا. "**مسافت دید**": بەتار، هەتەری چاو، ڕۆشنایی و بینایی چاو.

**مسافر:** ڕێبوار، ڕاویار، ڕێڤینگ، مسافیر.

**مسافرت:** بەسەفەرچوون، سەفەرکردن.

**مسافهە:** جوێن دان.

**مساکین:** کۆی "مسکین".

**مسالح:** کۆی "مسلحە".

**مسالك:** کۆی "مسلك".

**مسالمت:** 1) پێك هاتن، ئاشتەوبوون، ئاشت بوونەوە. 2) خۆشڕەفتاری و ئاشتیخوازی.

**مسالمت آمیز:** ئاشتی خوازانە، ئاشتییانە.

**مسالمت جو:** ئاشتیخواز.

**مسالمە:** سلاو لەیەك كردن. **"مسالمە كردن با كسی"**: بە نەرمی دەگەڵ ئەو هەڵسوكەوت كردن، مداراكردن.

**مسامات:** خۆ بە زل زانی.

**مسامحە:** درێغی كردن لە ئەنجامی كارێك دا، كەمتەرخەمی، گوێنەدان، خستنە پشت گوێ.

**مسامحەكار:** كەمتەرخەم، خەمسارد، گوێ نەدەر.

**مسامرت:** ڕابواردنی یان تێپەڕاندنی شەو بە دەمەتەقێ و ئەفسانە گوتن، شەڤبێری.

**مساند:** كۆی "مسند".

**مساوات:** یەكسانی، بەرابەری، هاوشانی. **"مساوات سیاسی"**: یەكسانی دانیشتوانی وڵاتێ لە كاروباری وەك هەڵبژاردنی نوێنەر و هتد. **"مساوات مدنی"**: یەكسانی تاكەكانی وڵاتێ لە بەرامبەر یاسا مەدەنی و ئیدارییەكاندا.

**مساوات طلب:** یەكسانیخواز، خوازیاری جێبەجێكردنی دادپەروەری.

**مساومت:** چەنەچەن، چەنەبازی، چەن و چوونی، چەنەلێدان لە سەر نرخی كاڵا.

**مساوی:** (مُ) تەواو بەرانبەر، یەكسان، لێكولێك، وەكوو یەك، هەڤیەك، چوونیەك، هاوئەندازە.

**مساوی:** (مَ) كۆی "مساءة"، كردار یان گوتارە دزێو وناحەزەكان.

**مساهرت:** شەونخوونی.

**مساهلە:** 1) دەگەڵ كەسێك بە نەرمی و سانایی هەڵسوكەوت كردن، نەرمكێشی. 2) كەمتەرخەمی، خەمساردی.

**مساهمت:** شەریك بوون لە قازانجدا، هاوبەهرەبوون دەگەڵ كەسێك، بەشداربوون. **"مساهمت دادن"**: كردنە شەریك.

**مسبّب:** هۆساز، هۆكار، سەبەبكار. **"مسبّب الاسباب"**: خوای مەزن.

**مسببیّت:** هۆكاربوون.

**مسبّح:** (مُ.سَ.بِ) یادكەرەوەی خوا، "سبحان اللّه"بێژ.

**مسبح:** (مَ.بَ) مەلەوانگە.

**مسبوق:** 1) ڕابردوو، كەسێك كە كەوتۆتە بەرەوە. 2) زانا، ئاگا. **"مسبوق بە امری بودن"**: ئاگاداربوون لەو.





**مست:** (مُ) 1) گلەیی، گازندە، شكایەت. 2) خەم، كەسەر.

**مست:** (مَ) 1) سەرگران، سەرخۆش، سەروەش، سەرگەرم، گیز، لوول، مەست. 2) خومار. 3) زۆر شاد و خۆشحاڵ. 4) بێ ئاگا، غافڵ. 5) سەركێش و نائارام. **"مست شدن"**: مەسكرن، مەست بوون، سەرخۆش بوون. **"مست كردن"**: 1) مەستكردن، خۆسەرخۆش كردن. 2) شەیداكردن. 3) غافڵ كردن. **"مست و ملنگ"**: شاد و سەرخۆش.

**مستأجر:** كرێگرتە، كرێدار، بەكرێگر، كرێنشین، كرانشین، كراهانشین.

**مستأجرە:** بەكرێدراو.

**مستأصل:** 1) ڕیشەكێش كراو، لە بێخ دەرهاتوو. 2) داماو، بێچارە.

**مستأنس:** خووگر، خووپێگر.

**مستأنف:** دەست پێكەر، سەرلەنوێ دەست پێكەرەوە، واخوا، داواكاری سەر لە نوێ كردنەوەی قسە یان كار.

**مستانە:** 1) مەسانە، مەستانە، وەك سەرخۆشان. 2) شاد و سەرخۆش. 3) مەستی هێن.

**مستبد:** سەرەڕۆ، خۆسەر، لاسار. ملهوڕ، زۆردار، ستەمكار.

**مستبشر:** 1) مزگێنیدەر. 2) گەشبین، شادمان.

**مستبصر:** بینا، بەرچاوڕوون، خاوەن بیروڕا، ئاگا، زانا، كەسێ كە بیوێ كار یان بابەتێك ئاشكرا بكا.

**مستبعد:** دوور، دوورە، شتێ كە بە زەین نەگا.

**مستتر:** شاراوە، شاریاگەوە.

**مستتم:** تەواوكەر، بەئەنجام گەێن.

**مستثنی:** 1) هاوێركراو، هەڵاوێردراو، دەرهاوێژراو، جیاكراوە. 2) شاز، سەرتۆپ، لەسەر.

**مستجاب:** وەڵامدراوە، قبووڵكراوە.

**مستجاب الدعوە:** كەسێ كە نزاكەی قبووڵ كراوە.

**مستجدّ:** نوێ، تازە.

**مستجمع:** كۆكەرەوە، بەربلاو، گشتگر، كۆگر، كامڵ، كەسێ كە بە تەواوی ئامانجەكانی گەیشتبێ.

**مستحّب:** 1) خوێن شیرین، ڕەزاسووك. 2) كردارێك كە بەجێهینانی پاداشی هەبێ و وازلێهێنانیشی گوناه و سزای نەبێ. 3) ڕەوا، پەسندكراو.

**مستحّث:** وورووژێنەر، هەڵخڕێنەر، هاندەر.

**مستحدث:** تازە وەدیهاتوو، نوێ.

**مستحسن:** چاك، پەسندكراو. جوان.

**مستحضر:** ئاگا، بەخەبەر.

**مستحقّ:** 1) شیاو، شایان، هێژا. 2) نەدار، ئاتاج.

**مستحكم:** پتەو، قایم، خۆڕاگر.

**مستحیل:** 1) نەشیاو، لە کردن نەهاتوو، محاڵ، ئەستەم، دوور. 2) فێڵەزان، کەڵەکباز. 3) تەواوە، حەلیایی. "**مستحیل شدن**": توانەوە، حەلیان. "**مستحیل کردن**": تواندنەوە، حەلاندن.

**مستخبر:** هەواڵگر، پەیدۆزی هەواڵ.

**مستخدم:** (مُ.تَ.دِ) 1) خزمەتکار، نۆکەر. 2) ئەوەی لەبەرامبەر مووچەیەکی دیاریکراودا لەسەر کارێکی دیاریکراو دانراوە. "**مستخدم کردن**": بەخزمەت گرتن، دامەزراندن.

**مستخرج:** (مُ.تَ.رِ) دەرهێنەر، هەڵێنجەر.

**مستخرج:** (مُ.تَ.رَ) دەرهێنراو، هەڵێنجراو.

**مستخلص:** ئازادکراو، ڕزگارکراو. "**مستخلص کردن**": 1) ڕزگارکردن، سەربەست کردن. 2) داگیرکردن. 3) گرتن.

**مستدام:** پایەدار و جێگرتوو، خۆڕاگرتوو.

**مستدرك:** قەرەبووکراو(ە).

**مستدعا/مستدعی:** خوازراو، داواکراو.

**مستدعی:** (مُ.تَ.عِ) داواکار، خوازیار. "**مستدعی شدن**": داواکردن.

**مستدل:** بە بەڵگەوە سەلمێنراو، بەلگێنراو، لۆژیکی.

**مستدیر:** بڕوانە: "مدور".

**مستّر:** داپۆشەر، وەشێر.

**مسترد:** گەڕاوە، دراوە. "**مسترد کردن**": گەڕاندنەوە، دانەوە.

**مسترق:** ڕفێنەر، فڕێنەر.

**مسترقات:** دزینە ئەدەبییەکان.

**مستریح:** ئاسوودە، ئارام.

**مستزاد:** 1) زۆر، زیاد. 2) بڕوانە:"مزاید".

**مستزید:** ڕەنجاو، دڵشکاو.

**مستسقی:** 1) ئەوەی کە ئاوی بۆ خواردنەوە بوێ. 2) تووش بوو بە نەخۆشی تینشکی.

**مستسلم:** فەرمانبەر، ملکەچ.

**مستشار:** ڕاوێژکەر، ڕاوێژەر، ڕاوێژیار، تەگبیرکەر، بەتەگبیر، شێڤرمەند.

**مستشرف:** بڵیند، بەرز، زاڵ، کەسێك کە شتێکی خستبێتە ژێر چاوەدێری.

**مستشرق:** بڕوانە: "خاورشناس".

**مستشعر:** 1) ئاگا، بەخەبەر. 2) نیگەران. "**مستشعر داشتن**": ترساندن.

**مستشفی:** نەخۆشخانە.

**مستصحب:** هاوڕێ، هاودەم.

**مستضعف:** 1) کەم داهات، دەسکورت. 2) داماو، بێ توان.

**مستضیء:** ڕووناکی خواز.

**مستطاب:** 1) پاك و خاوێن. 2) شیاو.

**مستطاع:** 1) فەرمانبەر، ملکەچ. 2) ئەوەی لە ئاستی تاقەت و توانایی هەیە. 3) زۆر.

**مستطر:** نووسراو.

**مستطرف:** داهێنەر.

**مستطیر:** بڵاو، پرش.

**مستطیع:** بەتوانا، دەوڵەمەند، دارا.





**مستطیل:** لاکێشە، تەشك، درێژۆکە، درێژکۆڵە.

**مستظرف:** ناسك، جوان، قەشەنگ.

**مستظهر:** (مُ.تَ.هِ) یارمەتی خواز، ئەوەی پشت و پەنای دەوێ.

**مستظهر:** (مُ.تَ.هَ) پشتگەرم، خاترجەم، ئەرخەیان.

**مستعار:** خوازراو، خواستراو. "**اسم مستعار**": نازناو، ناوی خوازراو، خوازناو.

**مستعجل:** 1) پەلەکەر، لەزکەر. 2) تێژتێپەڕ.

**مستعد:** 1) خاوەن بەر، خاوەن بەهرە، بەهرەدار. 2) ئامادە، ساز.

**مستعرب:** لاساییکەرەوەی عەرەب.

**مستعفی:** وازهێنەر، دەست لە کار کێشەر. "**مستعفی شدن**": وازهێنان، دەست لە کارکێشانەوە.

**مستعمره:** کۆلۆنی، داگیرکراو، ژێرچەپۆکە، سەرزەوی یان وڵاتێك کە سیستمی سیاسی و ئابووری و فەرهەنگییەکەی لە لایەن وڵاتێکی بێگانەوە بەڕێوەبچێ.

**مستعمل:** دەکارکراو، دەکارکریاگ، بەکارهێنراو، بەکاربراو، کارپێ کراو، کارکردە، کارکردوو، لەکارکەوتوو، کۆن بوگ، شەق و شڕ، کارینای، نیمداشت.

**مستعین:** یارمەتی خواز، ئەوەی داوای کۆمەگ لە کەسێك بکا.

**مستغاث:** بڕوانە:"فریادرس".

**مستغرق:** 1) نغرۆبوو، نقووم بوو. 2) کەسێك کە بە تەواوی بە کارێك یان بابەتێکەوە خەریك بێ.

**مستغَل:** زەوییەك کە دەغڵودانی لێ هەڵدەگرنەوە، ماڵ یان دووکانێك کە بەکرێی بدەن، مڵکێ کە داهاتی ڕێکوپێکی هەبێ.

**مستغلات:** 1) ملك و ماڵێ کە داهاتێکی لێ ڕەنیو دێ وەك باغ و ماڵ و دووکان و هتد. 2) هەڵگرتنەوە و گێرەکردنی خەلەوخەرمان.

**مستغنی:** دەوڵەمەند، دارا، زەنگین، ساماندار، بێ نیاز.

**مستفاد:** 1) هەڵێنجراو، وەرگیراو. 2) وەدەست هاتو.

**مستفرع:** بەشەکۆمەڵە، ژێرکۆما.

**مستفید:** سوودمەند، بەقازانج، ب مفاح. بەکاربەر.

**مستفیض:** 1) بەهرەمەند، خوازیاری قازانج. 2) لەناو خەڵك دا بڵاو.

**مستقبح:** بە ناحەز دانراو، ناحەز و ناپەسند.

**مستقبل:** (مُ.تَ.بَ) بڕوانە: "آینده".

**مستقبل:** (مُ.تَ.بِ) پێشوازیکەر، بەرەو پیرەوەچوو.

**مستقر:** 1) جێگیر، سەقامگیر. 2) بنکە. 3) پێتەخت. "**مستقر کردن**": جێگیرکردن، سەقامگیرکردن، ساوکەکردن، نیشتەجێکردن، بنەجێکرن.

**مستقرض:** قەرزکەر.

**مستقل:** 1) سەربەخۆ، خۆبەڕێوەبەر، سەربەست و ئازاد. 2) بڕوانە: "جداگانە". "**شبەمستقل**": نیوە سەربەخۆ.

**مستقلاً:** 1) سەربەخۆیانە، بە پاڵپشتی خۆ. 2) بەتەنیایی، بەبێ یارمەتی و دەستێوەردانی ئەویتر.

**مستقیم:** 1) ڕاستەوخۆ، ڕاستەوڕاست، ڕاستەڕێ، ڕاستەوڕێ، سەرڕاست، ڕێك، ڕێگەی بێ پێچ، بێ پێچ و خواری. 2) زیندوو. 3) دروست، ڕاست(رأی مستقیم). 4) ڕاوەستاو. "**غیرمستقیم**": ناڕاست، ناڕاستەوخۆ.

**مستقیماً:** 1) ڕاستەوخۆ، زیندوو. 2) بەبێ گۆڕانی ڕەوگە. 3) بەبێ چوون یان سەردانی شوێنێکی تر.

**مستکبر:** 1) فیزدار، لووت بەرز، لە خۆڕازی، قودە. 2) حکوومەتە دەسەڵات سەپێن و زۆردارەکان. 3) کەڵەگا، سەرکێش.

**مستگر:** دڵشکاو، دل شکەستی، ڕەنجاو، زیز، مەلوول.

**مستلزم:** پێویستی، پێداویست.

**مستلزمات:** پێداویستییەکان.

**مستلقی:** بە پشتا خەوتوو.

**مستمد:** یارمەتی خواز.

**مستمر:** هەمیشە، بەردەوام، دایم، هەرتم. "**مستمر شدن**": درێژەکێشان.

**مستمری:** مووچە، مچە، مووچانە، مانگانە، بڕانە، جیرە، بەراتی جیرە، بەشە نان و بژیو.

**مستمری بگیر:** مووچەخۆر.

**مستمسك:** (مُ.تَ.سَ) دەساوێژ، بیانوو، بیانگ، هێجەت. "**مستمسك قراردادن**": کردنە بیانوو.

**مستمع:** گوێگر، بیسەر، گوهدار.

**مستملح:** بڕوانە: "نمکین".

**مستملی:** قوتابی، فەقێ.

**مستمند:** ڕووت و نەدار، ڕووت و ڕەجاڵ، نەدار، هەژار، بەلەنگاز.

**مستنبط:** هەڵهێنجراو، هەلگوێزراو.

**مستنبە:** ئاگاکەرەوە، زانیاریدەر.

**مستند:** 1) بەڵگەدار، بەڵگەیی، بەڵگەمەند، بەڵگەنامەیی، ب ببەلگە، دیکۆمێنتی. 2) ڕەپاڵ دراو، ڕەپاڵ خراو. 3) بەمسۆگەری. 4) جێی متمانە، پاڵپشت. "**مستند کردن**": بەڵگەمەندکردن. "**مستند کردن بە کسی (چیزی)**": ڕەپاڵ ئەو دان.

**مستنصر:** یارمەتیخواز، کەسێك کە یارمەتی بوێ.

**مستنطق:** بڕوانە: "بازپرس".

**مستنکر:** ناحەز، ناپەسند، ناخۆش.

**مستنکف:** خۆبوێر لە کارێك لەبەر فیز و لووت بەرزی.

**مستنیر:** کەسێك کە بە دوای ڕووناکیدا دەگەڕێ.





**مستوجب:** شیاو، شایستە.

**مستودع:** 1) بە ئەمانەت دانراو، سپێردراو. 2) شوێنی ڕاگرتنی سپاردە. 3) شوێنی تۆل لە ناو زگی دایکدا.

**مستور:** 1) شاراوە، پۆشراو، داپۆشراو. 2) داوێن پاك، بەئابڕوو.

**مستورە:** ژنی داوێن پاك و خۆپارێز، ب نامووس.

**مستوفی:** 1) تەواو، کامڵ. 2) ماف وەرگر، کەسێك کە تەواوی مافەکەی وەرگرێ. 3) دەخڵدار و دەفتەرداری خەزێنە.

**مستولی:** زاڵ، باڵادەست، دەسەڵاتدار، کەسێك کە بەتەواوی شتێ وەدەست بێنێ.

**مستوی:** 1) بەرابەر و ڕێك، هاوئاست، ڕاست و دروست. 2) تەخت، ساف. 3) ڕاست، ڕاستەوخۆ.

**مستهام:** سەرگەردان، سەرلێشێواو.

**مستهان:** زەلیل، بێڕێز، ڕیسوا.

**مستهجن:** دزێو، ناحەز، ناپەسند.

**مستهزء:** گاڵتەکەر، تیزپێکەر، پەسقەڵە، حەنەك کەر.

**مستهلك:** لەناوچوو، تیاچوو. "**مستهلك شدن**": 1) دانەوەی بەرەبەرەی قەرز و شتی وا. 2) پرتۆکیان، پۆسیان. 3) توانەوە. 4) لەناوچوون، تیاچوون.

**مسجد:** مزگ، مزگت، مزگەت، مزگەوت، مزگەفت، مزگی، مێژگە، مەچت، مەچچت، مەچیت، نڤێژگە، نمینگە، نوێژدان، پەرستگە.

**مسجّع:** قسەی هاو سەروا.

**مسجّل:** (مُ.سَ.جَ) 1) تۆمارکراو. 2) سەلمێنراو.

**مسجور:** سەرڕێژ لە ئاو، دەریای پڕ ئاو.

**مسجون:** بەندکراو، بەندکری، گیراو، زیندانی.

**مسح:** 1) خاوێن کردنەوە، سڕین، سڕینەوە. 2) دەست پیاهێنان بە تەوێل و قاچ لە کاتی دەس نوێژدا.

**مسحور:** جادووکراو، تەلیسماوی. شەیدا. "**مسحور کردن**": 1) جادووکردن. 2) شێت و شەیدا کردن.

**مسحوق:** ساوراو، کوتراو، وردکراو، هاڕاو.

**مسخ:** گۆڕینی سەروسەکوت و هەڵگەڕاندنەوەی بە شێوەیەکی ناحەزتر، کەسێك کە فۆڕم و بیچمی گۆڕابێ و بە فۆڕمێکی ناشیرین دەرهاتبێ، تەشك گۆڕان، دۆنادۆن، بەدگۆڕان.

**مسخّر:** 1) دەست بەسەرداگیراو، زەوت کراو، داگیرکری. 2) ڕام، گوێڕایەڵ، بەرفەرمان.

**مسخرگی:** تەڵفیز، گەمەوگەپ، گەپجاڕی، حەنەك، مەزاق، تیتاڵ.

**مسخرە:** 1) تناز، تیز، گاڵتە، گاڵتەجاڕ، گەپجاڕ، قەشمەر، مەچەڵ، پێکەنیناوی، هەلك، هێلۆل. 2) گاڵتەجاڕانە. 3) بڕوانە: "دلقك". "**مسخرە شدن**": گاڵتەپێکران، قەشمەری پێکران. "**مسخرە**

**کردن"**: گاڵتە پێکردن، تیزپێکردن، تەڤز پێکردن، قەشمەری، مەزاق پێکردن. **"مسخره کننده"**: بارهنگێڤ، پەسقەڵە، تیزبەخەڵك کەر، کەسێك کە بە گاڵتە پێکردن خەڵك تووڕە دەکا.

**مسدّس**: شەش پالّوو، شەش گۆشە، شەش لایەکی. دەمانچە، کۆڵت.

**مسدود**: بەرگیراو، داخراو، پێوەدراو، ڕتمی. **"مسدود شدن"**: گیریان، داخران، کپ بوون. **"مسدود کردن"**: داخستن، بەستن، مسمتاندن.

**مسرّت**: شادی، شادمانی، خۆشی.

**مسرت بخش**: شادیهێن.

**مسرح**: 1) لەوەڕگە. 2) سەیرانگا.

**مسرع**: 1) خێرا، فرز. 2) تیژڕەو.

**مسرف**: هەڵەخەرج، دەستبلاو، دەست پێوەنەگر.

**مسرور**: شاد، خۆشحاڵ، دڵخۆش.

**مسروقه**: دزراو، براو.

**مسری**: تەشەنەسێن، دزەکەر، پەتا.

**مسطح**: تەخت، پان و تەخت، ساف و ڕێك، هاوڕێك.

**مسطّر**: نووسراو. کاغزی هێڵ کێشیکراو، خەت خەت، ڕیٚڕیٚ.

**مسطور**: نووسراو، نووسراوە.

**مسعود**: 1) خۆشبەخت، بەختیار. 2) موبارەك، پیرۆز.

**مسعی**: هەوڵ، تەقالا، کۆشش.

**مسقّف**: میچدار، سەرداپۆشراو، شوێنیٚ کە میچی هەبیٚ.

**مسکر**: مەستی هێن، سەرخۆشکەر.

**مسکن**: (مَ.كَ) ماڵ، خانوو. **"مسکن داشتن"**: جیٚ هەبوون، ماڵ هەبوون. **"مسکن کردن"**: جێگیربوون، نیشتەجێبوون، دامەزران، ماڵ کردن.

**مسکّن**: هێورکەرەوە، ئارامکەرەوە، دامرکێن، ژان شکێن، ژان بڕ، سوکناییهێن.

**مسکنت**: 1) هەژاری، نەداری، دەسکورتی. 2) بیٚدەسەڵاتی و داماوی.

**مسکوت**: بێدەنگ کراو، کپ کراو، متکراو، کووژاوە، دامرکاو. **"مسکوت گذاشتن امری"**: بێدەنگی لێکردن، ڕاگرتنی ئەو بابەتە.

**مسکوك**: نەخت، پارەی لە سکەدراو.

**مسکون**: نیشتەجێکراو، جیٚپێدراو، ئاکنجی، دانیشێنراو.

**مسکونی**: ئاوەدان، شوێنیٚ کە خەڵکی تێدا نیشتەجێیە.

**مسکین**: هەژار، نەدار، بیٚ ماڵ و حاڵ، بیٚ جێوڕیٚ، بیٚتوتە، بەلەنگاز، بەستەزمان، داماو.

**مسگر**: قەزانچی، پاخرگەر، بەرۆش ساز، مسگەر.

**مسلّح**: 1) چەکدار، بەچەك، ژاندار، کەسێك کە چەکی شەڕی پێیە، خاوەن کەلوپەلی شەڕ، کۆك و پۆشتە. 2) تەیار بە کەلوپەلی پێویست، خاوەنی ئامراز (چشم مسلّح). 3) لەسەرپیٚ(تفنگ مسلّح/ وەك دەمانچەی لەسەرپێم).





**"مسلّح کردن"**: چەکدارکردن. خستنە سەرپیٚ، تفەنگ لێکێشان، لە چەخماخەدان. **"بتن مسلّح"**: بێتۆنی شیشدار.

**مسلحه**: 1) شوێنی ترسناك کە پێویستی بە چەك هەڵگرتن بیٚ، شوێنی دیدەوانی. 2) هەمباری چەکوچۆڵ.

**مسلخ**: شوێنی پێست داماڵین، کوشتارگا.

**مسلسل**: 1) شەستیر، ڕەشاش، مەترەلۆز، ئاگربار.2) لێکدالێکدا، پەیتاپەیتا، بیٚپسانەوە. 3) سڕیاڵ.4) جلی ڕیٚڕیٚ.

**مسلّط**: دەس ڕۆیشتوو، دەسەڵاتدار، دەستەڵاتدار، زاڵ، سەرکەوتوو.

**مسلك**: 1) ڕیٚبەر، دۆز، ڕێباز، مەرام، ئایدیۆلۆژی، مەبەست لە ژیان. 2) شێوە، شێواز. 3) ڕێگە، ڕەوگە.

**مسلکی**: ئایدیۆلۆژیك، مەرامی.

**مسلم**: (مُ.لِ) موسوڵمان، پێڕەوی ئایینی ئیسلام.

**مسلّم**: (مُ.سَ.لَ) 1) (لۆژیك) بەڵگە نەویست، سەلمێنراو. 2) قبووڵ کراو، بڕاوە. 3) بڕوانە: "مسلماً". 4) ڕاستەقینە. 5) شیاو، شایستە. **"مسلم داشتن"**: 1) باوەڕهەبوون. 2) سپاردن، دان. 3) عافووکردن، بەخشین. 4) بە یەکجارەکی زانین، بەمسۆگەر زانین. **"مسلم شدن"**: 1) سەلمێنران. 2) وەدیهاتن. **"بر کسی مسلم شدن"**: بۆ ئەو مسۆگەر بوون.

**مسلماً**: بەمسۆگەری، بیٚ ئەملاوئەولا، بەبیٚ دڕدۆنگی.

**مسلّمات**: پرسە بەڵگەنەویستەکان.

**مسلم البرهان**: سەلمێنراو.

**مسلمان**: بڕوانە: "مُسلِم". **"مسلمان کردن"**: خستنە سەر ئایینی ئیسلام، موسڵمان کردن. **"مسلمان متعصب"**: ڕەشەموسوڵمان، موسوڵمانی سەروشکی نەفام.

**مسلمان باشی**: موسڵمان بوون، موسڵمانی.

**مسلمه**: ژنی موسوڵمان، موسوڵمانی سەروشك و دەمارگیر.

**مسلوب**: لیٚسەنراو، گیراو. **"مسلوب الاختیار"**: بیٚدەسەڵات، بیٚئیختیار. **"مسلوب المنفعه"**: بوورە.

**مسلوخ**: پێست داماڵراو، پێست لێوەکراو، ڕووت کراو.

**مسلوك**: 1) ڕۆیشتوو، پێوراو. 2) ئەنجام بوو و ئەزموون کراو.

**مسلول**: 1) سیار، سیلاوی، سیلدار، وەرەمی، نەخۆش بە دەردی سی، ژانا زراڤ کەتی. 2) لە کالان دەرهاتو.

**مسله**: ئەنجنراو، لەت لەت کراو.

**مسما/ مسمی**: 1) ناونراو، ناولێنراو. 2) کاری بیٚ ناوەرۆك کە تەنیا بۆ پاراستنی ڕواڵەت ئەنجام بدریٚ. 3) مەئموور. **"مسماشدن"**: 1) ناو دەرکردن، ناوبانگ ڕۆیشتن. 2) دیاریکران.

**مسمّط**: 1) بڕیاریٚ کە ڕەت نەکرێتەوە و ناڕەزایەتی لە سەر نەبیٚ. 2) پێوەکراو، بە بەنەوەکراو. 3) نووسراو.

**مسمّن:** چەور، چەوراوی، ڕۆندار.

**مسموع:** 1) بیستراو. 2) شیاوی بیستن. "**مسموع داشتن**": 1) بیستن. 2) قبوولکردن. "**مسموع شدن(افتادن)**": 1) بیستران، بەگوێ گەیشتن. 2) قبوولْ کران.

**مسموم:** دەرمانداوکراو، دەرمانخوار، دەرمان خۆر، سەم خواردوو، ژەهراوی، ژارخواردوو، کەسێ کە ژەهر چۆتە لەشییەوە. "**مسموم شدن خون**": خوێن ژەهراوی، خوون ژەهری. "**مسموم کردن**": دەرمانداوکردن، ژاردان.

**مسمومیّت:** ژاراوی بوون، ژەهراوی بوون.

**مسنّ:** بەساڵاچوو، بەتەمەن، پیر.

**مسند:** (مَ.نَ) 1) تەخت، پاڵگە، کۆڵەکە. 2) پلە و پۆست، پێگەی بەرز. 3) جێ، شوێن. 4) پشتی. "**مسند نشین**": دەسەڵاتدار، ڕاژۆر. "**بر مسند نشستن**": گەیشتن بە پۆستێ.

**مسند:** (مُ.نَ) ڕەپاڵ دراو، وەپاڵدراو. "**مسندالیه**": پاڵ لێدراو.

**مسنّن:** دیانساز، دیان پزیشك.

**مسوّد:** 1) ڕەشکەرەوە. 2) نووسەر.

**مسوده:** ڕەشنووس.

**مسهل:** سنامەکی، ڤژۆکەر، دەرمانی ڕەوانی، ڕەوانکەر. "**مسهل هذیان خوردن**": کاتێ دەوترێ کە کەسێك پەیتاپەیتا و بێوچان قسەگەلی قۆڕ بێژێ.

**مسیحانفس:** ئەوەی کە هەناسەی وەك حەزرەتی عیسا هەیە کە بتوانێ مردوو زیندوو کاتەوە.

**مسیحی:** خاچ پەرست ، فلّە، فلە، فلّەه، فەلە، فەلا، گاڤر، گاور، کەسی بڕوامەند بە ئایینی حەزرەتی عیسا.

**مسیحیّت:** فەلاتی، خاچ پەرەستی، مەسیحیبوون، ئایینی عیسا مەسیح کە بریتییە لە سێ لکی کاتۆلیکی، پرۆتستانی و ئۆرتۆدۆکس. "**مسیحی رعیّت**": فەلەڕەشکە، فلّەی بۆرەپیاگ.

**مسیحی سان:** فەلانی، وەك خاچ پەرستان.

**مسیر:** 1) ڕەوگە، ڕێڕەو. 2) ڕێگا، جاددە. 3) ئاراستە، ئاقار. 4) جوولّە، گەڕان. 5) ڕەوت.

**مسیل:** سێڵاوگر، سێلگا، جێلافاو، ئاودڕ، خڕ.

**مسئلت:** 1) داواکردن، خوازتن، خوایشت کردن. 2) کاری دژوار. 3) سواڵ.

**مسئله:** 1) پرس، دۆز، مەسەلە، بابەت. 2) کێشە، کاری دژوار. 3) پرسیار.

**مسئلەساز:** کێشەخولقێن، مەسەلەساز، دۆزچێکەر.

**مسئول:** 1) بەرپرس، بەرپرسیار، لێپرسراو، کاربەدەست، کارگێڕ. 2) داوا، خوایشت. "**مسئول دانستن**": بە بەرپرس زانین.

**مسئولیّت:** 1) بەرپرسی، بەرپرسایەتی، بەرپرسییەتی، بەرپرسیارێتی، لێپرسراوی. 2) بەڕێوەبەری، سەرپەرشتی. 3) ئەرك.





**مسئولیّت پذیر:** هەست بە بەرپرسایەتیکەر.

**مشاء:** (فەلسەفە) شێوازێکی فیکری لە زانستە ئاوەزییەکاندا کە دۆزینەوەی هەقیقەت لە ڕێگەی ئەقڵەوە بە شیاو دەزانێ.

**مشابك:** تێکەڵاو. تێك چڕژاو. ئاڵۆز.

**مشابه:** وەك، وەکۆك، وەکی، وەکو، وەکوویەك، لێکچوو، میناك، هاوتا.

**مشابهت:** وەکیەکی، هاوتایی، لەیەك بوون، لێکچوویی، چوونیەکی.

**مشابەنگار:** "پانتۆگراف".

**مشاجره:** دمبەدمە، دم لە دم نان، دندووکە، مقۆمقۆ، هەنەهەبسێ. "**مشاجرەلفظی**": دەمرگە، دمەقاڵە، دەمەقاڵە، کێشەوقێڕە، چەقەوگوڕە. "**شکست دادن در مشاجرەلفظی**": بۆڕدان. "**شکست خوردن در مشاجرەلفظی**": بۆڕخواردن.

**مشاحت:** 1) گەنگەشە. 2) دوژمنایەتی.

**مشار:** (مُ) 1) ئاماژەپێکراو، هێماپێکراو. 2) لایەنی ڕاوێژ و تەگبیرپێکردن. 3) ناودار، بەناوبانگ.

**مشارالیه:** 1) کەسی ئاماژەپێکراو، ناوهاتی. 2) کلکەنما، ناسراو. 3) ناوبراو، باسکراو.

**مشاربالبنان:** ناسراو، بەناوبانگ، کلکەنما.

**مشارك:** هاوبەش، هەڤپشك، شەریك.

**مشارکت:** بەشداریکردن، هاوکاری. "**مشارکت دادن**": بەشداری پێکردن. "**مشارکت داشتن**": بەشداربوون، هاوکاریکردن. "**مشارکت کردن**": بەشداریکردن، هاوکاریکردن.

**مشارکتی:** بەشداریکەرانە.

**مشاطه:** شانەکار، جوانکەر، ڕازێنەر، خەملێن.

**مشاع:** زەوی دابەش نەکراو لە ناو هاوبەشاندا، مشا، مشەمر، ناوکۆ.

**مشاعر:** هەواس، بیر.

**مشاعره:** کێ بەرکێی شێعر خوێندنەوە، شەڕەشێعر.

**مشاعی:** هاوبەشێتی. بەهاوبەشی، بەدابەش نەکراوی.

**مشاغل:** 1) کارەکان، ئیشەکان، شوغڵەکان. 2) گرفتارییەکان.

**مشافهه:** گفتوگۆ، ڕووبەڕووی یەك قسەکردن. "**بە مشافهه**": گفتوگۆی ڕووبەڕوو.

**مشّاق:** 1) فێرکار، ڕاهێن، ڕاهێنەر، هینکار. 2) مامۆستای خەت. 3) قوتابی، فێرخواز.

**مشاکل:** (مَ.كِ) کۆی "مشکل".

**مشاکل:** (مُ.كِ) وەك، وەکوو، هاوفۆڕم.

**مشاور:** ڕاوێژکار، ڕاوێژەر، ڕاوێژیار.

**مشاورات:** ڕاوێژەکان، تەگبیرەکان.

**مشاوره:** ڕاوێژکردن، تەگبیرکردن، شێورکردن. ڕاوێژکاری، ڕاوێژەری.

**مشاهد:** (مُ.هِ) 1) گڵکۆی شەهیدان. 2) شوێن گەلی دەرکەوتن و دیارکەوتن. 3) شوێنی ئامادەبوون.

**مشاهده:** 1) بینین، دیتن، چاولێکردن، تواشاکردن، سەیرکردن. 2) ئامادە و دیارکەوتنی هەق لە دڵی عارف دا. 3) ڕوخسار، دەموچاو.

**مشاهره:** 1) بەکرێگرتنی کەسێك بە هەقدەستی مانگانە. 2) هەقدەستی مانگانە.

**مشاهیر:** کۆی"مشهور".

**مشایعت:** 1) پێڕەوی کردن، بەدوای کەسێك داچوون. 2) بەڕێکردن، خستنەڕێی میوان. 3) لە گەڵ مردوو ڕۆیشتن.

**مشبع:** 1) تێربوو. 2) بەتەواوی.

**مشبّك:** تۆڕدار، تۆڕی، وەك پەنجێرە، کون کون.

**مشبه:** وێکچوو، لێکچوو، ئەوەی بە شتێك دەشوبهێنرێ.

**مشبهات:** کارە دژوارەکان.

**مشبەبه:** وێکچواو، شوبهێنراو بە ئەو، لەوچوو.

**مشبّهه:** (مُ.شَ.بَ.هَ) 1) وێکچوو، شوبهێنراو. 2) ئەوەی خوا وەك جسم وێنا دەکا و بە خولقێنراوی دەشوبهێنێ.

**مشت:** 1) مست، مشت، پەنجەی لێك نراو. 2) ئەندازەی دوو لاوێچی قووڵ کراو لە شتێ. **"مشت بر سندان زدن(کوبیدن، کوفتن)":** کاری پووچ و بێهوودە کردن. **"مشت خوردن":** مشت وێکەوتن. **"مشت در تاریکی انداختن":** ئەنجامدانی کارێ بەشێوەی کوێرکوێرانە و بەبێ بیرکردنەوە. **"مشت را گره کردن":** دەست قووچاندن. **"مشت زدن":** مست لێدان. **"مشت کسی باز شدن":** ئاشکرابوونی ڕازی ئەو، ئاشکرابوونی درۆ و فێڵی ئەو. **"مشتی":** مشتێك، مستێك. **"به مشت آوردن":** وەدەست هێنان. **"به مشت بودن":** لە دەست دا هەبوون، هەبوون. **"توی مشت کسی گذاشتن":** لە مستی ئەو نان، بەو گەیاندن. **"در (توی) مشت کسی بودن":** بەتەواوی ملکەچی ئەو بوون، لە ئیختیاری ئەودا بوون.

**مشتاق:** تاسەخواز، تاسەمەند، تامەزرۆ، تامازرۆ، بەتاسە، ئارەزومەن، بەئاوات، ئاواتەخواز، گز، مشتاق. 2) ئاشق، دڵدار. **"مشتاق بودن":** بەتاسەبوون، تاسەکردن، تامەزرۆبوون، یادکردن. **"بسیارمشتاق":** عەزرەتی، زۆر بە تاسە.

**مشتبك:** تێکەڵ، پێکەڵ.

**مشتبه:** 1) بەشك، بەگومان. 2) هەڵەکەر، تووشی هەڵەبوو.

**مشتبەکاری:** درۆوتن، فێڵبازی.

**مشت پر کن:** بە قەرای مستێك.

**مشترك:** 1) هاوبەش، شەریك. 2) بەشداربوو، پشکداربوو، ئابوونە.

**مشترك المنافع:** هاوبەرژەوەند.





**مشتری:** 1) کڕیار، سەنیار، بسێن. 2) لایەنگر، خوازیار.

**مشت زن:** (وەرزش) بۆکسۆر.

**مشت زنی:** بۆکس.

**مشتعل:** 1) گەش، بڵێسەدار، داگیرساو، گڕگرتوو، گڕتێچوو، ڤێ، پەشقەلەدار، پەلۆخ. 2) چالاك، کاری. **"مشتعل شدن":** ئاگرگرتن، ئاورتێبەربوون، بڵێسەسەندن، ئایسان، ئاییسان، داگرسان، داگیرسان ، هەڵگیرسان، هەڵایسان، داگیران، داگیریان، ڤەگەشین، گەشانەوە، گەش بوونەوە، گڕتێچوون، هەڵ بوون، ڤێکەتن. **"مشتعل کردن":** 1) داگرساندن، داگیرساندن، داگریساندن، هەڵگیرساندن، هەڵکردن، داگیراندن، داگیرانن، گەشاندنەوە، وەکەردەنە. 2) تووڕەبوون، هەڵچوون.

**مشتغل:** کەسێ کە شوغڵ و کارێکی هەیە، لەکارەوەچوو، خەریك، سەرقاڵ، سەرگەرم، مژوول. **"مشتغل از امری":** ڕوو وەرگێڕاو لەو بابەتە. **"مشتغل شدن":** 1) خەریکبوون، سەرقاڵبوون. 2) نیگەران بوون.

**مشتق:** 1) تڵیشاو، شەق بردوو. 2) لێگیراو، دەرهێنراو.

**مشتقات:** بە هەموو باراندا، لێ گیراوەکان، دەرهێنراوەکان.

**مشت کاری:** بڕوانە:"مشت مال".

**مشتکی:** شکایەتکار، دادخواز.

**مشتکی عنه:** شکایەت لێکراو.

**مشتلق:** بڕوانە: "مژدگانی".

**مشت مال:** 1) مشتوماڵ، شێلان، ماساژدان. 2) کوتەك، تەمبێ.

**مشتمل:** بریتی، لەخۆگر، هەڵگر.

**مشتنگ:** بڕوانە: "مشنگ".

**مشتواره:** مست ئاسا، وەك مشت، مستێ لە شتێك.

**مشتهر:** ناوبانگ دەرکردوو، بەناوبانگ و ناسراو.

**مشتهی:** (مُ.تَ.ها) خوازراو و ئارەزووکراو، دڵخواز، پەسند.

**مشتهی:** (مُ.تَ.هِ) ئیشتیا، مەیل، مەگیرانی، تامەزرۆ.

**مشحون:** پڕکراو، لێوڕێژ، سەرڕێژ، لێوانلێو، دارماڵ.

**مشخّص:** 1) دیار(یکراو)، دەست نیشان کراو، زانراو، ناسراو، شینبەر، ئاشکرا. تایبەتی. **"مشخّص کردن":** دەست نیشان کردن، دیاریکردن.

**مشخصاً:** بەڕوونی، بەڕاشکاوی.

**مشخّصات:** کۆی"مشخّص"، نیشانەکان، چلۆنایەتی شتەکان.

**مشخصه:** 1) تایبەتمەندی. 2) تایبەتی.

**مشدّد:** 1) توندوپتەوکراو، بەهێزکراو. 2) نیشانەی شەددە بۆ دانراو.

**مشرب:** 1) ڕوانگە، بۆچوون( مشرب این دو اندیشمند تاحدی متفاوت است).

2) شوێنی ئاوخواردنەوە. 3) مەشرەف، ڕاوێـژوڕوو، خولـق و خـوو. "**خوش مشرب**": مەشرەف خۆش، ڕاوێژوڕووخۆش.

**مشرَح:** (مُ شَ رِ) شیکەرەوە، شرۆڤەکەر.

**مشرف:** (مُ.رِ) 1) زاڵ، سـیار، سـوار، بڵندتر، بەرزتر. 2) چاوەدێر. 3) سیخوڕ، مەئمووری نهێنی.

**مشرق:** خۆرهەڵات، ڕۆژهەڵات، خۆرەڵات، خۆرهەڵات، هۆرامان، هۆراسان، هۆرگە، خاوەر.

**مشرق زمین:** وڵاتانی هەڵکەوتوو لە خۆرهەڵاتی جیهان .

**مشرقی:** 1) خۆرهەڵاتی، ئاسیایی. 2) لای خۆرهەڵات .

**مشرقین:** 1) خۆرەڵات و خۆراوا. 2) گشت جیهان .

**مشرك:** کەسێك کە شەریك بۆ خودا دابنێ، بڕوامەند بە فرەخودایی، چەن پەرست.

**مشروب:** 1) خواردنەوە، ئاو و هەر تراوێکی تر کە بخورێتەوە، مەشرووب. 2) تێراو. "**مشروب کردن**": 1) تێراوکردن، ئاودێریکردن. 2) پڕکردن لە ئاو.

**مشروح:** 1) ڕاڤەکری، ڕاڤەکراو، واتای شیکراو، شرۆڤەکراو، مانا بە درێژی لێوەدراو، تێروتەسەل. 2) بەتێروتەسەلی. 3) ڕاپۆرتی بارودۆخ. 4) کراوە. "**مشروح کردن**": 1) شیکردنەوە، ڕوونکردنەوە. 2) کردنەوە.

**مشروحاً:** بەشیکردنەوە و ڕوونکردنەوە، بەتێروتەسەلی.

**مشروط:** مەرجدار، ئەوەی کە پابەند بە مەرج بێ. "**مشروط به (بر) امری**": بەستراوە بە ئەو، بەو مەرجەی.

**مشروطه:** 1) لە زاراوەی لۆژیکدا: بڕیار یان مەسەلەیەك کە مەرجی تێدابێ. 2) (ڕامیاری) سیستمی سیاسی خاوەنی یاسای بنەڕەتی کە لەودا نوێنەرانی خەڵکی لە پارلمان دا یاسا دادەنێن و دەوڵەتیش ئەو یاسایانە جێبەجێ دەکا، دەستووری.

**مشروع:** ڕەوا، ڕێدراو، ئەوەی بە پێی شەرع بێ.

**مشروعیّت:** ڕەوایی، ڕێپێدراوێتی، گونجان دەگەڵ بڕیارە شەرعییەکان.

**مشعر:** (مُ.عِ) ئاگادارکەرەوە، پێراگەێن.

**مشعشع:** 1) ڕۆشن، ڕووناك، ورشەدار، شۆقدار، بەدرەوش، بەدرەوشێن. 2) زۆر باش.

**مشعل:** شاپلێتە، مێڵەدە، مێڵی دە، یەلمووم، چراوڵە، چۆڵەچرا، ئەختەرمە، مەشخەڵ، مەخشەڵ.

**مشعل دار:** 1) هەڵگری مەشخەڵ. 2) پێچشڕەو، ڕێنوێن.

**مشعله‌افروز:** 1) پێکەر/ هەڵکەری مەشخەڵ. 2) ئاورهەڵایسێن، پێکەر. 3) پێشڕەو، ڕێنوێن.





**مشعوف:** شاد، خۆشحاڵ.

**مشغلت/مشغله:** 1) خەریکی، سەرگەرمی، مژوڵاهی، مژوولی، مەشخەلە. 2) کار، پیشە. 3) **هە**راوهوریا، دەنگەدەنگ.

**مشغول:** 1) خەریك، خەریکە، خەرکاو، سەرگەرم، سەرقاڵ، خەجڵ، مژوول، لێ لێ، پاپا. 2) گرفتار، تووشبوو. "**مشغول بودن**": خەریك بوون بە شتێکەوە/کارێکەوە، سەرگەرم بوون، دەست تێوەردان. "**مشغول بودن از کسی**": خافڵ بوون لەو. "**مشغول شدن**": خۆخەریك کردن بە شتێکەوە، خاوان، مژوول بوون، سەرگەرم بوون. "**مشغول کردن(داشتن)**": خاواندن، خەریك کردن، سەرقاڵ کردن، خافڵاندن.

**مشغول الذمه:** مشکولۆزمە، ئۆباڵ بەگەردن.

**مشغولیّت:** پەرژان، سەرقاڵبوون، سەرگەرمی، خەریك بوون، گوێپێدان.

**مشفق:** دلۆڤان، دڵنەرم، دڵسۆز.

**مشق:** 1) ڕاهێنان، خۆڕاهێنان، پڕۆڤە. 2) کار، ئەرك. 3) پڕۆڤە و دووپات کردنەوەی کارێ بۆ باشتر فێربوون. 4) نووسینی خەت بۆ ڕاهێنان و فێربوونی باشتر.

**مشقت:** دەردیسەر، دەردەسەری، دەردیسەری، چەرمەسەری، چەرمەسەرە، مەینەت، کوێرەوەری، دەرد و زەحمەت، ئەرك و ڕەنجی زۆر، ئەرکی گران، دژواری، زامەت.

**مشقت بار:** کولەمەرگی، کولەمەرگێ، سەمەرگی، سەگمەرگی.

**مشك:** (مَ) 1) مەشك، مەشکە. 2) سك، زگ. "**مشك زدن**": مەشکەژەندن، ژاندنی مەشکە. "**با مشك خالی پرهیز آب گفتن**": وەرێخستنی دەنگەدەنگی لەخۆڕایی. "**در مشك خود را گذاشتن**": بێدەنگ بوون.

**مشك انداز:** مەشکەژەن.

**مشكل:** ئاریشە، گیروگرفت، تەنگوچەڵەمە، تێگیراوی، کێشە، گرێپێچك، دژوار، زەحمەت، چەتوون، سەخت.

**مشكل آفرین:** گرفتساز، ئاریشەساز، کێشەخوڵقێن.

**مشكلات:** کۆی "مشکل"، ئاریشەکان، دژوارییەکان، گیروگرفتەکان، گرێوگۆڵەکان.

**مشكل پسند:** دژپەسند، دژوارپەسند، وازوازی لە هەڵبژاردنی شتێکدا.

**مشكل تراشی:** کێشەوکۆسپ سازکردن، ئاستەنگی‌نانەوە.

**مشكل ساز:** بڕوانە:"مشکل آفرین".

**مشكل گشا:** گرێکەرەوە، ئاسانکەرەوە، کێشە ڕەوێنەوە.

**مشكو(ی):** 1) حەرەمسەرای پاشاکان. 2) بوتخانە.

**مشكور:** سوپاس لێکراو.

**مشكوك:** گوماناوی، بڕواپێنەکراو، شتێك کە شك و گومانی لە سەر بێ، جێ گومان، بەگومان.

**مشمّع:** مۆمناو، مۆمنایی، مۆمینە، مشەما، مشەمما.

**مشمول:** بريتی، لەخۆگر. بەرکەوتوو.

**مشموم:** ئەوەی بە بۆن پێوەکردن هەستی پیٚبکریٚ.

**مشمئز:** بێزراو، بەقێز، بێزار، وەڕەز. **"مشمئزکننده"**: بێزهەستێن، قێزەون، بێزارهێن.

**مشنگ:** 1) دز، چەتە، ڕێگر. گەوج، گەمژە.

**مشوب:** 1) بارگاوی، تێوەردراو. 2) ئاوێتەکراو، تێکەڵ کراو. 3) ئاڵۆز و پەرێشان و ناتەکووز.

**مشورت:** ڕاوێژ، ڕابێژ، رابێژەك، تەگبیر، تەگبیروڕا، شیرەت، شێور. **"مشورت کردن"**: ڕاوێژکردن، تەگبیرکردن، لێکۆڵینەوە، لێدوان.

**مشوّش:** شێواو، شێویاو، شپرزە، پەشۆکاو، پەشۆکیاگ، شڵەژاو، پەریشان(و ئاڵۆز)، نیگەران، ناتەکووز. تۆفانی و نائارام.

**مشوّق:** هاندەر، دنەدەر، هەڵخڕێن، تیژەڤان، وەزەوقهێن.

**مشهد:** 1) هەنتەش، شوێنی ئامادەبوون. 2) شوێنی شەهیدبوون. 3) گڵکۆ.

**مشهود:** 1) دیتراو، بینراو. 2) گەواهی، شایەتی. 3) ئاشکرا، دیار. 4) بە مانای ڕۆژی هەینی و ڕۆژی پەسلانیش هاتوە.

**مشهودبه:** ئەوەی سەبارەت بەو شایەتی دەدەن.

**مشهودعلیه:** ئەوەی بە زەرەدی ئەو شایەتی دەدەن.

**مشهودله:** ئەوەی بە قازانجی ئەو شایەتی دەدەن.

**مشهور:** بەناوبانگ، بەناودەنگ، بناڤ و دەنگ، بەناو، بەناڤ، ناودار، ناڤدار، نۆمدار، خاوەن ناو، دەنگدار، ناسراو، سەربەدەرەوە. **"مشهور شدن"**: ناوبانگ ڕویشتن، ناوبانگ دەرکردن، ناوداربوون، ناودەرکردن، ناسران.

**مشهی:** 1) ئیشتیاهێن. 2) ورووژێنەری هەوەس.

**مشی:** 1) ڕیٚڕۆیشتن. 2) ڕێباز. 3) شێوە، شێواز.

**مشیب:** پیری، بەسالاچوون.

**مشیّت:** خواست، ویست، ئارەزوو.

**مشیر:** 1) هێماکەر. 2) ڕاوێژکەر، تەگبیرکەر.

**مشئوم:** شووم، بیٚفەڕ، قەشان، پیٚ و قەدەم خراو.

**مشیمه:** هەڤالۆك، ئاواڵ منداڵ، هژی، پەردەی مناڵدان.

**مشیمیه:** (پزیشکی) تۆڕی خوێن بەر و خوێن هێن.

**مصاب:** لێقەوماو، بەڵالێدراو، بەلالێدایی.

**مصابرت:** سەبرکردن.





**مصاحب:** هاونشین و هاوڕاوێژ.

**مصاحبه:** چاوپێکەوتن، گفتوگۆ، هەڤپەیڤین، هەڤدیتن، دیمانە، وتووێژ. **"مصاحبه مطبوعاتی"**: هەڤپەیڤینی چاپەمەنی، دیمانەی چاپەمەنی، کۆنگرەی ڕۆژنامەوانی.

**مصادر:** کۆی"مصدر".

**مصادره:** دەست بە سەرداگرتن، دەس لەسەردانان، زەوت کردن، تاپۆکردن، داگیرکردن لە لایەن زۆردارەوە. **"مصادره به مطلوب"**: جۆریٚ بەڵگاندنی هەڵەپەتەکاریانە و ئەویش دانانی دڵخواز(ئەوەی دەبیٚ بسەلمێنریٚ) وەك بەڵگە.

**مصادف:** 1) لێککەوتوو، ڕووبەڕووبۆوە. 2) هاوکات.

**مصادقه:** بە نیازپاکییەوە بوونە هەواڵی کەسێك.

**مصارعت:** زۆرانبازی.

**مصارف:** کۆی"مصرف"، خەرج، خەرجی.

**مصارمت:** پێوەندی پساندن.

**مصاص:** ڕاز. پوختەی شتێك.

**مصاعد:** جێگە بەرز و بڵێندەکان.

**مصاف:** 1) شەڕ، جەنگ. 2) شوێنی ڕیزبەستن و گۆڕەپانی شەڕ، شەڕگە، شوێنی ڕووبەڕووبوونەوە. **"مصاف برکشیدن"**: ڕیزبەستن و لەشکر ڕازاندنەوە. **"مصاف دادن"**: شەڕکردن. **"مصاف شکستن"**: تێکدانی خۆڕێکخستنی لەشکری دوژمن و زاڵبوون بەسەریدا. **"به مصاف کسی (چیزی) رفتن"**: دەگەڵ ئەو ڕووبەڕووبوونەوە.

**مصافحه:** مچڕێن، مچڕاندن، تەوقەکردن، دەست لێدانەوە، دەس و مشتاق، دەست لە ناو دەست نان.

**مصاف گاه:** شەڕگە، مەیانی شەڕ.

**مصاقبت:** نزیك بوونەوە لە یەکتر.

**مصالح:** (مَ.لِ) کۆی"مصلحت"، ئەوەی کە ببێتە مایەی بەرژەوەندی و ئاسوودەیی مرۆڤ، بەرژەوەندییەکان. ئەوەی بۆ سازکردنی خانووبەرە پێویستە، کەرەستەی خانووبەرە سازکردن.

**مصالح:** (مُ.لِ) سازشکەر، ئاشتیکەر.

**مصالحه:** پێکهاتن، سازان، ڕێککەوتن، ئاشتیکردن.

**مصالحه‌طلبی:** ئاشتی خوازی.

**مصانعت:** مداراکردن.

**مصاهره:** ژن و ژن خوازی، خزمایەتی. بوونە زاوا.

**مصائب:** کۆی"مصیبت".

**مصب:** ئاوڕێژگە، ڕێژاو، ڕێژاڤ، ڕەزاو، ملەگا، دواوان، جێگەی پێکگەیشتنی دوو چۆم.

**مصحّح:** (مُ.صَ.حِ) 1) ڕاستکەرەوە، هەڵەگر، هەڵەبڕ، هەڵەچن. 2) ئەوەی نمرە دەدا بە بەرگەکانی تاقیکاری.

**مصحّح:** (مُ.صَ.حَ) ڕاست کراوە، هەڵەبڕکراو.

**مصحف:** 1) کتێو، پەرتووك. 2) قورئان.

**مصداق:** نموونە، شایەت. ڕاستێتی. "**مصداق داشتن**": 1) ڕاست/دروست دەرهاتن. 2) بوونی دەرەکی هەبوون.

**مصدر:** (مَ.دَ) چاوگ، چاوگە، چاڤگە، ڕەگەزی وشە، ژێدەر، سەرچاوە، شوێنی گەڕانەوە. "**مصدر کاری کردن**": کردنە مەئمووری ئەنجامدانی ئەو کارە. "**اسم مصدر**": (ڕێزمان) ناوی چاوگ(ە).

**مصدّر:** (مُ.دَ) بان نشین، سەروونشین. "**مصدّر کردن**": لەسەرەوەدانان.

**مصدّق:** (مُ صَ دَ) ئەوەی دروستییەکەی پشت ڕاست کراوەتەوە، تەسێق کراو. "**مصدق داشتن**": پشت ڕاست کردنەوە، تەسێق کردن.

**مصدّق:** (مُ صَ دِ) تەسێق کەر.

**مصدوم:** زەربە دیتوو/وێکەوتوو، بەرکەوتوو، ئازارپێگەیو، کوتراو.

**مصّر:** پێداگر، پێچەقێن، سوور، سوێڕ، شێلگیر، شێتگیر، شێرگیر، مقیڕ، هەتەر.

**مصراع:** 1) خشتە، نیوەشێعر. 2) تایەکی درگا.

**مصرّح:** 1) ڕوون و ئاشکرا. 2) بەڕاشکاوی.

**مصرف :** 1) دەکارکردن، بەکاربردن، کارپێکردن، دەکارهێنان، بەکارهێنان. 2) خەرج(ی)، مزەخت، پێخۆر(برای مصرف زمستان: بۆ پێخۆری زستان). 3) خەرجگە، شوێنی خەرج کردن. 4) بەنداو. "**تاریخ مصرف**": ڕێکەوتنی بەسەرچوون.

**مصرف کننده:** بەکاربەر، بەکارهێن، بەرخۆر.

**مصرف گرایی:** هۆگری بۆ بەکاربردنی کەلوپەلە ئابوورییەکان.

**مصرفی:** 1) شیاوی بەکاربردن. 2) بەکاربەر، بەرخۆر. 3) بەکاربراو.

**مصروف:** 1) دەکارکراو، بەکاربراو، خەرجکراو، خوراو.خەرجی. هەر شتێکی پوخت و پاك کە دەگەڵ شتی دیکەدا ئاوێتە نەبووبێ. 2) هەڵگەڕاوە، وازهێن.

**مصطفی:** هەڵبژاردە، هەڵبژێراو، هەڵبژارتی.

**مصطلح:** 1) زاراوە، ئیدیۆم. 2) باو.

**مصغّر:** بچووك کراو، گچکەکراو. "**اسم مصغر**": ناوی چووکە.

**مصفّ:** جێگەی ڕیز بەستن، گۆڕەپانی شەڕ، شەڕگە.

**مصفا :** (مُ.صَ.فا) پاك، خاوێن. ساف و ڕوون.

**مصقع:** (مِ.قَ) قسەڕەوان، زمان پاراو.

**مصقول:** سیقاڵدراو، مشتوماڵدراو. سوور.

**مصلح:** چاکساز، ڕێفۆرمیست. پێکهێن، ئاشتی کەرەوە، ڕاستکەرەوە.

**مصلحت:** مەسڵەحەت، بەرژەوەندی، قازانج، ڕێوشوێنی دروست و باش. "**مصلحت دیدن**": بەدوای خێر و چاکەوە بوون و چارەدۆزیکردن، بەباش زانین.





**مصلحت آموز:** وەبیرخەرەوەی خێر و چاکەی کەسێ.

**مصلحت آمیز:** مەسڵەحەتییانە.

**مصلحت اندیش:** بڕوانە:"مصلحت بین".

**مصلحت بین:** کەسێ کە لە کارەکان دا خێر و چاکە لەبەرچاو دەگرێ، خێروچاکە دەبەرچاو گر.

**مصلحت دید:** بڕوانە:"صلاح دید".

**مصلوب:** لە خاچ دراو.

**مصمت:** (مُ.مَ) ناوپڕ.

**مصمّت:** (مُ.صَ.مَ) بێدەنگ، کپ، دامرکاو.

**مصمّم:** سوور، پێداگر، شێلگیر، کوڕڕە، کۆڵنەدەر، مکووڕ، بەردەوام.

**مصنّف:** (مُ.صَ.نِ) دانەر، نووسەری کتێب.

**مصنّف:** (مُ.صَ.نَ) دانراو، نووسراو. پۆل پۆل، دەستەدەستە.

**مصنوع:** 1) چێکراو، سازکراو، دەستکرد، دەست ساز. 2) ئافرێنراو، خولقێنراو.

**مصوب:** پەسندکراو، پەژراندی.

**مصوّت:** دەنگدار، بزوێن.

**مصوّر:** (مُ.صَ.وِ) نیگارکێش، وێنەگر.

**مصوّر:** (مُ.صَ.وَ) 1) وێنەگیراو، وێنەکێشراو. 2) وێنەیی، وێنەدار.

**مصورسازی:** (مُ.صَ.وَ) ئامادەکردنی وێنە بۆ دەقی وەك کتێو.

**مصون:** پارێزراو، نگاداریکراو، ڕاگیراو. "**مصون کردن**": پاراستن، ڕاگرتن، نگاداریکردن. "**مصون ماندن**": پارێزران، ڕاگیران.

**مصونیّت:** پارێزراوی، پارێزران.

**مصیبت:** بەلا، ئاپۆر، ئاپۆرە، تەگەرە و تووشی، تەنگوچەڵەمە، چۆرتم، قەدا، قەزا، نەهامەت، نەدامەت، نەگبەتی، کەڵەمە، ماڵ وێرانی، بەسەرهاتی ناخۆش، کارەسات، کۆست، کوێرەوەری، وەیشووم، وەیشوومە، پەتەر. "**مصیبت بزرگ**": جەرگبڕ، بەلای گەورە. "**مصیبت گریبانگیر**": گەردنگر، گەردنگیر، کێشە و بەلای بەسەرهاتگ.

**مصیبت دیده:** بەلا بەسەر هاتگ، تووشی بەلا هاتوو، داغ دیە.

**مصیبت زده:** لێقەوماو، بەلالێدراو، بەلالێدایی، داغ دیە.

**مصیر:** 1) گەڕانەوە، ڤەگەڕیان. 2) شوێنی گەڕانەوە.

**مضاحکه :** شۆخی کردن و پێکەنین.

**مضّاده:** 1) دژایەتی، بەرهەڵستی. 2) دوژمنایەتی.

**مضّار:** کۆی"مضرت".

**مضاربه :** 1 ) تێکهەڵچوون، دەگژیەك ڕاچوون، بەیەکداکێشان، پێکدادان. 2) بازرگانیکردن بە سەرمایەی کەسێکی دی.

**مضارع:** 1) لێکچوو، وێکچوو. 2) داهاتوو، (ڕێزمان) ڕانەبردوو. "**مضارع اخباری**": (ڕێزمان) ڕانەبردووی هەواڵی. "**مضارع التزامی**": (ڕێزمان) ڕانەبردووی پێویستی. "**فعل مضارع**": (ڕێزمان) فرمانی ڕانەبردوو.

**مضاعف:** دووقات، دووبەرابەر، دووئەوەندە.

**مضاف:** سەربار، زیادکراو، پترکراو، ڕەپاڵ دەر. لە ڕێزماندا: دیارخراو. "**مضاف بر**": بێجگەلە، سەرەڕای.

**مضافات:** دەورووبەری شارێ یان سەرزەوییەك.

**مضاف الیه:** بەربار، ڕەپاڵدراو. لە ڕێزماندا: دیارخەر.

**مضامین:** کۆی"مضمون".

**مضایق:** کۆی"مضیق".

**مضایقە:** خستنەتەنگانەوە، سەخت گرتن، درێغیکردن، خۆبواردن لە ئەنجامدانی کارێ یان دانی شتێ. هەژاری، نەداری.

**مضبوط:** 1) تۆمارکراو، ئارشیوکراو، ئەرشیف کری. 2) ڕێکوپێك. 3) پتەو، قایم. 4) ڕاگیراو، پارێزراو. 5) دروست، ڕاست( نسخه اساس، نسخه مضبوطی است). "**مضبوط داشتن**": 1) پاراستن، ڕاگرتن. 2) کۆنترۆڵ کردن. "**مضبوط شدن**": 1) ڕێکوپێك بوون/کران. 2) خرانە ژێر دەسەلات و ئیختیار.

**مضحك:** پێکەنین هێن، پێکەنیناوی، کەنیناوی، قۆشمە.

**مضحکە:** هۆکاری پێکەنین، مایەی پێکەنین، گەپجاڕ، گاڵتەجاڕ. "**مضحکە کسی شدن**": گاڵتەپێکران لەلایەن ئەوەوە.

**مضر:** زەرەرپێگەێن، زیاندەر، بەزیان.

**مضرب:** شوێنی هەڵدانی شتێك.

**مضرّت:** زەرەر، زیان.

**مضروب:** لێدراو، کوتەك خواردوو، تێهەڵدراو، زەربەدیتو. "**مضروب کردن**": لێدان، کوتان.

**مضطرّ:** 1) داماو و بێچارە. 2) ناچار. 3) دەستکورت، دەست تەنگ. 4) بەحاڵەتی داماوی.

**مضطرب:** شلەژاو، پەشۆکاو، شێواو، پەشێو و لەرزۆك، هەولّ بوو، پەرێشان، نیگەران، وەدڵەتەپێکەوتوو.

**مضعّف:** لاوازکەر، بێ تواناکەر.

**مضلّ:** بەلاڕێدابەر، گومڕاکەر، لەخشتەبەر، هەڵخەڵەتێن.

**مضمحل:** لەنێوچوو، تەفروتوونابوو، لەبەریەك بڵاوبوو.

**مضمر:** شاراوە، وەشارتی، لە ناخدا ڕاگیراو، نادیار.

**مضموم:** 1) پیتێ کە بزوێنی بۆری لەسەرە. 2) هاوپێچ کراو، زیادکراو.

**مضمون:** 1) ناوەرۆك، ناواخن، مانا، واتا. 2) نوکتەیەکی باریك و ناسك کە شاعیر لە شێعرەکانی خۆیدا دەیهێنێ. 3) قسەی خۆش، پێکەنینۆك.





**مضمون پردازی:** بەکاربردنی نوکتەی باریك و ناسك لە شێعردا.

**مضمونی:** واتادار، مانادار.

**مضیّ:** (مُ.ضِ) ڕۆیشتن، تێپەڕبوون.

**مضیق:** شوێنی بەرتەسك، تەنگەبەر، بەرتەنگ، تەڵزگە.

**مضیقە:** تەنگانە، تەنگژە، تەنگەبەر. دەستەنگی، نەداری.

**مطابق:** یەکسان، بەرابەر. "**مطابِق**": بەپێی، بە گوێرەی. "**مطابق کردن**": بەرابەرکردنی شتێ دەگەڵ شتێکیتر.

**مطابقت:** 1) یەکسان و بەرابەربوونی شتێ دەگەڵ شتێکی دی. 2) گونجان و سازگاری. "**مطابقت دادن**": بەراوردکردن، پێك گرتن. "**مطابقت کردن**": 1) بەراوردکردن. 2) بەرابەریکردن، بەرابەربوون، هاوڕێك بوون، دەگەڵ یەك هاتنەوە.

**مطار:** فڕینگە، فڕۆکەخانە، بالافرگە.

**مطاع:** کەسێك کە خەڵك پێڕەوی لێبکەن.

**مطالب:** کۆی"مطلب"، بابەتەکان، نووسراوەکان.

**مطالبە:** 1) داخوازی، ویست، داواکاری مافی خۆ بوون. 2) بڕوانە:"بازخواست".

**مطالعات:** کۆی"مطالعە"، توێژینەوەکان، لێکۆڵینەوەکان.

**مطالعە:** 1) موتالاّ/ متالاّ کردن، وەخوێندن، خوێندنەوەی بێ دەنگ و هەربەچاو، وانەیش، وەندس، وەندش. 2) تاوتوێ، لێکۆڵینەوە. 3) دیتن، تواشاکردن. "**مطالعە داشتن**": لێکۆڵینەوە و تاوتوێ کردن.

**مطامع:** کۆی"مطمع".

**مطاوع:** ملکەچ، گوێڕایەڵ، بەرفەرمان.

**مطاولت:** ئەنجامدانی کارێك بە ساوەساو، کێش دانی کارێ، گنخاندن.

**مطایبە:** شۆخی کردن.

**مطبخ:** چێشتخانە.

**مطبع:** چاپخانە.

**مطبوخ:** کوڵاو، کوڵێنراو، لێنراو.

**مطبوع:** 1) چاپکراو. 2) شتێ کە لە گەڵ زەوقی مرۆڤ بێتەوە، خۆش، سازگار.

**مطبوعات:** چاپەمەنی، بەلاڤۆك.

**مطبوعاتچی:** ڕاگەیەنکار.

**مطبوعاتی:** 1) ڕاگەیەنکار، ئەوەی لە بەلاڤۆك دا ئیش دەکا. 2) ڕۆژنامەفرۆشی. "**مصاحبە مطبوعاتی**": وتووێژی چاپەمەنی، کۆنگرەی ڕۆژنامەوانی.

**مطرّا:** تەڕوتازە و ئاودار.

**مطراگر:** تەڕوتازەکەرەوە، تەڕوبڕکەرەوە.

**مطرب:** ژەنیار یان گۆرانیبێژ یان سەماکار، بێلتیڤان، بەزمگێڕ.

**مطرح شدن:** هاتنەئاڕا، هاتنەبەرباس، هاتنەگۆڕ، خرانەڕوو.

**مطرح کردن:** هێنانەبەرباس، هێنانەکایە، هێنانەگۆڕ، خستنەڕوو، ئانینەرۆژەڤ، ئانینەبەرباس. شوێنی خستن/هاویژتن.

**مطروح:** هاوێژراو، فڕێدراو. (بیرکاری) دەرکراو.

**مطرود:** دەرکراو، ڕادراو، دوورخراوە. "**مطرودشدن**": خرانەلاوە، دەرکران.

**مطعم:** 1) چێشتخانە. 2) خۆراك، خواردەمەنی.

**مطعون:** 1) بە نێزە لێدراو. 2) تانەلێدراو، سەرزەنشت کراو. 2) نادروست.

**مطفی:** 1) کووژێنەر، دامرکێن. 2) سوکنایی دەر.

**مطلا:** زێڕکفت کراو، زێڕچن کراو.

**مطلب:** 1) هەرجۆرە نووسراوە یان وتەیەك. 2) بابەت، درغە، شیاوی نووسین. 3) مەبەست، مراد. 4) ناوەرۆك و واتایەك کە لە نووسراوە یان وتارێك دایە. 5) (فەلسەفە) هەر پرسیارێ کە بۆ پێناسە و تاوتوێی دۆخ و هەقیقەتی شتەکان بەکار دەبرێ. "**حق مطلب را ادا کردن**": پڕ بە پێست بوون، بایەخی تەواو پێدان.

**مطّلع:** (مُ طَ لِ) ئاگادار، بەئاگا، خەبەردار، خەوەردار، هایا، های دار، هایلێ. "**مطلع شدن**": بیستنەوە، پێگەیشتنەوە، گوێ لێ بوونەوە، ئاگاداربوون/ بوونەوە.

**مطلع:** 1) شوێنی هەڵاتنی ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ. 2) یەکەمین کۆپلە لە غەزەڵ و قەسیدە و هتد. 3) سەرەتا. 4) قیامەت.

**مطلق:** 1) بەدوور لە کەموکورتی و سنووردارێتی و کۆتوبەند، تەواو، کامڵ (زیبایی مطلق، قدرت مطلق). 2) ئازاد و ڕەها. 3) بێ شەرت و مەرج. 4) پوخت، ناتێکەڵاو، پاك. 4) بەهیچ کلۆنجێ. 6) بەشێوەیەکی گشتی.

**مطلقاً:** 1) بەتەواوی، یەکجێ، بێزیادوکەم. 2) حاشاوەلیللا، هەرگیز، بەهیچ بارێکدا نە، لەهیچ کاتێکدا.

**مطلقات:** ژنە تەڵاق دراوەکان.

**مطلق العنان:** 1) خاوەنی دەسەڵاتی تەواو و کامڵ. 2) سەرەڕۆ، خۆسەر، لاسار، ملهوڕ.

**مطلق انگاری:** بڕوا بەوەی کە هەموو شتێ تەواوە و هیچ شتێ ڕێژەیی نیە، دوگماتیسم.

**مطلق گرایی:** 1) تیۆرییەك کە لەو بڕوایەدایە کە دەبێ تەواوی دەسەڵاتەکان بە دەسەڵاتدارێك بسپێردرێ، ڕەهاگەری. 2) بڕوانە: "مطلق انگاری".

**مطلقە:** تەڵاق دراو.

**مطلوب:** 1) دڵخواز، باش. 2) داواکراو، خواستراو، ویستراو. 3) خۆشەویست، دۆست.

**مطلوبیت گرایی:** (ئابووری) بڕوا یان بایەخدان بە دابین کردنی زۆرترین خۆشگوزەرانی و بەختەوەری بۆ زۆرترین کەسەکان.





**مطمح:** 1) جێی سەرنج. 2) شوێنی تواشاکردن.

**مطمع:** شتێ کە تەماحی تێبڕن، شتێ کە بکەوێتە بەر تەماحەوە.

**مطمئن:** خاترجەم، دڵنیا، ئارخەیان، ئەرخەیان، فریقەت، بێ خەم، دڵ ئاسوودە، بێترس.

**مطمئناً:** 1) بێگومان، بێ شك. 2) بەخاترجەمی، بەدڵنیایی.

**مطهّر:** (مُ.طَ.هِ) پاك کەرەوە، خاوێن کەرەوە.

**مطهّر:** (مُ.طَ.هَ) پاك و پیرۆز، پاك و خاوێن.

**مطیِّب:** 1) بۆنخۆشکەر. 2) شتێ کە بۆنی خۆش بدا.

**مطیع:** ژێردەست، بەرفەرمان، ژێرفەرمان، سەرخوار، ملکەچ، گەردنکەچ، ملچەوت، فەرمانبەر، ڕاژێر، گوێڕایەڵ، گوێلەمست، گوێ بە فەرمان.

**مظالم:** 1) کۆی"مظلمە". 2) ستەمەکان. 3) دادخوازی، لێکۆڵینەوە لە ستەمەکان. 3) دادگە. "**بە مظالم نشستن**": ڕێخستنی کۆڕ یان کۆبوونەوەیەك بۆ لێکگۆڵینەوە لە سکاڵاکان.

**مظانّ:** کۆی"مظنە"، جێی گومان.

**مظاهر:** (مَ.هِ) کۆی"مظهر".

**مظاهر:** (مُ.هِ) پشتیوان، پشتگر، یاریدەدەر.

**مظاهرت:** (مُ.هِ) 1) خۆپیشاندن. 2) یارمەتیدان، پشتیوانی.

**مظفّر:** سەرکەوتوو، سەرکەڤتی، براوە، زاڵ.

**مظلم:** تاریك و نووتەك، تاریکەسەلات.

**مظلمە:** ئەوەی بە زوڵم و ستەم لە کەسێك دەگیرێ، ستەمێ کە لە کەسێك کراوە. "**مظلمەبردن**": سکاڵاکردن، شکایەت کردن.

**مظلوم:** 1) زۆرلێکراو، ناهەقی لێکراو، ستەم لێچوو، بەشخوراو، زیان لێدراو، مەغدوور، دەشەنی. 2) بێ ئازار، فەقیر.

**مظلوم نما:** ئەوەی لە ڕواڵەتدا خۆی وەك زوڵم لێکراو و فەقیر پیشان دەدا.

**مظلّە:** خێوەت، سێبەر، چەتر. "**مظلّەخضراء**": بریتی لە ئاسمان.

**مظنون:** گومان لێکراو، جێگەی گومان. "**مظنون شدن**": دڕدۆنگ بوون، بەدگومان بوون.

**مظنّە:** 1) جێگەی گومان، جێگەی شك. 2) مەزننە، مەزندە، نرخی کاڵا. 3) گومان.

**مظهر:** 1) شوێنی دەرکەوتن، شوێنی ئاشکرابوون، دیارگە. 2) ڕواڵەت، دیمەن. 3) نیشانە، هێما. 4) سەرچاوە.

**معابد:** کۆی"معبد".

**معابر:** کۆی"معبر".

**معاتب:** سەرزەنشت کراو، لۆمەکراو.

**معاتبت:** سەرزەنشت، لۆمە.

**معاد:** 1) گەڕانەوە، ڤەگەڕیان. 2) شوێنی گەڕانەوە. 3) ژیانەوە، هەڵسانەوە، زیندووبوونەوەی مرۆ دوای مردنی لە ڕۆژی پەسڵان. 4) بڕوا بە سەر لەنوێ زیندووبوونەوە. 5) ئەو دنیا، قیامەت.

**معادات:** دەگەڵ یەك دوژمنایەتیکردن، بوونە دوژمنی یەکتر.
**معادل:** 1) هاوتا. 2) هاوكێش، هاوسەنگ. 3) هاومانا. 4) بەرابەر، یەكسان.
**معادلە:** 1) هاوكێشە، هاوسەنگی. 2) پەیمان، گرێبەست. "معادلەكردن": بەرابەریكردن.
**معادن:** كۆی"معدن".
**معادی:** دوژمن.
**معاذ:** 1) پەنابردن، هانابردنەبەر. 2) پەناگە، حەشارگە.
**معارض:** 1) بەرهەڵست(كار)، نەیار، بەرەنگار، دژ، هۆگەچ. 2) خەنیم، رقەبەر.
**معارضە:** 1) بەرهەڵستی، بەرگری، بەرپەرچدانەوە، بەربەرەكانی. 2) رووبەڕوو، بەرامبەر. "معارضەكردن": 1) دژایەتیكردن. 2) بەربەرەكانیكردن. 3) باس و مشتومڕكردن. 4) بە تانە قسەكردن. "بە معارضە برخاستن": دژایەتیكردن.
**معارف:** كۆی"معرف"، زانستەكان. كەسانی ناسراو، ناودارەكان.
**معارف پرور:** پەرەپێدەری زانستەكان، زانست پەروەر.
**معارفە:** یەكترناسین، بە ئاشنا دەرچوون.
**معارك:** كۆی"معركە"، شەڕگەكان.
**معاش:** 1) ژیان كردن، ژیان بە سەر بردن. 2) بژیوی، پێداویستی ژیان. 3) مووچە.
**معاشر:** (مَ.شِ) كۆی"معشر"، گروپەكان، كۆمەڵەكان.
**معاشر:** (مُ.شِ) هەڤاڵ و هاودەم، هاونشین.
**معاشرت:** هەڵسوكەوت، دانوستان، هاتوچۆ و تێكەڵی، دەگەڵ یەكتر ژیان، هاوڕێیەتی.
**معاشقە:** ئەوینداریكردن، دڵداریكردن.
**معاصر:** 1) هاوچەرخ، هاوچاخ، هەڤچاخ، هەڤدەم، هەڤبەز، هاودەورە، هاوزەمان. 2) ئەمڕۆیی، نوێ.
**معاصی:** كۆی"معصیّت".
**معاضد:** یارمەتیدەر، یاریدەدەر.
**معاضدت:** یاریدەدان، یارمەتیدان.
**معاف:** بەخشراو لە ئەركی سەرشان، بووراو، عافووكراو، نوخافتی. "معاف خواستن": داوای لەسەر كار لابردن كردن. "معاف داشتن": بەخشین، عافووكردن.
**معافیّت:** كەوتنەبەرلێبوردن، عافووكران. "معافیّت كفالت(تكفل)": عافوكران لە خزمەتی سەربازی بەهۆی سەرپەرشتی كردنی دایك و باوك یان نەنە و باپیرە.
**معاقب:** (مُ.قِ) 1) ئازاردەر، ئەشكەنجەدەر. 2) ڕاوەدوونەر، شوێن هەڵگر، شوێن كەوتوو.
**معاقبە:** سزادان، ئەشكەنجەكردن، ئازاردان، تەمێكردن.
**معاقدە:** دەگەڵ یەك پەیمان بەستن.
**معاقل:** كۆی"معقل".





**مع الاسف:** داخەكەم، داخی گرانم، داخی داخانم، مخابن.
**مع الوصف:** لە گەڵ ئەوەش دا كە، سەرەڕای.
**معالج:** تیماركەر، دەرمانكەر، چارەكەر.
**معالجە:** چارەسەركردن، چارەكردن، دەرمان كردن، تیماركردن. "معالجە موضعی": چارەسەری شوێنكاری.
**معالم:** نیشانەكان.
**معالی:** خسڵەتە دیار و باشەكان. پۆستە بەرزەكان.
**معامل:** مامڵەكەر، مامەلەچی، ئاڵوویركەر.
**معاملە:** 1) مامڵە، مامەڵە، داوستە، دادوبسەت، دان وستان، سەودا، ئاڵوویر، كڕین و فرۆشتن، ئاڵشت. 2) ڕەفتار، هەڵسوكەوت. 3) ئەندامی جووت بوونی پیاو، چووك، سیرەت. 4) بڕینی قۆناغەكانی سۆفیگەریێتی بۆ نزیك بوونەوە لە خودا. 5) هاتوچۆكردن. "معاملە بە مثل": دان و ستان. "معاملە رفتن": ئەنجامبوونی مامڵە. "معاملە فضولی": مامڵە لەسەر ماڵ و سامانی كەسێكیتر بەبێئیزن یان نوێنەرایەتی لەلایەن ئەوەوە. "معاملەی پایاپای": ماڵ بە ماڵ، دووسەر، سەربەسەر، گۆڕینەوەی كالا بە كالا.
**معاندت:** دژایەتی، دوژمنایەتی.
**معانقە:** دەستەملانی یەكتربوون، یەكتر لە باوەش گرتن.
**معانی:** كۆی"معنی".
**معاودت:** گەڕانەوە، گەڕیانەوە، ڤەگەڕیان.
**معاوضە(كردن):** گۆڕینەوە، گۆڕانەوە، گۆڕاننەوە، پێك گۆڕینەوە، ڤەگوهارتن، هەڤ گوهارتن، گوهەڕ، گوهەڕین، گوهەڕاندن، گوهێرەك، هەڤگەلی، وەگۆڕانی شت بە شت، ڕشت، بەردیل، ماڵ بە ماڵ، ژن بە ژن.
**معاون:** 1) جێگر، جێنشین. 2) دەستیار، یارمەتیدەر، یاریدەدەر. 3) هاودەست، شەریك. "معاون امیر": میرك، بەردەستی میر، جێگری میر.
**معاونت:** 1) یارمەتیدان، یاریدەدان. 2) جێگر. 3) هاودەستی، بەشداربوون (بە جرم معاونت در سرقت بازداشت شد).
**معاهد:** (مَ.هِ) كۆی"معهد".
**معاهد:** (مُ.هِ) هاوپەیمان، هاوسوێند.
**معاهدە:** (مُ.هِ) پەیمان، پەیماننامە. "معاهدەبستن": بڕوانە:"عهدكردن".
**معاینە:** سەحكردن، تێڕوانین بە وردی، تەماشاكردنی لەش بە وردی، دەویان. بەچاودیتن. ئاشكرا، بەڕاشكاوی. "بەمعاینە": بەڕاشكاوی، بەڕوونی.
**معبد:** پەرستگە، پەرستگا، مزگ، مزگان.
**معبر:** (مَ.بَ) گوزەر، ڕێڕەو، شوێنی ڕابردن/تێپەڕین، پرد.
**معبّر:** (مُ.بِ) شرۆڤەكەر، شرۆكەر، لێكدەرەوەی خەون.
**معبود:** 1) پەرستێنراو، پەرستراو، بەندێتی. 2) خودا.

**معتاد:** گیرۆده، خوو پێگرتوو، ڕاهاتوو.

**معتبر:** 1) بڕواپێکراو، جێی باوەڕ، جێگەی متمانه، جێگەی متمانه، بەقاپێکراو، بەڕێز و قەدر، بەڕێز، موحتەرەم، ڕیش سپی. 2) بەرچاو، گرینگ. 3) بەنرخ، بەهادار.

**معتدل:** 1) فوونك، فوونکایی، فوونکی، نه گەرم نه سارد، هەوای سازگار. 2) میانەڕەو، مامناوەند. 3) هاوکێش، هاوڕێژه.

**معتدی:** سنووربەزێن، دەست درێژ، زۆردار.

**معترض:** خۆپیشاندەر، ڕەخنەگر، وردەگیر.

**معترضه ـ جمله:** ڕستەیەك له دەرەوەی بابەت که بێته ناو ئاخاوتەوه.

**معترف:** درکێن، درکێنەر، مکوڕ، موکوڕ، مقیڕ، دانپیانەر، پێلێنەر. **"معترف به":** دانپیانراو. **"معترف شدن":** دانپیانان، درکاندن، پێلێنان، ڕاستی گوتن.

**معتزل:** گۆشەگیر، کەنارەگیر.

**معتسف:** بڕوانه:"منحرف".

**معتصم:** دەستەوداوێن بوو، داوێن گیر، پەنابەر.

**معتقِد:** (مُ.تَ.قِ) بڕوامەند، به بڕوا، باوەڕدار، بەبیروبڕوا.

**معتقَد:** (مُ.تَ.قَ) بڕوا، باوەڕ، ئەوەی ئینسان بڕوای پێیەتی.

**معتکف:** گۆشەنشین.

**معتمد:** (مُ.تَ.مَ) جێی بەقا، باوەڕپێکراو، متمانەپێکراو، تێڕادیتوو. **"معتمد داشتن":** تێڕادیوی، تێڕادیتن.

**معتنی:** بایەخ پێدەر، گوێ پێدەر، خەم لێ خۆر.

**معتوه:** کەم ئاوەز، ئەقڵ سووك، شێتۆکه، سەرگەردان.

**معجب:** (مُ ج ِ) سەرسووڕهێنەر، سەیر و سەمەرە.

**معجز:** 1) جاڕزکەر، وەڕەزکەر. 2) بڕوانه: "معجزه". **"معجز دادن":** بەجێهێنانی نزا یان داخوازی کەسێك.

**معجزنما(ی):** سەیروسەمەرە، سەرسووڕهێنەر.

**معجزه:** 1) پەرجۆ، دەرئاسا، توانابڕ، کارێ که له دەست مرۆڤی ئاسایی نەیات. 2) سەراسایی.

**معجم:** (مُ جَ) 1) پیتی خاڵدار. 2) فەرهەنگی وشه، وشەدان.

**معجون:** تێکەڵ کراو، شێلراو. هەوێر.

**معدّل:** (مُ.عَ.دَ) 1) نێونجی، ناونجی. 2) یەکسان و هاوکێش کراو. 3) تێکڕا.

**معدلت:** دادپەروەری، دادگەری.

**معدلت پرور:** دادپەروەر، دادگەر.

**معدن:** 1) کان، کەن، کەند، کانگە، کانگا، کانۆك، کاراك، کارە، مەڵبەن، مەڵبەند. 2) سەرچاوە، ئاخێزگە. **"معدن آب گرم":**





گەرمکاو، گڕاو. **"معدن خاك رس":** گڵەجان، گڵەجانی، گڵەنجان، گڵێنجان، گڵکەن، گڵکەند، کانی گڵەدیزە و ئێربار. **"معدن زغال سنگ":** کەمران، کانزای خەڵووزەبەردینه. **"معدن کوچك":** کانۆك. **"معدن گچ":** گەچینه، کانی گەچ.

**معدنچی:** کانکەن، کەسێ که له دانەوەی کاراك خەریکه.

**معدن کاوی:** هەڵکۆڵینی کان و دەرهێنانی کانزا لێی.

**معدنی:** 1) کانزا، هەرچی له کان پەیدا دەبێ. 2) جەوهەری، زاتی. **"آب گرم معدنی":** گەرماو، گەرمۆ.

**معدود:** 1) ژماردراو، ژمێرراو. 2) کەم، نەختووکه.

**معدوم:** 1) تەفروتوونا، له ناوبراو، گوم بوو. 2) له سێدارەدراو.

**معده:** گەدە.

**معذَّب:** ئەشکەنجەدراو، ئازارچەشتوو، ناڕەحەت.

**معذرت(خواهی):** داوای لێبوردن، لێبوردن خوازی، داوای بەخشینکردن، عوزرخوازی.

**معذور:** 1) عوزرهێنەوە، کەسێك که عوزر و بیانووی قبووڵ بکرێ. 2) ژنێ که له عادەتی مانگانەدایه.

**معرا/معری:** 1) ڕووت، پەتی. 2) پاك.

**معرّب:** (مُ.عَ.ڕَ) به عەرەبی کراو، وشەیەك که عەرەب له زمانێکی ترەوە بیگرێ و به فۆرمی وشەی عەرەبی دەرهێنابێ. (ڕێزمان) ئەو وشەیەی له پارزنین(اعراب)ی رستەیەکی عەرەبیدا بزاوتی پیته کۆتاییەکەی به گوێرەی (رفع و نصب و جر) دەگۆڕێ.

**معرض:** (مَ.ڕَ) پیشانگە، پێشانگەه، بەردەم، شوێنی نیشان دان، شوێنی خستنه ڕوو.

**معرض:** (مُ.ڕِ) ڕوو وەرگێڕان له شتێ، پشت تێکەر، خۆبوێر.

**معرِّف:** 1) ناسێنەر، ئاشناکار، پێناسکار. 2) شیمی) ئەندیکاتۆر(معرف شیمیایی).

**معرفت:** 1) مەعریفه، ئەبستیم. 2) ناسینی کەسێ یان شتێك و ئاشنابوون به تایبەتمەندییەکانی ئەو له ڕێگەی موتالا و لێکۆڵینەوە یان ئەزموونەوە. 3) زانست. 4) ناسینی دابونەریتی کۆمەڵگا و ڕەچاوکردنیان له له تێکەڵی و پێوەندی دەگەڵ دیتراندا. 5) ئاشنایەتی، شارەزایی. **"معرفت استدلالی":** (فەلسەفە) تێگەیینی وردەکارییەکان به بەڵگەوە **"معرفت الاحشاء":** هەناوناسی. **"معرفت الارض":** زەوی ناسی. **"معرفت الجو":** کەشناسی. **"معرفت الحیات":** بڕوانه:"زیست شناسی". **"معرفت العروق":** دەمارناسی. **معرفت العضلات":** ماسولکەناسی. **"معرفت المفاصل":** جومگەناسی. **"معرفت النفس":** دەروون ناسی، پسیکۆلۆژی. **"معرفت حسی":** ئاگایی و ناسینێ که له ڕێگەی هەسته ڕواڵەتییەکانەوە وەدەست دێ. **"معرفت شناسی":** ئەبستیمۆلۆژی، زانستێ که سەبارەت به سەرەتا و چییەتی و ڕادە و بایەخی زانستی مرۆڤەوه دەدوێ.

**معرفه ـ اسم:** دیارناو، ناوی ناسراو.

**معرفی:** پێناساندن، ناساندن، پێناسین، پێدانەناس کرن.

**معرفی‌نامه:** ناسێن نامە .

**معرکه:** 1) گۆڕەپانی شەڕ، شەڕگە. 2) شوێن یان قەرەباڵغی تێکەڵ بە هات و هاوار یان مەترسی. 3) زۆر باش. 4) گرفتاری، ژانەسەر. "**معرکه برپا کردن**": قاڵ و هەراوهەنگامە وەڕێخستن. "**معرکه چیزی گرم شدن**": برەوسەندنی ئەو. "**معرکه شدن**": 1) بارودۆخی زۆرباش پەیداکردن. 2) دەنگەدەنگ و حەلەلا سازبوون. "**معرکه‌کردن**": گاڵەکردن، گاڵە پێکردن، چاك وەخۆکەوتن لە کارێك. "**از معرکه دور بودن**": ئاگادارنەبوون لە ڕەوتی شتێ.

**معروض:** 1) پێشکەش کراو، دەرخراو، پیشاندراو. 2) ئەوەی شکایەتی لێکراوە. "**معروض داشتن**": وتن، گوتن، عەرزکردن.

**معروضات:** نووسراوەکان یان وتەکان.

**معروضه‌جات:** بڕوانە:"معروضات".

**معروف:** 1) ناسراو، ناودار، بەناوبانگ. 2) واجبی شەرعی.

**معروفه:** سۆزانی، ژنی بەدکارە.

**معروفیّت:** ناوبانگ، ناڤدەنگ.

**معزّز:** بەڕێز، خۆشەویست، ڕێزدار، هێژا.

**معزول:** 1) لە کار لادراو، لە سەر کار لابراو، کاربەدەستی دەرکراو، راقەتاندی، لێکەفتگ، لێکەفتە، لێکەوتوو، بێکار و گۆشەنشین. 2) بێبەش، بێنسیب. "**معزول شدن**": 1) لەسەر کار لابران، لێخران. 2) دوورکەوتنەوە، چوونەلاوە.

**معسر:** (مُ.سِ) ئاتاج، دەسکورت، دەست تەنگ.

**معسّر:** (مُ.عَ.سِ) دژوار.

**معشر:** کۆمەڵ، دەستە، گروپێك لە خەڵك.

**معشوق:** 1) دۆس، دۆستك، لەیل، خۆشەویست. 2) گراوی، دلبەر، دڵبەند. 3) خودا.

**معشوقه:** 1) ژنێ کە دەگەڵ پیاوێ پێوەندی نامەشرووعی هەیە. 2) گراوی، دڵبەر، دلبەر، دڵبەند، دڵدز، دلدایی، واشتا، ماشقە، ماشکە، کزەی جەرگان، گیانی گیانان، جانانە، گوڵم، یاری مێوینە. 3) دۆس، دۆست، خۆشەویست.

**معصر:** کچێ کە نزیك بە باڵق بوونە .

**معصره:** گوڤاشگە، گوڤاشتەك، گوشینگە، کوشینگە، هێسل.

**معصوم:** پاك، بێگوناه، تاوان نەکردە.

**معصومیّت:** بێ گوناهی، پاکێتی، پاکبوون.

**معصیّت:** 1) گوناه، تاوان. 2) سەرکێشی. "**معصیّت کردن**": تووشی گوناح بوون.

**معصیت کار:** گوناحکار، گوناحبار.

**معضل:** 1) دژوار، سەخت. 2) کاری دژوار، کێشە، گرفت. 3) بەشێوەی دژوار.

**معطّر:** بۆنخۆش.





**معطّل:** 1) دەسەوسان، دەستەوستان، دەستەوەستان، بێکار، بێکارمانەوە، ماتڵ، مەحتەل. 2) چاوەڕوان. 3) بێکار و بێئاسۆ. "**معطل داشتن**": لە چاوەڕوانیدا هێشتنەوە، ماتڵ کردن. "**معطّل شدن**": 1) ماتڵ بوون، مەحتەل بوون، بێکارمانەوە. 2) چاوەڕوان بوون، درەنگکردن. "**معطل ماندن**": 1) ماتڵ مانەوە. 2) چاوەڕوان بوون. 3) داخران، بەستران. 4) بێکار مانەوە.

**معطّلی:** 1) ماتڵی، مەحتەلی، ماتڵ بوون، بێکاری. 2) چاوەڕوانی.

**معطوف:** 1) بادراو، چەماوە و بەلاداهاتوو. 2) ئەوەی خراوەتە بەر ڕوانین و سەرنج، ئاراستەکراو. 3) پەیوەست. "**معطوف کردن**": ئاراستەکردن. بەستنەوە، گرێدان.

**معظم:** (مُ.ظَ) 1) زۆرترین بەشی شتێ. 2) گەورە و گرینگ.

**معظّم:** (مُ.عَ.ظَ) خاوەن شکۆ، بەشکۆ، شکۆدار.

**معفو:** بەخشراو، عافووکراو.

**معقّد:** (مُ.عَ.قَ) 1) ئاڵۆز، دژوار. 2) بەگرێ و ئاڵۆزکاو.

**معقل:** (مَ.قِ) قەڵا، جێگەی پەنا.

**معقود:** بەستراو، گرێدراو. ژمێردراو.

**معقول:** 1) ئاوەز پەسند، بەجێ، شیاو، بەرئاوەز. 2) زۆر، زیاد. 3) دروست و حەساوی. "**معقول و منقول**": زانستە فەلسەفی و زانستە شەرعییەکان.

**معکوس:** پێچەوانە، چەپەوانە، ئاوەژوو، بەرەڤاژی، وەرگەڕاو، تەرسە.

**معلّق:** هەڵپەسێراو، هەڵپەسارتوو، هەڵپەسارتە، هەڵپەساردە، هەڵپەساردوو، هەڵ سپێراو. هەڵواسراو، ئاوێزان. "**معلّق در نوسان**": شندل، بەحەواهەڵواسراوی بە تەکەتەك. "**معلّق زدن( برداشتن، خوردن )**": سەرموقلات بردن. "**معلّق شدن**": هەڵ پەسێران، هەڵ سپێران، بێکارکران. "**معلّق کردن**": 1) هەڵپەساردن/تن، هەڵ سپاردن، لەکارخستن، لەچاوەڕوانیدا ڕاگرتن. 2) هەڵواسین، هەڵاوەسین، داشۆڕاندن، دالەقاندن.

**معلق بازی:** سەرموقلات دان.

**معلّقه:** نیوەچڵ و وێڵ بوو، بێئاسۆ.

**معلّل:** (مُ.عَ.لِ) دەربڕی هۆ/هۆکار.

**معلّل:** (مُ.عَ.لَ) هۆدار، ئەوەی کە دەلیل و هۆکاری هەیە.

**معلّم:** ماموسا، مامۆسا، مامۆستا، فێرکار، دەرس بێژ، وانەبێژ، هەڤۆتکار، هیندار، هینکار، سەیدا.

**معلول:** 1) کەم ئەندام، پەك کەوتە، سەقەت، مڤرۆ، نوقسان، نقوستان، نەقوستان، نوسخان. 2) (فەلسەفە) بەرهۆ، ئاکام. 3) نەخۆش، دەردەدار.

**معلولیّت:** 1) کەم ئەندامی، نوقستانی. 2) بەرهۆیی.

**معلوم:** 1) ئاشكرا، ڕوون. 2) زانراو، (ڕێزمان) ناسراو. 3) دیار. **"معلوم داشتن":** 1) ئاشكراكردن، دەرخستن. ئاگاداربوون، بەخەبەربوون. 3) سەرمایەهەبوون، پارە هەبوون. **"معلوم شدن":** ڕۆشن/ڕوون بوونەوە، دیاردان، دیاریدان. **"معلوم كردن":** 1) ڕۆشن كردنەوە، دەرخستن، ئاشكراكردن. 2) تێگەیشتن، زانین. 3) پرسین. **"معلوم كسی كردن":** ئەو تێگەیاندن.

**معلومات:** كۆی زانست و زانیارییەكان.

**معلومات فروش:** كەسێك كە زانست و زانیاری خۆی بەڕووی خەڵكیدا دەدا.

**معمّا:** 1) مەتەڵ، مەتەڵۆكە، مەتهەڵۆك، تشتانۆك، شتیكانێ، چمام، فیشاردە، قەوسەل، قاف، ئەوەچیە. 2) ناڕوونی، ئاڵۆزی.

**معمار:** 1) ئاڕشیتێكت، بیناساز، تەلارساز. 2) ئەوەی بناغەی شتێ دادەڕێژێ و پەرەی پێدەدا.

**معماری:** 1) زانست و هونەری سازكردنی بینا. 2) تەلارسازی. 3) شێوازی داڕشتن و چێكردنی بیناكان.

**معمّر:** 1) بەتەمەن، پیری بە ساڵاچوو. 2) ئاوەدان.

**معمم:** مەندیل بەسەر، مێزەربەسەر، ئاخوند.

**معمور:** 1) نووژەن كراوە، ئاوەدان. 2) بەرز. 3) پڕ، لێوڕێژ. 4) ئاسوودە، خۆش بژیو، حاڵ خۆش.

**معمول:** 1) كار یان ڕەفتار یان نەریتی باو. 2) باو، ئاسایی. 3) ڕەعەمەل هاتو. **"معمول كردن":** 1) كردنەباو. 2) جێبەجێكردن، ئەنجام دان. **"بنابر (بنا بە) معمول":** بەپێی نەریتی باو.

**معمولاً:** بەشێوەی سروشتی، زۆرجار، زیاتر.

**معمولی:** ئاسایی، عادی، نە ئەوەندە باش.

**معنایی:** 1) مانایی. 2) مەعنەوی.

**معنوی:** 1) واتایی، مانایی. 2) ورەیی، مەعنەوی. 3) ناوەكی، ناخی، مەعنەوی.

**معنویّت:** مەعنەوییەت، ورە و هێزی دڵ. غەیرەماددی بوون.

**معنی:** 1) مانا، واتا. 2) نیاز لە قسە و نووسراو، وێڕ، مەبەست. 3) بارە، بابەت (در این معنی زیاد صحبت شده است). 4) لایەنی مەعنەوی و غەیرەماددی شتێ. 5) هەقیقەت، ناخ و ناوەرۆكی شتێ. 6) هۆ. 7) كار، كردەوە. **"معنی توصیفی":** مانای وەسفی. **"معنی شكنی":** مانا/واتاشكێنی. **"معنی شناسی":** ماناناسی، واتاناسی. **"معنی ضمنی":** واتای پاڵەكی. **"معنی كردن":** 1) ماناكردنەوە. 2) وەرگێڕان. **"معنی لغوی":** مانای قاموسی/وشەیی. **"به معنی":** لە هەقیقەتدا، لە ڕاستیدا. **"بەهیچ معنی":** بە هیچ كلۆنجێ، هەرگیز. **"درمعنی":** لە هەقیقەتدا.





**معنی دار:** مانادار، پڕمانا، واتادار. هەڵگری مەبەست یان نیازێكی تایبەتی. **"معنی داری":** واتاداری، ماناداری.

**معنی دان:** مانازان، تێگەیو لە هەقیقەتی كاروبارەكان.

**معنی شناس:** 1) بڕوانە:"معنی دان". 2) ئەوەی لە زانستی ماناناسیدا موتاڵا و لێكۆڵینەوە دەكا.

**معنی شناسی:** زانستی ناسینی مانا، تاوتوێی پێوەندیی نێوان مانا و واتاكان.

**معنی گذار:** ڕەهاكەری مانا و ناخ و هەقیقەتی شتەكان.

**معنی گزار:** شرۆڤەكەری مانا.

**معنی لان:** پڕمانا.

**معوّج:** (مُ.وَ) لار، لارەوەبوو، چەمیو، ناڕاست. **"كج و معوّج":** چەپ و چیڕ، چیران چەپ، خواروخێچ.

**معوّق:** ڕاگیراو، دواخراو، پەك خراو.

**معوّل:** جێگەی متمانە، پشت ئەستوور.

**معونت:** یارمەتیكردن، یاریدەدان، هەڤكاریكرن، دەستگیری.

**معهد:** 1) پەیمانگە. 2) شوێنی كۆبوونەوە یان ئامادەبوونی خەڵكی.

**معیار:** 1) پێوەر، پێوانە. 2) سەرچەشن. 3) نرخ، بایەخ.

**معیارشناختی:** پێوەرناسانە.

**معیارشناسی:** پێوەرناسی.

**معیب:** بڕوانە: "معیوب".

**معیّت:** هاوڕێیەتی، دەگەڵ یەك بوون.

**معیشت:** گوزەران، بژیوی، ژیان، بەڕێچوون.

**معین:** (مُ.عِ) یارمەتیدەر، هاریكار.

**معیّن:** (مُ.عَ.یَ) دیاریكراو، دەست نیشانكراو، هەڵبژێراو، دانراو.

**معیوب:** عەیب دار، سەقەت، زەدەدار، خەوشدار، گۆسپە، ناساغ، ناساخ.

**مغ:** (مُ) 1) پێشەوای ئایینی زەردەشتی. 2) زەردەشتی.

**مغازله:** دڵداریكردن لە گەڵ ژنان، قسەی عاشقانە گوتن.

**مغافصت:** لە ناكاو هێرش بردن.

**مغالات:** گران فرۆشی.

**مغالبه:** سەركەوتن، زاڵبوون.

**مغالطه:** هەڵەكاری، بەهەڵەبردن، بەڵگەی سست و هەڵە هێنانەوە.

**مغ اندیش:** بڕوانە:"ژرف اندیش".

**مغایر:** ناتەبا، ناجۆر، دژ.

**مغایرت:** ناتەبایی، دژایەتی.

**مغبوط:** كەسێك كە ئێرەیی پێببەن، ئەوەی خۆزگەی پێ دەخوازن.

**مغبون:** زیان دیتوو لە مامڵەدا، وەبن كەوتوو، زەرەرمەند.

**مغبونیّت:** زیان دیتن، تووشی خەسارەت بوون.

**مغتنم:** 1) بە هەل زانراو، بە دەرفەت زانراو. 2) بەنرخ. **"مغتنم شمردن":** بڕوانە:"غنیمت شمردن".

**مغذّی:** شتێ کە مەواددی غەزایی هەبێ.

**مغرب:** خۆراوا، خۆرنشین، رۆژاوا، ڕۆژئاوا، هۆراوا، زەردەپەڕ. ئێواران.

**مغربین:** خۆراوا و خۆرهەڵات .

**مغرض:** قین لەدڵ، غەرەزاوی، مەبەستدار.

**مغرور:** 1) لە خۆدەرچوو، لە خۆبایی، لەخۆگۆڕاو، باغر، بە فێز و هەوا، دفرە، خەرۆ، خەڕە، غەڕە، غلور، خۆبەزۆرزان، هەرانە. 2) فریودراو، هەڵخەڵەتێنراو. "**مغرورشدن**": لەخۆدەرچوون، سەرخۆچوون، لەخۆگۆران، لە خۆبایی بوون، فڕسواربوون، بایی بوون، بادی هەوابوون، غلووربوون.

**مغز:** 1) مێشك، مژك، مژی، مزگ، مەژۆ. 2) ئەقڵ، فكر. 3) سەر، كەللە. 4) بەشی ناوەوەی هەر شتێ، كاكڵ، ناوك. 5) ئەسڵ و هەقیقەتی هەر شتێك. 6) ناوەڕاست. "**مغز استخوان**": مۆخی ئێسك، "بۆن مارۆ". "**مغز بردن**": مێشك بردن، جاڕز و ناڕەحەت كردن. "**مغز تیز كردن**": وشیاری و وریایی بەكاربردن. "**مغز در استخوان خون گشتن**": نیگەران بوون و ترسیان. "**مغز دماغ بردن**": بەكاربردنی توانایی فیكری. "**مغز كردن**": دەرهێنانی كاكڵی بادام و پستە و هتد. "**مغز كسی را برآوردن**": لەناوبردنی ئەو. "**مغز كسی را تیز كردن**": تووڕەكردنی ئەو. "**مغز و پوست**": ناخ و ڕواڵەتی شتێ. "**توی (در) مغز كسی فروكردن**": خستنە مێشكییەوە، تێگەیاندن.

**مغزدار:** 1) بەكاكڵ، كاكڵ دار. 2) پڕناوەرۆك، پڕمانا.

**مغزشویی:** مێشك شۆردنەوە.

**مغزیدن:** درەنگ كردن، كات بەخت كردن.

**مغزین:** پڕناوەرۆك.

**مغشوش:** 1) ئاڵۆز، پەرێشان، شێواو. 2) خەوشدار، قۆپیە، قەڵب.

**مغصوب:** داگیركراو، زەوتكراو. دەست بۆ درێژكراو.

**مغفرت:** بەخشینی گوناه، چاوپۆشی، لێخۆشبوون.

**مغفّل:** نەزان، كەم زەین.

**مغفور:** بەخشراو، نوخافتی، عافوو كراو.

**مغلطه:** قسەیەك كە كەسێك بخاتە هەڵەوە، هەڵەكاری، هەڵەپەتێ. "**مغلطه خوردن**": بڕوانە: "فریب خوردن". "**مغلطه دادن**": بڕوانە: "فریب دادن". "**مغلطەكردن (زدن)**": وتنی قسەی نالۆژیكی و داپۆشینی هەقیقەتی بابەتەكە.

**مغلطەبازی:** گێژ و سەرلێشێواندن بە ئاخاوتەی نالۆژیكی، هەڵپەتەكاری، پەرت گۆیی.

**مغلطەسازی:** بڕوانە: "مغلطەبازی".

**مغلطەكاری:** بڕوانە: "مغلطەبازی".

**مغلق:** 1) داخراو، بەستراو. 2) ئاڵۆز، دژوار، ناڕوون. "**كلام مغلق**": ئاخاوتەی ئاڵۆز و دژوار، قسەی لێڵ و ناڕوون.

**مغلوب:** ژێركەوتوو لە گەمەو شەڕدا، شكست خواردوو، تێك شكاو، بەزیو، دۆڕاو.





**مغلوبه:** 1) بڕوانە: "مغلوب". 2) توند و تێكەڵ پێكەڵ.

**مغلوط:** 1) هەڵەدار. 2) بەشێوەی نادروست.

**مغمّز:** 1)ماڵشتە، مشتوماڵدەر. 2) هێماكەر بە چاو و برۆ. 3) بڕوانە: "سخن چین".

**مغمورشدن:** 1) ڕۆچوون، نوقم بوون. 2) شكست خواردن.

**مغموم:** خەمبار، خەمناك، دڵتەنگ، بەپەژارە، خەمگین.

**مغناطیس:** ئاسن ڕفێن.

**مغنی:** (مُ.نِ) بێنیازكەر.

**مغنّی:** (مُ.غَ.نِ) 1) گۆرانی بێژ، ئاواز خوێن، سروودخوێن. 2) ژەنیار.

**مغیث:** بڕوانە: "فریادرس".

**مغیر:** (مُ.یِ) تالانچی.

**مغیّر:** (مُ.غَ.یَ) گۆڕاو.

**مفاجات:** كوتوپڕ، لە ناكاو، لەپڕدا، ژنشكێڤە.

**مفاخره:** بە خۆ نازین، شانازی بە یەك كردن.

**مفاد:** مانا، واتا، ناوەرۆك.

**مفارقت:** لێك جیابوونەوە، لێك دوور كەوتنەوە، جیایی، تەكینەوە. "**مفارقت كردن از جایی**": ڕۆیشتن لەو شوێنە.

**مفاسد:** كۆی "مفسده".

**مفاصا:** یەكلاكردنەوەی حەساو.

**مفاصل:** كۆی "مفصل".

**مفاوضت:** 1) بڕوانە: "مفاوضه". 2) هاونوێنی، هاوجێیی.

**مفاوضه:** گفتوگۆ، وتووێژ.

**مفاهیم:** كۆی "مفهوم".

**مفت:** 1) خۆرایی، خوێڕایی، بەلاش، مفت، مفتی، مفتێ، فیڕۆ، ئاوانتە، هاوانتە، هەوانتە، هەلەمتە، بادیهەوا، بایهەوا، مشە، وەڵیفەت. 2) بێ مانا، پووچ. 3) كەم نرخ. 4) كاری بێ هەقدەست. 5) زۆر هەرزان. 6) شیاو. "**مفت چنگ كسی**": شیاوی ئەو. "**مفت و مجانی**": 1) بەخۆڕایی. 2) زۆر هەرزان. 3) بێ هۆ و لەخۆڕا، بە خوتوخۆڕایی. "**مفت و مسلّم**": 1) بەڕاحەتی و بەبێ ژانەسەر. 2) بەخۆڕایی، بەلاش. 3) زۆر هەرزان.

**مفتتن:** ئاشق، شەیدا .

**مفتّح:** 1 ) والاكەر، ئاوەڵەكەر، وازكەر. 2) دەسپێكەر.

**مفتخر:** شانازیكەر، پێوەنازیو.

**مفتخور/ مفتخوار:** مفتەخۆر، گەللات، چەورەی ماڵانگەڕ، هاوانتەخۆر، هەلەمتەچی.

**مفترق:** جیا، پەرتەوازە.

**مفتری:** درۆیین، قسەی هەڵبەستراو.

**مفتّش:** پشكن، پشكنەر، پشكێنەر، ماڵپشكن، ماڵپشكێن، ماڵبشكن، ماڵبشكێن، گەڕێن، دۆز.

**مفتضح:** 1) سەرشۆڕ، ڕیسوا، ئابڕووبراو. 2) ناحەز، زۆر خراو.

**مفتضحانه:** سەرشۆڕانە.

**مفتعل:** فریودەر، خەڵەتێن.

**مفتقر:** بڕوانە: "محتاج".

**مفتّن:** ئاژاوەچی، بەئاژاوە، سەهندە، سەهنگە، سەهەنە، کتکە نەفتینە، مایەفیتنە، تێچێن، دووزمان، نەئال.

**مفتوح:** 1) ئاواڵە، واڵا، کراوە. 2) گیراو، داگیرکراو.

**مفتون:** شەیدا، عاشق. "**مفتون و مسحور**": شێت و شەیدا.

**مفتی:** 1) دیناوەر، دینەوەر، فتوادەر. 2) مفتێ، بەلاش. 3) بەڕاحەتی، بەبێ ژانەسەر.

**مفحم:** داماو لە قسەکردن دا، بێدەم و دوو.

**مفخر:** جێگەی شانازیکردن و پێوەنازین.

**مفرّ:** 1) سەرەدەر، دەرەتان، ویستە، ڕێگەی دەرچوون. 2) درز، کەلێن، کەلەبەر. "**مفرگریز**" : دەرەتانی دەرچوون و تێپەرین.

**مفرّح:** دڵخۆشکەر، شادیهێن.

**مفرد:** تاك، تاق و تەنیا.

**مفرط:** 1) زیادەڕۆ، لەڕادەتێپەر، تێپەڕێن، سنووربەزێن، پێوەنەر. 2) زۆر و زەوەندە.

**مفرغ:** حەوت جۆش، هەمەندوش.

**مفروش:** فەڕش کراو، ڕاخراو.

**مفروض:** فەڕزکراو، دانراو. واجب، ئەرکی خوایی.

**مفروق:** پڕژوبڵاو، جیابۆوە، لێك جیا.

**مفسد:** گەندەڵکار، خراپەکار. بەفیڕۆدەر، پیسکار.

**مفسده:** خراپە، گەندەڵی، هۆکاری گەندەڵی و خراپەکاری.

**مفسّر:** ڕاڤەکار، ڕاڤیار، ڕاژەوان، ڕوونکار، شیکارکەر، لێکدەرەوە.

**مفصل:** (مَ.صَ) خرتکە، خڕکە، جومگە، جونگە، جەمسەر. "**مفصل آرنج**": جومگەی ئەنیشك. "**مفصل خاصره**": جومگەی کلۆت، سێبەندە. "**مفصل های متحرك**": جومگە بزواوەکان/جووڵەدارەکان. "**مفصل های نیمەمتحرك**": جومگە نیوەبزواوەکان.

**مفصّل:** (مُ.فَ.صَ) تێروتەسەل، تێروپڕ، پوخت، ڕاڤەکراو، مانا بە درێژی لێوەدراو، دوورودرێژ.

**مفصّلاً:** (مُ.فَ.صَ) بە تێروتەسەلی، بەدوور و درێژی، بە پوختی، بەوردەکارییەوە.

**مفطر:** ڕۆژووشکێن.

**مفطرات:** ئەو شتانەی ڕۆژوو پووچەڵ دەکەنەوە.

**مفعول:** 1) لە ڕێزمان دا: بەرکار. 2) گاندەر، قووندەر. 3) ئەنجام بوو، جێبەجێبوو. "**مفعول شدن**": گاندان، ئیلاقەکران، بەرکاری گان بوون.

**مفعولی:** بەرکاری.





**مفقود:** گوم بوو، ون بوو، بزربوو. لەبەین چوو. "**مفقودالاثر**": بێسەروشوێن، شوێنبزرکراو، گومەسار، مەرگوجێ، هامووتا.

**مفکّر:** بیرکەرەوە، بیرمەند.

**مفلاك:** دەست کورت، نەدار.

**مفلس:** بابردە، تەواو ڕووت و نەدار، مایەپووچ، نابووت.

**مفلق:** کەسێ کە وتەی جوان و تازە داهێنێ.

**مفلوك:** 1) بەدبەخت، بێچارە. 2) زۆر پرتوکیاو. 3) بێتوان، داماو و لاواز.

**مفنگی شدن:** کز و لاواز بوون.

**مفوّض کردن( داشتن ):** پێ سپاردن.

**مفوضه:** ژنێ کە بەبێ مارەیی لە پیاوێ مارەکرابێ.

**مفهوم:** 1) چەمك. 2) مانا، واتا، ناوەرۆك. 3) شیاوی تێگەیشتن. 4) لە باری لۆژیکییەوە: کۆمەڵێك سیفەتە یان تایبەتمەندییە کە مانایەکی هەمەکی یان گشتی ڕوون دەکەنەوە و لە سەر بنەڕەتی ئەو پێناسە و پۆلێنکردن ئەنجام دەدرێ. "**مفهوم داشتن**": ماناداربوون، بە مانا بوون. "**مفهوم شدن**": تێگەیین، تێگەیشتن، حاڵیبوون.

**مفهوم سازی:** چەمك دانان.

**مفهوم شناختی:** واتای تێگەیینی.

**مفید:** 1) بەکەڵك، کەڵکدار، بەبەهرە، بەهرەدەر، بەقازانج، بەسوود، سووددار، فەڕدار، بەکارهاتگ، کێراتی. 2) مانادار.

**مقابحه:** جوێن دان بە یەکتر، قسەی ناحەز گوتن بە یەکدی.

**مقابل:** 1) هەمبەر، همبەر، هندەق، لە ڕووی یەکتردا، ڕووبەڕوو، بەرامبەر لە باڵا یان لە کێشدا، لبەر، عاست، ئاست، مشلاق، هەنداف، هەڤهەسوو، مێزین. 2) خەنیم، هاوتا. "**مقابل شدن**": 1) ڕووبەڕووبوونەوە. 2) بەرابەر بوون(ەوە). "**مقابل کردن**": 1) قەرەبوو کردنەوە. 2) گونجاندن. 3) بەراوردکردن.

**مقابله:** 1) بەربەرەکانی، بەرامبەرکێ، بەرەنگاربوونەوە، بەرەنگاری، بەرهەڵستی، بەرانبەری، مەیدانداری، بەرپەرچدانەوە، دەگژڕاچوونەوە، هاوتاییکردن، ڕووبەڕووبوونەوە، ڕووبەڕووکردنەوە، پێ وەستان، وەستانەوە، وێستانەوە، بەرابەر وەستان، باشار، ملانە، ملانێ، هۆملکێ، کەنایش، کەناین. 2) بەراوردکردنی نوسراوەکانی دەقێك دەگەڵ یەکتر. 3) قەرەبووکردنەوە. 4) لە ڕووبەڕووەوە. "**درمقابلهء**": 1) لە ولامی. 2) لەبەرامبەری.

**مقاتل:** 1) بڕوانە:"قاتل". 2) سپایی، شەڕکەر.

**مقادیر:** کۆی"مقدار".

**مقاربت:** 1) ئیلاقەکردن، زیکیکردن، جووت بوون، گان کردن. 2) نزیکی، دۆستایەتی.

**مقارن:** 1) هاوكات، هەڤدەم. 2) نزيك. **"مقارن شدن"**: هاوكات بوون.

**مقارنه:** 1) بەراورد. 2) هاورێیەتی. 3) هاوكاتی.

**مقاسات:** ڕەنج و سەختی كێشان.

**مقاصد:** كۆی:"مقصد"، مەبەستەكان، خواستەكان.

**مقاطعه:** 1) لێك دابڕان، قسە لە گەڵ یەك نەكردن، تەركی هاتوچۆكردن. 2) پەیمانكاری، بەڵێندەری.

**مقاطعەكار:** پەیمانكار، بەڵێندەر.

**مقاله:** 1) وتار، نووسراوەیەكی كەمتر لە بیست هەزار وشەیی كە تێیدا بابەتێك دەخرێتە بەرباس و لە ڕۆژنامە و گۆڤارەكان دا بڵاو دەبێتەوە. 2) پار، بەش(كتێب).

**مقالەنویس:** وتارنووس.

**مقام:** (مَ) 1) پۆست، پێگە. 2) شوێنی نیشتەجێبوون، جێگەی وێستان. 3) دەرەجە، پلە. "مقام گرفتن": 1) نیشتەجێبوون. 2) مانەوە، گیرسانەوە. 3) جێگرتن.

**مقامات:** كۆی"مقامە"، بەرپرسان. شوغڵەكان.

**مقاوله:** بەڵێن بەستن، لە مەڕ بابەتێ گفتوگۆكردن و بەڵێن دانان، بەڵێنداری.

**مقاولەنامه:** بەڵێننامە. قەواڵە.

**مقاوم:** خۆڕاگر، ڕاوەستاو، كۆڵنەدەر، قایم و پتەو، كێشدار، بەرگەگر، چیڕ، لە پسان بەدوور.

**مقاومت:** خۆڕاگری، خۆڕاگرتن، بەرەنگاری، بەرگری، كۆڵنەدان، ڕاوەستاوی، دەربڕدن، بەربەرەكانی، بەرخوەدانی، دەست كردنەوە، باشار. **"مقاومت در جنگ"**: دەس/دەست كردنەوە، دەس ڕاكرن، بە گژ دوژمناچوون، بەرگری، خۆڕاگری. **"مقاومت نكردن"**: فس خواردن، فس دادان، دەسدانان، دەست نەكردنەوە، خۆڕانەگرتن، بەربەرەكانی نەكردن.

**مقایسه:** بەراوردكردن، هەڵسەنگاندنی دوو شت، پیێ(ك) گرتن، بە قەد یەكگرتن. **"در مقایسه"**: لەچاو، لە بەراورد.

**مقبل:** (مُ.بِ) 1) رووكەرە شتێ. 2) خۆشبەخت، بەختیار.

**مقبلات:** وەڕنەوسانە، بەركوڵ، پرۆشەكردن لە خواردن بەر لە شیو ئانین.

**مقبوض:** وەرگیراو، وەچنگ هێنراو.

**مقبول:** 1) پەسند، وەرگیراو، قبووڵ كراو، پەژراندی. 2) دلگر، لەبەردڵان، جوان. 3) دڵخواز، باش.

**مقبول القول:** جێیمتمانە، جێیبەقا.

**مقتبس:** (مُ.تَ.بِ) لێوەرگر.

**مقتحم:** نەترس، بوێر.

**مقتدا:** 1) پێشەوا، كەسێك كە خەڵك پێڕەوی لێدەكەن. 2) پێش نوێژ.





**مقتدر:** دەسەڵاتدار، بەهێز، بەتوانا.

**مقتصد:** 1) میانەڕۆ. 2) ئاگا لە ماڵ، دەست پێوەگر، دەست گێڕەوە.

**مقتضی:** (مُ.تَ.ضِ) 1) شیاو، لەبار. 2) خوازیار، خوازەر، داواكار. 3) هەڵكەوتە و بارودۆخێ كە شتێك پێویست دەكەن.

**مقتضیات:** پێویستییەكان، پێداویستییەكان، ویستەمەنییەكان، حەوجەهیان.

**مقتفی:** پێڕەویكار، وەشوێن كەوتوو.

**مقتل:** شوێنی كوشتن، كوشتگە.

**مقتول:** كوژراو، كوژاو، مرێندراو، كشتا، كشیایا، كشیایە، كشیایش، كیشتا، كێشتە. **"مقتول كردن"**: كوشتن.

**مقحم:** لاواز، سست.

**مقدار:** 1) هێند، هاندۆ، هاندێ، هەند، بڕ، ئەندازە، پاژێك لە شتێك. 2) بایی، بۆ نرخ. **"مقدار داشتن"**: پێگە و پۆست هەبوون، بایەخ هەبوون. **"مقدار گرفتن"**: پێگە و پۆست پەیاكردن، بایەخداربوون. **"مقدار مختلط"**: بڕی تێكەڵاو. **"كمترین مقدار"**: زەڕا، پیچەك، بڕۆكە، تۆزوڵكە، كەموسكە، زلبری، زلپاتە.

**مقدَر:** 1) پێشهات. 2) چارەنووس، بەش. **"مقدر داشتن"**: بەكاربردن، دانان. **"مقدر كردن"**: چارەنووس دیاریكردن.

**مقدرت:** هێز، وزە، توانایی.

**مقدَس:** پیرۆز، پاك و خاوێن.

**مقدم:** (مَ.دَ) لە سەفەر هاتنەوە. كاتی هاتن.

**مقدَم:** (مُ.قَ.دَ) 1) پێشەنگ، پێشڕەو. 2) لەسەرتردا، لە ئەولەوییەت دا. 3) سەرۆك، گەورە، پێشەوا. **"مقدم داشتن"**: لەسەرتردانان، لە ئەولەوییەت دانان. **"مقدم شدن"**: بوونە پێشەوا.

**مقدمات:** كۆی"مقدمە"، پێشەكییەكان، سەرەتاكان.

**مقدَماتی:** سەرەتایی، بەرایی، پێشونەی هەرشتێ.

**مقدمتاً:** لەسەرەتادا، لە پێشەكی دا.

**مقدَمه:** 1) پێشەكی، سەرەتا، دەسپێك. 2) ڕووداو، پێشهات. 3) پێشڕەوی لەشكر. **"مقدمه چیدن"**: ڕەخساندنی هەلی لەبار بۆ وتنی قسەیەك یان ئەنجامدانی كارێ. **"بر مقدمه"**: پێشتر، لەپێش دا.

**مقدور:** 1) ڕەخساو، گونجاو، لواو، مەیسەر. 2) چارەنووس.

**مقرَ:** (مَ.قَ) 1) بارەگا، بنكە. 2) جێ، شوێن.

**مقرّ:** (مُ.قِ) بڕوانە: **"اعتراف كننده"**.

**مقرَر:** (مُ قَ رَ) 1) جێگیر، دامەزراو، دیاریكراو. 2) ئاشكرا، زانراو. **"مقرر داشتن"**: 1) دیاریكردن. 2) دەستووردان.

**مقررات:** 1) ڕێسا. 2) ماڵیاتە دیاریكراوەكان.

**مقرری:** بەرات، جیرەی هەمیشەیی.

**مقروض:** 1) بڕاو. 2) لە فارسی دا بە مانای قەرزدار و وامدار دێ.

**مقروع:** کوتراو، لێدراو.

**مقرون:** 1) نزیك به یەك. 2) هاوڕێ. **"مقرون به صرفه"**: بەقازاج، بەکەڵك.

**مقسط:** بڕوانە: "دادگر".

**مقسم:** (مَ.سِ) شوێنی دابەش کردن، سنوور.

**مقسّم:** (مُ.قَ.سِ) دابەش کەر.

**مقسوم:** دابەشکراو، بەشکراو. **"مقسوم علیه"**: (بیرکاری) بەشدراو، بەشبەر.

**مقشّر:** 1) پێست لێوەکراو، پێست هەڵکەنراو. 2) ڕوون، ڕاشکاو.

**مقصد:** شوێنی مەبەست، ئامانج.

**مقصّر:** تاوانکار، سووچدار، خەتاکار، گوناهکار، شەپنی. **"مقصر کردن"**: بە گوناهکار دانان.

**مقصود:** نیاز. مەبەست، ئامانج، شکنا، دۆز. **"مقصود بردن از چیزی"**: گەیشتن بەو. **"مقصود یافتن"**: بە ئاوات گەیشتن، بە مەبەست گەیشتن.

**مقضّی داشتن:** بەجێهێنان، ڕەواکردن.

**مقضی المرام:** کامڕەوا، خۆشبەخت.

**مقطّر:** تکاو، دڵۆپ دڵۆپ تکاو، دڵۆپێنراو، داچۆڕاو.

**مقطع:** (مَ.طَ) 1) قۆناغ، بڕگە. 2) شوێنی بڕین، شوێنی جیابوونەوە. 3) دوایین کۆپلەی غەزەڵ یان قەسیدە. 4) کۆتایی شتێ. **"مقطع سرّه"**: بڕوانە: "زادگاه". **"مقطع عرضی"**: (بیرکاری) پانەبڕگە، بڕگەی پانی. **"مقطع طولی"**: (بیرکاری) درێژەبڕگە، بڕگەی درێژی. **"مقطع مخروطی"**: (بیرکاری) قوچەکەبڕگە.

**مقطوع:** 1) بڕاو، پچڕاو، قەتیایی. 2) نەگۆڕ، دایمی.

**مقطوع النسل:** کۆرەوەبوو، دوابڕاو، دوابڕیاگ.

**مقطعی:** قۆناغ بە قۆناغ، بڕگەیی.

**مقعّر:** ناقچاڵ، ناوچاڵ، قولۆر، قووپاو، قووپیو، کۆد، کاس، ناوقووڵی لێوهەڵگەڕاوە، هەر شتی قووڵ و ڕۆچووگ.

**مقفّل:** بەستراو، قفڵ دراو، کلۆمدراو. داپۆشراو و دوورەدەست.

**مقفی/مقفا:** ئاخاوتەی بەسەروا، سەروادار.

**مقلّب:** هەڵگەڕێنەوە، ژێروژوورکەر، ئاوەژووکەر.

**مقلّد:** لاساییکەرەوە، لاساکەر، چاولێکەر، پێڕەو، مرید.

**مقلوب:** هەڵگەڕاوە، ئاوەژووکراو، بەراوەژووکراو، شێوێندراو.

**مقلوع:** لێکەوتوو و لە سەر کار لابراو. هەڵکێشراو.

**مقنن:** یاسادانەر، یاساناس.

**مقننه:** یاسادانان.

**مقنّی:** زەوی هەڵکۆڵ، قومەشکەن، قوموش کەن، ڕەهەندلێدەر، کەنکەنەچی، کارێزکەن، چاڵکەن.

**مقولات:** کۆی "مقوله"، وتەکان، گوتارەکان. وتەزاکان.





**مقوله:** 1) گوتەزا، وتەزا، بابەتی جێی باس. 2) گوتراو، گوتار. **"مقوله علیّت"**: وتەزای هۆکارێتی.

**مقوم:** 1) ڕاستکەرەوە. 2) نرخێنەر، خەملێنەر، ڕازێنەر.

**مقوّی:** وزەدەر، وزەبەخش، هێزپێدەر، هێزنك، تین دەر.

**مقهور:** شکست خواردوو، تێك شکاو، بەزیو، گرفتار، گیرۆدە. **"مقهور کردن"**: خستنەژێر ڕکێف، زاڵبوون بەسەر.

**مقیاس:** 1) پێوانە، پێوەر. 2) ئەندازە. 3) بەراورد. **"مقیاس خطی"**: پێوەری بەهێڵ. **"به مقیاس آوردن"**: ئەنازەگرتن، پێوان.

**مقیّد:** 1) بەستراوە بە شتێ. 2) دەربەست، پێخەم، لەخەمی، پابەند. 3) بڕوامەند بە کۆتوبەند لە نەریت و ئاکاردا. 4) بڕوانە: "متعهد". 5) داخراو، بەرتەسك. 6) بەندی، گیراو، گرفتار. 7) دەست بەستراو. **"مقید داشتن"**: خستنە حەپسەوە، گرفتارکردن. **"مقید شدن"**: 1) پابەندبوون. 2) بەسترانەوە.

**مقیم:** 1) نیشتەجێ، نشتەجی، نیشتەجه، دانیشتوو، ئاکنجی، خۆجێ، خۆجێیی، ماندەنە، جاگرتە، ئاری. 2) هەمیشەیی، دایمی. 3) بڕوانە: "ثابت قدم".

**مك:** مەخت، مژ، بە دەم مریستن.

**مکابر:** شەڕەنگێز، شەڕاشۆ، شەڕانی.

**مکابره:** 1) دژایەتیکردن، دوژمنایەتیکردن. 2) زۆر، توڕەیی و توندوتیژی.

**مکاتب:** کۆی "مکتب".

**مکاتبه:** نامە نووسین بۆ یەکتر.

**مکاتبه‌ای:** نامەکاری.

**مکّار:** بەمەکرو فێڵباز، فێڵەزان، فێڵکار، خەڵەتێن، فریودەر، تەڵەکەباز، فەنەك باز، ئۆین باز، گزیکار، وەگەڕ، نەپاك، ڕیپۆ، ڕیپۆکار، شەمچك، قماربار، کۆنا، کای کەردۆخ، عەیار.

**مکارم:** بڕوانە: "مکرمة"، چاکەکان، خاسییەکان. **"مکارم اخلاق"**: ئاکاری باش.

**مکاری:** بەکرێدەر.

**مکاس:** کەمکردنەوەی نرخ، چەنەلێدانی کڕیار و فرۆشیار.

**مکاسب:** کۆی "مکسب".

**مکاشفت:** 1) بەڕاشکاوی دوژمنایەتیکردن. 2) بڕوانە: "مکاشفه(1)".

**مکاشفه:** 1) دیناو، بەگیان خودا دیتن. 2) دۆزینەوە، ئاشکراکردن، دەرخستن. 2) بڕوانە: "مکاشفت(1)".

**مکافات:** 1) پاداشت دانەوە. 2) سزادان. 3) سەختی، زەحمەت، دەردەسەری( با چە مکافاتی از رودخانە عبور کردیم). **"مکافات چیزی را پس دادن"**: سزادران لەبەر ئەو. **"مکافات داشتن"**: تووشی سەختی و ناڕەحەتی بوون. **"مکافات کردن"**: 1) سزادان(ەوە). 2) پاداشت دان. **"مکافات کسی باز کردن"**: 1) سزادانی ئەو. 2) پاداشت دانەوەی ئەو. **"مکافات یافتن"**: سزادران. **"به مکافات خود رساندن"**: سزادان.

**مکالمە:** دیالۆگ، دەگەڵ یەك ئاخاوتن، گفتوگۆ.

**مکان:** 1) جاگە، جێگە، جە، شوێن. 2) پلە، پۆست. 3) ماڵ، شوێنی نیشتەجێبوون. "**مکان اعتماد**": جێیمتمانە. "**مکان عمومی**": شوێنی گشتی. "**مکان کردن(گرفتن)**": جێگرتن(ەوە).

**مکانت:** جێگە، پێگە، پلەوپایە، پۆست.

**مکانفە:** یارمەتی یەکتر دان، یاریدەدان.

**مکانیزە:** مێکانیزە، ماشێنیکراو.

**مکانیسم:** مێکانیسم، ئالیەت، رێوشوێنی گونجاو.

**مکانیك:** 1) لقێك لە فیزیك کە هێزکاری وزە(نیرو)ەکان لە دەزگا ماددیەکان تاوتوێ دەکا، مێکانیك. 2) ئەوەی کارەکەی چاك کردنەوە یان نووژەنکردنەوەی ماتۆڕی ئوتومبیل یان دەزگا میکانیکییەکانە.

**مکاوحت:** دژایەتی، دوژمنایەتی.

**مکایدە:** فێڵ کردن، کەڵەك کردن، مەکرکردن.

**مکتب:** 1) رێباز، مەرام، شێوەیەکی تایبەتی لە بیرکردنەوە. 2) شوێنی نووسین، شوێنی وانە وتنەوە، قوتابخانە.

**مکتسب:** (مُ.تَ سَ) وەدەست هاتوو، دەستکەوتوو.

**مکتسی شدن:** 1) جل دەبەرکردن. 2) دەرهاتن بە فۆڕمی شتێ.

**مکتشف:** دۆزەرەوە، دەرخەر.

**مکتوب:** 1) نووسراو. 2) نامە. "**مکتوب کردن**": نووسین.

**مکتوم:** شاراوە، ڤەشارتی.

**مکث(کردن):** هەڵوەستە، هەڵوێستە، وچان، وەستان، ڕاوەستان، خایاندن، پێچوون، دێرکردن.

**مکدّر:** 1) لێڵ، تاریك. 2) دڵتەنگ، زویر، زیز، ناڕەحەت.

**مکذوب:** درۆ، ڤرۆ، ناڕاست.

**مکر:** مەکر، فێڵ، گزی، گەڕ، ڤیلك، لەبان، وەین، فوون، چیل، بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "حیلە". "**مکرخوردن**": بڕوانە:"فریب خوردن". "**مکر زدن**": بڕوانە:"فریب دادن".

**مکرّر:** دووپاتەوەبوو، دووپاتەکراو، دووبارە گوتراو.

**مکرراً:** پەیتاپەیتا، لێکدالێکدا.

**مکرساز:** بڕوانە:"حیلەگر".

**مکرّم:** بەڕێز، ڕێزدار، خۆشەویست.

**مکرمت:** گەورەیی، جوامێری، بەخشش، کەرەم.

**مکروه:** 1) کردەوەیەك کە دەبێ وازهێنان لێی بهێنرێ بەڵام ئەنجامدانیشی گوناح نیە. 2) ناپەسند، ناڕەوا، نەویستراو. 3) ناحەز، ناشیرین.

**مك زدن:** بڕوانە: "مکیدن".

**مکسب:** 1) کەسب و کار، پیشە. 2) داهات، سوود.

**مکسّر:** (مَ.کَ.سَ) شکاو، تێکشکاو.





**مکسور:** شکاو، بەزیو.وشەیەك کە "ژێر"ی هەبێ.

**مکعّب:** سێ جا، شەش پاڵوو.

**مکلّف:** 1) لەسەریەتی، دەرووەست بوو بۆ ئەنجامدانی شتێ، ئەرك وەخۆگرتوو، کەسێك کە ئەرك یان ئیشێکی وەئەستۆ گرتووە، کەسێك کە مەئمووری بەڕێوەبردنی کارێکە. 2) ئەوەی بەتەمەنێ گەیشتبێ کە ئەرکە شەرعییەکانی لەسەر واجب بێ.

**مکلل:** گەوهەرنیشان، ڕازاوە بە گەوهەر.

**مکمّل:** (مُ.کَ.مَ) 1) تەواوکەر، کاملکەر. 2) دوو گۆشە کە کۆی دەرەجەکانیان سەدوهەشتا بێ.

**مکمَّل:** (مُ.کَ.م) تەواوکراو، کامل کراو، کۆتایی هاتوو.

**مکنت:** (مُ.نَ) 1) هێز، وزە، توانایی. 2) دارایی، سامان.

**مکندە:** مژن، مژلێدەر، مژە.

**مکنون:** شاراوە، حەشاردراو، پۆشراو، ڤەشارتی. "**مکنون خاطر(ضمیر)**": ئەوەی لە ناخی کەسێك دا شاردراوەتەوە. خواست و مەبەستی سەرەکی.

**مکنونات:** 1) خەیاڵاتەکان، ئەندێشەکان. 2) کاروبارە نهێنی و غەیبییەکان.

**مکیاژ:** دەمرووت، لیسکە، سابوورە.

**مکیدن:** مژین، مژتن، مژان، مێژان، مێژتن، مێژین، مژلێدان، ڤەمژین، ڤەمشتن، ڤەمێتن، هەڵمژین، مشتن، مێشتن، میتن، مێتن، مێهتن، مرێس، مروس، هل خوارن، مڵکنای، ملۆسنایش. "**مکیدن پیاپی**": مژمژ.

**مگر:** ئاخۆ، مەگەر، دەنا، چما.

**مگسی:** 1) بەدخوڵق. 2) خراو(امروز حالم خیلی مگسی است).

**ملّاح:** کەشتیوان، گەمیەوان.

**ملاحت:** لەبەردڵان بوون، خوێن شیرین بوون، جوان و قەشەنگ بوون.

**ملاحظە:** 1) دیتن، سەیرکردن، لێڕوانین، هەمەت. 2) تاوتوێکردنی شتێ بە وردی. 3) تێبینی، نیشانك. 4) ڕەچاوکردن. 5) بایەخ پێدان و خۆش ڕەفتاری دەگەڵ کەسێك. "**ملاحظە داشتن**": ڕەچاوکردنی حاڵی دیتران، لەبەرچاوگرتنی لایەنە جۆراوجۆرەکانی شتێ یان کارێ. "**ملاحظە کردن**": 1) بڕوانە: "ملاحظە(1)". 2) ڕەچاوکردن، دەبەرچاوگرتن. "**قابل ملاحظە**": بەرچاو.

**ملاحظەکار:** تێبین، قایمکار، دوور ڕوان، ئەوەی لایەنە جۆراوجۆرەکانی مەسەلەیەك یان بابەتێك بە وردی لەبەرچاو دەگرێ.

**ملازم:** 1) کەسێ کە بەردەوام لە گەڵ کەسێکی دیکە بێ، هاوڕێ. 2) دەرووەست، بەڵێندەر. "**جایی را ملازم شدن**": بەردەوام نیشتەجێی ئەوێ بوون.

**ملازمت:** 1) بەردەوام هاوڕێ و لەتەنیشتی کەسێك بوون، لێك جیانەبوونەوە. 2) بڕوانە: "تعهد". 3) مانەوە و نیشتەجێبوون لە شوێنێ. "**ملازمت کردن**": بەردەوام لەتەك کەسێکا بوون، هاوڕێیەتیکردن.

**ملاست:** نەرم بوون، نەرمی.

**ملاطفت:** دلۆڤانی و دڵنەرمی نواندن سەبارەت بە کەسێك، لاواندنەوە.

**ملاطمت:** 1) زللەلێدان. 2) بەربەرەکانی، تێکهەڵچوون.

**ملاعبە:** 1) دەگەڵ یەك شۆخی و گەمەکردن. 2) دەست گەمەکردن.

**ملاقات:** 1) چاوپێکەوتن، پێك گەیشتن، یەکتردیتن، تووشی یەکتربوون، سەردان، دیدار، بەرخواردن. 2) ڕووبەڕووبوونەوە. 3) هاوکاتی.

**ملاك:** پێوەر، پێودانگ.

**ملال:** 1) لاوازی و شەکەتی ڕۆحی و جەستەیی، وەزاڵەهاتن، وەئامان هاتن. 2) دڵتەنگی، خەم و کەسەر، جاڕزی.

**ملالت:** بڕوانە: "ملال(1)".

**ملامت:** سەرزەنشت کردن، سەرکۆنەکردن، لۆمەوتانە.

**ملامسە:** دەستهێنان بە لەشی کەسێکی تردا لە ڕووی مەیلی سێکسییەوە.

**ملانکولی:** بڕوانە: "مالیخولیا".

**ملایم:** 1) نەرم. 2) لەسەرەخۆ، هێدی، ئارام. 3) دلۆڤان، خۆش ئەخلاق. 4) تایبەتمەندی ڕەنگی ڕۆشن و ئارام بەخش. 5) نە زۆر گەرم نە زۆر سارد، سازگار. 6) بەنەرمی و ئەسپایی، بەئارامی، بەشێنەیی، مام ناونجی لەبەینی توند و سەبر دا. 7) گونجاو، لەبار، سازگار.

**ملایمت:** 1) بە نەرمی هەڵسوکەوت کردن، خۆش ڕەفتاری، دلۆڤانی. 2) نەرمی، ئەسپایی، ئارامی.

**ملبس:** (مَ.بَ) پۆشەن، پۆشەنی، پۆشاك، جلوبەرگ.

**ملبّس:** (مُ.لَ.بَ) جلوبەرگ پۆشیو.

**ملبوس:** 1) پۆشراو. 2) پۆشەنی، شیاوی پۆشین، پۆشاك.

**ملّت:** 1) نەتەوە Nation 2) ئایین، ڕێباز. 3) پێڕەوانی ئایینێك.

**ملتجاء:** پەنا، پشت و پەنا، نگابان.

**ملتحد:** پەناگا، حەشارگە.

**ملّت خواهی:** نەتەوەپەرستی، نەتەوەخوازی.

**ملتزم:** 1) هاوڕێ. 2) پابەند، دەروەست، وەئەستۆگر، کەسێك کە شتێ وەئەستۆ بگرێ.

**ملتفت:** 1) تێگەیشتوو، حاڵی. 2) لالێکەرەوە، ئاوڕلێدەرەوە، سەرنجدەر. "**ملتفت شدن**": تێگەیشتن، تێگەیین.





**ملتقا:** شوێنی پێکگەیشتن، شوێنی چاوپێکەوتن، ژوانگە.

**ملتمس:** (مُ.تَ.مِ) لالکەر، لالکەهاس، داواکار، تکاکار.

**ملتمس:** (مُ.تَ.مَ) خوازراو، داواکراو.

**ملتوی:** پێچ خواردوو، باوخواردوو، قەف خواردوو، پێچاوپێچ، خواروخێچ.

**ملتهب:** 1) بڵێسەدار، بەبڵێسە، بڵێسەسەندوو، هەڵایساو، گڕگرتوو، ب پەشقەلە. 2) هەوکردوو، هەڵماسیو.

**ملتئم:** سارێژبۆوە، چاکەوەبوو.

**ملجاء:** لیزگە، پەناگە، حەشارگە، پەناوپەسیو.

**ملحد:** بێ بڕوا بە خودا، کافر، بێدین، هەڵگەڕاوە لە ئایین.

**ملحق:** پەیوەست، بەستراوە، ڕەگەڵ کەوتوو، پاشکۆ. "**ملحق شدن**": پەیوەست بوون، ڕەگەڵ کەوتن، چوونەپاڵ. "**ملحق کردن**": پەیوەست کردن، ڕەگەڵ خستن، وەدووخستن، خستنەپاڵ، پێگەیاندن.

**ملحقات:** پێوەزیادکراوەکان، هاوپێچ کراوەکان.

**ملحوظ:** دیتراو، بینراو، ڕەچاوکراو، دەبەرچاوگیراو. تێبینیکراو. "**ملحوظ داشتن**": ڕەچاوگرتن، دەبەرچاوگرتن. "**ملحوظ شدن**": 1) دەبەرچاوگیران. 2) بینران، دیتران.

**ملخّص:** 1) کورتە، کورتکراوە. 2) پاك، پوخت.

**ملزم کردن:** ناچارکردن، پێکردن، وەئەستۆخستن، خستنەمل، پێویستکردن.

**ملزوم:** 1) پێویستی، پێداویستی. 2) پابەند، دەروەست.

**ملس:** 1) مزر، مێخۆش، ترش و شیرین. 2) سازگار، خۆش.

**ملعبە:** بڕوانە: "بازیچە".

**ملعون:** لەعین، نەحلەتی، بەنەحلەت کراو، نفرەلێکراو، سەرناوە بۆ شەیتان.

**ملغا/ ملغی:** هەڵوەشاوە، پووچەڵکراوە، بەژمارنەهاتوو. "**ملغی کردن**": هەڵوەشاندنەوە، پووچەڵکردنەوە.

**ملفوظ:** تایبەتمەندی پیت یان وشەیەك کە دەرببڕدرێ، بێژراو، گوتراو.

**ملفوظی:** لەبزی، زارەکی.

**ملفوف:** پێچدراو، لوولدراو، لوولدایی.

**ملقّب:** نازناوپێدراو، خاوەنی سەرناو، ناسراو.

**ملقلق:** قلی وبلی، ئاڵۆز و دوور لە زەین(قسە).

**ملك:** (مُ) 1) سەرزەوی، وڵات. 2) پاشایەتی. "**ملك راندن**": حکوومەتکردن، پاشایەتیکردن.

**ملك العرش:** خودا.

**ملك الموت:** ئیزرایل.

**ملکت:** 1) سەرزەوی، وڵات. 2) پاشایەتی. "**ملکت راندن**": حکوومەتکردن، دەسەڵاتدارەتیکردن.

**ملك جو:** دەسەڵاتخواز.

**ملك ستان:** 1) ئەوەی دەتوانێ وڵات و حکوومەتێ لە چنگ کەسێك دەربێنێ. 2) زۆر بەهێز.

**ملکوت:** جیهانی غەیب، جیهانی غەیرەماددی.

**ملکوتی:** 1) ئاسمانی، مەعنەوی. 2) فریشتە.

**ملکوتیت:** خاوەنی دەسەڵاتی ڕەها بوون، خوایەتی.

**ملکە:** تایبەتمەندی ڕۆحی و ئەخلاقییەك کە لە زەیندا دەمێنێتەوە. "**ملکە ذهن کردن**": بەتەواوی خستنە مێشکەوە و لە زەیندا ڕاگرتن. "**ملکە شدن**": بۆ هەمیشە لە زەین دا مانەوەی شتێ.

**ملکە:** شاژن، ژنی شا، شاهینە.

**ملکیّت:** مڵکایەتی، خاوەندارێتی.

**ملل:** کۆی"ملّت"، نەتەوەکان. ئایینەکان، ڕێبازەکان. "**ملل و نحل**": ئایین و ڕێبازە جۆراوجۆرەکان.

**ملموس:** دەست لێدراو، پیامالڕاو. هەست پێکراو.

**ملنگ:** 1) سەرخۆش، مەست. 2) لەسەر کەیف و دڵخۆش. 3) کەم ئەقڵ.

**ملودرام:** مێلۆدرام، شانۆی مام ناوەند و جەماوەر پەسند.

**ملوس:** کتکاڵ، خۆبەنازکەر، بەنازونووز، نەرم و قەشەنگ.

**ملوك الطوایفی:** 1) خان خانەکێ، خانخانی، فەرمانڕەوایی خان و سەرەك هۆزان بەسەر ڕەعیەت و ژێردەستەکانیاندا. 2) حکوومەتی کەسانی سەرەڕۆ.

**ملول:** خەمبار، دڵتەنگ، کز، بێزار، جاڕز، کوومڕەش.

**ملوم:** سەرزەنشت کراو، لۆمەکراو، سەخەربری.

**ملوّن:** 1) ڕەنگا و ڕەنگ، ڕەنگ کراو. 2) هەردەبیر، ڕەنگ گۆڕ.

**ملّی:** 1) نەتەوەیی، نەتەوایەتی، گەلی، گەلێر، سەربە گەل. 2) خۆماڵی. 3) نیشتمانی (شورای ملّی مقاومت: شووڕای بەرگری نیشتمانی). 4) تایبەتی، خوسووسی(مدرسە ملّی). 5) هەڵگری خاوەنداریێتی گشتی (بانك ملّی). "**ملّی شدن**": خۆماڵی بوون، بەنەتەوەییبوون، بەدەوڵەتیبوون. "**ملّی کردن**": خۆماڵیکردن، بەنەتەوەییکردن، بەدەوڵەتیکردن.

**ملیّت:** 1) کۆمەڵە تایبەتمەندی گەلێکی وەك سەربە سەرزەوی یان فەرهەنگێکی تایبەت بوون کە شوناسی تاکەکەسی لە شوناسی تاکگەکانی تر جیادەکاتەوە، کۆمەڵە تایبەتمەندییەکانی نەتەوەیەك کە لە تاك تاکی ئەوان دا دەردەکەوێ، تایبەتمەندییە نەتەوەیی و قەومییەکان، ناسیۆنالیتی (Nationality، Nationhood): ملیت، موجودیت ملی)، ناسیۆنالیزم. 2) هاوڵاتیبوون (او ملیّت ایرانی دارد). 3) نەتەوەیی بوون، لایەنگری نەتەوەبوون. 4) نەتەوە.





**ملیح:** لەبەردڵان و خوێن شیرین، زەڕەشیرین.

**ملّی گرایی:** 1) بڕوانە:"ناسیونالیسم". 2) لایەنگری لە بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان.

**ملیوّن:** نەتەوەخوازەکان، نەتەوەپەرستەکان، ناسیۆنالیستەکان.

**ممات:** (کاتی) مەرگ.

**مماثل:** وەکیەك، هاوتا، هاوشێوە، لێکچوو.

**ممارست:** پرۆڤەکردن، ئەنجامدانی کارێك و دووپات کردنەوەی بەمەبەستی شارەزایی پەیداکردن تێیدا.

**مماسّ:** لێککەوتوو، بەرکەوتوو، لێك ساویاگ، پیامالڕاو."**مماس مشترك داخلی**": (بیرکاری) لێکەوتی هاوبەشی ناوەوە. "**مماس مشترك خارجی**": (بیرکاری) لێکەوتی هاوبەشی دەرەوە.

**مماشات:** مداراکردن، نەرمکێشی، لەگەڵهاتن.

**مماطلە:** ئەمڕۆ و سبەی پێکردن، دەستیدەستی پێکردن.

**ممالك:** 1) وڵاتان. 2) سەرزەوییەکان، ئیالەتەکان. "**ممالك و مسالك**": وڵاتان و ڕێگاکان.

**ممانعت:** پێشگیری، پێش گرتن، بەرلێ گردن، بەرگرتن، بەرگێڕەوەکردن.

**ممتاز:** شاز، بژارە، بژاردە، هەڵبژاردە و جیاکراوە، ژماردە، هەڤیاز، قوتحە، هەرەچاك، دانسقە، سەرتۆپ، سەرگوڵ، کەم وێنە، شتی نایاب و پەسند، لەسەر، بەلای ئەودا هاتگ.

**ممتد:** درێژەوەبوو، درێژەپێدراو، کێشراو.

**ممتلکات:** سەر و سامان، دارایی.

**ممتلی:** بڕوانە: "آکندە".

**ممتنع:** 1) سەرپێچیکار، خۆبوێر، خۆلێنەدەر. 2) ئەستەم، محاڵ، شتی نەشیاو. 3) دەنگی سپی، بێلایەن. "**ممتنع شدن**": پێشگرتن، نەهێشتن.

**ممدّ:** 1) یاریدەدەر، یارمەتیدەر، ئاریکار. 2) زیادکەر.

**ممدوح:** ستایشکراو، پەسندراو.

**ممرّ:** 1) ڕێگەی وەدەست خستنی داهات و دابین کردنی بژیوی. 2) ڕاگوزار، ڕاگوزەر، ڕێڕەو، ڕێگەی هاتوچۆ.

**ممزوج:** ئاوێتەکراو، تێکەڵاو.

**ممسك:** پارێزکەر، بەخیل، قڕنیس، سەقیل، ڕژد.

**ممکن:** مەیسەر، لواو، ڕەخساو، گونجاو. "**ممکن شدن**": شیاوی بوون، شیان، لوان، ڕەخسان، گونجان، دەس/دەست دان، مەیسەربوون. "**غیرممکن**": ناشۆ، نەشیاو، محاڵ، ئەستەم.

**ممکن الوجود:** ئەوەی کە نە بوونی پێویستە نە نەبوونی.

**مملکت:** 1) وڵات. 2) سەرزەوی. 3) پاشایەتی، حکوومەت.

**مملکت داری:** بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات.

**مملو:** لێوان، لێوانە، لێوڕێژ، دارماڵ، لێوانلێو، بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "پر".

**ممنوع:** قەدەغە، قاخە، قۆرغ، یاساغ، ڕێ نەدراو، نەهێڵراو، بەرگیراو، ناڕەوا. "**ممنوع کردن**": هەماندن، کردنە پاوان، قۆرخ کردن، قەدەغە کردن، یاساغ کردن، نەهێشتن، ڕێنەدان.

**ممنون:** بەرمنەت، منەتبار، منەتکار، منەتدار، سوپاسگوزار. "**ممنون بودن**": منەت کێشان، منەتباربوون، سپاس کردن، کرەکردن.

**مموش:** 1) قرتی، کەسێ کە زۆر پێڕەوی لە مۆد دەکا. 2) لەبەردڵان و جوان.

**ممهد:** 1) ڕاخراو، پانەوەکراو. 2) ئامادە.

**ممیز:** 1) جیاکەرەوە، جیاکار. 2) نرخێنەر، خەملێنەر. 3) سانسۆرچی. 4) جیاکەرەوەی چاکە و خراپە. 5) زانا، ئاگا.

**ممیزی:** پشکنین، لێکۆڵینەوە، گەڕان.

**منابر:** کۆی"منبر".

**منابع:** کۆی"منبع".

**مناجات:** کەبار، سەڵا، مناجات، ڕازونیازکردن.

**مناجی:** مناجاتکەر، ڕازونیازکەر.

**منادم:** هاودەم، ئاودەنگ، هاونشین.

**منادی:** 1) کەرەلیاس، جارچی. 2) بانگەشەکەر. 3) بانگکەر، بانگدەر.

**منار:** 1) شوێنی نوور، شوێنی ڕووناکی. 2) منارە.

**منازعات:** شەڕەکان، تێکهەڵچوونەکان، پێکدادانەکان.

**منازعه:** شەڕ و کێشمەکێش کردن، تێکهەڵچوون، پێکدادان.

**منازله:** دابەزینی دوو گروپ لە گۆڕەپانی شەڕ دا بە مەبەستی شەڕکردن، شەڕکردن دەگەڵ خەنیم.

**مناسب:** لەبار، ڕێك وپێك، شیاو، شایستە، قۆڵا، گونجاو، کێس، لەجێ، بەجێ، بەجێ و ڕێ، بابەت، هاولە.

**مناسبات:** پێوەندییەکان.

**مناسبت:** 1) بۆنە، ئاهەنگ، ڕێوڕەسم. 2) گونجان، شیاوبوون. 3) هۆ. 4) خزمایەتی، پێوەندی. 5) لەجێدابوون، بەجێبوون. "**به مناسبت**": بە بۆنەی.

**مناسك:** شوێنی قوربانیکردن. ئایینە دینییەکان. "**مناسك حج**": بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمەکانی حەج وەك تەوافی کابە و هەڵاتن لە نێوان "صفا" و "مروه" و قوربانیکردن.

**مناصب:** کۆی"منصب".

**مناصفه:** دوولەت کردن، کردنە دوو بەش، پارڤەکرن. "**به مناصفه**": نیوەبەنیوە.

**مناطق:** کۆی"منطقە".

**مناظر:** کۆی"منظر". "**مناظر و مرایا**": پرێسپێکتیو.

**مناظره:** ڕووبەڕووبوونەوە(لەباس دا)، باس و گفتوگۆ لە مەڕ بابەتێك.





**مناعت:** 1) گرینگی نەدان بە پارە و ماڵی دنیا، هیممەت بەرز. 2) گەورەیی، مەزناهی. 3) بێ مەترسی بوون.

**منافات:** نەسازان و لێکدژی، دژبەری، دژی یەکتر بوون، ناتەبایی.

**منافذ:** کۆی"منفذ".

**منافسه:** ڕکەبەری، بەربەرەکانی، کێبەرکێ، بەرێکانێ.

**منافع:** کۆی"منفعت"، قازانجەکان، سوودەکان.

**منافق:** دووڕوو، دوڕاز، دووسەر، دووقوون، فرەڕوو، ڕووبین، ناڕاست، قەفراخ، زندق، حەفت ڕەنگ.

**منافقت:** دووڕوویی، ڕووبینی، ڕیاکاری.

**منافی:** 1) حاشالێکەر، نکۆڵی لێکەر، دان پیانەنەر. 2) دژ، ناتەبا.

**مناقشه:** 1) شەڕوکێشمەکێش کردن، دوژمنایەتیکردن. 2) گەنگەشە، باس و گفتوگۆ، نیقاش.

**مناقشه‌آمیز:** گەنگەشاوی، ب نیقاش.

**مناقشه پذیر:** گەنگەشەهەڵگر.

**مناقصه:** داشکاندن، کەمکردنەوە، ململانێکردن دەگەڵ یەك بۆ داشکاندنی نرخی شتێ، کەمبەرکێ، "تەندەر".

**مناقض:** پێشێلکەر، دژ، دژکار.

**مناقضه:** دژایەتیکردن دەگەڵ قسە یان بۆچوونی ئەویتر، پێچەوانەی بۆچوونی ئەویتر قسەکردن.

**مناقله:** دەگەڵ یەك ئاخاوتن.

**مناکر:** کرداری ناحەز و پێچەوانەی شەرع و نەریت.

**منبت:** (مَ.بَ) 1) شوێنی ڕوانی ڕوەك. 2) شوێنی ڕوانی موو. 3) سەرچاوە.

**منبر:** میمبەر، مینبەر، نیەر، دوانگە. "**بالای منبر رفتن**": 1) لەسەر میمبەر دانیشتن و وازدادان. 2) بەدگۆییکردن. 3) چەنەوڕی، فرەوێژی.

**من برتر:** بڕوانە:"ابرمن".

**منبری:** بڕوانە:"خطیب".

**منبسط:** 1) کێش هاتوو، لێك کشاو، کشاو، لێك بڵاوبوو. 2) خۆشحاڵ، ڕووخۆش، گەش.

**منبع:** 1) کانی. 2) سەرچاوە، ژێدەر.

**منبعث:** سەرچاوەگرتو.

**من بعد:** لەمەبەدوا، دوای ئەمە.

**منبل:** 1) تەوەزەل، بێکار. 2) بێ بڕوا.

**منبل دارو:** بڕوانە: "مرهم".

**منبه:** ئاگاکەرەوە، وریاکەرەوە.

**منت:** 1) چکی، منەت، منە. 2) بەچاودادانەوەی چاکە. 3) خوایشت کردن، تکاکردن. 4) سپاس. "**منت پذیرفتن (گرفتن)**": چاکەی کەسێك قبووڵ کردن و سپاس کردن، منەتباربوون. "**منت کشیدن**": منەت کێشان، منەت هەڵگرتن، چوونە ژێرباری چاکە، چاڤ دانان، چاودەبەری.

**منتبه:** وشیار، ئاگا.

**منت پذیر:** منەتبار، منەتکار، سوپاسگوزار.

**منتج:** بەبەر، بەقازانج و سوودمەند.

**منتجب:** (مُ.تَ.جَ) هەڵبژاردە و پەسندکراو.

**منتجب:** (مُ.تَ.جِ) هەڵبژێر، هەڵبژێن.

**منتخب:** (مُ.تَ.خَ) هەڵبژاردە، هەڵبژێراو، پاڵێوراو.

**منتخب:** (مَ.تَ.خِ) هەڵبژێر، هەڵبژێرە، هەڵبژێن.

**منتخبات:** هەڵبژاردەیەک لە بەرهەمی شاعیران و نووسەران.

**منتر:** 1) گاڵتەپێکردن، تیزپێکردن. 2) ماتڵ، چاوەڕوان.

**منتسب:** 1) ڕەپاڵ دراو، وەپاڵ دراو. 2) خزم، فامیل. 3) بەستراوە، سەربە.

**منتشر:** 1) بڵاوبۆوە، پەخش بۆوە. 2) پرژ، پەرژ، بڵاو. "**منتشرکردن**": 1) بڵاوکردنەوە، پەخش کردنەوە، وەشاندن. 2) چاپ کردنی بابەتێ یان وێنەیەک.

**منت شناس:** بڕوانە: "قدرشناس".

**منتصب:** 1) دانراو، دامەزراو. 2) ڕاست، هەڵدراو.

**منتصف:** نیوەی ڕێگا، ناوەڕاست.

**منتظر:** چاوەڕوان، چاوەڕێ، چاونۆڕ، چاوەنۆر، چاونهێر، چاڤنێر، چەشدار، چەشرێ، چەمەرا.

**منتظره:** چاوەڕوانکراو. "**غیر منتظره**": چاوەڕوان نەکراو.

**منتظم:** 1) ڕێکوپێک، تەکووز. 2) هۆنراوە، گەوهەری دەداو کێشراو.

**منتفع:** قازانج بەر، کەڵك وەرگر.

**منتفی شدن:** ڕەدبوونەوە، بەئاکام نەگەیشتن.

**منتقد:** 1) ڕەخنەگر. 2) ئیرادگر.

**منتقل:** ڕاگوێزراو، گوێزراوە. "**منتقل شدن**": گۆزانەوە، گۆزینەوە، گوێزانەوە، گوێزرانەوە. "**منتقل کردن**": 1) گۆزانەوە، گوازتنەوە، گوێزانەوە، گۆزیانەوە، گۆستنەوە، ڕاگواستن، ڕاگوازتن، ڕاگوێزان. 2) دان یان سپاردنی شتێ وەك زانست و ئاگایی بە کەسێ یان بە گروپێك. 3) تێگەیاندن. "**منتقل کننده**": ڕاگوێز، گوهێز، گوێزەرەوە، ڤەگوهێز.

**منتقم:** بڕوانە: "انتقامگیر".

**منتکس:** بڕوانە: "سرنگون".

**منّت کش:** چاوشۆڕ و منەتبار، بنبار، بەرباری منەت، چاوبەرەژێر، سوپاسگوزار.

**منتهز:** هەل قۆزەرەوە، کەسێك کە بە دوای دەرفەت یان هەلی لەبار دا دەگەڕێ.

**منتهی:** بەکۆتایی گەیشتوو، دوایی‌هاتوو، ئەوپەڕ. "**منتهی شدن**": دوایی هاتن، بەکۆتایی گەیشتن، قوتاربوون، بڕانەوە.

**منثور:** 1) قسە یان نووسراوەیەك کە کێش و سەروای نەبێ، پەخشان. 2) پرژێنراو، وەشێنراو.

**منجرشدن:** بوونەهۆی.

**منجلاب:** 1) زلقاو، قوڕ و لیتە، حەڕیا تراو. 2) بارودۆخی خراپ و ناخۆش.

**منجلی:** ڕووناك، ئاشكرا.

**منجّم:** حیسابگەر. ئەستێرەناس.





**منجمد:** 1) بەستوو، سەهۆڵ کردوو، سەهۆڵ بەند، ڕچیاو. 2) بێ جوڵە، نەبزوو، ڕاوەستاو. "**منجمد کردن**": قڕاندن، کردنە سەهۆڵ.

**منجنیق:** هێلکال، هێلکان، ئامرازێکی شەڕی کەونارایە.

**منجی:** (مُ) ڕزگاریدەر، ڕزگارکەر، قوتارکەر.

**منحرف:** 1) لەڕێ دەرچووگ، لە ڕێ کلا، لاڕێ، لادەر، ڕەت، نەتڵ، ئاڤڕێ. 2) چەماوە، خوار، لارەوەبوو. "**منحرف شدن**": لاڕێگرتن، لاڕێبوون، لەڕێ دەرچوون، لە ڕێ لادان، لادان لەڕێ، لەڕێگەگلابوون، کێلەکدان، کێلەکردن، کلابوون، کلبوون، تلاسان، خریان، بەهەڵەداچوون، گومڕابوون. "**منحرف کردن**": لەخشتە بردن، لەڕێ دەربردن، بەلاڕێ دابردن، لاڕێکردن، چەواشەکردن، بەهەڵەدابردن، گومڕاکردن.

**منحصر:** 1) قۆرخ کراو، پاوانکراو، بەرتەسك. 2) تأیبەت. 3) تەنیا. "**منحصربەفرد**": 1) ناوازە، بژاردە. 2) تاقانە، تەنیا. "**منحصرشدن**": 1) بەرتەسك بوونەوە، پاوان کران. 2) بەحەساوهاتن، ژمێرران.

**منحصراً:** تەنیا.

**منحط:** نزم بوو، پەست بوو.

**منحلّ(کردن):** هەڵوەشاندن، هلۆشاندن، لەناوبردن. تواندنەوە، حەلکردن.

**منحلّە:** هەڵوەشاوە، هلۆشی.

**منحنی:** چەماوە، چەماوەیی‌دار، لار. "**منحنی قوسی**": (بیرکاری) کەوانەدار، کەوانەیی. "**منحنی گشتن**": چەمانەوە، چەمینەوە.

**منحوس:** شووم، قەشان، نان و دۆ بڕ، بێ‌فەڕ، نگریس.

**منحول:** 1) نووسراوە یان شێعرێ کە کەسێ بەدرۆ ڕەپاڵ خۆی بدا. 2) بەرهەم، دەسکەوت.

**من حیث القاعده:** بەپێی ڕێسا و شێوازی باو.

**من حیث المجموع:** لەسەریەك، بەگشتی.

**مندرج:** تۆمارکراو، نووسراو. "**مندرج کردن**": نووسین.

**مندرس:** قرپاڵ، قەرادە، شڕوکۆن، شڕۆڵ، کۆنە، ڕزیو.

**مندور:** بەدبەخت، سەرلێشێواو، داماو.

**منذر:** ترسێنەر، ترس وەبەرنەر.

**منزجر:** بێزراو، وەڕەز.

**منزل:** (مَ.زِ) 1) ماڵ، خانوو. 2) هاوسەر یان ژن و منداڵ. 3) قۆناغ. 4) مەبەست، ئامانج. "**منزل کردن(گرفتن)**": نیشتەجێبوون. "**منزل مقصود**": هەوارگەی مەبەست.

**منزلت:** 1) بایەخ و گرینگی. 2) پێگە، شوێنگە، پلەوپایە. "**منزلت چیزی داشتن**": لەبری ئەو بوون، وەك ئەو بوون. "**بە منزلت**": وەکوو.

**منزلگە:** گیهانەك، قۆناغ، شوێنی نیشتەجێبوون.

**منزلە بە:** لەبری، بەجێی.

**منزوی:** گۆشەگیر، گۆشەگر، گۆشەنشین، کەنارەگیر، دوورەپەرێز، لەخۆنامۆ، دەروون خواز، تەریك، پەناگیر، لاپەڕ، **هەڵ** کورماو. "**منزوی بودن**": تەریك بوون، گۆشەگیربوون. "**منزوی شدن**": گۆشەگیربوون، چوونە پەڕاوێزەوە، تەریك کەوتنەوە.

**منزە:** 1) پاك و خاوێن. 2) بە دوور لە خراپە و دزێوی، بەری.

**منسجم:** یەکگرتوو، لێك دانەبڕاو، یەکپارچە.

**منسدّ:** بەستراو، سەدکراو.

**منسوب:** 1) سەربە، سەروە، بەستە، هاوگەر. 2) ڕەپاڵ دراو. 3) خزم، فامیل. "**منسوب داشتن(کردن)**": بڕوانە:"نسبت دادن".

**منسوج:** تەنراو، تنراو، تەندراو، تەناو، ڕایەڵی پۆ تێوەدراو، جۆڵاییکراو، چنراو، کر، سەردڕ.

**منسوخ شدن:** پووچەڵبوونەوە، هەڵوەشانەوە، بەتڵان، لەبەین چوون.

**منسوخ کردن:** 1) هەڵوەشاندنەوە، پووچەڵکردنەوە. 2) لەبرەوخستن. 3) لەبەین بردن.

**منش:** ڕەوشت، ئاکار، گەد، سرشت، خوو. "**منش خاستن**": وەزاڵەهاتن. "**منش زدن**": ڕشانەوە، **هەڵ**ێنانەوە.

**منش ابزاری:** ڕەوشت ئامێری.

**منش انگیز:** دڵ بەیەکاهێن، هێڵنج هێن.

**منشأ:** 1) ژێدەر، سەرچاوە، چاوگە، چاڤکانی. 2) **هۆ**. 3) شوێنی نەشونما. "**منشأ اثر**": سەرچاوەی کاریگەرێتی، کارتێکەر.

**منشآت:** نوسراوەکان، نامەکان.

**منش شناسی:** زانستی ناسینی سفەتەکانی مرۆڤ لەڕووی دەست نووس یان نیگارکێشییەو.

**منشعب:** 1) جیابۆوە لە جێیەك یان لە بەشی سەرەکی. 2) شاخەشاخە بۆوە، لك لك بۆوە، دابەش بوو.

**منشعبات:** لقەکان، لکەکان.

**منش گردا:** بڕوانە:"استفراغ".

**منشور:** 1) ڕاگەیەنراو. 2) بڕیار، فەرمان بەتایبەتی فەرمانی حکوومەت یان فەرمانی سەرئاوەڵە. 3) بەڵگە، قەواڵە. 4) جاڕنامە. 5) پرژ، بڵاو.

**منشویسم:** تیۆرییەك کە لایەنگرەکانی بۆچوونی لێنین یان سەبارەت بە ڕۆڵی حیزب ڕەت کردەوە و خوازیاری یەکیەتی دەگەڵ حیزبە ئازادیخوازەکان بوون.

**منشی:** کەسێك کە ئەرکی ڕێکخستنی کارگەلی ڕۆژانە و پێڕاگەیشتن بە کاروباری ناوخۆیی دامەزراوەیەك یان کۆمپانیایەکە، سکرتێر. 2) ئینشابەند، کەسێ کە ئینشای باشە. 3) پەیام گیر.

**منشی باشی:** سەرقەڵەم، گەورە نووسەری میری.

**منصب:** 1) پلەوپایە، پۆست. 2) کاری فەرمی و گرینگ.





**منصرف:** وازهێن، دەست (**هە**ڵگر/لێ بەردەر)، لێگەڕ. "**منصرف شدن**": وازهێنان، وازلێهێنان، لێگەڕان، دەست کێشانەوە، دەس لێبەردان، پاشگەزبوونەوە.

**منصّف:** (مُ.صِ) نیوەکەر، لەتکەر.

**منصف:** (مُ.صِ) دادگەر، دادپەروەر، بەئینساف.

**منصفانە:** دادپەروەرانە، بێلایەنانە.

**منصوب کردن:** دانان، دیاریکردن، دامەزراندن.

**منضمّ:** (مُ.ضَ) هاوپێچ کراو، لە گەڵ خراو، پەیوەست کراو.

**منطبق:** (پێکەوە)گونجاو، هاوڕێك، هاوتا، یەکسان.

**منطفی:** کووژاوە، دامرکاو، ڤەمریایی.

**منطق:** 1) ژیربێژی، لۆژیك، بیرسا، زارشت. 2) دەلیل، **هۆ**. 3) فیکری دروست. 4) یاسای زاڵ بەسەر دیاردەکاندا. 5) شێوەی تێفکرین و بەڵگەهێنانەوە. 6) ئاخاوتە، بێژە. 7) ئاخاوتن، قسەکردن، پەیڤین. "**منطق استقرایی**": لۆژیکی خوێندنەوە. "**منطق جدلی**": لۆژیکی دیالێکتیکی. "**منطق زبانی**": لۆژیکی گوتەیی، گوتە(لەزمان و هزر دا). "**منطق ستیزی**": دژەلۆژیکی. "**منطق صوری**": لۆژیکێ کە تاوتوێی یاساگەلی حوکم و بەڵگاندنەکان دەکا و لە ناوەرۆکی بەڵگاندن دەگەڕێ، لۆژیکی وێنەیی. "**منطق گفتگو**": لۆژیکی وتووێژ. "**منطق موقعیت**": لۆژیکی پێگەیی. "**منطق نمادی**": لۆژیکی هێمایی.

**منطق پذیر:** شیاوی قبووڵ کران لەباری ئەقڵ و لۆژیکەوە، لۆژیك **هە**ڵگر. کەسی پابەند بە لۆژیك یان بەڵگاندنی ئەقڵی.

**منطقە:** 1) ناوچە، ناڤچە، بەشێك لە وڵات، هەرێم، مەڵبەند، محاڵ(محاڵی گەورك)، ئاقار، ئۆلکە، وڵکە، هەوێرکە، ڤاچ، شوێن. 2) بەرەی شەڕ. "**منطقەصفر**": (سیاسی) لەسەر هێڵی سنووری. "**منطقە محرمە**": ناوچەی قەدەغەکراو.

**منطقی:** 1) ژیربێژانە، لۆژیکی(یانە)، بیرسایی. 2) ئاوەزپەسند، شتێ کە ئەقڵ هەڵی بگرێ، بەجێ، دروست. 3) مرۆی فیکر دروست لە گوتار و ڕەفتار دا. 4) مامۆستای لۆژیك.

**منطوق:** ئەوەی لە ڕواڵەتی قسە و گوتاری کەسێك هەڵدەهێنجرێ.

**منطیق:** ڕەوانبێژ، زمان پاراو.

**منظر:** دیمەن، چاوگە، پێشچاو، بەرجەوەن، خویانەك. 2) ڕەنگ و ڕوو، دەموچاو. "**منظر چشم(دیدە)**": گلێنەی چاو. "**از منظرِ**": لە ڕوانگەی.

**منظرە:** دوورنما، دوورەدیمەن، نما، دیا، دیمەن، چاوەنداز، بەرچاو، چاوگە.

**منظّم:** 1) تەکووز، تەکویز، تەکویس، لەباروبێکەمایەسی، پۆڕ، ڕێك وپێك، ڕێك و

جۆر، سیستماتیك. 2) لەسەریەك، پەیتاپەیتا. 3) هۆنراوە، دەداو كێشراو. "**منظم شدن**": ڕێك و پێك كران، ڕێكخران، هەڵ وەژێران. "**منظم كردن**": ڕێكوپێك كردن، تەكووزكردن، ڕێكخستن، هەڵوەژارتن.

**منظور:** 1) لەبەرچاوگیراو، ڕەچاوكراو. 2) مەبەست. 3) نیاز لە قسە و كار. 4) جیی سەرنج و بایەخ. "**منظور داشتن**": 1) نیازهەبوون، مەبەست هەبوون. 2) دەبەرچاوگرتن، ڕەچاوگرتن. "**منظور نظر**": مەبەست، مراد.

**منظوم:** 1) هەڵبەستە، بە شێعر گوتراو. 2) دەداوكێشراو. "**منظوم داشتن**": ڕێكوپێك كردن.

**منظومه:** 1) هۆنراوە، هۆندراوە، هەڵبەستە. 2) سیستم. 3) دەداوكێشراو، بەبەنەوەكراو.

**منظومه پرداز:** شاعیر، هەڵبەستوان، هۆزان.

**منع (كردن):** نەهێشتن، ڕێگە نەدان، ئیزن نەدان، قەدەغەكردن، گرتنەوە.

**منعطف:** نەرم و شلك، نەرمكێش، چەمهەڵگر، چەمیو، دانەویو. "**منعطف كردن**": 1) ئاراستەكردن، گرێدان. 2) ئاراستەگۆڕین.

**منعقد:** بەستراو، گرێدراو، مەیو، ئەماس، ڕچ. "**منعقد داشتن**": بەڕێوەبردن، سازدان، بەرپاكردن. "**منعقد شدن**": 1) بەستران، مەیین، ڕچان، ڕچیان، ڕسیان، گرسیان، پڵپ بەستن، توندبوونی شل. 2) بەڕێوەچوون، سازدران، پێكهاتن. 3) شكلٚ گرتن. "**منعقدكردن**": 1) بەستن، مەیاندن، ڕچاندن. 2) پێكهێنان، سازدان، بەڕێوەبردن.

**منعكس شدن:** 1) دەنگدانەوە، كاردانەوە. 2) دەركەوتن، دیاركەوتن. 3) بڵاوبوونەوە (این خبر باید منعكس بشود). 4) نووسران، تۆماركران. 5) ئاوەژووبوون، بەراوەژووبوون، پێچەوانەبوون.

**منغص:** ناخۆش، تاڵ، نەخوازراو.

**من غیرحق:** 1) بەبێ هەبوونی هەق. 2) بەناهەق.

**منفجرشدن:** تەقین، تەقینەوە، تەقانەوە، ترۆقین، پەقین، ترەكان، ترەكین.

**منفجر كردن:** تەقاندن، تەقاندنەوە، تۆقاندن، ترەكانن، پەقاندن، هەڵ ترەكان، هەڵ ترەكیان.

**منفذ:** بوێر، تێ پەڕ، درز، كەلێن، كەلەبەر، شوێنی ڕەخنەكردن، شوێنی تێپەڕین، پەنجێرە، دەلاقە، ڕۆچنە، كون. "**منفذ باد**": باگر، باگا، بابوێر، باكەش، باخن، باخوڕ، بادرز، بائەنگێو، كونەبا، قەڵشێ یان كونێ كە بای لێوە دێ.

**منفرج:** كراوە، ڤەكری، والا.

**منفرد:** 1) تاقانە، بێهاوتا. 2) تەنیا، تاق، تاك كەوتوو.

**منفرداً:** بەتەنێ، تاك تاك، جوێ جوێ.

**منفسخ:** پووچەڵبۆوە، هەڵوەشاوە.





**منفصل:** جیا و سەربەخۆ و نەبەستراوە بە ئەویتر. "**منفصل كردن**": لەسەركار یان خزمەت لابردن، لێخستن. 2) جوێكردنەوە.

**منفعت:** بەرژەوەندی، قازانج، بەهرە، خێر، خێروبێر، سوود.

**منفعت طلب:** بەرژەوەندی خواز، قازانج خواز.

**منفعل:** 1) پاسیو، پاسیڤ، ناچالاك. 2) شەرمەزار، سەرشۆڕ.

**منفكّ:** جیابۆوە، پچڕاو.

**منفور:** ڕەزاگران، پێرم، بێزراوە، لەبەرچاوكەوتوو، لەبەرچاو ڕەش بوو، خوێنتاڵ لای خەڵك، ناپەسند، نەویستراو، كەس نەویست. "**منفور شدن**": هەڵ كەفتن، لەبەرچاوكەوتن، ڕەش بوون، كەس نەویستن.

**منفی:** (مَ.فا) شوێنی دوورخستنەوە، تاراوگە.

**منفی:** (مَ.فِ) 1) نەرێنی، نیگاتیڤ، سەلبی. 2) ئەوەی نیشانەی قبووڵ نەكردنی شتێ بێ، دژ.

**منفی باف:** كەسێك كە سەبارەت بە شتێ یان كەسێ یا خود كارێ ڕوانگەی ڕەشبینانە و دژی هەیە.

**منقاد:** بڕوانە: "مطیع".

**منقبض:** ڕێك هاتوو، وێك هاتوو، گرژبوو، چرچ و لۆچ بووگ، شتێ كە چووبێتەیەك، چوونەیەك.

**منقّح:** 1) پاك كراوە، چاك كراوە. 2) پاك، خاوێن.

**منقد:** بڕوانە: "منتقد".

**منقذ:** ڕزگاریدەر.

**منقرض شدن:** لەناوچوون، لەبەین چوون، قڕتێكەوتن، قڕهاتن، قەڵاچۆتێكەوتن، قڕان تێكەوتن، دوابڕان، ئاسەواربڕان، كۆرەوەبوون.

**منقرض كردن:** قەڵاچۆكردن، لەناوبردن، ئاسەواربڕین، قڕكردن، قڕان تێخستن.

**منقسم:** دابەش بوو، كەرت بوو، بەش بەش بوو.

**منقّش:** نەخشاو، نەخشیو، نەخش كراو، بەنەخش، بەنەخش و نیگار، نەخشدار، نەخشاندی، نگارین، ڕەنگاورەنگ كریاگ.

**منقصت:** كەموكووڕی، ناتەواوی.

**منقضی:** بەسەرچوو، تێپەڕیو، ڕابردوو.

**منقّط:** خاڵدار.

**منقطع:** 1) بڕاو، دابڕاو، پچڕاو، پساو، لێك جیابۆوە. 2) كاتی (هاوسەرگیری). 3) گۆشەنشین، تەریك. 4) ئەوەی لە سەفەر جێ بمێنێ. "**منقطع شدن**": 1) بڕان، پسان، پچڕان. 2) لەبەین چوون، كۆتایی هاتن. 3) دووركەوتنەوە، جیابوونەوە. 4) ڕێ ونكردن و مردن. "**منقطع كردن**": بڕین، پچڕاندن، پساندن. "**منقطع ماندن**": جیاكەوتنەوە لە هاوڕێیانی خۆ لە سەفەردا، دابڕان، ڕێ ونكردن.

**منقطع النسل:** دوبڕیاگ، دوابڕاو، ڕیشەكێش كراو، جووچكەبڕیاگ، لە زار و زیچ بێبەش.

**منقلب:** 1) تێکچوو، نائارام، بێئۆقره. 2) ئەوەی توشی گۆڕان دەبێ. "**منقلب شدن**": 1) تێکچوون، گۆڕان. 2) وەرگەڕان، ژێرەوژووربوون.

**منقلع:** هەڵکەنراو، ڕیشەکێش کراو.

**منقورداشتن:** هەڵکۆڵین، هەڵکەندن.

**منقوش:** نەخشین، نەخشاو، نەخشیو، جوان و ڕەنگاوی، بە ڕەنگی جوان ڕەنگاو. "**منقوش کردن**": هێڤساندن، نەخشاندن، بەڕەنگی جوان ڕەنگاندن.

**منقوط:** خاڵدار، پیتێ کە خاڵی هەبێ.

**منقول:** 1) گوێزراوە، ڕاگوێزراو. 2) گێڕاوە. "**اموال غیرمنقول**": مردە، مردەماڵ. "**اموال منقوله**": میری، ماڵ و دارایی کە ڕادەگوێزرێ.

**منکر:** (مُ.كِ) بڕوانە: "انکارکننده".

**منکَر:** (مُ.كَ) 1) هەرجۆرە کار و کردەوەیەکی ناحەز و ناپەسند. 2) ناحەز، ناشیرین. 3) نەناسراو، کەس نەناس.

**منکسر:** 1) شکاو، شکەستی. 2) (بیرکاری) شکاوە. "**منکسرشدن**": 1) کەمبوونەوە. 2) شکست خواردن، تێکشکان.

**منکشف:** دیار، ئاشکرا.

**منکوب:** تێکشکاو یان سەرکوت کراو، شکست خواردو، تووشی نەگبەتی و چارەڕەشی هاتوو.

**منکوحه:** مارەکراو، مارەبڕاو.

**منکور:** کەس نەناس، نەناسراو.

**منگ:** 1) تووشی گێژی و ئالۆزی زەینی بوو، تووشی سەرەگێژە یان سەرقورسی بوو. 2) قومار.

**منگنه:** قرتە، قرتێنە، ئەشکەڵە، نێرە و مێوە لە باتی دوگمە.

**منگولیسم:** بڕوانە:"سندروم داون."

**منگیا:** قومارخانە.

**منگیاگر:** قومارباز، خاوەن قومارخانە.

**منگیدن:** بە ئەسپایی ئاخاوتن، لە ژێر لێوەوە قسەکردن.

**منم زدن:** بەخۆدا هەڵکوتن، تاریفی خۆکردن.

**منوسیت:** (پزیشکی) مۆنۆسایت، تاکەخانە.

**من(و)من:** مینگەمینگ کردن، منجەمنج کردن.

**مننژیت:** (پزیشکی: هەوکردنی پەردەی مێشک، ئاوسانی پەڕەی مەژی.

**منوال:** شێوە، شێواز، چەشن.

**منوپوز:** (پزیشکی) تەمەنی بێهیوایی، کاتێ ژنان بەهۆی چوونەسەری تەمەنییانەوە لە خولی مانگانە ڕادەوەستن

**منوّر:** ڕووناک، چراخان، ورشەدار، بەدرەوشین.

**منورالفکر:** بڕوانە:"روشنفکر".

**منوط:** 1) بەستراوە، گرێدراو. 2) بەمەرج، مەرجدار. "**منوط کردن**": بەستنەوە، گرێدان.





**منوگام:** یەك ژنە، خاوەن یەك ژن.

**منولوگ:** تاك دەنگی، مۆنۆلۆگ.

**منها(کردن):** لێدەرکردن، (لێ)کەم کردنەوە. بەحەساونەهێنان.

**منهج:** 1) ڕێگەی ڕاست، ڕێگەی ئاشکرا. 2) پێڕەو، بەرنامە(ی کار). 3) شێواز، مێتۆد، بەشێوەیەکی گشتی ئامرازێکی دیاریکراوە بۆ ئامانجێکی دیاریکراو. لەوانەش مێتۆدی زانستی و مێتۆدی مێژوویی‌و مێتۆدی پێکهاتەیی و مێتۆدی خودی و مێتۆدی بەراوردکاری.

**منهدم:** ڕووخاو، ڕمیاو، کاول بوو، وێران بوو، هەڵتەکاو، تێکوپێك دراو.

**منهزم:** شکست خواردوو و هەڵاتوو، تێك شکاو، بەزیو.

**منهوب:** بەتاڵان براو.

**منهی:** (مُ.هِ) 1) هەواڵ گەێن، هەواڵدەر، نووچەگهان. 2) بڕوانە:"جاسوس".

**منهیّ:** (مَ.هِ) نەهێشتراو، نەهێڵراو.

**منهیات:** کارە خراپەکان کە شەرع ڕێی پێنەداوە.

**منی:** (مَ.نِ) منەمنە/ منێمنەکردن، خۆنوێنی، خۆپەسندی، خۆپەرستی.

**منیت:** (مُ.یَ) ئارەزوو، هێڤی.

**منیّت:** (مَ.یَ) 1) ئەجەل، مەرگ. 2) خۆپەسندی، خۆبینی.

**منیر:** 1) ئەوەی لە خۆیەوە نووری هەبێ وەك خۆر. 2) ڕووناك کەرەوە، درەوشەدار.

**منیع:** 1) بەرز. 2) پایەبەرز، هێژا.

**موات:** 1) بێگیان، مردوو. 2) زەوی وشك و بوورە.

**موّاج:** 1) شەپۆلاوی، شەپۆلدەر، بەپێل. 2) چین دار.

**مواجب:** 1) جیرە و مووچەی مانگانە یان ساڵانە. 2) کاروباری واجب.

**مواجب بگیر:** مووچەگر.

**مواجەشدن:** ڕووبەڕووبوونەوە، بەرەنگاربوونەوە.

**مواجەکردن:** ڕووبەڕووکردنەوە.

**مواجهه:** 1) بەرەنگاربوونەوە، ڕووبەڕووبوونەوە. 2) ڕووبەڕووکردنەوەی دوو یان چەند کەس بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی هەقیقەتێ. "**درمواجهه**": لەڕووبەڕوو، لەبەرامبەر.

**مؤاخذه:** لێپرسینەوە، لێپێچینەوە، لێگرتن، ڕەخنەگرتن، ئیرادگرتن.

**موادّ:** کۆی"مادە". "**مواد آلی**": ماددە غەیرەکانزاکان. "**مواداولیّه**": کەرەستەی سەرەتایی، ئەوەی کە لە کانگاکان وەدەست دێ. "**موادّخام**": کەرەستەی خاو، کەرەستەی دەکارنەکراو، کەرەستەیەك کە لە ڕێگەی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری وەدەست دێ. "**موادسوختنی**": شەواتەك، سووتەمەنی. "**موادّ غذایی**": ماددە خۆراکییەکان. "**مواد مخدر**": ماددەسڕکەرەکان، ماددەبێهۆشکەرەکان. "**موادمعدنی**": ماددەکانزاییەکان، ماددە کانزاکان.

**موادعە:** وازهێنان لە دوژمنایەتی، ئاشت بوونەوە.

**موارد:** کۆی"مورد".

**مواریث:** کۆی"میراث".

**موازات:** هاوڕاستا، هاوتەریب. **"بە موازات"**: بەهاوتەریبی.

**موازرت:** یارمەتیدان.

**موازنــە:** 1) هاوسەنگی. 2) هاوکێشی. **"موازنە مستقر"**: هاوسەنگی جێگیر. **"موازنە مستقر"**: هاوسەنگی بەردەوام. **"موازنە منفی"**: (سیاسی) سیاسەتێ لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا لەسەر بنەمای نەدانی پوان بەهیچ کام لە وڵاتانی بەهێز.

**مــوازی:** هاوتەریب، تەریب، بەرامبەر، ڕووبەڕوو.

**مــوازین:** کۆی"میزان"، پێوەرەکان. ڕێساکان، یاساکان.

**مواسات:** یارمەتی ماڵی بە یەکتر کردن.

**مواسم:** کۆی"موسم".

**مواضع:** کۆی"موضع".

**مواضعــە:** 1) وادەدانان دەگەڵ یەکتر بۆ ئەنجامدانی کارێك، قەرار و مەدار. 2) هاودەستی و کەین و بەین بۆ ئەنجامدانی تاوانێ. 3) ماڵیات.

**مواطن:** کۆی"وطن".

**مواظب:** ئاگا لەخۆ، لەخۆ ئاگادار، لەسەرهۆش، وریا، نگادار، مقات، مقاتە، مقەیەت، سەراپێ، نگابان، چاوەدێر، کەسێ کە بەردەوام چاوەدێری لە کارێ یان بابەتێ دەکا.

**مواظبت:** نگاداریکردن، ئاگالێبوون، پاراستن، ئاگاداری، نگاهێشتن، هوشیاربوون.

**مواعد:** کۆی"موعد".

**مواعده:** وادەدان بە یەکتر، قەول و قەرار.

**مواعظ:** کۆی"موعظە".

**مواعید:** کۆی"میعاد"، وادەکان، بەڵێنەکان.

**موافق:** 1) هاوڕا، هاوبیر، لەگەڵ دابوو. 2) ڕازی، قایل. 3) سازگار. **"موافق آمدن"**: قبووڵ کران، پەسندکران.

**موافقت:** 1) ڕازی بوون، ڕەزامەندی، قایل بوون، چوونە ژێربار. 2) هاوڕابوون، هاوبیرابوون. **"موافقت شدن با امری"**: قبووڵ کرانی ئەو، ڕەزامەندی نیشان دان بەو.

**موافقتنامە:** ڕێککەوتننامە.

**مواقع:** کۆی"موقع".

**مواقف:** کۆی"موقف"، وێستگەکان.

**مؤالفت:** هۆگری و خووگرتن بە کەسێك، تێکەڵی، دۆستایەتی.

**موالید:** 1) (موالید زیاد) زاوزێ، زاوزوو، زکوزا، زاکوزا. 2) مناڵەکان. 3) ئاسەوارەکان، ئاکامەکان. **"موالید سەگانە"**: بریتی لە ڕەقەمەنی و ڕووەك و ئاژەڵ. **"دفتر موالید"**: زابەند، دەفتەری نووسینی تازەزاوان.





**موانع:** کۆی"مانع".

**مواهب:** کۆی"موهبة".

**مؤبد:** هەمیشەیی، دایمی، هەتاهەتایی، هەرمانی.

**مــوبــد:** 1) ڕووحانی زەردەشتی. 2) بیرمەند، زانا. 3) وەزیر، ڕاوێژکار. 4) مێژووزان.

**موبیز کردن:** دابێژان، بێژنگ کردن، بێژتن.

**مــوت:** مەرگ. **"موت احمر"**: 1) کوژران و دەخوێن دا شەلاڵ بوون. 2) دژایەتی دەگەڵ نەفس. **"موت اخضر"**: دەبەرکردنی جلوبەرگی بەپینە. **"موت اسود"**: تەحەممول کردنی ئازاری خەڵك.

**موتاسیون:** گۆڕانی کتوپڕی تایبەتمەندییەکانی ژێنێتیکی گیانلەبەران، موتاسیۆن.

**مؤتمر:** 1) شوێنی کۆبوونەوە، کۆنگرە، کۆنفرانس. 2) مەئموور.

**مؤتمن:** کەسی ڕاست کردار و جێیمتمانە.

**موتی:** کۆی"میت"، مردووەکان.

**موتیل:** جووڵە، جووڵەکردن.

**مــؤثر:** کاریگەر، کارتێکەر، ب باندۆر، کارکوو، کاری بەهرەدەر، سوودبەخش.

**موثق:** باوەڕپێکراو، جێگەی متمانە، جێی بڕوا.

**مــوج:** 1) سیپەل، شەڵپاو، شەپێل، شەپۆل، شیپە، شیپەل، پێل، لەف، لیپ، لیپان، لیپاو، بۆڕ، مۆنج. 2) جەریانی توند و کتوپڕ. **"موج برداشتن"**: 1) شەپۆل هەڵگرتن. 2) چرچولۆچ بوون. 3) بڵاوبوونەوە، پەرژبوون. **"موج بزرگ"**: گەڤل، شەپۆلی زل. **"موجدار"**: شەپۆلاوی، شەپۆلدەر، بەپێل، بەمۆنج. **"موج رودخانە"**: قەڵبەزە، قەڵەوەز. **"موج زدن"**: 1) شەپۆل دان/ لێدان، پێل دان، لەپێل بوون. 2) ئاشکرابوونی شتێ بەهۆی زۆربوونی. 3) بڵاوبوونەوە. **"موج کوچك"**: شەپۆلك، شەپۆلکە، شیپەلك.

**موجب:** هۆ. **"بە موجب"**: بە گوێرەی.

**موجان:** هەڵچوون و پێل دانی دەریا، شەپۆلاوی بوونی دەریا، پێل بوونا بەحرێ.

**موجد:** وەدیهێنەر، داهێن، ئافرێنەر.

**موجر:** بەکرێدەر، کرێدەر، خاوەن ماڵ.

**موجز:** کورت، پوخت.

**موج زن:** شەپۆل دەر، پێل دەر.

**موج سوار:** 1) بریتی لە هەلپەرست. 2) شەپۆل سەوار.

**موج شکن:** شەپۆل ڕەوێن، پێل شکێن، کەڵەرە.

**موجود:** 1) بوون، شتێ کە هەیە، ئارایی. 2) بوونەوەر، رح ل بەر.

**موجودات:** بوونەوەرەکان، هەمگەل، هەسان، هەرچی خاوەن بوونن.

**موجودی:** هەبوو، بوون و نەبوون، هەست، هەست و نست، هەست و نیست، ئاشتەبا، ئەشت، شت.

**موجودیّت:** بوونێتی، هەبوون، هەیاتی، مان و نەمان.

**موجّە:** 1) شیاوی قبوولّ، پەسندکراو. 2) خاوەنی فام و شعوور و ئەدەب. 3) پلە، پۆست. 4) پاساوهەلگر.

**موچلکا:** بەلگە.

**موچول:** چوکە و ناسك.

**موحّد:** یەك پەرست، خودای تاك و تەنیا ناس.

**موحش:** ترسناك، ترسێنەر، بەخۆف.

**مودّت:** دۆستایەتی، خۆشەویستی.

**مؤخر:** بەشی دواوەوەی شتێك، پاشەوە. "**مؤخرەلشکر**": دواجەنگ، دوایی لەشکر، ئەو شەڕکەرانەی پاشی لەشکر دەپارێزن، پاش پارێز. "**مؤخراً**": بەم دواییانە.

**مؤدب:** بەئەدەب، بارهاتوو، تەربیەت کراو، بەڕێز، ب حورمەت.

**مودت:** دۆستایەتی، خۆشەویستی.

**مؤدی:** مالّیاتدەر، باجدەر.

**مؤذن:** بانگدەر، بانگوێژ، ئەوەی بانگی نوێژ ئەخوێنێ.

**موذی:** زینات، بەدفەڕ، ئازاردەر، مافەتا، مافەتە، مزیڕ، ئاوری ژێرکا، بەدجنس، قاپگر، ئاوری ژێر کا.

**مورّب:** مارودو، قیلەوقاچ، فیچەلّفاچ، قیچەلّفاچ، شەفتوور، شەفتوول، چەفت بڕیاگ.

**مورّث:** (مُ.وَ.رِ) کەسێك کە میرات لە خۆی بە جێ دێلّێ.

**مورِّخ:** مێژووزان، مێژووناس، مێژووڤان، دیرۆکناس.

**مورد:** 1) بابەت. 2) مەسەلە. 3) لەجێدابوون، بەجێبوون. 4) شوێنی چوونەژوورەوە. 5) شت. 6) جێی، جێگە(مورد ترحم: جێگەی بەزەیی، مورد اعتماد: جێیمتمانە). "**مورد داشتن**": 1) مەسەلەدار هەبوون. 2) لەجێدابوون، بەجێبوون. "**بی مورد**": بێ جێ، نابەجێ، بێ مانا. "**در مورد**": سەبارەت بە، لەبارەی.

**موردی:** بەشێوەی تایبەت.

**مورفولوژی:** 1) (پزیشکی) داڕشتەناسی، زانستی تاوتوێی فۆڕم و پێکهاتەی بوونەوەرانی زیندوو. 2) (زمان ناسی) پێکهاتەناسی وشە، وشەناسی. 3) پێکهاتەناسی.

**مورمورشدن:** سووکە لەرزین، گزگزین، مرۆچانەکردن، موچڕك پێداهاتن، مێرولەکردن، بیزبیزین، خۆران و تەزینی پێست.

**مورمورکردن:** لنگ قەرسین، مرۆچەکردن، تەزین و خورانی پێست.

**موروثی:** 1) بەمیرات گەیشتو. 2) مالّێ کە بە میرات بە کەسێك بگا. 3) کەسێ کە میراتی لە خۆی بەجێ هێشتبێ.

**موزِّع:** دابەشکەر، پارڤەکەر، پەخشکەرەوە.

**موزون:** 1) تەکووز و هاوئاهەنگ و هاوڕێك و جوان. 2) ڕیتمیك، ئاهەنگ دار، کێشدار. 3) تەواوعەیار. 4) هاوکێش. "**موزون شدن**": وەزن کران، کێشران.





**موزونیّت:** 1) هاوئاهەنگی. 2) خاوەن بەهرەبوون لە شێعروێژیدا.

**موزە:** عەنتیکەخانە، مووزە، مووزەخانە.

**موزیسین:** مۆسیقاژەن، ژەنیار.

**موزیك:** مووسیقا، هونەری مووسیقا.

**موزیکال:** سەربە مووسیقا، دەگەلّ مووسیقا و ئاواز.

**موژ/ موژە:** بڕوانە: "تالاب".

**موسّخ:** بڕوانە: "چرکین".

**مؤسِس:** دامەزرێنەر، دانەر، بناخەدانەر، بنیاتنەر، ڕۆنەر.

**مؤسسات:** دامەزراوەکان، دامودەزگاکان، بنیاتەکان.

**مؤسسە:** دامەزراوە، ڕێکخراوە، ڕۆنراوە، (دام و)دەزگا، بنیات، هیندە، ئاژانس، نووسینگە، دەفتەری نوێنەرایەتی.

**موسم:** کژ، کەژ، وەرز، وادە، هەڕەت، هەڕەمە، چاخ، جەنگە، جەرگە، دۆخ، دۆخیان، دوخیانەت، دان، دەم، وەگ، هنگ، هەڤرونگ، ئەنگۆرە، تۆف، تاف، سەردەم، سەروبەند، کات، وەخت. "**موسم باران**": سەرپەل، چاخی دەسپێکردنی بارانی پەلّە، کژەباران، کژەبارانە. "**موسم باران بهاری**": شاسە، شەستە باران، جەنگەی بارانی بەهار. "**موسم باران پاییزی**": سەرپەلّە، جەنگەی بارانی پاییزی. "**موسم برداشتن خرمن**": خەرمان سوور، وەختی خەرمانان. "**موسم برگریزان**": خەزەلّوەرین، غەزەلّوەر، گەلاخان، گەلاڕێزان، گەلاڕێژان، گەلاکەوتن، ڕەوتین، جەنگەی پەلك وەرینی داران. "**موسم بهار**": خوێن جمان، خوێن جومان، هەڕەتی بەهار/وەهار. "**موسم جفتگیری بز و گوسفندکوهی**": کەلّەز، کەلّەهەرز. "**موسم جفتگیری حیوانات وحشی**": گوهتێل، گوهێر، گوەنێر، هەڕەتی جووت بوونی حەیوانە کێوی. "**موسم جفتگیری در گلّە**": گوەنێر، هەڕەتی بەران تێبەردان. "**موسم چیدن میوە**": ڕنە. "**موسم خرمن کوبی**": کێشەوگێرە، جەنگەی خەرمان کوتان. "**موسم درو گیاە**": کۆپەڕ، پووشپەڕ، جەنگەی گیادروون. "**موسم درو غلّە**": گولّپەڕ، وەختی دروێنە هاتنی دەخلّ. "**موسم درویدن یونجە**": هەلّزبڕ، وەختی دروێنەی وێنجە. "**موسم دمیدن غنچەها**": گولخیڤ، دەمی پشکوتنی گولّان. "**موسم چیدن ترەبار**": وەرزقورێف، جەنگەی ڕنینی تەڕەکاری. "**موسم مازو چیدن**": هێلامازیا. "**موسم وزیدن باد**": کژەبا، سەردەمی با هاتنی زۆر. "**اوایل موسم**": لەنگۆرە، لەنگۆرێ، سەرەتا، دەسپێکی دەمێك. "**پایان موسم صیفی کاری**": هێڤشین، کاتی بەسەرچوونی بێستان و تەڕەکاری. "**گذشتن موسم**": هێڤشهاندن، دەم بەسەرچوون.

**موس موس:** بڕوانە: "چاپلوسی".

**موسوم:** 1) ناولێنراو، ناونراو. 2) ناسراو.

**موسیقی ترا پی:** دەرمان کردن بە مۆسیقا.
**موسیقی دان:** مۆسیقازان، مووسیقاژەن.
**موسیقی درمانی:** بڕوانە: "موسیقی تراپی".
**موسیقی نگار:** ئاهەنگ ساز.
**موسیو:** ئاغا.
**مـوش:** مشك. **"موش آب کـشیده"**: بریتی لە تەڕوتلیس بوو. **"مـوش دوانـدن"**: کارشکێنی کردن، هاندان و پیلان گێڕان. **"موش شـدن"**: لە ترسان متەق لێوەنەهاتن و سەرخستنە قاپیلکی خۆوە. **"خود را به مـوش مردگـی زدن"**: سەگەسەگ، خۆگێل کردن و خۆ بە بەستەزمان نیشان دان.
**موشکاف:** وردبین، باریك بین، کونج پشکن.
**موشـکافی:** هووربینی، وردبینی، باریك بینی، شەن و کەوکردن شتێ یان بابەتێ، شیتەڵکاری، مووئەنگێوی.
**موشـك دوانـی:** 1) کارشکێنی، هاندان و پیلانگێڕی. 2) ئاژاوەگێڕی.
**موش واره:** (کۆمپیۆتێر) ماوس.
**موصِل:** گەیەنەر، بەیەکگەیەنەر.
**مـوصـوف:** 1) وەسف کراو، پەسن کراو. 2) لە ڕێزمان دا: خاوەن ئاوەڵناو.
**موصـول:** 1) پەیوەست کراو، پێکەوە گرێدراو، پێکەوە بەستراو. 2) (ڕێزمان) لێکدەر.
**موصِی:** وەسیەت کەر.
**مـوضـع:** 1) پێگە، شوێن، جێگە. 2) هەڵوێس، هەڵوێست. 3) روانگە. **"موضع دفاعی"**: حاڵەتی بەرگری، بەرخوەدانی.
**مـوضـع گـیـری:** 1) هەڵوێست گرتن. 2) هەڵبژاردنی شوێنێکی تایبەت و جێگیربوون تێیدا زۆرتر بۆ بەربەرەکانی دەگەڵ دوژمن.
**موضـوع:** 1) بابەت، باس. 2) سووژە (موضوع فیلم، موضوع نقاشی). 3) مەسەلە یان گرفت یاخود ڕووداوێکی تایبەت. 4) چێکراو یان دانراو. **"موضوع داشـتن"**: 1) سووژە هەبوون، جێیباس بوون. 2) پاساوهەڵگربوون. **"موضـوع شناختی"**: بابەتی ناسینەوە، بابەت ناسانە. **"موضوع صحبت"**: سەرباس.
**موضوعیّت:** بابەتێتی، جێیباس بوون.
**موطن:** بڕوانە: "وطن".
**موظّـف:** 1) ئەوەی ئەرکی سەرشانییەتی کاریٚ ئەنجام بدا، ئەوەی ناچارە کارێك ئەنجام بدا. 2) فەرمانبەر، کارمەند، مووچەخۆر. **"موظف شدن"**: وەئەستۆگرتنی ئەرك یان سپاردنی ئەرکێ بە کەسێك.
**موعـد:** 1) ژوان، کات و شوێنی یەکتر بینین. 2) کاتی دیاریکراو بۆ ئەنجامدانی کارێك.
**موعدی:** مۆڵەت دار.
**موعظـه:** ئامۆژگاری، کارووس، ئامۆژگاری دینی.
**موعود:** وادەدراو، بەڵێن دراو. **"یوم الموعود"**: ڕۆژی قیامەت.
**موفّر:** زۆر و زەوەند.





**موفّق:** 1) سەرکەوتوو، بە ئاوات گەیشتوو، بە کام گەیشتوو. 2) سەرکەوتوانە (زندگی موفّقی دارد). **"موفـق شـدن"**: تێ‌هێنان، سەرکەوتن لە کارێك دا، بە ئاوات گەیشتن.
**موفقیّـت:** سەرکەوتن، فەرکۆشین، دەسکەوت وەدەستهێنان.
**موفقیّت آمیز:** سەرکەوتوو(انە).
**موقّت:** کاتی دیاریکراو، وەختی سنووردار.
**موقتـاً:** تاو، وچان، سەب، جاریٚ بە ئەمانەت.
**مـوقّتی:** کاتی، ساتی، گاڤی، نەهەمیشەیی، نەبەیەکجاری، ئەمانەتی، سەردەمی، وەختی، نەتم، دونیایی.
**مـوقر:** 1) ژیر و قورسوقۆڵ. 2) قایم و شوێن دانەر.
**موقع:** 1) کات، سات، ئان، شوێن، جێگە. 2) هەل، دەرفەت. **"بـەموقع"**: لە کاتی خۆیدا، بەوەخت. **"بەموقع اجـرا گـذاشـتن"**: جێبەجێکردن، ئەنجامدان.
**موقع شناس:** کات ناس، وەخت ناس.
**موقعیّت:** 1) پێگە، شوێنگە. 2) هەڵکەوتە. 3) هەل، دەرفەت. 4) بارودۆخ.
**مـوقـف:** 1) شوێنی وەستان، وێستگە. 2) هەڵوێست. 3) شوێنی وەستانی حاجیان لە عەرەفاتدا. **"موقـف ایستادن"**: بەجێهێنانی حەج.
**مـوقـوف:** 1) بەسە، لێی مەڵێ. 2) بەستراوە. 3) مەوقووفە. 4) بەندکراو، گیراو. 5) چاوەڕوان. **"موقوف داشتن"**: قۆڵبەست کردن، گرتن. **"موقوف کردن"**: نەهێشتن، ڕاگرتن. 2) بڕوانە: "موقوف داشتن".
**موقوفـه:** وەرەستا، ملکی مزگەوت، مەوقووفە، وەقف کراو.
**موکاری:** مێوچاندن.
**مؤکد:** جەخت کراو، تەئکیدکراو، دڵنیا، پتەو و ڕاوەستاو.
**موکّـل:** (مُ.وَ.كِ) بریگرتە، کەسێ کە پارێزەر یان نوێنەر بۆ خۆی دیاری دەکا.
**موکّل:** (مُ.وَ.كَ) 1) پێسپێردراو، مەئموور. 2) نگابان، پاسەوان.
**موکوس:** لینجی.
**موکول کردن:** وەدواخستن، خستنەدواوە، سپاردن.
**مول:** 1) بڕوانە: "حرامزاده". 2) دۆستی ژن جگە لە مێردەکەی. **"مول کردن"**: منداڵی زۆڵ هێنان.
**مولتی فونی:** چەنددەنگی.
**مولد:** (مَ.لِ) شوێنی لە دایك بوون، زێد. کاتی لە دایك بوون.
**مولّـد:** (مُ.وَ.لِ) 1) بەرهەمهێنەر، وەدیهێنەر، بزێ، سك و زاکەر. 2) ژێنراتۆر.
**مـولش:** 1) درەنگ، دێر. 2) دوودڵی، دڕدۆنگی.
**مؤلـف:** (لِ) 1) نووسەر، نڤیسەر، نڤیسکار، دانەر. 2) کۆکەرەوە.
**مؤلف:** (لَ) دانراو، نووسراو، کۆکراوە.

**مؤلفه:** 1) پیشاندەر، نیشانه. 2) (بیرکاری) هەرکام لە چەند فلشێ کە کۆی ئەوان بەرابەری فلشێکی فەرزکراو بێ.
**مولکول:** مولوکوول، وردیله.
**مؤلم:** ئازارهێن، بەژان، لەژان، بەئازار.
**مول مول:** درەنگ.
**مولود:** 1) لەدایکبوو، بەدنیاهاتوو، منداڵ. 2) ئاکام، بەرهەم.
**مولویّت:** ئاغایی، سەروەری.
**مولی/مولا:** 1) ئاغا، سەروەر. 2) دۆست، هەڤاڵ. 3) کۆیلە، کۆیلەی ئازاد بوو. 4) نۆکەر.
**مولیدن:** دێرکردن، درەنگ کردن، پێچوون، خۆوەدواخستن.
**موم:** کراش، کراژ، شەم، شەمێ، مێو. **"موم شدن"**: نەرم بوون.
**موم اندود:** میواوی، شەماوی.
**مؤمن:** 1) باوەڕدار، بەئیمان، خواناس، لەخواترس، خوەدێترس. 2) موسڵمان.
**مونارشی:** حکومەتی پاشایەتی.
**مونتاژ:** سوارکردن، بەسەریەك دا بەستن، مونتاژکردن.
**مؤنث:** مێ، مێچکە، مێوینە، مێینە، ژن.
**مونس:** خەمرەوێن، هاودەم، هاوڕێ، هاوڕاز، خووگرتوو، خووپێگرتوو، هۆگر.
**مونوپول:** پاوان کردن، تاپۆکردن، قۆرغ کردن، مۆنۆپۆل کردن.
**مونودی:** ئاوازی تاك دەنگی.
**مونوگراف:** تاکنووسین، نامیلکەتاك، شانۆی تاککەسی (نەك تاککەکەسی)
**مونوفونی:** تاکدەنگی.
**مونوفونیك:** تاکدەنگ.
**مونولوگ:** تاك بێژی، شانۆیەکی کورت کە لە لایەن کەسێکەوە پێشکەش دەکرێ.
**مونه:** بڕوانە: "خاصیّت".
**مونیسم:** یەکخوازی، یەکتاخوازی، یەك شێوە ڕوانین. **"مونیسم کلامی"**: یەك شێوە ڕوانینی ئاخاوتەیی.
**موهبت:** بەخشش، دەسەنە، کەرەم.
**موهم:** 1) ئەوەی ببێتە هۆی وەهم و گومان. 2) وە شك و دڕدۆنگی خەر.
**موهن:** سووکانە، بێئەدەبانە، دڵ ڕەنجێن.
**موهوب:** بەخشراو، پێدراو. بەهرەدار.
**موهوم:** وەهماوی، خەیاڵی.
**موهون:** 1) زەلیل، پەست. 2) سست و بێ توان.
**مویان:** لە حاڵی شین و ڕۆڕۆدا.
**مؤیّد:** پشت ڕاست کەرەوە، سەلمێنەر.
**مویرگ:** ڕەهچك، وردە ڕەگی لەش.
**مویزك/مویزه:** بەردەمووکە، دەمووکانە، دەنووکە، موخوڕ.
**مویش:** درەنگ کردن، وەدواخستن.
**مویه:** بەمردوو هەڵگوتن، لاواندنەوە، لاواننەوە، لاوانەوە، شیوەن، موور، نووزەنووز.





**مویەگر:** دولکەبێژ، سەردولکەبێژ، شیوەن گێڕ.
**مویيدن:** شین و شەپۆڕکردن، شین و ڕۆڕۆکردن، شیوەن کردن، لاواندنەوە، بەمردوو هەڵگوتن.
**مویین:** ئەوەی کە لە موو ساز کراوە.
**مه آلود:** بە تەمومژ، تەمومژاوی.
**مهابت:** 1) سامداربوون، ترس هێن بوون. 2) گەورەیی و شکۆ، شکۆمەندی.
**مهاجات:** گوتنی عەیبی یەکتر، هەجووکردنی یەکتر.
**مهاجر:** کۆچەر، کۆچکەر، مەژێر، مشەخت، دەربەدەر، ئاوارە.
**مهاجرت:** کۆچکردن، دوورکەوتنەوە لە شار و زێدی خود.
**مهاجم:** پەلاماردەر، وروژمکەر، هاژۆتکار، هێرشبەر، هێرشکەر، شاڵاوبەر، هەڵمەت بەر.
**مهاجمه:** هێرش بردنە سەریەکتر، لە ناکاو پەلاماری یەکتردان.
**مهادات:** دیاری دان بە یەکتر.
**مهادنت:** پێك هاتن، ئاشتەوبوون، ئاشت بوونەوە، سازان.
**مهار:** 1) هەوسار، لغاو. 2) کۆنترۆڵ کردن، زاڵبوون بەسەر شتێکدا. **"مهارکردن"**: 1) کۆنترۆڵکردن، خستنە ژێر ڕکێفی خۆ. 2) بەستنەوە.
**مهارت:** کارامەیی، شارەزایی، لێزانی، پسپۆری، زانایی لە کار، تەردەستی، دەگەر، ژێلێ، قاڵی، هۆستایی، ئادا.
**مهارشه:** کسکس کردن لە سەگان، تێکبەردانی سەگان.
**مهارگسسته:** 1) هەسارپچڕاو. 2) لە کۆنترۆڵ دەرچوو.
**مه پاره:** بریتی لە زۆر جوان و دلگر.
**مهتاب:** تریفە، تیشکی مانگ، تاڤ هەیڤ، مانگەشەو، مانگاشەو، شەومە، هیڤەڕوون. **"مهتاب به گز پیمودن"**: بریتی لە کاری بێهوودەکردن.
**مهتدی:** ڕێی ڕاست گرتوو، ڕێنوێنیکراو.
**مهترنژاد:** ڕەسەن، بنەچەدار.
**مهجور:** مارزیای، بەجێهێڵراو، تەرك کراو، دوورەوەکەوتوو، دوورکەفتگ. **"مهجورماندن"**: وێڵ بوون، تەرابوون، لە ماڵ دوورکەوتنەوە.
**مهد:** 1) لانك، لاندك، لانکە، دەیدیك، دەرگوش، بێشکە. 2) شوێنی سەرهەڵدان و پەرەسەندنی شتێ. **"مهد کودك"**: باخچەی ساوایان.
**مهدورالدم:** کەسێك کە کوشتنی حەڵاڵە و بکوژەکەی ناکوژرێتەوە.
**مهذار:** چەڵتەباز، کۆڵەوێژ.
**مهر:** (مِ) 1) بڕوانە: "محبّت". 2) ڕەزبەر، یەکەم مانگی پاییز. **"مهر از کسی برداشتن(برگرفتن)"**: خۆش نەویستن. **"مهر باختن"**: خۆش ویستن. **"مهرورزیدن"**: خۆشویستن، هۆگری زۆر بە کەسێك بوون.

**مهر:** (مُ) 1) مۆر. 2) دەست لێنەدراو، کارپێنەکراو. 3) نەخش و نیگاری سەر سککە. **"مهر از زبان گشودن":** قسەکردن. **"مهر از لب برگرفتن":** قسەکردن، وەقسەهاتن. **"مهر بر دهان بودن":** بڕوانە:"سکوت کردن". **"مهر چیزی را بر پیشانی کسی زدن":** ڕەپاڵ ئەودان. **"مهر خوردن":** مۆر کران. **"مهر زدن":** مۆرلێدان. **"مهر شدن":** 1) مۆرکران. 2) کۆتایی هاتن. **"مهر کردن":** 1) مۆرکردن. 2) سککەلێدان. **"به مهر بودن":** دەست لێنەدراو، مانەوەی پەردەی کچێنی.

**مهرانگیز:** ورووژێنەری خۆشەویستی.

**مهربان:** دلۆڤان، دڵسۆز، دڵسۆژ، دڵنەرم، دڵ تەنك، خاوەن بەزەیی، خۆشەویست.

**مهربانی:** دلۆڤانی، دڵنەرمی، دڵسۆزی، بەزەیی، مێرەوانی، مێریڤان، خۆشەویستی.

**مهرپرستی:** میترائیسم، یەکێك لە ئایینە کۆنەکانی ئێرانی لەسەر بنەمای پەرستنی خۆر و ڕووناکی.

**مهرساز:** بڕوانە:"مهرانگیز".

**مهرکاری:** ئاشقی، ئەویندارى، دڵداری.

**مهرگان:** 1) پاییز. 2) هەر وەها ناوی جێژنێکی کۆنە کە لە لایەن پارسییەکانەوە لە شازدە تا بیست و یەکی خەزەڵوەر بەڕێوەدەچوو و دوای جێژنی نەورۆز گەورەترین جێژنی ئەوان بووە.

**مهرنامە:** مارەنامە.

**مهره:** 1) مۆرە، زاری تەختەنەرد. 2) چینەدیواری قوڕ، مۆرە. 3) مۆرتخە. 4) هەرکام لە کەسانی کاریگەر و کارساز لە کاروباری سیاسی و کۆمەڵایەتیدا. **"مهره باختن":** فێڵبازیکردن، تەڵەکەبازیکردن. **"مهره به کف ماندن":** داماو و بێتوان بوون. **"مهره چیزی را برچیدن":** کۆتایی‌هێنان بەو. **"مهره دست کسی بودن":** مۆرەبوون لە دەستی ئەودا، ملکەچی ئەو بوون. **"مهره‌کردن(زدن)":** ساف و لووس کردن. **"مهره کور نخ کردن":** بیرکردنەوە لە شتی بێ بناغە. **"مهره نهادن":** 1) مۆرەچنین. 2) چاوەڕوانی هەبوون.

**مهریه:** مارەیی، مارەبڕی، مارەبڕانە، ماکەلە، کاوین.

**مهزوم:** شکست خواردوو، تێك شکاو.

**مهست:** 1) گەورەترین، مەزنترین. 2) گرینگ، بایەخدار.

**مهستی:** 1) خاتوو، خانم. 2) گرینگی، بایەخداری.

**مهشت:** سەرەکی.

**مهشید:** بڕوانە: "مهتاب".

**مه گرفت:** بڕوانە:"خسوف".

**مهلت:** دەرفەت، هەل، قان، قانگ، ماوڵ، ماوە، وادە، مەودا، مۆڵەت، وچان. **"مهلت دادن":** دەرفەت پێدان، دەرفەت دان بۆ تاوێ، هەل ڕەخساندن، مۆڵەت دان، ماوە(پێ)دان، ماوەدان، ماوڵ دان، گاڤدان، دوڤ بەردان، دەسەرەوەچوون، وچان دان.





**مهلك:** (مُ.لِ) لەناوبەر، تەفروتووناکەر، کوژەر، کوشندە.

**مهلکه:** قڕانگە، تالوکە، مۆلەکە، جێگەی مەترسی، جێگەی بڤە، شوێنی مەترسیدار، جێگەی ترس و مردن.

**مهم:** گرنگ، گرینگ، گەرەنگ، بایەخدار، جێگەی بایەخ دان، پڕبایەخ، کاری دژوار.

**مهمات:** 1) تەقەمەنی، کەلوپەلی شەڕ، چەکوچۆڵ. 2) کارگەلی بەبایەخ. 3) پێداویستییەکان، نیازەکان.

**مهمان:** مێوان، میوان، مێمان، مەیڤان، مێڤان، مەیمان، مەیموون، میرڤان، میمون، میمو. **"مهمان پذیرفتن":** میوان داکردن، میوان ڕاگرتن، ڕێگەدانی میوان بۆ ناو ماڵ.

**مهمان پذیر:** میواندار، میوانگر، وجاخدار، وجاخ ڕوون، ماڵی بە میوان.

**مهمان پرست:** بڕوانە:"مهمان نواز".

**مهماندار:** 1) خانەخوێ، میواندار. 2) بڕوانە:"مهمان نواز".

**مهمان دوست:** بڕوانە:"مهمان نواز".

**مهمان سرا(ی):** میوانخانە، مێوانخانە، شوێنی میوانداریکردن لە میوان. دنیا.

**مهمان غریبه:** خوازبێنیکەر.

**مهمانکده:** بڕوانە: "مهمان سرا".

**مهمان نواز:** بەخزمەت، میوانەوین، میهڤان دۆست، میوان دۆست، کەسێ کە بە میوانان حەز دەکا.

**مهمانی:** مێڤانی، میوانی، مێمانی، بانگهێشتن، بانگێشتن، دەعوەت.

**مهم ساز:** ئەوەی کێشە و گرفتی کەسەکان چارەسەر دەکا.

**مهمل:** 1) قۆڕ، بێمانا. 2) ئەوەی کارێکی لە دەست نایە. 3) بێکەڵك. 4) تایبەتمەندی هەر وشەیەك کە خاڵی نیە وەك: س. 5) فەرامۆشکراو، پشت گوێخراو، بێکارکراو، وازلێهێنراو. **"مهمل بافتن":** قسەی بێ مانا وتن. **"مهمل گذاشتن چیزی":** گرینگی پێنەدان بەو، بەهێندنەگرتنی ئەو. **"مهمل گرفتن":** بە گرینگ نەزانین. **"آدم مهمل":** قنگ لێکەوتوو، شل و شەوێق و ئاگا لە خۆنا. **"کلمه مهمل":** وشەیەکە لە جیاتی تشت، وانێك، هەرامە، هین.

**مهمیز:** زەخت، مامز، مامزە، مامێز، دەرزیك، زیخت.

**مهنا:** چێژبەخش، دڵپەسند.

**مهندس:** ئەندازیار. **"مهندس مسّاح":** زەوی پێو، زەڤیپیڤ.

**مهندی:** گرینگی، بایەخ.

**مهوش:** بڕوانە: "ماەوش".

**مهوع:** 1) هێڵنج هێن. 2) زۆر ناحەز و قێزەون.

**مەوغبار:** مژومۆر، تەمومژ، تەپومژ.

**مهیا:** سازکری، ئامادەکراو، ئامادەوتەیار، گیف، گیف. **"مهیا شدن":** خۆساز و تەیارکردن، ئامادەبوون، سازبوون،

کارکرن، چلیان. "**مهیّا کردن(دیدن)**": ئامادەکردن، سازوتەیار کردن، سازدان، سازکردن، کاردش. "**مهیای سفر**": باربەست، ئامادەی سەفەر.

**مهیب:** 1) سامدار، ترسێنەر، جێگەی ترس. 2) بەشکۆ، بەهەیبەت، بەهەیبەت.

**مهیّج:** وورووژێنەر، بزوێنەر، هاندەر، هەست بزوێن.

**مهین:** 1) گەورە، گەورەتر، گەورەترین.2) سووك و پەست. 3) سەر بە مانگ، ناوی ژنانە. 4) بالآدەست، دەسەلآتدار.

**میادین:** کۆی"میدان".

**می ارزد:** دەهێنێ، دەژی، ئەژی.

**میان:** کەمبەرە، کەمەر، مابەین، مابێن، مینە، مینجا، مەیان، نێوان، ناو، ناوقەد، ناوەڕاست، دوڕ. "**میان بستن**": پشتێن بەستن و ئامادەبوون. "**میان را تنگ بستن**": بڕیاری لێبڕاو دان بۆ شتێ. "**میان زبانی**": نێوان زمانی. "**میان ذهنی**": نێوان زەینی. "**میان متنی**": نێوان دەقی. "**از میان برخاستن**": لابران، چارەسەربوون. "**به(در) میان آمدن**": 1) هاتنەگۆر. 2) دەست تێوەردان، خۆتێهەڵقوتاندن. 3) دەرکەوتن. "**به میان افتادن**": 1) بوونە ناوبژیوان. 2) دەست تێوەردان. "**به میان کشیدن**": خستنەبەرباس، هێنانەگۆڕ. "**در این میان**": لەو کاتەدا. "**در میان انداختن (افکندن) سخن**": هێنانەبەرباس. "**در (به) میان گذاشتن**": هێنانەگۆڕ، هێنانە بەر باس.

**میان برد:** نێوان بڕ، نێوان مەودا.

**میان پاچه:** ئەندامی جووت بوون.

**میانبر:** لابڕ، سەربڕ، ناوبڕ، ناڤبڕ، قەدبڕ، قەوبڕ، قەیبڕ، نزیکترین ڕێ بۆ گەیشتن.

**میان پرده:** 1) ناوبڕ. 2) شانۆی کورت.

**میان تهی:** 1) بۆش، ناوبەتاڵ، ناوخاڵی، کلۆر، کولۆر، هلۆڵ، خافوور، قەلپووت، پووچ، پووك، والا. 2) پووچ و بێمانا.

**میان جا:** 1) نێوان، ناوەڕاست، دوڕ. 2) چەقی زەوی .

**میانجی:** 1) برەڤان، بەرەڤان، بەریڤان، بەریوان، بەریوانکەر، ناوبژیکەر، نێوبژیکەر، نێوبژەکەر، ناڤبژیکەر، ناوجیکار، نێوانجیکار، ناوەندیار، ناوجیکەر، نێونجی، بێس، هەجاس، قبڕاخ. 2) میانەڕۆ.

**میانجی گری:** ناوبژی، ناڤبژی، ناوبژیوانی، ناوجی، نێوبژی، نێوبژە، نێوبژیوانی، بەریڤانی، بەرەڤانی، نێوان کردن، هەجاسی.

**میان خالی:** 1) ناوبەتاڵ، ناوخاڵی. 2) بێبنەما، بێبناغە.

**میان خانه:** ناوەڕاست، ناوەند.

**میان درآمد:** خاوەنی داهاتی نێونجی.

**میان دوره:** نێوان دەورە.

**میان سال:** کال، ناڤسالٚ، نێوانسال، سەرەمێر، تازەپیر، کەسێ کە تەمەنی لە چل بەرەوژووره و نەگەیشتۆتە پەنجا.





**میان قامت:** دەستە، نێوان گەورە و بچووك.

**میان کره:** "مێزوسفێر".

**میان گاه:** 1) ناوەند، ناوەڕاست. 2) ناوەڕاستی لەشکر.

**میانگی:** هەڵکەوتوو لە ناوەڕاستی چەند شت.

**میانگین:** نێونجی، ناونجی، مام ناونجی، مام ناوندی، مام ناوەندی، ناڤین، ناوگین، ناڤنج.

**میا نمایگی:** میانجێتی، نێونجێتی.

**میان مدت:** نێوان ماوە.

**میان مردمگانی:** نێونەتەوەیی، جیهانی.

**میانه:** 1) نێوان، ناڤبەین، ناڤین، ناڤبڕك، ناوەوە، بەرزەك، بەرزایی نێوان دوو شت، دۆمەی، داگ، مەیانە، مەینە. 2) دۆستایەتی، ئاشنایەتی، بەین، پێوەندی. 3) میانەڕۆ. 4) مەودای نێوان دوو شت یان دوو واتا. "**میانه افتادن**": بوونە نێوبژیوان، ناوبژیوانیکردن. "**میانه را گرفتن**": بڕوانە:"میانەافتادن". "**میانەکردن**": دوور کەوتنەوە. "**میانه گذاشتن**": هێنانەگۆڕ، هێنانە بەرباس. "**میانه نداشتن با چیزی**": نێوان نەبوون دەگەڵ ئەو. "**میانه نگاه داشتن**": میانەڕۆییکردن. "**در این میانه**": لەم کاتەدا، لەم حاڵەدا.

**میانەبالا:** دەستە، نەکورتەبالآ و نە بالآبەرز.

**میانەخوار:** مفتەخۆر و زك لەوەڕێن.

**میانەداری:** بڕوانە:"میانجی گری".

**میانەرو:** میانەڕەو، مامناوەند.

**میانەروی:** میانەڕەوی، ناوەندێتی.

**میانەقد:** بڕوانە:"میانەبالا".

**میانەگرا:** میانەڕۆ.

**میانی:** لە ناوەڕاستدا، هەڵکەوتوو لە ناوەڕاستدا.

**میتامورفوسیس:** گۆڕانی بیچم.

**میترائیسم:** بڕوانە:"مهرپرستی".

**میتوز:** (پزیشکی) دابشبوونی ناڕاستەوخۆ، دەزوویی ئاسایی.

**میتولوژی:** چیرۆکی پاڵەوانەکان، زانستی لێکدانەوەی ئوستوورە و ڕازەی خوداکان و پاڵەوانەکان، ئوستوورەناسی.

**میثاق:** بەڵێن، پەیمان.

**میختن:** بڕوانە: "میزیدن".

**میخکوب:** 1) بزمار ڕێژ، بزمارکوت، بەبزمار قایم کراو. 2) وێستاو و نەبزوو. "**میخکوب شده**": سنگەبەر، سنگ لێداکوتراو، بزمار ڕێژکراو.

**میخوارگی:** شەڕاوخواردن، مەینۆشی.

**میخواره:** مەیخۆرەوە، مەینۆش، شەڕاوخۆر.

**میخوش:** ترش و شیرین، مێخۆش، مزر.

**میدان:** گۆڕەپان، مەیان، مەیدان، هۆل، کاد، قاد، فێز. "**میدان بازی**": گۆڤان، کایەگا، گۆڕەپانی گەمە. "**میدان جنگ**": قاداشەڕی، شەڕگە، گۆڕەپانی شەڕ، هێل، هێلٚ. "**میدان دادن به کسی (چیزی)**": هەل و

دەرفەت بۆ ڕەخساندن. "**میدان را خالی کردن**": خۆکێشانەوە و سپاردنی گۆڕەپانی چالاکی بە دیتران، مەیدان چۆڵ کردن. "**میدان یافتن**": هەل و دەرفەتی چالاکی پەیا کردن. "**از میدان به در رفتن**": مەیدان چۆڵ کردن. "**به میدان درآمدن**": ئامادەی کردەوە بوون.

**میدانچه:** مەیانۆچکە، مەیدانی گچکە.

**میدان داری:** مەیدان داری، دەگژیەك ڕاچوون.

**میدان دیده:** بەئەزموون.

**میدان گاه:** چوارچێوەیەکی بەرین بە شکڵی بازنە.

**میدەکردن:** نەرم کردن، ساوینەوە.

**میرا:** لەنەمان، نابەردەوام، ناپایەدار.

**میراب:** میراو، میراڤ، مەرداب، ئاریختیٚ، کەراخ، وەراز.

**میراث:** میرات، کەلەپوور، جامەنە، جێماوە، پاشماگە. "**میراث پدری**": بابێنی، میراتی باب، کەلەپووری بابی مردو. "**میراث نیاکان**": کالکی، کەلەپوور لە باپیرانەوە.

**میراث خور:** 1) میرات خۆر، میراتبەر. 2) ئەوەی میراتی کەسێك زەوت بکا.

**میراثی:** 1) ماڵیٚ کە لە ڕێگەی میراتەوە وەدەست دیٚ. 2) میراتگر، میراتبەر.

**میراندن:** قڕکردن، مراندن، مرانن، هەڵ پڵۆسکانن، مەرگ بڕین، کوشتن، ڤەتەمراندن، گیان کەندن، ڕۆح کێشان، سپیکردن، سپیکردنەوە.

**میرغضب:** میرخەزەب، میرخەزەو، بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "جلاد".

**میرلشکر:** سپاسالار، فەرماندەری لەشکر.

**میروك:** بڕوانە:"مردنی".

**میزاپلی:** جوان کردنی حاڵەتی مووی سەر.

**میزان:** 1) ڕادە، ڕاژە، ڕێژە، ئەندازە. 2) پێوەر، پێودانگ. 3) سالم و کەیف ساز. 4) ڕاست و ڕێك. 5) بەشێوەیەکی ورد و دروست. 6) کێشی شێعر.

**میزانسن:** دیمەن ڕازاندنەوە.

**میزبان:** خانەخویٚ، خانەخوێگ، خاوەن ماڵ، مێواندار، مێڤاندار، ماڵخۆ، (میزبان مهمان نواز )مازووڤان.

**میزیدن:** میزکردن.

**میستان:** مەیخانە.

**میستیسیسم:** سۆفیگەرێتی، عیرفان.

**میسّر:** مەیسەر، مەیسەل، لواو، گونجاو، ڕەخساو، سانا، شیاوی دەسکەوتن بە هاسانی. "**میسر شدن**": مەیسەربوون، ڕەخسان، سەرگرتن(کارەکەت سەری گرت).

**میسیون:** شاندی نوێنەرایەتی.

**میسیونر:** بانگەشەکاری ئایینی، میسیۆنێر.

**میشوم:** ناپیرۆز.

**میعاد:** ژوان، جوان، وادە، شوێنی پێك گەیشتن، کاتنی پێککەیشتن لە جێگەی دیاریکراو.





**میعادگاه:** ژوانگە، جیٚژوان، قەلەمردارە، قەلەمرداریٚ، میرە.

**میعان:** 1) تاویانەوە، توانەوە، ڤەبووهوژین، بوونە ئاو.2) بڕوانە: "چگالش".

**میقات:** 1) کات، وەخت. 2) ژوانگە، شوێنی پێککەیشتن.

**میکروب:** هوورك، زیلە، میکرۆب، میقرۆب.

**میکروبیولوژی:** میکرۆب ناسی، میکرۆبیۆلۆژی.

**میکروبیولوژیست:** ئەوەی سەبارەت بە میکرۆبەکان موتاڵا و لێکۆڵینەوە دەکا، میکرۆبیۆلۆژیست.

**میکروسکوپ:** وردبین، هووربین.

**میکروگرافی:** بڕوانە: "خردنگاری".

**میکرون:** پێوەرێکی زۆر گچکەیە بۆ پێوانی شتی چووکە، یەك لە هەزار میلیمیتر، میکرۆمیتر.

**میگرن:** شەقەسەر، ژانەلاسەر، ئازاری توندی لایەکی سەر.

**میگسار:** 1) عارەقخۆر، شەڕابخۆر(ەوە). 2) مەیگێڕ.

**می گون:** 1) بەڕەنگی شەڕاب، شەڕابی، ئاماڵ سوور. 2) خوماراوی، سەرخۆش.

**میل:** 1) چەمینەوە، نووشتانەوە. 2) واز، ئارەزوو، حەز، ئیشتیا، دڵ بردن، دڵ لێچوون، مەیل، گرۆی. 3) لاری، خواری. "**میل کردن**": 1) هۆگری پەیاکردن، مەیل لێبوون. 2) خواردن. "**میل کردن از کسی**": ڕوووەرگێڕان لەو. "**میل گرفتن**": چەمینەوە، داهاتنەوە. "**میل نداشتن**": دڵ نەبردن، ئیشتیا لیٚ نەبوون.

**میلاد:** 1) ڕۆژی لە دایك بوون، کاتی هاتنەدنیاوە. 2) زایین، بەدنیاهاتن، هاتنەدنیٚ.

**میلادی:** زایینی.

**میلان:** (مَ.یَ) چەمانەوە، داهاتنەوە، خواربوونەوە، هاتنەلادا.

**میلیتاریزه:** میلیتاریزە، بە چەکوچۆڵ تەنین، بە نیزامیکردن.

**میلیتاریسم:** (سیاسی) 1) حکوومەتیٚ لەسەر بنەمای باڵادەستی هێز و دەسەڵاتی نیزامی. 2) مەیل بۆ بەکارهێنانی هێزە نیزامییەکان بۆ گەیشتن بە مەبەستە سیاسییەکان.

**میمنت:** پیرۆزی، موارەکی.

**میمون:** 1) پیرۆز، بەفەڕ. 2) مەیموون.

**میمیك:** حاڵەت و جووڵەی ئەندام بەتایبەت دەموچاو.

**مینا:** 1) لەنگەرگە، بەندەر. 2) ناوی گوڵێکە. 3) ئاوێنە، شووشە.

**مینافام:** ئاماڵ شین، ڕەنگی ئاسمانی.

**میناکار:** شووشەبەند، مینابەند، میناکار.

**میناگر:** 1) بڕوانە:"میناکار". 2) کیمیاگەر.

**مین گذاری:** مین دانان (ەوە)، مین چاندن، مین ڕێژی.

**مینو:** بەهشت.

**مینوت:** ڕەشنووس، پێش نووس.

**مینوگرایی:** بڕوانە: "پندارەگرایی".

**مینیاتور:** مینیاتۆر.

**مینیاتوریست:** مینیاتۆرساز، کەسێ کە بە شێوازی مینیاتۆر نیگار دەکێشێتەوە.

**مینیموم:** لانیکەم، کێمیڤە.

**میوپ:** نزیك بین، کەسێ کە بە باشی نەتوانێ شتەکان لە دوور ڕا ببینێ.

**میوز:** (پزیشکی) کەمەدابەشبوون.

**میولوژی:** ماسوولکەناسی، زانستێ کە دەربارەی شیتەڵکاری ماسوولکەکان دەدوێ.

**میهن:** نیشتمان، وڵات، ژێگە، زێد، وار، نشینگە.

**میهن پرست:** نیشتمان پەروەر، نیشتمان پەرست، نیشتمان خواز.

**میهن دوست:** نیشتیمان پەروەر، وڵات پارێز، نیشتمان پەرست، وڵات خۆشەویست، خزمەتکاری زێد.

**میهن دوستی:** وڵاتپارێزی، نیشتمان پەروەری، نیشتمان پەرستی.

**میهن فروش:** نیشتمان فرۆش، خیانەتکار بە نیشتمان.

# ن

**ناآرام:** بزۆز، سەربزۆك، سەربزێو، نەگونجاو، هەدانەدەر، دانەسەکناو، هەدانەدەر، عەردنەگر، چرتی، بێئۆقرە، هولوولی.

**ناآزموده:** بێئەزموون، چاونەکراوە، نائاشنابەکار، پیاوی هێشتا خاو، نەگهیشتی.

**ناآشنا:** 1) بێگانە، نامۆ، کەس نەناس. 2) نەناسراو. 3) ناشارەزا، نابەڵەد.

**ناآگاه:** 1) بێئاگا، بێخەبەر، های لە هیچ نا. 2) بەبێ نیاز و مەبەست. 3) غافڵگیرانە و بەبێ ئاگاداری پێشو. "**ناآگاهی**": بێئاگابوون، بێئاگایی.

**ناآمد:** ئاڵۆزی و نەبوونی هاوکاری.

**ناآمیخته:** ناتێکەڵاو، پوخت، پاك.

**نائب/نایب:** جێنشین، جێگر، بریکار، شوونگر، وەرت.

**نائب الحکومه:** فەرماندار، کەسێك کە لە لایەن ڕاژۆرێکەوە کاروباری شارێك ڕادەپەڕێنێ.

**نائب الوزاره:** جێنشین یان جێگری وەزیر.

**نائب اول:** سکرتێری یەکەمی باڵوێزخانە.

**نائب رئیس:** بڕوانە: "معاون".

**نائب مناب:** جێنشین، خەلیفە.

**نائبه:** 1) مێینەی "نائب". 2) ڕووداو و بەڵا و تەگەرەوتووشی، ئاستەنگ و تەنگاسی.

**نائح:** بڕوانە: "نوحەگر".

**نائره:** ئاوری هەڵایساو. ڕق و دوژمنایەتی، کەرب و کین.

**نائل:** گیرخەر، وەدەست خەر، دەستقەئینەر، بەهرەمەند، کەسێك کە بە ئاوات و دڵخوازەکانی بگا. بەخشش، دەسەنە.

**نائم:** خەوتوو، نووستوو، نقستی.

**نائمه:** مێینەی "نائم"، ژنی خەوتوو. مەرگ، مردن.

**ناارز:** بێنرخ، بێبایەخ.

**نااسپری:** بڕوانە: "ابدیّت".

**ناامن:** پرمەترسی، نەبوونی ئەمنییەت و ئاسوودەیی.

**ناامید:** بەرچاوتاریك، ناهومێد، هیوابڕاو، بێ هێڤی، دەمسارد.

**نااندیشیده:** 1) نەهزراو و بەبێ ڕامان. 2) چاوەڕواننەکراو. 3) بەبێ بیرکردنەوە.

**نااهل:** 1) ناپابەند بە بنەمای ئەخلاقی. 2) نالایق، نالێهاتوو.





**ناب:** ناتێکەڵاو، نەتێکەل، پاڵاوتە، پالوون کری، بێگەرد، ساف و خاوێن، بێ خەوش، ڕەسەن، پەتی.

**ناباب:** نالەبار، نەشیاو، نەژێهاتی، ناجۆر، ناجوور، دوور لە دابونەریتی کۆمەڵ.

**نابارور:** بڕوانە: "نازا".

**ناباکدار:** نەترس، بوێر.

**نابالغ:** منالی هێشتا گەورەنەبووگ، نابالغ، نابالق، نەگهشتی.

**ناباور:** ئەوەی نەشێ بڕوای پێبکەی، شیاوی قبووڵ نەکردن.

**نابایا:** ناپێویست، نەحەوجە، نەپێدڤی.

**نابایست:** 1) ناپێویست، ئەوەی کە پێویست نەبێ. 2) نارەوا. 3) حەرام. 4) ناپەسند، ناحەز. "**بر نابایست**": بەپێچەوانەی مەیل.

**نابت:** تازەڕواو، تازە شین بوو.

**نابخرد:** بێ ئاوەز، بێ ئەقڵ، گەوج، نەزان، تێنەگەیشتوو، بێفام.

**نابرآورده:** 1) وەدینەهاتو، جێبەجێ نەبوو. 2) کورت و نارەسا.

**نابرجایگاه:** بێجێ، نابەجێ.

**نابردار:** (بُ) بێ سەبر و حەوسەڵە، کەم چیکەڵدانە/ چیکلدانە، بیهن کورت، بێهن تەنگ، ناچار.

**نابردبار:** بڕوانە: "نابردار".

**نابرومند:** 1) بەبەر. 2) خراو، وێران.

**نابرید:** 1) نەبڕاو، قوماشێ کە هێشتا نەبڕابێ. 2) سونەت نەکراو.

**نابسنده:** کەم.

**نابسود:** 1) دەست لێنەدراو. 2) کەڵك لێوەرنەگیراو، نوێ. 3) کون نەکراو.

**نابغه:** بلیمەت، بڵیمەت، هەڵکەوتە، هەڵکەفتگ، هەڵکەفتە، هەڵکەوتوو، هلکەفتی، بەرکەتی، تاقانە، میرکۆر، هەڵبژاردە، شاز، پیاوی کەم وێنە، کەسێك کە خاوەنی هۆش و بەهرەی زۆر بێ.

**نابل:** تیرهاوێژ.

**نابلد:** 1) نابەڵەد، ناشارەزا. 2) بڕوانە: "ناشی".

**نابنوا:** 1) زایە و خەساربوو، بێ چنەچوو. 2) نەدار، هەژار، دەست تەنگ.

**نابود:** 1) توونا، تەرتووتوونا، تەڕاو، فەوتاو، نەماو، لەناوچوو، لەبەین چوو، تیاچوو، مفح بوو، ژناڤ چوو، نادیار. 2) بوختان، تۆمەت. "**نابود شدن**": سەر تیاچوون، لە ناوچوون، لەبەین چوون، تەفروتوونابوون، فەوتان، وەرفتن، نەمان. "**نابودکردن**": تەرتووتووناکردن، تەفروتووناکردن، لەناوبردن، لەناودان، تیابردن، دەماردەرهێنان، هەشافتن، هەشفاندن. "**نابودکننده**": تەفروتووناکەر، تەرتووتووناکەر.

**نابودمند:** مایەپووچ، ڕووت و نەدار، بێ ماڵ و حاڵ.

**نابودنی:** 1) ئەوەی ئیمکانی بوونی نیە. 2) نەشیاو، مەحاڵ، ئەستەم. 3) ئەوەی نەبوونی پێویستە.

**نابودە:** 1) نەبوو، ون بوو. 2) ئەوەی ڕووی نەداوە.

**نابویا:** ئەوەی بۆنی نیە، بێ بۆن. 2) ئەوەی هەستی بۆنکردنی نیە.

**نابەجا:** نابەجێ، بێجێ، بێمانا، ناجۆر، نالەبار، قسەی لابەلا، قسەی قۆڕ و بێ تام، بێڤا. بێهۆ.

**نابهرە:** بێ بەر، بێ کەڵك. قڕنیس، سەقیل.

**نابەسامان:** 1) بێ کەلوپەل و پێداویستی، بێ ئامراز و کەلوپەل، بێ تڕوتفاق. 2) ناتەکووزی و ڕێکوپێکی، قەیراناوی، ئاڵۆز، پشێو، شێواو. 3) بێئۆقرە، هەدانەدەر. 4) گومڕا، بەدکار. 5) نەشیاو، ناپەسند.

**نابەکار:** 1) ناپابەند بە بنەما ئەخلاقییەکان، بەدکار، بەدکردار، خراپەکار. 2) بێبەهرە، بێفایدە، بێکەڵك. 3) نادروست، ناپەسند. 4) ستەمکار، زاڵم.

**نابەنوا:** 1) نەدار، هەژار. 2) بێبرەو.

**نابەهنجار:** 1) کار یان کردەوەیەك کە لە ڕوانگەی گشت خەڵکەوە قبووڵ نەکرێ، ناپەسند، ناشایست، نائاسایی. 2) (کۆمەڵناسی) ناسازگار لەگەڵ پێکهاتەی گشتی سیستمێکی کۆمەڵایەتی. 3) (دەروونناسی) نەخۆشیێ کە لەباری دەروونییەوە تەواونیە، "آنرمال". 4) ناهاوئاهەنگ و کۆنترۆڵ نەکراو.

**نابەهنگام:** 1) ناوادە، ناوەخت، بێ وەخت، بێگاڤ، بێدەم. 2) لە کاتی نالەبار و بێ ڕەچاوکردنی هەل. 3) بێجێ، نابەجێ.

**نابینا:** 1) کوێر، کۆر، کۆرە، مجرۆ، حافز، بێ چاو، بێ چاڤ. 2) بێ ئاگا، بی خەبەر، خافڵ. "**نابینا شدن**": کوێربوون، کۆرەبوون، موقرایی داهاتن، موقرایی ڕۆژان، لێڵایی داهاتن، مجرۆیی داهاتن.

**نابینایی:** کوێری، کۆری، کوێرێتی، کوێریەتی، کوێرایی، کۆرینی، کۆراتی، مجرۆیی، لێڵایی چاو، موقرایی، ئامایی، نەدین.

**نابیوس/نابیوسان:** کتوپڕ، لەنەکاو، لەپڕ، ژنشکێڤە.

**ناپاسگر:** بێ ئەدەب.

**ناپاك:** 1) پیس، گەمار، چڵکن، ناپاك، نەپاقژ. 2) بەدکار، داوێن پیس. 3) تێکەڵ بە هەوەس یان نیازی خراپ. 4) ناحەز، نگریس، شووم. 5) حەرام. 6) گوناحکار، کافر. 7) بڕوانە: "حیلەگر".

**ناپاکزاد:** بێژوو، زۆڵ، زوێڵ، بیچ، سنۆتە، سووتار، شەلووف، کەسێ کە ڕەسەن و جسن نەبێ .

**ناپایا:** کاتی، تێپەڕ، نابەردەوام.

**ناپایدار:** 1) خۆڕانەگر، ناسەقامگیر، ناجێگیر، نەجیگرتی، نابەردەوام، ناپتەو. 2) بڕواپێنەکراو، جێی بەقانەبون، جێی متمانەنەبوون. 3) بێ بناغە.





**ناپایشگر:** بێئەدەب.

**ناپختگی:** 1) نەکوڵاوی. 2) ناکامڵی، کەم ئەزموونی، بێ جەرباندی.

**ناپختە:** 1) نەکوڵاو. 2) کاڵ، خاو، خاڤ، فەریك، ناکامڵ. 3) بریتی لە بێ ئەزموون، چاونەکراوە، کاربڵاو. 4) خۆش نەکراو، دەباخ نەکراو.

**ناپدرام:** ناخۆش، جێگەی ناخۆشی، ناپەسن.

**ناپدری:** زڕباب، زڕباو، زڕباوك، باوەپیارە.

**ناپدید:** 1) نادیار، نەدیار، بەرپیوار، نوخوم، داپۆشراو، شاراوە. 2) ون بوو، گوم بوو، بزربوو. 3) هیچ. 4) لەناوچوو. 5) نادیار، ناڕوون. "**ناپدیدشدن**": 1) لەناوچوون. 2) لەبەر چاو ون بوون، بزربوون. "**ناپدیدکردن**": 1) بڕوانە: "پنهان کردن". 2) لەناوبردن. "**ناپدیدکردن بر خویشتن**": چاوپۆشی لێکردن، بە ڕووی خۆدا نەهێنان.

**ناپدیدگاە:** گومگە،ونداگەه، جێگەی ونبوون.

**ناپذیرا:** 1) ئەوەی شتێ قبووڵ ناکا. 2) ئەوەی ئامادەیی بۆ کارێ نیە.

**ناپروا:** 1) بەهێندنەگر، دڵ لێنەچوو، بێمەیل. 2) نەترس، بەجەرگ، بوێر، ئازا، گەڕناس.3) بێئۆقرە، نیگەران.

**ناپروردە:** 1) پەروەردەنەکراو، گەورەنەبوو. 2) ناتەواو، کامڵ نەبوو.

**ناپرهیزگار:** بەدکار، سۆتە، بێدین.

**ناپرهیزی:** 1) پارێزنەکردن، دەم نەگرتنەوە. 2) کاری ناڕەوا.

**ناپز/ناپزا:** شتێ کە درەنگ بکوڵێ.

**ناپسری:** زڕکوڕ.

**ناپسند:** 1) بەردڵ نەکەوتوو، نەب دل، ناپەسن، ناپەسند. 2) ناحەز، نەشیاو.

**ناپسودە:** دەست لێنەدراو.

**ناپلئونی قبول شدن:** دەرچوون بە نمرەی دە یان لانیکەم نمرەی قبووڵی.

**ناپیدا:** نادیار، نادیاری، بەرپیوار، ناخویا، بزر، شرت، شرتوگوم، گوم، وندا(بوویی)، وەندا.

**ناپیمان دار:** بێلایەن.

**ناپیمودە:** شتێ کە نەپێورێ، بێکۆتایی.

**ناپیوستە:** 1) (لێك) جیا. 2) بڕوانە: "منقطع".

**ناتراشیدە:** 1) نەتاشراو، درشت و بەکەندوکلۆ، گروخواروخێچ. 2) بێ ئەدەب، پەروەردەنەکراو. 3) ناحەز.

**ناترس گار:** 1) نەترس، بوێر. 2) خۆ نەپارێز و بێبڕوا.

**ناترنگ:** ناحەز، ناشیرین.

**ناتلنگ:** بێ ئەمەگ، پەیمان شکێن.

**ناتمام:** 1) ناتەواو، ناتاو، ناتواو، بەکەموکووڕی، کەموکووڕیدار. 2) نیوەچڵ. "**ناتمام گذاشتن**": تەواونەکردن، بەکۆتایی نەگەیاندن. "**ناتمام ماندن**": بە کۆتایی نەگەیشتن، ناتەواو مانەوە.

**ناتندروست:** 1) نەخۆش، ناساغ، دەردەدار، لەش بەبار. 2) سست، نایەکگرتوو. 3) بە تەمبەڵی.
**ناتنی:** زڕ.
**ناتو:** سووکەڵەی "ڕێکخراوی پەیمانی ئاتلانتیکی باکوور".
**ناتو:** (تَ) 1) ناپاك و دەروون پیس، فێڵاوی. 2) ناتەبا، ناسازگار. 3) بڕوانە: "چموش".
**ناتوان:** بێ‌هێز، بێ وزە، بێ توش، بێتاقـ، بێتقاب، بێ تاب، بێتاقەت، بێتوان، بێتان، بێ تین و تابشت، کەم تین، بێدەس، بێدەست، دەست نەڕۆیشتوو، دەس تەنك، کەم دەست، بێ دەسەڵات، کلۆڵ، داماو. نەخۆش، دەردەدار. "**ناتوان شدن**": 1) بێ‌هێزبوون، وزەنەمان، لەدەست دانی توانایی ئەنجامدانی کارێك. 2) نەخۆش کەوتن، لاوازبوون. 3) بێ‌ئۆقرە و بێ‌تاقەت بوون.
**ناتور:** سروشت، هێزی سروشت، سرشت، خوەزا، ناخ، دەروون.
**ناتورالیست:** 1) بیرمەندی زانستە سروشتییەکان، سروشت ناس. 2) سروشت خواز، پێڕەوی ناتۆرالیزم. 3) سروشتی، دەهری.
**ناتورالیسم:** بیرۆکە یان کردەوەیەك لە سەر بناغەی خواست و خدە سروشتییەکان، بڕوا بە سروشت/خۆڕست، حاڵەتی سروشتی/ خۆڕسکاو، سروشتی‌بوون، ڕێبازی "طبیعیون": کەسانێ کە حاشایان لە بوونی ئافرێنەر دەکرد و هەموو شتێکیان ڕەپاڵ سروشت دەدا.
**ناثر:** پەخشان نووس، نووسەر.
**ناجایگاه:** بێجێ، نابەجێ.
**ناجای گیر:** (فەلسەفە) تایبەتمەندی شتێ کە جێ داگیرناکا.
**ناجح:** سەرکەوتوو، سەرکەفتی، براوە. کاری ئاسان و سانا. "**ناجح آمدن**": بەکەڵك هاتن.
**ناجع:** 1) بەکەڵك، بەقازانج، ب مفاح. 2) کاریگەر، شوێن دانەر.
**ناجم:** سەرکێش، یاغی.
**ناجنبا:** پتەو، قایم.
**ناجوانمرد:** ناجوامێر، ناپابەند بە بنەما ئەخلاقییەکان.
**ناجور:** ناجۆر، ناجوور، نالەبار، شتێ کە دەگەڵ شتێکی دی دا جۆر نەیەتەوە، تاوتا، ناتەبا، دژ.
**ناجی:** قوتارکەر، ڕزگارکەر، دەربازکار، ئازادکەر.
**ناچار:** ناچار، نەچار، چارەلێبڕاو، دەستەوسان، دەستەوستان، ماتل ماو، مەحتەل مایی، ناعیلاج، بێ‌دەسەڵات، دەست ل سەر دەست، داماو، بێچارە. "**ناچاروچار(ناچاروناکام)**": بەناچار، چاری‌ناچار، خوایی‌نەخوایی.





**ناچارە:** 1) شتێ کە ناتوانی لێ‌دەرچی. 2) بەناچار.
**ناچرید:** نەلەوەڕاو، مرۆ یان ئاژەڵێ کە هیچی نەخواردبێ .
**ناچگال:** بڕوانە: "رقیق".
**ناچیز:** 1) کەم، کەموکە، کێم. 2) بێ نرخ، بێ‌قیمەت. 3) بێ‌فایدە، پووچ. "**ناچیزشدن**": 1) بێ‌نرخ بوون، لە گرینگی کەوتن. 2) لەناوچوون. 3) تێپەڕین. 4) خراو و کاول بوون. "**ناچیز کردن**": 1) لەناوبردن، تەرتوتووناکردن. 2) تووشی داماوی و نەداری کردن. 3) شکست دان. بەزاندن.
**ناحفاظ:** 1) بێ‌شەرم، بێ‌حەیا. 2) بڕوانە: "فاسق".
**ناحق:** ناهەق، نابەحەق، ناڕەوا، درۆ، پێچەوانەی هەق و دادپەروەری. لەخۆڕا، بێ‌هۆ. "**به ناحق**": 1) لەخۆڕا، بێ‌هۆ. 2) بەبێ ڕەچاوکردنی هەق و دادپەروەری.
**ناحی:** خاوەنی زانستی ڕێزمان، کەسێ زانستی ڕێزمان دەزانێ.
**ناحیە:** 1) سنجەق، مەڵبەن، مەڵبەند، ناوچە، ناڤچە، هەرێم، بەشێك لە وڵات، بەشێك لە شار. 2) بەش. 3) لا، ئالی، ڕەخ. "**از ناحیە**": لەلایەن.
**ناخالص:** ناخاوێن، ناپوخت، پوختەنەکراو، نەپاڵێوراو، پالوون نەکری.
**ناخدا:** 1) خەفتان، گەمی‌وان، گەمیڤان، گەمیەوان، گەمێوان، سەرۆکی گەمیە، کەشتیوان، کەشتیەوان، کەشتیڤان، پاپۆڕوان، پاپۆڕەوان. 2) بێدین، کافر.
**ناخدمتی:** درێغی‌کردن لە ئەنجامدانی ئەرك.
**ناخدنگ:** ناڕاستەوخۆ.
**ناخستون:** بڕوانە: "منکر".
**ناخستویی:** بڕوانە: "انکار".
**ناخشنود:** ناڕازی، بێ‌مەیل، سەرگەشتە، زیز، زویر، تۆراو.
**ناخشنودی:** ناڕەزایی، نەرازی، تووڕەیی و قەڵسی، ناقایلی. "**اظهارناخشنودی کردن**": سەر لێ بادان، سەرزڤراندن، لچ هەڵقرچاندن، لچ هەڵقوتاندن، ناڕەزایەتی دەربڕین.
**ناخلف:** ناجسن، ناڕەسەن، زڕ، منداڵێ کە لە کردار و خووی بابی لای دابێ .
**ناخن:** نینۆك. "**ناخن از دنیا برکشیدن**": دەست لە دنیا هەڵگرتن. "**ناخن افکندن**": بڕوانە: "تسلیم شدن". "**ناخن بازکردن**": نینۆك کردن. "**ناخن بە دندان ماندن**": سەرسوورمان، واق وڕمان. "**ناخن پیراستن(چیدن)**": نینۆك کردن. "**ناخن پیراستن از چیزی**": وازهێنان لێی. "**ناخن را حنا گرفتن**": 1) خەنە لە نینۆك دان. 2) شادی کردن و جێژن گرتن. "**ناخن رساندن**": 1) ڕووشاندن، کراندن. 2) ژەنین، لێدان (مۆسیقا). "**ناخن زدن**": 1) پاك

کردنەوەی شتێ بە نینۆك. 2) کونجکۆلێکردن، کونج پشکنی. 3) نارەزایەتی دەربڕین. 4) لێدان، ژەنین (مۆسیقا بە نینۆك).

**ناخن خشك:** بڕوانە: "خسیس".

**ناخن زن:** 1) ئازاردەر. 2) کاریگەر، کارکوو.

**ناخنك:** ناخونەك، کول، خواردنی بێ ئیجازە. "**ناخنك زدن**": کەف لێدان، کول لێدان، خواردنی بێ ئیزنی خاوەن.

**ناخوار:** زبرە و ناقۆڵا.

**ناخواست/ناخواستە:** نەخوازراو، نەخوازیاگ، نەخوازیاو، نەخواستی، نەویستراو، بێبەش لە داواکردن.

**ناخوانا:** 1) خەتێ کە بە سانایی نەخوێنرێتەوە، خەتی ناخۆش و تێکەڵ پێکەڵ، شەڕە پشیلە (بریتی). 2) نەخوێندەوار، نەخۆنە، نەخوندەڤان.

**ناخواندە:** 1) چەورە، زگ لەوەڕێن، لاورگە. 2) نەخوێندەوار، نەخۆنە، نەخۆندی، نەخوەندی، نەخوێندوو. 3) نەخوێندراوە. 4) کتوپڕ، لە ناخافڵ، ژنشکێڤە، بێ ئاگادارکردنەوە، بێ ئاگەهدارکرن. 5) داوەت نەکراو، بانگهێشت نەکراو.

**ناخواە:** نەخوازراو، نەویستراو.

**ناخواهری:** زڕخوشك، زڕخوەه، زڕخۆینك.

**ناخودآگاە:** 1) شاراوە و نەناسراو(ضمیر ناخودآگاە). 2) بەنائانقەست، نەزانستە. 3) نەست. 4) نش، لەنەکاو، هیکا، گزوگومەت، خوت و خافڵ، نەخافڵ، ناخافڵ، نەژگاف، نەژگاڤ، کتوپڕ، لەپڕوناکاو، لە پڕێکا.

**ناخورانی:** نەخواردن، پارێزکردن.

**ناخوردنی:** 1) نەشیاو بۆ خواردن. 2) نەپێکەر، نەهەنگێو. 3) لە تاقەت بەدەر، لە تاقەت نەهاتو.

**ناخوردە:** 1) ئەوەی کە شتێکی نەخواردوە یان نەخواردۆتەوە. 2) نەگەیشتو. 3) لە حاڵی نەخواردن دا.

**ناخوش:** 1) نەخۆش، نەخوەش، دەردەدار. 2) پیشاندەری نارەحەتی یان نارەزایەتی. 3) خەڵك ئازار. 4) چلۆنایەتی خراو و نادڵخواز. 5) خەمبار، نارەحەت، دڵتەنگ، دل گرتی. 6) بڕوانە: "ناخوش". 7) بە هەورازونشێو، هەڵەمووت. 8) بەدخوو، بەدئەخلاق. "**ناخوش آمدن**": ناپەسندبوون، خۆش نەهاتن. "**ناخوش داشتن**": زایەکردن، لەناوبردن. "**ناخوش کردن**": 1) نەخۆش خستن. 2) نارەحەت کردن. 3) زایەکردن.

**ناخوش احوال:** نەخۆش، دەردەدار.

**ناخوشایند:** ناخۆش، نادڵخواز، نابەدڵ.

**ناخوشداشت:** بێزاری، حەزلێنەکردن.

**ناخوش دیدار:** دیمەن یان ڕواڵەت ناحەز.

**ناخوش مزاج:** بڕوانە: "ناخوش احوال".





**ناخوشی:** 1) نەخۆشی. 2) سەختی، دژواری. 3) دوژمنی، دوژمنایەتی. 4) ناخۆشی. 5) نارەزایی، ناقایلی. 6) پیسی، ناپاکی. "**ناخوشی داشتن**": نەخۆش بوون.

**ناخویشتن:** لەخۆنامۆ، ژخوەبیهانی.

**ناخویشتن شناس:** کەسێ کە پێ زیاتر لە بەرەی خۆی ڕادەکێشێ، بێ ئەدەب و بێ شەرم.

**ناخویشتنی:** لەخۆنامۆیی، ژخوەبیهانیتی.

**نادار:** نەدار، هەژار، بێپووڵ، بێپارە.

**ناداشت:** 1) نەدار، فەقیر، بێتوتە، بەلەنگاز، دەست تەنگ. 2) نەداری، دەست بەتاڵی. 3) بێشەرم، ڕووهەڵماڵاو.

**نادان:** نەزان، بێئاوەز، هشتاری، تێنەگەیشتوو، نەخوێندەوار. "**نادانی**": نەزانین، نەزانی، نەفامی، بێ فامی، نەخوێندەواری.

**نادانستە:** 1) نادیار، نەزانراو. 2) نەزانستە، لە ڕووی نەزانی و بێ خەبەرییەوە.

**نادبیر:** نەخوێندەوار.

**نادختری:** زڕکچ.

**نادر:** دەگمە، دەگمەن، دانسقە، کەم وێنە، نایاب، نایەب، کەس نەدار، بێ هاوتا. سەیر، سەیروسەمەرە. بەدەگمەن.

**نادرخور:** 1) ناشایست، نالایق. 2) ناپەسند.

**نادرست:** 1) سەرچەوت، ناڕاست، فێڵباز، ب فرتوفێل. 2) شکاو، زەدەدار، خەوشدار. "**نادرستی**": ناڕاستی، ناڕاسی، چەفتی، لاری.

**نادرستان:** کۆمەڵەیەکی بێ وێنە و سەیر و دەگمەن.

**نادرگذار:** لێنەبوردە، سەختگیر.

**نادرگیر:** بێلایەن.

**نادرە:** 1) کەسی بلیمەت و هەڵکەوتە. 2) ڕووداوی سەیر و بێ وێنە. 3) قسەی مانادار و دلگر. 4) سەیر، سەیروسەمەرە. 5) ئەوەی بە دەگمەن ڕوودەدا.

**نادلواپس:** خاترجەم، دڵنیا.

**نادم:** بڕوانە: "پشیمان".

**نادی:** 1) بانگکەر، گازیکەر. 2) یانە، گاستین، کلووپ.

**نادیدار:** شاراوە، نادیار.

**نادیدە:** 1) نەدیتراو، نەبینراو. 2) ئەوەی نابینرێ. 3) کوێر. 4) نەدیوبدیو، چاوچنۆك. "**نادیدە انگاشتن**": دەبەرچاو نەگرتن، ل بەرچاڤ نەگرتن. "**نادیدە کردن (آوردن)**": بڕوانە: "نادیدەگرفتن". "**نادیدەگرفتن**": 1) دەبەرچاونەگرتن، چاوپۆشی لێکردن. 2) بەهێندنەگرتن، گرینگی پێنەدان.

**ناراحت:** 1) نارەحەت، خەمبار، وەڕەز، حێدز، حێجز، لەئاسوودەیی بێ بەش. 2) بێ ئۆقرە، نیگەران. 3) ئاژاوەخواز. 4) تووڕە، قەڵس.

**ناراست:** 1) لار، چەوت، خوار، چەمیو. 2) ناڕاست، ناهەق، درۆ، درەڤ. 3) خاین، پەیمان شکێن، ناپاك، گزیكار، فێڵباز. 4) درۆیین.

**ناراضی:** 1) ناڕازی، ناڕەزا، زویر، قەڵس، ناقایل، لووتخوار، کەسێ شتێ قبوولێ نەکا. 2) ناڕازی، دژبەری سیاسی، نەیاری حکوومەت.

**نارایی:** ناڕەزامەندی.

**نارپستان:** مەمك قیت و سفت، مەمك وەك هەنار.

**نارخو:** بڕوانە:"جوشی".

**ناردانە:** 1) دەنکی هەنار. 2) فرمێسکی خوێنین.

**نارس:** خاو، کاڵ، ئاڵوبۆڵ، نەگەیو، نەگەیشتوو، نەگەهشتی، کامڵ نەبوو.

**نارسا:** 1) بە ئاستی دڵخواز نەگەیشتوو، ناتەواو، بەکەموکووڕی، ب کێم و کاسی. 2) هێواش، کز. 3) کورت.

**نارسان:** ناتەواو، کەموکووڕیدار.

**نارسانا:** شتێ کە تین و کارەبای لێوەدەرنەچێ.

**نارسایی:** 1) "نارسا"بوون. 2) (پزیشکی) بێ توانایی هەر ئەندامێ لە ئەنجامدانی ئەرکی سروشتی خۆی، ناتەواوی. 3) (پزیشکی) نەبوونی توانایی زەینی یان بەهرەی جەستەیی.

**نارستگار:** نەحلەتی، نەحلەتکراو.

**نارسیدە:** 1) کاڵ، نەگەیو. 2) بێ ئەزموون، کاڵ. 3) نابالغ، کەم تەمەن. 4) کۆرپە، ساوا. 5) نەونەمام.

**نارسیسیسم:** بڕوانە:"خودشیفتگی".

**نارشید:** 1) ئەوەی بە تەمەنی بالغ بوونی ئەقڵی نەگەیشتووە. 2) بیرتەسك، بیرکورت.

**نارفتە:** گەسك نەدراو.

**نارکوتیسم:** (پزیشکی) گیرۆدە بە ماددەگەلی سڕکەر.

**نارکوتیك:** سڕکەر، هۆشبەر، بێهۆشکەر، سست کەر، خەوهێنەر.

**نارو:** فێڵ، فرتوفێڵ، فندوفێل، گزی، گزە. "**نارو خوردن**": بڕوانە:"فریب خوردن". "**نارو زدن**": پێچ لێدان، فریودان، فێڵ لێکردن، گزەلێکردن، دەسبڕین.

**ناروا:** 1) ناڕەوا، زاڵمانە، دوور لە هەق و ڕاستی. 2) هەڵە. 3) بەجێنەهێنراو. 4) ناپەسند، ناحەز. 5) بێ برەو، لەبرەوکەوتو. 6) گزی، گەڕ، لێب.

**نارواگزینی:** بڕوانە:"تبعیض".

**نارول:** دەگمەن، کلك نیشان.

**نارون:** 1) ناڕەوان، سفت. 2) لەبرەو کەوتو. 3) بەبێ یەکگرتوویی، سست، لاواز. 4) بڕوانە:"راکد".

**نارونی:** 1) ڕەوان نەبوون، بێ جووڵەبوون. 2) (فیزیك) ویسکۆزیتێ. 3) (پزیشکی) بڕوانە:"یبوست".





**نارویی:** 1) ستەم، زوڵم، زۆر. 2) دژواری، ژانەسەر. 3) لەبرەوکەوتن، بێ برەوی.

**ناروزن:** بەمبۆڵە، فێڵباز، دەسبڕ، هەوچی، هاوانتەچی، گزیکار، گزیکەر، لێبۆك، دەغەڵباز، دەغوولێ، تەپڕەش، تەڕن، گەڕساز، ناڕاست، چۆغڵ، زوان شڕ.

**ناز:** 1) خنج، خنجە، ناز، عیشوە، کریشمە. 2) جوان، قەشەنگ(چە دختر نازی!). 3) نەرم و ڕاحەت(تختخواب ناز). 4) بڕوانە:"نوازش". 5) چاك بژی و ئاسوودەیی. 6) هاوڕێژە. "**نازآوردن**": 1) نازکردن، غەمزەکردن. 2) لاواندنەوە، دڵدانەوە. "**نازکردن**": 1) نازکردن، نازفرۆشتن، هەنگ کرن، غەمزەکردن، عیشوە و غەمزەکردن، خۆشاندان بە نازوغەمزەوە. 2) خۆبواردن لە ئەنجامدانی کارێك یان کەمتەرخەمیکردن بە کەسێك یان شتێك. 3) لاواندنەوە. "**نازونوز**": نازونووز، شاخوبەڵەك، نازکردن بە مینگەوفینگە. "**نازونوش**": خۆشگوزەرانی، خۆش ڕابواردن.

**نازا:** نەزۆك، ستێور، ئەستێور، ئەستەویر، ستەور، بەیچەڵ، بێوار، هەرکان، مەزا، بێ دوندان، قسر. "**نازا شدن**": لەبارچوونەوە، هەرکین، نەزۆك بوون دوای زك کردن.

**نازادە:** 1) نەزاو، لە دایك نەبوو. 2) بەشێوەی نەزۆك.

**نازان:** 1) نازکەر، نازفرۆش، لە حاڵی نازکردندا. 2) بڕوانە:"بالندە".

**نازپروردە:** نازپەروەر، بە ناز و خۆشەویستی گەورەکراو.

**نازدار:** کتکاڵ، خۆبەنازکەر، نازدار.

**نازش:** شانازی، نازین، پێوەنازین. "**نازش آوردن**": بڕوانە:"نازکردن(2)". "**نازش کردن**": 1) لاواندنەوە. 2) شانازیکردن.

**نازك:** 1) ناسك، ناسکە، نازك، نازگ، زراڤ، کاغەزی، دژی ئەستوور. 2) تەسك، تەنك. 3) وردوباریك، گرینگ، هەستیار. 4) لاواز، بێهێز. 5) زووهەڵچوو، فیشقی، دڵناسك. 6) ئەوەی توانایی و تاقەتی کەمی هەیە. 7) شیوا، ڕەوان. 8) خۆش، سازگار. 9) تورت و ناسك. 10) تەنگی، تەسکی. 11) دۆستی بەژن باریك و ناسك. 12) بەشێوەی نازپەروەردە. "**بسیار نازك**": زراڤیك، زۆر باریك.

**نازك اندام:** 1) نازکەك، لەش ناسك، ناسکەنام. 2) کز، لەڕ.

**نازك اندیش:** باریك بین، وردبین.

نازك بدن: بڕوانە:"نازك اندام".

**نازك بین:** وردەبین، وردبین، باریك بین.

**نازك جگر:** بڕوانە:"زودرنج".

**نازك خیال:** خەیاڵ ناسك، باریك بین.

**نازك دل:** بڕوانە:"زودرنج".

**نازکش:** نازکەش، خەمخۆر و نازقبووڵکەر لە خاوەن ناز.

**نازك مزاج:** تەبع ناسك.

**نازك نارنجی:** ناسك نارنجی، نازونووزکەر، هایلۆ.

**نازکە:** تیکەی باریك و ناسك لە هەر شتێ.

**نازکی:** 1) ناسکی، نازکی، نازکەی. 2) هەستیار و گرینگ بوون، گرینگی. 3) ناز. 4) بڕوانە: "غرور". 5) تراوبوون.

**نازگر:** نازکەر.

**نازل شدن:** 1) دابەزین، هاتنەخوار. 2) ناردران. 3) وتران، هۆنرانەوە.

**نازل منزل:** جێنشین.

**نازلو:** نازپەروەردە.

**نازلە:** بەڵای سەخت، نەهامەتی، کوێرەوەری.

**نازنازان:** بڕوانە: "خرامان".

**نازنازی:** 1) ناز پەروەردە، نازنازی. 2) لەبەردڵان، خوێن شیرین.

**نازندە:** نازکەر، نازفرۆش.

**نازنین:** 1) بەناز، نازدار، نازار، نازلی، نازەنین. 2) لەش ناسك، جوان و ناسك. 3) زۆر خۆشەویست، زۆر خوێن شیرین. 4) لە ناز و نێعمەت دا پەروەردەکراو. 5) نازکەر. 6) دلبەر، دۆست.

**نازیبا:** 1) ناحەز، ناشیرین. 2) ناپەسند. 3) نالایق.

**نازیدن:** 1) نازکردن، نازفرۆشتن. 2) بڕوانە: "مباهات کردن". 3) پاڕانەوە، خوایشت کردن. 4) بەناز ڕۆیشتن، بە لەنجە ڕۆیشتن.

**نازیسم:** مەرام و ڕێبازی حیزبەکەی هیتلێر لە ئاڵمان کە بڕوایان بە ڕەگەزپەرستی و ناسیۆنالیزمی پەڕگر هەبوو، ناسیۆناڵ سوسیالیسم.

**ناساختە:** 1) 1) دروست نەکراو، چێنەکراو. 2) بەبێ کەلوپەلی پێویست و ئامادەیی. 3) ناتەواو، کەموکووڕیدار. 4) بێ هزر.

**ناساز:** 1) دژ، دژکار. 2) بڕوانە: "ناموزون". 3) پێچەوانە، ناجۆر، تاوتا. 4) ئاڵۆز، بێسەروبەر. 4) ناسازگار، توندخوو. 5) بێئەدەب و بەدخوڵق.

**ناسازگار:** ناتەبا، نەگونجاو، نەحەواوە، نێوان ناخۆش، پێکەوەنەسازاو، لەلەش ناخۆش، ناکۆك، ناسازگار، نەیار، دژکار.

**ناسازگاری:** ناتەبایی، نەگونجان، نەحەواوەیی، پێکەوەهەڵنەکردن، نێوان تێکچوویی، ناخۆشی.

**ناسازوار:** ناسازگار، ناهاوئاهەنگ.

**ناسازە:** پاڕادوکس، دژوازی.

**ناسازەوار:** پارادۆکسیکاڵ، دژواز.

**ناسامان:** 1) بێسەروبەر، ئاڵۆز. 2) بێ ئۆقرە. 3) نابەجێ، نالەبار.

**ناسان اندیشی:** جیاوازی بۆچوون، بەرهەڵستی.

**ناسان نمایی:** بڕوانە: "تمایز".

**ناسانی:** بڕوانە: "تفاوت".

**ناسپاس:** سپڵە، دەلۆش، بێ ئەمەگ، بێوەفا، پێنەزان، ناشکور، ناشکیر.





**ناستردە:** بڕوانە: "شوخگن".

**ناسخ:** 1) پووچکەرەوە، هەڵوەشێن، هلوەشینەر. 2) لەبەرگرەوە، کۆپیست.

**ناسرواد:** ناتەکووز، نارێکوپێك.

**ناسرە:** 1) قەڵب، زەغەڵ، ناعەسڵ، زڕ. 2) ئاخاوتەی ناحەز و کەموکورتیدار.

**ناسزا:** 1) قسەی لە سەر دڵ گران، چۆڕس، جوێن، دژون، دوژێن. 2) ناشایستە، ناهێژا، نالێهاتوو، نەژێهاتی. 3) بێنرخ.

**ناسفتە:** دەست لێنەدراو، کون نەکراو، کون نەکری، نەسمراو.

**ناسك:** خۆپارێز، تەرکەدنیا، خواپەرست، خودێپەرس.

**ناسگالیدە:** 1) بێ بیر، بێ ڕامان. 2) لە ڕووی بێ فکرییەوە.

**ناسوت:** سروشتی مرۆ، خوەزایا مرۆڤ، دنیای سروشتی و ماددی.

**ناسودمند:** 1) بێکەڵك، بێفایدە. 2) زیانهێن، ئازارگەێن. 3) پڕزیان و مەترسیدار.

**ناسور:** 1) برین. 2) برینێ کە ئاوی کێشابێ و ماسیبێ. 3) "فیستول".

**ناسوی دار:** بێلایەن، بێغەرەز.

**ناسی:** فەرامۆشکار، ژبیرکەر، کەسێ کە شتی لەبیر دەچێتەوە.

**ناسید:** سەییدی درۆیین.

**ناسیونال:** نەتەوەیی.

**ناسیونال سوسیالیسم:** بڕوانە: "نازیسم".

**ناسیونالیست:** نەتەوەخواز، نیشتمان پەروەر، نیشتمان پەرست، ڤەلات پەرست، ناسیۆنالیست.

**ناسیونالیسم:** نەتەوەخوازی، نیشتمان پەروەری، نیشتمان پەرستی، ناسیۆنالیزم.

**ناشاد:** 1) خەمبار، ناشاد. 2) خەمهێن، خەفەت هێن.

**ناشاکر:** بڕوانە: "ناسپاس".

**ناشایاکردن:** حەرام کردن.

**ناشایست/ناشایستە:** ناپەسند، ناشایست، نالایق، نەشیاو، نەهێژا، ناحەز.

**ناشتا:** 1) خورێن، خرێن، لەخرێن، لەخرێنی، لەخورێن، لەخورێنی، لەرخێنی، ناشتا، دوای لە خەو هەستان هیچ نەخواردوو. 2) بێ کڕیار، بێ پشتیوانە. 3) برسییەتی. "**ناشتا شکستن**": ناشتا خواردن، بەرچایی خواردن.

**ناشتاب:** 1) لە حاڵێکا ناشتای نەخواردوە و هێشتا برسییە. 2) چاوچنۆك و تامەزرۆ.

**ناشتامنش:** چاوچنۆك، تێرنەخۆر.

**ناشخود:** نەڕووشاو.

**ناشر:** بڵاوکەرەوە، بڵاڤکەر.

**ناشزە:** ناچیزە، ژنێ کە لە فەرمانی شوو سەرپێچی دەکا.

**ناشستە:** 1) نەشۆردراو. 2) بێ حەیا و پیس.

**ناشکستنی:** لە شکان نەهاتوو.

**ناشکیبا:** کەم چیکەڵدانە، کەم جیقڵدانە، بێ سەبر و حەوسەلە، خۆنەگر، تەنگەنەفەس. بەپەلە، بەلەز.

**ناشکیبایی:** تەنگەنەفەسی، بێئارامی، کەم چیکەڵدانەیی، بێ سەبروحەوسەلەیی، بێهن تەنگی.

**ناشناخت:** 1) کەس نەناس، غەریبە. 2) نەزان. 3) نەزانی، نائاگایی. 4) بەشێوەی کەس نەناس و غەریبە.

**ناشناختە:** 1) نەناسراو، نەزانراو. 2) کەس نەناس، غەریبە. 3) نەزان.

**ناشناس:** 1) نەناسراو، نەزانراو. 2) کەس نەناس، غەریبە، بێگانە، لاپەرە، لاپەرەسەن. 3) بەشێوەی نامۆ و غەریبە.

**ناشناسا:** 1) نائاگا، بێخەبەر. 2) نەناسراو، نادیار. 3) بەشێوەی غەریبە و نامۆ.

**ناشنوا:** بلەوەز، گوێنەبیس، گوێ نەبیست، گوێگران، گوێکپ، گوهـ گران، کرێڵ، نەژنەو، لاسار، سەرەڕۆ، هەڵەشە، کەڕ، کەهەڕ، کەهڕۆ.

**ناشنید:** نەبیستراو.

**ناشو:** شتی نەشیاو، لە کردن نەهاتوو، محاڵ، ئەستەم، دژڤار.

**ناشی:** 1) خەشیم، تازەکار، نوهانی، گەندەکار، چەپلەر، کەم زان، کارنەزان، فێرەکارنەکراو، باش ڕانەهاتوو لە کار، شول نەزان، ناشی، کەسێ کە لە کار دا ناشارەزایە. 2) سەرچاوەگرتوو.

**ناشیگری:** ناشیگەریەتی، نیاوەزیان، لەکار نەزانین.

**ناصب:** دامەزرێنەر، بەرپاکەر.

**ناصح:** 1) ئامۆچیار، ئامۆژگاریکار. 2) دڵسۆز، خێرخواز.

**ناصر:** 1) یارمەتیدەر، ئالیکار. 2) دۆست و هەڤاڵ.

**ناصوفی:** بەدڕەفتار، بەدکردار.

**ناطق:** 1) ڕەوانبێژ، قسەڕەوان، قسەزان، بەدەم و دوو، بە دەمو پل. 2) بێژەر، قسەکەر، پەیڤەر، ئاخێوەر. 3) (شانۆ، سینەما) دەنگدار. 4) ئاشکرا، خویا. 5) ئاماژەکەر، گێڕەوە.

**ناطقە:** مێینەی"ناطق". توانای ئاخاوتن و دەربڕین.

**ناطور:** باخەوان، نگابانی کێڵگە، بێستانەوان، بۆستانڤان.

**ناظر:** چاوەدێر، چاڤەدێر، چاودێر، چاویار، ڕوانەر، دیدەوان. "**ناظر بە چیزی بودن**": ئەویش لەخۆگرتن، بریتی لەویش بوون.

**ناظم:** 1) تەکووزکەر، هۆنەر، ڕێکوپێککەر، ڕێکخەر، سەروبەرکەر. 2) دەسەڵاتدار. 3) بڕوانە: "آرایندە". "**ناظم شعر**": هەڵبەس، هەڵبەست، بوێژ. "**ناظم کل**": خودا.





**ناعلاج:** بێدەرەتان، چارەلێبڕاو، چارەژێ بڕیایی، ناچار.

**ناعم:** نەرم و نۆڵ، نەرم و ناسک.

**ناغوش:** سەربردنە ژێر ئاو.

**ناف:** 1) ناوك، نێوك. 2) بەشی ناوەندی یان ناوەڕاستی شتێ. "**ناف آسمان**": ناوەڕاستی ئاسمان. "**ناف انداختن**": زەربەوێکەوتن، لەپیکەوتن. "**ناف بر زمین گذاشتن**": 1) ناوك لە زەویدان، قوورس بوونی باری چوارپێ بەجۆرێ کە سکی لە زەوی بخشێ. 2) بڕوانە:"عاجزشدن". "**ناف بریدن**": ناوك بڕین. "**ناف خاك**": 1) ژێر خاك، قووڵایی زەوی. 2) ناوەڕاستی زەوی. 3) مەککە. "**ناف زدن**": 1) ناوك بڕین. 2) زان، زایین. "**ناف شب**": نیوەشەو. "**ناف عالم**": بڕوانە:"ناف خاك(1،2)". "**ناف کسی (چیزی) افتادن**": 1) ناوك کەوتن. 2) لە پێ کەوتن. "**ناف کسی را با دیگری بریدن**": لەسەر لانکە مارەبڕین. "**ناف کسی را چرب کردن**": وەدەستهێنانی دڵی ئەو، ڕازیکردنی ئەو. "**ناف هفتە**": ڕۆژی سێ شەممە. "**چیزی بە ناف کسی بستن**": تەعاروف کردن بەو، دەرخواردان بەو. 2) قسەی ناحەز پێوتن. "**چیزی بە ناف کشیدن**": خواردنی ئەو شتە.

**ناف بری:** 1) ناوك بڕین. 2) لەسەر لانکە مارەبڕین. "**ناف بری کردن**": 1) ناوك بڕین. 2) ناولێنان، ناو لەسەرنان.

**نافذ:** 1) ڕەخنەکەر، دزەکەر، ڕەوان. 2) کاریگەر، ب باندۆر، دەست ڕۆیشتوو.

**نافذالامر:** دەسەڵاتدار.

**نافراون:** ناڕاستەوخۆ.

**نافرجام:** 1) ئاخر شەڕ، ئەو کەسەی ئاخری کارەکەی بە خێر تەواو نەبێ. 2) ناسەرکەوتوو (ترور نافرجام). 3) بێهوودە، بێنرخ. 4) جوێن، جنێو.

**نافرزان:** نەزان، تێنەگەیشتو.

**نافرمان:** سەرشەق، سەرکێش، سەربزێو، نافەرمان.

**نافرمانی:** سەرچەوتی، سەرکێشی، سەربزێوی، نافەرمانی.

**نافرمودنی:** کارگەلی چەوت و ناحەز کە ڕێ بەئەنجام دانیان نەدراوە.

**نافع:** بەکەڵك، بەسوود، بەقازانج، ب وەج.

**نافصیح:** لەوچە(هەر لەوچەلەوچییەتی)، بێدەموپل، قسەناڕەوان و دەم خوار، بێ دەڤ و لمۆز.

**نافەبو:** 1) بۆن خۆش. 2) ئەوەی زاری بۆنی ناخۆشی لێ دێ.

**نافهم:** نەفام، نەزان، بێشعوور.

**نافی:** ڕەتکەرەوە، نکۆڵیکەر، حاشالێکەر.

**ناقد:** 1) ڕەخنەگر. 2) ئەوەی پارەی ئەسڵی لە تەزویر جیادەکاتەوە.

**ناقص:** 1) ناتەواو، کۆلکە، سەقەت، نیوەچڵ، بەکەموکووڕی، کەمووکووڕی دار، ب کێماسی. 2) شتێ کە بە کەماڵ نەگەیشتبێ . "**ناقص شدن**": 1) کەم کردن، کورت هێنان. 2) عەیبداربوون، سەقەت بوون. 3) نەخۆش کەوتن.

**ناقص الخلقه:** نوقوستانی زکماکی.

**ناقص العضو:** کەم ئەندام، نوقوستان، بۆ مانای زیاتر بڕوانە:"معلول".

**ناقص العقل:** کەم ئەقڵ، کەم ئاوەز.

**ناقض:** 1) پێشێلکەر، ژێرپێنەر، پێپەس کەر. 2) پووچکەرەوە، هەڵوەشێنەر. 3) پەیمان شکێن.

**ناقل:** 1) هەڵگر، هلگر. 2) ڕاگوێزەر، گەیەنەر، گەهینەر. 3) گێڕەرەوە، ڕەوایەتکەر، هەقایەتکەر. 4) گومڕاکەر.

**ناقلا:** 1) بیرتیژ و زیرەك. 2) فێڵاوی و بەدفەڕ. 3) ئازاردەر، مزیڕ.

**ناقوس:** گەڕناڵ، زەنگوڵەی زل.

**ناقه:** (قِ) نەخۆشێ کە تازە چاك بوبێتەوە و هێشتا بێهێز بێ .

**ناك:** 1) نەدار، دەسکورت. 2) خەمبار و بێحاڵ. "**ناك كردن**": سوخت کردن، ماڵ لێ سەندن، ڕووتاندنەوە.

**ناکاراساز:** پووچەڵکەرەوە، هەڵوەشێنەر.

**ناکار:** ناکارامە، سست و بێهێز، بێ توان. "**ناکارکردن**": زەربەلێدان، لەپێخستن.

**ناکاردیده:** 1) بێئەزموون. 2) تازە، نوێ، دەکارنەکراو. 3) پەست، نزم.

**ناکام:** 1) بێمراد، بێمراز، نامراد، کام نەدیو، بە ئاوات نەگەیشتوو، کەسێ کە بە ئامانج و ئارەزووی خۆی نەگا، مراز حاسل نەبوویی. 2) ناهومێد، بێبەش. 3) ناڕازی. 4) ناچار. 5) بەپێچەوانەی مەیل و ئارەزوو. "**ناکام کردن**": ناهومێدکردن، بێهیوا کردن. "(**بە**)**ناکام و کام**": بڕوانە:"خواەناخواە". "**بەناکام**": بەپێچەوانەی مەیل، بەناچار.

**ناکث:** پەیمان شکێن.

**ناکجاآباد:** 1) شاری ئاوات. 2) شوێنی نادیار، شوێنی خەیاڵی.

**ناکردنی:** 1) حەرام، ئەوەی بۆ ئەنجامدان نەشێ. 2) ناڕەوا، زاڵمانە.

**ناکرده:** 1) ئەنجام نەبوو. 2) نەخوازراو، نەویستراو.

**ناکردەکار:** بێئەزموون.

**ناکس:** (كَ) ناجسن، خوێڕی، بێ سەروپێ، شەلاتی، پەست، ناکەس.

**ناکس:** (كِ) سەرشۆڕ، سەرنەوی، چەمیو، چەماوە، سەرنخوون، سەرەوژێر.

**ناکس بچه:** هەتمچە، هەتمچەرەك، هەتیوچە، هەتیومچ، نانەجیبی خوێڕی و بێ ئابڕوو.

**ناکفته:** نەترەکیو، نەتەقیو.

**ناکنش ور:** ناچالاك، پاسیڤ، بێ جموجۆڵ.





**ناگاه:** 1) ناوەخت، بێ وەخت، بێگاڤ. 2) لەنکاو، لەپڕ، بێ چاخ. 3) نابەجێ.

**ناگذر/ناگذرا:** لە ڕێزماندا: پێویست.

**ناگرای:** کەمتەرخەم، بەهێندنەگر. بێ مەیل.

**ناگرفت:** بێخەبەر، ناوەخت، لەنەکاو. "**ناگرفت زدن**": زەربەلێدانی کتوپڕ.

**ناگرفته:** 1) نەگیراو، سەربەست و ئازاد. 2) دیل نەکراو و ئازاد.

**ناگزران:** 1) پێویست، حەتمی. 2) بێ ئیختیار.

**ناگزیر:** ناچار، چارەلێبڕاو، چاری ناچار، بەناچار، مەژبوور. "**ناگزیرشدن**": 1) ناچاربوون. 2) واجب بوون. "**ناگزیرشدن از چیزی (کاری)**": ئاتاج بەو کەسە بوون. "**ناگزیرکردن**": ناچارکردن.

**ناگفتنی:** 1) وەسف هەڵنەگر. 2) ئەوەی بۆ وتن نەشێ. 3) نەوتراو.

**ناگوار:** 1) ناخۆش، دڵتەزێن، جەرگ بڕ، ب ئێش و ژان. 2) تام ناخۆش، بێ تام. 3) ئەوەی بەباشی هەرس نەبێ . 4) لەتاقەت نەهاتو، لەتاقەت بەدەر. 5) بڕوانە:"امتلا".

**ناگوارد:** بڕوانە:"امتلا".

**ناگوارش:** 1) ئینتەلا، سابخۆر، سقڵ. 2) بێ سەروبەری و شپرێوی.

**ناگواریده:** بەشێوەی هەرسنەکراو.

**ناگواشته:** بڕوانە:"ناگواریدە".

**ناگه:** سووکەڵەی"ناگاە".

**ناگهان:** 1) کتوپڕ، کوتوپڕ، لەنەکاو، لەنکاو، لەپڕ، لەنخافڵ، لەهێك، لەهێکڕا، گزوگومەت، بێچاوەنۆڕی، بێخەبەر. 3) بەڕێکەوت. 3) نەزانستە.

**ناگیرا:** 1) سەرنج ڕانەکێش، ئەوەی کاریگەری پۆزەتیڤی بەسەر شتێکیترا نەبێ . 2) بڕوانە:"فلج".

**نالان:** 1) ناڵان، نکن، نالەنال، کەسێ کە لە تاوی خەم و دەرد بکڕووزێتەوە. 2) ناڵان، لەحاڵی ناڵە و کڕووزانەوەدا. 3) شکایەتکەر، سکاڵاکەر. 4) نەخۆش، لەش بەبار، دەردەدار. "**نالان نالان**": لە حاڵی ناڵەوشیوەندا.

**نالش:** 1) ناڵە و شیوەن، نالین و گری. 2) شکایەت، گلێیی. "**نالش زدن**": ناڵاندن، ناڵانن، ناڵین.

**نالنده:** ئەوەی دەناڵێنی و دەکڕوزێتەوە.

**نالوطی:** ناجوامێر، ناپیاو.

**ناله:** ناڵە، نالەنال، کڕووزانەوە لە دەرد و خەم، کوزەکوزا ل بەر کول و خەم. "**نالە برآوردن**": دەنگ لێوەهاتنی ساز مۆسیقاییەکان. "**نالەبرکشیدن**": 1) بڕوانە: "نالە برآوردن". 2) ناڵانن، ناڵین. "**نالەکردن**": 1) ناڵین، ناڵاندن. 2) دەنگ لێوەهاتنی شتێ کاتی کەڵك لێوەرگرتنی. 3) گازندەکردن، گلێیی کردن. 4) بەکڕووزانەوە و لاڵانەوە داوای

شتیکردن. "**نالەکشیدن**": بڕوانە: "نالیدن (1)". "**نالە و زاری**": نالە وشیوەن. "**نالەونفرین**": گلەیی و دوژێن.

**نالە کنان:** نالان، لە حالی نالان و کڕووزانەوەدا، ب نالەنال.

**نالیدن:** 1) نالین، نالین، نالاندن، نالانن، نالای، نالایش، نالایەنە، نالنی، نالەنە، نالەکردن، نکین، کازکاز، کڕووزانەوە لە دەرد و داخ. 2) گازندەکردن، گلەییکردن. 3) لالانەوە، کڕووزانەوە. 4) دەنگ لێوەهاتنی سازە مۆسیقاییەکان. 5) خرۆشیان، خرۆشین، نالەوهاوارکردن. "**ازکسی (چیزی) نالیدن**": گلەیی هەبوون لەو، لەدەست ئەو نالین. "**به (پیش) کسی نالیدن**": بۆ سکالا یان دادخوازی چوونە لای ئەو.

**نام:** 1) ناو، نێو، ناڤ. 2) ئابڕوو، شانازی. 3) نیشانە، ئاسەوار. 4) وشە، لەبز. 5) ناوبانگ، ناوودەنگ. "**نام برآوردن (آوردن)**": ناوبانگ ڕۆیشتن، ناودەرکردن، ناسران. "**نام بردن**": ناوبردن، ناڤ برن، ناوهانین، ناوهاوردن، ناوهێنان، ناڤ ئانین، باس کردن. "**نامِ بلند**": ناووناوبانگ. "**نام به ابر اندرآوردن**": ناوبانگ ڕۆیشتن، زۆر ناوڕۆیشتن. "**نام پراکندن**": ناوبانگ ڕۆیشتن، ناودەرکردن، ناسران. "**نام جاوید**": ناوبانگی هەرمانی. "**نام جستن**": بەدوای ناووناوبانگەوە بوون. "**نام خانوادگی (نام فامیلی)**": ناوبانگ. "**نام داشتن**": 1) ناولێنران. 2) ناوبانگ هەبوون. "**نام زشت**": ناوبانگی خراپ. "**نام کردن**": 1) ناونان، ناولێنان. 2) دیاریکردن، کاندیداکردن. "**نام کسی (را) بر آب نوشتن**": فەرامۆش کردنی ئەو، لەبیربردنی ئەو. "**نام کسی برداشتن**": ناوبردن لەو. "**نام کسی (را) بردن**": ناوبردن، ناوهێنان، باسکردن. "**نام کسی (چیزی) بر یخ زدن (نوشتن)**": لەبیرکردنی ئەو، فەرامۆش کردنی ئەو. "**نام کسی در گل افتادن**": لەبیرچوون(ەوە)ی ناوی ئەو. "**نام گذاشتن**": ناولێنان، ناوبۆ دیاریکردن، ناودێرکردن. "**نام مستعار**": ناوی خوازراو، نازناو، نازناڤ. "**نام نامی**": ناوی ناسراو. "**نام نوشتن**": ناونووسین، ناوتۆمارکردن. "**نام و نان**": ناوبانگ و سەروەت و سامان. "**نام و نشان**": 1) ناونیشان. 2) نیشانە، ئاسەوار. 3) ناو و ناوبانگ یان ناوی تەواو. "**نام و ننگ آوردن**": ئابڕوو و ئێحتوبار پەیاکردن. "**بەنام**": بەناوبانگ، ناودار. "**به نام خود کردن**": 1) تەرخان کردن بۆ خۆ. 2) بەناوی خۆوە تۆمار کردن. "**به نام کسی بودن**": بە نێوی ئەوەوەبوون، هی ئەو بوون. 2) دەزگیرانی ئەو بوون.

**نام آشنا:** بەناوبانگ، ناودار، بەباڤ، ناسراو.

**نام آوا:** ناوێکی تێکەلاو کە لە دەنگەکانی سروشتەوە وەردەگیرێ وەك چۆڕچۆڕ و میاومیاو.





**نام آور:** ناودار، بەناوبانگ، بەناودەنگ، ناسراو، ناسکری.

**نامادری:** زڕدایك، زڕداك، باوەژن.

**نامانداگ:** بڕوانە: "ناماننده".

**ناماننده:** ئەوەی لە شتێکیدی ناچێ، لێکنەچوو.

**نامأنوس:** 1) مانا و واتای دوور لە زەین. 2) خوو پێ نەگرتوو، ڕانەهاتوو.

**نامبردار:** 1) بڕوانە: "نام آور". 2) بەنرخ، گرانبایی. 3) پالەوانی ناودار. 4) گرنگ، گرینگ. 5) ناسراو.

**نامبرده:** ناوبراو، ناڤبری، ناڤ گوتراو، باسکراو، باسکری. بە مانای ناوداریش هاتووە.

**نامتجانس:** نەگونجاو، ناهاوچەشن، ناهاوجنس.

**نامتجزی:** دابەش نەبوو، لەت نەبوو.

**نامتراکم:** تەنك.

**نامتعادل:** 1) ناتەواو لە ئەقلدا. 2) نابەرابەر، نایەکسان.

**نامتعین:** نادیار، نادیاریکراو.

**نامتکافی:** نابەرابەر.

**نامتکلف:** 1) بەبێ خۆنوێنی، سادە. 2) سادە، ڕەوان.

**نامتناهی:** 1) بێکۆتایی، بێبڕانەوە، بێ داڤی، بێبریان. 2) بڕوانە: "طولانی".

**نامجو:** 1) ناوبانگ خواز. 2) بەناوبانگ، ناسراو.

**نامحتمل:** ڕێ تێنەچوو، نەگونجاو، نەشیاو.

**نامحدود:** بێسنوور، بێکەوشەن، نەبەرتەنگ. "**نامحدودیّت**": بێسنووری.

**نامحرم:** 1) نامەحرەم، نامەرەم، دگەر، بێگانە، پێك شیاو، دوو کەس کە دەزنوێژیان لێك بشکێ. 2) کەسێك کە ڕازدار نەبێ و نەکرێ متمانەی پێ بکرێ، بێبەقا.

**نامحسوس:** هەست پێنەکراو.

**نامحکم:** سست، لەق، ناپتەو، ناتۆکمە، نەقاهیم.

**نام خواه:** بڕوانە: "نام جو".

**نامدار:** 1) ناودار، بەناوودەنگ، ب ناڤ و دەنگ، بەدەنگ و ناو، ناسراو، سەربەدەرەوە. 2) گەورە، مەزن. 3) پالەوان. 4) بەنرخ، گرانبایی. 5) هەلبژێراو، زۆر باش.

**نامراد:** بەئاوات نەگەیشتوو، بێمراد، ناکام.

**نامربوط:** 1) بێ پێوەندیدار بە شتێ یان بابەتێکەوە. 2) بێسەروبن، قسەی قۆڕولابەلا.

**نامرتب:** نەتەکووز، ناڕێك، تێکەل و پێکەل، شپرزە، شپڕێو، شێویاگ، ناورتە، بێسەروبەر، شلوشەوێق، شلوشێواو، شلەپەتە.

**نامرد:** گەندەپیاو، ناپیاو، کۆژۆ، دل نزم، نائینسان، نامرۆڤ. بێغیرەت، ترسەنۆك. بێتوان لە کرداری سێکسیدا.

**نـــــامردى:** پەســـــتى، خوێرپيــــەتى، هەتمچەرەكى.

**نامرضى:** ناپەسند.

**نامرغوب:** 1) ئەياغ، چرووك و بێنرخ، نـەباش، بێبرەو، بێرمێن، قرپـۆك، نائەسڵ، ئاشاخە، قەسپ، خراپ. 2) نادڵخواز.

**نامرئى:** ناديار، ون لەبەرچاو، نەبەدى.

**نـامزد:** 1) پـاڵێوراو، ناولەسـەر، كانديـدا، بەرئەندام، بەربژار، نـاودێركراو بـۆ كـارێ، كـەسێ كـە بـۆ كـارێ لەبەرچاوگيراوە. 2) دەزگـــر، دەزگرتـــى، دەســـتگرتى، دەزووران، دەســـگيرۆ، دەســـتگيران، دەزگـــيران، دەزبـــيران، دەرگـــست، دەرگـــستـــى. 3) يادگـار. "**نـامزدكردن**": 1) كانديـــداكردن، بەرئەنـــدام كـــرن، ناودێركردن. 2) دياريكردن، نيشانەدان و شيرينى خواردنى خوازبێنى. 3) نـاوبردن، ناوهێنـــــان، ديـــــاريكردن. 4) دانـــــان، دياريكردن. 5) تەرخان كردن.

**نام زده:** دياريكراو، ناودێركراو.

**نام زشتى:** بەدناوى، ناوزڕاوى.

**نامسئول:** نابەرپرس، بێبەرپرسيارى، بـێ بەرپرساتى.

**نامساعد:** 1) نالەبار، ناخۆش، ناسـازگار. 2) دژ، دژبەر، ناهاوڕا.

**نامستوى:** نارێكوپێك.

**نامسلمان:** 1) ناموسڵمان. 2) دڵڕەق، بـێ بەزەيى.

**نامسلوك:** نەپێوراو، نارێك.

**نامشار:** ئاماژەپێنەكراو.

**نامشخص:** ناديار، ناروون.

**نامشروع:** 1) حەرام. 2) زۆڵ، بێژوو.

**نام شكسته:** بەدناو، ناوزڕاو.

**نامطـلـوب:** 1) نـادڵـخـواز، نــاخۆش. 2) بـــەزەڕ، مزيـــڕ( عنـــصر نـــامطلوب سياسى).

**نامعقول:** نابەجێ، نائەقڵانى، پێچەوانەى ڕێوشوێنى ئاسايى، پێچەوانەى ئەقڵ.

**نامعلوم:** نەناسراو، ناديار.

**نامعهود:** 1) بێپێشينە، چاوەڕواننەكراو. 2) نەناسراو.

**نامگذارى:** ناونان، ناڤــ دانـێن، ناڤانـدن، ناولێنان، ناونيان، ناودێركردن، ناودێرى.

**نـام گرايـى:** (فەلسەفە) بڕوايـەك لەسـەر بنەماى ئەوەكە واتا پەتييەكان هيچ جۆرە سەرچاوەيەكى بابەتييان نيە و تەنيا وەك ناو هەن، "نوميناليسم".

**نام گرفته:** 1) بڕوانە:"مشهور".

**نـــام گـــستر:** خوازيـارى نـاو و ناوبـانگ، ناوبانگ خواز.

**نـــاملايــــم:** 1) سەخـتـــى و دژوارى. 2) نـــاخـــۆش. 3) سـەخـــت، دژوار. 4) ناپەسند، ناحەز.

**ناملايمات:** سەختييەكان، دژوارييەكان.

**نـامـمكن:** 1) نەشياو، مـەحاڵ، ئەسـتەم. 2) بڕوانە: "ناياب".





**نامناسب:** 1) نالەبار، نـاجۆر. 2) نابـەجێ، نەشياو، نەهەژى.

**نامنتظر:** چاوەڕواننەكراو.

**نامنسجم:** بڕگەبڕگە، لێكچڕاو، لێك دابڕاو، نەهەڤگرتى، ناكۆك.

**نام نويسى:** ناونووسى، تۆماركردنى ناو.

**نـامور:** 1) بڕوانـە:"مـشهور". 2) بـەنرخ، گرانبايى. 3) ناونراو، ناودێركراو.

**نـاموزون:** لـە كـێش تـرازاو، نـاهـاوكێش، لەنگ. 2) لار، خـوار، ناسـاف. 3) ناحـەز، ناشيرين.

**نـامـوس:** 1) شـەرەف، ئـابڕوو، نـامووس. 2) ژن، دايـك يـان خوشـكى پيـاو كـە پاراسـتنى حورمـەت و ئـابڕووى ئـەوانى لەئەسـتۆيە. 3) ڕێـسا، ياسـا. 4) بڕوانـە: "شـريـعـت". 5) ڕيـا، فـێـڵ، تـەڵەكە. 6) سياسـەت، پـرس و ڕا. 7) فيـز، دەعيـە، خۆپەسـندى. 8) ناوبـانگ، نـاوودەنگ. "**نـاموس اكـبر**". جوبرەئيـل. "**نـاموس الاهـى**": بڕوانە:"شريعت". "**ناموس چيزى( جايى ) رفـتن**": لە بايەخ و ئێعتوبارى ئـەو كـەم بوونـەوە. "**نـاموس خـود را قـايم گردانـدن**": پاراسـتنى ئـابڕووى خـۆ. "**نـــاموس كـــردن**": 1) خۆنوێنيكردن يان خۆبە داوێن پاك نيشان دان. 2) ئابڕوو وەدەستهێنان. "**ناموس كسى را برداشتن**": ئابڕوو ڕژاندن، ئـابڕوو تكانـدن. "**ناموس كسى (چيزى) را شكستن**": لـەناوبردنى بايەخ و ئێعتوبارى ئەو.

**ناموسگر:** بڕوانە:"مدعى".

**ناموسيكردن:** خۆنوێنيكردن، وانواندن.

**ناموية:** ژنێ كە بە مێردەكەى وەفادارە.

**نامـــــه:** 1) نامــــە. 2) دەســـــتوورى بەنووســـــراوە. 3) كتێـــوى ئاسمـــانى. "**نامەاعمال(عمـل)**": 1) نامـەى كردارەكـان. 2) كارنامە يان پەروەندە. "**نامە پرانـدن**": نامـــەگۆڕكێ، نامەگۆڕينـــەوە. "**نامـــە تـــوقيعى**": نامەيـەك كـە مـۆر و واژۆى پاشـاى پێـوەبێ. "**نامـە سرگـشادە**": نامەى سەرئاوەڵە. "**نامەء سياە( سيە )**": نامـەى كـردارى كەسـى تاوانبـار كـە تاوانـەكانى لـەودا تۆمـاركرابێ. "**نامـە (را ) سياە( سيە ) كردن**": 1) نامـە نووسـين. 2) نامە ڕەشكردنەوە. "**نامـە عنـايتى**": ڕاسپێرنامە. "**نامەكردن**": نامەنووسين.

**نامـــەبر:** تەتـەر، وڵام بـەر، نامەبـەر، خەبەربەر، پۆستەچى، بەرسـيڤ بـر، نڤشتۆك بر.

**نامە پرانى:** نامە نووسينى پەيتاپـەيتا بۆ فەرمانگە يان بۆ كەسەكان.

**نامەرسانى:** نامەگەياندن.

**نامەسياه:** بريتى لە كەسى تاوانبار.

**نامـــەنگار:** نامـەنووس، نامـەنڤيس، نڤشتۆك نڤيس.

**نامەنگارى:** نامەنووسين.

**نامە نما:** بڕوانە:"انديكاتور".

**نامەور:** بڕوانە:"نامەبر".

**نامی:** 1) به دەنگ و ناو، ناودار، ناڤدار، سەرناس، ناسراو، ناسکری. 2) گەشە (کردوو/ کری)، بەخۆداهاتوو، بالاکردوو. 3) خۆشەویست، بەرێز. "**نامی داشتن**": رێز و حورمەت گرتن. "**نامی کردن**": ناوداركردن، بەناوبانگ کردن.

**نام یافته:** ناودار، بەناوبانگ.

**نامیدن:** 1) ناونان، ناڤ دانین، ناڤاندن، ناولێنان، ناونیان. 2) ناونران، ناولێنران، ناودێرکران.

**نامیری:** بڕوانە:"ابدیّت".

**نان آور:** دابینکەری بژیوی بنەماڵە، نان بدە.

**نانای:** سەما.

**نان بارە:** بڕوانە:"شکم پرست".

**نان بدە:** 1) بڕوانە:"نان آور". 2) دڵاوا، بەخشندە.

**نان بندان:** نان دروست کردن، نان کردن.

**نان بە نرخ روز خور:** هەلپەرست، دەرفەت هێن.

**نان جو:** 1) ئەوەی بەدوای نانەوەیە. 2) بڕوانە: "گدا".

**نانجیب:** 1) نارەسەن، ناجسن، ناوەجاخ، نانەجیب. 2) بێ سەروبەر لە کاری سێکسیدا.

**نانخواە:** 1) خوازیاری نان. 2) نەدار، هەژار.

**نان خور:** 1) ئەوەی بژیوی و داهاتەکەی بە کەس یان کەسانیترەوە بەستراوەتەوە. 2) ئەوەی بۆ ئەنجامدانی کاری کەسێنی مووچە وەردەگرێ. 3) مووچەگر. 4) نانخۆر، بریتی لە خێزان و منالّ.

**نان دار:** شتێ کە قازانجی زۆری هەیە.

**نان درآ:** 1) ئەوەی نانەکە لە تەندوور دەکاتەوە. 2) دابینکەری بژیوی بنەماڵە.

**نان درانبان:** ئامادەی ڕۆیشتن و سەفەر.

**نان ربا(ی):** بڕوانە:"آزمند".

**نانکور:** 1) بریتی لە بەدنمەك، سپڵە، بێ ئەمەگ، پێنەزان. 2) کوێرنان، کۆرنان، نان نەخۆر، نانکوێر، نان بڕێر، نان تالّ.

**نانمازی:** 1) بێ نوێژی. 2) ناپاکی و پیسی.

**نان و آب دار:** پڕداهات، پڕقازانج.

**نانورد:** 1) بڕوانە: "ناموزون". 2) نەشیاو، نالایق.

**نانیوشان:** لەپڕ، بێ خەبەر، لەنکاو، بێ پێ حەسیان.

**ناو:** 1) هەر شتێکی درێژ و ناوبەتاڵ. 2) بەناز و لەنجەولار ڕۆیشتن.3) پاپۆڕ، پاپۆڕی شەڕکەر. 4) پلووسك. 5) شیو، دۆڵ. 6) جۆگەلەی ئاو.

**ناوا پاد:** لەغاوپچڕاو، کۆنترۆڵ نەبوو.

**ناواجب:** 1) کردارێك کە بەجێهێنانی پاداشی هەبێ و وازلێهێنانیشی گوناه و سزای نەبێ . 2) ناڕەوا، ناپەسند. "**بە ناواجب**": 1) بەناهەق. 2) بێ هۆ.





**ناوارد:** 1) لەکارنەزان، خەشیم، ناشارەزا، نابەڵەد، نابەڵەگ، نابەڵەڵ. 2) نابەجێ.

**ناوانیدن:** چەماندن، چەڤاندن، دانەواندن، داهێنان.

**ناوبری:** زانستی دیاریکردنی ڕەوگەی حەرەکەتی پاپۆڕ و فڕۆکە.

**ناوجە:** بڕوانە:"بیهودە".

**ناوخدا:** بڕوانە:"ناخدا".

**ناودان:** پلووسك، لووساوك، پلور، شوورك.

**ناودیس:** نارێکی و بەرزونزمییەکانی سەرزەوی کە بە شکڵی "ناو"ە.

**ناورد:** 1) شەڕ، جەنگ. 2) بڕوانە: "جولان". 3) توانای ڕۆیشتن، هێزی بزووتن. 4) شەڕگە. "**ناورد دادن**": تاودان، ڕمبازێن، تەراتێن. "**ناورد کردن(زدن)**": گەڕان، دەورلێدان، تەراتێن. "**ناوردگرفتن**": 1) بڕوانە: "ناورد کردن". 2) شەڕکردن. 3) ململانیکردن، کێبەرکیکردن.

**ناوردجو:** شەڕخواز، شەڕکەر، شەرڤان، جەنگاوەر.

**ناوردگاە:** شەڕگە، شەڕگەه، گۆڕەپانی شەڕ، قادا شەڕ.

**ناوردگر:** خەنیم، ڕقەبەر.

**ناورزیدگی:** بێ ئەزموونێتی.

**ناوسالار:** سەرهەنگی هێزی دەریایی سپای پاسداران.

**ناولخرجی:** بڕوانە:"صرفەجویی".

**ناوناوان:** بڕوانە:"خرامان".

**ناوندان:** بڕوانە:"ناودان".

**ناووس:** گۆڕ یان قەبری غەیرە موسڵمان.

**ناوی:** سەربازی هێزی دەریایی.

**ناویدن:** 1) چەمینەوە، چەڤیان، داهاتنەوە. 2) خلنگین و بەلەنجەولار ڕۆیشتن. 3) بڕوانە:"تلوتلوخوردن".

**ناویژە:** پوختەنەکراو، نەپالێوراو، پالوون نەکری، خەوشدار، تێکەڵاو.

**ناویژەکار:** ناشارەزا، ناپسپۆڕ.

**ناهار:** 1) فراوین، نیوەڕۆژە، نانی نیوەڕۆ، نەهار. 2) کاتی نیوەڕۆ. 3) برسی. 4) بڕوانە:"حریص". 5) بێ بەش. 6) تێرنەخۆر، چاوبرسی. 7) توونی، تینوو. 8) برسێتی. "**ناهار شکستن**": بەرکوڵدان، برسێتی یان توونیەتی ڕەواندنەوە.

**ناهاربازار:** 1) قەرەباڵغی کاتی نیوەڕۆ . 2) برەوی کار و بازاڕ.

**ناهارگاە:** 1) کاتی فراوین خواردن. 2) شوێنی نەهارخواردن.

**ناهاری:** 1) بڕوانە:"گرسنگی". 2) ئەوەی بۆ ڕەواندنەوەی برسێتی دەیخۆن، بەرکولّ.

**ناهمانستی:** بێهاوتایی.

**ناهب:** تالانچی، پوورکەر.

**ناهرگزی:** دنیای لەناوچوو و نابەردەوام.

**ناهماد:** بڕوانە: "ناقص".
**ناهمال:** 1) بێوێنە، بێهاوتا. 2) دژ، دژبەر.
**ناهم اندیشی:** جیاوازی بۆچوون، بەرهەڵستی.
**ناهمانندی:** بڕوانە: "تفاوت".
**ناهمبسته:** جیا، جوێ.
**ناهمبند:** جیا، جوێ.
**ناهمتا:** 1) بێهاوتا، بێوێنە، بێچوون. 2) ناهاوچەشن. 3) دژکار، ناسازگار.
**ناهم رایی:** بڕوانە: "مخالفت".
**ناهم زینگی:** بڕوانە: "تفاوت".
**ناهمساز:** پێکەوەنەگونجاو، ناسازگار، ناهاوئاهەنگ، نەحەواوە، نەحەڤیایی.
**ناهمسر:** ئەوەی دەگەڵ یەکیدی هاوڕێز و هاونرخ نیە.
**ناهمگنی:** بڕوانە: "تفاوت".
**ناهمگون:** ناهاوچەشن، نالێکچوون، جیاواز، ناتەبا.
**ناهموار:** نارێك، نالەبار، ناساف، ناقۆڵا، ناخار، نەپۆڕ، قولۆر، خواروخێچ، خیچ و خوار، زبر و بەکەندوکولۆ، بەکەندولەند، ب کەندال و کۆر، پڕ هەورازونشێو، زبرودرشت، نەتاشراو، سیقاڵ نەدراو. دژوار. نابەرابەر. خۆسەر، بێئەدەب.
**ناهمواری:** 1) کەچایی، نارێکی، خواروخێچی، پڕ لە کەندوکولۆیی، پر ژ کەندال و کۆری. 2) سەختی، دژواری. 3) ناهاوڕێژەیی، ناهاوئاهەنگی. 4) شوێنە بەرز و نەوییەکان. 5) دژایەتی. 6) پەرێشانی. 7) جوێن، جنێو.
**ناهنجار:** ناسازگار دەگەڵ نەریت و ڕێسا، دژەنۆرم، نانۆڕم، ناباو، نەشیاو، نەسازاو، نەگونجاو، نارێك، لاروخواروخێچ، ناقۆڵا، ناکلۆکار، ناکولۆکار، قەلۆ، ناڕاست و تووش، پۆرخز، شەنی، کرێت، خوێنتاڵ، ئێسك گران، ناحەز و ناپەسند، کەرچۆڤە، شەڕانی.
**ناهی:** نەهێڵ، بەرگێڕەوە.
**نایاب:** کەم وێنە، دانسقە، گێرنەکەوتوو، قات، نایەب، نایاب، کەس نەدار، کێم میناك، بێهاوتا.
**نایافت:** 1) بڕوانە: "نایاب". 2) نەدۆزینەوە.
**نایافته:** 1) ئەوەی نەناسراو و نادیار ماوەتەوە. 2) وەدەست نەهاتو. 3) بێ بەش.
**نئوژن:** چاخی دووهەم لە دەورانی سێهەمی زەوی ناسی.
**نبات:** 1) ڕوەك، ئەوەی لە زەوی بڕوێ وەك گوڵ و گژوگیا و دار. 2) نەبات، جۆرە شەکرێکی مینایی ڕەنگە. "**نبات ریختن**": 1) دروستکردنی نەبات. 2) قسەی شیرین وتن.
**نبالت:** بەڕێزبوون، خودان قەدر بوون. 2) گەورەیی و لەسەردابوون.
**نبرد:** 1) شەڕ، جەنگ. 2) کێشمەکێش و هەوڵ و مشتومڕ. 3) ڕووبەڕووبوونەوە دەگەڵ کەسێك. 4) بڕوانە: "ستیزە". "**نبرد آزمودن( جستن )**": شەڕکردن، جەنگان. "**نبرد آوردن**": بوونە خەنیم.





**نبردآزما:** شەڕکەر، جەنگاوەر.
**نبردافزار:** ئامرازی شەڕ، چەکوچۆڵ.
**نبردگاه:** شەڕگە، گۆڕەپانی شەڕ.
**نبرده:** شەڕکەر، شەڕانی، جەنگاوەر، بوێر، دلێر.
**نبریده:** 1) سوننەت نەکراو، خەتێنەنەکراو. 2) بڕوانە: "حیلەگر".
**نبش:** ویرنج، ئانیشکە، سەری پێچیکۆلان. "**نبش قبر**": هەڵدانەوەی گۆڕ، هەڵکەندنی زەوی و دەرهێنانی شتێ لە ژێر زەوی دا.
**نبشتن:** (نَ بِ.تَ) بڕوانە: "نوشتن". "**نبشته**": نووسراوە.
**نبشتن:** (نَ بَ.تَ) 1) پێوان، ڕێگەبڕین. 2) پێچدان، لوولدان.
**نبض:** رەهـژەن، چرف، چڵ، چلّك، پل، شوار، فرت، پت لێدانی دەمار، لێدانی دڵ. "**نبض چیزی (کاری) را دردست داشتن**": بە تەواوی لەژێر کۆنترۆڵ دابوون، زاڵبوون بەسەریدا. "**نبض زدن**": چلّك لێدان، چلّکدان، پت لێدان. "**نبض کسی را در دست داشتن**": شارەزای ورە و تین وتاوی ئەو بوون و کاریگەری لەسەر دانانی. "**نبض گیری**": شوارگرتن، پتی دەمار ژماردن.
**نبع:** هەڵقولان، سەرچاوەگرتن.
**نبوت:** (نَ.وَ) 1) کول بوونی شمشێر. 2) کزبوونی چاو. 3) ناحەزبوونی لە ڕادەبەدەری چڕوچاو. 4) بێزلێهاتن و قبووڵ نەکردن.
**نبوّت:** (نُ.بُ.وَ) 1) پێغەمبەری، پەیامبەرێتی. 2) پێشبین، نوقلانەلێدان.
**نبود:** نەبوون.
**نبوغ:** 1) بلیمەتی، هەڵکەفتن، هلکەڤتن، کەم وێنە بوون. 2) دەرکەوتن، دیارکەوتن.
**نبوغ آمیز:** بلیمەتانە.
**نبهره:** 1) بێبەر، بێبەش، بێپشك. 2) قەلب، زەغەڵ، زڕ. 3) پەست، نزم. 4) نهێنی، شاراوە. 5) کتوپڕ، بەخەبەر.
**نبیّ:** پەیامبەر، پێغمبەر.
**نبید:** شەڕاب، مەی.
**نبیسنده:** نووسەر.
**نبیل:** خەڵکی نەجیب و بەئابڕوو. وریا، زیرەك.
**نبیه:** شەریف، زیرەك، زانا و ئاگا.
**نپری:** (بیرکاری) لۆگاریتم.
**نپسندیدن:** خوزیان، پەسندنەکردن، هەڵنەبژاردن، قبووڵ نەکردن، نەپەرژاندن، بەدڵ نەبوون.
**نتایج:** کۆی "نتیجە".
**نت برداری:** یاداشت هەڵگرتنەوە.
**نت خوانی:** توانایی خوێندنەوەی نۆتە.
**نترس:** بوێر، ئازا، دلێر، بەجەرگ، گەڕناس، دەم سوور، نەترس.

**نترسیدن:** وێران، وێرین، نەترسان، نەترسین.

**نتروفیل:** (پزیشکی) نۆترۆفیل، خرۆکە هاوتاکان.

**نتیجتاً:** لەئاکامدا، سەرەنجام.

**نتیجه:** 1) سۆخی، ئاکام، دەرەنجام، ئەنجام، دۆنگی، هافل. 2) نمرەی تاقیکاری. 3) منالّی نەوە. "**به نتیجه رسیدن**": بەئاکام گەیشتن، هەبوونی ئاکامی بەکەڵك."**درنتیجه/بالنتیجه**": سۆخین، لە ئاکامدا. "**در نتیجهء**": بەهۆی، لە ئاکامی.

**نتیجه بخش:** بەبەر یان بەرهەمی دڵخواز.

**نتیجەگیری:** ئاکام بەندی، ئاکام لێوەرگرتن.

**نثار:** 1) خۆکردنە قوربانی، خوێن دان. 2) دیاری، پێشکەشی. 3) بەخشین، پێشکەش کردن، دانان. 4) ئەوەی لە زەماوەنددا بەسەر بووك و زاوایدا هەڵدەخەنەوە. "**نثارآوردن**": دیاری هێنان، دیاری پێشکەش کردن. "**نثار افشاندن**": شاباش کردن. "**نثارکردن**": 1) بڵاوکردنەوە، پرژاندن، هەڵاویشتن. 2) خۆکردنە قوربانی، گیاندان، خوێندان. 3) پێشکەشکردن. 4) دیاریدان.

**نثاران:** بڵاوکردنەوە و پرژاندنی شتێ.

**نثر:** 1) بڵاو، بەلاڤ، پرژوبڵاو. 2) پرژوبڵاوبوون، لێك بڵاوبوون. 3) پەخشان، پێچەوانەی هۆنراوە. "**نثر مزیّن**": پەخشانی ڕازاوە. "**نثر مقفا**": پەخشانی هاوسەروا/ سەروادار. "**نثرموزون**": پەخشانی کێشدار.

**نثیر:** پرژوبڵاو، کەرت و پەرت.

**نجابت:** ڕەسەن بوون، ڕەسەنایەتی، مەزن و بەڕێزبوون. داوێن پاکی.

**نجات بخش:** ڕزگاریدەر، ئازادکەر.

**نجات دادن( بخشیدن ):** پەڕاندنەوە، ڕزگارکردن، قوتارکردن، دەربازکردن.

**نجات یافتن:** ڕزگاربوون، قوتاربوون، دەربازبوون، فلتین، پەڕینەوە. "**نجات یافته**": ڕزگاربوو، قوتاربوو.

**نجاح:** 1) سەرکەوتن، سەرکەڤتن. 2) ڕزگاری.

**نجّار:** دارتاش.

**نجاست:** گڵاوی، پیسی، ناپاکی، نەپاقژی.

**نجدت:** 1) ئازایەتی، دلێری، جوامێری. 2) یاریدە، کۆمەگ.

**نجس:** گڵاو، ناپاك، سپلۆت، سپلۆتی، سپلۆك، سەنم، تەرێف، پیس. "**نجس شدن**": گڵاوبوون، سەنمین. "**نجس کردن**": گڵاوکردن، سەنماندن.

**نجوا:** 1) پسکەپسك، سرتەسرت، پچەپچ. 2) ڕازی نێوان دووکەس.

**نجوش:** کەسێ کە تێکەڵی خەڵکی نابێ ، "ئانتی سۆسیال".





**نجیب:** 1) بەشەرەف. 2) داوێن پاك. 3) ڕەسەن، جسن. 4) کەحلان، کەحێل (بۆ ئەسپ و وشتر و هتد).

**نجیب خانه:** (تەنز) بڕوانە: "فاحشەخانە".

**نجیب زاده:** پسمیران، بنەچەدار، رەهێشتە، ئەسڵزادە، نەجیم زادە، خانەدان.

**نچیز:** کەم، بێبایەخ.

**نحات:** کۆی"ناحی".

**نحافت:** کزی، لەڕی، لاوازی.

**نحر:** قورگ بڕین، کوشتنەوەی وشتر. قوربانیکردن.

**نحریر:** ئاوەزمەند، مەژوودار.

**نحس:** 1) بێفەڕ، سەرکڕنیك، شووم، جووت قۆشە، جووت مۆر، کابرەش، پێڕەش، قەدەم شەڕ، قەشقە، بەدودم، قدۆش، کەفارەتی، کەفارەتدار، سمسك، نەفەس پیس، چاوپیس. 2) خراو، ناجۆر، ئازاردەر. 3) بەدفەڕ، بیانووگر.

**نحله:** (نِ.لَ) 1) ڕێباز، مەرام، ڕێبەر. 2) بەخشینی ماڵ و سامانێ کە ڕاناگوێزرێ. 3) دانی مارەیی.

**نحو:** 1) وەك، وێنە، ئاراستە، ڕێگە، شێواز، چەشن. 2) ڕێزمان، سێنتاکس. "**نحوِ**": نزیك بە. "**به نحو احسن**": بە باشترین شێوە. "**به نحوی از انحا**": بەشێوەیەك لە شێوەکان، بە جۆرێ لە جۆرەکان.

**نحوس:** کۆی"نحس".

**نحوست:** شوومی، بێفەڕی، پێڕەشی.

**نحول:** کزی، لەڕی، لاوازی.

**نحوه:** 1) شێواز، شێوە. 2) چۆنیەتی.

**نحوی:** کەسێ کە زانستی ڕێزمان دەزانێ، شارەزا لە ڕێزماندا.

**نحیف:** کزولاواز، لەڕ و ڕەقەڵە، زەردەڵە، رەق و حشك.

**نخّاس:** 1) کۆیلەفرۆش. 2) بازاڕی کۆیلەفرۆشان.

**نخاله:** 1) سەربێژنگ، سیڤۆی، سۆس، پاژینە، کرپك، کەپەك، کیرپك، زبرە، سەرهێڵەك، درشتەی لە هێڵەك دراو، کەپەکی ئارد. 2) ناحەز، ناقۆڵا. 3) بێ ئەدەب و بێ شەرم.

**نخبه:** 1) بژاردە، هەڵبژاردە، دەستەبژێر، سەرتا، سەرتڵ، سەرگەڵا، سەرچن، سەرگوڵ، سەربەلك، سەربەنگ، هەرەباش، ellite . 2) زانا، بیرتیژ، زیرەك. "**نخبەگرا**": ئێلیتیست، بژاردەخواز. "**نخبەگرایی**": ئێلیتیزم.

**نخجل:** بڕوانە:"نشگون".

**نخجیر:** نچیر، نێچیر، ئەوەی بە ڕاو دەگیرێ. "**نخجیرکردن**": ڕاوکردن.

**نخجیربان:** ڕاوکەر، نێچیرڤان. "نخجیر پرداز" و "نخجیردار" و "نخجیرزن" و "نخجیرگان" و "نخجیرگر" و "نخجیرگیر" و "نخجیروان"یش هەر بەم مانایەن.

**نخجیرگاه:** نێچیرگا، نێچیرگەه، ڕاوگە.

**نخجیروال:** کەسێك کە ئاژەڵە ڕاوییەکان بۆ ڕاوگە ڕاو دەونێ.

**نخجیل:** بڕوانە: "نخجل".

**نخراز:** سەرگەلە، سەرجەلە، پێشڕۆ، ڕەمکێش، پێشەنگی مێگەلەمەڕ.

**نخراشیده:** 1) ناخۆش(دەنگ). 2) ناحەز، ناقۆڵا. 3) باهۆدار و بەدقەوارە.

**نخری/ نخیری:** یەکەمین منداڵ، نۆبەرە.

**نخست:** یەکەم، هەوەڵ. "**از نخست**": لەهەوەڵەوە، لەسەرەتاوە.

**نخست وزیر:** سەرەك وەزیر، سەرۆکی دەوڵەت، سەرۆك شالیار.

**نخستین:** یەکەمین، هەوەڵین، ئێکمین. "**نخستین که**": هەرکە، کاتێ کە.

**نخستینه:** 1) یەکەمین. 2) ئەوەی بۆ یەکەمین جار وەدیهاتوە.

**نخستینیان:** پێشینیان، پێشوونان، وەرینان.

**نخل آرا:** باخەوان.

**نخ نما:** بڕوانە: "مندرس".

**نخوار:** (نَ) بە شکڵی دەزوو.

**نخوار:** (نِ) ترسەنۆك. بێهێز. لەخۆبایی.

**نخوّت:** 1) بەخۆفشین، بەخۆنازین. 2) فیز، لووت بەرزی، خۆهەڵکێشان، بەخۆداهەڵکوتن، گەورەیی، پایەبەرزی، شکۆمەندی.

**نخور:** قڕنیس، بەغیل.

**نخورد نداشتن:** 1) پێکرانی حەتمی. 2) مسۆگەربوون.

**نخەکردن:** مووی دەمووچاو هەڵگرتن(بە دەزوو).

**نخیز:** بڕوانە: "کمین گاه".

**ندا:** دەنگی بەرز، بانگ. "**ندا( در)دادن**": خەبەرکردن، ڕاگەیاندن. 2) وتنی شتێ بە دەنگی بەرز. "**ندا زدن**": بڕوانە: "نداکردن". "**نداکردن**": بانگ کردن، جاڕدان، جاڕکێشان.

**ندار:** 1) هەژار، دەسکورت. 2) بڕوانە: "صمیمی". "**با کسی ندار بودن**": دەگەڵ ئەو گەرموگوڕبوون.

**نداشت:** هەژاری، نەداری، دەسکورتی.

**ندّاف:** هەللاج، کەسێ کە بە کوتك و کەوان خوری شیدەکاتەوە.

**ندامت:** پەشیمانی، پەشیمان بوون، پەژیوانی، پۆشمانی. "**ندامت خوردن( آوردن، بردن، کردن، کشیدن )**": پەشیمان بوونەوە. "**ندامت رفتن**": هەست بە پەشیمانیبوونەوە کران.

**ندامت زده:** پەشیمان، پەژیوان.

**ندامتگا:** بەندیخانە.

**ندانسته:** 1) نەزانستە. 2) لەڕووی بێ ئاگایی و بێ خەبەرییەوە. 3) پێ نەزانیو.

**ندانم کار:** نەزانمکار، زانای خۆگێل کەر.

**نداوت:** 1) تەڕبوون، شێداربوون. 2) تورت و تێراوبوون، تەڕ و تازە بوون.





**ندبه:** 1) شیوەن و شەپۆڕ، گریان و ڕۆڕۆ بۆ مردوو و باسکردنی سفەتە باشەکانی. 2) شکایەت، گلەیی.

**ندرت:** دەگمەن، بەکەمی، هەڵکەوت، هەڵکەفت. "**ندرت داشتن**": دەگمەن بوون، کەم وێنەبوون. "**برسبیل ندرت**": بەدەگمەن، بەهەڵکەوت، جاروبار.

**ندره:** دەگمەن و سەرسووڕهێنەر.

**ندید:** 1) هاوتا، وێنە، وەك. 2) نەبینە، نەدیتە، نەدیو. "**ندید گرفتن**": دەبەرچاونەگرتن، چاوپۆشی کردن.

**ندیدبدید:** نەدیبدی، نەدیوبدیو، تازەپێداکەوتوی زۆر ماڵ خۆشەویست.

**ندیده:** 1) ئەو کەسەی تا ئێستا لە نزیکەوە چاویان پێنەکەوتوە. 2) نەدیتراو. 3) نەناسراو و نادیار. 4) نەدیو، نەدیتە.

**ندیم:** هاودەم، هاونشین، ئامپیاڵە.

**نذر:** (نَ) لەخۆگرتن، فوتو، نزر، نەزر، بڕیاردان بە مەرجێ کار پێك بێ خێرێ بکا. "**نذر بستن**": بڕوانە: "شرط بستن". "**نذر داشتن**": نەزرکردن، خۆ دەروەست کردن بۆ ئەنجامدانی کارێك یان دانی شتێك.

**نذر:** (نُ.ذُ) ترساندن، بزداندن. ترس وخۆف.

**نذری:** 1) نەزری. 2) خۆڕایی، بەلاش، مفتێ.

**نذیر:** بەئاگاهێن، ورياکەرەوە، ئاگەهدارکەر.

**نر:** 1) نێر، پێچەوانەی مێ. 2) بەهێز، بەقەوەت. 3) ئەندامی جووت بوونی ڕەگەزی نێر. 4) کامڵ.

**نراك:** هەمیشە، بەردەوام.

**نرباز:** نێرباز.

**نرخ:** 1) نرخ، بایی، بەها، بهێ. 2) رادەی گۆڕان (چوونەسەر یان دابەزین)ی شتێك لە ماوەی زەمان دا، رەوت. "**نرخ بالاکردن**": 1) قیمەت زیادکردن، بردنەسەری نرخ. "**نرخ بستن**": نرخ دیاریکردن. "**نرخ تسعیر**": نرخی ئاڵوگۆڕی دوو دراو. "**نرخ تنزیل**": نرخێ کە قازانج یان خەرجەکانی داهاتوو بەپێی ئەو دادەشکێ. "**نرخ چیزی شکستن**": 1) قیمەت شکان، نرخ شکان. 2) لە نرخ و بایەخی ئەو کەمبوونەوە. "**نرخ روز**": 1) نرخی ڕۆژ. 2) نرخی عادڵانە. "**نرخ نهادن**": نرخ دیاریکردن.

**نرخ بردار:** ئەوەی ماڵیات دەیگرێتەوە یان مەحکووم بەدانی ماڵیاتە.

**نرخ بندی:** نرخ دیاریکردن، نرخ بۆدانان، نرخ بەندی.

**نرخ گذاری:** بڕوانە: "نرخ بندی".

**نرد:** تەختەنەرد، تاوڵە. "**نردباختن**": 1) کایەکردن. 2) تەختە (نەرد) کردن. "**نرد چیزی ( کاری ) باختن**":

خەریکی ئەو بوون. **"نرد راست نیامدن"**: بۆ نەهاتن، دروست جێبەجێ نەبوونی کارێ. **"نرد را کژ باختن"**: ئەنجامدانی کاری نابەجێ و نادروست.

**نردبان:** ناردیوان، پەیژە، پەیجە، پەینجە. **"نردبان بر (به) راه افکندن (نهادن)"**: قسەکردن لە درێژایی ڕێگەدا تا ڕێگەکە کورت بێتەبەرچاو. **"نردبان دزدها"**: بریتی لە کەسی بالابەرز.

**نرس:** بڕوانە:"پرستار".

**نرسیده:** 1) نەگەیو، کال. 2) نەگەیشتو.

**نرگدا:** 1) بڕوانە:"خسیس". 2) سوالکەری یال و کۆپال دار و بێ شەرم.

**نرم:** (نَ) 1) نەرم، پێچەوانەی زبر. 2) ناسک، نەرمونیان. 3) هێواش، ئارام. 4) بەئەسپایی، بەئارامی. 5) ئاسان، سانا. 6) کەم تین. **"نرم شدن"**: 1) نەرم بوون(هوە)، نەرمژین، هووربوون، لە ڕەقی تەکینەوە. 2) ڕازیبوون، ملدان، تەسلیم بوون. 3) وردبوون و وەک ئارد لێهاتن. 3) ڕەوان بوون، لە قەبزی ڕزگاربوون. 5) دانەوین(مل). **"نرم نرم"**: 1) هێدی هێدی، سەبرە سەبرە. 2) بەئەسپایی، بەئارامی. 3) بە نەرمی. **"بسیار نرم"**: نەرمیچانک، نەرمژی، هلهول، فرە نەرم لە دەستان. **"زمین هموار و نرم"**: نەرمان، زەوی بێ بەرد و لە کێلان خۆش، شلۆملۆ، پێچەوانەی بەردەلان.

**نرم:** (ن) نۆرم، ئاستی ئاسایی شتێ یان ئاستی دلخواز، پێوەر.

**نرم آهنی:** داماوی، نەتوانین.

**نرما:** نەرمی.

**نرمادگی:** نەنێرنەمێوی، دوو ڕەگەزی بوون، نێرەمووک.

**نرم افزار:** نەرم ئامێر.

**نرمال:** نۆرمال، ئاسایی، بەپێی ڕێسا، بەشێوازی دیاریکراو.

**نرمایه:** نەنێرنەمێو.

**نرم بالگان:** لە زاراوەی بوونەوەرناسیدا: ئەو ماسییانەی بالی نەرمییان هەیە.

**نرم بر:** (نَ.بُ) بڕوانە:"حیلەگر".

**نرم بروت:** بڕوانە:"مخنث".

**نرم چشم:** بێشەرم، بێحەیا.

**نرم خو:** خۆش ئەخلاق، دلۆڤان.

**نرم دست:** فرز، بەدەست وبرد، لێزان.

**نرم زبان:** زمان نەرم، خاوەنی گوتای نەرم و دلگر.

**نرم سم:** ڕام، دەستەمۆ، مالی، کەوی.

**نرمش:** نەرمکێشی، مدارا، سازگاری.

**نرم شانه:** بریتی لە کەسی کەم وزە و توان، کەم هێز، خاکەڕا و ملکەچ.

**نرم شمشیر:** سست، داماو.

**نرمك:** بەئەسپایی، بە ئارامی. **"نرمك نرمك"**: هێدی هێدی، هێواش هێواش.

**نرم گردن:** بریتی لە ملکەچ و گەردن کەچ.

**نرم گو(ی):** زمان نەرم، نەرم وێژ.





**نرم گونه:** نەرم و خۆش خولق.

**نرم نرمك:** هێدی هێدی، ئارام ئارام.

**نرمه:** 1) هەر شتێکی نەرم و شل، نەرمە. 2) شلکەی گوێ. 3) ئارام، هێدی.

**نرمی:** 1) نەرمی، نەرمایی، شلکی، پێچەوانەی ڕەقی. 2) دلۆڤانی، خۆش ڕەفتاری. 3) ئارامی، ئەسپایی. 4) ئاسانی، سانایی.

**نرو:** بەدفەڕ، نەحەواوە، ناسازگار.

**نری:** 1) نێری، نێربوون. 2) هێلکەگون. 3) پیاوەتی، ئازایەتی. **"نری کسی ریختن"**: نەمانی وزەی سێکسی ئەو(پیاو).

**نریمان:** نێر سروشت، دلێر، پالەوان.

**نرینه:** نێرینە، لە ڕەگەزی نێر.

**نزا:** بڕوانە:"نازا".

**نزار:** 1) کز، لاواز، لەڕ، ڕەقەلە. 2) بێ هێز، بێتاقەت، بێتوان. 3) دەردەدار، لەش بەبار. 4) کەم، کەمەکێ. 5) ڕەنگ و ڕوو پەڕیو، زەردهەلگەڕاو. 6) بێ چەوری. **"نزارکردن"**: کزکردن، لاوازکردن.

**نزاع:** 1) تێکهەلچوون، پێکدادان، دەستەویەخەبوون، دەگژیەك ڕاچوون. 2) مقۆمقۆ، شەڕ ومشتومڕکردن، گفتوگۆ و کێشمەکێش. 3) بڕوانە:"اشتیاق". **"نزاع زنان"**: چنگەپرچە، چنگەپۆپان. **"نزاع شدن"**: دوژمنایەتی سازبوون، شەڕسازبوون. **"نزاع لفظی"**: شەڕەچەقە، شەڕەدندوکە، جڕاجڕ، دەمبەدەمە، دمبەدمە، دەمەقرە، شەڕەمشەرعێنە.

**نزاع جویی:** شەڕانی بوون، شەڕاشۆیی، جینگنی.

**نزاکت:** 1) هەلسوکەوتی تێکەل بە ئەدەب و ئەخلاق، ئاکارباشی، ڕەچاوکردن یان پاراستنی دابونەریت. 2) ناسکی. 3) ڕازاوەیی، جوانی.

**نزاکت طلبی:** ڕەچاوکردنی ئەدەب و نەریت.

**نزاکت مآب:** بەئەدەب، لەسەرەخۆ.

**نزال:** دابەزین لە گۆڕەپانی شەڕ دا بۆ شەڕکردن.

**نزاهت:** 1) پاکێتی، خاوێنی، بێگەردی، داوێن پاکی. 2) جوانی و ناسکی.

**نزد:** 1) نزیك، کن، نك، لەلا، لا، بال، تەك، جم، دەف، هاف، هەتەك. 2) لەلای، لەکن. 3) بۆلای. 4) لە بەرامبەر، لە بەراورد دەگەل. 5) نزیکەی. **"از نزد"**: لەلایەن.

**نزده رقصیدن:** چاوەڕوانی بڕوبیانوو نەبوون و ئەنجامدانی کارێك.

**نزدیك:** تخون، نزیك، نێزیك، نزینگ، نەدوور. بە مانای خزم و هاوسێش هاتووە. **"نزدیك بودن امری"**: ئەگەری ڕوودانی ئەو. **"نزدیك شدن"**: هاتنەبەرەوە، هاتنەبەر، هاتنەلا، هاتنەپێش، گەیشتن، قەرەکەوتن، تخوون کەوتن، نزیك کەوتنەوە، نزیك بوون/بوونەوە،

کوشبوون، نەمانی دووری لە ناودا. "**از نزدیك**": لەنزیکەوە، بەباشی، بەتەواوی.

**نزدیك بین:** نزیك بین، کەسێك کە بە هۆی کزبوونی چاوەوە نەتوانێ دوور بە باشی ببینێ.

**نزدیکی:** 1) نزیك بوون. 2) نزیك بوونەوە و تێکەڵی. 3) هەبوونی پێوەندیی سێکسی دەگەڵ کەسێك. 4) نزیك بوون، هەبونی پێوەندیی دۆستانە. 5) دەوروبەر. "**نزدیکی بە شبهە**": ئیلاقەکردن بەبێ هەبوونی پەیمانی ژن و مێردایەتی یان بەبێ ئاگاداربوون لە یاساغ بوونی نزیکایەتی لێکردن. "**نزدیکی جستن**": نزیك بوونەوە، خوازیاری پێوەندیی دۆستایەتی بوون. "**نزدیکی کردن**": هاونوێن بوون، ئەنجامدانی کردەی سێکسی. "**نزدیکی ها**": دەوروبەر، دەوروپشت.

**نزع:** 1) هەڵکەندنی شتێك لە جێیەك. 2) گیان دان، گیان دەرچوون. "**حالت نزع**": گیانەڵا، گیانەڵاو، ئاویلکەدان، ئاوەزینگ، سەرەمەرگ، نختکاپەیەنێ. "**نزع السلاح**": چەك داماڵین. "**نزع کردن**": جیاکردنەوە.

**نزف:** هەڵێنجانی ئاو تا بیرەکە وشك دەبێ. گرتنی خوێن لە لەش. "**نزف الدم**": خوێن پژان(خوێن بەربوون) لە لووت یان دەمار.

**نزل:** (نُ) 1) ئەوەی بۆ میوانی دادەنێن. 2) دیاری، پێشکەشی. 3) داهات، بەرهەم. 4) ڕسق، ڕۆزی.

**نزول:** 1) دابەزین، هاتنەخوارەو، داکەتن. 2) ناردران، نێردران. 3) بارین (نزول برف). 4) کەمبوونەوە، دابەزین. 5) سووتی پارە. 6) ڕوودان، پێشهاتن. 7) هاتنەناوەوە، چوونەناوەوە. "**نزول اجلال**": هاتنەناوەوەی کەس یان کەسانی مەزن بۆ جێیەك. "**نزول پیداکردن**": پلە یان پۆست دابەزین. "**نزول خوردن**": خواردنی سووتی پارە. "**نزول کردن**": 1) دابەزین، هاتنەخوار. 2) ناردران. 3) کەمبوونەوە. 4) قەرزکردن بەدانی سووت. 5) هاتنەناوەوەی شوێنێ. 6) ڕەخنەکردن، دزەکردن. "**نزول گرفتن**": بەقەرزوەرگرتنی پارە لە کەسێك بە دانی سووت بەو.

**نزول خوار:** سووتخۆر، سەڵەفخۆر.

**نزولی:** ڕوو لە دابەزین.

**نزە:** پاك، پاقژ، داوێن پاك.

**نزهت:** 1) پاکی، پاکێتی، داوێن پاکی. 2) خۆشحاڵی، شادمانی. 3) گەشت و سەیران.

**نزهتگاە:** سەیرانگا.

**نزیدن:** کێشان. هەڵکێشان، هەڵێنجان، دەرکێشان.

**نزیف:** خوێن بەربوون.

**نژاد:** تۆرەمە، رەچەڵەك، ڕەچەڵاك، ڕەگەز، بنەچە، بنچینە، بنەچەکە، تروم، ڕەسەن، ڕەتەوە، نەژاد، خیم، سۆلان، ئاسەوار.





**نژادپرست:** ڕەگەزپەرست، ئەوەی کە بڕوای بە سیاسەتی هەڵاواردنی نەژادی هەیە.

**نژاد شناس:** تۆرەمەناس، ڕەچەڵەك ناس.

**نژادکشی:** نەژادکوژی، نەسڵ کوژی.

**نژادگرایی:** بڕوامەند بە سیاسەتی هەڵاواردنی نەژادی، ڕاسیسم.

**نژادە:** 1) ڕەسەن، جسن. 2) لە ڕەچەڵەکی باش.

**نژغار:** هەرا، گوڕە، نەڕە.

**نژند:** خەمبار، خەمناك، ناشاد، ناڕەحەت. 2) ناحەز، قێزەون. 3) نیگەران. 4) نزم. 5) ژاکاو، سیسیاگ. 6) ڕق هەستاو، تووڕە. 7) کز، لەڕ. 8) ناهاوڕا، ناسازگار. 9) شەرمەزار. 10) تاریك، لێڵ. "**نژند داشتن**": خەمبارکردن.

**نژنداختر:** بەدبەخت، ڕۆژڕەش.

**نژیدن:** بڕوانە: "نزیدن".

**نسابت:** نزیکی، خزمایەتی.

**نسّاج:** بڕوانە: "بافندە".

**نساجی:** بڕوانە: "بافندگی".

**نساز:** نەحەواوە، هەڵنەکەر، ناسازگار.

**نسب:** 1) ناوپشتە، ڕەچەڵەك، ڕەگەز. 2) خزمایەتی، خێشایەتی. 3) ژن، هاوسەر. "**نسب از کسی داشتن**": سەربەو بوون، خزمی ئەو بوون. "**نسب شناس**": ڕەچەڵەکناس. "**نسب شناختی**": ڕەچەڵەکناسانە. "**نسب کردن**": ڕەپاڵدان، ڕەگەڵ خستن.

**نسبت:** 1) ڕێژە، ڕادە، لەچاو، ل چاڤ. 2) خزمایەتی، پێوەندی. 3) سەبارەت، دەرهەق. 4) ڕەپاڵ، دووکەوتوویی، ڕەگەڵکەوتوویی. 5) وێکچوون، هاواهەنگی. "**نسبت بستن**": بڕوانە: "نسبت دادن". "**نسبت بە**": 1) سەبارەت بە، لەمەڕ. 2) لە بەراورد دەگەڵ. "**نسبت دادن**": ڕەپاڵدان، وەپاڵ دان، ڕەگەڵ خستن، پێوەخستن، خستنەگەڵ، خستنەپاڵ، خرانەپاڵ. "**نسبت داشتن**": 1) پێوەندیی هەبوون. 2) هەبوونی پێوەندیی خزمایەتی. 3) بۆ بەراوردبوون شیان، هاوئاهەنگ بوون، لێکچوون. "**نسبت سببی**": خزمایەتی لە ڕێگەی هاوسەرگیرییەوە. "**نسبت کردن**": 1) بڕوانە: "نسبت دادن". 2) ڕەپاڵدان یان گومانبارکردنی کەسێك بە سفەتێ. 3) بەراوردکردن، هەڵسەنگاندن. "**نسبت نیست**": دروست نیە. "**بە نسبت**": 1) ڕێژەیی. 2) بەشێوەی ڕێژەیی. 3) لەبنچینەڕا. 4) لە بەراورد دەگەڵ. "**پسوند نسبت**": پاشگری پاڵشت/ پاڵوێدان.

**نسبتاً:** تاڕادەیەك.

**نسب نامە:** بڕوانە: "شجرەنامە".

**نسبە:** بڕوانە: "نسبت". "**بە نسبە**": بڕوانە: "نسبتاً".

**نسبی:** 1) ڕێژەیی. 2) هەبوونی پێوەندی خزمایەتی لەڕێگەی ئابا و ئەژدادییەوە.

**نسبیّت:** ڕێژەییبوون.

**نسبیّت گرایی:** ڕێژەیی خوازی.

**نستوه:** کۆڵنەدەر، نەبەز، بەگیرگە، ماندوویینەناس، دەس هەڵنەگر.

**نسج:** چنراوەکان، شانەکان، تەیمانەکان.

**نسج شناسی:** بڕوانە:"بافت شناسی".

**نسخ کردن:** هەڵوەشاندنەوە، پووچکردنەوە، کوێرکردنەوە، ڕەتکردنەوە.

**نسخه:** 1) نووسراوە، کۆپی، لەبەرگیراوە، "وێرژێن". 2) تیراژ، دانە. 3) سیایی، فاکتۆر. 4) نموونە یان نموونەی هەرەباش لەهەر شتێك. "**نسخەبرداشتن**": لەبەرنووسینەوە، ڕوونووسیکردن، کۆپیهەڵگرتنەوە. "**نسخەخطی**": دەستنووس، کتێو یان نامیلکەیەك کە بە دەست نووسرابێ. "**نسخەکردن**": 1) دیاریکردنی دەوا لە لایەن دوکتورەوە بۆ نەخۆش. 2) یاداشت کردن، نووسین. 3) ڕوونووس کردن. "**نسخە کسی را نوشتن**": هەوڵدان دژی ئەو، لەژێرەوە دژی ئەو کارکردن. "**نسخە دکتر**": ڕاچێتە، ڕەچەتە. "**برای کسی نسخە پیچیدن**": ڕاسپاردەی نابەجێ یان ناماقووڵ بەو کردن یان پێشنیارکردنی ڕێگەچارەی ناکردەیی بۆ کێشەکەی ئەو، ڕێگە و هێڵی نابەجێ بۆ کێشان.

**نسخەبردار:** کۆپیست، کۆپیهەڵگرەوە، لەبەرگرەوە، لەبەرهەڵگرەوە.

**نسخەبرداری:** دووبارە نووسینەوە، لاساکردنەوە لە نووسیندا، گوهاستۆ، لەبەر هەڵگرتنەوە، کۆپی هەڵگرتنەوە، کۆپیکردن، ڕوونووس کردن، ل بەر نقیساندن، ڕایشان.

**نسخە پردازی:** مۆنتاژکردن(کتێب و گۆوار و هتد).

**نسخەشناسی:** دیاریکردنی مێژینە و ڕەسەنایەتی و جۆری کاغز و جەوهەر و خەتی نووسراوە دەستنووسەکان.

**نسف:** 1) هەڵتەکاندنی بینا لە بناخەوە و وێران کردنی. 2) لە بێژنگ دانی دەخڵ و دان و پاك کردنەوەی.

**نسق:** (نَ.سَ) 1) شێوە. 2) تەکووزی و ڕێکوپێکی. 3) سزا، 4) دۆخ، حاڵ. "**نسق دادن**": ڕێکوپێك کردن، سەروبەرکرن. "**نسق شدن**": دامەزران، جێگیربوون. "**نسق کردن**": 1) تەمبێ کردن، سزادان. 2) ترساندن. "**نسق افتادن**": لە تەکووزی کەوتن، ناڕێکوپێك بوون. "**بر نسق**": وەك، وەکوو.

**نسل:** 1) وەچە، بەرە، بەرەباب، دەقڵ، نفش، ڕەژەڵاك، قنگەزە، چین. 2) بڕوانە: "زادوولد". 3) زان، بەرهەم هێنان. "**نسل در نسل**": پشتاوپشت، بەرە لە دووی بەرە، بابەڵباب. "**نسل پیوستن**": زاوزێ کران.

**نسل کشی:** وەچەکوژی، نەژادکوژی.





**نسنجیده:** نەهزراو، هەڵنەسەنگێنراو، گۆترەکاری، نەشیاو، ڕەمەکی.

**نسو:** نەرم و ساف و خز.

**نسی:** لەبیرکردن، لەبیرچوون، ژبیرچوون.

**نسیان:** لەبیرچوونەوە، بیرچونەوە، فەرامۆشی.

**نسیب:** 1) قسەگەلی ئاشقانە. 2) ڕەسەن، جسن. "**نسیب کردن**": غەزەڵ وتن.

**نسیج:** بڕوانە:"منسوج". "**نسیج وحد(وحده)**": بێ هاوتا، بێ وێنە.

**نسیم:** سور، سروە، سریوە، سر، شنە، شنەبا، شنۆ، شێنە، شیبا، سۆزە، نزە، نزەبا، کزەبا، بای بسکان، بای هێدی و فێنك. "**نسیم شبانه**": شەوبا، سروە لە شەو دا. "**نسیم غروب**": ماشەڵان. "**وزیدن نسیم**": شنیان، شنین، هەڵکردنی شنەبا.

**نسیمك:** 1) شنەبای زۆر ئارام. 2) بۆنی خۆش.

**نسیه:** قەرز، قەرزوقۆڵە. "**نسیەدادن (فروختن)**": قەرزدان، بە قەرز فرۆشتن.

**نشا:** چلاسك، شەتڵ، شتڵ، شتل، گیایەك کە هەڵدەقەنرێ و دەچێنرێتەوە. "**نشازدن**": شەتڵ چەقاندن، کانەنیا. "**نشاکردن**": شەتڵ چەقاندن، شەتڵ لێدان، کانەنیا.

**نشازار:** شەتڵجار، شتڵجاڕ، شەتلگە، شتل گەه، شێنە.

**نشاط:** 1) شادی، خۆشی، خۆشحاڵی. 2) مەیل، شەوق. 3) خۆش ڕابواردن، خۆشگوزەرانی. "**نشاط بخشیدن**": شادی و خۆشی خستنە دڵی کەسێکەوە. "**نشاط راندن**": شادیکردن. "**نشاط کردن**": شادمانیکردن، خەریکی کایە و سەمابوون. "**بە نشاط آوردن**": شادکردن، دڵخۆش کردن. "**بازیافتن نشاط**": گورگرتنەوە، گوربەستنەوە، بووژانەوە.

**نشاط آور:** شادی هێن.

**نشاط پرست:** بڕوانە:"عیاش".

**نشاط کاری:** خۆش ڕابواردن، خۆشگوزەرانی.

**نشاف:** شێتی، دێوانەیی.

**نشامندی:** نیشان، نیشانە.

**نشان:** 1) نیشان، نیشانە. 2) ئاسەوار، شوێن. 3) ئارم. 4) سێرەلێگرتن. 5) تایبەتمەندییە ڕواڵەتییەکانی کەسێ یان شتێ. 6) خاڵ، پەڵە. 7) ناوبانگ. 8) شوێنی ژیان، ناونیشان. 9) داغ. 10) بەڵگە، دەلیل. 11) یادگار. 12) خشڵ، خەمڵ. 13) جۆر، چەشن. 14) خەبەر، هەواڵ. 15) ڕوخسار. 16) دەستوور. 17) ناودار، بەناوبانگ. "**نشان آمدن از چیزی**": دەرکەوتنی دروستی ئەو، سەلمێنرانی ڕاستی ئەو. "**نشان بردن**": کەوتنەبەرەوە، کەوتنە پێشەوە. "**نشان بر یخ زدن**": لەناوبردن. "**نشان پی بر آب جستن**": کاری بێهوودە کردن. "**نشان تمثال**": نیشانەیەك کە وێنەی پاشای لەسەر

کێشراوەتەوە. "**نشان دادن**": 1) نیشان دان، شاندان، شانیدان، دەرخستن، ڕووکردن، خستنەبەرچاو، ڕانان، ڕایدان. 2) تێگەیاندن. 3) هەڵێنجران. 4) وەبەرچاوهاتن. 5) خەبەردان لە بوونی کەسێك لە شوێنێ. "**نشان داشتن از کسی**": بوونی تایبەتمەندییەکانی ئەو، وەك ئەو وابوون. "**نشان زدن**": 1) میدالٚ لە سینگ دان. 2) پێکان، لە ئامانج دان. 3) نیشانە لێدان. "**نشان شدن**": 1) دەرکەوتن. 2) ناوبانگ ڕۆیشتن، ناودەرکردن. "**نشان کردن**": 1) دەس نیشان کردن، نیشانەدانان. 2) دیاریکردن، نیشانەکردن. 3) نیشانەلێگرتن، سێرەلێگرتن. 4) مۆرکردن، واژۆکردن. "**نشان گذاردن**": نیشانەدانان، نیشان کردن.

**نشان انداز:** تیرهاوێژ، تفەنگاوێژ.

**نشان بازگو:** گیومە یان کاما.

**نشاندن:** 1) دانیشاندن، رونشتاندن. 2) پێوەکردن. 3) دامرکاندنەوە. 4) توشکردن، گیرۆدەکردن. 5) خانوو دانان. 6) کووژاندنەوەی ئاگر، تەمراندنا ئاگر. 7) سوارکردن. 8) تێخستن، تێڕۆکردن. 9) ئارام کردنەوە، سوکنایی پێدان، داسەکناندن. 10) نغرۆکردن. 11) لەسەر کار لابردن. 12) حەپس کردن، خستنە بەندیخانەوە.

**نشان کرده:** 1) دەزگیران، دەزگرتی. 2) نیشانەیەك کە بۆ دیاریکردنی سنوور دایاندەنا.

**نشان گاه:** 1) شوێنی نیشانەکراو. 2) ئاسەوار.

**نشانگر:** پیشانگەر، پیشاندەر.

**نشانه:** 1) نیشان، نیشانە. 2) نیشانەك، کێلك، ئامانج. 3) ئارم. 4) ناونیشان. 5) بڕوانە:"مصداق". 6) بەناوبانگ، ناڤدار. "**نشانه‌رفتن**": سێرەلێگرتن، نیشانەگرتن. "**نشانه‌زدن**": پێکان، لە نیشانەدان. "**نشانه‌کردن**": 1) نیشانەگرتن. 2) دیاریکردن، نیشانەکردن. "**نیشانه‌گذاشتن**": نیشانەدانان. "**نشانه گرفتن**": سێرە گرتن، نیشان گرتن، نیشانە گرتن، نیشان لێ گرتن، مشت لێگرتن، ئامانج بەدیکردن.

**نشانه‌شناسی:** نیشانەناسی، زانستی موتالای نیشانەکان و ماناکانیان.

**نشانه‌شناختی:** نیشانەناسانە.

**نشانه‌گاه:** شوێنی دیاریکراو، ژوانگە.

**نشانه‌گذاری:** 1) نیشانە دانان. 2) خاڵبەندی. "**نشانه‌گذاری راه**": چەخەر، نیشانەی ڕێگەوبان، کێلکا سەر ڕێکێ.

**نشانی:** 1) ناونیشان، ناوونیشان، ناڤ نیشان، ناونیشانە. 2) نیشانە. 3) دەلیل، بەڵگە. 4) وەسف. 5) شوێن، ئاسەوار.

**نشت کردن:** 1) ئاولێچوون، دەلاندن، دادان. 2) بڵاوبوونەوەی هەواڵێ.

**نشخوار:** کاوێژ، کاویچ، قاویچ، قاویش، کائین، کایی، وەکار، ژاو، کنشت.





**نشدنی:** مەحاڵ، ئەستەم.

**نشر:** 1) بڵاوکردنەوە، بلاڤ کرن، ڕاگەیاندن، راگەهاندن. 2) ناوەندی بڵاوکردنەوە، چاپەمەنی. 3) زیندووکردنەوەی مردووەکان لە قیامەت دا. 4) بڕوانە:"وزیدن". "**نشر اکاذب**": بڵاوکردنەوەی درۆودەلەسە بە نیازخراپییەوە. "**نشر دادن**": 1) بڵاوکردنەوە و بەهەموان ڕاگەیاندن. 2) برەوپێدان. "**نشر کردن**": 1) بڵاوکردنەوە. 2) ڕاگەیاندن. 3) برەوپێدان. 4) بڵاوبوونەوە. 5) کردنەوەی شتێ کە لوول دراوە. 6) وتنی شتێ کە داپۆشراوە یان سووکەئاماژەیەکی پێکراوە. "**نشر یافتن**": بڵاوبوونەوە یان دابەشینەوەی بەرهەمی چاپکراو. 2) برەوسەندن. "**یوم النشر**": ڕۆژی قیامەت.

**نشریه:** بڵاڤۆك، بڵاوکراوە.

**نشست:** 1) دانوستان، دانیشتن، رونشتن، کۆبوونەوە، کۆمبوون.2) نیشتن، نووشتن، داتەپین. 3) تێکەڵی، هاونشینی. 4) هاتوچۆ. 5) شێوەی دانیشتن. 6) دامەزران، جێگرتن. 7) خامۆشی. 8) بنکە، پێتەخت. 9) پۆست. 10) بڕوانە: "مجلس". 11) تەخت. "**نشست آوردن**": 1) نیشتەجێبوون. 2) مانەوە. 3) چوونە ژوورەوە، ئامادەبوون. 4) دانیشتن، ڕۆنیشتن. "**نشست داشتن**": 1) کۆبوونەوە هەبوون، دانیشتن هەبوون. 2) نیشتەجێبوون، دامەزران. 3) هاونشینی، تێکەڵی. 4) ئامادەبوون. "**نشست کردن**": 1) تێچەقین، تەپین، داتەپین، نەوی بوونی شتێ، نزم بوونا تشتەکێ. 2) جێگیربوون. 2) نیشتەجێبوون، جێگرتن. 3) هاتوچۆکردن. "**نشست و برخاست**": هاتوچۆ، تێکەڵی. هەڵسوکەوت.

**نشست جای:** بنکە، پێتەخت.

**نشستگاه:** 1) شوێنی دانیشتن. 2) کۆم. 3) سەکۆی تایبەتی دانیشتن. 4) کۆڕ، کۆڕگە. 5) پێتەخت.

**نشستن:** 1) دانیشتن، ڕۆنیشتن، ڕووی‌نیشتن، ڕۆنین، ڕوونین، ڕوونان، نیشتن، نستەن، نستەنە، نشتش، نشتن، نشتەنە، نیشتەی. 2) دامرکان، دامرکانەوە، نیشتنەوە. 3) نیشتەجێبوون. 4) هاتوچۆکردن، تێکەڵی. 5) جێگرتن، نەخش بەستن. 6) سەبرکردن. 7) سواربوون. 8) تێچەقین، داتەپین. 9) کەمبوونەوە. 10) خەریکی کارێك بوون. 11) نزیکایەتی‌کردنی ژنی سۆزانی دەگەڵ کڕیار. 12) دانیشتن لەسەر تەخت و پۆستێ. 13) تووشبوون، گیرۆدەبوون. 14) کرانەوە (لبش بە خندە نشست). 15) ڕەخنەکردن، دزەکردن. 16) داپۆشینی ڕووی شتێ. 17) دابەزین.

18) ژیان کردن. 19) بڕوانە: "خاموش شدن". 20) ڕاوەستان، مانەوە. 21) زاڵبوون. 22) نوقن بوون، نغرۆبوون. 23) خرتوخاڵ نیشتن. 24) دەست لە کار کێشانەوە. 25) ئارام و ئۆقرە گرتن، هەدادان. 26) دەست بە ئاو گەیاندن.

**نشستن گاه:** 1) شوێنی دانیشتن. 2) پۆست، پلەوپایە. 3) پێتەخت.

**نشگنج:** بڕوانە: "نشگون".

**نشگون:** خڕمووسک، قورینجان، هەڵ قورینجان، نقووچ، نقورچک، چڕنۆق، قورنج، قورینج، قورینجین، قورنچک، قورینچەک، قورنیسک، قولینجێ، قونجریک، قونچرک، نەقوس، نەقوسکی، کورچی، کورنیشک، کونجرک، کونجرکە، گفشک.

**نشلیدن:** چنگەکرێ و خۆهەڵواسین بە شتێکەوە.

**نشمە:** سۆزانی، ژنی بەدکارە.

**نشمیدن:** خۆش ڕابواردن.

**نشناخت:** نەناسین.

**نشناس:** نەناسراو. "**نشناس شدن**": نەناسراو مانەوە.

**نشنیدە:** نەبیستراو.

**نشو:** 1) ڕوان، هەڵدان. 2) مەست بوون. "**نشوونما**": گەشە، باڵا بلند بوون و بە خۆداهاتن، نەشونماکردن.

**نشوان:** مەست، سەرخۆش.

**نشور:** 1) ڕۆژە پەسلان، قیامەت. 2) زیندووبوونەوەی مردووەکان لە ڕۆژی پەسڵان.

**نشوز:** سەرپێچی و نەحەواوەیی ژن دەگەڵ مێردەکەی.

**نشوە:** 1) بۆنکردن، بێهن کرن. 2) مەستی، سەرخۆشی.

**نشیب:** 1) نشێو، نشیو، نشێف، نشوف، بەرەخوارە، لێژ، سەرنجە، سەربەرەژێر، سەربەرەوژێر. 2) نزم. 3) بەدبەختی، داماوی. 4) قووڵی، قووڵایی. 5) کۆم، قنگ. "**نشیب گرفتن**": بەرەو نزمی و تیاچوون چوون. "**نشیب و فراز**": 1) نشێو و هەوراز. 2) چاك و خراپ، سەختی و خۆشی.

**نشئت:** 1) سەرچاوە. 2) مەستی. "**نشئت گرفتن**": سەرهەڵدان، سەرچاوەگرتن، چاڤکانی گرتن.

**نشئگی:** 1) نەشەیی، نەشەبوون. 2) گیرایی.

**نشئەجات:** ماددە سڕکەرەکان.

**نشیط:** شاد، دڵخۆش.

**نشیم:** بڕوانە: "ماندگاە".

**نشیمن:** 1) دانیشتن. 2) شوێنی دانیشتن. 3) ماڵ، خانوو. 4) هێلانە. "**نشیمن کردن**": 1) جێگرتن، نیشتەجێبوون. 2) هێلانەکردن.

**نشیمند:** نیشتەجێ، دانیشتو.

**نشیمندی:** نیشتەجێبوون، جێگرتن.

**نشیمنگاە:** شوێنی دانیشتن، نشینگە، ڕونشتنگەهـ، ماڵ.





**نص:** دەق، تێکست. "**نص صریح**": دەقاودەق.

**نصارا:** پێڕەوانی ئایینی مەسیحی.

**نصایح:** کۆی "نصیحت".

**نصب شدن:** دانران. هەڵواسران، پێوەگیربوون، پێوەبەندبوون.

**نصب کردن:** 1) دانان، دیاریکردن. 2) دامەزراندن، هەڵدان، هڵدان. 3) داکوتان، ڕاست چەقاندن، هەڵواسین، پێڤەکرن.

**نصر:** 1) یارمەتی، هاریکاری. 2) هاریکار، هەڤکار، یارمەتیدەر.

**نصرانی:** بڕوانە: "مسیحی".

**نصرانیت:** بڕوانە: "مسیحیت".

**نصرت:** 1) یاریدە، کۆمەگ. 2) سەرکەوتن. "**نصرت دادن**": 1) یارمەتیدان. 2) بەسەردا زاڵکردن. "**نصرت کردن**": یاریدەدان، یارمەتیدان. "**نصرت کشیدن**": یارمەتی وەرگرتن. "**نصرت یافتن**": سەرکەوتن.

**نصف:** نیوە، نیڤ، نیڤی. "**نصف بیشتر**": زیاتر لە نیوە. "**نصف جان شدن**": نیوەگیان بوون، زۆر تووڕەبوون و خۆدۆڕاندن. "**نصف شب**": نیوە شەو. "**نصف نصف**": نیوەنیوە.

**نصفە:** 1) نیوە. 2) ناتەواو.

**نصفەکارە:** ناتەواو، نیوەچڵ.

**نصفی زدن:** شەڕاب خواردن.

**نصوح:** 1) بڕوانە: "ناصح". 2) دۆستی ڕاست و بێگەرد. "**توبەنصوح**": تۆبەی یەکجارەکی.

**نصوص:** کۆی "نص".

**نصیب:** 1) بەش، پشك، نسیب. 2) بەشی هەرکەس لە چارەنووس. "**نصیب آمدن**": وەدەست هاتن. "**نصیب افتادن**": بەقسمەت بوون، بەنسیب بوون. "**نصیب برداشتن**": بڕوانە: "نصیب بردن". "**نصیب بردن**": بەهرەمەندبوون، بەهرەوەرگرتن، پێبڕان. "**نصیب داشتن**": بەش هەبوون. "**نصیب رساندن**": بەهرەمەندکردن، بەش پێدان. "**نصیب کردن (دادن)**": بەهرەمەندکردن، بەنسیب کردن. "**نصیب کسی شدن**": بەرکەوتن، وەبەرکەوتن، پێ بڕان، بەش پێ گەیشتن، پار پێگەهشتن، بەنسیب بوون. "**نصیب و قسمت**": چارەنووس. "**نصیب یافتن**": بڕوانە: "نصیب بردن".

**نصیح:** بڕوانە: "ناصح".

**نصیحت:** 1) ئامۆچیاری، ئامۆژگاری، ئامۆژیاری. 2) خێرخوازی، چاکەی خەڵکانیدی ویستن.

**نصیحت آموز:** ئامۆژگاریدەر، ڕێنوێن.

**نصیحت پذیر:** ئامۆژگاری وەرگر.

**نصیر:** یارمەتیدەر، هاریکار.

**نضارت:** 1) تەڕوتازەییوپڕئاوی، تورت و تێراوی و بەگەشەیی. 2) برەو.

**نضج:** گەیین، پێگەیشتن. "**نضج پذیرفتن(یافتن)**": پوختەبوون و پێگەیشتن.

**نطّاق:** دم گەرم، دەم گەرم، دەڤ گەرم، قسەڕەوان، وتاربێژی چاك، لە وتندا خێرا.

**نطربوق:** هەڵەگەڕ، بێکارە.

**نطفه:** 1) ئاوی پاك و ڕوون. 2) "ئێسپرێم"، تۆو، تۆ، تۆم. 3) گەرا. "**نطفەبستن**": 1) مەیینی تۆم. 2) وەدیهاتن. ""**نطفەستدن**": بڕوانە: "نطفە گرفتن". "**نطفە گرفتن**": تۆم وەرگرتن و ئاوس بوون. "**در نطفە خفە کردن**": سەرکوت کردن لەسەرەتای سەرهەڵدانەوە.

**نطق:** (نُ) ئاخاوتن، دوان، ئاخێوەری. "**نطق بربستن**": مردن. "**نطق تهیجی**": لێدوانی وروژێنەر(انە). "**نطق زدن**": قسەکردن، ئاخاوتن. "**نطق فروبستن**": ئیمکانی قسەکردن نەبوون. "**نطق کردن**": 1) وتاردان، ئاخێوەریکردن. 2) قسەکردنی زیاتر لەئەندازە. "**نطق کسی باز شدن**": وەقسەهاتن، دەست بە قسە کردن. "**نطق کسی کور شدن**": متەق لێوەنەهاتن، قسەنەکردن، بێدەنگ بوون.

**نطق سرا:** بڕوانە: "سخنگو".

**نظائر:** کۆی "نظیرە".

**نظّار:** (نُ) کۆی "ناظر".

**نظارت:** چاوەدێری، چاویاری، چاوێری، چاڤدان، چاڤدێری، ئاگاداری، ئاگالێبوون، بەردایین، سەرپەرشتی، کۆنترۆڵ.

**نظّارگان:** کۆی "نظارە".

**نظارگی:** بینەر، تواشاچی.

**نظارە:** (نَ یا نِ) ڕوانین، نۆڕین، نواڕین، تواشا کردن.

**نظّارە:** (نَ.رَ) بینەران، سەیرکەران، تواشاکەران، تواشاچیان.

**نظارەسازی:** تواشاگەری، تواشاچییەتی.

**نظارەگاە:** دیمەن، بەرجەوەند.

**نظارەگر:** بڕوانە: "تماشاگر".

**نظافت:** پاك و خاوێنی.

**نظام:** 1) تەکووزی، ڕێکوپێکی. 2) دەداوکێشانی مرواری. 3) سیستم. 4) شێوە، شێواز، ڕێڕەو. 5) ڕێژیم. 6) سپا، ئەرتەش. 7) خزمەتی سەربازی. 8) شێعر، هۆنراوە. "**نظام اجباری**": خزمەتی سەربازی. "**نظام اشتراکی**": (کۆمەڵناسی) کۆخوازی. "**نظام اقتصادی**": شێوەی خاوەنداریێتی و کەڵك وەرگرتن لە مڵکایەتی و ڕادەی دەست تێوەردانی دەوڵەت لەودا. "**نظام تك فلزی**": سیستمی تاك کانزایی، سیستمێ لەسەر بنەمای یەك کانزا وەك تەڵا. "**نظام دادن**": ڕێکخستن، تەکووزکردن، ڕێکوپێك کردن، ڕازاندنەوە، سەروبەرکرن. "**نظام داشتن**": تەکووزبوون، ڕێکوپێك بوون. "**نظام سخن**": تەبعی شێعر.





"**نظام گرفتن**": ڕێکوپێك بوون، تەکووزبوون. "**نظام یافتن**": تەکووزبوون، ڕێکوپێك بوون. "**بر نظام کردن**": ڕێکوپێك کردن. "**بە نظام**": ڕێکوپێك.

**نظامات:** 1) ڕێوشوێنەکان، ڕێساکان. 2) کۆی ڕێسا و نەریتەکان.

**نظام سازی:** سیستم سازی، بەسیستم کردن.

**نظام مند:** سیستم مەند، شێوازمەند.

**نظامنامە:** ئایین نامە.

**نظام وظیفە:** خزمەتی سەربازی.

**نظامی:** سەرباز، چەکداری دەوڵەت، سپایی، لەشکری، نیزامی.

**نظام یافتە:** سیستماتیك، ڕێکخراو، ڕێکخستی، ڕێکوپێك.

**نظامی گری:** میلیتاریزم، زاڵبوون و باڵادەستی کەسانی نیزامی بەسەر هەموو کاروبارەکانی وڵات دا، بەنیزامیکردن.

**نظر:** ڕوانین، تێڕوانین، تواشاکردن، لێنهێرین. 2) ڕوانگە، بۆچوون، بڕوا، باڤەری. 3) بوار. 4) چاوەزار. 5) لا، لایەن. 6) چاو. 7) سۆما، سۆمایی. 8) ڕامان، وردبوونەوە. 9) بیر، هزر. 10) ئاخاوتە. 11) دۆخی دوو ئەستێرە نیسبەت بەیەکتر. "**نظر آوردن و بردن**": بەوردی و تێڕامانەوە سەیر کردن، چاوپێداگێڕان. "**نظر از روی کسی کوتاە کردن**": تواشای ئەو نەکردن. "**نظر از کسی برانداختن**": لەبیرکردنی ئەو. "**نظر افتادن**": وردبوونەوە. "**نظر افکندن**": 1) تواشاکردن، سەیرکردن. 2) سەرنجدان. 3) هۆگربوون بە کەسێك یان شتێ، دڵ پێوەبوون. "**نظر باختن**": چاوچاوێن، چاوبازی. "**نظر بازگرفتن**": 1) چاوهەڵگرتن و تواشانەکردن. 2) سەرنج نەدان. "**نظر بد**": 1) چاوەزار. 2) نیازی خراپ. "**نظر برگرفتن**": چاوهەڵگرتن، چاولێنەکردن. "**نظر بستن**": چاولێکنان و تواشانەکردن. "**نظر بە**": بەسەرنجدان بە. "**نظر بە چیزی جفت کردن**": سەرنجدانە ئەو. "**نظر پیوستن**": سەرنجدان، سەیرکردن. "**نظر خواستن**": ڕاپرسیکردن. "**نظر خوردن**": چاوەزار کارلێکردن، بەچاوەوەبوون. "**نظر دادن**": ڕادەربڕین، بۆچوون دەربڕین. "**نظر داشتن**": 1) سەرنجدان. 2) نیاز هەبوون. 3) ڕا هەبوون. 4) دڵ پێوەبوون. 5) تواشاکردن، سەیرکردن. "**نظر دوختن**": 1) تەماکردن، وەتەماکەوتن. 2) چاولێکنان و سەیرنەکردن. "**نظر ربودن**": ڕاکێشانی بۆچوونی کەسێك. "**نظر رفتن**": سەرنج ڕاکێشران. "**نظر زدن**": چاولێدان، بەچاوەوەکردن. "**نظر کردن**": 1) سەیرکردن، تواشاکردن. 2) سەرنجدان، تێڕامان. 3) چاوپێهەڵێنان، بەچاوەوەکردن. 4) گرینگیپێدان. 5) بڕوانە: "پاییدن".

"**نظر کسی برگشتن**": 1) ڕاگۆڕینی ئەو. 2) نەمانی سەرنج و بایەخ پێدان لە لایەن ئەوەوە. "**نظر کسی را زدن**": بوونە هۆی ڕاگۆڕینی ئەو. "**نظر کسی را گرفتن**": سەرنجی ئەو بۆ لای خۆ ڕاکێشان. "**نظر کوتاە کردن**": چاوهەڵگرتن و سەیرنەکردن. "**نظر گرداندن**": چاوبڕینە لایەك. "**نظر گسستن**": چاولێ نووقاندن، چاوپۆشیکردن. "**نظر گماشتن**": بڕوانە: "نظر دوختن". "**از نظر**": لەباری، لەڕوانگەی. "**از نظر افتادن**": 1) بایەخ نەمان، لەدەست دانی گرینگی. 2) گرینگی پێنەدران، لە بەر چاو کەوتن. "**از نظر افکندن( انداختن، راندن، رفتن**": بایەخ و گرینگی پێنەدان. "**از نظر کسی گذشتن**": کەوتنەبەر چاوی ئەو. "**ازنظر گذراندن**": 1) دیتن، تواشاکردن. 2) خستنەبەر چاوی ئەو. "**بەنظر آمدن**": 1) دیتران، وەبەرچاوهاتن. 2) بەزەین گەیشتن. "**بەنظر درآوردن**": تاوتویکردن. "**بەنظر رسیدن**": بە زەین گەیشتن. "**تحت نظر( زیر نظر )**": لەژێر چاوەدێریدا. "**تنگ نظر**": بەرچاوتەنگ، کورت بین، بیرتەسك. "**درنظر آمدن**": 1) دیتران، وەبەرچاو هاتن. 2) سەرنج ڕاکێشان. 3) وێنابوون، هاتنەزەینەوە. 4) بایەخپێدران. "**درنظر آوردن**": 1) دیتن، تواشاکردن. 2) وێناکردن، هێنانە زەینەوە. "**درنظر بودن**": لەبیربوون، لەیادبوون. "**درنظر داشتن**": 1) بەنیازبوون. 2) لە بیربوون. "**درنظر گرفتن**": 1) لەبەرچاوگرتن، گرینگیپێدان. 2) دیاریکردن، کاندیداکردن. "**درنظر ماندن**": لەبیر مانەوە. "**دنبال نظر بودن**": دڵ پێوەبوون و ئاشق بوون. "**صاحب نظر**": خاوەن ڕا/ بیروبۆچوون. "**کسی را نظر دادن**": ئەو بە شیاوی گرینگ زانین.

**نظرآزمایی**: ڕاخوازی، ڕاپرسی.

**نظراء**: کۆی"نظیر".

**نظرباز**: چاوچڕێن، چاوچڵێس، چاولەوەڕێن، چاوباز، چاوحیز، چەش خیز، بەچاوخاین.

**نظربازی**: چاوچاوێن، چاوچڕاندن، چەم چەڕاندن، چاولەوەڕێنی، چاوبازی، چاوحیزی.

**نظربریدە**: بێبەش لە تواشا.

**نظربلند**: دەست و دڵ ئاوەڵە، **هیممەت** بەرز.

**نظربند**: 1) نووشتە بۆ بەچاوەوەنەبوون، نووشتەی چاوەزار. 2) دیل، گیراو. 3) بڕوانە: "مسحور". "**نظربند کردن**": 1) گرتن، قۆڵبەستکردن. 2) بڕوانە: "مسحورکردن".

**نظرپرست**: بڕوانە:"نظرباز".

**نظرتنگ**: بەرچاوتەنگ، بەغیل.





**نظرخواه**: خوازیاری دیداری دۆست.

**نظرخواهی**: ڕاپرسی.

**نظرسنجی**: 1) ڕاپرسی، ڕیفراندۆم. 2) تاوتوێی ڕاپرسی و دەرەنجامگیری لێی.

**نظرقطعی**: بڕوای نەگۆڕ، دوابڕیار.

**نظرکردە**: 1) ئەوەی لەلایەن یەکێك لە پیاوانی ئایینەوە گرینگی پێدراوە. 2) خۆشبەخت، بەختەوەر.

**نظرگاە**: 1) ڕوانگە، بڕوا. 2) شوێنی تواشاکردن. 3) تواشاگە. 4) بەرامبەر چاو. 5) چاو.

**نظرگیر**: سەرنج ڕاکێش، جێی سەرنج. "**نظرگیرکردن**": سەرنج پێدان، گرینگی پێدان.

**نظرور**: خاوەن ڕا.

**نظرە**: یەك جار تواشاکردن.

**نظری**: 1) تیۆرەکی، تیۆریك، تیۆریتیکاڵ، بیردۆزەکی. 2) لەخۆگری لایەنی زەینی و فیکری، ئەزموووننەکراو. 3) وەدەستهاتوو بەمەزندە. 4) تایبەتمەندی ئەوەی تێگەیشتن لێی پێویستی بە بۆچوون و فیکرەوە هەیە.

**نظریات**: کۆی"نظریە".

**نظریە**: 1) شرۆڤەکردنی کۆمەڵێ لە ڕاستییەکان لەباری پێوەندیان بەیەکترەوە. 2) بیردۆزی، بیرداڕێژی، تیۆری، بنەما زانستییەکان. 3) بەراورد، گومان، مەزندە. 4) بڕوا، باوەڕ. "**نظریە تقلیدی**": تیۆری لاسایکارانە. "**نظریە تولّدذاتی**": تیۆری خۆدروست کردن(خۆڕسکاندن). "**نظریە رشد**": هۆی تاوتوێی ئابووری لە گۆشەونیگای گۆڕانی ڕادەی سەرمایە، حەشیمەت و پێشکەوتنی فەننی. "**نظریە فیض**": تیۆری هەڵقوڵین(تەقین).

**نظریە پرداز**: بیرداڕێژ، بیردۆز، تیۆریسین، تیۆرزان، "ئایدیۆلۆگ".

**نظریە پردازی**: تیۆری داڕێژی، داهێنانی تیۆر، تیۆریزەکردن.

**نظم**: 1) تەکووزی، ڕێکوپێکی، سەقام، دووزەنە، دیسیپلین. 2) دەداوکێشانی مرواری. 3) **هۆنراوە**، **هۆنە**، **هەڵبەست**، پێچەوانەی پەخشان. "**نظم دادن**": 1) سەروبەرکردن، ڕێکوپێك کردن. 2) **هۆنینەوە**، شێعر وتن. 3) دەداوکێشان. "**نظم کردن**": 1) **هۆنینەوە**. 2) دەداو کێشان. "**نظم یافتن**": تەکووزبوون، ڕێکوپێك بوون. "**بەنظم ( در)آوردن**": **هۆندنەوە**.

**نظمیە**: شارەوانی.

**نظیر**: هاوتا، **هاوشان**، وێنە، وەکو.

**نظیف**: پاك، خاوێن.

**نعت**: 1) وەسف کردن، ستایش کردن، مەحت کرن. 2) نازناو. 3) خسڵەت.

**نعرە**: گوڕە، نەڕە، **هەلان**، نەعرەتە. "**نعرە**

**زدن(کشیدن، کردن)"**: گوڕاندن، گرماندن، نەڕاندن، هارەکردن، هاڕاندن، توممێن، نارەتەلێدان، بە دەنگی قەو زیقاندن.

**نعرەوار:** مەودایەك کە نەڕەیەکی بەرز پێی بگا.

**نعش:** 1) تاقێر، تەرم، کەلەش، مەیت، جەندەك. 2) بڕوانە:"تابوت". **"نعش کسی را با تیر زدن"**: دوای مەرگیشی دوژمنایەتی دەگەڵ کردن. **"نعش کسی را دراز کردن"**: کوشتنی ئەو.

**نعل:** ناڵ، پێڵاوی یەکسم. **"نعل افکندن"**: بەپەلە ڕۆیشتن. **"نعل بر ستور بستن"**: ناڵ کردنی چوارپێ. **"نعل بستن"**: ناڵ کردن. **"نعل در(بر) آتش بودن"**: نیگەران و بێ ئۆقرەبوون. **"نعل در سنگ افکندن"**: بێتوان بوون، بێتابشت بوون. **"نعل ریختن"**: 1) بەپەلە ڕۆیشتن. 2) ماندووبوون، بەجێمان. **"نعل کردن(زدن)"**: ناڵ کردن. **"نعل وارونە زدن"**: بۆ هەڵخڵەتاندنی دیتران بەپێچەوانەی ویست و نیازی خۆ هەڵسوکەوت کردن. **"نعل و میخ"**: تانە و تەشەر. **"بە نعل و بە میخ زدن"**: هەم لە ناڵ دان هەم لە بزمار دان. **"چیزی را نعل گرفتن"**: خستنە ژێر کۆنترۆڵ و بەسەریدا زاڵبوون.

**نعل ریز کردن:** بەلەز ڕۆیشتن.

**نعمات:** کۆی"نعمت".

**نعمت:** نیعمەت، خەڵاتی خوا، ماڵ و سەروەت، ڕسق و ڕۆزی، بەهرە و خۆشی. دیاری. داهات، بەرهەم. **"نعمت دادن"**: ڕسق و ڕۆزیدان، نێعمەت دان. **"نعمت دنیا"**: ماڵ و سامان. **"نعمت دیدن"**: بەهرەمەندبوون لە نێعمەت. **"نعمت نهادن"**: سەروەت و سامان کۆکردنەوە.

**نعمت خوار:** بڕوانە:"روزیخور".

**نعمت خیز:** بڕوانە:"حاصلخیز".

**نعوذ:** پەنادەبەین، هانادەبەین.

**نعوظ:** هەستان/ڕاستەوەبوونی ئەندامی جنسی نێرینە، کیرهەستان، ڕەپ بوون.

**نعومت:** نەرمیوشلی. نەرمی، دژی زبری و درشتی.

**نغز:** 1) دلگر، خۆش. 2) باش، چاك. 3) ڕێکوپێك، تەکوز. 4) جوان، قەشەنگ. 5) سەیر، سەرنج ڕاکێش. 6) بەتام، بەچێژ. 7) تورت و تێراو، تەڕوتازە. 8) نەرم. 9) بڕوانە:"چابك". 10) بەئەزموون، کارامە.

**نغزبو:** بۆن خۆش.

**نغزکار:** کارجوان، شیرینکار.

**نغزگفتار:** گفت و لفت خۆش، شەکرلێو، بەدەم و پل، دەماوەر، قسەڕەوان.

**نغل:** (نَ.غَ) 1) زایەبوون، ڕزین، گەنین. 2) دووزمانی، شووفاری. 3) ئاژاوەگێڕی.

**نغمات:** کۆی"نغمە".

**نغمە:** 1) ئاهەنگ یان مێلۆدی. 2) سترانی خۆش، سروود، ئاواز، چریکە. **"نغمە امری (را) سر دادن"**: بەنیازی ئەنجامدانی ئەو بوون. **"نغمە حروف"**: دابەشینی پیتەکان.





**"نغمە داوودی"**: ئاوازی خۆش و دڵنشین. **"نغمە دیگر نواختن"**: وتنی قسەیەکی نوێ و بیانووهێنانەوە. **"نغمە ساختن"**: گۆرانی وتن یان سازلێدان. **"نغمە ساز(کوك) کردن"**: دەست بردن بۆ کارێکی ناڕەوا یان فریودەرانە. **"نغمەکردن"**: چریکاندن، ستران بێژی.

**نغمەساز:** 1) بڕوانە:"نغمەسرا". 2) ژەنیار.

**نغمەسرا:** ئاوازخوێن، سروودخوێن. "نغمەپرداز" و "نغمەسنج" و "نغمەطراز" و "نغمەگر"یش هەر بەم مانایەن.

**نغوشاك:** پێڕەوی ئایینی مانی.

**نغوشە:** بڕوانە:"استراق سمع".

**نغول:** 1) قووڵ. 2) دوور و درێژ. 3) تەواو، بێ کەموکوڕی. 4) تێفکرین، قووڵبوونەوە، وردبوونەوە. **"نغول رفتن"**: گەیشتن بە قووڵایی شتێکا، لێ وردبوونەوە. **"اندر نغول"**: بەقووڵی.

**نغول اندیش:** بڕوانە:"ژرف اندیش".

**نفائس:** کۆی"نفیسە"، شتە بەنرخ و بەڕمێنەکان.

**نفاث:** بڕوانە:"ساحر".

**نفاد:** تێپەڕینیکات، بەکۆتایی گەیشتنی شتێ، تەواوبوون، نەمان.

**نفّاذ:** فرە دەست ڕۆیشتوو، گەلەك دەست چوویی.

**نفاذ:** 1) جێبەجێبوون. 2) ئەنجامدان و جێبەجیکردن. **"نفاذ یافتن"**: جێبەجێبوون. **"بە نفاذ پیوستن"**: ئەنجام بوون، هاتنەدی.

**نفار:** ڕەوینەوە، سڵەمینەوە.

**نفاست:** بەنرخ بوون، گرانمایەبوون، ب سەنگ بوون.

**نفاق:** (نِ) دووڕوویی، دووڕەنگی، ڕیاکاری. **"نفاق افکندن(انداختن)"**: جیایی و ناکۆکی نانەوە.

**نفاق:** (نَ) برەوسەندنی کڕین و فرۆشتن، برەوی بازاڕ.

**نفام:** بۆر، تەپوتۆزاوی، ئاماڵ ڕەش.

**نفت آلود:** نەوتاوی، نەوتینە.

**نفتگر:** کرێکاری سەنعەتی نەوت.

**نفح:** هەڵکردنی با، هەڵکردنی سروە.

**نفخ:** 1) فووتێکردن، پف دان، فوودان، بە فوو پەنەماندن، باکردنەناو، ئاوساندن. 2) فیز و لووت بەرزی.

**نفر:** (نَ.فَ) 1) یەکەی ژماردنی مرۆ، کەس، تاکەکەس. 2) پێرسۆنێل، کارمەند. 3) یەکەی ژماردنی وشتر. 4) سەرباز. **"نفربرنفر"**: 1) گروپ گروپ. 2) زۆر، فراوان. **"نفربەنفر"**: بەجیا، تاك تاك. **"نفر کردن"**: بڕوانە:"رمیدن".

**نفر:** (نَ) ڕەوینەوە، دوورکەوتنەوە.

**نفرت:** خۆش نەویستن، دڵ لێشێوان، دڵ هەڵەنگوتن لە دیتنی شتێ یان کەسێ، دڵ تێکچوون لە دیتنی شتێ یان کەسێ، بێزاری و ڕەوینەوە، قێزوبێز لێهاتن، کەرب لێ ڤەبوون. **"نفرت دادن"**: بێزارکردن.

**نفرت آور:** بێزارکەر، قێزەون.

**نفرون:** گورچکۆکە.

**نفریدن:** تووك لێکردن، نزای خراو لێکردن.

**نفریده:** 1) نەحلەت کراو، نەحلەتی. 2) ناپەسند، ناحەز.

**نفرین:** ڕت، نفر، نفرە، زۆتی، تووك، پشۆر، نزای خراپ، قسەی بێزاری، لەکۆڵەڕۆ. "**نفرین بردن**": نەحلەت کرن، نزای خراپ لێکران. "**نفرین کردن (فرستادن)**": تووك لێکردن، ڕتاندن، نزای خراپ لێکردن. "**نفرین گفتن( خواندن )**: بڕوانە: "نفرین کردن". "**بەنفرین**": تووك لێکراو، نەحلەت کراو، ناحەز.

**نفس:** (نَ) 1) جەوهەر و هەقیقەتی هەر شتێ یان کەسێ، سرشت، نەفس. 2) خود، خودی هەر کەسێك یان هەر شتێك. 3) دڵ و دەروون، زەین. 4) کەس. 5) لەش، جەستە. "**نفس الامر**": هەقیقەتی بابەت یان کارێك، جەوهەری هەر شتێ. "**نفس امارە( شیطانی )**": ئەو نەفسەی مرۆ بۆ لای هەوەس و خولیا و کاری نەشیاو هان دەدا. "**نفس انسانی( عاقل، مدرکە، ملکی، ناطقە )**": هێزێ کە سەرچاوەی ئاخێوەری و ئاوەزکارییە. "**نفس پروردن**": پێڕەویکردن لە ئارەزووی نەفس. "**نفس خود( خویش )**": خود. "**نفس سبعی**": هێزێ لە مرۆڤ و ئاژەڵ دا کە سەرچاوەی مەیلی بەرەو لەسەرتر خوازییە. "**نفس لوامە**": نەفسی لۆمەکار کە مرۆ لە ئەنجامدانی کاری خراو دەگێڕێتەوە. "**نفس واحد( واحدە )**": یەك گیان، یەك کەس. "**بە نفس خود( خویشتن )**": خۆی، خودی کەس. "**سلیم النفس**": دەروون پاك، نەفس بەرز. "**ضعیف النفس**": نەفس نزم. "**مسلّط بر نفس**": نەفس پیت.

**نفس:** (نَ.فَ) 1) نز، هلم، هەناسە، پشوو، پیش، پشی، بینگ. 2) کاتێکی زۆر کورت، چرکەسات. 3) کەسی زۆر خۆشەویست. 4) هەستی بۆن پێکردن. 5) ئاواز، چریکە. 6) فوو. 7) هاودەمی. 8) دۆعا. 9) بۆن. "**نفس آخر**": دوایین ساتی ژیان. "**نفس آخر را کشیدن**": مردن. "**نفس از خود بریدن**": متەق لێوەنەهاتن. "**نفس از ما تحت (کون) کشیدن**": تێپەڕاندنی دوایین چرکەساتەکانی ژیان، "تڕی ئاخر کەندن". "**نفس بازپسین**": بڕوانە: "نفس آخر". "**نفس برآمدن**": بەکۆتایی گەیشتنی تەمەن. "**نفس برآوردن**": 1) هەناسەدان. 2) بەڕاحەتی هەناسەکێشان یان بەخۆشی ژیان. 3) قسەکردن، ئاخاوتن. "**نفس برزدن**": 1) هەناسەکێشان. 2) هەڵهاتن، هاتنەدەر. 3) بڕوانە: "آسودن". 4) گازندەکردن، گلەییکردن. "**نفس بر کسی سوختن**": وەهەناسەبڕکیکەوتن. "**نفس بر نفس**": پەیتاپەیتا، پشت سەرییەك. "**نفس بستن**": شاردنەوەی





هەقیقەت، بێدەنگی لێکردن. "**نفس بە آخر آمدن**": بەکۆتایی گەیشتنی تەمەن. "**نفس بە تنگی افتادن**": بەسختی هەناسەدان. "**نفس بە شمار زدن**": زۆر ئاگاداربوون. "**نفس تنگ شدن**": بەسەختی هەناسەدان. "**نفس داشتن**": 1) وزە هەبوون، توانایی هەبوون. 2) زیندووبوون. "**نفس در دهان کشتن**": بێدەنگ بوون، متبوون. "**نفس در سینە کسی گرە خوردن**": تووشی هەناسەبڕکێ بوون. "**نفس درگرفتن**": کاریگەربوونی قسە. "**نفس در گلو گسستن**": مردن. "**نفس راحت کشیدن**": ڕزگاربوون لە نیگەرانی یان کێشەیەك، هەناسەیەکی بەڕاحەتی کێشان. "**نفس راندن**": قسەکردن، ئاخاوتن. "**نفس زدن**": 1) هەناسەکێشان. 2) هەواخۆری. 3) هەڵاتن، دەرکەوتن. 4) قسەکردن، ئاخاوتن. 5) ئاواز خوێندن. 6) هەوڵدان. 7) زەمانێ بەخۆشی ڕابواردن. "**نفس زدن از چیزی**": قسە لێکردن. "**نفس سرد**": قسە یان کارێ کە کاریگەری لەسەر دیتران نەبێ. "**نفس شمردن**": کات بە هەل زانین. "**نفس صبح**": سروەی بەیانان. "**نفس کردن**": هەناسەدان، هەناسەکێشان. "**نفس کسی برای کسی دررفتن**": زۆر هۆگری ئەو بوون. "**نفس کسی بند آمدن**": 1) نەمانی توانایی هەناسەدان لەودا. 2) زۆر ترسان یان مردنی ئەو. "**نفس کسی بە دیگری خوردن**": کاریگەریدانانی ئەو لەسەر ئەویتر. "**نفس کسی بە شمارە افتادن**": 1) بەسەختی هەناسەدانی ئەو. 2) وەگیانەڵاکەوتن. "**نفس کسی بە لب آمدن**": وەزاڵەهاتن یان گیاندانی ئەو. "**نفس کسی بە نفس دیگری رسیدن**": چاوپێککەوتنی ئەو دوانە. "**نفس کسی پس رفتن**": نەمانی توانایی هەناسەدان لەودا. "**نفس کسی تازە شدن**": هەناسە وەبەر هاتنەوە، هێز و وزەی تازە وەبەرهاتنەوە. "**نفس کسی تنگی کردن**": بەسەختی هەناسەدانی ئەو. "**نفس کسی درنیامدن**": 1) هەناسەنەدان. 2) بێدەنگ بوون. "**نفس کسی را بریدن**": توشی ناڕەحەتی و جەزرەبە کردن. "**نفس کسی را گرفتن**": 1) وەزاڵەخستنی ئەو. 2) کوشتنی ئەو. "**نفس کسی را گوشمال دادن**": ئەشکەنجەدانی ئەو. "**نفس کسی سنگین شدن**": بەسەختی هەناسەدان. "**نفس کسی سوختن**": تووشی بەرهەنگ/هەناسەبڕکێ هاتن. "**نفس کسی فرورفتن**": بێدەنگ و ئارام بوون. "**نفس کسی گرفتن**": تووشی هەناسەبڕکێ بوون. "**نفس کسی گسستن**": مردنی ئەو. "**نفس کشیدن**": 1) هەناسەدان، هەناسەدەرهاتن، هەناسەکێشان، پشوودان، بێهنڤەدان، هەل کشاندن. 2) بەڕاحەتی ئیسترِاحەت کردن. "**نفس کشیدن از یاد کسی رفتن**": مردنی ئەو. "**نفس گرفتن**": هەناسە وەبەرخۆ هێنانەوە، هەناسە تازەکردنەوە. "**نفس گشادن با کسی**":

هاوپەیڤ بوون لەتەك ئەودا. "**نفس گیرا**": ئاخاوتەی کاریگەر. "**نفس نداشتن**": بێ هێز و بێ هەست بوون. "**نفس نفس زدن(کشیدن)**": خیشەخیش، هانکەهانك، هلکەهلك، هەناسەسواری. "**از نفس انداختن**": لە هەناسەخستن، ماندوو و شەکەت کردن. "**بازگشت نفس**": هەناسەدانەوە، پشوو گەڕانەوە. "**به نفس (نفس نفس) افتادن**": هەناسەسواری، زۆر ماندوو بوون". "**به نفس رسیدن جان**": بە دوایین هەناسیە گەیشتن. "**تا آخرین نفس**": تا دوایین هەناسە، تا کاتی مەرگ.

**نفس بر:** (نَ فَ.بُ) پشووبڕ.

**نفس پرست:** (نَ) هەوەست پەرست، ئەوەی بە هەوەس و مەیلی خۆی ڕەفتار دەکا.

**نفس تنگی:** (نَ فَ) بڕوانە:"تنگی‌نفس".

**نفس دار:** (نَ فَ) 1) کەسێ کە دەتوانێ زۆر هەناسە ڕاگرێ. 2) پتەو، قایم.

**نفس درازی:** (نَ فَ) 1) توانای ڕاگرتنی هەناسە بۆ ماوەیەکی زۆر، هەناسە نەکێشان بۆ ماوەیەکی زۆر. 2) چەنەوڕی، زۆربلێیی، فرەوێژی.

**نفس سوخته:** 1) بێدەنگ، کپ، وست. 2) دڵسووتاو، دلشەواتی، مەینەتی کێشاو.

**نفس کش:** 1) باکەش، بابوێر. 2) جێگەی بەرین، جێگەی لەبار بۆ چالاکی. 3) ئەوەی هەناسە دەکێشێ. 4) بوونەوەری زیندوو.

**نفس گرفتگی:** بڕوانە:"تنگی نفس".

**نفس گسسته:** بێدەنگ، مات، کپ.

**نفس گیر:** 1) پشووبڕ. 2) گیرۆدەی نەخۆشی بەرهەنگ بوون.

**نفسەزدن:** خیشەخیش کردن، هەناسە سواری، پشووسواری.

**نفسی:** 1) دەروونی، ڕووحی. 2) لەسەر بنەمای هەوەس و ئارەزوو. 3) خۆم. "**نفسی(و)نفسی زدن**": بەدوای ڕزگاری خۆوەبوون.

**نفع:** بەهرە، سوود، خێر، قازانج، کەڵك، بەرژەوەندی. "**نفع بردن**": خێرکردن، قازانج کردن، سوودبردن. 2) وەدەست خستنی ئاکامی دڵخواز. "**نفع دادن**": 1) قازانج گەیاندن. 2) باشتر/ چاکترکردنەوە. 3) ئاکامی دڵخواز پێدان. "**نفع داشتن**": 1) قازانج هەبوون، سوودهەبوون. 2) کاریگەرهەبوون، کاریگەری دانان. "**نفع کردن**": قازانج کردن، بەهرەبردن. "**نفع بردن**": قازانج بردن. "**به نفع کسی بودن**": بەقازانجی ئەوبوون. "**به نفع کسی تمام شدن**": بە قازانجی ئەو تەواو بوون.

**نفع پرست:** بڕوانە:"سودجو".

**نفع گر:** قازانج بەر، بەهرەبەر.

**نفقات دادن:** خەرجی دان.

**نفقه:** 1) خەرجی ژیانی ژن و منداڵ، بژیوی. 2) تێشووی سەفەر و ڕێگا. "**نفقەدادن**": دانی خەرجی بژیوی ژن و منداڵ. "**نفقه کردن**": 1) خەرج کردن. 2) بەخشین.

**نفله:** بێ دەست وپێ و لاواز و ناکارامە.





"**نفلەکردن**": 1) کوشتن. 2) لەناوبردن، ئەنفال کردن.

**نفوذ:** 1) ڕۆچوونە ناو شتێکەوە بەبێ گۆڕینی پێکهاتەکەی، ڕەخنەکردن، دزەکردن، پێدزەکردن. 2) تێدان (کرم تێدان)، کارتێکردن. 3) توانایی قبووڵاندنی شتێ بەکەسێ یان لەجێییەك، کاریگەرێتی، شوێن دانان. 4) دەست ڕۆیشتن، قسەڕۆیشتن، قسەبڕکردن، دەست ڕۆیی، دەست چوون، بڕشت. 5) پێشڕەوی. "**نفوذ پیدا کردن**": بڕوانە:"نفوذ(1)". "**نفوذ دادن**": بڵاوکردنەوە، پەرەپێدان. "**نفوذ داشتن**": بڕوانە: "نفوذ (3)". "**نفوذ کردن**": 1) بڕوانە: "نفوذ(1)". 2) بڕوانە: "فرورفتن". "**نفوذکردن در کسی (جایی)**": دەست بە سەردا ڕۆیشتن، زاڵبوون بەسەر ئەودا، خستنە ژێر ڕکێفی خۆ. "**نفوذ کلام(کلمه)**": کاریگەربوونی قسەی کەسێك لە کەسێکی تردا. "**به نفوذ رسانیدن**": تێپەڕاندن، ڕەتکردن.

**نفوذنا پذیر:** ڕێ‌تێنەچوو، ڕەق، پتەو.

**نفوذی:** سیخوڕ، دزەکەر، کەسێ کە دەچێتە ناو گروپێکەوە تا لە سڕ و ڕازی ئەوان بگا و مەبەستەکانی خۆشی بەوان تەڵقین بکا.

**نفور:** ڕەوینەوە، دوورکەوتنەوە، دەرچوون.

**نفوس نویسی:** بڕوانە:"سرشماری".

**نفهم:** نەفام، گوهماکەر، ناتێگەیشتوو، تێ نەگەهشتی، نەزان، بێ ئاوەز، دەبەنگ، گەوج، گەلحۆ.

**نفهمیده:** نەزانستە.

**نفی:** 1) نەرێ. 2) ڕەتکردنەوە، نکۆڵیکردن، مل نەدان، دان پیانەنان، حاشالیکرن. 3) تاراندن، دەربەدەرکردن، دوورخستنەوە. 4) سڕینەوەی سفەتە مرۆییەکان لە خۆدا. "**نفی بلد**": دوورخستنەوەی کەسێ لە شار یان وڵاتێ کە لێی نیشتەجێیە، خستنە تاراوگە. "**نفی کردن**": 1) بڕوانە: "نفی(1)". 2) دوورخستنەوە. 3) خستنە تاراوگە. "**نفی وجود**": بڕوانە:"نفی(4)".

**نفیر:** 1) کەڕەنا، شەیپوور، بۆڕی. 2) هەڵاتن، ڕاکردن. 3) گروپی کەمتر لە دە کەس. 4) دەنگی بەرز، هەرا. 5) هێرش، پەلامار. "**نفیر آوردن**": 1) هێرش هێنان. 2) هاوارکردن. "**نفیر برآمدن**": داد و هاوار بەرزبوونەوە. "**نفیر برآوردن/ نفیر زدن**": هاوارکردن، خرۆشین. "**نفیرعام**": سەرهەڵدانی گشت خەڵك بۆ شەڕ دەگەڵ دوژمن. "**نفیر کردن**": بڕوانە:"نفیر زدن". "**به نفیر آوردن**": وەخرۆشان هێنان.

**نفیس:** 1) بەنرخ و بەها، گرانبایی، بوهاگران. 2) بەڕێز، هێژا.

**نقاء:** پاکی، خاوێنی.

**نقائص:** کۆی "نقیصه".

**نقّاب:** (نَ) پیاوی دەس ڕۆیشتوو و فرە کونجکۆڵ لە کاروباردا.

**نقاب:** (نِ) دەمامک، ماسک، ڕووپۆش، سەرپۆش، پەچە، لچک. "**نقاب از چهره (صورت) کسی افتادن (کنار رفتن)**": دەرکەوتنی ناوەرۆکی ئەسڵی ئەو. "**نقاب باز کردن**": دەمامک لادان، ڕووپۆش لادان. "**نقاب برافتادن**": دەرکەوتن. "**نقاب برانداختن**": 1) بڕوانە: "نقاب باز کردن". 2) دەمامک لەسەر ڕوخساری کەسێک لادان. "**نقاب بربستن**": بڕوانە: "نقاب زدن". "**نقاب برداشتن**": 1) بڕوانە: "نقاب بازکردن". 2) نیشاندانی ناوەرۆکی ئەسڵی خۆ. "**نقاب برگرفتن (برافکندن، برکشیدن، گشادن، فروکشیدن)**": بڕوانە: "نقاب باز کردن". "**نقاب بستن**": بڕوانە: "نقاب زدن(1)". "**نقاب زدن**": 1) دەماخ هەڵبەستن، دەماخ هەڵدان، دەماخ کردن، بەرلووت هەڵپێچان، دەمامک لێدان. 2) شاردنەوەی ناوەرۆکی ئەسڵی خۆ. "**از چیزی نقاب انداختن**": ئاشکراکردنی ئەو، دەرخستنی ئەو.

**نقاب پوش:** دەمامک پۆش.

**نقابت:** پێشەوایی، سەرۆکایەتی.

**نقابی:** دەمامک پۆش، بەدەمامک.

**نقّاد:** 1) ڕەخنەکار، ڕەخنەگر. 2) جیاکەرەوەی چاک لە خراو. 3) جیاکەرەوەی پارەی ئەسڵ لە تەزویر.

**نقّادی:** 1) ڕەخنەگری. 2) جیاکردنەوەی پارەی ئەسڵ لە تەزویر.

**نقار:** (نِ) 1) ڕەنجان، زیزبوون. 2) شەڕ و مشتومڕ، کێشە و دم بە دمە.

**نقّار:** (نَ) 1) فرە کونجکۆڵ لە کاروبار و هەواڵ دا. 2) کۆڵیار، کەندۆخ، بەردتاش، کەڤرتەراش. 3) ژەنیاری دەف یان دەهۆڵ.

**نقارت:** هەڵکۆڵین و نیگارکێشان لە سەر بەرد یان دار.

**نقارەخانه:** جێگەی دەهۆڵ و زوڕنا لێدان.

**نقّاش:** نیگارکێش، وێنەکێش، کەسێ کە لە سەر کاغز شکڵ دەکێشێ، کەسێ کە دارودیوار ڕەنگ دەکا، ڕەنگ کار.

**نقّاشی:** نیگارکێشی، شکڵ کێشان، ڕەنگ کردنی دیوار. "**نقاشی متحرک**": کارتۆن.

**نقاض:** (نِ) پێچەوانەوێژی، بەرەڤاژی بێژی، وتنی قسەیەک کە لە گەڵ قسەی یەکەم یەک نەگرێتەوە.

**نقاضت:** دژایەتی، دوژمنایەتی.

**نقاط:** کۆی "نقطه".

**نقّال:** 1) ڕاگوێزەر، ڤەگوهازینەر. 2) نەققاڵ، نەقاڵ، قسەخۆش، قسەزانی قسەخۆش، گێڕەوە، چیرۆک بێژ، هەقایەت خوێن.

**نقّاله:** دەستەبەرە، ئامرازێکە بۆ پێوانی گۆشە.

**نقاوت:** خاوێن بوونەوە، پاڵێوران.





**نقاوه:** بژاردە، پوختە و هەڵبژاردەی شتێ.

**نقاهت:** 1) تێگەین، تێگەیشتن، حاڵیبوون، سەرلێدەرکردن. 2) ڤەترسین، تازە لە نەخۆشی هەستانەوە، تازە خۆش بوونەوە، حاڵەتی بێ هێزی و بێ توانایی دوای هەستانەوە لە نەخۆشی.

**نقب:** 1) کون کردن، قووڵ کردن، کوورکرن، چاڵ کەنین، هەڵکۆڵین. 2) لەغمە، لوغم، لەغەم، قمیش، ڕێگە بە بن زەویدا، داڵان یان ڕێڕەوی ژێرزەوینی.

**نقد:** 1) ڕەخنە، خوێندنەوە(نقدی بر...: خوێندنەوەیەکی...)، هەڵسەنگاندن. 2) نەخت، نەختینە، پێچەوانەی قەرز. 3) حازر و ئامادە. 4) زێڕ و زێو. 5) ناسین و جیاکردنەوەی پارەی ئەسڵ و نائەسڵ لە یەکتر. 6) هەقیقەت و جەوهەری شتێ یان کەسێک. "**نقد ادبی**": ڕەخنەی ئەدەبی، تاوتوێ و شرۆڤەکردنی بەرهەمی ئەدەبییەکان.. "**نقد تأویلی**": ڕەخنەی ڕاڤەکارانە. "**نقد تکوینی**": ڕەخنەی پێکهاتەیی. "**نقد حال**": ئەوەی دەربڕی ئێستایە. "**نقد ذهنی**": ڕەخنەی زەینی. "**نقد عملی**": ڕەخنەی پڕاکتیکی، ڕەخنەی کردەیی. "**نقدعینی**": ڕەخنەی بابەتییانە. "**نقد فمینیستی**": ڕەخنەی فێمینیستی، ڕەخنەی مێخوازانە. "**نقد قانونمند**": ڕەخنەی یاسامەند/ یاساڕێژ. "**نقد قضایی**": ڕەخنەی دادوەرانە. "**نقد کلامی**": ڕەخنەی ئاخاوتەیی. "**نقد کردن**": 1) کردنە پارە، نەخت کردن. 2) هەڵسەنگاندنی بەرهەمی هونەری و ئەدەبی، خوێندنەوە و تاوتوێکردن. 3) وەدەست هێنان. "**نقد نسبیّت**": ڕەخنەی ڕێژەییخوازانە. "**نقدنظری**": ڕەخنەی تیۆریک/ تیۆرەکی. "**به نقد**": لە حاڵی ئێستا دا، لە دۆخی ئێستادا.

**نقداً:** 1) بەنەخت، نەختی. 2) لە دۆخی ئێستادا.

**نقدشناس:** بڕوانە: "صراف".

**نقدی:** نەختی، نەختینە، دەستی.

**نقدین:** زێڕ و زێو.

**نقدینگی:** نەختینەیی.

**نقدینه:** نەختینە، پارەی نەخت.

**نقر:** 1) هەڵکۆڵین و نیگارکێشان لە سەر بەرد یان دار. 2) کون کردن، ڤەرۆتن، سمین. 3) کوتان، ژەنین.

**نقرس:** دەردەمیران، دەردەشا، نەخۆشی دەوڵەمەندەکان، گۆشت گر.

**نقره:** زێو، زیو، زیڤ. "**نقرەاندود**": سیماڤ، ڕووکەش کراو بە زێو، زێوکفت.

**نقرەای:** 1) زێوی. 2) چێکراو لە زێو.

**نقرەداغ کردن:** وەرگرتنی پارەیەک لە کەسێک بە ناڕەوا.

**نق زدن:** نقەنق کردن، نووکەنووک کردن، پرتەپرت کردن.

**نقش:** 1) ڕەنگاندن، کێشانەوەی شکڵ و

فۆڕمی شتێ یان کەسێك، نەخش، هێڤس، نتل. 2) ڕۆڵ، دەور. 3) ئاسەوار، نیشانە. **"نقش آوردن"**: لە قوماردا تاس یان کارتی براوە هێنان. **"نقش امری را زدن"**: خستنە خانەی جێبەجێکردنەوە. **"نقش انداختن"**: نەخش ساز کردن. **"نقش انگیختن (برآوردن، برانگیختن)"**: نەخش سازکردن، وێنەی جۆراوجۆر دەرخستن. **"نقش باختن"**: فرتوفێڵ کردن، فەندوفێڵ کردن. **"نقش باز مالیدن"**: 1) بردنەوە لە قوماردا بە هاتنی خاڵی باش. 2) تەمبێ کردنی ئەو. **"نقش بازیکردن"**: 1) دەورگێڕان، ڕۆڵ گێڕان. 2) ڕواڵەت نوێنی کردن. 3) ڕۆڵ هەبوون، نەخش هەبوون. **"نقش بر آب زدن"**: 1) کاری پووچ و بێهوودە کردن. 2) فێڵ کردن، فەندوفێڵ کردن. **"نقش بر زمین شدن"**: کەوتن، بە زەوی دادران. **"نقش برگشتن"**: بەخت و شانس وەرگەڕان. **"نقش بر یخ زدن"**: کاری بێ بەر و بێهوودە کردن. **"نقش بستن"**: 1) نەخش گرتن، نەخش ساز بوون. 2) وەدیهاتن، دروست بوون. 3) بڕوانە: "بە تصویر کشیدن". 4) ئافراندن، هێنانەدی. 5) ڕازاندنەوە. 6) وێناکردن، خەیاڵ کردن(ەوە). **"نقش به حرام بودن"**: بێ بایەخ بوون، پووچ بوون. **"نقش پذیرفتن"**: قبووڵ کردنی ڕۆڵ یان نەخش. **"نقش خواندن"**: ئاگاداربوون لە دۆخێ. **"نقش دادن"**: ڕۆڵ پێدان، دەورپێدان. **"نقش داشتن"**: دەورهەبوون، ڕۆڵ هەبوون. **"نقش دست دادن"**: بڕوانە: "نقش آوردن". **"نقش دیوار"**: بێ کەڵك و بێ هونەر. **"نقش زدن"**: 1) نیگارکێشانەوە، وێنەکێشانەوە. 2) فەندوفێڵ کردن، فێڵبازی کردن. **"نقش (روی) زمین شدن"**: بە زەوی داکەوتن، بە زەوی دادران. **"نقش غلط خواندن"**: هەڵەکردن، گومڕابوون. **"نقش کردن"**: نیگارکێشانەوە، وێنەکێشانەوە. **"نقش کردن با کسی"**: فریودانی ئەو. **"نقش کسی را تباه کردن"**: لە ناوبردنی ئەو. **"نقش کسی را شستن"**: زایەکردنی کاری ئەو، شۆردنەوەی دەور و نەخشی ئەو. **"نقش کشیدن"**: نیگارکێشانەوە، وێنەکێشانەوە. **"نقش کم زدن"**: دۆڕاندن لە قوماردا. **"نقش گرفتن"**: 1) مانەوە. 2) نەخش وەرگرتن، نەخش گرتن. **"نقش نهادن"**: بڕوانە: "نقش انگیختن".

**نقش آفرین:** 1) نیگارکێش، وێنەکێش. 2) ڕۆڵگێڕ، دەورگێڕ.

**نقش آفرینی:** دەورگێڕی، ڕۆڵ گێڕی، ڕۆل لیستن.

**نقش الحجر:** 1) نەخشی سەر بەرد. 2) نەخشی پایەدار.

**نقش انداز:** بڕوانە: "نقاش".

**نقش باز:** 1) ڕۆڵگێڕ. 2) بڕوانە: "فریبکار".

**نقش بند:** نیگارکێش، نەخش بەند، کەسێ شت بە ڕەنگ پیاساوین جوان دەکا.





**نقشبندی:** 1) نیگارکێشی، وێنەکێشی. 2) فێڵبازی، پیلان.

**نقشبندیه:** نەخشبەندی، نەخشەبەندی، مریدانی تەریقەتی نەخشبەند.

**نقش پذیری:** 1) نەخش وەرگرتن. 2) ڕۆڵ وەرگرتن. 3) قبووڵ کردنی ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو.

**نقش پرداز:** بڕوانە: "نقاش".

**نقشدار کردن:** نەخشاندن، نتلاندن، هێڤساندن.

**نقشگر:** دەس ڕەنگین، هونەرمەند. وێنەکێش، نیگارکێش.

**نقش مند:** (زماننناسی) بوونی ڕۆڵی ڕێزمانی.

**نقش نامه:** کتێوی وێنەدار.

**نقشه:** 1) خەریتە، نەخشە. 2) پلان، بڕیاری چۆنیەتی کردنی کارێك لە بیر و هۆش دا. **"نقشه ریختن (چیدن)"**: پلان داڕشتن یان ڕێکخستنی بەرنامەیەکی زەینی بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو. **"نقشه کشیدن برای کسی"**: 1) پیلان گێڕان دژی ئەو. 2) ڕێگاخۆشکردن و بەرنامە بۆ داڕشتن بۆ ئەو بەشێوەی نهێنی.

**نقشەبرداری:** نەخشە هەڵگرتنەوە، ڕووپێوی.

**نقشەکشی:** 1) نەخشەکێشانەوە. 2) پلان دانان.

**نقشەنگاری:** "کارتۆگرافی".

**نقشین:** نەخشین، نەخشدار.

**نقشینه:** شتی گرانبایی، شتی ئەنتیکە.

**نقص:** (نَ) 1) کەم کردن، کورت هێنان. 2) کەمایەسی، کەموکورتی، کێم و کاسی، کێماسی، ناتەواوی، عەلەم، خەش، عەیب. **"نقص داشتن"**: کەموکورتی هەبوون، کەمایەسی هەبوون. **"نقص رسیدن"**: زیان پێگەیشتن. **"نقص عضو"**: نوقستانی، کەم ئەندامی، سەقەتی. **"نقص کردن"**: ڕەخنەگرتن، ئیرادگرتن.

**نقصان:** (نُ) 1) کەم کردن، کورت هێنان. 2) کەمووکووڕی، ناتەواوی، کەممی. **"نقصان پذیرفتن"**: کەمبوونەوە. **"نقصان کردن"**: کەمبوونەوە. **"نقصان کشیدن"**: زیان دیتن. **"نقصان گرفتن"**: لەکەمیدان، بەرەو کەمبوونەوە چوون. **"نقصان یافتن"**: 1) کەمبوونەوە. 2) زیان دیتن، تووشی زیان بوون. **"بدون نقصان"**: نەخت و پوخت، بێ عەیب و کەمایەسی.

**نقصان اندیش:** بیرکورت، کەم زەین، سەرکوێر، نەزان.

**نقض:** 1) شکاندنی بەڵێن و پەیمان، پێ ڕێخستن، پێشێل کردن، پێپەس کرن، بن پیکرن. 2) (مافناسی) هەڵوەشاندنەوەی بڕیار. **"نقض کننده"**: پێشێل کەر، پێ پەسکەر، پەیمان شکێن.

**نقضی:** پووچەڵکەرەوە، هەڵوەشێنەر.

**نقط:** (نُ.قَ) کۆی "نقطە".

**نقطه:** 1) پن، پنت، پنك، نوختە،

نوختا، نوختك، خالْ. 2) جێگە، شوێن. 3) ناوەند، چەقی بازنە. "**نقطە اتکا**": پالْپشت، پشتیوان. "**نقطە التقا**": خالْی بەیەك گەیشتن. "**نقطە انجماد**": خالْی بەستن، خالاجەمدینیْ، خالا قەرسینیْ. "**نقطە اوج**": چلْەپۆپە، دوند، دهار، گۆپك. "**نقطە تماس**": خالْی لێکەوتن. "**نقطە جوش**": تین و گەرمایەك کە لەودا تراو دێتە کولْ. "**نقطەدایرە**": چەقی بازنە/ جەغز. "**نقطە سیاە**": گلێنەی چاو. "**نقطە ضعف**": خالْی لاواز. "**نقطەعطف**": خالْی وەرچەرخان، خالا گوهەرینیْ. "**نقطە کور**": نەبین، جێیەك کە نەبینریْ. "**نقطە گذاردن**": خالْ دانان. "**نقطە معین**": خالْی دیاریکراو. "**نقطە مقابل**": خالْی بەرامبەر، خالاهەمبەر. "**نقطەنقطە**": خالْ خالْ، خالْدار، پنۆك پنۆك. "**حرف نقطەدار**": نوختکن، بەنوختە، پیتی نوختەدار، پیتا پنك دار.

**نقطەای:** بە شکلْی نوختە.

**نقطەبند:** نوختە ویرگوول.

**نقطەگاە:** چەقی جەغز.

**نقطە گذاری:** خالْبەندی.

**نقطە نظر:** ڕوانگە، سۆنگە.

**نقل:** 1) گواستنەوە، ڕاگوێزان، ڕاگواستن، ڤەگوهاستن. 2) گێڕانەوە (لە قەولی کەسێکەوە). 3) چیرۆك، خەبەرۆشك، ڕازیْ. 4) قسە، پەیڤ. 5) وەرگێڕان. 6) ڕەوانە، ڕێکەوتن. "**نقل افتادن**": 1) ڕاگوێزران، ڕاگواستران. "**نقل داشتن**": 1) ئەنجامدانی کاری زیرەکانە یان هەبوونی حالْەتی سەرسووڕهێنەر کە بۆ گێڕانەوە بشیْ. 2) گرینگ بوون، بەبایەخ بوون. "**نقل قول**": گوتنەوە یان نووسینەوەی قسەیەك لە کەسێکەوە (بە نقل قول از: بە قەولی). "**نقل قول کردن**": گوتەگێڕانەوە. "**نقل کردن**": 1) گێڕانەوە. 2) دەربڕین، هەقایەتکردن. 3) وەرگێڕان. 4) ڕاگواستن، ڕاگوێزان. 5) مردن. 6) ڕۆیشتن، چوون. "**نقل گفتن**": هەقایەت وتن. "**نقل مذهب**": ڕێباز گۆڕین، ئایین گۆڕین. "**نقل مکان**": جێگۆڕکیْ. "**نقل و انتقال**": ڕاگواستن. 2) بردنی پارە لە حەساوێکەوە بۆ حەساوێکی تر. "**نقل و تحویل کردن**": 1) ڕاگواستران، ڕۆیشتن. 2) ڕاگواستن، بردن.

**نقلی:** ڕاگوێزراو، ڕاگواستراو.

**نقود:** کۆی"نقد".

**نقوش:** کۆی"نقش".

**نقول:** کۆی"نقل".

**نقیب:** سەرۆکی قەوم.

**نقیر:** کەمیْ، کەمەکیْ. تەك و تەنیا. "**نقیر و قمطیر**": 1) کەم و زۆر. 2) هەموو شتیْ. 3) بە تێروتەسەلی.





**نقیصە:** عەیب، کەموکورتی، کەمووکوڕی، کێماسی، خوو و خدەی ناحەز.

**نقیض:** دژ، پێچەوانە، تایبەتمەندی ئەوەی لە بەرامبەر شتێکی تردا جیْ دەگریْ و بەجۆریْ کە بە بوونی ئەو ئیتر ناتوانیْ بوونی هەبیْ وەك مەرگ لەبەرامبەر ژیاندا.

**نقیە:** وشە، پەیڤ، گوتە.

**نکات:** کۆی"نکتە".

**نکاح:** مارەبڕین، پەیمانی ژن و مێردایەتی. "**نکاح بستن**": مارەکردن، مارەبڕین. "**نکاح مفوض**": پەیمانی ژن و مێردایەتییەك کە لەودا مارەیی دیاری نەکرابیْ. "**نکاح منقطع (انقطاعی)**": ژن و مێردایەتییەك کە هاوسەرگیری دەبیْ ماوەکەی دیاری بکریْ. "**بە نکاح درآمدن**": مارەکران، بوونە ژنی کەسێك. "**در نکاح شدن**": بڕوانە:"بە نکاح درآمدن":

**نکاح نامە:** بڕوانە:"عقدنامە".

**نکارت:** نەزانی.

**نکاف:** (نُ) گویْ ڕەپە، سەرپنوم، نەخۆشی بنانگویْ ئەستوور بوون، ملەخڕە. "**نکاف گاو**": گابنێزك، گابنێزکی، گابنێسك.

**نکال:** 1) ئازار، ئەشکەنجەی سەخت. 2) مایەی ژانەسەر و عەزاو. 3) ناودەرکردن بە سەرشۆڕی و ناوزڕان.

**نکبت:** (نَ.بَ) 1) بەدبەختی و چارەڕەشی. 2) بەلەگەور، نەهاتی، نەگبەتی. 3) بڕوانە: "شآمت". 4) بەلاْ، نەگبەت، ڕەنج، سەختی.

**نکتە:** 1) خالْ. 2) قسەی خۆش، پێکەنینۆك، حەنەك، نوکتە. 2) بڕوانە: "موضوع". 4) هێما، برێتی. 5) قسەی بەکەلْك و تێکەلْ بە پەند. 6) بڕوانە: "ایراد". "**نکتە بە نکتە**": خالْ بە خالْ، پاژبەپاژ، مووبەموو. "**نکتە درانداختن**": خستنەڕووی بابەتێکی ورد و سەخت بۆ تاقیکردنەوەی دیتران. "**نکتە راندن**": بە وردی و ناسکی ئاخاوتن. "**نکتە گرفتن**": وردەگرتن، ئیرادگرتن.

**نکتەانداز:** بڕوانە:"نکتەپرداز".

**نکتەبین:** وردبین.

**نکتە پرداز:** کەسیْ کە قسەگەلی ورد و قوولْ و پڕمانا ئێژیْ، نوکتەپەروەر، نوکتەوێژ.

**نکتەجو(ی):** بڕوانە:"نکتەسنج".

**نکتەدان:** نوکتەزان، کەسیْ کە قسەی ناسك و پڕمانا دەکا.

**نکتەسنج:** قسەقوت، وردبین، تیژبین.

**نکتەشناس:** بڕوانە:"نکتەسنج".

**نکتەگو:** بڕوانە:"نکتەپرداز".

**نکتەگیر:** ئیرادگر، ڕەخنەگر، وردەگیر.

**نکتەیاب:** بڕوانە:"نکتەسنج".

**نك تیز:** سەرتیژ، سەرتێژ، سەرتووژ، نووك تیژ.

**نکث:** پەیمان شکاندن، شکاندنا پەیمانیْ، تێکدانی پەیمان.

**نکراء:** 1) زیرەکی. 2) توندی و سەختی. 3) ناحەز و ناپەسند.

**نکردەکار:** بیْ ئەزموون، کارنەکردو.

**نکره:** 1) ناڕێك و ناقۆڵا. 2) بێ فەرهەنگ. 3) (ڕێزمان) نەناسراو.

**نکس:** 1) سەرەونخوون کردن، هەڵگێڕانەوە و سەرنخوون کردن. 2) سەرشۆڕکردن. 3) گەڕانەوەی نەخۆشی.

**نکش:** نەکێشراو.

**نکند:** نەکەی، مەبادا.

**نکو:** 1) چاك، باش، خاس. 2) جوان. 3) شیاو، پەسندکراو. 4) دروست. "**نکو داشتن**": بەباشی ئاگا لێبوون. 2) بەباشی میواندارەتی لێکردن. "**نکویی**": چاکە، چاکەیی، پیاوەتی.

**نکوخو:** خۆش ئەخلاق، دلۆڤان.

**نکورای:** 1) خۆش فکر، بیر ڕوون، بۆچوون باش. 2) خێرخواز.

**نکورو:** بڕوانە:"نیکورو".

**نکوگو:** 1) قسەخۆش، قسەشیرین. 2) ئامۆژگاریدەر.

**نکول:** ترسان و ڕووەرگێڕان لە دوژمن. خۆبواردن لە وڵامدانەوە یان سوێندخواردن.

**نکومحضر:** ڕووخۆش، ڕوولکەن.

**نکومنظر:** جوان قەشەنگ.

**نك ونال:** سکاڵا و ناڵەوگریان.

**نکوهش:** سەرزەنشت، سەرکۆنە، لۆمە.

**نکوهنده:** سەرزەنشتکار، لۆمەکار.

**نکوهیدن:** سەرزەنشت کردن، لۆمەکردن، زەمکردن، بەدوێژی، تانەوتەشەرلێدان.

**نکویی:** 1) چاکی، خاسی. 2) جوانی.

**نکهت:** بۆنی خۆش، بۆن و بەرامە، لابانتە.

**نکیر:** حاشا، نکۆڵی، بابەتی سەخت و دژوار.

**نگار:** 1) نەخش، نەخش و نیگار، وێنە. 2) دۆستی جوان چاك. 3) ژن یان کچی جوان چاك. 4) خشڵ، خشر، زێڕوزەنبەر. 5) بڕوانە:"منقش". "**نگار افکندن(بستن، نهادن)**": خەنەلێدان. "**نگار پذیرفتن**": نەخش گرتن/ وەرگرتن. "**نگارکردن**": 1) نیگارکێشانەوە، وێنەکێشانەوە. 2) تۆمارکردن. 3) ڕازاندنەوە، خەملاندن. 4) گەوهەرنیشان کردن. 5) خەنەلێدان. "**نگارگرفتن**": 1) نەخش و نیگار گرتن. 2) خەنەلێدان. "**بەنگار**": بڕوانە: "منقش".

**نگاربندی:** نیگارکێشی، وێنەکێشی.

**نگارپرست:** بوت پەرست.

**نگارخانه:** 1) نیگارخانە، جێگەی ڕانانی وێنە و شکلان، پیشانگای نیگارکێشی. 2) کارگەی نیگارکێشی. 3) بوتخانە.

**نگارستان:** شوێنی پڕنەخش و نیگار، کارگەی نیگارکێشی.

**نگارش:** نووسین.

**نگارشات:** نووسراوەکان.

**نگارکار:** نەخشدار، بەنەخش و نیگار، ڕازاوە.

**نگارگر:** 1) نیگارکێش، وێنەکێش. 2) بوت ساز.





**نگارنده:** 1) نووسەر. 2) وێنەکێش، نیگارکێش. 3) ئافرێنەر. "**نگارنده غیب**": خوا.

**نگاره:** شکڵی کێشراو، وێنە، هێڵکاری، پیشاندەر، "گراف".

**نگاری:** تایبەتی نەخش و نیگار.

**نگاریدن:** 1) بڕوانە: "نگاشتن". 2) نیگارکێشانەوە.

**نگارین:** 1) جوان، قەشەنگ. 2) ڕەنگین، نەخشدار، نەخشاو، بەنەخش و نیگار، ڕەنگاوڕەنگ کراو، ڕازاوە. 2) دۆست و خۆشەویستی قەشەنگ. 3) خەنەکراو.

**نگاشتن:** 1) نووسین، نڤیساندن. 2) تۆمارکردن. 3) وێنەکێشانەوە، نیگارکێشانەوە. 4) کێشانەوە. 5) چێکرن، ئافراندن. 6) کۆڵین، هەڵکۆڵین. 7) گەوهەرنیشان کردن. 8) ڕازاندنەوە، خەملاندن.

**نگاه:** 1) تواشا، ڕوان، نواڕ، هێف. 2) چاو. "**نگاه افکندن**": بڕوانە: "نگاه انداختن (1)". "**نگاه انداختن**": 1) چاولێکردن بۆ ماوەیەکی کورت. 2) بڕوانە:"بررسی اجمالی". "**نگاه باختن**": بڕوانە: "نگاه انداختن (1)". "**نگاه بازکردن**": تێفکرین، تێڕامان. "**نگاه برداشتن از چیزی**": چاو لێهەڵگرتن لێی. "**نگاەداشتن**": 1) ڕاگرتن، ئاگالێبوون، لای خۆ پاراستن. 2) ڕاگرتن، وێستاندن، هێشتنەوە، هێلشتن، هەڵ شڵنگاندن، هەڵ شلێنگاندن. 3) هێشتنەوەی کەسێ لەلای خۆ وەك میوان. 4) بەندکردن، خستنە بەندیخانەوە. 5) یاداشت کردن، لە بیر دا هێلانەوە. 6) شاردنەوە، وەشاردن. 7) بڕوانە: "پاییدن". 8) سەرنجدان، لێوردبوونەوە. 9) خۆپاراستن، قایمکاری کردن. 10) دوورخستنەوە، خستنەلاوە. "**نگاه دوختن به کسی**": بەزەقی تواشای ئەو کردن، زیتەوبوون لەو. "**نگاه را دزدیدن**": بەخێرایی چاوهەڵگرتن لەکەسێك و ئیتر تواشانەکردنی. "**نگاه کج**": تواشای بەخێسەوە، ڕوانینی بەتووڕەییەوە. "**نگاه کردن**": 1) ڕوانین، تێڕوانین، نۆڕین، نواڕین، نهێڕین، نهێڕتن، نێڕتن، نێڕین، نەیڕین، تواشا کردن، چاولێکردن، سەیرکردن، سەرنج دان، لێمەیزاندن، هێف کرن، هێڤ کرن، دیای، هۆونەیش، وەینیایش. 2) تاوتوێکردن. 3) تێڕامان، تێفکرین. 4) سەرنجدان. 5) پێشبینیکردن. 6) پەیاکردن، وەدەست خستن. "**خود را نگاه داشتن**": بەربەخۆگرتن، خۆبواردن.

**نگاەدار/ نگهدار:** نگادار، پارێزەر، ڕاگر، ئاگادار، چاوەدێر، پشتیوان.

**نگاەداشت:** پاراستن، ئاگالێبوون.

**نگاەگذرا:** ڕوانینی سەرپییی، چاوخشاندنی خێرا، لێ نهێرینەکە سەرپێ.

**نگر:** نموونە، سەرچەشن.

**نگران:** پەرۆش، دڵبەدوا، دەهدل، دوودڵ، دڵ پەرێشان، دڵ پەشێو، چاوەڕێ، چاوەنۆر، چاولەدوو، دڵخور، نیگەران.

**نگرانی:** تاتێل، پەژارە، دڵ پەشێوی، دڵەخورپێ، دڵەقوتکێ، چاوەڕوانی، چاولەدوویی، پەرۆشی، نیگەرانی.

**نگرش:** 1) بۆچوون، ڕوانگە. 2) بڕوانە: "نگاه".

**نگره:** بڕوانە: "نظریه".

**نگرەای:** بڕوانە: "نظری".

**نگرەپرداز:** بڕوانە: "نظریەپرداز".

**نگریدن:** بڕوانە: "نگریستن".

**نگریستن:** 1) بڕوانە: "نگاەکردن(1)". 2) سەرنجدان، گرینگیدان، ئاوڕلێدانەوە. 3) تێفکرین، تێڕامان، هەڵسەنگاندن. 4) خۆپارێزیکردن، ئاگا لەخۆبوون.

**نگریه:** بڕوا، بۆچوون.

**نگندن:** ناشتن.

**نگوسار:** سووکەڵەی "نگونسار".

**نگون:** 1) سەرنخوون، نخوون، نووخن، نگم، ئاوەژوو، قڵپ. 2) لارەوەبوو، چەماوە. 3) دەمەوڕوو، بەڕووداکەفتگ. "**نگون آمدن**": سەرەونخوون بوون، سەرەوژێربوون. "**نگون افکندن**": داهێڵان، چەماندن. "**نگون شدن**": 1) سەرەونخوون بوون. 2) بە زەوی دادران. 3) خراوبوون، ڕووخان، داڕمان. 4) بڕوانە: "سرازیرشدن". 5) پێچەوانەبوونەوە، پووچەڵبوونەوە.

**نگون بخت:** چارەڕەش، بۆنەهاتوو، بەدبەخت.

**نگونسار:** 1) نخوونەوەبووگ، سەراونخوون، سەرەوژێر، سەرنەوی، نگمەسار. 2) کاول، وێران. 3) شەرمەزار. 4) بڕوانە: "شوم". 5) پەست، نزم. 6) دەمەوڕوو، بەڕووداکەوتو.

**نگون ساری:** 1) سەرەونخوونی. 2) پەستی، نزمی. 3) بەدبەختی، چارەڕەشی.

**نگونه:** بڕوانە: "سرنگون".

**نگونی:** 1) بڕوانە: "سرنگونی". 2) بڕوانە: "سرازیری".

**نگە:** بڕوانە: "نگاە". "**نگە بە پشت پا بستن**": شەرمەزاربوون. "**نگەچراندن**": بڕوانە: "چشم چرانی". "**نگەداشتن**": 1) بڕوانە: "نگاەداشتن(1)". 2) چاوەدێریکردن، ئاگالێبوون. 3) ڕاگرتن، لە حەرەکەت خستن. 4) ڕاگیران.

**نگەانداز:** ئەو مەودایەی کە چاو هەتەری لێ دەکا.

**نگهبان/نگهبان:** زیرەڤان، ئێشکگر، کێشکچی، جەزایرچی، نۆبەچی، نۆبەدار، نگابان، پاسەوان، پازگر، دبدۆب، دبدب.

**نگهبانی:** کێشک گرتن، کێشک کێشان، ئێشک گرتن، پاسەوانی، زیرەڤانی، نۆبەت، نۆبەگرتن، ئاگاداریکردن، ئاگالێبوون، پاراستن.

**نگەچرانی:** بڕوانە: "چشم چرانی".





**نگهداری:** پاراستن، پارازتن، پارێزنای، ئاگاداری(لێ)کردن، ئاگالێبوون، چاولێبوون، ڕاگرتن، نگاداری، بەخەم کردن، بەدیارەوەبوون، سەرپەرستی، خوێداری، هەڵگرتن، سەغبیری. "**نگهداری شدن**": هەڵگیران، هەڵگیریان، ڕاگیران، پارێزران.

**نگین:** 1) نقێم، قاش. 2) کلکەوانە، ئەنگوستیلە. "**نگین نگین**": تنۆك تنۆك، دڵۆپ دڵۆپ. "**نگین نگین شدن**": بە شکڵی نقێم دەرهاتن. "**نگین(بر) نهادن**": مۆر کردن. "**بە زیر نگین آوردن**": مل پێکەچکردن، مل پێدانەواندن. "**در زیر نگین داشتن**": لەژێر دەسەڵات دابوون. "**زیر نگین**": بەرفەرمان، فەرمانبەر، ملکەچ.

**نگین بخش:** ئەوەی نقێم پاشایەتی دەبەخشێتە کەسێك. 2) دەسەڵاتداری زۆر مەزن.

**نگین سا(ی):** گەوهەرساز.

**نگین کدە:** کلکەوانە، ئەنگوستیلە.

**نم:** 1) هی، هێو، هێویتی، هێوایی، هێمی، هێمیتی، هوت، هووت، شە، شی، شێ، تەڕایی، تەڕی، نم. 2) ئاو. 3) باران. 4) ئەسرین، فرمێسك. 5) دڵۆپ، تنۆك. "**نم افکندن**": وشك بوونەوە. "**نم برداشتن**": نم کێشان. "**نم برون (بیرون) ندادن**": 1) تەڕایی نەدان، شێ نەدانەوە. 2) بڕوانە: "نم پس ندادن". "**نم پس ندادن**": 1) قڕنیس بوون، سەقیل بوون. 2) نەگێڕانەوەی هەواڵێ یان لێوەشاردن. "**نم خوردن**": ئاودێری کران. "**نم دادن**": 1) نمدانەوە، تەڕایی دان. 2) بارین. "**نم داشتن**": شێداربوون، نمداربوون. "**نم زدن**": تەڕکردن. "**نمِ شب**": بڕوانە: "شبنم". **نم کشیدن**": نم کێشان، شێ کێشان، شەلێدان، نم کێشان، شەه کێشان، هووت ئانتش. "**نم کشیده**": شێدار، نم کێشاو، هیمین. "**نم گرفتن**": 1) شێداربوون، نم لێدان. 2) فرمێسك ڕشتن.

**نما:** نما، نوان، نوێن، شاندەر، دیمەن، ڕواڵەتی شتێ، بەشی دەرەوەی بینا، ڕووکار، لەبەرچاو. "**نمای درشت (نزدیك)**": (سینەما، شانۆ) بڕوانە: "کلوزاپ".

**نمابر:** فاکس.

**نمابندی:** پێکهاتەی ڕواڵەتی.

**نماد:** هێما، سەمبول، نوێنەر، نیشانە،پیشاندەر، شاندەر. "**نماد عمومی**": هێمای گشتی. "**نماد منطقی**": هێمای لۆژیکی.

**نمادپردازی:** بە کۆمەگی هێما یان سەمبولەوە نیشاندان یان تاوتوێی شتێ یان بابەتێ، کەڵك وەرگرتن لە هێما بۆ مەبەستێکی تایبەت.

**نمادگان:** سەمبولیزم، هێماخوازی.

**نمادگرایانە:** هێماخوازانە.

**نمادگرایی:** بڕوانە: "سمبولیسم".

**نمادی:** بڕوانە: "نمادین".

**نمادین:** هێمایی، هێمایین، هێمادار، سەمبولیك، ڕەمزی.

**نمار:** هێما، ئاماژە، ڕەمز.

**نماز:** نوێژ، نۆژ، نڤێژ، نمیٚ، نمێژ، مێژ، نما. "**نماز آدینە**": نوێژی هەینی. "**نماز آوردن**": کڕنۆش بردن. "**نماز استسقاء( باران )**": نوێژەبارانە، نڤێژابارانیٚ، نڤێژ بۆ باران بارین لە وشکەساڵیدا. "**نماز اشراق( بام، بامداد )**": نوێژی بەیانی. "**نمازبردن**": 1) چەمانەوە لەسەر خاك و كڕنۆش بردن. 2) نوێژخوێندن. "**نماز بە جا آوردن**": نوێژکردن. "**نماز پسین**": نوێژی عەسر. "**نماز پیشین**": 1) نوێژی نیوەڕۆ. 2) کاتی نیوەڕۆ. "**نماز چسباندن**": بەپەلە نوێژ خوێندن. "**نماز عشا**": نوێژی خەوتنان. "**نمازخواندن**": نوێژکردن، نوێژکردن. "**نماز دیگر**": نوێژی عەسر. "**نماز را شکستن**": پووچەڵکردنەوەی نوێژ. "**نماز فرادا**": نوێژیٚ کە بە تەنیایی دەخوێنریٚ. "**نمازگزاردن**": نوێژخوێندن، نوێژکردن، نۆژکرن، بەجێهێنانی نوێژ. "**نماز گزاردن بر کسی**": نوێژخوێندن لەسەر تەرمی ئەو. "**نماز گذشتە را قضاکردن**": نوێژگێڕانەوە، نوێژقەڵاکردن، نوێژقەڵاکردنەوە، نوێژی چوو کردنەوە. قەرەبووکردنەوەی نوێژی فەوتاو بە نوێژ. "**بە (در) نماز ایستادن**": دەست بەنوێژ کردن. "**در نماز آمدن**": 1) دەست بە نوێژخوێندن کردن. 2) کڕنۆش بردن.

**نمازخوان:** 1) نوێژخوێن، نوێژکەر. 2) باوەڕدار، بەئیمان.

**نمازکار:** بڕوانە: "نمازگزار".

**نمازگزار:** نوێژخوێن، نمێژکەر، نوێژکەر، مێژکەر، کەسیٚ کە نوێژ بەجیٚدێنیٚ. "**نمازگزار دائمی**": نوێژقایم، کەسێك کە نوێژی ناچیٚ.

**نمازی:** 1) نوێژخوێن. 2) پاك، شۆراو و خاوێن. 3) بەپێی شەرع، دروست. "**نمازی کردن**": شۆردنەوە، پاك كردنەوە.

**نماکاری:** ڕازاندنەوەی نمای خانووبەرە.

**نمّام:** شۆفار، تێچێن، شەیتانیکەر، دووزبان، دووزمان، دۆقلمەر.

**نماهنگ:** ویدیۆکلیپ.

**نمایان:** 1) دیار و ئاشکرا، بەرچاو. 2) جێی سەرنج، گرینگ. "**نمایان آمدن**": بڕوانە: "نمایان شدن". "**نمایان شدن**": ئاشکرابوون، خویابوون. "**نمایان کردن**": دەرخستن، ئاشکراکردن.

**نمایاندن:** نواندن، نوڤاندن، شاندان بە خەڵك، پیشان دان، ئاشکراکردن، دەرخستن، ڕانان، ڕانوان، ڕانواندن، خستنە بەرچاوی حەشیمەت.

**نمایانگر:** پیشاندەر، شاندەر، نیشاندەر، نیشانە،نیشانەیا، دەرخەر.

**نمایش:** 1) شانۆ، ماشکانیٚ. 2) پیشاندان، نیشان دان، نواندن، ڕانان. 3) خەیاڵ، وەهم. "**نمایش دادن**": 1) پیشاندانی شانۆ. 2) نواندن، پیشاندان. "**نمایش داشتن**":





بڕوانە: "ظهورکردن". "**نمایش عینی**": شانۆی بابەتی/ بابەتییانە. "**نمایش کردن**": 1) بڕوانە: "جلوەکردن". 2) ڕێنوێنیکردن. "**بە نمایش درآمدن**": پیشاندران، خرانە بەر دیدەی تواشاچیان. "**بە نمایش گذاشتن**": 1) پیشاندانی شانۆ، نواندن. 2) خستنە بەر دیدەی تواشاچیان، شاندان بۆ خەڵك. "**نمایش مهیّج**": شانۆی هەست بزوێن، ماشکانییا ب جۆش.

**نمایش پرداز:** بڕوانە: "نمایشنامەنویس".

**نمایش پردازی:** شانۆنامەنووسی، هونەری شانۆ.

**نمایشگاه:** پێشانگا، پێشانگە، ڕانگە، جێگەی ڕانان.

**نمایشگر:** 1) ئەکتەر، شانۆکار. 2) (کامپیۆتێر) مۆنیتۆر.

**نمایش نامە:** شانۆنامە، "پەیس". "**نمایشنامەنویس**": شانۆنامەنووس، دراماتیست.

**نمایشی:** ویترینی. شانۆیی( دەپێوەندی دەگەڵ هونەری شانۆدا)، دراماتیك.

**نمایندگی:** 1) نوێنەرایەتی، نونەراتی. 2) ڕێنوێنی.

**نماینده:** 1) شاندەر، پیشاندەر. 2) نوێنەر، نونەر، بەرکەیە، بریکاری خەڵك، دەمڕاستی گەل. 3) هێما، سەمبول. 4) ڕێنوێنیکەر. 5) ئاشکرا، دیار.

**نمایه:** 1) پێرست. 2) پێشەکی، سەرەتا.

**نمایی:** باڵاکەر، گەشەکەر.

**نماییدن:** نیشاندان، پیشان دان.

**نمج:** بڕوانە: "نم".

**نمد:** لمەد، لبا، لباد، کولاڤ. "**نمدافکندن**": نیشتەجیٚ بوون لە شوێنیٚ. "**نمد بافتن**": لبادسوونەوە. "**نمد درربودن**": فریودان، خەڵەتاندن. "**نمد مالیدن**": لبادسوونەوە. "**نمدی آفتاب کردن**": وەدەست خستنی هەل و دەرفەتیٚ، ساتیٚ بەئاسوودەیی ڕابواردن.

**نمدار:** شێدار، شەدار، تەڕ، نمین، نمسار، هیت، هووتن.

**نمدیده:** بڕوانە: "نمدار".

**نمره:** نمرە، ژمارە بۆ ئەزموونی دەرس خوێنان. پلە. پلاك. "**نمره انداختن**": ژمارەخستن. "**نمره برداشتن**": ژمارە هەڵگرتنەوە. "**نمره زدن**": ژمارەلێدان. "**نمرەگرفتن**": 1) نمرە وەدەست هێنان لە وانەدا. 2) ژمارەگرتن. "**نمره نا پلئونی**": لانیکەمی نمرەی قبووڵی.

**نمرەگذاری:** ژمارە بۆ دانان.

**نم زده:** 1) تەڕ، شێدار. 2) بڕوانە: "اشك بار".

**نم سنج:** شیٚپێو، ئامرازی دیاریکردنی ڕادەی شیٚ.

**نمش:** فیٚڵ، تەڵەکە.

**نمط:** شێوە، شێواز، چەشن.

**نمك:** خویٚ، خیٚ. "**نمك از چیزی رفتن**": بیٚ خویٚ بوونی ئەو شتە، بیٚ کەڵك و بیٚ نرخ بوونی ئەو. "**نمك از لعل ریختن**": قسەی

خۆش و دڵگیر کردن. "**نمك پاشیدن**": خوێ پێداکردن، خوێ پێوەکردن. "**نمك بر (بە) زخم (کسی) پاشیدن**": برین کولاندنەوە. "**نمك پاشیدن**": 1) خوێ پیاکردن، خوێ پێوەکردن. 2) شۆخی بێ تام کردن. 3) برین کولاندنەوە. "**نمك تازە کردن**": پەیمان نوێ کردنەوە. "**نمك چشیدن و نمکدان دزدیدن**": نان خواردن و نانەدێن دڕاندن. "**نمك چیزی را چشیدن**": خوێ چەشتن. "**نمك چیزی را زیادکردن**": زێدەڕۆییکردن. "**نمك خوردن**": پێکەوە غەزا خواردن. "**نمك خوردن و نمکدان (را) شکستن**": ناشکوریکردن. "**نمك در ساغر کسی ریختن**": تێکدانی خۆشی ئەو. "**نمك ریختن**": 1) خوێ پێوەکردن. 2) شۆخی بێ تام کردن. "**نمك زدن**": خوێ پێوەکردن، خوێ لێدان. "**نمك کردن**": خوێدان پڕکردن لە خوێ. "**نمك یافتن**": دڵگیربوون و کەوتنەبەردڵان.

**نمك بەحرام:** سپڵە، بێ ئەمەگ، پێنەزان.

**نمك بەحلال:** پێزان، بەئەمەگ.

**نمك ریز:** 1) گریان. 2) دڵگیر، دڵپەسند.

**نمکزار:** کانی خوێ، خوێڵێن، جێگەی خوێ لە دەم دەریا.

**نمکسار:** بڕوانە:"نمکزار".

**نمك سایی:** سوونەوەی خوێ.

**نمکستان:** کانی خوێ.

**نمك شناس:** بەئەمەگ، ئەمەگدار، پێزان، وەفادار، بەینەتدار، نمەك ناس.

**نمك فشان:** 1) خوێ پڕێن. 2) گریان.

**نمك گیر:** ئەوەی نان و نمەکی کەسێکی بکا و بەو نان و نمەکە بزانێ. لە کوردیدا دەڵێن نانەکە بخۆ و نانەدێنەکە مەدڕێنە.

**نمك لاخ/ نمك لان:** بڕوانە:"نمکزار".

**نمك نشناس:** بێئەمەگ، پێنەزان، سپڵە، بەدنمەك، نمەك کوێر، نمەك بە حەرام، نان خۆری سفرە دڕ.

**نمکی:** 1) سوێر، پڕخوێ. 2) خوێ فرۆش.

**نمکین:** 1) سوور، پڕخوێ، خوێدار. 2) لەبەردڵان، خوێن شیرین، قەشەنگ، دەلال.

**نمگین:** بڕوانە:"مرطوب".

**نمناك:** 1) نمین، نمسار، نماوی، نمدار، شێدار، شەهـ دار، شۆدار، هیی، هیت، تەڕ. 2) گریان. 3) بارانی(هوا نمناك بود).

**نم نم:** 1) نم نم، بارینی کەم کەم و لەسەرخۆ، خوناو، خوناڤ، خناف، بارانا نارین. 2) بەئەسپایی.

**نم نمك:** بەئارامی، بەئەسپایی.

**نمو:** 1) ڕوان، سەوزبوون. 2) پێشکەوتن، پەرەسەندن. "**نموکردن (یافتن)**": 1) بالاکردن، هەراش بوون، هەڵدان، خێزیان، گەورە بوون، گەشەکردن، بووژان، پەرەسەندن. 2) پێگەیشتن، لەخەم ڕەخسان، لەخەم ڕەخسین، لەبەلادوورکەوتنەوە.





**نمود:** 1) نما، نیشانە، هێما. 2) ڕوخسار، قەلافەت، دیمەن. "**نمود پیداکردن**": ئاشکرابوون، دەرکەوتن. "**نمود دادن**": ئاشکراکردن. "**نمود داشتن**": سەرنج ڕاکێشان. "**نمودکردن**": 1) سەرن ڕاکێشان. 2) خۆنیشاندن، خۆنواندن. 3) بە زەین گەیشتن. "**بە نمود آوردن**": دەرخستن، ئاشکراکردن.

**نمودار:** 1) پیشاندەر، شاندەر، ناسێنەر. 2) دیار، ئاشکرا، بەرچاو. 3) نەخشە یان پلانێ کە شێوەی کار یان پێوەندیی نێوان پاژەکانی شتێ پیشان دەدا، "چارت". 4) هێڵکاری، "دیاگرام"، "گراف". 5) سەرچەشن. 6) بەڵگە، دەلیل. 7) نیشان، نیشانە. 8) هاوتا، هاوشان، وەکوو، وێنە. 9) نەخش.

**نموداری:** 1) ئاشکرابوون، دەرکەوتن. 2) ئەوەی وەك سەرچەشن دەردەبڕدرێ یان پێشکەش دەکرێ. 3) هێڵکارانە، وێنەیی، گرافیك، دیاگرامیك.

**نمودگار:** بڕ یان ژمارەیەکە لە شتێ یان کۆمەڵێ کە پیشاندەری تایبەتمەندییەکانی ئەو شتە یان ئەو کۆمەڵە بێ، نموونە.

**نمودن:** 1) نیشان دان، خستنە بەر چاو، نواندن. 2) بەزەین گەیشتن. 3) خویابوون، دەرکەوتن، ئاشکرابوون. 4) دەربڕین، وتن. 5) ناساندن. 6) بەرچاوهاتن. 7) ئاماژەکردن.

**نمودی:** ڕواڵەتی.

**نمور:** بڕوانە:"نمناك".

**نموك:** بڕوانە:"نمناك".

**نموم:** بڕوانە:"نمّام".

**نمون:** 1) بڕوانە:"مَثَل". 2) ئاماژە، ڕەمز. 3) نیشاندان، نواندن.

**نمونش:** 1) بڕوانە:"نمونە(1)". 2) ڕێنمایی.

**نمونك:** ماکێت.

**نمونە:** 1) بڕ یان ژمارەیەکە کەم لە شتێ یان کۆمەڵێ کە پیشاندەری تایبەتمەندییەکانی ئەو شتە یان ئەو کۆمەڵە بێ، مشتێ لە خەرواری، مودێل، نموونە. 2) نموونە، نمانا، نمینە، نمووچ، نمووج. 3) سەرچەشن. 4) ناحەز، ناشیرین. "**نمونەشدن**": 1) بەچاکە یان خراپە ناودەرکردن. 2) لە برەوکەوتن. "**نمونەکردن**": 1) کردنە سەرچەشن. 2) بڕوانە: "نامزدکردن". "**نمونەگرفتن**": 1) هەڵگرتنی کەمەکێ لە شتێ بۆ تاقیکاری. 2) نموونەهەڵگرتنەوە.

**نمونەخوانی:** هەڵەچنی، هەڵەبڕی.

**نمونەگیری:** جیاکردنەوەی ژمارەیەك لە حەشیمەتێ کە نموونەیەك لە تەواوی ئەو حەشیمەتە بێ، نموونەهەڵگرتنەوە.

**نمید:** (نُ) بڕوانە:"نومید".

**نمیدن:** شێ کێشان، شەلێدان، نم کێشان. بە مانای مەیل کردن و ئاوڕلێدانەوە لە کەسێ یان شتێکیش هاتوە.

**نمیدە:** شێدار، نم کێشاو.

**نمیرا:** بڕوانە:"جاودان".

**نمیم:** بڕوانە:"سخن چینی".

**ننگ:** 1) شوورەیی، شوورە، عەیب و عار. 2) مایەی بەدناوی و سەرشۆڕی. 3) ناوزڕان، خەنزاری، ئابڕووتکان. 4) ناپاکی، پیسی. "**ننگ آمدن(گرفتن)**": سەرشۆڕ و شەرمەزاربوون. "**ننگ آوردن بر چیزی**": ڕیسوا و بەدناو کردنی ئەو. "**ننگ بستن**": بە بەدناوی و ناوزڕان تۆمەتبار کردن. "**ننگ داشتن**": سەرشۆڕ و شەرمەزاربوون. "**ننگ کردن**": 1) بڕوانە: "ننگ داشتن". 2) ئەنجامدانی کردەوەیەکی ناحەز. "**ننگ کشیدن**": تەحەممولی شوورەیی و بەدناوی کردن. "**ننگ و نبرد**": 1) ئابڕوو و ئێحتوبار. 2) شەڕ. "**(زیر) ننگ آوردن**": بڕوانە:"رسواکردن".

**ننگ آمیز:** شەرم هێن، تێکەڵ بەشەرم و شوورەیی.

**ننگ آور:** ناوزڕێن، ڕیسواکەر، پڕشوورەیی.

**ننگ زده:** بەدناو و ڕیسوا.

**ننگ نامی:** ناوزڕاو و بێ ئابڕوو بوون.

**ننگین:** پڕشوورەیی، ناوزڕاو، ناحەز و ئابڕووچوو.

**نو:** 1) نوێ، نووی، نوو، نەوا، تازە، دژی کۆن. 2) تەڕوتازە. 3) بژاردە، دیار. 4) ڕووناك، بەدرەوشین. 5) لاو، گەنج. 6) تازەکار. 7) بەتازەیی. "**نوبەنو**": 1) تازەبەتازە. 2) لێکدالێکدا، پەیتاپەیتا. "**نوکردن**": 1) تازەکردنەوە. 2) تەڕ و تازەیی یان برەودان بە شتێ. "**نونو**": پەیتاپەیتا. "**به نو**": تازە، بەتازەیی.

**نوآمد:** تازەپێگەیو.

**نوآمده:** ئاردە، داهاتگ، تازەبابەت، تازەپەیابووگ، نۆهاتی، نۆڤ هاتی.

**نوآموز:** قوتابی، زانست خواز، سوختە، تازەفەقێ. تازەکار.

**نوآنس:** جیاوازی ناسك و کەم.

**نوآور:** 1) داهێن، داهێنەر. 2) شاعیرێ کە بە شێوازی نوێ شێعر دەڵێ. 3) نوێخواز.

**نوآوری:** نوێگەری، نووگەری، داهانین، داهاوردن، وەدیهێنانی شتی نوێ.

**نوآیین:** 1) نوێئایین، ئایینی نوێ، ئۆلا نوو، تازە پەیابوو. 2) جوان، ڕازاوە. 3) بڕوانە:"ناشی". 4) داهێنەر. 5) شیاو، پەسندکراو. 6) لاو، گەنج.

**نوا:** 1) دەنگ و ئاواز، هەوای ستران، چریکە، نەوا. 2) ناڵە. "**نوا برکشیدن(برگرفتن، پرداختن، راندن)**": ئاواز خوێندن، سترانی خۆش وتن. "**نوا زدن**": ژەنین، ئاهەنگ لێدان. 2) ناڵین، ناڵان. 3) بڕوانە:"نوا برکشیدن".

**نوا:** 1) پێداویستی ژیان. 2) ڕێکوپێکی، تەکووزی. 3) قازانج، سوود. سەروەت و سامان. "**نوا داشتن**": سامان هەبوون. "**نوا کردن**": 1) دەوڵەمەندکردن، بێ نیازکردن. 2) دابینکردن، ئامادەکردن. 3) بارمتەکردن. "**نوا یافتن**": سەروەت و سامان وەدەست





خستن. "**به نوا**": بەشێوازی دروست و هەڵسەنگێنراو. "**به نوا کردن کسی**": دەوڵەمەندکردنی ئەو. "**به نوایی رسیدن**": بوونە خاوەنی داهات و کەرەسەی ژیان یان بە ماڵ و سامانێ گەیشتن.

**نوائب:** کۆی"نائبە"، ڕووداوەکان، پێشهاتەکان.

**نوابغ:** کۆی"نابغە".

**نوّاح:** بڕوانە:"نوحەخوان".

**نواحی:** 1) مەڵبەندەکان، ناوچەکان. 2) لێوارەکان، قەراغەکان. 3) دەورووبەری شار. 4) سنوورەکان.

**نواخانه:** بەندیخانە، گرتووخانە، گرتی خانە.

**نواخت:** 1) (زماننناسی) بەرزونزمی "هجا". 2) دڵدانەوە، لاواندنەوە. 3) بەخشش، خەڵات. 4) ژەنین، لێدان (مۆسیقا). "**نواخت کردن**": 1) بڕوانە: "نواخت(2)". 2) بەخشین. "**نواخت یافتن**": دڵنەوایی درانەوە.

**نواختن:** 1) دڵداری دانەوە، دڵخۆشیدانەوە، لاواندنەوە. 2) بە زەوی دادانی شتێك. 3) ژەندن، مۆسیقا لێدان، دەنگ دەرهێنان لە ئامرازی مۆسیقا. 4) لێدان. 5) ئاگالێبوون و پەروەردەکردن. 6) کووك کردنی ساز.

**نواخوان:** بڕوانە:"نغمەسرا".

**نوادر:** 1) کەسە بێهاوتاکان، کەسە بێ وێنەکان. 2) شتە دەگمەن و بێوێنەکان. 3) هەقایەتەکان. 4) بەسەرهاتە سەیر و سەمەرەکان.

**نواردن/ نواریدن:** قووت دان، قورتاندن، دابەلاندن.

**نوازش:** 1) دڵدانەوە، دڵداری دانەوە، دڵخۆشیدانەوە، لاواندنەوە، لاونا، لاونای، لاوە، بالدان. 2) دلۆڤانی. 3) لە ڕووی دلۆڤانی و خۆشەویستییەوە دەست بە سەر و ڕووی کەسێکا هێنان. 4) بەخشش، خەڵات. 5) ژەنینی ئامێری مۆسیقا. "**نوازش دادن**": لاواندنەوە، دڵدانەوە. "**نوازش کردن**": 1) لە ڕووی دلۆڤانی و خۆشەویستییەوە دەست بە سەر و ڕووی کەسێکا هێنان. 2) دڵخۆشیدانەوە، دڵدانەوە، دلدانی دان. 3) خەڵات یان بەخشش دان. "**نوازش یافتن**": وەدەستهێنانی خەڵات یان بەخشش. "**به نوازش درآوردن**": دەنگ لێوەهێنان.

**نوازشکار:** بڕوانە:"نوازشگر".

**نوازشگر:** لاوێن، لاوێنەر، لاون.

**نوازندگی:** 1) مۆسیقا ژەنین/ لێدان. 2) ژەنیار، مۆسیقاژەن. 3) دلۆڤانی.

**نوازنده:** 1) ژەنیار، سازڤان، سازژەن. 2) لاوێن، لاوێنەر، دلدانیدەر. 3) ستران بێژ، ئاوازخوێن.

**نوازیدن:** بڕوانە:"نواختن".

**نواساز:** 1) ژەنیار. 2) ستران بێژ، ئاوازخوێن.

**نواصب:** کۆی"ناصب".
**نواقص:** کۆی"ناقصه"، کەموکوورِییەکان، کەموکورتییەکان، ناتەواوییەکان.
**نواگر:** 1) ژەنیار، سازڤان. 2) ستران بێژ.
**نوال:** بەش، پشك. بەخشش.
**نوان:** 1) نالان، ئەوەی دەنالێنێ. 2) بڕوانە: "جنبان". 3) شەلەنگ، بەلەنجەولار. 4) چەماوە، چەمیو. 5) کز، لاواز، بێتوان. 6) خرۆشان.
**نوانخانه:** خێرات خانە، فەقیرخانە، هەژارخانە، تەمەڵخانە، ژارخانە، لەنگەرخانە، جێگەی بەخێوکردنی بێ ماڵ و حالان.
**نواندن:** لەراندنەوە، لەرزاندن.
**نواندیش:** نوێبیر، داهێنەر.
**نوانش:** بڕوانە:"انحراف".
**نوانگیزی:** داهێنان، داهاوردن.
**نوباف:** تازەچنراو.
**نوباوه:** 1) منداڵ یان تازەلاو. 2) منداڵ، ڕۆڵە. 3) نۆبەرە. 4) تەڕوتازە. 5) تازەهاتگ، تازە پەیابووگ. "**نوباوگان**": منالان، ڕۆڵەکان.
**نوبت:** 1) نۆبە، نۆب، نۆرە، سەرە، سەری، سرە، گیوە، گۆڤی، کایە. 2) هەل، دەرفەت. 3) جار، چەل، کەڕەت. 4) دەوران، سەردەم. 5) کێشك، ئێشك. 6) تەپڵ. "**نوبت آمدن**": نۆبە گەیشتن. "**نوبت به دیگری گذاشتن (سپردن)**": مردن و مەیدان بۆ ئەویتر چۆڵ کردن. "**نوبت چیزی را داشتن**": پاراستنی هەقی ئەو. "**نوبت داشتن**": 1) نۆرە هەبوون. 2) نگابانی دان، کێشك دان. 3) هەل ڕەخسان، دەرفەت دەست کەوتن. "**نوبت زدن**": تەپڵ لێدان. "**نوبت کاری (را) زدن**": خەریکی ئەوکارە بوون. "**نوبت کسی بەسر آمدن**": مردنی ئەو. "**نوبت گذاشتن**": نۆبە دانان. "**نوبت گذشتن**": بەسەرچوونی نۆبە. "**نوبت گرفتن**": نۆبەگرتن، نۆرەگرتن، وەسەفیایش. "**به نوبه**": بە نۆبە، یەك لە دوای یەك. "**به نوبت ایستادن**": نۆرەگرتن، نۆبەگرتن، بە نۆرە چاوەڕوان بوون، گۆڤی گرتن. "**رعایت نکردن نوبت**": نۆرەبڕی، نۆبەبڕی، نۆبەبڕین. "**کسی که نوبت را رعایت نمی کند**": نۆرەبڕ، نۆبەبڕ، گۆڤی بر.
**نوبتی:** 1) بەنۆرە. 2) تەپڵ ژەن، دەهۆڵ ژەن. 3) خێوەتی گەورە. 4) یەخترمە. "**نوبتی بە زیر گلیم زدن**": شاردنەوەی بابەتێکی ئاشکرا. "**نوبتی زدن**": 1) تەپڵ لێدان. 2) خێوەت هەڵدان.
**نوبر:** 1) نۆبەر، نۆبەرە، نوبار، کوبار، کوباری، بالاتە، خیف، خیفە، خیوە، خیڤە، ناخوری، نخوری، میوەی تازە پێگەیشتوو. 2) نوێ، تازە. 3) تەڕوتازە، تورت و تێراو. "**نوبر غله**": نوخشانە، نۆبەرەی دەخڵ. "**نوبر کردن**": نۆبەرەکردن.





**نوبنیاد:** تازەساز، تازە دامەزراو، تازە داهاتو یان تازە وەکارکەوتو.
**نوبود:** هەواڵ، خەبەر.
**نوبه:** 1) (پزیشکی) مالاریا. 2) دەوران، سەردەم. 3) تەپڵ. "**نوبه زدن**": تەپڵ لێدان. "**نوبه کردن**": بە نۆرە هاتن و چوون وەك تاولەرز. تووشی تا(نۆبەتێ)ی مالاریا بوون. "**به نوبه خود (در نوبه خود)**": بە نۆرەی خۆ، لە کاتی دیاریکراودا.
**نوبهار:** 1) وەرزی بەهار، سەرەتای بەهار، دەسپێکی وەرزی بەهار. 2) گوڵ و چرۆی تازەڕواو. 3) دۆست یان ژنی جوان.
**نوبهاران:** وەرزی بەهار، کاتی بەهار.
**نوبەخیز:** شوێنێ کە مالاریای تێدا بلاوبۆتەوە.
**نوبیوگ:** تازە بووك.
**نوپا:** 1) پێ گرتی، تازەپێ گرتوو، تازە فێرە ڕۆیشتن بوو. 2) تازە پەیابوو، تازە دامەزرا، تازە دەست بەکارکردو.
**نوپرداز:** 1) ئەوەی شتی نوێ بێنێ، هەڵبەستڤانێ کە بە شێوازی نوێ شێعر بهۆنێتەوە. 2) نوێخواز.
**نوجو:** نوێخواز، ئەوەی بەدوای کار و شتی نوێوەیە.
**نوجوان:** تازەلاو، تازەگەنج، لاوی تازەپێگەیشتوو، جحێڵ، لاجك، لاجەك، لاژەك، لاوژۆك، لاوژۆکە، لاوێژە، لاویژە، هەرزەکار، جوانکە، نۆجوان.
**نوجوان کردن:** تەڕوتازەکردنەوە، تورت و تێراوکردنەوە، گیانی تاوە پێ بەخشینەوە.
**نوجوانی:** تازەلاوی، سەردەمانێ لە تەمەنی مرۆڤ لە نێوان سێزدە تا حەڤدە ساڵەیی. "**دوران نوجوانی**": ڕۆژانی لاوی، هەرزەکاری.
**نوچرخ:** تازە بە دەوران گەیشتو.
**نوچه:** 1) ئەوەی لایەنگر و لەژێر فەرمانی کەسێکی بەهێز و دەست ڕۆیشتودایە. 2) تازەکار، کارنەزان، باش ڕانەهاتو. 3) نوێ، تازەپێگەیشتو.
**نوحه:** دولکە، سەردولکە، سەروە، پەسنی مردوو بە دەنگی گۆرانی دولکە، بەندی بە مردن هەڵگوتن، بە مردوو هەڵگوتن، سروودی ماتەم(یکورت). "**نوحه آراستن**": شین و شەپۆڕکردن، گریان و نالاندن. "**نوحه خواندن**": سەردولکە وتن و گریان و نالاندن.
**نوحەخوان:** شینگێڕ، مردوولاوێنەوە، سەردولکە بێژ، دولکەبێژ، بلاو، نەهاری، کەسێ کە بە گۆرانی پەسنی مردوو دەدا.
**نوحەسرا:** بڕوانە:"نوحەخوان".
**نوحەگاه:** ماتەم خانە، خەمخانە.
**نوحەگر:** بڕوانە:"نوحەخوان".
**نوخاسته:** 1) تازە بەسەربەخۆیی گەیشتوو. 2) تازەپێگەیشتوو، تازەلاو، تازەرابوویی. 3) نەونەمام، نۆنەمام. 4) تازە بە دەوران گەیشتو.

**نوخر:** نوێخواز.

**نوخریده:** تازەکڕاو.

**نوخواه:** نوێخواز.

**نوخیز:** 1) تازەهەستاو، تازەپێگەیشتوو. 2) نەونەمامی ناسك.

**نوداد:** هەواڵ، خەبەر.

**نوداماد:** تازەزاوا.

**نودر:** تازە پەیابوو.

**نودمیده:** 1) تازەهەڵاتو، تازەدەرهاتو. 2) تازە ڕواو.

**نودوز:** تازە دورواو.

**نو دولت:** تازە بە دەوران گەیشتو، تازە دەوڵەمەندبوو، تازە پیاکەفتگ.

**نور:** 1) نوور. 2) ڕۆشنایی، ڕۆناکایی، ڕۆناهی. 3) سۆمایی، بینایی، هێزی چاو. 4) هێمای دیارکەوتنی خوا لە جیهان دا. "**نور انداختن**": ڕووناك كردنەوەی جێیەك. "**نور بصر**": 1) سۆمایی، بینایی. 2) منالی خۆشەویست. "**نور تافتن**": ڕووناکیدان. "**نور چشم (دیده)**": هێزی چاو، سۆمایی. 2) منالی خۆشەویست. 3) کەسی زۆر خۆشەویست و بەڕێز. "**نور دادن**": ڕووناکیدان، نووردان. "**نور داشتن**": 1) ڕۆشن بوون، ڕووناکی هەبوون. 2) هێزی چاو هەبوون، سۆمایی هەبوون. "**نوردهی**": ڕووناکیدان.

**نوراستنی:** لاوازی دەمار.

**نورافکن:** پرۆژۆکتۆر.

**نورالانوار:** ڕووناکی ڕووناکییەکان، ڕۆناهیارڕۆناهیان. جەوهەری خوداوەند.

**نورانی:** 1) بەدرەوشین، پرنوور، ڕۆشن. 2) ڕووحانی، فریشتە.

**نورانیت:** 1) ڕۆشنایی، ڕووناکایی، ڕووناهی. 2) مەعنەوییەت و ڕووحانییەت.

**نوراه:** تازکار، نوێکار.

**نوراهان:** بڕوانە:"نورهن".

**نوربخش:** ڕووناکیدەر، ڕۆنەك.

**نورخند:** بڕوانە:"تبسم".

**نورد:** 1) بڕوانە:"انحنا". 2) ناخ، زەین. 3) لوولبوون، پێچدران، لوولیان. 4) چنراو، تەنراو، قوماش. 5) پاشەکەوت. 6) سفرە. 7) فەرش. 8) لەت، تیکە. 9) پەسندکراو، جوان. 10) بڕوانە: "زوال".

**نوردکاری:** پرۆسەی فۆرم پێدانی کانزاکان بە هۆی دەزگای "نورد"ەوە.

**نوردن:** بڕوانە:"نوردیدن".

**نورده:** ڕووناکیدەر.

**نوردیدن:** 1) پێوان، ڕێ بڕین. 2) پێچانەوە، پێچاندنەوە، پێچ دان، نواڵەکردن، لوولدان، نووشتاندنەوە. 3) لە لایەك دانان، تەرك کردن. 4) لەناوبردن. "**نوردیده**": 1) پێچ دراو، پێچراو، بادراو، لوول دراو، لوولە. 2) پێوراو.

**نورز:** 1) تێکچوونی زنجیرەی دەمارەکان. 2) تێکچوونی دەروونی.





**نورس:** 1) تازەگەییو، میوەی تازەپێگەیشتوو. 2) تازەڕواو، ناسکەنەمام، نەونەمام، تازەشێنە. 3) تازەکار.

**نورسته:** 1) تازە ڕواو، تازە شین بوو، ساوا، ساڤا، نۆنەمام. 2) لاو، گەنج.

**نورسیده:** 1) تازەڕواو. 2) تازە پێگەیشتوو، لاو. 3) تازەهاتوو. 4) ساوا، نووزا، کۆرپە.

**نورشناسی:** لقێکە لە فیزیك کە باس لە ناسینی نوور و ئامرازە نوورییەکان دەکا، "ئۆپتیك".

**نورگرایی:** "فتۆترۆپیسم".

**نورنجه:** تالاو، هەسێڵ.

**نورندگر:** وەرگێڕ (بەشێوەی زارەکی).

**نوروز:** نەورۆز، ڕۆژی سەری ساڵ، سەرەتای بەهار. "**نوروز کردن**": جێژن گرتن لە نەورۆزدا. "**تبریك عید نوروز**": نەورۆزانە، جێژنە پیرۆزەی نەورۆز.

**نوروزماه:** خاکەلێوە.

**نوروزی:** نەورۆزانە، جێژنانەی نەورۆز.

**نوره:** بڕوانە:"واجبی".

**نورهان:** سەوقات، دیاری، پێشکەشی، مزگێنی.

**نورهی:** بڕوانە:"نورهان".

**نوزاد:** 1) کۆرپە، کۆرپەلە، بەبك، ساوای تازە زاو، زارۆی ساوا، شپل، نووزا، نووزاك. 2) تازە، نوێ. "**نوزاد دوست داشتنی**": ساڤا لۆك، تازەزاوی جوانکیلە. "**نوزادبدترکیب**": هۆرتك، زارۆی ساوای ناحەز. "**نوزاد چاق و شاداب**": کۆرپەلە، زارۆی ساوای قەڵەو.

**نوزاده:** 1) بڕوانە:"نوزاد(1)". 2) شینایی تازە ڕواو.

**نوزایشی:** بڕوانە:"تناسلی".

**نوزایی:** لە دایك بوونەوە، بووژانەوە، ژیانەوە.

**نوزخمه:** تازەکار، نوێکار.

**نوزیستی:** بووژانەوە، لەدایك بوونەوە.

**نوس:** بڕوانە:"قوس قزح".

**نوساخته:** تازەپیاکەوتوو، تازە بە دەوران گەیشتو.

**نوساز:** 1) تازەساز، تازە دروست کراو، تازەچێ بوو. 2) تازە، نوێ.

**نوسازی:** 1) نوێکردنەوە، نووژەن کردنەوە، کەڵتەکردنەوە، دروست کردنەوەی خراوبووگ. 2) مودێرنیزاسیۆن. "**نوسازی کردن**": بڕوانە: "مرمت کردن".

**نوسان:** سەنگەلاّ، ڕاژان بە حەواوە، لۆژ، لۆژان، لۆژە، لەپ، لەپە، لەپەلەپ، هەڕاز، هەژان، هەژین، هەلاج، هەلاجین، هەلاجان، ڕاژانەوە، هەڕاز، هاتووچۆ بە دالەقاوی، هەرادیای، بزاوی بە هەر دوك لای ڕاست و چەپ دا. "**نوسان دادن**": هێلکاندن، هەلاجاندن، ڕاژاندن بە حەواوە، لقاندن. "**معلق در نوسان**": شندل، بە حەواوە هەڵواسراوی بەتەکەتەك.

**نوسبق:** تازەکار، نوێکار.

**نوسپاس:** بڕوانە:"ناسپاس".

**نوستالژی:** خەمی دووری، دەردی جیایی، خەمی غەریبایەتی.

**نوسخن:** 1) منالێ کە تازە زمانی گرتبێ . 2) بێژەری قسەی تازە.

**نوسواد:** بڕوانە:"نوآموز".

**نوسە:** بڕوانە:"رنگین کمان".

**نوشاب:** ئاوی حەیات.

**نوشاد:** تازەزاوا.

**نوشاندن:** دەرخواردانی تراو، نۆشاندن، نۆشنای، دانەڤەخوارن.

**نوشانوش:** 1) شەڕاب خواردن. 2) مەیگێڕی.

**نوش بخش:** بەچێژ، چێژبەخش.

**نوشتار:** نووسراو، نووسراوە.

**نوشت افزار:** پەڕاوگە، کەرەسەی نووسین.

**نوشتجات:** نوسراوەکان.

**نوشتن:** 1) نڤیسان، نڤیستن، نڤیساندن، نڤیسین، نووسین، نووسان، نووساندن، نووسیان، نوستەنە، نوشتش، خەت لە کاغزدان. 2) تۆمارکردن.

**نوشتە:** 1) نووسراو، نووسراوە، نووساو، نووسیاگ، نووسیاو، خەت لێدراو. 2) نامە، دەستنووس. 3) بەڵگە، فاکتۆر، دڤانەك. 4) چارەنووس. 5) حەتمی، یەکجارەکی. "**نوشتەدادن**": دەستەبەربوون، بەڵێن دان.

**نوش خند:** بڕوانە:"تبّسم".

**نوشخوار:** 1) بڕوانە:"نشخوار". 2) ئەوەی بەچێژەوە شتێ دەخوا.

**نوش خورد:** خۆش ڕابواردن، خۆشگوزەرانی.

**نوشدارو:** نۆژدار، دەرمانی کاری بۆ چارەی دەرد، ژاربەر، ژاربڕ. "**نوشدارو بعد (پس) از مرگ سهراب**": چارە یان دەوایەك کە زۆر درەنگ بگا و ئیتر سوودی نەبێ .

**نوشکفتە:** تازە پشکوتوو، تازە چرۆ دەرکردوو، تازەپشکڤی، گوڵێ کە تازە پشکوتووە.

**نوش گو(ی):** قسەخۆش، قسەشیرین.

**نوشگوار:** بڕوانە:"گوارا".

**نوشنجە:** نۆش، تراوی بە گیان خۆش.

**نوشندە:** خۆرەوە، ڤەخۆر، هەڵقوڕێن، فڕکەر.

**نوشە:** (نَ.شَ) 1) پاشای لاو. 2) تازەزاوا.

**نوشە:** (نُ.شَ) 1) نەمر، پایەدار. 2) بەختەوەر، خۆشبەخت. 3) نۆش، تراوی بە گیان خۆش.

**نوشیدن:** خواردنەوە، ڤەخارن، ڤەخوارن، لێڤەخارن، لێڤەخوارن، لێوەخواردن، نۆش کردن، نۆشین، نۆشان، نۆشای، فڕکردن، فڕکرن، **هەڵقوڕان(دن)**، **هەڵقۆڕان**.

**نوشیدنی:** شیاوی خواردنەوە، بۆ خواردنەوە، ڤەخارن، ڤەخوران، خورانەوە، واردش.

**نوشین:** 1) نۆش، تراوی بە گیان خۆش، شیرین. 2) شیاوی ماچکردن. 3) بڕوانە: "شفابخش".

**نوطلب:** نوێخواز.





**نوظهور:** نووداهاتگ، تازەپەیابووگ، تازەسەرهەڵداو، نیڤار.

**نوع:** چەشن، جۆر، جزم. بابەت. "**نوع بشر**": مرۆڤ. "**بە نوع نوع**": بەشێوەگەلی جۆراوجۆر. "**بە نوعی**": بە جۆرێ، بەچەشنێ.

**نوع پرست:** مرۆڤ دۆست.

**نوع پرور:** یارمەتیدەر و هەڤاڵی مرۆڤەکان.

**نوع دوست:** مرۆڤ دۆست.

**نوعدوستی:** مرۆڤ دۆستی، مرۆڤایەتی.

**نوعروس:** تازەبووك.

**نوع شناختی:** چەشن ناسانە.

**نوع شناسی:** چەشن ناسی.

**نوعیت:** 1) مرۆڤ دۆستی. 2) بڕوانە: "نسل".

**نوفیدن:** هەراکردن، گوڕاندن، خوڕین.

**نوقدم:** 1) بڕوانە:"نوپا(1)". 2) تازەکار.

**نوقلم:** نووسەری تازەکار.

**نوك:** 1) دەنووك، دەندووك. 2) نووك، سەری تیژ و باریکی هەر شتێ. 3) گۆشە. 4) زار. "**نوك چیزی را قیچی کردن**": کورتکردنەوەی ئەو. "**نوك کسی را چیدن (قیچی کردن)**": ڕووکەمکردنەوەی ئەو، ناچار بە بێدەنگ کردن.

**نوکار:** 1) بڕوانە:"تازەکار". 2) بڕوانە: "نوکر".

**نوکدخدا:** زاوا، زاڤا.

**نوکر:** 1) خزمەتکار، نۆکەر. 2) سیخوڕ، شوفار. 3) مەئموور، دانراو. 4) بڕوانە: "سپاهی". "**نوکر دولت**": کارمەندی دەوڵەت.

**نوکرباب:** 1) لە چینی نۆکەران. 2) وەك نۆکەران.

**نوکلئار:** ناوك.

**نوکلئوپلاسم:** ناوکە پلازم.

**نوکند:** ساوا، تازەپێگەیشتوو.

**نوکندە:** دەمڕوتی تازەپێگەیشتو.

**نوك نوکی:** کون کون.

**نوکیسە:** تازە پیاکەوتوو، تازە پێداکەوتوو، دیتۆك، نۆبەخت، تازە کیسە، کەسێ کە لە ڕووتییەوە دەوڵەمەند بووبێ .

**نوگرا:** نوێخواز.

**نوگرفت:** ئەوەی بەتازەیی گرفتار و گیرۆدە بووە.

**نوگیر:** نەچێنراو و ئامادەی چاندن (زەوی).

**نوماە:** مانگی نوێ، مانگی یەکشەوە.

**نومید:** ناهومێد، ناهمێ، ناهومێ، بێ هیوا، بێ هێڤی، دڵ سارد، هەناسەسارد، بێڤەر، خۆبان. "**نومید شدن**": ورەبەردان، هوورەبەردان، ساردبوونەوە، دڵساردبوونەوە، تەواسیانەوە، ناهومێدبوون، هێڤی بڕین، هیوابڕین، هیوابڕان، بێ هێڤی بوون.

**نومینالیسم:** بڕوانە:"نام گرایی".

**نومیدی:** تەواسان، دڵساردی، هەناسەساردی، بێڤەری، ناهومێدی، بێ هیوایی، بێ هێڤیتی.

**نوند:** 1) فرز، چالاك. 2) ئەسپ یان وشتری خۆشبەز. 3) نامەگەێن.

**نونشانده:** تازە دانراو.

**نونوار:** 1) تازە دورواو. 2) تازە دروستکراو.

**نونهال:** نۆنەمام، نەونەمام، توولەنەمام، خەڵفی تازەی یەکساڵە.

**نونیاز:** تازەکار، نوێکار، تازەفێربوو. ئەوەی تازە ئاشق بووە.

**نوول:** چیرۆکی کورت بەشێوەی نوێ.

**نوه:** زاز، نەوە، جیل.

**نوی:** 1) تازەیی، نوێبوون. 2) تەڕوتازەیی. "**نوی دادن**": تازەکردنەوە. "**نوی داشتن**": نوێبوون. "**ازنوی**": 1) جارێکی تر، دووبارە. 2) بەتازەیی.

**نوید:** 1) مژدە، مزگێنی، هەواڵی خۆش. 2) بەڵێنی خۆش، قسەی هیوابەخش. 3) هەڕەشە. "**نویدآوردن**": مزگێنی هێنان، هەواڵی خۆش دان. "**نویددادن**": 1) مژدەی خۆش پێدان، دڵخۆش کردن، مزگێنی پێدان، دڵاڤدان. 2) هیوادارکردن. 3) هەڕەشەکردن، ترساندن. "**نویدداشتن**": هیوادarbوون، بەهومێدبوون، گەشبین بوون. "**نویدرسیدن**": مزگێنی پێگەیشتن. "**نویدکردن**": هیوادارکردن، وادەپێدان.

**نوید بخش:** مزگێنی دەر، هیوابەخش.

**نویدگر:** 1) مژدەهێن، ئەوەی هەواڵی خۆش دێنێ. 2) داوەتکەر، لێگێڕەوە.

**نویدن:** (نَ) لەرینەوە، بزووتن، جووڵانەوە.

**نویدن:** (نُ) ناڵاندن، شیوەن کردن.

**نویسا:** خوێندەوار. نووسەر، نڤیسکار.

**نویساندن:** ناچار بە نووسین کردن.

**نویسایی:** کاری نوسین، نووسەری، نڤیسکاری.

**نویسنده:** 1) نووسەر، بنووس، نڤیسەڤان، نڤیسەر، نووسندە، نوشتۆخ. 2) خوێندەوار. "**نویسندەمآب**": نووسەرانە.

**نوین:** نوێ، نوو، تازە.

**نویه:** ناڵە و شیوەن.

**نوییدن:** گریان و شیوەن کردن.

**نهائی:** کۆتایی، دوایی، دوماهی.

**نهّاب:** بڕوانە:"غارتگر".

**نهاد:** 1) دامەزراوە، ڕێکخراو، بنیات، دەزگا. 2) هەناو، هەناڤ، دەروون، سرشت، ویژدان. 3) بنچینە، بناغە. 4) (دەروونناسی) یەکێ لە سێ بەشی دەروون لە دەروون شیکاریدا. 5) لە ڕێزماندا: بڕوانە:"مسندالیە". 6) (فەلسەفە) تێز. 7) شێوە. 8) ئایین، نەریت، ڕێسا. 9) پۆست، جێگە. 10) چۆنیەتی دروست کردنی شتێ. 11) بڕوانە: "نهادن(1)". "**ازنهاد**": لەبنەڕەت ڕا، بەشێوەی سروشتی.

**نهادسازی:** بنیات سازی.

**نهادگی:** بڕوانە:"آهستگی".





**نهادمند شدن:** بەدەزگا بوون، بە دام و دەزگا بوون.

**نهادن:** 1) دانان، دانیان، دانین، نیان، نانەسەرزەوی، ڕۆنان. 2) خستنە بەردەم. 3) پاشەکەوت کردن. 4) پانکردنەوە، ڕاخستن. 5) وادانان، وازانین. 6) چاوتێبڕین. 7) بە یەکسان دانان. 8) خستنەلاوە بۆ کەسێك، تەرخان کردن بۆ کەسێك. 9) دەرهاویشتن. 10) خستن. 11) ڕادەست کردن. 12) دروسکردن، بیناکردن. 13) ئافراندن، خولڤاندن. 14) داهێنان. 15) کردنەباو. 16) سازدان، بەڕێوەبردن. 17) ئامادەکردن. 18) خەرجکردن. 19) ڕشتن، پرژاندن. 20) دەستووردان. 21) بەجێهێنان. 22) ڕێخۆشکردن. 23) نووسین. 24) چاندن. 25) ئیلاقەکردن، نزیکیکردن.

**نهاده:** 1) (فەلسەفە) تێز. 2) دانراو، دانیاو. 3) پاشەکەوت، پەسمەندە. 4) سپاردە، ئەمانەتی. 5) ڕاخراو، چنراو. 6) بڕوانە: "مدفون". 7) بڕوانە:"مقدر".

**نهادی:** 1) سەربە یەکێك لە بنیاتە دەوڵەتییەکان یان سەر بە حکوومەت. 2) بڕوانە: "نهادینە".

**نهادینه:** جێکەوتوو، جێگیربوو، سەقامگیربوو، چەسپیو. "**نهادینەکردن**": بەدەم و دەزگاکردن، بەدەزگاییکردن، جێگیرکردن، چەسپاندن.

**نهار:** 1) فراوین، فراڤین، نیوەڕۆژە، نانی نیوەڕۆ، نەهار. 2) برسی. 3) کەمبوونەوە. "**نهارکردن**": ناشتاخواردن، لەخورێنی خواردن. 2) برسێتیکێشان. "**بەنهار**": برسی، برسێتی.

**نهار:** ڕۆژ. "**نهاربی گە شدن**": بە کۆتایی گەیشتنی ڕۆژ.

**نهاری:** بەرکولێ، بەرچایی. "**نهاری کردن**": بڕوانە:"ناشتا شکستن".

**نهاز:** (نُ) تەجە، تەژە، تەکە، تەگە، نێرەبزن، سابرێن، ساورێن. سەرگەلە.

**نهاز:** (نِ) ترس.

**نهازش:** خەیاڵ، وەهم، Phantom.

**نهازیدن:** ترسان، ترسیان، ترس لێ نیشتن.

**نهال:** دەرخ، دەرخك، نەمام، شەتڵ، شێنە، هال، چڵاك، خەڵف، غەڵف، ڕیشەی نازتن. "**نهال نشاندن**": نەمام چاندن.

**نهال کاری:** چاندنی نەمام.

**نهالەگاه:** بڕوانە:"شکارگاه".

**نهالی:** دۆشەك، نوێن. "**نهالی بەجایی فرستادن**": بەنیازی چوونە ئەو شوێنە بوون.

**نهالین:** بڕوانە:"نهالی".

**نهان:** 1) نهێنی، شاراوە. 2) بەنهێنی. 3) نادیار، بەرپیوار، بزر. 4) بەشێوەی نەناسراو. 5) بەنهێنی، ژێرجلەکی. 6) جیا، دوور. 7) نەناسراو، کەس

نه‌ناس، نه‌بناڤ. 8) ناخ، ویژدان. 9) دڵ. 10) ڕاز. 11) پاشه‌که‌وت. 12) گۆڕ. 13) ئه‌ودنیا، په‌سڵان. 14) حه‌ره‌مسه‌را. **"نهان داشتن"**: شاردنه‌وه، وه‌شاردن. **"نهان دیدن"**: به‌دزییه‌وه تواشاکردن. **"نهان شدن"**: 1) بڕوانه:"پنهان شدن". 2) ئاواره‌بوون، ته‌ره‌بوون، زرووقان، بازره‌بوون. 3) قات بوون، نایاب بوون. 4) له‌به‌رچاو ون بوون. **"نهان کردن"**: 1) بڕوانه:"نهان داشتن". له‌ناوبردن، له‌بیر بردنه‌وه. **"اندر نهانی"**: 1) به‌نهێنی. 2) له ناخه‌وه. 3) له نه‌بوونیدا. **"به نهان"**: به‌شێوه‌ی نهێنی.

**نهان بین**: هه‌قیقه‌ت بین، واقیع بین.

**نهان جای**: بڕوانه: "مخفی‌گاه".

**نها نخانه**: 1) شوێن یان ماڵێکی دوور له‌چاوی دیتران. 2) خه‌زێنه یان گه‌نجینه‌یه‌ك له نێو دیوار یان کونجی ماڵه‌وه بۆ ڕاگرتنی زێڕ و زێو. 3) دڵ.

**نهان دان**: پێوارزان، ئاگادار له نادیار.

**نهانزا**: له زاراوه‌ی ڕووه‌ك ناسیدا: ئه‌و ڕووه‌کانه‌ی ته‌نیا ڕیشه و لق و گه‌ڵایان هه‌یه و گوڵ ده‌رناکه‌ن.

**نهان سازی**: نهێنیکاری.

**نهانك**: به‌نهێنی، په‌نامه‌کی.

**نهان کار**: 1) نهێنیکار، که‌سێ که کاره‌کان دوور له چاوی خه‌ڵکی ئه‌نجام ده‌دا. 2) بڕوانه:"ریاکار".

**نهان گاه**: 1) حه‌شارگه. 2) ئه‌ندامی جووت بوون.

**نهانی**: 1) (به)نهێنی، په‌نامه‌کی، به‌دزییه‌وه، نادیاری، خه‌ف، وه‌شاردوو، ڤه‌شارتی. 2) گه‌نج، خه‌زێنه. 3) کاروباری مه‌عنه‌وی/ ڕووحانی. 4) ڕاز. 5) ناخ، دڵ. 6) گۆڕ، گڵکۆ.

**نهانی گشا(ی)**: ئه‌ستێره‌ناس.

**نهایت**: دومایی، دوایی(ن)، داڤی، کۆتایی، ئه‌وپه‌ڕ. **"نهایت نداشتن"**: 1) زۆر بوون. 2) وه‌سف نه‌کران. 3) دوایی نه‌بوون. **"درنهایت"**: سه‌ره‌نجام.

**نهایتاً**: سه‌ره‌نجام.

**نهب**: بڕوانه:"چپاول".

**نه‌برجا(ی)**: 1) نابه‌جێ، ناله‌بار. 2) بڕوانه: "سبکسر".

**نه‌بس دیر**: نه ئه‌وه‌نده دره‌نگ، به‌زوویی.

**نه‌بس روزگار**: له ماوه‌یه‌کی کورتدا.

**نهج**: ڕێگه‌ی ڕوون و ئاشکرا، شێوه.

**نهزت**: هه‌ل، ده‌رفه‌ت.

**نهستن**: بڕوانه:"مستقرکردن".

**نهستی**: نه‌بوون.

**نهش**: خستنه‌جێ.

**نهشت**: دۆخ، حاڵه‌ت.

**نهضت**: 1) بزووتنه‌وه، بزاڤ، ته‌ڤگه‌ر. 2) هه‌ڵ ته‌زینه‌وه، ڕاپه‌ڕین، شۆڕشکردن. **"نهضت کردن"**: چوون، ڕۆیشتن، ڕه‌وانه‌بوون.

**نهفت**: 1) نهێنی، په‌نامه‌کی، له ژێره‌وه. 2) ناوه‌وه، ژووره‌وه. 3) بڕوانه:"کمین گاه". 4) غه‌یب، پیوار. 5) شوێنی





نووستن. 6) دڵ. 7) سرشت، ناخ. 8) گۆڕ. 9) حه‌ره‌مسه‌را. 10) هه‌مبار. 11) خه‌زێنه، گه‌نجینه. 12) به‌شێوه‌ی نهێنی. 13) خه‌ڵوه‌ت. **"نهفت داشتن"**: شاردنه‌وه، وه‌شاردن. **"از نهفت برآوردن (گشادن)"**: ئاشکراکردن. **"به‌نهفت"**: له خه‌ڵوه‌تدا. **"در نهفت آوردن"**: هه‌مبارکردن. **"در نهفت کردن"**: پاشه‌که‌وت کردن.

**نهفتگر**: ئه‌وه‌ی به‌نهێنی و له‌ژێره‌وه ئیش ده‌کا، نهێنیکار، ئاوری ژێر کا.

**نهفتگی**: 1) سه‌رده‌می کۆمۆن. 2) بڕوانه: "اختفا".

**نهفتن**: 1) داپۆشین و شاردنه‌وه، شاریان، شاردن، به‌نهێنی تاقه‌ت کردن. 2) بڕوانه: "پنهان شدن". 3) ناشتن.

**نهفت نیاز**: که‌سێ که نیاز و پێداویستییه‌کانی خۆی ده‌شارێته‌وه.

**نهفته**: 1) شاراوه، شاریاگه‌وه، شێراوه، داپۆشراو، نهێنی. 2) نه‌زانراو، نادیار. 3) ڕاز. 4) ون، بزر، گوم له‌به‌رچاو. **"نهفته‌داشتن"**: شاردنه‌وه، داپۆشین.

**نهل**: (نَ.هَ) توونیه‌تی.

**نهمار**: 1) بێ ژمار، له‌ڕاده‌به‌ده‌ر، له ژماره به‌ده‌ر، ل قاسێ ب ده‌ر. 2) گه‌وره، مه‌زن. 3) به‌هێز، به‌قه‌وه‌ت. 4) به‌ته‌واوی، بێ زیادوکه‌م، یه‌کجێ. 5) به‌رده‌وام، هه‌میشه. 6) به‌دژواری.

**نهمت**: 1) ئه‌وپه‌ڕی ویست و ئاره‌زوو. 2) دڵخواز، مه‌به‌ست، ئامانج.

**نهنبیدن**: شاردنه‌وه، وه‌شارتن.

**نهی**: نه‌هێشتن، نه‌هێڵان، پێشگرتن، به‌رگری، ئیزن نه‌دان.

**نهیب**: 1) هه‌رای به‌رز به‌تایبه‌تی بۆ ترساندن یان بانگ کردن. 2) ترس. 3) نیگه‌رانی. 4) ئازار، به‌ڵاوده‌رد، ته‌وه‌ره. 5) تووڕه‌یی. 6) شه‌ڕگه، مۆڵه‌که. **"نهیب آمدن کسی را"**: 1) ترسانی ئه‌و. 2) ئازار وێکه‌وتنی ئه‌و. **"نهیب دادن"**: 1) بڕوانه: "نهیب زدن". 2) ترساندن. **"نهیب زدن"**: خوڕین، داخوڕین، تێڕاخوڕین، تێ خوڕین، داکاڵیان، ده‌نگ دان، ده‌نگ لێکردن، لێ تووڕه‌بوون، تێ گرماندن، نه‌ڕاندن، شاتاول، گه‌ف کردن.

**نهیدن**: 1) دانان، دانیان. 2) بیرکردنه‌وه و خه‌م خواردن.

**نهیده**: بڕوانه: "اکتسابی".

**نهیلیست**: پووچگه‌را، پێڕه‌وی ڕێبازی نهیلیزم، ئه‌م ڕێبازه له سه‌ده‌ی نۆزده‌هه‌م سه‌ری‌هه‌ڵدا و ئامانجی له‌ناوبردنی بڕوا و ڕێوشوێنه کۆمه‌ڵایه‌تییه‌کان بوو.

**نهیلیسم**: نهیلیزم، پووچگه‌رێتی.

**نیابت**: 1) بوونه جێنشین، له جێی که‌سێك دانیشتن، به‌جێی که‌سێك ئه‌نجامدانی کارێك. 2) جێنشینی،

جێگری، بریکاری. 3) نۆره، نۆبه. "**نیابت کردن**": ئەنجامدانی کارێك لەجیاتی کەسێك. "**نیابت نهادن**": نۆره دیاریکردن، نۆبەدانان. "**به نیابت از**": لەجیاتی، بەجیاتی. "**بەنیابت چیزی آمدن**": بەدوای ئەو داهاتن و بوونە جێنشینی ئەو.

**نیابت دار:** جێنشین.

**نیّات:** کۆی "نیّت".

**نیاح:** گریان و شیوەن بۆ مردنی کەسێك.

**نیادی:** سروشتی.

**نیاز:** 1) پێویستی، پێداویستی، پێدڤی، ئاتاجی، حەوجەهی، دەروایسی، نیاز. 2) کەممی ئامرازی بژیوی، دەست تەنگی، دەسکورتی. 3) پێویست. 4) نزا و داوا و تکا، نیاز. 5) دۆست، خۆشەویست. 6) بڕوانە: "نیازمند". "**نیاز آوردن**": نزا و شیوەن کردن. 2) ئاتاج کردنی کەسێك بە کەسێکی تر. "**نیاز برداشتن به کسی**": پێداویستی ویستن لەو. "**نیاز داشتن**": پێویستی هەبوون. "**نیاز گرفتن**": وەرگرتنی پارە یان شتێ وەك تەبەڕوك یان بۆ چاکبوونەوە لە کەسێك. "**به نیاز**": ئاتاج، چاو لەدەست. 2) بەخاکەڕایی و لەڕووی ڕاستگۆییەوە.

**نیازاده:** بڕوانە: "خویشاوند".

**نیازك:** ستێرپژیان، ڕاخوشینی ئەستێرە.

**نیازمند:** 1) داواکار، خوازەر، ئاتاج، هەژارونەدار، چاولەدەست، دەست کورت، نەتێر، حەوجەدار. 2) شیاو.

**نیازمندی:** 1) ئاتاجی، چاو لە دەستی، حەوجەهی، پێداویستی، دەست کورتی، نەبوونی، کەمایەسی. 2) بڕوانە: "اشتیاق". 3) بڕوانە: "تواضع".

**نیازور:** بڕوانە: "نیازمند".

**نیازی:** 1) بڕوانە: "نیازمند(1،2)". 2) دۆست، خۆشەویست. 3) ئاشق، ئەویندار، دڵدار. 4) بەڕێز، خۆشەویست.

**نیاکان:** ئاژدا، ئاژداد، ئەژداد، باپیران، باب و باپیران، باوباپیران، باڤ و کال، باب وکال، بنەباب.

**نیالوده:** بڕوانە: "ناآمیختە".

**نیام:** کالان، کاڤلان، کاولان، کایلان.

**نیامد:** بەدبەختی، نەهاتی.

**نیایش:** نزا و پاڕانەوە بۆ دەرگای خوا. 2) بەندەیی و ڕێز نیسبەت بە کەسێك.

**نیایش گاه:** پەرستگە.

**نیایشگر:** نزاکەر.

**نیّت:** نیاز. مەبەست، خواست. بیر، هزر، خەیاڵ. "**نیّت جزم کردن**": بڕیاری یەکجارەکی دان. "**نیّت داشتن**": بە نیازی کارێك بوون. "**نیت گرداندن**": بۆچوون گۆڕین، وازهێنان لە مەبەستی خۆ.

**نیدلان:** بڕوانە: "کابوس".

**نیّر:** ڕووناکیدەر، ڕۆشنزۆر بەدرەوشین. "**نیّراعظم**": خۆر، ڕۆژ.

**نیرم:** نێر سروشت، دلێر، پاڵەوان.





**نیرنگ:** (نَ.رَ) 1) گزی و فێڵ، فرتوفێڵ، فاك و فیك، فەند، فەندوفێڵ، قوڕۆك، حیلە و حواڵە، خاپ، تەڵەکە، گەڕ، بەن، سپەیین، گزیکاری، چاوبەستی، قوماربازی. 2) سێحر. 3) تەگبیر. "**نیرنگ باختن**": بڕوانە: "نیرنگ زدن". "**نیرنگ زدن**": فرتوفێڵ کردن، فەندوفێڵ کردن. "**نیرنگ ساختن**": 1) جادووکردن، سێحرکردن. 2) مەکرکردن، فرتوفێڵکردن.

**نیرنگ:** (نِ.رَ) 1) وێنەیەکی سەرەتایی کە نیگارکێش دەیکێشێتەوە. 2) وێنەی هەر شتێ.

**نیرنگ ساز:** (نَ.رَ) 1) گزیکار، فێڵباز. 2) چاوبەست، تەڕدەست. 3) بڕوانە: "مدبر".

**نیرنگی:** (نَ.رَ) تەڵەکباز، مەکرباز، گەڕساز، گزیکار.

**نیرو:** هێز، وزە، تاقەت، توانایی، تین، تاو، تابشت، شیان، ستین، خووز، گوژم، گوڕ، زۆر، زوور، شنگ، قەوە، دەگەر، هێل. کوود. "**نیرو آوردن**": 1) چڕکردنەوەی هێز و توان لە شوێنێکدا. 2) خۆڕاگرتن، ڕاوەستان. "**نیرو افکندن**": کوود دان. "**نیرو بخشیدن**": بەهێزکردن، وزەپێدان. "**نیرو بردن از چیزی(کسی)**": هێز و توانایی لێبڕین لەو، بێ توانکردنی ئەو. "**نیرو دادن**": 1) بەهێز/ بەقەوەتکردنی کەسێك. 2) یارمەتیدان. "**نیرو کردن**": 1) هێز و قەوەت بەکاربردن. 2) هەوڵدان، تێکۆشین. 3) زۆرەزمیکردن، شەڕکردن. 4) یارمەتیدان. "**نیرو گرفتن**": 1) وزەگرتن، قەویبوون. 2) زاڵبوون. "**نیروی امدادی**": هێزی یارمەتیدەر. "**نیروی امنیتی**": هێزی ئاسایش. "**نیروی پیوستگی**": (فیزیك) وزەیەك کە مولوکولە هاوچەشنەکان پێکەوە دەلکێنی. "**نیروی چسبندگی**": (فیزیك) وزەیەك کە مولوکولە ناهاوچەشنەکان پێکەوە دەچەسپێنێ. "**نیروی دافعه**": هێزی پاڵنەر، پاڵهێز. "**نیروی دست**": 1) هێز، توانایی. 2) هەوڵ، تەقالا. "**نیروی دید**": سۆمایی، بینایی، هێزی چاو. "**با نیرو**": پتەو، ڕەق. "**بەنیرو(ی)**": 1) بەهێز، قەوی. 2) توند. "**دوباره نیرو گرفتن/ نیرو بازیافتن**": خووزتێگەڕان، خووزتێگەڕانەوە، بووژانەوە، وەهێزکەوتن دوای نەخۆشی، هێزگرتنەوە، هێزیانەوە، وەکەیف هاتن دوای لاوازی.

**نیرو بخش:** وزەدەر، وزەبەخش، هێزنك.

**نیروده:** یاریدەدەر.

**نیرورسانی:** بڕوانە: "تقویت".

**نیرومند:** بەهێز، هێزان، خورت، گازۆر، بەتاقەت و توان، بەقەوەت، پڕ زۆر، مزوور.

**نیزار:** چیتەڵان، قامیشەڵان، قامیشەڵێن، ژاژۆك، ژاژەڵان، شەخەڵان، جۆم، دەحل، قۆپی.

**نی زن:** بلوێرژەن، بلول بێژ، نەی ژەن، نەیڤان.

**نیزە:** کورتەڕم، نێزە. "**نیزە باختن**": بە نێزە شەڕکردن. "**نیزە دوانیدن**": بە نێزە هەڵمەت بردن. "**سر نیزە از آفتاب گذاشتن**": زۆر بەخۆنازین.

**نیست:** 1) تیاچوو، لەناوبراو، نەبوو. 2) نیە. "**نیست شدن**": 1) لەناوچوون. 2) دیارنەمان، ونبوون. "**نیست کردن**": لەناوبردن. "**نیست و نابودکردن**": تیابردن، ئاسەوارسڕینەوە. "**بە نیست آوردن**": لەناوبردن.

**نیستان:** بڕوانە: "نیزار".

**نیست انگاری:** بڕوانە: "نهیلیسم".

**نیست درجهان:** ئەوەی بوونی دەرەکی نیە، بوونەوەری خەیاڵی.

**نیست رنگ:** بڕوانە: "نیست نما".

**نیست کن:** لەناوبەر، نابوودکەر.

**نیست نما** (ی): تایبەتمەندی ئەوەی بوونی هەیە بەڵام بەڕواڵەت نابینرێ.

**نیست وش:** بڕوانە: "نیست نما".

**نیست همتا:** بێ هاوتا، تاقانە.

**نیستی:** 1) لەناوچوون. 2) مەرگ. 3) دەستەنگی، نەداری.

**نیش:** 1) چز، گەز، چزوو. 2) تانە، تەشەر. 3) زار، دەم. "**نیش باز** (وا) **کردن**": 1) زارکردنەوە. 2) بێ تام پێکەنین. "**نیش خود را کشیدن**": پێش بە پێکەنینی خۆگرتن. "**نیش خوردن**": چزیان، چزوو تێڕاچوون، پێوەدران. "**نیش خوردە**": پێوەدراو، گەستە. "**نیش زبان** (**کلام**)": تانە، تەوس. "**نیش زدن**": 1) پێوەدان، پۆدای، گەسەی، چزاندن، چزوونە، چزە لێ هێنان، چزوو تێڕۆکردن، چزنای، وەزە. 2) تانە و تەشەر لێدان. 3) ڕوان یان دەرهاتنی شتێکی نووك تیژ، سەردەرهێنان. "**نیش کسی** (**تا بناگوش**) **بازشدن**": لە خۆشحاڵیان پێکەنینی ئەو. "**نیش کشیدن**": بەدیان لێکردنەوە و خواردن. "**نیش و کنایەزدن**": تانەوتەشەر لێدان. "**نیش و نوش**": قسەی بەچز و قسەی خۆش. "**بە نیش کشیدن**": 1) بە دیان لێکردنەوە و خواردن. 2) بەدیان هەڵگرتن و بردن.

**نیش باز:** بڕوانە: "خندەرو".

**نیش خند:** زەهرخەنە، پێکەنین لە ڕکان، پێکەنینی تاڵ.

**نیش دار:** 1) بڕوانە: "گزندە". 2) ئازاردەر، سووکانە.

**نیش زن:** پێوەدەر. ئازاردەر.

**نیشگان:** بڕوانە: "نشگون".

**نیشگون:** بڕوانە: "نشگون".

**نیشە:** بڕوانە: "نی‌لبك".

**نیك:** 1) باش، چاك، هاولە، چاك. 2) کەسی چاکەکار. 3) زۆر، لەڕادەبەدەر. 4) بەتەواوی. 5) بەکەڵك، بەقازانج. 6) شیاو. 7) نەرم. 8) سەیر، سەیروسەمەرە. 9) خۆشی، بەختەوەری.





"**نیك آمدن**": 1) بەپێی خواست هاتنەوەی فاڵ و شتی وا. 2) بەکەڵك هاتن. 3) خۆش لێهاتن. "**نیك آوردن**": بەدروستی ئەنجامدانی کارێك، کاری بەجێ کردن. "**نیك خواستن**": ویستنی خێر و چاکەی کەسێك. "**نیك داشتن کسی را**": دەگەڵ ئەو بە چاکی هەڵسوکەوت کردن. "**نیك رفتن**": 1) کاری چاك کردن. 2) دروست ئەنجامدانی کارێ، کاری بەجێ کردن. "**نیك شدن**": چاکبوونەوە، خۆشبوونەوە. "**نیك کردن**": 1) چاکەکردن. 2) دروست کردن(اصلاح). "**نیك گفتن**": تاریف کردن، بارەقەڵاکردن.

**نیك اختر:** بەختەوەر، خۆشبەخت.

**نیك ازار:** داوێن پاك.

**نیك انجام:** ئاخرخێر، سەروخێر.

**نیك اندیش:** خێرخواز، چاکەخواز.

**نیك بخت:** بەختەوەر، خۆشبەخت.

**نیك بین:** خۆش بین، گەش بین.

**نیك پی:** بڕوانە: "خجستەپی".

**نیك خو:** خۆش خولق، خدەپەسند، خۆش ئەخلاق، خوەش سنج.

**نیکخواە:** چاکەخواز، کەسێ کە چاکی و باشی کەسێکی دی بوێ.

**نیك داشت:** بەباشی ئاگالێبوون، خزمەتی میوان کردن.

**نیك دان:** زانا، مامۆستا.

**نیك دل:** خێرخواز و دلۆڤان، دڵ پاك.

**نیك روز:** بەختەوە، خۆشبەخت.

**نیکساز:** سازگار.

**نیك سیرت:** خۆڵق و خوو باش و لەبەردڵ.

**نیك عهد:** بەئەمەگ، خۆش قەول.

**نیك فرجام:** ئاخیرخێر، کەسێك کە ئاخری خێر بێ.

**نیك محضر:** ڕووخۆش، هەڵسوکەوت جوان، خۆش ڕاوێژ.

**نیك مرد:** پیاوی چاك، پیاوی چاکەکار، جوامێر.

**نیکنام:** خۆش نێو، خۆش ناو، خوەش ناڤ، ناو بە چاکە دەرچووگ.

**نیك نفس:** خێرخواز، دەروون پاك، دڵ پاك.

**نیك نهاد:** سرشت چاك، دەروون باش.

**نیکو:** 1) چاك، باش، خاس. 2) دڵپەسند. 3) بەنرخ، گرانبایی. 4) پەسند و لەبەردڵ. 5) دروست. 6) جوان. 7) بەچاکی، بەباشی. 8) بەتەواوی. 9) بەدروستی. 10) کەسی جوان چاك. "**نیکو داشتن**": ڕێزلێگرتن. "**نیکو شدن**": چاك بوونەوە، خۆش بوونەوە.

**نیکوباوری:** خۆش باوەڕی، ساویلکەیی.

**نیك و بد:** پاکوپیس، چاکوخراپ، ڕندوکرێت.

**نیکوداشت:** 1) بڕوانە: "نیك داشت". 2) پاداشت، خەڵات.

**نیکودان:** زۆرزانا.

**نیکودیدار:** جوان، خۆش قەڵافەت.

**نیکو رای:** بڕوانه: "نکورای".

**نیکورو:** جوان، قەشەنگ، دەلال، خوەشك، خوەشكۆك.

**نیکوروش:** ئاكارچاك، خۆش ڕەفتار، خۆش سیرەت، چاكەكار.

**نیكوسگال:** خێرخواز، چاكەخواز.

**نیكوكار:** خێركار، خاوەن چاكە، خێرەومەند، چاكەكار، خێرەمەن، خێرەمەند، ئاكارباش، دەستگرە.

**نیكوكاری:** چاكەكاری، پیاوچاكی، پیاوەتی، ڕندی، خێرەومەندی.

**نیكوكردار:** بڕوانە: "نیكوكار".

**نیكومنش:** ڕەوشت جوان، سرشت چاك.

**نیكویی:** 1) چاكە، چاكی، چاكەیی، چاكەكاری، خێرۆمەندی. 2) حاڵ خۆشی، خۆش بژی، ئاسوودەیی. 3) جوانی. 4) نێعمەت، 5) سوود، قازانج. "**نیكویی كردن**": چاكەكردن. "**نیكویی گفتن**": تاریف كردن، پیاهەڵگوتن. "**بە نیكویی**": بەباشی و خۆشی.

**نیكی:** 1) چاكە، چاكی، چاكێتی، چاكەكاری، خاسی. 2) ئاسوودەیی، حاڵ خۆشی.

**نیكی دهش:** 1) چاكەكار، خێرۆمەند. 2) خودا.

**نیكی سگال:** بڕوانە: "نیك اندیش".

**نیكی شناس:** 1) بڕوانە: "سپاسگزار". 2) پاداشت دەرەوەی چاكەكان.

**نیكی فروش:** بڕوانە: "ریاكار".

**نیكی گمان:** بڕوانە: "نیك اندیش".

**نیل:** 1) گەیشتن بە دڵخواز، گەیین بە ئامانج و مەبەست. 2) بەخشش، خەڵات.

**نی لبك:** بلوێر، بلور، بلول، نای، نەی، لولی، لیولی.

**نیل فام:** ئاماڵ خومین، خمین.

**نیلگر:** خومچی، خمگەر.

**نیلگون:** خمی، خمین، خومی، خومین، شین لە ڕەنگی هەش.

**نیم:** نیو، نیوە. "**نیم چشم زدن**": كاتی زۆر كورت.

**نیم آدمی:** ژن.

**نیم آهنگ:** بڕوانە: "ترنم".

**نیمادگر:** بڕوانە: "بصیر".

**نیم بار:** كاتی زۆر كورت.

**نیم بسمل:** نیوەگیان، نیڤەرح، زیندەوەرێ كە ملیان بە تەواوی نەبڕیبێ و لە حاڵی گیان دان دابێ.

**نیم بند:** 1) نیوەچڵ، دەڵەمە، دۆڵەمە، دۆڵەمێ. 2) پێكهاتەی سست و لەق.

**نیم بها:** نیوە قیمەت.

**نیم پخت:** 1) نەكوڵاو. 2) كەم ئەزموون.

**نیم پهلو:** لاتەنیشت، لاتەنشت، لاتەك.

**نیم تابیده:** خاوپەڕ، نیوەبادراو، تەواو با نەدراو.

**نیم جان:** 1) نیوەگیان، نیوەمردوو، شلوكوت و بێهێز. 2) نیوەیەك لە گیان.

**نیم جو:** شتی زۆر كەم و كەم نرخ. "**بەنیم جو**": كەمێ، كەمەكێ.





**نیمچە:** هەرشتێكی كورت و ناتەواو.

**نیم خام:** 1) نیوەكوڵاو. 2) كاڵ، فەریك. 3) ڕەعەمەل نەهاتو.

**نیم خند:** بڕوانە: "تبسم".

**نیم خواب:** خەواڵوو.

**نیم خورده:** بەرماوە، بەرما، بەرماوی خواردن.

**نیم خیز:** 1) نیوەهەڵسان، ئاخێز، لاخێز. 2) تازە وەدیهاتو.

**نیم دار:** كاركردوو، جلكێ كە ماوەیەك لەبەر كرابێ.

**نیم داشت:** بڕوانە: "نیم دار".

**نیم دم:** چركەساتێ، كاتێكی كورت.

**نیم ذره:** 1) زۆر چووكە و ناسك. 2) كەمێ، كەمەكێ.

**نیمرخ:** 1) لاجامە، لاڕوو، نیوڕوو، نیوەڕوو، ئێك ڕەخ، وێنەی لە تەنیشتەوە، دیمەنی ڕوخسار لە تەنیشتەوە. 2) لە هیندسەدا: بڕگە.

**نیم رس:** 1) نیوەگەیشتوو، تەواو نەگەیشتوو، كاڵ، كال، فەریك. 2) ناتەواو، نیوەچڵ. 3) تازەلاو.

**نیم رسیده:** 1) نەگەیو، كاڵ. 2) تازەلاو.

**نیم رنگ:** ڕەنگ پەڕیو، ڕەنگ چوو، كەمڕەنگ، كاڵەوەبوو.

**نیمرو:** 1) بڕوانە: "نیم رخ". 2) هێلكەوڕۆن، هێك ڕۆن، هێڕۆن، خاوڕوون، خاوڕۆن.

**نیمروز:** 1) نیوەڕۆ، كاتی نیوەڕۆ. 2) باشوور.

**نیم زن:** لە ژن كەمتر.

**نیمسال:** تێرم، نیوەی ساڵی خوێندن.

**نیم سوز:** نیوەسووتو، سۆتك، سۆتەك، سووتەڵ، بزووت، سەرە بزووت، بسۆت، سەرچومەت، سەرسۆت، سەلكەبزووت، ئەخترمە، خەتیرە، ختیرە، چاوڵە، چریسك، چلاسك، چلووسك، چلۆسك، چۆڵەچرا، بەیسووس. كز و ڕەش. "**نیمسوزشدن**": هەڵپڕووكان، هەڵپڕووكین، نیوەسووتانی پێست و شتیتر، نیوەشەوتین، كەمێ سووتان.

**نیم سیر:** 1) نیوەتێر. 2) تەواو ڕازی نەبوو، نیوەڕازی.

**نیم قد:** كورتەباڵا.

**نیم كار:** 1) كرێكار. 2) ناتەواو، نیوەچڵ، نیوەكار. "**نیم كار گذاشتن**": نیوەچڵ وێڵ كردن، بەكۆتایی نەگەیاندن.

**نیم كش كردن:** سینەكێش نەكردن.

**نیم كشت/نیم كشته:** بڕوانە: "نیم بسمل".

**نیم كوب:** تەواونەكوتراو.

**نیم گاه:** مەودای كەم.

**نیمگرد:** نیوەجەغز، نیڤ گۆڤەند، هەلەك.

**نیم گرم:** بڕوانە: "ولرم".

**نیم لنگ:** نیوەشەل، ئەوەی كەمێ دەشەلێ.

**نیم مرده:** 1) نیوەمردوو، نیوەگیان. 2) بێ هێز، بێحاڵ. 3) نیوەكووژاوە.

**نیم نفس:** چرکەساتێ، کاتێکی کورت.

**نیم نگاه:** کورتە ڕوانین. تواشاکردنی سەرسەری.

**نیمە:** نیو، نیوە، نیڤ، بەشێ لە دوو بەش. "**نیمەروز**": نیوەڕۆ. "**نیمەکردن**": نیوەکردن.

**نیمەتن:** نیوەهەڵسان.

**نیمەجان:** نیوەگیان.

**نیمەخام:** بەتەواوی نەکوڵاو، نیوەکوڵاو.

**نیمەراە:** 1) نیوەڕێ. 2) ناوەڕاستی ڕێ. 3) ناوەڕاستی هەر شتێ.

**نیمەکارە:** وەرتاخ، وەرتاق، نیوەکار، نیوەکارەی ناتەواو، ناتەواو، بەکەموکورتی، ب کێم و کاسی، کارێ کە نیوەی کرابێ .

**نیمەنفس:** هەناسەسوار، وەهەسکەهەسک کەوتو.

**نیمەوقت:** نیوەوەخت.

**نی‌نواز:** بڕوانە:"نی‌زن".

**نی‌نی:** 1) کۆرپە، بەبك. 2) گلێنەی چاو.

**نیو:** niv لاو، بوێر، گەرناس، پاڵەوان. پلووسك.

**نئوریالیزم:** ریالیزمی نوێ، نێئۆریالیزم.

**نیوشا:** 1) بڕوانە: "شنونده". 2) بڕوانە:"آموزنده".

**نیوشان:** 1) بڕوانە: "شنونده". 2) درکێنەر، دان پیانەر.

**نیوشاندن:** خستنە مێشکەوە، خستنە بیر و زەینەوە.

**نیوشە:** 1) گوێ هەڵخستن، بە دزییەوە گوێڕاداشتن بۆ قسەی کەسانی دی. 2) مەیل، بەریان.

**نیوشەگر:** خۆگرتوو، خۆگرتی، گوێگر لە قسەی خەڵك بە نهێنی.

**نیوشیدن:** 1) بیستن، گوێدان، گوێ هەڵخستن، گۆهدان. 2) تێگەیشتن، سەرلێدەرکردن. 3) چاوەڕوانی هەبوون.

**نیوند:** تێگەیین، فام، سەرەدەر، سەرودەر.

**نیوە:** ناڵە.

**نیهیلیسم:** بڕوانە:"نهیلیسم".



**واافتادگی:** قوولّك، قوولایی، قوولّی، چالاّیی هەر شتێك.

**واافتادن:** 1) کەمبوونەوە. 2) دوورکەوتنەوە یان بەجێمان لە کەسێك یان شتێك. 2) ڕاکشان.

**واایستادن:** 1) ڕاوەستان، وێستان. 2) وەستان، ڕاگیران.

**واایستیدن:** ڕاپەڕین، شۆڕش کردن.

**وابر:** جیاوازی.

**وابرسیدن:** 1) لێکۆڵینەوە، تاوتوێ. 2) بەکۆتایی گەیشتن، تەواوبوون.

**وابریدن:** 1) بڕانەوە، جیابوونەوە. 2) بڕینەوە، جیاکردنەوە. 3) تووشی ڕاوەستان کردن.

**وابستگان:** کۆی "وابستە"، خزم و کەسوکارەکانی کەسێك، خزم و خێشان.

**وابستگی:** بەستراوەیی، وابەستەیی، پێك بەستراوەیی، لێك گرێدراوێتی، گرێدایی، پێوەندارێتی، پێوەندی.

**وابستن:** 1) پێوەنددان، پێکەوەبەستن، لێك جۆشدان. 2) کەین و بەین کردن، ساتوسەوداکردن. 3) بڕوانە: "بستن".

**وابستە:** 1) بەستراوە، پێوەبەستراو، گرێدراو، قەمتی، پێوەندی. 2) خزم، فامیل. 3) ئاتاج بە کەسێك یان شتێك. 4) سەربە. 5) (سیاسی) ئەندامی باڵوێزخانەی وڵاتێ لە وڵاتێکیتر بە پسپۆڕی و بابەتێکی تایبەتەوە(وابستە بازرگانی، وابستە مطبوعاتی). **"وابستە اسم"**: لە ڕێزماندا: ئاوەڵناو. **"وابستەشدن"**: بەسترانەوە، گرێدران. هۆگری پەیاکردن.

**وابل:** بارانی بەخوڕ، لێزمە، ڕێژنەباران.

**وابندگر:** جیاکەرەوە.

**وابوسیدن:** ڕامووسین، یەکتر ماچ کردن. 2) ڕووەرگێران، بێزاربوون.

**واپادکردن:** کۆنترۆڵ کردن، لغاوکردن. چاوەدێریکردن.

**واپادی:** چاوەدێری، دیدەوانی.

**واپاشی:** 1) هەڵوەشانەوە، لێك هەڵوەشان، جیایی. 2) (فیزیك) شکان و لێك هەڵوەشانی ناوکی ئەتۆم و گۆڕانی بە گەردیلە یان ناوك گەلی چووکەتر.

**واپرداختن:** 1) بەتاڵ کردن، خاڵیکردن. 2) بڕوانە: "فراغت یافتن".





**واپس:** 1) دواکەوتوو. 2) دواوە، پشتەسەر. 3) لەدواوە، لەپشتەسەر. **"واپس آمدن"**: هاتنەوە، گەڕانەوە، دووبارەهاتنەوە، ڤەگەڕیان. **"واپس انداختن"**: پاشەکەوت کردن، پەزمەندەکردن. **"واپس اوفتادن(افتادن)"**: 1) بەپشتاکەوتن. 2) وەدواکەوتن، ڤەدرەنگ کەفتن. **"واپس دادن(سپردن)"**: دانەوە، گەڕاندنەوە. **"واپس رفتن"**: تەك دانەدواوە، بەرەوپاش کشانەوە، بەرەو دواوە چوون، پاشەکشەکردن. **"واپس زدن"**: (دەروونناسی) پاڵنانی نائیرادی بیروبۆچوون و هەست و نیگەرانییەکان بۆ ناو بەشی نەستی زەین. **"واپس فرستادن"**: بەرەودواوەبردن، بەرەوپاش بردن. **"واپس کردن"**: تێپەڕاندن. **"واپس کشیدن"**: کشانەوە، هاتنەلاوە، دووریکردن. **"واپس گریختن"**: پاشەکشەکردن،هەڵاتن بەرەو دواوە. **"واپس گشتن"**: گەڕانەوە. **"واپس گفتن"**: گێڕانەوە. **"واپس ماندن"**: دواکەوتن، بەجێمان. **"واپس نشستن"**: پاشەکشێکردن، بەرەودواوەچوون.

**واپس رو:** بەرەودواوەچوو.

**واپس گرا:** 1) کۆنەپەرست، کەللەکۆن، کۆنەپارێز. 2) 2) دواکەوتو، پاشڤەڕۆ.

**واپس ماندە:** 1) دواکەوتووی زەینی. 2) دواکەوتوو، دواکەوتە، وەدواخراو. 3) بەجێماو لە هاوڕێیان.

**واپس نگر:** کۆنەپەرست، کۆنەپارێز.

**واپس نگری:** ئاوڕدانەوە، بۆدواوەڕوانین، لاوەکردن، لاکردنەوە.

**واپسی:** 1) بڕوانە: "واپسین". 2) بەجێمان، جیمان. 3) نەهامەتی، ڕۆژڕەشی، بەدبەختی.

**واپسین:** دوایین، هەرەپاشین، ئاخرەمین، پشتگین، هەرەدوا، هەرەداڤی، داڤیترین، دوماهی. **"واپسین دم"**: گیانەڵا، دواهەناسە، دەمی مەرگ، سەرەمەرگ، ئاویلکە، ئاوزینگ، دەماداڤی یێ.

**وات:** 1) یەکەی وزەی ئیلێکتریسیتە. 2) پیت، قسە. 3) فەروە، کەوڵێوس.

**واترپروف:** "واتێرپروف"، شێ هەڵنەگر، جلوبەرگی بارانی، دژی ئاو، شتێ کە ئاوی تێنەچێ.

**واتکانیدن:** تەکاندنەوە.

**واتگر:** 1) بێژەر، وتەبێژ، شاعیر، هەڵبەستڤان. 2) کەوڵدروو، کەوڵکەر.

**واتگردانی:** بڕوانە: "تحریف".

**واثق:** 1) دڵنیا، خاترجەم، متمانەکەر، پشت قایم. 2) پتەو، قایم، توکمە. 3) بەمسۆگەری و قایمی.

**واج:** 1) فۆنێم، واژە، وشە. 2) نزایەك کە زەردەشتییەکان لە سەر سفرەی تەعام دەیانخوێند، ویرە، ویرەویر. 3) سەرگەردن، واق وڕ.

**واج آوایی:** دابەشکردنی پیتەکان.

**واجارکردن:** ئاشکراکردن، دەرخستن.

**واجب:** (زۆر) 1) پێویست، واجب، واجۆ، واژۆ، ئەوەی کە بەجێهێنانی پێویست بێ

و وازلێهێنانی گوناه و سزای به دواوه بێ. 2) مووچه، هەقدەست. 3) بڕوانە: "مایحتاج". "**واجب آمدن**": پێویست بوون، واجب بوون. "**واجب دیدن (داشتن)**": 1) بەپێویست زانین. 2) مسۆگەربوونی جێبەجێبوونی کارێك. "**واجب شمردن**": بەپێویست زانین. "**واجب عینی**": کردارێ کە لەسەر هەر تاکێکی موسڵمان واجبە وەك نوێژ. "**واجب کردن**": 1) واجب کردن. 2) پێویست کردن. 3) شیاوبوون، ژێهاتن. 4) بوونەهۆی. "**به واجب**": 1) شیاو، شایان. 2) بەشێوەی شیاو.

**واجبات:** 1) کرداره واجبەکان. 2) پێویستییەکان، پێداویستییەکان. 3) خەرجییەکانی ژیانی کەسێك.

**واجب الوجود:** خودا.

**واجبی:** 1) مووخۆر، واژوی، داڕوو، نەورە، دەرمانی حەمام. 2) مووچە، جیرە. 3) واجب بوون. "**به واجبی**": بەو جۆرەی کە پێویستە، بەشێوەی شیاو.

**واجد:** 1) هەڵگر، گرتنەوە، دۆزەرەوە. 2) دارا، دەوڵەمەند. "**واجد شرایط**": ئەوانەی مەرجەکان دەیانگرێتەوە.

**واجست:** بڕوانە: "بازخواست".

**واجستن:** تاوتوێ و توێژینەوە بۆ پەی بردن بە هەقیقەتی شتێك.

**واج شناسی:** (زماننناسی) موتاڵای سیستمی دەنگی زمان و ڕۆڵی دەنگەکان لەودا، فۆنۆلۆژی.

**واجل:** ترسناك، سامدار، بەسام.

**واچرتیدن:** 1) ڕاچەنین لە کاتی وەنەوزدا. 2) داچڵەکین، پەشۆکان.

**واچیدن:** هەڵگرتنەوە، چنینەوە، خڕکردنەوە، خڕکرن.

**واحات:** کۆی"واحە".

**واحد:** 1) یەکە. 2) یەك. 3) تاك، کەسێك. 4) بێ هاوتا، بێ وێنە، کت. 5) بەڕێوەبەری یان بەشێك لە بەڕێوەبەری. 6) یەکدەست. "**واحد خویشاوندی**": یەکەی خزمایەتی. "**واحد مطلق**": تایبەتمەندی جەوهەری دابەشنەبوو. "**واحد وزن**": یەکەی کێش. "**واحدهای پس از متن**": ئەو لاپەڕانەی لە کۆتایی دەقی سەرەکیی کتێبەوە دێن.

**واحدالشکل:** یەك فۆڕم، یەك بەرگی، یەکسان.

**واحدیّت:** 1) یەکانەیی و تاقانەییبوونی خوا. 2) خوا.

**واحه:** خەمرك، کانی و شینایی لە ناو بیاباندا.

**واخمش:** بڕوانە: "انحراف".

**واخواست:** 1) لێپرسینەوە، لێپێچینەوە. 2) ڕەخنەگرتن، وردەگیری، ئیرادگرتن.

**واخوان:** خوێندنەوەی دووبارەی دەقێك.

**واخواندن:** دووبارەخوێندنەوە.

**واخواهی:** (مافناسی) ناڕەزایەتی و ڕەخنە سەبارەت بە بڕیاری دادگا کە لە ئامادەنەبوونی کەسێکدا دەرچووە، داوای پێداچوونەوە بە بڕیاری پاشملە کردن.





**واخوردن:** 1) شکست خواردن، بەرەو دواوەبران. 2) خواردن یان خواردنەوە. 3) لەبرەوکەوتن. "**بهم واخوردن**": بەیەکتر گەیشتن.

**واخورده:** 1) شکست خواردوو، سەرنەکەوتوو. 2) بێبرەو، لاواز. 3) (دەروونناسی) تووشی دڵساردی سەرچاوەگرتوو لە فەرامۆش بوونی مەیل و وارسکەکان بوون کە بەهۆی نەگونجانی تاك لە گەڵ کۆمەڵگادا دەردەکەوێ.

**واخیدن:** لێك جیاکردنەوە، شیکردنەوەی کوڵکە و موو، هەلاجیکردن.

**واداد:** گەڕانەوە، وەگەڕان، ڤەگەڕ، زڤرین، ڤەزڤڕان. "**وادادکردن**": نەهێشتن، ڕێپێنەدان. 2) دوورخستنەوە، وەدەرنان، ڕەداندن.

**وادادگی:** بڕوانە: "تسلیم".

**وادادن:** 1) ڕازی بوون، ملدان. 2) شل بوون(ەوە). 3) لە زۆرەوانیدا: هەوڵ نەدانی زۆرانباز بۆ سەرکەوتن بەسەر غەنیمدا و خۆبەدەستەوەدان. 4) دان. 5) دانەوە، وێ دانەوە، پێدانەوە، گەڕاندنەوە.

**وادار:** ناچار، نەچار، وادار، واداشت. "**وادارشدن**": وادارکران، ناچارکران، بەزۆر پێکران. "**وادارکردن**": ناچارکردن، پێکردن، وادارکردن. دنەدان، هاندان، هەڵخڕاندن. "**وادارکننده**": پێکەر، ناچارکەر، کارپێکەر.

**واداشتن:** 1) ناچارکردن، پێکردن. 2) هاندان، دنەدان. 3) داوەت کردن، بانگهێشت کردن، ڕاڵێشان، بەرەولای خۆهێنان. 4) ڕاگرتن. 5) هەڵدان، ڕاوەستاندن. 6) دانان یان دامەزراندنی هەر بەشێکی بینا. 7) نەهێشتن، پێش گرتن.

**واداشته:** ناچار، دەروەست، بەرعۆدە.

**وادانستن:** 1) ناسینەوە. 2) ناسین.

**وادریده:** دڕاو، هەراوبوو، دەڵب بوو.

**وادنگ درآوردن:** پاشگەزبوونەوە لە قسەی پێشوو، دەبەپێکردن.

**وادی:** 1) سەرزەوی. 2) کەشێکی زەینی کە بۆ شتێك وێنا دەبێ، چوارچێوە. 3) بیابان. 4) فەزا، شوێن، جێگە. 5) شیو، دۆڵ. 6) ڕووبار. "**وادی ایمن**": سەرزەوینی پیرۆز، زەوینی کەنعان.

**وادید:** 1) سەردانی شوێنێکی وەك مووزە و شوێنەوای مێژوویی کردن. 2) سەردانی کەسێك کردن کە پێشتر بۆ دیتنی ئەو هاتبێ. "**وادیدآمدن**": ئاشکرابوون، دەرکەوتن.

**وادیدن:** 1) بەوردی تێڕوانین. 2) تێڕامان، ڕامان. 3) سەرنج دان، لالێکردنەوە، گرینگی پێدان. 4) ناسینەوە، لێك جیاکردنەوە.

**وار:** 1) نۆبە. 2) نەریت، باو، عادەت.

**واراهه:** بڕوانە: "منحرف".

**وارث:** میراتگر، میراتبەر، کەلەپوورگر، بەشبەر، شرەگر، بۆجێماو. "**وارث اعمار**": زۆر بەتەمەن. "**وارث چیزی شدن**": بەمیرات بردن.

**وارد:** 1) هاتوو، گەیشتوو. 2) شارەزا، لێزان، بە ئەزموون، ئاگادار لە کارێ. 3) بەجێ. 4) میوان. 5) ڕەوا، ڕێدراو.

"**واردآمدن**": 1) تێگەیشتن. 2) دابەزین، هاتنەخوار. "**وارد چیزی شدن**": دەسپێکردن بەو، خەریکی ئەو بوون. "**وارد دیدن چیزی**": بەباش و بەجێ زانین. "**وارد شدن**": 1) گەیشتن، هاتنەبەرەوە، هاتنەناوەوە، هاتنەژوورەوە، یاوان، یاوای. 2) زانیاری و ئەزموون وەدەست هێنان، ڕاهاتن، شارەزابوون. 3) ڕەپاڵ دران. 4) وتنی بابەتێك، شیکردنەوەیەك. "**وارد شدن بر کسی**": وەك میوان چوونە ماڵی ئەو، بوونە میوانی ئەو. "**وارد کردن**": 1) خستنەناوەوە، بردنەناوەوە. 2) هاوردن، هێنان(بەتایبەتی کەلوپەلێ لە دەرەوەی وڵات). 3) هێنانەدی، وەدیهێنان. 4) ڕەپاڵدان، خستنەپاڵ. 5) پاك نووس کردن، نووسینەوە. 6) لێدان.

**واردات**: 1) هاوردە، ئەو کەلوپەلانەی لە وڵاتێکەوە دەهێنرێتە وڵاتێکی دی. 2) خەیاڵ کردنەوەکان، بیروبۆچوونەکان. 3) ڕووداوگەلێکی تاڵ و ناخۆش کە بەسەر کەسێکدا دێ. "**واردات غیبی**": ئاگایی تێکەڵ بە حاڵەتی سۆزداری کە بەبێ بیرلێکردنەوەی پێشتر لە ناخی عارفدا پێك دەگەن.

**وارداتی**: هاوردەیی، لەدەرەوەی وڵاتەوە هێنراو.

**وارده**: 1) گەیشتو، هاتو. 2) گێڕاوە.

**واردین**: هاتوان بۆ ماڵێك، میوانان.

**وارساندن**: گەیاندنەوە.

**وارست**: ئازاد، سەربەست.

**وارستگی**: ئازادی، ڕزگاری، سەربەستی.

**وارسته**: ئازاد، سەربەست، ڕزگاری هاتوو، ئاسوودە و بێ کۆتوبەند.

**وارسی**: پشکنین، گەڕیان، هل کەوشاندن، تاوتویکردن، لێکۆڵینەوە، سەرقوتان، چوونە دیداری شت. "**وارسی دقیق**": وردپشکنین، هلکەواشتن. "**وارسی شدن**": کۆنترۆڵ کران، پشکێنران. "**وارسی شده**": پشکناو، هلکەواشتی."**وارسی عمیق**": قووڵ کردنەوە، زۆر بیرلێکردنەوە.

**وارسیدن**: 1) تاوتوێ کردن، پشکنین. 2) بێ فایدەبوون، بێ کەڵك بوون. 3) گەڕێنرانەوە.

**وارف**: کێشراو، بەربڵاو.

**وارفتن**: 1) بێحاڵبوون، سست بوونەوە، لەخۆچوون. 2) لێك هەڵوەشان. 3) شل بوونەوە، شۆڕبوونەوە بە هۆی ژاکاوی. 4) پەخش بوونەوە، بڵاوبوونەوە. 5) توانەوە، تاویانەوە، حەلبوون، ڤەحەلیان، بوونە ئاو. 6) حەپەسان، واق وڕمان. 7) خیت بوونەوە، گاڵتەپێکران و شەرمەزاربوون. 8) دووبارە چوونەوە شوێنێك. 9) گەڕانەوە، ڤەگەڕیان. 10) پاك بوونەوە، سڕانەوە.

**وارفته**: 1) لەخۆچوو، بێحاڵ، بێهێز. 2) لێك هەڵوەشاوە. کراوە، تواوە. 2) ترازاو، لە ڕێسمە دەرچوو، لە گرێژەنەدەرچوو. 3) شلووێل، شلوول، داشۆڕاو. 4) کەم بزوو و تەوەزەل.





**وارنگ**: ڕەنگاوڕەنگ، ڕەنگاڵە. "**وارنگ زدن**": بەپێچەوانە جووڵانەوە.

**وارنگی**: ڕەنگدانەوە.

**وارو**: 1) وەرگەڕاو، بەراوەژوو، سەرەونخوون، سەرنخوین. 2) بڕوانە: "پشتك"."**واروزدن**": 1) سەرمەقولات دان لە ناو ئاو یان زۆرخانەدا، تەقلەلێدان. 2) دژکردەوە/ پەرچەکردار نیشاندان.

**وارون**: 1) ئاوەژوو، واژی، ڤاژی، بەرەواژ، بەراوەژوو، بەرەواژی، بەلۆڤاژی، بەرەڤاژی، بەرپاش، بەرشووش، بەرسوڤ، سەرەونخوون، نخوون، سەرەوژێر، ژێرەوژوور، سەروقوون، دیواندیو، وارو، پێچەوانە، چەپەوانە، وەرگەڕاو، قلێپ.2) بڕوانە: "نحس". 3) بەدبەخت، ڕۆژڕەش.

**وارونگی**: بەراوەژووبوون، ئاوەژووبوون.

**وارونمایی**: بڕوانە:"تحریف".

**وارونه**: پێچەوانە، چەپەوانە، بەراوەژوو، بەرەواژی. 2) بە شێوەی پێچەوانە و بەراوەژوو. 3) بەروپشت، پشتەوڕوو. 4) بڕوانە:"شوم".

**واره**: کەڕەت، چەل، نۆبە، جار.

**وارهاندن/وارهانیدن**: ڕزگارکردن، قوتارکردن، ئازادکردن، بەڕەڵاکردن.

**وارهیدن**: ڕزگاربوون، ڕزگاری، ئازادبوون، قوتاربوون، بەربوون، بەڕەڵابوون، بەردایی.

**واریته**: جۆراوجۆری، هەمەجۆری، ڕەنگاڵەیی، ڕەنگاوڕەنگی، فرەچەشنی.

**واریختن**: 1) تاوتوێکردنی حەساو بۆ دیاریکردنی باقی ماوی قەرزدار و خاوەن قەرز. 2) ڕشتن، ڕژاندن، داڕژان. 3) لێك هەڵوەشان، خراوبوون، وێران بوون.

**واریز**: کردەی"واریختن" ی حەساو.

**واریزکردن**: 1) داڕژان، لەسەرەوە بۆ خوار ڕژان. 2) تێکردن، تێکرن، تێڕژاندن، تێڕژتن، تێڕشتن.

**واریس**: (پزیشکی) فرەوانبوونی شینەدەمارەکان.

**وازآمدن**: 1) گەڕانەوە، هاتنەوە. 2) وازهێنان.

**وازدن**: 1) لادان، بەرەو دواوە بردن، تەست دانەوە. 2) لیکەمکردن(ەوە). 3) دابەزین، کەمبوونەوە. 4) بێ مەیلکردن. 4) وازپێهێنان، نەهێشتن. 5) ڕەدکردنەوە، قبووڵ نەکردن.

**وازده**: 1) بەرەو دواوە براو، لادراو. 2) فڕێدراو، بێ نرخ، بێ کەڵك. 3) لەکارکەوتە. 4) ماندوو، بێزار، ڕەویو.

**وازر/وازره**: لابەر، هەڵگر. گوناهکار، سووچبار، تاوانبار.

**وازع**: 1) بڕوانە: "بازدارندە". 2) دابەشکەر. 3) بەڕێوەبەری کاروباری سوپا.

**وازماندن**: بێبەش مانەوە.

**وازنش**: بڕوانە: "دفع".

**وازنگریستن:** بەباشی ڕوانین، تاوتوێکردن.

**وازنی:** بڕوانە: "طرد".

**واژفهرست:** بڕوانە: "قاموس".

**واژگان:** پێرستێ لە کۆی وشەکانی کتێوێك یان بابەتێك یان زمانێك.

**واژگان شناسی:** ڕەچەڵەکناسی وشە.

**واژگان نگار:** فەرهەنگ نووس.

**واژگون:** 1) بەراوەژوو، بەراوەژی، بەلەقاژی، بەرۆڤاژی، واژی، ئاواژی، بەرەوپشت، بەراوپشت، سەرنخوون، سەرەونخوون، دەمەوخوار، دەمەوژێر، دەمەونخوون، دەمەوڕوو، سەرەوژێر، ژێروڕووکراو، وەرگەڕاو. 2) لەپۆست و پلە کەوتوو، لەسەر کارلابراو، لێکەوتوو. 3) شووم، بێفەڕ، بەدودم. "**واژگون شدن**": 1) سەرەونخوون بوون، قلپ بوونەوە، وەرگەڕان، بەراوەژووبوونەوە. 2) لەدەست دانی دەسەلات، وەرگەڕان. 3) تووشی شوومی و بێفەڕیبوون. "**واژگون کردن**": 1) وەرگەڕاندن، هەڵگەڕاندن، ژێر و ڕووکردن، قلپ کردنەوە، قولپاندن، سەرەونخوون کردن، سەرەوژێرکردن. 2) لەناوبردن. 3) کاول کردن، وێران کردن. 4) شکست دان، بەزاندن.

**واژگونه:** 1) بڕوانە: "واژگون(1)". 2) سەرەوژێر، سەروبن. 3) ئەوەی کارەکانی بەپێچەوانەیە.

**واژگونی:** بەراوەژوویی، سەرەونخوونی، سەرنخوون بوون، بەراوپشت بوون، وەرگەڕان.

**واژون:** بڕوانە: "واژگون".

**واژونه:** 1) ئاڵۆز، پەرێشان. 2) بڕوانە: "واژگونە(3)". 3) قسەی ناڕاست، قسەی تێکەڵ بە درۆ.

**واژه:** واژە، واچە، وشە، پەیڤ.

**واژه‌آرایی:** ڕستەبەندی.

**واژه‌سازی:** نوێکاریی وشەیی، وشەدانان، واژەسازی، پەیڤ ئافراندن.

**واژه‌شناسی:** ڕەچەڵکناسی وشە، واژەناسی.

**واژه‌گرای:** بڕوانە: "لفاظ".

**واژه‌نامه:** فەرهەنگۆك.

**واژیدن:** گوتن، وتن.

**واسازکردن:** نووژەنکردنەوە، قەرەبووکردنەوە.

**واسپاری:** سپاردن، پێسپاردن.

**واستدن:** وەرگرتنەوە، گێڕانەوە، وەدەست خستنەوە، وەدەست هێنانەوە، ئەستاندنەوە.

**واسرنگ رفتن:** بڕوانە: "واسرنگیدن".

**واستریوش:** وەرزێر، جووتیار، کشتیار.

**واستریوشان:** چینی جووتیاران، گوندنشینان، یەکێك لە چوار چینی خەڵك لە ئێرانی کۆندا.

**واسرنگیدن:** 1) شالاوبردن، هەڵمەت بردن، بەگژداهاتن، دەگژڕاهاتن. 2) حاشالێکردن، نکۆڵیکردن، نەچوونەژێر. 3) پرۆتێستۆکردن، ناڕەزایەتی دەربڕین.

**واسطه:** 1) ڕوولێنەر، دەلال، نێونجیکەر، ناوبژیوان. 2) تکاکار، دیلەکچی. 3) خوازبێنیکەر. 4) ناوەند. 5) هۆ، ئامێر.





"**واسطه برانگیختن**": کردنە ناوبژیوان.
"**واسطه‌شدن**": بوونە ناونجیکەر.
"**به‌واسطه**": بەهۆی.

**واسطه‌ای:** بەهۆی "واسطە"وە.

**واسطه‌جویی:** کردنە ناوبژیوان بۆ ئەنجامدانی کارێك.

**واسطه‌گر:** 1) ڕوولێنەر، دەلال. 2) بڕوانە: "میانجی".

**واسع:** 1) پانوبەرین، هەراو، گوشاد، دەلپ، بەرفەرەه. 2) والاکەر.

**واسوختن:** 1) سووتان. 2) ڕوووەرگێڕان و پشت تێکردن.

**واسوخته:** 1) سووتاو و ڕەش بوو بەهۆی تینەوە. 2) وشك بوو یان لەگەشەکەوتوو بەهۆی بێ ئاوییەوە.

**واسوکردن:** بەلاڕێدابردن، لەخشتەبردن.

**واسه:** بۆ.

**واشدن:** 1) کرانەوە، ڕەوانەوە، ڕەمنای، ئاوەڵەبوون، هەراوبوون/ بوونەوە. 2) توانەوە، تاویانەوە، جیاوەبوون. 3) مانەوە. 3) دوورکەوتنەوە، ڕۆیشتن. 4) چوونەپێشەوە، نزیکبوونەوە. 5) لەدەست چوون. 6) پشکوتن، گەشیان، گەشانەوە.

**واشر:** بەرپێچ.

**واشستن:** شۆردنەوە، شتنەوە.

**واشگونه:** 1) بەراوەژوو، بەرەوپشت. 2) سەروژێر، سەروبن. "**واشگونه‌کردن**": ژێروڕووکردن.

**واشناخت:** (لە پزیشکیدا)دیاریکردنی نەخۆشی.

**واشی:** دووزمان، دووزوان.

**واصف:** پەسندەر، پەسنکەر، تاریفکەر، ستایشکەر.

**واصل:** 1) گەیەنەر. 2) گەیشتوو، گەییو، هاتوو. 3) بڕوانە: "آرایش گر". "**واصل شدن**": 1) گەیشتن بەو، پەیوەست بوون بەو. 2) گەیشتن، وەرگیران، دران. "**واصل کردن**": پێگەیاندن. "**به‌واصل**": بەنەختی.

**واصله:** گەیشتوو، هاتوو.

**واضح:** ئاشکرا، ڕوون، دیار، خویا، بەرچاو.

**واضحات:** کاروبارە ڕوون و ئاشکراکان.

**واضع:** 1) پێکهێنەر، دروستکەر، دانەر، ڕۆنەر، دامەزرێن، داڕێژەر. 2) داڕێژەر. 3) نووسەر. 4) ئافرێنەر، خوڵقێنەر.

**واطلبیدن:** 1) داواکردن، ویستن. 2) بانگهێشتکردن، داوەت کردن.

**واعظ:** ئامۆژگاریدەر، ئامۆژیار، پەندێر، شیرەتکەر.

**واعی:** بیسەر، گوێگر.

**وافد:** داهاتو.

**وافر:** فرە، زۆر، گەلێك، فراوان.

**وافرستادن:** ناردنەوە.

**وافی:** 1) بەوەفا، بەئەمەگ، بەینەتدار. 2) تەواو و کامڵ.

**واقع:** 1) دابەزیوو، کەوتوو. 2) جێگرتوو لە شوێنێ، **هەڵکەوتوو** لە جێیەك. 3) ڕاستی، واقیع. "**واقع شدن**": 1) جێگرتن، **هەڵکەوتن**. 2) ڕوودان، پێشهاتن، ئەنجام بوون. 3) دەرکەوتن، ئاشکرابوون. "**در واقع**": لەڕاستیدا.

**واقعاً:** لە ڕاستیدا، بەڕاستی، ڕاستی.

**واقع انگاری:** واقیع بینی.

**واقع بین:** ڕاست بین، بیرڕاست، دڵ باش، واقیع بین.

**واقع گرا:** ڕیالیست، واقیع خواز.

**واقع گرایانە:** ڕیالیستانە، واقیع خوازانە، ڕاست بینانە.

**واقع گرایی:** واقیع خوازی، ڕیالیزم.

**واقع نمایی:** واقیع نوێنی.

**واقعە:** 1) ڕووداو، پێشهات، بوویەر. 2) کارەسات، ڕووداوی سەخت و خەمهێن. 2) ڕۆژی پەسڵان، قیامەت. 4) شەڕ، جەنگ. 5) **هەڵکەوتوو** یان جێگیربوو لە شوێنێك. 6) کۆچی دوایی، مەرگ. 7) خەون. 8) دۆخ، حاڵ. 9) کار، کردەوە. 10) باسکردنی ڕووداو، شیکردنەوەی پێشهات. 11) بڕوانە: "مشکل". "**واقعەافتادن کسی را**": 1) مردنی ئەو. 2) پێشهاتنی ڕووداوێ بۆ ئەو. "**واقعە بە کسی برداشتن**": شکایەت بردنە لای ئەو. "**واقعەگفتن**": شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی ڕووداوێ.

**واقعەدیدە:** بەئەزموون لەشەڕدا، شەڕدیتوو.

**واقعەطلب:** ئاژاوەخواز، ئەوەی بەدوای ئاژاوە و فیتنەوەیە.

**واقعەنگار:** بڕوانە:"وقایع نگار".

**واقعەنویس:** بڕوانە:"وقایع نگار".

**واقعی:** 1) ڕاستەقینە، بەڕاستی، بەدوور لە خەون و خەیاڵ. 2) تەواو، کامڵ. 3) ڕاست. 4) بنەڕەتی، بنچینەیی. "**غیرواقعی**": ناڕاستەقینە، دوورەڕاستی.

**واقعیّت:** 1) ڕاستێتی، ڕاستی بوون، ڕاستەقانی. 2) ڕووداو، پێشهات. "**واقعیّت خارجی(عینی)**": (فەلسەفە) ئەوەی لە دەرەوەی زەین و لە جیهانی واقیعدا بوونی **هە**یە. "**واقعیّت یافتن**": وەدیهاتن، وەدەستهاتن، دەستەبەربوون، گەیشتن، ڕیالیزەبوون. "**بە واقعیّت پیوستن**": بڕوانە: "واقعیّت یافتن".

**واقف:** 1) ئاگا، زانا، بەخەبەر، شە**هر**ەزا. 2) ڕاوەستاو، وێستاو. 3) چاوەدێر.

**واقول درآوردن:** تەشقەڵەپێکردن، گێچەڵ پێکردن، لەژێر قسەی خۆدان.

**واکابیدن:** بڕوانە:"واکاویدن".

**واکافت:** بڕوانە:"تجزیە".

**واکاویدن:** لێکۆڵینەوە لە بابەتێ.

**واکردن:** 1) کردنەوە، ئاوەڵەکردن، ڤەکرن. 2) ڕزگارکردن، قوتارکردن.

**واکسیناسیون:** کوتان، کوتاندن، واکسیناسیۆن.





**واکسینوتراپی:** بڕوانە: "مایەزنی".

**واکشیدن:** 1) کێشان، **هەڵ**کێشان، دەرهێنان. 2) بەزۆر یان بەفریو قسە لێ دەرکێشان. 3) ڕاکشان، پاڵدانەوە. 4) بەرەو لای خۆکێشان.

**واکنش:** دژکردەوە، پەرچەکردار، کاردانەوە، وەرکەست، دژەکریار. "**کنش**": کردار، کردەوە.

**واکوشیدن:** شەڕ و کێشەکردن.

**واکوفتن:** 1) کوتان/لێکدانی دووشت لە یەك، ل **هە**ڤدان. 2) دووپات کردنەوە.

**واکە:** پیتی دەنگدار.

**واگ:** بڕوانە:"واج".

**واگذاردن/واگذاشتن:** 1 ) ڕادەست کردن، پێسپاردن، دانەدەست، بەدەستەوەدان. 2) دان، پێشکەش کردن. 3) وازهێنان، دەست **هە**ڵگرتن، لەکۆڵ بوونەوە.

**واگذارشدن:** 1) پێسپێران. 2) پێبڕان، پێدران. 3) فرۆشران.

**واگذارکردن:** 1) سپاردن، پێسپاردن. 2) ڕادەستکردن، دانەدەست، خستنە ئیختیار کەسێکی ترەوە. 3) پێشکەشکردن.

**واگرا:** 1) لێك بڵاو، پرش، پەرتەوازە. 2) تایبەتمەندی ئەو تیشکانەی لێك دوور دەکەونەوە.

**واگرایی:** تەکینەوە، دوورکەوتنەوە، دووری.

**واگردان:** 1) سەرلەنوێ **هە**ڵگەڕاندنەوە، ژێروڕووکردن. 2) دووبارە حەساو کردن. جیاوازی. 3) زەرەر.

**واگردانیدن:** گەڕاندنەوە، دانەوە.

**واگردیدن:** گەڕانەوە.

**واگرفتن:** 1) گرتنەوەی نەخۆشی لە کەسێکەوە. 2) وێڵکردن و سەرلەنوێ گرتنەوە. 3) درێغیکردن، خۆبواردن، نەکردن. 4) تەرکی عادەت پێکردن بە کەسێك. 5) جیاکردنەوە، دوورخستنەوە. 6) گرتن، قۆڵبەست کردن.

**واگشادن:** 1) کردنەوە، ئاوەڵەکردن. 2) ئاشکرابوون. 3) ڕەوینەوەی خۆر یان مانگ گیران.

**واگشتن:** 1) گەڕانەوە بۆ دواوە. 2) گەڕانەوە. 3) لەیەکچوون، وەك یەك لێهاتن.

**واگفتن:** 1) گوتنەوە، وتنەوە، گێڕانەوە. 2) ئاخاوتن، گفتوگۆکردن.

**واگو:** 1) وتن، دەربڕین. 2) دەنگدانەوە. "**واگوشدن**": وترانەوە، بوونە ویردی سەرزاران. "**واگوکردن**": گوتن، دەربڕین.

**واگویە:** گێڕانەوە، دووپات کردنەوەی بابەتەکان لە زەیندا، سەرلەنوێ وتنەوەی قسەیەك.

**واگیر:** تەشەنەسێن، تەشەنەکەر، پەرەستێن، شەوب، پەتا، ئاهۆ، درم، ئازار، نەخۆشی گیرۆ، گوازراوە. "**واگیر داشتن**": تەشەنەسەندن، گرتنەوە.

**واگیری:** تەنینەوە، داگری، داگرتن، گیرۆیی، تەشەنەسەندن.

**والا:** 1) بەرز، بڵیند، پایەبەرز. 2) خۆشەویست، بەڕێز. 3) ڕەسەن، بنەچەدار. 4) بەنرخ و گرینگ. 5) شیاو، پەسندکراو. 6) لەسەرتری، سەرکەوتوو. **"والاشدن"**: 1) نرخ و گرینگی پەیاکردن. 2) پێشکەوتن. **"والاکردن"**: نرخ و گرینگی پێدان.

**والاتبار:** بنەچەدار، ڕەسەن، جسن.

**والاجاه:** پایەبەرز.

**والاقدر:** پایەبەرز.

**والاگوهر:** بڕوانە: "والاتبار".

**والامقام:** پایەبەرز، پایەبڵێند.

**والامنش:** ڕەوش بەرز، تەبع بەرز.

**والان:** لە زاراوەی بوونەوەرناسی دا: گروپێك لە گواندارانی دەریایی.

**والانژاد:** بڕوانە: "والاتبار".

**والانه:** برین.

**والاهمت:** هیممەت بەرز.

**والایش:** (دەروونناسی) نەرم و هێورکردنەوەی ئەو مەیلە خۆڕسکییانەی (غرایز) کە دوورە لە نەریت و باوی کۆمەڵ و پەلکێش کردنیان بەرەو ڕەوگەیەك کە شیاوی پەسندی کۆمەڵگایە. بەتاڵکردنەوەی گرێی دەروونی.

**والدین:** دایك و باب.

**والگی:** ئەوین، شەیدایی.

**والیدن:** تخێل بوون، ڕاکشان.

**والوچیدن:** دەمەلاسکێ کردنەوە.

**والور:** بەهای کۆمەڵایەتی، نرخ، گرینگی.

**واله:** (لَ) 1) تراویلکە. 2) باڵۆن، پڤدانك. 3) پێداگری، شێلگیری، سووربوون.

**واله:** (لِ) 1) هەڤین گەرم، شێت و هار لە دڵداریدا، سەوداسەر، شەیدا. 2) واماگ، داماگ، داماو، خەمبار، مەینەتبار.

**والی:** 1) دەسەڵاتدار، خاوەن دەسەڵات، ڕاژۆر، پارێزگار. 2) پاشا. 3) لە سفەتەکانی خوا.

**والیدن:** نەشونماکردن، بەخۆداهاتن، هەڵدان، گەشەکردن، شانازیکردن.

**والی گری:** دەسەڵاتدارەتی، دەسداری.

**وام:** 1) قەر، قەرز، قەرد، دەسقەرز، وام، سامە. 2) تەوزیم، ئەرك. **"وام خواستن"**: وام وەرگرتن. **"وام دادن"**: 1) وام دان، قەرزدان. 2) بەئەمانەت دان. **"وام درگردن کسی بودن"**: 1) قەرزداربوونی ئەو. 2) لەئەستۆبوونی ئەرکێك. **"وام شرافتی"**: پارە یان سامانێك کە بەبێ هیچ گرەنتییەك دەدرێتە کەسێك و ئەو کەسەش بەپێی پابەندبوونی ئەخلاقی خۆی دەیداتەوە خاوەنەکەی. **"وام کردن"**: قەرزکردن. **"وام گرفتن"**: قەرز کردن. 2) بەقەرز وەرگرتن، وام وەرگرتن، لێ وەرگرتن. **"وام گزاردن"**: دانەوەی قەرز. **"کسی را وام برآمدن"**: قەرزداربوونی ئەو.

**واماندگان:** چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵ، کوێروکەچەڵەکان.

**واماندگی:** دواکەوتوویی، پاشکەوتوویی، بەجێماوی، ئەرامەندەیی.





**واماندن:** 1) دواکەوتن، پاشکەوتن، لەدوامان، بەجێمان، پاشمان، قەمان، دامان، تیامان. 2) ماندووبوون، شەکەتبوون، لەپێکەوتن. 3) وەستان، ڕاوەستان. 4) سەرگەردان بوون، سەرلێشێوان. 5) تووشی دەسکورتیبوون. 6) تووشی کێشە و ئاریشەبوون. 7) بێ بەشبوون. 8) سەرسووڕمان، سەرسام مان، تیاڕامان.

**وامانده:** 1) وەستاو، ڕاوەستاو. 2) مات و سەرگەردان. 3) دەسکورت و نەدار. 4) بێبەش. 5) نەحلەتی، خاوەن مردگ. 6) داماو، کلۆڵ، ئەرامەندە، بێدەسەڵات، چەلەنگ، بەدبەخت. 7) ماندوو، شەکەت. 8) دواکەوتوو، پاشکەوتوو، پاشکەوتە، بەجێماو، قەمای. 9) میرات. **"واماندەکردن"**: تووشی دەستەنگیکردن.

**وامخواه:** 1) کەسێ کە داوای قەرز دەکا، قەرزخواز. 2) ئەوەی کە داوای وەرگرتنەوەی قەرزەکەی لە قەرزدار دەکا، خاوەن قەرز.

**وامدار:** بڕوانە: "بدهکار".

**وامش:** بڕوانە: "تهوع".

**وامق:** دڵدار، ئەویندار، دۆست.

**وامگزار:** 1) بڕوانە: "بدهکار". 2) بەجێهێنەر، ئەنجامدەر.

**وامگیری:** 1) وام وەرگرتن. 2) لێ وەرگرتن.

**وام واژه:** (زمانناسی) وشە وەرگیراوەکانی زمانێکی تر.

**وامی:** 1) قەرزدار. 2) داماو و بێدەسەڵات.

**وامیدن:** ڕشانەوە، هێنانەوە، هەڵێنانەوە.

**وانشاندن:** 1) بڕوانە: "خاموش کردن". 2) لەناوبردن.

**وانفسا:** 1) زۆر سەخت و دژوار. 2) بارودۆخی سەخت و چەتوون.

**وانگاه:** (وە)ئەوسا، (وە)ئەودەم، وێگاڤێ، ڤێجا.

**وانگریستن:** 1) تواشاکردن، سەیرکردن، تێڕوانین. 2) بەوردی تێڕوانین، تێڕامان.

**وانگهی:** 1) ئەوسا، ئەوساکە، ئەودەم، ئەوکات، وێگاڤێ، دوای ئەوە، ڤێجاهنگێ. 2) لەوکاتەدا.

**وا نمودکردن:** 1) واپیشاندان، وادەرخستن، وانواندن، ڕواڵەت نوێنیکردن. 2) ئاشکراکردن، خویاکردن.

**وانمودگر:** ڕیاباز، ڕیاکار: لاساییکەرەوە، لاساکەر.

**وانمودگری:** ڕیابازی، ڕیاکاری، فێڵبازی.

**وانمودن:** پیشاندان، نیشاندن.

**وانمودین:** ئەفسانەیی. ڕواڵەتی.

**وانویس:** 1) یاداشت، نووسراوە. 2) نووسینەوە. **"وانویس کردن"**: نووسینەوە، دووبارە نووسین.

**وانهادن:** پێ سپاردن.

**واهب:** بەخشندە، بەخشەر، بدەر، پێدەر، دایندە، دەسەنەدار، دڵاوا، نان بدە. **"واهب العطیات"**: بەخشندەی بەخششەکان، لە سفەتەکانی خوا.

**واهب الوجود:** خودا.

**واهشتن:** 1) تەرك كردن یان وازهێنان لە كەسێك. 2) لێك هەڵوەشاندن، لەبەریەك بردن.

**واهشتە:** 1) تەریك، گۆشەگیر. 2) چۆڵكراو، تەرك كراو. 3) تەڵاق گرتوو، جیابۆوە.

**واهمە:** هێزی وەهم و خەیاڵ كە شتە دیتراو و نەدیتراو و ڕاست و درۆكانی پێ وێنا دەكرێ. گومان، خەیاڵ. ترس و خۆف، سام. **"واهمەبرداشتن (گرفتن) كسی را"**: ترسانی ئەو، ترس هەڵگرتنی ئەو.

**واهی:** 1) بێبناخە، بێبنەما، ناڕاستەقینە. 2) پووچ و بێمانا، پڕوپووچ. 3) سست، لاواز، كۆن و ڕزیو. **"واهی شدن"**: 1) (دا)ڕزان و لێك هەڵوەشان. 2) سست بوون، بێهێزبوون، لاوازبوون. **"واهی كردن"**: پرتوكاندن و لێك هەڵوەشاندن.

**وایا/وایە:** بڕوانە: "بایا".

**وایافتن:** دۆزینەوە، پەیاكردن.

**وایستادن:** بڕوانە: "واایستادن".

**وایستن:** بڕوانە: "بایستن".

**وبا:** چاوقووڵكە، كولێرا، درمی ڕشانەوە، ڕەشەڕشانەوە. **"وبای مرغ"**: سەرشینكە، پۆپەڕەشە، پۆپنەڕەشە.

**وبال:** 1) وەباڵ، ئۆباڵ، ئازوبەزە، گوناح. 2) مایەی ژانەسەر و ڕەنج و دەرد. 3) بەد ئاكام، سەرەنجامی خراو. 4) هۆكاری دەرەنجامی نەخوازراو. **"وبال آوردن"**: بڕوانە: "وبال شدن". **"وبال شدن"**: مایەی ڕەنج و ژانەسەربوون. **"وبال گردن"**: ئۆباڵ بە ئەستۆ، مایەی ڕەنج و ژانەسەر.

**وبیل:** دژوار، سەخت، خراپ.

**وتر:** (بیركاری) ژێ.

**وترّیت:** تاقانەبوون، بێ هاوتابوون.

**وتگر:** بڕوانە: "واتگر".

**وتو:** ڤێتۆ، دژایەتیكردن، بەرهەڵستی، خۆبواردن، خۆلێپاراستن، نەكردن، ڕەتكردنەوە.

**وت وت:** 1) پچەپچ، سرتەسرت، سركەسرك. 2) بڕوانە: "شایعە".

**وتیرە:** شێواز، شێوە، ڕێوشوێن، دەستوور.

**وثائق:** كۆی "وثیقە".

**وثقی:** پتەو، قایم، خۆڕاگر.

**وثوب:** هەڵبەزین، هەڵبەزان، بازدان، ڕاپسكان.

**وثوق:** دڵنیایی، خاترجەمی، متمانە، تێڕادیتن.

**وثیق:** پتەو، قایم، خۆڕاگر، تۆكمە.

**وثیقت:** 1) پەیمان، بەڵێن. 2) متمانەی دوولایەن بەیەكتر، دۆستایەتی و گەرموگوڕی.

**وثیقە:** 1) گرێو. 2) بەڵێن، پەیمان. 3) ئەوەی متمانی پێبكرێ، جێمتمانە.

**وثیقەنامە:** بەڵێننامە.





**وجازت:** بڕوانە: "ایجاز".

**وجاهت:** 1) بوونە خاوەن پلە و شان و شكۆ، بەشكۆیی، گەورەیی، مەزناهی. 2) ڕێزوحورمەت، جێپەسندی خەڵك. 3) جوانی و ڕازاوەیی.

**وجب:** بس، بست، بۆست. **"وجب بە وجب"**: بست بە بست، گشت جێیەك. **"وجب كردن"**: 1) پێوان بە بست. 2) خستنەژێر چاوەدێری.

**وجد:** 1) خۆشحاڵی و شادی زۆر، زەوق. 2) ئەوینداری و خۆشەویستی، شەیدایی. **"بە وجد آوردن"**: خۆشحاڵ كردن، وەزەوق خستن.

**وجدان:** 1) دۆزینەوە، دۆزینەوەی دڵخواز. 2) ویژدان، وژدن، هەست كردنی دڵ و دەروون، زەوێڵ. 3) ئاوەز، ئەقڵ، دەرك.

**وجع:** ئێش، ژان، نەخۆشی، ناساغی.

**وجل:** ترس، مەترسی، خۆف.

**وجوب:** پێویست بوون، پێویستی، حەوجەهی، پێدڤیبوون.

**وجود:** 1) تێگەیشتن، ڕێ تێبردن، زانین. 2) بوون، پێچەوانەی نەبوون. 3) هەمگەل، كۆی ئەو شتانەی كە هەن. 4) لەش، كەلەخ، قاڵب. 5) جەستە و گیانی بوونەوەرێكی زیندوو. 6) تاك، كەس. 7) بەها، گرینگی. 8) خودا. **"وجود بی وجود"**: كەسی نزم و چووكە. **"وجود خارجی پیداكردن"**: لە دنیای ڕاستێتیدا هاتنەدی، هاتنەبوون. **"وجود خارجی داشتن"**: هەبوون لە جیهانی واقیع دا. **"وجود داشتن"**: 1) بوون، هەبوون. 2) عورزەهەبوون، توانایی هەبوون. 3) گرینگی هەبوون، نرخ هەبوون. **"وجود ذی جود"**: ئەو كەسە بەڕێزە. **"وجود كسی امری را برداشتن"**: قبووڵ كردنی ئەو شتە لە لایەن ئەوەوە. **"وجود گذاشتن"**: نرخ بۆدانان. **"وجودمطلق"**: 1) هەبوونی ڕەها، جەوهەری حەقیقی. 2) خودا. **"با تمام وجود"**: لە ناخی دڵەوە. **"بە وجود آمدن"**: 1) هاتنەدی. 2) بەدنیاهاتن، لەدایك بوون، زان. **"بە وجود آوردن"**: 1) وەدیهێنان. 2) ئافراندن، خوڵقاندن. **"دروجود آمدن"**: هاتنەدی، دەركەوتن. **"دروجود شدن"**: هاتنەدی، وەدیهاتن، هاتنەبوون.

**وجودگرایی:** (فەلسەفە) بڕوانە: "اگزیستانسیالیسم".

**وجودی:** 1) فەلسەفەی بوون، هۆی سەرهەڵدانی شتێ. 2) بڕوانە: "واقعی".

**وجوە:** كۆی "وجە". 1) پارەكان، پووڵەكان. 2) هۆكارەكان، لایەنەكان. 3) هۆیەكان. 4) ڕووەكان، ڕوخسارەكان. 5) گەورەكان. 6) حاڵەتەكان، شێوەكان.

**وجوەانگیز:** ئەوەی بە زۆر لە خەڵكی پارە دەستێنێ.

**وجە:** 1) شێوە، شێواز، چەشن. 2) پارە، پووڵ. 3) هۆ. 4) بڕوانە: "عامل". 5) ڕوو، ڕوخسار، دەم وچاو، چڕوچاو، ڕوومەت، ڕواڵەت، ڕووكەش. 6) بڕوانە: "عنوان". 7) ئاراستە، لا، ڕوو، بەر، دیو. 8) لاپەڕ،

لاپەڕە. 9) بڕوانە: "امکان". 10) جەوهەر، بوون. **"وجە"**: وەك، وەکوو. **"وجەاشتراك (مشترك)"**: تایبەتمەندی یان سفەتی هاوبەش، خاڵی هاوبەش. **"وجە اشتقاق"**: هۆی لێبوونەوەی وشەیەك لە وشەیەکی تر. **"وجە تسمیە"**: هۆی ناولێنان. **"وجە تمایز"**: هۆکاری جیایی و جیاوازی. **"وجەداشتن"**: هەبوونی بەڵگە یان دەلیل، شتێ کە پاساوهەڵگرێ. **"وجەدستی"**: دەست قەرز، دەستەواو، پووڵ بە قەرزدان. **"وجەصواب"**: ڕێوشوێنی دروست. **"وجەفرزندی"**: وەکوو ڕۆڵە. **"وجەکفاف"**: پارەیەك کە بەشی ڕابواردنی ژیان دەکا. **"وجەمطلق"**: خودا. **"وجەمعاش"**: پارەیەك کە ژیانی پێ ڕادەبوێرن. **"ازآن وجە"**: بەم هۆیە، لەبەر ئەمە. **"از وجە"**: بەهۆی. **"بر(بە) وجە"**: 1) بەشێوەی. 2) وەك، وەکوو. **"بە وجە احسن"**: بە باشترین شێوە. **"بە وجە کسی (چیزی) نشستن"**: شیاوی ئەوبوون، بە کاری ئەو هاتن، بە دەردی ئەو خواردن.

**وجەالضمان:** پارەیەك کە دەستەبەری پێدەکەن.

**وجەالکفالە:** پارەیەك کە کەسێك بۆ ئازادکردنی کەسێکی دی لە بەندیخانە دەیرژێنێتە سندۆقی خانەی داپەروەرییەوە.

**وجەالمصالحە:** 1) ئەوەی بۆ دابین کردنی ئاشتی نێوان دوو یان چەند لایەن دادەنرێ. 2) هۆ، ئامراز.

**وجهاًمن الوجوە:** بەهیچ کلۆنجێك، هەرگیز.

**وجهت:** لا، ئالی، ڕوو.

**وجهە:** 1) ئەوەی دیتران لە شەخسییەت و ڕەوشتی کەسێکی هەڵدەهێنجن، ئابڕوو، ئێحتوبار، نرخ. 2) لا، لایەن، ڕوو. 3) جۆر، چەشن، شکڵ. **"وجهەنظر"**: 1) ئەوپەڕی سەرنج و هۆگری. 2) چۆنیەتی بیروبۆچوون. **"وجهەهمّت"**: جێی سەرنج و بایەخ.

**وجیز:** کورت، کورتە، ئاخاوتەی کورت و پوخت.

**وجیزە:** 1) کورت، کورتە. 2) قسەی پوخت و بەکەڵك. 3) نامیلکە، کتێب.

**وجیع:** بەژان، ئێشدار، کۆڤاندار.

**وجین:** بژارکردن، کاژەنگ کردن، پاك کردن، چنین، سلمتە، حەپارە، خەپارە. **"وجین کنندە"**: هەرزەچن، بژارکەر، ئالاخ کەر.

**وجیە:** پیاوی خۆش سیما. بەشان و شکۆ، شکۆدار. گەورەی قەوم.

**وجیهە:** مێینەی "وجیە"، ژنی جوان و خاوەن ڕێز و شکۆ.

**وچر:** بڕوانە: "فتوی".

**وچرگر:** دیناوەر، فتوادەر.

**وحدانی:** تەنیا، تەنێ، تاق و تەنیا.

**وحدانیّت:** تەنێتی، یەکایەتی، یەکینی، تاکێتی، بێهاوتایی.

**وحدت:** 1) یەکبوون، یەکیەتی، یەکگرتن، (وحدت دوبارە) یەکگرتنەوە. 2) تەنیایی.





**"وحدت بخشیدن"**: یەکخستن، کردنەیەك. **"وحدت اصل"**: یەکیەتیی بنچینە، یەکگرتنابنگەهین. **"وحدت صفوف"**: یەکڕیزی. **"وحدت عناصر"**: یەکگرتوویی و هاوئاهەنگی لە ناو پاژەکانی شتێکدا. **"وحدت کلمە"**: یەکیەتی، یەکگرتن. **"وحدت موضوع"**: یەکیەتیی بابەت/مژار. **"وحدت وجود"**: یەکیەتیی بوون، بڕوایەك کە بەپێی ئەو تەواوی جیهان لە یەك ماددە چێ بووە، "پانتەئیزم".

**وحدت وجودی:** بڕوامەند بە پانتەئیزم.

**وحش:** بوونەوەرگەلی بیابانی، بوونەوەرگەلی نادەستەمۆ، هۆڤ.

**وحشت:** 1) تەنیایی، نەبوونی هاودەم. 2) سام، ترس و خۆف و دڵتەنگی لە تەنیایی دا. 3) ڕەوەکیەتی، سڵی، دووری. 4) بڕوانە: "نجاست". **"وحشت انگیختن"**: بوونە هۆی ڕەوینەوە و دوورکەوتنەوە، دووری خستنە نێوانەوە، لێك کردن. **"وحشت برتافتن"**: ترس و سام هەبوون. **"وحشت داشتن"**: ترس و خۆف هەبوون، ترسیان. **"وحشت در دل کسی انداختن"**: تووشی ترس و خۆف کردن. **"وحشت کردن"**: ترس لێنیشتن، تووشی ترس هاتن، ترس و سام ڕێنیشتن، سامکردن. **"وحشت گرفتن"**: ڕەوینەوە، سڵەمینەوە، دووری کردن. **"بە وحشت افتادن"**: بڕوانە: "وحشت کردن".

**وحشت آباد:** 1) شوێنی سامناك. 2) دنیا.

**وحشت انگیز:** سامهێن، ترس و خۆف هێن.

**وحشت زدە:** 1) ترساو، تووشی ترس و سامی زۆر بوو. 2) بە ترسی زۆرەوە.

**وحشتناك:** 1) سامناك، خۆفناك، ترسناك. 2) زۆر، فرە(فیلم، وحشتناك قشنگ بود).

**وحشی:** 1) بێبەزەیی، دڕندە، واهش، واهشی، کێوی، لاور، وەحشی، هۆڤ، هۆڤی، دەستەمۆنەکراو، کەوی نەکراو. 2) پەروەردەنەکراو، بێفەرهەنگ، دوور لە شارستانی. 3) بزۆزوسەهندە، پڕجووڵە، پڕجموجۆڵ، هەوسارپچڕاو(رودخانە وحشی). 4) شوێنێ کە بۆ نیشتەجێبوون نەشێ. 5) بێگانە، غەریبە، غەوارە. 6) ناجێگیر، زوو لەبیرچۆوە. 7) خاوەنی جوانی نائاسایی، وەسف هەڵنەگر و لەهەمان کات دا جوان.

**وحشیانە:** 1) دڕندانە، بێ بەزەییانە، هۆڤانە. 2) بە توندوتیژی زۆرەوە. 3) بەپێچەوانەی نەریت و ئاکاری کۆمەڵایەتی.

**وحشیگری:** وەحشیگەری، نامۆکاری، کاری دڕندانە، دڕندەیی، هۆڤیتی، هۆڤینی، بریتی لە زوڵم کردن.

**وحل:** (وَ.حَ) 1) قوڕوچڵپاو، زڵقاو، کوڕوشێل، ڤۆبی. 2) خەتا، هەڵە.

**وحوش:** کۆی "وحش".

**وحی:** سروش، وەحی، ئاماژەکردن و قسەی پەنامەکی وتن بە کەسێك و دە دڵ چەقاندنی، ئاماژە و پەیام و نامە. "وحی

آوردن": پەیام هێنان. "**وحی شدن (آمدن)**": هاتنەخواری پەیامی خوا بۆ پێغەمبەرەکان. "**وحی کردن**": پەیام ناردنی خوا بۆ پێغەمبەرەکان. "**وحی مُنزل**": پەیامێ کە لە لایەن خواوە بە پێغەمبەر دەگەیشت، قورئان. 2) قسەی نەگۆڕ و یەکجارەکی.

**وحید:** 1) تەنیا. 2) تاقانە، بێهاوتا.

**وخامت:** 1) مەترسیداربوون. 2) دژواری و سەختی، ناخۆشی و خراپی، بارگرانی و سەختی و ناسازگاری. 3) خراپی، ناحەزی.

**وخش:** هەرشتێکی نزم و بێنرخ، خەڵکانی پەست و نزم.

**وخشودن:** بڕوانە:"بخشودن".

**وخشور:** پێغەمبەر، بە زەردەشتیان گوتووە.

**وخشوربند/ وخشورپند:** ئایین، ڕێباز، شەریعەت، ئۆل.

**وخشه:** بڕوانە:"شعله".

**وخیم:** 1) مەترسیدار، جێی مەترسی. 2) خراو، خراپ، ناخۆش. 3) سەخت، دژوار. 4) ناسازگار، ناڕازی.

**وِدّ:** خۆشەویستن، ئەوین و خۆشەویستی.

**وداد:** خۆشویستن. خۆشەویستی، دڵداری.

**وداديه:** دۆستانە.

**وداع:** (وَ) ماڵئاوایی، خواحافیزی، خاترخواستن.

**وداع:** (وِ) 1) بەڕێکردن، ڕەوانەکردن. 2) جیابوونەوە، ڤەقەتیان.

**ودود:** زۆر دلۆڤان، خۆشەویست.

**ودیعت:** 1) بڕوانە: "ودیعە(1)". 2) سپاردە، ئەسپاردە، سپارتی، ئەمانەت. "**ودیعت حیات (باز) سپردن**": ماڵئاواییکردن، مردن. "**بە ودیعت نهادن(سپردن)**": بە ئەسپاردە دانان، بە ئەمانەت دانان.

**ودیعه:** 1) پارەیەك کە بابەتی گرەنتی و دەستەبەری ئەنجامدانی کارێ دەدرێتە کەسێك. 2) ئەسپاردە، ئەمانت. "**ودیعە نهادن(گذاشتن)**": شتێ بە ئەمانەت لە شوێنێ دانان.

**ور:** (وِ) قسەی قۆڕ. "**ورزدن**": 1) قسەی قۆڕو پووچ وتن. 2) دەنگ دەرهێنان و تەنگ پێهەڵچنین.

**ور:** (وَ) لا، ئالی، ڕەخ، تەنشت. "**وِر دست کسی رفتن**": بە چارەنووسی ئەوەوە تووش بوون. "**وِر دل کسی**": تەنیشت ئەو.

**ورآمدن:** 1) لێ بوونەوە، لەجێ دەرهاتن. 2) باکردن، پەنەمان، ماسین. 3) پێ وەستان، بەربەرەکانیکردن. 4) بڕوانە: "برآوردەشدن".

**ورآوردن:** دەرهێنان، هەڵکەندن.

**وراء:** 1) ئەودیو، پشتەوە، دوا، دواوە، سەروو. 2) کوڕەزا. 3) جگە، بێجگە، خنجی.

**وِرّاث:** کۆی"وارث"، میراتبەران.

**وراثت:** 1) میراتی، بەشەمیرات، بۆماوەیی، بنەماوە، کنێتی. 2) بەشەمیرات بردن.





**وَرّاج:** چەقەسرۆ، چەنەوەڕ، چەنەباز و زۆربڵێ، چەنەدرێژ، چەڵتەباز، چەڵتەکەر، دەڤەڕۆ، دەڤەژەن، قەرەچناخ، قەرەچەناخ، قەرەچەناغ، قەرەزاخ، ڤلڤلە، کەرتڕ، گالەگوڕی، گیڕ، پڕبێژ، زۆروێژ، زۆربێژ، هەرزەبێژ، فرەبێژ، قسەدرێژ، هەرزەچەنە، هەرزەبێژ، هەرەوەڕ، زۆروەڕ، زۆروێژ، هەڵەوەڕ، لەوجڕ، بەجووج، پتات، بەکێش، بێژۆك، بەڵەبڵ، درێژدادڕ، دەم درێژ، لاکێش، چناکەشکیاگ، دەلوقەل، کودکودۆ. "**وَرّاج و نادان**": بەرزەبلێس، ئەوەی لە هەموو قسان هەڵدەداتێ، زۆربێژی نەزان.

**وَرّاجی:** چەقەسرۆیی، چەنەوڕی، چەنەوەری، چەنەبازی، چناکەدان، چن چن، چەڵتەکەری، چەڵتەچەڵت، زۆربلێیی، زۆروێژی، فرەوێژی، زۆروەڕی، دەم درێژی، لاکێشی، هەرزەچەنەیی، گەوجەگەوج، گێژەگێژ، ڕینگانەوە، هەڵەوەڕی، وڕە، وڕەوڕ، وڕلێدان، لەوت لەوت، ڕینگانەوە.

**وراشتاو:** بڕوانە:"رفاقت".

**وارفتادن:** 1) لەناوچوون، تیاچوون. 2) لە مۆد کەوتن، دێمۆدەبوون.

**ورام:** 1) هەرشتێکی سووك و کەم کێش. 2) ناتەواوی لە کێش یان ئەنازەی شتێکدا. 3) سانا، ئاسان. 4) بڕوانە: "عَرَض".

**وارنداختن:** لەناوبردن.

**وارنداز:** خەمڵ، قەبڵ، مەزندە.

**وارنداز کردن:** بەچاوکردن، خەمڵاندن، مەزندەکردن، دیاریکردنی نرخی شتێك بە چاولێکردن.

**ورپریدن:** مردن بەشێوەی کتوپڕ و چاوەڕواننەکراو.

**ورتابی:** بڕوانە: "انحراف".

**ورثه:** کۆی"وارث".

**ورج:** ڕێز، نرخ، بەها، پلە.

**ورجاوند:** پایەبەرز، هێژا، ڕێزدار، بەنرخ، شیاو، بەهێز.

**ورجلازدن:** هەڵبەزینەوە لە مەترسی گەلێکی وەك تەقن و زۆنگاو.

**ورجمند:** بەڕێز، ڕێزدار، هێژا، بەنرخ.

**ورجه:** قنەکردن، هەڵقوون، خۆهەڵدان، هەڵبەزینەوە.

**ورجهیدن:** بڕوانە:"جَستن".

**ورچلوزیدن:** وشك هەڵاتن، ژاکان، سیسیان.

**ورچندیدن:** ترسان و لەجێدەرپەڕین.

**ورچیدن:** کۆکردنەوە، هەڵگرتنەوە، چنینەوە.

**ورخج:** ناپاك، چەپەڵ، چڵکن، پیس، پەڵۆخ، ناحەز و زەبوون.

**ورخسبیدن:** پاڵ پێوەدان، پشت پێوەدان.

**ورد:** 1) ویرد، وێرد، نزای لەبن لێوانەوە، دوعای بەپرتەپرت، پاژێ لە قوڕان کە مرۆڤ هەر ڕۆژ و شەوێك بیخوێنێ. 2) هەر کارێ کە چەند پاتە ببێتەوە، کاری هەر ڕۆژە. "**ورد خود کردن**": دووپات کردنەوەی قسەیەك بەبەردەوامی.

**وردار( و ) ورمال:** 1) بریتی لە کەسێك کە شتێك هەڵگرێو بۆی دەرچێ. 2) ماڵ و سامانی خەڵك خۆر.

**ورداشتن:** 1) بڕوانە: "برداشتن". 2) کردنە هاوڕێ و لەتەك خۆ بردن. 3) پڕکردن. 4) بەرگەگرتن، تاقەت هێنان/ هاوردن، دەوام هێنان، خۆڕاگرتن. 5) تووشی دۆخ یان حاڵەتێك بوون. 6) تێڕۆکردنی شتێ لە کۆم یان زێ. **"ورداشتن چیزی کسی را"**: زاڵبوون بەسەریدا، داگرتن. **"ورداشتن و ورمالیدن"**: ڕفاندن و بردن.

**وردست:** یاریدەدەر، هاریکار، بەردەست. **"وردستِ"**: لە تەنیشتی، لەپاڵی.

**وردك/وردوك:** جیاز، جیازی، باوانی.

**وررسیدن:** تاوتویکردن، پرسین.

**وررفتن با ( بە ) چیزی:** 1) خەریك و سەرقاڵ بوون بەوەوە، سەرگەرم بوون بەوەوە. 2) دەستکاریکردن یان دەست تێوەردانی بەمەبەستی چاککردن یان نووژەنکردنەوە. **"وررفتن با ( بە ) کسی"**: سەرخستنەسەر ئەو. **"بە خود وررفتن"**: 1) بەخۆڕاگەیشتن، خۆجوان و ڕێکوپێککردن، خۆتیلکردن. 2) دەسپەڕکردن، مشتاوکردن.

**ورز:** 1) پیشە، کەسپ و کار. 2) زەرعات، چاندن. 3) هێلکە، دانە. **"ورزدادن ( آوردن )"**: شێلان و تێکوەردانی هەویر و گۆشتی چەرخ کراو و شتی وا.

**ورزا:** 1) بەکار، ئازا لە کار. 2) گا.

**ورزش:** وەرزش، وەرزشت، کاری بەردەوام، هەر جۆرە کردار و جووڵانەوەیەك کە بۆ بەهێز کردنی ئەندامەکانی لەش و بەمەبەستی پاراستنی لەشساغی ئەنجام دەدرێ، ڕاهێنانی ئەندامەکانی لەش بە کارکردن بۆ ساغی و بەقەوەت بوون. **"ورزش کردن"**: وەرزین، وەرزش کردن، جووڵانەوە و خۆماندووکردن.

**ورزش خانە:** شوێنی زۆران گرتن.

**ورزشکار:** وەرزشوان، وەرزڤان، لیزەڤان، پاڵەوان.

**ورزشگاە:** شوێنی وەرزش، یانە، وەرزشگە، گۆڕەپانی وەرزش.

**ورزکار:** بڕوانە: "برزگر".

**ورزاگاو:** گای جووتکەر.

**ورزگر:** بڕوانە: "برزگر".

**ورزم:** ئاور، بڵێسەی ئاگر، تینی ئاور، پەشقەلائاگر.

**ورزندە:** وەرزشوان، وەرزڤان.

**ورزە:** بڕوانە: "ورزکار". **"ورزەدادن"**: وزەپێدان، توانایی پێدان، بەهێزکردن.

**ورزی:** بڕوانە: "ورزکار".

**ورزیدن:** 1) جێبەجێ کردن، ئەنجامدان. 2) وەدەستهێنان، وەدەست خستن. 3) خەریکی کارێ یان بابەتێك بوون. 4) بەکارهێنان. 5) زەرعات کردن. 6) پێڕەویی کردن لە کەسێ یان شتێ. 7) هەوڵدان، تێکۆشا، هەڵسووڕانی بێوچانن.





**ورزیدە:** 1) بەخۆوە، بەهێز، خورت، بەتاقەت و زۆر، گازۆر. 2) وەدەست هێناو. 3) بەئەزموون، کارامە.

**ورزی گر:** وەرزێر، جووتیار.

**ورستاد:** جیرە، مووچە، بڕانە، بەشە نان و بژیو.

**ورسوزدن:** بڕوانە: "پرسەزدن".

**ورشدن:** 1) چوونەبان، ڕۆیشتنەسەر. 2) بڕوانە: "مشتعل شدن".

**ورشکست:** نابوو، نابووت، مالکەتی، مایەبۆش، مایەپووت، مایەپووچ، داشوشتن، موفلیس، بێجێ، لێکەفتگ، لە دارایی کەفتگ، شکستهێناو، سووتاو، دەسمایە لە دەست چوو. **"ورشکست شدن"**: نابووت بوون، لەدارایی کەوتن، مالکەتن، لێکەفتن، بات بوون، زیان دیتن و نسکۆهێنان لە مامەڵە و دواکەوتن لە کەسپ و بازرگانیدا.

**ورشکستگی:** 1) نابووت بوون، ماڵەڤین، هیچ بۆ نەمان. 2) لاوازی، ناتەواوی.

**ورشکستە:** 1) بڕوانە: "ورشکست". 2) ناکام، نامراد، بەئاوات نەگەیشتو، شکست خواردو. **"ورشکستە بە تقصیر"**: ئەوەی بەهۆی کەمتەرخەمی خۆیەوە تووشی نابووتی بووە.

**ورطە:** 1) گێچەڵ، هەچەڵ، دەردیسەر. 2) تالوکە، مۆلەکە، جێگەی مەترسی، شوێنی مەترسیدار. 3) گەرداو، گێژاو، قووڵکە، هەر کار یان بابەتێك کە ڕزگاربوون لێی دژوار بێ.

**ورع:** (وَ.رَ) 1) دووریکردن لە گوناە. 2) خۆپارێزی، داوێن پاکی.

**ورع:** (وَ.رِ) خۆپارێز، پاك داوێن، ب ناموس.

**ورغلانیدن:** وروژاندن، هاندان، دنەدان، هایدان.

**ورغلنبیدن:** بڕوانە: "ورقلمبیدن".

**ورّفان:** تکاکار، پاڕێرەوە، دیلەکچی.

**ورفشان:** بڕوانە: "ورفان".

**ورق:** 1) گەڵا، پەلگەکەدارێ. 2) لاپەڕ، لاپەڕە. 3) وەرەق، پاسۆر. **"ورق افشاندن"**: لێکردنەوە و پڕش و بڵاوکردنی گەڵای دار. **"ورق برگشتن"**: گۆڕانی بارودۆخ. **"ورق خوردن"**: 1) هەڵگەڕانەوەی لاپەڕە. 2) تەواوبوون، تێپەڕین. **"ورق در حکم کسی بودن"**: زاڵبوونی ئەو بەسەر کارێکا. **"ورق زدن"**: ڕووپەڕهەڵدانەوە، لاپەڕ(ە) وەرگێڕان، لاپەڕەهەڵدانەوە. 2) موتاڵاکردنی شتێ بۆ سەرگەرمی یان ئاشنایەتی سەرەتایی دەگەڵ ئەو. **"ورق شستن"**: تەرك کردن و وازلێ هێنانی شتێ. **"ورق کردن"**: 1) جیاکردنەوەی لاپەڕەکانی کتێو لەیەکتر. 2) بە شێوەی وەرەق دەرهێنان. 3) گوڵ دەرکردن، گەڵادەرکردن. **"ورق (بر)گرداندن"**: گۆڕین.

**ورق بازی:** قومارکردن بە پاسۆر یان ئەنجامدانی کایەی جۆراوجۆر پێی.

**ورق پارە:** 1) لەتەکاغز. 2) بەلگەی بێنرخ.

**ورق ساز:** گزەکەر لە پاسۆردا.

**ورق گردانی:** پێکهێنانی گۆڕانکاری.

**ورقلپیدن:** بڕوانە:"ورقلمبیدن".

**ورقلمبیدن/ورقلنبیدن:** بەشێوەی زەق دەرکەوتن، زکدان، قیتەوەبوون، هەڵتۆقین.

**ورقە:** 1) پەڕە کاغزێك، گەڵایەکی دار. 2) توێ، توێژ، توێکڵ. 3) بەڵگە، شانەك، نقیسك. **"ورقە کردن"**: بەشێوەی توێگەلی ناسك دەرهێنان. **"ورقەورقە"**: توێ توێ، پەڕپەڕ. **"ورقە هویت"**: ناسنامە، پێناسە.

**ورگذارکردن:** بڕوانە:"گـذراندن".

**ورگر:** (شاعیرانە) ئەگەریش.

**ورگرداندن:** بڕوانە:"برگرداندن".

**ورگرفتن:** دەست پێکردن.

**ورگشتن:** بڕوانە:"برگشتن".

**ورم:** (وَ) بیر، بیرۆگە، لەبەر.

**ورم:** (وَ.رَ) پەنەم، پەنام، ئاوسان، ئەستووربوون، ماسان، ماسین، هەڵمساوی. **"ورم اندك"**: خانەبا، خانەما، ئەستووربوونێکی کەم. **"ورم خاستن"**: بڕوانە: "ورم کردن(1)". **"ورم داشتن"**: بڕوانە: "ورم کردن(1)". **"ورم کردن"**: 1) ماسان، ماسین، ئەستووربوون، وەرمین. 2) هەستان (وەك هەستانی دەمار بە هۆی تووڕەیی). 3) قەڵەوبوون.

**ورمالیدن:** 1) هەڵماڵین، هەڵکردنی قۆڵ و دەلینگ و داوێن، هەڵ مشتن، هلمالشتن. 2) بریتی لە هەڵاتن و دەرچوون.

**ورمالیده:** 1) هەڵماڵدراو، هەڵکراو، هەڵمشتی، هلمالشتی، داوێن و قۆڵی بەرەوژوور براو. 2) بێحەیا، بێشەرم.

**ورنا:** بڕوانە: "برنا".

**ورنامه:** سەردێری کتێب.

**وروت:** تووڕەیی، ڕق، کەرب، غەزەب.

**وروجك:** بەدفەڕ و بزۆز و کونج کۆڵ یان فێڵەباز.

**ورود:** 1) هاتن، گەیشتن، ئامای. 2) دەسپێکران. 3) چوونە ناو ئاوەوە.

**ورودی:** 1) (بۆ) چوونە ناوەوە(ژوورەوە). 2) شوێن یان زارکی چوونە ناوەوە. 3) خوێندکارێ کە لە ڕێگەی ئەزموونەوە چۆتە زانکۆ. 4) دەرگانە.

**ورودیه:** 1) دەرگانە، دراوێ کە بۆ چوونە ژوور دەبێ بدرێ. 2) (بۆ) چوونە ناوەوە(ژوورەوە).

**ور(و)ور:** قسەگەلی پشت سەرییەك و بێمانا و قۆڕ.

**وریب:** بڕوانە: "اریب".

**ورید:** خوێنهێن، شینەدەمار.

**وز:** 1) لێك ئاڵۆسكان، تێك هاڵۆزان، لێك هاڵان. 2) ویزەویزی زەردەواڵە و مێش و هتد. **"وزوزکردن"**: ویزین، ویزان، وزاندن، وزەکردن، وزوزکردن، وزەوزکردن.





**وزارت:** 1) وەزارەت، وەزیری، پلە و پۆستی وەزیر، پلەوپایەی وەزیر. 2) وەزارەتخانە.

**وزان:** (وَ) لە حاڵی هەڵکردن دا، شنینەوە.

**وزان:** (وِ) یەکسان کردن لە کێش دا، هەڵسەنگاندنی دوو شت تا بزانرێ کامیان قورسترە، هاوسەنگی.

**وزّان:** (وَ) کێشەر، هەڵسەنگێنەر.

**وزانش:** بڕوانە:"تهویە".

**وزایز:** ویزەویزەکان.

**وزر:** (وِ) 1) تاوان، گوناە. 2) باری قورس.

**وزر:** (وَ.ذَ) چیای بڵیند، پەناگە.

**وزش:** جووڵانی هەوا، هەڵکردنی با، هاتنی با.

**وزن:** 1) کێشان، بەراورد بە تەرازوو. 2) کێش، سەنگ، قورسایی شتێك، سەنگایی، سەنگاتی، سەنگینی. 3) نرخ، گرینگی. 4) (مۆسیقا) ڕیتم. **"وزن آوردن"**: 1) قورسایی هەبوون. 2) بەبایەخ بوون، هەبوونی ئێعتوبار. **"وزن ایقاعی"**: کێشێ لەسەر بنەمای ڕیتم. **"وزن داشتن"**: 1) قورسایی هەبوون. 2) گرینگ و بەنرخبوون. **"وزن کردن"**: 1) کێشان، کێشانەکردن، دەتەرازوونان. 2) سەنگاندن، بەراوردکردن. **"وزن گرفتن"**: پێزیادبوونی کێش و قورسایی، کێش زیادکردن. **"وزن مخصوص"**: خەستایی، کێشەچڕی، کێشی یەکەیەك لە بارستایی هەر ماددەیەك. **"وزن نهادن چیزی(کسی) را"**: نرخ و بایەخ دانان بۆ ئەو، گرینگی دان بەو.

**وزندار:** کێشدار، بەکێش، سەنگدار.

**وزن کشی:** دیاریکردنی کێشی وەرزشوانان.

**وزنە:** 1) کێش، بەکێشانە، وەزنە. 2) سەنگایی، قورسایی، گرانایی. **"وزنەزدن"**: بەرزکردنەوەی هالتێر، هالتێر لێدان.

**وزیدن:** هەڵکردن (دیسان با هەڵیکرد)، باهاتن، جووڵانی با یان سروە.

**وزیر:** 1) وەزیر، بەرپرسی وەزارەتخانەیەك. 2) سەرۆك، سەرپەرشت.

**وزیری:** 1) وەزیربوون، کاری وەزیر. 2) پۆستی وەزیر، وەزارەت. 3) تایبەتمەندی یەکێك لە قەوارەکانی کتێبو.

**وزین:** 1) قورس، سەنگین. 2) قورس و قۆڵی، حەیا و سەنگینی. 3) گرینگ و بەنرخ. 3) خاوەنی چۆنیەتی باش و جێکەوتو.

**وژولیدن:** 1) شڵەژان، شێوان، پەشۆکان، پەریشان بوون، نیگەران بوون. 2) ژاکان، سیس بوون.

**وژە:** بست.

**وسائط:** کۆی"واسطە یا وسیطە".

**وسائل:** کۆی"وسیلە".**"وسائل ارتباط جمعی"**: ڕاگەیەنەگشتییەکان، دەزگاکانی بڵاوکردنەوە، وەشینەك. **"وسائل نقلیە"**: هەر ئامرازێ کە بۆ ڕاگواستن بەکار بێ وەك ماشێن و پاپۆڕو هتد.

**وساده:** تەختی پاشایەتی.

**وساطت:** 1) ناوبژی، ناڤبژی، نێوبژی، بەریڤانی، بەرەڤانی، نێونجیکردن، نێوان کردن، کەوتنەبەینەوە. 2) ناوەند، ناوەڕاست.

**وسام:** (وِ) نیشانە، میداڵ.

**وساوس:** کۆی"وسواس".

**وستا:** بڕوانە: "اوستا".

**وستاخ:** بڕوانە: "گستاخ".

**وستادن:** زۆربوون.

**وستی:** شیکردنەوە، لێکدانەوە.

**وسط:** 1) ناوەڕاست، نێوان، ناوەند، ناڤبەند، ناڤبەین، ناڤی، ناڤین، نیڤەك، ناڤگین، ناوگین، وەرت، وەرتە، جەرگە، چەق، شەق، کونەڵە. 2) شتێ کە نە باش بێ نە خراپ. 3) جنسی ئەیاغ و دەرەجە دوو. "**وسط افتادن**": 1) هاتنەناوەوە(ی کۆڕ) و لەبەرچاوان بوون. 2) بوونە ناوبژیوان، ناوبژیوانیکردن. 3) لە خۆڕا خۆ تێهەڵقوتاندن و دەست تێوەردان. "**وسط کشیدن**": خستنە بەرباس، هێنانەئاراوە. "**وسط گذاشتن کسی**": کردنی ئەو بەبابەتی گەپجاڕی خۆ لە ناو کۆڕێکا. "**به وسط آمدن**": بڕوانە:"وسط افتادن". "**به وسط کشیدن چیزی**": هێنانە ناوەوەی. "**خود را وسط انداختن**": خۆتێگەیاندن، خۆتێهەڵقوتاندن.

**وسط گیری:** ناوبژی، ناوبژیوانی، بەرەڤانی.

**وسطی:** ناوەڕاست. "**قرون وسطی**": سەدەکانی ناوەڕاست.

**وسع:** (وُ) 1) تاقەت، توانایی. 2) توانایی ماڵی. "**وسع کسی رسیدن**": هەبوونی توانایی ماڵی. "**به قدر وسع**": بە ئەنازەی هێز و توانایی ماڵی. "**به وسع طاقت**": بە ئەنازەی تاقەت.

**وسعت:** 1) بەربڵاوی، هەراوی، بەرفرەهی، پانوبەرینی، بەرینایی، پانتایی. 2) فراوانی، زۆری. "**وسعت دادن**": پەرەپێدان. "**وسعت داشتن**": بەرفرەبوون، بەرین بوون، بەربڵاوبوون. "**وسعت گرفتن**": پەرەسەندن، بەرین بوونەوە. "**وسعت مشرب(نظر)**": پێکەوە هەڵکردن، هەڵکردن دەگەڵ دژبەر. "**وسعت یافتن**": پەرەسەندن.

**وسعت طلبی:** زێدەڕۆیی، زێدەخوازی.

**وسم:** 1) داغکردن، نیشانەکردن. 2) شەقڵ، جێی داغ.

**وسمت:** نیشانە، پەڵە.

**وسن:** 1) ئاتاجی، پێویستی، نیاز. 2) خەو، وەنەوز. 3) ئالوودەیی، ناپاکی.

**وسواس:** 1) حەمبەڵی، حەنبەڵی، عەنبەڵی، وازوازی، وازیوازی، ڕاڕا، حولحولی، دوودڵ، بەگومان، دڕدۆنگ لە پاك بوونەوە، کەسێ کە هەرچی دەکا لای وایە خاوێن نەبۆتەوە، کەسێ کە لە ئاو خەرجکردن دا زۆر پێ دادەگرێ. 2) وردبینی زۆر لە وردەکارییەکانی شتێکدا. 3) شك، گومان، دڕدۆنگی. 4) فکری خراو. 5) شەیتان. "**وسواس تن**": بڕوانە:"شهوت".





**وسواسی:** 1) تووشبوو بە "وسواس". 2) وردبین، باریك بین. 3) دڕدۆنگ، دوودڵی، ڕاڕایی.

**وسوسە:** 1) کەڵکەڵە، خولیا، گینگەڵە، حەمبەڵی پەیداکردن، خراوبیرکردنەوە. 2) هەڵخڕانە شەیتانییەکان. "**وسوسەکردن**": تین دان، هەڵخڕاندن بۆ ئەنجامدانی کارێك، گینگەڵەدان. 2) دەمێشك نانی بیرێکی خراو.

**وسوسەانگیز:** کەڵکەڵەهێن، خولیاهێن، هەڵخڕێن.

**وسیط:** 1) بڕوانە: "میانجی". 2) جێگرتو لە ناوەڕاست دا.

**وسیع:** بەربڵاو، پەرەگرتوو، پانوبەرین، فرەوان، بەرفرەه، هەراو، هیرا، واڵا.

**وسیله:** 1) هۆ، هۆکار، بیانوو. 2) ئامراز، ئالاڤ، کەرەسە. 3) نێونجیکەر، ناوبژیوان. "**(به) وسیله**": بەهۆی، لەلایەن، لەڕێگەی. "**وسیله برانگیختن**": کەڵك وەرگرتن لە دەسەڵات و دەست ڕۆیشتووی خەڵکانیدی بۆ ئەنجامدانی کارێ بە قازانجی خۆ. "**وسیله تراشیدن**": بڕوانە:"وسیلەبرانگیختن". "**به این(بدین) وسیله**": بەم شێوەیە، بەمجۆرە، لەم ڕێگەیەوە. "**چیزی (کسی) را وسیله کردن(قراردادن)**": 1) کەڵك لێوەرگرتن لەو بە قازانجی خۆ. 2) کردنە بیانوو.

**وسیلەساز:** دابینکەری پێداویستی و بارودۆخی پێویست بۆ چارەسەری کێشەکان.

**وسیم:** جوان، دەلال، خوشیك.

**وشایت:** دووزمانیکردن، شۆڤاریکردن.

**وشت:** باش، چاك، خاس.

**وشتار/وشتارش:** سەفەر.

**وشتن:** سووڕدان. سەماکردن.

**وشکردن:** خێراکردن، بە فرزی و زرکی ئەنجامدانی کارێك، بەدەست و بردبوون. "وشگردن" و "وشگردیدن" یش هەر بەم مانایەن.

**وشکرده:** 1) سووربباش، کارگێڕ. 2) ئامادە، ساز.

**وشکول:** چالاك، چوست، فرز، بەکار، لەزگین، ئازا لە کار.

**وشکولی:** فرزی، چوستی، چالاکی، بەکاری.

**وشگون:** بڕوانە:"نیشگون".

**وشن:** پیس، ئالوودە.

**وشینه:** زرێ، زرخ.

**وصّاف:** پەسندەر، پەسنکەر، وەسفکەر.

**وصال:** پێکگەیشتن، پێك بڕان، بەیەکگەیشتن، وەدیهاتنی مرادی دڵدار و دڵبەر. "**وصال پیوستن با کسی**": گەیشتن بەو، پەیوەست بوون بەو. "**وصال جستن(طلبیدن)**": داوای بەیەکگەیشتن کردن. "**وصال داشتن**": بە کەسی دڵخواز گەیشتن و یەکتر لە باوەش گرتن. "**به وصال کسی رسیدن**": بڕوانە:"وصال داشتن".

**وصایا:** 1) کۆی"وصیّت". 2) پەندەکان، ئامۆژگارییەکان، ڕاسپاردەکان.

**وصف**: پەسن کردن، پەسن دان، تاریف کردن، پیاهەڵدان، مەحت کرن. "**با این وصف**": لەگەڵ ئەمەش دا. "**بە وصف (در)آمدن**": شیکرانەوە، وتران.

**وصل**: 1) گەیشتن بە کەسی دڵخواز و یەکتر دەباوەش گرتن. 2) گەیاندن، پێوەنددان. 3) پێوەنددران، پێوەست کران. "**وصل بودن**": پێوەندی هەبوون، پێکەوەبەستران. "**وصل کردن**": 1) چەسپاندن، لکاندن. 2) پێوەنددان. 3) بەستن. 4) بڕوانە: "پیوندزدن".

**وصلت**: (وَ.لَ) 1) پێکگەیشتن، بەیەکگەیشتن، پێك بڕان، زەماوەندکردن. 2) پێوەندی، خزمایەتی. "**وصلت افتادن**": دامەزرانی پێوەندی ژن و مێردایەتی. "**وصلت دادن بە کسی**": وەدەست هاتن بۆ ئەو. "**وصلت کردن**": 1) پێکهێنانی ژیانی هاوبەش. 2) دامەزراندنی پێوەندی نێوان دوو بنەماڵە بە زەماوەندکردنی دوو کەس لەوان.

**وصله**: (وَ.لِ) 1) پینە، پنو. 2) شیاو، گونجاو، جۆر. "**وصله بر (بە) کسی بستن**": تۆمەت دان لەو، درۆ ڕەپاڵ دان. "**وصله بە کسی چسباندن**": بڕوانە: "وصله بر کسی بستن". "**وصله پیراستن**": پینەدان لە شتێك. "**وصله تن (جان)**": خزم و قەومی نزیك، ڕۆڵە. "**وصله تن کسی بودن**": 1) زۆر لەو نزیك بوون، وەك منداڵی ئەو وابوون. 2) شیاو و گونجاو، هاوتا. "**وصله خوردن**": پینەلێدران. "**وصلەزدن (انداختن، کردن)**": پینە لێدان. "**وصله زدن بە کسی**": بڕوانە: "وصله بر کسی بستن". "**وصله شکم کردن**": خواردنی خۆراکێکی کەم. "**وصله ناجور**": 1) پینەی ناجۆر، پینەی ناحەز، پینەیەك کە لە ڕەنگی قوماش یان پێڵاو نەبێ. 2) کەس یان بابەتی نەگونجاو یان ناهاوچەشن و ناتەبا دەگەڵ کۆمەڵێك.

**وصله**: (وُ.لِ) پێوەند، پێوەندارێتی. "**وصله کسی نشستن**": شیاوی ئەوبوون، لەوهاتنەوە. "**بە وصله کسی نشستن**": بە دەردی ئەو خواردن، بە کاری ئەو هاتن.

**وصمت**: 1) شوورەیی، عەیب و عار. 2) ناتەواوی، عەیب.

**وصول**: 1) گەیشتن، هاتن. 2) وەرگرتن، پێگەیشتن. "**وصول کردن**": وەدەست هێنان، وەرگرتنی پارە یان شتێ لە کەسێك. "**سهل الوصول**": قامخۆش، ئەوەی کە بە سانایی دەست دەکەوێ، لەبەردەستان.

**وصولی**: وەرگیراو، پێگەیشتو.

**وصی**: 1) سەروەسیەت، سەرەوگرد، سەرگەڤار. 2) جێنشین.

**وصیّت**: 1) وەسی، وەسێت، وەسیەت، قەوینتی، ڕاسپێری. 2) پەند، ئامۆژگاری. "**وصیت رفتن**": ڕاسپێران. "**وصیت کسی را بە جای آوردن**": بەجێهێنانی وەسێتی ئەو.

**وصیف**: خزمەتکار، بەردەست.





**وضع**: 1) دانان، دانیان، نیان، ڕۆنان. 2) ڕەوش، دۆخ، بارودۆخ، هەلومەرج، حاڵ، بار، چلۆنایەتی، مەرە، مەرەد. 3) چۆنیەتی جێگرتنی پاژەکانی شتێ. 4) توانای ماڵی. 5) قەوارە و فۆڕم و شێوە. "**وضع حمل**": منداڵبوون، بێچووهێنان، زایین. "**وضع شدن**": 1) هاتنەدی. 2) دانران. "**وضع کردن**": 1) دانان. 2) بڕوانە: "ساقط کردن". "**وضع مزاجی**": چۆنیەتی وەزعی جەستەیی لەباری لەشساغی و نەخۆشییەوە.

**وضعی**: 1) لەپێوەندی دەگەڵ "وضع". 2) لەپێشدا دیاریکراو، قەراردادی. 3) بڕوانە: "موضعی".

**وضعیّت**: 1) ڕەوش، دۆخ، بارودۆخ، چلۆنایەتی حاڵ و ئەحواڵ. 2) توانایی ماڵی.

**وضو**: دەسنوێژ، دەزنوێژ، دەسمێژ، دەسنۆژ، دەسنێژ، دەسنمێژ، دەسودیم. "**وضو برآوردن**": دەسنوێژگرتن. "**وضو تازەکردن**": دەسنوێژ هەڵگرتنەوە. "**وضو کردن از (با) خون**": ئامادەی شەهیدبوون بوون. "**وضوگرفتن**": دەسنوێژگرتن.

**وضوح**: ڕوونی، ڕوونبوون، ئاشکرابوون. "**بە (طور)وضوح**": بەڕوونی، بەئاشکرا.

**وطء**: 1) پێشێل کردن، پێ‌ڕێخستن، پێ پیانان، پێخوستکرن. 2) سواری ئەسپ بوون. 3) گان کردن، ئیلاقەکردن.

**وطر**: نیاز، پێداویستی.

**وطن**: 1) نیشتمان. 2) شوێنی نیشتەجێبوون. 3) زێد، ژیگە. 4) هێلانە، هێلین. "**وطن دادن**": نیشتەجیکردن، جێپێدان. "**وطن داشتن**": نیشتەجێبوون، ماڵ هەبوون. "**وطن فروختن**": خیانەت کردن بە بەرژەوەندییەکانی وڵات، نیشتمان فرۆشتن. "**وطن کردن**": نێشتەجێبوون، جێگرتن. "**وطن مألوف**": شوێنێ کە مرۆ هۆگری پێگرتوە.

**وطن پرست**: نیشتمان پەروەر، نیشتمان پەرست، نیشتمان خواز.

**وطن دوست**: نیشتیمان پەروەر، وڵات پارێز، نیشتمان پەرست، وڵات خۆشەویست.

**وطن فروش**: نیشتمان فرۆش، خیانەتکار بە نیشتمان.

**وطن گاه**: شوێنی نیشتەجێبوون.

**وظایف**: کۆی "وظیفە".

**وظیفە**: 1) ئەرکی سەرشان، کارێ کە پێویستە بکرێ، کار و خزمەت. 2) کار، پیشە، شوغڵ. 1) مووچە، مانگانە. 3) بڕوانە: "وجەمعاش". 4) ئەندامی نادایمی لە ئەرتەشدا. "**وظیفەدادن**": دانی "وجەمعاش" بەکەسێك. "**وظیفەداشتن**": ڕاپەڕاندنی ئەرکی سەرشان، هەبوونی ئەرك.

**وظیفەباور**: ئەرك وەخۆگر.

**وظیفەبگیر**: پاشماوەی فەرمانبەرێ کە دوای مەرگی ئەو مووچانەکەی وەردەگرێ.

**وظیفەخور:** مووچەگر.

**وظیفەدار:** بڕوانە:"موظف".

**وظیفەشناس:** ئەرك ناس، ئەرك جێبەجیکەر.

**وعاظ:** کۆی"وعظ".

**وعد:** 1) مژدە، مزگێنی. 2) قەول، گفت، پەیمان.

**وعده:** 1) واد، وادە، بەڵێن، قەول، گفت، سۆز. 2) جار، چەل، کەڕەت. 3) مژدە، مزگێنی. "**وعده به قیامت ماندن**": هەرگیز جێبەجێنەبوون. "**وعده حق رسیدن**": گەیشتنی کاتی مەرگ. "**وعده خلاف کردن**": جێبەجێنەکردنی وادە و بەڵێن. "**وعدەدادن(کردن)**": 1) وادەدان، بەڵێن دان، قەول دان، سۆزدان. 2) مزگێنیدان. "**وعدەداشتن**": وادەهەبوون دەگەڵ کەسێك. "**وعده سر خرمن**": وادەی سەر خەرمان، وادەیەك کە جێبەجێ نابێ. "**وعده شب درمیان**": گفتێ کە ئەمڕۆ بدرێ و بەیانی جێبەجێ بێ. "**وعده گذاشتن(گذاردن)**": قەول و قەراردان، وادەدان. "**وعدەگرفتن**": 1) داوەت کردن بۆ میوانی. 2) قەول وەرگرتن. "**به وعده خود وفاکردن**": بەڵێنی خۆ بردنەسەر، ئەنجامدانی کارێك کە پێشتر گفتی دراوە. "**سر وعده حاضر شدن**": لە کاتی دیاریکراودا ئامادەبوون.

**وعدەدار:** ماوەدار.

**وعدەکژ:** بەدقەول، بێسۆز، پەیمان شکێن.

**وعدەگاه:** 1) بڕوانە:"میعادگاه". 2) کاتی چاوپێکەوتن.

**وعر:** زەوی ڕەق.

**وعظ:** 1) وازدان، وازدادان، ئامۆژگاری کردنی ئایینی. 2) پەند، ئامۆژگاری.

**وعید:** هەڕەشە، وادەی شەڕ و خراپەدان.

**وغد:** کەم ئاوەز، گەمژە، گێل. نۆکەر، خزمەتکار.

**وغستن:** (وَ.غَ.تَ) ئاشکراکردن، دەرخستن، خویاکرن.

**وغول:** هاتنەناوەوە.

**وغیش:** 1) فرە، فراوان، زۆر. 2) بە مانای لێرەوار و قامیشەڵانیش هاتوە.

**وفا:** بەقا، بەینەت،ئەمەگ، هەمەك، هەمەگ، وەفا، بەجێهێنانی وادە و پەیمان، پەیمان پارێزی، بەردەوامی لە دۆستایەتیدا. "**وفا بریدن**": پەیمان شکێنیکردن. "**وفا بە جای آوردن**": بردنەسەری پەیمان، بەجێهێنانی واد و پەیمان. "**وفا جستن**": داوای ئەمەگ و خۆشەویستی کردن. "**وفا دادن**": جێبەجێکردنی وادە و قەول و قەرار. "**وفا داشتن**": بەوەفابوون، بەئەمەگ بوون. "**وفا شدن**": جێبەجێبوون، ئەنجامبوون. "**وفا کردن**": 1) بەجێهێنان و بردنەسەری وادە و پەیمان. 2) دان. 3) بەشکردن، بەسبوون، بە هەموان گەیشتن. 4) ئەنجام دان. "**وفا و صفا**": دۆستایەتی و دلۆڤانی و پاکی. "**وفای صحبت**": بەردەوامی لە دۆستایەتی و تێکەڵی دا. "**وفای (بە) عهد کردن**": بەجێهێنانی وادە و پەیمانی دۆستایەتی، وادە و پەیمان بردنە سەر. "**بی وفا**": بێئەمەگ، پێنەزان، سپڵە، بەڵێن شکێن.

**وفات:** مردن، کۆچیدوایی کردن، کۆچاداڤییێ، وەغەرکرن. "**کسی را وفات رسیدن**": گەیشتنی کاتی مەرگی ئەو.

**وفادار:** بەوەفا، بەئەمەگ، بەینەتدار، چاکەلەچاو، وەفادار.

**وفاداری:** پێزانین، چاکە لەبەر چاو بوون، بەئەمەگ بوون، وەفاداری.

**وفاق:** 1) هاوڕێیی، هاوکاریکردن دەگەڵ یەکدی، یەکیەتی. 2) سازگاری، تەبایی، هاوڕایی.

**وفد:** 1) شاند، لێژنە، دەستە. 2) نوێنراو. 3) پەیام بردن، پەیام گەیاندن.

**وفق:** سازگاربوون، سازگاری، پێکەوەگونجان و سازگاری نێوان دوو شت، خۆگونجاندن. "**وفق دادن**": 1) پێکەوەگونجان، سازگاری هەبوون. 2) پێکەوەگونجاندن. "**وفق کردن**": هاوڕێیەتیکردن، ڕێککەوتن. "**بر وفق(بە وفق)**": بەپێی، بەگوێرەی. "**بر وفق مراد**": بەپێی مەبەست و ئارەزوو.

**وفور:** فرەپاتی، فرەیی، زۆری. "**به وفور**": فرە، زۆر.

**وفیّ:** زۆر بەئەگ، ئەمەگدار، کەسێك کە بەڵێن و پەیمان بەرێتە سەر.

**وفیات:** کۆی"وفات".

**وقاحت:** بێ شەرمی، بێ حەیایی، چەقاوەسوویی، بێچاوەڕوویی، ڕووهەڵماڵراوی.

**وقار:** حوزم، عوزم، شەرم و حەیا و سەنگینی، قورسایی و گرانی مرۆ، قورس و قۆڵی، بەلەسەرخۆیی، هێمنیومەندی، مەزناهی. شکۆ.

**وقاع:** 1) شەڕکردن دەگەڵ کەسێك. 2) کرداری سێکسی ئەنجامدان، هاونوێن بوون دەگەڵ ژن، جووت بوون.

**وقایت:** پاراستن، پارێزگاری، پارێزڤانی.

**وقایع:** کۆی"واقعە". ڕووداوەکان، پێشهاتەکان. شەڕەکان، جەنگەکان. ئەو حاڵەتە ڕۆحی و سۆزدارییانەی کە لە عارفدا دەردەکەوێ.

**وقایع نگار:** کەسێ کە ڕووداو و هەواڵەکان دەنووسێتەوە، ڕووداونووس، ڕێپۆرتێر.

**وقایع نوس:** بڕوانە:"وقایع نگار".

**وقت:** 1) وەخت، کات، سات، گاڤ، گامە، دەم، زەمان. 2) هەل، دەرفەت. 3) ئەو کات (نخست وزیر وقت). 4) نۆبە (امروز وقت آب دادن گلهاست). 5) کاتی مەرگ، دەمی مەرگ، ئەجەل. 6) بەروار. 7) بڕوانە:"فصل". 8) ماوەی تەمەن. "**وقت آزاد**": کاتی ئازاد، کاتێ کە کەسێ کار یان بەرپرسێتییەکی لە ئەستۆ نیە. "**وقت آمدن**": 1) گەیشتنی کاتی

مەرگ. 2) گەیشتنی کاتی ئەنجامدانی کارێ. "**وقت است**": 1) کاتی ئەو گەیشتوە. 2) نزیکە. "**وقت اضافی**": 1) کاتی زیادی.2) وەختی بەفیڕۆچوو. "**وقت بردن**": خایاندن، پێچوونی ماوە، ڕابردنی دەم و کات. "**وقت بود**": وەخت بوو، نزیك بوو. "**وقت پر کردن**": کات پڕکردنەوە. "**وقت پیدا کردن**": وەدەستهێنانی دەرفەت. "**وقت تلف شده**": وەختی بەفیڕۆچوو، وەختی لەدەست چوو. "**وقت تلف کردن**": کات بەفیڕۆدان. "**وقت تنگ**": 1) ماوەی کەم. 2) تەمەنی کورت. "**وقت چیزی درآمدن**": نۆبەی ئەو گەیشتن. "**وقت دادن**": کات پێدان، مۆڵەت پێدان. "**وقت داشتن**": 1) وەخت هەبوون، دەرفەت هەبوون. 2) قەراری چاوپێکەوتن دەگەڵ کەسێك هەبوون یان وەخت گرتنەوە لە کەسێك. "**وقت دیدن**": هەلی لەبار پەیاکردن بۆ ئەنجامدانی کارێك. "**وقت را بودن**": کات بە هەل زانین. "**وقت زوال**": نیوەڕۆ. "**(به) وقتش**": لەکاتی خۆیدا، لە کاتی لەباردا. "**وقت کردن**": دەرفەت پەیاکردن. "**وقت کسی تنگ (گرفته) بودن**": نەبوونی دەرفەتی تەواو بۆ ئەو، خەریك بوون بە زۆر شتەوە، وەخت نەبوون. "**وقت کسی را گرفتن**": 1) وەختی ئەو گرتن، بەفیڕۆدانی وەخت و کاتی ئەو. 2) تەرخان کردنی ماوەیەك لە وەخت و کاتی ئەو بۆ خۆ. "**وقت کشتن**": کات بەخت کردن، کات کڕین، کات کوشتن. "**وقت گذاشتن**": کات دانان، کات دیاریکردن. "**وقت گذراندن**": کات بەسەربردن. "**وقت گذشتن**": 1) تێپەڕبوونی کات. 2) درەنگ بوون بۆ ئەنجامدانی کارێك. "**وقت گرفتن**": 1) قەراری چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسێك دانان، ئیزنی چاوپێکەوتن وەرگرتن دەگەڵ کەسێك، وەخت گرتنەوە. 2) وەخت دانان بۆ ئەنجامدانی کارێ. "**وقت گل نی**": هیچ کات. "**وقت ملاقات**": کاتی چاوپێکەوتن، کاتی سەردان. "**وقت میدان**": کاتی شەڕ. "**وقت وقت**": بڕوانە:"گاەبگاە". "**وقت ها**": جاربەجار، هەندێ جار. "**وقتی**": وەختێ، زەمانێ، ڕۆژگارێ. "**وقتی دارد**": کاتێکی لەباری دەوێ. "**از وقت رفتن**": درەنگ بوون. "**اندر وقت**": بڕوانە:"فوراً". "**اوّل وقت**": بەیانی زوو یان یەکەمین کاتژمێرەکانی دەسپێکرانی کارێ. "**به وقت**": لەکاتی خۆیدا. "**در وقت**": بڕوانە:"فوراً".

**وقت شمار:** 1) وەخت ژمێر. 2) نیگەران، پەرێشان.

**وقت شناس:** 1) وەخت ناس، ئەوەی بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك لە وەختی خۆیدا ئامادەیە. 2) ئەوەی هەل بە دەرفەت دەزانێ.

**وقت کشی:** بەتلاندن، کات بەخت کردن، کوشتنی کات و وەخت، کات کڕین، بەفیڕۆدانی وەخت بەبێ ئەنجامدانی کاری جیددی.





**وقت گیر:** وەخت گر، وەخت گیر.

**وقر:** 1) قورسی، قورسایی. 2) بڕوانە: "وقار". "**وقر نهادن**": گرینگیدان.

**وق زده:** 1) دەرپەڕیو، دەرهاتو. 2) لە زەوق دەر.

**وقع:** 1) گرینگی، بایەخ. 2) زەربە، ئازار. "**وقع افکندن**": وەدەست هێنانی بایەخ و گرینگی. "**وقع داشتن**": بایەخ و گرینگی هەبوون. "**وقع گذاشتن( دادن، گذاردن، نهادن )**": گرینگی پێدان، بایەخ پێدان.

**وقعه:** 1)شەڕ. 2) ڕووداو.

**وقف:** 1) وەستان، وێستان، وێسان، ڕاوەستان، ڕاوەستیان. 2) کەمێك ڕاوەستان لە نێوان ئاخاوتن دا و سەرلە نوێ دەسپێکردنەوە. 3) وەقف، ئەوەی بەشێك لە سامان و ملکی خۆی لە پێناو بەرژەوەندی گشتی خەرج دەکا. 4) تەرخانکراو بۆ کارێ یان کەسێك.

**وقفه:** 1) یەکجار وەستان، ورنگ، پشوو، وچان، ئۆقرە، گت. 2) بڕوانە:"مکث".

**وقواق:** بڕوانە: "بزدل".

**وقود:** (وُ.قُ) داگیرسان، هەڵگیرسان، بڵێسەسەندنی ئاگر. سووتەمەنی.

**وقور:** بڕوانە: "باوقار".

**وقوع:** 1) ڕوودان، پێشهاتن. 2) کەوتن، دابەزین، هاتنەخوار. "**به وقوع آمدن**": بڕوانە:"بە وقوع پیوستن". "**به وقوع پیوستن**": ڕوودان، وەدیهاتن، جێبەجێبوون.

**وقوف:** 1) وەستان، وێستان. 2) ئاگایی، شارەزایی، زانایی."**وقوف افتادن**": زانیاری وەچنگ کەوتن. "**وقوف به هم رساندن**": زانیاری وەدەست خستن، بەخەبەربوون. "**وقوف داشتن**": زانیاریهەبوون، ئاگاداربوون. "**وقوف کردن**": وێستان، وەستان. "**وقوف گرفتن**": بڕوانە:"آگاەشدن". "**وقوف یافتن**": بڕوانە:"آگاەشدن".

**وقیح:** 1) بێشەرم، بێحەیا. 2) ناحەز، کرێت.

**وقیعه:** 1) خەسار، زیانی شەڕ، ڕووداو. 2) پاشملە و بەدگۆیی.

**وکالت:** 1) وەکیلەی، وەکێڵی کردن، بریکاری، پارێزەری. 2) پێسپاردنی کارێك بە کەسێك و متمانەکردن پێی، نوێنەرایەتی."**وکالت دادن**": دیاریکردنی کەسێك وەك پارێزەر. "**وکالت کردن**": پارێزەری کردن، خەریکی کاری وەکیلەی بوون. "**وکالت گرفتن**": وەئەستۆگرتنی کاروباری حوقووقی کەسێك.

**وکالت نامه:** بریکارنامە.

**وکلاء:** کۆی"وکیل".

**وکیل:** 1) پارێزەر، ئاوقات، ئاوقاتی، بریکار، شوونگر، وەرت، وەکیل، وەکێڵ. 2) کەسێك کە متمانەی پێبکەن و کاری پێ بسپێرن، کەسێك کە لە لایەن

کەسێکی دیکەوە بۆ ئەنجامدانی کارێك دیاری بکرێ، نوێنەرێ کە لە لایەن حیزبێك یان گروپێك لە خەڵکەوە بۆ جێبەجێ کردنی کارێ یان بابەتێ هەڵدەبژێردرێ. 3) دانراو، نوێنەر. 4) بڕوانە: "مباشر". "**وکیل اجل**": ئیزرابیل. "**وکیل عمومی**": بڕوانە: "دادیار". "**وکیل قاضی**": مەئمووری جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی دادوەر. "**وکیل کردن**": کردنە وەکیل. 2) هەڵبژاردنی کەسێك وەك نوێنەری پارلمان. 3) کردنی کەسێك بە نوێنەر تا کارێ ئەنجام بدا. "**وکیل گرفتن**": گرتنی پارێزەر. "**وکیل مجلس**": نوێنەری مەجلیس. "**وکیل مدافع**": پارێزەری بەرگری.

**ول**: 1) ئازاد، بەرەڵڵا، سەرگەردان، بێ جێ و ڕێ، وێڵ، ویت، ڕەها. 2) بێ ئەدەب، تەربیەت نەکراو. "**ول دادن**": 1) خستن، هاویشتن. 2) تەرك کردن، وازهێنان. 3) تەواوکردن، کۆتایی پێهێنان. 4) پەخشکردن، بڵاوکردنەوە. "**ول شدن**": 1) وێڵ بوون، بەرەڵابوون. 2) شل بوونەوە، شۆڕبوونەوە. 3) بڕوانە: "پراکندەشدن". "**ول کردن**": 1) وازئانین، وازهانین، وازهێنان، وازهاوردن، دەست هەڵگرتن، دەستبەردار بوون، تەرخ کردن، خۆتێ نەگەیاندن، لەکۆڵبوونەوە. 2) بەرهەڵداکردن، بەرەڵدا کردن، بەرەڵاکردن، بەردان، وەردان، وێل کردن. 3) تەواوکردن، ئیتر نەوتن. "**ول گشتن**": سووڕانەوە بەبێمەبەست، هەڵەگەڕی. "**ول گفتن**": قسەی قۆڕ و پووچ وتن.

**ولاء**: 1) خۆشەویستی، دۆستایەتی، هەڤالینی. 2) نزیکی، خزمایەتی. 3) پاشایەتی.

**ولات**: کۆی "والی".

**ولادت**: لە دایك بوون، زایین، هاتنەدنیا، منداڵ بوون. کاتی لە دایك بوون.

**ولادت گاه**: شوێنی لە دایك بوون، زێد، زاینگە.

**ولانه**: سووکەڵەی "والانه".

**ولایات**: کۆی: "ولایت".

**ولایت**: (وَ یا وِ.یَ) 1) هەر شار یان گوندێ جگە لە پێتەخت. 2) زێد، زاینگە، زانگە. 3) شارستان. 4) ناوچە. 5) وڵات. 6) حکوومەت، دەسەڵاتدارەتی. "**ولایت دادن**": سپاردنی حکوومەتی جێیەك بە کەسێك. "**ولایت عهد**": جێنشینی پاشا.

**ولایت دار**: حاکم، ڕاژۆر.

**ولخرج**: هەڵەخەرج، دەسباد، دەسبڵاو، دەست بە قرپ، دەست شاش، دەسکراوە، دەست ڤەکری، دەست بەردایی، قەللاش، ئەبلەخەرج، ماڵ بە فیڕۆدەر.

**ولخرجی**: دەس بڵاوی، دەست شاشی، ماڵ بە فیڕۆدان، ماڵ بە خۆرایی خەرج کردن، سەرتێکردن، باش و بۆشی، قەللاشی، ئەبلەخەرجی، هەڵەخەرجی، چەنگ لفە، خۆبەردان.





**ولدالزناء**: 1) بڕوانە: "حرامزادە". 2) ئەستێرۆك، گوڵەستێرە.

**ولرم**: شیلەوگەرم، شیلەوتێن، شلەتێن، شیرتێن، ساردوگەرم، ئاوی نێوان سارد و داخ.

**ولع**: چاوچنۆك بوون، ڕژدبوون، بەتەماح بوون، تەماکاری، ڕژدی.

**ولگرد**: چەورە، خوێڕی و بێکارە، فستووقی، لووگی، ماڵانگەڕ، گەڕیانۆخ، هەڵەگەڕ، بەرهەڵدای بێکارە، گەڕیدەی سەرگەردان، وڵحێ، یارمباز، تۆڕی، سەگ پاسووتیاگ، سەگی پێسووتاو.

**ول گویی**: 1) قسەی قۆڕ. 2) زمان شڕی، زارشڕی.

**ول معطل**: 1) لەخۆڕا هیوادار. 2) لەهەڵەدا، خەتاکەر.

**ولنگار/ول انگار**: گوێنەدەر، نەگوهدار، بێسەروبەر، کەمتەرخەم، حولحولی، ساردەگووش، ناپابەند، بێ سەروبەرە.

**ولنگ وواز**: 1) بەرین، بەربڵاو، گەورە. 2) شەقاو. 3) بێسەروبەر، گوێ نەدەر، کەمتەرخەم.

**ولنگیدن**: بەدگۆییکردن.

**ولو**: (وِ.لَ) 1) وەشاو، لێك بڵاو، پرژوبڵاو. 2) تخێڵ بوو، ڕاکشاو. 3) بەشێوەی ناتەکووز لە جێیەك جێگرتو. "**ولوشدن**": تخێڵ بوون، بەسەر عەرز دا درێژ بوون.

**ولوال**: هەراکردن، بەرزکردنەوەی دەنگ بە گریانەوە، گابۆڕ.

**ولوج**: چوونەناوەوە، تێچوون، پیاچوون.

**ولود**: ژنێ کە زاوزێی زۆر دەکا، زایا، زاییێ، زاڤۆك، زەوك، زەڤۆك.

**ولوع**: فرە ڕژد و تەماکار و بەئێرەیی. بەتەماح بوون، چاونەزێربوون.

**ولوله**: 1) دەنگەدەنگ، هەراوهوریا، هەیتەهەیت. 2) هەڵڵاوهەنگامە، ئاژاوە. 3) جووڵانەوە، جووڵە، بزووتن. 4) دەنگۆ، مقۆمقۆ. 5) سام، ترس. "**ولوله(در)افتادن**": بەرزبوونەوەی دەنگەدەنگ و زەنازەنا. 2) دروست بوونی هەڵڵا و ئاژاوە. "**ولوله افکندن(انداختن)**": ئاژاوە و هەراوهوریا نانەوە.

**وله**: 1) زۆر خەمبار بوون، مات و وڕ بوون لە خۆشی یان خەم و خەفەتدا. 2) سەرلێشێواوی، شەیدایی.

**ولی**: (وَ.لِ) بڕوانە: "امّا".

**ولیّ**: (وَ.لِ) 1) دایك و باب. 2) ئەوەی بەپێی یاسا دەسەڵاتی بڕیاردانی سەبارەت بە کەسێك هەیە. 3) دۆست. 4) سەرترین پۆست لە ئایین دا دوای پێغەمبەر. "**ولی امر(فقیه)**": سەرپەرشتی کۆمەڵگا. "**ولی دم**": خزمە نزیکەکانی کەسی کووژراو.

**ولید**: منداڵ، زارۆك، کۆرپە، ساوا.

**ولیعهد**: جێنشینی دەسەڵاتدار دوای مەرگی، میراتگری پاشایەتی.

**ولیمه:** میوانی، زەماوەند، شایی، خواردنێك کە لە جێژنی زەماوەند یان لە دایك بوون یان کڕینی ماڵ دەیدەن، گوێزەبان.

**وندسار:** ناوەند، ناوەڕاست.

**ونديداد:** بەشێك لە کتێبی ئەوێستا.

**ونـگ زدن:** 1) گریان. 2) نقەنق کردن، بۆڵەبۆڵ کردن.

**ونگ:** دەست کورت، نەدار.

**وورووور:** خێراخێرا، پشت سەرییەك.

وول: جووڵە، بزووتن.

**وهّاب:** 1) زۆر بەخشندە. 2) یەکێك لە ناوەکانی خودا.

**وهّاج:** زۆر ورشەدار، بەدرۆشین، درەوشاوە، گرشەدار، ڕووناك.

**وهب:** بەخشین، پێدان.

**وهران:** بڕوانە: "خائف".

**وهره:** تێکەوتن لە کار یان بابەتێك کە ڕێی دەرچوونی نەبێ، پێوەبوون.

**وهلـه:** سەرەتا/دەسپێکی بابەت یان شتێك. جار، کەڕەت.

**وهـم:** 1) ئەوەی بە زەین دادێ، وێنا، خەیاڵ، وێژینگ، وەهم. 2) ئەوەی دەبینری و دەبیسرێ و واقعییەتی نیە، تارمایی، ڕەشکەوپێشکە، ڕەشایی بەرچاو. 3) خەیاڵی پووچ. 4) زەین. "**وهم افتادن کسی را**": تووشی وەهم بوونی ئەو. "**وهم کردن**": وێناکردن، وازانین، پێوابوون. "**وهم کسی را برداشتن( ورداشتن )**": تووشی ترس و نیگەرانی بوون.

**وەمـنش:** ڕەوشت باش، ئاکارباش، دەروون باش.

**وهمیه:** خەیاڵی، وەهمی.

**وهـن:** سستی، لاوازی، بێدەسەڵاتی، بێهێزی.

**وهنگ:** یەچك، هێچك، هەچك، قوڵفەداری سەر گوریسی بار.

**ویار:** بێزو، وێزو، بێزگ، بێژی، مەگیرانی، کەروا، کەروایی، کەربا، کەرب، کەربایەی، کەربایی، نەوریان، مەبرانی، مەهگران، مەورانی، مەوریان. "**ویار داشتن**": 1) بێزوو هەبوون. 2) زك پڕبوون، ئاوس بوون.

**ویترین:** جامخانە، شوێنی ڕانانی شتی فرۆشتن، ویترین.

**ویچاردگر:** پاساودەر.

**ویچاردن:** 1) وەرگێڕان. 2) پاساودان.

**ویختن:** بڕوانە:"بیختن".

**وید/ ویدا:** کەم، کەموکە، ئاستەم. ون. ونبوو.

**ویر:** 1) بیر، یاد، هزر، هۆش. 2) هاوار، ناڵە. 3) زەین. 4) بەش، پشك.

**ویرا:** بەبیر، بیرتیژ، بەهۆش.

**ویراست:** هەڵەگیری، هەڵەچنی.

**ویراستار:** هەڵەگیر، هەڵەگر، هەڵەبڕ، هەڵەچن، شاشگر، "ئێدیتۆر".

**ویراستاری:** هەڵەچنی، هەڵەهەڵگرتن، هەڵەگیری، هەڵەبڕی.





**ویراستن:** 1) هەڵپەرتاوتن، بڕینی لکی زیادی دار، تەکمیش کردن، لێك و لەبارکردن، ڕێك وپێککردن. 2) هەڵەچنیکردن، هەڵەگیریکردن.

**ویراسته:** نووسەر.

**ویـران:** 1) خاپوور، ڕووخاو، کاڤل، کەییل، کایل، کاول، کەلار، کەلارێ، کەلاوە، خەراو، دێرس، پەشیل، هەڕفتی، تێك و پێك چووگ، تێك تەپاو، داتەپاو، زەمەر، وێران. 2) پەشێو، شپرزە، پەرێشان. 3) ناسالم، ئازاردیتو. "**ویران شدن**": کاول بوون، ڕووخان، خاپووربوون، وێران بوون، پەشیلان، پەشیلین، ڕمیان، هلۆشان، وڕای. "**ویران کردن**": 1) ڕووخاندن، ڕماندن، هەرماندن، هەڵشاندن، هلساندن، تۆلدان، تەپخ کردن، پەشیلاندن، وێران کردن، تەرتووتووناکردن، خاك بە توورەکە کێشان. 2) بڕوانە:"آشفتن"."**ویران کننده**": ڕووخێنەر، وێرانکەر، ڕمێن.

**ویرانگر:** کوژەر، فەوتێفەر، وێرانکەر، ماڵ وێرانکەر.

**ویرانـه:** 1) کەلاوە، کاول، خاپوور، خراوە، خۆپان، وێرانە، شوێنی خراو و وێران. 2) دنیا، جیهان.

**ویرانـی:** 1) وێرانی، کاولی، کاول بوویی، خاپووربووگی، خراوی. 2) پەرێشانی، پەشێوی.

**ویرایش:** هەڵەگیری، هەڵەچنی، هەڵەبڕی.

**ویـروس:** زیندوولە، ویرووس، ماکەی سەرەکی کە دەبێتە هۆی نەخۆشی گیرۆ.

**ویزا:** ویزا، ڤیزا، مۆرکردنی تێپەڕنامە.

**ویزار:** بڕوانە:"بیزار".

**ویـزیـت:** 1) بڕوانە: "معاینەکردن". 2) سەردان، سەرلێدان، چاوپێکەوتن (ویزیت موزە). 3) هەقدەست.

**ویزیدن:** بڕوانە:"بیختن".

**ویژگان:** تایبەتەکان، بژاردەکان، نزیکانی کەسێك، خۆمانەکان.

**ویژگی:** تایبەتمەندی، گەوشین، دانستە، خاسمانی.

**ویژه:** 1) تایبەتی، خاسەکی، خاسەیی. 2) دەرەجە یەك، هەرەباش، شاز، دانسقە. 3) پاك، خاوێن. "**ویژه داشتن**": پاك ڕاگرتن. "**ویژەکردن**": پوخت کردن، پاك کردن. "**بەویژه**": بە تایبەتی، ب خاسمانی.

**ویس:** 1) نەداری، هەژاری. 2) دڵخواز.

**ویسپرد/ویسپرت:** یەکێك لە بەشەکانی ئەوێستا.

**ویس کنسول:** جێگری کونسول.

**ویشگون:** بڕوانە:"نیشگون".

**ویشناك:** کوشندە، کوژەر.

**ویغ:** بڕوانە:"جیغ و داد".

**ویـل:** (وَ) 1) بەڵا، چورتم، نەگبەتی، نەهامەتی، دژواری. 2) هاتنی شەڕ و خراپە. 3) شوێن یان چاڵێکە لە جەحەندمدا. 4) بڕوانە:"عذاب".

**ویل:** (وِ) دەسپێشخەری و زاڵبوون بە سەر شتێکدا، هەل، دەرفەت. "**ویل جستن**": لە بۆسەی هەلێکدا بوون. "**ویل یافتن**": دەرفەت دەس کەوتن، کێس لێهێنان، هەل ڕەخسان، هەل ڕەخسین.

**ویلان:** 1) ڕیتاڵ، لانەواز، عەوداڵ، پەرتەوازە، ڕەهەندە، ڕەهندە، ماڵ بەکۆڵەوە، ئاوارەی چۆڵگەڕ. 2) سەرگەردان، سەرلێشێواو.

**ویله:** (وَ.لَ) گرفتاری و دژواری، ئابڕووچوون، ناوزڕان، خەنزاری.

**ویله:** (وِ.لَ) هەراوهوریا، هەوارهەوار، هاتوهاوار، قرموقاڵ، دەنگ و هەرای بەرز. دەنگ. "**ویله کردن**": هەراکردن، خرۆشاندن.

**ویمه:** تۆمەت، بوختان، دووزمانی.



**هاپلوئید:** تاك.

**هاپولی:** 1) تالان کردن، ڕاووڕووتکردن. 2) پەلامارهێنان بەمەبەستی ڕفاندن.

**هاجر:** 1) جیابیکەرەوە. 2) شیاو و سەرکەوتوو. 3) لەسەریەتی، سەرووتر لە دیتران.

**هاجس:** دڵخەبەردان، ئەوەی لە دڵدا ڕابرێ.

**هاجم:** هێرشکەر، پەلاماردەر.

**هاج و واج:** سەرگێژ، گێژوویژ، هاژوواژ، سەرسام، سەرگەردان، پەشێواو، پەشۆکاو، حەپەسیو، تاسیو، هوول، واق وڕ، داماو، چاش، شاش. "**هاج و واج شدن**": پەشۆکان، شەپۆکان، شەپۆکیان، وڕبوون، تاسان، تەوسین، حەپەسان، حەپەسین، دامان، سەرلێ تێکچوون.

**هادم:** کاولکەر، خاپوورکەر، تێکدەر. "**هادم اللذات**": بریتی لە مەرگ.

**هادوری:** سواڵکەر، سواڵکەری قیرسیچمە کە بە پێداگری داوای شتێ بکا، خەڵکی بێسەرووپێ و نزم.

**هادی:** 1) ڕێنوێنیکەر، ڕێنماییکەر. 2) بڕوانە: "رسانا". 2) دەستەمۆ، پەروەردەکراو.

**هار:** 1) بێحەیا، بێشەرم. 2) سەگێ کە لە نەخۆشی مێشکەوە هار بووبێ، هار، مێچی. "**هاروهور**": زۆر برسی و تینوو.

**هارب:** ڕاکردوو، هەڵاتوو.

**هارت و پورت:** هەرا و هاتوهوتی بێهوودە.

**هارمونی:** 1) هارمۆنی، هاوئاهەنگی و هاوڕێژەیی نێوان پاژەکانی کۆمەڵەیەك. 2) هونەری ئاوێتەکردن و هاوڕێژەکردنی ئەو دەنگانەی کە گیرا و خۆشن.

**هارمونیك:** 1) هاوئاهەنگ، هارمۆنیك. 2) هاودەنگ، سازگار.

**هاژ:** 1) داماو، بێدەسەڵات، زەبوون. 2) نەبزوو، بێجووڵە.

**هاژیدن:** وڕبوون، سەرلێشێوان، دامان، گریان.

**هاس:** 1) سووکەڵەی "هراس" بە مانای ترس و خۆف. 2) لەمەبەدواوە، ئیتر.

**هاسیدن:** 1) بڕوانە: "کالیدن(1)". 2) ترسان، ترسین.

**هاشم:** شکێنەر، وردکەر.

**هاضم:** هەڵتاوێن، هەزمکەر، هەرسکەر.

**هاضمە:** مێینەی "هاضم". "**جهازهاضمە**": کۆئەندامی هەرسکردن.





**هاگسان:** هێلکەیی شکڵ.

**هال:** 1) ئارام، ئۆقرە، سەبر و لەسەرخۆیی. 2) تراویلکە. 3) هاڵ.

**هالك:** 1) لەناوچوو، فەوتاو. 2) بڕوانە: "مرگبار".

**هالو:** بەیتەشە، گێلۆکە، گێلە، گێل و نەزان، گێل و حۆل، خۆل، حەپۆل، چلێ، چۆپیك، کەرۆکە، گەڤە، گەمژە، گەمشۆ، گێژوویژ، گێلۆکە، گێلە، گەوج، لەوج، کەم فام، مێشۆ، مێخۆلی، جلخۆز، ساویلکە.

**هالە:** 1) خەرمان، خەرمانە، ئاخڵە، تامار، سەیوان، تەمومژی دەوری مانگ. 2) تێچێن، کتکەنەفتینە، خراپەکار، بەدڕەوشت.

**هامال:** 1) هاوتا، هاوشان، وێنە. 2) شەریك، هاوبەش.

**هامراه:** بڕوانە: "همراه".

**هامش:** پەراوێز/ لێواری کتێو.

**هامن:** بڕوانە: "هامون".

**هاموار:** بڕوانە: "هموار".

**هامواره:** بڕوانە: "همواره".

**هامون:** 1) کرك، دەشتی زۆر پان و بەرین، زەوی ڕێك و تەخت. 3) سارای بێ ئاو و شینایی. 3) وشکی، وشکایی. 4) زەوی. 5) دەرەوەی ماڵ یان شار. 6) تەخت، ڕێك، ساف.

**هامّە:** (مَ) هەر بوونەوەرێ کە ژەهری هەبێ.

**هامە:** (مَ) 1) سەر یان تەپڵەسەر. 2) سەرەك قەوم. 3) گرووپی خەڵك. 4) ئەسپ. 5) کوند.

**هامی:** وڕ، سەرلێشێواو، سەرگەردان.

**هاوش:** نەتەوە.

**هاوشی:** نەتەوەیی.

**هاون:** ئاونگ، دەسکاونگ، هاڤن. "**هاون کردن**": کوتانەوە و هاڕین لە ناو ئاونگدا.

**هاویە:** دۆزەخ، دۆژە، جەحەندەم.

**هایاهای:** بڕوانە: "هیاهو".

**هایاهوی:** بڕوانە: "هیاهو".

**هایب:** ترسێن، ترسێنەر، زات بەر، نەتەڵە، مرۆترسێن، چەش چەڕە.

**هایج:** 1) بزۆك و بەکولوکۆ، خرۆشان. 2) ورووژاو، هەڵخڕاو، هاندراو. 3) ئاژەڵی نێر کە بۆ مێکە ورووژا بێ.

**هاید:** تۆبەکار و گەڕاوە بۆ لای هەق.

**هایل:** 1) ترسێن، ترسێنەر، ترسناك. 2) بابەتێ یان کارێ کە بۆ ئینسان گەورە و قورس بێ.

**هایم:** سەرگردان، سەرلێشێواو. سەرسووڕماو، حەپەسیو.

**هباء:** 1) تەپوتۆز، تەپوتوومان. 2) زایە، فیڕۆ. "**هبا شدن**": 1) بەشێوەی تۆز دەرهاتن. 2) زایەبوون و لەناوچوون. "**هبا و هدر**": زایەبوو، لەناوچوو.

**هبوب:** هەڵکردنی با، باهاتن.

**هبوط:** (هُ) هاتنەخوارەوە، دابەزین، داکەوتن.

**هبه:** 1) بەخشین، پێدان، خەڵات. 2) بەخشراو.

**هپاتیت:** (پزیشکی) هەوکردنی جەرگ، هەوکردنی خانەکانی جەرگ.

**هپرو:** ڕفاندنی شتێ، تالان، پووڕ، ڕاووڕووت. "**هپروشدن**": 1) کەوتن و سەرەونخوون بوون. 2) پەلامارهێنان بەمەبەستی ڕفاندن. 3) تالان و بڕۆکران. "**هپرو کردن**": بەتالان بردن، ڕفاندن.

**هپرهپو:** تالان کردن.

**هپل(و)هپو:** 1) بڕوانە: "**لاقید**". 2) تالان کردن، ڕاووڕووت کردن. 3) هێرش هێنان بە نیازی ڕفاندن.

**هپلی:** 1) پیس و نارێك و ئاڵۆز. 2) گێلۆکە، سەپۆل، حەپۆل.

**هپلی هپو:** 1) بڕوانە: "**لاقید**". 2) ئاڵۆز، نارێکوپێك. 3) بێ بڕوا، بێ باوەڕ. 4) تالانکردن. 5) شاڵاوهێنان بە نیازی ڕفاندن.

**هتّاك:** ڕیسواکەر، ئەتك کەر، ناوزڕێن، بەدبێژ، بەدزوان.

**هتروژن:** ناهاوجۆش، جیاواز، لێکدژ، چێکراو لە چەشنی جۆراوجۆر.

**هتك:** (هَ) 1) دڕاندنی پەردە، کێشان و هەڵکەندنی پەردە لە جێگەی خۆی. 2) سووکایەتی، بێ حورمەتی، شوورەیی، ئەتك. "**هتك حرمت(احترام)**": سووکایەتی، سووك و چروك کردن، چاوشکاندن. "**هتك ستر**": ناوزڕاندنی ئەو، سووك کردنی ئەو. "**هتك كردن**": ئەتك کردن، هەتك کردن، هەتکاندن، ئابڕووبردن، ناوزڕاندن، سووکایەتی بەسەرهێنان. "**هتك ناموس**": دەستدرێژی سێکسی.

**هتك:** (هَ تَ) کۆم، قوون. "**هتك خود را پارەكردن(دریدن، جر دادن)**": 1) زۆر قەڵس و تووڕە بوون. 2) خۆ خستنە زەحمەت و ژانەسەرەوە.

**هجا:** (هِ) 1) بەدوێژی، بەدگۆیی، جوێن دان، باسی خراپەی کەسێك کردن، ژماردنی عەیبەکانی کەسێك. 2) حینجە/حونجە/حونجیکردن، خوێندنەوەی بە سەر و ژێر و بۆرەوە. 3) بڕوانە: "**هجویه**". "**حروف هجاء**": ئەلف و بێ، لە ئەلف تا بێ. "**هجایی**": حینجەیی. بڕگەیی.

**هجّاو:** (هَ) فڕاوێژ، فڕباز، کەسێك کە بە شێعر جوێن بە خەڵك دەدا.

**هجاور:** گرووپێك لە خەڵك. "**هجاورهجاور**": گرووپ گرووپ.

**هجر:** دووری، جیایی، لێك جیایی.

**هجران:** هەڤدووری، لێك هەڵبڕان، جیایی، دووری لە دۆستان و هەڤاڵان.

**هجرت:** دوورکەوتن لە زێد، کۆچ کردن لە نیشتمانی خۆت و چوونە شوێنی دیکە، ڕۆیشتن لە شارێکەوە بۆ شارێکی دی و تێیدا نیشتەجێ بوون. بنەمای مێژووی موسڵمانەکان کە ڕۆژی کۆچکردنی حەزرەتی محەممەد(د.خ)ە لە مەککەوە بۆ مەدینە. "**هجرت ملكوتی**": کۆچکردن، مردن.





**هجری:** کۆچی.

**هجمه:** هێرش.

**هجن:** (هًَ.جَ) قسەی ناحەز و خەوشدار و بێتام.

**هجن:** (هُ.جُ) کۆی "**هجین**".

**هجو:** 1) فڕ(پێدادان)، کەترە، هەجب، هەجو، جوێنی بە شێعر، خراوگوتن، بەدگۆیی. 2) بڕوانە: "**هجویه**". 3) بێکەڵك و بەدەردنەخۆر و بێنرخ. "**هجوكننده**": فڕاوێژ، فڕباز، قەرفۆك.

**هجوع:** 1) خەوتن، نووستن. 2) خەو، خەف.

**هجوم:** هێرش بردن، پەلاماربردن، هەڵکوتانەسەر، هەڵمەت بردن، هەلابردن، هاژۆتن، (**هجوم سریع**) دابڕسکان، دابڕسکین، دابەڕزین، دابەڕزان.

**هجویات:** 1) قسەگەلی قۆڕ و بێ مانا. 2) کۆمەڵە شێعر یان پەخشان گەلێك کە ناوەرۆکی هەجوایییان هەیە.

**هجویه:** نووسراوەیەك بەشێوەی پەخشان یان هۆنراوە کە کەسێکی تێدا هەجو کرابێ، فڕنامە، هەجونامە.

**هجیر:** (هَ) نیوەڕۆ، گەرمای نیوەڕۆ.

**هچل:** گێچەڵ، گرفتاری، ژانەسەر، بارودۆخی دژوار.

**هدات:** کۆی "**هادی**"، ڕێنوێنیکەران.

**هدایا:** کۆی "**هدیه**".

**هدایت:** 1) ڕێنوێنیکردن، ڕێنماییکردن، ڕێنیشاندان. 2) بڕوانە: "**رسانش**". "**هدایت الكتریكی**": بڕوانە: "**رسانش**".

**هدر:** 1) لەناوچوو، زایە، فیڕۆ. 2) بێ بەر، بیکەڵك. "**هدردادن(كردن)**": بەتلاندن، بەفیڕۆدان، زایەکردن، خەسارکردن، لەبەین دان، خراکردن. "**هدردهنده**": بەفیڕۆدەر، خەسارکەر، زایەکەر، دۆڕێن. "**هدرشدن(رفتن)**": بەفیڕۆچوون، هەڕمین، زایەبوون، هەرزبوون، خەساربوون، لە دەست چوون، پووچ بوون(ەوە). "**هدرشده**": بەترەف، بەفیڕۆچووگ، لەدەست چووگ، زایەبوو، خەساربوو. "**به هدررفتن**": بڕوانە: "**هدرشدن**".

**هدف:** 1) ئامانج، مەبەست. 2) شوێنی مەبەست. 3) نیشانە، کێلك. "**هدف چیزی قرارگرفتن**": کەوتنەبەر هێرشی ئەو، وەبەرهاتن، وەبەرکەوتن. "**هدف داشتن**": بەدوای ئامانجێکەوە بوون. "**هدف گلوله(تیر) قرارگرفتن**": وەبەرهاتن، وەبەرکەوتن، پێکران، وێکەوتن، وەئامانج کەوتن، هەنگوان، ئەنگوان. "**هدف گرفتن**": 1) تەقەلێکردن، سێرەگرتن. 2) خستنەگەڕی تەواوی هەوڵ و تەقالای خۆ بۆ گەیشتن بە ئامانجێك. "**بەهدف زدن**": 1) پێکان، هەنگاوتن، هنگافتن، هنگاڤتن، هنگڤتن، لە نیشان و ئامانج دان. 2) ئاماژەکردن بە خاڵی سەرەکی.

**هدفدار:** مەبەستدار، ئامانجدار.

**هدف غائی:** دوائامانج.

**هدف گیری:** سێرەلێگرتن.

**هدفمند:** مەبەستدار، ئامانجدار، بەئامانج.

**هــدم:** کــاول کــردن، وێــران کــردن، ڕووخاندن.

**هدنه:** (هُ.نَ) ئاشتی، سوڵح.

**هدونیزم:** ڕێبازی چێژ.

**هــده:** (هُ.دَ) 1) هــەق، ڕاست و دروست. 2) سوود و قازانج. "**بیهده**": ناهەق، پووچ، بێهوودە.

**هدی:** 1) ڕێنوێنی، ڕێنمایی. 2) گەیشتن بە هـەق و هەقیقـەت. 3) ڕێگـەی ڕاست، ڕەوگەی دروست. 4) ئیسلام.

**هدیــه:** دیـاری، پێـشکەشی. "**هدیـــه‌کردن (دادن)**": دیـــاری دان، پێـــشکەشکردن. "**هدیه‌گرفتن**": دیاری وەرگرتن.

**هذیان:** وڕێنە، وڕینە، وڕاوە، ڕاوە، ڤڕاڤە، ڕاوان، ئاتــەران، پاتــەران، قــسەپەڕێنی، هوڕێنــە، هــۆڕاوە، هەرپلــە، لافــە، غلــت، غلتــە، قــسەی نەخۆشــی بێهــۆش. "**هــذیان بافتن**": بڕوانە:"**هژیان گفتن**"."**هذیان گفــتن**": (قسە)ڕاوانـدن، قـسەپەڕاندن، بزڕکانـدن، وڕێنــەکردن، وڕاوەکــردن، هــۆڕاوەکردن، غلتاندن، شپەستە، دەم بە یەکاهاتن.

**هــرآینـــه:** 1) بــێگومــان، هەڵبەتــە، بێئەملاولا. 2) هەرکات، هــەر گاڤــ، هــەر دەم. 3) بەهەرحاڵ.

**هــرا:** دەنــگ و هــەرای بەسـام، هــەرای سامناک.

**هــراس:** تــرس، خــۆف. "**هــراس بــەدل(خــود، خویش) راه‌دادن**": هەست بە مەترسیکردن، ترسان."**هراس خوردن**": ترسان، سام کردن. "**هراس داشتن**": ترس هەبوون، ترسیان. "**بـه هــــراس افکنـــــدن**": تووشـــی تـــرس و نیگەرانیکردن.

**هراسان:** لە حاڵی ترس و خۆفدا، ترس لە دڵ، تووشی ترس هاتو، حەجمین لێهەڵگیراو. بەترسەوە.

**هراساندن:** تووشی ترس و نیگەرانیکردن.

**هراس انگیز:** ئـەوەی ببێتـە هـۆی تـرس و خۆف، سامهێن.

**هراسمند:** ترسەنۆک، نەوێر، بێجەرگ.

**هراسـناک:** خــەڵك ترسـێن، پیـاوتۆقێن، ترسناک، چاڤسۆر، چاوسوور، بەهەیبەت و مەترسی.

**هراسنده:** بێجەرگ، ترسەنۆک، کەسێك کە لە شتێك بترسێ.

**هراسه:** داوەڵ، داوڵ، داهۆڵ، داڵۆ، داڵهۆ، قەیلۆك، لۆپك.

**هراسیدن:** ترسان، ترس و خۆف کردن.

**هراسیده:** ترساو، تووشی ترس و خۆف هاتوو.

**هــراش:** 1) بـڕوانـە: "استفراغ". 2) تێکبەربوون و شەڕ و کێشمەکێشکردن.

**هــراکش:** بــەو زەرعاتــەی دەڵــێن کــە تۆوەکەی لە کاتی خۆیدا بچێنرێ. ئەگەر دێرتر بچێنرێ پێی دەڵێن "وراکش".

**هراول:** پێشەنگ/پێشڕەوی لەشکر.





**هــرب:** 1) هــەڵاتن، ڕاکردن. 2) پیربوون، بەتەمەن بوون.

**هــرت:** بـێ یاسـا، بـێ حەسـاووکتاو، ناڕێکوپێك و ناتەکووز.

**هــرج:** 1) کەوتنە فیتنە و ئاژاوەوە. 2) فیتنە و گەندەڵی و ئاژاوە.

**هرجایــه:** بـێسـەروبەر، گـوێنـەدەر، حولحولی.

**هرجایی:** 1) کەسێك کە هەردەمەو دڵ بە کەسـێ یـان شـتێ دەدا. 2) سـۆزانی، ڕووسپی.

**هرج و مرج:** بێسەرەوبەرە، تێکەولێکە، تەڕاوبەڕا، ئاخۆران زاخـۆران، ئاخۆران بخۆران، هـەڵڵاد، تێکوپێك، تاڵان و بڕۆ، ئـاژاوە، پـشێوی. "**هــرج و مــرج طلــب**": ئاژاوەخواز، پشێویخواز.

**هرچگاه:** هەرکات، هەر دەم.

**هــردری:** 1) ماڵانگەڕ، هەڵەگەڕ. 2) بێ بناغە.

**هردم:** هەموو کات، بەردەوام.

**هردمبیل:** 1) ئاڵۆز و ناتەکووز، بێحەساو و کتاو، ناڕێکوپێك. 2) بـێ خـەیاڵ، گوێنـەدەر، کەسـێ کـە هەسـت بـە بەرپرسیارەتی ناکا.

**هردم جوش:** ماڵانگەڕ و بێسەروبەرە.

**هردودکـــشیدن:** بەکۆمەڵ و هاتوهاواری زۆرەوە چوونە شوێنێك.

**هرز:** 1) شتێ کە ددانۆکەکانی خراو بووبێ وەك پێچ و مۆرە، هەرس. 2) بەفیڕۆچوو، خەساربوو. 3) هـەرێس، هـەرێز، فریـزوو. "**هرز دادن**": بەفیڕۆدان، خەسارکردن. "**هرز رفـــتن**": 1) بەفیڕۆچــوون، زایـــەبوون، خەساربوون. 2) بڕوانە:"منحرف شدن". "**هرزشدن**": هەرس بوون، سوان.

**هرزآب:** ئاوی بیکەڵك کە بەفیڕۆ دەچێ.

**هرزانگاشت:** خەیاڵی پووچ.

**هرزبندی:** بڕوانە:"صرفەجویی".

**هرزگی:** 1) بڵحی، ئاکاری بێشەرمانەو ناپەسند، خوێڕیەتی، کاری خوێڕییانە، لەدەفی، گەف. 2) ناحەزی، دزێوی. 3) جوێن دان، شتی خراو ڕەپاڵ دان. 4) کۆئەندامی جووت بوون.

**هرزگیری:** بڕوانە:"صرفەجویی".

**هــرزه:** بلـح، ئاکارناپەسند، بێئاکار، ڕەوشت ناشیرین، سووك و چرووك، جڵف و سووك، جڵف و بێ شەرم، جرت، قرت، خوونك، ولحێ، ولحێ، یارەمەز، یارمباز، لەدەف، خوێڕی، بێکارە، بێهوودە. "**هــرزه لافیــدن**": لافی بێهوودە لێدان. "**بـه(بـر) هـرزه**": بێهوودە، بێ هۆ، لەخۆڕا. "**کار هرزه**": یارم، کاری هەرزە و سووك.

**هرزه‌آب:** 1) بڕوانە:"**هرزآب**". 2) شاوەت.

**هرزه‌پو:** بڕوانە:"**ولگرد**".

**هرزه‌چانه:** بڕوانە:"**یاوەگو**".

**هرزه‌خند:** ئەوەی لە خۆڕا پێدەکەنێ.

**هرزه‌خوار:** هەمووشت خۆر.

**هرزەدرای:** چەنەوەڕی قسەبێتام، چەڵتەباز، بێژۆك، كۆڵەوێژ، گەفۆك.

**هرزەرو:** ئەوەی بەبێ مەبەست و ئامانجێكی دیاریكراو دەچێتە هەر جێیەك.

**هرزەسرایی:** 1) قسەی بێتام و قۆڕكردن، چەڵتەبازیكردن، كۆڵەوێژی. 2) قسەكردن بە بێشەرمی و بێئەدەبی.

**هرزەگرد:** چەورە، لووگی، هەڵەگەڕ، بەرهەڵدای بێكارە. "**هرزەگردبی هدف**": گەڕاڵ، گەڕیدەی بێ مەبەست.

**هرزەگو:** بڕوانە: "**هرزەدرای**".

**هرزەگویی:** بڕوانە: "**هرزەسرایی**".

**هرزەلاف:** چەنەبازی بێ تام بێژ، چەنەوەڕی قسەبێتام، چەڵتەباز.

**هرزەلای:** بڕوانە: "**هرزەلاف**".

**هرزەلایی:** بڕوانە: "**هرزەگویی**".

**هرزەمرض:** گەڕاڵ و بلّح.

**هرزەنگاری:** بڕوانە: "**پورنوگرافی**".

**هرزەنگاە:** چاولەوەڕێنی، چاوحیزی.

**هرس (كردن):** (هَ.رَ) هەڵپەرتاوتن، پەرتاوتنیدار، داپەڕژنین، داپتین، داپاچین، ڤەپاچین، ڤەپرژنین، ڕۆپلاندن، ڤەپرژنین، كرخ، كزخان، كزخاندن، كەسخ، كەسخاندن، كەزاخ، كەزاختن، تەرافكرن، هەڵپیتاندن، پەنجنین، بەترمە، باغ برین، بڕینی ڕەز، قرپاندن، سەروگوێ كردن، شاخ ڤەدان، شفتیك، لك هەڵپاچینی دار، هەڵپاچینی لكی پۆپ و دار، پەڕاندنی لكی دار، پەڕاندنی لق و پۆپی دار، بڕینی لكی زیادی دار، قەیچیكردنی دار.

**هرس:** (هَ) 1) دەستەك بۆ دارەڕا. 2) كوتان(ەوە)، وردكردن.

**هركجا:** هەرجێیەك، هەر شوێنێ.

**هركن پركن:** زۆر قەبە و هەرزان.

**هركەهركە:** بڕوانە: "**هركیهركی**".

**هركیهركی:** ڕفان ڕفان، فڕان فڕان، گورگوتاو، كەس لە كەس، بێ سەرەوبەرەیی.

**هرگاە:** 1) هەركات، هەركاتێك، هەرڕۆژێك، هەردەم، هەرگاڤ، هەرتم، هەرچاخ، چساتێ، وڕۆنێن. 2) وشەی مەرج بە مانای ئەگەر، ئەگەركوو.

**هرگز:** هەرگیز، قەت، هیچكات، هیچ وەخت، بەهیچ كلۆجێ، هیچ نە.

**هرگزی:** هەمیشەیی، تممی، بێبڕانەوە.

**هرگونە:** هەرجۆرە، هەرچەشنە.

**هرم:** (هُ) تینی ئاور، بلێسەی ئاگر.

**هرم:** (هَ.رَ) پیربوون، پیری.

**هرم:** 1) (هَ.رِ) پیر، بەساڵداچوو. 2) دەروون و ئاوەز، هۆش و ئاوەز.

**هرم:** (هَ.رَ) قووچەك، قوویچك، قووچكە. "**هرم قدرت**": زنجیرە پلەی دەسەلاتی سیاسی لە كۆمەڵگایەك دا.

**هرماس:** (هُ) ئەهریمەن، شەیتان.

**هرمنوتیك:** ئازەنتی، هێرمێنۆتیك، زانستی ڕاڤە.





**هرو:** (هَ) ئازا، بوێر، بەجەرگ.

**هروانگە:** بڕوانە: "**هروانە**".

**هروانە:** 1) نەخۆشخانە، خەستەخانە. 2) شێتخانە، دینگە. 3)بە مانای ئەشكەنجە و شوێنی ئەشكەنجە و ئازاردانیش هاتوە.

**هرولە:** گورگەلۆق، گورگەلۆقە، قۆترە، قەترە، قۆتە، قۆرتە، لەقلۆق. "**هرولەكردن**": لۆقاندن، لۆقانن، (گورگە) لۆقەكردن، لۆقەلۆق كردن، بە قۆرتە ڕۆیشتن.

**هروم:** ژنی بەدخوو و بەدڕەوشت.

**هرهری:** (هَ.هَ یان هُ.هُ) بێ باوەڕ، بێ بڕوا، كەسێك كە پابەندی هیچ بڕوایەك نەبێ.

**هری:** هێڕی، گوم بە، بڕۆ وەدوای كارت كەوە.

**هریمن:** سووكەڵەی "**اهریمن**".

**هرین:** دەنگی بەسام، دەنگی بوونەوەری دڕندە.

**هزار:** 1) هەزار، دە جار سەدی. 2) بولبول، یان جۆرێك لە بولبول. "**هزار اسم روی كسی گذاشتن**": ناو و ناتۆرەی ناڕەوا ڕەپاڵ ئەودان یان تاوانباركردنی ئەو بە كارگەلی ناڕەوا. "**هزار بار هزار**": ملیۆنێك. "**هزارهزار**": 1) ملیۆنێك. 2) ژمارەیەكی زۆر. "**هزاری هم**": هەر ئەننازە زۆر.

**هزارآوا/هزارآواز:** بولبول.

**هزارتابە:** بریتی لە هەتاو، خۆر.

**هزارتو:** 1) زۆر ڕەمزاوی و فێڵباز. 2) پێچاوپێچ، پێچەڵاوپێچ. 3) شاراوەترین بەشەكانی ناوەوەی شتێك.

**هزارچانە:** دەمهار، دەم درێژ، زۆربلێ، فرەوێژ، چەنەباز.

**هزاردستان:** بولبول.

**هزاركارە:** 1) ئەوەی گشت كارێك ئەنجام دەدا. 2) بڕوانە: "**هرجایی**".

**هزارگان:** 1) چوارەمین ژمارە لە لای ڕاستەوە بۆ چەپی هەر ژمارەیەك. 2) هەزاردانە هەزاردانە.

**هزارمیخ:** 1) بریتی لە جلوبەرگی زبر و پڕتەقەڵی دەروێشان. 2) بریتی لە ئاسمانی پڕ ئەستێرە.

**هزارە:** 1) هەزارە، دەورەیەكی هەزار ساڵە. 2) ڕێوڕەسمێ كە بە بۆنەی هەزارەمین ساڵوەگەڕی لە دایك بوون یان كۆچی دوایی كەسێك بەڕێوەدەچێ. 3) گروپێك لە سپا بریتی لە هەزار كەس.

**هزاك:** گەوج، گەمژە، نەزان، كەسێك كە زوو فریو بخوا.

**هزال:** (هُ) كزی، لاوازی.

**هزّال:** فرە قسەخۆشی گاڵتەكەر.

**هزالت:** شۆخی و گاڵتە، خۆش زەوقی.

**هزبر:** (هُ.بَ) 1) چالاك و دلێر. 2) شێر.

**هزل:** گاڵتە، گاڵتەوگەپ، شۆخی، حەنەك.

**هزل گو:** گاڵتەچی، حەنەكچی.

**هزم:** تێكشكاندن و پەرتەوازەكردنی دوژمن.

**هزمان:** سووکەڵەی"هرزمان".

**هزوارش:** (هُ.ر) 1) شیکردنەوە و لێکدانەوە. 2) شێوەی خوێندنەوەی وشەیەك نە بەو جۆرەی کە نووسراوە.

**هزیل:** کز، لاواز.

**هزیمت:** ترۆقە، ڕاکردن لە شەڕ، شکان لە شەڕ، شکست خواردن، تێکشکان، بەزین. "**هزیمت دادن**": ترۆقانن، تۆپدان، شکست دان/ پێدان، تێکشکاندن، شکاندن لە شەڕدا، ڕاونانی دوژمن. "**هزیمت دهنده**": بەزێن، شکست دەر بە دژ، تێکشکێنەر. "**هزیمت کردن**": 1) شکست دان، تێکشکاندن. 2) ڕاکردن لە شەڕ، هەڵاتن لەبەر نەیار، بازدان لە شەڕ، ترۆقان. "**هزیمت گرفتن**": تێکشکان و هەڵاتن.

**هزینە:** 1) خەرج، تێچوون. 2) ئەوەی لەپێناو وەدەست خستنی شتێکی دڵخواز لەدەست دەچێ. "**هزینەکردن**": خەرج کردن، دانی پارەیەك بۆ کڕینی شتێ یان ئەنجامدانی کارێك. 2) تەحەممول کردنی شتێکی ناخۆش یان لەدەست دانی شتێ یان کەسێ لەپێناو گەیشتن بە ئامانجێ. 3) بڕوانە:"انفاق کردن".

**هژبر:** بڕوانە:"هزبر".

**هژمون:** هێژموون، باڵادەستی.

**هژیر:** 1) باش، چاك، پەسندکراو. 2) جوان. 3) چالاك، گورج. 4) بەباشی.

**هسبند:** بڕوانە:"هست بند".

**هست:** هەبوون، بوون، شتێ کە هەیە. "**هست شدن**": هاتنەدی، هاتەبوون. "**هست کردن**": وەدیهێنان، هێنانەدی، هێنانەبوون. "**هست مطلق**": بوونی ڕەها. "**هست و نیست**": 1) بوون و نەبوون، دارونەدار، تەواوی دارایی، هەموو شتێ. 2) تەواوی جیهان.

**هستار:** شتێ کە هەیە، بارودۆخێ کە هەیە.

**هستانە:** دەپێوەندی لەگەڵ هەبوون و هەمگەل، دەپێوەندی لەگەڵ کاروباری ماددی.

**هست بند:** 1) ئاشق، شەیدا. 1) لە شەڕە کەڵەشێر و شتی وادا لایەنگری یەکێك لە دوو لایەنی مەرج بەستوو بوون.

**هست بین:** بڕوانە:"واقع بین".

**هست بین گرایی:** ڕیالیزم.

**هستش:** 1) ڕیالیزەبوون، هاتنەدی. 2) بڕوانە: "موجودیّت".

**هست شدن:** هاتنەدی، وەدیهاتن.

**هستش زایی:** بڕوانە:"هستی زایی".

**هستش شناسی:** بڕوانە:"هستی شناسی".

**هست نگر:** بڕوانە:"واقع بین".

**هستمند:** ڕاستەقینە، واقیعی.

**هستمندسازی:** بڕوانە:"تحقق".

**هستمندگرایی:** ڕیالیزم، واقیع خوازی.

**هستن:** هەبوون، بوون، هەیی.

**هست نما:** تایبەتمەندی ئەوەی وەك بوونێك دێتە بەرچاو لەحاڵێکا بوونی نیە.





**هستو:** درکێن، دانپیانەر.

**هستومندی:** بڕوانە:"موجودیّت".

**هستە:** 1) ناوك، نێوك، دەنك، دەندك، دەنکە، دندك، کاکڵ، کاکڵە. 2) بەشی سەرەکی و بنەڕەتی شتێ. 3) چووکترین بەشی ڕێکخستنێك. 4) قۆناغی سەرەتایی و دەسپێکی کارێ. "**هستە مرکزی**": بەشی سەرەکیی ڕێکخستنێ.

**هستەای:** ناوکی.

**هستی:** 1) هەبوون. 2) تەواوی دارایی، گشت سامانی کەسێك. 3) ژین، ژیان. 4) جیهان، هایدن. 5) فیزن و لەخۆبایی. "**هستی مطلق**": هەبوونی ڕەها. "**هستی و نیستی**": هەبوون و نەبوون، تەواوی دارایی.

**هستی بخش:** پێکهێنەری ژیان، ئافرێنەری ژیان.

**هستیدن:** هەبوون، بوون.

**هستی زایی:** لە زیندەوەرناسیدا: هەبوون زایی، ontogeny.

**هستی شناسی:** هەبوون ناسی، ontology.

**هستی شناختی:** هەبووںناسانە.

**هستی گرایی:** بڕوانە:"اگزیستانسیالیسم".

**هستی یافتن:** هاتنەدی، وەدیهاتن.

**هش:** (هُ) 1) سووکەڵەی"هوش". 2) هۆش، هۆئش، وشەیەك کە بۆ ڕاگرتنی کەر ئێژن.

**هشاشت:** شادبوون، دڵخۆش بوون، شادمانی و ڕووخۆشی.

**هشام:** 1) بەخشش، وەخشە، دەسەنە، دڵاوایی، جوامێری. 2) جوامێر، مێرخاس.

**هشتن:** 1) دانان. 2) هێشتن، هێڵان، تڵین، تلیان، وازلێهێنان. 3) بەجێهێشتن.

**هشداردادن:** ئاگادارکردنەوە، وریاکردنەوە، وشیبارکردنەوە.

**هشداردهنده:** وریاکەرەوە، وشیارکەرەوە.

**هشنگ:** (هَ.شَ) بێ سەروپێ، مایەپووچ، پەست، ناکەس.

**هشوار:** وریا، وشیار، بەهۆش.

**هشومند:** بیرتیژ، مەژوودار، خاوەن ئاوەز و هۆش.

**هشیار:** دڵ زیندوو، دل زیندی، دڵاوەدان، وریا، وشیار، بەهۆش، بەبیر، زرنگ، زیرەك، ئاگادار، هاگی دار، شەس بێدار، لەسەرهەست، چراخ. "**هشیارشدن**": وریابوونەوە، بێداروشیاربوونەوە، هاتنەسەرخۆ.

**هشیوار:** بەئاوەز، بیرتیژ، بەهۆش، ئاوەزمەند.

**هضم:** 1) دەن، هەرسەك، هەڵتاوین، بگاردن، ئەزم، هەزم، تاواننەوەی خۆراك لە ورگدا. 2) شکاندن و ستەم کردن. 3) تێگەین و شیکردنەوەی پرس و بابەتەکان. "**هضم رابع**": دوایین قۆناغی هەڵتاوینی خۆراك. "**هضم کردن**": 1) مهاندن، گڤێرین، گڤیراندن، هەڵتاواندن، دەناندن، هەرسکردن،

هەزمکردن. 2) تێگەیشتن و تاوتویکردن. 3) هەڵمژین و تاواندنەوە. **"هضم کننده"**: هەڵتاوێن، هەزمکەر. **"هضم نفس"**: زاڵبوون بەسەر توورەیی یان خۆویستیدا. **"از هضم رابع (هم) گذشتن"**: لەناوچوونی بەتەواوی شتێك و کۆتایی پێهاتنی.

**هفت اقلیم:** بریتی لە تەواوی وڵاتانی سەر زەوی، دنیا.

**هفت اندام:** حەوت ئەندامی لەشی مرۆڤ : سەر. زگ. سنگ. دوو دەست. دوو لاق. **"هفت اندام زمین"**: بەبڕوای پێشینیان حەوت نهۆمی زەوی.

**هفت پشت:** 1) حەوت بەرە/ وەچەی ڕابردوو. 2) حەوت بەرەی داهاتو. **"هفت پشت کسی را جنباندن"**: جنێو بە ئاباوئەژدادی ئەو دان، جوێن بە مردوەکانی ئەو دان.

**هفت جان داشتن:** خۆڕاگر و ڕاوەستاو بوون لە بەرامبەر مەترسی و زیانەکان دا، گیان سەخت بوون.

**هفت جوش:** 1) زۆر کوڵاو. 2) توندڕۆ، پەرگر. 3) فێڵاوی و کەڵەکباز، حەوت خەت. 4) کانزای زۆر ڕەق و پتەو، کانزایەك کە لە تێکەڵکاری حەوت کانزای دیکە چێکرابێ، قەرەسوو.

**هفت چاك:** تەواوی ئەندامی لەش، گشت لەش.

**هفت خزینە:** بریتی لە حەوت ئەندامی گرینگی لەش: مێشك، دڵ، سی، گورچیلە، کرش، سپڵ، جەرگ.

**هفت خط:** فێڵەزان، کەڵەکباز، حەوت خەت.

**هفت روزە:** 1) حەوت ڕۆژە. 2) کەم تەمەن.

**هفت زمین:** حەوت نهۆمی جۆراوجۆری زەوی.

**هفت سین:** سفرەیەك کە لە کاتی هاتنی ساڵی نوێدا دەیچنن و بە حەوت خواردەمەنی کە هەوەڵەکەیان بە "س" دەست پێدەکا دەیڕازێننەوە وەك: سیر. سرکە.سێو. سماق. سەمەنی. سنجوو. سەوزی.

**هفت صناری:** کەم نرخ، کەم بایەخ.

**هفت کار:** پارچەی حەوت ڕەنگ.

**هفت کشور:** 1) بڕوانە: **"هفت اقلیم"**. 2) جیهانیان. 3) جیهان، ڕۆژگار.

**هفت کفن پوساندن کسی:** تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر لە مەرگی ئەو.

**هفتگی:** حەوتوانە.

**هفت ماهه به دنیا آمدن:** کەم چیکەڵدانە و بێئۆقرەبوون.

**هفتە:** حەوتە، حەوتوو، ڕۆژەکانی حەوتوو. بەمانای ڕۆژی حەوتەمیش هاتوە. **"هفتەبەهفتە"**: 1) هەر حەوتووی جارێك. 2) ماوەیەکی دوور و درێژ.

**هفتەنامە:** حەوتوونامە.

**هفوت:** هەڵە، خەتا.

**هق هق زدن:** خرینگی، هەنیسك دان دەگەڵ گریان، فڵقوهۆڕی گریان.





**هکتار:** دەهەزارمیتری چوارگۆشە.

**هکتو:** سەد. **"هکتومتر"**: سەدمیتر. **"هکتولیتر"**: سەدلیتر.

**هکچە:** نزگەرە، نزگرە.

**هکذا:** بەمجۆرە، هەروەها.

**هکك:** بڕوانە:**"هکچە"**.

**هکهك:** بڕوانە:**"هکچە"**.

**هگرز:** هەرگیز، هیچکات.

**هل:** (هُ) پاڵ، دەڵەك، ڤەزۆقان. **"هل دادن"**: پاڵ پێوەنان، پاڵدان، پاڵنان، کول کردن، دەڵەکدان، ڤەزۆقاندن، بۆقدان، زیخاندن، نووسك دایش.

**هلاشم:** ناحەز، پەست.

**هلاك:** 1) کوژران، مردن. 2) زۆر ئاواتەخواز و بەتاسە. 3) زۆر ماندوو و شەکەت. 4) لەناوبەر، تیابەر. 5) سڕانەوە، لەناوچوون. 6) کوشتن، لەناوبردن. **"هلاك شدن"**: بەرڤین، مردن لە ڕێی خراپدا، لەناوچوون. **"هلاك شده"**: تۆپیو، کەوتی، سەکەت، بەرڤی، مردوو لە ڕێگەی خراپدا، بەرانبەری شەهید بوون.

**هلاکت:** 1) 1) کوژران، مردن، مەرگ. 2) بەدبەختی، بێچارەیی، ڕۆژڕەشی. **"بە هلاکت رساندن"**: کوشتن، لەناوبردن. **"بە هلاکت رسیدن"**: کوژران، مردن.

**هلال:** مانگییەکشەڤە، مانگ یەکشەوە، مانگییەکشەوە، مانگیلە، مانگ نوێ، مانگی نوێ، مانگ تازە، هەیڤك، هێڤك. **"هلال احمر"**: مانگی سوور. **"هلال شدن"**: وەك مانگی یەکشەوە باریك و زەردهەڵگەڕان.

**هلالوش:** زەنازەنا، قاڵمەقاڵم، قوقوو، فیتنە و ئاژاوە.

**هلالی:** 1) بە شکڵی مانگی یەکشەوە، کەوانەیی، چەماوە. 2) مانگی. 3) تاریکەسەلات.

**هلالین:** پەڕانتێز، دووکەوانە.

**هلاهل:** (هَ.هِ) هەلاهەل، هەلاهیل، زەهری هەلاهەلایی، شیلەگیایەکە زۆر کوشنندە.

**هلاهل:** (هُ.هِ) ئاوی زۆر ساف و ڕوون.

**هلپند:** تەوەزەل و بێسەروبەر.

**هلك( و )هلك:** هەڵتەك هەڵتەك.

**هلنیسم:** یۆنانی گەرێتی، هۆگری بە فەرهەنگی یۆنانی کۆن.

**هله:** بێڵە، وازبێنە.

**هل هلکی:** بەپەلە و پڕتاو.

**هلهلە:** تلیلی، هەلەلە، هەلهەلە، بالۆرەلێدان بە گەروو، بە هۆی زمان لە ناو دەمدا دەنگی شادی دەربڕین.

**هلیدن:** هێشتن، هێڵان، وازلێهێنان.

**هلیم:** لکەمەنی، نووسەمەنی.

**هلیوتراپی:** چارەسەری هێندێ نەخۆشی بە تیشکی خۆر.

**هم آخور:** هاوپلە.

**هم آشیان:** 1) هاولان، هاوهێلان، پێکەوە لە یەك هێلانە. 2) هاودەم، هاونشین.

**هم آغوش:** 1) دەستەملان، کەسێك کە لە باوەشی کەسێکیدی دابێ.2) هاودەم، هاونشین.

**هم آوا:** هاودەنگ، تایبەتمەندی دوو یان چەند شکڵی نووسراوەیی بە شێوە دەربڕینی وەك یەك وەك"خوان" و "خان". "**هم آوایی**": هاودەنگی.

**هم آواز:** 1) هاوئاهەنگ، هاوڕا، هاوڕێ، لەگەڵ، سازگار. 2) لە حاڵی پێکەوە خوێندندا.

**هم آورد/هماورد:** خەنیم، غەنیم، دژیار.

**هم آویز:** بڕوانە:"**هم آورد**".

**هماتوری:** (پزیشکی) خوێناویبوونی میز.

**همارا:** بڕوانە:"**هموارە**".

**هم ارز:** هاونرخ. "**هم ارز شیمیایی**": "ئیکی والان".

**همارش:** بڕوانە:"شمارش".

**همارە:** بڕوانە:"**هموارە**".

**همّاز:** بڕوانە:"سخن چین".

**هم اکنون:** هەرئێسە، ئەئێستا، نهو، نووکە، هەنووك، هەنگا، هەنهۆ.

**همال:** 1) هاوتا، بەرابەر، نزیك. 2) هاوسەر. 3) هاونشین، هاوکار.

**همام:** (هُ) 1) پیاوی ئیرادە بەرز، پیاوی گەورە و ئازا و بەخشندە، هێژا. 2) شێری دڕننە.

**همانا:** 1) وەك، وەکوو، وێکچوو. 2) وازانی، پێوایی، دەڵێی.

**هم اندیشی:** سمینار.

**همانستی:** بڕوانە: "**هویت**".

**همانند:** وەك، وەکی، وەکوو، وەکیەك، وەکوویەك، وەك یەکتر، وەکۆك، هەروەك، هەروەکوو، هەروەکی، چوونیەك، هاوتا لە ڕەنگ و بیچمدا، لەڕەنگی، شبی، یەك توخم، لەچەشنی، لە وێنە، تەواو لە گوێن، چوون، چاشتی، دەدی.

**همانندسازی:** هاوتاسازی، خوڵقاندنی بەرهەمێکی هونەری کە بەتەواوی دەگەڵ ئەسڵی بابەتەکە یان بەرهەمی ئەسڵی بێتەوە.

**همانندی:** لەیەکچوون، هاوشێوەیی، چوونیەکی.

**هماوری:** 1) زاوزێ، مناڵ خستنەوە. 2) بڕوانە: "مسابقە".

**هماهنگ:** 1) هاوئاهەنگ، یەك ڕیتم، سازگار. 2) هاوڕا، یەکگرتوو، هاوبڕوا. 3) (فیزیك) هارمۆنیك. 4) لەحاڵی ڕێککەوتن دەگەڵ یەکدی. "**هماهنگ کردن**": دابین کردنی پێشەکییەکانی کارێك و بەرنامەداڕشتن بۆی بەجۆرێ کە نەزمی کارەکان تێك نەچێ، ڕێکخستن.

**هماهنگی:** 1) هاوئاهەنگ بوون. 2) تەکووزی و یەکپارچەیی و هاوڕێژەیی پاژەکانی شتێ دەگەڵ یەکدی. 3) هاوڕێیەتی.

**همایستایی:** هاوسەنگی، هاوتایی.

**همایش:** 1) کۆبوونەوە، گەل بەستن. 2) کۆنگرە.

**همایش ناپذیر:** قووڵ، بێبن.

**همایند:** تایبەتمەندی دوو یان چەند واژە کە دەگەڵ یەك بەکاردەبرێن وەك"همّ وغم" و "داغ و درفش" و هتد.





**همایون:** 1) پیرۆز، موارەك، بەفەڕ. 2) ناوی یەکێك لە ئاهەنگەکانی مووسیقای ئێرانی.

**همایونگاه:** پێتەخت.

**همباز:** 1) شەریك، هاوبەش. 2) هاوتا، هاوشان.

**همبازی:** 1) هاوگەمە، هەڤلیز، هەواڵ لە گەمە و کایەدا. 2) خەنیم.

**هم بالا:** هاوبەژن و باڵا، لە باڵادا وەکیەك. 2) بەرابەر.

**هم بالین:** هاوسەر.

**همباور:** هاوبڕوا، هاوباوەڕ.

**همبر:** 1) ئەوەی لە تەنیشت شتێ یان کەسێك جێیگرتبێ. 2) بەرابەر، یەکسان، لە یەك ڕیزدا. 3) هاونشین، هاوڕێ. 4) لەتەنیشت یەك، لە پاڵ یەك.

**همبستاد:** بڕوانە:"**همست**".

**هم بستر:** هاوجێ، هاونوێن.

**همبستگی:** هاوپێوەندی، پێوەندی، هاوجۆشی. "**همبستگی مبارزاتی**": هاوخەباتی.

**هم بستە:** 1) کانزایەك کە دەگەڵ یەك یان چەند کانزایتر تێکەڵ بووبێ، هاوجۆش، ئالیاژ. 2) بەستراوە بە شتێ، پاژێ لە کۆمەڵەیەك.

**هم بند:** 1) هاوجۆش، لێك جۆشدراو. 2) هەڤبەند، هاوزیندانی.

**همبود:** ئەنجومەن. خاڵی هاوبەش.

**هم بهرە:** بڕوانە:"سهیم".

**همپا:** 1) ئامپا، پێبەپێی، کەسێك کە پێ بەپێی کەسێکی دی بڕوا. 2) هاوپلە (وپایە). "**همپایی کردن**": هاوڕێیەتیکردن.

**همپار:** (شیمی) ئیزۆمێر.

**همپالکی:** هاوڕێ و هاوکار یان هاودەست.

**همپایە:** 1) هاوپلە(و پایە)، هاوشان، هاوڕیز، لە کەسپ و کار دا وەك یەك. 2) بەرابەر، یەکسان.

**همپرسە:** دیالۆگ، گفتوگۆ.

**هم پرسی:** بڕوانە:"مصاحبە".

**هم پشت:** 1) ئاریکار، یارمەتیدەر، دوو کەس کە بە پشتیوانی یەکتر کارێك بکەن و پشتیوانی لێك بکەن. 2) دوژمن، نەیار.

**هم پهلو:** تەنیشتاوتەنیشت و نزیك یەك. "**هم پهلوی**": لە بەراورد دەگەڵ، نیسبەت بە.

**هم پیالە:** هاوپیاڵە، هەڤ پەیالە، هەڤ پیالە، هاودەم، کەسانێ کە پێکەوە شەڕاب دەخۆنەوە.

**هم پیشە:** هاوپیشە، هەڤ پیشە، هاوسنعات، هاوکار، ئامپا.

**هم پیمان:** هاوپەیمان، هاوسوێن، هاوسوێند، هەڤسۆند، یەك قسە.

**هم پیوند:** خزم، فامیل.

**همّت:** ویست و ئیرادەی بەهێز بۆ گەیشتن بە ئامانجێ، هیممەت. 2) خواست، ئارەزوو. 3) نزا لە ناخی دڵەوە. "**همّت با کسی داشتن**": 1) یادکردنەوەی ئەو بە دۆعا. 2) دڵ لای ئەو بوون، لە دڵەوە ئاگا

لەوبوون. **"همّت بستن"**: لە ناخی دڵەوە دۆعا کردن. **"همّت بە خرج دادن"**: ئیرادەکردن، هیممەت کردن. **"همّت خواستن"**: داوای دۆعای خێرکردن لە کەسێك. **"همّت کردن"**: 1) هیممەت کردن، بەکارهێنانی ئەوپەڕی توانایی و ئیرادەی خۆ. 2) لەخۆنیشاندانی تەبعی بەرز و جوامێرانە.

**همتا**: 1) هاوتا، هاوتەك، ئاوتا، هەڤتا، تا، هنداق، هاوشان، لەنگە، لنگە، میناك، وەك، وەکیەك. 2) هاوجنس، هاوچەشن. 3) هاوجووت، هاوجفت، هاوژین. 4) شیاو.

**همتاب**: هاوشاخ، غەنیم، لە زۆر و هێز دا وەکیەك.

**همتازیانە**: هاوڕمبازێن، هاوشەڕانخێوی.

**همتاسە**: هاوبەش لە خەم و پەژارەدا.

**هم تخت**: هاوپایە، بەرابەر.

**هم تراز**: هاوئاست، هاوتا، هاوتەراز، شان لە شان، بەرانبەر. **"هم تراز شدن"**: ڕێك بوون، بەرانبەرهاتنەوە.

**هم ترازو**: 1) هاوکێش، هاوسەنگ، هاوپایە، هاوشان، هاوتەرازوو، بەرابەر. 2) هاوەڵ، هاونشین. 3) خەنیم.

**هم تقدیر**: هاوچارەنووس.

**هم تك**: هاوقەدەم، هاوڕێ، دوو کەس  کە پێکەوە ڕادەکەن.

**هم جفت**: هاوەڵ، هاوڕێ.

**هم جناق**: ئاوەڵ زاوا، ئاواڵ زاوا.

**هم جنس**: 1) هاوڕەگەز. 2) هاوکار، هاوپیشە. 3) هاوبیر، هاوفکر. 4) هاوچەشن.

**همجنس باز**: نێرباز، مێباز.

**همجنس بازی**: ئارەزووکردن لە هەمان ڕەگەز. **"همجنس بازی زنان"**: پانپانۆکە، پانپانۆکێ. **"همجنس بازی مردان"**: نێربازی، قنگەگان.

**همجنس گرا**: 1) بڕوانە:"همجنس باز". 2) جەماڵباز، کەسانێك کە تەنیا ئاشقی جوانییەکانی هاوڕەگەزی خۆیان دەبن و بەس.

**همجوار**: بڕوانە:"همسایە".

**همجواری**: بڕوانە:"همسایگی".

**همجوش**: هاوجۆش، کانزایەك کە لە تێکەڵکاری چەند کانزایتر پێك دێ.

**همجوشی**: 1) پێکەوە کوڵان و بە فۆڕمی ماددە یان پێکهاتەیەکی نوێ دەرهاتن. 2) بڕوانە: "سازگاری". 3) فیزیك) هاوجۆشی، "فیوژن".

**هم چرا**: هاولەوەڕ.

**هم چشم**: هاوچاو، هومال، هاڤرك، هەڤرك، ملەکەر، کەسێ دەگەڵ یەکێ بەربەرەکانی دەکا.

**هم چشمی**: هاڤرکێ، کێبەرکێ، ڕکبەرکێ، ڕقەبەری، ڕکەبەری، قینەبەری، ململانێ، ملەملە، حەمەڕەمزێ.

**هم چم**: بڕوانە:"مترادف".

**همچنان**: 1) هەروا، هەروەها. 2) وەك، وەکوو.

**همچنان چون**: وەك، وەکوو.





**هم چند**: بەرابەر، یەکسان، هاوکێش. **"هم چندِ"**: 1) بە ئەنازەی، بە قەرای. 2) هاوتەمەن.

**هم چندی**: بەرابەری، هاوسەنگی، هاوتەرازی.

**هم چندین**: بە هەمان ئەنازە.

**هم خاك**: 1) هاونیشتمان. 2) هاوسێ، خاوەنی سنووری هاوبەش.

**همخانە**: 1) هاوماڵ، هەم هوونە، هاوبەش لە ماڵدا. 2) هاوهێلان. 3) هاونشین، هاودەم، هاوەڵ.

**هم خرج**: هاوخەرج.

**هم خداوند**: کەسێ کە دەگەڵ یەکیدی لە خزمەت یەك کەس دابێ.

**همخواب**: 1) هاوجێ خەو، هاونوێن. 2) هاونشین، هاودەم.

**همخوابگی**: سەرجێیی، هاوجێیی، نووستن لە گەڵ ژندا.

**هم خوابە**: 1) هاوجێ خەو، هاونوێن. 2) هاودەم، هاونشین. 3) هاوسەر، ژن.

**همخوان**: 1) هاوجەم، هاوخوان، هاوسفرە. 2) هاودەنگ. 3) تەبا، جۆر.

**همخوانی**: دەگەڵ یەك هاتنەوە، یەکترخوێندنەوە، یەکگرتنەوە( این دو مسئلە باهم همخوانی ندارند: ئەم دوو مەسەلەیە یەکترناگرنەوە)، تەبابوون، سازگاری.

**هم خورد**: بڕوانە:"تصادم".

**همداستان**: 1) هاوقسە، هاوپەیڤ، هاوڕاز، هاوڕا، هاوبڕوا. 2) هاودەم، ئاودەنگ، هەڤ نشین. **"همداستان شدن"**: یەکگرتن و هاوبیربوون، ڕێککەوتن. 2) بوونە هاوڕێ، بوونە هاونشین.

**هم دانش**: هەماوەز، دەیەك ڕادەی ئەقڵدا.

**همدرد**: هاودەرد، هامدەرد، هەڤدەرد، هەڤدەڤ، هاونشین، بە دەردی یەکتر تووش بوون، خەمبار بە خەمی تۆوە، کەسێ کە لە خەم و پەژارەی کەسێکی دی هاوبەش بێ.

**همدست**: 1) هاوبەش، هەڤاڵ، هاوکار، ئاریکاری یەکتر، هاودەست. 2) یەکگرتوو، هاوڕا. 3) بڕوانە: "دستیار". 4) بڕوانە: "هم آغوش". 5) هاوسەر.

**هم دستان**: هاوبڕوا، هاوبیروباوەڕ.

**همدل**: یەکدڵ، هاوڕا، دۆستی ڕاست.

**همدم**: هاودەم، هاودەنگ، ئاودەنگ، هۆگر، خەمڕەوێن، هەڤ دەڤ، هەڤ نشین، هەواڵی هاونشین، ڕیهەڤ.

**هم دندان**: 1) هاوتەمەن بەتایبەتی کەسانی پیر و بەتەمەن. 2) هاوبیر، هاوفکر. 3) هاودەم، هاونشین.

**هم دورە**: هاودەورە.

**همدوش**: 1) هاوشان، هاوقەدەم، بەرابەر، یەکسان. 2) هاوکات.

**هم دهان**: 1) هاودەنگ. 2) هاوڕا.

**هم دیس:** بەرابەر، هاوتا، هاوڕێك، هاوئاهەنگ.

**همراز:** هاوڕاز، هەوڕاز، ئامڕاز، هاوسوڕ، دۆستی زۆر نزیك، لەیەكتر ئەمین، هاونشین.

**همراه:** 1) (بەهمراه)دەگەڵ، ڕەگەڵ، لەتەك، وەل، وێڕا، ڤێڕا، پێڕا. 2) هاوڕێ، هاڤڕێ، هەڤڕی، هەڤڕێ، هەڤڕێك، ئامڕا، هەتەك، وڵاش، هاوسەفەر. 3) هاریكار، یارمەتیدەر. "**همراه داشتن**": 1) پێبوون، لەتەكابوون. 2) لە كن یان لە تەنیشت خۆ هەبوون. "**همراه شدن**": لەتەك كەسێكا ڕۆیشتن بۆ شوێنێ. 2) ئاوێتەكران، تێكەڵ كران. 3) بڕوانە:"قرین شدن". "**همراه كردن**": 1) ناردنی كەسێك بۆ شوێنێ لەتەك كەسێكیتردا. 2) كردنە شەریك، بەشداری پێكردن. 3) دانانی دوو یان چەند شت لە تەنیشت یەكدا. 4) كردنە هاوبیروباوەڕ. "**بە همراه داشتن**": پێبوون، لەتەكابوون.

**همراهی:** 1) هاوڕێیەتی، هاوسەفەری. 2) یارمەتی یان بەشداریكردن لە ئەنجامدانی كارێكدا.

**هم رأی:** هاوڕا، هاوبڕوا، هاوفكر.

**هم رخدادی:** هاوكاتی.

**هم ردیف:** هاوڕیز، هاوئاست، كەسێ كە دەگەڵ كەسێكی دی لە یەك پۆست و پایە دابێ.

**همرس:** لێك نزیك.

**همرسی:** لێك نزیك بوونەوە.

**همرفت:** (فیزیك) كۆنوكسیۆن.

**هم ركاب:** 1) هاوجڵەو، هاوڕكێف. 2) بەرابەر، یەكسان. 3) هاونشین، هاودەم.

**همرنگ:** هاوڕەنگ، هەڤڕەنگ، یەك ڕەنگ، هاوبیچم، لەوێنە، لەفۆڕما وەكیەك.

**همرنگی:** لێكچوونی، هاوڕەنگی، یەكڕەنگی، هاوبیچمی.

**همروان:** ئێسكۆرت، پارێزەر.

**هم ریش:** 1) هاوتەمەن، هاوعومر، هاوزێ. 2) ئاوەڵ زاوا.

**همز:** هێما بەچاو.

**همزاد:** هامزا، ئاوڵ دوانە، هاواڵ دوانە، هاوسك، لف، لفە، لفەدوانە، جمك، جوی.

**همزانو:** 1) هاونشین، هاودەم، كەسێك كە ئەژنۆی بە ئەژنۆی كەسێكی دیكەوە نابێ و دانیشتبێ. 3) هاوسێ، تەنیشت.

**همزبان:** 1) هاوزمان، هەڤزمان، هەڤزار، یەكزمان، خاوەنی یەك شێوە ئاخاوتن، ئەوانەی گشتیان بە زمانێ دەئاخێون. 2) یەككگرتوو، یەككگرتی. 3) هاودەنگ.

**هم زدن:** لێكدان.

**همزمان:** هاوكات، هاوزەمان، هاوچەرخ، هاودەورە.

**همزمانی:** هاوكاتی، هاوكات بوون، هاوچەرخی.

**همزن:** میكسێر.

**همزی:** 1) هاوشان، هاوپلە و پایە. 2) هاوفۆڕم، وەكیەك.





**همزیستی:** پێكەوەژیان، دەگەڵ یەك ژیان. "**همزیستی مسالمت آمیز:** پێكەوە ژیانی ئاشتییانە.

**همزیگاه:** 1) گەڕەك، تاخ. 2) شوێنی كۆبوونەوە.

**همزیگری:** بڕوانە:"**همزیستی**".

**همساز:** 1) گونجاو، سازگار، هاوڕا، هاوفكر. 2) هاوئاهەنگ. 3) هاوسەر.

**همسازكردن:** سازگاركردن، هاوئاهەنگ كردن، هاوڕاكردن.

**همسازی:** تێكەڵكردنی چەند مێلۆدی، هارمۆنی.

**همسال:** هاوزا، هاوزێ، هاوزە، هاوزگە، هاوساڵ، هاوعومر، هام عومر، هاوتەمەن، هامڤەر، بەژا، لە تەمەن دا بەرابەر.

**همسان:** وەكیەك، چوونیەك، لێكچوو، هاوتا.

**همسانه:** یونیفۆڕم.

**همسایش:** بڕوانە:"تماس".

**همسایگی:** هاوسایەتی، هاوسایی، هاوسێتی، هاوسێیەتی، هاوسێی، هەڤسیایی، دراوسێیەت، دراوسێتی، جیرانەتی. هاونشینی، دۆستایەتی.

**همسایه:** 1) ئاوسا، هاوسا، هاوسێ، دراوسێ، هام سایە، هاشووشە، جیران، هەڤسی، هەڤمال. 2) سازگار، هاوڕا. "**همسایەرنجان**": دراوسێ وەزن، هاوسا ڕەنجێن، خراپ دەگەڵ هاوسێیان.

**همست:** سیستم، تۆڕ، پێكهاتە. خولگە، تەوەرە.

**همستكان:** بەرزەخ.

**همستی:** سیستماتیك، سەربەسیستم.

**هم ستیز:** 1) خەنیم، دژیار. 2) ناتەبا، ناجۆر. 3) لێكدژ، دژبەیەك.

**هم ستیزی:** دژكاری، دژایەتی.

**هم سخن:** 1) هاوقسە، هاوپەیڤ. 2) هاوبڕوا، هاودەنگ.

**همسر:** 1) هاوسەر، هاوسەرین، هاوجووت، هام جووت، ئاوجووت، هەڤخەو، هەڤسەر، وڵیفەت، هاونیلە. 2) هاوبەژن وباڵا، یەكسانی لە بەرزی و ڕێز و پلە و پایەدا، هاوپایە. "**همسرگرفتن**": لفگرتن، لفگری، لفگیری، ژن هێنان و شووكردن.

**همسرا:** هاوماڵ، كەسێ كە دەگەڵ كەسێكی دی لە یەك ماڵ دا دەژی.

**همسرایان:** (مۆسیقا) كۆڕ.

**هم سطح:** 1) هاوئاست، هاوتەراز. 2) هەر كام لە دوو یان چەند كەس كە پلە و پۆستی یەكسانیان هەیە.

**همسفر:** هاوسەفەر، هاوڕێ، ئامڕا، هەواڵی ناو ڕێگا.

**هم سفرگی:** 1) هاوسەفەری. 2) هاونشینی، دۆستایەتی.

**هم سفره:** 1) هاوجەم، هاوخوان، هاوسفرە. 2) هاونشین.

**هم سلف:** ئاوەڵ زاوا.

**هم سلول:** تایبەتمەندیی ئەوانەی كە لە ژوورێكی تاكەكەسیدا زیندانین.

**هم سنّ:** بڕوانه: "همسال".

**هم سنخ:** هاوفکر، هاوبیروڕا.

**همسنگ:** هاوکێش، هاوسەنگ، هاوتەرازوو، لەئاکاردا وەکیەك. هاوپلەوپایە.

**هم سنگر:** هاوسەنگەر، هاومەتەرێز، لە گۆڕەپانی شەڕا ئاواڵ و ئاریکاری یەکتر.

**هم سو:** 1) هاو ئاراستە. 2) هاوبەمەست و ئامانج.

**هم سود:** هاوقازانج، هاوسوود.

**هم سوگند:** هاوسوێن، هاوسوێند، هاوپەیمان.

**همسوگی:** دلۆڤانی، دڵسۆزی.

**هم سهشی:** هەستی هاوفکری و هاودەردی.

**هم شأن:** هاوشان، هام شان، هاوپلەوپایە، هاومل، هنکووف، لەقەدر و پایەدا بەرانبەر، لەیەك پلەدا. "**دو زن هم شأن**": هاولەچك، دوو ژن لە پایەدا بەرانبەر.

**هم شاگردی:** دوو یان چەند کەس کە لە لای مامۆستایەك وانە بخوێنن یان لە ژێردەستی وەستاکارێك دا ئیش بکەن، هاوپۆل، هاووانە.

**هم شکل:** هاوفۆڕم، هاوتەرح، هاوچەشن، هاوجۆر، هاوشکڵ.

**هم شکم:** بڕوانە: "دوقلو".

**همشهری:** هاوشاری، هەڤساری، هەڤجی، پێکەوە خەڵکی باژێرێك.

**همشیر:** هاوشیر، هام شیر، شیری، دوو شیرەخۆرە کە مەمکێکیان مژی بێ.

**همشیره:** 1) هاوشیرە، هەم شیرە. 2) خوشك. 3) هاوتەمەن. 4) خزم، فامیل. 5) هاوڕێ، هاونشین.

**هم صدا:** 1) هاودەنگ. 2) هاوفکر، هاوبڕوا.

**هم طراز:** 1) خاوەنی تایبەتمەندیی هاوتا، هاوفۆڕم و هاوئەنازە. 2) هاوپلەوپایە. 3) بەرابەر.

**هم عرض:** لە بەرینایی‌دا بەرابەر. 2) بەرابەر، هاوئاست. 3) هاوتەریب و هاوئاراستە دەگەڵ کەسێ یان شتێ.

**هم عصر:** هاوچەرخ.

**هم عقیده:** هاوڕا، هامڕا، هاوبیر، هاوباوەڕ، یەکڕا، هاودەنگ.

**هم عنان:** 1) هاوجڵەو، سوارێ کە دایم دەگەڵ ئاغا سەفەر دەکا. 2) هاونشین. 3) هاوڕێ، هاوسەفەر. 4) لەپاڵ یەکدا، لە تەنیشت یەکدا.

**هم عهد:** 1) هاوچەرخ. 2) بڕوانە: "علاقمند".

**هم فراش:** بڕوانە: "هم بستر".

**هم فکر:** هاوفکر، هاوبڕوا هاوهزر، یەکڕا.

**هم قافیه:** هاوسەروا.

**هم قدم:** 1) هاوهەنگاو، هاوقەدەم، پێ بەپێ، کەسانێ کە پێکەوە بۆ کارێ دەچن. 2) هاوپایە. 3) یەکدڵ.

**هم قول:** هەماواز، هاوقسە، هەمزار، پێکهاتگ.





**همکار:** 1) ئامیار، هاوکار، هەواڵ، یاریدەدەر، پێکەوە لە کارێکدا، هاوپیشە. 2) هاودەست، هاوکار. 3) خەنیم، دژیار.

**همکاری:** هاوکاری، ئاریکاری، هەڤکاری، کاربرا، یاریدە، دەگەڵ یەك کار کردن. "**همکاری گروهی**": گەلەکۆمەگێ، ئێلجاڕ.

**همکاسه:** هاوکاسە، هاوخۆراك، بریتی لە دۆستی نزیك.

**همکام:** هاوئارەزوو، هاوخواست، هاومەرام.

**هم کردارگری:** بڕوانە: "اشتراك مساعی".

**هم کسوت:** 1) هاوبەرگ. 2) هاوکار.

**هم کشیدن:** 1) خستنەلاوەی تەمبەڵی. 2) ڕێکهاتن، گرژبوون، چرچ و لۆچ بوون.

**هم کفؤ:** هاوکوف، ژن و مێردێ لە پلە و پایە و ڕەسەندا وەك یەك.

**همکلاس:** هاوپۆل، لە یەك پۆلدا.

**هم کناری:** لە پاڵ یەك دانان.

**هم کنان:** هاوکار، هاوپیشە.

**همکوفت:** بڕوانە: "تصادم".

**هم کیش:** هاوئایین، هاودین، چەند کەسانێ لە سەر ئایینێ.

**همگام:** 1) هاوهەنگاو، هاوقەدەم، پێ بەپێ. 2) بەشێوەی هەماهەنگ.

**همگان:** هەموان، هەموویان، هەمیان، هەمینە، تێکڕا، گشتیان، گشان، گشیان، گشت لە گشت، پێکەوە.

**همگانی:** هەموانی، گشتی، تێکڕایی، گش لە گش، سەرپاك، بۆ هەموو کەس. "**همگانی یافتن**": گشتگیربوون، تێکڕایی بوون.

**هم گذاشتن:** لەسەریەك دانان.

**هم گذاشتی:** دەسکرد.

**همگر:** پێوەنددەر، جۆڵا، هۆنەر، تەقەڵ لێدەر.

**همگرا:** 1) یەکگرتوو. 2) (فیزیك) تایبەتمەندیی ئەو تیشکانەی لە خاڵێکا پێك دەگەن. 3) بڕوانە: "متقارب".

**همگرایش:** بڕوانە: "جاذبه".

**همگرایی:** 1) یەکیەتی، یەکبوون، یەکگرتوویی. 2) نزیك بوونەوە، بەرەو یەکچوون.

**همگروه:** هاوگروپ، دوو یان چەند کەس کە لە گروپێکدا بن.

**همگری:** بڕوانە: "تناسب".

**همگن:** (هَ.گِ) 1) وەکوویەك، لێکچوو، هاوچەشن. 2) (فیزیك) "هێمۆژێن".

**همگنان:** کۆی "همگن و همگین"، بەمانای گشت، هەموو کەسانی گروپ، هاوکاران.

**هم گوشه:** هاوسێ، دراوسێ، هاونشین.

**همگون/همگونه:** هاوچەشن، هاوڕەنگ، لێکچوو، لێچوو، هاوجسن. "**همگونه چیزی شدن**": ڕەنگی ئەو گرتن.

**همگونی:** هاوچەشنێتی، هاوڕەگەزێتی، لێکچوویی.

**همگویی:** دوان، پەیڤین، ئاخاوتن.

**همگی:** سەراسەر، سەرانسەر، گشت، هەموو، هەمی، تێکڕا، تم.

**همگین:** بڕوانە: "همگی".

**همم:** (هِ.مَ) کۆی "همّت".

**هم محل:** هاوگەڕەك.

**هم مرز:** هاوسنوور، هەڤسینوور، هاوکەوشەن، هاوخاك، دوو پارچەحاکی بەیەکەوە نووساو.

**هم مشرب:** هاوفکر، هاوبیر.

**هم معنا:** هاومانا، هاوواتا.

**هم میهن:** بڕوانە: "هم وطن".

**همنام:** هاوناو، هەڤناڤ، کەسانێ کە ناوێکیان لێنراوە.

**هم نبرد:** خەنیم، دژیار.

**هم نژادی:** هاوڕەگەزێتی، هاونەژادی.

**هم نشست:** 1) بڕوانە: "سمپوزیوم". 2) هاودەم.

**هم نشین:** 1) هاونشین، هاودەم، هەڤاڵ، هەواڵ. 2) هاوپایە، هاوپلە، بەرابەر.

**هم نفس:** هاودەم، هاونشین، یەکدڵ.

**هم نگاشت:** تایبەتمەندیی دوو یان چەند وشە فۆڕمی نووسینەکەیان وەك یەك وایە.

**هم نوا:** 1) هاودەنگ، هاوئاواز. 2) هەماهەنگ و گونجاو دەگەڵ شتێ.

**هم نوازی:** لێدانی ئاهەنگێ بەکۆمەڵ.

**هم نواله:** هاوجەم، هاوخوان، هاوسفرە.

**هم نورد:** 1) هاوڕێ، هاونشین. 2) هاوپایە، بەرابەر.

**هم نوع:** هاوچەشن، لەیەك چەشن، لەیەك جۆر.

**همنه:** بڕوانە: "مؤلفه(2)".

**هم نهاد/هم نهاده:** (فەلسەفە) سەنتێز.

**هم نهش:** بڕوانە: "تنظیم".

**هم نهشت:** بڕوانە: "هم نهاد".

**هم نیرو:** هاوهێز، دەربات، دەبار.

**هموار:** 1) تەخت، ڕێك، لێك، ڕاست، گۆڕ، ساف، دەشت، بیکەندوکلۆوڕاست، بەرابەر، یەکسان. 2) بەبێ سەختی و گرفتاری. 3) ئارام و بەئەسپایی. 4) سازگار، لەبار، بەپێی مەیل. 5) بەرابەر، یەکسان. 6) بێشێلەوبێلە، بێفرتوفێڵ، بێڕیا. 7) بەردەوام، دایم. **"هموارشدن"**: ڕێکوپێك بوون، ڕێخۆش بوون، هاتنەبار، ڕاست و ڕێك بوون. **"همواررفتن"**: بەنەرمی و بەئەسپایی ڕۆیشتن. **"هموارکردن"**: 1) ڕێخۆش کردن، خۆش کردن، ساف و ڕێك کردن، تەخت کردن، ئامادەکردن. 2) بڕوانە: "تحمل کردن". **"زمین هموار"**: تەختان، تەختانی، تەختایی، گۆڕایی، گوهۆڕ، گۆڕەپان، هەردی ڕاست و تەخت.

**همواره:** هەمیشە، بەردەوام، بێ پسانەوە، تم.

**همواری:** تەختایی، ڕێکی، تەخت و ڕاستایی، تات، گۆڕایی، هاماری. **"همواری زمین"**: ڕاسایی، ڕاستان، تەختایی زەوی.

**همورازی:** خوێن بەربوون، خوێن ڕێژی.





**همورئید:** مایەسیری، بێوەسیری.

**هم وزن:** هاوکێش، هاووەزن، هەڤکێش، هنکووف.

**همو سکسوآلیسم:** بڕوانە: "همجنس بازی".

**هم وطن:** هاوزێ، هاوزێد، هاونیشتمان، خۆوڵاتی.

**هموفیلی:** خوێن بەربوون.

**هموگلوبین:** ماددەی ئاماڵ سووری خڕۆکەکانی خوێن.

**هم ولایتی:** وەڵاتی، هاووڵاتی، خۆوڵاتی، هاوزێدی.

**هموند:** ئەندام.

**هموندی:** ئەندامەتی.

**همه:** تەواو، گشت، تێکڕا، گردین. **"همه‌اش"**: 1) بەبەردەوامی، دایم. 2) هەموو، گشت. 3) تەنیا(همه‌اش یك فرزند دارد). 4) لەسەریەك.

**همه‌باهم:** تێکڕا، تێگرایی، سەرجەم.

**همه پرسی:** گشت پرسی، ڕاپرسیگشتی، ڕێفراندۆم.

**همه پسند:** گشت پەسند.

**همه‌جانبه:** هەمەلایەنە، کۆگر، گشتگر.

**همه‌جایی:** 1) سۆزانی، ڕووسپی. 2) باو. 3) لەمۆدکەوتوو، دێمۆدە.

**همه‌دان:** 1) زۆر ئاگا و زانا. 2) خوا.

**همه‌روزه:** 1) هەر ڕۆژە، گشت ڕۆژێ. 2) هەمیشە، بەردەوام.

**همه‌سویه:** بڕوانە: "همه‌جانبه".

**همه‌شمول:** بریتی و لەخۆگری هەموو کەس یان هەموو شتێ.

**همه فن حریف:** 1) هەزارپیشە، هەمەکارە، ئەوەی سەری لە زۆر کاران دەردەچێ. 2) بڕوانە: "مکار".

**همه‌فهم:** ئاسان، سادە.

**همه‌گیر:** 1) نەخۆشییەك کە گشت خەڵکی ناوچەیەك بیگرنەوە. 2) بڕوانە: "فراگیر".

**همه‌گیری:** بڕوانە: "اپیدمی".

**همهمه:** هەراوچەقە، زەنازەنا، قاڵمەقاڵم، خوڵخوڵە، خولوو. **"همهمه و جنجال بچه‌ها"**: زاق و زرووق، زاق و زووق، زاق و زیق، زاك و زووك، زاك و زیك.

**همیاری:** 1) یارمەتیدانی دوو یان چەند کەس بە یەکتر. 2) یەکیەتی و هاوکاری و هاوئاهەنگی تاکەکان لە کردار یان ڕەفتاردا بەمەبەستی وەدەست خستنی ئامانجێکی دیار.

**هم یاسه:** خاوەنی ئایینی هاوبەش.

**همیدون:** 1) هەرئێستە، ئائێستە، هەروەها. 2) هەمان کات، لەو کاتەدا.

**همیشگان:** بڕوانە: "جاودانە".

**همیشگی:** هەمیشەیی، بەبەردەوامی، بێ برانەوە، تمی.

**همیشه:** هەمیشە، دایم و دەرهەم، بەردەوام، هەتاسەر، هەروهەر، هەرماو، نەبڕ، شەووڕۆژ.

**هم یوغ:** هاوگا، دووگا بەرانبەر بە یەکتر کە پێکەوە جووت دەکەن.

**هنایش:** کاریگەری، کارتێکەری.

**هنایشگر:** کاریگەر، کارتێکەر.

**هناییدن:** کاریگەری‌دانان، کارتێکردن، کارلێکردن، کارکردنەسەر.

**هنباز:** بڕوانە: "**همباز**".

**هنبازگو:** بڕوانە: "مشرك".

**هنجار:** 1) نۆرم، بەها، ڕێسا. 2) گونجاو، لەبار، قۆڵا. 3) شێوەی کردەوە، ڕەفتار. 4) ڕێگە، جادده. "**هنجاربریدن**": ڕێگەبڕین، ڕێگەپێوان. "**بر هنجار چیزی**": لە ڕاستای ئەودا، بەپێی ئەو. "**به هنجار**": 1) بەپێی ڕەوشت و ئایینی دروست. 2) خاوەنی ڕێوشوێنی دروست.

**هنجارشکنی:** نۆڕم شکێنی، تێکدان و لەبەرچاونەگرتنی ڕەوشت و ئایینی باو.

**هنجارگریزی:** لادان لە نۆڕم و بەهاکان، کلابوون لە ڕێگەی ڕاست.

**هنجاری:** بەهاداری، بەهامند، نۆرماتیڤ.

**هنجام:** تەوەزەل، بێکارە، سست.

**هنجله:** بڕوانە: "اصرار".

**هنجیدن:** کێشان، دەرکێشان، هەڵێنجان، دەرهێنان، هێنانەبان. "**درهنجیدن**": کێشان، مژین.

**هند:** ڕێگە، شێواز، نۆڕم، ڕێسا و یاسا.

**هنداد:** سیستم، ڕێکخراوە، دەزگا.

**هندادی:** بڕوانە: "**همستی**".

**هندام:** ئاسایی، عادی.

**هندسه:** ئەندازە، هێندسە، لقێ لە بیرکاری کە باسی ئەندازە و پێوەندیی نێوان خاڵەکان و هێڵەکان و گۆشەکان و هتد دەکا.

**هندسی:** 1) ئەندازەیی، ئەندازیاری، سەر بە هێندسە. 2) زانا لە زانستی هێندسەدا. 3) ئارشیتێکت، تەلارساز.

**هنر:** 1) هونەر، دەس ڕەنگینی، کاری گرینگ و جێی سەرنج، سنعات، فەن. 2) توانایی، لێهاتوویی، شیاوی. 3) داوێن پاکی. 4) تایبەتمەندی. "**هنر تجسمی**": هونەرێ کە بەرهەمی وێنای زەینی هونەرمەند لە دیاردەیەکە وەك نیگارکێشی و کۆتەڵسازی. "**هنرکردن**": 1) ئەنجامدانی کاری گرینگ و جێی‌سەرنج. 2) هونەرنوێنی‌کردن. "**هنر کردن با کسی (چیزی)**": بەرامبەرکێ‌کردن دەگەڵ ئەو، لە عۆدەی ئەو هاتن.

**هنرآزمایی:** هەڵسەنگاندنی توانایی هونەری کەسێك.

**هنرآموز:** قوتابی هونەرستان، کەسێ کە لە حاڵی فێربوونی هونەرێك دایە، هونەخواز.

**هنر انتزاعی:** هونەری دەرهەست.

**هنرانتقادی:** هونەری ڕەخنەیی.

**هنرپرداز:** هونەرمەند، دەس ڕەنگین.

**هنرپرور:** 1) خاوەن هونەر، هونەرمەند، دەس ڕەنگین، هونەرپەروەر. 2) کەسێك کە لەبەرەوپێش بردنی هونەر و ڕاهێنانی هونەرمەندان دا هەوڵ دەدا. 3) پەروەردەکار و پەرەپێدەری بەها ئەخلاقییەکان.





**هنرپیشگی:** شانۆکاری، ئەکتەری، نیاری.

**هنرپیشه:** ئەکتەر، ئاڕتیست، شانۆگەر، شانۆکار، نیارڤان. کەسێك کە لە یەکێك لە سنعاتەکانی نیگارکێشی و مۆسیقا و شانۆدا مامۆستا بێ.

**هنرجو:** بڕوانە: "هنرآموز".

**هنرستان:** هونەرستان، هونەرگە، فێرگەی هونەر، فێرگەیەك کە لەوێدا سنعاتە ناسکەکانی وەك نێگارکێشی و شێوەکاری و مۆسیقا دەوترێتەوە.

**هنرستیز:** دژەهونەر.

**هنرسرا:** فێرگەیەك کە لەودا سەنعەت و هونەر دەوترێتەوە، هونەرستان.

**هنرکده:** فێرگەی بەرز کە تێیدا ڕشتە هونەرییەکان فێری فێرخوازان دەکرێ.

**هنرمند:** 1) هونەرمەن، هونەرمەند، بەهونەر، خاوەن هونەر، بەجەوهەر، مایەوەر، جوانکار، کارجوان، دەس ڕەنگین. 2) بەقەوەت، بەهێز، خورت.

**هنرمندانه:** هونەری، هونەرمەندانە.

**هنرنمایی:** نواندنی هونەر و لێهاتوویی یان بەهرە و تواناییەکانی خۆ بە دیتران.

**هنرور:** بەهونەر، هونەرمەن، خاوەن هونەر.

**هنری:** 1) هونەری، شتێ کە هونەری تێدا دەکار کراوە. 2) هونەرمەندانە. "**هنری کردن**": ناچار بە خۆپارێزی و پارێزکاری کردن.

**هنگ:** 1) زانایی، وشیاری، فام. 2) بایەخ و گرینگی. 3) قورس بوون، قورسی. 4) قورس و قۆڵی، هێمنی و مەندی. 5) زۆر، هێز، وزە. 6) سپا، لەشکر. 7) یەکەیەکە لە ئەرتەشی ئێران دا. "**هنگ گرفتن**": بایەخ و گرینگی پەیاکردن.

**هنگار:** تاڵووکە، پەلە، لەز.

**هنگام:** 1) دەم، کات، سا، سات، وەخت، واخت، هەنگاڤ، گاڤ، حان، عان. 2) سەروبەند، وەرز. 3) نۆبە. 4) دەوران، ڕۆژگار.

**هنگامه:** 1) هەنگامە، هەراوهوریا، فیتنە، ئاژاوە. 2) سەیروسەمەرە، سەراسایی. 3) کات، سات، وەرز. "**هنگامه چیزی (کسی) گرم شدن**": برەوسەندنی کاری ئەو.

**هنگامەجو:** شەڕخواز، شەڕانی، شەڕفرۆش، قوون بە گێچەڵ.

**هنگفت:** 1) قەبە، زل، چڕوپڕ، زۆر، فرە. 2) ئەستوور.

**هنگمند:** (هَ.گُ مَ) سوور، شێلگیر.

**هنوز:** 1) هێشتا، هێشتاکوونێ، هێشتاکوو، هێشتاکانێ، هێشتانێ، هێشاتەکێ، تائێستە، وێستا، ویستا، هێستا، هێستاکانێ، هێستاکوونێ، هێستاکینێ، یەمە، هلا، هێمان، هیچتا، هیچتاکێ. 2) هەرگیز، هیچ کات. 3) ئیتر. 4) بەتازەیی.

**هن هن:** نیخەنیخ، هانکە، هانکەهانك، هەنکەهەنك، هانەهانە، هەلکەهەلك، نرکەنرك.

**هنیء:** خۆش، نۆش، ئەوەی بەبێ ڕەنج و مەینەت وەدەست بێ.

**هنیز:** بڕوانە: "هنوز".

**هوا:** 1) هەوەس.2) ئارەزوو، مەیلی دەروون. 3) نیاز، نییەت. 4) خۆشەویستی. "**هوا بە سر کسی افتادن**": خەیاڵی شتێ یان کارێ دان لە کەللەی. "**هوای دل**": ئاوات و ئارەزووی دڵ. "**هوای نفس**": مەیلی دەروونی، هەواوهەوەس. "**بر هوای**": بەهۆی دۆستایەتی، لەبەر. "**بە هوای**": 1) بەنیازی. 2) لەبەر، بەخاتر(ی).

**هوا:** 1) گازێکی بێ ڕەنگ و بێ بۆن و بێ تامە کە نابینرێ و لە کاتی هاتنی با دا هەستی پێدەکرێ، هەوا. 2) ئاسمان ( هوا ابری است). 3) حەوا، سەرۆ( توپ را بینداز هوا). "**هوا پس بودن**": بەپێی خواست نەبوونی دۆخەکە. "**هواخوردن**": هەواخۆری کردن. "**هوادادن**": 1) بەرەو ئاسمان ناردن. 2) خستنە بەر با. "**هوا کردن**": 1) لە حەواکردن. 2) بەرەو ئاسمان ناردن. "**هوا کشیدن**": تەزووپێداهاتن یان ئێشان بە هۆی هەوا لێدان. 2) هەواکێشان، ڕزان بەهۆی لەبەر با بوون. "**هوای دم کردە**": هەوای گەرم و شێدار و ڕاوەستاو. "**از هوا آتش باریدن**": زۆر گەرم بوونی هەوا. "**از هوا کرە گرفتن**": توانایی و زیرەکی زۆر هەبوون.

**هوا:** ئاواز، چریکە. "**هوا زدن**": ئاواز خوێندن.

**هوا افتادن:** بڵاوبوونەوەی هەواڵێکی ناڕاستەقینە، دەنگۆ بڵاوبوونەوە.

**هواپرست:** کەسێ کە پێڕەوی هەوا و هەوەسی خۆی بێ، دڵچەڕێن، هەوەس پەرست.

**هواخواه:** 1) تاسەمەند، تامەزرۆ، ئارەزومەن، بەئاوات، ئاواتەخواز. 2) لایەنگر، لاگر، پشتیوان، داژدار.

**هواخواهی:** لاکۆشکە، لاگری، لاگیری، داژداری.

**هواخوری:** هەناسەکێشان لە هەوای ئازاددا. 2) گەڕان، سەیران. 3) مانەوە لە بەندیخانە.

**هوادار:** 1) لاگر، لایەنگر، داژدار. 2) خوازیار، تاسەمەند. 3) بەرین و گەورە.

**هوار:** داروپەردو. "**هوارشدن**": 1) داڕمان یان کەوتنی شتێ بەسەر کەسێك یان شتێدا. 2) بەبێ داوەت کردن لە ماڵی کەسێك داکوتان و بۆ ماوەیەك ڕابواردن لەوێ.

**هوار:** هاوار، هەرا. "**هوار زدن**": هەراکردن، هاوارکردن.

**هوازی:** 1) کتوپڕ، لەنکاو. 2) بوونەوەرێ کە بۆ زیندوومانەوە پێویستی بە ئۆکسیژنی هەوا هەیە.

**هواسیدن:** وشك و بێڕەنگ بوونی لێو لە بێهێزی یان لە ترسان، وشك و ژاکان.

**هواشناسی:** کەشناسی، ناسینی کەش و هەوا.





**هواگیرشدن:** 1) حاڵ تێکچوون بەهۆی خراپی هەوا و کەمبوونی ئۆکسیژن. 2) هەڵفڕین.

**هوامّ:** گەناوەرە ژەهردار و مزیڕەکان.

**هوانورد:** فڕۆکەوان، فڕۆکەئاژۆ.

**هوایی:** 1) هەوایی، حەوایی. 2) لە ڕێگەی فەزاوە. 3) بەبێفکر و تاوتوێی ورد، نەهزراو. 4) بەرەو حەوا، بەرەو بان. "**هوایی شدن**": بەرەو حەوا چوون.

**هوبخت:** بەختەوەر، خۆشبەخت.

**هوتخش:** پیشەگەر، سنعاتکار.

**هوتك:** برق ئاسا، کتوپڕ.

**هوتن:** خۆش قەڵافەت، بەژن و باڵا ڕێك.

**هوچی:** 1) ئاژاوەخواز. 2) بڕوانە: "شارلاتان". 3) پەسقەڵە، تیزبەخەڵك کەر. 4) بڕوانە: "شب گرد".

**هود:** 1) جوولەکە، جوولەکەکان. 2) کۆی "هائد" بە مانای تۆبەکار و گەڕاوە بۆ لای هەق.

**هودج:** کەژاوە.

**هودر:** هەر شتێکی ناحەز و زەبوون.

**هودە:** سوود و قازانج. ڕاست و دروست.

**هور:** خۆر، هەتاو.

**هورا:** هۆتاف، هوورا، هوڕا، وڕا.

**هورخش:** خۆری ورشەدار.

**هورمزدا:** بڕوانە: "اهورامزدا".

**هورمون:** وشەیەکی لاتینی کۆنە و لە وشەی "ئۆرمۆن"ەوە وەرگیراوە کە بە مانای هاندەرە.

**هورمونولوژی:** هۆرمۆن ناسی، هۆرمۆن زانی.

**هورهور:** دەنگی سووتان یان گەرم بوونی شتێ.

**هوژاردن:** دانان، دانیان.

**هوس:** هەوەس، مەیل و ئارەزووی نائیرادی و تیژتێپەڕ سەبارەت بە شتێ یان کەسێك، واز، سەودا، هەز، خولیا، ئیشتیا بە خەیاڵ، خیتك. تامەزرۆیی گەیشتن بە کەسێك، ئێشق. "**هوس آزمندانە**": مرخ، قرم، خەیاڵی تەماحکارانە. "**هوس آنی**": فلووف، ئارەزووی کاتی و زووڕابر. "**هوس باختن**": بڕوانە: "عشق ورزیدن". "**هوس پختن**": خۆلێخۆش کردن، لە دڵ دا بوونی خەیاڵ و ئارەزووی شتێ یان کەسێك. "**هوس کردن**": سەرلێخوران، لووت خوران، لووت لێخوران، مرخ خۆش کردن، قرم خۆش کردن، تەماح کردن، خەیاڵ لێکردن و بەتەمابوون، ئارەزووکردنی کارێك، ئاو دە گون گەڕان. "**هوس و آرزو**": تاسەوتامەزرۆیی، گێول. "**هوا و هوس دل**": دڵ کورکان، ئارەزووکردنی شتێ. "**بە هوس انداختن**": وە هەوەس خستن، ورووژاندنی مەیل و هۆگری کەسێك.

**هوس انگیز:** هەوەس وروژێن، هەوەس هەڵخڕێن.

**هوسباز**: باپەرست، هەوەسباز، هەوەسپەرست، دڵچەڕێن، ئارەزووباز. "**پیر هوسباز**": ڕداڵ، ڕەداڵە، تەڕپیر.
**هوسبازی**: دڵچەڕاندن، خۆش ڕابواردن، بەکەیفی خۆکردن.
**هوسبافی**: خەون و خەیاڵ کردنەوە.
**هوس ران**: بڕوانە: "هوسباز".
**هوسمند**: فلووفا، فلووفاو، کەسێ کە خولیای کار و بیرێکە.
**هوس ناك**: 1) بڕوانە: "هوس انگیز". 2) بڕوانە: "هوسباز". 3) تامەزرۆ، بەتاسە، تاسەمەند.
**هوش**: 1) هۆش فام و هەست، بیر. 2) وشیار، وریا. 3) ئاوەز، ئەقڵ. 4) ڕۆح، گیان. 5) جەوهەر و بنچینەی شتێ. "**هوش از سر کسی پریدن( رفتن)**": 1) لە دەست دانی وشیاری. 2) زۆر سەرسوورمان. 3) بە تەواوی شێت و شەیدای ئەو بوون. "**هوش داشتن**": وریا و ئاگا بوون سەبارەت بە شتێك و وردبوونەوە لێی. "**از هوش بردن**": 1) بێهۆشکردن، لە هۆشبردن. 2) شەیداکردن. "**از هوش رفتن**": بێهۆش بوون، لە هۆش چوون. "**به هوش آمدن**": وەهۆش هاتنەوە. وە ئاگاهاتنەوە.
**هوشکاری**: دووربوانی، دووربینی.
**هوشمند**: مەژوودار، بەئاوەز، ژیر، بیرتیژ، زرنگ، وشیار.
**هوشیار**: بڕوانە: "هشیار".
**هول**: 1) ترسی زۆر و نیگەرانی سەرچاوەگرتوو لەو ترسە. 2) هەوڵ، هەولەکی، پەشۆکیاگ. 3) تەماح و ئێرەیی بۆ وەدەست خستنی شتێك. 4) ترسناك، سامناك. 5) توند. 6) گەورە. "**هول چیزی را داشتن**": ترسان لەو یان نیگەرانی ئەو بوون. "**هول زدن**": 1) پەلەکردن و هەوڵ بوون لە ئەنجامدانی کارێکا. 2) تەماح و بەئێرەویی بۆ گەیشتن بە شتێ. "**هول شدن**": لەبك، خەبسین، سەرلێشێوان، سەرلێ تێکچوون، پەشێوبوون، شێویان، هەوڵ بوون، هۆش بڵاوبوون، ترسان. "**هول کردن**": لەبکاندن، سەرلێشێواندن، سەرلێتێکدان، هەوڵ کردن، تووشی ترس و خۆف کردن. "**هول و تکان**": ترس و نیگەرانی زۆر و خافڵگیرانە. "**هول و ولا**": ترس، نیگەرانی.
**هول انگیز**: سامناك، بەسام، ترسناك.
**هولکی**: بڕوانە: "هول هولکی".
**هولناك**: بەسام، ترسناك، بەهەیبەت، پڕ ترس و خۆف، گیان سووز.
**هول هول**: بڕوانە: "هول هولکی".
**هول هولکی**: بەپلەپەرتکێ، بە پەلەپرووزێ.
**هومانیزم**: مرۆڤخوازی، ڕەسەنایەتی مرۆڤ، ڕێبازی مرۆیی، مرۆڤگەرێتی.
**هوێت**: 1) شوناس. 2) ناسنامە، پێناس.





**هوێت فردی**: شوناسی تاکی، شوناسی تاکەکەسی.
**هویدا**: دیتبار، تەواوئاشکرا، ڕوون و دیار. "**هویداشدن**": دەرکەوتن،خویابوون، ئاشکرابوون.
**هیاکل**: کۆی"هیکل".
**هیاهو**: 1) بڕوانە: "جاروجنجاڵ". 2) پروپاگەندە یان دەنگۆی بێ بناغە.
**هیئت**: 1) چۆنیەتی و فۆرم و ڕوخساری شتێ. 2) حاڵەت، دۆخ. 3) لێژنە، شاند، دەستە. 4) کۆمیسیۆن. "**هیئت تحریریه**": دەستەی نووسەران. "**هیئت حاکمه**": دەسەڵات بەدەستانی سەرەوەی حکوومەت. "**هیئت دولت**": کابینە. "**هیئت علمی**": کۆی (وانەبێژان/مامۆستایان)ی زانکۆ. "**هیئت نظارت**": لێژنەی چاوەدێری. "**به هیئت اجتماع**": بە کۆمەڵ، پێکەوە. "**علم هیئت**": زانستێ کە سەبارەت بە ئەستێرەکان دەدوێ، ئەستێرەناسی.
**هیبت**: سام، ساو، ساوێر، ساهمەك، ترس و خۆف، مەترسی، حەیبەت، هەیبەت. شکۆ و گەورەیی. "**به هیبت**": سامدار، بەهەیبەت.
**هیبت انگیز**: سامناك، بە ترس و خۆف.
**هیپرتانسیون**: چوونەسەری پەستانی خوێن.
**هیپرترمی**: چوونەسەری گەرمی لەش.
**هیپرتیروئید**: زۆر ڕژانی هۆرمۆنی ڕژێنەی ملەقۆرتە.
**هیپرتیروئیدیسم**: زیادبوونی چالاکی ڕژێنەی ملەقۆرتە.
**هیپرگلیسمی**: چوونەسەری قەندی خوێن.
**هیپرلیپیدمی**: چوونەسەری ڕێژەی چەوری ناوخوێن، زیادبوونی ڕێژەی چەوری خوێن.
**هیپنوتیزور**: خەوکەر، نوێنەر، هیپنۆتیزۆر، ئەوەی کەسێکی دی دەباتە خەوی ناسروشتییەوە.
**هیپنوتیزم**: هیپنۆتیزم، شێوازێکە بۆ کردنە خەوی کەسەکان بە شێوەی ناسروشتی.
**هیپنوز**: خەوی ناسروشتی، خەوی دەسکرد، خەوی مێغناتیسی.
**هیپوتانسیون**: (پزیشکی) دابەزینی پەستانی خوێن، دابەزینی تەوژمی خوێن.
**هیپوتیروئیدیسم**: (پزیشکی) کەمبوونی چالاکی ڕژێنەی ملەقۆرتە.
**هیپوگلیسمی**: (پزیشکی) دابەزینی قەندی خوێن.
**هیپولیپیدمی**: کەمبوونی ڕێژەی چەوری خوێن.
**هیپی**: لە زمانی ئینگلیزیدا بە مانای خەمۆکی و مالیخولیاییە. ئەم وشەیە ئەمڕۆ بەو لاوانە دەوترێ کە جۆرێك بێسەرەوبەرەیی و گوێنەدان دەگرنەبەر و مووی سەر و ڕیشیان چاك ناکەن و جلوبەرگی وەك جلوبەرگی ژنان دەبەر

دەكەن و مەرامیان خۆشەویستی و دڵدارییە. هەر كام لە پێڕەوانی جووڵانەوەیەك دژی دیاردەكانی كۆمەڵگای سەنعەتی كە لایەنگرەكانی بە ئەنجامدانی هەڵسوكەوتی تایبەتی وەك پۆشینی جلوبەرگی سەیر یان خۆڕازاندنەوەی نائاسایی دژایەتی خۆیان دەگەڵ دنیای ماشێنی پیشان دەدەن.

**هیجا:** شەڕ، جەنگ.

**هیجان:** 1) ورووژ، هورووژ، دڵەكوتە، گوڕوتین، كوڵوكۆ. 2) دەست و پێ لێدان. **"به هیجان آمدن"**: ورووژان، هورووژان. **"به هیجان آوردن"**: ورووژاندن، وەدڵەكوتە خستن.

**هیجان انگیز:** ورووژێنەر، هورووژێنەر.

**هیجان زده:** ورووژاو، تووشی حاڵەت گەلی سۆزداری بوو، ئاشق.

**هیجان گر/هیجان نما:** ورووژێن گەر، "ئێكسپێرسیۆنیست".

**هیجان گری/هیجان نمایی:** ورووژێن گەری، "ئێكسپێرسیۆنیزم".

**هیچ:** نەتشت، هیچ. **"هیچ در هیچ"**: بە تەواوی پووچ و بێبناغە. **"هیچ نشدن"**: ڕوونەدانی شتێ، هێچ نەبوون. **"به هیچ باب"**: بە هیچ كلۆنجێك: **"به هیچ حال"**: بە هیچ كلۆنجێك، هەرگیز. **"به هیچ روی"**: بڕوانە:"به هیچ حال". **"به هیچ قیمتی"**: 1) بە هیچ نرخێ. 2) بە هیچ كلۆنجێ. **"به هیچ گرفتن( شمردن)"**: بە هیچ دانان، بە بێبایەخ دانان. **"به هیچ نشمردن"**: بە هیچ نەزانین، بە گرینگ نەزانین. **"به هیچ وجه"**: بە هیچ كلۆنجێك، هەرگیز، قەت.

**هیچ انگاری:** بڕوانە:"هیچ گرایی".

**هیچستان:** جێیەك كە هیچی لێ نیە یان شوێنێكی لەدەست چوو.

**هیچگاه:** هەرگیز، هیچكات، چجار.

**هیچ گرا/گرای:** نهیلیست، پووچ گەرا.

**هیچ گرایی:** نهیلیزم، پووچ گەرێتی.

**هیچ گونه:** هیچ جۆر(ە)، هیچ چەشن(ە). **"به هیچ گونه"**: بە هیچ كلۆنجێك.

**هیچ وقت:** 1) هەرگیز، هیچ كات. 2) بڕوانە: "هرگاه".

**هیختن:** كێشان، هەڵكێشان، دەركێشان.

**هید:** (هَ) 1) ترساندن، ئازاردان، جووڵاندن، بزواندن. 2) شڵەژاو و پەرێشان.

**هیدروالكتریك:** سەنعەتی بەرهەمهێنانی كارەبا لە وزەی ئاو.

**هیدروتراپی:** ئاودەرمانی، زانستی كەڵك وەرگرتن لە گراو/گەراوەكان بۆ چارەسەری هێندێ لە نەخۆشییەكان.

**هیدرولوژی:** زانستێ كە سەبارەت بە ئاوە جۆراوجۆرەكان و تایبەتمەندییەكانیان دەدوێ، ئاوناسی.

**هیدرولیز:** شیكردنەوەی پێكهاتەیەك بە ماددەی سادەتر بە زیادكردنی ئاو.





**هیراتیك:** سەبارەت بە شتە پیرۆزەكان. یەكێك لە هێڵە قەدیمییەكان كە دوای هێڵی هیرۆگلیف داهێنرا.

**هیربد:** پێشەوای ئایینی.

**هیرمند:** ملكەچ، سەربەژێر.

**هیرمندی:** بڕوانە:"اطاعت".

**هیروگلیف:** هێڵی پیرۆز، یەكێك لە هێڵە قەدیمییەكان، هێڵێ كە بە جیاتی نووسینی ناوی شتەكان شكڵەكەیان دەكێشایەوە.

**هیز:** 1) هیزەكە، سابوورە، نێرەمووك. 2) قرت و چاولەوەڕێن. 3) چاوحیز.

**هیزم بیار معركه:** ئاگرخۆشكەر، شەڕهەڵایسێن، شەڕەنگێز، ئاژاوەگێڕ.

**هیزی:** قرتی و چاولەوەڕێنی.

**هیستری:** نەخۆشی ڕۆحی، نەخۆشی خەیاڵی و دەمارگیری(عصبی) كە تووشبوو بەو تووشی تێكچوونی هەستەكان و وەهم و بێهێزی دەبێ و هەندێ جار نەخۆشەكە بێهۆش دەكەوێ.

**هیستولوژی:** بڕوانە:"بافت شناسی".

**هیضه:** زكچوون و ڕشانەوە بەهۆی زۆرخۆری یان بەدخۆراكی.

**هیكل:** 1) بینای بەرز. 2) داری بڵیند و گەورە. 3) مرۆ یان ئاژەڵی قەبە و باهۆدار. 4) قەوارە، قەڵافەت، بەژن و باڵا. 5) پەیكەر، كۆتەڵ. 6) قۆڵبەند. 7) بڕوانە: "تعویذ". 8) بتخانە. 9) بڕوانە:"معبد".

**هیكل دار:** باهۆدار، زنتۆل، زەلام.

**هیكل سازی:** كۆتەڵ سازی، پەیكەرسازی.

**هیكلی:** بڕوانە:"هیكل دار".

**هیمان:** (هَ.یَ) ئاشق بوون، شەیدابوون، ئەویندارى، دڵدارى.

**هیمان:** (هَ) توونی، شەیدا، سەرگەردان، تووشبوو بە شێتی ئەوین.

**هیمنه:** 1) ئامین گوتن. 2) پەروباڵ كردنەوە. 3) هێژموون، دەسەڵات، شكۆ.

**هیمه:** چڕوچیلكە، ئیشكەڵ.

**هیمەسوز:** شوومینە.

**هین:** (هِ) سێڵ، سێڵاو.

**هیَن:** (هَ.یِ) ئاسان، سانا. بێهێز و زەبوون.

**هیناهین:** 1) لە حاڵی پەلە و لەز دا. 2) كاتی ئاڵۆزی و پەلەپرووزە.

**هیولا:** 1) بوونەوەرێكی خەیاڵی و ناسروشتی و زۆر گەورە و سامناك. 2) گەورە و بەهەیبەت. 3) كەسی خاوەن هەڵسوكەوتی نامرۆڤانە و بێبەزەییانە. 4) جەوهەر و بنچینەی هەرشتێ یان هەر كەسێك. 5) ماددە، ماكەی سەرەكی.

**هیولانی:** سەر بە ماددە، ماددی، ڕواڵەتی.

**هیولی:** بڕوانە:"هیولانی".

**هیوم:** وڕ، سەرگەردان، سەرلێشێواو.

**هیهات:** حەیهو، هەیهو، تەهۆ، هەرگیز پێك نایە، دوورە.

# ی

**یائس:** 1) ناهومێد، بێهیوا، هیوابڕاو، بێ هێڤی. 2) نەزۆك، نەزا.

**یائسگی:** لە زك وەستانەوەی ژن کە بە لە عوزرچوونەوە و هێندێ گۆڕانی جەستەییتر دیاریدەکرێ و بەشێوەی ئاسایی لە چل ساڵ بۆ سەرێ ڕوودەدا.

**یائسەشدن:** لەبەرچوونەوە، لەزك وەستان، لەزك وەستانەوە، لە زك وێستان، لەزك وێستانەوە، لە زك و زا وەستان، لەزکەوچوون، لەعوزرچوونەوە، لەعوزروەستان، لەعوزروەستانەوە، ناهومێدبوونی مێوینە لە زان، ئاوس نەبوون.

**یاب:** بڕوانە: "یاوە".

**یابایی:** هەستی بۆن پێکردن، بۆنایی.

**یابس:** وشك، سفت و ڕەق. **"رطب و یابس"**: وشك و تەڕ، بریتی لە قسەی قۆڕ و فشقیات.

**یابش:** دۆزرانەوە، وەدەست خران، دەستقەئانین.

**یابشگر:** بڕوانە: "کاشف."

**یابشگری:** بڕوانە: "تحقیق".

**یابندە:** دۆزەر، دۆزەرەوە، گیرخەر، وەدەست خەر.

**یابو:** 1) گۆڵە بارگین، یابوو، ئەسپی ناڕەسەنی بارکێشان. 2) نەفام و بێئەدەب.

**یابیدن:** بڕوانە: "یافتن".

**یاختن:** 1) هەڵکێشان، هلکێشان، دەرکێشان، دەرهێنان، دەرهانین. 2) بە مانای دەست درێژکردن بۆ لای شتێك، ئیرادەکردن و ویستن و لێدان و هاویشتنیش هاتوە. **"یاختە"**: دەرهێنراو، دەرکێشراو.

**یاختە:** خانە. **"تك یاختە"**: تەك خانەیی، "پرۆتۆزۆئێر"، زیندەوەرێ کە لەشی لە یەك خانە پێکهاتبێ.

**یاد:** بیر، بیرگە، بیرەوەری، یاد، زەین. **"یادآمدن"**: وەبیرکەوتنەوە، کەوتنەوەبیر، بیرهاتنەوە، هاتنەوەیاد، کەوتنەوەیاد، ب بیرهاتن/کەتن. **"یادآوردن"**: خستنەوەبیر، هێنانەوەبیر. **"یاد بە دل درنیاوردن از کسی"**: گرینگی نەدان بەو، نەترسان لەو. **"یاددادن"**: 1) بڕوانە: "تعلیم دادن". 2) بیرخستنەوە، بیرهێنانەوە. **"یادداشتن"**: 1) لە بیر بوون، خستنەوە بیر.





2) زانین، شارەزابوون. 3) لەبەربوون. **"یاد رفتن"**: 1) قسەوتران سەبارەت بەکەسێك، یادی کەسێك کران. 2) لە بیر چوونەوە. **"یادکردن"**: 1) وتن یان نووسین، یادکردن(ەوە). 2) وەبیرهێنانەوە، بەڕوودادانەوە. 3) بیرخستنەوە، بیرهێنانەوە. 4) ئارەزووکردن، ویستن. **"یاد کردن قسم(سوگند)"**: سوێندخواردن. **"یاد کسی(چیزی) افتادن"**: کەوتنە بیری ئەو. **"یاد کسی را گرامی داشتن"**: ڕێزلێنان لەو، ڕێزگرتن لەو. **"یادگرفتن"**: 1) فێربوون، فێرەکاربوون، ڕاهاتن، هەڤۆتن، هاڤۆتن، هیێبوون، هووین بوون، هین بوون، هۆژان، هۆژین، هەوسین، موسنایا، موسایش. 2) لەبەرکردن. 3) شەڕاب خواردنەوە بە یادی کەسێك. **"یاد و هوش"**: بڕوانە: "حافظە". **"یادی از کسی کردن"**: 1) وەبیر هێنانەوەی ئەو، لە بیری ئەودا بوون. 2) چوونە دیدار و هەواڵپرسی ئەو. **"از یاد بردن"**: بڕوانە: "فراموش کردن". **"از یاد رفتن"**: بڕوانە: "فراموش شدن". **"از یاد هشتن"**: بڕوانە: "فراموش کردن". **"بە یاد آوردن"**: وەبیرهێنانەوە، وەبیرخستنەوە. **"بەیادداشتن"**: لەبیربوون، وەبیرهاتن، لەبیرنەچوون، ژبیرنەکرن، فەرامۆش نەکردن. **"بە یاد کسی(چیزی) افتادن"**: کەوتنەوە بیری ئەو. چوون بە پەیسەری ئەودا. **"بە یاد کسی انداختن"**: خستنەوەبیری ئەو. **"بە یاد گرفتن"**: یادکردن(ەوە)، وتن. **"بە یاد ماندن"**: لەبیرمان، لە بیر نەچوون.

**یادآور:** وەبیرهێنەرەوە، وەبیرخەرەوە، ب بیرهێنەر.

**یادآوری:** 1) بیرخستنەوە، خستنە(وە) یاد، بیرهێنان، بیرهێنانەوە، هێنانەبیر، وەبیرهێنان، وەبیرهێنانەوە، بەیادهێنانەوە، هێنانەوەیاد، بەئاگاهێنان. 2) بڕوانە: "واکسن".

**یادبود:** 1) یادگار، یادگاری. 2) ڕێوڕەسمێ کە بۆ یاد و بیرەوەری کەسێ بەڕێوەدەچێ، کۆڕیاد. 3) بیرەوەری، یاد. 4) یادکردنەوە لە کەسێك و چوونە سەردانی، هەواڵپرسی.

**یادداشت:** 1) یادداشت، یاداشت، بیرەوەری نووسیاگ، نیشە. 2) ڕەخنە یان شیکردنەوەیەکی کورت سەبارەت بە بابەتێك لە پەراوێزی لاپەڕەکانی نووسراوەیەك. 3) بڕوانە: "حافظە". 4) یادی خوا. **"یادداشت برداشتن"**: یاداشت هەڵگرتنەوە. **"یادداشت تفاهم"**: یاداشتی لێك تێگەیشتن. **"یادداشت کردن"**: یاداشت کردن، نووسین.

**یادزدودگی:** (دەروونناسی) سڕانەوەی بیرگە بەتەواوی لە دەورەیەکی دیاریکراو لە ژیاندا.

**یادسپاری:** خستنە بیرگەوە، لە بیرگەدا ڕاگرتن.

**یادکرد:** 1) باسکردن، یاد. 2) بیرەوەری. 3) بڕوانە:"یادآوری".

**یادگار:** 1) یادگار.2) یاد، بیرەوەری. 3) جێنشین، میراتبەر. 4) ئاسەوار، شوێنەوار. 5) هەرمانی، نەمر. **"یادگار داشتن":** وەك یادگاری لای خۆ ڕاگرتنی شتێ. **"یادگار شدن":** مردن و بوونە یاد و بیرەوەری. **"یادگار کردن":** 1) جێهێشتنی شتێ وەك یادگاری. 2) دیاریکردنی کەسێك وەك جێنشین. **"یادگار گذاشتن":** جێهێشتنی شتێ وەك یادگاری. **"یادگار ماندن":** 1) بەجێمانی شتێ لە کەسێك وەك یادگاری. 2) بەجێمانی کەسێك لەدوای مەرگی کەسێکی تر وەك جێنشین. 3) مانەوە وەك ئاسەوارێ لە پێشینیان. **"به یادگار":** وەك یادگاری.

**یادگارخواهی:** (دەروونناسی) بڕوانە:"فتی شیسم".

**یادگاری:** یادگاری، دیاری بۆ لە بیر نەچوونەوە.

**یادگیر:** 1) بەبەهرە، بەهرەمەند. 2) زانا و بەئەزموون. 3) ئاگادار لە شتێ. 4) یادکەرەوە.

**یادگیری:** 1) بڕوانە: "یادگرفتن". 2) گۆڕانێ کە بەهۆی ئەزموون یان ڕاهێنان لە هەڵسوکەوتی بوونەوەری زیندوو دێتە ئاراوە.

**یادمان:** ڕێوڕەسمی یادوبیرەوەری بۆ کەسێك.

**یادنامە:** بیرەوەری.

**یادوارە:** ڕێوڕەسمێ کە بۆ یادوبیرەوەری کەسێك بەڕێوە دەچێ.

**یادە:** 1) یاد، بیر، بیرگە. 2) بەرتیل.

**یار:** 1) بڕوانە:"معشوق". 2) دۆست، هەڤاڵ، ئاواڵ. 3) هاودەم، هاونشین. 4) خۆشەویست، گراوی، دڵبەر. 5) ئاریکار، یارمەتیدەر. 6) هاودەست، هاوکار. 7) هاوڕێ، هەڤرێ. 8) یارمەتیدەر، یاریدەدەر، ئاریکار. 9) خودا. 10) پێڕەو، مورید. 11) وەك، وێنە، هاوتا، خەنیم. **"یار شدن":** بوونە هاوڕێ و یەککگرتن. 2) تێکەڵبوون، ئاوێتەبوون. **"یار غار":** 1) هاوڕێی ئەشکەوت، هەڤاڵی زۆر گیانی گیانی. 2) لە بنەڕەت ڕا بە حەزرەتی ئەبووبەکر دەڵێن کە لە ئەشکەوتی "ثور"دا دەگەڵ پێغەمبەر بوو. **"یار کاسە":** ئەوەی لەبەر بەرژەوەندی ماددی دۆستایەتی دەکا. **"یار گرفتن":** هەڵبژاردنی خۆشەویست، هەڵبژاردنی کەسێك وەك دۆست. 2) هاوڕێ و هاوبڕوا کردن. **"یارودیار":** 1) دۆست و نیشتمان. 2) گشت دڵبەستراوەییەکان. **"یارویاور":** یارمەتیدەر و پشتیوان. **"کسی(چیزی) را یار کردن":** داوای یارمەتی لێکردن.

**یارا:** 1) تابشت و توان، هێزوتوانا، تاقەت، وزە، ورە، زات، زاور، زاڤر، نەترە. 2) هەل، دەرفەت. **"یارا داشتن":** 1) توانایی هەبوون، بەتوانابوون. 2) بوێر و بەزات بوون. **"یارا کردن":** بڕوانە:"یاریکردن". **"یارای کاری (را) داشتن":** توانای ئەنجامدانی ئەو هەبوون، لە تواناد هەبوون.

**یارانە:** 1) سووبسید. 2) دۆستانە.

**یارایی:** توانایی، وزەوتاقەت، هێز، دەسەڵات، کارین و شیان.

**یارد:** پێوانەیەکی قوماشە نەوەدودوو سانتی میترە بەرامبەر بە 36ئینچ.

**یاررس:** ئاریکار، یاریکار، یاریدەدەر، یارمەتیدەر، شوینکار.

**یاررسی:** یاریدە، کۆمەگ، هاریکاری، هەڤکاری.

**یارسالار:** جێگری بەرپرس.

**یارستن:** 1) توانین، لەوزەدابوون، پێکران، لەدەست هاتن، دەرۆست هاتن، باشارکردن. 2) زات هەبوون.

**یارغو:** 1) بڕوانە: "استنطاق". 2) سکاڵا، دادخوازی. 3) بڕیاری سزادان. 4) دادگە. 5) خانەی داد. **"یارغو پرسیدن":** پرسیارلێکردن، دادگاییکردن. **"در یارغو کشیدن":** سزادان.

**یارغوچی:** پرسکەر، پرسیارکەر، دادوەر.

**یارفروشی:** تاریف و پیاهەڵدان بە "یار"دا.

**یارك:** 1) بڕوانە: "معشوق". 2) دۆستی خۆشەویست. 3) دۆستی ناسك و جوان.

**یارگر:** یارمەتیدەر، هاریکار.

**یارگی:** توانایی، هێزوتاقەت، هەل و دەرفەت.

**یارلاقان:** درز، قەڵشت.

**یارمند:** یاریدەدەر، یارمەتیدەر، ئاریکارکەر، هەڤاڵ و دۆست.

**یارو:** کاورا، کابرا، مێرك، ئەوەکە، فلان، فلان، فران، جەبۆ، گۆرین، گۆیین، کەسێ کە ناوی نابەن.

**یارور:** یارمەتیدەر، هاریکار.

**یارە:** 1) بڕوانە: "یارا". 2) بازن، بازنە. 3) ملوانکە. 4) ئالقە.

**یاری:** 1) وەهید، باربوو، تەوجی، هانا، هاریکاری، یاریدە، یارمەتی، کۆمەگ، هاوڕێیەتی، دۆستایەتی. 2) دش، هاوگیان. **"یاری جستن":** یارمەتی ویستن، کۆمەگ ویستن. **"یاری خواستن":** 1) یارمەتی خواستن، هاریکاری خواستن، کۆمەگ ویستن، هاناویستن. 2) کەڵك وەرگرتن. **"یاری دادن":** یارمەتیدان، یارمەتیکردن، یاریدەدان، ئاریکاریکردن، یاریکردن، یاریکرن، کۆمەگ کردن. **"یاری دادن (کردن) دل":** ڕازی بوونی ئەو. **"یاری دهندە":** هاریکار، ئاریکار، یاریکار، یاریدەر، یاریدەدەر، یارمەتیدەر، پشت مێر، پشتەمێر. **"یاری**

**رساندن"**: یارمەتی پێکردن، یاریدەدان. **"یاری طلبیدن"**: یارمەتی ویستن، هاریکاری خواستن. **"یاری کردن"**: 1) یارمەتیدان، ئاریکاری کردن. 2) توانین، لە وزەدابوون، پێکران. 3) سازگاری و مدارا کردن. 4) بەهێزکردن. **"یاری کردن طالع"**: شانس هێنان.

**یاری رس**: دادرەس، یارمەتیدەر.

**یاریگر**: بڕوانە: "یاری دهندە".

**یازان**: 1) داواکار، خوازیار. 2) ئیرادەکەر، بەنیاز. 3) بڕوانە:"خرامان". 4) بازەڵە، لەگەشە. 5) درێژ.

**یازدن**: بڕوانە: "یازیدن".

**یازش**: 1) ئیرادە، ویست. 2) گەشەکردن، نەشونماکردن، هەڵدان.

**یازکردن**: دەست درێژیکردن.

**یازندگی**: 1) کردەی"یازندە". 2) بڕوانە: "خمیازە".

**یازندە**: 1) مەیلکەر، بەریانکەر. 3) بەنیاز. 4) درێژبوو. 5) گەشەکردو، باڵاکردوو، بڵیند. 6) درێژ.

**یازندەسر**: سەبەرز.

**یازە**: لەرە، جووڵە.

**یازیدن**: 1) درێژکردن. 2)درێژکردنەوەی شتێ بەنیازی لێانی لە شتێ. 3) کێشران، درێژبوون. 4) گرتنی شتێ، دەست بردن بۆ شتێ. 5) بڕوانە:"گراییدن". 6) چەمینەوە و خۆدرێژکردن. 7) ڕووکردنە شتێ، خەریك بوون. 8) ڕۆیشتن، ڕەوان بوون.

9) هێرشکردن، هەڵمەت بردن. 10) بڕوانە: "گلاویزشدن". 11) بڕوانە: "جَستن". 12) باوێشك دان.

**یاسا**: 1) دام و دەستوور، ڕێوشوێنی ناوکۆمەڵ، قانوون، یاسا. 2) دەستوور، بڕیار. 3) سزا. 4) ئەم وشەیە مەغوولییە و لەسەردەمی موغول دا باو بووە. **"یاسا دادن"**: دەستووردان، بڕیاردان. **"بە یاسا رسیدن"**: سزادران.

**یاسر**: 1) ئاسان، سانا. 2) لای چەپ. کەسێك کە وشتر دەکووژێتەوە و گۆشتەکەی پارچەپارچە دەکا.

**یاسین**: یاسین. **"یاسین بە گوش خر (درازگوش) خواندن"**: یاسین بە گوێی کەردا خوێندن کە کاتێ دەیڵێن کە پەند و ئامۆژگاری کارنەکاتە سەر گوێگر. **"یاسین بە (در) گوش کسی خواندن"**: بەگوێدادان، وتنی بابەتێ بە ئەو و دووپاتکردنەوی. **"یاسین در دهان مردە دادن"**: کاری بێهوودە کردن. **"بە یاسین افتادن کسی"**: لەسەرەمەرگ دا بوون، لە حاڵی گیانەڵادابوون.

**یاغی**: لامۆفەك، یاخی، یاغی، ئاخی، خەتمی، جەبە، مکوڕ، شیوارە، کەنهەش، شەقی، ئەشقی، پێچەقێن، سەربزێو، سەرکێش، سەرسەخت.

**یاغیگری**: یاخیەتی، یاخی بوون، یاخیگەری، یاغێتی، ملەپێچی، سەرپێچی، سەرکێشی، سەربەرزکردنەوە، سەربڵیندکردنەوە.





**یافت**: 1) بڕوانە:"دریافتن". 2) دۆزینەوەی شتێ، گەیشتن بە شتێ. 3) پەنی، دیار. **"یافت شدن"**: 1) وەدەست هاتن، دۆزرانەوە. 2) هەبوون.

**یافتگان**: دێکۆمێنت، بەڵگە.

**یافتگر**: بڕوانە:"کاشف".

**یافتن**: 1) وەدەست خستن، وەدەست هێنان، گیرهێنان، پەیداکردن، دۆزینەوە. 2) هەست پێکردن. 3) زانین. 4) بڕوانە: "فهمیدن". 5) خواستن، گەڕان. 6) بە مەبەست گەیشتن.

**یافتە**: 1) ئەوەی لە ئاکامی ئەزموون یان تاقیکردنەوەدا سەلمێنراوە، سەلمێنراو (یافتەهای علمی). 2) وەدەست خراو، وەدەست هاتوو، ب دەست خستی. 3) دۆزراوە.

**یافع**: تازەپێگەیشتوو.

**یافە**: 1) پڕوپووچ، بێمانا و پووچ. 2) ناتەکووز، پرژوبڵاو، پەرێشان. 3) تەنیا و بێ پشتیوان، بێکەس. 4) ونبوو. **"یافەشدن"**: ونبوون. **"یافەکردن"**: ون کردن، لەدەست دان. **"یافەگذاشتن"**: پاداشت نەدان، بەگرینگ نەزانین. **"یافەماندن"**: بێ بەش و ماتڵ مانەوە، بێکار سووڕانەوە.

**یافەدرا**: بڕوانە:"یاوەگو".

**یافەزن**: بڕوانە:"یاوەگو".

**یافەکاری**: هەوڵی بێئاکام و بێهوودە.

**یال**: 1) یاڵ، تووکی ملی شێر و ئەسپ و هتد. 2) یاڵ، شانی کێو. 3) مل، ئەستۆ. 4) بەژن و باڵا، ئەندام. **"یال آکندن"**: باڵاکردن، هەڵدان، نەشونماکردن. **"یال افراختن"**: 1) بڕوانە: "یال آکندن". 2) سەر ڕاست کردنەوە، سەرهەڵێنان. **"یال برآوردن"**: بڕوانە:"یال افراختن". **"یال برتافتن (تابیدن)"**: سەرپێچیکردن. **"یال برکشیدن"**: 1) هەڵدان، باڵاکردن. 2) پێگەیشتن، بە پلە و پۆست گەیشتن. **"یال بستن"**: فیزودەعیەکردن، لووت بەرزبوون. **"یال پیچیدن"**: پشت تێکردن، ڕوووەرگێڕان.

**یالمند**: ژن و منداڵدار، خاوەن ژن و منداڵ.

**یالیت**: خۆزگە، خۆزیا، خوەزی، بریا.

**یامفت**: 1) بەلاش، بەخۆڕایی. 2) بێهوودە. 3) بێکار.

**یانکی**: هەرکام لە تاکەکانی گەلی ئەمریکایی.

**یاوتن**: بڕوانە:"یافتن".

**یاور**: 1) یاریدەدەر، یاریدەر، ئاریکار، ئامیار، هەڤدەست، هەواڵ. 2) لە زاراوەی ئەرتەشدا: سەرگورد.

**یاوری**: یارمەتی، یاریدە. **"یاوری کردن"**: یارمەتیدان، هاریکاریکردن.

**یاوگی**: 1) بێهوودەبوون، پووچ و بێ مانابوون، پڕوپووچی. 2) سپای ناتەکووز و بێ فەرماندە. 3) بیرئاڵۆز و بێ

سەروبەر. 4) سەرگەردان، سەرلێشێواو.

**یاوگیان:** کۆی "یاوگی"، کەسانێك کە بێهوودە یان خۆسەرانە بۆ هەر لایەك دەچن و بەبێ نەزم و ڕێکوپێکی ئیش دەکەن.

**یاوند:** دەسەلاتدار، پاشا.

**یاونده:** بڕوانە: "یابندە".

**یاوه:** 1) فلت، فلتە، فلتەفلت، قسەی شڕوبێتام، ئاخافتنی بێتام، ئاشۆپاشۆ، فشقیات، قۆڕیات، گەف، لەوج، پڕوپووچ، بێمانا، بێهوودە. 2) وێڵ و بێسەرپەرشت. 3) ونبوو. "**یاوەبافتن**": قسەی شڕوبێتام وتن، فلتەکردن. "**یاوەبردن روزگار**": بە بێهوودەیی تێپەڕاندنی ڕۆژگار. "**یاوەشدن**": 1) ونبوون. 2) توانەوە، بوونە جسمێکی تر. "**یاوەکردن**": 1) ونکردن. 2) زایەکردن. 3) تەرك کردن، وێڵ کردن.

**یاوەتاز:** 1) هەڵەگەڕ، لووگی، بەرهەڵدای بێکارە. 2) بڕوانە: "یاوەگو".

**یاوەدرا(ی):** بڕوانە: "یاوەگو".

**یاوەسرا:** بڕوانە: "یاوەگو".

**یاوەگو:** چەنەبازی بێ تام بێژ، چەنەوەڕی قسەبێتام، فلتەوێژ، دم هەڵەی قسەقۆڕ، شیتەوێژ، چەلتەباز، بێژۆك، کۆلەوێژ، گەفۆك.

**یاوەگویی:** گەوجەگەوج، فلتاندن، دەم لێکدان، دەم لێدان، چەنەلێدان، چەنەبازی بەخۆڕایی، زۆروێژی، درێژدادڕی، ڕنگانەوە.

**یاویدن:** بڕوانە: "یافتن".

**یأس:** ناهومێدبوون، ناهومێدی، بێهیوایی، هیوابڕاوی، دڵساردی.

**یباب:** خراو، وێران، کاول.

**یبس:** (یُ) 1) وشکبوون، وشکی، حشکی. 2) تووشی قەبز بوو.

**یبوست:** 1) وشکی، دژی شێ. 2) زك گیری، قەبزی، قەبزایەتی، گرفت، سك وێستان.

**یتاق:** نیگەبانی، کێشك، ئێشك. "**یتاق داشتن**": نگابانی دان. "**یتاق رفتن**": نگابانی دان.

**یتاق دار:** پاسەوان، نگابان.

**یتاقی:** نگابان، پاسەبان، پاسەوان، ئاژان، ئێشکگر.

**یتیم:** 1) هەتیو، سەخیر، سەغیر، سێوی، بێباوك. 2) بێسەرپەرشت، بێپشتیوان. 3) بێوێنە، بێهاوتا(دُر یتیم). 4) دز، ڕێگر. "**یتیم ماندن از کسی(چیزی)**": بێبەش بوون لەو.

**یتیم خانە:** 1) بڕوانە: "دارالایتام". 2) شوێنی دزەکان.

**یتیمە:** 1) بێهاوتا، بێوێنە. 2) گرانبایی و بێوێنە.

**یحتمل:** لەوانەیە، رەنگە، ڕەنگبێ، وێدەچێ، دوور نیە.

**یخ:** 1) سەهۆڵ. 2) زۆر سارد. 3) بێ هەست و بەبێ نیشانەیەك لە





هەست و سۆز، ساردوسڕ. "**یخ انداختن**": ئاو دانان لە سەهۆڵدان بۆ سەهۆڵ کردن. "**یخ بستن**": بوونەسەهۆڵ، سەهۆڵ کردن، قەمرین، جەمداندن، بەستن، کاك بوون. "**یخ بسته**": سەهۆڵ کردوو، بەستوو، بەستەڵەك، بەستەڵۆك، جەمدی. "**یخ جویدن**": قسەی قۆڕ و بێ مانا وتن. "**یخ زدن**": 1) بڕوانە: "یخ بستن". 2) کەوتنەبەر سەرماوسۆڵ، کەوتنە بەر سایقە. "**یخ شدن**": 1) بڕوانە: "یخ بستن". 2) زۆر سارد بوون. "**یخ کردن**": 1) بڕوانە: "یخ بستن". 2) ساردبوونەوە(غذا یخ کرد). 3) کەسیرەبوون لە سەرمان. 4) تووشی ترس یان واق وڕمانی زۆر و کتوپڕ هاتن. "**یخ کسی باز شدن**": وەڕەزی شکان و کەیف سازبوونەوە یان حاڵەتی خۆمانەیی و گەموگوڕی پەیاکردن. "**یخ گرفتن**": سەهۆڵ دروست کردن بە دانانی ئاو لە بەستێنەردا. "**یخ های رابطه کسی با دیگری بازشدن**": چاکبوونەوەی پێوەندی ئەو دووانە.

**یخ آب:** سەهۆڵاو، ئاوی تێکەڵ بەسەهۆڵ، بووزئاڤ.

**یخبندان:** سۆڵبەندان، سەهۆڵبەنان، سەهۆڵبەندان، سۆڵە، بەستەڵەك، بەستەڵۆك، بەسڵەك، شەختە، ڕچ، قەڕماندن، کەرزین، زەوینی وشك هەڵاتوو لە سەرمان.

**یخ بندی:** بڕوانە: "یخبندان".

**یخچال:** سەهۆڵدان، بەستێنەر. "**یخچال طبیعی**": سەهۆڵان، زاندۆر، چاڵەبەفر. "**یخچال مصنوعی**": سەهۆڵخانە.

**یخچه:** تەرزە، تەیرۆك، گللێرە، گژگژۆك.

**یخ زده:** 1) بەستو، سەهۆڵ کردو، ڕچیاو. 2) سەرمابردو، سەرما کار لێکردن، زۆر سارد. 3) ساردوسڕ(نگاه یخ زده).

**یخ شکن:** سەهۆڵ/ سۆڵ شکێن.

**یخ لخشك:** خزین بەسەر سەهۆڵدا.

**یخ مالە:** کایەکردن لەسەر سەهۆڵ.

**یخنیکردن:** 1) کولاندن. 2) پاشەکەوت کردن.

**یخنی نهادن:** پاشەکەوت کردن، پەسمەندەکردن.

**یخی:** 1) سازکراو لە سەهۆڵ. 2) بەستو، سەهۆڵ کردو.

**یخین:** 1) سازکراو لە سەهۆڵ. 2) ساردوسڕ.

**یدبیضاء:** 1) دەستی سپی و ڕۆشن. بریتی لە دەستی حەزرەتی مووسا کە هەر کاتێ دەیخستە ژێر باغەڵ و دەری دەهێناوە دەدرەوشایەوە. 2) کەرامەت.

**یدطولی:** 1) دەستی درێژتر. 2) بریتی لە لێزانی و بەدەست و بردی و هێز و توانایی.

**یدعلیا:** بالادەست، هێزی بانتر.

**ید غاصبانە:** دەست بردن و زەوت کردنی ماڵ و سامانی کەسێك بەبێ ڕەزامەندیی ئەو و بەشێوەی نایاسایی.

**یدك:** 1) ئەسپی یەخترمە، ئەسپی بەزین کە لە دوای سوار دەڕوا. 2) ئامرازی زیادی بۆ جێگرتنەوەی خراوبووگ. "**یدك کشیدن**": 1) ڕاکێشان و بردنی ئامرازی ڕاگواستن بە ئامرازێکیتری ڕاگواستن. 2) ڕاکێشان و بردن، دەگەڵ خۆ بردن. 3) وەسفبوون بە ناو و سفەتێ. 4) لە ئەستۆبوونی بەرپرسیایەتییەکی تر بێجگەی لە شوغڵی سەرەکی.

**یراق کردن:** ساز و ئامادە کردن یان ساز و ئامادەبوون.

**یرغوبردن:** سکاڵاکردن، دادخوازیکردن.

**یرغوکردن:** دادگایی کردن و سزادان.

**یرقان:** زەردوویی، زەردەیی، زەردی، زەردیوی، زەرکی، بەزەك، نەخۆشییەکە کە ڕەنگی پێست و چاو زەرد دەکا.

**یرلیغ:** بڕیاری پاشا.

**یرمغان:** بڕوانە: "ارمغان".

**یزدان:** خودا. 2) خوای خێر و چاکە.

**یزدان پرست:** خواپەرست.

**یزدان شناخت:** زانستی خواناسی و ناسینی ئایینەکان.

**یزدان شناسی:** تیۆلۆژی.

**یزدان نمود:** دیارکەوتنی خودا.

**یزدانی:** 1) لەپێوەندی دەگەڵ خوادا. 2) بڕوانە: "الوهیت".

**یزك:** 1) بڕوانە: "جلودار". 2) پاسەوان، نگابان.

**یسار:** (یِ) 1) چۆپە، چەپە، لای چەپ. 2) بێفەڕ، قەشان، وەیشوومە. 3) سامان. 4) دەوڵەمەندی، سامانداری.

**یساق:** 1) شەڕ. 2) بارەگا، دیوان، دەزگای دەوڵەتی. 3) بڕوانە: "فسق". "**یساق کردن**": دەستوور دان.

**یسر:** 1) ئاسانی، سانایی، ساناهی. 2) دەوڵەمەندی، سامانداری. 3) لای چەپ.

**یسری:** لای چەپ، دەستی چەپ.

**یسنا:** یەکێك لە بەشەکانی ئەوێستا کە کاتی ڕێوڕەسمی ئایینی دەخوێنرێ. بە مانای ستایش و پەرستن و نوێژیش دێ.

**یسیر:** 1) کەم، نەخت. 2) سانا، ئاسان.

**یشتن:** پەرستن، ستایش کردن، بەندەییکردن.

**یشتەکردن:** نزاخوێندن، بەندەییکردن، نوێژخوێندن.

**یشك کردن:** گازگرتن، گەستن.

**یغما:** 1) تاڵان، تاڵوو. 2) تاڵانی. "**یغماکردن(زدن)**": تاڵان کردن، شەلاندن. "**به یغما بردن**": بە تاڵان بردن، تاڵان کردن. "**به یغما دادن**": لە دەست دان، خستنە بەر تاڵانی و ڕاووڕووت. "**یغماشدن**": تاڵان کران، بە تاڵان بران.

**یغماچی:** بڕوانە: "یغماگر".

**یغماگر:** تاڵانکەر، ڕاووڕووتکەر، نژدە.

**یغمایی:** بڕوانە: "یغماگر".





**یقظان:** بەخەبەر و وریا.

**یقە:** یەخە، پێسیر، بەرۆك. "**یقە چاك زدن**": یەخەدڕاندن ، یەخەدادڕین بە نبشانەی خەم و پەژارە. "**یقە چاك کردن**": 1) بڕوانە: "یقە چاك زدن". 2) لایەنگریکردن بە پێداگری و تامەزرۆییەوە لە کەسێ یان لە شتێ. "**یقە کسی را چسبیدن**": یەخەگرتن، بەرۆك پێگرتن، پێش پێگرتن. "**یقە کسی را گرفتن**": 1) بڕوانە: "یقە کسی را چسبیدن". 2) گرفتارکردنی ئەو. "**از یقە خود پایین انداختن کسی**": 1) ئەو وەك منالی خۆ قبووڵ کردن. 2) خستنەگەڵ خۆ، ڕەپاڵ خۆدان. "**برای کسی یقە جر دادن( پارەکردن )**": یەخۆ بۆ دڕاندن، بەتوندی لایەنگری یان بەرگری لێکردن.

**یقەدرانی:** هەرا و قاڵ کردن و خۆ وەك ستەم لێچوو نیشان دان، یەخەدڕاندن.

**یقین:** 1) حاڵەتی ئاگایی ورد یان دڵنیایی تەواو. 2) ڕاست، حەتمی. 3) بێگومان، بێشك، بێدوودڵی. 4) خاترجەم، دڵنیا، ئەرخەیان. 5) بڕوا، باوەڕ. 6) بڕوانە: "رستاخیز". 7) بابەتێ کە ڕوون و سەلمێنرابێ. "**یقین داشتن**": خاترجەم بوون، گومان نەبوون. "**یقین دانستن**": بە ڕاست زانین، دڵنیابوون. "**یقین شدن**": سەلمێنران، مسۆگەربوون، حەتمیبوون. "**یقین کردن**": خاترجەم بوون، دڵنیابوون. "**به یقین**": بڕوانە: "یقیناً". "**علم الیقین**": زانینی بابەتێ بە جۆرێك کە هیچ شك و گومانێکی لە سەر نەبێ. "**عین الیقین**": بەڕاست زانینی چییەتی شتێ یان بابەتێ کە بە چاو دیترابێ. "**حق الیقین**": بەڕاست زانینی چییەتی شتێ کە بە کۆی هەستەکان هەستی پیکرابێ و هیچ گومانی تێدانەبێ.

**یقیناً:** 1) خاترجەم، دڵنیا، ئەولە. 2) بێگومان، بێئەملاوئەولا.

**یك آب خوردن:** کاتێکی کەم، ساتێك.

**یك اسبە:** 1) خاوەن یەك ئەسپ، تاکەسوار. 2) تەنیا. 3) تایبەتمەندی کەسی سووك و بێ بایەخ.

**یکان:** 1) تاك، تاکان، دانەدانەکان. 2) بێهاوتا.

**یك انداز:** 1) یەك ئەندازە، یەکسان. 2) نیشانەئەنگێو، سەگوان.

**یکان یکان:** 1) یەك لە دوای یەك، پشت سەری یەك. 2) هەموو، گشت. 3) جۆراوجۆر، فراوان.

**یکایك:** 1) تاك تاك، تاك بەتاك، یەکیەك، یەك لە دوای یەك. 2) بە تەواوی و پاژبەپاژ. 3) کتوپڕ، لەنکاو. 4) دەزبەجێ، بەبێ مەحتەلی. 5) بە هیچ کلۆنجێ، هەرگیز. 6) دوو قات، دوو بەرابەر. 7) تاك و تەرا، بە تەنیایی. 8) هەرکام بەجیا. "**یکایك شدن**": دوو بەرابەر بوون(ەوە).

**یکبار:** 1) یەکجار، یەك کەڕەت، تەنیاجارێك. 2) بڕوانە: "ناگهان". 3) بەتەواوی، بە گشتی.

**یکبارگی:** یەکجارەکی، بەتەواوی، بەگشتی.

**یکباره:** 1) لەپڕ، لەنەکاو. 2) یەکجار، یەك کەڕەت. 3) بەتەواوی. 4) دروست، بە وردی. 5) کە واتە. 6) لە ناکاوی، کتوپڕی. "**بە یکبارە**": 1) بە تەواوی، بەگشتی. 2) لە یەك نۆبەدا.

**یك بر چند:** چەند بەرابەر، چەند قات.

**یك بسی:** 1) بەتەواوی، بەگشتی. 2) گرینگ، دژوار. 3) تەنیا.

**یك بعدی:** تاك ڕەهەندی.

**یك بیك:** تاك بە تاك، تاق بە تاق، یەکبەیەك، یەکبیەك، هەموو.

**یکپارچگی:** یەکپارچەیی، یەکگرتوویی، لەتنەکراوی.

**یکپارچە:** 1) یەکپارچە، یەکپارە، لەتنەکراو، یەك شەق، دروست و تەواو و کامڵ. 2) سەراپا، بەتەواوی. 3) یەکدەست، هاوئاهەنگ.

**یك پشت ناخن:** کەمێ، کەمەکێ.

**یك پوست:** 1) یەکدڵ، گەرموگوڕ، نێوان خۆش. 2) نەدار و هەژار.

**یك پهلو:** 1) لاتەنیشت. 2) بریتی لە خۆسەر و کەللەڕەق و پێداگر، کەللەشەق.

**یکتا:** 1) تەنیا، تاقانە. 2) بێهاوتا، بێ وێنە، بێمیناك. 3) بێ نیاز، چاڤ تێر. 4) ڕاست، ڕاستەوخۆ. 5) موخلیس، یەکدڵ. 6) یەك ڕەنگ، بێڕیا. 7) بە تەنیایی.

**یکتاپرست:** یەك پەرست، یەکتاپەرست، خودای تاك و تەنیاناس.

**یکتاپرستی:** یەك پەرستی، یەکتاپەرستی، خودای تاك ناسین.

**یکتادل:** 1) بڕوانە: "یکدل". 2) بڕوانە: "سادەدل".

**یکتایی:** 1) "یکتا"بوون. 2) یەك ڕەنگی، هەڤڕەنگی. 3) تەنیایی. "**یکتایی کردن**": دڕاندن، دادڕین.

**یك تختە:** یەکپارچە.

**یك تکە:** 1) یەکسەرە، بەردەوام. 2) یەکپارچە.

**یك تنە:** 1) تاق و تەنیا، بەتەنیا، بەتەنێ. 2) تاقانە، بێوێنە. 3) یەك دڵ.

**یك تو:** 1) یەك توێ، یەك لا. 2) گەرموگوڕ، یەك دڵ. 3) ئاشکرا.

**یك تهی:** یەك لا، یەك توێ.

**یك تیغ:** 1) یەك دەست، یەکپارچە. 2) یەك بین، بەبێوەستان. 3) یەکگرتوو و هاوئاهەنگ لە شەڕدا.

**یك جا:** 1) یەکجێ، بەتەواوی، بەگشتی. 2) هاوکات. 3) پێکەوە، دەگەڵ یەك. "**یك جا شدن**": شەریك بوون دەگەڵ کەسێك دا. "**یك جا کردن**": بە سەر یەکا ڕشتن یان لەتەنیشت یەك دانانی دوو یان چەند شت. "**یك جا گذاشتن**": بە یەکسان زانین. "**بە یك جا**": پێکەوە، دەگەڵ یەك.

**یك جان:** بڕوانە: "صمیمی".





**یکجانبە:** یەك لایەنە، یەك ئالی.

**یك جانشینی:** مانەوە لە شوێنێ بۆ هەمیشە.

**یك جلو:** لەنکاو، کتوپڕ و بێپێشەکی.

**یك جور:** یەك چەشن، یەکجۆر، یەکسان.

**یك جهت:** 1) یەك دڵ، کۆك. 2) بە یەك دڵی. 2) بڕوانە: "مأنوس". 4) بێڕیا، بێ ڕووبینی.

**یك چشم:** 1) یەکچاو، یەکچاوە، یەکچاڤە. 2) بریتی لە کەسی ڕواڵەت بین و بیرکورت و دووڕوو.

**یك چشم خواب:** ماوەیەکی کەم، ساتێك، چاوتروکانێك.

**یك چشم زد:** بڕوانە: "یك چشم خواب".

**یك چند:** چەندێ، دەمێك، دەمەك، ماوەیەك، هەیامەك.

**یك خردە:** کەمێ، کەمەکێ.

**یکدست:** 1) کەسێك کە یەك دەستی هەبێ و دەستەکەیتری لەکار کەوتبێ یان بڕابێ. 2) یەکچەشن، یەکجۆر، یەکسان. 3) یەکگرتوو. 4) یەکسەرە، بەتەواوی.

**یکدستی:** 1) بە یەك دەست. 2) یەکدەست بوون، هاوئاهەنگی. 3) بڕوانە: "تحقیرآمیز". 3) یەکێتی، یەکگرتن. "**یکدستی خوردن**": بڕوانە: "فریب خوردن". "**یکدستی گرفتن**": بە دەستەکەم گرتن، گرینگی پێنەدان، بە ئاسان دانان.

**یکدش:** (یَ.دَ) 1) دووتۆمە، دوڕە. 2) تێکەڵاوی و پێوەندی. 3) خۆشەویست و دڵخواز. 4) بڕوانە: "حرام زادە".

**یکدك:** بڕوانە: "ولرم".

**یکدل:** هاوڕا، یەکگرتوو، یەکڕوو، بێڕیا، دڵپاك، یەکدڵ، دۆست ڕاست، ڕاستگۆیانە.

**یکدلە:** یەکدڵ، بێڕووبینی، بێڕیا.

**یك دم:** بۆ ساتێك(یش).

**یك دندان:** هاوتەمەن.

**یکدندە:** 1) لاسار، سەرسەخت، سرتغ. 2) بێوچان، یەکسەرە.

**یك دهن:** 1) یەك پاروو. 2) بەقەرای یەکجار پێکەنین یان ئاواز خوێندن.

**یکدیگر:** یەکتر، یەکتری، یەکترین، یەکیەکێ، یەکیەکی، ئێکتر، یۆبینۆ، یۆنا، یەونا، یەوبنا، یەوبینان، یەونۆ، یەمنۆ، یەك و دوو. "**یکدیگر را دیدن**": چاوبەیەکترکەوتن، یەکتر چاوپێکەوتن، یەکتر دیتن، یەوبینان دیایش، یەوناڤینایش.

**یك ذرە:** 1) تۆزێك. 2) بەهێچ کلۆنجێك.

**یکراست:** 1) ڕاستەوخۆ، ڕاست بێ ئاوڕدانەوە، یەکسەر، یەکشەق. 2) بەبێ ماتڵی.

**یکران:** ئەسپی خۆشبەز و ڕەسەن.

**یك راه:** یەك جار، یەك نۆبە. "**بە یك راه**": بەیەکجاری، بەتەواوی.

**یك رکابی:** 1) ئەسپی یەخترمە. 2) پێداگر، شێلگیر. 3) بەپێداگری و شێلگیری.

**یك رکیبی:** پێداگر، شێلگیر، سوور.

**یکرنگ:** 1) هاوڕەنگ، یەك ڕەنگ، هەڤرەنگ، لە ڕەنگدا وەکیەك. 2) بریتی لە هەواڵی بێ ڕیا و ڕاست و پاك. 3) یەك فۆڕم، هاوتا. 4) لە ئەندازە و بەژندا وەك یەك. 5) سووراو.

**یکرو:** 1) بێ ڕیا، بێ ڕووبینی، ڕاست و ڕەوان، بێ درۆودووڕوویی. 2) بە هاوڕێیەتی. 3) یەك ڕوو. "**یکروکردن**": 1) یەکسەرەکردن، یەکلاکردنەوە، بەیەکجاری بڕاندنەوە، بەکۆتایی گەیاندنی کارێك. 2) هەڵسوکەوت کردن بە ڕاستی و بێ ڕیا.

**یك روند:** پەیتاپەیتا، پشت سەری یەك.

**یك رونشین:** لاسار، یەك دندە.

یك رویە: 1) یەك ڕوو. 2) گشت، هەموو. 3) بەتەواوی، یەکسەرە. 4) بە هاوڕێیەتی. 5) بێڕیا، بێڕووبینی. 6) گەرموگوڕ، یەکدڵ. 7) ڕوون، ئاشکرا. "**یك رویەشدن**": 1) بوونە یەك ڕوو. 2) یەکسەرەبوون و بە سەرەنجام گەیشتن. 3) بوونەیەك، یەکسان بوون. "**یك رویە کردن**": 1) یەکسەرەکردن(ەوە) یەکالاکردن(ەوە). "**بە یك رویە**": بە هاوڕێیەتی.

**یکرویی:** بێڕیایی، ڕاست و دروستی، دژی دووڕوویی.

**یکرە:** یەکجار. بێڕیا و درۆ و ساف و سادە. "**بە یك رە**": بەیەکجاری، بەتەواوی.

**یك ریز:** بەردەوام، دایم.

**یك زبان:** 1) هاوزمان، هاوبڕوا، هاوڕا. 2) هاودەنگ، هەڤدەنگ، هاوئاهەنگ. 3) ڕاست و یەکدڵ و بێڕیا.

**یك زفان:** بڕوانە:"یك زبان".

**یکساله:** 1) یەکساڵە لە تەمەندا، یەوسەڕا، یەوسەڕە. 2) لە یەك ساڵدا. 3) بەقەرای یەك ساڵ، بۆ یەك ساڵ.

**یکسان:** 1) یەکسان، یەکجۆر، هاوچەشن، بەرانبەر، وەکیەك. 2) هەمیشە، بەردەوام. 3) هاوڕا، هاوبڕوا. "**یکسان شدن**": وەکیەك لێهاتن، یەکسان بوون، بوونە هاوچەشن. "**یکسان کردن**": بڕوانە: "یکسان سازی". "**با خاك یکسان کردن**": خاك بە توورەکە کێشان، تەرتوتووناکردن، وێران کردن.

**یکسان سازی:** هاوچەشن کردنەوە، هاوچەشن سازی، یەکدەست کردنەوە، وەك یەك لێکردن، یەکسان کردن/ کردنەوە.

**یك سخن:** 1) هاوبڕوا، هاودەنگ. 2) بەبێ چەنەلێدان و باس کردن.

**یك سر/یك سرە:** یەکجارە، یەکجارەکی، بەیەکجاری، بەتەواوی، بیکەموکووڕی، یەکسەر، یەکسەرە، ڕاست بێ ئاوڕدانەوە. بە مانای گشت، هەموو و سەرانسەریش هاتووە. "**یك سرەشدن**": 1) یەکسەرەبوونەوە، بەسەرەنجام گەیشتن. 2) بوونەهاودەست. "**یك سرە کردن**": یەکالاکردن(ەوە)، بەسەرەنجام گەیاندن. یەکسەرەکردن(ەوە).

**یك سراسر:** بڕوانە: "یك سر".





**یك سلولی:** تەك خانەیی.

**یکسو:** جیا، لا، دوور. "**یکسوشدن**": چوونەلاوە، لاچوون، دوورکەوتنەوە، کەنارەگرتن، وەلاکەوتن، چوونەپەراوێزەوە. یەکسەرەبوونەوە. "**یکسوکردن**": خستنەلاوە، لەلاوەدانان، دوورخستنەوە، جیاکردنەوە، یەکسەرەکردن، یەکالاکردن. "**یکسونهادن**": خستنەلاوە، وەلانان.

**یکسوار/یکسوارە:** 1) تاك سوار، سوارچاك، شەهلوەند. 2) بریتی لە هەتاو.

**یکسون:** 1) یەکسان، هاوچەشن، یەکجۆر. 2) لە یەك کەنار دا، یەك لا.

**یك سونگری:** یەك لایەنە ڕوانی.

**یکشنبە:** یەکشەم، یەکشەممو، یەکشەممۆ، یەکشەممە، یەکشەمو، یەکشەمۆ، یەکشەمە، یەکشەمی، یەکشەمبی، یەوشەوا، یەوشەوە، ڕۆژی دووهەم دوای هەینی.

**یك صدا:** 1) یەك دەنگ، بەکۆ. 2) بە هاوڕێیەتی.

**یك ضرب:** 1) بەبێ تەژدیدی. 2) یەك کەڕەت. 3) بەبێوەستان، یەکسەرە.

**یك طرفە:** یەك لا. یەك لایەنە، یەك ئالییانە.

**یك عمر:** تەمەنێك، ماوەیەکی دوورودرێژ.

**یك قبا:** فەقیر، نەدار.

**یك قدم:** یەکگرتوو، هاوهەنگاو.

**یك قطبی:** تەك جەمسەری، خاوەنی یەك هێزی دیاریکەر.

**یك قلم:** 1) یەکسەرە، بەتەواوی. 2) یەکجێ.

**یك کارە:** بەبێهۆ و پێشەکی، لەخۆڕا.

**یك کاسە:** 1) یەکجێ، لەسەریەك. 2) بەتەواوی.

**یك کلام:** 1) بەیەکەوە، پێکەوە. 2) بەبێ چەنەلێدان و باسکردن. 3) لێبڕاوانە، بێ ئەملاوئەولا. "**یك کلام شدن**": یەکگرتن. یەك قسە کردن.

**یك کلمە:** یەك دەنگ، یەکگرتو، هاوبڕوا.

**یك کلە:** 1) بێپسانەوە، بەردەوام، یەکسەرە. 2) ڕاست، ڕاستەوخۆ. "**یك کلە افتادن**": بۆ ماوەیەکی زۆر لەجێدا کەوتن.

**یك گرە:** یەکگرتوو، هاوپەیمان.

**یك گونە:** هاوڕەنگ، یەکڕەنگ، یەکسان.

**یك گیر:** 1) جێکەوتو و ئامادە.

**یك لا:** 1) یەکلا، تاکەلۆیەك، پارچە یان جلوبەرگی ناسك. 2) کز، لاواز.

**یك لایە:** یەك لا، یەك لایی، یەك لۆنە، یەك توێ، یەکبەر، بێ قەدکردن.

**یك لخت:** (یَ.لَ) 1) یەکپارچە، یەکدەست، یەك تیکە. 2) قسەلەڕوو. 3) ڕووڕاست و بێڕیا. 4) کەسێ کە هەمیشە لە یەك دۆخ و حاڵەت دابێ و شێوازی خۆی نەگۆڕێ، نەگۆڕ، نەگۆهەر، یەك دندە. 5) بەیەکجاری، بەتەواوی. 6) کەمێ، کەمەکێ.

**یك لفظ:** یەك زمان، هاوبڕوا.

**یك لقمەکردن:** 1) یەکجێ قووتدان. 2) لەپێ خستن، تیابردن.

**یك مرتبه:** 1) کتوپڕ، لەنکاو، لەناخافڵ. 2) یەکجێ. 3) ڕاستەوخۆ، بەبێدەلاڵ.

**یك ناگاه:** بڕوانە: "ناگهان".

**یك نفس:** 1) یەکبین، لە یەك **هە**ناسەکێشاندا، یەك دەم. 2) پەیتاپەیتا، بێپسانەوە. 3) ماوەیەکی کەم.

**یکنواخت:** یەك ڕیتم، یەك توخم، یەکڕەنگ، یەکجۆر، وەکیەك، **ها**وئاهەنگ، بێگۆڕان، بێگوهارتن، یەکهاوی.

**یك نهاد:** 1) یەکدڵ و بێڕیا. 2) خاوەنی ڕەوشتی نەگۆڕ.

**یك نورد:** بەیەك شێوە/شێواز، بە یەك ڕێگە.

**یکنوع:** یەکجۆر، یەك نەسەق، یەك چەشن، یەکدەس.

**یك نیمه:** نیوەی شتێ.

**یك وجبی:** 1) یەك بستی. 2) زۆر چووکە.

**یك وری:** خواروخێچ، چەپوچیڕ.

**یك وقت:** 1) زەمانێ، سەردەمانێ. 2) لەپڕ، کتوپڕ. 3) لەوانەیە، ڕەنگە.

**یکّه:** تەرەجە، تاك، بەتەنیا، بێ هاوتا، بێوێنە. "**یکەخوردن**": شڵەژان، شڵەژین، شڵەژە، داچڵەکین، داچڵەکان، داچڵەکیان، خەجڵین، داتروسکان، داتروسکیان، داخرپان، داخرپیان، داخورپان، داخورپین، داخورپیان، ڕاچەنین، ڕاچڵەکین، ڕاجلفین، ڕاپەڕین لە نەکاو، **هە**ڵپەنمین، **هە**ڵبەزین(یەك بە خۆم **هە**ڵبەزیمەوە)، ڤابرن، ڤەگاڵیان، کۆخواردن، کۆخواردنەوە، گڤردی، گڤۆردی، لێبوون، لێویان، جەنقین، وەرچسە. "**یکەخوردن دل**": دڵ داخورپان. "**یکه زیاد گفتن( حرف زدن )**": قسەی درشت و تۆمەتاوی وتن. "**یکەوتنها**": تاق و تەنیا، تاك و تەرا. 2) تەنیایی.

**یکەتاز:** تاکەسوار، سواری بێهاوتا، دلێر و نەترس.

**یکەتازی:** تەراتێنی، پاشاگەردانی.

**یکەچین:** گوڵچین، **هە**ڵبژاردە.

**یکەخوان:** تاکبێژ، تاکخوێن، کتبێژ.

**یکەزا:** ژنێ کە تەنیا زگێکی کردبێ و ئیتر منالّی نەبێ.

**یکەسوار:** بڕوانە: "یکسوار".

**یکەگزین:** بێهاوتا، **هە**ڵبژێراو.

**یکهو:** کتوپڕ، کوتومزرەقی، لەنەکاو، گزوگومبەت، گزوگوم، لووت و بزووت، گوز، لەپڕ، لەپڕڕا، لەپڕایەکی، لەپڕێ، ژنشکاف.

**یك یك:** تاك تاك، یەکیەك، یەکەیەکە، یەك لە دوای یەك.

**یکی:** 1) یەکێ، یەکێك، کەسێك. 2) **هە**رکام. 3) یەکسان، وەکیەك. 4) نەگۆڕ، یەك. 5) یەکگرتوو. 6) یەك کەڕەت، یەکجار. 7) کەمێ، کەمەکێ. 8) خێرا، گورجێ، بەبێ مەحتەلی. 9) تەنیا. 10) ئێستا، ئێستاکە. 11) یەك، تاك، تاق. 12) خودا. 13) تاقانەیی، یەکتایی.





"**یکی ازیکی**": یەك لە یەکی، **هە**رکام لەویتر. "**یکی شدن**": 1) یەکگرتن. 2) گەرموگوڕبوون، نێوان خۆش بوون. 3) **ها**وبڕوابوون، **ها**ودەنگ بوون. "**یکی کردن**": 1) کردنە یەکجێ. 2) یەکگرتووکردن. "**یکی یکی**": یەکیەکە، یەکبەیەك، یەکۆیەکۆ، یەکی یەکی، یەوبیەو.

**یکی گو:** ئەوەی بڕوای بە یەکبوونی خوایە.

**یگان:** 1) یەکە. 2) یەك، یەك ژمارە. 3) تاقانەبوون، بێهاوتابوون. 4) بڕوانە: "یکی یکی". "**یگان یگان**": یەك بە دوای یەکا، یەکبەیەك، یەکییەکی.

**یگانگی:** 1) یەکتایی، تاقانەیی، بێ **ها**وتایی. 2) یەك ڕەنگی، **هە**ڤڕەنگی، دۆستایەتی گەرم. 3) یەکیەتی. 4) تەنیایی.

**یگانه:** 1) یەکتا، تاك، تاقانە. 2) بێ **ها**وتا، بێوێنە. 3) یەك ڕەنگ، یەکدڵ. 4) تەنیا. "**یگانەکننده**": یەکتاکەرەوە.

**یگانه پرست:** بڕوانە: "موحد".

**یکتا پرستی:** بڕوانە: "توحید".

**یگانەدل:** یەك ڕەنگ و یەکدڵ.

**یگانەگوی:** کەسی خواپەرست/یەکپەرست.

**یگونه:** بڕوانە: "یك گونه".

**یل:** پاڵەوان، دلێر، ئازا، بوێر.

**یلدا:** 1) وشەیەکی سریانییە بە مانای زایین، بەدنیاهاتن، کاتی لە دایك بوون. 2) درێژترین شەوی ساڵ کە **هە**وەڵ شەوی زستانە. 3) تاریك و بڵیند یان تاریك و قووڵ.

**یللی زدن:** خۆش بوون، گیزبوون.

**یله:** 1) بڕوانە: "ول". 2) لار، خوار. 3) تەنیا. 4) سۆزانی و **هە**ڵەگەڕ. 5) ڕزگاری. "**یلەدادن**": 1) بڕوانە: "لم دادن". 2) بڕوانە: "رهاکردن". "**یلەشدن**": 1) لاربوون، کەوتن. 2) بڕوانە: "رهاشدن". 3) تراتێن، تاودان، ڕەوانەبوون. 4) نەگونجان، نەلوان. "**یلەکردن**": 1) خوارکردن، لارکردن. 2) تەرك کردن، وازهێنان. 3) ئازادکردن. 4) ئیزن دان، هێشتن. 5) دانان، جێگیرکردن. 6) پێ سپاردن. 7) ڕەوانەکردن، ناردن. 8) **هە**ڵگرتنەوە، ڕفاندن. 9) جیاکردنەوە. 10) بە حەساونەهێنان. 11) پڕژاندن، وەشاندن. 12) ناچارکردن. 13) دڵ پێدان. 14) جێهێشتن.

**یلەگو:** بڕوانە: "یاوەگو".

**یمن:** فەڕ، پیرۆزی، موبارەکی، ودم، یوم، ورمێ، پیت، خێروبەرەکەت، خێروبێر، سەروسەنەمە، پێوقەدەم.

**یموت:** مەرگ.

**یمین:** 1) دەستی ڕاست، لای ڕاست. 2) سوێند. 3) خێر و بەختەوەری. "**یمین از یسار دانستن**": توانایی ناسین(ەوە) **هە**بوون. "**یمین خوردن**": سوێندخواردن.

**ینگ:** 1) ڕێوشوێن، شێوە. 2) ڕێگە، چارە. "از ینگ شدن کار": لە ڕێسا و ڕەواڵی ئاسایی دەرچوون.

**ینگا:** 1) نوێ، تازە. 2) بەربووک.

**ینگە:** 1) یەدەك، پاشکۆ. 2) پێخەسوو، بەربووک، بەربوودی.

**ینگی دنیا:** دنیای نوێ. ئەمریکا.

**ینگی چری:** لەشکری نوێ.

**یواش:** لەسەرخۆ، بەسەبر، سەبرۆکە، بەئەسپایی، ئاسپایی، ئێواش، هێدیکا، هێواش، یەباش، یاباش. "یواش کردن": هێواش کردنەوە، بەئەسپایی ڕۆیشتن. "یواش یواش": هێواش هێواش، قۆڵەقۆڵ، سەبرسەبر ڕۆیشتن، گۆلەگۆل.

**یواشکی:** 1) بەنهێنی، پەنامەکی. 2) بەئەسپایی، ئارام و بەپارێزەوە.

**یوتلیتاریانیزم:** ڕێبازی قازانج خوازی.

**یوتوپیا:** شاری ئاوات، کۆمەڵگای ئارمانی.

**یورتمە:** دۆمانە، گورگەلۆقە، قۆرتە، ئۆرخە.

**یورش:** هێرش، ئێریش، هرووژم، گالا، گلپ، گورمتە، گوژم، هەڵمەت، شالاو، پەلامار، هاژۆت، تەپ، دابەڕزین، دابەڕزان، نهێو، هەڵکوتان، هەڵکوتیان. "یورش بردن": هەڵمەت بردن، پەلاماردان، دارِسان، دارِسکان، تەپدان، هەڵکوتاندن، هەڵکوتانەسەر، بەسەردادان، هێرش بۆبردن، شالاوبردن، سەردائاژۆتن، گورمژین.

**یورو:** یورۆ، یەکەی پارەی هاوبەشی وڵاتانی ئەندامی یەکیەتی ئورووپا.

**یوز:** بڕوانە:"گدایی".

**یوزندە:** لێگەڕ، پەیجۆر، دۆزەر.

**یوزیدن:** خواستن، لێگەڕان، بۆگەڕان. تکاکردن.

**یوسون:** دابونەریت.

**یوغ:** کەڵەوە، کولاڤە.

**یولاخ:** زەوی بوورە و بێئاو و دوور لە ئاوایی.

**یوم:** ڕۆژ. "یوم دین": ڕۆژی پەسلانێ.

**یومیّە:** 1) ڕۆژانە، هەر ڕۆژە. 2) کرای ڕۆژانە، کرێی ڕۆژبەڕۆژ. 3) ئاسایی. 4) ڕۆژنامەیەك کە هەموو ڕۆژێك دەردەچێ.

**یونسکو:** ڕێکخراوی کولتووری سەربە ڕێکخراوی نەتەوەکان کە ساڵی 1946دامەزرا.

**یونیسف:** سندۆقی نێونەتەوەیی سەربە ڕێکخراوی نەتەوەکان کە ئامانجی کۆمەگ بە تەندروستی مناڵان و دایکان و ئامادەکردنی مناڵان و گەنجان بۆ کارگەلی سوودمەندە.

**یونیفورم:** یۆنیفۆرم، یەك بەرگی.

**یهود:** جوولەکەکان، پێڕەوانی حەزرەتی مووسا.





**یهودی:** جوو، جوولەکە، مووسایی، کەلیمی. "یهودی متعصب": ڕەشەجوو.

**یهودیت:** 1) ئایینێ کە حەزرەتی مووسا هاوردوویەتی. 2) مووسایی‌بوون، جوولەکەبوون.

**ییلاق:** هەوار، هاوینەهەوار، هاڤینەهەوار، هاڤینەوار، هاوینەوار، هاوینگە، هاڤینگە، هەوارگەیکۆچەران، زۆزان، کۆسان، کوێستان، بانەمەڕ، کۆز، لەیلاخ، ئێلاخ، ئێلاق، میلکان، ڤار، وار. "ییلاق خالی شدە": جامالگە، هەواری چۆڵ، زۆزانا کۆچەر لێنەمایی. "ییلاق رفتن": هەوارچوون، هەوارکردن، چوونەکوێستان، ڕۆیشتن بۆ بانەمەڕان. "ییلاق رو": هەوارچی، کۆچەر، کوێستانچی، ڕەوەند. "ییلاق کوچك": زۆزك، کوێستانۆکە، هەوارگەی بچووک. "ییلاق و قشلاق": گەرمێن و کوێستان.

## منابع:


1) فەرهەنگی هەنبانە بۆرینە، کوردی ـ فارسی، دانانی: مامۆستا هەژار، چاپی سێیەم 1381.

2) فرهنگ فشرده سخن، دوجلدی، تألیف دکتر حسن انوری، چاپ اوّل 1382.

3) فرهنگ فارسی دو جلدی عمید، تألیف حسن عمید، چاپ ششم 1364.

4) فرهنگ فارسی چهار جلدی معین، مؤلف: دکتر محمّد معین، چاپ سوّم 2536 شاهنشاهی.

5) فرهنگ انگلیسی ـ فارسی یك جلدی پیشرو آریان پور، مؤلف: دکتر منوچهر آریان پور کاشانی، چاپ 1377.

6) فرهنگ انگلیسی ـ انگلیسی و انگلیسی ـ فارسی نشر نو، تألیف و ترجمه: محمّدرضا جعفری، چاپ 1381.

7) فەرهەنگی ئینگلیزی ـ عەرەبی ـ کوردی فەلسەفی، ئامادەکردنی: محەممەد چیا، چاپی 2004.

8) فەرهەنگی ئینگلیزی ـ عەرەبی ـ کوردی نما ، دانانی د. ڕێباز جەمال عەبدول، چاپی یەکەم 2001.

9) فەرهەنگی ئینگلیزی ـ عەرەبی ـ کوردی و عەرەبی ـ کوردی ـ ئینگلیزی فەلسەفە، دانانیڕۆشنا ئەحمەد، چاپی 2003.

10) ئینسکلۆپیدیای ئابووری، عەرەبی ـ ئینگلیزی ـ کوردی، دانانی: فەیسەڵ دەباغ.

11) فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی، کوردی ـ ئینگلیزی و ئینگلیزی ـ کوردی، دانانی بەختیار سەجادی و محەمەد مەحموودی، چاپی 2002.

12) بەرگی یەکەم و دووهەمی فەرهەنگی هەرمان، کوردی ـ کوردی، دانانی عەلی نانەوازادە، چاپی2005.

13) فەرهەنگی نوێ بۆ شیکاری ڕامیاری، ئینگلیزی ـ عەرەبی ـ کوردی، نووسینی geoffre roberts&alistair edwards، وەرگێڕانی بۆ کوردی محەممەد چیا.

14) واژەنامە فارسی ـ کوردی ، محمّد تقی ابراهیم پور، چاپ 1373.

15) فەرهەنگی جوگرافیای سروشتی، ئینگلیزی ـ عەرەبی ـ کوردی و عەرەبی ـ کوردی ـ ئینگلیزی، دانانی: جەزا تۆفیق تالیب و ئەحمەد عەلی ئەحمەد.

16) قاموس عربی ـ کردی، تألیف: گیو مکریانی، چاپ 1986.





17) گۆڤاری پەروەردە و زانست، ژمارەی تایبەتی فەرهەنگی زاراوەکانی قوتابخانە عەرەبی ـ کوردی، هاوینی 1978.

18) یادداشتەکانی دانەری ئەم فەرهەنگە.

19) فەرهەنگی گیرفانی ئاسان، عەرەبی ـ کوردی، ئامادەکردنی : ئاکۆ فاتیح، چاپی 2004.

20) فەرهەنگی گیرفانی جاف، ئینگلیزی ـ کوردی، ئیحسان عەلی، چاپی 2003.

21) فەرهەنگی گیرفانی خاك، فارسی ـ کوردی، مەحموود عەبدوڵڵا و جەمال جەلال، چاپی 2005.

## بەشێك لە كتێبە چاپكراوەكانی دەزگای موكریانی

1- دادگای نێودەوڵەتی تاوانكاری ، ن: د. مورشید احمد و احمد غازی ، و: ئاسۆ كەریم

2- كۆمەڵناسی گشتی ، ن: مەنوچێهر موحسنی و: موسلح ئیروانی

3- خۆ بە كۆیلە كردن ئاتین دولابوتی ، و: رێبوار سیوەیلی – مراد حەكیم

4- مێژووی هزری سیاسی لە ڕۆژئاوا(بەرگی دووەم)،ن: د.كمال پۆلادی، و: ئازاد وەڵەدبەگی– سیروان زەندی

5- مێژووی هزری سیاسی لەڕۆژئاوا(بەرگی سێیەم) ، ن: د.كمال پۆلادی،و:ئازاد وەڵەدبەگی– سیروان زەندی

6- گەشتە دوورەكەم لە پێناوی ئازادیدا ، ن: ماندێلا ، و: شێرزاد هەینی

7- هونەر و ژیانی كۆمەڵایەتی بلیخانۆف ، و: حەمە كەریم عارف

8- ژن ، ن: رێواس جاف

9- ئەدەبی منداڵانی كورد ، ن: ناهیدە احمد

10- بەڵێنەكانی لیبرالیزمی عەرەبی ، ن: تارا كۆفمان ، و: بێوار عەبدولرەحمان

11- بارودۆخی سیاسی كوردستان (1880-1946) ، ن: موجتەبا بورزوویی ، و: نازەنین مەلا محمد

12- دیاردەی گەندەڵی ، ن: د. ناسر عوبێد ، و: سەلاح شاكەلی

13- دنیای راستەقینەی دیموكراسی ، ن: س.ب.مەكفێرسۆن ، و: اسماعیل زادە

14- رۆژێك لە تەمەنی ئیڤان دنیسۆڤیچ ، ن: سۆلژنیستین ، و: سلێمان دڵسۆز

15- كاتژمێری شووم ، ن: گارسیا ماركیز ، و: ئەسكەندەر محمود

16- شۆڕش و بزووتنەوە كۆمەڵایەتییەكان ، ن: ئەنتۆنی گیدنز ، و: هیوا حاجی

17- كانت نموونەیەك لە ژیان و كارە فكرییەكانی ، ن: عیماد عەبدولسەلام ، و: پەژارە عەبدولحەمید

18- رووپێوێكی جیۆپۆلەتیكی كوردستان ، ن: یۆرگین لاسۆ- یسپەر ئایدم ، و: ئاسۆس محمد مەلا قادر

19- ژن لە سەر تەختی دەسەڵات ، ن: مەحموود تلووعی ، و: ئەبوبەكر مەجیدی

20- فەرهەنگی هەرمان (بەرگی یەكەم) ، ن: عەلی نانەوازادە

21- فەرهەنگی هەرمان (بەرگی دووەم) ، ن: عەلی نانەوازادە

22- بنەماكانی فەلسەفەی شیكردنەوەی مەنتیقی ، ن: د.حەمید عەزیز



23- منداڵی ئاخر زەمان ، ن: عزیز نەسین ، و: غەریب پشدەری

24- كوردەكانی ئەستەمبۆڵی كۆن ، ن: رۆهات ئەلاكۆم ،و: ئەحمەد تاقانە

25- سنووری كوردستان ، ن: عەبدوڵلا غەفوور

26- تاگوور و ویژدانی مرۆیی ، ن: رامین جەهانبەگلۆ ، و: یادگار حەمە غەریب

27- فەندەمێنتالیزمی ئیسلامی لە جیهانی عەرەبدا ، ن: ریچارد هرایەر دكمەجیان ، و: ئاسۆ كەریم

28- مێژووی فەلسەفە ، ن: هیگڵ ، و: عرفان مستەفا

29- ژیان كورتە(نامەیەك بۆ ئاگۆستینی قەدیس) ، ن: یۆستین گۆردەر ، و: رێبوار سیوەیلی

30- لێكۆڵینەوەكانی پێش مێژوو لە كوردستانی عێراقدا ، ن: رووبەرت جێی برید وود ، و: ئاسۆس محمد مەلا قادر

31- سەرەتایەك بۆ تێگەیشتنی هونەری شێوەكاری ، ن: حسن سلێمان ، و: نەژاد عزیز سورمێ

32- رێگاوبان ، ن: نیكۆلای خاتیۆف ، و: نەژاد عزیز سۆرمێ

33- جوگرافیای كوردستان ، ن: د. عەبدوڵلا غەفور

34- دەروازەكانی كۆمەڵناسی ، ن: مەنوچێهر موحسنی ، و: كۆمەڵێك وەرگێڕ

35- میژووێتی هزری عەرەبیی ئیسلامی ، ن: محەمەد ئاركۆن ، و: نەریمان تالیب

36- گوڵبژێرێك لە چیرۆكەكانی سادقی هیدایەت سادقی هیدایەت ، و: عەلی نانەوازادە

37- چەند وێستگەیەكی ئەدەبی و فیكری ، و: ئازاد بەرزنجی

38- خواوەند و پاڵەوانەكانی گریكلاند ، ن: ئیریك ئێریكسۆن ، و: تەها ئەمین هەڵەدنی

39- حەكیمانە ، ن: پاولۆ كۆیلیۆ ، و: یوسف محەمەد/كارا فاتیح

40- یەكەمین سەرچاوەكانی هونەری مۆدێرن ، ن: ه. و. جەنسن ، و: سەیوان سەعیدیان

41- چەند دۆكیۆمێنتێكی نێودەوڵەتی لەبارەی مافەكانی مرۆڤەوە ، و: قادر وریا

42- دیجلەی هزرم ، ن: د. مارف خەزنەدار

43- ئایین و دەوڵەت و پیادەكردنی شەریعەت ، ن: د. محەمەد عابد جابری ، و: فوئاد سدیق

44- فەلسەفەی ئەخلاقی و كۆمەڵایەتی ئوگوستین ، ن: د. عەلی زەیعور ، و: سنوور عەبدوڵلا

45- گۆرستانی غەریبان ، ن: ئیبراهیمی یونسی ، و: غەریب پشدەری

46- فیهی ما فیهی ، ن: مەولەوی ، و: عەلی نانەوازادە

47- گوڵستان ، ن: سەعدی ، و: عەلی نانەوازادە

48- ئایدیای قانوون ، ن: دنیس لوید ، و: ئاسۆ كەریم و...

49- مرۆڤ و ئایینەكان ، ن: میشێل مالرێب ، و: هیوا مەلا عەلی سوورەدێیی

50- پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵ ، ن: ئا. مکارنکۆ ، و: مستەفا غەفور

51- القبائل الكوردیە ، ن: ویلیام ایغلتون ، و: د. احمد محمود خلیل

52- گەڕیان ل دیف بەتەوەریێ ، ن: لورد ئاوویبۆری ، و: جگەرسۆز پێندرۆیی

53- تەنگژەکانی تیرۆریزم ، ن: کۆمەڵێك نووسەر ، و: هێمن غەنی و مەروان کاکل

54- دوا وەسوەسەی کریست ، ن: کازانتزاکی ، و: کەریم دەشتی

55- گوتاری تیرۆریزم ، ن: کۆمەڵێك نووسەر ، و: کۆمەڵێك وەرگێڕ

56- ژان ، ن: مارگارێت دوراس ، و: رەسوڵ سوڵتانی

57- تیرۆریزم وەك تاوانێکی ڕێکخراو ، ن: گاری پوتەر/ مایکڵ لیمەن ، و: ئەبوبەکر مەجیدی

58- چەند لایەنێکی واتاسازی ، ن: کوروش سەفەوی ، و: دلێر سادق کانەبی

59- هەموو هەڤیانە ، ن: مەنۆچەهری کەریم ، و: زادە غەریب پشدەری

60- کاتێ نیچە گریا ، ن: ئیرڤین دی یالوم ، و: دڵشاد هیوا

28- ژانی ژینگە ، ن: سەدرەدین نورەدین

29- عاشقانە ، ن: پاولۆ کۆیلیۆ ، و: کارا فاتیح / یوسف محمد

61- کۆمەڵگای کراوە و دوژمنەکانی (بەرگی یەکەم) ، ن: کارل پوپەر، و: ئیدریس شێخ شەرەفی

62- کۆمەڵگای کراوە و دوژمنەکانی (بەرگی دووەم) ، ن: کارل پوپەر ، و: ئیدریس شێخ شەرەفی

63- میسیۆ برایم و گوڵەکانی ناو قورعانەکەی ، ن: ئیریك ئیمانوئیل شمیت ، و: سەلاح گادانی

64- خطوة علي الطریق الي البیت الکوردي الکبیر د. حسین بدیوی

65- آلیة العلاقة بین المعارضة والسلطة في الاسلام د. کاوه محمود شاکر

66- جمالیات الطبیعة في کردستان العراق د. محمد عارف

67- کورد و جینۆساید و ئیبادەکردن، هەژار عزیز سورمێ

68- پرۆدۆن جۆرج گۆرڤیچ، ئارام ئەمین

69- مینۆرسکی و کورد، ئەنوەری سوڵتانی

70- کورد و سەلجوقییەکان، د. نیشتمان بەشیر ئیدریس عەبدوڵلا

71- لەدەوڵەتی دەسەڵاتەوە تا دەوڵەتی عەقڵ، کەمال پولادی، و: سیروان زەندی

72- ئیبن خەلدون وکۆمەڵناسی مۆدێرن زیرەك رەحمان و سنور عبدالله

73- ئەو ئایدیایانەی دەستیان بەسەرجیهاندا گرت، و: گۆران سەباح

74- کورد لەئەرشیفی روسیاو سۆڤیەتدا، د. ئەفراسیاو هەورامی

75- قوتابخانە ئەدبیەکان، ن: رەزا سەید حوسێنی، و: حەمەکەریم عارف



76- عاریفانە، ن: پاولۆ کۆیلۆ و: گارا فاتح

77- زمان، هزرو کولتور چەند نووسەرێك، و: رەحیم سورخی

78- توێژینەوەی تیۆری ئەدەبی، ن: راجێر وێبستەر، و: عەبدولخاق یەعقوبی

79- ماکیاڤیللی و بیری رێنسانس، ن: رامین جەهانبەگلو، و: موسلح ئیروانی

80- راپەڕینی کوردان، ن: پ.م.ا.حەسرەتیان، و: جەلال دەباغ

81- جێگای بەتاڵی سلووچ، ن: مەحمود دەوڵەت ئابادی، و: ئەمین گەردی گلانی

82- سەرکەوتنی بێ سنوور بە 20 رۆژ، ن: ئانتونی رابینز، و: هاموون

83- واتاسازی، کلۆد جێرمان، و: د. یوسف شەریف سەعید

84- - رێبازە ئەدەبییەکان، ن: د. هیمددادی حوسێن

85- زمان، وەرگێڕان، پێوەندییە کولتوورییەکان، ن: حسین وثوقی، و: اسماعیل زارعی

86- رابەی رۆژنامەنووس لە جیهانی سێیەمدا، ن: ئەلبێرت ل. هستر و وای لان ج. تو، و: حەسەن عەبولکەریم

87- سیاسەت وحکومەت لەئەوروپا، احمد نقیب زادە، و: علی مێهرپەروەر

88- سەرهەڵدان و بەردەوامی حزبەسیاسیەکان لە ئەوروپا، ن: حوجەتوڵلاٌ ئەیوبی، و: ئازاد وەڵەدبەگی

89- پێشەوای رابوون، هاشم سەلیمی، و: رەسووڵ سوڵتانی

90- نهێنی سەرکەوتن لە بازارەکانی کاردا، ن: کیهان نیا، و: ئەدهەم ئەمین

91- پێشەکیەك بۆ کۆمەڵناسیی سیاسی، ن: د. احمد نقیب زادە، و:مەسعود رەواندووست

92- شارەوانی و کارگێری و دیموکراسی، ن: سەردار شەریف سندی